


ناوەندی چاپ و بڵاو کردنەوەی کتێبی میهرەگان

**ناسنامە**

ناوی کتێب: **چێشتی مجێور**
نووسەر: **مامۆستا هەژار**
نوویسیار: **ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**
پیتچنین: **ئاراز محەمەد ساڵح**
ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: **ئاری محەمەد ساڵح**
هەڵەگری: **ئەفشین بەهاریزەڕ، ئاری محەمەد ساڵح، شوانە ماجد**
ڕووبەرگ: **حەمیدڕەزا زەڕی**
چاپی دووهەم: ٢٠٠٧

**نرخ**:

لە کوردستانی عیراق ١٠ دۆلار

لە کوردستانی ئێران ٧٥٠٠ تمەن

# ناوەرۆک

# دەسپێک

چێشتی مجێور - بەکورتی- بەسەرهاتی نووسەرێکە، بە قەڵەمی خۆی؛ کە ڕۆژاواییان «ئوتۆبیوگرافی»[1] پێ دەڵێن. لە لای ئێمە -تا ئەم دواییانە- کاری وا زۆر باو نەبووە و زیاتر، دیتران، بەتایبەت مێژوونووسان لە مەڕ ژیان و بەسەرهاتی کەسانیترەوە نووسیویانە. خۆ ئەگەریش تاک و تەرا چەند کەسێک بیرەوەری ژیانی خۆیانیان نووسیبێت، یان هەر ڕووناکی نەدیوە و هیچ کەسی پێ نەزانیوە، یان ئەگەریش بووبێتە کتێب و لەچاپ درابێ، نەیتوانیوە لەناو خەڵکدا جێی خۆی بە جۆرێ بکاتەوە. ئەگەر وایە، لەبەر چی چێشتی مجێور ئاوا بۆتە هاودەمی زۆرێک لە خەڵک و هەرکەسێ جارێک خوێندیەوە، وای بە دڵەوە دەنیشێ و ئۆگری دەبێ، زووبەزوو تاسەی دەکا و لەسەرڕا پێیدا دەچێتەوە؟

بۆ وەرامی ئەم پرسیارە، چەند هۆکارێک لە بەرچاوە:

١. کات، نیوەی دووهەمی چەرخی بیستەمی زایینی و پاش دووهەم شەڕی جیهانگیرە. هێزە سەرکەوتووەکان، یەکیان بە ناوی ئازادی مرۆڤ و بیروبڕوا، شیشاوەتە زێد و نیشتمانی گەلە ژێردەست و چەوساوەکانەوە و یەکیتر لە ژێر درۆشمی دیکتاتوری کرێکار و جووتیاراندا، مێشک و کەسایەتی خەڵکی داماوی زوێڵ کردووە و گیان و ژیانیانی وەبەر داوە.

٢. شوێن و هۆی سەرەکی ڕووداوان، کوردستانە؛ بەو مێژووە هەستبزوێنەوە، لەم ڕۆژگارە پڕ لە هەرا و هووریایەدا.

٣. نووسەری کتێب، هەستیار و وێژەوان و وەرگێڕی گەورە و بەناوبانگی کورد، مامۆستا هەژارە کە هەموو ژیانی بۆ گەل و نیشتمانی بەخت کردووە و ماوەیێکی زۆر لە عومری خۆی، پێشمەرگە بووە و بە شیعر و پەخشان خەباتی کردووە و هیچ زۆردار و گزیکارێکیشی هەڵنەبواردووە. بەم بۆنەوە چڵی چاوی ملهوڕان و گەلخۆران بووە و لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکیتر هەلاتووە. بە قاچاغ ژیاوە و قەت خۆی بەدەستەوە نەداوە.

٤. هێزی بیر و وەبیرهێنانەوەی نووسەر، گاڵەی پێ دەکا. لەو هەموو ناوی کەسانی ناسراو و نەشناس و شوێنی دوور و نزیک و ڕووداوی ورد و درشت و وردەکارییانەی کە یەک لە دووی یەک ڕیز کراون، سەری هەموو خوێنەرێک سووڕ دەمێنێ.

---

١. Autobiography ؛ بە کوردی «ژینامەی خۆنووس» پڕ بە پێستیەتی.

٥. لە باری وێژەییشەوە زمانی ئەم کتێبە زمانێکی زۆر ڕەوان و ئاسان و ساکارە کە بۆ ڕۆژنامەوانان و هەوالگرانی کورد زمان، شیاوە سەرمەشق بێ.

ئەمانە هەموو ڕاستن و هەرکام بە بەشی خۆیان بایەخی کتێبەکەیان زیاتر کردووە؛ بەلام بە بڕوای من هۆی سەرەکی سەرکەوتوویی و هێژایی ئەم نووسراوەیە، ڕاست و بێپێچوپا بوونیەتی. نووسەر پێش هەموو کەسێک خۆی دەداتە بەر تیری تەوس و توانج و تانەوە. ئەوی بەسەریدا هاتووە یان کردوویە - ئەگەرچی زۆر ناحەز و ناشیرینیش بووبێت- خۆی لێ نەبواردووە و بە ڕاشکاوی نووسیویە. خوێنەری چێشتی مجێور هێشتا پەنجا لاپەڕەی لێ نەخوێندۆتەوە، وا بە دڵ بڕوا بە نووکوبەدی دەکا و خۆی دەداتە دەستی قەلەمەکەوە، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، جار- جار لەگەلی قا- قا پێدەکەنێ و جاروبارەش بەدوویدا تک-تک فرمێسک دادەوەرێنێ.

بەم بۆنەوە، بە بۆچوونی من چێشتی مجێور گەوهەرێکی نایابە لە گەنجینەی زمان و فەرهەنگی کوردیدا.

***

ڕۆژێک مامۆستا هەژار چوار دەفتەری گەورەی دووسەد بەرگی بۆ هێنام و فەرمووی: ئەوا بەسەرهاتەکەم؛ با لای تۆ بێ و تۆ یەکەم کەس بی دەیخوێنیەوە.

سێ دەفتەریان -پڕبەپڕ و پشت و ڕوو- نووسرابوون و چوارەم، چواریەکێکی و باقی سپی بوو. بە ئارەزوو چۆکم لە پێشی دادا و بێوچان و بێپشوودان کەوتمە خوێندنەوەی و - وەک عادەتمە- قەلەم و کاغەزێکم لە پەناوە، ئەگەر تێبینییەکم کەوتە بەرچاو، بینووسم. بڕوا بکەن شەو و ڕۆژم نەدەزانی و تا تەواوم نەکرد لێی نەبوومەوە. ئەمجار دەفتەرەکانم هەلگرت و چوومە خزمەتی مامۆستا.

- قوربان ئەوا هەمووم خوێندەوە.

- وا بە پەلە؟!

- بەلێ؛ چەند خالێکیشم هەیە.

- خالی چی؟ دە بێژە بزانم!

یەک بە یەکم لە ڕووی ژمارەی لاپەڕە و دێڕ دەدۆزینەوە و دەمگوتن. جیا لە هەلەی بە دەم نووسینەوە، زۆربەی زۆریان پێشنیاری ناو نەبردن و باس نەکردنی کەسانێک بوو کە خراپەیەکی وایان کردووە، ئێمەمانان بۆمان دەست بدا، دوور نییە بیکەین؛ ئێستا کەی خودا بەردارە وا ناویان لە هەموو کوردستاندا بزڕێ، نەک بەتەنیا هەر بۆ خۆیان، بگرە بنەمالەکەشیان هەتا هەتایە پێی شەرمەزار بن؟ من دلنیام تا کورد مابن، ئەم کتێبە - جار لە دووی جار- لە چاپ دەدرێتەوە و هەرکەسێک کەچە سیوادێکی هەبێ دیخوێنێتەوە.

- بابە من چم داوە لە هەموو کوردستان و ئەم هەتاهەتایە تۆ ئێژی؟ قسەی دلی خۆم هەلڕشتووە؛ گال و گەنمیشی تێ کەوتووە. چاو لە خۆت مەڕوانە [بە پێکەنینێکەوە] کەس تاقەتی خوێندنەوەی ئەم ....ەی منی نییە.

به کورتی چەند بابەتێک لە هەوەڵەوە نەبێ، ئەویش بە نابەدڵی، باقی هەر ئاوڕی لێ نەدایەوە و بە هیچی حیساب نەکردن. تەنانەت لە سەر باسێکیان لێشم تووڕە بوو و بەگژیشمدا چوو!

***

ساڵێک و چەند مانگ پاش کۆچی دوایی مامۆستا، دۆستی خۆشەویستم کاک خانی شەرەفکەندی (هەژار) -کە ئەو دەم لە ئەنستیتۆی کورد لە پاریس بوو- داوای دەسنووسەکەی چێشتی مجێوری لێ کردم و گوتی لێبڕاوم کاری لەسەر بکەم و لە چاپی بدەم. پێم دا و ڕاستوپاکی حیکایەتی خۆشم بۆ گێڕایەوە.

ماوەیەک ڕابرد؛ خەبەرم هەبوو کاک خانی بەردەوام خەریکی تایپ و تەرتیبی کارەکەیە؛ تا لە چاپ دەرهات و بەرگێکی بۆ ناردم. کە خوێندمەوە، تێگەییشتم چەند بە ئەمانەتەوە کاری کردووە و چەندی پێوە ماندوو بووە.

کتێب نەگەیشتبووە بەرەوە، تەواو بوو. ئەمجار دەستەیەک کتێبدز وەخۆ کەوتن؛ نە جارێک و دوان، دەیان جار بە خراپترین شکڵ و شێواز پەیتا-پەیتا لە چاپیان دا و ڕژاندیانە بازاڕەوە.[2] هەرکەسم چاو پێ دەکەوت، لە سەر ئەم حاڵە بەسەر ئەو کتێبە هاتووە، گلە و گازندەی لێم دەکرد. سەیری خۆش لەوەدایە کەس لە دز ناپرسێ و کاری بەسەریەوە نییە؛ چ دەکا با بیکا. بەڵام ئەگەر ویستت بە ڕەسمی چاپی بکەی، ڕێت نییە!

بەم بۆنەوە ماوەیەک بوو بە ئارەزوو بووم بۆ ئەم کتێبە هێژایە، ناوەڕۆک و ناونامە و پاشکۆیەک دانێم و ئەگەر دەست بدا، بە شێوەیەک کە شیاوەتی لە چاپی‌دەم. لە سەر ئەو نیازە، دەستم دایە ئەم کارەوە و دەوری ساڵێکە پێوە خەریکم. چاک یان خراپ، ئەوا لە بەر دەستتانە؛ لێرەدا نایەوێ لەسەری بڕۆم. تەنیا لەمەڕ ناونامەکەوە چەند تێبینی هەیە کە شیاوی باسە:

١. وەک باوە، بۆ هەر ناوێک یەک جار ژمارەی لاپەڕەیەک هاتووە؛ ئەگەرچی ئەو ناوە چەند جاریش لەو لاپەڕەدا هاتبێتەوە.

٢. ناوەکان هەروان کە مامۆستا نووسیونی؛ جارێک «عەبدوڵلا»یە، جارێکی‌تر دەبێتە «عەولا» یان «عەبوود» یان...

٣. کەسی وامان هەن بە دوو یان چەند ناو ناسراون. بۆ وێنە مامۆستا هەژار بۆ خۆی، کە هەڵاتووە بۆ عێراق ناوی خۆی ناوە «عەزیز قادر»؛ چۆتە سووریە بوەتە «عەبدوڕەحمان حەسەن»؛ جاروبار «مەلاڕەحمان» و «مەلامحەممەد» و «حاجی»شیان پێ گوتووە. دوایش هەر لە عێراق بە ناوی «عەبدوڕەحمان محەممەد» ناسنامە و پاسی وەرگرتووە. لە گەڕانەوەشی بۆ ئێران، دیسان بوەتەوە «عەبدوڕەحمان شەرەفکەندی». هەموو ئەو ناوانە لە ژێر ناوی «هەژار»دا کۆ کراونەتەوە و ژمارەی لاپەڕەکانیان بۆ داندراوە.

---

٢. لەو کتێبدزانە دوانیانم ناسییەوە؛ بەڵام ئەم جارە ناویان نابەم. با خۆیان شەرم بکەن و چیتر بەلای ئەو کارە دزێوەدا نەچن.

٤. برێ لە ناوەکان ئاوەڵناو یان نازناویان دەگەڵە؛ وەک: سەید، حاجی، مەلا، شێخ، دوکتور، تیمسار و... کە برێ جار وا بە ناوەکەوە نووساون جیایی هەڵناگرن و ئەگەر لێت قرتاندن، کار تێکدەچێ. وەک: «سەیدرەشیدی خانەقا»، «حاجی قادری کۆیی»، «مەلاکەریم»، «شێخ عوبەیدیللای نەهری» و... منیش -وەک نویسیارێک- هەموو ئەو کەسانە ناناسم تا بزانم کام نازناو دەکرێ لەنێو کەوانی دانێم و کامەی دەبێ پاڵبەپاڵی ناوەکەوە بنووسم؛ ئەمجار بۆ ڕیز کردنیان بە تەرتیبی ئەلفوبێتکە دادەمێنم. کەوابوو هەموو نازناوە ئایینیەکانم بە بێ جیا کردنەوە داناوە و باقی، وەک: دوکتور و موهەندیس و مامۆستا و... لە نێو کەواندا هێناومن. جا بەو پێیە دەبینین «سەید تەها» لە «س»دایە و «(سەروان) خاکسار» لە «خ»دا.

٥. وەک دەزانین، لە ئێران ناوی هەموو کەسێک دوو پاژە: ناوی خۆی (بچووک) و ناوی بنەماڵەیی (خانەوادەگی)؛ وەک: عەبدوڕەحمان شەرەفکەندی. لە عیراق و باقی وڵاتە عەرەبەکان، ناوی خەڵکی دوو یان سێ پاژە: ناوی خۆی و بابی و برێ جار باپیری؛ وەک مەسعوود محەممەد یان جوبران خەلیل جوبران. بەم بۆنەوە ناوە ئێرانییەکان بە هۆی ناوی بنەماڵەییەوە ڕیز کراون؛ وەک: (دوکتور) سەججادی (سەید جەعفەر)، کە لە «س» دایە و ئەوانیتر بە پێی ناوی خودی کەسەکەوەیە؛ وەک: شوکور مستەفا، لە «ش»دا. ئەگەریش کەسێک دوو یان چەند ناوی بووبێ، ناوی ناسراوترم بەرچاو بووە و ناوی کەمتر ناسراو، لە نێو کەواندا؛ وەک: ئەحمەد تەوفیق (سەید عەبدوللا ئیسحاقی). چەند ناویش هەن کە بە هەر دوو لادا ناسراون؛ ئەوانەم لە دوو جێ هێناون.

٦. گرفتی گەورەی ناونامەی ئەم کتێبە، کێشەی هاوناوەکانە. بۆ وێنە بیست «مستەفا» ناومان هەیە. برێ ناوی باوی ئیسلامیش وەک: «محەممەد» و «ئەحمەد» و «مەحموود» و... لە چل و پەنجاش تێپەڕیان کردووە. زۆر جاریش ئەم ناوانە بە تەنیا هاتوون. دەجا وەرە و سەر دەرکە کام ناو هی کامە کەسە!

ئەگەر ڕاستت دەوێ هەوەڵ جار کە لێی برام ناونامە بۆ ئەم کتێبە خۆش‌کەم، هیچ بە بیرمدا نەدەهات کارێکی ئەوەندە دژوار و کات‌گر بێت. ئێستاش بە تەواوی لێی دلنیا نیم. بەو بۆنەوە لە هەموو خوێنەرانی هێژا داوا دەکەم ئەگەر هەڵە و ئاڵۆزییەکیان بەرچاو کەوت، ئاگادارم کەن کە بۆ چاپی داهاتوو لێی بسرینەوە.

هەر بۆ ئەم ناونامە برای خۆشەویستم کاک مستەفا شەرەفکەندی (هەژار) و بەڕێز کاک ئاری محەممەد سالح زۆریان زەحمەت کێشا و حەولیان دا یاریدەم بدەن؛ بە دل سپاسیان دەکەم.

براتان: **ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**

سنە، جۆزەردانی ١٣٦٨ (٢٠٠٧)

# پێشەکی

زۆر دەمێکە زۆر لەوانەی کە بوونە ناسیاوم، هەڵیانپێچاوم کە سەرگوروشتەی ژیانی خۆم بنووسمەوە و بزانن چم بە سەر هاتووە!

من وەک دەڵێن: «چوێلەکە خۆت چی و شۆرباوت چی؟!»، دەمزانی ژیانێکی زۆر قۆڕ و توورڕەهاتم ڕابواردووە و ڕووی مەجلیسی یارانی نییە؛ هەمیشە خۆم لێ بواردووە. بەڵام کەوتمە فکر کە بەڵکو گێڕانەوەی ئەو ڕابردووە پڕ لە هەوراز و لێژ و گەوە و کەنداڵ و قووڵکە و جاروبارەش دەشتاییە، هیچ نەبێ بۆ کوڕەکەم (خانی) -کە بە ڕواڵەت لە چوار کوڕان هەر ئەوم ماوە و ئارەزوومە تەمەنی درێژ بێ و دەشزانم ئەگەر زۆر بژی، دەکەوێتە ناو گونگەڵ و تەشقەڵەی دنیاوە- ڕەنگە بێبەهرە نەبێ. لەو گەرم و سارد و خۆشی و ناخۆشیانەی بە سەر من هاتووە، دەرسێک وەرگرێ و تەجرەبەی بۆ پەیدا بێ؛ یان هیچ نەبێ لە تەنگانەدا ناهومێد نەبێ و لای وا نەبێ ڕێگەی ڕزگار بوون بە یەکجاری پێشی گیراوە. لە خۆشی و ئاسوودەیی ژیانیشیدا زۆر خاترجەم و مەغلوور نەبێ؛ وانەزانێ خۆشی هەمیشە یاریەتی و بە جێی ناهێڵێ. هەر وەک ناخۆشی و خەم لە گۆڕان نزیکە، خۆشی و شادیش هەمیشە بەردەوام نییە. خۆی ئامادە کا کە ئەگەر لێی قەوما، چۆن مل بداتە بەر کار و کۆشش و حەولی ڕزگاری لە خەم و دەرد بدا. ئەگەر لە خۆشیانیشدا بوو، لە بیری نەچێ کە ڕەنگە تووشی لێقەومان ببێ و خۆی بۆ ئەو ڕۆژە نەهاتووە ئامادە بکا. جا من ڕووی قسەم دەوییە و سەرگوروشتەی خۆمی بۆ دەگێڕمەوە؛ هەر چەند زۆریش بێتام و پەرژ و بلاویش بێ، لەوانەیە لە هێندێک شوێندا تەجرەبەی لێ هەڵکرێنێ. خۆ ئەگەر دۆست و ناسیاویش وەیخوێنن، با هیچ نەبێ بەو قسە قۆڕانە پێبکەنن.

گێڕانەوەی بەسەرهاتم لە ژیاندا، قسەی بەرئاگردانە و چیرۆکێکە بۆ لاوێکی دەگێڕمەوە. ئیتر نامەوێ بڵێن ئەدەبی نییە و عیلمی نییە. پێی ناوێ فلان بڵێ بۆ لەو جێگەی وای نەگوتووە؟ بۆ فلان وشەی عارەبی یان فارسی دەکار هێناوە؟

ئەگەر ڕاستت دەوێ بە زمانێک نووسراوە کە لە مەجلیسان قسەی پێدەکەم و هیچ خۆم پێوە ماندوو نەکردووە کە ئاسەوارێکی ئەدەبی بێت. ئەو کاری بۆ شەرەفنامەم کردووە و خۆم دەگەڵ ماندوو کردووە و بیر و مێشکم هەڵکوشیون، لێرەدا باسیان نییە.

ئێستا کە ئەم خەتانە دەنووسم، تەمەنم شێست و سێ سالی شەمسییە و نزیک بوومەوە لە شێست و چوار؛ کە بە سالی مانگی لە شێست و پێنج سالی دام و بەرەو شێست و شەش پەل بووم. لەو بەرزایی عومرەوە دەڕوانمە شێست و ئەوەندە پلەی خوارەوە، لە پیریان فکرم ئالۆزاوە؛ زۆر کەمم لە بیر ماوە. هەر وەک چاوم بێحوکم بووە و بە عەینەک نەبێ نابینم، چاوی بیر و مێشکیشم کز بوون و عەینەکیان دەست ناکەوێ. لێم ڕوونە لە هەزار شت کە بە سەرم هاتووە، سەتم لە بیر نەماوە. وا مستێک لە نموونەی خەڵوارێک، یان وەک کورد دەڵێن «هەشتێک لە مشتێک» دەگێڕمەوە:

زەمانی منداڵیم دام و دەستوور لە گوندی موکوریان وا بوو: ڕۆژی جەژن هەموو پیاوی

کەیخودای ماڵ دەبوایە دوای خوتبەی جێژن و نوێژی جێژن، تێر دەم و فلچی یەکتر ماچ کەن و سلاوەتی بە شیعری کوردی لێدەن. ئەمجار بەڕیز دانیشن و لە ماڵە خۆیانەوە نانیان بۆ بێنن و دانیشن پێکەوە نانی جێژنە بخۆن. دەوڵەمەند و حاڵخۆشەکان پلاوی برنج و قەیسی، یان گۆشتاویان بۆ دەهات. هی وا هەبوو فەقیر بوو، پلاوی بروێش، یان زۆر شیوی فەقیرانەیان هەبوو. ئەو هەمووجۆرە خواردنانە لە تەنیشت یەک دادەنران و هەموو پێکەوە لە نانی هەموانیان دەخوارد.

مجێوری مزگەوت مەنجەڵێکی خۆی دێنا، هەرچی بەرماوی ئەو خەڵکە بوو، بە سەر یەکی دادەکرد و ئەمەش جێژنانەی ئەو بوو؛ کە ناوی نرابوو «**چێشتی مجێور**». تێکەڵاوێکی سەیر بوو؛ لە ناو مەنجەڵدا دەنکە برنج پاڵی بە دەنکە بروێشەوە دەدا. دەنکە کشمیشی پلاو، پەرژ و بلاو بووە و هەر یەکەی لە سووچێکەوە جێگەی گرتووە. پارچە ئێسکێک -کە ڕۆژی خۆی لە پەنا قوچکەی برینج داندراوە- ئێستا دەناو بروێش و کەشکەکی گەنمدا خنکاوە! من دیتم ئەو چیرۆکەی ژیانەم -کە پاش شێست و چەند ساڵ بە سەر دەکەمەوە- ڕاست بۆتە چێشتی مجێور. نە دەمی ڕووداوەکانم لە بیر ماوە، نە دەتوانم یەک بە دوای یەک بە زنجیرە بیانگێڕمەوە. لێکدراوە و بۆ خۆشم نازانم کامیان لە پێش کامیاندا بوون؛ بەلام دەزانم ئەوی نووسیومە، یان دیومە، یا لە خۆم قەوماوە، یان لە دەمی برادەرانی هاوسەفەرم قۆزتۆتەوە. تەمام وا بوو ناوی بنێم: «قانگە لاشک»، «بابردەڵە»، «بۆت بریم» کەچی بە بیرمدا هات «چێشتی مجێور» پڕ بە پێستیەتی.

دەمەوێ جارێ بە سەرچڵی باسێکی گشتی لە خۆم بکەم. زۆرم باسی شاعیرانی کۆن و نوێ خوێندووە و بیستووە. لام وایە لەم ڕۆژهەلاتەی خۆماندا، یانی لە ناو فارس و عەرەب و کورددا، ڕەنگە من -وەک شاعیر- لە هەموان حالم خۆشتر بووبێ. دەخوێنمەوە کە فلانە شاعیر تاریفی فلان خەلیفەی بە قەسیدەیەک کرد، دە هەزار، سەد هەزار زێڕیان دایە. بەلام حالی شاعیر چۆن بووە؟ تۆ بێنە بەر چاوت: سەد شاعیر هەر یەک چەند شەو خۆی جیرەبابە داوە، قەسیدەی پڕ لە درۆی گەورەی بە قەد و بالای نافەسالی خەلیفە یان پادشا هەلگوتووە؛ پرسیویانە:

– ئەمڕۆ خەلیفە یان شا ڕووی خۆشە؟ تووڕە نییە؟ ئیجازە هەیە بچینە خزمەتی؟

– بەلێ فەرمون... دەی شیعر بخوێننەوە!

شا و خەلیفە -لە کەر کەرتر- لەو ناوەدا شیعری یەکێکیانی پەسند کردووە؛ خەلات بەو دراوە و ئەوانیتر دەم لەپووش دەرکراون. «نیزامی» کە خودای شیعرە، بە حاکمی وەخت دەڵێ: من سەگێکی دەرکی تۆم؛ چاوم لە ئێسکێکە بۆم باوێژی. «فیردەوسی» خاوەنی شانامە، وەها خۆی لە بەرانبەر «مەحموود غەزنەوی»دا بە سوالکەر نیشان دەدا، پیاو بەزەی پێدا دێت. زۆربەیان، لەو شاعیرە گەورانە بە سوالکەری ژیاون. ئەوانەی خۆم دیتمن و زۆر لە خۆم شاعیرتر بوون، وەک مەلا مارفی کۆکەیی، قەسیدەیەکی سەد بەیتی بۆ تاجرێک دەنووسی، دەیگەیاندە تەشقی عاسمان؛ نیو کیلۆ گۆشتی دوو تمەن بایی بۆ دەنارد.

من کە تازە دەستم بە شیعر گوتن کردبوو، لام وا بوو منیش دەبێ تاریفی پیاوێکی گەورە بکەم و جایزە وەرگرم. چەند شیعرێکم لە مەدحی ئەحمەداغای حاجی بایزاغادا گوت. جایزەکەم ئەوە بوو دەیگوت: «ئەو کەرە باش باشی گوتوون!». ئەم قسە بۆ من بوو بە دەرسێکی گەورە. ئیتر وازم لەوە هێنا بۆ جایزە شیعر بلێم؛ با هەر بۆ عیشقی دڵی خۆم بێ. عاشقی ئازادی

کوردستان بووم؛ کەیفم پێ دەهات. جا ئەگەر مەدحی قازی محەممەد یان ستالین و ڕووسیام دەکرد، بۆیە بوو کە بە ڕەمزی ئازادی کوردستانم دەزانین. چاوم هەرگیز لەوە نەبوو پووڵێکم بخەنە گیرفانەوە. بۆ خۆم کاسبیم دەکرد و شیعرەکانم دیارییەک بوو بۆ گەلی کورد.

لە بیرمە جارێک شیعرێکم لە کۆبوونەوەیەکدا خوێندەوە؛ قازی محەممەد ئافەریمی کردم و گوتی سەد تمەنت بەخشش بێ. هەر لە مەجلیسەکە گوتم: ئەو سەد تمەنە بدرێ بە دەفتەر و قەڵەم بۆ منداڵە فەقیرەکانی مەدرەسە. تەنانەت کە «ئاڵەکۆک» لە «ڕەوابیتی فەرهەنگی ڕووس و ئێران» لە تەورێز چاپ کرا، گوتیان چوار هەزار تمەنت حەقی تەئلیف هەیە. هەر چەند ئەوە قانوونی و هیچ سواڵیش نەبوو، نەمەویست. لە ئاوارەییشمدا لە عێراق، هەر خۆم بە ئارەقی ناوچاوان و ڕەنجی شانی خۆم بەڕێ دەچووم و شیعرم پێشکەش و دیاری بۆ ئازادی کوردستان بوو؛ کە ئەم حاڵە حورمەتی زۆری لە بەرچاوی خەڵک بۆ پەیدا کردم و لە نووسینی شیعردا زۆر ئازاد بووم.

هەرگیز بە شیعر سواڵم نەدەکرد؛ بەڵام ئەگەر داوای یارمەتی و قەرزم لە هەر ناسیاوێک بکردایە، زۆر بە ڕووی خۆشەوە دەیکرد.

زۆر کەس هەبوو لە باری سیاسی ناخۆشیان ویستووم، جوێنیان پێداوم. بەڵام لە ڕوویان نەهاتووە بڵێن شاعیرێکی سواڵکەرە و مل لە بەر پیاوی خوێڕی نەوی دەکا. توانیومە زۆر بە سەربەرزی بژیم. زۆر جار ئەگەر دیتوومە کەسێک دڵی لێم ڕەنجاوە، گوتوومە چی داومێ با لێم وەستێنێ.

دیاریشە لە پاش ئەوە توانیومە بە یارمەتی بارزانی کتێبی شیعری خۆم چاپ کەم، پووڵی کتێبانم زۆر دەسکەوتووە کە مەمنوونی هیچ کڕیارێک نەبووم. من بارزانیم بە گەورەی خۆم قبوڵ کردبوو؛ شانازیم بەوە دەکرد کە نۆکەری ئەو بم. پێشم شەرم نەبوو ئەو یاریدەم بدا، چونکە لام وا بوو مەرد و ڕەندێکە نموونەی کەم لە دنیادا هاتوون. جارێک «حافز مستەفا قازی» - کە لە بەردەستی «ڕەشید عارف سەقا»ی کوردی ملیۆنێردا کاری دەکرد- گوتی: کاک ڕەشید خەییامەکەی تۆی بە خەت دیوە. دەڵێ من لە سەر حیسابی خۆم بۆی چاپ دەکەم. فرسەتە با پێێ چاپ بکەین. گوتم: حازر نیم ناوی ڕەشید عارف لە سەر کتێبی من بێ و بڵێ یاریدەی هەژاری داوە و ئەو فەخرەی بدەمێ!

لە کاسبی کردن و فەقیریشدا زۆرم کەساسی و هەناسەساردی دیتووە و زۆر جاریش سەرکەوتوومەوە. چەند جار نانی شەوم شک نەبردووە؛ بەڵام ناهومێد نەبووم؛ لە کار ماندوو نەبووم. توانیومە جێگەی خۆم بکەمەوە. زۆر جاریش بوومە خاوەن پارە و دیسان هاتوومەوە سەر سیفر و دیسان تێهەڵچوومەوە.

ئەوی دەیزانم و بە ئەدیب و خوێندەوارم دەزانن، لە سایەی ماندووبوون و شەوبێداری خۆمەوە دەستم کەوتووە. سەر لە هەوەڵەوە زوو لە خوێندنەوە ماندوو دەبووم؛ بەڵام پیاو کە لە سەر شتێک سوور بێ و دەست هەڵنەگرێ، خووی پێ دەگرێ و لێی دەبێتە سەیران و سەیاحەت. وەک چۆن نازانی لە منداڵیەوە چۆن گەورە دەبی، لە خوێندنەوەش زۆر ئاگا ناکەی؛ کەچی دەبینی زۆرت مەعلوومات وە سەر یەک ناوە و تۆ بە خۆت نەزانیوە. زۆر جار کتێبم خوێندۆتەوە و تەواو لە بیرم چۆتەوە. تیا بووە تەنانەت ناوی دانەرەکەیشم لە بیر نەماوە؛ کەچی هەر وەخت قسە لە شتێک کراوە، من باسی ئەو شوێنەم وەبیر هاتۆتەوە. وا دیارە مێشک عەنبارێکی زۆر

بەرفرەوان و ئەمینە؛ لە وەختی پێویستدا چت دیوە یان خوێندووتەوە، نیشانت دەداتەوە.

دۆستی ڕاست و بێ‌منەت کتێبە و بەس؛ تاریخت بۆ دەڵێ؛ چیرۆکی کۆن و تازەت بۆ دەگێڕێتەوە؛ لێی پرسە جوابت دەداتەوە و منەتت لە سەر ناکا.

لە تەجرەبەی ئەو ژیانە تێکەڵ- پێکەڵەمدا ئەوەندەم بۆ ڕوون بۆتەوە کە لە هەزار دۆستی بە دەم دۆست، یەکێکیان لە ڕۆژی تەنگانەدا دەهاوارت نایەن. نابێ چاوت لەوە بێ کە ئەگەر لێت قەوما، فریات کەون. ناشبێ دۆستایەتی ئەو تەرزە کەسانە نەکەی؛ دەنا بە تەنیا دەمێنیەوە و پیاو لە دنیادا بە تەنیا ناژی. لەوانەشە لە ناو زۆراندا، بەختت بیهێنێ و ئەگەر لە هەموو تەمەنتدا دوو یان سێ دۆستی زۆر باشت دەس کەوێ -کە لە خۆشی و ناخۆشیدا هەر یاریکارت بێ- خۆت بە بەختەوەر بزانە! ڕۆژانێ کە لە بەغدا بووم و لەوپەڕی هەژاریدا ڕامدەبوارد، کەسانێک جار و بارە دەیانەویست، یان بە دەم دەیانگوت دەمانەوێ پووڵت بدەینێ، دەمگوت سواڵ ناکەم؛ کارم بۆ بدۆزنەوە. لەو «نامەوێ»یەی من ئیستفادەیان دەکرد، لای ناسیاوێکی من دەیانگوت: پیاوێکی کەللەشەقە، پووڵی دەدەینێ نایەوێ!

کاتێ کە دەگەڵ بارزانی گەینەوە یەک و نان و ئیحترامم پەیدا کردبوو، ئەو کەسانەی خۆیان هەڵکێشابوو کە دەیانەوێ چاکەم دەگەڵ بکەن و من قبووڵ ناکەم، کەوتمە تەجرەبەکردنیان. دەمگوت فلان کەس! دەتوانی بە چەند دینارێک دەستم بگری؟ یان فلانە شتم بۆ بکڕی؟ ملیان لە سوێندان دەنا کە دەستیان تەنگە!

جارێک لە «تۆپزاوا»ی کۆیە، بارزانی گوتی: عومەر دەبابە دەڵێ هەزار جاران هیچی نەدەویست، ئێستا داوای قەڵەم و کراسم لێ دەکا؛ ئەوە چییە؟ گوتم: کاکە! لای هەموو کەس دەیگوت ئەگەر هەژار قبووڵ بکا دەیکەم بە شەریکە مالی خۆم؛ چونکە دەیزانی هیچم ناوێ. ئێستا کە زۆر سازم، ئەوانە تەجرەبە دەکەمەوە. نە کراسم لازمە نە قەڵەم؛ پێم خۆشە وە درۆ کەوێتەوە.

زۆر کەس خۆی کردۆتە ڕەفیقم هەر بۆ ئەوە لە چێشتخانە، من پووڵی بۆ بدەم؛ یان لە سەفەر و تاکسیدا من زووتر دەس بۆ گیرفانم بەرم. جاری وا هەبووە بۆ تاقی‌کردنەوە گوتوومە: دەی با مخارجی ئەمڕۆ لە سەر تۆ بێ! خۆی دزیوەتەوە و تازە نەمدیوەتەوە. خولاسە زۆر کەس بە کەریان زانیوم؛ ویستوویانە بەهرە لە من بەرن و بۆ خۆیان خۆش بژین و گاڵتە بە سادەیی و خۆش‌باوەڕی من بکەن. لە ڕاستیشدا من لە درێژایی عومردا زۆر دڵ‌ساف بووم؛ باوەڕم بە هەموو کەس کردووە. زۆرم زەرەر لەو خۆش‌باوەڕییەدا دیوە؛ بەلام لە ئەنجامدا هەر ڕاستی و خۆش‌باوەڕییەکەم فریام کەوتووە و توانیومە وا بم، لە ناو زۆربەی کورد و عەرەبی ناسیاومدا ڕێزم لێ بگیرێ.

قسێکی جوان هەیە نازانم کێ گوتوویە، دەڵێ: «پیاو دوو عومری لازم بوو؛ لە یەکیاندا تەجرەبە خڕ کاتەوە، لە عومرەکەی‌تردا تەجرەبەکانی بە کار بێنێ»؛ کە ئەو عومرە دووبارەیەش نییە. زۆر تەجرەبەی تاڵم لە ژیاندا لە چنگ ئەوانەی بە ڕواڵەت خۆیان کردۆتە دۆستم دیوە. زۆر گورگم بە مەڕی پێغەمبەر زانیوە و دەستیان بڕیوم و بە عەقڵەم پێکەنیون؛ کە نەمتوانیوە و نەمزانیوە خۆمیان لە چنگ ڕزگار کەم. هەرگیز نەمویستووە منیش وەک ئەو نالەبارانە فێڵبازی بکەم و دەستی خزم و دۆست ببڕم. چونکە ڕاست بووم، خوا هەر ڕاستی هێناوەتە ڕێم. حەزم دەکرد و حەز دەکەم زۆر لەوە زیرەکتر بام و نەمهێشتبا پیاوی خوار و خێچ بە زمانی خۆش

فریوم دەن و بە قازانجی خۆیان چەرخم دەن؛ بەڵام لە پاش هەزار تەجرەبەی تاڵ، چۆن بە ژیاندا بگەڕێمەوە؟!

بە کوردی دەڵێن: «نە هێندە تاڵ بە تفت کەن! نە هێندە شیرین بە قووتت دەن!» سەعدیش دەڵێ: «شوانێک نسحەتی کوڕەکەی ئەکرد: پیاوی چاک بە! بەڵام هێندە چاک مەبە گورگ دەرفەتت لێ بێنێ!». بە داخەوە زۆر جار قووت درام و زۆر گورگ تێم ڕۆهاتن. حەز دەکەم تۆ بە قەدەر من دڵساویلکە و زووباوەڕ بە هەموو کەس نەبی. ئەوانەی دەبنە دۆستت تەجرەبەیان بکە! وەک ئەوان لە تۆ داوای ماندوو بوون و شت بە قازانجی خۆیان دەکەن، تۆش بزانە ئایا ئەوانیش دڵیان دەگەڵت پاکە؟ یان هەر دەیانەوێ لە بەستەزمانی و دڵسافی تۆ بەهرە وەرگرن؟

لە ماڵی دنیا پەیدا کردن ماندوو مەبە! بەڵام نە لە ڕێگەی ئابڕوو فرۆشتنەوە. زۆر جێگەی وا هەیە نانی لێ پەیدا دەبێ. چونکە ئەوە بزانە کە ڕووت و ڕەجاڵ و بێماڵ بی، کەست ڕەفیق و دۆست نییە. تا لە ڕێی پەیدا کردنی ئەسپابی ژیاندا ماندوو بی کەمە؛ بەڵام دەبێ ئابڕوو و شەرەفی خۆت لە بیر بێ. هەرگا کار گەیشتە ئابڕووچوون و نامووسی میللی فرۆشتن، دەست هەڵگرە و کارێکیتر بکە با کەمتریشت دەس کەوێ. لە نازداری و خلیسک و خاوی دوورەپەرێز بە! بەشی تەنبەڵ و تەنپەروەر، هەر نەبوونی و ئابڕووچوونە و ناچار دەبێ دەم لە بەر نامەردان پان کاتەوە. ئەوەندەش بزانە مانای ئەو قسە زۆر هاسانە: «هەر کەس کارت کەوتە لای و بۆ یاریدەدان لە بەری پاڕایەوە، نامەردە!». کە وا بێ ئەو دوعایەی کە دەڵێن: «خودایە موحتاجی دەستی نامەردم نەکەی»، یانی موحتاجی دەستی کەسم نەکەی.

کە تازە چووبوومە عیراق و لە کار دەگەڕام، دەمدی ئەوانەی لە دوورەوە عاشقی ناوبانگ و ناوم بوون، ئەگەر دەمگوت کارم بدەنێ یان بۆم پەیدا کەن، بەوپەڕی نامەردی خۆیان لێ دەبواردم. کەچی لە مەجلیسی خۆیاندا تاریفی شیعر و هونەری منیان دەکرد!

قەت خۆت بە ناوی باب و باپیرتەوە بە خەڵک مەناسێنە. حەول بدە خەڵک بڵێن فلان کەس باوکی ئەو کوڕە باشە بوو. کوڕی خۆت بە و ئیعتیماد و باوەڕیت لە سەر خۆت بێ. ئەگەر کەسێکیش بە ڕاستی و دڵسۆزی یاریدەی دای، زۆر بەختەوەری. جارێک بە جحێڵی، پیرەعەجەمێک قسێکی گوت: «هەر کەسی دیتت وا بزانە دوژمنتە و دەیەوێ زیانت پێ بگەیەنێ. ئەگەر خوای کرد وا نەبوو، چاکەی دەگەڵ کردی، یان هیچ زیانی لێ نەدای، ئەوە خۆت و بەختت چاکت بۆ هاتووە». تازە بە پیری بیر لەو پەندە بەقیمەتە دەکەمەوە و لە دەستم دەرچووە. هەر کەس دەبێتە ڕەفیقت، بە دڵسادەیی خۆتی تەسلیم مەکە! چاوەنۆڕ بەو لە سەر هەست بە! ئەگەر هەر بە ڕاستی خۆشی دەوێی، خۆشت بوێ، ئەگەر دیتت نیازی خراپە و ڕاست نییە، بە زمانی خۆش دەگەڵی ڕابوێرە! بەڵام دەستت بە گیرفان و دەمی خۆتەوە بێ! دۆستێکی ڕواڵەتیش -با بشزانی بە دڵ دەگەڵت نییە- بە توورە بوون لە خۆتی مەڕەنجێنە! لەوانەیە زیانت لێ بدا؛ بەڵام کەم-کەم خۆی لێ بدزەوە و کارێک مەکە کە ببێتە دوژمنت. هەزار دۆست کەمە و دوژمنێک زۆرە.

تا تۆ لەشی خۆت زۆر خۆش نەوێ و کەیفت لە تەنبەڵی نەبێ، هەموو کەس خۆشی دەوێی و بە سەربڵندی دەژی. ڕۆژگار هەر چەندی ماندوو بی، شەو دەحەسێیەوە. کارت لە ڕێی ژیاندا پێ عەیب نەبێ. ئەگەر ناتوانی ببیە وەزیر، دەتوانی ببیە حەممال و کۆڵکێش. شەرت ئەوەیە بێکار

نەبی. ئەگەر لە سەر کارێکی کە مایەی ژیانتی پێ پەیدا دەکەی، تا کارێکی لەوە باشتر و بەقازانجتر پەیدا نەکەی، کاری خۆت بەجێ مەهێڵە! مەڵێ دەچم کاری چاکتر پەیدا دەکەم، کارەکەی خۆشت لە دەست بچێ. بێکاری -با دوو ڕۆژیش بێ- پیاوی تەنبەڵ دەکا؛ پشتت لە کار سارد دەکاتەوە. ناشزانی چۆن وەخت ڕابوێری.

نە ڕەزیل و چرووک بە، نە دەست بڵاو. بابم دەیگوت: «دەوڵەمەندی خەسیس و فەقیری سەخی دەبێ هەردووکیان بۆ بابیان عاقڵ کرێن». ئەگەر هەتە، ببەخشە! بەڵام بە ئەندازە. پاشەڕۆژت لە بەر چاو بێ؛ دنیا بێئیحتوبارە. ئەگەر بتوانی شتێکت پەزمەندە هەبێ بۆ لێقەومان و نەدار بوون. ئەگەر نیتە و فەقیری، چاو لەوانە مەکە زۆریان هەیە و زۆر خەرج دەکەن.

ئەو وردە نسحەتانەی من هەموو زیادین. کتێبی باش زۆر بخوێنەوە. بە تایبەتی لە بیرت نەچێ ئەدەبیات و نووسراوی ڕابردووان، لە هەموو بابەتێکەوە پڕن لە پەندی زۆر بەقیمەت. دەتوانی بەرنامەی ژیانی ئابڕوومەندانە لەوانە فێر بی و دەکاری بێنی. بە منداڵی گولستانی سەعدیم دەخوێند. بابم دەیگوت: «دەڵێن گولستان بە حەوت ساڵەیی دەخوێنن و بە حەفتا ساڵەیی تێی دەگەن». گوتم: بابە! ئەدی ئەگەر نەگەیشتمە حەفتا ساڵ عومر چ بکەم؟! بە ڕاستی دەزانم سەعدی هیچی نەهێشتۆتەوە کە نەیڵێت.

بەخشین و سەخاوەت دوو جۆرە: ئەگەر دەستی فەقیر و بێدەستێک بگری، هەتیوێک پۆشتە کەیەوە، بێوەژنێکی هەتیوبار یارمەتی بدەی، بەخشینی پیاوانەیە؛ بەڵام ئەگەر بادی هەوا، مەسەلەن لە داوەت شاباشی زیاد لە خەڵک بدەی، یان لە ڕستوورانێک، چاخانەیەک زیاد لەوەی کابرای خاوەن ڕستووران دەیەوێ بدەی، ئەوە ناوی کەریەتییە نە پیاوەتی!

جارێک دەگەڵ سەید برایمی ئازادی لە تەورێز سەرمان تاشی. لە جیاتی دوو تمەن -کە حەقی سەرتاشین بوو- پێنج تمەنی دا.

- ئەوە بۆ زیادت دا؟

- ئاخر عەیبە!

- یانی سبەی عەکست لە ڕۆژنامەدا چاپ دەکەن کە ئەو کوردەی نازانین ناوی چ بوو زیادی داینێ؟!

لە تەرەغە خەنجەرێکم هەبوو، زۆر بە خەیاڵی خۆم بە باشم دەزانی. گوتم وا باشە بیکەمە دیاری بۆ کاکە ڕەحمانی حاجی بایزاغا. بە دڵ و داو خەنجەرم بۆ برد. لێی وەرنەگرتم بزانێ چۆنە، بە نۆکەرێکی خۆی گوت: لێی وەرگرە و دەبەر خۆتی چەقێنە! زۆرم دڵ بە خۆم سووتا. ئیتر بڕیارم دا کە تازە غەڵەتی وا نەکەم. فەقیر ناتوانێ شان لە شانی دەوڵەمەند بدا. ئەوی بە لای منەوە زۆر شتێکی بەنرخ بوو، لای ئەو هەر لایقی نۆکەرانی بوو!

بۆ نان خواردن دەعوەتی کەسێک بکە لە نانەکەت مەمنوون بێ! دەعوەتی کەسانێک مەکە کە نۆکەریان لە تۆ تێرترە و هەمیشە سفرەیان لە سفرەی ڕۆژی دەعوەتەکەت ڕەنگینترە. یانی «ئەگەر مریشکی، بۆ هێلکە کردن لاسای قاز مەکەوە!».

دنیا پڕیەتی لە پیاوی فێڵباز کە لە سەر فریودانی دڵسادە و بەستەزمانان دەژین. بنیادەمن لە شکڵی تۆ؛ بگرە تۆ جوانتر و ڕێکوپێکتریشی لەوان؛ بەڵام دەبینی بە ڕدێن، بە کەوای شۆڕ، بە مێزەرەی زل و تەزبیح و مت و مووروو خۆیان لە خەڵک گۆڕیوە. دەڵێ وەرە بتبەمە بەهەشت! یان ئەفەندی عەینەک لە چاوە و خۆی لە سەر خەڵک بە هەیبەت کردووە؛ کۆمەڵێک

دڵ ساده دوای خۆی دەدا: «وەرن حیزبم دروست کردووه، واتان بۆ دەکەم، وا بکرێ...»، لەوانەدا زۆر ئاگاداری خۆت بە! دەتوانی بێنیه بەر چاوت: ئەو کابرایەی دەڵێ شێخم، ڕیشی بتاشرێ، شۆرتێکی دە بەر کرێ، پێخواس بێ، یان وەک چیرۆکەکەی «چیخۆف» لە حەمام ڕووت بێتەوە، چۆن مەیموونێکی لێ دەردەچێ؟! دەکرێ بڵێی: بۆ تۆ شتێک نادەی بە من تا من تۆ ببەمە بەهەشت؟ خۆ هی هەردووکمان حەواڵە بە دوای مردنە! یان: کابرای سیاسی خاوەن حیزب! ئەگەر تۆ لە پێشمەوە بی لە سەنگەردا، قبوولمە. بەڵام تۆ بۆ خۆت لەوپەڕی خۆشیدا بژی و من بە کوشتن و گرتن بدەی، خوا هەڵناگرێ...

جارێک لە شیعرێکمدا -کە چاپیش نەکراوە- گوتوومە:

هەرگیز مەبە عەنتەری پیاوێ      تۆ هەڵپەڕی، بەو بدەن پلاوێ

جحێل -هەموو جحێلێک- هەر چاوی لەوەیە ژنێکی جوانی دەست کەوێ. حەقیشی هەیە؛ چونکە ئارەزووی جینسی غالبە و تا هاوسەرێکی جوانتری دەس کەوێ، کەیفی خۆشترە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانی کە جوانییەکەی ژن هەر هەتا دوو مانگ و ئەوپەڕی شەش مانگ و یەک ساڵ زۆر لات بەنرخ دەبێ؛ لەوە بەولاوە تۆ خزم و کەسێکی دڵسۆزت دەوێ. کەسێکت بۆ ژن لازمە کە لە خۆشی و ناخۆشیدا هەر پێت ڕازی بێ و شانازی بە ڕەفیقایەتی و هاوبەشی لە ژیانتدا بکا. خۆ نەخوازا کە منداڵێکیش پەیدا بوو، ئیتر خۆشەویستی دایک دەکەوێتە سەر منداڵ. نابێ باب لای وا بێ دەبێ وەک جاران، ژنی هەموو ڕووح و گیانی بە تەنها لە سەر ئەو بێ؛ هەرچەند باب و دایک لە خۆشەویستی منداڵدا دووبارە گەیونەوە یەک. جا پیاو ئەگەر بە تەمایە ژن بێنێ، دەبێ حەولی ئەوە بدا ژنێک بکاتە شەریکی ژیان کە ژنەکە خۆی بە زیاتر لە مێردەکە نەزانێ. منەتی بە سەردا نەکا کە تەنازولی کردووە و بۆتە ژنی! ژنی وا ژیان لە مێرد دەکاتە جەهەننەم. ژنێک مەخوازە کە بە تەماحی داراییەکەت مێردت پێ بکا. چونکە ماڵی دنیا دێ و دەچێ؛ ئەگەر فەقیر بووی دەگەڵت هەڵناکا. ژنی چاک ڕەحمەتی خودایە و فەقیر بی و دەوڵەمەند بی، لە بەهەشتای و بە دڵخۆشی دەژی. ژنی خراپیش و بەبۆڵە و پرتە و لووت بەرز - با حۆری بەهەشتیش بێ- ژیانت لێ دەکاتە جەهەندەم و خەلاس بوونت زۆر چەتوونە.

دڵم چووبووە سەر کچێکی شێخ محەممەدی خانەقا. بە هۆی کچی قازی زڕدایکمەوە بە بابم ڕاگەیاند. گوتی: «کوڕی خۆم! لە باتی سێ ژن، ژنێک بێنی باشترە!» پێم سەیر بوو؛ بۆی ڕوون کردمەوە: کچی شێخ خۆی لە تۆ پایەبەرزتر دەزانێ. دەبێ کارەکەرێکی بۆ بگری خزمەتی بکا. دەبێ کارەکەرێکیش بۆ خۆت پەیدا کەی خزمەتت بکا!

ئەگەر ڕێک بکەوێ کیژێکی لادێیی بێنی و خۆشی بوێ زۆر چاکترە لە کیژێکی شارستانی نازدار و کارمەندی شارستانی. کیژی لادێ کە دێتە شار، حەمام چوون و جلی شارستانی بە لاوە خۆشییەکە کە بە هۆی تووە دەستی کەوتووە؛ بەڵام کیژە شارییەکە کە عادەتی بە خووی شارەوە گرتووە، بەهانەی لێ نابڕێ. من خۆم ژیانی ئەو مێرد و ژنانەم بە لاوە ژانە و ژیان نییە، کە هەردووک لە بەیانییەوە تا ئێوارێ هەر یەکە لە ئیدارەیەکی دوور لە یەکتر دەژین و ئێوارە بە ماندوویی دێنەوە و منداڵیان بە خەڵکی بێگانە سپاردووە. ئەگەر مومکین بێ ژن ئاگای لە ماڵ بێ و پیاو ماندوو بێ، بە لامەوە خۆشترە. پیاو کە گرانایی ژیانی لە سەرە و بە ڕۆژگاردا لە دەرەوە دەژی و هەزاران قسەی ناخۆش لە دەسەڵاتداران و بێئاکاران دەبیسێ، بە دڵ تووڕەیە؛ لە ماڵە خۆی -وەک دەربڕینی هەست- وا دەبێ بە سەر ژنیدا دەقیڕێنێ. ژنی نەجیب ئەوەیە

دڵخۆشی مێردی بداتەوە و بزانێ کەچۆن دەرد و ناڕەحەتی ڕۆژگاری لەبیر دەباتەوە؛ نەک ئەویش چەنە بە چەنەی دەگەڵ بکا و ماڵی لێ بکا بە جەهەننەم. ژنیش لە ماڵداریدا، لە بەخێوکردنی منداڵدا، لە لای دەروجیرانی خراپەوە دڵی پڕ دەبێ، چاری ناچار ئەویش وا دەبێ هەڵدەچێ و بۆڵە و دەردی دڵ دەکا. دەبێ مێردی عاقڵ ئەو کارەش هەڵسەنگێنێ، بە خوێنساردی و دڵخۆشیدانەوە خەمی ژنی شەریکی عومری بڕەوێنێ و بە سەریا نەگوڕێنێ و نەیکاتە شەڕ و دمەدم نان؛ کە هەم ژیان لە هەر دووکیان تاڵ دەبێ و لەوانەشە لێک جوێ ببنەوە. کە وا بوو دەبێ هەردووک ئەوەندە عاقڵ بن، ئەگەر یەکیان خەریکە تووڕە دەبێ، ئەوی‌تریان نەرمی کاتەوە. تووڕەییش هەر سەرێکە و زوو دەڕوا و ئەوی لای وایە بۆتە مایەی ناڕەحەتی هەواڵەکەی پەشیمان دەبێتەوە. ئاوا دەتوانن تا مردن یەکتریان خۆش بوێ و دنیا بکەنە بەهەشتی خۆیان.

کورد دەڵێن: «ژن و ماڵ»، ژن بۆیە پێش دەخەن کە تا ژن نەبێ ماڵیش نابێ. کورد دەڵێن: «پیاو کرێکاری قوڕە و ژن بەننایە»، پیاو هەرچەند خۆی ماندوو کا و زۆر پەیدا کا، ئەگەر ژنەکەی بە سەلیقە و دڵسۆز نەبێ بۆ ماڵی مێردەکەی، خانوو سەر ناگرێ. ژنێ کە دڵی بە ماڵی خۆی خۆش بێ و مێردی خۆی خۆش بوێ، هەرچی مێردی بۆی دێنێ بە دڵ و داو ماڵی پێ ڕێک دەخا و حەز دەکا لە ماڵی خەڵک خۆشتر بێ. ترسەنۆکی و خەسیسی بۆ پیاوان ڕەوشتێکی زۆر عەیبە؛ بەڵام بۆ ژن مەدح و کارێکی پەسندە. «عەلی بن حوسێن توغراسی» لە «لامیەتولعەجەم»دا دەڵێ: «قسەی زۆر چاک دەربارەی ئەو کیژانەوە دەکەن کە ترسەنۆک و خەسیسن»!

پیاو دەبێ ببەخشێ؛ بەڵام ژن هەر دەبێ بە دڵ و داو ماڵداری بکا.

ترس و ئازاییش دوو جۆرن: تۆ کە هەر شەڕ بکەی و گێچەڵ دەخەڵک هاڵێنی، ئەوە ئازایەتی نییە، بێ ئەخلاقییە. بەڵام کەسێک بە ئاشکرا زوڵمت لێ دەکا؛ ئەویش یەکێکە وەک تۆ. ئەگەر لە بەری دانەوێنی و دیفاع لە خۆت نەکەی، ترسەنۆکی و بە خوێڕیت دەزانن. چیرۆکێک لە «الاغانی»دا هەیە: کابرایەکیان دەبرد لە تۆڵەی پیاوێکا کە کوشتبووی بیکوژنەوە، دۆستێکی لێی پرسی: «بۆ ئەو کارەت کرد؟»، گوتی: «من بێ‌خەتا بووم، ئەو کابرایە زوڵمی لێ دەکردم. گوتیان دوعای لێ بکە و شکایەت لە خوا بکە. دیتم خوا پێم دەڵێ: من ئەویشم وەک تۆ دروست کردووە. شەرم ناکەی بۆ خۆت دیفاع لە خۆت ناکەی و هاوار بۆ من دێنی؟...». خولاسە شەڕی خەڵک مەکە هی خۆت؛ بەڵام واش خوێڕی مەبە لەسەر خۆت وە جواب نەیەی. حەول بدە بە شکایەتی قانوون، بە یاریدەی دۆستانت زوڵم لە سەر خۆت لا بەرە.

هەمیشە زمان و ڕووخۆش بە. فێری جوێندانی پیس و بازاڕی مەبە. بە ڕووی خۆش و زمانی خۆش دوژمنیش دەکەیتە دۆست. ئەگەر تۆ ڕاست بی و ناڕاستان قسەت بۆ دروست کەن و غەیبەتت بکەن، زوو هەڵمەچۆ. ڕاستی و بێگوناهی بۆ خۆی دەردەکەوێ و قسەهەڵبەست شەرمەسار دەبێ. حەوسەلە و خوێنساردی لە ژیاندا بناغەیەکی زۆر پتەوە. من لام وایە پشوو و لەسەرخۆیی و کەم تووڕەبوون و لە پێست دەرنەچوون و پەلە نەکردن، نیوەی ژیانی خۆشە و بگرە زیاتریش. وەک دەڵێن «پیاوی بە حەوسەلە کەروێشک بە عەرابە دەگرێ».

لە قسە دەگەڵ خەڵک کردندا شەرم مەکە؛ بەڵام قسەی ناسک و بە ئەدەب هەڵبژێرە. کە داوای یاریدە و کار پێکهاتن لە هەواڵ و ناسیاوت دەکەی، تۆ قەرزێکت لە سەری نییە؛ کە وا بێ

دەبێ زۆر پشوو لەسەرخۆ بی. ئەگەر لە دە کار یەکیشت بۆ پێک بێنێ، دیسان شوکری خوای دەوێ. ئیتر هەرچی گوتت و پێکی نەهێنا، نابێ نێوانی دەگەڵ ناخۆش کەی و لە لای خەڵک غەیبەتی بکەی. «بە زمانی نەرم و خۆش مار لە کون دێتە دەر». ئەمجار کارێکت بۆ ناکا؛ بەلام لە چەند جار، جارێک فایدەیەکی هەر لێ دەبینی. لەوانەشە تووشی هەواڵی وا ببی کە بە پێی توانا بە دڵ یاریدەت بدا.

بە کەلیمەی خزمەتم و لە تاریف کردن فریو مەخۆ، ئەخلاقی کابرای کە خۆت لێ نزیک دەکاتەوە بێنە بەر چاو. من لەوەدا زۆرم زەرەر کرد...

دەگەڵ برا و عایلەی خۆت تا باش بی کەمە. خوێنی خۆتن، قەت با ماڵی دنیا لێکتان نەکا. برایەتی من و «سادق» و «عەبدوڵلا» دەگەڵ «زێنەب»ی خوشکم بۆ من زۆر خۆش ڕابراوە؛ بەلام دیسان هەموو برایەک ناکرێ وا بن. زۆر برای وا هەیە لە دوژمن خراپترە. زۆر دۆستی وا هەیە لە دوژمن خراپترە. زۆر دۆستی واش هەیە لە برای دایک و بابی چاکترە. ئەوانە تەجرەبەی ژیان بۆت دەردەخا.

خولاسەی هەموو مەبەستان لە مەڕ دۆستانەوە - وەک باسی کتێبم کرد- دۆستی چاک، پووڵی ناو گیرفانی خۆتە. ئەگەر بتوانی پەیدای کەی و بە فیڕۆی نەدەی، هەر چییەکت لەو گیرفانە پووڵدارە خواست، بێمنەت دەتداتێ.

کار زۆر بکە؛ زۆر خۆت ماندوو کە. با منەتت هەر لە سەر گیرفانی خۆت بێ. ئەگەر توانیت بە کەسب و کاری خۆت بەڕێ بچی، دۆست و خزمیشت زۆرە. کورد دەڵێن: «تا دووکەڵ لە سەر مدبەق دیارە، دۆستایەتیمان هەر بەرقەرارە». تا جحێڵی و تا دەتوانی ببزوویەوە، لە حەولدان واز مەهێنە. خۆت زۆر ماندوو کە. ڕۆژگاری پیریت لە بیر بێ. فەقیریشت لە بیر بێ؛ کە بە فەقیری کەس ناتناسێ. بۆ ڕۆژانی تەنگانە سنعاتێک بزانی زۆر بەکارە. ئیتر هەر سنعاتێک؛ با پینەدۆزیش بێ. دەڵێن برسیەتی دەوری ماڵی سنعاتکار دەدا؛ بەلام ناوێرێ بچێتە ژوورەوە.

بە بڕوای من ئەو وردە نسحەتانەش هەمووی زیادین. کە زۆر بخوێنییەوە، دنیا و کتێب پڕیانە لە نسحەتی زۆر بەنرخ. بەسەرهات و تەجرەبەش گەورەترین مامۆستا و ئامۆژگارن. بە هومێدم ببیە پیاوێک کە زۆر سەربەرز و شەرافەتمەندانە بژی و بتوانی خزمەت بە لێقەوماوان و نەخوازا دایکی پیرت بکەی و خەلک و خوا خۆشیان بوێی و نەڵێن پیاوێکی بێ ئابڕووە. ئیتر ئەوە خۆت و ئەمەش «چێشتی مجێور».

لەوانەیە لە بەسەرهاتی ژیانم -کە سەفەرێکی زۆر دوور و درێژ و پڕ هەوراز و لێژ و خوێناوی و خەماوی بووە- چەند ئەزموون و تەجرەبەیەکت لێ دەس کەوێ؛ یان جاروبارە بۆ یادی ژیانی بابت -وەک چیرۆکی بەر ئاگردان- بۆ خۆت و دایک و منداڵی خۆتی بخوێنییەوە. لاشت وا نەبێ هەر ئەوەندەم بە سەر هاتووە کە نووسیومە؛ نەخێر. زۆر شتم بواردووە و نەمنووسیوە؛ زۆریشم هەر لە بیر چوونەوە. بەلام لەم هەشت لە مشتەشدا، زۆر شت هەیە کە سەرنجڕاکێشە و پێت سەیر دەبێ کە چۆن تاقە پیاوێک سی ساڵ لە ئاوارەییدا ئاوا هەڵیکردووە و بە چەند دەرد و مەخسەرەدا تێپەڕیوە و ئێستاش هەر بە ئاوارەیی لە شاری کەرەج -وەک لە ناو جزیرەیەکدا بێکەس و بێ دەر قەتیس مابێ- بە پیری و بە تەمەنی شێست و چوار ساڵی ڕایدەبوێرێ و نازانێ کام ڕۆژ دنیا بەجێ دێلێ.

## سەرەتا

### خوایە! بە هومێدی تۆ

بۆ خۆم لە بیرم نییە کەنگێ بۆ یەکەم جار هاتوومە دنیاوە! بەڵام وەک بۆیان گێڕاومەوە و باوکم لە بیرەوەریەکانی خۆیدا نووسیبووی، ڕۆژی شەشی شابان، ساڵی ١٣٣٩ی هجری مانگی، بەری بەیانی -کە ڕۆژێکی زۆر تووش و بارانی بووە- لە دایک بووم و بریا هەر نەبووبام...

دایک و باب دڵیان خۆشە و خەنی بوون خوا کوڕێکی داونەتێ. مامان ناوکی ببڕە و مزگێنی و هەق دەست وەرگرە! باب هەر بە پەلە، بەر لە حەوتم، پەل بووە ناو بۆ تاقانەکەی بدۆزێتەوە. لەو دەمەدا کە مژدەیان داوەتێ، خەریکی خوێندنەوەی کتێبێک بووە کە زۆری لێ خۆش هاتووە. دەسا بە خوا ناوی نووسەری ئەم کتێبە لە کوڕی خۆم دەنێم. خاوەن کتێب «عەبدوڕەحمانی سیوتی» بووە و زانا و شاعیر و مێژووزانێکی لەزەبرە. پێغەمبەریش فەرموویە: ناوی هەرەچاک عەبدوڵلا و عەبدوڕەحمانە. دەسا با منداڵ لە ناو پەڕۆ و پاڵدا زیقەی بێ و فێری مەمک مژینی کەن، تا کورتە باسێک لەو دایک و باوکە بگێڕمەوە:

باوک مەلایەکە لەو ڕۆژەدا کە خوا ئەم کوڕەی داوەتێ، چل و هەشت ساڵی لە تەمەنی ڕابواردووە، بەڵام چۆن ڕابواردنێک؟ بابی و دایکی هەردووک مەلا و مەلازادە بوون. بەر لەوە ئەو چاو بە دنیا هەڵێنێ، هێندێک ملکیان لە گوندی شەرەفکەند هەبووە؛ بەڵام کەوتوونە فەقیری. باب زوو مردووە و کوڕ کە ناوی محەممەدە و حەمەیان پێ گوتووە و لە ناو منداڵان، بۆریشیان لەقەب داوەتێ بۆتە «حەمەبۆر». لە باوەشی دایکی بێوەژن و نەداردا بەخێو بووە و هەر لای ئەویش ماوەیەک دەرسی خوێندووە. تەمەنی لە چاردە ساڵاندایە، دایکی دەینێرێتە فەقییەتی. لە بابم بیست گوتی: لەو دەمەدا کە دایکم دەیگوت بڕۆ ببە بە فەقێ، من چیلکەیەکم دەعەرز دەوەژاند و کز و مات بووم. پرسی: چیت لە دڵدایە؟ گوتم: دایە! خۆزگە دەرپێیەکی تازەم ببوایە، ئەمەم دڕاوە. گوتی: کوڕم! بە خودا نەک دوو قران -کە قیمەتی دەرپێیە- تەنانەت چوار تاقە شاییش شک نابەم. بڕۆ بۆ خۆت ببە پیاو، پەیدا کە!...

لە فەقێیەتیدا بۆتە موستەعید؛ بەڵام نەگەیوەتە ئیجازە وەرگرتن. خاڵی -کە «مەولانا سادق»ی خەلیفەی شێخی بورهان بووە- کردوویەتە خزمەتکاری خۆی. مەولانا وەکیل و بریکاری شێخ بووە لە سەر مولک و ماڵی شێخ و زۆر پیاوێکی بەبڕشت و کارامە و بەهەڵسووڕ داسووڕ بووە؛ شوێنەواری لە موکریاندا هەر ماون: «پردی قەرەقشلاغ»، «جادەی بەسری» و «پردی قەلاتاسیان» کردەوەی مەولانان. لە ساڵی گرانی گەورەی ١٣٣٦ی کۆچی-مانگی، خەڵکی هەژاری ناوچەی سەردەشتی، لە مردن و بێنانی ڕزگار کردووە و دەخڵی بۆ ناردوون و بەخێری خۆی داونیەتێ.

مەولانا جارێک لە شێخ زیز بووە و سەری خۆی و بابمی هەڵگرتووە و ڕووی کردۆتە شاری «وان» لە وڵاتی تورکان و بۆتە میوانی مزگەوتێک. بۆ بەختی ئەو دووە، دارتوویێکی سوور لە مزگەوتەکەدا بووە و لەو دەمەدا هەڕەمەی بەرگرتنی بووە. نانی وشکیان دەئاوی توو کوشیوە و

خواردوویانە. مەولانا خوارزاکەی خۆی خستۆتە ناو بازاڕ و کاسبی فێر کردووە.
دەیگوت: لە بازاڕی «وان»دا دەگەڵ ئەرمەنییەک بوومە ئاشنا. ڕۆژێک گوتی: من سەد لیرەت دەدەمێ، کاسبی پێوە بکە؛ قازانج بە نیوەیی. گوتم: با پرس بە خالم بکەم. خالم گوتی: وا دیارە ئیمانتان لێک نزیکە! بچۆ لێی وەرگرە!
وردە-وردە حەمە بۆتە قاچاغ فرۆش. لە نێوان ئێران و ڕووس و عوسمانیدا تفەنگ و فەڕش و جەوهەری ئاڵوگۆڕ کردووە. زۆری پێ نەچووە خالی دەوڵەمەند بووە و لە گوندێکی بە ناو «خوڕخوڕە» خانەقایەکی بنیات ناوە و چەندین باخچە و ڕەزیشی لە دەوری شاری وان کڕیوە.
دەیگوت ڕۆژێک چەند کەسێک هاتنە سەر ڕێم، گرتیانم و بردیانمە ئاوایی کە گوندێک بوو ئاغای موسلمان و ڕەعیەتەکانی زۆربەیان ئەرمەنی بوون. ئاغا گوتی: تۆ دەگەڵ کەشەی دێ وتوویژی دینی بکە! ئەگەر سەرنەکەوتی ئەوا ڕووت کراوی و ئەگەر سەرکەوتی ئازادت دەکەم. «یاخوا کەشە هێندە زانا نەبێ دەگەڵی دەرنەبەم!». مەجلیس ڕازاوە، کەشە هات؛ ئەم وتوویژە ڕووی دا:
- ئێمە ئەگەر خۆشەویستێکمان بە چەکێک بکوژرێ، چاومان بڕوایی نادا ئەو چەکە ببینین. کەچی مەسیحی ئەو دارەی «مەسیح»ی پێ ئیعدام کراوە بە پیرۆز دەزانن و هەر یەکە دە ملیاندایە و بەرەکەتی لێ دەخوازن.
- وا دیارە پیاوێکی ناتێگەیشتووی! سەلیب لە شکلی بنیادەمە بۆیە ڕێزی لێدەگرین. بڕوانە! کەشە خۆی درێژ کرد و هەردووک دەستی لێک بلاو کرد، بوو بە سەلیب.
- ڕاست دەکەی مامە کەشە؛ بەلام ژنەکانیش هەر وەک سەلیب وان، چۆن دەچنە لایان؟!
حازران بەو قسە قۆڕە ملیان لە پێکەنین نا و ڕێگەی جوابی کەشەشیان بڕی؛ ماڵەکەیان دامەوە. جارێکی‌تریش چەتە ڕووتیان کردم. دەهاتن بڕۆن گوتم من ماڵی خۆمتان لێ دەستێنمەوە، من خوارزای شێخی خوڕخوڕەم. لە ترسی مەولانا -کە ناویان بیستبوو- دایانمەوە.
حەمەد بەر لەوەی تووشی ئاوارەیی بێ، ژنێکی هێناوە خزمی خۆی و ناوی «ئامین» بووە. ئەو ژنەش لەو ئاوارەییەدا دەگەڵی ژیاوە و لەو ماوەی ئاوارەییەدا کچێکیان بووە.
پاش حەوت ساڵ ژیانی ئاوارەیی، شێخ ناردوویە مەولانای بردۆتە لای خۆی و گەڕاونەتەوە ولات. ئەوسا «حەمەبۆر» کە ئێستا ناوی بۆتە «مەلا محەممەدی بۆر»، پیلی ماڵ و منداڵی گرتووە و لە شەرەفکەندەوە هاتۆتەوە سابلاغ. لەم بەینەشدا -کە ئەو هێشتا فەقێ بووە- دایکی مردووە.
ماڵە لادێیەک بە چەند سیپاڵێکەوە هاتۆتە شار، لە چاوە خانوێک دەگەڕێ تێیدا ستار بێ. «حاجی سەید مستەفای کولیجی» باوکی سەید محێدینە شینە و باپیری سەید عەبدوڵلای کولیجی، ژوورێکی پشکەڵدانی دەداتێ کە خاوێنی کاتەوە و تێدا بژی و کرێ نەدات. بابم دەیگوت «ئامین» ئەوەندەی دڵ بەو ماڵەی خۆش بوو کە هیچ پادشایەک ئەوەندە شایی بە کۆشک و سەرسەرای خۆی نەبووە.
با ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە مەولانا بەو خوارزایەی خۆی گوتووە «حەمەبۆر»، پاش خوێندنی بۆتە «مەلا محەممەدی بۆر»، دوایش کە چۆتە حەجێ، کراوەتە «حاجی مەلا محەممەدی بۆر».



مەلا لە شار ملی لە کاسبی و کار ناوە. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا توانیویەتی خانوو بکڕێ و ماڵ وە سەر یەک نێ. لە شەڕی گەورەی یەکەمدا -کە ڕووس قەتلوعامی خەلکی سابلاغیان کردووە- تالان کراوە و لە مردن خەلستووە. ژنی هەوەلی مردووە؛ کیژەکەشی لە تەمەنی چاردە سالیدا بە مردنی خۆی داخی بە جەرگی باوکیەوە ناوە. ژنێکی‌تری هێناوە کە کیژی «سلەمان ئاغا» ناوێکی کۆنە تاجری لە کارکەوتە بووە. لەسەر ئەوە کە دیتوویە ژنەکە بە بێ ڕووپۆش هاتۆتە بەر دەرک و کۆلان، تەلاقی داوە و بێ ژن و بێ عەولاد ماوەتەوە.

لە کاسبی‌کردندا زۆر زرینگ و لێزان بووە. دووبارە پاش تالانی ڕووس، خۆی گرتۆتەوە و پارە و پوولێکی باشی وە سەر یەک ناوە و هەولی ژن هێنانی داوە. کچی «حاجی سەید حەمەدەمینی سارەوانان»ی خواستووە کە تەمەنی شازدە سالان و زۆر جوانێکی بەناوبانگ بووە. فەرقی عومری مێرد و ژن سی و دوو سال بووە؛ بەلام پیاوەکە پارەدارە بە زەبری پارە بەردیش نەرم دەبێ.

لە پاش سالێک لە گوێزتنەوەی بووک، ئەوا خوا کوڕێک دەدا کە باوک لە وەجاغ کوێری و دایک لە بێ بەری ڕزگار دەکا. «مالی دنیا بۆ ئەمڕۆ نەبێ بۆ کەنگێ دەبێ؟ هەر بۆ پلاوی حەوتەمی کوڕ، مەنجەلێکی چوار قولفەی زنجیردار دەکڕم، هەر چی دەیناسم بانگی دەکەم. دەبێ مەلا تەهای دۆستم بانگی بە گوێدا لێدا و ناوی بنێ عەبدوڕەحمان».

وەک دەلێن زۆر مندالێکی گرینۆک و بەگڕوو بووم؛ کەم وەختان ژیر بوومەتەوە. بەلام دایک و باب و نەخوازە دایک ئەوەندەیان شایی و شانازی بەو تاقانە هەبووە کە نەبێتەوە. گۆیا دایک لە پاش هەموو نوێژان دوعای کردووە: «خوایە هیچ کوڕی دیکەم نەبێ تا لە مالدا نەبێتە شەریکی عەبدوڕەحمان»!

کاتێ کە هاتوومە دنیا، ئاخر و ئۆخری بەهاری ١٣٠٠ی شەمسی بووە و لە پێناسەکەمدا -کە حەوت سال دوای لە دایک بوونم وەرگیراوە- ڕۆژی لە دایک بوونم هەژدەی جەوزا، واتا مانگی پووشپەڕە. لە پاییزی ئەو سالەدا لەشکری «سمایلاغای سمکۆ» بۆ شەڕی عەجەم، سابلاغی داگیر کردووە و شکاک ڕژاونەتە شار و ملیان لە تالانی کوردان ناوە. وا دیارە سمایلاغا هەر وەک ویستوویە لە چنگ عەجەم ڕزگارمان کا، ویستوویە لەو مالەش کە دەبەر پێی عەجەمدا پەیدا کراوە، ڕزگارمان کا! جا ئەگەر خەلکی شار کەم تا کورتێک مالی خۆیان شاردبێتەوە و لە تالانیان پاراستبێ، باوکی من بەو هومێدە کە کاک هەمزەی برای قەرەنیاغای مامەش برادەریەتی و ڕاوێژکەری سمایلاغاشە، ناهێلێ تالان بکرێ، دەستی لە هیچ ئاشتەبایەک نەداوە. بۆ نەگبەتی برادەر نەهاتووە، شکاک ڕژاونە مال، هەرچی بووە بردوویانە. تەنانەت دەسرازە و پەڕۆ و پالی لانکی منیشیان بردووە و منیان لە سەر خۆلەمێش بە ڕووت و قووتی فڕێ داوە. بابم دلخۆشی دایکمی داوەتەوە کە خەم مەخۆ! مالی دنیا پەیدا دەبێتەوە. دایکم زریکاندوویە: «من خەمی هیچم نییە، تەنیا خەمی ئەوەمە کوڕەکەم ڕووتە، چی تێوە پێچم؟!».

ئەو تالانی شکاکانەش بۆتە چیرۆکێکی سەیر لە ناو خەلکی سابلاغدا: ژنیان ڕووت کردوون بەلام ڕوویان وەرگێڕاوە و گوتوویانە: «خویشکا من! دەرپێ خۆ بدە من. ئەز ل تە نانهێرم؛ خودێ قەبوول ناکە!». جگە لەوە هەموو کەس و هەموو مالیان تالان کردووە، پیاوەکانی خەلکی شاریشیان بە بێگار گرتووە، مالی تالانی بۆ بنکە ڕاگوێزن. «مەلا مارف»ی شاعیر لەو باسەدا دەلێ:

ئاواڵ کراسی کیژ و ژن و خانمی وەتەن     دایانرنین ئەوانی سەبابانی قوون ترۆڵ
قازی و مەلا و تاجر و ئەسنافی خەڵکی شار     گیران بە سۆغرە کەوتنە ژێر باری دار و کۆڵ

شکاک کوردی سابلاغییان هەر تالان کردووە و نەیانکوشتوون؛ بەلام هەر ترک زمانێکیان وەبەر پەل هاتووە کوشتوویانە. یەکێک لەو ترکە ئازەریانە برادەری بابم بووە؛ خۆی و ژنەکەی پەنایان بە ماڵی ئەو هێناوە و حاواونەتەوە. ژنی «کەربەلایی فەتحوللا زەنگانی» ساوای لە بەربووە و شیری زۆر بووە. یاریدەی دایکمی داوە و شیری داومێ. کە زۆر ساڵان بە جحێلی تا منی دەدیت دەگریا و منی وەک کوڕی خۆی خۆش دەویست.

دایک لە تەمەنی حەڤدە سالیدا تووشی نەخۆشی سیل دەبی و زۆری پێ ناچێ دەمرێ. تاقانەکەی لە تەمەنی دوو سالیدا لە دایک بێبەش و هەتیو دەمێنێ. ژنێک بە ناوی «خات شەرافەت» لە سارەوانان ماوەیەک شیری داومەتێ. لە پاش ئەوە دوو ساڵ ژنێک بە ناوی «خات ڕوقیا» سەرپەرشتیم دەکا. تا بابم سەر لە نوێ بۆ جاری چوارەم ژن دێنێ و ژنەکەشی لە بنەماڵەی قازیەکانی سەردەشت بوو. ناوی «مریەم» بوو؛ بەلام هەر بە ناوی «کچی قازی» دەناسرا. پاش دوو ساڵ هۆگر گرتن بە خات ڕوقیاوە، دیسان هەتیو کراومەوە و دراومە دەست دایکی سێهەم.

خواوڕاستان زۆری نەبرد کە خوشکێکم بۆ پەیدا بوو؛ هەم هەواڵی من و هەم خەمڕەوێنی ماڵەوە. واتا هەر پێنج ساڵ تاقانەی ماڵ بووم. بابم بەو پێ و شوێنە کە دەبێ بەچکەی سۆنە مەلەوان بێ، هەر لە تەمەنی پێنج سالییەوە دەرسی ئەلف و بێتکە و جزمی عەممەی پێدەخوێندم. ئای کە خوێندن ناخۆشە! هەرچی فێر دەکرام پاش سەعاتێک لە بیرم نەدەما و لە تەنبەڵیدا تاقەسوارەی مەیدان بووم. باب هەر دەیگوت: جزمی عەممە ڕەوان کەی دەتنێرمە لای مەلای باڵەکی لە خانەقای شێخی بورهان قورعانت پێ ڕەوان کا. زۆر پیاوێکی ممبارەک و قورعانزانێکی لە زەبرە. بەلام ئەو ئاواتە هەر پێک نەهات. تا سوورەتێکم دەخوێند، نەک هەر سوورەتی پێشوو، بەڵکە ئەلف و بێتکەکەشم لە بیر دەچوونەوە.

«ئەی خوایە بە دەست ئەم هەتیوە دەبەنگ و نازیرەکەوە چ بکەم؟ تەگبیر، تەگبیر... بە خوا بینێرمە قوتابخانەی مەلا لە هەمووی چاکترە، لە من ناترسێ لەو دەترسێ».

لە بیرمە ڕۆژێک پیلی گرتم و ڕۆیشتین. چووینە شوێنێک، تاریک، ڕەش بە دووکەڵ. چەند حەسیرێک ڕاخراوە و بیست منداڵێکی وەک خۆمیان لە سەر دانیشتووە. مەلایەکی مێزەر زلی دەنگ گەورە، دوو شووڵ بە دەستەوە، لە بەر بابم هەستا و بەخێری هێنا.

بابم گوتی: مامۆستا دەستت بێنە.

دەستی منی خستە دەستیەوە و گوتی: ئەم کوڕەم بۆ هێناوی، گۆشتی بۆ تۆ، ئێسکی بۆ من. شەرت و مەرجی قوتابخانە چییە؟

مامۆستا فەرمووی: مانگێ قرانێک. حەقی ئاوخواردنەوە دوو شایی. حەسیر بێنێ بۆ لە سەر دانیشتن. ئەگەر باشیش نەخوێنێ یان هاروهاجی بکا، بۆتی تەنبێ دەکەم.

سەودا سەری گرت؛ خێری لێ بینی. لەو ڕۆژەوە دەبوو سیپارە لە بن هەنگلدا بچم تا نیوەڕۆ لە قوتابخانە بم و دوای نیوەڕۆ بەرهەڵدای کۆلان و سەرگەرمی گەمە و کایە بم. ڕۆژانەم دوو شایی واتا سەدیەکی تمەنێک بوو؛ کە لە پێم دەهات و لە سەرم دەردەچوو. بایی شاییەک کشمیش و لەبلەبی گیرفانی داخنیم و مڕی دەکردم.

مەلاوڕەحمانی مامۆستا، ژنێکی هەبوو بە ناوی خاتوامان و دەروجیران ئامانی مـەلاوڕەحمانیان پێ دەگوت. ڕۆژانە لە بەری بەیانەوە لە تەنـدووری ناوەڕاستی قوتابخانەکەمانـدا نـانی دەکـرد و دەیفرۆشت. هەر لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ چرەدووکەڵێک بوو چاو چاوی نەدەدیت؛ بـەلام زۆرمـان کەیف بەوە دەهات کە تیشکی ڕۆژ لە کولانکەوە دەیدایە ژوورەکە و دووکەڵ لە تیشک دەهـالا و کۆلەکەیەکی جوان و لەباری لێ ساز دەبـوو. مـەلا زۆر دەنـگ گـەورە بـوو؛ بـەلام لـە بەرامبـەر خاتواماندا دەنگی وەک دەنگی مێش دەگەڵ گوڕەی شێر وا بوو. هەمیـشەش چەققـە و هـەرا و شەڕەجوێنیان بوو؛ کە بە ڕاستی لە چەقە و گوڕەی ئەو دوانە ئێمە کەیفمان دەکرد.

مامۆستا لە لای سەرووی قوتابخانە، یان بلێم دووکەڵدانەکەوە دادەنیشت. دوو شوولی درێژی لە سەر کۆش بوو. چاوی دەگێڕا کێ لە ئێمە چاوی بە سەر سیپارەدا چڕ نەکردووە، بە بـێ ئـەوە هەستێ، شوولێکی تێ دەسرەواند و جوێنێکی حەوالـە دەکـرد. دارێکـی کـەوانی، پـەتێکی تـێ خرابوو لە پشت سـەریەوە بـە گرێـی کۆلـەکەیەکەوە هەڵواسـرابوو، نـاوی «فەلاقـە» بـوو. هـەر منداڵێک هاروهاجی بکردایە، پەتی فەلاقەی لە لاقی بادەدرا و یەکێک لە ئێمە دەیگرت و قـاچی گوناهباری بەرز دەکردەوە؛ مامۆستا بە شوولی تەڕ وەردەگەڕا بەری پـای و هـاوار و زیـرەی لـێ هەڵدەستاند. منداڵێک میزی هاتبا، دەبوو قامک بەرز کاتـەوە و بـلێ دەچمـە سـەراوێ. هـەقی دەرچوونیش بۆ میز کردن دەبوایە بەری دەستی پان ڕاخا و مامۆستا شوولێکی لە بەری دەسـتی بدا ئەوسا بچێتە دەر. زۆر زوو عادەتمان بـە ئێـشی شـوول گـرت و ڕۆژێ دوو-سـێ جار داوای چوونە سەراومان دەکرد کە هیچ نەبێ تاوێک لە خوێندن خۆ بدزینەوە.

هەر کە مامۆستا بە فەرمانی خاتوامان دەبوو بچێتە بازاڕ و کەل‌وپەل بکڕێ، سەرمان لـە سـەر سیپارە لادەبرد و هەر کە خاتوامان چەمبوولێکی بەرەوپشتی مامۆستا حەوالە دەکرد، دەمـانزانی وچانی خوێندنە؛ دەمانکردە چەقە و هەرا. گاڵتەی هەرەخۆشمان مێش گرتن بوو. خـوا نەیبـڕێ چەندی خوا حەز کا مێش هەبوو. نەخاڵ مێشێکمان دەقۆزتەوە، یـان بەلـەکمان هەڵدەمالـی و تفمان دەکرد و داوە بەنێکمان لە سەر گوێزینگ بە هەر دوو دەست ڕادەگرت. مێش لە جێ تف دەنیشت، هێدی- هێـدی بەنەکـەمان بـەرەو ژوور دەخزانـد و لاقـی مـێش بـە تەلـەوە دەبوو؛ دەمـانگرت. پووشـکەیەکی بـاریکی حەسـیرمان دەکنگـی دەچەقانـد و بـەرەلامان دەکـرد و کێبەرکێمان بە مێشی کلک حەسیر دەکرد و دەتریقاینەوە. تا مامۆستا دەهاتەوە، بە سەدان لەو مووشەکە مێشانە لەژوورەکە سووریان دەخـوارد. زۆر جـار دار و فەلاقـە لەسـەر ئـەو مووشـەک فڕاندنە وەکار دەکەوت.

ڕۆژێکی زستان و بەفر بوو؛ وەخت چێشتەنگاو بـوو؛ لـە پـڕ بـۆ هـەوەڵ جـار لـە ژیـانی ئێمـە منداڵاندا گوێمان لە دەنگی تۆپ و ئاگربار بوو، کە بە ئاگرباریـان دەگـوت «شێـستیر». مامۆسـتا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، هەر تفی قووت دەدا. خاتوامان بـەربووە سـنگ کوتـان و هـاوار؛ ئێمـەش وێکڕا وەک دەستەی سیمفۆنی بە یەک هەوا دەستمان کرد بە گریـان. مامۆسـتا بـە دەنگێکـی گڕی گریاناوییەوە فەرمووی بڕۆنەوە ماڵ. هەر کەس بە گریان، بە بـێ ئـەوە بزانـێ بـۆ دەگـری، بەرەو ماڵ هاتینەوە. کارەساتم بۆ بابم گێڕاوە. پێکەنی و گوتی:

- لەشکری مەلا خـەلیل -کـە دژ بـە دەوڵـەتە و مـەلا نایـەوێ کـلاوی پەهلـەوی لـە سـەر موسوڵمانان بنێن و کافریان کەن!- گەیـشتوونەتە بـلندایی دەوری شـار و دەوڵـەت بـە تـۆپ و شێستیر دایگرتوون. بەلام خوا مەلا خەلیل سەرکەوتوو بکا، ئیشاللا دەرەقەتی نایەن.

بابم و زۆر لە برادەرانی -کە میوانمان دەبوون- دوعای سەرکەوتنی مەلا خەلیلیان دەکرد و دەیانگوت خوا ڕوحم بە موسڵمانان بکا و لەو کافرانە ڕزگارمان بێ. بەلام بەو حالەش چونکە جارێک لە شەڕی شکاکاندا دەستی بە زاخاودا چووبوو، ماڵ و نەغدینەی خۆی شاردەوە؛ نەوەک مەنگوڕی لەشکری مەلا خەلیل تالانی کەن. من ئەو کاتە تەمەنم حەوسالان بوو. لە قسەی بابم و میوانانەوە مەلا خەلیلی کوردم خۆش دەویست و ڕقم لە دەوڵەت هەڵدەستا. لە ژووری ماڵدا دەگەڵ خۆم گوێزێنم دەکرد؛ پێکم دادەدان. هەر گوێزێک بشکایە دەمگوت ئەوە عەجەمە شکا و دوعام دەکرد یاخوا هەر بشکێن و مەلا خەلیلی کورد سەرکەوێ. مەلا خەلیل و مەنگوڕی لەشکری، خۆیان زۆر بۆ نەگیرا و شکان. سپای دەوڵەت بە یاریدەی هۆزەکانی گەورک و مامەش، وڵاتەکەی داگیر کردنەوە و هەرچی وە بەر پەلی هات بە تالانی برد و چەند ئاغایەکی مەنگوڕیشی بە دیل گرت و لە زیندان توند کرد. کتێبخانەی مەلا خەلیل لە بازاڕی سابلاغ هەڕاج کرا. بابم زۆر لەو کتێبانەی کڕیەوە و بۆ خزمەکانی مەلا خەلیلی ناردەوە.

لەو قوتابخانەدا «جزمی عەممە و تەبارەک»، «سمایل نامە و ناگەهان»، «یاقیدەی شێخ سەمیع» و «ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدێیی»م خوێند.

«قازی محەممەد» -کە ئەوسا «میرزا محەممەدی قازی» ناو بوو ببوە مدیر مەعارفی سابلاغ، بە بێ مەعاش واتا ئیفتیخاری. جا ئەو کە نوێنەری دەوڵەت بوو- دەبوایە هەموو فێرگەکان بە سەر کاتەوە. بڕیاری دابوو بێتە قوتابخانەکەی ئێمەش و بڕوانێ چۆنمان خوێندووە. مامۆستا بە منی گوت: کوڕم! ئەگەر جاروبارە لێتم داوە بەلام تۆم خۆش دەوێ. حەز دەکەم تۆ بە مدیری مەعارف بناسێنم. زیرەک بە! بە باشی جواب بدەوە! ئەی بەخێری ناسلامەتی، کەس نا، من! تۆ بڵێی مودیر چ بێ؟ چیم لێ بپرسێ؟ ڕۆژێک لە پڕ مدیربەگ خۆی کرد بە ژووری پڕ لە دووکەڵ و مێشدا. مامۆستا منی نیشان دا، گوتی: قوربان ئەم کوڕە تاقی کەوە! مدیر فەرمووی: دەی شتێک بخوێنەوە! ملم لە ئەحمەدیە بۆڕ نا:

ڕەئس سەرە، عەین چاوە　　بەدەن قالب، ئیسم ناوە
جەبین و جەبهەت توێلە　　مەکر وکەید و حیلە فێلە

گوتی: ئافەریم، بەلام بۆ گوتت فێلە و توێلە؟ دەبوو بە لامی قەڵەوی بڵێی. من ئافەریمم وەرگرت و مامۆستاش لەوە کە مدیری دڵخۆش کردووە هەر بزەی سمێڵی دەهات. مودیریش لە بیری چوو لێم بپرسێ توێڵ و فێڵ یانی چی؟ تا وەک هەرامە دە قوڕ چەقیبام! چونکە وەک تووتی فێر کرابووم و نەمدەزانی چیم خوێندووە. هەر دەمزانی هیچ نازانم.

خواوڕاستان قوتابخانەکەمان دانەخرا، ئەویش لە سایەی زیرەکی من!

لە تەمەنی هەشت سالیدا بووم برایەکیشم بۆ زیاد بوو. ژمارەی منالی ماڵ گەیشتە سێ: «عەبدوڕەحمان» و «زێنەب» و «عەبدوللا».

دەورانی منالیم جگە لەو خوێندنە خاوێنە، دەگەڵ جگێن و گوێزێن و هەڵماتێن و قۆچەقانی چوێلەکەکوژ و کەلای جوان و هەلووکێن و جەغزێن، هەر لە پاش نوێژی نیوەڕۆوە تا تاریکانی ئێوارە، بە پێخاوسی، بە سەر ڕووتی هەڵدەبەزیم و دادەبەزیم و ژیانی پاڵشایەتی ڕاستەقینەم بوو؛ بەلام نەمدەزانی چەند بەختەوەرم. شەوانەش دوای نان خواردن دەچوومە کۆلان، دەگەڵ منالان تا خەو بە لایدا دەبردینەوە، گەمەمان دەکرد. گەمەی شەوو، ئەوانی لە بیرم ماوە: «مەلا تەقتەقێن»، «کەری سووری پشت درێژ»، «کلاوێن»، «هەیجۆ»،

«چاوشارکێنه» و «هەمزەل» بوو.

چونکە دایکم بە نەخۆشی سیل مردبوو، ترسی ئەوە هەبوو کە منیش گرتبێتمەوە. دەبوایە تا دەست دەڕوا و دەلوێ، لە هەوای سافدا بژیم. لە لایەکیش بابم وای دەویست کوڕەکەی خلیسک و خاوی شارستانی نەبێ و بە ژیانی زبرەوە خوو بگرێ. هەموو بەهاران و هاوینان دەیناردمە لادێ، یان دەچوومە «ماسوێ دایماو» لە هەواری «ماڵە مامە سەید» کە «سەید محەممەدی لاجانی» ناو بوو؛ من پێم دەگوت مامە سەید. یان لە گوندی «سارەوانان» لە ماڵی خاڵانم دەژیام. لە ڕاستیدا ژیانی منداڵی لە لادێ هیچ ژیانێکی شارستانی ناگاتێ. پادشای بێ جوققە، منداڵی لادێیە. هەر لە تاوهەڵاتەوە بە دەشت و کێودا بەرەڵا دەبووین؛ هێلانە مەل بدۆزەوە، داوی بۆ دانێ، هێلکەی لێ بدزە، بچۆ بێستانان، بە دار هەڵگەڕێ. خۆ ئێوارە هەر باسی ناکرێ؛ سەعاتێک پێش گاران هاتن، بەرەو گاران غار دە و لە ڕێ تووشی بە و پێچی سەر یان تیتولە پشتێند، دەملی کەرێکی ڕووتی بێ جل هاڵێنە و خۆی باوێ سەری. کەر بەرەو ماڵ ڕادەکا، جووتە داوێ، هەڵدەتیزێنێ، ئازا بە و خۆ بگرە نەکەوی. ڕەنگە پتر لە بیست جار لەو گاڵتە خۆشەدا سەرم شکابێ؛ بەڵام سەرشکان لە ڕێگەی کەرغارداندا خەڵاتە!

لە خاڵۆزاکانم دوو هاوعومرم هەبوون: «حەمەدەمین» و «مامە ڕەحمان» کە دەگەڵ ئەوان زۆر کەیفم ساز بوو. حەزم دەکرد هەر کوێ زۆر بڵیندە بچمە سەری و بزانم لەودیو چ هەیە. زۆر جار بە تەنیا ملی ڕێم دەگرت و بە چیا هەڵدەگەڕام. جارێک لەو جارانە کە دەمویست بچمە سەر دوندی قووچی کێوی «هومام» لە «ماسوێ»، زۆرم پێ چووبوو؛ ماڵە مامە سەید وەیانزانیبوو مار لە دەشت پێوەی داوم. ببوە هەرا و هاوار و چەند کەسیان خستبووە شوێنم کە بمدۆزنەوە. ئەوان لێم ناهومێد ببوون و من بۆ خۆم هاتمەوە.

دەگەڵ شوانی ماڵە مامە سەید دەچوومە بەر مەڕی، ناوی گژ و گیام لێ دەپرسین؛ چیرۆکی خۆشم لێ دەبیستن. بۆ ناسینی حەیوانان ببوومە پسپۆڕێک، شوان ئافەریمیان لێ دەکردم. نان و شیرم دەگەڵ دەخواردن و لە سەر عەرزی ڕووت دەنوستم و تەواو نازداری شارم لە بیر دەچوو.

### ناو فەقێ

وا دیارە بەشی قوتابخانە چوونم بە سەر چووبوو. بردیانمە حوجرەی مزگەوتی هەباساغا کە ببمە فەقێ. مامۆستاکەی منیان پێ سپارد، یەکێ بەرزەباڵای ڕیش پانی مووڕەش و چاوزەق و لووتبەرانی بوو کە بە «مەلاسەعیدە شێتە» مەنشوور بوو. یەکی تریش لای ئەوی دەخوێند: یەکی تۆپەڵەی گردەبنەی چاوزەردی گوێ تەشکەبەرە بوو بە ناوی «فەقێ بایز». بەر لە هەموو کارێک فێریان کردم کە چۆن ئێوارانە بە ماڵانەوە بگەڕێم و هاوار کەم: «نانی فەقێ ڕەحمەتی خواتان لێ بێ»! نانی گەڕەک بچنمەوە و بیهێنمە حوجرە. بە چەند ڕۆژێک شەرم کردن و مینگەمینگ، لەو سنحاتە جوانە ڕاهاتم! بڕیار درا دەرسی «گولستانی سەعدی» بە سایە بخوێنم؛ جا پاشان بگەڕێمەوە و بە ماناوە پێم بڵێن. قورعان خوێندنەکەشم ئەوە لە جێی خۆی؛ دەبێ هەر خەتمی کەم و زۆریشم ڕەوان بێ. مەلا سەعید هەر عەرەبی کتێبی دەزانی. تەنانەت نەیدەتوانی ناوی خۆی بە ڕەوانی بنووسێ. مەشق و خەت و فارسی لە ملی فەقێ بایز بوو. ڕۆژێک وەک بەڵای ناگەهانی منداڵێکیان هێنا حوجرە کە بە تەمەن لە من باوخۆشتر و بە باڵا لە من کورتەباڵاتر بوو. یەکێکی سووری چاوزیت، لێم بوو بە عیزراییل. دەبوایە ئەویش گولستان

بخوێنێ. هەتیو ئەوەندە زیرەک بوو کە نەبێتەوە. من بە هـەزار گێـرە و نێـرە دوو خـەتم ڕەوان دەکرد، ئەو پەڕ و دوو پەڕی تێ دەپەڕاند. وەک ئاگری قودرەتی وابوو. جا وەرە زللـە و چـەپۆک بخۆ، کە بۆ ئەو هێندە و هێنـدەی ڕەوان کـردووە و تـۆ هـەر منجـە-منجـت دێ؟! هـەر لەبـەر خۆمـەوە لـە خـوا دەپاڕامـەوە ئـەو بەدفـەڕە بمـرێ و لـە کـۆڵ دنیـا بێتـەوە. نـاوی ئـەویش «عەبدوڕەحمان» کوڕی «سۆفی مینە» بوو؛ کە لە دواڕۆژدا بە ناوی «زەبیحـی» ناسـرا. زەبیحـی وەک من فەقێی دایمی و ڕەسمی نەبوو؛ دەرسی دەخوێند و دەگەڕاوە ماڵـە خـۆی. وردە-وردە پێکەوە بووینە ئاشنا و لە دەرسی گولستان یاریدەی دەدام و ئەو ئاشنایەتییە پتر لە پـەنجا سـاڵ دەوامی کرد و ئێستاش هەر دۆستمە.

تەواو نازانم چ ساڵێک بوو، دەوڵەت فەرمانی دابوو جگە لە مەلا و فەقێ، دەبـێ هـەموو کـەس کڵاوی پەهلەوی لە سەر نێ و مێزەرە و جلی کوردی قەدەغەیە. مەلا و فـەقێش دەبـێ قاقـەزی حاکمی شاریان پێ بێ کە لە کڵاو مـەعافن. ئـەو حوکمـە بـۆ پۆلیـسی دەوڵـەت، بـازاڕێکی زۆر بەقازانجی پێک هێنابوو. هەر کەس تیتۆڵە پشتێندێک، بزگوڕە مێزەرێک بە قەد و سـەریەوە بـا، یان پاتۆڵ و ڕانکی نێفەک شۆڕی کوردانەی بوایە، بە دار و قـامچی بەردەبوونـە گیـانی و بـە بـێ بەرتیل ڕزگار بوونی چەتوون بوو. دەی خودایە مامۆسـتا مـەلا سـەعید و ئێمـەی چـارەڕەش چ بکەین؟ پاش مقۆ- مقۆیـەکی زۆر، قـەرار درا بچینـە خزمـەت حـاکم و قاقـەز وەرگـرین. مـەلا عەلیەکی کوێری بانگدەری مزگەوتەکەش گوتی منیش دەگەڵتانا دێم؛ ممبارەک بێ.

پاش نوێژی نێوەڕۆیەکی گەرم، مامۆستا و فەقێ بایز و مەلا عەلیە کـوێرە و مـن ملـی ڕێمـان گرت. پرسیار-پرسیار ماڵی حاکممان دۆزیەوە. بۆ نەچووینە ئیدارەکەی؟ نازانم. لە دەرگایـەکی زەلامی گاڵەدراومان دا، کەس بە دەنگمانەوە نەهات. ناچار مەلا سەعید بە بەرد و مەلا کوێرە بـە عاساکەی دەستی وەرگەڕانە کوتانی دەرگا. تومەز ئەمە دەرگای پشتەوەیە و بـە سـەر تەویلـەدا دەکرێتەوە و کەس لەوێوە ناچێتە ماڵی حاکم. ئاخری بەو درنگ و هۆڕی بەرد و عاسـایە، حـاکم لە غوراِبی خەو ڕادەپەڕێ و شێتانە بە پیژامەوە ڕادەکا بزانێ لەم جەنگەی گەرمایەدا چ قـەوماوە؟ دەرگا کرایەوە. کابرایەکی زڕتە زەلامی سورهوڵ، دەتگوت بەرازی دابەستراوە، دەرگەی کـردەوە و بە فارسی گوتی: «چیتان دەوێ؟». مـن لـە دیـتنی حـاکم ئەوەنـدە ترسـام دەڵـەرزیم؛ ئیتـر نەمزانی ئەو سێ فارسی نەزانە چۆنیان وەرام دایەوە. هەر هێندە دەزانم حاکم بـەگ بـە هـەموو هێزی خۆی نەڕاندی: «بڕۆن لە بەر چاوم گوم بن!»، دەرگای تەق بە سەریەکدا دایەوە و گاڵـەی دا و ئێمە دەست لە گونان درێژتر لە پشت دەرگا ماینەوە. ئیتر جوێنی سـێ قۆڵـی و تەپەتـەپی چوار قۆڵی دەستی پێکرد و لۆژ-لۆژ بەرەو مزگەوت پەل بووینەوە. مامۆستا مـەلا سـەعید تـەواو تەم دایگرتبوو، دەیگوت:

- جەحەندەم کە دەریکردووین، بە قوونی بابیەوە؛ بەڵام لـەوەتا چـاوم بـەو کـافرە کـەوتووە قەساوەت دڵی داگرتووم! هەر دوعای بن لێوانی دەخوێند و قرپی بـەڕێ دەکـرد کـە قەسـاوەت بەرهەڵدا کا. نەخێر قەساوەت وای نەگرتبوو بە قرپ و ورتەی بن لێو لە دڵی دەرپەڕێ! چار هەر ئەوەیە لەم شارە بڕۆین و بچینە «خانەقای شەرەفکەند» تا قەساوەتی کافر تەفر و تونا بێ.

وا دیار کەوت کە حاکم لە داستاننووسیندا دەستێکی بـاڵای هـەبووە. لـەو ڕۆژەوە کـە ئێمـە چووبووینە خزمەتی و دەریکردبووین، بۆ هەموو کەسێکی کە چووبوونە لای گێڕابۆوە:

- کوڕە زۆر سەیر بوو. من لە کاری ئیدارە ماندوو، لە ماڵ نێوەڕۆژم خواردووە و نوسـتووم. بـە

گرم و هۆڕی دەرگای پشتەوەی ماڵ لە خەو ڕاپەڕیوم. لام وابوو خانە بگیر کراوم. بە هەزار ترس و لەرز و دڵەتەپێ دەرگام کردۆتەوە. چ ببینم؟ یەکی درێژی ڕیش گەزی، تۆپنەیەکی گردەڵەی قوت، کوێرێک بە عاساوە، منداڵێکی سەر بێشکە، هاتوون نەهێڵم کلاویان لە سەر نێن. قەت بە عومرم دیمەنی ئەوەندە سەیرم نەدیوە و قەت بە عومرم هێندەش نەترساوم!

بابم زۆری کەیف هات کە دەگەڵیان بچمە خانەقا؛ کە شوێنێکی پیرۆزە و خوێندنی ئەوێ بەرەکەتی هەیە. بوخچە و پرێسکە پێچرایەوە و هێلکەی کولاو و نان ئامادە کرا و بەرەبەیانێک بەرەو خانەقا لە شار دەرچووین.

لە خانەقا لە حوجرەیەکی تەنگی دوو میتر لە دوو میتردا دامەزراین و خوێندن دەستی پێکردەوە. لە گولستانەوە چووبوومەوە «بووستان» و ئەوجار دەرسی عارەبی لە «تەسریفی زەنجانی» و «عەوامل»ڕا بەرەو «نموزەج» و «حەمدیە» ڕۆیشت. هەر دەرسێکم دەخوێند دەبوو لە بەری کەم. بەڵام ئاخۆ تێدەگەیشتم باسی چی دەکەن؟ نە خودای تۆ شاهیدە! هەر تەقەم لە سەریەوە دەهات و لام وا بوو برێشکە دەخۆن.

جارێ با بزانین ئەو خانەقایە کە چەند جار ناوم بردووە چییە و چۆن دامەزراوە و ئەو ڕۆژەی کە من دیتوومە لە چ بارێکدا بووە:

یووسف ناوێک، کوڕی وەرزێرێکی خەڵکی قەشان و ماوەتی شاربازێری کوردستانی بەردەستی عوسمانی ئەوسا و عیراقی ئێستا، چۆتە خوێندن، بۆتە فەقێ، بۆتە مەلا و ئیجازەی وەرگرتووە. خۆی گەیاندۆتە «تەوێڵە» و لای «شێخ عوسمان سراجەدین» بۆتە مرید و پلە-پلە سەرکەوتووە تا کراوەتە خەلیفە و هاتۆتە «بورهان» کە گوندێکە لە مەڵبەندی موکریان. مریدی پەیدا کردوون، زەوی لە ئاغا قەبەڵ کردووە و بە مریدانی ڕەنێو هێناوە و لە نانی ڕەنجی شانی مریدان، میوانداری مریدانی لاوەکی کردووە و پووڵ و دیاری وەرنەگرتووە. داوای کەشف و کەراماتی نەبووە، هەموو شتێکی حەواڵە بە کتێبی شەرع کردووە و لە شەرع بە موو کلا نەبووە. مەلایانی وڵات بە دڵ و داو هەموویان عاشقی ئەو ئاکارەی بوون و بوونەتە مریدی. خەڵکی ڕەمەکیش بە شوێن مەلایاندا هرووژمیان هێناوە. جووتێر و وەرزێری بە خێری خوا، ڕۆژ بە ڕۆژ زێدە بوون و دارایی تەکیە پەرەی گرتووە. ملک کڕاوە و بەشی ئاغای لێ نەدراوە. پاش چەند ساڵێک کە گوندی «شەرەفکەند» بۆتە ملکی خانەقا لە قشلاغی شەرەفکەند بنیات نراوە. جگە لە سۆفی تەرکە دنیا، فەقێ و مەلای زۆریشی لێ کۆ بۆتەوە، کە شێخیش لە ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی مانگیدا مردووە، دام و دەزگای خانەقا تێک نەچووە و نانی میوان و دانیشتوان لە مەوقووفەجاتی خانەقا دابین دەکرێ و سۆفیلکەی تەرکەدنیاش کاروبار بەڕێوە دەبەن. گەورەی خانەقا شێخ محەممەدی کوڕی شێخە کە مەلایەکی زۆر بەناوبانگە و داوای شێخایەتی ناکا. دەرسی فەقێ دەڵێتەوە و فتوای شەرعی دەردەکا. دەڵێن دە پێشدا ئەو مرید و سۆفیانەی تەرکی دنیایان داوە و خۆیان دە قەبەڵ خودا کردووە و خزمەتی شێخ و خانەقایان لە مل بووە، زۆر زۆر بوون؛ بەڵام ئەو ڕۆژانە کە من خانەقام ناسی ئەو جۆرە تەرکە دنیایانە کەم ببوون و وەک ڕەچەڵاکی فیلی ماموت لە دوا بڕاندا بوون.

دەڵێن جارێک شکاکێک کە هاتووە و سۆفی ڕەبەنی خانەقای دیتوون، تووشی دێرێکی مەسیحیان بووە کە پڕ لە کیژی خۆ دە قەبەڵ خودا کردووی بێ مێردە، کە توێشتیری عیسا پێغەمبەریان پێ دەڵێن. چۆتە بەر دەرکی دێر و گوتوویە: «هێندێک نێری محەممەد پێغەمبەر

له خانەقا هەن، با ئەو تویێشتیرانه خۆ لەوان چا بکەن!».

«عەزیزی ڕابیه شەل» دز بوو، بەر له نوێژی شێوان نزیکەی سەعاتێک دەخەوت. دەیگوت کەمێک خەوی پاش ڕۆژاوا خەوی شەوم دەپەڕێنێ و تا بەیانی خەوم نایه و بۆ دزیەکەم بە کارە. زۆرم لەو قسه بەهرە وەرگرت؛ که نووسینی شەوم هەبا ئەو کارەم دەکرد.

شێخ محەممەد، ناوێکی فەرعی بۆ هەموو کەس دەدیتەوە. بە منی دەگوت «جووجەڵە»، مەلا حەمەدەمین ناوێکی ناو نابوو «فەریکه کەر». سەر زەلامێکی لووت گرۆیّ بوو. گاڵتەی خەڵکی خانەقا له سەر ئەو بوو. خۆی دەیگوت: «خودا خەڵکی دروست کردووه که ماندوو ببن، هێندێکی هەر بۆیه دروست کردوون ماندووەکان بحەسێننەوە و پێیان پێ‌بکەنن!». زۆر چیرۆکی سەیری هەن؛ خەونێکی گێڕاوه که پێغەمبەر هاتۆته خەونی فەرموویە: «مەلا تا ماوی دە حاڵی حەیاتدا بە»!

ئەوانەی له بیرم ماون: مام جەعفەر و محەممەدیار (تورکی کوێرە سوننی)! مەلا ڕەسووی سوڵتانی، مەلا حوسێنی کاکی مەلازادە، حاجی مام حوسێنی مەنگوڕ، کاکی شێخەلی، شێخی شامی، سەید ڕەشیدی شاعیر و زانای بەناوبانگ و چەند کەسێکی‌تری وا بوون. قەلەوقووتە و تەنبەڵ و تەوەزەلی نان‌خۆری بۆرەپیاگیش هەتا بێژی فریه بوون؛ که نان و دۆی خانەقایان دەخوارد و قاچیان بە دیوار هەڵدەپەسارد و بێکار ڕایاندەبوارد. بە قەولی مام هێمن: «خانەقا وەک کەشتی نووح وا بوو، هەرچی بتویستا تێیدا بوو».

شێخی شامی، ناوی مەلا مستەفا سابڵاغی بوو؛ تەرکە دنیا لە حوجرەیەکا دەژیا. لەوەتا مەهدی‌نامەی «ابن‌الحاج»ی خوێندبۆوە حەزی دەکرد چاوی بە محەممەدی مەهدی بکەوێ. ڕۆژێک لاوێکی ئەسمەری لووسی چاوگەورە که خاڵێکی له سەر ڕوومەتە، دەعوەتی دەکا بۆ حوجرە. لاو دەڵێ: من سەیدم و ناوم محەممەدە. تا مەلا دەچێتە دەسنوێژ گرتن و دێتەوە، هەتیو نەماوە. پەل دەبێ و پرسیار دەکا دەڵێن نەماندیوە. خەیاڵ دەکا که ئەم کوڕە لووسە یەقین محەممەدی مەهدی بووە. دیارە له شام زهوور دەکا؛ با بچمه پێ و شوێنیەوە.کەل-پەلی هەڕاج کرد و ڕۆیشت. پاش دوو مانگ هاتەوە، گوتی: چووم تا سولەیمانی، لەوێوە گەیمە کەرکووک و مخارجیم نەما، بوومە میوانی خانەقای سەید ئەحمەد. لە جوابی «لە چی دەگەڕێی» سەیددا گوتم: دەچمە شام بۆ دیتنی مەهدی. سەید گوتی: وا دیارە زۆر ساویلکەی، تۆ پەساپۆرتی عیراق و سووریات نییە، دەتگرن، پارەشت نییە. ناچار پەشیمانی کردمەوە. پارەی سەفەری دامێ؛ هاتوومەوە. لەو ساوە شێخ محەممەد ناوی لێ نا «شێخی شامی».

خوا بتحەسێنێتەوە، خانەقا ئەو تەمبەڵ بازاڕە بوو که هەموو منداڵێک لە خوای دەوێ. منداڵانی ماڵی شێخ جگه له بەدفەڕی و تووشی، فێری هیچ نەکرابوون. کاریان هەر دزی باغ و شەڕ و کێشه بە مەردم فرۆشتن و زیانی گەللایی بوو.

له خانەقا دەگەڵ هاوتەمەنێکی خۆمدا بوومە ئاشنا؛ ناوی «حەمەدەمینی شێخولئیسلام» و پوورزای منداله شێخەکان بوو. ئەویش دەبوایه بۆ بەرەکەت دەرس لای مامۆستا مەلا سەعید بخوێنێ و له ماڵی شێخ بژی. نازانم ئەو زیرەک‌تر بوو یا من! بەڵام ئەوەندە دەزانم له دەبەنگی و هیچ فێرنەبووندا، درۆزنیش فەرقی نەدەکردین. هەر دووکمان وەک یەک دارکاری دەکراین و بە قەد یەک بەر جنێو دەدراین. تەنیا فەرقێکمان که هەبوو، ئەو بۆ نەگبەتی، شیعری دەگوت و خۆی له من بە هونەرمەندتر دەزانی. بەڵام شیعری چۆن؟ یا خوا بە نسیبی دوژمنانت بێ! من له

بەغیلیان گاڵتەم بە شیعرەکانی دەکرد. ئاخری هەر وازی نەهێنا و لە دوارۆژدا بوو بە شاعیرێکی هەرەبەرز و بە ناوی «هێمن» ناوبانگی کرد.کاری هەرەگرینگمان ڕاوەدووپشک، دزی باغان، مریشک دزین لە ماڵە شێخان و هەزار بەدفەڕی و کاری ناڵەباری دیکە بوو.

جارێکیان کە بۆ سەردان هاتبوومەوە ماڵ، مەلایەکی جحێڵ میوانمان بوو؛ لە ترسی سەربازی لە لای ئێمە خۆی شاردبۆوە. بابم بە هۆی دۆستانی، حەولی بۆ دا پێناسەکەیان بۆ گۆڕی و لە سەربازی خۆی دزیەوە. لە بەرامبەر ئەو چاکەیەدا بە بابمی گوت عەبدوڕەحمان بدە دەست من پێی بخوێنم. ئەو بۆ خۆشی -کە ناوی «سەید محەممەد» بوو- موستەعید بوو؛ دەرسی لای مەلای گەورە دەخوێند. دەگەڵ ئەو چوومە پەسوێ؛ کە بنکەی قەرەنیاغای مامەش بوو. مەدرەسەی فەقێیانی لێ بوو. قەرەنیاغا ئاشنای نزیکی باوکم بوو. کە بیستبووی منیان هێناوەتە گوندی ئەو، فەرمانی دا کە شەوانە لە قەڵایە بم و بە ڕۆژ لە ناو فەقێ. ئەو زستانە -هەر چەندە زۆرم لەبەر گران بوو- دەگەڵ کوڕانی ماڵی ئاغای ژیام و دەبوو بە پێی ڕێ و شوێنی ماڵی ئاغا بېزوومەوە.

قەرەنیاغا بە ڕاستی شتێکی سەیر بوو. کۆنەپیاوێکی زۆر شەڕوشوڕ دیتووی هەڵکەوتە و بە دەردی کورد گوتەنی «گورگی باران دیتوو» بوو. ئاغایەکی زۆر بەهەیبەت و بەسام بوو. زۆر کەمدوێن بوو. ئێواران کە دەهاتەوە دیوەخان، لە لای سەروو ڕۆدەنیشت، تا شەو شەق دەبوو -وەک هەیکەلی بوودا- متەقی لێدەرنەدەهات. تەزبیحەکەی هەڵدەسووڕاند و لە بن لێوانەوە دەگەڵ خۆی دەدوا و جارجارە پێدەکەنی و جاری وا بوو ڕووی گرژ دەکرد. وا دیار بوو کاوێژی تەمەنی پڕ لە هەوراز و نشێوی خۆی دەکردەوە. بەڵام ئێمەی بەدبەخت چی؟ دوو کوڕی و دوو نەوەی و من، بە گوێرەی تەمەن لە سووچێکی خواروی ئۆدە بە ڕیز لە سەر چۆک دادەنیشتین. من دەکەوتمە ناوەڕاست. هەر کەس ورتەی لەبەر بهاتایە، لێدان و تێهەڵدانی نۆکەران ئامادە بوو. منداڵ وەرە و خۆت ڕاگرە! پتر لە شەش سەعات لە سەر چۆک مەجووڵێ، ورتەت نەیە، وەڕەزیش مەبە، ڕێگەی چوونە دەرەوەش نەبێ. ناچار بووم بۆ خۆم بەزمێکم ساز دەکرد. هەر کە ئاغا چاوی لێ خافڵ دەکردین، ئاوڕم لە منداڵان دەداوە و زمانم دەردێنا و لێچم لێ خوار دەرکردنەوە. لە پرمەی پێکەنینیان دەدا. دەستبەجێ ئاغا بانگی دەکرد: «وەرن بیانبەن!» هەر یەکەی لە پاشخانەی دیوەخان بەر شەق و زللەی نۆکەران دەدران و دەبوو بە گریان و هاوار و دەهاتنەوە شوێنەکەی خۆیان. ئاغا دەیفەرموو: هەی بێحەیاینە! ئەنگۆ هیچ نەبێ چاو لە کوڕی حاجی مەلا کەن چەند بە شەرم و عەدەبە! خۆ زاتی ئەوەشیان نەبوو بڵێن تاوان لە بن سەری ئەو دایە.

ڕۆژێک کە بەفر بوایە، زەلامێک هەبوو بە ناوی «کوزەر». دەبوایە لە سەر قەلاندۆشم دانێ و بمباتە حوجرە و ئێواران بمهێنێتەوە.

پاش ماوەیەک لەو ژیانی ئاغایەتییەش ڕزگارم بوو. هەر لە حوجرە بە سووختەیی دەژیام و دەرسم لای مەلا سەید محەممەد دەخوێند. مامۆستاکەم -کە لە سایەی پێناس گۆڕینەوە، سێ نازناوی «داشاغلوجی» و «ڕەببانی» و «حەمیدی» هەبوو- کابرایەکی ڕۆشنبیری خەڵکی زەمانی خۆی بوو. هات ئەزموومی، دیتی هیچ فێر نەکراوم؛ هەر وەک تووتی شتم لە بەر کردووە و مانای نازانم. گوتی تۆ دەبێ لە سەرڕا دەست پێ بکەی. کتێبی ڕێزمانی عارەبی تازە بابەتی میسری پێ دەخوێندم. بە زۆری زۆرداریش قەسایدی کۆنی عارەبی پێ لەبەر دەکردم. کە لەوانە ئەوی

لە بیرم ماوە، قەسیدەی «ئەمریئولقەیس» لە «سەبعەی موعەللەقە» و «لامیەتولعەجەم طوغرائی» بوو. بۆ خۆشی زۆری لە شیعرەکانی نالی لەبەر کردبوو. عاشقی «سەید جەمالەدینی ئەفغانی» بوو. دنیایەکی دەربارەی ئەو کۆ کردبۆوە و ڕێکی کردبوو.

«لە پاش سالێ، سلامالێ»، من تازە کەم-کەمە تامێکم لە خوێندن دەکرد. لەو سەردەمانەشدا وەک دەڵێن خەریکی خۆناسین و بۆربوون بووم، دلم چووبووە سەر کیژێک کە عەرز و عاسمانی لە بیر بردبوومەوە. دەڵێن عیشقی ئەفلاتوونی درۆیە؛ بەلام باوەڕ دەکەی یان ناکەی، بە هیچ جۆرێک ئارەزووی جنسیم دەگەڵ ئەو کیژە نەبوو. هەر پێم خۆش بوو بیبینم و هیچیتر. قەت لە بیرم نەدەچوو؛ گڕی چرام دەدی، گوێم لە دەنگی خۆش دەبوو، چاوم دەبڕیە ئەستێرەی عاسمان، مانگ، دەسبەجێ دیداری ئەوم دەهاتەوە بەرچاو. ئاخم هەڵدەکێشا و فرمێسکم دادەباری. قەت ورەی ئەوەشم نەبوو پێی بێژم تۆم خۆش دەوێ؛ چونکە ئەو زۆر نازدار و کۆک و پۆشتە و بابی دەوڵەمەند و من فەقیر بووم. ئەگەرچی بە ڕواڵەتیش زۆر دۆست بووین و زۆرم لە مالی ئەوان ڕادەبوارد، بەلام هیچم نەدرکاند. خولاسە عیشقی پاک و خاوێنم بەسەردا هات و ڕابرد و پاش چەند سال ئەم ئاگرە دامرد و کوژایەوە.

جارێکیتر هاتمەوە و سیپالم لە خانەقا بە زەویدا دا. بەلام ئەمجار شێخ محەممەد بۆ خۆی دەرسی ئوسووڵ و هێندێک شەرعی شافعی پێ گوتم. دەگەڵ فەقێیەکدا -بە ناوی ئەسعەد- هەر لە حوجرە تەنگەبەرە کونەگورینەکەدا بووین.

ئەسعەدی هەوالم شەڕێکی کردبوو؛ دەریان دەکرد. منیش بە ناوی هەوالەتی ئەو گوتم دەگەلی دەڕۆم. شەوێکی درەنگ بوخچەمان بە سەر گۆچانەوە کرد و چووینە گوندێک بە ناوی «ئیساکەند»؛ ڕاست چووینە حوجرەی فەقێیان، کە لامان وابوو ئاوەدانە؛ بەلام چۆل و هۆل و تەنانەت حەسیرێکیشی تێدا نەبوو. حوجرە تاریک و ڕایەخ خۆل و هەردووکمانیش برسیمانە. دەی چ بکەین؟ گوتم من دەچم نان سوال دەکەم. وە ناو دێ کەوتم. شەو زۆر درەنگە؛ هەموو مال نوستوون. لە دەرکی هەر کەس بدەم لەوانەیە تووڕە بێ. لە دوای گەڕەکە مالێک، حەوشێکی زلم دیت. ویستم بە سپایی درگا چەپەرەکەی بکەمەوە و لە نزیکەوە بانگی نوستووەکان بکەم، کابرایەک دەنگی دام: «کێی؟» بۆم گێڕاوە کە کێم و چیم دەوێ. گوتی: دە بڕۆرەوە حوجرە، ئێستا دێم. هێندەی پێ نەچوو کابرا کە خۆی زەلامێک بوو دەگەڵ یەکێتردا نقەیان دەهات. حەسیر و بەڕە و نان و شیرێژ و سەماوەر بە دامو دەزگاوە و چرایان هێنابوو. کابرای خانەخوێ گوتی: شەرتم دەگەڵ بکەن تا ئێوە لەم گوندە بن نەچنە نان چنینەوەی مالان و من بە برای خۆتان بزانن. ئەرێ فەقێ ئێوە گۆرانیتان پێ خۆشە؟ من ناوم «کەریمە کوێری گۆرانی بێژە». هەر وای گوت و ملی لێ نا، ئەوی دەیگوت نەیدەگوتەوە. وەک دەڵێن ئێستاش بە سەری پیری، خۆشی ئەو شەوە و دەنگی کەریمە کوێرم هەر لە بنی ددانان دایە. لەوێ دامەزراین. ڕاستت دەوێ دەرسی مەلا بۆ ئەوە نەدەبوو پیاوی لە بەر بحەسێتەوە؛ پاش ماوەیەک وەڕەز بووین؛ بڕیارمان دا بڕۆین.

ئەوەم لە بیر چوو کە بەر لەوە لە خانەقا دەگەڵ ئەسعەد ببمە هەوال، هەر لە خانەقاوە ڕۆیشتم بۆ ناو مەنگوڕان، لە لای «مەلا ڕەسووی کەرمنداری» بوومە فەقێ؛ کە چوار فەقێیتریشی هەبوون. بەهار بوو، مەنگوڕ لە کوێستان بوون. ئێمەش کەپرێکمان کردبوو نزیک بە هۆبە دەژیاین. هەڕەمەی لاوەتیم بوو. دنیایەکی ئازاد و هەوایەکی خۆش و جوانی و لەباری

کیژە مەنگوڕان گاڵەی دەکرد. مەستی لاوەتی بووم و عەقڵ و خوێندن لە حەوت کێوان ئاوا بوون.

ویستم لە کەرمندارەوە بچمەوە ماڵ. سۆفی عەلی ناوێک بارگینێکی جلکراوی دامێ کە بە پێ نەڕۆم. لەوسەر کە دەگەڕامەوە، لە کوێستانی «کیفاراوێ»، سەیدێکی خڕکەڵە، هەموو گیان فیشەک و دەمانچە و تفەنگ، لەکەندالی کانییەک دەرکەوت و هەرای کرد: «فەقێ ئاگرت پێیە؟»، سیغارێکی بە دەستەوە بوو. زۆر ترسام، هەڵمکوتا غار و سەربەرەژێر هەڵاتم. تفەنگێکی بە سەر هەڵتەقاندم؛ بەڵام دەرچووم.

لە ڕەشماڵی مام حەسەنی ئافان بووم. پاش نوێژی شەوان، مەلای دێ -کە ناوی مەلا ڕەحمان بوو- هات گوتی: سەیدێکی چەکدار داوای ئاگری لێکردم، جلەوی گرتم ماینی لێ ساندم. هەر ئەو شەوەش چەند گاجووت لە«قۆزلوێ» دزرابوون. دیار بوو من چاکم خەلاس بووە. ڕۆژی دواتر لە گەدەی کوێستانی مەنگوڕان چەند کەسێکم دی کە لە سەر کانیەکی چایان لێنابوو؛ چەکدار بوون. زانیم چەتەن؛ بەڵام ڕێگەی هەڵاتن نەبوو. سەلامم کرد و چووم لایان دانیشتم؛ نان و چام دەگەڵ خواردن. زانیان فەقێم و ماین ئەمانەتییە. گوتم: برا جومعانە نادەن بە فەقێ؟ یەکیان گوتی: ئێمە دەبینی چەتەین؛ ڕووتت ناکەین مەمنوون بە! دیسان دوو قڕانیەکی زێویان دامێ کە دام بە گیسکێک بۆ حوجرە.

لەو سەردەمانەدا، واتا لە هاوینی ئەو ساڵە (١٣١٥ی هەتاوی)دا گوتیان سێڵاو هاتووە و شاری سابڵاغی بە جارێک وێران کردووە. شەویش خەونم دیت ددانەکانم کەوتوون. کەوتمە نیگەرانی دەبێ باوکم چی بە سەر هاتبێ. بە هەڵەداوان هاتمەوە شاری سابلاغ. بە ڕاستی بەڵایەکی گەورەی بە سەر هاتبوو. مەلا مارفی کۆکی بە قەسیدەیەک زۆر پڕ بە پێست باسی کردووە، دەویدا دەڵێ:

لە تاریخی هەزار و سێسەد و سێ، پەنجی شەمسیدا
بە ڕۆژی جومعە دوازدەی جیمی یەک، نۆی ماهی موردادا

یانێ من تەمەنم پازدە ساڵ بوو. دوو خانوومان هەبوون سێڵاو بردبوونی و سێ کەسی فەقیریان تێدا خنکابوو. بابم کە لە یەکێکیاندا خەریکی قورعان خوێندن دەبێ. سێڵاو هێرش دەکا بە سەریاندا. خۆی خەلاس دەکا و قورعان ئاو دەیبا. جومعە بووە و زۆربەی خەڵکی شار لە باغاتی خوارووی شار سەیران دەکەن؛ دەست دەکەن بە گرتنەوەی سروسیپالی ئاوماڵک. یەکێک قورعانەکەی بۆ بابم هێنابۆوە.

پێویستە ئەوەش بڵێم: بابم لە دەوڵەمەندی کەوتبوو؛ قەرزداری خەڵک بوو. دوکانێکی چیتفرۆشی لە قەیسەری سابلاغدا هەبوو. هەمیشە هەر خەریکی خوێندنەوەی کتێبی دینی و تاریخ بوو. لای وابوو قازانجی گەزە چیتێک لە دوو شایی پتر بێ حەرامە. سەودای دەگەڵ ژنان نەدەکرد. تەواو دابوویە باری کزی. چاویشی کز ببوو. لە ترسی کڵاو لەسەرنانی پەهلەوی چەند مانگێک ماڵی بەجێ هێشت و لە خانەقا دەژیا. ئاخری ناچار لە شار بارمان کرد و چووینە گوندی «تەرەغە» لە نزیک بۆکان کە دوو دانگمان هەبوو؛ بریتی بوو لە چوار جێ جووتی دێمەکار و کەمئاو کە بەهرەی ئەوەندە نەدەدا پێی بژین. دوو خانووشمان لە شار هەبوو؛ زۆر فەقیرانە و قوڕین؛ کرێیان زۆر کەم بوو. جا لە سێڵاوەکەدا ماڵمان لە گوند بوو؛ باوکم بۆ سەردان هاتبووە شار.

دوای ئەو سەردانەی باوکم، چوومە «کەرمندار». پاش ماوەیەک چوومە تورجان و لە وێڕا هاتمە سابلاغ. لە مزگەوتی بازاڕ بوومە فەقێ لە لای «مامۆستا مەلا حوسێنی مەجدی» زانای مەشهوور. جگە لە دەرسی سەرف و نەحو، قەسیدەی «بانەت سوعاد»ی «کەعب ئیبن زوهەیر» و «لامیەتولعەرەب»ی «ئیبنولوەردی»م لای خوێند و لە بەرم کردن. لە هەمان کاتدا مەلا سەید محەممەدی مامۆستای پێشووم و یەکێک لە ماڵە شێخەکانی بیارە بە ناوی شێخ مەعسووم لە مزگەوتی بازاڕ، لای مەلا حوسێنیان دەخوێند و من لای هەردووکیانم دەخوێند؛ کە شێخ زۆر نەزان و سەید محەممەد زۆر زانا بوو.

شێخ کوڕە جحێڵێکی ئامۆزای خۆی لەگەڵ بوو بە ناوی شێخ نەسرەدین -کە بەڕواڵەت دیندار و شەرمێون بوو- ببوە فەقێ لای شێخ مەعسووم. ئەو نەسرەدینە کوڕی شێخ کامیل بوو کە لە وڵاتی «تالش» ببوە شێخێکی سەر بەڕماڵی زۆر ممبارک -کە لە دواییدا باسیان دەکەمەوە چ بوون.

دیسان چوومەوە خانەقا. لەم جارەی دواییمدا دەگەڵ کچێکی شێخ محەممەد -کە ناوی فاتم بوو- دڵمان لێک چووبوو. براکانی ڕازی نەبوون خوشکیان بدەن بە بەچکە مەلایەکی کە نە ئاغایەکی دەوڵەمەندە و نە کوڕی بازرگانی شارە؛ تا لێی میوان بن و بەهرەیەکیان پێ بگا. بابیشم کە ئەوەی بیستبوو، تەواو تووڕە ببوو: «من هەر ئاواتم ئەوەیە کوڕی من ببێتە مەلا و بە کەوای شۆڕەوە ببینم کە دوو فەقێی لە دواوە دەڕۆن. ئەگەر کوڕی منە دەبێ لە خانەقا نەمێنێ و لە خزمەت شێخدا تووشی شەرمەزاریم نەکا...».

ئەو هەموو لا لێ گیرانە و دەرەتان نەمانە، زۆری کار لێ کردم و خەم و پەژارە دایگرتم. جا کە دەگەڵ ئەسعەد ڕۆیشتم، دوو نیشانەم بە تیرێک ئەنگاوت: یەکێ ڕازی بوونی بابم و دوور کەوتنەوە لە یارێک کە بە هیچ بارێکدا دەستم پێ ڕاناگا و دووهەم هەواڵەتی برادەرەکەم. دەگەڵ ئەسعەد لە ئیساکەندەوە چووینە وشتەپەی خوار بۆکان، کە «مەلا حەمەدەمینی حاجی مەلای تورجانی» دەرسبێژی ئەوێ بوو.

ئەوساکە لە هەر کوێ ئەمنیەی دەوڵەت تووشی کەسێک بان جلی کوردی با، جلیان دەسووتاند و پوولیان لێ دەستاند. فەقێ لە ترسان هەر بە شەو سەفەریان دەکرد. لای بەرەبەیان گەیشتینە وشتەپە؛ کە سێ فەقێی تری لێ هەبوون. چێشتەنگاو مامۆستامان دیت و داوای دامەزرانمان کرد. گوتی: ئەسعەد کە برازامە با لێرە بێ و ئەو فەقێیەم - مەبەستی من بوو- ناوێ؛ با بڕوا. زۆرم دڵ بە خۆم سووتا. مامۆستا گوتی: بەڵام ئەمشەو میوانی من بە و سبەی بڕۆ!

شەو لە ماڵی مامۆستا -کە نانمان خوارد- باس هاتە سەر لەغەز و موعەمما. لێرەدا باو باوی من بوو. لە موعەمما حەل کردندا لە هەواڵانم چێتر بووم. بەیانی مامۆستا فەرمووی: تۆش هەر بمێنەوە. تۆ بە تەرح و دیدار زۆر گێژ و نازیرەک هاتیە بەر چاوم؛ بەڵام وادیارە وەک دیار دەکەی وا نیت!

لای ئەو دەستم کرد بە «شەرحی سیووتی» لە سەر «ئەلفییەی ئیبنومالک»؛ کە ڕێزمانی عارەبییە. دەرسی ئەدەبیاتی فارسی و حیساب و ئینشایشی فێر دەکردم. ئەوەندەش نێوانمان خۆش بوو کە هەر نەبێتەوە. بە ڕاستی قەت تووشی مودەڕیسی ئەوەندە ڕووحسووک و بێدەعیە نەبووم. فەقێ لە هەموو جێیان حەزیان لە چارەی مامۆستای گەورە نەدەهات؛ حەزیان دەکرد

جگە لە وەختی دەرس، چاویان پێی نەکەوێ و بە ئازادی گەپ و گاڵتەی خۆیان بکەن؛ بەڵام ئەو مامۆستایە هەواڵی گاڵتە و گەپیشمان بوو. خۆی لە ئێمە بە زیاتر نەدەزانی. تەنانەت لە شەڕەشەق و زرمە زلیتانەی دەرەوەی حوجرەشدا بەشداری دەکردین. خواخوامان بوو شەوانی سێشەمە و جومعە لە ناوماندا بێ و لە گەپ و گاڵتەدا یاریمان بکا.

تەنبەڵی لە خوێندندا کراسێک بوو بە بەژنم برابوو. سەر لە هەوەڵەوە، بە منداڵی چۆن بووم بە موو لام نەدابوو؛ بەلام بیرم زۆر تیژ بوو. هەر چیم بیستبایە دەس بەجێ لە بەرم دەکرد. سەد بەیتم لە ئەلفییە خوێندبوو، قەت سەرم نەدابۆوە. ڕۆژێک مامۆستا گوتی: بۆم بخوێنەوە بزانم لەبەرتن؟ گوتم: ئێوارە بۆت دەخوێنمەوە. گوتی: دەزانم هەر ئەمڕۆ لەبەرت کردوون، بە ڕاستی لە تۆ تەنبەڵتر و بەزەیینترم نەدیوە!

مامۆستا لە نوێژ و تەلقینی مردوو زۆر بێزار بوو؛ منی دەنارد کە ئەو کارە لە جیاتیان بکەم. منیش لەو بێزارتر بووم. ڕۆژێک مردووێک مردبوو؛ ڕامکرد لەوبەری بەندی وشتەپە، لە ناو دارانـدا ملم لە دەور کردنەوە نا. دیتم مامۆستا چاو دەگێڕێ؛ دیتمیەوە. گوتی: ڕووڕەش! دەزانم لە نوێژ و تەلقین خۆت دزیوەتەوە. برۆ ئەو مردووە سەگبابەم لە کۆڵ کەوە! ناچار چوومە قەبرستان؛ کابرایەکی لووتزەلامی خوێنتاڵ لەوێ قاقەزێکی بە دەستەوە.

- قوربان! ئەمە چییە؟

- کوڕم! ئەمە تەلقینە. (مەلا دیار نەبوو) منیش مەلام، نوێژ لە مردوو دەکەم و تەلقین دەخوێنم.

تەلقینەکە نووسرابوو: «یا عبدَالله». گوتم: ئەوە چییە؟ کە دالەکە هەم سەری هەیە، هەم ژێر؟

- ها، ئەوە تۆ نایزانی. ئەگەر مردوو پیاو بێ، دەڵێم: «یا عبدَالله»، ئەگەر ژن بێ دەڵێم: «یا عبدِالله»!

هاتمەوە گوتم: مامۆستا مزگێنیم دەیە! مەلایەک لە دێدا هەیە بە قولەقاپەشی ڕاناگەی! نەجاتمان بوو! بۆم گێڕاوە؛ زۆری کەیف پێ هات!

زستانی وشتەپە زۆر سارد بوو؛ ئێمەش داری سووتانمان بۆ کوورە نەبوو. هاوارمان بۆ مامۆستا برد. گوتی: دار بە من پەیدا نابێ؛ خۆتان عیلاجی خۆتان بکەن. گوتمان مەگەر بدزین. گوتی: بدزن! چی تێدایە؟ فتوامان وەرگرت و ملمان لە داردزین نا. دوو سووختەمان هەبوون بە ناوی سەید حەسەن و قادر؛ هەر کە ئێواران دەچوونە نان چنینەوە، داری ماڵانیان هەڵدەنا و شەوانە دەچوون، یەکیان سەگی بە خۆیەوە خەریک دەکرد و ئەوی‌تریان داری دەدزی. داردزین گەیشتە ڕادەیەک نیر و ئامور و پنە و تیرۆکیش دەدزران و دەسووتێنران. ڕۆژانە لە مزگەوت باس هەر باسی داردزین بوو. هەموو خەڵکی دێ ئێمانیان وا بوو کە جندۆکە ئەو کارە دەکەن. دوعایان بە مەلا دەنووسی کە گێچەڵی جندۆکەیان لێ دوور خاتەوە.

ماڵە عەلیاغای ئێلخانی و هەموو ماڵە ئێلخانی، مریدی زۆر دڵگەرمی شێخ حیسامەدینی تەوێڵە بوون. یەک لە خەلیفەکانی تەوێڵە بە ناوی خەلیفە محەممەد - بۆ بەرەکەت - لەو دێیە دەژیا. خوا هەڵناگرێ هەموو دنیا بگەڕێی دوانی وا خوێنتاڵ و مرومۆچ و خۆبەزلزانت دەس ناکەوێ. بە ڕاستی لە شەیتانمان ناخۆشتر دەویست. ئێوارەیەک کە سەید حەسەن لە نان چنینەوە هاتەوە گوتی: کوڕینە! کاریتەیەک بە سەر دیواری ژوورێکی سەردانەپۆشراوی خەلیفە

ڕایەڵ کراوە، بەشی ئەم زستانەمان دەکا؛ بەڵام هێنانی کاری کەسێک و دوان نییە. شەو ماڵ نوستنان هەر شەشمان چووین و کاریتەکەمان بە نقەنق کێشایە حوجرە و سەماوەری تەنەکەمان جۆش دا و بە بیور وەرگەڕاینە کاریتەبڕ و تا مەلابانگدان هەموومان کردە قەلاشکەری سۆپە و لە حوجرەیەکی چۆلی تەنیشتمانەوە لە سەر یەکمان کەڵەکە کرد. حوجرە لە سەر ڕێگەی مزگەوت بوو. تازە دەمانویست بخەوین، خەلیفە لە مزگەوت هاتە دەر و دوو سۆفی دەگەڵ، ڕاست ڕوو بە حوجرە هات. یەکێکمان کە مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عەلی حەمامیان و برازای مامۆستا بوو گوتی: ئێوە خۆتان دە خەو کەن، خەلیفە بە کاریتە دزینەکەی زانیوە؛ لێمان تووڕەیە. تەنیا من بە نەرمی و زمانی خۆش جوابی دەدەمەوە. بەڵکو دەس هەڵگرێ و شکاتمان لێ نەکا.

خەلیفە بەر لە هەر شت چووە حوجرە چۆڵەکە و دەستی کرد بە تەق و هۆڕی دار بە سەریەکداندا. ئەوسا هاتە ژوورەوە و گوتی:

- فەقێ! ئێوە خۆتان بە موسڵمان و خزمەتکاری قورعان دەزانن؛ عەیب ناکەن دزی دار دەکەن؟

مەلا محەممەد -کە نسحەتی ئێمەی کردبوو- سەری لە بن لێفە هەڵێنا و بێ سێ و دوو گوڕاندی:

- هەی ڕیش کلکەسەگی سەگباب! وات لێ هاتووە قسەی سووک بە فەقێ بڵێی؟ هەستم هەزار شەقت تێهەڵدەم؟!

خەلیفە دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو. «ماڵ بریا و بە کۆی زوخاڵ بێ». هەر دەرپەڕی و سۆفی بە شوێنیدا پەل بوون و بە بۆڵەبۆڵ بەرەو ماڵی ئاغا ڕۆیشتن. بەختی ئێمە مامۆستا لە حەوشە دەسنوێژ دەشوا و پرتەوبۆڵەی خەلیفە دەبیسێ.

- ها خەلیفە گیان! خێرە؟

- بەڵێ فەقێکانت کاریتەیێکیان لێ دزیوم کە بە کوڕێکم نەدەدا. سەرباریش ئەوی خراپە پێیان کردووم. دەچمە لای عەلیاغا، ئەگەر حورمەتی شێخی تەوێڵەی لە لا بێ، دەبێ ئەوانەم بۆ تەنبێ کا.

مامۆستا بە زمانی خۆش خەلیفە خاو دەکاتەوە کە خۆی تۆڵەی بۆ دەستێنێ. مامۆستا بە خەلیفەوە هاتنە سەرمان. دەمی کردەوە و چاوی قوچاند، هەزار جنێوی دا:

- ڕوو ڕەشینە! چۆن فەقێ دزی دەکا؟ ئەویش لە پیاوێکی وا ممبارەک!

سەری خۆمان داخست و ملمان حیز کرد؛ متەقمان لە بەر نەهاتە دەر. جوێن و هەڕەشەی مامۆستا -کە بەم زستانە دەرتان دەکەم- گەیشتە ڕادەیەک کە خەلیفە گوتی: قوربان! من گەردنیان ئازا دەکەم؛ تۆش بیانبەخشە. خەلیفە ڕۆیشت؛ بەلام مامۆستا لە جنێودان و لۆمە کردن دەستی هەڵنەدەگرت. گوتم: قوربان! خۆت فەرمووت دار بدزن قەیدێ ناکا. لەپڕ لە قاقای پێکەنینی دا، گوتی: ئەگەر وا بێ جندۆکەکەی دارەدزیش هەر ئێوە بوون! خوا بتانگرێ، پنە و نیر و ئامووریشتان دزیوە؟ ئەمما وەڵلاهی کاری چاکتان هەر ئەوە بووە کە داغتان بە دڵی ئەو خەلیفە سەگبابەوە ناوە. دا سۆپەی لێ نێڵ دەن با خۆم گەرم کەمەوە!

ئیتر بۆ خەڵکی ئاواییش ساغ بۆوە کە جندۆکەی داردز لە حوجرەی فەقێیانەوە سەری هەڵداوە.



شەوێک لە هاویندا دوو میوانی مامۆستا هەبوون، یەکیان مەلا عەلی حەمامیان و مەلایەکی‌تریش بە ناوی مەلا ئەحمەدی سەممەیی. لە بەر هەیوانی مزگەوت کۆڕمان بەستبوو. مەلا عەلی باسی نوشتە و ویفقی دەکرد کە زۆر بەکارن؛ مەلا ئەحمەد دەیگوت خرافات و درۆن. مەلا عەلی دەیگوت: من ویفقی چوار گۆشەی ناوبەتاڵ دەزانم، دەتوانم هەموو کارێکی پێ بکەم.

مەلا ئەحمەد گوتی: ئاخر مامۆستا گیان! من دوو ساڵ هەر دەرسی ویفقم لە خزمەت خوێند کە ئەو ویفقەشت فێر کردم. جارێک لە پاش لێکدانەوە و حیساب، ناوی مەلائیکەتێکی لێ دەرچوو: «بی موچە غی غی تا شازدە غیو لائیلاک»! ئاخر چۆن خوا لە ئێمە نازیرەک‌ترە کە ناومان نراوە: عەلی، ئەحمەد، بایز، سوارە؛ سووک و خۆش لە سەر زمان. خودا ناوی نەدیوەتەوە لە مەلائیکەتی خۆی بنێ، ئیللا وا درێژ؟!

دامانە پێکەنین و کێشە خەلاس بوو.

شەوێکی‌تر لەو شەوانە کە هەر خۆمانە بووین و لە هەیوانی مزگەوت ڕۆ نیشتبووین، باسی ویفق و نوشتە دامەزرایەوە. مامۆستا گوتی: دەڵێن لە هیندوستان دوعایەک دەزانن، کابرا هەموو کەس دەبینێ؛ کەس ئەو نابینێ؛ دیارە درۆیە.

گوتم: نەخێر ئەمە ڕاستە و دەیزانم! پێیان سەیر بوو.

- چۆنە؟ شانمان دە.

ئیشارەتێکم لە مامۆستا کرد. قادری سوختەی ناردەوە ماڵ کە قەند و چایی بێنێ و بەڵکو ئەو سیحرە ببینن. تا قادر هاتەوە تێمگەیاندن کە مرازم چییە. مامۆستا هەڵیپێچام کە دەی سیحرەکەت بکە! دەمگوت جندۆکەی کاربەدەستی ئەو سیحرە شەو لە خەودا دەمخنکێنن. هەموو تێکڕا داوای پێک‌هێنانیان دەکرد و قالە لە هەموان شێلگیرتر بوو؛ لە بەر مامۆستا دەپاڕاوە کە زۆریم لێ پکا و ئەو سیحرە ببینێ. ئاخری دوای خۆگرتنێکی زۆر گوتم: دەبێ منداڵێکی نابالغ بێ ئەو سیحرەی لێ بکەم. قالە بە سوێندانەوە ڕەش دەبۆوە کە من نابالغم؛ درۆشی دەکرد!

قاقەزێکم هێنا چەند چوار گۆشەیەکم لێ کێشا و پڕم کرد لە ژمارە و حرووفی عارەبی، وەک: «ط» و «ض» و «ص» و ئەمانە. قالەم بردە ژووری مزگەوت، پارچێکم لە قاقەزەکە دڕی و خستمە باخەڵی و پێم گوت: من و کەسی‌تریش تۆ نابینن. بەڵام ئەگەر دەنگت بێ دەزانین لە کوێی. ئەگەر ئەم پارچەی لای خۆم بسووتێنم، تۆ وەک خۆت لێدیتەوە و دیێەوە بەرچاو.

قالە هاتەوە ناو کۆڕ؛ کەس ئاوڕی لێ نەداوە و لە منیان دەپرسی: چی لێهات؟ بۆ کوێت نارد؟ فێڵمان لێ مەکە! قالە بۆ ئەزموونی تەواو کلاوی بە دەمەوە گرت و چووە بەردەمی مامۆستا، هەڵتروشکا و گاڵتەی پێ دەکرد!

گوتم: ناتوانین بە چاو ببینین؛ با بە پەلەکوتێ و لاق هاویشتن حەول بدەین؛ بەڵکو دەنگی لێ دەرچێ. هەموو ڕاست بووینەوە. قالە لە ناوماندا چەقیوە. شەق دە سەرینێک هەڵدەدەین، پەل بەرەو دیوار دەکوتین و بە هەموو هێزی خۆمان شەقێک دە قالە هەڵدەدەین؛ هەر قنگیش ناسوورێنێ! ڕەنگە پتر لە سەعاتێک بەر شەقمان دا. ئەو هەر دەمی لێ خوار دەکردینەوە و لای وا بوو نایبینین. هەستمان کرد کابرایەکی گوندی بەوێدا دێت. پارچە دڕاوەکەی سیحرەکەم خستە ناو ئاگردانی سەماوەر؛ دووکەڵی هات و گوتم: ئەوەتا قالە وەک خۆی لێ هاتەوە!

ئیتر ئەو هاوینە گەمەی هەرە خۆشمان غەیب کردن و تێهەڵدانی قالە بوو کە هەموو جار

خۆی دەپاڕاوە غەیبی بکەین و حەڵوای بە شەقانی بۆ بگێڕین! تەنانەت ڕۆژێک هەموومان لە بەندی وشتەپە مەلەمان دەکرد، قالەم غەیب کرد. چونکە شڵپەی لە ئاودا دەهات، لە سەر یەک تێمان هەڵدەدا تا وای لێهات دەگریا و دەیگوت:

- مامۆستا بۆ خاتری خودا بە مەلا ڕەحمان بڵێ وەک خۆم لێ بکاتەوە؛ قوونگم دێشێ!

- هەیهوو کوڕە خۆ ئەوە دەنگی خۆیەتی! دەیسا تێیهەڵدەن!

ئەو دەنگ و باسی غەیب بوونە هەر لە زمانی قالەوە کەوتە ناو ئاوایی. پیاوان ترسیان ڕێ نیشتبوو نەوەکا من ئاوا خۆم غەیب کەم و خوانەخواستە بچمە جەستەی کچ و ژنیان. ناچار سیحری غەیب کردنمان بەربەست کرد.

سەیری خۆش لەوەدایە پاش چەند ساڵێک، ڕۆژێک لە شاری سابلاغ بە مزگەوتێکا ڕادەبردم؛ دیار بوو خەڵکی زۆری لێیە. پرسیم گوتیان مەلایەک ئیجازە وەردەگرێ و شیرنی خواردنی ئەوە. چوومە ژوور دیتم هەمان قالەی سووختەکەی خۆمە جبەیەکی تازەیان دە بەر کردوە؛ ئیجازەنامەی دەخوێننەوە کە: شوکر بۆ خوا بۆتە مەلا. چووم لە پەنای دانیشتم و پیرۆزباییم لێ کرد.

گوتی: مامۆستا بیکە لە ڕاهی خودا ئەو دوعایەم فێر کە کە منت پێ غەیب دەکرد!

گوتم: جندۆکە ڕازی نابن! با پیر بی ئەو دەم تێتدەگەیەنم کە چۆنە!

لە وشتەپە ئاومان لە بیرێکی زۆر قووڵ، بە سەتڵ و گوریس هەڵدەکێشا. جارێک لەو ئاو هەڵێنجانە، قرچە لە پشتمەوە هات و پشتم کووڕ بۆوە و ژانی زۆر گرانی دەکرد. شکستەبەندێک لە دێدا بۆی هێنامەوە جێ و چەند ڕۆژان لە سەر جێ کەوتم.

سەید عەولا شێتەیەک هەبوو مەسخەرەی ئاغایان بوو. کچێکی لە وشتەپە خواست؛ هاتە حوجرە کە بچین مارەی کەین. گوتمان حەقی مارەبڕانەت نەهێناوە. سوێندی خوارد کە ماوەی بدەین تا دەچێتە بۆکان دوو کەللەقەند و تۆپێک کەتانی مێزەرمان بۆ دێنێ. گوتم: خۆت دەزانی بەستن هەیە؛ ئەگەر درۆ بکەی دەتبەستم. ئیتر درۆی کرد و پێمان پێدەکەنی کە دەستی بڕیوین. منیش دەمگوت بەستوومی. شەوی زاوایی بەسترابوو. هاواریان بۆ هێناین جوابمان نەدانەوە. هاواری بۆ ئاغا بردبوو، ناردی بە شوێنما و گوتی: من ئەوا پێنج کەللە قەند و دوو تۆپ کەتانتان دەدەمێ بیکەنەوە! هاتمەوە حوجرە و خەبەرمان دایە کراوەتەوە. کابرا بوو بە زاوا! دەسا باوەڕ کە نە بەستبوومان و نە هیچ؛ بەڵام ترسەکەی وای بە سەر هێنابوو.

ڕۆژی جێژنەیەک دەگەڵ مامۆستا چووینەماڵی عەلیاغا. عەلیاغا -کە نەخوێندەوارێک بوو، بەڵام زمانی فارسی دەزانی- پرسیاری لە فەقێکان کرد: فلان شت بە فارسی چییە؟ بە فیسارە شت دەڵێن چی؟ شیعرێکی سەعدیم لێ پرسییەوە کە دەڵێ: چەند دەسکە گوڵم دین کە لە سەر «گنبد»ێ بە گیا بەسترابوو. عەلیاغا گوتی: ئێوە نەتاندیوە، من لە شیراز دیتم گوڵ لە سەر گونبەز دادەنێن!

گوتم: نەتزانی، «گنبد» بە پیالە دەڵێن.

- لە کوێدا؟

- لە «بورهانی قاتیع»دا.

- خۆت دیوتە؟

- بەڵێ.

- دا بچن بورهان بێنن...

ئەم بەڵێیەی من درۆ بوو؛ نەمدیبوو؛ لە مەلا قادرە پیرەم بیستبوو کە زۆر فارسیزانی چاک بوو. هەر مانای گونبەدی لێ درایەوە و پیاڵە نەهات. هەموو گیانم وە سەر ئارەق گەڕا. ئاخری تووشی هاتن کە گونبەد بە مانا پیاڵە هاتووە. بە زاهیر قسەی من سەرکەوت؛ بەڵام ئێستاش پاش چڵوشەش ساڵ تا بیرم دێتەوە، شەرم دەمگرێ. درۆی بۆ چ بوو؟ با بمگوتبایە مەلا قادر وای دەگوت. ئیتر تۆبەیەکی وای پێ کردم کە بۆ هەمیشە تەنبێ بم. زۆر کەسیتریشم دیوە، کە شتێکی بۆیان گێڕاونەوە، دەڵێن بە سەر خۆمان هاتووە؛ بەڵام ئەوان ئەوەیان باشە درۆشیان لە سەر سوور بێتەوە شەرم نایانگرێ!

لە وشتەپە دەچوومەوە ماڵ. جارێک لەو سەفەرانەدا خوا برایەکی دیکەی بۆ ناردبووم کە ناوی نرابوو «سادق». جارێکیتر چوومەوە باوکم نەخۆش بوو؛ ناردمیە سابلاغ بۆ لای دوکتۆر یوناتانی کۆنە برادەری. تا من چووم و دەرمانم بۆ هێنا، بە ساغی فریا نەکەوتم و لە ئاخر دەمی گیاندانیدا گەیشتمە سەری و هەتیو مامەوە...

بە مردنی بابم ڕووپەڕێکی ژیانم هەڵدرایەوە و ڕووپەڕی دەورانی منداڵیم دادرایەوە. بێ جێی نازانم بە سەرچڵی تا نەمبەستووە سەرێکی بدەمەوە:

ژیانی ناو فەقێیان بە ڕاستی سەرنجڕاکێشە. ئەگەر کۆمەڵێکی هاوزمان و هاوولاتی بە میللەتێک دادەنێن، بە بڕوای من فەقێ تا نەبوونەتە مەلا، میللەتێکی سەربەخۆن. هەر مەلایەکی وەک باوکی من دەیەوێ کوڕەکەی جێگەی بگرێتەوە. زۆر کەسی نەخوێندەواری بە ئیمانیش کە خۆشیان لە مەلا و یاسین خوێندن هاتووە، کوڕیان دەنێرنە ناو فەقێیان. زۆربەی فەقێ، کوڕە بێوەژن و کوڕە هەژاری جووتیارن. دەچنە حوجرە دەبێ سواڵی نان لە ماڵان بکەن؛ بەشی جلک و شمەک لە ڕاتووە پەیدا کەن. کە بەهاران و پاییزان بە ئاوایی و هۆبانەوە دەگەڕێن، ڕۆن و پەنیر و کەشک و تووتن سواڵ بکەن و خۆیانی پێ پۆشتە کەنەوە و شەکر و چای پێ دابین بکەن؛ خەڵک لە زەکاتی گەنم و دراو بەشیان بدەن.

خوێندنەکەیان چۆنە؟ چەند کتێبێک لە سەتان ساڵەوە بۆتە باو، زۆر کەم وایە ئاڵوگۆڕ بکرێن؛ یانی بەرنامەی دەرس بە سەتان ساڵ نەگۆڕاوە. دەرس گوتنەوەش هەر لە عۆدەی ئەوانەیە کە لەو کتێبانەوە فێرە خوێندن بوون و هەرگیز بەرنامەی تازەکردنەوە و دەسکاری تێدا دەکار نەکراوە. نە فەقێ تێدەگا چی خوێندووە و نە مامۆستا خۆی دەزانێ چی بە دەرس کوتۆتەوە. لە سەد فەقێ، یەک یان دوان هەڵدەکەون کە لەو حەوتخوانی ڕوستەمە دەرچن و ببنەوە مەلای باش. ئەوی دیش هەمووی لە هەوەڵی ڕێگە لە ناوەڕاست بەجێ ماون و سەرنەکەوتوون. ڕێکوپێکی خوێندن و ئیمتحاناتی سێ مانگە و شەش مانگە و ساڵانەیان هەر نەبیستبوو؛ خۆی و خۆی. تەبنەڵ و ناتەنبەڵ بە یەک ڕێدا دەڕۆن.

زۆربەی وەختیان بە چاوبڕکێ لەگەڵ کچۆڵان و قسەی شڕ و قۆڕ ڕادەبرێ. زۆربەی هەرە زۆریان ڕووتن؛ چڵکنن؛ دژوێنن. زۆر جەمیان نانی هەرزن و جۆیە و پێخۆریان ئەو شتەیە کە ماڵان بە خێر دەیاندەنێ. لە ناو ئەو هەموو مایەی خەم و پەژارەدا داویانەتە باری بێعاری. شەوانی سێشەمە و جومعە لێک کۆ دەبنەوە و دەیکەنە بەزم و پێکەنین. کەمتر فەقێم دیوە زۆر گوێ بداتە باری ئایینی. هەموویان بەرانبەر بە شێخان بەدبین و بێیاقیدەن؛ گاڵتە بە زۆر شت دەکەن کە لە لای خەڵک گوناحە.

قەسیدەی «بوردیە» هەیە کە عارەبییە و لە پەسنی پێغەمبەرە و بۆ بەلا لابردن و ممبارەکی بە دەستی گەل دەیخوێنن. فەقێیەکی قۆشمە کە ناوی نەزانراوە کردوویەتە گالتەجاڕ و بە خواردنی حوجرەی هەلگوتووە و لە وەزن و قافیەشدا وەک قەسیدە عاربیەکەیە. شەوانی جومعە لە «پەسوێ» -کە سی فەقێیەکی لێ بوو- کۆ دەبوونەوە، دەی قەسیدەی «بگنیە- ورگیە» بخوێننەوە! ئەم چەند بەیتەم لەو قەسیدەیە لە بیر ماوە:

فەقێینە چاکی بزانن مزگێنیەکوو دەدەمێ
زیافەتێکی زۆر چەور، بۆن دێ بە دستی شەمێ
هەر چێشتێکی سوور چۆوە، ساوارە لێی دوورکەوە
شەو و ڕۆژی حازرە لە حوجرە وەختی جەمێ
ئەستەغفیروڵلاهی مەن ساواری و ئەلماشێنە
ئەگەر لە برسان بمرم شەرتە دەمی ناکەمێ
ئافەریم مام بابەکر! ئەتۆی تایفەی سەکر
زیافەتت وەکو شەکر، دەلێی نێ ئەوجار کەمێ

یەکێکی دەنگخۆش دانەدانەی بەیتەکانی دەخوێندەوە و ڕادەوەستا ئەوانیتر بە گەل سەربەندەکەیان دەخوێندەوە و دەیانگوت:

دە تێی کە! لێی کە! بە چاکی پاروانی لێ بکە
لوولی دە! قووتی بدە! هەتا زگت دەجەمێ

یان لاسای خەتم و تالیلەی تەکیەی شێخانیان دەکردەوە: بە دەورە دادەنیشتن چراکەیان خەفە دەکرد. سەر تالیلە بۆی دادەمەزراندن: «لا ئیلاهە ئی لەڕ نا!». تاوێکی باش بە کۆمەل ئەمەیان دەگوت. ئەوجار بۆی دەگۆڕین: «داندۆک»، تێکڕا وەک جەزم بوونی دەروێشان ملیان لێ دەنا: داندۆک، داندۆک. داندۆک دەبووە ساوار، هێلکا و...

لاسای قورعان خوێندن و تەکبیری جەژنیان دەکردەوە. یەکێک ناوی ولاتی بە دەنگێکی بلند دەخوێند. مەسەلەن دەیگوت: «وە شاوەلەیە و بایزاوێیە، وە قاڕنەیە وە گەلوان». دوای دوو سێ ئایەتی وا ملی خوار دەکردەوە: گوێگران تێکڕا دەیانگوتک: «پلاو بنکڕ، پلاو بنکڕ، پلاو بنکڕ، پلاو بنکڕ، لا بامیەتە لەنا ئیللا شلە قاورمە، پلاو بنکڕ بە لەحم و شەحمەوە».

گوویا جارێک چەند فەقێ لێک کۆ دەبنەوە و دەست دەکەن بە غەیبەت کردنی هەرچی دێتە بیریان. کار زۆر درێژەی کێشاوە و گەیشتوونەتە باسی مەلائیکەتانیش. لە پاش هێندێک ڕامان، یەکیان گوتوویە:

- ئائا نەقلی ئەوەیە خودای تەبارەک و تەعالا کاوڕە لەڕێکی بۆ برایمی پێغەمبەر ناردووە، سەری کەچەل کردووە هێندەی پێ بلێ: «وَ فَدَیناهُ بِذبحٍ عَظیم»!

بەلام جگە لەو جۆرە گالتە و گەپانە، بە تێکڕایی لە نوێژ و ڕۆژوو گرتندا زۆر خێرا بوون. بەلێ هێندێک لە نوێژی سبەینە تەنبەلییان دەکرد؛ بەلام ئەویشیان بە قەزا دەگێڕایەوە. لە زینا و داوێنپیسی زۆر بە دوور بوون. حەز لە کچان کردنیان لە دەستبازی و ئەگەر ڕێک کەوتبا ماچ و مووچێک تێ نەدەپەڕی. ئەو چەند سالەی فەقێ بووم نەمبیستووە فەقێیەک لە سەر ژن گیرابێ. دوو جاریش لە بیرمە کە فەقێ کیژی دلخوازی خۆیان هەلگرتبێ. ئیمانیان بە خوا و قورعان و ئیسلام پتەو بوو. منیش کە چەند سالێک لە ناو ئەو کۆمەلگایەدا ڕامبواردووە و شەو و

ڕۆژم دەرباز کردووە، دیارە لە ژیانی فەقێیەتی زۆرم پێوە نووساوە و خووم پێ گرتووە.

کاتێ لە وشتەپە فەقێ بووم، لە شەوی پازدەی شاباندا -کە جێژنی بەراتە- وەک باوە قورعانمان هێنا و یاسین و دۆعای بەراتمان خوێند. ئەسعەد بەشداری نەکردین. گوتی: ئێوە بەو دۆعا خوێندنە لە باتی ڕۆژی زیادبوون لە ڕزق و ڕۆزی بێبەش دەبن؛ من تەجرەبەم کردووە! گوێمان پێ نەدا و خۆشمان لێ تووڕە کرد. جاران کە هەموو بەیانیان هیچ نەبا ماستێک، شیرێژێکمان دەست دەکەوت، بەیانی ئەو ڕۆژە نانی گەنمیشمان نەبو. دوو سێ لەتکە نانە جۆی وشکەوەبوومان خوارد. ئەسعەد پێمان پێدەکەنی و دەیگوت: هائ؟ نەمگوت؟ ئێمەشی پەشیمان کردەوە. گوتمان دەسا چاری دەرد چییە؟ گوتی هەستن! قوربان سفرەی نانمان لە ناو حوجرەدا بەر شەقان دا تا ماندوو بووین. هەروا دوای تۆزێک ژنێک بە قاپێک ماست و چەند نانی گەنمی تازە و گەرمەوە هات و گوتی: فەقێکان نەزرم کردووە؛ ئەمەم بۆ ئێوە هێناوە!

لە وشتەپە فەقێی جگەرەکێش، بە زۆر نەفەسێک و دوو نەفەسیان خولق کردم تا بۆ خۆم فێر بووم. ئەوسا دەیانگوت عەیبە تۆ لاکێشی! ناچار تووتن و پەڕم پەیدا کرد و لە سایەی هەوالی ناجنسەوە فێرەجگەرە کرام. چەند جاران تەرکم کردووە و گەڕاومەتەوە سەری. ئێستاش کە پیرم و نەخۆشم و دەڵێن بۆت خراپە؛ بەلام ئەو بەلایەم بۆ تەرک ناکرێ.

دەیانگوت کارخانەی قەندی میاندواو زۆر جوان و خۆشە. دەگەڵ فەقێیەکدا لە بەر وەرزێرێکی وشتەپەیی پاڕاینەوە، گوتی: چەوەندەرم دەگەڵ بار کەن! لە بەیانەوە تا ئێوارە کامیۆنمان پڕ کرد. شەو لە سەر بار سوار بووین. بەیانی لە کن کارخانە دابەزین. تازە دەزانین برسیمانە و هیچیشمان لە گیرفاندا نییە. لە دەرکی کارخانە ڕێگەی چوونەژوور و تماشایان نەداین. دەبوایە چاوەنۆڕیش بین تا بمانبەنەوە. چووینە سەر چۆم، مەلەمان کرد؛ برسی‌تر بووین. نیوەڕۆ لە بن دیوارێک قۆڕەی زگمان بوو. مەلایەکمان لێ پەیدا بوو منی دەناسی؛ نانی داینێ و کارخانەشی پێشان داین.

ئاخری پاییز بوو، بە دەشتی شارۆێراندا دەهاتم، تووشی بەنداوێک بووم، ویستم بپەڕمەوە و کالە و پێتاو دانەکەنم. فکر، فکر، دار بیەکی باریکم لە سەر بەندەکە دیت؛ بە عەقلی تەواوی خۆم دەچمە سەر چلۆپکی؛ دادێ و فڕێم دەداتە ئەوبەر. بە ناشکوری نالێم حیساب ڕاست دەرنەچوو. چلۆپکی دار داهات، خستمیە ناوەڕاستی جۆگە و لە قوڕێدا قوم بووم! بە هەزار دەرد هاتمە دەر. سەرما، هەموو گیان تەڕ و قوڕاوی، غارم دا، لە «وسوکەند» خۆم بە مالێکدا کرد. ژنەکە هەر دیتمی خودار بوو:

- ئەی بیسمیللا ئەوە چییە؟!

- دایە گیان جندۆکە نیم، فەقێم!

لەبەر تەندوور خۆم وشک کردەوە.

***

تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو کە بابم مرد. قەت بیرم لەوە نەکردبوو کە ڕۆژێک باوکم دەمرێ و بە سەری شلکی هەتیو دەبم. تاسام؛ واقم وڕ ما؛ فرمێسک لە چاومدا قەتیس ما. گریانم نەدەهات. خەمێکی تەماوی دەوری سەری دابووم. دنیام باش نەدەدیت. لە سەر وەسیەتی خۆی بردمانە خانەقا لە پەنا گۆڕی دایکم ناشتیان. گەڕامەوە ماڵ؛ منداڵ دەگریان. گوێم لێ بوو خوشکم بە براکەمی گوت: «خەم مەخۆ! کاکمان لە جێی بابمانە». ئەو قسەیە وەک دەمبێن لە گۆزەی

سەرەونخوون هەڵگرن، کونی فرمێسکانی بەرەڵا کرد و گریام ئەمما گریام؛ تا بە تەواوی کوڵ و کۆم دامرد. ئاشنا و ڕۆشنام لەملا و لەولا هاتنە سەرەخۆشیم. ئیوایان تێدابوو هەر لە ئێستاوە تەماحیان کردبووە پارچە زەویەکانمان؛ دەیانگوت ئێوە تازە ناتوانن بە بێ بابتان لێرە بژین. گوێم لێ دەبوو دەیانگوت: هەر بینا لە برسان مردن. ئەمجار فکرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ لە برسان مردن چۆن بێ؟ بۆم حەل نەدەبوو...

بەوپەڕی ناهومێدییەوە چووم لە وشتەپە کتێب و سیپاڵەکەم هێنایەوە و مۆرم بە دەرگای خوێندن و فەقێیەتییەوە نا. ئەی خودا چ بکەم؟ تا ئەمرۆ نە زانیومە کاسبی چییە، نە لە جووت و گا سەرم دەردەچێ، دوو برای پچووک و خوشکێک و دایکێکم بە سەردا کەوتۆتەوە. باب کە مردووە سێسەد تمەن قەرزدارە و پاتالی دۆمان تەنیا مانگایەکی سیلدارە؛ بۆ گاڵتە ناوی نراوە «شمقار». ئەگەر بزانی کە دە مریشک بە تمەنێک و پێنج گیسک بە تمەنێک بوو، دەزانی سێسەد تمەن چەند زۆر بوو. بەڵام زۆری پێ نەچوو کە دەستم لە ناهومێدی بەردا و شانم وەبەر کاردا. مەنجەڵە زنجیردارەکەی بۆ پلاوی حەوتمم کڕدرابوو، لەو ساوە نخوون کرابۆوە؛ دام بە چوار بزنەزا و بە کاژیلەوە. گیسک و بزنم دەکڕی و دەمبردە بازاڕی «خورگە» و «قەباکەندی». ماوەیەک چۆداریم کرد. خۆم وەها شارەزای کاسبی لادێ کرد کە کۆنەپیاوان پرسیان پێ دەکردم کوێ بە چی بچێنین. کەم-کەم دەبووژامەوە؛ بەڵام دیسان ژیان زۆر فەقیرانە ڕادەبرا و شوکری خوامان دەکرد. شەوانە تا درەنگ زستانان لە مزگەوت جۆرابێنمان دەکرد؛ چراشمان فتیلە بوو. هەمیشە کە دەستم بۆ ناو کەپۆم ببردایە، قورمی ڕەشی نەفت بەدەستمەوە دەهات. زستانێکی سەرانسەر پێخۆرمان نەبوو؛ بە نانی وشک ڕامانبوارد.

خوێندەواریم چەند بوو؟ لە سایەی لەبەر کردنی قەسیدە عارەبیەکان، چەند وشەیەکی عارەبیم دەزانی؛ بەڵام منیش وەک هەموو مەلای ولاتی خۆمان، نە قسە کردن، نە خوێندنەوەی کتێبی عەرەبی تازە و نە هیچ. لە شەرعیشدا تەپەتەپێکم لە «فتح‌القریب» و «منهاج» دەکرد و ناویان نابووم «مەلاوڕەحمان». لە فارسیدا خراپ نەبووم؛ گوڵستان و بووستان و یووسف و زلێخای جامی و تاریخی نادرم بە دەرس خوێندبوو؛ دەمتوانی نامە بە فارسی بنووسمەوە و بخوێنمەوە. کە نزیکەی دە-دوازدە ساڵ ژیانم بە گەللایی ڕابرابوو؛ خۆم بۆ فێربوون ماندوو نەکردبوو؛ تازە پەشیمان ببوومەوە. دەستم کرد بە متالا و خوێندنەوە و خوێندن لە لای خۆم. شەوانە چرای نەوتم لە پێش خۆم دادەنا و کتێبم دەخوێندەوە. کتێبی چۆن؟ تەڕ و وشک، بێتام و بە تام، هەر لە ئەمیر ئەرسەلانی ڕۆمیەوە تا شیروویە و سیمین عوزار و فەلەکناز و تەڕەماش و تەڕەسازەوە تا دەگاتە خەمسەی نیزامی و مەسنەوی و حافز و شانامە و شتی‌تر... زۆر شەوان وا بە خوێندنەوە خافڵاوم کە ڕوانیومە وا تاو هەڵاتووە و چراکەم دایسێ. لە ئاکامی ئەو شێلگیریەم، بە بێ‌ئەوە بە خۆم بزانم، ببوومە فارسی‌زانێکی مناسب.

هێندێک بە قەرز و هێندێک بە نەغد جووتە گایەکم بە سی تمەن کڕی. دەگەڵ کابرایەک بووینە شەریک کە نیوەکارم بێ؛ تووتن و بێستانیشمان کرد. کابرا کە گیای دروو، گیشەی خۆی لێدا، گوتی من تووتن و بێستانم ناوێ، چاری ناچار خۆم لێ گیف کرد و بە نەزانی خەریکی تووتنەوانی بووم. تووتنم بن کۆڵ دەکرد و ئاوم دەدا. پاییز تووتنم بردە شار، بایی چل و پێنج تمەن بوو. پارەی گاکان و هەقی کووتاڵی پۆشتەکردنەوەی منداڵانی لێ دەرچوو.

دەمم لە کاسبی شیرین بوو. وردە- وردە مەڕم کڕی، ماینم کڕی و بوومە ماڵێک لە ڕیزی

ماڵان. بەڵام گیروگرفتی‌تر هاتە بەر: «سادق» تەمەنی هەشت مانگ بوو، دایک مێردی کردەوە و بە جێی هێشتین. خوشکم هێشتا منداڵ بوو؛ ناچار بووین لە ژنی ناو دێ یارمەتی بخوازین کە بە نان کردن و ماڵات دۆشین و مەشکە ژەندن ڕابگەن؛ کە ئەوانیش جگە لە هەقی خۆیان، نیوە بە نیوەیان دەدزی. گوتیان چار ئەوەیە ژن بێنی کە هەم ئاگای لە ماڵ و هەم ئاگای لە برا چکۆلەکەت دەبێ. کەوتمە حەولی ژن هێنان. لە هەر کوێ کیژێکیان ناو دەبرد کە جوان و باشە، سەرم لێ دەدا؛ یان من کەیفم نەیدەگرتن یان ئەوان پێم ڕازی نەدەبوون. ڕۆژێک کە دەگەڵ کاروانێک دەچوومە بۆکان، لە ڕێ تووشی کیژێک بووین کە دەچوومە مەزرای باوکی. زۆرم دڵ گرتی؛ ئەویش نیوە ئاوڕێکی لێ دامەوە. زۆری نەبرد کە خواوراستان ئەو کچە دەگەڵ هەواڵانی خۆی هاتبووە تەرەغە بۆ سەیران و مایندەکەی لە حەوشی ئێمە بەستبۆوە و خۆی میوانی حافزێک بوو. حافزم کردە دەلاڵ و بۆی سازدام و خۆم و کەسێکی‌تریش چووینە خوازبێنی لای باوکی. باوکی کچ گوتی:

– بە منداڵی لە سەر بێشکە لە کەسێکم مارە کردووە کە نایەوێ مێردی پێ بکا. بە کێ قایل بێ بەوی دەدەم؛ با پرسی پێ بکەم.

دیار بوو پرسی بە قازانجم بوو. ئەوجار پرسی:

– دەولەمەندی؟ دێمە ماڵت بزانم چت هەیە.

گوتم: باشە دوای دوو ڕۆژ وەرە؛ من هەموو فەرش و نوێنی ئاوایی دەخوازمەوە؛ مەڕ و مانگایەکی زۆریش دەخەمە حەوشەوە؛ ئەوسا دەڵێم دەولەمەندم. مامی خۆم! تۆ ئەگەر کچ بە دەولەت دەدەی، ئەگەر لە ئێستا فەقیرتر بووم دەبێ لێک جیا بینەوە. من شەریکی عومرم دەوێ کە سواڵیشم دەگەڵ بکات.

کابرا پێکەنی و گوتی ڕاستە. تەڵاقی کیژم بە سەد تمەن کڕیەوە و مارەم کرد. وا بوومە خاوەن ژن. بەڵام هەر ژن نەبوو، ڕەحمەتی خودا بوو. هەر چەند باوکی بە چەتە و دز و تووش و جنگن ناوی دەرکردبوو، ئەو تەواو بە پێچەوانە زۆر نەرم و نیان و بە سەبر و حەوسەڵە، زۆر فامیدە، کارزان، لە هەموو وەرزێرێک پتر لە وەرزێری سەری دەردەچوو. کابانێکی کەموێنە بوو. زۆر زوو حەسامەوە. کاروباری منی گرتبووە ئەستۆی خۆی. بە مەزرا و ماڵ ڕادەگەیشت. هەمیشە ڕووخۆش و گەش بوو. دۆستانی گوندی دیکەم دەیانگوت خۆزگە ئەگەر میوانی ماڵە تۆ دەبین تۆ لە ماڵ نەبی؛ چونکە «سەیدزادە ئایشێ» لە خۆت پتر قەدرمان دەگرێ.

لە کچی «سەید قادری بوغدەداغی» کوڕێکم هاتە دنیا و پاش پێنج ڕۆژ مرد. پیرێژنان دەیانگوت ئاڵەوشەوە بردوویانە. جارێکی دیکە حامیلە بوو. لەو ناوەدا من نەخۆشی گرانەتام گرت و زۆر پیسی خستم. لە ترسی گرتنەوە نەدەبوایە کەس نزیکم کەوێ. ئەو ژنە ئارەقی لەشمی بە زمان دەلستەوە. من چا بوومەوە بەڵام ئەو زۆری نەبرد کە تووشی گرانەتا هات و پاش نۆ ڕۆژ بە نەخۆشی کوڕێکی لە بەر چوو؛ بۆ خۆشی مرد. لە سەرڕا بێکەس و هەتیو بوومەوە. زەمانە لە باتی ئەو تۆزە خۆشیەی ژیانم، تاڵاو و ژەقنەمووتی بە گەروودا کردم. لە قەسیدە درێژەکەی بەرەو موکریانمدا باسێکم لێوە کردووە.

ژیانمان لە تەرەغە، جار تاڵ و جار شیرن و پڕ لە هەوراز و لێژ ڕادەبرد. لە بیرمە زستانێک تا بەهار پێخۆرمان نەبوو؛ بەرچامان نانی وشک بوو. لە بیرمە ساڵێک قەند گران بوو، چەند مانگێک چامان بە کشمیش و نوقڵ دەخواردەوە. بەڵام لە دواییەکاندا بە نیمچە دەولەمەندێکی لادێ

حیساب دەکرام.

بۆ خۆم دەرسم بە برا گچکە و برای گچکەترم دەگوت. بەڵام زۆر زەحمەتە منداڵێک بە تاقی تەنیا زەوقی لە سەر خوێندن بێ. بیرم زۆر لێ دەکردەوە کە ئەو برایانەم ئامانەتی بابمن و لە مل مندان. ئەگەر نەخوێندەوار دەرچن من خەیانەتم بە ئامانەت کردووە. زۆریش گران بوو دەست لە ژیانی لادێ -کە دەگەڵی ڕاهاتبووم- بەردەم و بچمە شار کە هیچ لە کاسبی شار سەرم دەرناچێ. ئاخری لێ برام کە هەرچی دەبێ با ببێ؛ تەنیا براکانم بتوانن بخوێنن. لەپڕ قەراری خۆم دا. مالاتەکەم سەرجەم فرۆشت و هاتمە بۆکان. خانوێکی پووتەکەی پیسەکەی لە لای سەرووی مزگەوت و بەرانبەر بە حەوزی بۆکانم مانگی بە سێ تمەن بە کرێ گرت؛ کە حەوشۆکێک و ناومالێک و وەتاغێک بوو. پاش ماوەیەک بە حەوسەد تمەنم کڕی و خانوێکی شاری سابلاغم دا بە هەشت سەد تمەن و قیمەتەکەم بژارد.

جا هەتا مەعلووم دەبێ کە لە بۆکان چم دەکرد، با وچانێک بدەین و بگەڕێینەوە سەر ئەوانەی کە ناسیومن و لە بیرم ناچنەوە:

١. **سەید ڕەشیدی خانەقا:** پیرێکی قەد و باڵا بڵندی بە ڕیشێکی درێژ و پانی زۆر جوانەوە. هەر لە فەقێیەتییەوە دۆستی نزیکی «حەریقی» شاعیر بووە؛ کە بابیشم هەر لە دۆستانی زۆر خۆشەویستی حەریق و سەید ڕەشید بووە. سەید ڕەشید ژنی نەهێنابوو. ساڵەهای ساڵ بوو هەر لە زەمانی مانی شێخەوە لە خانەقا ببوە تەرکەدنیا. حوجرەیەکی هەبوو؛ هەمیشە سەماوەری لەبەر دایسا. هەموو قورعانی لە بەر بوو؛ بە ماناوە و بە هەموو وردەکارییەوە. زۆربەی کاتی بە دەنگی زۆر خۆش قورعانی دەخوێند. دەیتوانی بە کوردی و فارسی شیعری زۆر باش بهۆنێتەوە. لە مەلا چاکەکانی عارەبی دەژمێردرا. مەجلیس و قسەی ئەوەندە خۆش بوو کە هەر کەس جارێکی کاک سەیدی دیبا، هەرگیز لە بیری نەدەچوو. من ڕۆژگارێک شیعر و نامە دەسخەتییەکانیم کۆ دەکردەوە کە بە ڕاستی لە نرخاندن نایەن؛ بەڵام بە داخەوە فەوتاون. دوو غەزەلی ئەوم دەس کەوتبوو کە یەکیان فارسی و ئەوی‌تریان کوردی بوو. ئێستا لە هەر یەکەی یەک یا دوو بەیتم لە بەر ماون، بەیتێک لە فارسییەکەی دەڵێ:

یکی صد گشته داغ دل از این رو     که الف بینی‌اش دو خال دارد

لە غەزەلە کوردیەکەدا دەڵێ:

لە چاومدای و چاوم پڕ لە ئاوە     وەرە ئەی گوڵبنی تێراوم ئەمشەو
ڕەقیب زانی غەریبی کۆی نیگارم     وەکو سەگ بۆیە دەوری داوم ئەمشەو

جارێک ڕەعیەتێکی قەرەنیاغای مامەش -کە ناوی یووسف دەبێ- دەچێتە لای کە قەرەنیاغا لە سەر کێشە کردن دەگەڵ مالێک -کە مالی یاقووبی پێ دەلێن- دەری دەکا، تکایەکی بۆ بکا دەری نەکەن. نامەی بۆ دەنووسێ و دوای چەندێک دێتەوە دەلێ: «ئاغا نامەکەی تۆی فڕێدا و گوتی ئەو سۆفیانەی خانەقا ئاغایەتیم لێ تێک دەدەن». سەید ڕەشید کە تەخەللوسی شیعری «چاوش» یان «شەهید» بووە، بۆی دەنووسێتەوە:

زاهیرەن فەرمووتە من سەردارم و خاوەن بەشم     گیرودارم پێ دەوێ چون شێرە کولـلەی مامەشم
دەست لە یووسف بەرمەدە بۆ خەرگەلی یاقووبیان     بەردەدەی بە گونم، چکیرم پێ دەچێ من چاوەشم

هەموو کەس جنێوی کاک سەیدی لە پێهەلگوتنی خەلکی پێ خۆشتر بوو. بەختەوەر لە خانەقا ئەو کەسە بوو کە لە مەجلیسی کاک سەیددا حازر بێ. من هەر چەند منداڵێکیش بووم،

چونکه کاک سەید بابمی زۆر خۆش دەویست، زۆر جار ڕێگەی دەدام بچمە خزمەتی و گـوێ لـە فەرمایشاتی بگرم. جگە لە قسە جەفەنگییەکانی -کە ئێستاش بە سەر دەم و زارانەوە ماون- زۆر چوارینە و تاک بەیتی سەیر و سەمەرەی هـەبوون. لەگـەڵ «عەبدولـڵابەگی میـسباح دیـوان»دا نامەی زۆریان بە شیعر پێک گۆڕیوەتەوە. باسی سەید بە تـەنیا کتێبووکێکـە و ئەگـەر دەرفـەت هەبێ دەبێ کۆ کرێتەوە و نەفەوتێ.

٢. **حاجیمەلا ڕەحمانی شەرەفکەندی:** مەلایەکی قەدبڵندی، ڕیشێکی چوار پەنجەیی هەبوو؛ کە من دەمدیت لە نێوان پەنجا و شێستدا بوو. هـەرگا کـە لـە شـەرەفکەندەوە دەهاتـە خانـەقا، وەک دەڵێن «چوێلەکە دەوری کوند دەدەن کە دندووک لە چاوە جوانەکەی بدەن» ئاوا خەڵـک دادەورووژانە دەوری و بە قسەکانی کەیفیان دەهات. دەم و زاراوی زۆر خۆش بـوو؛ قسەکانیـشی هەمووی گاڵتە و گەمە بوو. تەکیە کەلامی «وەنەکێ بابەلێ» بوو.

ڕۆژێک کۆمەڵێک لێی کۆ ببوونەوە. سۆفییەکی ڕیشپانی ملئەستوور، دڕی بە خەڵکەکە دا و خۆی گەیاندە حاجیمەلا و گوتی: حاجی مامۆستا ئەرێ بە شەرع ڕدێن خێری زۆرە؟

فەرمووی: وەنەکێ بابەلێ! ئەرێوەڵڵا ڕدێن ئەوەندە باشە کە هـەر نەبێتـەوە. تـۆ بڕوانـە مـن لەوەتا ئەو ڕدێنەم هێشتۆتەوە قوونگم حەساوەتەوە، جاران هەر دەیانگوت لە قوونگی بەم، ئێـستا دەڵێن های لە ڕدێنی بەم!

حاجی بابەشێخی تورجان لە لای شای ئێرانەوە عاسای سەر بـە جـەواهێری خـەڵات کرابـوو. جارێک دزی لە ماڵی کرابوو. لە زەنبیل بووم حاجیمەلا هات. سەید محەممەدی زەنبیـل لێـی پرسی: لە کوێوە تەشریف دێنی؟

گوتی: لە تورجانەوە، بە حاجی بابە شێخی مامتەوە بووم.

گوتی: ئەرێ مەعلووم بوو چیان لێ دزیوە؟

گوتی: وەنەکێ بابەلێ! گۆیەکیان لێ بردووە!

جارێک لە گوندی عەیشاباد بووم. حاجیمەلا هات. لە جەنگەی قـساندا مـستەفابەگی ئاغـای عەیشاباد کتێبێکی بە ناوی «شەمسولمەعاریفی کوبرا» هێنا و گوتی: ئەوە ویفقـی زۆر عـەجایبی تێدایە.

حاجیمەلا گوتی: ئاغا ئەم شتانە هەمووی درۆ و دەلەسەن. من باوەڕم بـەو سـیحر و جادوانـە نییە.

ئاغا گوتی: جا ئەگەر عالمێکی وەک تۆ گەورە ئەمە بفەرموێ، دەبێ جاهیل کام قوڕ بـە سـەر داکەن؟ دەسا وەڵڵا ئەمە ئەتۆ دەفەرمووی، من دوعای وام لێ پەیدا کـردووە ئەگـەر ئێـستا لـەم دیوارە بنووسم و قامیشێکی تێ چەقێنم، چەندی بمەوێ هەنگوین دێتە خوار.

حاجی مەلا فەرمووی: وەنەکێ بابەلێ! ئەوە هاسانە؛ ڕەنگە ئەودیوی دیوارەکە ئاودەست بێ!

جارێک حاجیمەلا لە بن دیواری مزگەوتی شـەرفکەند خـۆی دابـووە بـەر بەرۆچکـە و چەنـد کەسێکیش لە دەورەی بووین. کابرایەک بەوێدا ڕادەبرد و هەر پرتەو بۆڵەی بوو.

حاجیمەلا پرسی: ئەوە چیتە؟

گوتی: حاجی مامۆستا هەر لێم گەڕێ. قەرزم لە سەر سەعیدی مام حەمەدی سەگبابە، تـرێ بە دە شاییم بۆ ناکەنێ.

حاجیمەلا گوتی: وەنەکێ بابەلێ! ئەگەر زۆرت لازمە بۆی بکە بە یازدە شایی!

جارێک حاجی‌مەلا دەگەڵ سەید ناوێکدا بە پێ بەرەو خانەقا دێن. سەید جووکەیەکی لێ دێ، بەلام دەبینێ حاجی نە بزەی هاتێ و نە ئاوڕی لێ داوە؛ دیارە دەبێ نەیبیستبێ. ماوەیەک بێ‌دەنگ دەڕۆن و سەید دەڵێ: حاجی مامۆستا چۆنە وا هیچ فەرمایشتێک نافەرمووی؟

حاجی مەلا دەڵێ: بابەڵێ! باوەڕ بکە لەو دەمەوە ئەوا هەر خۆم دەجرێنم و دەنەقێنم، چ بکەم بۆ بەدبەختی فەرمایشتی وەک تۆم نایە!

مەلایەکی دەوڵەمەند و خاوەن گوند بە ناوی «مەلا کەریمی گول» کە دەیانگوت سوودخۆرە، مردبوو؛ هێنابوویانە خانەقا. کەس‌وکار و کوڕی مردوو لە حوجرەی شێخ محەممەد بوون. حاجی‌مەلاش لەوێ بوو. کوڕی کابرای مردوو کەولێکی تیسکنی ئاودامێنی لە پێش شێخ محەممەد دانا، گوتی: باوکم وەسیەتی کردووە تۆ دەبەری کەی. شێخ محەممەد کە بە حەرامی دەزانی گوتی: من پیرم و ئەو کەولە قورسە، ناتوانم هەڵیگرم. کوڕەکە و خزمەکانی گوتیان ئیلا دەبێ بتەوێ و وەسیەتی لە عەرز نەدەی. شێخ محەممەد فەرمووی: دەجا حاجی‌مەلا با بۆ تۆ بێ. حاجی‌مەلا گوتی: قوربان قەدیمی گوتوویانە: «میراتی کەر بۆ کەمتیارە». بێنە ئەوە بۆ من باشە! باوەڕ کە کوڕ و خزمی مردوو لە ئێمە پتر پێکەنین.

بۆ نموونە ئەو چەند نوکتانەم گێڕایەوە؛ باسی حاجی مەلاش دەشێ دە ناو کتێبێکی وەک ڕشتەی مرواری عەلائەددین سەججادی خرێ.

٣. **مامۆستای فەوزی:** مەلایەکی خەڵکی عەبابەیلی شارەزوور بوو. شێخ مەحموود لە پاش کوژرانی عیرفان ئەفەندی ویستبووی فەوزی -کە شاگردی عیرفان بووە- بکاتە ڕاوێژکەری. فەوزی لە ترسان پەڕەوازەی ولاتان بووە. ماوەیەک لە ناو کەڵهوڕ بۆتە مەلادێ. هاتبووە موکریان و لە گوندی ئاجی‌کەند دەژیا. زۆر عالم، زۆر کورد، شاعیر، ئیتر وەک ئاردی بەهار بۆ هەموو شت دەبوو. نسحەت و ڕێ شاندانی ئەو، بیری کوردایەتی خستە مێشکی زۆر لە لاوانی ئاشنای. دنەدانی ئەو هێمنی کردە شاعیر. پاش مەرگی بابم زۆری پێ ناخۆش بوو کە ناچارم دەست لە خوێندن بەردەم، دەیگوت زۆر حەیفە تۆ نەخوێنی.

ئێمە لە تەرەغە مالە مەلایەکی بێ‌دەسەلات بووین. بابم حورمەتی لە ناو خەڵکا زۆر بوو. دەوڵەتیش هەبوو. تا دنیا نەببووە پاشاگەردانی و خەڵک لە ئەمنیە دەترسان، ئێمەش توانیبوومان بمێنین. بەلام باب مرد، شیرازەی دەوڵەتیش بە هاتنی ئینگلیس و ڕووس و ئەمریکایی بۆ ئێران لە بەر یەک هەڵوەشا و دنیا بوو بە زۆردار و بێ زۆر. هەر وا ئاغای زل بوو وەک نەهەنگ وردە ماسی قووت دەدا. قەباڵە نووسینی وەک قەدیم و پێش داهاتنی ئیدارەی سەبت زۆر وە باو کەوتبوو. ئەمما کوا ئەو میرزا فیلەتەنانەی کە دەیانزانی قەباڵەی ملک بنووسن؟

من چووبووم عیباراتی قەباڵە کۆنێکم بە ڕەوانی لەبەر کردبوو. تەنیا ناوگۆڕینی دەویست تا ببێتە قەباڵەی حیسابی. بەو هۆیەوە منیش گەشەم کرد. لە هەر قەباڵەی مولک کڕینێک -یان دەبێ بڵێم ملک ساندنێک- لە لایەن حاجی بایزاغا و کوڕانیەوە -کە ئەوسا یەکەمین دەسەلاتداری ناوچەکە بوون- من بە دەستەوە بووم و بوومە ئاشنایان. ئەم ئاشنایەتییە پاراستمی. جارێک ڕەشیداغای نۆبار، جارێک کوڕی عەلیاغا، جارێک حوسێناغای قاجر دەیانەویست ئەو دوو-سێ زەویەم لێ بستێنن؛ مالە حاجی بایزاغا لاگریان دەکردم و ڕازی نەدەبوون ئاشنای قەباڵە نووسیان بە دەم گورگەوە بچێ.

لە تەرەغە کابرایەکی بەر پێی من چووبووە گوندێکی دیکە. شەو نیر و ئامووری لە مەزراکەیدا براپبوونەوە. هەرچەند من ئاگام لەم کارەساتە نەبوو، بەڵام کابرا منی بە تاوانبار دەزانی. ڕۆژێک لە باراش هاڕین من بە بارە ئاردەوە دەهاتمەوە، پیاوێکی ڕەفیقە ئاشێڕیشم دەگەڵ بوو. گەیشتینە ئەو گوندەی کابرای کۆنە ڕەعیەتی لێ بوو؛ لە ڕێ تووشی هاتین. غاری دا سەر گردێک و هاواری کرد: وەرن تۆڵەم بکەنەوە. ئاغای گوند و نۆکەرێکی بە تفەنگەوە و بە سواری گەینە سەرمان:

- ڕووت بن دەنا کوژراون!

ئاغا بە قونداغی تفەنگ ڕایهێشتە هاوڕێکەم، بەر لەوە لێی کەوێ تفەنگم گرت و ڕامتلەکاند و بە دەستمەوە هات. چەخماخم لێ ڕاکێشا کە دەتکوژم. دایە باری باریک ڕستن و بارمان بردەوە و لە نزیک تەرەغە تفەنگەکەم داوە؛ کە بە قسەی خۆی ئابڕووی نەچێ. بەو حاڵەش چوومە شیکایەتی ئەحمەداغای حاجی بایزاغا کە ئەویش لە بەهانەیەکی وا دەگەڕا. وابزانم ئەسپێکی لە ئاغا ئەستاند.

زۆر بەختەوەرم کە لە هاتوچۆ کردنی ماڵی ئەحمەداغا لە قەرەگوێز، دەگەڵ سەید کاملی شاعیری هەرە باش و ئاغا قۆچ بەگی قسەخۆشی بەناوبانگدا ڕامدەبوارد و یادی شیرینی ئەو ڕۆژانەم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە.

هەر لەو دەمانەی لە تەرەغە دەژیاین، بە هەوای لاوەتی و کەللەپڕی بێعەقڵانە، جارێکیتریش لەگەڵ وردە ماڵکێکی ئامپاماندا لە سەر ئەوە برام بەردی بە سەگی ئەو دادابوو شەڕ هەڵگیرسا. ئەو خزمی خۆی کۆ کردەوە و سەیدانی کولیجە –کە ماڵە خاڵوانم بوون- بە هاواری منەوە هاتن؛ کە چا بوو ئەویش بێخوێن ڕژان داکوژا.

دەبوایە لە بۆکان کاسبی پەیدا کەم و ژنیش بێنم و بە بێوەمێردی نەمێنمەوە. بەڵام ئاواتم پێک هات کە براکانم بنێرمە مەدرەسە. ئێستاش گرێی سەر دڵمە کە بۆچی خوشکم نەنارد و بۆ خۆشم پێم نەخوێند؟ چونکە تا ئێستا نەک هەر لە خانەوادەی خۆمان، بگرە لە لاوەش ئینسانی ئەوەندە زیرەکم نەدیوە. بەڵێ عەقڵم وا بوو کە نابێ ژن بخوێنێ؛ زۆر بە داخەوەم...

بۆ باسی کاسبی و سەرمایە هاوارم بۆ کاکە ڕەحمانی حاجی بایزاغا برد؛ پێنجسەد تمەنی دا کە کاسبی پێوە بکەم. دەگەڵ کوڕێکدا بووینە شەریک و هەتا چل تمەنمان زەرەر کرد، کلکی وشتر گەیشتە عەرزێ! بە پەلە قەرزەکەی کاک ڕەحمانم گەڕاندەوە؛ نەوەکا تووشی زیانی زۆرتر بم.

لە پاش مردنی هەوەڵ ژنم هەر دە حەولدا بووم بە دڵی خۆم ژنێک بێنم. زۆر کیژ و بێوەژنیان بۆ دۆزیمەوە؛ بەڵام کەیفم نەیدەگرتن. ڕۆژێک میوانی ماڵێک بووم، خوشکێکی چکۆلەی هێشتا کاڵی خانەخوێکەم زۆر دڵ گرتی؛ بەڵام هیچم نەدرکاند. دوایی بیستمەوە کە ئەو کیژە ئاشنای ماڵی قۆچبەگە و قۆچبەگیش ئاشنای قسەی قۆڕ و جەفەنگم بوو. خوازبێنیم لێ کرد و سەری گرت. «مەعسووم» کچی «کا حەمەدی نۆبار»م لێ مارە کرا؛ کە هێشتا تەمەنی لە چاردە ساڵاندا بوو. بۆ مخارجی بووک هێنان دامابووم. کابرایەک بە ناوی عەبدولکەریمی شەوکەت –کە بازرگانی کوتاڵ و دوڵەمەند بوو، خەڵکیش بە سوودخۆریان باس دەکرد- پیاوەتی کرد و گوتی من قەرزت دەدەمێ و هەر گا بووت بمدەوە. توانیم ژن بگوێزمەوە؛ بەڵام تا بە خۆم زانی پتر لە سێ هەزار تمەن بە عەبدولکەریم قەرزدار بووم. ڕۆژێک لێی پرسیم: بۆ کاسبیەک

ناکەی؟ گوتم: دەسمایە چۆن؟ گوتی: تۆ زۆر بە من قەرزداری، ها پێنج سەد تمەنی دیشت بدەمێ، یان گاڵ دێ یان پەمۆ. دەگەڵ کۆنە شەریکەکەم دامەزراندەوە. تووتنی شینی خراپی دەکڕی، دەیکوتا و سەبیلەڕێژی دەکرد و بە عەجەمانی دەفرۆشت. بە نیوە قازانجەکەی وردە-وردە دەبووژامەوە.

زستان بوو؛ ڕێگەوبان گیرابوو. ترسی عەجەمیش بۆ هاتنە کوردستان زۆر ببوو. ڕۆژێک حوسێن -کە ناوی شەریکەکەم بوو- هاتە لام. شلەژابوو؛ لووتی ئارەقی کردبوو. گوتی: ماڵمان خرابوو، تووتنی شینی زۆرم بە سەردا ماوەتەوە و مشتەری نایەن. چاری ناچار عەنبارێکمان بۆ تووتنە شین گرت و سەر لە بەری زستان و مانگێک بەهار لە ناهومێدیان سەرمان لێ نەدایەوە.

ڕۆژێک دیتم فەتحی بە هەڵەداوان هات و بزەی سمێلی بوو. گوتی: لە سایەی دڵۆپەی زۆر و تەڕایی بنی عەنبار، تووتنەکەمان هەر چەند نیو گەزێک لە سەر و بنیەوە ڕزیوە، بۆتە زێڕی بێ غەوش. تووتن بە دەرەجەی هەرە باڵا فرۆشرا و لەپڕ دەوڵەمەند بووین! هەر یەکی چوار هەزار و پێنج سەد تمەنمان پێگەیشت و هەر ئەو ڕۆژە قەرزی عەبدولکەریمم دایەوە و دەسمایەشم بۆ مایەوە.

هەر ئەوساڵەش لە ئیدارەی تووتنی بۆکان بوومە عەنباردار مانگێ بە سەدوبیست تمەن؛ بەو شەرتەی دوو مانگ لە حقووقەکەم بۆ ئەو کەسە بەرتیل بێ کە دایمەزراندم. تووتنیشم بە بەرەوە دەکڕی و دەفرۆشت. هێندێک شیعرم لە سەر تووتن دزین هەڵگێڕابوونەوە؛ هەرچی گووکارییەکی لە ئیدارەی تووتندا دەکرا، دەرمخستبوو. بازرەسی گشتی لە تارانەوە هاتبوو؛ ناوی فەرهادی بوو. داوای ئەو شیعرانەی لێ کردم؛ دەگەڵ خۆی بردن. پاش ماوەیەک نامەیەکی مەجەللەی گاڵتەی بابا شەمەلم بۆ هات، دەڵێ ئەگەر بێیە تاران جێگەمان بۆ تۆ هەیە. دیارە من کە لە بنەوە «ژێ-کاف» بووم نەدەچووم؛ بەڵام ڕەنگە ئەگەر ئەودەم لە سەر ئەم قسە قۆڕانە ڕۆیشتبام، بمتوانیا ببم بە نووسەرێکی گاڵتەچی.

ساڵەودوا خۆم کردە بازرگانی گەنم. دەگەڵ برادەرێکا بووینە شەریک؛ گەنممان لە بۆکانەوە دەبردە تەورێز و دەمانفرۆشت. چونکە زۆرمان دەبرد، ئەگەر کیلۆی نیو شایی خێری بکردایە، هێشتان زۆر بوو. جارێکیان سەدوبیست تمەنمان زەرەر کرد. هەر ئەو ڕۆژە چووینە دیدەنی حەمەدەمین ئاغای مەحمووداغا -کە ئاغای بۆکان بوو. قەپان و سەرانەی ماڵاتی بازاڕمان ئیجارە کرد بە مانگی هەشتاویەک هەزار تمەن. چوار کەسی دیش خۆیان کردە شەریکمان. نۆ ڕۆژمان بە دەستەوە بوو، یازدە هەزار تمەنمان خێر کرد؛ تا لە سەریان زیاد کردین. جارێک حەمامی بۆکانم بە ئیجارە گرت. بەڵام نەچوومە سەری و بە هەشت سەد تمەن خێر فرۆشتمەوە. خولاسە لە بۆکان خێروبێرم بە سەردا دەباری و تەواو ساز ببووم.

سەعدی دەڵێ: «دەنگی خۆش بژیوی گیانە»؛ هەمزەی شەریکم زۆر دەنگی خۆش بوو. بڕیارمان دا لە تەورێز نەچینە ئەو ئوتێلەی کە هەموو کوردی سابڵاغی دەچوونێ؛ چووینە ئوتێلێکی بێ کورد. کاک هەمزە شەو لە ژوورەکەدا گۆرانییەکی گوت. خاوەن ئوتێل هات گوتی: هەر چەند لە کوردی تێناگەم، بەڵام ئەو دەنگە زۆری کار لێ کردم. وەتاغێکی دوو نەفەری دوور لە جادەی داینێ و سوێندی خوارد کە پوولمان لێ ناستێنێ و هەرچی دەمانەوێ بۆمان پێک بێنێ، بەو شەرتە ڕۆژێ جارێک گوێی لە گۆرانی هەمزە بێ.

جگە لە کاری ڕۆژمان -کە سەردان لە بازاڕی گەنمفرۆشان و بە شارا گەڕان و سەیر کردنی

قەیسەری و ڕاستەبازاڕان و چاوچەڕاندن بوو- شەوانە هەر لە ئێوارەوە دەچووینە سینەما. ئەمما ڕاستت دەوێ ئێستاش نەمانزانی کام فیلم باشە و کامی ناخۆشە. خاوەن سینەماکان بۆ ڕاکێشانی لاوان، کچی زۆر جوانیان بە خزمەتکار ڕادەگرت. پیاو کە لە لۆژ دادەنیشت، کچێکی زۆر لووسی بە ناز و نووز فێرکراو، بە شیرنی و ئابجۆوە دەهاتە ژوور و بە دەست بازیبەک و گا ماچێک و دوان، پوولێکی باشێکی چوار و پێنج بەرابەری نرخی بازاڕی لە مشتەری دەستاند. ئێمەش لەو دادۆشین و دەستبڕینە بە ئاشکرایە خۆشمان دەهات و بە ئانقەست ملمان بە تەپکەوە دەکرد.

ڕۆژێک لە سەر قسەی خەڵک چووینە مزگەوتێک لە تەورێز بە ناوی «صاحب‌الامر» کە گوتیان چوارشەممۆیان زۆر خۆشە. حەوش و ژووری مزگەوت لە ژن و کچ جمەی دەهات؛ بەردی دیواریان دەلستەوە کە بە مراد بگەن. لە ژوورەوە گونبەزۆکێک هەبوو دەیانگوت ئیمامە. مەلایەکی پیری ڕدێن خەناوی بە زیارەت ڕادەگەیشت. دوای زیارەت من دوو تمەنم دایە. کابرا کە هیچ کەس هەرگیز لە چوار شایی پتری نەدابۆیە، لەو حاتەمییەم واقی بردەوە. هەر وەک بترسێ کە لێی بستێنمەوە، نایە تەنکەی باخەڵی و خۆی دایە سووچێکی تاریک و زەق لە منی ڕوانی. تا تەماشام دەکرد چاوێکی لێ دادەگرتم. تەواو دڵخورد بووم. هەمزەم تێگەیاند و لێی چووە پێش و بە تووڕەیی تێی ڕاخوڕی:

- بۆ چاو لە هەواڵم دادەگری؟

مەلا گوتی: کەس وەک ئێوە مەرد نییە، لە سەر یەک دوو تمەنتان داومێ. ئێستاش ئەمڕۆ وەرنە ماڵە من، نۆ ژنی زۆر جوانم بەدەستە، کامیانتان هەڵبژارد لێتان سیغە دەکەم و خزمەتکارم.

من گوتم: ئاغا ئێمە سوننی مەزەبین؛ سیغە و قەحبە لای ئێمە وەک یەکە و بە حەرامی دەزانین؛ ئەمە ناکەین.(ایا اینتر شود؟) ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: - خوا نەکا سوننی بن. پیاوی وا چاک حەیفە سوننی بێ!

چووشینە زیارەتی سەید هەمزە کە عەزیزخانی سەرداری موکری لە بارەگای ئەو نێژراوە و گۆڕەکەشی زۆری قەدر گیراوە؛ چونکە لە دەورانی دەستەڵاتیا خەڵکی تەورێزی لە بەڵای قاتی و گرانی ڕزگار کردووە. ڕەنگە نەشیانزانیبێ ئەویش سوننی بووە! ئەوی لە بیرمە کە سەرنجی ڕاکێشابم دیدار لە ماڵی قەرە سەید ناوێک بوو کە دەیانگوت فاڵ دەگرێتەوە و نوشتە دەنووسێ. خانووبەرەکەی دوو حەساری دە ناو یەکدا بوو. خێزەرەی مشتەری وەک مێرووی دەوری چەوری کۆمەڵ ببوون. دەبوو سەید وەخت بدا کە فلان ڕۆژ بێنە لای. کە زانی دوو کورد هاتوون، گورجێ ڕێگەی لای خۆی داین و قەدری زۆری گرتین و تێری قسەی خۆش بۆ کردین. پاش چەند ساڵ بیستمەوە کە سەید جاسووسی ئینگلیسان بووە.

لە تەورێز بۆ ڕیش تاشین و سەر چا کردن دەچووینە لای دەلاکێک. گوتی شتێکم بۆ بنووسە کە ڕیش تاشین بە قەرز نابێ. من دوو شیعری فارسیم بۆ نووسیبوو کە لە بیرم نەماون، بەڵام ماناکەی ئەوە بوو: «هەی بێ ئینساف! تۆ ڕیشەکەت لای من دەتاشی و قەرز نادەیەوە، من کوێت بگرم؟!». کابرا دە شووشەی گرتبوو هەڵیواسیبوو. ڕۆژێک گوتی: نازانم چت نووسیوە، بەڵام هەر چی دەیخوێنێتەوە پێ دەکەنێ و پێشم ناڵێن چییە!

ئەوەندەم لە بیر چوو بڵێم: بۆ هەوەڵجار کە هاتمە تەورێز و چوومە باغی گولستان، دیتم

تورکێک زوڕنا لێدەدا. هیچ شتێکم پێ لەوە عەجایب‌تر نەبوو. پێم وانەبوو جگە لە لۆتی کورد کەس زوڕنا لێ بدا. چەند سەیرە: تورک و زوڕنا لێدان؟!

### دینداری

بابم زۆر موسڵمانێکی بەڕاستی بوو؛ مەلاش بوو. ئەوانەی دەیانناسی بە وەلی و پیاوی خوایان دەزانی. هەر زۆر لە منداڵیمەوە، لە تەمەنی پێنج و شەش ساڵیمەوە فێری نوێژ جەماعەتی کردبووم. لە بیرمە جارێک زۆر گریام چونکە جەماعەتی نوێژی سبەینەم فەوتاوە. هەر لە منداڵی زۆر کاڵەوە ڕۆژووی ڕەمەزانم بە تەواوی گرتووە.

لە مەجلیسی بابمدا باس هەر باسی دینداری و پارێزگاری بوو. زۆر جار دەمبیست کە فلانە کەس زۆر دیندارە و فیسارە کەس دینی کەمە. زۆرم بیر لە دین دەکردەوە کە دەبێ چ بێ. ئاخری حەلم کرد: گرێی ئەستۆم بە دین زانی! منیش لە ناو منداڵاندا کە پیاوێکم دەدیت گرێی بەرئەستۆی زلە، دەمگوت ئەو پیاوە زۆر بەدینە! ئەگەر گرێی ئەستۆی زۆر زەق نەبوایە، دەمگوت دینی لاوازە. چونکە کوڕە مەلا بووم منداڵان باوەڕیان پێدەکردم و ئەوانیش دیندار و بێدینیان دەناسی. بۆ خۆشم دەستم لە گرێی ملی خۆم دەدا، بە داخەوە زۆر بچووک بوو. دەمگوت با گەورە بم ئەمنیش دێمە ڕیزی دینداران. تا نەکەوتمە ناو فەقێیان و زۆریان دەگەڵ نەژیابووم، دینداریبەکەم هەروا گەرم و گوڕ بوو. بەڵام دەڵێن: «گایەک دە پاڵ گایەکدا بێ، ئەگەر ڕەنگی نەگرێ خووی دەگرێ»، لەم بارەوە هاتمە ڕیزی فەقێیان و لە نوێژی سبەینە چوون نەدەگریام. بەڵام خودا و پێغەمبەر ناسین و عاقیدە بە شێخایەتی شێخی بورهانم هەر وەک خۆی ما. هەر چەند خۆم بە مەنسووبی شێخی بورهان دەزانی، دەگەڵ ماڵە سەیدی زەنبیلیش ئاشنایەتی زۆر گەرم و گوڕم هەبوو. شێخ محەممەدی خانەقا وەک کوڕێکی خۆی دادەنام و لەقەبی «جووجەڵە»ی دابوومێ. سەید محەممەدی زەنبیلیش زۆری خۆش دەویستم و هەتا بچوومایە زەنبیل دەیبردمەوە ژووری ماڵ و ئەوپەڕی لوتفی دەگەڵم هەبوو. واتا لە هەردووک بەری جۆگە دەلەوەڕام. ئەگەرچی لە دواییدا نوێژیشم دەچوون و زۆر جاران هەر تەرکم دەکردن، بەڵام ڕۆژوو گرتنم تا تووشی نەخۆشی سیل بوونم لە بەغدا دەست لێ بەرنەدابوو.

### دڵداری و لاوەتی

وەک باسم کرد تازە تەمەنم دەبووە یازدە ساڵ کیژێکم خۆش دەویست. بە بێ ئەوە هیچ لە لای دڵبەر بدرکێنم. دە پاڵ خۆمدا دەسووتام و پیاو هەق بلێ ئەو دڵدارییە زۆری دڵنەرم کردم و هەست و بیری ناسکی فێر کردم. دڵدارییەکی زۆر پاک بوو. هەر چەند دڵبەرەکەم لە پاش زۆر ساڵان هەستی پێ کرد و ڕووی خۆشی نیشاندام، بەڵام فەرقی دارایی ماڵی باوکی ئەو و باوکی من نەیهێشت پێک بگەین و بەرهەمی هەموو گریان و دڵ دۆڕاندن لە یەک-دوو ماچ تێنەپەڕی و بۆ یەکجاری لێک دیدار ئاخرەت بووین و ئێستاش بە پیری تا وە بیرم دێتەوە، ئاخێکی ساردی بە دوودا دەنێرم.

دووهەم جار دڵم وەک پەپوولەیەک بە پەڕەی گوڵی ڕوومەتی کیژێکی کچە مەڕدارەوە نیشتەوە. هەر چەند خەڵک دەیانگوت دەم و چاوی دەنکە - دەنکە ئاوڵاویە و سپیلکەڵەیەکی زۆر جوان نییە، بەڵام لەبەر دڵی من وینووسی خودای جوانی بوو. ئەویش زۆری خۆش

دەویستم. ڕەشماڵیان لە نزیک ڕەشماڵی خانەخوێی من بوو؛ هەر چیغێکمان نێوان بوو. ڕۆژانە کە پیاویان دەچوونە کارێ و کاری ماڵێ لە سەر ئەو بوو، زۆر دەرفەتمان بۆ دەڕەخسا کە یەکتر ببینین و بە ڕاز و نیاز و وردەماچان، کوڵ و کۆی خەم دامرکێنین. شەوێک لە شەو شەق بووندا، ئێستاش نازانم چۆن توانیم خۆم لە سەگان بدزمەوە و چۆنم وێرا وەک دزی لەزەبر درگای چیغ لادەم و بچم لە خەو خەبەری کەمەوە. هاتە دەر و لە سەر وردە دڕوە گوێنیان دەستەملان درێژ بووین. ئەوەندە کیژێکی پاک و شەرم بەخۆ بوو کە شەرمم لێ دەکرد و بە هیچ بارێک خەیاڵی خراپم بە دڵدا نەهات. حەزی دەکرد هەڵیگرم؛ بەلام تارمایی باوکم دەهاتە بەرچاوم و دەترسام. لە پاش ماوەیەک لە دڵی خۆمدا بڕیارم دا کە بچم و هەڵیگرم. بەلام هەیهوو، گوتیان براکانی زانیویانە و پاسی دەدێرن و تۆش ببینن سێبەرت بە تیر دەنگێون. هەر ئەوەندەم توانی لە دەرفەتێکدا نیو دەقیقەیەک بیبینم و داخ و عەزرەت بە یەکتر بگۆڕینەوە. ڕاستی برینێکی تازە هاتە سەر کۆنە برینی قرتماغە گرتووی دڵم.

لە پاش ئەو دوو جار ناهومێد بوونەم، ئیتر دڵداری ڕاستەقانیم لە بیر چۆوە. بوومە پەپوولەیەک کە لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێک دەفڕی و لە جیابوونەوەش تەم داینەگرێ. لە هەر دێیەکی خوێندوومە، لە هەر جێیەکی پیا ڕابردووم، هەر جوانێکم دیوە، چاوی بزم تێ بڕیوە. جا یان بە بۆلە جوێنیان پێ داوم، یان بزەیان هاتۆتە سەر لێوان و جار و ناجار بە دوو قسەی خۆش بە سەریان کردوومەوە و گاگایەکیش ماچ و مووچێکم دەس کەوتووە.

هێشتا لاوێکی لووس و پووس بووم، ژنە ئاغایەکی زۆر جوان و بە سەر و سیما و کەیخودا و پیاوانە، کە لە مەجلیسی پیاوان دادەنیشت و لە داکوژانی کێشەی خەلک و گوندیاندا قسەی لە سەرووی پیاوانەوە بوو، تەمەنیشی لەودێو سی ساڵ بوو، نازانم چۆنی چاو دابووە من، بە هەزاران نەرمە فێڵ و لاواندنەوەی دایکانە کێشامیە بەر کەمەندی خۆی و بە تەپکەیەوە بووم. ماوەیەکی زۆر وەک دایکەکەی ژان ژاک ڕوسۆی لێ هات. تا نەمرد لەو دڵداریە دەرنەچووم و لە ڕاستیشدا مەرگی ئەو داغێکی گەورەی بە جەرگەوە نام. ئیتر ئەو دڵداریە ڕاست و درۆیانە، گشتی بە ژن هێنانم دوایی هات و لە هەر دوو جاری ژن هێنانمدا عاشقی شەریکی ژیانی خۆم بووم و زۆریش خۆم بە بەختەوەر زانیوە.

## من و شیعر

مرخی شیعر شتێکی خودادادییە و تەبعی مەوزوون دەگەڵ منداڵ دێتە سەر دنیا. زۆر کەس لایان وایە شاعیری بە میرات لە باوکەوە بۆ منال دەچێ، ئەم قسە زۆری ڕێ تێدەچێ. هەرچۆنێک بێت، منداڵێ کە لەوانەیە ببێتە شاعیر، شیعری خەلک ڕاست دەخوێنێتەوە، فەرقی لەنگ و لۆر دەکا، بەلام لە مابەینی هۆنەر و شاعیردا فەرق و جیاوازی هەیە. کەسێ کە هەڵبەستە دەڵێ و لەنگ و لۆری تێدا نییە هۆنەرە، بەلام وشەی «شاعیر» لە وشەی «شعوور»ەوە هاتووە؛ واتا هەست. هەموو هەستێکی باریک و پڕ لە مانای ناسک، با مەوزوونیش نەبێ، دەتوانێ ناوی شیعری لێ بنرێ. کە وابوو وشەی «هەستیار» بۆ شاعیر پڕ بە پێستە و وشەی هۆنەر بۆ «ناظم» ڕاستە.

گۆرانیبێژی خۆوێژی نەخوێندەوار هۆنەرن؛ کە لە هۆنینەوەدا لەبارن. جا منداڵێکی دەتوانێ فەرقی شیعری لەنگ و نالەنگ بکا، دەتوانێ حەول بدا و ببێ بە شاعیر. بەلام دەبێ زۆری

شیعری شاعیرانی جۆراوجۆر لە بیر بێ و زۆری متالای کتێبی هەموو جۆرە و ئاگاداری تەواوی لە خەلکی دنیای دەوروبەری خۆی هەبێ و بە کورتی وەک مێشەنگوین وابێ؛ شیرە لە گولان هەلمژێ و لە پاش دەسکاری کردنێکی وەستایانە، بە شکلی هەنگوین هێقی بکاتەوە. ڕەنگە نەتوانم لە سەر ئەو باسە بڕۆم، چونکە مەسەلەیەکی زۆر گرینگە و زۆر لە پیاو عاقلان قسەیان لێ کردووە. با باسی خۆم بکەم باشترە:

بابم تەبعی مەوزوون بوو؛ دەیتوانی شیعر بلێ؛ بەلام زۆری ڕق لە شاعیری هەلدەستا و لای وا بوو هەرکەس لە کوردەواریدا دەبێتە شاعیر، خوا نان و دۆی دەبڕێ و بە سوالکەری دەژی و بە سوالکەری دەمرێ. میسالیشی بە حەریق و مەلا مارفی کۆکی دەهێناوە کە ئەو دوانەی لە نزیکەوە ناسیبوون. حەریق کە مردووە نانی شەوی نەبووە. مەلا مارفیش هەتا مرد سوالنامەی بۆ هەرە پیاوی خوێڕیش دەنووسی و ئیوا هەبوو پارەی دە نانی بۆ نەدەنارد. کە دەلێم بابم تەبعی شیعری هەبوو، جاروبارە تاکە بەیتی دەنووسی. جارێکیش فەقێ نامەیان بە شیعر لێ نووسیبوو کە هێندێک قەند و چایان بۆ بنێرێ و بابم هەر لە سەر وەزن و قافیەی شیعرەکانی ئەوان جوابی دابوونەوە:

| | |
|---|---|
| عەزیزم شیعر و بەیتی تۆ گوتووتە | هەمووی سوال و زەلیلی و هات و هووتە |
| شتێکی زیادە قەند و چا، برالە | نە پۆشاکە، نە پێلاوە، نە قووتە |
| لە باتی سوالی ئەسپابی زیادی | وەرە تەرکی کە! مایەی ئابڕووتە |
| ئەوا ناردم دەزانم تەرکی ناکەی | کە خووی بەد دوژمنە و دایم لە دووتە |

ڕەنگە شیعری چاک نەبن؛ بەلام زۆر لە وەزن و قافیەدا ڕێکوپێکن و ئەگەر حەولی دابا دەیتوانی شاعیر بێ. مامێکی دایکیشم کە ناوی «سەید حەمە سەعیدی نوورانی» و یەکێک لە نزیکانی شێخی بورهان و مەلایەکی بەناوبانگ بووە، شیعری زۆرن و زۆریش شیعری چاکی هەن؛ بە تایبەتی قەسیدەیەکی کوردی هەیە کە لەتە بەیتی سەرەتاکەی «پەرگەمای قەلبم، بە ڕشتەی میهری مەولا ڕوو نرا»یە. زۆر بە تەڕدەستی پەسندی شێخی خۆی لە ناو چوارچێوەی سنعاتی کلاش چنیندا جێ کردۆتەوە. بەو بەیتە دوایی دێنێ و دەلێ:

با حەوالەی پاشی مونکێر بێ سەری نووکی کەلاش
چونکە عەف- عەف وا لە دەوری پادشاهی دین دەکا

جا ئەگەر تەبعی مەوزوون لە باوکەوە یان لە بنەمالەی دایکەوە بە منال بگا، یان هەر کەسە بە تەنیا بەشی خۆی وەرگرێ، من هەر زۆر بە مندالی تەبعم مەوزوون بوو. زۆر زوو هەستم دەکرد فلان شیعر لەنگە و فلانە ڕاست و بێ زەدەیە.

تازە کوێرە سیواتێکم هەبوو، بابم دیوانێکی تورکی پێ دەخوێندمەوە. شاعیرەکە «میرعەلی شیری نەوایی» بووە. من و ترکی؟ خوای تۆ دەزانێ وەک کەڕ لە داوەتدا بێ وا بوو. قەت یەک کەلیمەشم مانا نەدەزانی. جار- جار لە خوێندنەوەدا گرێم دەکرد، ڕادەوەستام. دەیگوت بۆ نایخوێنیەوە؟ دەمگوت وابزانم تەواو نییە. تووڕە دەبوو: هەتیو تۆ ترکی نازانی، چووزانی ناتەواوی و تەواوی شیعرەکە چییە؟! بەلام کە خۆی تماشای دەکرد دەیگوت: بەلێ لەنگە، فلان کەلیمەی لێ دەرچووە. مەلێ ناتەواوە، بلێ لەنگە!

هەر زۆر بە مندالی لە ترسی شەڕەشیعر- نەوەک بدۆڕێنم- زۆر زۆرم شیعر لەبەر کردبوو. وام لێهاتبوو کەم کەس بۆری دەدام. تەنانەت جارێک لە گوندێک ویستیان بۆ شەڕەشیعر بە گژ



کوڕە مەلایەکم داکەن. وەک گرێوە ئەسپ هەر کەسە لە سەر هەڵبژاردەی خۆی دەبڕی. سۆفی عەلی ناوێک گوتی: ئەگەر کوڕی مەلای دێ بردیەوە، مەڕێک دەدەم، ئەگەر ئەم کوڕەش بردیەوە مەڕێکم دەنێ: زۆر زوو سۆفی عەلی مەڕێکی بردەوە...

شەوێکیش دەگەڵ چەند فەقێدا چووینە گوندێک بە ناوی «خورنج». ئاغا ڕووی خۆش نەبوو؛ دەیەویست جوابمان کا. بۆ بەهانە گوتی:

– ئەگەر بە شەڕەشیعر، کوڕی من بۆڕ دەن ڕاتان‌دەگرم و زۆر بەخێر هاتن.

هەر چەند من لەوانی‌تر منداڵ‌تر بووم، سینگم دەرپەڕاند و گوتم:

– من ئامادەم بە شیعری فارسی، یان هەر بە شیعری عەرەبی، یان هەر بە شیعری کوردی شەڕەشیعری دەگەڵ بکەم؛ با بۆ خۆی هەڵبژێرێ!

قسەی خۆمان بێ درۆم دەکرد؛ شیعری عەرەبیم هەر لەبەر نەبوو. بەڵام هەتیوی ئاغا زۆر ترسا. وەک دەڵێن «بە پەتیش نەیدەکرد»، فسی خوارد.

نازانم گەلانی‌تر چۆنن؛ بەڵام هەر بەچکە کوردێکی دوو پیت و لەتێکی خوێند، تووشی گرانەتای شاعیر بوون دەبێ و لای وایە ئەگەر شیعر نەڵێ هیچکارە نییە. دەتوانین بڵێین ئەو کوردانەی کە دەرسیان خوێندووە، سەدی نەوەدی خەریکی شیعر دانانن! منیش هەر زۆر زوو تووشی ئەو نەخۆشیەی بووم. ملم نابوو لە شیعر، یان باشتر وایە بڵێم «میعر» هۆنینەوە. باڕۆکە بووم و لاسای قازم دەرکردەوە. قەڵەم و دەفتەر بێنە و ڕەشی کەوە و ناوی شیعری لێ بنێ. بەڵام شیعر چ شیعر؟ یاخوا بە نسیبی دوژمنانت بێ! نەشمدەوێرا نیشانی کەسی بدەم نەوەک بمکەنە گاڵتەجاڕی خۆیان. بە ڕاستی قسەی قۆڕ و بن‌شڕ بوون و خۆم پێم وابوو زۆر باشن؛ بەڵام خۆیشم جیاوازیم لە نێوان دادەنان. هێندیکیانم پێ شاکار و هەڵبژاردەتر بوو. بابم بیستبوویەوە کە خەریکی شیعرم، جا وەرە جوێنم بۆ دابارێ و بە سوێندی درۆوە ڕەش ببمەوە کە من گوناهی وام نەکردووە.

جارێکیان بە شیعر جوابی نامەی ئاغایەکم نووسیبوو. جگە لەوە کە کابرا زۆری تاریف کرد و ئافەریمی لێ کردم، بۆ خۆشم لە خۆشیان دەتگوت فڕیم. پێم وا بوو هیچ مریشکێک هێلکەی وا دووزەردینەی نەکردووە!

ڕۆژێک لە سابلاغ لە سەر تاتەکانی مزگەوتی شادەرویش لە لای مەلا مارفی کۆکی دانیشتبووم و داوای شیعری تازەیم دەکرد کە لەبەری کەم؛ چونکە هەموو شیعرەکانیم لەبەر بوو. وەک دابی عەرەبی پێشوو من ببوومە ڕاویەی مەلا مارف. بە مینگە و سەرخوراندنەوە گوتم:

– مامۆستا! من شیعرێکم گوتووە؛ بۆتی دەخوێنمەوە. تکایە لەبەر خاتری من مەفەرموو باشە. ئەگەر پێت باش نەبوو، پێم بڵێ.

پێکەنی، گوتی: شیعریش، ئەو سنعاتە ڕەزیلە خاتر و ماتری دەوێ؟! دەی بزانم!

شیعرە هەرە باشەکەم –کە جوابنامەکە بوو– بۆ خوێندەوە. کە لێی بوومەوە گوتی:

– ڕۆڵەم! ئەمە میعریش نەبوو؛ زۆر منداڵانەیە. هەر ئێستا بیدڕێنە و خۆتی لێ نامۆ کە.

شیعرم دڕاند و فڕێم دا. پاش تاوێک گوتی: ڕاستی بڵێ! هەمووی هی خۆت بوون یا لە خەڵکیشت دزیبوو؟ گوتم: هەمووی هی خۆم بوون.

گوتی: ئەگەر ڕاست بکەی، دوو بەیتیان شاعیرانە و ڕێک‌وپێک بوون. ئەگەر وەک ئەوانە بڵێی، بە هومێدم ڕۆژێک وەک خۆم لە برسان بمری!

جا ئەگەر خانم ئاوا بێ، قەرەواش چۆن سەگێک بن؟ ئەوە شاکارەکەمە دەبێ بیدڕێنم، گووکاریەکانم چۆن؟! بێ سێ و دوو کردن دەفتەرەکانی دیوانە جوانەکەم ئاگر تێبەردان و خۆم لە شیعر و شاعیری تەرە کرد و ببڕای- ببڕای ئاوڕم وە سەر نەدایەوە.

ئەو ڕۆژگارەی لە وشتەپە فەقێ بووم، ڕۆژێک کاکە ڕەحمانی حاجی بایزاغا هاتە حوجرە. تەرجیعبەندێکی لە شیعری کوردی و کوردایەتی خوێندەوە کە زۆرم لە لا خۆش هات. زۆرم حەول دا کە بیلێ و بینووسمەوە، گوتی خاوەنیان کە خالەمینە سوێندی داوم وا نەکەم وە دەست کەس کەوێ. کە لەو ناهومێد بووم، بۆ خۆم کەوتمە گارەگار و تەرجیعبەندێکم دروست کرد. کە ئەویش هەر لە لای خۆم مایەوە و بۆ کەسم نەخوێندەوە، چونکە لام وا بوو ڕووی مەجلیسانی نییە. ئاخری ئەویشم لە ناو برد.

لە بیرمە لەو زەمانەدا کە شیعرم دەگوت، ڕۆژێک دەگەڵ فەقێیەک بە ڕێدا دەڕۆیشتین. فەقێ دەمی لە شیعر وەردەدا و هەر باسی شیعری باش و شاعیرانی ناوبەدەرەوەی دەکرد؛ منیش فرسەتم هێنا و غەزەلێکم لە شیعری خۆم بۆ خوێندەوە. گوتی: بە خوا شیعری چاکە، ئەوە هی کێیە؟

گوتم: شیعری مستەفا بەگی کوردییە.

گوتی: هەی هەزاران ئافەریم! توخوا ئەوجاریشی بخوێنەوە.

دیسان زۆری لا خۆش هات. گوتم: سا وەڵلا شیعری خۆمە.

گوتی: دادەی ئەمجاریشی بخوێنەوە.

ئەمجار کە خوێندمەوە، تفوویەکی کرد و گوتی: مردووت مرێ، ئەمە شیعرە؟ ئەمە قسەی قۆڕە!

بەڵام لە دواییدا کە ببوومە ئەندامی کۆمەڵی «ژێ-کاف» و دیتم کۆمەڵە بە ئاواتەوەیە شاعیری هەبن و هێندێک شیعری پەسندکراویانم دیت و لام وا بوو منیش هەرچۆنێک بێت دەتوانم وەک ئەوانە بهۆنمەوە، لە خۆشەویستی کۆمەڵە، بامدایەوە سەر شیعر گوتن و بوومەوە بە شاعیری ناچاری و لەو ساوە نازناوی شاعیریم بە سەردا سەپا.

بەرە- بەری زستان بوو؛ چووبوومە شار و سەرم لە کۆبوونەوەی برادەرانی حیزبی دا. تێگەیشتم کە کاک هێمن هێندێک سروود و شیعری بۆ نووسیون. چەند شیعرێکی شاعیرانی عیراقیشیان پەیدا کردبوو. گوتیان زۆرمان نیاز بە شاعیر هەیە کە لە ئینتشاراتی خۆماندا بەرهەمیان شاندەین و زۆر گرینگە. من هیچ دەنگم نەکرد. کە هاتمەوە دێ، بیری خۆم هەڵکووشی و توانیم قەسیدەی «عەقڵ و بەخت» درووس کەم؛ بەڵام زۆر دڵ‌کرمێ بووم کە ئاخۆ بە کار دێت یان نا؟ شەوێک کە لە بۆکان دەگەڕامەوە و میوانی کاکە ڕەحمانی حاجی بایزاغای ئاغای شێخلەر بووم، سەید کامیلیش لەوێ میوان بوو. باسی شیعر و شاعیرانی کورد دامەزرا. گوتم: برادەرێکم شیعرێکی داناوە، سوێندی داوم کە ناوی نەبەم و نوسخەی بە کەس نەدەم، بەڵام هێندێکم لەبەرە، باوەڕیش ناکەم بە کار بێت. هێندێکم لە عەقڵ و بەخت خوێندەوە. سبەینێ کاڵە و پیتاوم هەڵپێچا و ماڵاواییم کرد. کاکە ڕەحمان دەگەڵم هاتە دەر، دوو ئەسپ و سوارێک لە درگا بوون. گوتی: سواری ئەسپ بە! ئەم پیاوە دەگەڵتا دێ، گوتوومە تا نوسخەی ئەو شیعرانەی پێدا نەنێری نەیەتەوە. دەشزانم تۆ تاقەتی میوانی وات نییە کە چەند مانگ بە خێوی کەی! هەر چی حەولم دا ڕزگارم نەبوو. ناچار هاتمەوە نوسخەم نووسییەوە و ناردم. بەڵام

نەزانیم کردبوو، لە جوابی کاکە ڕەحماندا نووسیبووم:

بە کوردی پێت دەڵێم لێم مەگرە ئیراد          دیاری شوانە ویلە، ئالەکۆکە

بەو تاکە بەیتە تێگەیشتبوو کە ئەو شیعرانە ئی خۆمن. شیعرەکانی لە بەر کردبوون. جارێک بۆ قازی محەممەدی خوێندبۆوە؛ بەڵام نەیگوتبوو هی کێن. قازی گوتبووی بمدەیە ڕۆژی جومعە لە سەر مینبەر بۆ خەڵکی دەخوێنمەوە؛ نەیدابوویە. دەمەو بەهار کە چوومەوە شار و سەرم لە حیزب هەڵێنا، تماشام کرد وا شیعرەکانی منیان لە تایپ داوە و بلاوی دەکەنەوە. کاتێ گوتم شیعری منە و ئەوا نوسخەم بۆ هێناون. گوتیان دەسا دەبێ زۆرمان شیعر بۆ بنووسی؛ بەلام چونکە بە ناوی نەناسراوی «هەژار» نووسرابوون، زۆر کەس بە ئی خالەمینیان دەزانی و زۆر دەرەنگ تێگەیشتن کە ئەو ئاگای لێ نەبووە.

بۆ ژمارە دووی گۆڤاری «نیشتمان» دەمەتەقەیەکم دانا و نیشانی زەبیحیم دا کە چۆنە چاپی بکەین؟ وەریگرت و فڕیی دا، گوتی: ئەوە هەر زۆر عەیبە و شیعر نییە و ڕێی ناکەوێ لە گۆڤاردا بێ! بۆ کاکە ڕەحمانم خوێندەوە، بە زەبیحی گوت: مەن ئەو دەمەتەقەم بە لاوە زۆر باشە. زەبیحی گوتی: بەڵێ بە ڕاستی شتی چاکە و چاپی دەکەین!

### ترسان و وێران

منیش وەک زۆربەی مندالانی دیکەی کورد، هەر لە بێشکەوە بە شەو لە بان و جندۆکە و غوولی بیابان و ئەو شتانەی کە هەر نین و قەت نەبوون، ترسێندرابووم. جا چونکە ئەو بەلا و موجزاتانە هەر لە شەودا دەگەڕێن، لە شەودا دەترسام و نەخوازە لە تاریکەشەودا دەترسام هەر دەرکەوم. بەلام ترسێک کە من هەمبوو ڕەنگە وەک ترسی کەس نەبێ. باوەڕ ناکەم هیچ منداڵێک لە خۆم ترسەنۆکتر بووبێت.

جارێک لە خانەقای شێخی بورهان، جەنگەی چێشتەنگاو چووبووم لە سەر مەرقەدی شێخ قورعانم دەخوێند. ژەنگە سوورەیەک بە لای سەرووی بەر هەیوانی مەرقەددا وزەوز دەگەڕا. ئەوەندەی لێ ترسام وەخت بوو گیانم دەرچێ. نەمکرا قورعانەکە لێک نێم، بەجێمهێشت و هەلاتم، بەلام هەلاتن! ئێوارێ دەگەڵ زیارەتکەران هاتمەوە، قورعان لە سەر کورسییە قورعان بە ئاواڵەیی بەجێ مابوو؛ هێنامەوە. شەوانە هەموو پنجەک و دارێکم لێ دەبوو بە جندۆکە و عیفریت. بە تایبەتی کە زۆرم چیرۆکی خێوی ئاوان (خوای کانی) بیستبوو، بە تەنیا نەمدەوێرا بچمە سەر کانی و چۆماوان.

نازانم چۆن بوو بڕیارم دا کە ئەو ترسە لە کۆڵ خۆم کەمەوە. وردە-وردە غیرەتم وە بەر خۆم دەنا. شەو دەردەکەوتم، تۆزێک دەگەڕام. جارێک لە گوندێک کە نزیکەی سەعاتە ڕێیەک لە خانەقا دوور بوو، وەختی خەوتنان گوتم دەچمە خانەقا. لە دێ دەرکەوتم. هاشەی گەلای داران بە دەم باوە، خوڕەی ئاوی چەم و خڕان، هاڕەی ئاشان، ترسێکی زۆری وە بەر نام. لە ترسان دەستم کرد بە گۆرانی گوتن. لەپڕ بە سەر قەبرستانێکدا کەوتم کە ڕێگە بە ناویدا دەڕۆیشت. من و گۆڕستان و شەو؟ «ڕووح لە جێیەکی سەختە و دەرناچێ». هەر هێندە دەزانم چاوم قونجاند و هەلاتم. دە هەلاتنەکەمدا هاڕە لە گوێمەوە دەهات. نەمدەوێرا ئاوڕ دەمەوە. لە دەنگی سەگانی دێیەکی سەر ڕێم وشیار بوومەوە. چونکە ترس لە سەگانیش زۆر بە هێز بوو. ڕێگام لە دێ لا دا و لەو لاوە هاتمەوە سەر ڕێ و لە سەگ ڕزگار بووم. توزێک دم و چاوم لە جۆگە ششت

و پشووم تەواو هاتەوە سەر خۆ؛ ملی ڕێگەم گرت. هاتم تا خانەقا و چراکانیم لە دوورەوە دەدیت. بەلام لەپڕ و نەکاو چی ببینم؟ یەک دانە جندۆکەی پیرێژن لە تەنیشت ڕێ هەلتروو شکاوە؛ دەستی دە بەر چەنەی ناوە، زەق-زەق تەماشام دەکا! چۆن عەرز قووتی نەدام و عاسمان هەلینەکێشام؟ قاچم سست بوون؛ تف لە دەممدا وشک بوو. باوەڕ دەکەی یان ناکەی، دەستم بۆ کلاوەکەم برد، مووی سەرم وا گرژ ببوو، وەک دەرزی لە کلاوەکەمەوە دەرچووبوون. نازانم چۆن شێت نەبووم. هێندێک ئایەت و دوعام دەزانی کە بۆ دەمی وا بە کار بێ، بەلام کێ لە وەختی وادا دوعا و موعای لە بیر دەمێنێ؟! هەلێم، هێزی قاچم نییە. خۆ ئەگەر سەعاتێکیش هەلێم، جندۆکە بە دوو شەقاو دەمگاتێ. دیارە ئەجەلم هاتووە. بە بیرمدا هات کە ئەگەر لە بەرانبەری دوژمنی کافردا پیاو دەست نەکاتەوە ئیمانێ نابا. ناعیلاج بە دەستی لەرزۆکەوە، بە داروو کەیەکەوە کە بە دەستمەوە بوو، خۆم بە سەر جندۆکەی مەلعوون دادا. دەست و چاوم هەمووی بە نووکی دڕوو بریندار بوو. چونکە جندۆکە پۆلە شیلانێک بوو لە دەم ڕێگە. جا وەرە لەو دەشتە بە تەنیا خۆم بە خۆم پێبکەنم! ئیدی لەوساوە ئیمانم بەو هەموو چیرۆکانە نەما کە باسی جندۆکە و غوول دیتنیان بۆ کردبووم. زانیم ئەو کەسانەش هەر پنچکێک منچکێکیان دیوە و هەلاتوون و بۆ ئێمەیان وەک چیرۆکی جندۆکە دیتن گێڕاوەتەوە. ترسی تاریکەشەوم نەما و لێکم دەداوە کە بۆچی لە ژووری دیوار سپی ناترسم و ئەگەر ڕەشیان هەلگێڕا لێی بترسم؟ سپیایی ڕۆژ و ڕەشایی شەو فەرقی چییە؟...

شەوێکی باران بە ڕێگەدا دەڕۆیشتم؛ ماندوو ببووم. تووشی قەبرستانێک هاتم کە قەبرەکان بە بەردی لووس هەلنرابوون. ویستم وچانێک بدەم. زەوی قوڕ بوو، بە ترس و لەرزێکەوە قوونم خستە سەر بەردە تابووتێک؛ مردووم لێ ڕاست نەبۆوە. نەخێر لەو خوانی ڕۆستەمەش ڕزگارم بوو. زانیم مردوو تازە حەوسەلەی شەڕ کردنیان نەماوە. تەنانەت وام لێهات کە شەوی ئەنگوستەچاو گرێوم دەکرد بچمە ناو گومبەز و سەرقەبرستانی زۆر بەسام و نەدەترسام.

ئەمجار دەمەویست هەر چۆنێک بێ جندۆکەیەک ببینم. بەردەگەورەیەک لە دامێنی شاخی تەرەغە هەیە، بە ئامان و زامان دەیانگوت هەر کەس بە شەو بە لایدا بڕوا، جندۆکە دەستی لێ دەوەشێنن و ناوی چەند کەسیان دەگوت کە لەوێ شێت کراون. شەوێک کە وردە بارانی بەهاری دەباری، بۆ چوونەوە مال بە ئانقەست ڕێگەم خستە ئەوێ، چوومە ناو هلۆلایی بەردەکە و چاوەنۆڕ بووم. خشپەی گەلایەک، هاشەی بایەک، خرمەی وردە بارانێک دەهات، دە دلی خۆمدا دەمگوت ئەوا هاتن؛ بزانم چۆنم دەنگێون؛ هەر دەبێ جندۆکە ببینم. لە سەرمان کەسیرە بووم و کەس نەهات. بە ناهومێدی دەرکەوتم و ملی ڕێم گرت. شەوە ڕەشی بەهار و کوێرەڕێ بوو؛ کەمتر ڕێگەم بەدی دەکرد. لەپڕ دیتم شتێکی ڕەشی زەلام لە بەر چاوم قوت بۆتەوە. ئەها بەخوا ئەوە جندۆکەی بن بەرد هاتۆتە سەر ڕێگام تاقیم کاتەوە! بەلام ترسان نەمابوو. بۆی چووم، فیشقاندی و دەرپەڕی و بەرەو گوند پەل بوو. جاشکێکی یەکپڕ بوو؛ لە گاڕان بە جێ مابوو. بە شوێنی ئەودا ڕێگەم دیتەوە و پێکەوە گەیشتینەوە گوند.

کە تازەش چووبوومە ناو فەقێیان لە سەگ زۆر دەترسام؛ فەقێ گالتەیان پێ دەکردم. لەوەش ڕاهاتم؛ ئەگەر سەگم بۆ دەهات دادەهاتمەوە بۆ بەرد و ئەو ڕایدەکرد.

دە پێشدا لە بەر مارمێلکەش هەلدەهاتم؛ وەمدەزانی مارە؛ بەلام کە دەمدی مندالی وەک خۆم بە دار یان بەرد مار دەکوژن، منیش وردە- وردە غیرەتم وە بەر خۆم دەنا و فێر بووم لە بەر



مار هەڵنەیەم و بتوانم بیکوژم. «سەید محێدینە شێتە» هەبوو، پوورزای دایکم و پێم دەگوت خاڵە. پیاوێک بوو زۆر بە ئازا و شەڕکەر مەشهوور بوو. هەمیشە پێی دەگوتم ئەگەر تۆ کوڕێکی ترسەنۆک بی، دیارە خزمی من نیت. جارێک من و خاڵۆزایەکم کە هەردووکمان لە سایەی وڵات تێکچوونی شەهریوەری بیست و پاشاگەردانی تازە سەرو تفەنگمان پەیدا کردبوو، پاش نیوەڕۆیەک ویستمان لە شاری سابلاغ دەرکەوین. گوتیان ڕێگە خەتەرە و چەتە هەیە؛ گوێمان پێ نەدا. سێبەر شۆڕ ببوون تووشی کابرایەکی سوالکەری گەڕیدە بووین. گوتی: کوڕینە! لە ڕاهی خودا بگەڕێنەوە، چەتەتان لە سەر ڕێگەیە و ئێستا لە بەر چاوی من کاروانێکیان بەر گوللە دا و ڕووتیان کرد. لەو خەبەرە ترسام؛ ڕووم کردە خالۆزاکەم گوتم: ئێمە تا ئێستا لێمان نەقەوماوە و دیارە تووشی شەڕە تفەنگ دەبین. تۆ دەڵێی چی؟ کابرایەکی خاوەن قاوەخانەی سەرجادەمان دەگەڵ بوو کە بە تەمای ئێمە هاتبوو، گوتی: بگەڕێنەوە، شەو مخاریجتان لە سەر من. حەمەدەمینی خالۆزام گوتی: هەرچی تۆ بڵێی وا دەکەم. لەپڕ خاڵە محێدینم هاتە بیر، گوتم: ڕەنگە بڕۆین بکوژرێین؛ ئەگەر بگەڕێینەوە لەوانەیە خاڵە محێدینم بزانێ؛ ئەوسا ئابڕووی بە هەزار ساڵمان دەچێ. حەمەدەمین گوتی: تۆش بگەڕێیەوە من هەر دەڕۆم. لە بن هەورازی جێگەی خەتەر ئەسپەکانمان بە کابرای قاوەچی ئەسپارد، کە بە ڕێگەدا بڕوا. خۆشمان هەر یەکە بە لایەکی چیادا دەست لە سەر پەلەپیتکە و لە سەر هەست سەرکەوتین. بەڵام بە سەلامەت گوزەرا و تووشی چەتە و شەڕ نەبووین. لەو ساوە کەوتە دڵمەوە کە ئەگەر قەومابا شەڕم دەکرد و بۆم هەڵکەوتایە چەتەم دەکوشت. یانێ منیش خۆم بە پیاو زانی و دەخۆم ڕادەدیت کە لە کابرای دەستدرێژیکەر کەمتر نەبم. هەردووکمان هەر خوێنمان لە لەش دێت؛ بۆ دوژمن بوێرێ هێرش بکا و من نەوێرم بەربەرەکانی بکەم؟

ماینێکم هەبوو، زینێکی کۆنی ئینگلیسیم لێدەکرد. بە لای منەوە زۆر شتێکی باش و ئاسایی بوو. لە سابلاغ میوانی ماڵی سەعید ناوێک بووم. تکای لێ کردم بە سواری ماینەکەم تا قونقەلا بچێ. ئێوارە کە هاتمەوە سەعید دەناڵێنێ و لە جێدا کەوتووە:

– ئەی ماڵت ئاوەدان بێ! زینەکە هەموو قنگمی داماڵیوە! چوومە لای حەکیم، مەلحەم و دەرزی بۆ نووسیوم.

تازە چووم سەیری زینەکەم کرد، ئەوەندەی باران و تاو لێ دابوو، وەک بەردی قرنج قرنجی لێ هاتبوو؛ بەڵام دیارە قوونی سەعید لە هی من ناسکتر بوو، من فێری ببووم.

### کوردایەتی

وەک مەعلوومە لە سەرەتای ئیسلامەوە هەمیشە گەلی کورد ژێردەستەی بێگانە بووە و هەرگیز ڕۆژێک -وەک لازمە- ئازادی کورد و کوردستان خۆی نەنواندووە. جا ئەگەر لە چنگ ئەمەوی و عەبباسیانیش دەرهێنراوە، چۆتە ژێر باری تورک و ئێرانەوە. وڵاتێکی سەخت و شاخاوی و گەلێکی زۆر لە شەڕ ئازا؛ زەوی و زاری بە بەر و بووم؛ کراوەتە مەیدانی شەڕی تورک و ئێران و هەر کامەیان ویستوویانە کورد بە کوژ بدەن و بیکەنە بەلاگەردانی خۆیان. نەخوازەلا لە دەورانی سەفەویەکاندا، لە پاش ئەوەی کوردێکی ژەنگاوی خۆی کردۆتە شێخی سەربەماڵ و لە ئێراندا پەرەی ساندووە و مریدی زۆری پێکەوە ناوە و بە ناوی «شێخ سەفی ئەردەوێلی» ناسراوە و زمانی تورکی کردۆتە زمانی ئەهلی تەریقەتەکەی خۆی، کوڕانی ئەو ویستوویانە بەهرەی سیاسی

لەو تەریقەتە وەرگرن، بوونەتە شیعەی زۆر دڵگەرم تا بتوانن بـە چـالاکی بەربـەرەکانێ زۆربـەی سوننی مەزهەبەکان بکەن و ئێران بۆ خۆیان ساغ کەنەوە. سوڵتانانی عوسمانیش خۆیـان کردۆتـە پارێزەری سوننیمەزهەبان و هەمیشە ئەو دوو هێزە بە گژ یەکدا چوون و کوردی تێـدا مـاڵوێـران بووە. ئەم باسە زۆر قووڵە و زۆری لە سەر دواون؛ نایەوێ بە درێژی لێـرەدا باسـی بکـرێ. بـەڵام ئەوەندە هەیە کە سەدان ساڵە هیچ کوردێکی ئێران نەبووە کە ڕکـی زۆری لـە دەسـتەڵاتدارانی شیعە مـەزهەب و بـە گفـتی خۆیـان لـە عەجـەم نـەبووبێ. هـەر بەچکـە کوردێـک لـە هـەوەڵ چاوکردنەوە و زمان گرتنەوە، بە ئاواتە لـە چنـگ عەجـەم ڕزگـاری بێـت. عەجـەم واتـە ئێـرانی دەسەڵاتدار؛ بەڵام چونکە کوردی موکریان هەر کاربەدەسـت و پۆلیـسی تـرکزمانیـان ناردوونـە سەر و جەزرەبە و ئازاریان لەوان دیوە، ناوی عەجەم بۆ ترک زمانەکانی جیرانیان بە کار دەبەن.

منیش وەک هەموو منداڵە کوردێک هەر زمانم پشکوتووە و هاتوومە ڕیـزی منـداڵان، بـوغزی عەجەمم دەگەڵ شیر مشتووە و بە دڵ ناخۆشم ویستوون. گوتم لە حەو ساڵانیمدا گوێزم پێکـدا دەدا و ئەوی بشکایە دەمگوت عەجەم شکا. زۆر جار لە بەر خودا دەپاڕامەوە پادشایەکی کـوردی چکۆلە و جوانم بە نسیب بکا. لە گەمەی شەوانەی گەڕەکـدا دەبووینـە دوو دەسـتەی عەجـەم و کورد؛ دەبوایە شەڕ بکەین، عەجەم بشکێن و کورد سەرکەون.

بـابم لـە تورکیـە مـەلا سـەعیدی بـەدیعوززەمانی دیبـوو؛ زۆر بـە ممبـارەکی دەزانی. کـە بیستبوویەوە لە لایەن سوڵتانی ڕۆمەوە کوژراوە، جگە لـە ناخۆشەویـستی عەجـەم، جنێـوی بـە تورکی عوسمانیش دەدا و بە کافری دەژماردن. دەربارەی کورد ئازاد بوون و لە دەست دوژمـنی کافر ڕزگار بوون، لای هێندێک لە میوان و هاموشۆکەرانی باسی دەکرد. چەند لاوێکی سـابلاغی حەزیان لە قسەکانی دەکرد و زۆر جار دەهاتنە لای کە گوێی لێ بگرن.

من و زەبیحی منداڵ بووین و لە بەر خۆمانەوە بە ئەندازەی عەقڵی منداڵی، کەیفمان بە کـورد دەهات. زەمان زەمانی ڕەزاخانی پەهلەوی بوو. کەس نەیـدەوێرا بیریـش لـە کـوردی نووسـین بکاتەوە و ناوی کوردی خوێندنەوە وای لێهاتبوو، ئەگەر کەسێک باسی بکردایە، سەرەڕای جنێـو، دەکەوتە بەر تیز و تەشەر و شەڕ و دەبوو بە گاڵتەجاڕ. لە بیرمە ڕۆژێک زەبیحی لێم پەیـدا بـوو؛ ئیشارەتی بۆ باخەڵی کرد. گوتم چییە؟ گوتی با بڕۆین دەزانی. لە شار دەرچووین؛ نزیـک پـردی سوور گرە بەردێک هەبوو، بنی هلۆڵ بـوو. خۆمـان لـە بـەر چـاوان ون کـرد و کـتێبی دەرێنـا: «ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد» کە هـی پیاوێکـە بـە نـاوی «ئـەمین فـەیزی بـەگ» و لـە سـاڵی ١٣٣٩ک (١٩٢٠ز) لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە. پڕ بوو لە شـیعری شـاعیران. جـا وەرە و بتوانـە ساغی کەوە! هەر چۆنێک بوو تەقە-تەقێکمان لێ دەکرد و بەشی خۆمـان - ئـەویش بـە حاڵـی سەگ- لێ هەڵدەکڕاند. چەند ڕۆژێک ئەو کارەمان کرد. ڕۆژێک تووشـی شـیعرێکی شـێخ ڕەزا بووین و دە قوڕ گیراین:

خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا    مێروولە نەچێ چاکە بە گژ قوڵلەیی قافا

دەمانخوێند: «مێروو، لە پخێ چاکە بە کەپور قوڵلەی قافا!»، مـن دەمگـوت لەنگـە، دەیگـوت ئاخر یانی چی لەنگە؟ دەمگوت نازانم، بەڵام دەزانم نەمانزانیوە. فکر، فکر، خوایە چی بکەین و لە کێ پرسین؟ گوتم: هەر چەند دەزانم ڕەنگە لێدانێکیش بخۆم، بەڵام لە بابم دەپرسم. شـەو کـە بابم خەریکی متاڵا بوو، تۆزێک مینگەم کرد و سەرم خوراند و گوتم:

- بابە!

سەری هەڵێنا:

- ها چییە؟

بێدەنگ بووم؛ قرتەم نەهات. دیسان پاش تاوێک گوتم:

- بابە؟

- بەڵێ، دەڵێی چی؟

دیسان پەشیمان بوومەوە. ئەوجار هەستام چوومە لای درگا کە ڕێگەی هەڵاتن بە دی بکەم.

- بابە!

- ئەی سندان! ناوم لێ دەنێی؟ دە بڵێ بزانم چت دەوێ؟

- ئاخر لێم نادەی؟

- نا بۆچی لێت دەدەم؟

- شیعرێک هەیە من و زەبیحی نایزانین، پێمان بڵێ.

گوتی: زۆر باشە، کوانێ؟

ئەنجومەنە بۆرم لە باخەڵ دەرێنا و شیعرەکەم شاندا. گوتی؟ چۆنتان خوێندۆتەوە؟

کە بۆم گوت، لە قاقای پێکەنینی دا، گوتی: پیاو هەرچەندی بە ئانقەستیش حەول بدا نازانێ وای غەڵەت بخوێنێتەوە. بۆی ساغ کردمەوە و گوتی: جا ئەگەر ئێوە کوردی دەخوێننەوە من زۆرم هەیە.

هەستاین چووینە حەساری ماڵ؛ گڵی لادا، سندووقە فیشەکێکی ڕووسی داپۆشیبوو کە پڕی بوو لە دیوانە شیعری چاپکراو و بە خەت نووسراو. ئیتر خودا وەتحەسێنێ، دیوانی نالی، کوردی، شێخ ڕەزا، سالم، حەریق و نازانم چەندی‌تر، یەکە-یەکە وەرماندەگرت و غەڵەتمان دەپرسییەوە. سدیق حەیدەری و سەعید حەمەقالە ناویش کە لە ئێمە بە تەمەن‌تر بوون دەچوونە ڕەواندز و لە هاتنەوەدا چاپکراوی کوردییان لە لای حوزنی موکریانییەوە دەهێنا و دەیاندایێ. تا زۆر باش خۆمان لە کوردی خوێندنەوە ڕاهێنا و بەرە-بەرە دەممان لە باسی ئازادی کوردستان و ئاوات‌خوازی ڕزگاری کوردەوە وەردەدا.

نازانم چۆناوچۆن بوو کە چەند کەسێکی‌تریش ببوونە ئاودەنگیمان و شەریکی بیرکردنەوەمان بوون. لە سابلاغ «حوسێنی زێڕینگەران» کە پاشان بە «فرووهەر» دەناسرا، «عەزیزی کاکاغا» کە ئەفسەرێکی پۆلیس بوو، «مینەی شەرەفی»، «عەبدوڕەحمانی کەیانی»، لە لادێ «کاکە ڕەحمانی حاجی بایزاغا»، «مەلا ڕەحمانی حاجی مەلای عەزیزکەند» و ڕەنگە هی تریش کە لە بیرم نەماون، واتا حیزبێک بووین بێ بەرنامە و تەنزیم. کارمان هەر ئەوەندە بوو کە دەگەیشتینە یەکتر دڵی خۆمان بە ئاواتەکەمان خۆش دەکرد.

جارێک زەبیحی دەگەڵ خۆی بردمیە ماڵی پیاوێک بە ناوی «خالە مەلا». پێم وایە جگە لە ئێمە دە کەسی‌تریش لەوێ بوون. گوتیان ئێمە دەبینە حیزب و دەبێ ئاگامان لە یەکتر بێ و سوێند بخۆین کە خیانەت بە یەکتر نەکەین. ئەم کۆبوونەوە زۆر مایەی دڵخۆشی بوو؛ کوردایەتیمان پتەو بوو. دوو- سێ کورتە باسم لە بارەی ئەو هاوکاریەوە لە بیر ماوە:

دەگەڵ عەزیز و حوسێن چووبووینە قاوەخانەی حیکایەت‌خوان. حیکایەتی ئەسکەندەرنامەی دەگوت. هەر دەیگوت: «تۆز لە بیابان هەستا، بای ڕەحمەت تۆزی لادا، دە ئاڵا نیشانەی سەد هەزار چەکداری فلان پاڵەوان دەرکەوت و دیسان تۆز و ئاڵا و فلان پاڵەوان...» و هەروا درێژەی



دەدا. عەزیز –کە تۆزێک سەرخۆش بوو- بانگی کرد: «سەگباب ئەدی کوا ئالای کوردستان؟» و دەمانچەی دەرێنا. خەڵکی قاوەخانە بە جارێک تاسان، حیکایەتخوان سپی هەڵگەڕا و لەرزی و ملی لێ نا کە: «تۆز هات و ڕابرد و سەد ئالای نیشانەی یەک ملیۆن لەشکری سەلاحەددینی ئەییووبی دەرکەوت...» حوسێن عەزیزی لە چاخانە وە دەر نا و من شوێنیان کەوتم. دەمانچەکەیان دا بە من کە من منداڵ و بێ شکم، نەوەک بیانگرن.

گوتیان ئەفسەرێکی دژبان سەر و بنی قسەی، جنێو بە ڕەگەز و دینی کورد دانە و ناو و نیشانەشی فلانە. عەزیز خەتی بۆ کێشا کە تەمبێی بکا. شەوێک زستان و بەفر لە عەرزی بوو. چووینە دەوروبەری دژبان قەدەممان لێدا تا کابرا هاتە دەر. عەزیز بە هەوای سەرخۆشی یەخەی گرت و بەربووە لێدانی، حوسێن و منیش بە ناوی ناوبژیکەر چووینە یاریدەی و بگرە کوێندەرێت دێشێ، شل و کوتمان کرد. دژبان هاتن، ناوبژیکەر هەلاتن و عەزیز گیرا. وەک خۆی گوتبووی بە تەلەفۆن خەبەر بە فەرماندەری لەشکری سابلاغ درا و فەرمانی دا عەزیزیان بۆ بەرد کە خۆی تۆڵەی لێ بکاتەوە. هەمووی شەوێ پێکەوە ئارەقیان خواردەوە و قوماریان کردوە و سبەی عەزیز هاتەوە و ئازاد کرابوو.

کوڕێکی سابلاغی بە ناوی حەمیدی سولتانی –کە مەئمووری دەوڵەت بوو- بە سێ ئەمنییەوە هاتە تەرەغە و داوای مازاد گەنمی لێکردم. گوتم هیچم نییە و هێشتا دروێنە نەکراوە و بۆ خۆم جۆم قەرز کردووە و نانی جۆ دەخۆین. قسەمان تێک پەڕی و گوتی مەلابازی دەرمەهێنە. هەر چەند کەس ئەو ڕۆژە نەیدەوێرا بە پیاوی دەوڵەت بڵێ پشتی چاوت برۆیە، من زۆرم ڕک هەستا. کابرام بە سێ تمەن لە پۆلیسەکان کڕی؛ دوو کەسم بانگ کرد و خۆم، بەربووینە گیانی، «چت خواردووە ترش و چەوەندەر؟»، هەر چی هاواری کرد پۆلیس خۆیان کەڕ کرد. وای لێهات لە سەر پشتی بارگین دایانبەست و بەرەو شار بوونەوە. منیش بە ڕێیەکی سەربڕدا خۆم گەیاندە شار و هاوارم بۆ عەزیز و حوسێن برد کە لە شکایەت دەترسم. هەردووک لە حەمید خەفتابوون. هەر لە ماڵ دەرچووبوو وەریگەڕابوونێ و سوێندیان دابوو کە شکایەتم لێ ناکا. لەو ساوە مەئمووریتریش کە هەموو گیانیان تەشقەڵە بە خەڵک کردن بوو ترسابوون و لە بەرانبەر من پرکێشیان کەمتر دەکرد.

قسە، قسە دێنێ: ئەو دەمانەی کە لە تەرەغە دەژیاین، بە دەست ئەمنییە و مەئمووری دەوڵەتەوە ژیانمان جەحەندەم بوو. ڕۆژ نەبوو دەستەیەکمان لێ پەیدا نەبن و تەشقەڵەیەکمان پێ نەکەن و بەرتیلمان لێ نەستێنن. جلکی کوردی، تووتن و پەڕی ناو قوتوو، کەمخزمەتی خۆیان و ئەسپیان بە گوناهی گەورە دەژمێران. هیچ نەبا فیشەکیان دەخستە ماڵان و دەیانگوت چەکت هەیە. ئێمە کە هەموو فەقیر بووین و بەرتیلمان بۆ هەڵنەدەسووڕا، تەواو لە پەڕوپۆ بووینەوە. لە بەر چاوی من ئەوەندەیان بە قامچی لە فەقیرێک دا کە وەزکی دا و دوای دوو ڕۆژ مرد. گوناهی هەر ئەوە بوو کە زۆر زوو جڵەوی ئەسپی ئەمنییەی نەگرتووە...

سەرباری بەهانەی تووتن لە ماڵێ بوون و تۆمەتی قاچاغچییەتی و بڕوبیانووی بێپسانەوە، ساڵێک کەوتنە گیانمان کە گەنم بە دەوڵەت بفرۆشین و «نیمە» قبووڵ نییە. هەموو چارمان لەوەدا دی کە ئێمەی وردەماڵێک، لە شاری سابلاغ خۆ بشارینەوە و لە لادێ بەردەستی مەئموور نەکەوین. چەند کەسێک لە تەرەغە و قەرەڵی ڕێک کەوتین، چووینە شار و لە خانێکی کەران دامەزراین و وەتاغێکمان بە کرێ گرت. ڕۆژانە لە ترسی مەئموور تا ئێوارە دەرکەمان لە سەر خۆ

دادەخست؛ شەوانەش تا لای ڕۆژ قوماری پەرمان دەکرد. بەلام چۆن قومارێک؟ شەو تا بەیانی کەس لە قرانێک و دوان پتری نەدەدۆڕاند و نەیدەبردەوە.

ژنی کابرای خانچیمان فێر کردبوو، ئەگەر مەئمووری دەدی، هەرای دەکرد: «کش-کش هەلۆ هات»، دەرگەمان گالە دەدا و هەستمان لە خۆمان دەبری تا هەلۆ نەدەما.

خانچیە دوو ژنی بوون، یەکیان پیس و پیر، ئەوی‌تریان لووس و جوان و مندال‌کار. شەوانە کە قومارمان دەکرد، حەقی پێ چرای قومار -کە دە یەکی براوە بوو- بە جوانەکە دەگەیشت. جا چونکە منی بە لەبار و جوان دەزانی و کەیفی بە من دەهات، ئاخری شەو پاچراکەی بە دزیەوە دەخستەوە گیرفانی من. واتا هەمیشە نەدۆڕاو بووم. هەقی کەر و ئێستر و بارگین، شەوانە قرانێک بوو؛ هەقی پیاوان دوو قران. یانێ هەر پیاوێک بە دوو کەر دادەنرا!

شەوێکی زۆر سارد، یەکێک لە ئێمە لە سەر دراوی کەر، دەگەڵ پیرێژنەکە ببوە شەڕیان؛ هەمووما‌نیان دەرکرد. سیپاڵ دە بن هەنگلدا، بە سەر سەهۆلدا خرمەخرم بە کۆلانی شاردا بەرهەلدا، لە جێ خەوی شەو دەگەڕاین و سێ کەس بووین. ژوورێکمان پەیدا کرد، بێ ئاگر، بێ دەرگا، پەتوویەکی لە جێگای دەرگا پێیداکرابوو. خانەخوێشمان کابرایەکی چارداوەڕوو بوو. هێندێک ڕەژیمان لە مقەلیەکدا گەشاندەوە و لە بەر چرای نەوت ملمان لە قومار نا. خانەخوێکەمان خۆی کردە پای قومار. هەقی ئەو شەوە و شەش حەو قرانی خۆیمان لێ‌بردەوە. بە دزی ژنەکەوە قەند و چا و ئیستیکان و چەکوچ و تەنانەت مقەلی و ماشەکەمان قەبلاند و لێمان بردەوە. بەیانی ژن بە گڕی داهات و زیقاندی. لای ئێمە گریا، تا شتەکانمان داوە و ڕۆیشتین و هاتینەوە گوند.

ئەو فێرەقومار بوونە، هەر چەند لە هیچەوە و بۆ گاڵتە دەستی پێکرد، لێم بوو بە نەخۆشییەکی گران. لە لادێ هەر دەگەڵ ئەو لات و لووتە وردەمالیکانە دەمکرد و زۆر جاران زۆرم دەدۆڕاند. شەوێک لە بۆکان تووشی قومار بووم، چل تمەنێکم پێ بوو کەل‌وپەلی مالی پێ بکرم هەمووم دۆڕاند. بۆ ئەوە حەقی جێ خەوم پێ‌نەمابوو، نیوەشەو چوومە حەمام. لە حەمام کابرایەکی ئاشنام دیت، داوای قەرزم لێ کرد، بە هەموو هێزی خۆی پێنج قرانی دامێ! بە دەستی بەتاڵ و هەناسەی سارد هاتمەوە تەرەغە. قوماربازییەکەم لێ ببوو بە خوو؛ دەستم لێ بەرنەدەدا. شەوێک ئەو ڕەفیقە سالحانەم تەنانەت ماینەکەشمیان لێ بردمەوە. دوایی بەزەیان پێمدا هاتەوە و لێیان نەستاندم. نازانم چۆن بوو کە دلم بە جارێک لە قومار هەڵەنگوت و بە بێ سوێند خواردن تەرکم کرد و لە بیر خۆم بردەوە.

دوای چەند سالێک کە «هێمن» ژنی دێنا و من برازاوا بووم، شەو لێفە بۆ میوانان -کە یەکجار زۆر بوون و حیسابی ئەو هەموانە نەکرابوو- زۆر کەم بوو. بابی هێمن گوتی: بەو شەوە چارەی نوێن چۆن بکەین؟ گوتم: ئیجازە بدە من دەیکەم؛ تۆ بچۆرەوە مال. پەڕی قومارم هێنا و خەلکم بە قومارەوە سەرگەرم کرد. تا بەیانی کەس لێفەی نەویست و نەنوست. خۆم شتێکم دۆڕاندبوو؛ بەلام نە زۆر. جگە لەو جارە، تازە هەرگیز دەستم بۆ پەڕی قومار نەبردەوە و لەو بەلا گەورەیە خۆم ڕزگار کرد.

هەر ئەو سەروبەندە، کۆنە ئاغایەکی کورد -کە مەحمووداغای سەگەنێریان پێ دەگوت- بە مەئمووریەتی دەولەت هاتە سەرمان و ئەویش وەک هەموو مەئمووری‌تر لە بەرتیل دەگەڕا. من هیچم نەبوو بیدەمێ، ئەویش سوور بوو کە هەر لێم بستێنێ، دەنا کلاوێکم بۆ دروست دەکا. لە

ڕووی ناچارییەوە گوتم:
– ئاغا! مەرحوومی بابت لە خانەقا نێژراوە. پوولم نییە؛ بەڵام لە باتی ئەو بەرتیلە خەتمێکی قورعان بۆ ڕووحی بابت دەخوێنم!

زۆری لێ خۆش هات و پێک هاتین؛ بەڵام ئێستاش ئەو بەرتیلە قەرزدارم! هەر ئەم چیرۆکەم بۆ قزلجی گێڕاوە، ئەویش بە تێکدانەوە کردوویەتە کورتە چیرۆکێک لە «پێکەنینی گەدا»دا.

ژیانی تەرەغەم جگە لە متاڵا و ترسی مەئموور، بە خۆڕایی دەگوزەرا. پاییز کە کاسبی دەشت نەدەما، ئێواران لە سەربانان دەگەڵ پیرەپیاوان و لەبەر دەرکان دەگەڵ کۆنە پیرێژنان و شەوانە بە گۆرەوێبازی و گوێ گرتن لە بەند و باو و حیکایەتی قەدیم و لە بەفربارینداَ بە تەپکەنانەوە و ڕاوە کەرویشکمان ڕادەبوارد.

حیزبی خالە مەلا -کە هیچ ناویشی لێ نەبرابوو- سەربەخۆ پووچابۆوە و لە پەیوەندی دۆستانەی ئاسایی تێنەپەڕی. هەر کە بە هاتنی ڕووسان، شیرازەی دەوڵەت لە موکریان هەڵوەشا، «عەزیز زەندی» ناوێک کە بە «عەزیز ئەڵمانی» دەناسرا و پیاوێکی زۆر زانا و دەمپاراو بوو، چەند کەسێکی بانگ کردە ماڵە خۆی کە من و زەبیحیش دەگەڵدا بووین؛ گوتی بە سەرۆکی خۆم «حیزبی ئازادیخوای کورد» دروست دەکەم. بێ لام و جووم قبووڵمان کرد. زۆر کەسی‌تریش هاتنە ناو حیزبەکەی. عەزیز زەندی بۆ تەبلیغاتی حیزب، گەشتێکی کرد. شێخ محەممەدی خانەقا، خەلیفە مەلا عەلی زەنبیلی و زۆر ئاغای‌تری کردبووە دۆستی خۆی و بەڵێنی هاوکاری لێ ساندبوون. هەتا سەقز هات و گەڕایەوە. چووبووە تەوریز؛ زۆر ئەرمەنی تەوریزیشی کردبووە پەیڕەوی خۆی. بە تەنتەنە و سەنتەنەیەکەوە دەگەڕا، چەندین کێشکچی ئەرمەنی لە دوایەوە دەڕۆیشتن. پاشان -ڕاست یان درۆ- گوتیان لە هەمان کاتدا پیاوی دەوڵەتی ئێران بووە و پووڵی لێ ساندوون کە نەهێڵێ بیری ئازادیخوازی پەرە بستێنێ. بە ناشکوری ناڵێم ئەویشمان لێ پووچەڵ بوو.

**کۆمەڵی «ژێ‌کاف»**

جارێک کە چووبوومە شار، وەک هەموو جار بەر لە هەموو شت زەبیحیم دیتەوە؛ گوتی وەرە! بردمیە مزگەوتی قازی. گوتی بە قورئان سوێند بخۆ کە ئەوی پێتی دەڵێم لای کەس نایڵێی. بۆ جاری دووهەم سوێندم خوارد، گوتی شەو پێت دەڵێم چییە. پاش نوێژی شەوانێکی درەنگ، منی وە شوێن خۆی دا و بە کۆڵانێکدا ڕۆیشتین. لە سەری کۆڵان یەکێکم دی ڕاوەستابوو؛ دەستی دە بەر پشتێندی بوو. دیار بوو دەمانچەی پێیە. زەبیحی شتێکی پێ گوت. چووینە ماڵێک. تەرزی لە دەرگادان جۆرێکی نائاسایی بوو. زۆر زوو یەکێک -کە نەمناسی- بردمیە ژوورێک. مێزێک پشتە ماڵێکی بە سەر هەڵکێشراوە، قورعانێک بە ئاواڵەیی پاڵی بە دیوارەوە دراوە و لە سەر مێزەکە چەقاوە، ئالایەکی بە دروشمی ڕۆژەوە لە دیوار دراوە، خەنجەرێکی ڕووت بە قورعانەکەوە هەڵپەسێراوە، پەڕە کاغەزێک بە نووسراوی لە سەر کەناری مێزەکەیە. کابرا گوتی «ئەوە بخوێنەوە و هەموو جار دەست بە قورعانەکەدا بدە، ئەگەر لەو سوێندنامەیە لادەی خوێنت بەو خەنجەرە دەڕژێ.»

لە سام و عەیبەتی ئەو دیمەنە دەلەرزیم؛ زۆریش شانازیم بە خۆم دەکرد کە شیاوی ئەم باوەڕەم. سوێندنامەکە حەوت بەند بوو. بە داخەوە بە تەواوی لە بیرم نەماوە؛ بەڵام تێیدابوو کە:

«بە قورعان و ئالای کوردستان و شەرەفم سوێند دەخۆم لەمڕۆوە بە دڵ و گیان بۆ ئازادی کوردستان تێدەکۆشم و تا مردن قوسوور ناکەم؛ هیچ بەرژەوەندییەک وە پێش بەرژەوەندی خزمەت بە وڵاتەکەم ناخەم؛ برای حیزبیم بە قەد خۆم خۆش دەوێ؛ هەتا مردن بە زمان، بە قەلەم، بە ئیشارە و بە هیچ جۆرێ خەیانەت بە حیزب ناکەم و ڕاستی لێ ناڵێم و ناوی نهێنی ئەندامان لای کەس نادرکێنم» و شتی وا.

لە دوای سوێند خواردن، دەستی نایە دەستم و بردمیە ژوورێکی‌تر، کە لەوێ پتر لە دە کەس لاوی کورد دانیشتبوون. گوتیان ناوێکی نهێنی بۆ خۆت هەڵبژێرە و ژمارەی ئەندامەتیت بیستە. ئەی خودا چەند خۆشە! چۆن ئێمە بووینە بیست کەس؟ قەت باوەڕ ناکەم! خوا شوکور زۆر بە هێزین. «هەژار»م بە ناوی نهێنی بۆ خۆم هەڵبژارد. زۆر شەوان لە خۆشیان خەوم لێنەدەکەوت.

من تا ئەوسا لە بارەی ئاڵۆزبوونی وڵاتەوە هەر ئەوەندەم دەزانی کە ڕۆژێک تەیارەیەک بە سەر گوندەکەماندا فڕی و کاغەزی لێ بەربوونەوە. دوو بەیان بوون ڕووسان بڵاویان کردبوونەوە کە: «خەڵکی ئێران! خاترجەم بن. ئێمە لە گورگانی هیتلەری ڕزگارمان کردوون. دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێران کە هەواڵی نازی بوون، لە بەر یەک هەڵوەشاوە و سەربازەکانی تەسلیم بوون». بوو بە خۆشی خۆشیمان کە خوا شوکور لە چنگ ئەمنیە و شڵتاغی مەئموور ڕزگار بووین. سەر و بنی قسەمان سڵاوەت لە دیداری عرووس و تەیارە ڕەش بوو. هەر کەس لە شارەوە دەهات دەنگ و باسمان دەپرسی. هەر یەک جۆرێکی دەگێڕاوە. یەکێک گوتی: کاکە لێم ڕوونە تێک چووە؛ چونکە گوێم لێ بوو بەقاڵێک بە موشتەریەکی دەگوت: «پەهلەویش گووی وای نەخواردووە!». کوێخا سجیلێکمان هەبوو دەترسا بەراتەکەی نەدەینێ؛ لە شار هاتەوە و گوتی: درۆیە، دەوڵەت هەر وەک خۆیە و کاربەدەستانی ئەمنیەم دیون زۆر بەکەیفن. دڵمان ساردەوە بوو.

شەوێک دوو میوانی نەناسیوم هاتن؛ بەڵام چۆن میوانێک؟ ڕووت و قووت و تیتوڵ شڕ. کەسم هێندە ڕووت و پەریشان نەدیوە. گوتیان: ئێمە سەربازی لە ورمێ بووین، بە تفەنگەوە دەهاتینەوە بەرەو وڵات. شکاکان ئێمەیان وەک سەدان و هەزاران سەرباز و ئەفسەری‌تر ڕووت کردووە و ئەو جلانەیان داوینێ. هێندێک کۆنە جلکم دانێ. تێگەیشتین کە کوێخا ڕاستی نەگوتووە. تەواو کردمانە خۆشی و شادی.

بە ڕاستی ڕزگار بوون لەو جەهەنەمەی پەهلەوی -کە بۆ خەڵکی موکریانی نێل دابوو- هیچ خۆشیەکی نەدەگەیشتێ. ئەمنیە دەهاتنە دێ، هەر قەبرێکی تازەیان بدیبا، خەڵکیان دەخستە داری سەماواتێ: «ئەو کابرایەتان بۆ کوشتووە؟» جا وەرە لێدان و بەرتیل وەرگرتن کار بکا. لە بیرمە شەوێکی مانگەشەو درەنگێک، لە ماڵ دەرکەوتم کە تۆزێک بچمە دەشت. ڕوانیم کەلاکێک لە بەر هەیوانی مزگەوتە، خنەخنی دێت! پیرەمێردێک بوو خەریک بوو دەمرد. چووم کوێخای دێم خەبەر کردەوە. ئەسپی هێنا و کەلاکی نەناسی برد و لە پەنا نزیک‌ترین گوند فڕێی دا؛ کە نەوەک ئەمنیە بزانن و ماڵوێرانمان کەن. هەر ئەو شەوە کەلاک دێ بە دێ ڕۆیبوو تا گەیبووە «دەروێشان» کە ماڵی کچی کابرای لێ بوو. مەعلووم بوو لە «کەلبەڕەزاخان»ەوە بە نەخۆشی ئاوا گۆڕ بە گۆڕ کراوە!

خوا نەخواستە مەئموورێکی دەوڵەت لە گوندێک یان لە مەزرای گوندێک بە سەکتە بمردایە،

ئیتر واوەیلا بوو. سەتان کەس دەکەوتنە بەلاوە و لە سووچی ڕەشچالان توند دەکران. ئەگەر تەنیا ئەو دەردی کە تاقە گوندێک لە موکریان لە دەست پیاوی دەوڵەتی ڕەزاخانییەوە دیوە کۆ بکرایەتەوە، کتێبێکی گەورەی دەویست.

بیستمانەوە کە چۆن لەشکری ئێران -کە سەر تا پا لە چەکی ئەڵماندا خنکابوو- بەبێ شەڕ کردن لە بەر یەک بلاو بووە و سەری بێ کلاو ماوەتەوە. سەرباز تفەنگیان داوە بە نانێک و لە کۆڵ خۆیان کردۆتەوە. بەوپەڕی ڕەزیلی، دەوڵەت لەبەر یەک چووە. پاش کۆکردنەوەی خەڵە و خەرمان، هاتمە شار؛ دیتم هەوای سیاسی خۆشە. ئەوسا بوو کە چوومە سوێند خواردن و دوایی بۆیان گێڕامەوە کە حاڵ و باڵ چ بووە و چۆن ئەو حیزبە پێکەوە نراوە.

نابەجێ نازانم بەر لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە، شتێک دەربارەی باسی کورد و ئازادی لە کوردستانی ئێراندا -وەک بیستوومە یا خوێندوومەتەوە- بگێڕمەوە:

تاریخ پێمان دەڵێ کە «خان ئەحمەدخان» لە حەسەناباتی سنە تانجی لە سەر ناوە و پێنج سالان پادشایەتی سنە و سابلاغ و ولاتی بەردەستی ئێستای عیراقی تا موسڵ بە دەستەوە بووە. لە سالی ١٢٩٦.ک (١٨٧٨.زدا) «شێخ عوبەیدیللای نەهری» داوای سەربەخۆیی کوردستانی کردووە و تا میاندواو و بناویشی گرتووە. لە سالی ١٩٠٦ و ١٩٠٧ی زایینی، «شێخ بابای غەوسابات» بە بریکاری «حەمە حوسێن خان» و «سەیفەدین خانی سەقز» و «حەمەخانی بانە»، هاتوچۆی ڕووسانی کردووە کە بۆ ئازادی کوردستان یاریدەیان بدەن.

لە جەنگەی شەڕی یەکەمی گەورەدا، ئەفسەرێک بە ناوی «مستەفا پاشای نەمروود» بە بەرگی گۆڕاو هاتووە بە کوردستانی موکریدا گەڕاوە و داوای کردووە کە کورد ئازادیخواز بن. دەڵێن شەوێک لە سابلاغ چۆتە قاوەخانەی حیکایەتخوان، گوێی لە باسی ڕۆستەم و دێوی سپی بووە. لەپڕ گوتوویە: «الفاتیحە!»، خەڵک فاتیحایان خوێندووە. نەمروود دەستی هەڵێناوە و گوتوویە: «خێری ئەو فاتیحایە بۆ ڕووحانەتی ڕۆستەم و دێوی سپی! برام ئەوان مردوون. ئێوە کە زیندوون فکرێک بۆ حالی خۆتان بکەنەوە...».

هەر چەند ئەو باس و ڕووداوانە لە بیر خەڵک چوونەوە و کەمتر وە بیر هاتوونەوە، بەلام ڕەنگە شوێنەوارێکیان لە بن خۆڵەمێشی ئەو چەند سالانەدا مابێ و گەرمایی بە یەکجاری نەفەوتابێ.

لە پاش قەومانی شەهریوەر و هاتنی ڕووس بۆ مەڵبەندی موکریان، ئەفسەرێک لە لایەن کۆمەلی هیوای کوردستانی بەردەستی عیراقەوە هاتۆتەوە سابلاغ و دەیەوێ کەسێک پەیدا کا کە گوێ لە ئامۆژگاری بگرێ. چەند ڕۆژێک لەم و لەو پرسیار دەکا، پێی دەڵێن زەبیحی دەم لەو مەسەلانە وەردەدا. زەبیحی حوسێنی پێ دەناسێنێ و چەند کەسیش ساز دەدەن کە گوێ لەو ئەفسەرە -کە ناوی «میرحاجە»- بگرن. یازدە کەس لە باغی سیسەی سابلاغ دەگەڵ میرحاج کۆ دەبنەوە. لە سەر ئامۆژگاری ئەو، حیزبی «ژێ-کاف» دادەمەزرێنن؛ سوێندنامەکەی دەنووسنەوە. پرۆگرامی حیزبی هیوا بە تۆزێک دەسکارییەوە، دەکەنە پرۆگرامی «ژێ-کاف». حوسێن فرووهەر، زەبێحی، تەوحیدی مەلانەجمە، ئیمامی، محەممەدی نانەوا، قادری مودەڕڕیسی، محەممەدی یاهوو، شاپەسەندی، محەممەدی سەلیمی، قاسم قادری و خالە مەلای داودی، یازدە کەسی بناغەدانەر بوون. جا کە زەبیحی منی بردە سوێندان، بە منەوە بووینە بیست ئەندام. حوسێن ئەندامی ژمارە یەک و زەبیحی ژمارە دوو بوو و حوسێن سەرۆکی کۆمەلی «ژێ-کاف» بوو.

تازە ببووینە «ژێ-کاف»، وام لەبیرە سێهەمین کۆبوونەوەمان بوو؛ حوسێن فرووهەر گوتی:
- من پێشنهاد دەکەم هەژار دەرکەین، چونکە هیچ کارێکی لە دەست نایە.
ڕەنگم زەرد هەڵگەڕا، تف لە زارمدا وشک بوو، بە نووزەیەکەوە گوتم:
- نا، توخوا دەرم مەکەن! کارم پێ بسپێرن. ئاخر من ماڵم لە لادێیە و ئەنگۆش تا ئێستا لە لادێ کارتان نەبووە.
فرمێسکم هاتنە خوار... بەزەیان پێمدا هات و گوتیان قەیناکا؛ ڕاستە زۆر دەستەوستانی، بەڵام هەر لە کۆمەڵەدا بمێنە!
لە درێژایی تەمەنمدا -کە ئیستا لە پلەی حەوتەم و لە شێست و سێ ساڵیدا دەژیم- زۆرم حیزب لە نزیکەوە دیتوون؛ باسی ڕەفتار و ڕابردووی زۆریانم خوێندۆتەوە. زۆر چەتوونە هیچ کۆمەڵێک وەک ئەندامانی «ژێ-کاف» ئاوا فیداکار و دڵگەرم و یەکتر خۆشەویست بووبن. دەربارەی ئەسحابەی پێغەمبەر زۆر باسی یەکدڵی و فیداکاری هەیە، وەختە بڵێم ئەندامانی ئەو حیزبەش شتێکی وابوون. خۆدزینەوە لە فەرمان، درۆ، خۆخوازی و فێڵبازی بە جارێک تەرە ببوو؛ لە حەوت کێوان ئاوا ببوو. ماڵی دنیا هەر بۆیە مایەی دڵخۆشی بوو کە کۆمەڵە پێی لازم بێ.
جارێک لە تەرەغەوە هاتمە شار، بیست تمەنم پاشەکەوت کردبوو کە جلک بۆ منداڵان بکڕم و نەخوازە کە دیتم خوشکم کولووجەی پینە کردووە، زۆری دڵتەنگ کردبووم. هەر گەیشتمە شار، ئێوارە بوو. دەچوومە قاوەخانەیەکی دەم چەم کە هەواڵان ببینم. لە سەر پردی داوێنی چۆم تووشی یەکیان هاتم؛ گوتی: فلانی تۆ پووڵت نییە؟ هێندێک پووڵمان پێ لازمە دەبێ کۆی کەینەوە. دەست بەجێ بیست تمەنەکەم دایە و هەر لەوێوە گەڕامەوە و لە شار دەرکەوتم و هاتمەوە ماڵ؛ چونکە مخارجی شەوێکم بۆخۆم نەگێڕاوە. کە هاتمەوە خوشکم پرسی:
- جلکت کڕی؟
گوتم: بە داخەوە بە تەڵەی قوماری سێ خاڵەوە بووم و هەموو پووڵەکەم دۆڕاند.
گوتی: دەزانم نەتدۆڕاندووە؛ بەڵام خەم مەخۆ! ئێمە هەر چۆنێک بێ ڕایدەبوێرین.
هەرچەند زۆر زوو زۆرتر ببووین و ئەندامان لە سەد و دووسەدیان تێپەڕاندبوو، بەڵام هەموو ڕووت و نەدار بووین و پووڵمان بۆ هەڵنەدەسووڕا کە پەرە بە ڕاگەیاندنی حیزبی بدەین. دەمانەویست گۆڤارێک دەرکەین بە ناوی «نیشتمان». حیسابمان بۆ کردبوو، دەرینەدەهێنا. برادەرێکمان چووبوو بە ناوی خۆی سەد و پەنجا تمەنی لە حاجیەک قەرز کردبوو کە بە مانگێک دەیداتەوە. زەبیحی کە دەبوو بە کاری گۆڤارەکە ڕابگا و کەسیش پێ نەزانێ، چووبوو دەگەڵ خەلیفەگەری هەرمەنیان لە تەورێز ڕێک کەوتبوو کە لە چاپخانەی کلیسا بۆی چاپ کەن. مانگ تێ وەرسووڕا و گۆڤار دواکەوت. کابرا حاجی قەرزی خۆی دەوێ و دەبێ مۆڵەتی لێ بخوازن. ئاخری حاجی دەیگوت: ئەو قەرزە وەک قەرزی دی ناچێ، بابە هەر پێم بڵێ بۆچیت لێ قەرز کردووم، نامەوێ بمدەنەوە! ئاخری گۆڤار دەرکەوت و زۆر زوو بلاو کرایەوە و دەسمایەی ژمارەی دووهەمی قازانج کرد و ئیتر نەپسایەوە و زۆری دەنگ دایەوە. تەنانەت ڕۆژنامەکانی ژوور و لاوەی ئێرانیش کەوتبوونە باس کردنی.
لە بیرمە جارێک بیرمان لەوە دەکردەوە کە چاپخانەیەکی دەستی پچووک بکڕین و بیکەینە چەند بەشێکی پچووک و هەرکەسە بە پێی توانا بەشەکانی بکڕێ. کاکە ڕەحمان -کە ئەوسا

ببوە ئەندام و دەوڵەمەند بوو- گوتی من هەمووی دەکڕم. باوەڕ کە زۆرمان فرمێسکمان دەچاو گەڕا، کە لەو خۆشیە ناهومێد بووین و لە کڕینی چاپخانە بەشدار نابین.

کە لە خۆشی کۆمەڵەوە خۆم کردەوە شاعیر. جگە لـە شـیعری کوردایـەتی، شـیعری‌تریـشم دەنووسین. جێژنە پیرۆزە بۆ ئەحمەداغا، گاڵتە و گەپ، گوڵستانی سـەعدیم وەردەگێڕایـە سـەر باری گاڵتە، شیعری حافزم بە باری گاڵتە و گەپدا وەردەگێـڕا. ئەندازەیـەکی زۆرم لـەو شـیعر و نووسراوانە ڕێک خستبوو کە ئیستا هیچیانم نەماون و بە یەکجاری لەناو چوون. لە بیرمە بـەر لـە گۆڤاری نیشتمان، تەنیا دوو بەیتی من لە سەر کاغەزێک چاپ کرابوو. بۆ یەکەم جـار کـە دیـتم، ئەوەندەم کەیف پێ ساز بوو، بە «شا»م دەگوت هەتیوە! ئای کە چەندم شایی بە خۆم بووا

### ئاوڕێك بۆ دواوە

گوتم لە سەرەتای حوجرە و دەرسی گوڵستانەوە، دەگەڵ زەبیحی بوومە ئاشنا. جا چونکـە بـابی ئەو دەگەڵ بابم هەردووک مریدی شێخی بورهان بوون، نێوانیـان خـۆش بـوو؛ ئێمـەش پێکـەوە هۆگرمان گرتبوو. هەرچەند ئەویان بردبووە مەدرەسەی دەوڵەتی و من فەقێلەی مزگەوت بـووم، بەڵام لە کاتی بەرهەڵداییدا پێکەوە دەگەڕاین. هەروا تۆزێک لە خوێندنەوە ڕاهـاتین، ملمـان لـە کۆنەکتێبان نا و نوشتە و جادووی کۆنەکتێبان زۆری سەرنج ڕاکێشاین: چۆن مس بکەینـە زێـڕ! چۆن سکە لێ دەین! چۆن وا پکەین خەون بە خەزێنەوە ببینین...

لە بەزمی سکەلێداندا دوو شتی سەیرم دێتە بیر: قالبێکی سکەلێدانمان لە کتێبێکـەوە شـکڵ کێشا و چووینە لای پیرەمێردێکی تەنەکەساز کە بۆمان دروست کا.

کابرا پرسی: بۆ چیتانە؟

گوتمان: بۆخۆمان گاڵتەی پێ‌دەکەین.

گوتی: ڕۆڵە گیان دەزانم بۆ چیتانە، وەرن مامی خۆتان بکەنە شەریک! پەنجا ساڵە حەولی لـە دوو دەدەم، بۆتان دروست دەکەم و خزمەتیشتان دەکەم!

هەر وردە-وردە گەرمتر دادەهات، کەوتبووە پەلە و لرفەوە، ئارەقی دەردابوو:

– مامتان بە قوربانتان، بمکەنە شەریک!

هەر هێندەمان بۆ کرا ڕاکەین و واز لە کارەکە بێنین!

جارێکی‌تر لە کتێبە پەڕپووتێکدا نـاوی دەریچـە و بۆتـە و گـڵەبۆتەمان بـەرچاو هـات کـە بـۆ سکەلێدان دەشێ و زێڕینگـەر هەیانـە. پـیرە جوولەکەیـەکی زێڕینگـەری بـۆری چـڵکنمان لـە گۆشەی دوکانێکی تاریکی تەریکدا پەیدا کرد. هەر گوتمان گڵەبۆتە، دەستی کـرد بـە پاڕانـەوە، گوتی:

– ئێوە مەششاقی دەکەن؛ من خزمەتکارم. چیتان دەوێ بۆتان دەکەم؛ بمکەنە شەریک!

های بە کلکی خێوی! خۆ هێشتا نەڕێـسراوە و نـەپێچراوە شـەققەی دێ! زۆر زوو لـە چنگـی ئەویش هەڵاتین و تازە نەمانوێرا باسی بکەینەوە. بۆ خۆمان بە دزیەوە هەرچۆنێک بـوو قالـبێکی وەک بەرگە شەمچەمان لێکدا و پڕمان کرد لە قوڕی خۆڵـەمێش و دوو قرانیـەکی زیومـان تێـدا جێ کردوەوە. قەڵاییمان لە سەر مقەڵی پۆلوو بە فوو -کە هەموو شەویلکمان گۆڕابوو- توانـدەوە و بە سەرماندا کرد. خوا بە سەرتی نەهێنێ، قەڵایی بە دوو قرانیـەوە نووسـا و ئێـستا و ئێـستاش بەری نەدا و لە باتی قازانج زەرەرمان کرد!

به گەورەیی بیرم لەوە دەکردەوە: باشە ئەوا ئێمە منداڵ و کاڵ بووین، ئاخر ئەو دوو پیرەمێردە بۆ دەبێ هێندە کەر بن کە لەبەر دوو منداڵۆکە بپاڕێنەوە ئەو شتەی خۆیان نایزانن فێری ئەوانی کەن؟!

دوعایەکم دەس کەوت؛ نووسرابوو: «شەوێک جەغزێک لە سەر خۆڵ بکێشە، چل جار سوورەتی «یَا اَیُّهَا الْمُزَّمِّلْ» لە بەر و زۆر بە ڕەوانی بخوێنە، لە مابەینی هەر جارێک خوێندنی سوورەتدا ئەم دوعایە لەبەر بخوێنە، جندۆکە دەیانەوێ بتترسێنن، کێوێک بە موویێک هەڵواسراو لە سەر سەرت ڕادەگرن. خۆیان دەکەنە شێر، هێرشت بۆ دێنن. نەکەی بترسی. هەر یەک حەرفت لێ غەڵەت بێ واوەیلایە؛ دەمری و گوناحی خۆت لە سەر خۆت. ئەگەر لەو ئەزموونە سەرکەوتی و چل جارەکەت تەواو کرد، جندۆکەیەک دەبێتە نۆکەرت، هەرچی بڵێی پێکی دێنێت...».

ئای کەچەند شتی چاکە! شەرتە پێی دەڵێم کچی قاقانی چینێم بۆ بێنێ! خۆ زێڕ و زیو هەر باسی ناکرێ! نەمەویست زەبیحی بکەمە شەریک، پێم نەگوت. چەند ڕۆژان سوورەت و دوعام وەک ئاو لەبەر کرد. شەو لە پاش ماڵ نوستنان بە دزیەوە چوومە وەتاغێکی لای درگامان کە ژووری میوانان بوو. بەڕە و حەسیرم لابرد، جەغزم کێشا و بەرەو قیبلە ملم نا لە ورتە- ورت. خوێندن لە بیست جار تێپەڕی و دەنگی پێ هات. چاوم کە چووقاندبوو هەڵمنەهێنا و گوتم با جندۆکە بێن منەتیان نەبێ؛ من ناترسم. تەقەی پێ نزیکەوە بوو، دەنگی کوتانی گۆچانیش دەهات. گوێم لە هەناسەیەک بوو. نەخێر بخوێنەوە و ڕامەوەستە. لەپڕ زۆر بەقەو گۆچانێکم وەپشت مل کەوت و جنێوی بابمی بەدوو دا:

- مەلعوون ئەوە خەریکی سیحری؟!

هەر لە پەنجەرەوە خۆم هاویشت و هەڵێ ئەمما هەڵێ! بابم لە دەرگای حەوشەوە بانگی کرد:

- جارێکیتر نەتبینمەوە!

بە هەزار گریان و پاڕانەوە ڕاگیرامەوە و ئیتر وازم لە جندۆکە و کچی قاقانی چینیش هێنا!

کورتی ببڕمەوە: پەڕە شڕەیەکم دەدیت و شتێکی لەم بابەتی سیحر و جادوانە تێدابوو، لام وابوو ڕاستە. بەڵام خاوەنەکانیان ئەوەندە بە سەگیەتی نووسیبوویان کە مەپرسە: «مێشکی مێشوولە و هێلکەی مێرووڵە تێکەڵ کە و چاوتی پێ بڕێژە؛ جندۆکە دەبینی». «کیسەڵ دە خوێنی پەپووسێمانەدا بکوڵێنە، ئێسکێک سەر ئاو دەکەوێ، ودمی هەیە و بەختەوەر دەبی».

لە خانەقا حاجی عەبدوڵلای کوڕی گەورەی شێخی بورهان -بە پیری- وەک منی منداڵ بیری دەکردەوە. بڕیاری دابوو ئەگەر لە سایەی نوشتەوە خەزێنە پەیدا کا، بەشم بدا. ڕۆژ نەبوو بۆ پەیداکردنی شتی لە عەقڵ بە دوور نەمخاتە بێگارەوە؛ تەواو وەڕەزی کردبووم. ڕۆژێک گوتی: بچۆ پێستی لە بەر تاو سپی بووی کیسەڵی مردووم بۆ پەیدا کە؛ ئاوی «هەندەبا»شم بۆ بێنە؛ دوعای لێ دەنووسم. دەملی کەڵەبابێکی ڕەنگ شینی بێ خاڵی دەکەم و ڕۆژی جومعە بەری دەدەم؛ لە کوێ نیشتەوە خەزێنەی تێدایە.

گوتم: هەندەبا چییە؟

گوتی: پێم وایە ترۆزییە!

گوتم: قوربان! ئەگەر سیحرەکە بە کیری کەر لە پشتی کیسەڵی بنووسی باشترە!

ئیتر خۆی لێ تووڕەکردم و لە خەزێنەش بێبەش کرام؛ کە ئەویش هەر وەک من دەم لە

پووش ما.
دەگەڵ زەبیحی دووبەدوو زمانێکمان دروست کردبوو کە تێک‌دەگەیشتین و کەس تێمان نەدەگەیشت. ڕۆژێک کە بەو زمانە قسەمان دەکرد، کابرایەک گوێی لێ بوو؛ ڕووی کردە کابرایەکی دی و گوتی: ئاخر بۆچی ئاخر زەمان نییە؟ ئەو سەگبابانە بە زمانی جوولەکان قسە دەکەن، دەبلێ لە کوێی فێر بوون؟!

**مەئموورییەت لە ژێ‌کاف‌دا**
مانگی جۆزەردان بوو، دروێنەی جۆ لە دەوری بۆکان دەستی پێکردبوو، حیزب ناردی چوومە سابلاغ، دەگەڵ میرزا قاسمی قادری و زەبیحی -کە دەبووینە سێ کەس- گوتیان دەبێ بچنە «دزەی مەرگەوەڕ» دەگەڵ نوێنەرانی حیزبی هیوای کوردستانی عیراق گفتوگۆ بکەن و هەر قەرارێک ئێوە بیدەن ئێمە پێی ڕازین. بە سواری ترومبێل بەرەو ورمێ کەوتینە ڕێ کە لەوێوە فایتوون هەیە و دەمانباتە مەرگەوەڕ. گەیشتینە گوندی «بالانیش»، شەڕ و هەرایەک بوو سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسی. زێڕۆ ئاغای هەرکی و دەوڵەت شەڕیان بوو. پۆستی ئەمنیە سووتابوو؛ هەشت کەلاک درێژ کرابوون. هەر وا کورد بوون لە ورمێوە هەلاتبوون و دەهاتن. بە پەلە ترومبێلمان بەجێ هێشت و بەرەو چیا ڕەوین. چووینە گوندی «کوکێ» کە ماڵە زێڕۆی لێ بوو؛ ویستمان میوانی بین. کابرایەکی گەرمیانی -کە کۆنە ئاشنای زەبیحی بوو- لە دەرگا گێڕاینەوە. گوتی: زێڕۆ دوژمنی شێخ عەبدوڵلای دزەیە. لەوانەیە ڕووتتان بکا؛ چونکە دەچنە ماڵی ئەو. لەوێش بێدەنگ خۆمان ڕزگار کرد و چووینە گوندی «قاسملوو» لە دۆڵی قاسملوو لە بن چیای دمدم؛ کە ئێستاش شوێنەواری خانی لەپزێڕینی لێ دیارە. شەو لە ماڵی مستەفاغا ناو میوان بووین. کابرا دەیەویست ڕووتمان کا؛ بەلام کە زانی دەمانچەمان پێیە وازی هێنا. بەیانی ولاغمان لە سۆفی شێرە ناوێک بە کرێ گرت و چووینە دۆڵی دزە. بۆ نیوەڕۆ لای عەبدولقادری کوڕی شێخ عەبدوڵلا لە «گردوان» بووین و ئێوارە چووینە ڕەشماڵی ماڵی شێخ لە دزە.
**نوێنەرانی هیوا:** «شێخ عوبەیدیللای زینوێ»، «سەید عەزیزی شەمزینی» کە ئەفسەرێکی عیراق بوو، «سەعیدی کانی‌مارانی» ناوێکیش -کە تازەلاوێک و خوارزای شێخ عوبەیدیللا بوو- دەگەڵیان هاتبوو. چەندین کۆبوونەوەمان پێکەوە کرد و لە سەر دوازدە نوختە پێک هاتین کە هەردووک حیزب پێکەوە هاوکاری بکەن و مەعلوومات پێک بگۆڕنەوە. جا چونکە لەو شوێنەی کە پێک هاتین بناری «دالانپەڕ» و لایەکی شەمزینان و ئەم لایەی ئێران بوو، ناومان نا: **«پەیمانی سێ سنوور»**. بڕیار درا هەردووکمان بێ‌خۆگرتن -هەر کەسە لای خۆی- بەیانەکە بلاو کاتەوە. دوای حەوت شەو لە دزە بە ڕێگەی شنۆدا گەڕاینەوە. لە شنۆوە بە پێ هاتینە نەغەدە و لە نەغەدەوە بە سواری ترومبیلێکی سینمایی ئینگلیسیان -کە دەهاتە سابلاغ- هاتینەوە.
ئێمە دەست بە جێ نوسخە بەیانی خۆمان لە نیشتماندا چاپ کرد. هێشتا بلاومان نەکردبۆوە، خەبەریان داینێ کە حیزبی هیوا بەو پێکهاتنە ڕازی نەبووە و چاپی مەکەن. ڕووپەڕە چاپ کراوەکەی پێک هاتنەکەمان لە گۆڤارەکە دڕی.
خۆش ئەوە بوو کە لە بەندێک لە پێکهاتنەکەدا دەڵێ: «ئەگەر ئینگلیس لە عیراق بەشێ بدەن بە کورد، نابێ کوردی دەرەوەی عیراق هەلاوێرێ؛ چونکە کوردستان یەکپارچەیە. با بلێین

ئێمە بەشی کورد بە حەق دەزانین و بە پێی توانا یاریدەی هەموو کوردێک دەدەین. کە ئێمەش دەگەڵ رووسان هەر ئەو حەولە دەدەین و موکریان لە کوردی تورکیان و عیراق بە جیا نازانین».
حیزبی هیوا کە بە سەرۆکایەتی مامۆستا رەفیق حیلمی بوو، لە مەسلەحەتی نەزانیبوو کە هیچ ناوێک لە رووس و کوردی ئێران و تورکیە هەبێ.
باسی ئەو رێککەوتن‌نامە مێژوویە تا ئێستا لە زۆر چاپەمەنی ناوخۆیی و لاوەکیدا کراوە؛ بەڵام سەیر لەوەدایە کە ناوی «هەژار» لە هەمواندا فرێ دراوە و نووسیویانە: «زەبیحی» و «میرزا قاسم» لە ئێران و «شێخ عوبێدیللا» و «سەید عەزیز» لە عیراق و «قازی خدر» (یان قازی مەلا خالید، جاری واش هەیە گوتوویانە قازی عەبدولوەهاب) لە لایەن کوردی تورکیاوە ئەم پەیمانی سێ سنوورەیان پەسند کرد. هومێدەوارم ئەم گۆڕانی راستییە لە رووی هیچ غەرەزێکەوە نەبووبێ و هەڵەیەک بێ لە دڵپاکییەوە رووی دابێ.
لە بۆکان دەگەڵ هەوالانی «ژێ-کاف» کە نامەخوا زۆر ببوون، هاوکاریم دەکرد و بە بەریشەوە کاسبی گەنم و تووتن فرۆشیم دەکاردا بوو.
زۆر کەس لایان وایە کە حیزبی «ژێ-کاف» رووسان دروستیان کردووە؛ کە خوا هەڵناگرێ راستی بۆ نەچوون. کاتێ کە حیزب بۆ هەوەڵ جار لە سابلاغ دامەزرا، رووس هیچ ئاگایان لێ نەبوو. دەمانەویست کە بە رەسمی بمانناسن و یارمەتیمان بکەن؛ بەڵام هەرچی کۆششمان کرد جوابیان نەدراینەوە. لە ئاخریدا کە دیتیان هێز و پێزێکمان پێکەوە ناوە، ئەوانیش لەشکری زۆریان لە وڵاتەکەدا بوو، نەیاندەویست وڵاتەکە ئەمین نەبێ و نەوەکا ئینگلیس بەهرەمان لێ وەرگرێ، گوتیان حیزبەکەتان رەوایە و ئێمە مانعتان نابین و ئێوەش لە نووسراوەی خۆتاندا هەواڵەتی ئێمە بکەن. «کوێرە! چت دەوێ؟ دوو چاوی ساغ».
کورد لە هەموو شوێنان، زۆر ئازادپەرست و ئازا خۆشەویستە. کاتێ کە هیتلەر لە سەر بوو، دەگەڵ رووسیا شەڕی دەکرد، هەموو کەس چەپڵەی بۆ لێدەدا و تاریفیان دەکرد کە ئازایە و رووس خوێڕین؛ ئەگەرچی هیتلەر یاریدەی دەوڵەتی ئێرانیشی دەکرد و دەوڵەتی ئێرانیش لە بەر چاومان لە شەیتان خوێنتاڵتر و دزێوتر بوو. لەبەر ئەوەش کە لە شەڕی یەکەمدا کوردی موکریان یاریدەی دەوڵەتی تورکی موسوڵمانیان کردبوو، رووس زۆری کوشتبوون و زۆری بە یەخسیر بردبوو. تەنانەت چل و هەشت سەعات قەتلوعامی شاری سابلاغیان کردبوو، عورووسی کافر زۆر ناخۆشەویست بوو؛ بەڵام کە ئەمجار لە حوکمی کمونیستیدا هاتبوونە ئێران، بیری خەڵکیان گۆڕی. چوونە هەر شارێک -بەر لە هەر شت- دەرکی زیندانیان کردەوە و زیندانی سیاسی و ئاساییان هەموو بەرەڵا کردن. مەلایەکی شکاک دەیگوت: «ئەز حەفسێدا بووم. م دی رۆژەک مەلائیکەتەکە سۆری چاقشین دەری ڤەکر و گۆت: ئیدی سودا. ئەم هەمی قوتار بوون».
چەکداری رووس زوڵمیان لە کەس نەدەکرد؛ هەموو کەس خۆشی دەویستن. خۆ نەخوازا ئێمەی نیشتمانپەرست کە رووسمان بە فریشتەی ئازادی کوردستان دەزانی، بە قەد گلێنەی چاوی خۆمان رێزمان لێدەگرتن. لە خوامان دەویست ئێمەش بکەوینە بەر قانوونی ئەوانەوە. راستت دەوێ ناوی کموونیستمان نەدەزانی؛ پێمان دەگوتن باڵشەویک. وا تێگەیبووین کە وڵاتی رووس هەمووی زۆر ئاوەدانە؛ لە هەر گەڕەکە ماڵەی، لە مەنجەڵێکدا چێشت لێ دەنێن؛ هەموو کەس قاپی خۆی دەبا و لەو چێشتە بۆی تێ‌دەکەن. ئیتر کەس لە هیچ بارێکدا جیاوازی نییە. هەموو کارێکیش بە دەست پیاوێکە؛ ناوی ستالینە. نازانم خەڵکیتر چەندەیان لەم بارەوە

دەزانی؛ بەلام لەو کاتەدا نەمدی کەس لەمە پتری لێ بزانێ و زۆریش بەوە ڕازی و ئاواتەخواز بووین و لامان وابوو هەر ئەوان ئازادمان دەکەن و دەمانکەنە دەولەت. جا ئەوەندی لە تواناداا بوو، بە پەخشان و شیعر بە ڕووس و بالشەویکیمان هەلدەگوت. بەزم بەزمی من و هێمن بوو کە سەر و بنی قسەمان سلاوەت لە دیداری ستالین و دوعای بەخێر بۆ سەرکەوتنی ڕووسان بوو.

ئەو دەمانە کە لە تەرەغە بووم و تازە دەولەت تێک چووبوو، لەشکرێکی دەهەزار کەسی بە سەرکردایەتی «سەرهەنگ پزشکیان» ناوێک لە سەردەشت هەر ما و حوکمی خۆی دەکرد. گوتیان وا عەشایری کورد دەچنە جەستەیان. زۆرم حەول دا کە چەند هەوالێکم دەگەل بێ بەلکو لەو تالانە تفەنگمان دەسکەوێ، کەس نەهات. تەنانەت بە گالتە دەمگوت: ئەگەر هیچیشمان دەس نەکەوێ، خۆ تووشی پیاوی وا دەبین ڕووتمان کا؛ با بێکار دانەنیشین! ئەو سەفەرەم بە نسیب نەبوو.

عەبدولکەریم کورە گەورەی شێخ محەممەدی خانەقا خەبەری بۆ ناردبووم کە بەرەو خەلیفانی مەنگوڕان بچێ منیش دەیگەمێ؛ سەرەخۆشی لە مالی عەلیخان دەکەم. وا دیار بوو کەسی لە من باشتر دەست نەدەکەوت کە ڕاوێژکاری سیاسی بم. لە ڕێگەدا -کە تەنیا بووم- تووشی دەستە سوارێک هاتم. ڕێگەمان لێکی دەدایەوە. سوارێک تاق بۆوە و بەرەو من هات: گورجێ دابەزیم و تفەنگم هێنایە سەرپێ و گوتم: مەیە پێش دەتکوژم! گوتی: بابە نەهاتوومە شەڕ، ئەوا من لە خزمەت سەید کاملی کوڕی سەیدی زەنبیلدام و دەچینە «خەلیفان». لەو ڕۆژەوە دەگەل سەید کامیل بوومە ئاشنا و چەند سالان زۆر دۆستی نزیک بووین.

عەبدولکەریم و سەید کامیل هەردووک ڕاسپێرابوون کە مەنگوڕان ساز کەن بچنە یاریدەی حەمەرەشید خان لە سەقز. عەلی خان و مەنگوڕ نەهاتن. دەگەڕانەوەدا عەبدولکەریم سەری لە «قالوێ» دا و سەید کامیلیش هەر هاتە ئەوێ. من دەستم لە عەبدولکەریم بەردا و دەگەل سەید کامیل چوومە سەقز؛ کە بابەشێخی مامی سەید کامیل هەمەکارەی حەمەرەشید خان و لە سەقز بوو.

حەمەرەشیدخانی بانەیی -کە ئاغای «وێنە» و «دارۆخان»ی بەشی کوردستانی عێراق بوو- عەشیرەتی بانەیی دوای خۆی دابوو؛ بانە و سەردەشتی لە دەست عەجەم دەرهێنابوو. پاش زۆر شەڕی پالەوانانە و بەناوبانگ، بە یارمەتی بەگزادەی فەیزوللابەگی سەقزیشی گرتبوو؛ چەک و چۆلی زۆری لە دەولەت ساندبوو. بەیتی شەڕی حەمەرەشید خان، گوند بە گوند و مال بە مال دەگەڕا.

میوان لە مالان دامەزران. سەید کامیل و دەست و پێوەندی -کە منیش یەکێک لەوان بووم- لە مالی حاجی عەلی ئەکبەر ناوێک دامەزراین. نان و خوان و خەو لە سەر حاجی. هێشتان زۆر شوکرانەبژێر بوو کە بانەیی تەشقەلەباز نەهاتوونە مالی و بە نیوەشەو داوای کەبابی بازاڕی لێ ناکەن!

کاری ڕۆژانەی سەید کامیل هەر ئەوە بوو لادێیی هاواریان بۆ دێنا کەریان لێ ساندوون، ڕووتیان کردوون؛ تکای بۆ دەنووسین. خان حاشای دەکرد و دەیخستە ملی پیاوی سەلیم خانی کێوڕۆ؛ سەلیم خان دەیخستە ملی پیاوی خان.

لە دەرگای ژوورەکەمانی نووسیبوو:

کەر دزینی سەقزییەکان بە مەسال    هەربینا دیت ببێتە ئیستقلال!



بێنە شیکوا، لێیان بکەن حاشا    زوو مووەفەق دەبێ ڕەشید پاشا
بانەیی دەیانخوێندەوە و پێدەکەنین.
دوو مانگێک لە سەقز مامەوە. زاراوەی سەقزیان فێر ببووم؛ فەرقم پێ نەدەکرا. لەو ماوەیەدا خان هێرشی بردە سەر هێزی عەجەم لە «دیواندەرە»؛ عەشایری دەوروبەری سەقز و ئەحمەداغای حاجی بایزاغاشی دەگەڵ بوون. عەشیرەتی گەلباخی ببوونە پیاوی دەوڵەت. لەو شەڕەدا لەشکری خان زۆر پیس شکا و چەند کوژراو و ئەسیری دا. ئەویش دوو ئاغای گەلباخی بە دیل گرتبوو؛ لە سەقز کوشتنی. «نافیع مەزهەر»ی شاعیر قەسیدەیەکی بەو هۆیە گوتبوو کە زۆر قەسیدەیەکی چاک بوو. چەند بەیتێک نەبێ لە بیرم نەماوە. دەربارەی کوردە خاینەکانەوە دەڵێ:
دزی خانەگی! واجبە کوشتنت    لەبۆ عیبرەتی غەیرە، خوێن ڕشتنت
یان دەڵێ:
چ خۆشە کە یەک سانیە بێتە شێر    نەوەک دوو هەزار ساڵە بتنێنە ژێر
چ شیرینە شاعیرا! کە ئەنجامی کار    لە سەر پاسی ئەم قەومە بتدەن لە دار
تفەنگەکەم پێنج تیرێکی زۆر خراپ بوو. زۆر بە ئاوات بووم تفەنگی برنۆم هەبێ؛ بەڵام دەست نەدەڕۆیی بیکڕم. شیعرێکم بۆ حەمەڕەشیدخان نووسی، گوتم جایزە تفەنگم دەداتێ؛ بەڵام کەس هەر نەیخوێندەوە.
لەو ماوەیەدا سەید کامیل ڕۆیشت کە سەری ماڵ بداتەوە لە «گەردیگلان» و من بە تەمای هاتنەوەی لە سەقز مامەوە؛ بەڵام کە ئەو زۆری پێچوو نەهاتەوە. لە ماڵەکە گوێستمەوە بۆ خانێکی کەران. شەوێ دەگەڵ کابرایەک قەرارمان دا کە پێکەوە بڕۆینەوە ولات. ئێوارە سێبەر شۆڕ ببوون لە شار دەرچووین. کابرا سێ خزمی خۆی دەگەڵ بوو. زوو تێگەیشتم کە تووشی بەڵایەک دەبم و ئەوانە کاریان دزی و خەڵک ڕووتکردنە. زۆر بە خۆپارێزی لە دواوە دەڕۆیشتم و تفەنگم لە سەر پێ و ئامادەی ڕووداو بووم. نوێژی شەوانێکی درەنگ لە دەوری گوندی قارەوای سەقز هێندێک ڕەشەوڵاغ و کەری بە جلەوە دەلەوەڕان. هاوڕێکەم دەگەڵ خزمەکانی درگای کۆنە قاوەخانەیەکیان لە سەر کەرەکان دابەست و گوێلک و پانیرەکانیان پێش خۆ دا و دزیان. زۆر دوور نەکەوتبووین، خەڵکی دێ کەوتنە شوێنمان و چەند تفەنگیان هاویشت. من کە دەمەویست لە چنگ ئەو پیاوخراپانە ڕزگار بم، گوتم ئێوە بڕۆن من لێرە پێش بەو هاوارچییانە دەگرم. ئەوان ڕۆیشتن و منیان بەجێ هێشت. هاوارچییەکان دوای چەند گوللە تەقاندن گەڕانەوە. ئەوسا سوار بووم و بێ ڕێگە ملم لێنا. تووشی جۆگە ئاوێکی زل بووم؛ ویستم باز دەم، هەیم لە ماینەکەم کرد؛ بازی دا؛ بەڵام تەنگەی زین پسا و کەوتمە ناوەڕاستی قوڕ و لیتەی جۆگە. هەر چۆنێک بوو هاتمە دەر و چرایەکم لە دوور بەدی کرد و هاوارم کرد. دیار بوو خەڵکی دێ دەترسان. ئاخری دوو کەس بە تفەنگەوە هاتن. کە زانیان جێی ترس نیم، من و زینی قوڕاوی و ماینیان ڕاکێشا و بردمیانە ماڵێک. خۆم ششتەوە. کابرا چای بۆ لێنام و حەسامەوە. کە باسی خۆم بۆ گێڕایەوە، بە لایەوە سەیر بوو. گوتی:
– ئەو هاوڕێیەت کە ناوی حەمەکەریمی مەجیدی بوو، بۆ دوو قڕان پیاوێکی کوشتووە؛ سەیرە تۆ نەجاتت بووە. ڕەنگە لە ترسی سەید کامیل نەیوێرابێ بتکوژێ و ماین و تفەنگت بەرێ.
پتر لە سی ساڵ بە سەر ئەو ڕووداوەدا ڕابردبوو، ڕۆژێک چوومە خزمەت بارزانی. سۆفی عەلی

ناوێک زۆر بە گەرمی ئەحواڵی دەپرسیم. بارزانی فەرمووی: لەکەنگێوە هەژار دەناسیێ؟ گوتی: قوربان لەو ساوە کە ئەو کەری لە دەوری سەقز دەدزی! چیرۆکەکەم بۆ بارزانی گێڕاوە؛ فەرمووی: نەمزانیبوو کەریشت دزیوە!

کۆمەڵی «ژێ-کاف» دەیەویست خەڵکی شار بترسێنێ؛ شەو تەقەیان لە حاکمێکی ئێرانی کرد کە وەبەر نەهات؛ بەڵام لە شار هەڵات. «عیسازادە» ناوێک -کە زەمانی پەهلەوی شەیتانی لە خەڵک دەکرد و زەبیحی و فاروقی بە گرتن دا و خەبەری لە من و مەلا حەمەدەمینی حەدادی دابوو، لە دەست دەوڵەت هەڵاتبووبن و خۆمان شاردبۆوە- بە ئەمری حیزب کتێبخانەکەی تالان کرا. ترس و لەرزێکی زۆر کەوتبووە ناو خەڵکی شار و لە دوژمنی نادیاری دەترسان. وردە-وردە هەر دوژمن کەم دەبوون و دۆست زۆر. تا وای لێهات کە دەستەڵاتی کۆمەڵە لە شاری سابڵاغدا تەواو پەرەی سەندبوو؛ ئەوی خۆشیشی نەدەویست لێی دەترسا.

جارێک خەبەریان دا کە دەوڵەمەندی شاری، حیزبی خۆیان لە دژی ئێمە دروست دەکەن و فلانە شەو لە مزگەوتی سەید نیزام کۆ دەبنەوە. قەرار درا لێیان تێک دەین؛ بەڵام نەشدەبوو بناسرێین. حوسێنی سەرۆکمان -پاش کێشە و هەرای زۆر- ئەو ئەرکەی خستە سەر شانی خۆی کە وا نەکا بیناسن و لێشیان تێک دا. بە جلێکی گۆڕاو، دەم هەڵپێچراو، لە مزگەوت چووبووە ژوور و دەمانچەی دەرهێنابوو، کە: وا وا لێکراوینە! ڕووح بۆ کوێ دەبەن؟...

ئەو هەموو دەوڵەمەندە قەڵەوانە -وەک جندۆکەی بیسمیللا لێکراو- هەر ئەوەندەیان بۆ کرابوو کە لە پەنجەرەوە باز دەن و خۆ دەرباز کەن. پتر لە دووسەد جووتە کەوشی زۆر باش لەوێ بەجێ مابوو.

**قازی محەممەد**

ماڵە قازیان زۆر لە مێژەوە قازی و دەستەڵاتداری شار و بەناوبانگ بوون. قازی فەتاحێکیان هەبووە کە لە ئازایەتی و بە جەرگیدا ناوبانگی دەرکردووە و لە شەڕی عرووسان کوژراوە. قازی عەلیش -کە قازی سابلاغ بووە- لە پیاوە هەرە بەڕێزەکانی ولات ژمێردراوە. دوو کوڕی لە پاش بەجێ ماوە: میرزا محەممەد، کە پیاوێکی زۆر خوێندەوار بووە و لە زەمانی باوکیدا چەندین ئەرکی بێ حقووقی وەک مدیر مەعارف و سەرپەرشتی شێروخورشیدی سووری گرتۆتە ئەستۆ و زۆر خۆشەویستی خەڵکی ولات بووە و لە پاش باوکی کراوەتە قازی سابلاغ. دووهەمیان میرزا قاسم، کە بە «سەدرولئیسلام» ناو براوە و لە دەسگیرۆیی داماوان و تکا بۆ زیندانیانی بێچارەدا زۆری کۆشش کردووە و بە پیاوی چاک ناسراوە و لە زەمانی کۆمەڵەدا بۆتە نایب لە تاران.

دەگەڵ تێکچوونی دەسەڵاتی دەوڵەت لە موکریان، قازی بۆ پاراستنی شار لە تالان و بڕۆی عەشایری دەوروبەر، خەڵکی سابلاغی ساز دابوو کە تفەنگ بکڕن و شەوانە کێشکی شار بگرن. زۆر جاریش ڕۆژانە کۆی دەکردنەوە و ئامۆژگاری دەکردن؛ دەسەڵاتی سابلاغی تەواو لە دەستا بوو. پێمان خۆش بوو قازی ببێتە هاوکارمان؛ بەڵام ئەو ئێمەی بە هیچ نەدەزانی و بە لایەوە کەمایەسی بوو دەگەڵ چەند ڕەش و ڕووتێکی بێ ناو و نیشان زرمە زلیتانێ بکا.

ئێمەش هەستمان دەکرد کە عەشایر و خەڵکی دیکەی سەرناس، چەتوونە هەتا نەزانن سەرۆکمان پیاوێکی زل و شیاوی حورمەت گرتنە، بێن لەگەڵمان و هیچ کەسی پایەبەرز بە حوسێن ڕازی نەدەبوو. بەڵام قازی چۆن چار بکەین؟ ڕاماندەسپارد ئەندامان و لاگرانمان کە لە

کۆبوونەوە بۆ وتاری قازی بتەکنەوە. تا وای لێهات کە قازی خۆی هەستی بەوە کردبوو حیزب بە هێزە و گاڵتەی پێ ناکرێ. ئەوسا داوامان لێکرد کە بێتە حیزبەوە؛ قبووڵی کرد و زۆر زوو بڕیار درا قازی سەرۆکی کۆمەڵە بێ. ئیتر زۆر ئاغا و پیاوماقووڵان -کە پچووکی قازییان پێ شەرم نەبوو- هاتنە یاریمان و هاتنە ناو حیزبەوە. قازی کە ماڵەکەی قۆناغی میوانانی ڕووس بوو، توانی نێوانی حیزب و ڕووسان خۆشتر کا و دەمانتوانی بە ڕاشکاویتر کار بکەین. دەوڵەتی ئێران -کە لە موکریان پاشەکشەی پێ کرابوو- ئیدارەی موکریانی لە میاندواو دانابوو؛ بە هەموو توانا حەولی دەدا ئاغایانی وڵات لە خۆی دڵخۆش بکا. شەکر و قەندی زۆری دەدانێ، پلەی حاکمەتی شاری بە عەشیرەتان دەسپارد. دوژمنی سەرسەختی ئەو ڕۆژگارەمان «قەرەنیاغای مامەش» و «عەلیاغای ئێلخانی» بوون. قەرەنیاغا زەبیحی گرت و هەڕەشەی کوشتنی لێ کرد. ڕووس بەریان دا و هەڕەشەیان لە قەرەنیاغا کرد.

**باسی عەلیاغا و پیاوەکەی (بابەکری سەلیم ئاغا):**

دنیا عەشایری بوو. حیزب و کۆمەڵەیەک نەبوو. بۆ سەردانی حەمەدەمین حەدادی چووبوومە «کانیەڕەش»؛ چوومە دەسنوێژ گرتن. لە کونی دیواری ئاودەستەوە دیتم عەلیاغای ئێلخانی دەگەڵ کابرایەک هاتن و پاڵیان دا بەو دیوارەوە کە من لەودیوی گوێم لە قسەیان دەبوو. عەلیاغا گوتی: زۆر سەلام لە بابەکری سەلیماغا بکە! بڵێ: عەلی دەیگوت نەکا دەغیلی بم، فریوی هەتیو- مەتیوان بخوا و کوردایەتی و شتی وا بکا. ئەگەر ئێمە ئەو کارە بکەین ئاغایەتیمان لە دەست دەچێ...

جارێک ڕووسان زۆر پیاوماقووڵی وڵاتیان بۆ باکۆیە بانگ کرد کە عەلیاغا و قەرەنیاغا و حاجی بابەشێخ و زۆر ئاغایتریش لەو بانگ کراوانە بوون. کە هاتنەوە بیستمان باغرۆفی سەرۆکی وەزیری ئازەربایجانی ڕووسیا گوتبووی چتان دەوێ بۆتان پێک بێنین. یەک دەڵێ شەکر، یەک دەڵێ زینی عورووسی، دەمانچە... من دەمەتەقەیەکم لە سەر نووسین و لە «نیشتمان»دا چاپ کرا. تێرم گاڵتە بە عەقڵیان کردبوو. عەلیاغا هەڕەشەی کردبوو کە ئەو شاعیرە هەر دەکوژم. ماوەیەکی زۆر نەمدەوێرا بە گوندی ئەودا بڕۆم و ڕێگەم بۆ شاری سابلاغ گۆڕیبوو.

ڕووسان چەکداریان کردین و هێزی پێشمەرگە پێک هات و مەشق بە پێشمەرگە دەکرا و تەواو بووژاینەوە.

جارێک دەگەڵ مەلا ڕەسووڵ ناوێکدا ناردرام کە مەلا خەلیلی گۆڕومەر بکەینە لاگری شۆرش؛ بەڵام هەرچی شێر و ڕێویمان بۆ هێنایەوە ملی نەدەدا دەیگوت سوێند بە ئاڵا خواردن پیاو کافر دەکا و بیستوومە کچان لە سەر خەیابان ڕێژە دەڕۆن! پاش چەققە و سوێندی زۆر، ڕازیمان کرد بە قورعان سوێندی بۆ خواردین کە یاریدەمان بکا و هەرگیز خەیانەتمان پێ نەکا. بەڵام زۆر زوو خەیانەتی پێ کردین و سوێندەکەی وەبەر پێ دا.

بە شاعیر ناوم زڕابوو. لە سەر داوای ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و ڕووس بە خۆ و شیعرەکانمەوە چوومە تەورێز. قەرار درا بۆشم چاپ بکەن و تەرجەمەشی بە زمانی ئازەربایجانی بکەن. گوتیان لە ئوتێلێکی خۆش داتدەمەزرێنین و چاوەدێرت دەبین کە پیاوی ئێران زیانێکت پێ نەگەیەنن؛ قبووڵم نەکرد. چوومەوە ئوتێلەکەی کە لە سایەی دەنگخۆشی هەمزەوە بوومە هەواڵی خاوەنەکەی. ژوورێکی بە تەنیا دامێ و ڕۆژێ سەعات هەشت دەچوومە لای «جەعفەر

خەندان» شاعیری مەشهووری ئازەربایجانی و تەرجەمەی شیعرەکانم بە فارسی بۆ دەبرد و ئەویش دەیکردنە شیعری ئازەری. ئالەکۆکیان بە کوردی لە چاپ دا. تەرجەمەشی بە ناوی لایلایی دەرکەوت. ویستیان پارەی ئەو شیعرانەم بدەنێ، نەمەویست و گوتم دیاری من بێ بۆ رووسیا!

چەند شتێکی سەرنج ڕاکێشم لەو سەفەرەدا لە بیر ماوە:

لە تەرجەمەی شیعرەکانم کە گەیمە ئەو بەیتەی دەڵێم:

بە هەزار وەزنی هەزار شیعری دەگوت    گەیبووە ڕیزی هەژار و پووشکین

جەعفەر خەندان پرسی: پووشکین دەناسی؟

گوتم: هەر ئەوەندە دەزانم شاعیرێک بووە.

گوتی: کوڕم! تۆ هێشتا منداڵی؛ شانازیش بە شیعری خۆت دەکەی. لە کوردیەکەدا بۆت چاپ دەکەین؛ بەڵام تەرجەمەی ناکەین. پووشکین زۆر لەو پایەبەرزترە کە من و تۆ خۆمانی بێنینە ڕیزی.

زۆر بە خۆدا شکامەوە...

ڕۆژێک عەکسێکی منیان بە تەرجەمەی شیعرێکەوە لە ڕۆژنامەی «وەتەن یولندە»دا چاپ کردبوو. ئەوەندەم کەیف ساز بوو هەر نەبێتەوە. پتر لە سەد ژمارەی ڕۆژنامەکەم کڕی و ناردمەوە بۆکان و سابلاغ.

لە تەورێز جگە لە تەرجەمەی شیعرەکانم ڕۆژانە دەچووم دەستە کچێکم فێری سروودی کوردی دەکرد. ئەو سروودەی کە جارجار لە «ئێرەوان» دەیلێن: «خاکی گەوهەرە، ئاوی کەوسەرە...» یەک لەوانە بوو. جگە لە «وەتەن یۆلندە»، عەکس و تەرجەمەی شیعرم لە کۆمەڵە نووسراوێک بە ناوی «کۆڕی شاعیران»دا چاپ کرابوو. ئیتر بە کلک گوێزم دەشکاند. هەر کیژێکی لەوانەی سەر بە ئیدارەی فەرهەنگی رووسان بوون، کە لێی دەپرسیم تۆ کێی؟ گورجێ عەکس و شیعری چاپ کراوم دەنا بەردەمی!

لە بیرمە ڕۆژێک جەعفەرۆف ناوێک لە ڕەوابیتی فەرهەنگی گوتی:

- بەزم و کۆبوونەوەیە. خۆت کە هیچ، کارتی دۆستانیشت وەرگرە بانگیان کە.

- کارتێکم بۆ قاسماغا دەیە.

- ئاغا؟!

- زۆر پیاوی چاکە و دەگەڵ خۆمانە.

- کوڕم! مار مارە، سپی و بۆر و زەرد و سووری نییە!

لە ڕۆژگاری کۆمەڵەدا زۆر شیعرم نووسیون کە هێندێکیان لە ئالەکۆکدا کۆ کراونەوە. پتر لە دوو هەزار بەیتی بە خەت مایەوە و ڕووناکاییان نەدیت!

بۆ جاری دووهەم قازی دەگەڵ چەند کەسێکدا چوونە باکۆ. لێیان پرسیبوو: چۆنە شاعیرەکانتان دەگەڵ خۆت نەهێناوە؟ ئێمە زۆرمان ڕێزی شاعیران لەبەرە. ئەمەش زۆر بووە مایەی دڵخۆشی من و هێمن و قازیش نازناوی [شاعیری]میللی لە هەردووکمان نا.

تا حیزب بە ناوی «ژێ-کاف» بوو، ئەندامانی نهێنی و کەس نەناس بوون، هەموو کەس بە چاوێکی زۆر بەقەدرەوە لێی دەڕوانی. وای لێهاتبوو هیچ لاوێک بە چاوی هەرزەکارییەوە لە هیچ کیژێکی نەدەڕوانی. دزی و درۆ و دەستبڕین بە یەکجاری باری کردبوو. لە لادێ ئەگەر



زیانیەک بکرایە، ئەگر گوریس و ئامرازێک ون بوایە، قەت کێشەی لەسەر هەڵنەدایسا و گومبوویان دەداوە بە خاوەنی. خەڵک لە سەر خەرمانان نەدەنوستن کە دەیانزانی کەس دزییان لێ ناکا. کیژ و لاو چەند شەوان پێکەوە شەو بە کێو دەبوون، بۆ ڕێواس یا چرێش، کەس دڵپیسی لە کەس نەدەکرد.

جارێک لە زەنبیل میوان بووم و خەریک بووم بڕۆم؛ لەو دەمەدا دەستەیەک مرید هاتن. سەید گوتی ڕاوەستە قسەم هەیە. سۆفیەکی پیر دەستی ماچ کرد. سەید لێی پرسی: سۆفی تۆش بوویە کۆمەڵە؟ گوتی: قوربان خوا بە نسیبمان کا. بە خوا من دەستی باپیرتم گلاو کردووە، بوومە مریدی بابت، ئێستاش مریدی تۆم، قەتم دەست لە خەراپەکاری و دزی بەرنەداوە. بەڵام لە سایەی کۆمەڵەوە هەموو خراپەیەکم وە لا ناوە. زەمان زەمانی محەممەدی مەهدییە...

خۆم لاوێک بووم لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا. دەگەڵ برادەرێکی حیزبی بە ناوی «عەبدولقادر دەباغی» ڕامدەبوارد. زۆر جار دەچوومە مالیان و دەگەڵ عەبدولقادر و خوشکەکانی بێتەقیە گەمەمان دەکرد. ڕۆژێک یەکێک پێی گوتم: خۆشی لە خۆت! دەگەڵ ئەو خوشکە جوانانەی دەباغیدا کەیف دەکەی. باوەڕ کە تا وای نەگوت نەمزانی خوشکەکانی جوانن یا ناشیرین. لەو ساوە تەرکی ماڵە دەباغیم کرد و هەرچی کردیان نەچوومەوە؛ نەوەک بە چاوی خەیانەت بڕوانمە خوشکی برای حیزبیم.

حیزبی توودە -کە سەر بە ڕووسان و لە ئێراندا زۆر بەهێز بوو- نەیتوانیبوو لە موکریان خۆی دیار بدا. ڕۆژێک قازی لە تەورێز گەڕاوە و کۆی کردینەوە و گوتی: قولیۆف گوتوویە ئێمە جگە لە توودە هیچ حیزبێک قبووڵ ناکەین؛ دەبێ خۆتان حەل کەن و ببنە توودە؛ دەنا ناچارین بتانکوژین. ئێوە دەڵێن چی؟ زۆر زوو جوابمان داوە کە ئێمە بۆ خۆمان ئەم ڕێگەمان هەڵبژاردووە؛ ڕووس ئاگایان لێ نەبووە. ئێستاش هەر لە سەری دەڕۆین و چییان لە دەست دێ منەتیان نەبێ. قازی گوتی: خوا شوکور لاوی کورد وەک میشک وان؛ تا بیانسوویەوە بۆنیان خۆشتر دەبێ. جوابەکەی بردەوە بۆ تەورێز و گەڕاوە گوتی: لەو جوابە ترساون و «قولیۆف» گوتوویە: توودە چ گووێک دەخوا؟ ئێوە هەر وەک خۆتان بن!

قازی و هەواڵانی کە لە دووهەم سەفەری باکۆ گەڕانەوە، ڕایانگەیاند: ڕووس لە ناوی «ژێ-کاف» ڕازی نین؛ چونکە حیزبێکە بۆ ئازادی هەموو کوردستان تێدەکۆشێ و ئینگلیس و تورکان تووڕە دەکا. دەبێ ناوی خۆمان بنێین «**حیزبی دیموکراتی کوردستان**» و داوای خودموختاری لەئێران بکەین. زۆرمان ئەو خەبەرە لەبەر گران هات؛ بەڵام چار چییە، قبووڵ کرا. من ئێستاش نەمتوانی ناوی «ژێ-کاف» لە خۆم دوور کەمەوە و کارتی حیزبایەتی دیموکراتم هەر وەرنەگرت؛ بەڵام لە چالاکی ناوحیزب کورتم نەهێنا.

حیزبی دیموکرات لە سەر دار و پەردووی «ژێ-کاف» دامەزرایەوە؛ بەڵام ئەوجار بە ئەشکرا کاری دەکرد. ئیتر ئەو هەیبەت و ناوی پاکەی کە لە «ژێ-کاف»دا هەبوو -چونکە نهێنی بوو- زۆری لە کورتی دا. ئەندامانی فێڵباز و بەرژەوەندی خوازی زۆری تێهات. زۆری نەبرد زانیمان کە «قاسماغای ئیلخانی» کە برایەکی حیزبی زۆر خۆشەویست بوو، لە پاش گەڕانەوەی لە باکۆ، چۆتە باشگای ئەفسەرانی تەورێز و بۆیان بۆتە جاسووس بە سەر حیزبەوە. ئەوە یەکەمین داوی خەیانەت بوو کە دە ناوماندا قەوما. ئیتر شیرازەی تەنزیم و تەکوزی پێشوو هەڵوەشا و خزمایەتی و ئاشنایەتی و خۆبەخۆیایەتی کەوتە ناومان و هەی لە وەی زرینگ بێ و خۆی وە پێش خا. لە

گوناهی خەیانەت خۆش بوون و نەمانی زەبر و زەنگی زەمانی ترساندنی «ژێ-کاف»، زۆر کەسی شێلگیر کرد کە خەیانەتیش بکەن و هەر لە ناوماندا بمێننەوە. ئێران و غەیرە ئێران دەیانتوانی نۆکەرانی خۆیانمان دە ناو خزێنن. بە جارێک دەرگای حیزب کرابۆوە و هەر کەس دەهات بێ لێکۆلینەوە- قبوول دەکرا. قاسم ئاغا هەر بە برا مایەوە و زۆر ئاغایانی دیش هاتنەوە ناومان و بە دڵ لەگەڵ دوژمنان بوون.

ڕۆژێک پێشەوا قازی محەممەد لە مەجلیسێکدا گوتی: زۆرم پێ سەیرە، زۆر باسی نهێنی هەیە کە مخابەراتی ئینگلیس دسبەجێ دەیانزانی.

سەرم بردە بن گوێی، گوتم: شێخ مەعسووم خەبەریان پێدەدا.

گوتی: ڕاست دەکەی، من هەموو قسەی خۆم لای ئەو دەڵێم. بەلام شێخ زۆری لاگیر لە ناو شارستان و لادێدا پەیدا کردووە؛ چۆنی دەست بۆ بەرم؟

گوتم: شێخ لە مزگەوتی بازاڕ دەیخوێند و مامی لە تالش بوو. ئامۆزایەکی بە ناوی نەسرەدین لە لا بوو. شێخ لە سابلاغ خوێندنی تەواو کرد؛ ڕۆیشتەوە بیارە. دیسان گەڕایەوە سابلاغ و دەستی بە خوێندن کردەوە. من بە خەیاڵ لام وا بوو پیاوی ئینگلیسانە و کاریان پێ سپاردووە؛ بەلام دیسان تەواو لێم ڕوون نەبوو. زۆر ساڵ کەوتە نێوانەوە. لە بەغدا دوکاندار بووم، یەکێک هاتە لام گوتی: من لە زیندانی بەغدا دەگەڵ نەسرەدین ناوێک گیرابووم کە تۆی دەناسی و دەیگوت زۆر کوڕێکی ساویلکە و ئەحمەقە. بابم لە تاڵش و شێخ مەعسوومی ئامۆزام لە سابلاغ جگە لە شێخایەتی و فەقێیەتی، کاری گرینگ‌تریان لە سەر بوو. ئەمنیش گرووبان بووم لە لەشکری لیڤی ئینگلیسەکان. بۆ ماوەیەک مەئمووریەتیان دامێ چوومە سابلاغ و سەقز و دەگەڵ بابیشم پەیوەندیم هەبوو. خۆم کردبووە فەقێیەکی زۆر بەدین؛ هەژار لای وابوو مەلائیکەتم!

ئەوسا زانیم کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە. نەسرەدین بە گرووبانی لە «دانکەرک» بە دیل گیرا و دەگەڵ دیلی ئەلمانی ئاڵ وگۆڕ کرا. لە پاش هەڵوەشانی لەشکری لیڤی، قەدەرێک لە ئێران لە تەرحی چواری ئەمریکایی کاری کرد و لەسەر ژن، پیاوێکی لە بیارە کوشت و لە زیندانی بەغداوە باسی ئەو ئەحمەقیەی منی کردبوو. شێخ مەعسووم لە سابلاغ هەر مایەوە و دەولەمەند بووەوە. ژنی لە سابلاغ بە سەر ژنی بیارە هێنا و بوو بە پیاوی ساواک و خاوەن زەوی و زار و زۆر بە دەستەلات. بەلام دیسان زۆر لە لاوانی دلگەرم و پاک هەبوون کە ئاخیان بۆ ڕۆژگاری «ژێ-کاف» هەڵدەکێشا و بە وپەڕی دڵپاکییەوە حەولی گەشەکردنی شۆڕشیان دەدا و هیچ سارد نەببوونەوە.

ڕۆژێک لە میاندواو لەبەر قاوەخانە لە سەر کورسیەک دانیشتبووم. کابرایەکی ئەرمەنی بە ناوی «ئارام کوردیان» هات لە تەنیشتم دانیشت. بەبێ ئەوە ڕوو بکاتە من لە بەر خۆیەوە گوتی: من ناتناسم؛ بەلام ئەگەر تۆ هەژاری، هەڵێ! سێ برادەرت: زەبیحی، قاسمی قادری و دلشاد لە بالانیش گیراون و ئێستا دەیانەوێ تۆ بگرن.

وای گوت و ڕۆیشت. جا وەرە هەڵێ! بە پێ تا تەویلە و میانە یەک بین ڕامکرد. دەستم لە کامیوونێک هەڵێنا، گوتیان بچۆ سەر باری گێچ. بایەکی زۆر توند گێچی بە سەر و چاومدا دەدا. لە ڕێ ببوومە هەیکەلێ لە گێچ؛ هیچ کوێم بە دەرەوە نەما. جارێک تۆزێک خۆم تەکاند و چاوم هەڵێنا، ڕۆژ لە ئاوابووندا بوو، وەمزانی مانگە! دە ڕۆژیش هەر گێچم لە لووت و گەروو پاک دەکردەوە. تاریخی ئەو ڕۆژە -کە سەرتیپ زەنگەنە نووسیویە «اوایل آبانماه ١٣٢٤»- سەرەتای

گەلاڕیزانی سالی ١٣٢٤ی کۆچی-هەتاویە.

**بارزانی**

دەمانبیستەوە کە لە کوردستانی عیراق مەلا مستەفا بارزانی شۆرشی کردووە و دەگەڵ عیراق و ئینگلیس شەڕیەتی. دوعای بە خێرمان دەکرد و بە دڵ دەگەڵی بووین.

میرحاجی دامەزرێنەری «ژێ-کاف» و ئەفسەرێکی‌تر کە ناوی «مستەفا خۆشناو» بوو، لە سوپای عیراق دەرچووبوون و چووبوونە لای بارزانی و لەوێوە بۆ پەیوەندی دەگەڵ ئێمە هاتبوونە سابلاغ و تەواو دەگەڵیان مابەینم خۆش بوو. بە کورتی باسی شەڕەکەی بارزانی و ئینگلیس و عیراقم لە دوای چاپی دووهەمی شەرەفنامەدا نووسیوە.

پاییز بوو؛ باران دەباری. گوتیان بارزانییەکانی ئاوارە هاتوونە گوندی «قونقەلا» لە نزیک سابلاغ. بە پەلە دەگەڵ «حەمەی مەولوودە چرچ»دا دوو ترومبێلی باریمان خواستەوە و چرپی براومان لە مێشەیەک لێ بار کرد و بۆ بارزانیمان برد. زۆری نەبرد بارزانی هاتنە شارەوە. خەڵکی سابلاغ - ورد و درشت- بۆ پێشوازییان دەرکەوتن. خۆراک و جلک و پێلاو، لە هەموو مالانەوە باربوو دەهات. خۆم دیتم منداڵێک کە کۆمای جلکانی دیت، کەوشەکانی خۆی فڕێ دا و بە پێخاوسی ڕایکردەوە ماڵ. بارزانی، ئەوی چەکدار بوو لە سەربازخانە دامەزران، ماڵ و منداڵ و پاتالیش لە دێهات جێگەیان دانێ. بۆ یەکەم جار کە چاوم بە بارزانی کەوت زۆرم دەگەڵ ڕووخۆش و بە ئیلتیفات بوو. ئیتر ئەو خۆشەویستییە دەوامی کرد تا بارزانی چوونە ولاتی ڕووسان و کە هاتیشنەوە عیراقێ، تا بارزانی وەفاتی کرد هەر زۆر لوتفی دەگەڵما بوو.

کۆمەلە و دەولەت لە دەوری سەردەشت شەڕیان بوو. لەسەر داوای خۆم ناردمیان کە لەو شەڕەدا بەشدار بم. دەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی خۆمالی وەڕێ کەوتین. ڕێ بەفر بوو؛ دنیا کڕێوەی دەکرد. شەوێک لە گوندی «قۆزلوێ» لە مالی ئاغا ماینەوە. یەکێک بە گوییدا سرکاندم: کابرایەک لەم دێیە دەیەوێ بتبینێ و ناوێرێ بێتە مالی ئاغا. خۆم چووم. مالێک ڕووت و قووت و شەدار و تاریک. پیاوێکی ڕدێن سپی دانیشتبوو. خۆم پێ ناساند و گوتی: تۆ شاعیری، منیش شاعیرم. دەمەوێ شیعرێکی خۆمت بۆ بلێم.

دەستی پێ کرد نزیکەی دە دەقیقە بەیتێکی گوت کە لە سەر شۆرشی کورد و قازی دانابوو. بەیتی بڕ پێدا و لێی پرسیم: پێت چۆن بوو؟

گوتم: زۆر خراپ بوو! مامە تۆ زۆرت وشەی عارەبی مەلایانە بە کار هێناوە، تا بلێن وەک خوێندەوارانت گوتووە. خۆزگە بە زمانی شوانانت بگوتایە و عارەبی تێدا نەبوایە. من کە شیعر دەلێم هەر نارەحەتی ئەوەم کوردی باش نازانم و ناچارم وشەی بێگانە بە کار بێنم.

گوتی: دەسا وەللا من خۆم شوانم. گوێ بگرە!

لە سەرڕا دەستی پێ کردەوە، بە بێ ڕامان بەیتەکەی تەواو گۆڕی. بە ڕاستی سەرم سووڕ ما: خودایە چەند هەزارانی وا بلیمەتمان لێ هەلکەوتووە و وەک بەفری پار تواونەوە و خەبەرمان نەزانیبوون و کەس قەدری نەگرتوون؟! نامەیەکم بۆ نووسی و گوتم بیبە سابلاغ. ئەگەر منیش نەبم تۆ لەوێ کارت دەدەنێ و بەخێوت دەکەن. بەلام بیستمەوە کە مانگێک دوای ئەو دیدارە، پیرە مردبوو؛ نەیکرابوو نامە بەرێتە سابلاغ.

پێشمەرگە ئابلۆقەی گوندی قولتەی دابوو کە پێنجسەد کەسێک سوپای ئێرانی لێ بوو.

شەڕکەرانی ئێمە جگە لە بیست پێشمەرگەیەک، چەکداری گەورکی دیوی سەردەشت و سوێسنی بوون. زۆری نەبرد مستەفا خۆشناویش هاتە لامان. ڕۆژێک دەگەڵ «دڵشادی ڕەسوولی» کە لاوێکی ئەدیبی کورد بوو، بە سواری بە ملەی کێوێکدا دەڕۆیشتن؛ عەجەم بە تۆپ دایانگرتین. ئەوە یەکەمجار بوو کە تۆپم پێوەنێن و ببینم گوللە تۆپ لە نزیکمەوە دەکەوێ. وابزانم من لە شەرمی دڵشاد و دڵشاد لە شەرمی من دانمان بە جەرگی خۆمان ڕاگرت و هەڵنەهاتین و تۆپیشمان وێ نەکەوت.

چەند جارێک لە شەڕی ناو سەنگەردا بەشدار بووم. جارێک خەبەریان دا کە لەشکرێکی سێسەد و پەنجا کەسی لە بانەوە دێن بۆ ڕزگار کردنی قولتە. شەو چووین خۆمان لێ داگرتن. بەرەبەیانی گەینە بەرەوە و تەقە دامەزرا. زۆری نەبرد لەشکرەکە خۆیان دا بە دەستەوە و بە دیلمان گرتن. چەک و فیشەکمان دا بە عەشایەر و کەلوپەلی وردەمان گێڕاوە. کە دیتمان دوو شووشەی تێدایە، وامانزانی ئارەقە. دڵشاد و یەکێتر کردیانە هەرا کە خۆیان بیخۆنەوە. بەلام شووشە بە ئاولیمۆ دەرچوون و کردمانە چێشتەوە. نانمان هەبوو، پارەشمان هەبوو؛ بەلام قاتی و قڕی پێخۆر بوو. زۆربەی کات بە نانی وشک و چا ڕاماندەبوارد. چووینە سەر گوندی «بیزیلا»، ئاغاکەمان دەرکرد؛ کە جاشی دەوڵەت بوو. بۆ بەیانی تەیارەمان هاتە سەر و زۆری شێستتیر لێ ڕشاندین؛ بەلام کەسمان لێ بریندار نەبوو. ئەوەش هەوەڵ جار بوو کە تەیارە ببینم شەڕ دەکا.

هەوەڵ شەوی کە چوومە گوندی «شینوێ» چەند پێشمەرگەیەک نۆرەیان بوو ببنە کێشکچی لە سەنگەری دەوری قولتێدا. یەکیان ناوی «وەستا برایمی بەننا» بوو؛ دەنگی زۆر خۆش بوو؛ قەتاری زۆر خۆشی گوت. گوتم ئەمشەو تۆ مەچۆ؛ سبەی شەو پێکەوە دەچین. گوتی سبەی شەویش دەگەڵ تۆدا دێمەوە سەنگەر. بەیانی ئەو ڕۆژە وەستا برایم شەهید کرا. دوو پێشمەرگە بە ناوی «شەریف شکاک» و «ڕەحمان چەتە»، چوون بە ئێستر لاشەکەیان هێنایەوە.

قەبر هەڵدەقەندرا، بانگی مەلایەکم کرد کە لە سەر قەبرەکەی باسی شەهید بکا و بلێ ئەمە شەهیدە و نامرێ. مەلا گوتی: چۆن قسەی وا دەکەم؟ قەت ئەوە شەهید نییە؛ خۆ نەچۆتە شەڕی دینی ئیسلام!

بانگم کرد: دوو قەبر هەڵقەنن؛ یەکیان بۆ ئەو مەلا سەگبابە!

مەلا زەرد هەڵگەڕا و بێهۆش تخێل بوو. ئاویان بە سەر و چاویدا کرد؛ وە هۆشیان هێناوە. ملی نا وەک بلبل؛ کارێکی کرد کە وەستا برایمی وەک ئیمامی هەمزە و ئیمام حوسێن حیساب کردا!

ڕۆژێک باران دەباری. کابرایەک لە شەودا بانگی لە کەڵەکەوان کردبوو بیپەڕێنێتەوە. کابرامان گرت:

- چکارەی؟

- فەقیرم و لە خێر دەگەڕێم.

برادەران کەوتنە تەحقیقات و نووسین. زۆریان گوت فایدەی نەبوو. شەو بە دەنگێکی وا کە گوێی لێ بێ گوتم:

- ئەرێ بە شەو کێ دەتوانێ بە پێنج گوللە نیشان بپێکێ؟ ئەو کابرایە بێنن، دایکەین، بزانین کێ دەستی ڕاستە!

کابرا کردیه هاوار:

- باوکم مەمکوژن! بە خوا من جاسووسی عەجەمانم. کۆتری نامەبەر دە باخەڵم دەنێم، خەبەریان بۆ بە کۆتردا دەنێرمەوە. ناردوویانم بزانم ئێوە چەند کەسن و لە کام خانوودا دەژین.

کابرامان ناردە سابلاغ.

ڕۆژێ کە تەیارەمان هاتە سەر و دایگرتین؛ ئێمەش بە تفەنگ لە خوارەوە تەقەمان لێ دەکرد. من لە بن دار توێکەوە لە حەوشەدا تفەنگم داویشت. «عەولا شکاک» ناوێک -کە پێشمەرگەیەکی سابلاغی بوو- لە سەر سەربانەوە تەقەی لێ دەکرد. چەند جار هاوارم لێ کرد وەرە خوار! لەوێ خەتەرە! جوابی نەدامەوە؛ گوێی گران بوو. دەورەی هەموو لە گوللە دابێژرا بەلام خۆی بەرنەکەوت. دوایە خۆم لێ تووڕە کرد کە بۆ لە سەربان نەهاتۆتە خوار و خۆی پەنا نەداوە؟ حیکایەتێکی گێڕاوە کە جارێک شێخولیسلامی باوکی هێمن لە ڕاو بووە، کەروێشکێک بە تەماڵ دۆزراوەتەوە. نۆکەرێکی گوتوویە توخوا تاژی تێبەرمەدەن! من بە تفەنگ دەیکوژم؛ کەچی نەیپهەنگاوتووە. ئاغا لێی تووڕە بووە کە بۆچی کەروێشکت لە کیس داین؟ گوتوویە:

- بەڵێ ئاغا نەمپهەنگاوت، بەلام وام ترساند کە تازە ڕوو ناکاتەوە ئەم گردە!

دوای دەرکردنی مام حەسەنی بیزیلا، لامان وابوو تەیارەمان دێتە سەر. بۆ ئیحتیات پێش تاو کەوتن هەموو خەلکی دێی وەتماناوێمان وەدەر نا. لە تاو گەرمبووندا پیرێژنێکم دی بەرەو مالان دێت. دەنگم دا کە نەیە. پاڕاوە کە کارێکی زەرووروم هەیە. لام وابوو پریسکەی پووڵی لە بیر چووە بیبا؛ گوتم: ئەمما زوو بڕۆ تەیارە دێ. دوای تاوێکی دی دیتم دیسان بەرەو مالان دێتەوە. گوتم ئەمجار ڕێت نادەم. گوتی: بە قوربان! خاڵ سەعیدی پێشمەرگە دەڵێ تەیارە دوژمنی قەستەسەری خورییە؛ هێندێکم خوری لە دیزەیەک دایە دەچم دەریدێنم!

عەجەم قوللەیان هەبوو؛ تۆپمان نەبوو کە دژی قوللە بێ. ڕۆژێک کابرایەکیان هێنا، ڕەش چەتەوڵ، گوتی من ئامادەم چەند نارنجۆک لێک ببەستم و بچم لە بن قوللەوە بیهاوێمە سەرێ.

- ئەو خەتەرە بۆ دەکەی؟

- کاکە من بە سەد ساڵ حەبس مەحکووم بووم. نۆ ساڵم کێشا؛ نەوەد و یەک ساڵم مابوو، ڕووس بەریاندام؛ لە سەر زیادی ماومەوە. ئەگەر بە سەلامەت هاتمەوە تفەنگێکم دەیە.

- نا کاکە، ئەو کارە مەکە. پێشمەرگە بە و تفەنگیشت دەدەمێ.

«عەلەگاور» کابرایەکی دز و چەتەی مەشهوور بوو لەو ناوە؛ هات بوو بە پێشمەرگە. پیاوی وا ئازام زۆر کەم دیوە. شەوێک کە ئێمە دەچووینە پێش هێزی ئێران -کە بەرەو قولتە دەهات- لەشکرمان بە سەر کردەوە و عەلە دیار نەبوو؛ بێ ئەو ڕۆیشتین. زۆر دوور نەکەوتبووینەوە، لە لای قولتێوە بوو بە تەق و هۆڕێک هەر مەپرسە! بە هەزاران گوللە دەتەقێنرا؛ شەڕ بوو ئەمما شەڕ. خوایە ئەمە چییە؟ ئێمە نەچووینە سەر دوژمن، ئەو برێشکە تەقاندنە چییە؟ ئێمە لە شەڕی هەورازە سەرکەوتین و سەربازمان بە یەخسیر گرتن. کە هاتینەوە عەلە لە بنکە دانیشتبوو، تەواو وەک گۆلی قوڕاوی. هەموو گیان قوڕاوی؛ تەنیا پێنج فیشەکی پێمابوو.

- عەلە لە کوێ بووی؟

- کاکە ئەنگۆ باری شەڕ نازانن. ئەگەر قولتێ بە هاواری هەوالانی خۆیەوە هاتبا، دەکەوتنە نێو دوو ئاگرانەوە و دەرنەدەچوون. ئەمن خۆم گەیاندە کانیە ژنان لە قولتێ، تەقەم لە بورجەکان کرد. هەر من فیشەکێکم داویشت، ئەوان هەزاریان دەتەقاند. لە بیرم بردنەوە کە دەبێ بێنە

جەستەی ئێوە! بە ڕاستی تاقە کەسێک هەزار کەس مەشغووڵ کا، هەر لە چنگ عەلەی دەهات.
دوای نەمانی «جمهووری»، دەوڵەتی ئێران پووڵێکی دابوو بە سەلیماغای بایزی، ئەویش ناردبووی عەلەگاور و سەمەد ناوێک -کە ئەویش زۆر بە ئازا مەشهوور بوو، هەواڵیش بوون- بێنە لای کە بیانکاتە نۆکەر و چەتەی خۆی. هەردووک چووبوون. لە ناو دیوەخانی خۆیدا خۆیان بە سەردا دابوون و پەتیان خستبووە ملیان و لە گۆمدا خنکاندبوویان.
لێ بڕابووین کە هێرشێکی بەرپان بکەینە سەردەشت و قولتێ و دوژمنیان لێ دەرکەین. بڕیار درا شەو سوێسنی هێرش بەرنە سەردەشت و گەورگ خۆ دەگوندی قولتە هاوین. ڕۆژێک لە کازیبەی بەیانەوە تا ڕۆژئاوا بە کەلەک چەکدارمان لە «کەلوێ» پەڕاندەوە. دەپاش نوێژی شەواندا فەرمان هات کە دەبێ لە دەوری سەردەشت بکشێنەوە. ڕادیۆ لەندەن گوتوویە کوردەکان سەردەشتیان گرتووە. ڕووسەکان لەو خەبەرە نیگەرانن؛ نایانەوێ ئینگلیسیان تووڕە کەن. گوتم: من ئەم ئەمرە گوێ نادەمێ و دەست لە هجووم هەڵناگرم. پاشان حاڵیان کردم کە فەرمان لە عەرزێ نادرێ. لە داخان گریام. ئەو شەوە بە دزیەوە لەشکرمان بەجێ هێشت کە نەوەکا لە ڕقان بمانکوژن.
لە ڕێی گەڕانەوەدا لە دۆڵێکدا، زۆر دوور ورچێکمان دی. تفەنگێکم لێ تەقاند. سوور دەمزانی نەمهەنگاوت؛ بەڵام هێندێک لە هەواڵان گوتیان کوشتت. بە ڕاستی خاتری منیان گرت و درۆیان دەکرد. کە هاتینەوە سابلاغ، حەمەحوسێن خانی فەرماندەی سوپا بۆ ئەو دەستڕاستییەم -کە هیچ ڕاستی تێدا نەبوو!- دەمانچەیەکی خەڵات کردم و هەرچەند گوتم ڕاست نەبووە، باوەڕی نەکرد.
ماوەیەک شەڕ و هەرا مات ببوو. منیان ناردە سەرای لای سەقز کە مابەین بم و ئاگادار بم عەشایر ئاڵۆزی نەنێنەوە؛ نامەی نێوان دوژمن و دۆست پێک بگۆڕینەوە. جارێک خەبەرم وەرگرت کە سەربازانی دەوڵەت مەڕی گوندێکیان دزیوە. گوندەکە دەبوایە عەمەرخانی شکاک بیپارێزێ. نامەیەکم بۆ نووسی کە چۆن ئاگادار نەبووی و مەڕیان لە بەر پێی تۆ بردووە. بۆی نووسیبوومەوە: ئەو سەربازانە گەنمیان زۆرە، پێخۆریان کەمە؛ منیش گۆشتم بۆ ناردن!
جارێک «سەرتیپ هومایونی» نامەیەکی نووسیبوو ناوی پێشەوای «آقای محمد قازی» نووسیبوو. لە جوابیدا لە باتی تیمسار و تەڕەماش بۆم نووسییەوە: «آقای حاجی عەلی»! کە بەوە زۆر تووڕە ببوو.
لە «سەرا» لەپڕ نەخۆش کەوتم. ئەو ڕۆژە بارزانی هاتبوو؛ هەڵیگرتم و بردمیە سابلاغ و لەوێوە ڕەوانەی بیمارستانی ڕووسیە لە تەورێز کرام. مانگێک پتر مامەوە.
حەمەڕەشیدخان لە شەڕی پێشوویدا شکا و گەڕاوە، بانەی سووتاند و گەییە عیراق. دەوڵەتی عیراق بردیە جەنووب. لە شاری «ڕەمادیە» دەژیا. لە جەنگەی شۆڕشی ئێمەدا لەپڕ هاتەوە مەڵبەندی سەقز؛ دوو لاوی عیراقیشی دەگەڵ بوون بە ناوی «یەحیا چروستانی» و «حەمەدەمین مەنگووڕی» کە یەکیان مەلا و یەکیان شاعیر بوو. پێشەوا منی دەگەڵ میرحاج ناردە لای کە بچینە سابلاغ. لە گوندی «تورکمان» دیتمان و بە تەنیا ڕاسپێریەکەم پێ گەیاند.
خان زۆر شڵەژا؛ گوتی: نازانی بۆچیم بانگ دەکەن؟
- نە!
کە هاتبوو ڕووسەکان دواندبوویان، ڕاستی گوتبوو کە ئینگلیسان ناردوویانم کارتان لێ تێک

دەم؛ بەڵام قەول دەدەم بە قسەیان نەکەم و خزمەتکاری شۆرش بم. دەستیان لێ بەردا و لە «سەرا» بە ناوی ژنراڵ مایەوە.
دەولەتۆکەی ئازربایجان بە سەرکردایەتی پیشەوەری ملی لە ئاغا کوشتن نابوو. تەمای کردبووە ئاغاوەتی کوردستانیش. هاشمی خوسرەوی ناوێک لە لایەن سابلاغەوە حوکمی بۆکانی دەکرد. پیاوی پیشەوەری، هاشمییان ساز کردبوو کە شەوێک بێن و ماڵە مەحموداغا و عەلیاغا و حاجی بایزاغا قەتلوعام کەن. زۆر لام گران هات. بێگانە بێ و کورد بە دەستی شۆرش بکوژێ. لە بۆکانەوە بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە پێشەوا. فەورەن رۆیی بۆ تەورێز و لەو کارەی پەشیمان کردنەوە. هاشمیشیان لە بۆکان لابرد و دارکاریەکی باشیان کرد. ماڵە ئیلخانی کە بەو کەین و بەینەیان زانیبوو، بە سوپاسەوە دەیانگوت تۆ نەبوایەی ئێمە نەدەماین.
رۆژێک برادەرێک -کە نۆکەری ماڵە ئیلخانی بوو- گوتی:
- ئاغایان کۆبوونەوەیان کردبوو؛ منیان دانابوو ئاگام لە درگا بێ و کەس نەزانێ دەڵێن چی. من لە پشت درگاوە گوێم گرت: بیست رۆژی‌تر لەشکری سەقز دێن و هجووم دەکەنە سابلاغ. ئێمە دە پێشدا لە بەریان دەرۆین و دوایە ڕەگەڵیان دەکەوین.
ئەو خەبەرەم گەیاندە پێشەوا. لە نامەیەکی بە خەتی خۆیدا نوسیبووی: «هەژار! هەزار مامری شامیت بە قوربان بێ؛ مەترسە! هەموو کار بە کەیفی تۆ دەبێ». لەشکرێکی هەزار کەسی هات و پێشمەرگە لە «قەرەموسالیان» پێشی لێ گرت و شکاندی. ئاغایان ڕەوی بوون؛ بەڵام فریای ڕەگەڵ کەوتن نەکەوتبوون.

**ڕادیۆ**

لە تەورێز ڕادیۆی پیشەوەری هەبوو. بڕیار درابوو رۆژێ نیو سەعات ئێمەش قسەی لە سەر بکەین و بەرنامەی تایبەتی خۆمان هەبێ. من بۆ ئەو کارە چوومە تەورێز. وەتاغێکم لە ماڵی شازدە خانمی میرپەنج بە کرێ گرت. شەوانە تا نیوەشەو، ڕۆژانە هەر لە بەیانەوە تا نوێژی شێوان بە تەنیا خەریکی بەرنامە نیو سەعاتییەکەم دەبووم و دەچووم دەمخوێندەوە. پازدە ڕۆژ ئەو کارەم کرد. ڕۆژێک هاتن بە ترومبیلێکەوە و بردیانمە ئالێ قاپوو (نشیمەنی پیشەوەری). کە چووم پیشەوەری لەوێ بوو.
پیشەوەری گوتی: ئێمە نازانین تۆ چ دەخوێنیتەوە؛ پێویستە بەرنامەکەت تەرجەمە بکەی و ئێمە بیبینین.
گوتم: من وەمزانی بەرنامەی خۆمانە؛ ئەگەر بەرنامەی ئێوە بێ من کاری لێ ناکەم.
گوتی: ئاخر نازانی هەر چارەگە سەعاتەی سی تمەن حقووقی گوویەندەیە؟!
گوتم: من لە موعامەلەی خۆم زۆر پەیدا دەکەم؛ ئەو کارە بە کەسێکی‌تر بسپێرن.
ئیتر تازە نەچوومەوە ڕادیۆ تەورێز. هەر لەو سەر و بەندەدا نومایشنامەی «ئارشین مالالان»م کردە کوردی و شازدە خانم -کە تورکی باش دەزانی- یاریدەی دەکردم. بەڵام فەوتا و نەچووە سەر شانۆ.
بۆ دووهەم جار پیشەوەریم دیت. مانۆڕی هێزی ئازربایجان لە نزیک تەورێز بوو؛ پێشەوا منیشی دەگەڵ خۆی برد. لە دەمی نیوەڕۆژە خواردندا، من شیعرێکم دەربارەی برایەتی کورد و ئازەربایجانی خوێندەوە. کە بۆ پیشەوەریان تەرجەمە دەکرد، بە لایەوە خۆش هات؛ لیوانێک



ئابجۆی بە دەستی خۆی بۆ هێنام؛ وەرمنەگرت؛ کە عادەتم بـە مەشـرووب نییـە. حەمەحوسـێن خان لێم تووڕە بوو کە چۆن لە دەستی پیشەوەری وەرناگرێ؟ بەڵام فایدەی نەبوو، وەرمنەگرت.

«حەمەحوسێن خان» کوڕی «سەیفی قازی» و ئامۆزای پێشەوا بوو. پیـاوێکی سـوورهولی زۆر زەلامی چاوزەق و بەهەیبەت بوو. تا خوا حەز کـا کـوردێکی دڵـسۆز بـوو. کرابـووە فەرمانـدەی هێزی چەکداری کۆمەڵە. بە ڕاستی لە هـیچ شـتێ نەدەترسـا. ڕۆژێـک لـە تـەوریز خۆنوانـدنی لەشکری فیدائیانی پیشەوەری بوو. پیـشەوەری پرسـیبووی: «پێـت چۆنـە؟»، گوتبـووی: وەک کۆمەڵە ژنێکی حیزم دێنە بەرچاو کە بـەرموریان تفـەنگی بڕنۆیـە. بەرگـەی دە کـەس کـوردی چەکدار ناگرن! ئەم قسە هەرایەکی نایەوە و پیشەوەری زۆر تووڕە کردبوو. کە دەگەڵ پێشەواش ئیعدام کرا، تەنانەت ڕۆژنامـەی لەشـکری دوژمـن (ێـتش) نوسـیبووی: پیـاوی وا نـەترس هـەر نابێتەوە، دوو جار پەتی سێدارە پچڕا؛ بەڵام ئەو بە دەنگی بـەرز هـەر دەینەڕانـد: «بـژی کـورد و کوردستان! کوردستان هەر ئازاد دەکرێ» و لەو قسە بێمانایانەی دەکرد...

لە نەخۆشـخانەی سـابلاغ کـەوتبووم. کـە هاتمـە دەر گوتیـان کراویـە بەرپرسـی تـەبلیغات. سەرپەرشتی ڕۆژنامەی «کوردسـتان» و ڕادیـۆ چکۆلەکـەمانم دەکـرد. دوو یاریـدەم بـۆ دیـاری کرابوو. منداڵێکی تورکی خۆیی کـە تەمـەنی پـازدە و شـازدە دەبـوو، ژووری کـاری بـۆ خـاوێن دەکردینەوە.

من کە لادێیی‌یەک بووم هەمیشە لە خەڵکی شارستان و نـەخوازە ئەوانـەی کـە زۆر کـۆک و پۆشتە بوون و عەینەکیان بە فیز لە چاو دەکرد شەرم دەیگرتم و زۆر لە خۆم بە زیـاتر دەزانـین؛ کە یەکێک لە یاریدەکانم بە ناوی «عەلی خوسرەوی» لەوانە بوو.

ڕۆژێک مەقالێکم نوسیبوو، گوتم: کاکە عەلی زەحمەت نەبێ پاکنویسی کـە! تماشـای کـرد و گوتی: نایزانم!

گوتم: هەر شکڵ نووسی بکە بەسە.

گوتی: ناتوانم!

بە منداڵە تورکەکەم گوت: تۆ چۆنی؟

گوتی: خەتم خۆشە؛ کوردی نازانم؛ وات بۆ شکڵ نووس دەکەم بە نوختە فەرقی نەبێ.

ڕاستی کرد. ئیتر هەیبەت و سامی جلی تازە و فش‌وفۆلم لە بەر چاو نەما.

لەو کارەمدا نامەیەکم لە تەوریزەوە بۆ هات، کە دەبـێ لـە هـەموو ئازربایجانـدا ئـاوا تـەبلیغات بکرێ. لە داخان لە سەر پاکەتەکـەم نووسـیەوە: «ترکـی نـازانم» و بـۆم ناردنـەوە. دوای چەنـد ڕۆژێک پێشەوا لۆمەی کردم. فەرمووی: بەو کارە منداڵانەیەت کێشەیەکت بـۆ سـاز کـردووین. گوتم: من خۆم بـە کوردسـتانی دەزانم و لام وا نییـە کلکـی ئازەربایجـانین. پێـشەوا گـوتی وام نەزانیبوو. ئەویش گازندە نامەیـەکی نووسـی. ئـەوان عوزریـان لـێ خواسـتینەوە کـە سـەهویان کردووە!

بڕیار درا کە ئێمە و ئازەربایجانی لەگەڵ دەوڵەتدا بکەوینە وتوویژی پێک هاتن. «حاجی بابا شێخ»، «مەنافی کەریمی» و منیان نـاردە سـەقز. نوێنـەری ئازەربایجـانیش هـاتن کـە دەگـەڵ «ڕەزمارا» قسە بکەین. زەبیحی و سەدرولئیسلامیش دوایە هاتنە لامان. پێک هاتن کە دەوڵـەت بانە و سەردەشت و تکاب چۆڵ بکا، پیشەوریش زەنگان بە جێ بێڵـێ. تـا ئـەو کـارەش دەکـرێ ڕێگە بدرێ کە ئازووقە بۆ لەشکری بانە بنێرن و کورد ڕێگەی لێ نەگرن. کاروانی ئازووقە دەبوایە



به ئاگاداری من و دەگەڵ من بچێ و من و زەبیحی چاومان لە بارکردنی بێ؛ نەوەکو چەکی شەڕی تێدابێ. بەیانی گوتیان وا بار حازرە، وەرە بڕۆ. کە دیتمان ترۆمبیل بار کراون و نیشانمان نەدراون. زەبیحی و من پێمان داگرت کە تا ناوەرۆکی بار نەبینین قبووڵ ناکەین. پاش چەقەی زۆر، سەدرولئیسلام کە برای پێشەوا و سەرۆکی وتووێژکەران بوو، گوتی: بار چییان تێدا نییە جگە لە ئازووقەی خواردەمەنی و من ئەمر دەکەم کە نەیپشکنین. ناچار بۆ ئەمر ملم دانەواند. دەگەڵ باران چوومە بانە و لە ماڵی ئەفسەرێک بە ناوی «ستوان ڕەنجبەر» دامەزرێندرام. من خەوتبووم تەلەفۆن لە ستوان دەکرا، لە جوابێکدا گوتی: بەڵێ تانکێکیان دە ناو باراندا هێناوە. زانیم خەیانەتێکی گەورە بە دەستی من پێک هاتووە و خەتا لە سەدورلئیسلام بووە. داخی ئەوەم دەخوارد کە بۆچی لە ڕێگە ئەم کاروانەم بە پێشمەرگە بە ڕووت کردن نەداوە و دەشمتوانی.

بە فەرمانی پێشەوا ماڵم لە بۆکانەوە هاتە سابلاغ. کوڕێکم هەبوو بە ناوی «شێرکۆ»، تەمەنی چوار مانگ بوو؛ کە دیسان دەگەڵ سەدرولئیسلام و زەبیحی و حاجی حەمەداغای شێخالی بەڕێ کرام بۆ سەقز و گفتوگۆ کردن. سەدرولئیسلام دوای دوو ڕۆژ گەڕایەوە. بردیانینە ماڵێک لە سەقز و پاسەوانێکیان لە دەرگا دانابووین. ئەمجار دەبوایە یەک لە من و زەبیحی ڕەگەڵ کاروانی ئازووقە بچینە بانە. گوتم: زەبیحی تۆ زۆر جار حەبس کراوی. لێرە دەمانگرن. لە ڕێگەوە خۆت دەرباز کە و حەولێک بۆ ئێمە بدە تا نەگیراوین. زەبیحی لە ڕێ ڕایکردبوو. لە سابلاغەوە هێندێک دراویان بە «کاکاغا» ناوێک و ڕانندەیەکی ئەرمەنیدا بۆ ناردبووین. گۆز و گومبەت هاتنە سەرمان و داوای چەک دانانیان لێ کردین. من کە لاوێک خوێنگەرم و بێتەجرەبە بووم لام وابوو چەک لێ ساندن زۆر شەرمە، دەمانچەی خۆم نەدا و بە ئەفسەرەکەم گوت: دەبێ بکوژرێم و دەمانچەم لە قەدی بکەنەوە. ئەفسەرەکە گوتی: باشە لە تۆ ناستێنم.

دە ئێوارەدا هاتەوە لامان، گوتی: تۆ حەز دەکەی بچیە ناو شار، وەرە پێکەوە بڕۆین. چووینە قەراغ چەمی سەقز. زۆر بە نەرمی گوتی: برام من کوردی کرماشانیم؛ تۆشم زۆر وە بەر دڵ کەوتووە کە بۆ ئازادی گەلی کورد حەول دەدەی؛ بەڵام هێشتا زۆر کاڵی. لێم ڕوونە من پڕکێشیم بکردایە بە دەمانچە دەتکوشتم. دەوروبەری شار پتر لە چوار هەزار سەربازی تێدایە. دەرچوونت محاڵ بوو؛ دەیانکوشتیەوە. ئەو جار دەوڵەت هەزاران ئەفسەری لە من زلتریشی هەیە کە بە کوشتیان دەدا و گوێش ناداتێ. تکایە لەوە عاقڵتر بە! حەیفە لە دەست بچی. چاوەنۆڕی فرسەت بەو دەنگ مەکە. هەر ئەمڕۆ حەبستان دەکەن... ئەوەندەی بۆم بکرێ یاریدەتان دەدەم. خولاسە خاو بوومەوە. پێکەوە چووینە بازاڕ کە کتێبی داستان بە کرێ بگرم و لە زینداندا خۆمی پێ بخافڵێنم. ئەفسەرەکە ناوی وابزانم «ناسرپوور» بوو؛ بردمیە دوکانی کتێبفرۆشێک بە ناوی «کولاهی». کابرا گوتی: هەر کتێبەی شەوێ بە دوو قران بە ئەمانەت دەدەم. خۆی لێ تووڕە کرد: بێ ئینساف ئیجارەی کتێب شەوی چوار شاییە؛ بەڵام ناچار قبووڵم کرد و چەند چیرۆکێکم وەرگرت.

هەر ئەو شەوە حاجی حەمەداغا و کاکاغا و میناسی شۆفیر و منیان گرت و لە ماڵێکی نزیک چەمی سەقزدا حەبسیان کردین و شازدە سەربازیان لە سەر دانایین کە ئاگادارمان بن. پووڵەکەشیان کە بۆ ناردبووین نەدایێ. ئەفسەرە کوردەکە دوای چەند ڕۆژێک هاتە لامان و گوتی: وابزانم شکەنجەتان دەکەن چونکە منیان لە سەرپەرشتی ئێوە گۆڕیوە. ئەفسەرێکی تر

هاته سەرمان بە ناوی «نەسیرزادە»؛ ئازەربایجانی بوو. دیار بوو دە دلدا لاگیری پیشەوەری بـوو. زۆر کوڕێکی باش بوو. ئـەویش زۆری نـەبرد کـە نەماندیتـەوە. ئەفـسەرێک بـە نـاوی «سـەروان بیداربەخت» هاتوچۆی دەکردین؛ کە هەموو گیانی گاڵتە و گەپ بوو. هەر چەند بەندی بـووین و شەوانە هـەموو دوو سـەعات خەبـەریان دەکردینـەوە و دەیـانبژاردین، بـەڵام خواردنمـان زۆر پادشایانە بوو. بەیانی هەنگوین و کەرە و نەهار و شام گۆشت و برینج بوو. پێـنج ڕۆژی هەوەڵـی، زۆرم حەبس لە بەر گران دەهات؛ بەڵام عادەتم پێ گرت و پشووم هاتـەوە سـەرخۆ. قەسـیدەی بوردیەم لەبەر دەکرد. ڕۆژانە هەمووی بە گاڵتە و قسەی قۆڕم ڕادەبوارد. لەو سـەربازە پاسـدارانە یەکێک چێشتلێنەر بوو؛ یەکیان لوڕی سوڵتاناباد بوو؛ کە دەیگوت مـن بوومەتـە کۆمەڵـە. هـەر خەبەر و باسێک لە شاردا بوایە پێ دەگوتین. کتێبی بۆ دەگۆڕیمەوە؛ ڕۆژنامەی بۆ دەهێناین.

شازدە سەربازیان لە حەبسخانەدا -کە خانوویێک بوو- لە سەر دانـابووین و سـەرگرووهبانێکی لوڕ گەورەیان بوو. گاڵتەی خۆشم بەو سەرگرووهبانە لوڕە بوو. جارێ گوتی: هەر کەس هەر چی بە سەر دێ لە ناو چاوانی نووسراوە. گوتم: نەخێر نەنووسراوە. دە کوا بیخوێنەوە من چم بە سەر دێ. لە ناو چاوی تۆش هیچ نەنووسراوە. لەو سوێند کە نووسراوە و لـە مـن ئینکـار. لـە داخـان دەستی خۆی دەگەست!

بۆی گێڕامەوە کە جارێک عیزراییل چۆتـە دوکـانی تاجرێـک. تـاجر بردوویەتـە ماڵـە خـۆی. عیزراییل دەمی لە نان و چێشت نەداوە. کابرا سوێندی داوە کە دەبـێ نمـەکی بکـا. عیزراییلـی کەر! فریوی خوارد و قامکێکی تەڕی لە خوێ دا و نمەکی کرد. ڕۆژێک خوا گـوتی: بـڕۆ گیـانی ئەو کابرایە بکێشە. کابرا گوتی: تۆ نمەکی منت کردووە؛ شەرم بکە! هیچ نەبێ مۆڵـەتێکم بـدە. عیزراییل خۆی گەیاندە لای خودا، نەقڵی فریوخواردنەکەی بۆ گێڕاوە. خوا گوتی: باشە چل ساڵ مۆڵەتی بدە. بەڵام جارێکیتر ئەو کەریەتییە مەکە!

ڕۆژێک ئاودەستەکەمان سەیری لـێ ڕیـابوون؛ پیـسایی گـەیبووە بـڵندایی دیـواری پـشتەوە. سەروان بیداربەخت هات بۆ دیـدەنیمان. گـوتم ئێـوە چـۆن مەشـقی ئـەنگێوەیی بـە سـەربازان دەکەن؟

- دەبێ لە دووهەزار میتر خاڵی ڕەشی ناو هەدەف بپێکێ.

- ئەو سەربازانە مەشقیان کردووە یان تازە هاتوون؟

- هیچیان لە چوار ساڵ کەمتر نییە کە لێرەن؛ لەبەر شەڕی ئێوە هێشتوومانەوە.

- دە وەرە با بچینە سەیری ئاودەست. کونی ئاودەست تا قوونی سەرباز بستێکە؛ زۆریـش لـە خاڵی هەدەف گەورەترە. سەربازێک نەتوانی ئەو کونە گەورە بپێکێ، مەشـقی چـی و فێربـوونی چی؟!

زۆر پێکەنی و بانگی سەرگروهبانی کرد، گوتی: فلان فلان شودە! ئـەلعان دەبـێ دوو تەنەکـە ئاو بێنی لە چۆم ڕا و بیشۆیەوە؛ یان دەبێ بیلێسیەوە! ئاخری سەرگروهبان لە چۆم ئاوی هێنـا و شتیەوە.

زانیمان کە شەڕ لە نێوان دەوڵەت و پیشەوەری هەڵگیرساوە. بیستمان کە تەوریز شکاوە.

ڕۆژێک هاتن و بردیانمە لای حاکمی نیزامی کە «سەرهەنگ غەفاری» بوو. چـوار سـەرباز لـە پێشمەوە بە تفەنگەوە و چوار لە پشتمەوە بە کەلەپچەکراوی بردیانم و نێزەکانیان لە سەر قـوونم ڕاگرتبوو. بە کۆلانێکدا هاتین. چەند منداڵێکی سەقزی دڕیان دا و چوونـە بـەرێکی کۆلانەکـە و



ئامادەباش ڕاوەستان. لام وابوو جرتم بۆ دەکێشن و گاڵتەم پێ دەکەن؛ چاوم داخستبوو. هەر گەیشتمە لایان، هەموویان کڵاویان داگرت و سڵاوێکی گەرمیان لێکردم. سەرباز تێیان خوڕین و هەڵاتن. ئەو قەدر گرتنەی منالان زۆر دلگەرمی کردم. چوومە لای سەرهەنگ؛ حەمەداغای سەرای لە لا بوو. گورجێ دەسبەندیان کردمەوە و لە بەرم هەستا و جێگەی نیشاندام و ناردی چایان بۆ هێنام. حەمەداغا باسی خۆی کرد کە چۆن مولک و ماڵی چووە و چۆن لە شاپەرستی لای نەداوە.

سەرهەنگ گوتی: تۆ دەزانی ئازەربایجانمان گرتووە؛ قازیش یەک-دوو ڕۆژیتر تەسلیم دەبێ. شتێک بۆ ڕۆژنامەی «اطلاعات» بنووسە کە قازی بە زۆر تۆی کردۆتە کۆمەڵە؛ بەلکوو لە مردن رزگارت بێ.

دوو بەستە ئەسکیناسیشی لە سەر مێزەکە دانا، گوتی: وابزانم پووڵت نییە؛ ئەمەش بۆ تۆ.

گوتم: جەنابی سەرهەنگ! قازی بە زۆر نەیکردوومە کۆمەڵە؛ بەر لە ئەو کۆمەڵە بووم. حەمەداغا لە باسی خۆیدا دەرسێکی دادام. لە کوردپەرستی پەشیمان نیم و پەشیمان نابمەوە. گوناهی منیش بە تۆ و بە «اطلاعات» و بە «قوام‌السلطنە»ش نابەخشدرێ.

گوڕاندی: «وەرن بیبەن!» نەیهێشت چایەکەم بخۆمەوە؛ تێری جنێوی زۆر پیس پێدام و هەڕەشەی کرد. دەسبەند لە دەست هاتمەوە حەبسخانەکەم.

ڕۆژێک لە سەر داوای خۆم بردیانمە حەمام. دیسان هەشت سەرباز بردیانم و لە دەرکی حەمام دەستیان کردمەوە و لە درگا ڕاوەستان کە دوای چارەگێک بێمە دەر. ڕیشم زۆر هاتبوو، تیخی ڕیش تاشین مەمنووع بوو. کابرایەکم دی لە حەمام، ناسیمەوە کە ڕۆژێک لە بۆکان پێکەوە ئاشنا بووین. ئەو خۆی لێ گێل کردم و تماشای نەکردم. گوتم: برا با گیراویش بم، بۆ نامدوێنی؟ سوێندی خوارد کە ناتناسم. کە پێم گوت تۆ لە بۆکان بووی، گوتی: خوا ئەیزانێ ئەوە برام بووە و من ئەفسەری ئەرتەشیم! بۆ خۆی ڕیشی تاشیم و زۆر عوزرخوایی کرد.

کە هاتمە دەر لە حەمام، کابرایەکی سیسەکەی کورتەباڵا گوتی: هەژار! من نافیع مەزهەری شاعیرم؛ هاتووم لە حەمام بتبینم. ئیتر سەرباز نەیانهێشت بیدوێنم و ئەو حەسرەتەم ئێستاش هەر لە دڵ ماوە.

لە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عیراق -کە دادگا بە دەست مەلایانە بووە- دەڵێن نافیع مەزهەر لە هەڵەبجە فەقێیەتی کردووە. «من بۆچی قورعان بە شیعری کوردی تەرجەمە نەکەم؟...» لە سوورەی «القارعە» دەست پێدەکا: «ئەلکوتێنەر، وەلکوتێنەر، نازانی چییە ئەلکوتێنەر؟ ڕۆژێ کە خەڵک ئەبن بە پەپوولەی سەر لێشێواو وە کێوان ئەبن بە خوری پشەوەکراو. ئەو کەسەی قورس بێ تەرازووی، وا لە عەیش و خۆشییە. ئەو کەسەی سووک بێ تەرازووی، دایکی ئەوە هاویە. تۆ نازانی ئەوە چییە؟ ئاگرێکە گەرم...» قڕ دەیگرن. مەلای حاکم دوو مانگی حەبس دەکا!

ئەمجار شیعرێک لە سەر هەژاری و چارەڕەشی فەقێ دەڵێ و تیایا «سەرگونی خۆی شین نەکرد جبریل» هاتووە. دەیبەنەوە بەردەستی حاکم:

- هەتیو بۆ کفرت کردووە؟
- بۆچی قوربان جبریل گونی هەیە؟!
- وست! بێ ئەدەب! گونی کوا؟

- دەسا گوتوومە هیچی شین نەکرد!
بە تکا و ڕەجای خەلک وازی لێدێنن.
دوو مانگ بوو حەبس کرابووین. سەروان بیداربەخت ڕۆژێک هات؛ زۆر کز و کەنەفت دیاری دەدا. گوتی: خەبەری زۆر ناخۆشم پێیە؛ زۆر خەمبارم بۆ ئێوە.
گوتم: ئاخر یا لێرە دەمانکوژن یان دەماننێرنە تاران، دە بلێ چییە؟
گوتی: ئێوە ئەمڕۆ ئازادن و نانی نیوەڕۆتان نادەینێ. بۆیەش کزم کە تازە مەجلیسی گەپ و گاڵتەی دەگەڵ ئێوەم نامێنێ!
باوەڕمان نەکرد. گوتم: دەچمە لای غەفاری. ئیجازە درام. غەفاری گوتی: بەڵێ ئازادن. گوتم: کە وا بێ دەتوانم بچمە سالحاوا؟ خزمم لەوێ هەن.
- نا، دەبێ ئێمە بە حورمەت بەڕێتان کەینەوە.
تێگەیشتم کە بەردانی ڕاستی نییە و هەر دەمگرنەوە. چوومە مەنزلی حەمەدەمیناغا و قاسماغا لە سەقز؛ کە هەردووکیان برای حیزبی بوون. بۆیان گێڕامەوە کە لە پاش شکانی ئازەربایجان، پیشەوەری و زۆر لە دارودەستەی هەڵاتوون بۆ ڕووسیە. قازیش هاتۆتە حەمامیان و بێشەرت خۆی تەسلیمی دەوڵەت کردووە. ئەو داوای لە سەرتیپ هومایوونی کردووە کە ئێوە بەربدەن. بە کۆتری نامەبەردا فەرمانی ئازادی هاتووە. گوتیان زەبیحیش پەنای بە کونسوولگەری ڕووس لە ورمێ بردووە؛ ڕایاننەگرتووە. دەگەڵ سەید ئەحمەدی سەید تەها و دلشاد بە ماشێنێکی حیزبی ڕایکردووە بۆ عیراق و ڕادیۆ لەندەن خەبەری داوە.
گوتم: ئێوە ناترسن؟ حەمەدەمین دەستی بو سۆپە ڕاداشت، گوتی: هەموو ڕۆژێ گوزارشێکم نووسیووە، ڕەنگە پڕ بەو سۆپە ببن. من هەوالی دەوڵەت بووم! قاسم ئاغا گوتی: ئەگەر قازی نەفەوتابا ئێمە هەموومان دەفەوتاین.
بە ڕاستی خەبەر و باسێکی دلتەزێن بوو...
لەو حەپسەدا زۆرم قەرزی ئیجارەی کتێب کەوتبووە سەر. چوومە دوکانی کولاهی:
- کوا حیسابت چەندە؟
گریا، گوتی: بریا مردبام و ئەو ڕۆژەم نەدیبا. یەک شایی پووڵم ناوێ. ئەو ڕۆژەش لە ترسی ئەفسەرەکە داوای ئەو پووڵە زیادییەم کرد.
پاش نیوەڕۆ کە دەبوو سەفەر بکەین و چاوەنۆڕی ترۆمبیل بووین، سەرتیپ هومایوونی هات و ئەحوالێکی پرسیم. گوتم: من دەمانچەکەم لێ سێندراوە، حەز دەکەم بمدەنەوە. گوتی: جا بۆچیتە؟ خۆ ئێمە زۆر زوو چەک لە هەموو کوردێک دەستێنین. گوتم: بەڵێ ئەودەم قەیدی نییە، بەلام ئێستا بۆ من شەرمە بە تەنیا لە چەک کرابم. گوتی: دەمانچەکەی بدەنەوە! دایانمەوە. هومایوونی گوتی: من سواری ترۆمبیلی عەولاغای ئێلخانی دەبم. قاسماغا و حەمەدەمیناغا و هەژار سواری ماشێنی من ببن و لە بۆکان یەکتر دەبینین. جگە لە ئێمە سیان، سەربازێکی ڕاننده و ئەفسەرێکی سەرڕشتەداری لە سەقزەوە بەرەو بۆکان هاتین. لە ڕێگە تووشی پۆل پۆلی سەتی و دووسەتی لە فیدائیانی پیشەوەری دەبووین کە کورد تفەنگیان لێ ساندبوون و بە کۆمەڵ زۆر-زۆر دەگریان و یاحوسێنیان دەگوت. ئەفسەری سەرڕشتەداری دەیگوت من شاعیرم. ئاغایان گوتیان ئەوەش شاعیرە. هەڵیپێچام کە نموونەیەک لە شیعری خۆمی بۆ بخوێنمەوە و تەرجەمەی بکەم. ئەوەم بۆ خوێندەوە کە دەڵێم:



ڕۆڵـە! ناموسـت وەک خزمـەکانت | نەدەی بە شـەکر، دەسـتـم دامـانت
شـەرەف گەوهـەرە، قیـمەتی نایـە | دەویت ڕووڕەشی هەردووک دنیایە
ئـەو کەسـە پیـاوە، بۆ خاک و ئاوی | ڕۆح دانێ و بـە چاک بمێـنـێ ناوی
نەتبیستووە واتەی زانای سەرزەمین | مـەردانـە مردن نـەک حیـزانە ژین

بۆم تەرجەمە کرد؛ ئافەریمی لێ کردم. منیش مەبەستم لەو دوو ئاغایە بوو کە بـە بـێ شـەرم شانازی بە خەیانەت بە گەلی خۆیان دەکەن.

نوێژی شێوان لە بۆکان تووشی سـەرتیپ هومـایوونی بووینـەوە. گـوتی: بـا هـەزار لـە ماڵـی قاسماغا بێ، سبەی هەمووماں دەچینە مەهاباد. چوومە مەنزڵی قاسماغا کە لە ماڵـە عەبدوڵـڵای بارامی بوو. کاک هەمزەی کۆنە هەواڵم هات. گوتی: وەرە لە ماڵی من بخـەوەو گـوتم: وا بـزانم قاسماغا ڕێ نادا. چونکە وا دیارە منی پـێ سـپێراوە بـە هـیچ کوێـدا نـەچم. هـەمزە داوای لـە قاسماغا کرد کە من بەرێتە ماڵە خۆی. قاسماغا گوتی: لێـرەش نـوێن هەیـە؛ بـۆ بێـت؟ هـەمزە گوتی: من بەڵێن دەدەم کە سبەی بیهێنمەوە لای تۆ و ئەگـەر وا نـەبوو، بـا مـن ئیعدام کـەن. قاسمئاغا گوتی قەیدی نییە با بێت. هەر چووینەوە، هەمزە هەڵیپێچام کە ڕاکە و خۆت خـەلاس کە! زۆری حەول دا؛ گوتم: چونکە تۆ بوویە زامنم هەرگیز ڕاناکەم. با بزانین چۆن دەبێ...

بە خەیاڵی خۆم وام دانابوو کە لە میاندواو ئیجازە وەرگرم و بچم بە پێ و شـوێنی عەبدوڵـڵای برام؛ کە لـە تـەورێز دەیخوێنـد. ئەوسـا لـە تـەورێز خـۆم بـشارمەوە؛ کـە شـارێکی گەورەیـە و نامدۆزنەوە.

بەیانی دەگەڵ هەمزە هاتینەوە لای قاسماغـا. شـەیپووری سـەفەر لێـدەدرا و لەشـکر بـەرەو سابلاغ دەرچوو. عەشایریشیان دەگەڵ دەچوون.

لە قاسماغام پرسی: کوا کاکە ڕەحمان؟ گوتی: نەخۆشە و لە گوندی شێخلەرە. گوتم: نـاتوانم ببینم؟ لە پاش تاوێک بێ جواب مانەوە گوتی: من وام پێ باشە بچیە لای کاکە ڕەحمان و پێـی بڵێی بتنێرێتە قەرەگوێز لای ئەحمەداغا و هەرگا بە مەسلەحەتمان زانی؛ دەتوانی بێیـە سـابلاغ. ئەمرۆ دەگەڵ لەشکر مەیە! هەر ئەو وای گوت، ئەو پیاوەی کە وەختی خۆی خەبەری خەیانـەتی دێبۆکریانی دابوومێ، گورجێ لە ئەسپ دابەزی و ئاوزەنگی گرت و گوتی: وەرە سـوار بـە و بچـۆ شێخلەر! لە بن لێوانەوە گوتی: من ئەم ئەسپەم ناوێتەوە؛ ئیتر خۆت دەزانی. سوار بووم و هەر لە کۆڵانی حەمامەوە کردمە غار. لە شار دەرچووم و تەقڵەکوت ڕووم کردە شـێخلەر. لـە ڕێگـە وام حەل کرد کە ئەحمەداغای قەرەگوێز زۆری خراپـە دەگـەڵ دەوڵـەت کـردووە؛ منیـشی خـۆش ناوێ. قاسماغا دەیەوێ من ببمە دیاریەکی دەست و ئەحمداغا بمگرێ و گوناهی بە هۆی منـەوە ببەخشرێ. بە هومێدم ئەم خەیالەم ڕاست نەبووبێ، بەلام وای بۆ چووبووم...

گەیمە بەر دیوەخانی شێخلەر. کاکە ڕەحمان و چەند کەسێک ڕاوەستابوون. دابەزیم و گوتم: «حوللە مەرەسێ، هاتینەوە سەر سێ» ڕیسەکانمان بۆوە خوری!

کاکەڕەحمان وەک نەیبیستبێ وابوو. ڕەنگی بزرکابوو؛ لێوی دەلەرزین؛ دیار بوو زۆر ترسابوو. چووینە وەتاغ، تاوێکی پێچوو، کەس چای بۆ نـەهێنام. گـوتم: مـردن مردنـە، لینگـە فرتەکـەی چییە؟ کاکە چایەکەم بدەنێ! شیعرێکم لە باخەڵـم دەرێنـا، گـوتم: لـە حەبـسدا ئـەم شـیعرەم گوتووە؛ زۆر بەزم و گاڵتەیە. باسی چۆنیەتی حەبسخانەیە، با بۆتان بخوێنمـەوە. کاکـە ڕەحمـان زوو لە دەستی ڕفاندم و دە ناو کوورەی هاویشت و سووتاندی. حەیفێ ئەو شیعرەشـم چـوو کـە

وێنەیەکی تەواو لە ژیانی حەبسخانەم بوو.
ڕاسپێری قاسماغام ڕاگەیاند کە ئەسپێکم بدەنێ و بچمە قەرەگوێز. کاکە ڕەحمان گوتی: نە ئەسپت دەدەمێ، نە لاشم وایە مەسلەحەتە بچیە لای ئەحمەداغا. بۆ خۆت یا بچۆ خانەقا یان تەرەغە. گوتم: بەڵێ خۆم دەگۆڕم و دەچمە لای تەرەغە. جلکی تازە و باشی خۆم بە جلکی پیس و خراپی فەقێیانەی مەلا عەبدوڵلای حەساری گۆڕیەوە. کتێبی جامی و هێندێک قاقەز و قەڵەمم خستە بوخچێکەوە و بوومەوە بە فەقێ. داوام لە مەلا عەوڵا کرد کە سێ هەزار تمەنت لە لایە ئەگەر دەکرێ بمدەوە. گوتی: هیچم نییە. میرزا عەوڵای بارامی گوتی: من پێنج سەد تمەنت دەدەمێ و لە مەلا عەوڵای دەستێنمەوە. دەمانچەکەم دا بە کاکە ڕەحمان کە ئەگەر توانی بیفرۆشێ، پوولەکەی بدا بە منداڵ و براکانم. هەر ئەو ڕۆژە بەر لە نیوەڕۆ بە بیانووی چوونە تەرەغە دەرکەوتم و بەرەو مەحمووداوا ڕۆیشتم تا لە دێی شێخلەر نەدیوو بووم. دامقەلاشتە خوارێ و هاتمە ناو مێشەی مەحمووداغا و ڕوو بە جەنووب بە مێشەدا ڕۆیشتم. لە مێشە نەهاتمە دەر تا لە گوندی قاقلاوا تاوم لێ ئاوا بوو؛ لام دا.
جا با لێرە وچانێک بدەین و چەند کورتەباسێک بکەینە شەوچەرە:
لە سەرەتای کۆمەڵەوە تا برانەوەی، هێمن و من بە ناوی دوو شاعیری میللی، گوێ بە گوێوە و زۆر برایانە و هەمیشە پێکەوە شاعیری هەموو مناسەباتی خۆش بووین. لە کوێ جێژنی نیشتمانی گیرابا، یاد و بیرەوەری پیرۆز کرابا، ئێمە دەبوو شیعر ئامادە کەین و بیخوێنینەوە. ئەوەندەش لێک نزیک بووین کە زۆر کەس ناوی هەر کامێکیان نابووین: «هەژار- هێمن». لە مناسبەی هەوەڵ ئاڵا هەڵکردنی جمهوورییەت لە سابلاغ، لە ئاڵا بردنە بۆکان و زۆر جێگەیتر، وێڕای شاعیرانیتر شیعرمان دەخوێندەوە. پێکەوە دەژیاین و لە برا لێک نزیکتر بووین.
لە سەرەتای کۆمەڵی «ژێ-کاف»، چاپخانەیەکی دەستی چکۆلەی هەرزانمان کڕیبوو. ڕووسان بە ناوی یارمەتی فەرهەنگی، چاپخانەیەکی گەورەیان داینێ کە ڕۆژنامەی پێ چاپ بکەین و بۆ هەر کارێ دە کاری بێنین. چاپخانە چکۆلەکە درا بە بۆکان. دەگەڵ کاک حەسەنی قزلجی چەند نەشرە و نووسراومان پێ چاپ کرد و گۆڤاری هەلالەمان دەرخست. هەوەڵ ژمارەمان بۆ پێشەوا برد. تۆنێک کاغەزی خەلات کردین. کە هاتیشمەوە سابلاغ، قزلجی دەگەڵ کۆنە مامۆستاکەم (سەید محەممەدی حەمیدی) کە سەرنووسەری ڕۆژنامە بوو، هاوکاری دەکرد. هەلالە چوار ژمارەی دەرچوو.
ناوی مەشایخی نەخشەبەندیم بە شیعر هۆنیبۆوە، لە بۆکان چاپمان کرد. هەزار نوسخەی بە دوو-سێ ڕۆژ فرۆشرا؛ لام وابوو شیعرەکانیان پەسند کردووە. دوایی دەرکەوت وەک نوشتە کڕیویانە و دە بەرگیان گرتووە و بە کلاویانەوە درووە!
شەوانە لە بۆکان لە بن دیواری قاوەخانەیەک، بەرانبەر بە حەوز، دەگەڵ قازی کاکە حەمە، حەسەنی قزلجی، مەلا ئەمجەدی قەلایە و مەلا عەوڵا حەساری تا نیوەشەو مەجلیسمان دەگرت کە زۆر یادگارێکی خۆشە و لە بیر ناکرێ. لە تەرەغە زۆرم حافز خۆش دەویستن؛ نەمدەهێشت بچنە مزگەوت و دەمهێنانە ماڵە خۆم. چونکە چاویان نییە، شەرمە حزووری نایانگرێ؛ گەڕیدەش زۆر قسەی خۆش فێر دەبن. لە بۆکانیش هەر چەند دەوڵەمەند ببووم، نەمتوانی ببمە هەواڵی پووڵداران. خۆشیم بە حوجرەی فەقێ و حافزان دەهات. شەوی وا بوو دە و دوازدە حافزم لە خۆم کۆ دەکردەوە. خوشکم دەیگوت: لەوەتا سازی، بوویەتە چاوساغی حافزان! جگە لە قسە



خۆشەکانیان، حافز دەچوونە هەر دییەک، ملیان لە تاریفم دەنا و زۆر کەس دوور بە دوور خۆشیان دەویستم.

کە لە بۆکان بەرەو شێخلەر هەڵدەهاتم، سەید عەولا شێتە -کە لە باسی وشتەپەدا ناوم هێنا- ببوە جاسووسی حکوومەت؛ دیتبوومی کە دەڕۆم، خەبەری بە حاکمی نیزامی (سەروان خاکسار) -کە کوردێکی سنەیی بوو- دابوو کە بنێرن هەژار بگرن. خاکسار بە ناوی ئەوە سووکایەتی بە سەر ئەفسەر هێناوە، زۆر باشی دارکاری کردبوو!

کاتێ لە ڕێی هەڵاتنا بە ناو مێشەی مەحمووداغا دەچووم، مامۆستاکەی وشتەپەم (مەلا حەمەدەمین) -کە ئەوسا لە قەرەگوێز بوو- دەگەڵ چەند فەقێیەک بەڕێدا دەڕۆیشتن و گوێم لە قسەیان هەڵخست. بە هەڵکەوت مامۆستا لەو دەمەدا پرسی: ئاخۆ دەبێ هەژار چی بە سەر هاتبێ؟

فەقێیەک گوتی: دەڵێن لە حەبسی سەقز دەستیان پەڕاندووە؛ لەوانەشە کوشتبێتیان.

مامۆستا گوتی: ئەو ڕەحمانەی من دەیناسم ئەوەندە سەگە ئەگەر دەکونی قفڵدا ڕاکا، هەڵدێ. هەتیو تۆ چۆن، نایناسی؟ ئەدی چۆن تۆی بە هەوای زەکاتی ئالووبالوو ناردە وەتەمیش؟!

مێشە و مێشە بۆ ئێوارە خۆم گەیاندە «قاقلاوا». لەوێ چوومە ماڵێک. خاوەن ماڵ دوای نان خواردن بردمیە مزگەوت و نوێنی دامێ کە لەوێ بنووم. جحێڵ جۆرابێنیان دەکرد. هەتیوێکی زیتەکە چەند سرتەیەکی کرد؛ ڕوویان تێکردم گوتیان: فەقێ گیان ئەو کوڕە دەڵێ ئەوە شاعیری قازییە، دە توخوا هێندێک شیعرمان بۆ بڵێ! گوتم: ها، ئەو کوڕە وەدەزانێ من مەلا ڕەحمانی تەرەغەم؛ چونکە زۆر کەس لێی دەگۆڕیین؛ ئەویش وەک من دەچێ. من ناوم مەلا محەممەدە، شیعریش نازانم. بریا بمزانیبا و بۆم گوتبان. کوڕەکە گوتی: بە خودا وەمزانی هەوی؛ بمبەخشە!

بەیانی نان و چام خوارد و بە کابرام گوت: دەچمە عیراق. گوتی: لە گوندی «مووسێ» بچۆ ماڵە سۆفی سدیق، بڵێ خەجێ ناردوومی.

بەفر باریبوو، توابۆوە؛ قوڕێکی زۆر پیس بوو. کەوشم پاژنەدار بوو. بەڵام ترس ئەوە نازانێ، تا ئێوارە گەیشتمە «مووسێ»؛ کە بارگینێک ئەوەندە بڕ ناکا. لە ڕێگە تووشی مێوژفرۆشێک بووم؛ چنگێک مێوژی دامێ؛ بە ڕێوە خواردم و قەت دەقیقەیەک وچانم نەدا و هەر بە غار دەڕۆیشتم.

چوومە ماڵە سۆفی سدیق، جوابی سەلامی نەستاندمەوە. پرسیم مزگەوت هەیە، گوتیان نییە. چوومە سەر کانی دەسنوێژم گرت کە نوێژ بکەم. سۆفی سدیق چاوی لە دەسنوێژ گرتنەکەم بوو، پێی سەیر بوو. گوتی: تۆ مەلای؟

- ئەی چۆن!

- دەی فەرموو با بچینە ماڵەوە.

بردمیەوە ماڵ، وەتاغێکی زۆر گەورەی هەبوو. سەماوەری هێنا و خورما لە جیاتی قەند. لەتێ خورمام نا گوپمەوە، وابزانم بیست و چەند چام خواردەوە. سۆفی گوتی: بۆ دەست بۆ خورما نابەی؟ لەتە خورمام لە گوپم دەرێنا، وەک سوێنکە سابوون لووس ببوو! دیسان نامەوە گوپم. قاورمەشمان خوارد. شەو سۆفی -کە دەیگوت مریدی خەلیفە خەلیلم و مەڕێکی بۆ دەبەم- گوتی قاقەزێکم بۆ بنووسە بۆ کابرایەکی سەردەشتی؛ کە: فلان کەس! پاش ماچ کردنی دەستی تۆ و چاوی منداڵانت، چۆن فەرمووتە جوانوو ئەسپەکەم ئەگەر بەخێو ناکرێ بنێرەوە؟ حەیفت

نەکرد؟ من براتم؛ ماڵی من ماڵی تۆیە. جا ئێستاش دوو تەوریزی قەند، دوو گەروانکە چایی، قوماشی کراس و دەرپێ -بە خوا ئەسپەکەت وەک گوڵ بەخێو دەکەم- هەشت نۆ کیسە برینج - چونکە بابە غەلیفەم میوان دەبێ- بە سەرت قەسەم وەلاغی خۆم بمرن لەبەر بێ تفاوتی، ئەسپی تۆ هەر بەخێو دەکرێ. هێندێکیش سابوون بنێرە. لە ماڵەوەش داوای خەنە دەکەن. ئەسپی تۆ ئەسپی خۆمە. دیسان چاوتان ماچ دەکەم. باسی پووڵ نەکەی بە خودا دڵم دێشێ. ئەسپی تۆ لە ماڵاتی خۆم فەرزترە. سەرماش سەختە؛ تفاقیش گرانە؛ بەڵام ئەتۆ برای منی!...

بیرم لێ دەکردەوە: ئەو سۆفیە دەسبرە قیمەتی جوانوو ئەسپەکەی پتر داوا دەکرد تا بۆ کابرای بەخێو کا! بۆم نووسی.

بەیانی لە خەودا بووم، گوێم لێ بوو سۆفی دەیگوت: هەر کەس ئەمڕۆ لە کوێستان بدا بە هیلاک دەچێ، سەری کەکی کۆزاد بەتەمە. سۆفی هاتەوە ژوور. لێم پرسی: دەتوانم سەفەر بکەم؟

- بەڵێ هەوای زۆر خۆشە، سەیر کە تاو هەڵاتووە!

گوتم: نەشارەزام، کەس هەیە دەگەڵمدا بێ؟ گوتی: سێ تمەن بدە. کابرایەکی ڕەگەڵ خستم کە تا سەری کوێستانی گلەزەردەم بەرێ. هەوا تاو بوو. هەر گەیشتینە بناری کوێستانێ، بوو بە تەم و کڕێوەیەک چاو چاوی نەدەدی. بەلەدەکە گوتی: دەست دەقایشی پشتێندی من گرە و شوێنم کەوە. بەفر یەکجار زۆر بوو؛ دنیا زۆر تاریک ببوو. ئەو کابرایە شارەزایەکی سەیر بوو: ئێرە قولکەیە، ئێرە بەردە... کەچی دنیا لووس و پڕ لە بەفر بوو، چۆنی دەزانی، نازانم! لە نێوەڕاستی چیا ڕاوەستا. گوتی: تۆ چت دێتە بەر گوێ؟

- هیچ.

- دەسا تۆ لە شوێنی خۆت بچەقە، نەبزووی، من دەچم و ئێستا دێمەوە.

پاش تاوێک هاتەوە. گوتی: خێراکە بڕۆین تۆ ڕزگار کەم بگەڕێمەوە. سەد تفەنگچی بانەیی لە بەفردا قەتیس ماون و ڕێ دەرناکەن؛ نەیانگەمێ هەموو قڕ دەکەن.

منی گەیاندە لای بەڕۆژی کوێستانێ؛ دنیایەکە ڕەشانگ و دارستان. گوتی: دەچیە «سووتوو» میوانی ماڵە سەید عەولا بە و گەڕایەوە. بە غار دامقەڵاشتە خوار، کڵاوەکەم بە پەلێکەوە چوو؛ ئاوڕم نەداوە. گوتم ئەوەش بۆ تۆ! گەییمە سووتوو، چوومە ماڵەکە. پڕ بوو لە ژنی جوان و بێ پیاو. گوتیان پیاومان چوونە گەرمێن بۆ ماڵی قاچاغ؛ فەرموو میوان بە! گوتم دەڕۆم. گوتیان ئەو ڕێگەیە بگرە و بچۆ «سەرتەزێن». تووشی جادەی بانە-سەردەشت بووم؛ ترۆمبیلێکی پڕ لە سەرباز لەوێوە ڕابرد. زۆر ترسام؛ بەڵام بەخێر ڕابرد. لە گوندێک دەنگی گۆرانی داوەت دەهات. لەوێوە چوومە ناو دۆڵێک و پرسیم، گوتیان سەرتەزێنە و ماڵی حاجی شێخەی لێیە و میوان ڕادەگرێ. چوومە ژوورێک دوو کەسی لێ بوو؛ دیار بوو میوانن. ژن سەماوەریان وە ژوورێ نا کە خۆمان چای بخۆینەوە. پاش نوێژی شێوان حاجی و چەند کوڕێکی هاتنەوە. لە داوەتەکە ببوون. حاجی هەر دەیگوت: شەرت بێدەستی دە پیرێژنانم کوشیوە! بەخێری هێناین؛ جلەکانی لێساندین و ناردی تیان وەشاند. زۆر پیاوێکی نان بدە و مەشرەفخۆش بوو. بەیانی گوێم لێ بوو گوتی:

- مەلای هەڵمەستێنن با بخەوێ؛ بە خودای مەلای بە بێگارە و لە نوێژی سبەینان بێزارە!

پاش نان و چایی، حاجی جووتێک کاڵەی هەڵبەستراوی بە گۆریە و پەڕۆوە هێنا؛ گوتی: مەلا

تۆ دنیات کەم دیوە! بە کەوشی شارانی پاشنەدار، لە بەفر و قوڕدا سەفەر ناکرێ. کاڵەکانی دە پێ کردم. بە کابرایەکی سپاردم، گوتی: تا دەگاتە «سیاوما» هەرچی بە سەری بێ لە تۆی دەزانم؛ من حاجی شێخەم و دەمناسی. لە ڕێ بەفرێکی زۆر گەورە دایدا. تا گەیشتینە گوند، بەفر لە ئەژنۆی دەدا. ماڵی کابرا هاوڕێم تەڕ و تاریک و تەنگ بوو، زۆریش سارد بوو. چوومە مزگەوت؛ مزگەوتی زۆر خۆشی قەدیمی بە خشتی سوور. خەڵکێکی زۆر لە دەوری سۆپەی زەلامی نێلدراو دانیشتبوون.

- کاکە تۆ مەلای؟
- بەڵێ.
- سەرچاوان. دە ئەورۆ پێشنوێژیمان بکە.

پێشنوێژیم کرد و دوعای زۆرم لە پاش نوێژ خوێند. شەو کابرایەک بردمیەوە ماڵ بۆ شیو خواردن. هاتینەوە و لە مزگەوت خەوتم. بەیانی کە چاوم کردەوە، دەوراندەوری مزگەوت دانیشتبوون. کابرایەک هاتە قسە:

- مەلا گیان بۆ دەچیتە ئەو خوارە؟ چ دەکەی؟
- دەخوێنم.
- پاشان دەبی بە چی؟
- دەبمە مەلای چاک.
- ئەو دەم چ دەکەی؟
- دەبمە مەلا لە گوندێک.
- دە جا کاکی خۆم ئێمە تۆمان بە دڵەوە نووساوە؛ هەر لە ئێستاوە پێت ڕازین.
- ئاخر...؟
- ئاخری ناوێ. جارێ با قسەکانم تەواو کەم: ماڵ و بزنەزاوت دەدەینێ. دۆی بخۆ، کارەکەشی بۆ خۆت. زەکاتیشت لە دەغڵ و دانەوێڵە دەدەینێ. ها! دەزانم دەڵێی منی بێ ژن چۆن ماڵ بە خێو کەم؟ حەوت ڕۆژان بچۆ سەر ڕێی کانی، هەر کچێکت کەیف گرتی لێت مارە دەکەین. بە خودای دەزانم کچی من هەڵدەبژێری. چونکوو لە هەموو کچان جوانترە. من ناوم برایماغایە.
- ئاغا بە ڕاستی ئەوی گوتت لە سەری من زیادە. بەڵام برایەکم لە عیراقە؛ دایکمان زۆری پەرۆشە؛ دەچم دەیبینمەوە!

بە هەزار زمان لە کۆڵ خۆم کردنەوە. بەفر وێستابوو. ڕێگەم پرسی و لە سەر بەفری مۆر رووم کردە «بلەسەن» کە نیشانیان دابووم. تا ڕچەی کوتراوی حەیوانان بوو خەمم نەبوو، لەوە بەولاوە دە بەفر دەکەوتم و ناو لینگم لە سەر دادەنا. لە بەیانییەوە تا ئێوارە دە بەفردا تلامەوە؛ با بەفری دە سەر و چاوی دەکردم؛ هێزم لێ بڕابوو. تا لەپڕ تووشی شوێنی سەگان بووم و شوێنم هەڵگرت. لە سەر گردێکی بڵندەوە گوندی بلەسەنم دیت. بە خشکە خۆم بە سەر بەفردا خلۆر کردەوە و چوومە نزیکترین ماڵ. چوومە وەتاغێک لینگم درێژ کرد و پاڵم بە دیوارەوە دا. نەخۆشێک لەوێ دەینالاند. وا هاتە بەر چاوم کە گرانەتای بێت. ژنێک لە درگاوە دیتمی و ڕۆیشت. چوار پێنج ژنی دی دەگەڵی هاتنەوە و لێمیان دەڕوانی و دیار بوو سەیر ماون. گوتم: خوشکم بۆ تماشام دەکەن؟

- ئۆ خوا شوکور خۆ تۆ ساغی؟ برا بە خوا وەمانزانی مردووی؛ ڕەنگت لە مردوو دەکا. ڕەنگە برسی بی.

- نەخێر برسیم نییە، سەرمامە.

گورجێ سۆپەیان پێکرد و ژنێک قاپە شیرێکی بۆ هێنام. گوتی: پیاو لە بەفردا گیر بخوا، لە برسان دەکەوێ و هەست بە برسییەتی ناکا. دوای شیرەکە نان و پەنیری هێنا. ئەوەندەم خوارد زکم هەلازنا. کالەکانم کە لە پێیان داکەندبووم، دە پێ کردەوە و هەرچی خولقیان کردم چوومە مزگەوت و لە بەر سۆپەی مزگەوت خۆم وشک کردەوە. خاوەن مالەکە —کە ناوی کوێخا حەسەن بوو– کە زانیبووی میوانی چۆتە مزگەوت، ناردبووی بچمەوە؛ نەچوومەوە. مەلای دێ بردمیەوە مال و دانووی گەنمی دامێ. خواوراستان مەلا لە من کۆلکەمەلاتر بوو؛ زۆری من بە لاوە عالم بووم. شەو لە مزگەوت پرسیم: کەس هەیە بچێتە ئەو خوارە؟ دوو کەسیان گوت کە چۆدارن و بزنان دەبەنەوە «کەناروێ»؛ دەگەلیان کەوتم. بەلام بزن لە بەفر دەرنەدەچوون؛ دەبوایە ڕێگەیان بۆ بشکێنین و زۆر بە ئەسپایی بڕۆین. هەستم کرد نینۆکی پێم ژانی دەکرد. گوتیان تۆ بگە «ئەنجینە» و جێ بگرە تا ئێمەش دەتگەینێ.

- ئەنجینە لە کوێیە؟

- هەر لەو پێچە ئاوا بی، دێ دیارە.

لە پێچ پێچم خوارد، سەربانی ڕەشی دێیەکم دیت کە لە خوار هەزار بە هەزارێک بوو، هیچ ڕێشی بۆ نەدەچوو. دامقەلاشتە خوار، گەییمە پارچە ڕەشانگێک، قورێکی هێندە شل بوو هەلخلیسکام و لە سەر بەردێکی پان گیرسامەوە. ڕوانیمە خوار چ ببینم؟ تیشە بەردێکە بە قەد خانوێکی سێ قاتی بلندە، گورگیش ناتوانێ لێی باز دا. بە ڕەشانگدا بە چنگەکرکێ سەرکەوتمەوە. دیسان خزیمەوە سەر بەردەکە. هومێدم بڕا. سەرماش گالەی دەکرد. گوتم حەیئەللا! خۆم هەلدەدێرم. بوخچە کتێب و گۆچانەکەم هەلداشت. خۆشم چاوم قونجاند و بە خشکە چوومە سەر لێواری بەرد و خۆم هەلداشت. لام وا بوو هەپروون بە هەپروون دەبم. کەوتم؛ چاوم هەلێنا، بە حال عاسمانم لە کولانکەیەکەوە دیت؛ هیچ کوێشم نەدیشا. تۆمەز کەوتوومە سەر بەفرێکی باپەستاوتەی زۆر ئەستوور. بە چنگ بەفرم لە خۆم لادا؛ لە کونێک هاتمە دەر. جێگە بوخچەکەشم بەرچاو هات کە دە بەفر قوپابوو. گۆچانەکەشم چەقابوو. لە سەر بەرزاییەکەوە لە بەفری مۆرم ڕوانی، شوێنێکی درێژی قوپاوم بە دی کرد. زانیم جۆگەیە و ئەوسەری دەگاتە ئاوایی. بە شوێن قوپاودا هاتم؛ زۆری نەبرد دوازدە سەگی زەلام لە گردێکەوە پەلاماریان دام. دەستم گۆی نەدەکرد کە بە گۆچان لە خۆمیان دەرکەم. ناچار دانیشتم (سەگ کاری بە دانیشتە و ژن نییە). سەگەل هاتن لە چوار دەورم ئالقەیان بەست و چەمبۆلەیان دادا. دەتگوت هاتوون دەرس لای مەلا بخوێنن! کابرایەک بە بێلێکەوە لە گردەوە هات و هەرای کرد: هاتوومە یاریدەت. ئەو بە بێلەوە لە پێشەوە و من بە گۆچان – قوون بە قوونی کابراوە– گەینە ناو دێ. چوومە مالی؛ ژنەکەی کالە و پیتاوی بە گەسک مالیم و دامکەندن و پەلاماری ئاگری نێو گۆڕکم دا. کابرا گوتی: لە ئاگر بە دوور بە! نەوەک لاقت وەژان کەوێ. تۆ سەر پەنجەت شین هەلگەڕاوە، سەرما بردوویە.

- ئەری کاکە ئێرە ئەنجینەیە؟

- بەلێ؛ ئەمما ئەنجێنەی سەختە. ئەو ئەنجێنەی تۆ دەلێی لەو دیو ئەو کێوەیە. ئەو شوێنەی

تۆی پێدا هاتووی پڕه له ورچ و گورگ. بەڵام بەفر هێنده زۆره که دڕەندەش دەرناکەون.
له حەسانەوەدا بووم، کچێکی ده- دوازده ساڵی کراس جاوی سوور، وه ژوور کەوت؛ گوتی: وەستا هاوێنه و بریقەت پێیه؟ (به جوولەکەی وردەواڵە فرۆشی دەزانیم)!
کابرا گوتی: های ڕه زگت نێم! ئەوه جوولەکەیه یان مەلایه؟!
له پاش نان خواردن و حەسانەوه، کابرا دەگەڵما هات تا خستمیه سەر ڕێ. گەییمە سەر کانی ئەنجینه. منداڵێک وڵاغی ئاو دەدان؛ گوتی: مامه دەبیه میوانی ئێمه؟ هەر که گوتم ئا، وڵاخی بەجێ هێشت و به غار ڕوو به ماڵان بۆوه و گوتی شوێنم کەوه! له درگاوه بانگی کرد:
- دایه میوانێکم بۆ هێنای، مێوژم دەیه!
- ئەی به خێرێی؛ وەره چنگه مێوژی خۆت وەرگره!
سەرسوڕ مام: خوایه لەو کوردەدا ئیوا هەیه بەرتیل دەدا به منداڵی که میوانی بۆ بەرێ؛ «حاتەمی تەی» چ گووێکی خواردووه؟...
ماڵی خەلیفه ساڵح بوو. تا ئێواره هەشت میوانیتریش هاتن که دوویان هەواڵه چۆدارەکانم بوون. جلکیان بۆ تێوەشاندین. بۆ نوێژی شێوان دەگەڵیا چووینه مزگەوت. دوای نوێژ له هەموو ماڵانەوه نان هات و میوان و خەڵکی گوند له هەموو خواردنەکاندا شەریک بوون. مەجلیسی مزگەوت گەرم بوو، یەکێ گوتی: فەقێ تۆ سبەینێ مەڕۆ! پیاوی شێخ لەتیف که لەو ناوه دەگەڵ پژدەری شەڕیانه؛ ڕووتت دەکەن و سەعاتەکەت لێ دەستێنن.
گوتم: ئەو دەم دەچمه کن شێخ لەتیف دەڵێم سەعاتەکەم له تۆ دەوێتەوه.
کابرایەکی سۆفیلکەی کزوولکه گوتی: تۆ فەقێ نیت؛ تۆ ڕەنگه پیاوێکی گەوره بی. فەقێ ناوێرێ بڵێ دەچم و شێخ لەتیف دەدوێنم.
زانیم غەڵەتێکم کردووه؛ بەڵام خەلیفەی خانەخوێم قۆزتیەوه. گوتی: سۆفی تۆ کەمفامی؛ فەقێ که قورعان له سنگن دیاره پیاوی گەورەن!
خەلیفه چوار کوڕی گەورەی هەبوون که بۆ ئاڵ‌و وێر، گەرمێن- کوێستانیان دەکرد. بەیانی که خواحافیزیمان کرد به کوڕێکیانم به دزیوه گوت: دەوڵەت ساباڵاغی گرتۆتەوه. تفەنگ له لادێ زۆره و له ترسان هەرزانی دەدەن. بگەیه و تفەنگ بکڕه!
که بەرەو چەمی ئەنجینه دەچووین، سۆفیلکەی شەوم دیتەوه دانگەی بزنانی دەدا. گوتی: فەقێ ئەوا ڕۆیشتی؛ بەڵام دەزانم تۆ فەقێ نەبووی. نازانم دەتبینمەوه تا بزانی ڕاستم بیر لێ کردوویەوه. خوا حافیزت بێ. به بزنەگەلەوه هاتینه سەر چۆم؛ بەستبووی. به بەرد سەهۆڵمان شکاند و ڕچەی بزنانمان پەیدا کرد. خۆمان هەڵکرد. شاخی هەوەڵ بزنم گرت و پەڕاندمەوه. که چوومه ئەوبەر له خۆم ڕوانی دەتگوت چەکمەی سوورم دە پێدایه، له ئەژنۆمەوه تا قولەقاپه خوێن دەهاته خوار. سەهۆڵ و ساردی ئاو بڕیبووی. هەواڵەکانم بانگیان کرد: ئێمه به کاڵه و گۆریەوه دەپەڕینەوه؛ تۆ ئاگرێکمان بۆ هەڵکه. هێندێک وشکەڵ و پووشم له قسنێک هێنا و ئاگرم دا. قاچی نیوه سەرمابردووی سێ بەش قەلاشتوو، جا وەره ژان بکا...
کەوتینه ڕێ. لەبەر بەفر ڕێ دیار نییه. به شوێن بەرازاندا چووین؛ به سەر کۆخێکدا کەوتین، تەنیا ماڵه به بەندەنێکەوه. خوشک و برایەکی لێ دەژیا. زۆریان بەخێر هێنایین؛ مێوژ و گوێز و هەنجیریان دەپێش کردین. کوڕەکه دەیگوت: خەونم دیتبوو ترێ سپیلکەم دەخوارد؛ زانیم ئەو بەفره قورسه دەبارێ. ئەگەر دەخەودا ترێڕەشکه بخۆم، باران دەبارێ. هەموو ژیانیان ڕەزێک

بوو لە بناری گوندی «ورچەک» و لە دنیا تەریک ببوون.
بەیانی ئاوا بووینە دیوی عـیراق. نەفەسـێکی ئاسـوودەم هەڵکێـشا: ئۆخـەی لەبـەر حـوکمی عەجەم خەلاس بووم... پاش نوێژی شێوانێک، بە بزنەگەلەوە ڕوومـان کـردە گونـدێک «بێـورە» یان «بێوران»یان پێدەگوت. حەشر و حەلەلا بوو؛ دیار بوو شێواوە. ژنێک گوتی: زوو بـڕۆن لێـرە مەمێنن! هاواری سەر و ماڵە. تازە بۆ کوێ بچین؟ بزنمان کردنە حەسارێک و چووینە مزگـەوت. مزگەوت لە خەڵکی گوند جمەی دەهات. مەلایەکیش بـە نـاوی مـەلا عـەزیز بـە دەنگـی بـەرز دەیگوت: مـن ماڵـی خـۆم ڕاگوێزتـووە. ئێـوەش هەڵـێن هـەتا نـەکوژراون و تـالان نـەکراون و خانووەکانتان نەسووتێنراوە. کەس هۆشی ئەوەی نەبوو جوابی سـڵاومان بـستێنێتەوە. مەسـەلە چییە؟ پرسیمان، گوتیان شێخ لەتیف دەگەڵ پژدەری شەڕیەتی؛ گوندی تمتمـانی سـووتاندووە. ئەم گوندە سەر بە شێخ لەتیفە؛ ئەمشەو پژدەری لە تۆڵەدا دەیسووتێنن و تالانی دەکەن.
جارجار تڕ و تۆپ بە کار دێ. دەمزانی ئەگەر ئەوان بە قسەی مەلا بکەن، ئێمـە سـەرمان بـێ کڵاو دەمێنێ. قسەم لە دەمی مەلا قۆزتەوە، گوتم: بـرا بـۆ شکایەتی پـۆلیس ناکـەن؟ گوتیـان شکاتمان کردووە، ناوێرن بە شەو بێنە هاوارمان.
- بۆ خۆتان چەکتان هەیە؟
کەوتنە بژاردن: بەڵێ سێزدە تفەنگ و چوارسەد فیشەکمان هەیە.
- برام! کەس نەڕوا. بچن دوو ئاگر لـە دەوری دێ بکەنـەوە و خۆتـان لـە بـەری دامەنیـشن. دەستە-دەستە کێشک لە دێ بگرن و تا سەرماتان بـوو وەرنـە بـەر ئـاگری مزگـەوت و دەسـتە بگۆڕن. هەتا هێرشبەر نەیەتە بەر سێرەی تفەنگ، تەقەیان لێ مەکـەن. ئەمـشەو بـەو چوارسـەد فیشەکە دەتوانن خۆ بپارێزن. ئەگەر تەنگانەشتان بۆ هات. ئەوا من حازرم سـەد پـشدەریتان بـۆ بکوژم!
بوو بە هەرا:
- مەلا عەزیزی خوێڕی! تۆ کێوە دەچی بچۆ. ئەم کوڕە جحێلە گەورەمان بی و بە قسەی ئەو دەکەین!
سەرت نەیەشێنم، تەواوی شەو لـە نـاو لێفـەی زۆری مزگـەوتا خـەوتین و کـەس نـەهات بـۆ پشدەری کوشتن بانگم کا! بەیانی کابرایەک بردینیە ماڵە خۆی. ژنان شانیان ماچ دەکـردم. کـە ئەگەر تۆی وا ئازا و ڕەشید! نەبای ماڵوێران دەبووین. بۆ یەکەمجار پلاوساوارێکم خـوارد کـە تـا ئێستاش تامی لە بن ددانم دایە. هاوارچی لەشکری شێخ لەتیف گەینە گوند و بەجێمان هێـشت و بۆ ئێوارە گەینە «کەناروێ»؛ کە ماڵی هەر دووک هەواڵەکەم لەوێ بوون.
شەو لە ماڵی هەواڵێکی چۆدارم میوان بووم. خەسـوویەکی پـیری زۆر ناحـەزی هـەبوو. لێـی پرسیم:
- کاکە مەلا! ڕاستە دەڵێن کەسێک دڵی جیرانان بێشێنێ، لە قەبرا دەبێتە مەیموون؟
گوتم: نا دایە گیان، خودا دوو جار کەس ناکاتە مەیموون!
ژنی کابرا جحێل و جوان بوو. نازانم لە خۆشی هاتنەوەی مێردەکەی بوو، یان کەیفی بـە مـن دەهات، تەواو دڕدۆنگی کردم. هەر چەند جێگەش هەبوو، لێفەم برد و چوومـە مزگـەوت کـە لـە بەلا بە دوور بم. سبەی ئەو ڕۆژە بە تەنیا ملی ڕێم داگرت. لە ڕێگە تووشـم بـوو بـە تووشـی دوو پۆلیسی کوردی عیراقییەوە. دەمەویست خۆم وەک خەڵـکی وڵات نیـشان دەم؛ گـوتم: مـانگوو

نەبن!
لێیان پرسیم: کوێندەری؟
- خەڵکی کەنارویم.
پۆلیسێکیان پێکەنی، گوتی: دیارە خەڵکی ئێرانی. برۆ کارمان پێت نییە؛ بەلام مەڵێ مانگوو نەبن؛ سەیری دەلێی!
گەیشتمە قاوەخانەی ئەزمر؛ شەش چام لە سەر یەک خواردەوە. کابرایەکی قولەخڕەی میوان، لێی پرسیم: چکارەی؟ قاوەچی شانی گرت و فرێیدا دەرێ؛ گوتی: حەقت چییە لە موشتەری من دەپرسی؟
پوولی ئێرانیم بۆ دەرێنا، پێنج قڕانیەکی هەلگرت. لە گۆیژە سەرکەوتم. تووشی کاروانێک بووم دەچوونە سلێمانی. لە نێو قساندا تاریفی ئەسپەڕەشی شێخ لەتیف بوو، کە زۆریان موبالەغە تێدا کرد. پیاوی سادە و دەشتەکی، دەسەلاتداران زۆر لەوە زیاتر دەبینن کە هەن. تەنانەت باس گەیشتە ئەوە کە تاژیەکانی شێخ لەتیف نیوەڕۆژ و شێویان هەر پلاو و گۆشتە. هێندێک دەیانگوت بریا تاژی شێخ بووینایە!
ئێوارە درەنگ گەییمە ناو شار. لە دلدا بڕیارم دابوو بچمە حوجرەی مزگەوتی گەورە و ببمەوە فەقێ؛ بەلام دەمزانی لەوێ ئیستراحەت ناکەم. زۆر ماندوو بووم؛ نۆ ڕۆژ بوو بەو هەموو دەردەوە بەڕێوە بووم و لە حەپسیشەوە هەلاتبووم. با ئەمشەو بچمە مسافرخانە. لە کابرایەکم پرسی: مسافرخانە لە کوێیە؟ بانگی کردمە لاوە گوتی: بلێ هوتێل؛ مسافرخانە قاچاغە.
بردمی و لە دوور هوتێلێکی نیشاندام. بردیانمە وەتاغێکی دوو تەختی؛ کەسی تریش نەبوو. سەرما بوو؛ گوتم ئاگر. گوتیان نیمانە؛ ئەگەر خۆت خەلووز بکڕی بۆت دەگەشێنینەوە. بە خەلووز خۆم گەرم کردەوە. شەو میوانێکی تر بۆ تەختی دووهەم هات؛ لاوێکی بێ مووی جوانچاکی شازدە و حەڤدە ساڵە، بە تفەنگ و فیشەکدانەوە. هەر کە زانی مەلام، هەڵیپێچام نوشتەی بۆ بنووسم کیژێک حەزی لێ بکا. تێمگەیاند کە من لەو مەلایانە نیم.
شەو دە تمەنێکی ئێرانیم دا بە خاوەنی هوتێل، چوار پەنجایی دامێ و چوومە قاوەخانە. هەر پەنجاییەکانم هەلگێڕ وەرگێڕ دەکرد و دەمخوێندنەوە و زۆرم پێ سەیر بوو. نەشمدەزانی بەرانبەر بە چەند پوولی ئێرانە.
خەیالات بردبوومیەوە. هەیاران لە بۆکان بیستمان کە شاری پێنجوین بە بوومەلەرزە وێران بووە. کابرایەکی شاعیری پێنجوینی بە ناوی «موفتی» کە جارێک لە بۆکان لە کاتی نەخۆشیمدا سەری داوم. تۆ بلێی لێرە نەبێ؟ دەی سا چۆن بوێرم و لە کێ بپرسم؟ دوو کەس لە نزیک من تەختەیان دەکرد. بە نووزەیەک لە یەکیانم پرسی: تۆ موفتی تووتنچی دەناسی؟
- نا نایناسم.
ئەوی‌تر گوتی: کورە ئەو کابرایەی لە جادەی تازە دوکانی هەیە؛ بۆچیتە؟
- بۆ هیچ هەر پرسیم.
دەلێن خنکاو پەلاماری پووشیش دەدا. من کە ئاوارەیەکەم لەم شارەدا کەس ناناسم، ئەمەش هەر باشە. دەیدۆزمەوە.
شەو هەوالەکەی هاووەتاغم گوتی: سبەی سەعات پێنج دەچمە حەمام، تۆ نایەی؟
- ئای دەخیلت بم بەجێم مەهێلە!

بەیانی هەر تاریکان بوو چووینە حەمام. لاوەکە دەیگوت کوڕە ئاغام لە بازیان. گوتی: مەلا وەرە پشتم بشۆ! گوتم: تۆش پشتی من دەشۆی؟ گوتی: نا! چ حەددت هەیە؟ گوتم: من ڕەعیەتی بازیان نیم؛ هەر کەسە کوڕی بابی خۆی.

بەچکە ئاغا دیار بوو دڵی ئێشابوو، بەر لە من لە حەمام دەرچووبوو. تاو هەڵنەهاتبوو لە حەمام دەرچووم. لە سەر دوکانێکم خوێندەوە: «گەلاوێژ». لە چاخانە مامەوە تا دوکان کرانەوە. چوومە گەلاوێژ پرسیم:

- دوکانی موفتی توتنچی لە کوێیە؟

کابرا بە ترسێکەوە دەستی بە دەمیەوە گرت، یانێ دەنگ مەکە. تەواو ترسام. مشتەرییەک لەوێ بوو دەرچوو. خاوەن دوکان گوتی: وەرە! زۆر لە دوورەوە وتی: ئەوە جادەی تازەیە و گەڕایەوە. پێداچووم تووشی «موفتی» بووم کە ناوی چکۆلەی «مەلا کەریم» بوو. لە سەر دوکانێکی ڕووتەکە دانیشتبوو. هەر سلاوم کرد بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم:

- دەی چۆنی؟ چاکی شوکور؟ ماڵ و منداڵ چۆنن؟

- هەموو لا بە کەیفن.

- فرۆشتت؟ شوکور خێرت کرد؟ دەی سەر چاوم هاتی!

زۆری ڕست. گوتم وا دیارە ئەو کلیشەی دوکاندارە؛ بۆ هەموو مشتەریەکی دەڵێن.

- دەزانم نامناسیی.

گوتی: ڕاست دەکەی. دەتۆ کێی؟

- من هەژارم.

دەستی کردە گریان و فرمێسکی داباری.

- بریا کوێر بام و نەمدیبا شۆڕش تێکچووە.

- ئەم گریانەی پێ ناوێ. ئێستا من چ بکەم؟ چۆن کەس نەمناسێ؟

گوتی: من ماڵ وێرانی بوومەلەرزەم. دوو منالم هەن سەروپێچکە. ژنەکەم شەش ساڵە ئیفلیجە و بە دەست ئەودیو ئەمدیوی پێ دەکەین. تاقە ژوورێکی بن عەرزی تاریک و شەدارم بە کرێ گرتووە. ڕۆژانە بە هەزار زەحمەت نانی وشک و چایی لەم دوکانەم پەیا دەکەم. لە مێروولەش بێدەسەلاتترم. من ناتوانم بتحاوێنمەوە. لێمگەڕێ باسی تۆ بۆ برادەرێک بکەم.

- ئای نەکەی! نامەوێ کەسی دیکە بزانێ. دەوڵەت پێم دەزانێ و دەمداتەوە بە ئێران.

- نا، خاترجەم بە! ئەو برادەرە سەد جار تواوەتەوە و ساف کراوە تا تەواو بۆتە کوردێکی تەواو عەیار و بێعەیب.

وای کرد کە ملم دا بەو بلێ. موفتی شاعیر ڕۆیشت و زوو هاتەوە. زۆری پێ نەچوو کابرایەکی درێژی ڕانک و چۆغە پڕپینەی عەینەکی ئەستوور لە چاوی ڕیش و سمێڵ تاشراوی تەمەن بە ناوداچوو، پەیدا بوو. نە سەلام و نە کەلام هەر لە ڕێوە پێی گوتم:

- ئای ئای لەو پشتێندە گرێ چنە! مەلا دەڵێن هەر گرێیەکی شەیتانێکی تێدایە. ئەو مێزەرە سپییە ڕیشوودارە چییە؟ تێی ڕیم!

گوتم بە خوا ئەو کابرایە شێتە. دانیشت گوتی:

- هەژار نایەوێ خۆت کز کەی! من چەند جارم وەک تۆ بەسەر هات؛ دروستمان کرد و لێمان ڕووخایەوە. ئێستاش ناهومێد و دڵسارد نیم...

موفتی لە پێشدا پێی گوتم ناوی «میرزا ڕەحمانی بانەیی»یە و بە مام میرزا دەیدواند. گوتی هەستە با بڕۆین. لە ڕێگە لێی ڕوانیم گوتی: ڕەنگت زەردە، وا دیارە برسیت؟
- نەخێر برسی نیم.
- دەی درۆ مەکە، زۆرت برسییە.
بردمیە کەبابخانە تێری کردم.
- شەو لە کوێ بووی؟ چییان لێ ساندی؟
چووینە هوتێلەکە. بە گژ خاوەن هوتێلدا هات کە:
- تۆ چۆن دەسبڕێکی، چوار پەنجایی لە باتی دە تمەن دەدەی؟
لە حیسابدا دەرکەوت کە بەچکە ئاغا پوولی نەداوە و لە سەر من حیساب کراوە. کاتێ لە دەفتەرمان ڕوانی، من خەڵکی کەناروێ و ئەو بازیانی نووسرابوو. پوولی ئەویان لە من نەگێڕاوە و زانیان کلاویان لە سەر نراوە!
میرزا بردمیە دوکانی دەلاکێک. گوتی: وەستا ئەم کوڕە هەم دەروێشە هەم سۆفی؛ من پەشیمانم کردۆتەوە. چونکە خزمەتی پرچ و ڕیشەکەی بۆ ناکرێ، تکایە بۆی بتاشە!
دەلاک تماشایەکی سەری کردم، گوتی: مام میرزا ئەمە کاکۆڵی هەبووە پرچی نەبووە؛ گاڵتەی خۆتم پێ مەکە!
پاش سەر و ڕیش چا کردن هێنامیەوە ماڵە خۆی. حەوزێکی هەبوو، گوتی: ئەم قاچە پیسەت بشۆ با بۆگەنت نەیە! چووینە وەتاغێک کە بۆ میوان و تەریک لە وەتاغی ناو ماڵ بوو. پاش تاوێک بە شەرمەوە گوتم: تینوومە. گوتی: من نۆکەری بابت نیم، تینووتە بە جەهەننەم! بچۆ لە ماڵ داوای ئاو بکە! وست بووم. دیسان تینوەتی زۆری هێنا. ناچاری کردم بچم بانگ لە ماڵەوەی بکەم کە ئاوم دەنێ. خێزانی ئاوی بۆ هێنام. هەموو نیازی میرزا ئەوە بوو شەرم نەکەم و خۆم بە پاژێک لە خەڵکی ماڵ بزانم. شەو نوێنی دامێ و بە جێی هێشتم کە بخەوم. سەعاتێک بە دیوارەوە بوو. هەموو سەری سەعاتێک بە گرم و هۆڕی ڕادەپەڕیم. خوایە چ بکەم؟ هەستام بە پشتێندەکەم کلکی سەعاتم بەستەوە بە بزمارێکدا و هەستم لێ بڕی. بەیانی میرزا هات و دیتی؛ گوتی: های شەیتان! هەر دەمگوت دەبێ دەگەڵ سەعاتەکە چۆنی ڕابوێری!
زۆر زوو بوومە کوڕی ماڵ و شەرمی میوانەتیم نەما. کەوتمە لێکۆڵینەوەی مام میرزا. پیاوێکی زۆر سەیرم دی. بە دڵ و داو هەواڵی لێقەوماوان بوو. لە کاسبیدا شەریکە دوکانی یەکێتر بوو کە خۆی هیچ کاری نەدەکرد. زۆر زانایەکی خاوەن مەعلوومات بوو. بە سەتان کتێبی لە هەموو بابەتێکەوە متالا کردبوو. هەرچی خوێندبوویەوە لە بەری بوو. دژی شێخ و دەروێش و مەلای نەزان و مێشکوشک بوو. هیچ مەلایەکیش لە کێشەدا دەگەڵی دەرنەدەبرد. زۆریان بە کافریان دەزانی و بە بێ ئەوە بزانن «بابی» چییە، دەیانگوت میرزا بۆتە بابی. خۆی نەزری خزمەت بە داماوانی کورد کردبوو؛ لە کوردایەتیدا سووتابوو.
شەوێک چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە. گوتی: ماڵمان لە بانە بوو. منداڵێک بووم. بابم مرد و قەرزوقۆڵەیەکی زۆری لە سەر بوو. بە ڕووتی و پێخواسی هاتمە شاری سولەیمانی و حەماڵی بازاڕم کرد. پاش چەند ساڵ هەوای چوونە بەغدام کرد. لەبەر کاروانچیان پاڕامەوە دەگەڵ خۆیانم بەرن؛ خزمەتی ولاخ و باران دەکەم. گوتیان: تۆ پێخواسی و دە ڕۆژە ڕێ دەرنابەی. ئێوارەیەک لە کاتی جەماعەت چوومە مزگەوتێک جووتە کەوشێکی تازەی



ڕەنگ‌زەردم دزی. تا قەراغ شاری بەغدا دەگەڵ کاروان بووم و جیا بوومەوە. شەو لە حەوشی بارەگای غەوس -وەک سەتان ڕووتی بێ جێ- خەوتم. وا دیار بوو غەوس دەیزانی من عاقیدەم پێی نابێ، بۆیە کاربەدەستی غەوس -زیاد لە هەموان- منی دەرکرد. گوتی: تۆ لەوانەیە دز بی! لە کۆلانێک خەوتم. بەیانی جوولەکەیەک خەبەری کردمەوە، کە ئەگەر شتێک دەکرم لە خۆی بکرم. سەرگەردان دەخولامەوە، لە شوێنێکی دەم دەجلە چوومە قاوەخانەیەک. چایان بۆ هێنام نەمخواردەوە. گوتم: پارەم نییە؛ هەر لێم گەڕێن دانیشم. نیمەڕۆ و شەو هێشتیان لەسەر نیمکەتێ بنووم. بەیانی دیسان نانیان دامێ، نەمخوارد؛ گوتم: تا کار نەکەم و نانی ڕەنجی شان پەیا نەکەم، هیچ ناخۆم. دەباغچی بەوێدا ڕادەبردن. قاوەچی گوتی: ئەم کوڕەش بەرن چەرمتان بۆ بشوا. ڕەگەڵیان کەوتم. زۆر زوو دەریانکردم؛ گوتیان کار نازانی. هاتمەوە قاوەخانە. ئەو شەوەشم بە برسیاتی ڕابوارد. بەیانی ئەو ڕۆژە یەکێک هاتە قاوەخانە و بە قاوەچی گوت: لاوێکمان دەوێ لە بەر دەستی ئاشپەز کار بکا و ئەمین بێت. قاوەچی منی نیشان دا؛ گوتی: خزمی خۆمە، من زامن؛ ببەن. هاتمە دانشکدەی علوومی عەرەبی و درامە دەست ئاشپەز. هەر ئاشپەز چاوی پێکەوتم وا زەرد و لاواز و بێ تین، پالێکی پێوە نام و بەرەو دەرگای ڕەتاندم. وەختا بوو ملم بشکێ.

- بڕۆ دەرەوە تۆ بە کار نایەی.

گریام گوتم: برسیمە بۆیە بێهێزم. بەزەی پێمدا هاتەوە. نان و چێشتێکی دامێ و ملم لە پیواز پاک کردن نا. وەک شاگری بە قودرەتێ کارم دەکرد؛ دامەزرام. وردە- وردە خۆم خۆشەویست کرد. زۆربەی کاری ئاشپەزخانەکەم گرتبووە ئەستۆی خۆم. گەییمە پلەیەک کە کڕینی کەرستەی بازاڕیان بە من دەسپارد و دەستیان پێ لە کاری ناو ئاشپەزخانە بەردام و حەسامەوە. خوێندکارەکان کە زانیان نەخوێندەوارم، دەرسیان پێ دەگوتم. کەم-کەم وام لێهات کە ببمە یەک لە خوێندکارەکان و بە ڕەسمی ناوم بنووسن. توانیم لە ئەزموونەدا سەرکەوم و پلە- پلە بەرەو ژوور چووم تا دانشکەدەکەم تەواو کرد. لە دەورانی خوێندنمدا -کە عەربیم باش دەزانی و لە سارد و سەودای ناو بازاڕ شارەزا ببووم- بازرگانی کوردی سولەیمانی زۆریان خۆیان کردبووە ئاشنام و مالّم بۆ دەکڕین. دەگەڵ ئەوەشا خۆم شتم پێدا دەناردنەوە بۆیان دەفرۆشتم. تەواو ببوومە خاوەن پارە. تەنیا شتێک کە بە لامەوە گران بوو، تکای میوانانی سولەیمانی بوو کە دەبوو بیانبەم زیارەتی شێخ و مشایخی بەغدایان نیشاندەم کە زۆر وەختی دەگرتم. فێلێکم دۆزیەوە: هەش-نۆ حاجی و ماجیم وەدوو خۆ دەدا، هەر لە دەوری دانشکەدە تووشی هەر کاولێک دەبووین، دەمگوت: ئەلفاتیحا، دوعا بکەن! لە جوابی پرسیاراندا دەمگوت: ئێرە ئاشپەزخانەی هارونەڕەشیدە! ئەوە ئاودەستی ئەلقادروبیللایە! فلانە جێ خەوی ئەعووزەن بیللا بووە و هەروەها... هێندەم ئاودەستی خولەفای عەباسی پیشان دەدان تا ماندوو دەبوون و دەمیان لە دوعا کردن وەڕەز دەبوو؛ دەیانگوت: میرزا با ئەو جار بەس بێ، بۆ جارێ‌تر!

لە پاش تەواو بوونی دانشکەدە، جووتێ کەوشی زەردی زۆر باش و عەبایەکم کڕی و چوومەوە سلێمانی. دەولەمەند دۆستی زۆرە. لەبەر دەعوەت کردن سەری خۆم پێ نەدەخورا. هەر جەمەی لە مالێک بووم. ڕۆژێک لە میوانی حاجیەکە بووم کە کەوشم لێ‌دزیبوو. حاجی هەر داخی کەوشەکەی لە دلدا مابوو. بە ئانقەست باسی کەوش دزانم کرد. گوتی: میرزا گیان! سالێک نازانم چ سەگبابێک جووتێ کەوشی لە مزگەوت لێ دزیم؛ ئێستاش لە بیرم ناچێ!

کەوش و عەبام لە پێش دانا؛ گوتم: من دزەکە بووم. ئەم عەبایەش سووتی کەوشەکەت.
چوومەوە بانە قەرزەکانی باوکم دایەوە و لە سلێمانی ملـم لـە بازرگـانی نـا. هـەر لـە زەمـانی عوسمانیەوە تا بڕانەوەی شۆرشەکانی شێخ مەحموود، لـە هـەر کـوێ داوای ئـازادی کوردسـتان کراوە، بەشداریم کردووە. تەنانـەت هاتمـە سـەقز بـۆ یارمـەتی حەمەڕەشـید خـان و کـە دیـتم بەرهەڵدابیە، بە جێم هێشت. ئەوا ئێستاش کە پیر بووم و دارابیم زۆری لە کزی داوە، دڵم بـەوە خۆشە کە بتوانم یارمەتی داماوان بکەم...
ئێرانی کە بە قاچاغ دەهاتن بچنە حەج، میرزا دەرک و دیوانی بۆ دەکردن و پاسپۆرتی بۆ سـاز دەرکردن. لە بیرمە ڕۆژێک دەگەڵ میرزا لە دوکانێک بووین. کابرایەک هات لە تەپڵی سـەریەوە کەسک بوو تا سەر کەوشەکەی. سەید بوو ئـەمما سـەید! بـە زاراوەی مـەریوانی گـوتی: سـڵام، میرزاوڕەحمان کامەیە؟
- ها کاکە چت دەوێ؟
- دەچمە حەج، وتیان بێمە لای تۆ.
- باشە کاکە! دوو عەکسی خۆت بێنە بەڵکوو کارێکت بۆ بکەم.
- میرزا نابێ مەحتەلم کەی، من ئەمشەو دەبێ بچمە بەغدا.
سەید گوتی: سەید لاچـۆ خـۆت لادە! مـاڵوێـران ئێـستا کـەرێک بتبینـێ قەپاڵـت لـێدەدا وادەزانێ بارە وێنجەی! کوڕە ئەگەر بە بیست ڕۆژ بۆت جێبەجێ کەم دەبێ شوکری خوا بکەی.
ئەرمەنیەکی ئارەقفرۆش جارێک بە شەرمەوە و لە بن لێوانەوە گوتی: مام مـیرزا! تـۆ دەڵـێن پیاوێکی لە پرسیار تووڕە نابی. ئێوە دەڵێن دینی ئیسلام هەقە و دیـنی گـاوران بەتاڵـە. کـەچی ئێمەی گاورەکان نە شەڕ دەکەین؛ نە ژن هەڵدەگرین؛ نە دزی و چەتەیی دەکـەین. ئـەو کارانـە هەمووی لە موسڵمانان ڕوو دەدا؛ چۆن وا دەبێ؟
میرزا چاوەکانی کز کرد و گوتی:
- کەسپەڕ! هەر نانێکت دەس کەوت لەتێکی بکە بە خێری مەسیح کە بە سەڵتی مرد! ئەگەر مەسیح ژنی هێنابا و سێ چوار جاشەکەری بەجێهێشتبا، ئێستا هەزار خۆزگەتان بە موسـڵمانان دەخواست. هەتیو کێیە کاری خراپ دەکا؟ دە بڕوانە هەموویان عەولاد ڕەسووڵەکانن و سـەیدی بەرزنجەن، کام کرمانج خراپە دەکا؟!
جارێک مەلا شێخ نووری ناوێکی زگـزلی بە گیر هێنابوو، پرسیاری لێ دەکرد:
- مامۆستا شێخ نووری! چۆنە خوای تـەبارەک و تـەعالا دەربـارەی ژن عەداڵـەتی بـە خـەرج نەداوە؟ جگە لەوەی کە لە شایەتی و میراتدا دوو ژن بە پیاوێکە، دەڵێن پیاوی بەهەشتی حـەفتا حۆری دەدەنێ و ژنەکەی سەر دنیاشی دەدەنـەوە. واتـا ئەگـەر ژنێکـی زۆر خوداپەرسـتی وەک ڕابیعەی عەدەوی -کە بە ئەولیا حیسابە- لە پاش مـردن بچێتـە بەهەشـت، حـەفتا هـەوێی زۆر جوانی هەیە کە لە سەر دنیا دەگەڵ هەوێیەک نەدەحەواوە؟!
مەلا گوتی: ژن لە بەهەشت زۆر کـەیفیان سـازە؛ ئـەم پـەنیرە لـەزیزەی بەهەشـت دەخـۆن؛ خەمی چیانە؟!
- واتا مامۆستای بەڕێز! کچی من کە شوو دەکا هەر بۆ پەنیرە؛ خۆ لە ماڵیش پەنیری هەیە!
لەمەوە باسی بەهەشت و جەهەننەم دامەزرا. شێخ نووری گوتی: بەو قورعانەی لـە سـەر ڕانی ڕاستم داناوە شتێکم دیوە ڕەنگە ئەگەر بیگێڕمەوە بڕوام پێ نەکەن.

- بەڵێ بیفەرموو، کێیە بڕوا نەکا.
شێخ نووری دیسان سێ- چوار سوێندی خەستی خوارد و گوتی: لە گوندی سیتەک، شەوێک چووبوومە سەر ئاو. دیتم زنجیرێکی ئاگرین هەر ورشەی دەهات لە عاسمانەوە داهێڵرا، خرایە ملی مارێکی زەلامی بە قەد هەژدیها. مارە دەیزیراند. هەڵیان کێشا و بەرەو ژووریان برد تا لە بەر چاوم ون بوو. سەیرم دەکرد؛ دیارە بردیانە ویزەی جەهەننەمیەکان.
مام میرزا گوتی: باوەڕت پێ دەکەم؛ تۆ درۆ ناکەی. بەلام پێم بڵێ جەهەننەم لە کوێ و بەهەشت لە کوێیە؟
- میرزا تۆ خۆت دەیزانی کە بەهەشت لە ژووری عاسمانان و جەهەننەم لە ژێر حەو تەبقەی زەویدایە.
- دەسا مامۆستا گیان، بەو قورعانەی تۆ سوێندت پێ خوارد ئەو مارەیان بردۆتەوە بەهەشت بۆ گیانی بەهەشتیەکان! ئەگەر بۆ جەهەندەم با، دەبوایە عەرزی بۆ هەلکۆڵن و کونی کەن و مارەکەی تێخەن. بە خوا مام میرزا قسەکەت جێگەی فیکر لێ کردنەوەیە!
«سەید عەلی بیسمیلا» ناوێک هەبوو، بەرزەنجەیی؛ تا خوا حەز کا ناشیرین و خوێنتاڵ و زمانپیس و شەڕفرۆش بوو. ڕۆژێک میرزا لێی پرسی: دوو ئیشکالم هەیە بۆم حەل کە! یەکەم: دەڵێن ئەگەر مزگەوت ڕووخاوە میحرابی ماوە. دەڵێن پێغەمبەر زۆر جوان بووە، تۆ کوێت وەک ئەو باپیرەت دەچێ؟! دووهەم: دەڵێن موسڵمان چوار سەد ملیۆنن. ئایا بە تۆوە حیساب کراوە یان بە تۆڕا چوار سەد ملیۆن و دانەیەکن؟!
دیارە جوابی سەید عەلی هەزار جنێوی سەر بە کولکە بوو!
میرزا لە تاریخ، سیاسەت، ئەدەبیاتی کوردی و فارسی و عەرەبیدا بەحرێک بوو بێ بن. هەر خۆش بوو ئەو قسە بکا و گوێی لێ بگرێ. بە ڕاستی ئەو کابرایە مامۆستایەکی زۆر گەورە بوو بۆ من و زۆر شتی لێ فێر بووم.
میرزا لە نەورۆزدا بردمیە بەغدا.
ڕۆژێک گوتی: دەترسم لە ماڵە من بتگرن؛ دەسەلاتم نییە ڕزگارت کەم و ئابڕووم دەچێ. با بتکەمە پەنابەری شێخ لەتیف و واش ناکەم بزانێ تۆ لە لامی؛ تا نەزانم قبووڵت دەکا.
شەو ڕۆیشت و زوو هاتەوە. پاش تاوێک شێخ لەتیف بە تەنیا بە ترۆمبیلێکەوە هات و بردمیە ماڵە خۆی.
با ئەوەش بڵێم: وەک دەڵێن «ناوی گەورە و شاری وێران». منێکی وا نەزان و دنیا نەدیتوو، ناوەکەم وەک شاعیری شۆڕشی کوردە وە پێش خۆم کەوتبوو، دەوروبەر دەیانناسیم. شەوێک میرزا پرسی: تۆ جحێلی، شێخ نەجمەدینێک هەیە دەڵێ هەژار ئاواڵ فەقێم بووە؛ کە ئەو زۆر پیرە. تۆ دەیناسی؟
- نە بە خوا.
- باشە گاڵتەیەک دەکەین!
سبەی شەو شێخ و چەند برادەرێکی بانگ کردبوو. کە دەیانپرسی: ئەمە کێیە؟ دەیگوت: سۆفیەکی جاهیلە و من ڕیش و پرچم پێ تاشیوە! لە ناو قساندا لە شێخ نەجمەدینی پرسی:
- هەژاری ئاواڵت لە کوێیە؟
گوتی: دەڵێن لە بیارەیە. بریا بهاتایەتە ئێرە، ئای چەند بۆی بەتاسەوەم!



دەستی کرد بە حیکایەت گێڕانەوەی هەواڵەتی گەرمی خۆی و من کە چەند ساڵ پێکەوەمان خوێندووە.

میرزا گوتی: سوێند بخۆ کە درۆ ناکەی!

شێخ قوت بوو؛ تماشایەکی منی کرد؛ گوتی: ناکا ئەوە هەو بێ؟ بەخوا نەمدیوە، بەڵام خۆشم دەوێ.

شێخ لەتیفیش هەر بە ناوەکەم خۆشی دەویستم. لە ماڵی ئەو دامەزرام. لەوێشەوە چەند کەسێکی وەک «ڕەفیق چالاک»، «مەحموود ئەحمەد»ی موعەللیم و زۆر کەسی دیم بوونە ئاشنا. چاوم بە «برایم ئەحمەد» کەوت کە ئەویش ئەندامی کۆمەڵە بوو. شێخ لەتیف لێی پرسیم: برایمت چۆن دیت؟ گوتم: پیاوێکی زرینگ و زانایە و زۆریش کوردە، بەو شەرتەی خۆی بکەنە سەرۆکی کوردستان!

کاتێ مەلامستەفا لە سابلاغ بوو، «هەمزە عەبدوڵلا» ناوێکی ڕاسپاردبوو کە حیزبێک بۆ کورد لە عیراق دامەزرێنێ و کاغەزی دابوویە. شەوێک گوتیان مامۆستا دیت. هەمزە عەبدوڵلا پەیدا بوو. پیاوێکی زۆر لووتبەرزی قۆڕەدەماغم هاتە بەر چاو. گێڕایەوە کە لە سابلاغ - وەک پێویستە- قەدری نەگیراوە و قسەی وای کرد کە هەر شەللاتیەک پێی شەرمە بیڵێ. دەربارەی دەوڵەتانی ئەمریکا و ڕۆژاوا فەرمووی: هیچ جێگەی نیگەرانی نین؛ کارگەران لە جیاتی بارووت خۆڵ دەکەنە ناو بۆمباکانەوە و سەرکەوتن هەر بۆ دەوڵەتی سۆڤیاتی خۆمانە! دیارە قسەی مامۆستا زۆر بە ئیحتوبارە و کەس ناکرێ بڵێ وا نییە. هەر چی دەمدی و دوو پیت و لەتێکی خوێندبوو، کۆموونیستی دوو ئاتەشە بوو. سەر و بنی قسەیان سلاوەت لە دیداری ستالین بوو. من کە هیچم دە باراندا نەبوو، هەرگیز لە کۆمۆنیستیش تێنەگەیبووم، جارێک ویستم گلە بکەم کە ڕووس ئێمەیان بە جێ هێشت و شەرتیان نەبردە سەر، زۆر بە توندی بە گژمدا هاتنەوە و بە هەزار و یەک دەلیل حاڵییان کردم کە ڕووسیا لە مەسلەحەتی کورد ئەو کارەی کرد. ئەمریکا دەیەویست یاریدەی ئێران بکا و کوردستانیان وێران دەکرد. ڕووس بە ئامانەت خۆی کێشاوەتەوە؛ ڕۆژێکی نە دوور دێتەوە و ئازادمان دەکا! ئیتر ئەو جار منیش عوزرم بۆ ڕووسیا دێناوە و دەمەویست ئەو خۆ لە کوردستان بێ خاوەن کردنەی بە سەد باردا پینە بکەم! تا نەڵێن ڕیجعی و نەزانە!

لە بیرمە یەک لە دەلیلە باشەکان ئەوە بوو: مەسەلەی کوردی ئێران و هەرای یۆنان هەبوو. چینی شەشسەد ملیۆنیش هەبوو. ڕووسیا بۆ ئەوە چین بکاتە هەواڵی خۆی و تاقەتی ئەو هەمووە جەبهەی نەبوو - چونکە لە شەڕی ئاڵمان زۆر زیانبار و لاواز ببوو- دەستی لە قازی و مارکۆس هەڵگرت و چینی بردەوە. دوو دەسرەی سووتا و قەیسەریەکی وەگیر کەوت. پیاو قەیسەری هەبێ دەسرەش پەیدا دەکاتەوە. ڕووس و چین ئامریکا دەخنکێنن و ئێمەش لە چنگ ئێران و تورک دەردێنن. کێ بێ ئەو قسە خۆشەی وە بەر دڵ نەکەوێ؟! بەلام کەی؟ ستالین دەزانێ! ها، ڕاست دەکەن. منیش لە شیعرێکمدا لە تەورێز گوتبووم: ستالین دەزانێ چییە حاڵمان. کاک هێمنیش گوتبووی: ستالین گوتوویە: «یەمان پریسکی کوردیسکی خەرەشوێ». ئەمما ئێمە مانای قسەی خۆمان نەدەزانی، ئەوانە زانان و دەزانن دەڵێن چی! خولاسە منی ئاوارەی ماڵ وێران و کلۆلی پاشەکشەی ڕووسان لە ئێران، خواخوام بوو بە ڕیجعیم نەزانن و بە کۆمۆنیستم لە قەڵەم دەن و لە گەڵ هەڵمناوێرن.

بۆ شوێنەونی ناردرامە گوندێک بە ناوی «بی‌بی‌جەک»، ماڵی «مەحموود بەگ» ناوێک کە پیاوی شێخ لەتیف بوو. زۆری نەبرد «عەبدولقادر ئەحمەد» و «باقی بامەڕنی» هاتنە ئەوێ و یەکترمان ناسیەوە. باقی ناوی «مام غەفوور» و عەبدولقادر «کاخدر» بوو؛ تا نەناسرێن. مەلامستەفا لە شنۆوە ناردبوونیە عیراق؛ نامەیان بۆ چەند کەسێک هێنابوو. کە دەگەڕانەوە، گوتم: منیش دێمە لای مەلا مستەفا. گوتیان تا پرسی پێ نەکەین ناتوانین بتبەین. نامەم بۆ بارزانی نووسی، نامەم بۆ ماڵی خۆمان نووسی کە ساغم و حەق و حیسابی قەرز و قۆڵەم بو ڕوون کردنەوە. مام غەفوور هاتەوە و خەبەری دا کە کاخدر لە دەوری شنۆ لە بەفرا گیری کردووە و لە برسان کەوتووە و خۆی داوەتە دەست دەوڵەت و بەرەو تارانیان بردووە. مەلامستەفاش ڕووی کردۆتە وڵاتی ڕووس و لەو ناوە نەماوە. ئەویش لە ناچاری هاتۆتەوە عیراق. جوابی ماڵەوەشی بۆ هێنابوومەوە: کاکە ڕەحمان گوتبووی دەمانچەکەی ئەویان لێ ساندم. قاسماغا -کە نوسیبووم سێسەد و پەنجا تمەنی لایە- تووڕە ببوو: حەددی چییە قەرزی لای من بێ؟! مەلاعەولا گوتبووی: سێ هەزار تمەنم لا نییە؛ سوێند دەخۆم. دیار بوو پیاو هەرچی بێ، تا لەبەر چاوانە لەبەر دڵانە. تەنیا برایەک کە لە بیری نەچووبووم کاک هێمن بوو؛ لە جەنگەی سەرباز و عەشایر ڕژانە ناو شاردا، ماڵ و منداڵەکەمی بردبووە گوندی شیلاناوێ و لە خەتەر پاراستبوونی. کە دوای ئێمە ئاغایانی کوردیان بردبوونە تاران، شا پرسیبووی: ئەو هەژارەکە چی لێهات؟ حاجی بایزاغا گوتبووی: قوربان! ئێمە کوشتمان...

دوای هەڵاتنەکەم لە بۆکان، عەولاغای مەحموداغا جنێوی بە کوێخاکەی دابوو کە: دڵی پێنج قڕانی فیشەکێکتان نەهات هەژار بکوژن...

چوبوومە سولەیمانی لە وەتاغێکی تاریکی دیوەخاندا دەژیام؛ بۆ ئەوە کەس پێم نەزانێ. کە مام غەفوور هاتەوە و بوو بە ئاودەنگیم، ڕۆژێک درگا کرایەوە، «عوسمان دانیش» کە لە سابلاغ دەماننناسی و دەرسی کوردی بە منداڵان دەگوت، وە ژوور کەوت؛ کە ئەویش تازە گەڕابۆوە.

- کاک عوسمان ماندوو نەبی.

- عەفوو بکەن من ناوم مەلا کەریمە، عوسمان نیم. ها! من ئێوە دەناسم: تۆ باقی! تۆ هەژاری! باقی گوتی: ئاخر عوسمان گامووش! مانگێکە یەکترمان نەدیوە؛ بۆ تۆ دەماننناسی و ئێمە ناتناسین؟!

ڕۆژێک دیتم کابرایەکی مل‌پانی، پاڵتۆیەکی بەرگنە وشتری هەشتەڕۆیانە لە بەردا و کەوشێکی پاش پانیەدرێژی قەتارەچیانە دە پێدا هاتە ژوور. پاش تاوێک ناسیمەوە حەسەن قزلجیە و ماوەیەک لە بیارە سۆفی بووە و ئێستا هاتووە. پێک شاد و شوکور بووین. ناو بە ناو کاک هەمزەی کۆنە شەریکم و مەلا عەولای حەساریش بوونە پەنابەر.

ڕۆژێکی‌تر سەر لە بەیانی، کەشیدە بە سەرێک -کە دەتگوت زەردەچێوی پێدا ڕژاوە- هاتە لای شێخ کە چارێک بکا. حاجی عەلیم دەناسی لە بۆکان، ئەرزیابی تووتن بوو. ژنێکی شۆخی خەلیفەی هەبوو. زۆر دەوڵەمەند و وەجاخ‌کوێر بوون. ماڵیان چووبۆوە سەقز.

- حاجی گیان! تۆ و ئێرە چی؟

- ئای قوروان! حەقایەت من دوورە: خانم هەڵیپێچام، وتی هەوەڵ شام و ئاخر شام. ئێمە کە حەشرمان لە شام ئەکریە، بۆ ئیسە نەچین؟ گش ماڵەکەمان فرۆشت؛ فەرشمان هێشتەوە و بارمان کرد و چووینە قەسرشیرین. قالیەکانمان دا وە قاچاخچی، کە خۆشمان و فەرشەکانیش



بەرنە ئەودیو. قەرار دریا سەعات دوانزەی نیمەشەو بیانبینم. قووروان خـۆت ئـەزانی ئەسـڵەحەی موسولمان چییە؟ دەسنوێژە! دەسنوێژم گرت. چوومە سـەر کـۆڵان هـاوارم کـرد: عەبـدولقادر! تومەز کاورایەکی پۆلیسی شەو ناوی عەبدولقادرە! بە غار هات و منی دیت و کەلەمچـەی کـردە دەستمەوە. وە هەزار نارعەلی، وە سەد تمەن بەری دام. بێ ئەدەبییە لە خزمـەتتا، قالـیەکانیش لە خانەقین گیران و گومرگیان لێ ساندین. گەیینە بەغدا وتم لای عەبدولقادر گیـان دائەبـەزم. فـەرش و خـانم و مـن لـە بـن دیـواری غـەوس لـە پـەنا جـادە ماینـەوە. لـە زوان کـەس تێنەدەگەیـشتین. ئێـوارە وەختـە، کاورایـەک وە کـوردی وتی: ئێـوە چـین و بـۆ لێـرەن؟ کـە تێگەیشت، بانگ حەماڵی کرد و قالی و ئێمەی بردە ماڵ خۆی. وتی: لە ئێرانەوە قاچـاغ هـاتگن؛ پۆلیس بزانێ ئەتانگرێ. پاسپۆرتی سووریەتان نییە؛ ئەشچنە شام گشتی دەسـبڕ و نامـەرد. مـن نایەژم ئەو ئەیوت: «حەشری چە و مەشری چە؟» تۆبـە ئەستەخفیرولـڵلا! لـە سـەر قـسەی ئـەو گەڕاینەوە سولەیمانی و ئێستا هاتگمە لای شێخ فکرێ بکاتەوە چی بکەم.

ئەو بەینە زۆر بە تاسە بووم «شێخ مـەحموود» ببیـنم؛ بـەڵام تـا داوام دەکـرد، شـێخ لـەتیف بەهانەیێکی ئەدۆزیەوە و دەیگوت جارێ!

شێخ لەتیف بۆ خۆی شاعیر بوو؛ بەڵام باوەڕ ناکەم شیعری کەسی خوێندبێتەوە. تەنانەت ئـەو کاغەزانەی لێقەوماوان بۆیان دەنووسی، قەت یەکی نەدەخوێندەوە و وە بن دۆشەگی بـن قـوونی دەدان. کە لە «بی‌بی‌جەک» بووم، سوارێک بە غار هات و نامەی شێخ لـەتیفی دامـێ کـە: زۆرم تاریفی تۆ لای شێخ مەحموود کردووە؛ پێی خۆشە نموونەی شـیعرت ببینـێ. تکایـە شـیعرێک بنووسە با بۆی بخوێنمەوە. من کە دەمزانی حاڵی چۆنە، کاغەزێکی سپیم خستە ناو پاکەتـەوە و ناردم. کە شێخ لەتیفم دیتەوە گوتم: ها؟ شیعرەکەم چۆن بوو؟ فەرمووی: زۆر خۆش بـوو؛ شـێخ مەحموودیش زۆری پەسند کرد!

بەرەبەری نەورۆز قزلجی و مام غەفوور و من و هەمزە چووینە گوندی «سیتەک»؛ لە ژوورێـک دایانکردین. لایەکی چەپەرێکی شەق و شڕ، کە دیتمان تاژیەک لەوێوە خۆی کرد بە ژوورا. دنیـا تەڕی و قوڕی بوو. خۆمان بە قوڕی حەوشە، چەپەرمان کونبڕ کـرد. داری تـەڕی سـۆپەمان بـە بەرەوە هەڵچنی. ڕایەخمان لباد و پڕ لە ئەسپێ بوو؛ هێندەمان «دێ.دێ.تێ» پێـوە کـرد، پێـت لێدەنا تۆز هەڵدەستا. پاش دوو ڕۆژ میرزا ڕەحمان یەک باری کوتـەکی کتـێبی بـۆ ناردین کـە وەڕەز نەبین. کتێبی چۆن؟ هەر لە تالیفاتی مارکس و ئینگلسەوە تا «خـەباتی مـن»ی هێتلـەر، لەحەدیس و شەرعەوە تا تەرجەمەی کتێبی بێ شـەرمانەی بـازاڕی «سـان دۆنی» پاریـسی، تـا کەراماتی شێخ حیسامەدین! خولاسە ئەوەندەی دژ لێک کۆ کردبۆوە کە باسی نەکرێ.

ڕۆژانە من و هەمزە بە تفەنگێکی تاپڕی شێخەوە دەچووینە ڕاو، سوێسکە و کۆتر و کەومان ڕاو دەکرد. قزلجی لە ماڵەوە کتێبی دەخوێندەوە. شـەو حاسـڵی ڕاومـان دەخـوارد و گوێمـان لـە قزلجی دەگرت کە وەک حیکایەتخوانی لە زەبر، چی خوێندبۆوە دەیگێڕاوە.

شەوێک قزلجی لە مەلا عەولای پرسی:

– ئەگەر کەرێک زۆریش تێر بێ، وێنجەی تەڕی بۆ بەرن نایخوا؟

– جا ئەوە پرسیاری دەوێ؟

– دە بڕوانە لەم کتێبەدا دەڵێ: شێخ حیسامەدین چوبووە باغێک، کەرێک لەوێ بەسـترابۆوە. فەرمووی ئەو کەرە دەڵێ برسیمە. وێنجەیان بۆ برد خواردی!

گوتی: چ سەگبابێک نووسیویە؟
- خەلیفە مەحموود.
- جنێو بە خەلیفە نادەم، بەڵام قسێکی بێتامە!
ڕۆژێک دەگەڵ هەمزە لە سەر گردێکەوە بەرازێکمان لە قامیشەڵانێکدا بە دی کرد. تاپڕمان پێ بوو. وتم: با بۆی بچین!
- بەراز خەتەرە!
- نەخێر، دەیکوژین.
پاش مقۆمقۆیەکی زۆر، پێک هاتین. هەمزە بە قریوە و هەرا و من بە تاپڕ ڕیسکمان کرد و پەلامارمان برد. کەچی بەراز بە کۆلکە سووتاوێک دەرچوو!
ڕۆژێک کە نەدەچووینە ڕاو، لە سەربانی مزگەوت ڕاوێچکەمان دەکرد و گوێمان لە خەڵکی گوند دەگرت. «کوێخا تەوفیق» عاقڵمەندی دێ بوو؛ چەکداری عوسمانی کردبوو؛ لە شەڕی «بەسرا» بەشدار ببوو. ڕێی بە نوون دەگوت. باسی شەڕی دەگێڕاوە کە بە سەرەنێزە کراوە، دەیگوت: سوڵتان عەبدولحەمید! خوا غەنیقی نەحمەتت کا! تۆ ئەگەن بەغدات هەبوو، بەسنات بۆچبوو؟ ئەو هەموو گەنجەت بە سونگی تاق بە کوشتن دا!
جارێک قاو داکەوت خەلیفەی شێخ حەسەنی قەرەچێوانی بەڕێوەیە. لای وێڵەدەر ڕێویەک بەرەوپیری هاتووە، دەروێش خەریک بوون بۆی بچن بیگرن، خەلیفە فەرموویە لێیگەڕێن. ڕێوی ئاوزەنگی خەلیفەی ماچ کردووە و سەری پێدا ساویوە! خەلیفە دەستی بە سەری داهێناوە و فەرموویە: «ئەوا کردمی بە خەلیفەی ڕێوی ئەو ناوە، تۆ تۆبەیان دادە!» و بەرەڵای کردووە. بوو بە قریوە: ئای لەو پیاوە ممبارەکە! ئای خۆزگە بەو ڕێویە بەهەشتییە! زۆر گەرم داهاتبوون و کوێخا تەوفیق لە گشتیان زیاتر. «حاجی قادری کۆیی» دەڵێ:

سۆفی وەک تەشنە بوو لە زیکری هەتاو — هەموو دینی دەدا بە کاسێک ئاو
شیعە وەک تەشنە بوو لە سینە زەدەن — بە دوو قەترەی دەدا حوسێن و حەسەن

خەڵکی سیتەک هەموو بژیوی ساڵیان لە سەر دار فرۆشتن و ڕاوە ڕێوی بوو. لە تەنیشت مام کوێخاوە دانیشتم:
- خەبەر چییە؟
- چۆن تۆ باسی خەلیفە و خەلیفە ڕێوی نابیسی؟ بە خوا ئەبێ خۆمان ساز کەین خزمەتێکی باشی ئەم خەلیفە و دەروێشانە بکەین.
- کوێخا گیان! تا ئێستا خەلیفە ڕێوی هەموو ڕێویەکانی شاربازێری کردۆتە دەروێش. بە خوا هەرچی ڕێوی بکوژێ، ئەچێتە جەحەندەم. بەم خەڵکە بفەرموو لە ڕاوەڕێوی دەس هەڵگرن.
کوێخا تاسێکی بردەوە، بانگی کرد:
- کوڕە وەرن، هەی بکەم بە کنگی باوە خەلیفەوە! خۆ نابێ ڕاوەڕێوی بکەین!
- دیسان غەڵبە غەڵب دامەزرایەوە. بە کۆمەڵ دوای خۆم دان بۆ لای شێخ لەتیف کە ئەوسا لە سیتەک بوو:
- یا شێخ! خۆت دەزانی ئەم شاربازێڕە پاوانی تەریقەتی کاک ئەحمەدی شێخە. خەلیفەی گەرمیانی حەقی چییە ئاسۆگ بپەڕێنێ و مرید لە ئێوە داگیر کا؟
شێخ گەرم داهات:



- دادەی سوار! سوار بن ئەم باوەحیزە بەرەو شارەزوور بڕەتێنن!
مەلا شێخ نووری -کە باسی کرا- تیتوولە شالێکی سەیدانەی بە دەوری ورگیدا هێنابوو؛ دەتگوت کەمبەری دەوری دەهۆڵە. لاقی کورت، سەر درێژۆکە، لیچشۆڕ، هەر مشەی دەهات. ژنێکی زۆر لەبار و قەدباریک و بەناز و نووزی - مارە بە جاش- لە خۆی مارە کردبوو؛ تەلاقی نەدابۆوە. ژن شارستانی و خوێندەوار و تووشی ببوو بەو عەلامەتەوە و لە سیتەک دەژیا. خواخوای بوو مەلای تووڕە کا و تەلاق بدرێ. خەلکی دێ کە دەیانگوت بلح و سووکە، مەلا دەیفەرموو: قوربان! ئەم ژنەی منە خۆنگەوارەیە! قورعان لە سینگەیە! چونکە مەلا بوو، تێی نیشانەی مێوینەی عارەبی دەخستە سەر وشەی کوردیش!
ڕۆژێک زۆر بە شپرزەیی هات و گوتی:
- مەلا محەممەد، مەلاژن نەخۆشە و تۆی دەوێ کە دەرمانی کەی!
- مامۆستا من حەکیم نیم.
- بە خوا ئەلێ ئەبێ هەر بێ.
مەلاژن لە سەر جێگە کەوتبوو؛ سنگ بەرەلا. دەستی گرتم و لەسەر مەمکی دانا. زانیم داوە و بۆ منی ناوەتەوە. هاتمەوە و دوو بنێشتی ڕەوانیم بۆ نارد. مەلاژن لە سایەی من ساغ بۆوە و ناوم لە دێدا بە حەکیم زڕا. جا وەرە و سوێند بخۆ کە حەکیم نیم. «ئەی بۆچی مەلاژنت چا کردەوە؟» تا خۆم لە مەلاژن و سیتەکیان ڕزگار کرد، شەیتان گوتی چەق!
جارێ شێخ لەتیف هەلیپێچا کە ئەم ژنە تەلاق بدا؛ بۆ ئەو نابێ. لە وەراما دەیگوت: قوربان! من تەلاقی بەم و بچێ شوو بە نامەحرەمێ بکا؟ ئەمە چۆن ئەبێ؟!
پێم گوت: مامۆستا ئەو ورگ و گیپالەی تۆ بۆ خەلیفەتی دەنالێ.
گوتی: خۆ ئەم گەوادیەشم کردووە! شەش مانگ خەلیفەی سەید بووم. من شەشسەد تمەنم بۆ کۆ کردنەوە؛ ئەو سێ تمەنی دامێ، وازم لێ هێنا!
نانمان هەبوو؛ پێخورمان کەم بوو؛ ماست هەر دەس نەدەکەوت. ڕۆژێک دەگەل قزلجی لە سەر مانای شیعرێک کێشەمان بوو، قزلجی گوتی: بە ماست، بە مریشک سوێند ئەخۆم قسەی من ڕاستە!
- یانی چی؟
- ئاخر ئەگەر ئەوانە موقەددەس نین، بۆ کەس نایانخوا؟!
شێخ لەتیف حەفتا گوندی دەخوارد؛ بەلام هەمیشە قەرزار، نێو مال ڕووت و بێ فەڕش و لێفە، لە پێخۆردا ناساز، تا خواش حەز کا دلاوا و میوان دۆست، تا خواش حەز بکا بێ سەلیقە و لە کار نەزان. زۆر جار فزوولی دنەی دەدام و لۆمەم دەکرد:
- ئاخر یا شێخ! تۆ ئەو هەموو خەلکە دەڕووتێنییەوە، هەموو داهاتت چەند نۆکەرێکی شەلاتی دەیدزن. تۆ نابێ پێودانێک بۆ خۆت دانێی؟
دەیگوت: ئێمە بەرەی کاک ئەحمەد پێمانەوە نایە ڕێکوپێک بین؛ مالی شێخ مەحموودیش وەک مالی من وایە!
زۆر بە ناشکوری نالێم، لەم کوردستانەی ئێمەدا گەورەیی بە میراتە نەک بە هونەر و جەوهەر. عەولادی کاک ئەحمەدی شێخ تا دنیا دنیایە لە خەلکی‌تر پایەبەرزترن؛ نابێ گوێ بدرێتە زانین و هونەریان. جا چونکە کوڕی گەورەمالان لەلە و نۆکەر بەخێویان دەکەن، بە ئارەزووی خۆیان

ڕایاندێنن کە قازانجی ئەوانی تێدابێ. زۆربەی لەلە و نۆکەرەکانیش لە ئاکاردا پاک نین. زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ کوڕی پیاوی گەورە نالەبار هەڵنەکەون. ماڵە سەید تەها، عەولادی شێخی بورهان دوو نموونەن. هونەری شێخ لەتیف هەر ئەوە بوو کوڕی شێخ مەحموودە و بەس!

هەر لە سیتەک، قازی کاکە حەمەی بۆکانیشمان هاتە لا و لە ئێران ڕایکردبوو؛ تەواو پێی حەساینەوە. زۆر زانا، زۆر قسەخۆش و ڕووخۆش، تا خواش حەز کا ترسەنۆک. بە گشتی بەرەی ماڵە قزلجی هەر سەریان لە هێلکە جووڵایەوە عالمن. هەموویان زیرەکی بێهاوتان. بەڵام هەموویان ترسەنۆکێک خولقاون کە ناوێرن تەنانەت هونەر و جەوهەری خۆیان دەرخەن. «تورجانیزادە»، «محەممەدی قزلجی»، «قازی کاکە حەمە»، «حەسەنی قزلجی» نموونەی ئەو ترسە لە ڕادە بەدەرەن. هەر کەسیتر دە یەکی ئەوان زانا با، ناوبانگی دەنگی دەداوە؛ بەڵام ترسی وا بە تەوەژم ڕێگەی خۆدەرخستنی لێ بریون. جارێک شێخ لەتیف هاتبووە سەردانمان لە سیتەک. کاتێ سوار ببوو، دەڕۆیشت و ئێمە بەڕێمان دەکرد. «قازی کاکە حەمە» لە ڕیز دەرکەوت و چۆکی دادا و دەستی بە ئەژنۆی ئەسپی شێخ گرت. شێخ لەتیف بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- مامۆستا چیت لێقەوماوە؟

- یا شێخ دەترسم دوای تۆ سی پۆلیس بێن بمگرن!

- جا بۆ سی؟ بۆ بیست و هەشت یان سی و دوو نەبن؟

- قوربان لێرە دەترسم؛ بمنێرە لای شێخ مەحموود.

قازی بە جێی هێشتین و ئێمە لە خەتەردا ماینەوە!

قزلجی و من و لە بیرم نەماوە کێیتریش - پێم وایە هەمزەی سلەماناغا بوو- ناوی خۆمان گۆڕی. قزلجی ناوی «سەعید ڕەحیم» و من «عەزیز قادر»م هەڵبژارد و شێخ لە «چوارتا» پێناسی عیراقی بۆ وەرگرتین و بووینە عیراقی و ترس و لەرزمان لە گرتن بە سەر چوو.

لە سایەی ڕاوی هەموو ڕۆژەوە دەگەڵ هەمزە، ببووینە پیادەیەکی وا قۆچاغ تاژیمان نەدەگەیشتێ. جارێ بە غاری بێوچان لە سیتەکەوە بە هەورازی «هەرووتە»دا سەرکەوتین. ڕۆژێک سەر لە ئێوارە لە قەدی چیای «کورەکاژاو» حەیوانە کێویەکمان بەدی کرد. دامەزراین کە بیکوژین؛ کەچی مەعلووم بوو کە ئەویش ڕاوکەرێکی کولەباڵ لە بەرە و ئێمەی بە حەیوان زانیوە و لێمان دامەزراوە.

دەڵێن جارێک چەند مەلایەک لە دم چوومی «کەلوێ» چوونە سەر پێشاو کە دەسنوێژ بگرن؛ کابرایەک لای وابووە پۆلە کەلکن و تفەنگی پێوە ناون. ئێمەش وامان بە سەر هات.

لە بەهارا شێخ بە حەلاوی کارەکەریەوە - بۆ ڕاوە کەو- هاتە سیتەک. کەیفمان ساز بوو. دەگەڵ شێخدا شەو بە کێو لە ڕاو بووین. کاتێ لە بەغدا دەژیام دەگەڵ قزلجی -کە لە سولەیمانی بوو- دوو پارچە شیعرمان پێک گۆڕیەوە، کە زۆر بە وردی ژیانی ئەو ڕۆژانەی شارباژێریان وێنە دەکیشا. بە داخەوە نەمماون و هەر ئەوەندەم لە بیر ماوە کە نووسیومە.

عەولا ناوێک لە سیتەک بوو، جگە لە ناوی ئاغا هیچ عەشتەبای شک نەدەبرد. هەمیشە دەست لە کەلەکەدا و بە فیزەوە دەیگوت: من جگە لەوە کە ئاغام، ڕەعیسولعوزەرای شێخ لەتیفم! نەوسن و چەورەیەک بوو هەر مەپرسە. قادراغا ناوێک بۆی دانابوو:

ئەگەر نایناسن، ئاغا هەرووتە      لە تەقەی کەوگیر گوێی وەک کەر جووتە



ڕۆژێ بە فیزێکەوە دەگەڵ مەحموود بەگەکەی «بی‌بی‌جەک» هاتنە لام؛ گوتیان: ئاغا گەورەترە یان بەگ؟ گوتم: نازانم. «محێدین چنارەیی» درێژی لاواز، نۆکەری شێخ دەهات؛ عەولاغا بانگی کرد: محە ڕەق! تۆ خۆنگەواری. ئاغا گەورەترە یان بەگ؟

– بە خوا ئەمانە وەک سەگ و تاژی وان، فەرقێکیان ناکەم!

مەحموود بەگ گوتی: ساوەڵلا دەڵێن تاژی بەگزادەی سەگانە؛ من نەجیب‌ترم!

کابرایەکی وێڵی بێ ماڵی ڕووتەکە هەبوو، پەستەکێکی سەد پینەی درێژی تا سەر ئەژنۆی دەبەردا بوو. سەر و بنی قسەشی «زالیکە» بوو، خۆی بە پێغەمبەر دەزانی؛ شێخ گاڵتەی پێ دەکرد. گوتی: زالیکەی ماکەر! تۆ چۆن پێغەمبەرێکی؟

گوتی: پێغەمبەری کەرانم و خوا ناردوومیەتە سەر ئێوە!

لەو ڕۆژگارەدا باو باوی «خولەپیزە» بوو. ئازایەتیەکەی ببوە دڵخۆشکەرەی داخ لە دلان و بێچاران. لە ترسی سەربازی ڕایکردبوو؛ لە دەوڵەتی عیراق یاغی ببوو. خەڵکی شارباژێر بە دزیەوە یاریدەیان دەدا. عەلیاغا ناوێک هەبوو لە گوندی «ئەحمەداوا» زۆر زمان‌لووس و بە چاپ و گوپ؛ دەشیگوت دێبۆکریم. لە سولەیمانی پێنجسەد دیناری لە ئەستاندار ئەستاندبوو کە خولەپیزەی بۆ بکوژێ. عەلی‌ئاغا بە شات و شووت ئەو قسەی درکاندبوو. بەیانیەک خەبەریان هێنا کە شەو لە جێدا سەری ئاغا بڕاوە و کەس تا بەیانی دەرەنگ نەیزانیوە. خولەپیزە لەو یاخی بوونەیدا دووسەدوهەشتا پۆلیس و پتر لە سەد جاشی دەوڵەتی کوشت. لە ئاخریدا بە دەستی هاوکارێکی خۆفرۆش لە خەودا کوژرا. ئێستاش باسی ئازایەتی ئەو، چیرۆکی شەوانەی شارباژێریانە و بۆتە زاپاتایەک.

لەگەڵ شێخ هاتینەوە شار و ئاشناکانمان بە سەر کردنەوە و زۆریش دۆست و ئاشنای تازەمان بۆ پەیدا بوون. جگە لە میرزاوڕەحمان، ئەو کەسانەی ببوونە ناسیاومان و شیاوی باسن ئەمانەن:

١- **ڕەفیق چالاک**: موعەللیم، ئاهەنگساز، دەنگ‌خۆش، ئەدیب، هونەرپیشە و نومایشنامەنووس بوو. زۆر خۆشمان دەگەڵ ڕادەبوارد. لە ئاخریدا لە حیزبی کومۆنیست پلەی بەرز بۆوە و کرا بە ڕەئیسی حیزب و گیرا و بوو بە جاسووسی دەوڵەت و لە شۆڕشی بارزانیدا هاتە شۆڕش و لە ڕادیۆ کاری دەکرد و بە نەخۆشی دڵ مرد.

٢- **مەحموود ئەحمەد**: موعەللیم و هەمەکارەی شێخ لەتیف و خۆشەویستی شێخ مەحموود بوو. لە لایەن شێخ لەتیفەوە ناردرابووە باکۆیە؛ هاتبووە سابلاغ. دەگەڵ حەمەحوسێن‌خان قسەی تێک گیرابوو؛ دەرکرابو. هاتبۆوە سولەیمانی و گیرابوو. دایکی شێخ لەتیف (ئایشەخان) چووبووە تکایە کە بەری دەن و سوێندی خواردبوو کە مەحموود لە عیراق دەرنەکەوتووە و لە سەر مولکی ئێمە بووە. ئەستاندار گوتبووی: خانم فەرمایشتت لە سەر سەران؛ بەڵام مەحموود دوو شاهدی وا عادلی دەگەڵ خۆی هێناوە کە ڕەد ناکرێتەوە.

– ئەیڕۆ شایەتی چی؟ بە خوا درۆ دەکەن.

جووتێک چەکمەی لبادی فش‌وفۆڵی ساڵداتی ڕووسان و کلاوێکی کەوڵە بەرفی بە ئەستێرەی سوورەوە هێنابووە بەردەمی کە: بابە! ئەگەر ئەوە نیشانەی چوونە ڕووسیا نەبن لە کوێ دەس دەکەون؟! بەو حاڵەش بەریان دابوو.

٣- **قانیع**: هەر لە بۆکان بووم کە قانیع هاتبووە موکریان و بۆ یەکەم جار لە «قەرەگوێز» چاوم پێی کەوت. ماوەیەک پێکەوە بووین؛ گەڕاوە عیراق. لە زەمانی دەسەڵاتی کۆمەڵەدا هاتەوە

سابلاغ و دەگەڵ عەبدولقادر دەباغی ژووریکیان لە کاروانسەرای سەید عەلی گرتبوو. حەولی کاری دەدا و جوابیان دەکردەوە.

چوومە لای پێشەوا، داوای کارم بۆ قانیع کرد. فەرمووی: دەڵێن جاسووسی ئینگلیسە.

گوتم: ئەم کابرایە پتر لە شێست ساڵی عومرە، کەس نەیبیستووە تێری زگی نانی خواردبێ. ئاخر ئەو بەخششی جاسووسییەی بۆ کەنگێیە؟! بابە! من دەبمە زامن. ئەگەر خەیانەتی کرد من ئیعدام کەن.

پێشەوا فەرمووی تۆ ڕاست دەکەی؛ بەڵام ها بخوێنەوە: پتر لە سەد گوزارشی عیراقییەکانی ناو شۆڕش هاتبوو کە قانیع پیاو خراپە! فەرمووی: خۆیان پێکەوە خراپن...

ڕۆژێک نامەیەکی شاندام کە بۆ «عەلی مەدهۆش» ناوێکی، هەم خەیات و هەم شاعیری نوسیبوو: کاکە! ئێرە زۆر خۆشە، لایەکی ڕیشت لە سولەیمانی تاشیبێ لایەکی بێنە سابلاغ. چاوەڕێتم.

- قانیع ئەوە یانی چی؟

- ئەو حیزبابە هاتە بن کلیشەمەوە، وتی تۆ بچۆ؛ ئەگەر خۆشت لێگوزەرا خەبەر بنێرە منیش دێم. دەمەوێ ئەویش بە دەردی من بچێ و کاری دەس نەکەوێ!

ئێوارەیەک دەگەڵ قانیع چوومە مەنزلەکەی. لە دوورەوە بانگی کرد:

- عەولقادر ژوورەکە چاکەت دە.

- یانی چی؟

- گزکمان نییە بە چاکەت ئەیماڵین!

قانیع کرا بە موعەللیم لە «باڵانیش»؛ پاشان لە «کەلبەڕەزاخان». کە لێیان دەپرسی چ کارەی؟ دەیگوت: هام لە «سەگی پێشەوا»! ئەم گوندە ناوی کەلبەڕەزاخان بووە، «کەلب» سەگە و ڕەزاخانیش نەماوە.

ماڵ و منداڵیشی هێنا و ماوەیەک لە بۆکان ژیا. لەگەڵ تێکچوونی شۆڕش بەرەو عیراق ڕایکردبوو. کوڕێکی لە ڕێگە لێ ون ببوو، پاش ماوەیەک بۆیان هێنابۆوە.

لەم بەینەدا کە لە ئێران بوو، دیوانی شیعری -کە ناوی ڕاستی «دایکی کتێب» و ناوی ڕواڵەتی «باڵەکۆلارە» بوو- لای من دانابوو. دەگەڵ شیعرەکانی ئاشنا ببووم. قانیع لە سەیدەکانی «چۆڕ» بوو. باوکی شێخ بوو؛ کە مردووە لە فەقێیەتییەوە هێناویانەتەوە لە جێگەی باوکیان داناوە کە هیچ زەوقی لە سەر نەبووە. شەوانە، شێخانە زیکر و تالیلەی بۆ مریدان دامەزراندووە و هەر کە چاویان نووقاندووە بێ هەست بە جێی هێشتوون و چۆتەوە ماڵ و ملی لە چایی خواردنەوە ناوە و تاو- تاوە هاتووە زیکری بۆ تازە کردوونەوە و گەڕاوەتەوە و بە ئەقڵی دەروێشەکانی پێکەنیوە. دەروێش بەمەیان زانیوە و دەریانکردووە. لە کار گەڕاوە، بۆتە پۆلیس، بۆتە جەنگەڵبان، کراوەتە موعەللیمی دیانەت. زەمانێک لە ماڵی شێخ مەحموود ژیاوە و کاربەدەست بووە. هەرگیز لە عومریدا نان و دۆی نەگەیونە یەک و هەمیشە شڕ و وڕ ژیاوە. بەڵام ئەوەندەی ئەو گاڵتەی بە خەڵک کردووە و ئەوەندەی ئەو لە عومری خۆیدا پێکەنیوە، باوەڕ ناکەم بۆ هیچ شازادەیەکی بێکار ئەوە لوابێ. مەجلیسی لە شیعری خۆشتر بوو. شیعریشی -کە زۆر بە زمانێکی سادە و شارەزووریانە بوو- یەکجار کاری کردبووە سەر چینی نەخوێندەوار و پتر لە هەر شاعیرێک کوردایەتی بڵاو کردۆتەوە. شیعرەکانی زۆربەیان خەمبارانە و داخ و ئاخ بۆ

حالی بندەستی و پەرێشانی کوردستانە؛ بەلام قسەکانی ئەوەندە قدیلکەدار بوون مردوویان دەخستە پێکەنین. شێخ و مەلا، ئاغا و خان، دەسەلاتدار و دەولەمەند لای ئەو گالتەجاڕ بوون و زمانەکەی لێبوە بەلا و لە هیچ کوێ دانەدەمەزرا. نەویستانی بە کافریان دەزانی و بەم تۆمەتەش پێکەنینی دەهات.

چەند نوکتەیەک لە قانیع دەگێڕمەوە کە دەزانم لە دیوانەکەی چاپ ناکرێن:

* شێخ مەحموود لە سیتەک میوانی شێخ لەتیفە. زۆر کەس لە بەغدا و شارەکانیترەوە هاتوونە لای. شەو دەبێ بە فڕان- فڕانی لێفە و زۆردار لە دەست بێزۆری دەڕفێنێ. ئەفەندیەکی زۆر بە شەرم و حەیا کە لای شێخ دانیشتووە و دەبینێ قانیع هەڵدەسووڕێ، بەسرتە دەڵێ:

- شێخ قانیع دەستم دامانت. منت لەبیر نەچێ.

- ئەفەندی ڕازیت تۆش وەک خۆم بی؟

- زۆرت مەمنوونم.

شەو درەنگێک لە کەلێنی درگاوە بە قامک ئیشارەتی بۆ دەکا. دەچنە بەر هەیوانی مزگەوت. دوو حەسیری بوریای درێژی لێیە، قانیع لە سەر یەکیان ڕادەکشێ.

- دەی ئەفەندی لوولم دە!

ئەفەندی لوولی دەدا تا ئەو سەر، لاق و مل بە دەرەوە و حەسیر دە زگ پێچراوە.

- تۆش ڕاوەستە بەلکو یەکێک بێتە میز کردن، بێژە لوولت بدات!

* جەنگەڵ بانە؛ گوتوویانە هەر کەس گوێ بەرازێک بەرێ بۆ دەولەت دووسەد فلسی دەدەنێ. قانیع شەش بەراز دەکوژێ، دوازدە گوێ دەباتە ئیدارەی فەرمانداری لە چوارتا.

- قوربان بفەرموو دوو دینار و چوارسەد فلسم بەنێ.

- کاورا هەروا گۆترەیە؟ بە چیت کوشتوون؟ کوا پاسی تفەنگەکەت؟ فیشەکت لە کوێ هێنا؟

- قوربان! مودیربەگ! کوشتنی چی و تفەنگی چی و پاسی چی؟ من مەلادیم و ئەم گوێ بەرازانەیان بە زەکات و سەرفیترە داومەتێ. خوا خێریان بنووسێ!

پۆلیسێک بە سەرا دێت و دەڵێ: شێخ قانیع ماندوو نەبی.

مودیر دەڵێ: تۆ کە قانیعی بۆ دەنگ ناکەی؟

- جەنابی مودیر خەریک بووی گوێبەرازەکانم بخۆی!

* کاورایەک هاوار بۆ شێخ مەحموود دێنێ: قوربان! مار وە کوڕمیەوە داوە؛ نان بجاوە با خاسی کاتەوە.

قانیع هەڵدەداتێ: باوەحیز! نوشتەی ماری ئەوێ و نانی خۆشی نەهاوردووە شێخ بۆی بجاوێ؛ ئەشێ لە نانی خۆی کەم کاتەوە!

* ڕۆژێک شێخ مەحموود لای ئاغاوەتی میوانی باسی تاژیەک دەکا کە نازانم دەشگاتە کەروێشک، بۆچی نایگرێ. قانیع دەڵێ: قوربان! ئەمر بکە کەروێشکێکی ساغت بۆ بێنن. نانێکی لە پشت بەستە؛ ئەو تاژیەی بەردە. بە هەوای نان دەیگرێ و ئیتر هەر کەروێشکێکی دیت وادەزانێ نانی بە سەر پشتەوەیە و ڕزگاری ناکا! شێخ لە سەر ئەوە دەریدەکا.

* قانیع و فەقێیەک لە مزگەوتی دێیەکن. حاجییەک تۆپێک خام بۆ بەرمالی مزگەوت دەکرێ. قانیع دەرفەت دێنێ و بە فەقێ دەڵێ: ئەم مزگەوتە چەند ساڵە بنیات نراوە؟

- سەد ساڵ.

- چەند ساڵە ڕووخاوە و بە مردوو حەساوە؟
- چووزانم، پەنجا ساڵە.
- خاسە، پازدە ساڵ منداڵ و نابالغ بووە، ئەمێنێتەوە سی و پەنج ساڵ، خۆ ئیسقاتی بۆ نەکراوە!

بەرماڵ دەپێچێتەوە و سی و پێنج جار دەڵێ: ئەم بەرماڵەم دا بە تۆ لە کەفارەتی ئەو تڕ و تسانە و درۆیانەی لادێی لەم مزگەوتەدا کەندوویانە و کردوویانە. بڵێ قبووڵم کرد و دامەوە بە خۆت! بەرماڵ لەت دەکەن و دەیکەنە کراس و دەرپێ. لەسەر ئەمەش لە دێ دەری‌دەکەن.

* مامۆستای دینە لە گوندێک، بە منالان دەڵێ: کوڕم! ئەگەر بازڕەس هات و باسی دروست بوونی خەلکی سەرزەوی پرسی، بلێن ئادەم لەقوڕ دروست کراوە، دارە سیواکێکی لە کوونگی خراوە تا کونەکەی وێک نەکەوێتەوە. کاتێ وشک بۆتەوە داریان ڕاکێشاوە، دار گیر نەبووە چۆتە لای خودا بۆ شکایەت: خوایە بۆ کردووتمە گاڵتەجاڕی داران؟ خوا فەرموویە: خەم مەخۆ، وا دەکەم موسلمانان ڕۆژی پێنج جار بتخەنە دەمیانەوە! بازڕەس کە گوێی لەم جوابە دەبێ دەڵێ:
- ئەوە لە کام کتێب دایە؟

قانیع دەڵێ: قوربان «قصص الانبیاء» نووسیویە.
- کە وابێ گاڵتە بە دەوڵەت دەکەی؛ یاڵلا بۆ دەرەوە!

* کە لە سابلاغ گەڕابۆوە، کابرایەک نیوە ئاشێکی دابوویە؛ ببوە ئاشەوان. لە سەر جادەی گشتی تابلۆی نوسیبوو: بۆ ئاشی قانیع. تابلۆی بە داری دەوری ئاشدا چەسپاندبوو: ئاشێر لێرە دادەنیشن، کەرەکان لەم بن دارە مۆڵ دەخۆن. شێخ حەمەدەمینی خاوەن ئاش ڕۆژێک دەچێتە سەردانی قانیع و چاوەنۆڕە ببینێ. قانیع لە ئاش دێتە دەر و لە قاقا دەدا.
- بۆ پێدەکەنی؟
- یا شێخ خۆ تۆ خوێندەواری، لە جێی کەران مۆڵت خواردووە!
- بە خوا کەسێک هەواڵی قانیع بێ هەر مۆڵگەی کەری ڕەوایە!

نیوەئاشی لێ سێندرایەوە!

* شۆڕشی کوردی عیراق دەستی پێ کردبوو. ڕۆژێک قانیع دەچێتە سەیری خۆپیشاندانێکی گەورە لە سولەیمانی. وتاربێژێک دەنەڕێنێ:
- بە شانازییەوە ئەم شۆڕشە لەسەر شانی ڕانندە و کۆمەگ ڕانندە پێک هاتووە.

قانیع دەست بلیند دەکا:
- مامۆستا کە وا بێ مەکتەبی سیاسی ها لە گاراجی عەبدە!

لە سەر ئەوە برایم ئەحمەد لە عیراقی دەرکرد و لە مەریوان گرتیان و بردیانە تاران و تا دەرەنگ نەهاتەوە عیراق.

ئێستاش هەر بە داخەوەم کە نەیانهێشت «پیرەمێرد» و «فایق بێکەس» ببینم. دەیانگوت فایق سەرخۆشی زمانشڕە و ڕاستیت لێ دەڵێ. پیرەمێردیش خۆ دیارە جاسووسە!

پیرەمێرد ڕۆژنامەی ژینی دەنووسی. بۆ یەکەم جار لە دنیادا و بۆ ئاخر جاریش ڕۆژنامەیەک لە ڕۆژگارێکدا چوار ژمارەی لێ‌چاپ دەکرا. چونکە ئیعلانی چوار ئیدارانی بلاو دەکردەوە. نە کەس دەیکڕی، نە کەس دەیوێرا بیفرۆشێ. گوناهیشی هەر ئەوە بوو کە دەیگوت با بە دڵ کورد بین و کومۆنیست نەبین. جێژنی نەورۆزیشی دەگرت کە بە لای کومۆنیستانەوە کفر بوو.

فایق بێکەسی شاعیر زەلامێکی ورگن بوو؛ ملی نەبوو. شەوانە نەیدەتوانی بە ڕاکشانەوە بخەوێ. هەر تاکە لێفەیەکیشیان هەبوو. یان دەبوو فایق لە سەر کورسی دانیشێ و بە شانیدا بدا، یان دەبوو ژن و مندالی پێ بخەون. هەموو شەو چەند لاوێکی ڕێکوپێک دەچوونە بەر مالی فایق تا گوێ لە شەڕەجنێوی فایق و ژنەکەی بگرن لە سەر لێفە...

جارێک شێخ لەتیف دەگەڵ خۆیدا بردمیە گوندێک بە ناوی «چوارتاق». ئاویان بە کوندە لە عەربەتەوە دەهێنا بۆ خواردنەوە و مەشکە. حیسابم کردبوو کاروانەئاوێک لە سەعاتێکی پتر دەخایاند. شێخ هەڵیپێچان کە سەد دینار پووشانەم بدەنێ. هەر چەند ژن گریان و پیاو هاواریان کرد کە نە پوولمان بۆ هەڵدەسووڕێ، نە پووشانەکەش ئەوەندە دەکا، قامچی نۆکەران وەکار کەوت و سەد دینار کۆ کرایەوە و شەو گۆشتی مەڕی برژاو خورا و هاتینەوە.

- یا شێخ ئەو سەد دینارەت چۆن وا بە پەلە و بۆچی ئەستاند؟

- کاکە! عەلی کەماڵ بەگی بەغدایی هاتۆتە سولەیمانی و دەعوەتی دەکەم!

زۆر کەسی دەگەڵ عەلی کەماڵ بانگ کردبوو. فایق بێکەس هات، هەر لە درگا بوو گوتیان ئەو سەگبابە مەجلیسەکە پیس دەکا. من لە پشت درگاوە لە مەجلیسەکەم دەڕوانی کە نەبینرێم. داوای شیعریان لە فایق کرد. لایلایەکەی خۆی خوێندەوە. لەپڕ دەگەڵ ڕەفیق چالاک کێشەیان لێ پەیدا بوو؛ ملیان لە شەڕەجوێن نا. ئەو هەموو مامۆستا و ئەفەندیە ماقوولانە لە سەر چالاکیان دەرکردەوە، کە جلکی جوانتر و بە دیمەن ڕێکوپێکتر بوو. نۆکەران فایقیان بە پالەپەستۆ وەدەر نا. وەک دەشزانین لە مەرگی فایق بێکەسدا هەر ئەوانەی دەستیان نەدەچووە گیرفانیان کە لێفەیەکی بۆ بکڕن، بە هەزاران دیناریان لە سەرەخۆشیەکەیدا خەرج کرد. پیرەمێردیش هەروەتر. ئێستاش هەر بۆی دەنووسن: «پیرەمێردی نەمر».

جارێک لە مەجەللەی «هەولێر»دا مەقالێکم نووسی کە: لە دوکانێکی بەغدا چەقەڵێکی موومیایی‌کراوم دیت؛ لە بنی نووسرابوو نرخی بیست و پێنج دینارە. مات مام: خوایە دەبێ ئەو چەقەڵە شاعیر بووبێ یان خزمایەتی دەگەڵ شاعیر هەبێ؟! پەنجا چەقەڵ بە زیندوویی کەس بە فلسێکی ناکڕێ، بە مردوویی نرخی بیست و پێنج هزار فلسە! مرادیشم هەر شاعیرانی کوردستان، وەک مەلا مارف و قانیع و فایق و پیرەمێرد و جگە لەوان بوو.

پیرەمێرد چاپخانەی خۆی هەبوو؛ لە مالی دنیاش ناساز نەبوو. هەموو سالان جێژنی نەورۆزی لە گردی مامەیارە دەگرت و لاوی کۆ دەکردنەوە و شیعر و وتاری تێدا دەگوترا و داوەتی جێژنە دەگیرا. کە کومۆنیستی پەرەی ساند نەیانهێشت نەورۆز بگرێ. مەقالێکی زۆر جوانی نووسیبوو؛ ئەوەم لە بیر ماوە کە لە پاش باسێکی جوانی نەورۆز نووسیبووی: بەلام ئەمسال لە سایەی حیزبی حیزبابەوە نەورۆزەکەمان لێ تال بوو!

زۆر کەس بە دایمی هاتوچۆی مالی شێخیان دەکرد. لەوانە دوو لاوی برا و زۆر نۆجوان و جوانچاک بوون کە شێخ زۆری خۆشدەویستن و بە گفتی سەعدی: «سەر و سیرێکی» دەگەلیان هەبوو. زۆر شتی‌تری پشتی پەردەشمان دەبیستەوە کە باسیان شیاوی گێڕانەوە نییە...

قزلجی و من هەردووکمان لەو ژیانە پەنابەریە وەڕەز ببووین؛ بڕیارم دا دوایی پێ بێنم. شێخ گوتی: مەڕۆ! من دوو گوندت تەسلیم دەکەم، بە سەریان ڕابگە.

- یا شێخ تۆ دەفەرمووی من دزی بکەم؟ بۆیە نەگەیوومە ئێرە. دەچمە بەغدا و کار دەکەم.

نامەیەکی بۆ عەلی کەماڵ بەگ نووسی کە ملیۆنێرێک بوو. نووسی کارم بداتێ. قزلجیش بەو هەوایە کە مام و ئامۆزای لە بەغدان، ملی دا و چووینە بەغدا. لە پێنج سەد تمەنەکە -کە دینار دوازدە تمەن بوو- شازدە دینارم مابوو. قزلجیش بیست دنیارێکی هەبوو. عارەبیمان نەدەزانی؛ بەڵام لە ترسان چووینە ئوتێلێک کە هیچ کوردی لێ نەبێ. شەو دەمانەویست شیو بخۆین، کابرای خاوەن ئوتێل -کە خۆی جەرگی برژاوی دەخوارد- حالی کردین کە ئێمەش وەک ئەو بکەین. جەرگیان بۆ هێناین. پاش تاوێک منداڵێکی چلکنی بۆرەلۆکە، دەتگوت مشکی چەورە و دە خاکە ڕەژێدا گەوزاوە، هات گوتی: کوا قاپەکان؟

- قاپی کێ؟ (خاوەن هوتێل پرسی)

- قاپی ئێرانییەکان!

وشەی «ئێرانی» لە قزلجی بوو بە عیزرایل: ئەوە جاسووسە و بە گرتمان دەدا!

- کاکە! هەر کەس عەرەب نەبێ بە ئێرانی ناوی دەبەن. ئەم هەتیوە پیسە چووزانێ جاسووس ماسووس چییە؟!

هەر چی کردی دەگەڵی نەڕۆیشتم کە جێگە بگۆڕین و ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت.

لە زەمانی ڕەزاخاندا کە چەند هاودڵێکی کورد بووین و دڵی خۆمان دەداوە، باس باسی عەلی کەماڵ بوو کە دەمانبیست شەوانە سەر لە ئوتێلی بەغدا دەدا، هەر کوردێکی دەسکەوێ یاریدەی دەدا و هێندەهێندە کوردپەروەرە. بە دڵی خۆشەوە نامەی شێخمان هەڵگرت و دەفتەری کەماڵبەگ بگرە و هاتم! زەلامێکی چاو هەڵپزاوی سوورە زرتە بوو. نامەی وەرگرت؛ بەر لەوە بیخوێنێتەوە بە تالییەوە گوتی: دەستم لێ هەڵناگرن! بابە من پووڵم لە کوێ بوو بیدەم بەو خەڵکە؟ بۆ ناڕۆنەوە سولەیمانی؟!

گوتم: جەناب نامەکەت نەخوێندۆتەوە؛ ئێمە سوالکەر نین. نووسراوە کارمان پێ بسپێری.

خوێندیەوە، گوتی: ناوێرم کارتان بدەمێ؛ ئێوە خەتەرن. بۆ خۆتان کار پەیدا کەن! من دەتوانم سێ دینارتان بدەمێ!

- جەناب! سێ دیناریش مەدە و خوداحافیز...

بەڵام نابێ جوانان بشکێنین: عەلی کەماڵ کۆنە ئەفسەری عوسمانی، مودیری ئەمنیەتی عیراق بووە. دەستی کردووە بە تیجارەت؛ بۆتە ملیۆنێر. زۆری یاریدەی حیزب و کۆمەڵانی ئازادیخوازی کورد کردووە. پووڵی بۆ شۆرشی مەلامستەفا ناردووە و زۆر دۆستی بووە. لە هەموو دەورانی پەرلەمانی عیراقدا وەکیلی سولەیمانیە بووە. مولکی زۆری لە دەوری شاری «کووت» دەبەر دەستا بوو. هەموو ساڵێک منداڵی فەقیری سولەیمانی بە جلک و کاغەز و قەڵەمی عەلی کەماڵ خوێندوویانە. منداڵی فەقیری شاری کووتیش -ئەگەرچی کورد نەبوون- هەروەتر. ئەمما هەولێر و کۆ و کەرکووک و شارەکانی کوردنشینی عیراق لەو خێراتە بێبەش بوون. پیاوێک بوو دەیزانی دەوڵەمەند دەبێ چ بکا و عەرەب گوتەنی: «لە کوێوە شان دەخورێ». لە سولەیمانیە هەڵیدەبژێرن؛ لە کووت لە کێشەی مولکدا یاریدەی دەدەن و قازانجی دوو سەرەیە. مانگی دە دیناری داوە گۆڤاری «گەلاوێژ» بەو شەرتە هەموو ژمارەیەک شتێکی دەربارەی پیاوەتی عەلی کەماڵ تێدابێ. بەڵام دوو ڕووتەی لێقەوماوی شۆرشی فەوتاوی قازی محەممەد و بارزانی (قزلجی و من) هەرچی دەگەڵیان بکرێ، بە فیرۆ دەڕوا و هەرگیز خێر ناداتەوە. بەڵام دیسان ئیدارە تەبلیغاتەکەی بلاویان کردبۆوە کە دوو کوردی ئێرانی لێقەوماو هاتنە لای کەماڵ بەگ؛

بڕیاری دا هەر مانگێ یەکێ پێنج دیناریان بداتێ. پیاوەتی ئاوا دەبێ!!
پەنامان بە مام و ئامۆزای قزلجی برد. ئامۆزاکەی جەمەنانێکی داینێ؛ مامیشی نسحەتی کردین ببینە واکسی لە بەغدا و ئیتر نەماندیتنەوە. با بۆ خۆمان حەولی کار بدەین. ئوتێل دەری‌نەدەهێنا؛ بەجێمان هێشت. کۆنە خانێک هەبوو بە ناوی «منزل السرور»، چەند وەتاغێکی شڕ و شەوێقی تێدابوو؛ وەتاغێکمان مانگی بە دینارێک گرت. دوو تەختی هەرزانی نووستن، مەنجەڵێکی ئەڵمونیۆم، دوو قاپ و کەوچکێک، کەتری و چادان و ئیستیکان، تاوەیەکی قوڕکێشی بۆ جل‌شوتنمان کڕی؛ دامەزراین. وەتاغەکانی تەنیشتمان هەر یەکەی یەکی لە ئێمە بەدبەخت‌تری تێدابوو. من کەرستەم لە بازاڕ دەکڕی و قزلجی ئاشپەز و چاپەز بوو. سەر و حەسیر و پەتووشمان هەبوو. بە قەولی قزلجی «سیرمان دەخوارد و زوڕنامان لێ دەدا». چێشتی هەرە خۆشمان یارەڵماسی و پیوازاو بوو.
هەر لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ، لە پاش نیوەڕۆ تا ئێوارە، سەر لە بەری جادە و بازاڕم دەپێوا؛ بە بەر هەموو دوکانانەوە ڕادەوەستام؛ بە ملکەچییەوە دەمپرسی: شوغڵ ماکو؟ (کارت نییە؟). بۆ کابرایەکی کەس نەناسی زمان‌نەزان کار کوا؟ بە ناهومێدی دەگەڕامەوە و تێرم گلەیی لە زەمانە دەکرد و لە خەمخانەدا کزوولە-کزوولە دەنووستین.
وەتاغەکەمان دیوارەکانی زۆریان قەڵش تێدابوو کە پڕ بوون لە مارمێلکەی ماڵی؛ کە بەغدایی پێیان دەڵێن: «بالداری سولەیمان». هاتوچۆی مارمێلکە بە دیواراندا ببوە ئاودەنگی خەمڕەوێنمان. جیرانێکی دیوار بە دیوارمان بوو بە ناوی «سالح ئەفەندی» پیرەمێردێکی بێکەس بوو؛ خۆی بە خودا دەزانی. ئەوەشمان بەوەدا بۆ دەرکەوت کە هەمیشە قورعانی دەخوێند؛ جار-جار سەرێکی بۆ بادەدا، لیچی لێ هەڵدەقرچاند، لەبەر خۆیەوە بە بۆڵە دەیگوت: با وابێ! دەمانپرسی: ها! سالح ئەفەندی؟ دەیگوت: لە بیرم نییە من وام گوتبێ؛ بە غەڵەتیان نووسیوە؛ بەڵام دەسەڵات چییە؟!
خانەکە هەر ئەو چەند وەتاغە شڕە نەبوو. شەوانە پتر لە سەد کەس پیاوی بێ جێگە، دەحەسارەکەیدا دەنووستن؛ شەوی بە بیست فلس. ئاویش لە بۆشکە دەکرا و بە دەستندە دەماندرایە. دوکانێکی کابرایەکی جوولەکەی «مەنشێ» ناویان نیشاندام کە خزمەتکار بۆ ماڵان دەگرێ. پەنام پێ برد. گوتی: نە دەتناسم، نە زمان دەزانی. ئەگەر هەر بتزانیبا قاوەی تاڵیش دروس کەی شتێک بوو. کاری تۆم نییە.
بەیانییەک بە قرپ و هۆڕی پێکەنینی قزلجی وەخەبەر هاتم:
- خێرە؟
- خەونم دیوە؛ کابرایەک لە خەوما گوتی: بۆ ناچنە مەرقەدی غەوس بۆ کار بپاڕێنەوە؟
قزلجیەک کە بە عومری خۆی عەقیدەی بەو شتانە نەبوو، لەو ناچارییەدا تەواو دڵگەرمی خەونەکەی بوو. چووینە زیارەتی غەوس و پاڕاینەوە؛ بەهرەی نەدا. چەند ڕۆژێکی پێ چوو؛ خەونێکی دیکەی دیبوو:
- کابرایەک لە خەوما گوتی: غەوس چکارەیە؟ بۆ ناچیە زیارەتی ئیمام مووسا کازم؟
ناچاری هەموو کار بە پیاو دەکا. چووینە کازمین و داوای کارمان کرد؛ بەڵام لە گەڕانەوەدا بیست فلسی ئوتووبووسمان نەبوو. بە پیادەیی گەڕاینەوە بەغدا. ئیمامیش وەک غەوس گووی بە کڵاوی نەپێواین.

گوتیان: «حەمە سەعید کانیمارانی» لە بەغدا دەخوێنێ. ئۆخەی! برادەرێکم پەیدا کرد کە لە سەفەری مەرگەوەڕ دەگەڵی بوومە ئاشنا و مانگێک لە سابلاغ میوانم بووە. بەپرسیاران دۆزیمەوە. دیتمی گریا... قەولی دا کارمان بۆ پەیدا کا. جارێک گوتی: ئاسنگەرێک دەناسم، تکام لێ کردووە؛ قەولی داوە بتکاتە شاگرد؛ بەلام تا شەش مانگ هیچت ناداتێ.

- برا گیان وا بکە ڕۆژێ دوو نانی وشکم بداتێ قبووڵمە.

- نانت داتێ؟!

بۆ خۆی کوڕە دەوڵەمەندێکی زۆر زل بوو؛ ئەوەندەی دەخۆ ڕانەدەدی بڵێ من دوو نانەکە دابین دەکەم. ئەو کارەشم بە نسیب نەبوو.

زۆر لە مێژ بوو شتێکی چەورمان نەخواردبوو. شەوێک کە بە خەیاباندا دەگەڕاین، دیتمان قاشە باینجانی ڕەش سوور دەکەنەوە؛ هێندێکمان کڕی و دە کاغەزمانەوە پێچا و هاتینەوە ماڵ کە چاشی بۆ لێنێین و ئەمشەو جەژنی بکەین! بەلام داخەکەم باینجان تاڵێک بوو لە قوزەڵقورت تاڵتر.

قزلجی و من دوو کراسمان دە بەردا بوو کە هەردووکیان یەخەیان لە پشتەوە زۆر شڕ ببوو. نەشماندەتوانی کراسە کۆنیش بکڕین. گوتمان با بچینە لای خەیاتێک یەخەکەمان بۆ وەرگێڕێ؛ بەلام سەودای دەگەڵ دەکەین، نابێ لە دە فلس زیاتر بدەین. هەر خەیاتێک چووین، بێ سەودا کردن دەریدەکردین: ئەوە کاری من نییە! کاکە با خەیاتێکی خوێڕیلەی بێکاری برسی پەیدا کەین. بە کۆلاناندا دەگەڕاین، عەرەبێکی عەگاڵ بە سەر لە پشت ماشینێکی خەیاتییەوە دانیشتبوو. بە ملکزی و مینگە- مینگ گوتمان: برا ئەو کراسەمان بۆ وەرگێڕە.

گوتی: بدەن!

- ئاخر چەندمان لێ دەستێنی؟

- ئێوە بێنن، دوایی پێتان دەڵێم.

- نا بە خوا پووڵمان نییە. ئیستا بڵێ چەندت دەوێ؟

- دە فلس بۆ هەر یەکیان.

- هەی ماڵت ئاوا!

یەخەی کراسی وەرگێڕا. دڕاوی لای ژوورەوەشی پینە کرد. دە بەرمان کردەوە. بیست فلسمان دەرێنا. گوتی: هیچم ناوێ، بەو شەرتەی هەر کارێکی واتان هەبوو بینەوە لام. من عەکسی جوانی خۆم لە ئێوەدا دیت.

- چۆن؟

لە نەجەف هاتمە بەغدا کار بکەم. دورمانی بە دەستم دەزانی. یەک فلسم دە گیرفاندا نەبوو. خودایە! لە کوێ بنووم؟ نان چۆن پەیدا کەم؟ پاش نوێژ بوو، بە بازاڕی ئەحمەدیدا بە خەیاتانەوە دەگەڕام. بە دوگمە و دڕاو درووننەوە بیست فلسم پەیدا کرد. چوومە مزگەوتی ئەحمەدی، لە سەر حەسیری بەر هەیوان بەردەمۆرەم دانا نوێژ بکەم، مجێور هات بەردەمۆرەکەی فڕێ دا و بە پالەپەستۆ دەریکردم. مەلای مزگەوت بەزەی پێمدا هات، خۆی لە مجێور توورە کرد؛ گوتی: کوڕم! بڕۆ نوێژی خۆت بکە. ئەگەر جێگەی خەویشت نییە شەوانە لە حەساری مزگەوت بخەوە. ڕۆژانە دەچوومە کار پەیدا کردن و پاش عەسر دەهاتمەوە حەوشی مزگەوت. پاش عەسر کە مزگەوت چۆڵ دەبوو، چارەگە قالبێکم سەهۆڵ بە بیست و پێنج فلس دەکڕی و دەمخستە

کووپەی ئاوخواردنەوە و کەس نەیدەزانی منم. ڕۆژێ سەهۆڵم خستە ناو کووپە، مەلا خۆی لێ گرتبووم، دیتی من ئەو کارە دەکەم. لە پاش جەماعەتی نوێژی شێوان گوتی: ئێوە چەند ساڵە لەم مزگەوتە نوێژ دەکەن قەت دەستتان بۆ گیرفانتان نەچووە سەهۆڵ بکڕن. ئەم کابرا غەریبە نەجەفییە کە لە حەسار دەنوێ، سەهۆڵاوی بۆ ئێوە ساز کردووە... ئیتر لەو ساوە لە بەر هەیوانی مزگەوت لە سەر حەسیر دەنوستم. جا ئێستا ڕەنگە ئێوە بە فەقیرم بزانن. نەخێر، ئەم دوکانەم هەیە؛ خانووبەرەشم لە شارۆکەی وەششاش کڕیوە؛ ژن و منداڵیشم هەیە و زۆر سازم. بەڵام ئێوە ئەو ڕۆژانەتان بیر خستمەوە.

ئیتر لەو ساوە تەواو ببوە دۆستمان و ئەگەر لە هەفتەدا جارێک سەرمان نەدابا، گلەی لێ دەکردین.

جارێکی‌تر حەمە سەعید گوتی: ئەگەر «عەنباری» دەکەن کارم بۆ دیتوونەوە. دیارەعەنباری یانێ «عەنبارداری» و زۆر کارێکی چاکە. بەڵێ زۆر مەمنوونین. بردنیە لای تاجرێک. تاجر تەلەفۆنی کرد و ئادرێسێکی داینێ کە بچن لای «ڕەشید جەودەت» عەمباری بکەن. چەند ئوتووبووسمان گۆڕی و نزیکەی چوار کیلۆمیتر بە جادەی خاکیدا بە پیادە ڕۆیشتین. گەیشتینە کارخانەیەکی سەهۆڵ و خۆمان ناساند کە ئێمەین تەلەفۆنمان بۆ کراوە. ڕەشیدی خاوەنی کارگە کوردێک بوو؛ قەدەرێک ڕوانیە سەر و سووکتمان و سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: برا عەنباڵی سەهۆڵ بار کردن کاری ئێوە نییە؛ وەرن! بردینیە سەیری حەمباڵەکان، لە ناو قوڕ و تەڕیدا تلیسابوونەوە، هەموو زەردی ڕەنگ تولخی بە کۆخەکۆخ.

گوتی: هەر سەعاتەی دەبێ کامیۆنێک بار کەن. شەو و ڕۆژ هیچیان لە بیست دەقیقە پتر ئیستراحەت ناکەن. هیچ کارگەرێک دوو مانگ بەرگە ناگرێ و دەمرێ و ئیدیکە پەیدا دەکەم. من دڵم بڕوا نادا ئێوە بکوژم.

من حیرس گرتمی، گوتم: هەر چەند عەنبارم بە عەنبارداری دەزانی بەلام ئەو حەماڵییەش دەکەم.

کابرا قبووڵی نەکرد و بەو ڕێگە دوورەدا هەناسەسارد گەڕاینەوە.

گوتیان جولەکەیەکی سابلاغی دەلالی بازاڕە و لە خانێکە. چوومە لای و دەردی بێکاریم لە لا هەڵڕشت.

- سابلاغیت؟

- بەڵێ.

دەبچۆ لای «منەشێ» بلێ «یەرمیا لاوی» ناردوومی.

- چوومە لای منەشێ، جوابی کردم.

- ئەو جاریش بچۆ...

«منەشێ» کە زانی «یەرمیا» ڕایسپاردووم، گوتی: ئەمڕۆ بیست‌وسێیە؛ سەری مانگ وەرە کارت بۆ پەیدا دەکەم. خەبەرەکەم بۆ یەرمیا هێنایەوە.

- باشە ڕاوەستە.

- کوڕە چۆن حەوت ڕۆژ ڕاوەستم؟ هەر ئێستا ئەوە لە برسان قۆڕەی زگمە، چوار فلس شک نابەم بیدەم بە نانێک.

- من خواردنت دەدەمێ.



- خوا بتهێڵێ؛ بەڵام بڕیارم داوە لە ڕەنجی شانی خۆم نەبێ نانی کەس نەخۆم.

هەرچی کردی و کڕاندی فایدەی نەبوو. پووڵی دەرێنا بمداتێ نەمویست، گوتی:

- دەسا بچۆ مەرقەدی غەوس، حوسێنی کەرەناچی ببینە و بڵێ یەرمیا ناردوومی؛ کارم بدەیە. کابرایەکی ڕیش سپی، لیباسی عارەبی، لە حەساری دیوەخانی نەقیبی غەوس لە سەر کورسییەک بەرانبەر بە قاوەجاخ قلیان ئاوی دەکێشا و لینگی لەسەر لینگی دانابوو. ئەسپاردەی یەرمیام پێگوت. گوتی دانیشە.

- چای بۆ بێنن!

- دەی مامە کارت هەیە بیکەم؟

- بەڵێ، من چیم کرد و چیم خوارد، تۆش وەک من. هەستە با حەسار ئاوپرژێن کەین.

نیوەڕۆ گۆشت و پلاو بە پێی فیلان بوو؛ زۆرمان لە بەر مایەوە. بە شەرمێکەوە گوتم: هەواڵێکم هەیە، دەتوانم تۆزێکی بۆ بەرم؟

- چۆن ناتوانی؟ هەموو ڕۆژ بۆی بەرە.

بە پلاوی ماڵە نەقیبەوە مژدەی کارم بۆ قزڵجی هێنا و گەڕامەوە سەر کار. هەر دڵەتەپەشم بوو کە نەوەکا ناهومێدم کەن و دەربکرێم.

نانی نیوەڕۆ و شەوم دابین بوو؛ بەڵام بەرچایی باسی نەبوو؛ پووڵیش نەبوو؛ نەشمدەکرا تا نیوەڕۆ هیچ نەخۆم. فکرێکم کردەوە: بەیانیان چوار فلسم دەدا بە خورما، هەم نان و هەم چا؛ تا نیوەڕۆ هەر دەمبەم دەهات. چابوو شوکور ئەو دەمە جگەرەم تەرک کردبوو؛ دەنا مەخسەرەی سەگم بە سەر دەهات.

مام حوسێن کۆنە سابلاغی بوو. زۆر لەمێژ ساڵ بوو لە زەمانی عوسمانیدا ببوە جەندرمە؛ ببوە قاوەچی. پاش هەڵگێڕ- وەرگێڕ کردنێکی زۆر جۆرە کاسبی، کەوتبووە ماڵی نەقیبان و ببوە سفرەچی. جا چونکە زۆر کاردارێکی لە مێژینەیان بوو، حورمەتێکی زۆری دەگیرا. بە نەقیبی غەوسی گوتبوو -کە ئەو دەم سەید عاسم بوو- ئەو کوڕە خزمە و زامنی دەکەم. ئەمینە با دەگەڵ من کار بکا. ژنەکەشی بێوەژنی ئەحمەداغا ناوێک و کچی فاتمە سووری دەفەزەنی سابلاغی بوو. کوڕێکی ئەحمەد ئاغاشی پێ بوو. منیشی وەک کوڕی خۆی تماشا دەکرد.

ڕۆژانە دەگەڵ مام حوسێن وەتاغمان دەماڵی و کاشیمان بە گونیەی تەڕ دەستڕیەوە و حەسارمان گەسک دەدا و ئاوپرژێنمان دەکرد. بۆ دانان و هەڵگرتنی نان و خوانی نەقیب و میوانان، مام حوسێن هەمەکارە بوو؛ منیش یاریدەم دەدا. شەوانە چێشت و نانی زۆر بەرماو دەمایەوە؛ مام حوسێن لە نێوان قاوەچی و خۆیدا بەشی دەکرد. کابرای قاوەچی ئەوی لە خۆی و ماڵی زیاد بوایە دەیفرۆشت. مام حوسێن بەشی زیادی خۆی دەدا بە فەقیران. لەو چێشتە زۆر و حەلال و زەلالەی کە بەرهەمی ئەرکدانم بوو، بەشی قزڵجیشم دەبرد کە هەر لە خانەکە مابوو. شەوانە هەر لە دیوەخانی نەقیب لە سەر نیمکەت دەنووستم. زۆر ماندوو دەبووم؛ بەڵام تەواو دڵم ڕەحەت بوو؛ کارم دەست کەوتبوو.

ئامۆزایەکی قزڵجی شیرەشوانەی هێنابووە! دوکانۆکێکی پەیدا کردبوو کە قزڵجی شەربەتی تێدا بفرۆشێ. بەختی قزڵجی، لە تەنیشت ئەو ئوتێلێک دروست دەکرا کە پێشی دوکانەکەی ئەو گیرابوو؛ کەسی پێدا ڕانەدەبرد. شەربەت گەرم دادەهات و سەهۆڵی تێ دەخرایەوە و بە نەفرۆشراوی دەمایەوە. ئەویش چی لێ پەیدا نەبوو.



ڕۆژێک لە چێشتەنگاودا چوومە لای قزلجی، بۆ هەوەڵجار دیتم گریابوو.

- خەبەر چییە؟

- کاکە ئەوە ژیان نییە؛ وەرە با بچینەوە سولەیمانی. هیچ نەبێ کوردستانە و ئاشنا و ڕۆشنایەکمان هەیە.

- تۆ خۆت دەزانی، بەڵام هەر گا بیستتەوە کەلاکێکی لە برسان مردوویان لە کۆڵانی بەغدا دیتۆتەوە، ئەوە بزانە منم. یان کار پەیدا دەکەم یان بە ناهومێدی سەر دەنێمەوە.

- ئێستا پووڵی قەتارم هەبا دەچوومەوە کوردستان.

دەست بەجێ چوومە هەڕاجەبازاڕ، تەختە تێلەکانی نووستنمان بەچوار دینار لە کابرایەک کڕیبوو، پێم گوت: بە چەندی لێم دەکڕیەوە؟

- سێ دینار، حەمبالیش لە سەر خۆم.

پووڵم لێ ساند و شووتیەکەم کڕی و دەگەڵ حەماڵ هاتمەوە و تەختەکانی برد. قزلجی بلیتی کڕی و ئێوارە لێم دوور کەوتەوە. وردە کەلوپەلم هێنا ماڵی مام حوسێن و بە تەنیا مامەوە.

ڕۆژێک گوتیان وەرە نەقیب بانگت دەکا. سەیرە فیرعەونێک بانگی مارمێلکەیەک بکا. چوومە خزمەتی. ڕاوەستابوو. دوازدە سەر حاجی کورد نیودایرە دەورەیان دابوو. نەقیب پرسی: ئەمەیە؟

حاجی یەک- یەک تماشایان کردم؛ گوتیان: نەخێر هەو نییە!

مام حوسێن کە لە پشت نەقیبەوە بوو، دەمدی زەرد هەڵگەڕاوە و زۆر پەرێشانە، ڕەنگی هاتەوە بەر و نەڕاندی:

- مامە نەقیب لە پاش سەید عەبدوڕحمان پیاویان لێ پەیدا نەبووە. هیچ شەرم نەیگرتی کوڕێکی کە من بوومە زامن و گوتوومە خزمی خۆمە بە دز بزانی؟ بە ڕاستی نەقیبێکی نامەردی! نەقیب زۆری دانەواند و عوزرخوایی لێ کرد و دڵی دایەوە تا خاوی کردەوە.

- مام حوسێن مەسەلە چییە؟

- کوڕە هەر خوا پاراستمی. ئەم دوازدە گوێرەکەیە دەچنە حەج. لە حەساری غەوس لە ژوورێکدا بوون. یەکێک چووە خزمەتی کردوون؛ شتی لە بازاڕ بۆ کڕیبوون. گوتووشیە من ناوم عەزیزە و خزمەتکاری دیوەخانی نەقیبم. پێی گوتوون: حاجی! خاولی ئیحرام لێرە بە پێنج دینارە و لە مەکە بە بیستی نادەن. سەر و پێنج دینار بدەن تا بۆتان بکڕم. ئێستاش ئەوە دەیکڕێ! شکایەتیان لە نەقیب کردووە. تۆش کە ناوت عەزیزە کەوتوویە بەر تۆمەت. دەمگوت کە من نەمناسیوە، چۆن گوتوومە خزمە و زامنی دەبم؟ بەڵام کە تۆ بێتاوان دەرچووی، کوڵ و کۆی خۆم بە نەقیبی ماکەر ڕژاند!

دوایی ڕوونمان کردەوە ئەو عەزیزەی منی لە باتیان بانگ کردبوو، عەزیز ناوێکی قەد بڵیندی شنۆییە بە ناوی کەلانتەر؛ گیرفانبڕێک بوو لە بەغدادا ناوی دەرکردبوو.

با بزانین نەقیب چییە؟ بە عارەبی «نەقیب» یانێ سەردەستە؛ «شەریف» یانێ سەید و عەولادی پێغەمبەر. بنەماڵەیەک لە بەغدا بە سەید و سەردەستەی سەیدان ناسراون و بە گەورەکەیان دەڵێن «نقیب‌الاشراف» واتا سەردەستەی سەیدان. ئەمانە دەڵێن ئێمە لە ئەولادی غەوسین. ئەگەرچی لە ڕاستیدا غەوس سەید نەبووە؛ بەڵام تاریخی دوای خۆی بە سەیدی حەسەنی داناوە. مەوقووفەجاتی بارەگای غەوس -لە مەزرا و دوکان و خانوو- لە ڕادە بەدەرە.

هەر چەند زۆریشیان وەچە لێ کەوتۆتەوە، هەموویان زۆر دەوڵەمەندی قورسن. جگە لە دارایی خۆشیان، پووڵی نەزر و ناو شباکی مەرقەد و خێری هێندی و کورد و عەرەبان بە لێشاوە. لەو نەقیبانەی ئەم چەرخە «سەید عەبدوڕەحمان» و «سەید مەحموود» و «سەید ئەحمەد»یان بەناوبانگ بوون.

ئەوسا کە من نۆکەری دیوەخانیان بووم، نەقیب «سەید عاسم» بوو. پیاوێکی زۆر جوان و بەسەروسیما و تەڕپۆش بوو. دەیانگوت نوێژ ناکا؛ بەلام هەموو ڕۆژی جومعان دەچووە نوێژی جومعە و هەژ-نۆ مەلای زگزلی فشوفۆڵی دەگەڵ خۆی دەهێناوە بۆ نەهار خواردن. دەشیانگوت هەموو شەو ئارەق دەخواتەوە و دەیانگوت و دەیانگوت... بەلام من ئەمانەم پێوە نەدیبوو. هێندە دەزانم کچ و کوڕیان لە هەموو کەس بێشەرمتر بوون. کچ نیوەڕووت و کوڕ کاکۆڵ لە فڕدراو، هەرچی پاکی و خۆپارێزی بوو ڕووی تێ نەکردبوون. تەنانەت جارێکیان کە لە بن مێزی نان خواردن نوستبووم، دیتم دوو لە کوڕە جحێڵەکان خەریکن پێکەوە بنووسێن؛ بەلام یەکیان گوتی: با لێرە بڕۆین نەوەک ئەو کوڕە بەخەبەر بێ...

سەید عەلی ناوێکیان هەبوو؛ چل ساڵێک عومری دەبوو. بەرگی شباکی غەوس -کە ماهووتی بە زێڕ چندراو بوو- ساڵەو ساڵ هێندوستانی دەیانگۆڕی؛ کۆنەکەشی بەشی سەید عەلی بوو کە پارچەی بارێکی بە حاجی و زیارەتکەران بوو متفەرک دەفرۆشرا. ژنەکەی دلپیسی لە سەید عەلی دەکرد. ئەو ساڵە شباک گوم ببوو. ڕۆژێک ژنەتیو ژنێکی بانگ کردبووە ماڵە خۆی کاری پێ سپاردبوو، بۆ خۆی چووبووە ماڵەکەی، پڕ و پێسکەی گەڕابوو. شباک کرابووە کراسی ژنەکە؛ کە ناوی «نووریە» بوو؛ باشیشیان نەدەگوت. بوو بە چەققە و شیڕە- شیڕێک، دەتگوت کاسەی قەرەچی ئاو بردوویە.

سەید عەلی سیلی هەبوو؛ مرد. لە وەتاغێکی بارەگادا ناشتیان و شباکێکیان لە سەر قوت کردەوە و هەر زیارەتکەرێک دەهاتە زیارەتی بارەگای غەوس، زیارەتی سەید عەلیشیان پێ دەکرد و زیارەتانەیەکیان لێوەردەگرت. خۆم سەید عاسمی ملیۆنێرم دیت کە سەربازانی هێندی لە لەشکری ئینگلیس دەوریان لێدابوو، پووڵیان دەدایە. ئیوا هەبوو چوار فلسی دەدایە. تەشەکورێکی لێ دەکرد و وەریدەگرت.

لە موکریان بیستبووم کە ئەگەر گۆشت بە بن سێبەری غەوسدا بڕوا ئاگر کاری لێناکا؛ بۆیە مردووان بەر لە ناشتن دەبەنە بەر سێبەری بارەگا تا ئاگری جەهەندەم نەتوانێ بیانسووتێنێ. تەنانەت جارێک دەگەڵ «تورجانیزادە» چوومە بەخێرهێنانەوەی «حاجی عەبدوڵلای تۆکمەچی» لە سابلاغ کە لە حەج دەهاتەوە. گوتی: لە بەغدا من و حاجی فلان چووین لە دوکانێک بۆرەکی زێڕتواندنەوەمان کڕی. هاتینەوە سابلاغ. بۆرەکی من کاری نەکرد، لام وابوو دەستمان براوە. چوومە لای هەواڵەکانم. گوتیان بۆرەکی ئێمە زۆر باشە. خۆ هی تۆش هەر لە قوتووەکەی ئێمە تێکرا. ئای دڵی خافڵ! وە بیرم هاتەوە کە لە زیارەتی غەوس دەرمانەکە دەبەر پشتێندم دابووە!

لەسەر ئەو باوەڕانە ڕۆژێک لە چاوشی شێخ، واتا کاربەدەستی بارەگام پرسی: ئایا ڕاستە گۆشت بکەوێتە بەر سێبەری مەرقەد ئاگر کاری لێ ناکا؟ زرتێکی زۆر زەلامی بۆ کێشام: کەرە! ڕۆژێ سی کیلۆ گۆشت دەکڕین و لە بەر سێبەری بارەگاوە دێتە ژوور و دەکرێتە شۆرباو و دەکولێندرێ! ئیتر نەموێرا باسی بۆرەکی حاجی عەولا بپرسم!

وە بیرم دەهاتەوە کەبەچکە خەلیفەیەکی باب مردوو، سەفەرێکی دە ڕۆژەی کرد و گوتی چوومە لای نەقیبی بەغدا کردمیە خەلیفە.

مانگی ڕەمەزان تێپەڕی و جێژن هات. مام حوسێن زۆر بە تووڕەیی هاتە لام گوتی:

- کوڕە ئەو دەوڵەمەندە زەلامە! گوتم: ئەم کوڕەمان دوو مانگە لە لاتە. تۆ بۆ حقووقێکی نادەیەی؟ چارەگە دینارێکی دامێ کە بە جێژنانە بتدەمێ و گوتی: حقووق نییە؛ نان دەخوا بەسە!

چارەگە دینارم تووڕ هەڵدا و گوتم: لە لات نابێ.

- مام حوسێن من بە نانەزگ ڕازیم کار بکەم.

- نا، مەترسە! کارت هەر بۆ پەیدا دەکەم. کاری ئەو خوێڕییە مەکە!

لەو بەینەدا کە نۆکەری دیوەخان بووم، یەکێک هات گوتی: حوزنی موکریانی بیستوویە هەژار لێرەیە. حوزنی بە جاسووسی ئینگلیس ناوی زڕابوو؛ نەعووزوبیللا! مام حوسێن گوتی: شتی وا لێرە نییە. ڕۆژێکی دی -سەر لە ئێوارە- سەیدێکی ڕیش‌سپی تەنک، دەستەباڵای لاواز هاتە حەوشەی دیوەخان و قسەی دەگەڵ مام حوسێن کرد. مام حوسێن هات گوتی: ئەوە سەید حوسێن حوزنییە؛ دەیەوێ بتبینێ. چار نەمابوو. تەلەفۆنێکم لە دوکتور «جەعفەر محەممەد کەریم» کرد کە دەمناسی و ناوێ زۆر چاکی هەبوو. گوتی: سەید حوزنی پیاوی چاکە و دیتنی زیانێکی نییە. دەگەڵ حوزنی بوومە ئاشنا. ئێستاش لە بیرم ناچێ کە دیتمی، فرمێسک بە ڕیشەسپیە جوانەکەیدا هاتنە خوار... ئادریسی ڕۆژنامەی «دەنگی گیتی تازە»ی دامێ کە خۆی سەرمودیر و هاوکارێکی بە ناوی «حەمە عەلی بەگ» خەلکی سولەیمانی، سەرهەنگی بازنشستە هەبوو. جارجارە ئیجازەم لە مام حوسێن وەردەگرت دەچوومە لای. ئەو کابرا پیرە موحتەرەمە یەکپێ لە بەرم ڕاست دەبۆوە؛ دەیگوت: تۆ یادگاری جمهوری کوردستانی.

حوزنی لە گوندی «نیچکە»ی نزیک «بوغدەکەندی» سەر بە بۆکان هاتۆتە دنیاوە؛ کە ئێستا نیچکە نەماوە و زەمانی من شوێنەواری دێیەکە مابوو. باوکی لەو سەیدەکانی بوغدەکەندی و ناوی «سەید لەتیف» بووە و زوو مردووە و دایکی (خات سەلما) مێردی کردۆتەوە بە کابرایەکی ورمزیار کە «گیوی موکریانی» دەبێتە دایک برای حوزنی. هەر لە منداڵیەوە حوزنی پەڕەوازەی وڵاتان بووە: لە ئەستەمبووڵ فێری مۆرهەڵکەنی کراوە و بەو پیشەوە گەڕاوە. بۆتە سەیاح لە کوردستاندا. سەری لە کوردەکانی تورکیا و ئەرمەنستان و عیراق داوە و لە زەمانی فەرمانداری «سەید تەها» لە ڕەواندز دامەزراوە. بە سەلیقەی خۆی کەتە چاپخانەیەکی لێک ناوە. کلیشەی لە دار هەڵکەندووە و بۆ یەکەمجار لە کوردستانی عیراقدا نووسراوی بە کوردی بڵاو کردۆتەوە. لە زەمانی ڕەئیس ستادی «فایق کاکەمین»دا -کە کوردێک بووە- لە عیراق دەرکراوە. چۆتە شاری حەڵەب؛ لەوێش چاپخانەیەکی چکۆلەی دەست و پا کردووە و ملی لە کاری کوردایەتی ناوە. لە حەڵەبیش ئاویان دەبن کردووە و بێ دەرەتان ماوەتەوە. لە سەرەتای شەڕی ئاڵمان - کە فەڕانسە لە سووریە لە ڕێگەی گۆڤاری ڕووناهیەوە دڵی کوردیان خۆش دەکرد- ئینگلیس لە بەغدا بۆ کوردی‌زمانی خوێندەوار گەڕاون و داوایان لە حوزنی کردووە بێتەوە بەغدا و گۆڤاری «دەنگی گیتی تازە»یان بۆ بەڕێوە بەرێ. حوزنی لە «ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و عیراق» بە ناوی «عەلاقاتی عاممە» دەست بە کار بووە. لە ڕووپەڕێک و دواندا خەبەری شەڕ و لە پتر لە حەفتا ڕووپەڕدا فۆلکلۆری کۆنی کوردی زیندوو کردۆتەوە؛ شیعری شاعیرە باشەکانی لە چاپ

داوه. ئێستاش هەر کەس هەموو ژمارەکانی لابێ،زۆر بەختیاره و زۆر مەعلووماتی باشی لێ دەست دەکەوێ.

حوزنی لە کوردایەتیدا سووتابوو. دین و ئیمانی کوردستان و ئازادی کورد بوو. جسنی عارەبی زۆر ناخۆش دەویست. لاشی وابوو هەر بەلایەک لە دنیادا هەیە تاوانی ئینگلیسە. تەنانەت دەیگوت: بە دووری نازانم ستالین کاربەدەستی ئینگلیس بێ!

جارێ گوتم: تۆ سەیدی؛ دەبێ ڕەسەن عەرەب بی.

پێکەنی، گوتی: بیستم کە ئالمان لە خوێنەوە ڕەسەنی گەلان دەناسن. خوێنی خۆم نارد و جوابم بۆ هاتەوە کە تۆ ئارییایت. شوکور ئەم سەی سەیەم لە کۆڵ بۆوە!

جارێ گوتی: کوڕە سەیری کەریەتی من کە! لە گەشت و گوزارەکەم لە ناو کوردستانی ترکیەدا، شەوێک لە گوندێکی حەنەفی مەزەب لەسەر ئیمامی شافیعی -کە گوتم باشە- ئەوەندەیان دارکاری کردم، دوو ڕۆژ وەهۆش نەهاتمەوە. کەس نەیگوت تۆ کوردێکی، چت لە شافیعی داوە؟!

ئەوەندە گفت و لفت خۆش و ئاگادار بوو، پیاو حەزی دەکرد هەر گوێی بۆ ڕادێرێ. ڕۆژێک گوتی: بە داخەوە کورد چونکە هەمیشە ژێر چەپۆکە بوون، شاعیر و نووسەری گاڵتەچیمان لێ هەڵنەکەوتوون؛ کە گەپ و گاڵتەش بەشێکی گرینگە لە ئەدەبیاتدا. من باسی «مەلا حەسەنی دزلی»م بۆ کرد کە زۆر گاڵتەچی بووە و بە داخەوە لە برسان مردووە. نموونەی کردەی ئەو پیاوەی لێخواستم. شیعرێکم بۆ خوێندەوە کە لە مەریوانەوە بۆ فەقێیەکی برادەری خۆی بە ناوی «حەمەدەمین هەمەوەندی» بۆ شاری سابلاغی نووسیوە. من -وەک عادەتمە- لە خوێندنەوەی شیعری لەبەردا، چاو لە سەر یەک دادەنێم. لەو ناوەدا چاوم هەڵێنا: ئەو پیرە ڕیش‌سپییە بە دەست و پێ سەمای دەکرد. گوتی: پیاوێک دەنێرم کە بە دووی نووسراوی ئەو پیاوەدا بگەڕێ و لە ڕۆژنامەی دەنگی گیتی تازەدا بڵاوی دەکەمەوە؛ کە بە داخەوە مەرگ ڕێگەی نەدا. ئەمەش بڵێم کە لە پاش نەمانی شەڕ، گۆڤارەکە هەڵگیرا و ئیمتیازەکەیان دابوو بە حوزنی؛ بە ڕۆژنامەیەکی چوار لاپەڕی دەریدەکرد و ئەدەبیاتی کوردی تێدا دەنووسی.

شیعرەکان ئەوەندی لە بیرم ماون ئەمانەن:

ای عازم ساوجبلاغ! عرض سلام این حزین — برخوان برای آنکه نامش در دهانم انگبین
چابک همондی که او، در وقت غارت بارها — برکنده بزها پوست را، درویش‌ها را پوستین
از نام او پرسی اگر، احمد امین اسمش بود — اول محمد آمده، آخر نقیض لا امین
باری اگر مرسوله‌ای ننوشت سوی این طرف — منعش نباشد زان مکان،گر غافل است ازما چنین
شهر سیه‌چشمان وی همچون غزالان ختن — تعطیر ناف دلبرش چون نافەی آهوی چین
پیکان مژگان سیه، بر سینەی هر کس زنند — فوارەاش بالا رود، تا آسمان هفتمین
بەرخۆڵەٌ، دوو شحمةٌ، تاقانةٌ فی بلدة — قتالـةٌ بالغمزةٌ، با آن دو چشم نرگسین
آتش به جان‌ها افگنند، وقتی که چون کبک دری — آیند بیرون از حمام با آن خدود آتشین
پشمینه پوش اطلسی، زنگاریان طاوسی — جنبیدن دسمالشان گه بر یسار و گه یمین
لو عانق الانسان بالبنت التی من قربکم — صادر شود بی اختیار، از وی ریاح فا و سین (فس)
درویش‌های کولکنین، ریش نێری و زوڕنا کەپۆ — سەرچۆلەکەی،گون‌کوولەکە، مانندجامووس بطین
بینند چون آن لعبتان، چون دیوشان دربر کشند — با بۆلەبۆل و فیشە فیش، با لرفەلرف و ئاخنین

ڕەنگە چەند بەیتێکم لە بیر نەمابێ.

لە خۆشەویستی موکریان و تایبەتی سابلاغدا لە ڕادەی تیپەڕاندبوو. ڕۆژێک کە منی دەدواند و زۆر باسی سابلاغی کرد، محەممەد عەلیەکەی یاریدەری پرسی: مامۆستا وا دیارە تۆ خەڵکی سابلاغت زۆر خۆش دەوێ؟

گوتی: بەڵێ، سەگێکی سابلاغم لە کاکەحەمەدی شێخ خۆشتر دەوێ!

گوتم: کاکە حوزنی! چونکە کاری ئینگلیسانت کردووە، هەموو کەس بە جاسووس و خەتەرت ناو دەبا و منیش لام وابوو تووشم بی، دەمخۆی!

- خودا دەیزانێ، بەڵام لە عیراق دەرکرام پەنام بە عەلی کەماڵ برد کە زۆر دەستی دەڕۆیشت. لە گەرمای نیوەڕۆی چل و هەشت دەرەجەدا لە دەرگام دا، هاتە دەر:

- مامۆستا خێرە؟

- لە عیراق دەرمدەکەن.

- ڕاوەستە ئێستا دێم.

تاوێک لە بەر درگا وێستام. درگا کرایەوە. هەر نووسراوێکی بە دیاریم بۆ ناردبوو دە باوەشیدا بوو، لە بەر درگا هەڵیڕشت و دەرگای لە ڕوو پێوەدام. زۆر کەسی تری وەک ئەو، وەک ئەویان لەگەڵ کردم. کە بە ناوی کارمەندی ئینگلیسیان هاتوومەوە، ئێستا نە شەرم و نە حەیا، هەموو ئەو پیاوە زلە کوردانە فەخر دەکەن کە قسەیان لەگەڵ بکەم. بەدناویم لە ناو لاوە کوردەکانیش هەر ئەوەندەیە دەڵێم زگ‌ئێشەی بەتەنێتان نەبێ. ئێوە عاشقی ڕووس و ستالینن و مەعشووقە تفیشتان پێدا نادا. با بۆ بەرژەوەندی کوردستان خەبات بکەین و لە ڕێگەی ئازادیدا دەگەڵ شەیتانیش ببینە دۆست. با جگە لە ئازادی کورد کەس نەپەرستین...

لە ئاکاری شێخ مەحموود زۆر نارەحەت بوو، کە ئینگلیس کردیانە فەرمانڕەوای کوردستان؛ کەچی بە هەوای دین و دنەدانی تورکان، دەگەڵ ئینگلیس بە شەڕ دەهات؛ دەنا هەر وەک یاریدەی فەیسەڵیان دا و دەوڵەتی عیراقیان بۆ دامەزراند، ئەویشیان -کە جێگەی متمانە بوایە- دەکردە دەوڵەتۆکێک و لە مەسلەحەتیان بوو. دەیگوت: کاتێ خەبەری تێکچوونی کوردستانی موکریم بیست، زۆر بە تاڵی گلەم لە سەفیری ئینگلیس کرد. گوتی: حوزنی! ڕەفیقانی ئێران ڕاستیان کرد و ڕەفیقانی کورد درۆزن دەرچوون...

مەحموود ئەحمەد گوتی: خەریکن بمگرن و حقووقم ببڕن. دەگەڵم وەرە؛ حوزنی دەڵێن تۆی خۆش دەوێ. مەحموود وەک هەموو کوردێکی دیکە، جووتێک سمێڵی ستالینی و کراواتێکی سووری نیشانەی کومۆنیستی پێوە بوو. حوزنی زۆری بە خێراتن کرد و کە باسەکەم پێ گوت گوتی: باشە هەرچی لە دەستم بێ قوسوور ناکەم؛ بەڵام کاک مەحموود تۆ دەزانی عەرەب عەقڵیان لە چاودایە و لە مێشکدا نییە. ئەگەر دەکرێ تۆزێک سمێڵەکانت سووک بکە تا بتبەمە لای کاربەدەستان.

مەحموود خۆی لێ تووڕە کرد: جەناب تۆ جاهیلی! نازانی کومۆنیست چییە! من فەخر دەکەم کە بە کومۆنیستم بزانن!

حوزنی زۆر بە نەرمی گوتی: ڕاستە جاهیلم. تۆ دەتوانی بە زمانێکی سادە پێم بڵێی کومۆنیستی چی زۆر باشە؟

- تۆ نازانی لە ڕووسیە هەموو کەس نان و کاری دەدرێتێ؟



- کاکە مەحموود گیان! خۆ زیندانی بەغدایش نان و کاری تەواویان هەیە!
کاری مەحموودی هاسان جێبەجێ کرد و زۆری مەمنوونی خۆی کرد.
جارێک باسی بەدفەڕی هێندێک نەجیمزادان بوو؛ حوزنی گوتی: من لە ئیدارەی گۆڤار بووم قەت نەچووبوومە سەفارەتی بریتانیا. تەلەفۆن کرا کە سەفیر دەیەوێ بتبینێ. بردمیە پەنایەک و بە سرتە گوتی: کوردێکی زۆر گرینگی ڕووسیەمان لە لایە؛ تۆ بیدوێنە و دڵخۆشی بدەوە.
لە ژوورێکی تایبەتی کوردەکەم دیت. خوایە من وەک ئەو کابرایە بناسم وایە.
- کاکە! ناوت بەخێر؟
- مامۆستا حوزنی! نامناسی؟ من عەمەراغام، نۆکەری حاجی سەید عەولا؛ چەندم چایی بۆ داناوی؟
- تۆ و ئێرە چی؟
- بەدبەختی. سەید پۆشۆی سەید تەها هەڵیفریواندم: وەرە دەتکەمە کوردی ڕووسیە و دەتبەم بۆ سەفیری بریتانیا و پوولێکی باشت دەست دەکەوێ. وا لێرە وەک حەپسی وام و ئەوا لە ترسانیش زراوم چووە. دەخیلە ڕزگارم کە!
سەفیر لە دەرێ دەهات و دەچوو؛ چاوەنۆڕی خەبەری خۆش بوو. نووک و بەدم بۆ گێڕایەوە. وەک بیست کەس قدیلکەی بدەن ملی لە پێکەنین نا: ئەو پۆشۆیە پتر لە بیست جاران دەستی بریوم؛ بەلام دیسان فایدەی لێدەبینم!
پوولێکم بۆ عەمەراغا ساند و ناردمەوە سنووری ئێران.
هەر حوزنی گێڕایەوە کە: لە هەولێر بووم. دەچوومە دیدەنی حاکمی ئینگلیس، مەلایەکی لەباری کەلەگەتم دیت لە دەرگای حاکم کز وێستابوو. گوتی: سەید توخوا وا بکە حاکم ببینم؛ چەند ڕۆژە ڕێم نادا.
حاکم لە جوابما گوتی: ئەوە مەلا خەلیلی گۆڕەمەرە؛ ئەوی پێمان سپاردبوو، باشی پێک نەهێنا؛ ئێستا داوای پوول دەکا! پێی بڵێ ئەگەر خۆی نەشارێتەوە پۆلیسی عیراق دەیگرن.
ئەوسا تێگەیشتم کە ئەو پیاوە ممبارەکەی ئەو هەموو مەنگوڕەی بە کوژ دا و ماڵوێران کرد، کێ ناردوویە و ڕەسووڵ ناجی کە ئێمە لە سابلاغ گرتمان و دەرکەوت جاسووسێکی گەورەی بریتانیایە و دامانە دەست ڕووسان، لە خەزای مەلا خەلیلدا ڕاوێژکەری هەرە نزیکی بووە.
«تەوفیق وەهبی» وەزیری کار و ڕێ و بان بوو؛ لە ئەدیبە بەناوبانگەکانیشە. ڕۆژێک شیعری «لێفە شڕە»ی من بۆ حوزنی دەخوێنێتەوە و دەڵێ: کەمتر شیعری وا باشم دیوە؛ خۆزگە ئەو شاعیرەم بدیبا.
حوزنی دەڵێ: ئەوە لە بەغدایە و پێخواس و ڕووت و برسییە؛ بیکە بە کارگەرێکی سادە.
- ئەوە دەغیلە حوزنی! پێی بڵێ خۆی بشارێتەوە نەوەک بیگرن!
حوزنی ئیمتیازی مەجەللەی «زاری کرمانجی» -کە لە ڕەواندز دەینووسی و لێی هەڵوەشێنرابوو- وەرگرتەوە. بڕیاری دا کە بیداتە دەست من.
بەیانییەک برادەرێک هات، گوتی: حوزنی کوتوپڕ مردووە؛ با بچینە سەر قەبران. چەند دیمەنێکی دڵتەزێن بوو: جەنازەکەی لە سەر خاک درێژ کرابوو تا قەبری تەواو دەبێ، جگە لە من و برادەرەکە هیچ کەسی لەلا نەبوو. بیرم لە قەدرنەزانی کوردان دەکردەوە، گریانێکی زۆر بە کوڵ گرتمی و پێم وایە تەنیا کەسێک کە بۆ مەرگی گریابێ من بووم.



حوزنی که به جاسووس و هەمەکارەی ئینگلیسیان دەزانی، زۆر بە فەقیری مرد. جگە لە کتێبخانەکەی، هەموو ناومالی، یەک- دوو بەڕە و چوار نیمکەتی دار بوو. منالی نەبوو. ژنەکەی کوردی تورکیە بوو. «گیو» کتێبەکانی برد؛ ناومال بۆ ژن ما و کارەکەری مالانی دەکرد.

لە کاتی شەڕدا ئینگلیسیان ڕادیۆیەکیان لە شاری «حێفا» خستبووە کار کە «مامۆستا گۆران»، «ڕەفیق چالاک» و «شێخ حەسەن» ناوێک، ڕۆژانە دوو سەعات بەرنامەی کوردییان لەوێوە بەڕێوە دەبرد. لە بیرمە بۆ یەکم جار لە «گەردیلان» گوێم لێ گرت. ڕەفیق چالاک وتارێکی لەسەر چارەڕەشی کورد خوێندەوە؛ کوڵ هەڵیگرتم و تێر گریام. ئەویش دوای شەڕ هەڵگیرا.

تووشی هەر کوردێکی سەرناس بام، داوای کارم لێدەکرد. دوکتور جەعفەر حەولی دا ببمە فەڕاشی مەدرەسەی فەیلی؛ نەکرام. مامۆستا قادر قەزازێک هەبوو زۆری کار بە دەست بوو؛ دەشیناسیم کێم. لە باتی کار، پەنجا فلسییەکی بۆ ڕاداشتم! بێدەنگ بە جێم هێشت.

شەوێک برادەرێک هات گوتی: حیزبی پارتی ڕایسپاردووم، کارێکم لە ڕستوورانێک بۆ دیتوویەوە؛ مانگی بە چوار دینار و نان و پێخۆر. ئای لەو خۆشییە! ڕستوورانێکی زۆر گەورە بە ناوی «خەییام»، دوو کورد بە ناوی «ئەحمەد خواجا» و «ڕوشدی بەگ» دەگەڵ عەرەبێکدا کردبوویانەوە. ئەحمەد خواجا لە هەوالانی شێخ مەحموود بووە؛ مێژوویەکی بە ناوی «چیم دی؟» نووسیوە. ڕوشدی کوردێکی حەلەبی بوو. کاری من ئەوە بوو قاپی بەتاڵ لەبەر خەڵک هەڵگرمەوە؛ وڵات بماڵم و کاشی بسترمەوە؛ یاریدەی قاپشۆر بکەم. ئێوارانە بیستودوو مێز و هەشتاوهەشت کورسی ئاسن بەرمە سەربان؛ سەعات یەکی پاش نیوەشەو بیانهێنمەوە خوار. سەعات دووی پاش نیوەشەو لە سەربان خۆ درێژ کەم و سەری سەعات پێنج دیسان مل لێ نێمەوە. لە سەعات دوازدەی نیوەڕۆ بۆ سەعات و نیوێک وچان و ئیستراحەت بێ. چەند کەسێکی‌تری هاوکاری تێدابوو کە یەکیان کوردێکی سابلاغی بە ناوی «محەممەدی ڕەشادی» بوو کە ئێستا زێڕینگەرێکی زۆر دەوڵەمەندە. چەند کوڕێکی خەڵکی سولەیمانیش هەبوون؛ کەباب و شەربەتی مێوژیان دروست دەکرد. ئارەقیش لەوێ دەفرۆشرا.

ڕۆژانە تێکڕا بیست سەعات پتر ماندوو دەبووم و سەری خۆم پێ نەدەخورا. نیوەڕۆ و شەو نەفرۆشراویان دەداینێ. بەیانیان سەموونێکی ڕەقهەڵاتووی لە کەڵکی خوران کەوتوویان بە چایەکەوە -کە بە حەبی سوکەرین [ساکارین] شیرن دەکرا- جیرەمان بوو. ئەو دەم سێ دەسک کەرەوز بە فلسێک بوو. ڕۆژێک دەستم برد نیوە دەسکە کەرەوزێکم هێنا کە بیخەمە ناو سەموونەکەم، دوژمنی ڕای ئیمانت بێ، خاوەن ڕستووران لە دەستیان دەرهێنام و فەزیحەتی سەگیان پێ کردم. شەڵوارێکی زۆر ئەستووری پینەکراو، کراسێکی شڕ و بێ قۆڵ، جل و بەرگم بوو. پێخواس بووم. لە گەرمای هاوینی بەغدا هەموو لەشمان هەمیشە لە بەر ئارەقە جلقەی دەهات؛ تەنانەت نەیاندەهێشت نیوەڕۆیان لە بەر دووشی ئاودەستخانەش ئاو بە خۆدا کەین؛ نەیاندەهێشت لە بەر سێبەر خۆ درێژ کەین.

لە بیرمە ڕۆژێک ناردیانمە شوێنێکی دوور کە قالبە سەهۆڵیان بۆ بێنم. پێخواس بووم؛ عەرزی خەیابان لاقی دەسووتاندم. لە تاوان هەر غارم دەدا کە نەمدەوێرا زۆر پێم وەعەرز کەوێ؛ زوو هاتمەوە. خاوەن ڕستووران گوتی: ئافەریم زوو هاتیەوە؛ ئەوجار هەر تۆ دەنێرم!

سەر لە هەوەڵەوە لەو شاگرد گارسۆنییە زۆر بە خۆمدا دەشکامەوە؛ بە شەرمەوە ئامان و

دەفرم لە پێش موشتەری لادەبرد؛ بەزەشم بە خۆمدا دەهات. بەیتێکی مستەفابەگی کوردیم هاتەوەبیر کە دەڵێ:

سەبا! یارانی مەجلیس گەر دەپرسن حاڵی زارم لێت
بڵێ کێشایە مەیخانە دوو چاوی بێچووە عەییارێک

بێچووە عەییاری ئەو شاعیرە، بەچکە ئاغایەکی لووسکەڵە بووە. بێچووە عەییاری من، کوردستان و چەندین ملیۆن کوردی لێقەوماوە؛ بۆشی بچمە سووچی مەیخانە و لەوەش ڕەزیل‌تر بم جێی شانازیمە. ئیتر بە ڕاستی ئەم بەیتە شیعرە، شەرم و تەقیەی لابردم و زۆر بە ڕاشکاوی کاری خۆم دەکرد.

شەوێک میوانی بووک‌هێنان بوو؛ زۆر شلووغ بوو. ئەحمەد خواجا گوتی: دەزانی بنووسی؟

- بەڵێ.

- وەرە لە بەر سندووق ڕاوەستە! هەر شێوێک دەچێتە دەر بینووسە!

کابرای خاوەن میوانیش دەینووسی. کە هاتینە حیساب کردن، حیسابی کابرا لە هی من پتر بوو. ئەحمەد خواجا دەیگوت هی ئەو ڕاستە؛ لە من تووڕە بوو کە سەهوم کردووە. چەققە پەیدا بوو. کاتێ لە ئاشپەزیان پرسی حیسابی من ڕاست بوو. خاوەن میوانی نیو دیناری بە خەڵات دامێ؛ ئەحمەد خواجا دە دەستم نووسا، لێی ساندم!

ڕۆژنامە بە دە فلس بوو؛ نەمدەتوانی بیکڕم. جارجارە لە خەڵک بەجێ دەما، دەمبرد و تماشام دەکرد. ڕۆژێک دوو پۆلیس بە باوەشە کتێبەوە هاتن، بە کابرای خاوەن ڕستووورانیان گوت یەکیان بکڕە. هەر چەند زیقاندی کە ناکڕم، چارەگە دینارێکیان لێ ساند و کتێبێکیان بۆ دانا و ڕۆیشتن. کابرا لە کتێب نەوی و تا هێزی تێدابوو فڕێی دا و چەند جوێنێکی حەواڵەی دەوڵەت کرد. چووم کتێبم لە ناو خۆڵ هەڵگرتەوە؛ داستانێک بوو بە عارەبی جلفەی ناو بەغدا نووسرابوو. زۆرم کەیف پێ هات کە زۆر وشەی بەغدایانەم فێر دەکا. ڕەنگە بیست جارم خوێندبێتەوە.

ڕۆژێک کابرایەکی زۆر بە سەر و سیما هاتە ڕستووران. من کە چووم قاپە بەتاڵەکانی بەردەمی هەڵگرم، بە بێ ئەوە چاو لە من کا بە سرتەوە گوتی: تۆ هەژاری؟

- بەڵێ.

- من ئەمین ڕەواندزی ئەفسەری مەشهوورم. ویستم حەولت بۆ بدەم لە سەحرا سەرعەمەلەییت بدەنێ؛ بەڵام لام وا باشە بچیەوە ئێران. دەڵێن عافواتی شا دەرچووە.

- قوربان! هیچ زەحمەت مەکێشە! ناچمەوە ئێران؛ ناشچمە سەحرات. لێرە هیچ نەبێ سێبەر هەیە؛ نانیش هەیە. زۆر سوپاست دەکەم.

ڕۆژنامە نووسیبووی: «مستەفا خۆشناو»، «محەممەد مەحموود قودسی»، «خەیروڵڵا» و «عیززەت عەبدولعەزیز» -کە ئەفسەر بوون و چوونە یاریدەی بارزانی- حوکمی ئیعدامیان دراوە. ئیتر ڕستووران هەر جمەی دەهات. کوردی بەغدا و سولەیمانی بۆ نەجاتیان تێدەکۆشین و لەوێ کۆ دەبوونەوە. لە پەناوە گوێم هەڵدەخست کە بزانم خەبەر چییە؟ ئاخری ئیعدام هەر کران و لاشەکانیان بردەوە شوێنی لە دایک بوونیان. منیش هەر ئەوەندە بوو لە پەنایەکەوە چەند فرمێسکێکم هەڵوەراند.

جاری وا بوو خواردنم لە ڕستوورانەوە دەبردە ئوتێلان. جارێک کەبابم برد بۆ شێخ عەرەبێک ناوی عەبدوڵڵا یاسین بوو؛ لە شێخە هەرە زلەکانی نێوان کووت و عەمارە. کەبابی سولەیمانی

زۆر لێ خۆش هات. ڕۆژی دواییش داوای کردبوو؛ بۆم برد. هێشتا لە بەر دەمیم دانەنابوو، قاچم تێک هالا و کەوتم و قاپ شکا و کەباب پەرژ و بلاو بوونەوە. لەترسان و لە حیرسان فرمێسکم پەڕیە چاو. گوتی: گوێ مەدەیە. تەلەفۆنی کرد کە من قاپەکەم شکاند. دوو دیناری بۆ ناردن؛ نیو دیناریشی بەخشش دا بە خۆم. گوتی: ئەگەر دەبیە خزمەتکارم و دەتوانی لە سەحرا بژی، ژنت بۆ دێنم، ڕەشماڵت دەدەمێ، مانگێ دە دیناریش حقووق.

- چۆن نایەم؟ دەستیشت ماچ دەکەم؛ ژنیشم ناوێ. خوا ڕاوەستاوت کا.

- دەجا سبەی سەعات شەش وەرە بەر ئوتێل.

شەو لە خۆشیان نەمزانی خەو چییە. شرە و پەتووم پێچایەوە. لە جەنگەی گەسکدانی بەیانیدا، کۆڵەپشت لە سەر شان، لە بەر دەرکی ئوتێل «شطالعرب» وێستام و نیو سەعات هەڵلەرزیم تا شێخ تەشریفی هاتە دەر. تێلەکەیان لە سەر ماشێن دابەست.

- خۆ دەزانی کەبابم بۆ دروست کەی؟

- نا بە داخەوە، بەڵام هەموو کارێک دەکەم.

- شرەی بۆ فڕێ دەنەوە! وەمزانی کەبابی سولەیمانی دەزانی.

بە هەناسەساردی هاتمەوە جەهەننەمەکەی خۆم و نەمدەزانی جوابی پرسیارکەران چی بدەمەوە.

ماڵی مام حوسێن لە ڕستوورانەوە چارەگە سەعاتێک ڕێ بوو. نیوەڕۆیان ناچار دەچوومەوە ئەوێ ئاوم بە خۆدا دەکرد و برێک ڕادەکشام. ڕۆژێک لەم ڕێگەیەمدا تووشی مغازەیەکی کتێبفرۆشی بووم کە هەموو کتێبەکان باسی ئایینی خاچپەرستی بوو. تابلۆیەک بە پەنجەرەکەوە درابوو: «ڕۆزنامە خوێندنەوە بە خۆڕایی». بە خوا باشە! با بچم. کابرایەکی پیر، هەشتا- نەوەد ساڵە، لووت کورتی سوور، گوێ پان، لە سەر کورسییەک قوت ببۆوە، جێگەی نیشاندام. دوو لاوی عارەبیشی لێ بوو. پرم بە ڕۆزنامەدا گرت و بە خۆشیەوە لێم دەڕوانی. گوتم ئیستراحەتی نیوەڕۆم لێرە دەگوزەرێنم. چەند تابلۆیەک بە دیوارەوە بوو، نووسرابوون: «ئەگەر مجادەڵەی دینی دەکەن هەرگیز تووڕە مەبن! بە زمانی نەرم و خۆش یەکتر بدوێنن». کابرا کە بۆ بەخێراتن دواندمی گوتی: بە لەهجەتدا وادیارە عەرەب نیت. وتم کوردم.

بە کوردی گوتی: زۆر باشتر، من سی ساڵ لە سابلاغ و دە ساڵ لە تەورێز ژیاوم. تەبلیغاتی دینی مەسیحیم کردووە. ئێستاش ئەوا تەرجەمەی کتێبێکم بە دەستەوەیە کە بە فارسی بلاوم کردۆتەوە و دەیکەم بە عارەبی. خۆ فارسیش دەزانی؟

- بۆچی، کەم تا کورتێک.

- با برێکت بۆ بخوێنمەوە.

- بە خوا من هاتووم ڕۆزنامە بخوێنمەوە.

- نا، دەبێ هەر گوێم لێ بگری، زۆر بە فایدەیە.

ملێکم لار کردەوە:

- بەلێ بفەرموو!

- ڕۆژێک لە ڕۆژانی بەهار کەربەلایی زەینەلعابدین و یووسفی هاواکیان چووبوونە سەیران لە شاگوڵی. یووسف خەریکی چا لێنان بوو؛ کەربەلایی نوێژی دەکرد. لە دەمی نان خواردنا یووسف پرسی:

- چەند ساڵە نوێژ دەکەی؟
- چل و پێنج ساڵ.
- چەند نوێژت کردووە؟ چەند ڕکاتی تێدا بووە؟
- نازانم.
- من حیسابم کردووە، دەکاتە ئەوەندە هەزار ڕکات. ئەو هەموو موسوڵمانە لە دنیادا لە هەموو ڕکاتێکدا لە بەر خودا پاڕاونەوە: بمانخە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەدی خودا کەی دوعایان لێ قبووڵ دەکا؟!

گوتم: بەسمە، تێگەیشتم. جەناب! فاتیحا قسەی خودایە. فەرمانی داوە موسوڵمان لە ڕکاتە نوێژدا بیڵێن، وەک ئەوەیە کە ئێواران سەربازان فێر کراون بڵێن بژی مەلیک. فەرمانە؛ دوعا نییە. ڕەنگە تۆ قورعان بە قسەی خودا نەزانی؟
- شتی وا مەڵێ! قورعان زۆر گەورەیە. لە چەند جێ بە ئاشکرا باسی مەسیحی تێدایە کە لە فووی خودایە.
- بەه ـ بەه! چەند مبارەکە! لات وایە هیچ قسەی پێغەمبەری تێدا نییە؟
- بەڵێ، ئەوانەی «قول»یان تێدایە، واتا: «بلێ» بێشک فەرمایشتی خودایە.
- کە وابێ محەممەد «قول»ەکانی بۆ خۆی لێ زیاد کردووە کە قورعان دەڵێ: «هەر کەس جگە لە ئیسلام دینێکی دیکە هەڵبژێرێ لێی قبووڵ ناکرێ» قسەی خودا نییە؟!
- من ئەوە ناڵێم...
- تۆ بڵێ! شەرم و تەقیەی پێناوێ. وەرە هەردووکمان بڵێین محەممەد بە ناوی خوداوە ئایەتی خستوونە ناو قورعان و دزی کردووە. کەسێک دز و بوختانکەر بێ بۆ پێغەمبەر نابێ. ئەوسا وەرە پێم بسەلمێنە کە مریەم لە فووی خودا ئاوس بووە و ئەو کچە جوولەکە جوانە کەس لاقەی نەکردووە!
- کوڕە تۆ دەڵێی چی؟! قورعان ئاشکرا دەڵێ.
- گوتمان قورعان بڕوای پێ ناکری چونکە خاوەنەکەی بە زمانی خواوە هەڵیبەستووە.
- جا دەڵێی چی؟
- دەڵێم ئەو هەموو موسوڵمانە دەربارەی پاکی مریەم و عیساوە بە هۆی قورعانەوە دەمیان بەستراوە. ئێوە حەول بدەن قورعان زۆر چاپ بکەن با موسوڵمان هەموو بزانن کە مەسیح زۆڵ نەبووە. چارتان هەر ئەوەیە.
- تۆ ناوت چییە؟
- عەزیز.
- عەزیز هەستە بڕۆ! جارێکی دیکە نەیەوە ئەم دوکانە!

کلک لە گەلۆزدا دەرکەوتم و پەکی ڕۆژنامەی بە خۆڕاییم کەوت. حوزنیم وە بیر هاتەوە کە لە سەر شافیعی تێهەڵدانی خواردبوو!

دوو مانگ بەوپەڕی چەوسانەوە کارم کرد. مانگی یەکەم گوتیان دوایە حقووقت دەدەینێ؛ مانگی دووهەم گوتیان نیمانە و نایدەین! حەمەی ڕەشادیش وەک من هەشت دیناری دوو مانگەیان نەدایە. گوتی با شکایەت بکەین؛ گوتم من نایکەم. ئەو چوو دوو پۆلیس و دەرەجەدارێکی لەگەڵ خۆی هێنا. گوتیان: حەقی ئەو فەقیرە بۆ نادەن؟ خاوەن ڕستووران

گوتی: جارێ فەرموون ئیستراحەتێک بکەن! بوتڵێ ئارەق و کەبابیان بۆ بردن. تێریان خوارد و حەمەیان وەبەر شەق و زللە دا: نامەردی لات! ئەو پیاوە نەجیبانە چۆن هەقی تۆ دەخۆن؟!

من هەر ئەوەندەم بۆ کرا حەسیر و پەتووەکەم لە سەر شان دانێم و بێمەوە لای مام حوسێن.

لە ڕستوورانەکەدا نامەم بۆ کرێکارەکان دەنووسی ئەوانیش تیغی ڕیش‌تاشین و سابوونیان بۆ دابین دەکردم؛ پەکم لە سەر ئەو دوانە نەدەکەوت. ڕۆژێک کرێکارێک کە چەند جار نامەم بۆ نووسیبوو گوتی: وەرە لە سەر حیسابی من بچۆ لای قەحبەیەک!

گوتم: چەندی تێ‌دەچێ؟

گوتی: نیو دینار

گوتم: کاکە چارەگە دینارێکم دەیە و ناچم.

گوتی: سا بە خوا نەچی فلسێکت نادەمێ!

پێم سەیر بوو؛ چۆنە بۆ کاری خراپە وا دلاوان و بۆ خێرێک وا دڵ‌کوێرن؟! زۆربەی خەڵکی‌تریشم وادیوە. نازانم سوڕ چییە؟

دەستم کرد بە حەمباڵی کردن؛ بەڵام حەمباڵیەکی لۆکس. دەچووم لەبەر ئوتێلی گەورە ڕادەوەستام. گارسۆن بانگیان دەکردم، چەمەدانی میوانان -کە دەڕۆیشتن- بەرمە دەر و بۆیان بار کەم. خۆیان و خودایان شتێکیان دەخستە مشتمەوە. شەوانەش لە بەر هەیوانی دیوەخانی نەقیب لێی وەردەکەوتم.

سەید عاسم مرد؛ ئامۆزایەکی پیری ئەویان کە ناوی سەید برایم بوو کردە نەقیبی غەوس. مام حوسێن لای نەقیبی تازە بە نۆکەری دایمەزراندم کە مانگی چوار دینار و نان و پێخۆرم بداتێ. گەسک لێدان و کاشی مالینم نەما. حاجی حەسەنێکی ئەفغانی، حاجی کەرامەت ناوێکی پاکستانی و ئەحمەد ناوێکی هیندی کارە گرانەکانیان دەکرد. کاری من ئەوە بوو نەهار و شام سینی بۆ سەید برایم بەرم و لە ماستاو دروست کردنی من زۆر کەیفی دەهات.

سەید برایم پێنجسەد خانووبەرەی عەرەسەی گەڕەکی ئەرمەنیانی هەبوو؛ پتر لە دووسەد دوکان و خانووی‌تری لە بەغدادا بە کرێ دابوو. دەیانگوت پێنج ملیۆن دیناری لە بانکدایە؛ بەڵام دیسان چاوی لە فلس و دوو فلسی زیارەتکەرانی هیندی و کورد بوو. جینگنێک بوو هەمیشە دەتگوت درووی وە بن کلکی دراوە. بە ڕاستی شێتێکی تەواو بوو. باغێکی خورمای هەبوو، بە دوازدە هەزار دینار بە ئیجارە چووبوو. شەوێک دەگەڵ ئیجارەداری باغەکەی لە سەر ناوی جۆرە خورمایان بوو بە هەرایان. دایە بەر جنێودان و وەهای دەنەڕاند کە هەموو نووستووی حەساری غەوسی لە خەو ڕاپەڕاند:

- سەگباب چۆن من دەڵێم ئەو خورمایە ناوی سوورە کێویلەیە و تۆ دەڵێی نەخێر قامکی بووکە؟!

ڕۆژێک دیتی ڕۆژنامە دەخوێنمەوە، کردیە هەرا:

- مەمنووعە ڕۆژنامە بخوێنیەوە؛ مێشکت تێک دەدا. تۆ نۆکەری منی؛ نابێ کاری وا خراپ بکەی!

بۆ نەگبەتی خۆی لای وابوو فارسی دەزانێ؛ شتهایەکی کاوێژ دەکرد نەمدەزانی چ زمانێکە. ڕۆژێک وێرام بڵێم: ئەفەندی ئەوە فارسی نییە؛ من شتێک لە فارسی دەزانم. سەیر بوو کە تووڕە نەبوو! گوتی: باشە فێرم کە! نازیرەکێک بوو لام وابوو خوا مێشکی نەخستۆتە سەریەوە. خولاسە



ببوومە ئاجوودانی نەقیب. دەگەڵی دەچوومە باغەکەی. خانوویکی خۆشی لێدروست کردبوو. جارێک ئیجارەداری باغ بە من و شۆفێرەکەی گوت: سەر و دەسرەم بدەنێ خورماتان بۆ تێدەکەم؛ بەڵام ئەفەندی نەزانێ. هەرچەند من ئیجارەدارم و ئەو حەقی بەسەر بەریەوە نییە و من لە ماڵی خۆم بەشی ماڵەوەی دەدەم و دەبێتە میوانم؛ بەڵام ببینێ من خورما بە ئێوە دەبەخشم، هەر دووک چاوی کوێر دەبێ لە خەسیسیان.

ژنی نەبوو؛ کوڕێکی هەبوو بە ناوی «شەمسەددین». لە قەسرێکی دووردا دەژیا. کابانی ماڵ ئەو نووریە بوو کە باسی کرا. سفرەچیش من بووم. ئەفەندی زۆر موسڵمانێکی بە نوێژ و ڕۆژوو بوو؛ هەمیشە ورتەی دەهات؛ دوعای دەخوێند. زەکاتی پووڵ و خورمای نەدەدا؛ بەڵام ڕۆژانی جومعە دووسەد تاق فلسی دەکردە کیسەیەکەوە، بە سواڵکەرانی بەر دەرگای بارەگای غەوسەوە دەگەڕا، فلسێک و دوو فلسی بە هەر یەکێکیان دەدا. ناوبانگی بە خێرومەند ڕۆیشتبوو. لەو خێر بەخشینەوەدا مەلایەکی بە ناوی غەززالی لە دواوە دەڕۆیشت. ڕۆژێکی جومعە پەنجا فلسیەکی دامێ، گوتی: بچۆ بیدە بە فەقیران و بڵێ هی فلان کەسە. لە بەر دەرگا ژنێکی کوێرم دیت پەنجا فلسییەکەم دایە و گوتم سەید برایم ناردوویە و گورجێ هاتمەوە خزمەتی. سرتەیەکی دەگەڵ مەلا کرد. مەلا گوتی: پوولەکەت چ لێ کرد؟

- بردمە لای ژنە کوێرەکە.

لێی پرسی: کەس پەنجا فلسی داویەی؟ ژنەکە -پوولەکەی هەر لە دەستیدابوو- نیشانی دا، گوتی: سەید برایم بۆی ناردم. ئەفەندی کە دڵی خاترجەم بوو نەمدزیوە، گوتی: تۆ کوڕێکی ئەمینی؛ بەڵام دەبوایە بیدەی بە پەنجا سواڵکەر!

- ئەفەندی جارێکی تر من خێری تۆ نابەخشمەوە؛ با مەلا ئەو کارە بکا.

شەوێک لە خزمەتیدا دەچوومەوە ماڵ، لە پلەکان فەرمووی وەپێشم کەوە. لە سەرکەوتنا دووپشکێکم دیت؛ پێم ڕێ خست. گوتی: ئەوە چ بوو؟

- دووپشک بوو کوشتم.

بە پلەکانێکی دیکەدا سەرکەوت و ئێستاش نەیوێرا لەو پلەکانەوە سەرکەوێ. لە لای هەموو میوانانی تاریف، تاریفی پاڵەوانەتی و نەترسانی من بوو کە توانیومە دووپشک بە پێلەقە بکوژم!

ڕۆژێک لە حەوشەی دیوەخان گوێم لە زیقە و هەرای ژنان بوو؛ ڕامکرد، دیتم توولەمارێکی باریکیان دیوە. کلکی مارم گرت و لە کون دەرمکێشا و بۆم کوشتن. ئیدی کار لەوەدا نەما. هەموو ڕۆژ دەیانگوت ئەفەندی تۆی دەوێ. نیشانی میوانانی دەدام: بڕوانن! ئەو کوردەیە کە ماریش لە کون دەردێنێ و دووپشکیش دەکوژێ! ئاخری وای وەڕەز کردم. دەینارد لە دووم نەدەچووم.

«حاجی کەرامەت» چل و پێنج ساڵ بوو لە بەغدا دەژیا؛ قەت چوار کەلیمەی عەرەبی بە باشی فێر نەببوو. باشی لە بیر بوو کە ساڵێک ڕووس هاتوونە خانەقین و چونکە وەک شوومن، قاتی و گرانیان بە پێوە هاتووە و هەر نانی وشکی بە ئاو خواردووە و شوکری خوای کردووە. ڕۆژێک بەیانی چووبوو نانی گەرم بکڕێ، گوم بوو نەهاتەوە. ئەفەندی شێوا؛ تەلەفۆنی بۆ هەموو پۆست و بیمارستانان کرد، سۆراغ نەبوو. دەستمان لێ شوشت. پاش یازدە ڕۆژ، بەیانی بە باوەشێک نانی گەرمەوە لێمان وە ژوور کەوت.

- حاجی چت بە سەر هات؟

- وەڵلا گوێم لێ بوو شۆفیران بە گۆرانی دەیانگوت: هەر چی نەچێتە زیارەتی سەلمان، عومری بە زایە چووە. وە بیرم هاتەوە زۆر لە مێژە نەچوومە ئەو زیارەتە. بە پێ ملم لێنا. بە دوو ڕۆژ گەییمە سەلمان پاک. حەو ڕۆژ لەوێ بووم و بە پێ هاتمەوە و نانم کڕی!

جا وەرە زاری ئەفەندی بکرێتەوە و جنێو دابباری!

ئەفەندی نەخۆش کەوت. ئەحمەدی هیندی و من بووینە دەرکەوان کە هەر کەس دێتە لای، بێ‌پرسی ئەو ڕێگەی نەدەین.

لەو بێکاری دەرکەوانیەدا مرخم خۆش کرد عارەبی کتێب فێر بم. مونجدێکی چکۆلەی دانشجویان -کە فەرهەنگی عەرەبی بە عەرەبی و هاسانە- پەیدا کرد. ژمارەیەکی مەجللەی هیلالی میسری -کە دەربارەی ئەحمەد شەوقی بوو- دەستم کەوت. هەر وشەیەکی نایزانم لە فەرهەنگ دەیدۆزمەوە و بە میداد دە بن وشەکەی دەدەم. وا دیار بوو هیچم هەر لێ نەزانیبوو؛ چونکە مەجەللەکە وەک سەر و بەر تەرجەمە کرابێ وابوو، بە میدادی من سەر تا پای بۆر هەڵگەڕابوو. لەو زەحمەت‌کێشانە بێ‌وچانەمدا -کە هەمیشە جگە لە وەختی کار دەمخوێندەوە- تا ئەندازەیەکی باش خۆم لە عارەبی ڕاهێنا.

ڕۆژێک دەروێشێکی کوردی سەیدی پارسانی هات؛ گوتمان ڕێت نییە بیبینی.

- کوڕە ئەوە دەڵێن چی؟ دێو دەتوانێ پێشم پێ بگرێ؟! بڕۆن پێی بێژن من چوومە گەیلان زیارەتی مووسا جەنگی دۆستی باوکی غەوسم کردووە؛ سلاوی ئەوم بۆ غەوسی کوڕی هێناوە. بە خوا تا مخارجی گەڕانەوەم پێ نەدا لەگرە نابزووم و چاویشی دەرتێرم!

چوومە ژوور بۆ ئەفەندیم گێڕاوە. زۆری جنێو دا، ئەوەندەشی گوت: ئەوە کوردە و خزمی خۆتە بۆیەت ڕێ داوە.

- جا دەفەرمووی چی؟ لێی دەم؟

- نا نا دوعام لێدەکا دەمرم! بچۆ ڕازی بکە؛ بەڵام تا دەتوانی کەمی بدەیە!

بە هەزار چەق و تەف دەرویش بە نیو دینار ڕازی کرا و شلتاغی بە ئەفەندی نەما. ئەفەندی تا دوو ڕۆژان جنێوی بە مووسا جەنگی باپیری دا، بۆ دیارییەکی بۆی ناردووە!

کاری من و ئەحمەدی هیندی جگە لە تەشریفاتی بەر دەرگا، دەبوایە ئەگەر ئەفەندی کاری ئاودەستی بوایە، بە چوار دەستان بە تەختەوە هەڵیگرین و لە بەر دەرکی ئاودەستی دانێین و پاشان ئاوا بیهێنینەوە شوێنەکەی خۆی، کە لە حەسار بوو.

لای مام حوسێن درکاندم کە خواردنەکەمان تێرمان ناکا، چی بکەین؟ چووبوو گوتبووی فلان کەس لە لات دەڕوا. تووڕە ببوو: چۆن دەڕوا؟ ئەدی کێ ماستاوم بۆ دروست کا؟! بە پۆلیس دەڵێم بیگرن؛ سەربازی نەکردووە. حوسێن بە گژیدا هاتبوو؛ شەش دیناری لێ ساندبوو. گوتی: نابێ لای ئەو خوێڕیە بی. نانێکم هەر دەبێ تۆ بیخۆی. بۆ کاریش خوا کەریمە.

هەر لەو دەرکەوانیەدا جارێک «جەلال تالەبانی» -کە تازە خەتی سمێلی دەدا- هاتە لام و بوو بە ئاشنام. کوڕێکیش بە ناوی «عوسمان مەجیدی کۆیی» دیتمی و گوتی:

- حەز دەکەی لە فەلسەفەی مارکسی شارەزا بی؟

- چۆن حەز ناکەم؟

چەند نامیلکەیەکی دامێ: بیخوێنەوە!... جارێکی‌تر هات گوتی: مامۆستایەکمان بۆ دیاری کردووی زۆر زانایە؛ بچۆ لە فلان قاوەخانە بیبینە! باشت فێر دەکا.

لاوێکی سمێڵ‌زەردی، سەر چکۆلەی، چاو شین و عارەب، بەر لەوە دەرسێک بڵێ فەرمووی:
- کارت چییە؟
- نۆکەری کابرایەکی عەرەبی دەولەمەندم.
- مەڵێ عەرەب، ئەوە بیری شۆڤینییە!
- کابرایەکی بەغدایی؟
- مەڵێ بەغدایی، ئەوە سیاسەتی ئیقلیمییە!
- عیراقییە و بە زمانی من قسە ناکا.
- ئەوەش مەڵێ، دنیا یەکێکە و ئیستعمار کردوویەتە چەند بەش!
خولاسە وەک بەیتی مێشوولەی لێ هات: هەر من بڵێم، ئەو بڵێ مەڵێ! وەختی دەرس بە سەر چوو؛ بە جێم هێشت و هەر لە بەر خۆمەوە دەمگوت: مەڵێ! مەڵێ! عوسمانم دیتەوە:
- ها؟ مامۆستاکەت چۆن بوو؟
- چ لەوە باشتر دەبێ؟ مەڵێ «مامۆستا» ئەوە سیاسەتی تەبەقییە!
کە بۆم گێڕاوە لە قاقای پێکەنینی دا: بە خوا نەمدەزانی کەری ئاواش هەیە!
ڕۆژی دوایی هاتەوە. کومۆنیستەکانی بالا زۆر لەو سمێڵ‌زەردە تووڕە بوون:
- قەرارە مامۆستایەکی زۆر زانا لە خۆیان بنێرن؛ ئێوارە دێتە لات.
مامۆستای نوێ ناوی «ئەحمەد بانی‌خێلانی» بوو. چووینە قاوەخانەیەک، گوتی:
- ئیتر نامیلکە و مامیلکەت پێ ناوێ، هەرچی مارکسیەتە وا لە سینگمدا؛ هەمووت لە بەر پێ دەڵێم!
ملی نا لە باسی کومونیستی بنیادەمی بەر لە تاریخ کە لە نامیلکۆکێکدا خوێندبوومەوە. بەر لە قسە کردنیش گوتی:
- دەزانی دیالەکتیک چییە؟
- نەخێر.
- مانای وەرام و پرسیاری دەم بە دەمە؛ تا گرێ کوێرە نەمێنێ.
لە سەر قسەکانی ڕۆیشت:
- لە ژیانی سەرەتاییدا هێندێک فێڵبازی تەنبەڵ پەیدا بوون، گوتوویانە ئێمە ڕاسپاردەی خوداین و عاسمان ئێمەی کردۆتە گەورەتان. بەو فێڵە چەوساندوویاننەوە و بۆ خۆیان خۆش ژیاون.
- مامۆسا ئیجازە هەیە قسە بکەم؟
- ئەی دیالەکتیک بۆ چییە؟ بڵێ!
- لەم بارەوە ئەوا گوتمان مووسا خۆی کردۆتە سەرۆکی جوولەکە و محەممەد دەولەتی بۆ عەرەب دامەزراندووە؛ بەڵام بۆ مەسیح دەڵێی چی کە هەتا کوژراوە نانی شەوی نەبووە و بە پێخواسی و بە سواری کەر گەڕاوە؟ چەوساندنەوەی خەڵکی لە کوێدایە؟!
گوتی: ها کابرایەک تماشامان دەکا؛ نەوەکا جاسووس بێ. با بڕۆین دوایە جوابت دەدەمەوە!
ئێستا و ئێستاش مامۆستا نەهاتەوە! عوسمان گوتی گوزارشی داوە کە ئەم کوڕە لە دەردی کۆنەپەرستیدا خنکاوە و چارەی بە کەس نایە! پاش چەند ساڵێک دەگەڵ چەند هەواڵێک تووشمان بوو بە تووشیەوە، گوتی: دڵخۆشم کە من مامۆستات بووم؛ لە بیرتە؟



- بەڵێ، بەلام ئێستاش پرسیارەکەم بێجوابە!
ئێستێ کە ئەم باسە دەنووسم، ئەم پیاوە لە مامۆستا هەرە پایەبەرزەکانی حیزبی کۆمۆنیستی عیراقە!
پاش ماوەیەک مام حوسێن گوتی ئاشنایەکی عەکاسم هەیە دەڵێ کارم بۆ دۆزیوەتەوە. عەکاس بردمیە لای وەکیلێکی دادگوستەری، بە حەوت دینار و نیو دامەزرام کە ڕۆژانە دەفتەرەکەی خاوێن کەمەوە و ئێواران لە پشت دەرکە دانیشم، چا و نووشابە بۆ میوانانی بێنم. شەویش لە دەفتەر بخەوم. نیوەڕۆیان دەیناردمە ماڵێ خواردنم بۆ دەهێنا و بەشی منیشی دەکرد. ماڵەکەی زۆر دوور بوو؛ دەبوایە دوو ئوتووبووس بگۆڕم و زۆریش بە پێ بڕۆم. زۆر ماندوو دەبووم؛ بەلام نانی نیوەڕۆکەم کە دەردەچوو ڕازی بووم.
ئاغاکەم ناوی «عەبود شالچی» بوو. وەکیلێکی زۆر پڕکار بوو و زۆر دەوڵەمەند و ئەشرافی و لە ئازادیخوازانی حیزبی چادرچی بوو. کتێبی زۆری لە دەفتەرەکەی هەبوو. کەترێەکی بەرقی هەبوو شەوانە چام لێدەنا و کتێبم دەخوێندەوە. یەک لەو کتێبانەی خوێندمەوە و زۆرم خۆش لێ هات، نووسراوێکی «ئەدگار سنو» بوو کە لە سەر ژیانی منداڵی و لاوەتی مائوتسێتونگی نووسیبوو؛ ناوی نابوو: «پیاوی ئاسیا». ئاغاکەم زۆر هۆگری متالا کردن بوو؛ تەنانەت کە دەچووە سەر پێشاویش شتێکی دەبرد لەوێ بیخوێنێتەوە.
ڕۆژێک گوتی: وەرە بەندی کەوشەکانم توند کەوە! کردم؛ بەلام هەستی کرد کە زۆرم بە لاوە گران بوو. ئیتر وازی لەم کارە هێنا. دوکتور ناجی مراد ناوێک هەر لەو ئاپارتمانەدا بوو. فەڕاشەکەی ڕۆژانە کە لە بیمارستان دەگەڵی بوو. ئێواران ئەویش دەگەڵ من لە پێشخانە دادەنیشت و بباووینە ئاشنا. بۆی گێڕامەوە کە ڕۆژێک دوکتور بە عارەبێکی دەشتەکی گوتووە:
- خرووجت بێنە.
- خرووج چییە؟
- گووت بێنە معایەنەی بکرێ.
سبەی کابرا بوخچەیەکی گرانی پێبوو، شەش کیلۆ دەبوو، گووی لە ڕۆژنامەیەکدا نابووە بوخچەوە:
- فەرموو دوکتور!
دوکتور بانگی کرد:
- سەلمان وەرە مامت دیاری بۆ هێناوین، لێی وەرگرە!
- دوکتور بیبەمەوە ماڵە خۆتان؟!
- نەخێر بیبە ماڵە بابە سەگبابەکەت!
ئاغام ڕۆژانی جومعە لە بەیانەوە دەهاتە دەفتەر؛ کوڕێکی عارەبی دەگەڵ خۆی دێنا کە لە ئیدارە دایمەزراندبوو. دەیگوت تۆ بڕۆ تەعتیل بە و تا ئێوارە مەیەوە. هەستم دەکرد کە ئەو کوڕە دەچێ ژنی بێگانەی بۆ دێنێتە دەفتەر و ئاغای وەکیل خەیانەت بە ژنی خۆی دەکا و حەزیش ناکا من بزانم.
لەو ڕۆژانەدا بەغدا لەپڕ وەک گۆمی خوێنی لێهات. خۆپێشاندانی خەڵک دژی پەیمانی «پۆرتسمۆس» و سالح جەبری سەرەکوەزیر لەوپەڕی تەوژمیدا بوو. ڕۆژ نەبوو چەند کوڕ و کچێک لە سەر جادە نەکوژرێن. نیوەڕۆ بوو، لە بازاڕ بووم تەقە قەوما. بە غار هاتم بگەمەوە

دەفتەر، تفەنگیان تەقاند و کابرایەکیان لە نزیک منەوە کوشت. خوێنی لە بەر دەچوو، غارم دایە سەری کە بەڵکو خوێنەکەی ببەستم، لەپڕ قۆنداغە تفەنگێکیان بە پشتمدا کێشا؛ هەر ئەوەندە بوو نەمردم. بە کۆمە-کۆمە ڕامکرد و خۆم دە دەفتەر هاویشتەوە. شالچی زانی لە خۆپێشاندانیدا وام بە سەر هاتووە، گوتی: وا دیارە تۆش سەرت لەو کارانە دەخورێ. لەو ساوە زۆر بە هێدی‌تر دەیدواندم.

ڕۆژێک کابرایەکی ڕەشی سوودانی دەگەڵ خۆی هێنا و گوتی یاریدەت دەکا. تێگەیشتم کە ڕەشەی پێ لە من چاترە و دەفتەر دوو کەسی ناوێ. داوای حیسابەکەم کرد و خواحافیزیم لێکرد. خڕ هاتمەوە ماڵی مام حوسێن.

بە هۆی دژایەتی دەوڵەت و خۆپێشاندانی ساڵی ١٩٤٨، گوتیان دەبێ شیعە و سوننی ببنە برا. کامیۆنێکی زۆر لە بەر بارەگای غەوس ڕاگیرابوو، هەرایان دەکرد: کێ دێتە نەجەف؟ هەزار رووتە و پووتە و لات خۆیان تێ‌دەخزاند و دەیانگوت پلاو دەخۆین. سەرکردە مەلا تەها ناوێک بوو؛ گوتم: حەز دەکەم بێم؛ لای شۆفێر دەگەڵ خۆی سواری کردم. خۆم لە پلاو دزیەوە؛ چوومە ئوتێل، چوومە زیارەتی ئیمام عەلی. لە کابرای خاوەن ئوتێلم پرسی: لە وڵاتی ئێمە دەڵێن ئیمام لە سەرەمەرگدا فەرموویە مەمنێژن تا دێن دەمبەن. عارەبێک بە وشترێکی سپی چاوڕەشەوە هاتووە تەرمی بردووە و کەس نازانێ قەبری لە کوێیە. کابرا پێکەنی گوتی: ببەخشە دیارە لە وڵاتی کەرانەوە هاتووی! ئیمام لە کووفە مردووە، هێناویانەتە ئەو تەپکە سێڵاو نەیگرێتەوە و نەجەف یانی تەپۆلکە.

مەحموود ئەحمەدی ئاشناکەی سولەیمانیم نەقڵ کرابووە بەغدا و لە ئیدارەی ئامووزش و پەروەرشدا دەفتەردار بوو. گوتی: نامەیەکت بۆ دەنووسم بچۆ کووت؛ لەوێ کارت دەدەنێ. نامەم دا بە موهەندسێکی کورد کە ناوی نووری بوو؛ ناوی بابیشم لە بیر نەماوە. شایانی باسە کە لە بەغداوە گەیشتمە کووت و لە گاراژ دابەزیم، کەل-پەلەکەم دزرا. زۆری بۆ گەڕاین دیتمانەوە؛ بەلام کەتری چا لێنانم هەر فەوتا و زۆرم خەم بۆ خوارد. موهەندیس گوتی: ئەمشەو دەگەڵ باغچەوانەکە بە! دوو ماسییان دابوو بە باغچەوان بیبرژێنێ. ماسی لەسەر ئاگر بوون، باغچەوان گوتی: نوێژ دەکەم ئاگات لێ بن چەقەڵ نەیانبا. لە نوێژ خەلاس بوو، بەجێم هێشت. کردیە هەرا: ئای چەقەڵ بردی! پێم سەیر بوو لە ناو شاردا چەقەڵ ماسی بەرێ.

بەیانی موهەندیس ناردمیە لای چەند کارمەندێک کە دەگەڵیان بژیم. ماوەیەک مامەوە. کووت ئەوسا شارێکی زۆر پیس و پۆخڵ بوو؛ لە شار نەدەچوو. تەنیا کابرایەک ڕۆژنامەی بەغدای دێنا و لە قاوەخانە بە کرێی دەدا؛ تەواو چوار خەتت نەدەخوێندەوە دەیساندەوە و دەیدا بە یەکی‌تر. لە کوێ نان بخۆم؟ کارمەندەکان بردمیانە ناو بازاڕ چێشتخانەیەکیان نیشاندام کە: ئێمە ئابوونەین، مانگی چوار دینار دەدەین و هەرچی بمانەوێ و کابرا هەیبێ دوو جەمە دەخۆین. بوومە ئابوونە! سینەماش هەبوو، هەر بە دوو ڕۆژ فیلم دەگۆڕا.

ڕۆژانە بێکار و وەڕەز دەبووم، دەچوومە سەر سەدی «غەراف» سەیری ماسیان و قولکەی ماسی‌گریم دەکرد و پێی دەخافلام. ڕۆژێک چاوم لێ بوو عەرەبێک بەرەو کووت دەهات؛ بوخچەیەکی دە بن هەنگلدا بوو. گەیشتە سەر پردی سەد، دانیشت جووتێ کەوشی لە بوخچە دەرێنا، خاوێنی کردەوە و کردیە پای و هەستا. وەک ژنە لادێییەک کە تازە پاژنە بەرز دە پێ دەکا، هەر تلاوتلی بوو. کردی و نەیکرد نەیتوانی بڕوا. دانیشت و دایکەند و نایەوە ناو بوخچە و

به پێخواسی ڕووی له شار نا.

خۆپیشاندان دژی سالح جەبری له کووتیش بەردەوام بوو. دەڕۆین و به تێکڕایی دەیانگوت: «بکەویّ! بکەویّ!» عارەبێکی ڕووتی پێخواس که له کەنارەوه وێستابوو چەند جار هاواری کرد: «یا خوا بکەویّ! ده با بکەویّ!».

پرسیم: مامه چی بکەویّ؟

- دینار بکەویّ و من هەڵیگرمەوه!

له کووت دەگەڵ کوردێکی کۆیی و عارەبێکی کوردیزانی باش بوومه ئاشنا و خۆشم لێ دەهاتن. کوردەکه ناوی ئەحمەد حەویّزی و عارەبەکه ناوی خالید بوو.

ڕۆژێک موهەندیس گوتی دەتنێرمه «بەدرە» یان «جەسان» کارمان هەیه. باغچەوانەکه تێیگەیاندم که ئەو دوو شاره ئاویان سوێره و هەوایان زۆر پیسه، گوتم ناچم.

- دەچیه نوعمانیه؟

کابرا چاوی لێ داگرتم، گوتم بەڵێ دەچم. دەگەڵ بەننایەک و دارتاشێکدا چوومه نوعمانیه که ئیدارەی پۆلیس تەعمیر کەینەوه و من سەرعەمەله بم. بیست فەعلەیەکی عەرەبی دەشتەکیم تەسلیم کرا و دەسمان به کار کرد. به قانوون دەبوایه کرێکار ڕۆژانەی له چارەگه دینارێک کەمتر نەبێ و هەشت سەعات کار بکا. بەڵام عارەب گوتەنی: «کێ دەبیه و کێ دەخوێنێتەوه؟» فەعله دوازده سەعات کاری پێ دەکرا و کرێیان ڕۆژانه سێ پەنجایی بوو. هەر وا دوای یەک دوو ڕۆژ هەستم کرد کرێکارەکان سرته دەکەن و له من دەڕوانن.

- برا ئەوه دەڵێن چی؟

- دەڵێن ئەو کابرایه هیچ له سەر عەمەلەیی نازانێ. ئەوانی پێش تۆ قسەی خۆشیان «سەگی کوڕی سەگ» و «قاحبه دایک» بوو. تۆ هیچ جنێومان پێنادەی؛ جگه له کاری دەوڵەت کاری خۆتمان پێ ناکەی! پێمان سەیره...

من و بەننا و دارتاش له وەتاغێکی چکۆلەدا دەژیاین؛ کرێکاریش له ژوورێکی زۆر بەرفراواندا - که عەنباری گێچ و سیمانیش بوو- دەنووستن. هەر له بەرەبەیانەوه تا تاریکان ده ناو تۆز و خۆڵدا هەڵدەسووڕاین. نیوەڕۆیان سەعاتێک وچانی فاعلان بوو. داروو‌جانی ناو برنج به بار له کووت دەفرۆشرا. فاعلەکان داروجانیان دەکڕی و به بەرد دەیانکوتا و له سەر تەنەکەیەکی ڕەش به ئاگری کۆنەقامیش دەیانکردە سەوله و دەیانخوارد؛ که وەک زەهری مار تاڵ بوو.

ڕۆژێک بەخشداری شار هات گوتی: ئەگەر هێندێک ماڵەکەم تەعمیر کەنەوه مەمنوون دەبم. گوتم: باشه وەختێکت بۆ دەدزم. پیاوێکی زۆر ناسک و هێمن و خەڵکی نەجەف بوو. ویستی نەجابەت بنوێنێ، به عەمەلەیەکی گوت: تۆزێک لەو نانەی خۆتم دەیه! گوتم مەخۆ! نەخێر، وەریگرت و نایه دەمی؛ دەسبەجێ تفی کردەوه و گوتی: تاڵه، ناخورێ. چاوم لێبوو فرمێسکی ده چاو تزا، ملی نا له جوێندان بەو دەوڵەته دەوڵەمەندەی خاوەن نەوت و داهاتەی عیراق، که هێشتا زۆربەی دەشتەکی عیراقی ناتوانن هیچ نەبێ نانی جۆ بخۆن و پەنا به داروو‌جان دەبەن.

سبەی ئەو ڕۆژه کرێکارم بردە ماڵەکەی. بۆ نیوەڕۆ گۆشت قەڵەموون و خۆرشت و پڵاوی زۆری داینێ. گوتم: جەناب! بەدبەختت کردن؛ تا چەند ڕۆژ تام له داروو‌جانەکەیان ناکەن و تازه تا مردنیش جەمێکی وا مەگەر ده خەون ببینن.

ڕۆژێک دیتم بۆ کرێکارێکی پیری کۆڵکێش خیزی زۆر تێدەکەن. گوتم: خاتری ئەو پیره

بگرن! باری زۆر گران مەکەن! لەو ڕۆژەوە بوومە موقەددەسیان و زۆر بە دڵ کاریان دەکرد کە لێیان نەڕەنجێم و ڕۆژێ بیست جار باسی ڕوحم کردنەکەمیان بۆ یەکتر دەگێڕاوە.

ڕۆژێک کرێکارەکان گوتیان کارمان بە قەبەڵ بۆ دانێ، زووتر مەرەخسمان کە کە جێژنە دەکەین. کاری خۆیان بە زیادەوە کرد و سەعات چوار گوتم بچن. پاش تاوێک گەڕامەوە خورمای زەهدییان لە پێش بوو. گوتم: خورمای زەهدی کیلۆی بە چوار فلس، بۆ جێژن کردن نابێ؛ ئێوە فریوتان داوم. یەکیان گوتی: چۆن نابێ؟ بە ئیمام حوسێن سوێندە کە ساڵێکە دمم لێنەداوە. سەد و پەنجا فلس بۆ ژن و ماڵم خەرج کەم یان خورما بکڕم؟!

شەوێک باران بوو، دەگەڵ دارتاش و بەننا بە چراگاز چووینە شەوارەی کۆتران، لە تەویلە کۆنێکی ئیدارەی پۆلیس؛ چوار کۆترمان گرت. دارتاش گوتی: کرێکار دێنم پێی چا دەکەم.

- دوو کۆتری بدەیە!

- کۆتری چی؟

- من ڕازی نیم بێگار بکەن.

- برا تۆ ناتەوێ زۆر ڕازی بن و کەیفیان ساز بێ؟ دە بڕوانە!

«بەدر» ناوێکی لە کرێکارەکان هێنا، پاکی کردن. لە نرخی ماندووبوونی، سەر و پێ و ڕیخۆڵەی کۆترەکانی برد و هەر هەڵدەپەڕی. چووم لە کونێکەوە خۆم لێ گرتن، یەک دەیگوت: کۆنە قامیش بسووتێنین سەرکارگەر تووڕە دەبێ. ئەوانیتر دەیانگوت: پیاوی چاکە دەمانبەخشێ. گوتم: بسووتێنن بزانم چ دەکەن؟ لاقە کۆتریان کەوڵ کردبوو، سەرەکانیان پاک کردبوون، ڕیخۆڵەیان شوشتبۆوە، خستبوویانە سەر تەنەکەیەک و نابوویانە سەر ئاگر و هەر بیستیان وێکڕا لە خۆشیان گۆرانیان دەگوت و چەپڵەیان لێ دەدا.

منداڵێکی شازدە ساڵە دەگەڵ کرێکاران بوو. ئێوارەیەک باوکی هات و دەگریا و کوڕەکەش گریا: چۆن پێتان نەگوتووم؟ برای چکۆلەی مردبوو؛ ناشتبوویان تازە خەبەریان دەدایە. کە من لۆمەی بابیم کرد، گوتی: دەترسام تۆ ئیجازەی نەدەی و کارەکەی لە دەست بچێ.

ڕۆژێک وەک هەموو ڕۆژان پاش کار چوومە مزگەوتی سوننی کە نزیکمان بوو دەم و چاو بشۆم. ئەو شارە چوار ماڵ سوننی و مەلایەکی لێ بوو، کاروباری مولکی پادشایان بەڕێوە دەبرد. لەو دەمەدا یەکێک لە مەلاکەی پرسی: مامۆستا شیعەش وەک ئێمە موسلمانن؟

- بەڵێ کوڕم ئەویش وەک ئێمەن.

گوتم: ئوستاد مەفەرموو وەک ئێمەن، بفەرموو ئەوانیش دینێکیان هەیە!

مەلا کە یەکێکی دم و چاو ئاوڵاوی کورتەباڵا بوو پرسی: خەڵکی کوێی؟

- کوردستان.

- ها کەرکووک!

- بەڵێ وەک کەرکووک!

- لە کوێ دەنووی؟

- لە ئیدارەی پۆلیس دەگەڵ دوو کەسان.

مەلا و ئەوانیتر گوتیان نابێ لەوێ بی؛ وەرە حوجرەی مەلا. حاجی عەبدوڕەحمانیش -کە مجێورە- نان و چات بۆ ساز دەکا.

هەر ئەو ئێوارە، مەنجەڵ و قاپ و قاچاغ و برینج و ڕۆن و زۆر شتی پێداویست گەیشتە



مزگەوت. حاجی کەتەی لێنا. حاجی چ حاجی؟ ڕیشێکی درێژی دوفلیقانەی ماش و برنج، بلندبالا، بێسەواد، قەت دەمی ڕانەدەوەستا، لە سەر یەک قسەی دەکرد، تێنەدەگەیشتم دەڵێ چی، بۆ خۆشی نەیدەزانی چ دەڵێ! قسەکانی دەتگوت دیوجامەی کەوگرتنە؛ هەر پینەی لە ڕەنگێک و لێکی دەدان و دەیپرست تا خەو بە لایدا دەیبردمەوە. مەسەلەن دەیگوت: بەسرا دووره، شبلی پیاوی خوا بوو، لە بەغدایە گەرمایە، ماستی گامێش شلە، جەواهیرول قەلاید، بایەزیدی بەستامی، سەدەی غەراف، عەبدولقادر فادخلی جەننەتی... ئیتر لەو قەبیلە قوماشە لە دووی دەدا. منیش هەر بۆ سبەی شەو دەفتەر و میدادم ئامادە کرد هەرچی دەیفەرموو، دەمنووسی. بەزمێکی سەیری لێ دەرچووبوو. بە داخەوە فەوتا.

ڕۆژانە حاجی کلاوێکی لۆتی چەقۆیانەی لەسەر دەنا؛ هەژ-نۆ ئاوێنە و لیزگە مووری پێوە کردبوو. سواری دارێک دەبوو بە کۆلاناندا ڕمبازێنی دەکرد. دەیگوت هەتکی نەفسە و ئەولیا وایان کردووە. سەد منداڵی وە دوو دەکەوت و دەیانکردە قریوە. بە ڕاستی حاجی لە کن سوننی و شیعەی شار بە ئەولیا ناسرابوو. شۆفیران هەزار سوێندیان دەخوارد کە حاجی بە پێ و ئەوان بە ترومبیل ڕۆیشتوون، حاجی دەپێشدا گەیوەتە بەغدا! حاجی نامەی لە بەغداوە بۆ دەهاتن؛ من بۆم دەخوێندەوە. ژنە وەزیر و جێ گەورە داوای نوشتەیان لێ دەکرد؛ دەعوەتیان دەکرد کە بە سەریان کاتەوە. دیار بوو لە بەغداش بە ئەولیای دەزانن. نوشتەکانیشی هەر خۆم بۆم دەنووسی کە دە پێشدا مەلا بۆی نووسیبوو.

ڕۆژێک لە پاش کار و چاوشوتن، بە جادەدا دەچووم، تووشی کتێبخانەی شار بووم. هەر چوومە ژوور کابرای کتێبدار یەکپێ ڕاستەوە بوو؛ بە غار ئاوی سارد و چای بۆ هێنام؛ لە پەیتا کتێبی دینا و قوربان قوربانی بوو! زۆر لە خۆم دڕدۆنگ بووم: ئەم کابرایە کە نامناسێ، ئەو کلکەسووتەی لە چییە؟ بە زمانێکی زۆر لووس گوتی: خێره لێرەی؟!

- سەرعەمەلەم و کار دەکەم.

- قوربان! من تۆم لە «شوعبەی خاسە» دیوە؛ هەرچی دەفەرمووی دە بەر ئەمرت دام!

کابرام بۆ کەر بووە بۆ دەنگ بکەم؟! زۆر درەنگ زانیم «شوعبەی خاسە» بە ئیدارەی پۆلیسی سیڕی دەڵێن. ئەو کەرە منی لێ گۆڕابوو؛ خراپیش نەبوو!

شەوانە دەچوومە قاوەخانە؛ تەویلەیەکی زۆر درێژ و پان، پڕ لە نیمکەتی ڕەقی درێژ، عەکسی جوجک و مریشکی ئینگلیسی، جۆرج و ئەلیزابت، کچی کافرۆش و هەزار جینجر- فینجری دی بە دیواراندا کرابوو. نیمکەت هەموو پڕ دەبوونەوە و دەبووە هەرا و چەقەقەیەک مەگین خوا بزانێ. من کە هیچ کەسم نەدەناسی، دەفتەر و میدادێک و خۆم کردبووە خەبەرنیگاری خۆم! کەچەڵەکان، یەکچاوەکان، زگزلەکان و لووتخوارەکانم دەبژاردن. ئەو جار قسەم دەنووسینەوە: چەند ماسیت گرت؟ گامێشت کڕی؟ تازە لە بەغدا هاتمەوە، چوومە زیارەتی کەربەلا... هەرچی دەیانگوت دەمنووسیەوە.

شەوێک پەیمانکار هات کە بە کرێکارەکان بڵێ: بارە گێچ و خشتی بەتاڵ کەن. چووم پێم گوتن: نەچن بە بێ پووڵ بیکەن! داوای دە دینار بکەن. گوتیان: هەر بە خۆڕاییمان کردووە!

- هەتیو ڕۆژێ دوازدە سەعات کار دەکەن؛ شەو هی خۆتانە!

کارگەر ئیعتسابیان کرد و کابرا ناچار گوتی شەش دینار دەدەم. فەورەن گوتیان باشە! ڕانەوەستان بۆیان زیاد کرێ. پەیمانکار زۆری ڕق لە من هەڵگرتبوو. ڕۆژێک ڕیزە خشتم

دەبژارد، گوتم: چەندن؟
- دوازدە هەزار.
- نەخێر ئەوەندە نین.
قیڕاندی: تۆ دوژمنایەتیم دەگەڵ دەکەی! پووڵێکی نا گیرفانمەوە. پووڵەکەم دایەوە، گوتم: شازدە هەزارە و چوار هەزارت لە بیر چووە. بەرتیلم مەدەیە و هەقی کارگەرانیش مەخۆ!
کارمان تەواو کرد؛ موهەندیس هات گوتی: لە حیسابێ کە من کردوومە، حەوت هەزار دینار لە پێشین؛ چونکە نەتهێشتووە دزیم لێ بکرێ. تا ئێستا حقووقت مانگێ دوازدە دینار بووە، بچۆ بەغدا چەند وەرەقێک وەرگرە تا بتوانم بۆت بکەمە هەژدە دینار. کەچی بەو حاڵەش دەرچوو کە لە ئیدارەی تەلەفۆنات چل گفتوگۆی نێوان نوعمانیە و کووتیان زیاد لە سەر حیساب کردووین!
لە بەغدا کارەکانم کرد؛ وەرەقەی عەددەمە مەحکوومیەتم مابوو، شەش ڕۆژ هەر دەچووم، کۆمەڵێک ئەفسەری دەرەجەداری گەورە دەیانگوت سبەی وەرەوە! ڕۆژی شەشەم پۆلیسێک لە دەرگا پرسی: چ بوو؟
- دەڵێن سبەی!
- کاکە چارەگە دینارێکم دەیە!
گورجێ ڕۆیشت و وەرەقەی بۆ هێنام. سوێندی خوارد کە تەنیا سەد فلسی بەو گەیوە و سێ پەنجایی داوە بە ئەفسەرە زەلامەکان!
تا هاتمەوە کووت، موهەندیس تەسادوفی کردبوو؛ بردبوویانە بەغدا. هاتمەوە بەغدا؛ دەگەڵ مەحموود ئەحمەد بوومە هاومەنزڵ؛ کە ماوەیەک لە بەغدا ماڵ و منداڵی دەگەڵ بووە و خەرجی دەرنەبردووە؛ ناردوونیە سولەیمانی و ژوورێکی لە خانوویێکی هەشت ماڵیدا گرتبوو؛ بە تەنیا دەژیا. مەحموود نیوەی ژیانی لە زیندان‌دا گوزەراندبوو؛ سەری زۆر لە گۆنگەڵ دەخورا. لە پەرژ و بڵاویشدا وەک من کۆڵەوار بوو. شەوانە ئارەقی هەرە گرانی بە لیوانێکی لێو قرنجاوی شکاو دەخواردەوە؛ بە جووتەش چامان پێ دەخواردەوە. دەبوو لێو بگێڕین خۆ لە قرنجاو لا دەین؛ نەوەک بریندارمان کا! لیوانم دەکڕی دەیشکاند کە من وام پێخۆشە بەو لیوانە ڕایبوێرم! جارجارە دەعوەتی گۆرانیبێژ و مۆسیقادانی دەکرد؛ بەڵام لیوان هەر نەدەگۆڕا!
شەوانە جلی کوردی دەبەر دەکرد و دەردەچوو. دەچووە قەحبەخانە، یەکێکی بانگ دەکرد: پووڵەکەت دەدەمێ و کارم هەر ئەوەندە پێتە بۆم بگێڕیەوە چۆن گەیشتوویە ئێرە و سەرگوزەشتەت چییە؟... چەند جارێک لە لایەن گەوادانەوە دارکاری کرابوو. ترسابوون قەحبەکانیان لێ بفڕێنێ. ئەو چیرۆکانەی کۆ کردەوە و لە چاپی دا بە ناوی «لە سایەی دەربەگیدا». هەر فۆرمەیەکی دەردەچوو دووسەد دانەم پێ دەهێناوە ماڵێ. کتێب لە چاپ دەرچوو، گیرا و مەحموودیان گرت.
پاش بیست ڕۆژ بەردرا. کتێب نرخی بیست و پێنج فلس نووسرابوو. کە لاوان بیستیانەوە خاوەنی گیراوە و نووسراوە سووتێنراوە، بۆی دەگەڕان. هەر نوسخەم بە دووسەد فلس فرۆشت و کە هاتە دەر، بارێکم پارە بۆ وە سەر یەک نابوو.
بۆی گێرامەوە کە ئەو دەم هێشتا ماڵ و ژنی لە بەغدا بووە و بۆ چیرۆک چۆتە قەحبەخانە، نیوەڕۆیەکی گەرما، ژنێک خۆی بە ماڵا کرد. یەک لەو ژنانە بوو کە مەحموودی ناسیبوو: کاکە مەحموود هەڵاتووم؛ بیکە بە خاتری پیاوەتیت ڕزگارم کە! هەر ئەو دەمە ترۆمبیلێکی گرتووە و

بردوویە تا قەراغ شاری سولەیمانی و گەڕاوەتەوە. پاش چەند مانگێک ڕێگەی کەوتۆتە شێخە دێیەک، لە حەساری تەکیە سۆفیەک پێی گوتووە: وەرە دایە خانمی حەرەمی شێخ بانگت دەکا. کە دەچێ، دایەخانم هەمان ژنە. خانم شانی ماچ دەکا:

- کاکە مەحموود! قەت لە منەتت دەرناچم.

- دایکم! بە غەڵەت چووی؛ بە خوا نە دەتناسم، نە ناوم مەحموودە؛ لێت گۆڕاوە.

خانم دەگری و دەڵێ: بە ڕاستی پیاوی...

- نا نا، دایکم! بە خودا ناتناسم، خوداحافیز.

لە سۆفی و مۆفیانم پرسی: دایە خانم چۆن ژنێکە؟ ئەوەندەیان تاریفی خێرەومەندی و ئیمانداری و بەزەیی گێڕایەوە کە باس ناکرێ.

مەحموود بە عاقیدە چەپی بوو؛ بەڵام لە حیزبی کۆمۆنیست و پارتیدا ئەندام نەبوو؛ هەردووک لاش خۆشیان دەویست. زۆر دڵاوا بوو. جارێک لە بەر دوکانەکەم کابرایەک سرتەی دەگەڵ کرد؛ مەحموود ڕۆیشت و زوو هاتەوە، سێ دیناری دا بە کابرا. کابرا ڕۆیشت.

- مەحموود ئەو سێ دینارەت لە کوێ هێنا؟

- کاکە ئەو پیاوە گوتی پووڵی سەفەرم پێ نییە. چوومە هەڕاجە بازاڕ کۆتەکەم بۆ فرۆشت!

زۆر کاری سەیرترم لە مەحموود دیوە؛ بەڵام پێویست ناکا زۆرتری لە سەر بڕۆم.

دوای هاومالیم دەگەڵ مەحموود ڕۆژێک لە ڕۆژان خانووەکەیان تێکداین کە تازەی کەنەوە. مەحموودیش خۆی نەقڵ کردە سولەیمانی و ناچار سیپالم بردەوە ماڵی مام حوسێن!

تووشی برادەرێک بووم گوتی: وەرە من هەشتا دینارم هەیە. دوکان بە شەریکی دەکەینەوە؛ مایە لە من و کاریش لە هەردووکمان. دوکان نەبوو، دەبێ بڵێم تاقەیەکی پەل بوو لە دیواردا. هێندێک وردەواڵە و کتێبمان لێ دانا. لە بەیانی زووەوە تا نیوەشەو بە نۆرە لە دوکان دەبووین. خواردنمان سەموون و شەربەت بوو. زۆر ماندوو دەبووین و کەممان دەست دەکەوت. کتێبفرۆشێکی شیرازی لە بازاڕی کتێبفرۆشان خۆی کردە ئاشنامان؛ بە دەمیش زۆر کۆمۆنیستی غەلیز بوو. چەند کتێبی داینێ، گوتی مەمنووعە بەڵام زۆر خێر دەکەن. نازانم چۆن بوو کتێبمان نەهێنابووە دوکان، لەپڕ پۆلیس هاتن دوکانیان پشکنی و سەلامەت دەرچووین. دیار بوو کاکی شیرازی وەک قرژاڵ بە دوو سەر دەڕوا.

دوو مانگی نەکێشا شەریکەکەم وازی لە دوکانداری هێنا. حیسابێکی کرد گوتی: دوازدە دینارمان زەرەر کردووە؛ بدە شەش دینار!

- کاکە خۆت دەزانی شەش ئەسپێ شک نابەم!

هەر چۆنێک بوو بەخشیمی و یەک فلسم دەست نەکەوت.

لەو دوکانە ڕۆژێک منداڵێکی دە- دوازدە ساڵە هات پرسی: ماڵی ئیمامی لە کوێیە؟ من خەڵکی سابلاغم، ناوم عەزیزە و لە ماڵی نانەوام. ئیمامی مێردی خوشکم لە بەغدایە و سۆراغی ناکەم. دەگەڵیا چوومە ماڵی براگەورەی ئیمامی کە ناوی محەممەد بوو.

پاش دوکان فرۆشتن بێکار مامەوە. یەرمیای جوولەکە دیسان وەک فریشتە دە هاوارمەوە هات. دوکانێکی چکۆلەی بەتاڵی بێ بەرقی پەیدا کرد لە سەر خەیابانی ڕەشید؛ لە لای حەیدەرخانە. هێندێ قەفەسە و جامەکی بۆ کڕی و شتومتی وردەوپردەی تێ خست؛ گوتی: سەد و پەنجا دینارم پێ قەرزداری. ئەگەر بووت بمدەوە؛ دەنا گەردنت ئازاد بێ. مەشترسە! من

هەموو ڕۆژ پاش نوێژان دێمە لات و فێرە کاسبیت دەکەم. بەرق بە نۆرە بوو؛ دوکان و ماڵی وا هەبوو بە سێ ساڵ نۆرەی نەدەهات. یەرمیا جوولەکەیەکی کارمەندی بەرقی ساز دابوو کە بە سی و پێنج دینار بەرتیل، بەرقی بۆ بدزێ. نوێژی شێوانێک دوو کرێکار بە ناردیوانەوە و کابرای کارمەند هاتن و بووینە خاوەن بەرق. ڕووی کردە یەرمیا:

- دە بدە سی و پێنج دینار.

- هەی جوولەکەی سەگ دین! تۆ دزی لە دەوڵەت دەکەی؟ دەبێ لە زینداندا بترزێنن.

کابرا تۆقی؛ خواخوای بوو هەڵێ. بە تکای من کە خوا هەڵناگرێ، پێنج دیناری دایە.

لە دوکان زۆر نەزان بووم. ئەو هەموو وردە شتە چۆن بناسمەوە؟ لە سەری هەموو قوتووەکانم نووسیبوو. ماوەیەکی زۆری ویست تا شارەزایی تەواوم پەیدا کرد. یەرمیا ڕازی نەبوو کتێب بفرۆشم بەلام بە قسەم نەکرد. بە بەر کتێب فرۆشتنەوە، مەجەللە و ڕۆژنامەشم دادەنا. دەبوایە سەعات چواری بەیانی -کە هێشتان تاریکان بوو- بچمە دەفتەری ڕۆژنامە دابەش کردن. پتر لە سێسەد منداڵ و جوان و پیری لێبوو؛ هەرا بوو. لە هەر ڕۆژنامەیەک -کە ئەوسا نزیکەی دوازدە ڕۆژنامە دەردەچوو- چەند ژمارەیەک وەرگرم. لە دە فلس دوو فلس بۆ خۆم. ڕۆژی دوایی نەفرۆشراو بەرمەوە و تازەم دەنێ. ناوی دوکانەکەم نابوو «مەخزەن شوهەدا» بە یادی ئەوانەی کە لە خۆپیشاندانەکانی بەغدا کوژراون. بلاوکراوەکانی حیزبی شەعبم دەفرۆشت کە «عەزیز شەریف» و «ڕەحیم شەریف» دەریاندەکردن و دەستەچەپی بوون.

«حیزبی ئیستقلال» دروست ببوو؛ دژی دەستەچەپیان بوو. هەموو ئەندامەکانی، وەک هەموو عەرەبی‌تر، لات و چەقۆکێش بوون و هەر ترساندنیان دەزانی. شەوێک هاتنە سەرم، ملیان لە شکاندنی جامخانە و دڕاندنی کتێبان نا، کە «بۆچی ناوی دوکانت شوهەدایە؟». «ڕەحیم شەریف» بەیانی ناردی کە قەرەبووی زیانم بکاتەوە و شکایەتم بۆ بکا، گوتم لێم خراپتر مەکەن و هیچم ناوێ. ڕۆژێکی‌تر پۆلیس هات و دووسەد کتێبۆکەی چەپی لێ زەوت کردم. ئیتر یەرمیا نەیهێشت چیتر کتێب و ڕۆژنامە بفرۆشم. دوکان بە پتەوی کرا بە خەرازی؛ ناویشمان کردە «موختار». یەرمیا دەگەڵ خۆی بردمیە ناو بازاڕ. بە جوولەکانەوە گەڕاین کە عومدەفرۆش بوون و هەموویان دەیانناسی و لە کاری فرۆشتنا زۆریان ئیحتیاج بە دەلالی بازاڕ بوو. دەیگوت: ئەم کوڕە ئامۆزامە و بابی موسڵمان بووە؛ هەرچی دەیەوێ بیدەنێ و من زامنم. بە قەولی شێخ ڕەزا: «من کە یەک پارەیی جلقم لە ئەزەل شک نەدەبرد»، هەمیشە بایی سێسەد تا چوارسەد دینارم ئامانەتی جوولەکان لە دوکاندا هەبوو. هەموو پێنج شەموان داخڵەم حیساب دەکرد؛ بۆ هەر عومدەفرۆشە شتێکم دەبرد و شتی تازەم وەردەگرت. ئێواران یەرمیا دەهاتە لام و دەرسی کاسبی فێر دەکردم. لە هەواڵەتی و ڕێ شاندانی ئەوڕا زۆر باش ڕوون بوومەوە کە جوولەکە چەند لە موسڵمان و عەرەب و مەمانان زیرەکترن. دەمدی کە هەموو ئابووری عیراق و بازاڕی بەغدا سەری بە جوولەکەوە بەندە و هەموو هاوردەیەک لە دەستی ئەوانەوە بە عەرەب و بازرگانی عیراق دەگا. لەوانەی کە خۆم لێم دیون چەند نموونەیەک دەگێڕمەوە:

ڕۆژێک یەرمیا دەگەڵم هات عەتر بکڕین. زۆر جۆرە عەتری بە مارکی فەڕانسە و ئەڵمان و ئسپانیا و کوێ و کوێ هەبوو. یەرمیا گوتی: غەزەبتان لێ بارێ! هەمووی لێرە دروست کراوە! توخوا ئەگەر هەتانە عەترێکی ۷۷۷م بدەنێ بۆ خۆم، کە عەسلە. شووشەیەکیان بۆ هێنا؛ بۆنی کرد گوتی: بەڵێ ئەوەم دەگوت کە خاریجییە. کابرا جڕتێکی بۆ کێشا: مردووت مرێ بۆ



کەریەتیت! سی سالیشە هیچ عەترێکی خارجی نەهاتۆتە بەغدا، هەمووی دەسکردی خۆمانە!

بەرەجێژنان بوو، چووینە بازاڕی «شۆریجە». تاوێک بە دالانێکی تاریکدا ڕۆیشتین. بە گاڵتە گوتم: یەرمیا دەڵێن جوولەکە بۆ جێژنە فەتیرە، محەممەد ناوێک دەتەلیس دەنێن و شووژن ئاژنی دەکەن؛ کوڕە من باوکم ناوی محەممەد بووە، بۆ کوێم دەبەی؟! پێکەنی. سەرمان لە عەنبارێک دەرهێنا. مەنجەڵێکی یەکجار زەلامی تێدا دەکولی. دەگەڵ چەند کەسێک بە جوولەکانە کردیانە قلی و بلی.

- بچین مارک هەڵبژێرین.

دەسکاری ئالمان، بریتانیا، ئیتالیا و... وەک تەمری پۆستە، شووشە لە کۆما هەڵگرین.

چکۆڵە، ناوەنجی، بە گرنج، ساف، بوتڵی ئاسایی. نرخی شووشە و مارک بڕا و ڕۆن بە خۆڕایی. ڕۆنی سەرمان بۆ هات، یەرمیا نرخی بۆ دانان. بوتڵی پڕ شێست فلس، شووشەی هەرە چکۆڵە چوارسەد، ناونجی و بە دەرەجە لە سەتەوە تا سێسەد و دیاریشە ئەڵمانی لەوانیتر بەنرخترە!

لە جێژنەدا هەموو شووشە ڕۆنەکانی سەر فرۆشران جگە لە بوتڵە سادەکان، کە هەموشیان یەک ڕۆن بوون و لە یەک مەنجەڵ تێکرابوون!

کوڕێکی چکۆڵەی حەوت ساڵەی هەبوو. ڕۆژێک هاتە بەر دوکان. گوتم:

- گورجی! ئەو دوو دەستە گۆرەویە بۆ بابت بەرە بیگۆڕێتەوە، نافرۆشرێن.

- مامە ئەوە نرخیان چەندە؟

- تۆ چت بەو قسانە داوە؟

- جا بۆ پێم نالێی؟

- جووتی بە حەفتا فلس کڕاوە.

دوای دوو سەعات یەرمیا هات. ڕەنگی پەڕیبوو:

- گورجی کوڕم گوم بووە، کەس نازانێ چی بە سەر هاتووە.

- من دیتوومە و بۆم گێڕاوە. بە ڕاکردن ڕۆیشت. گوێی گورجی گرتبوو بە گریان هێنای:

- ئەم هەتیوە لە سەر پرد گۆرەویەکانی دەفرۆشت! تاقە دوو جووتی ماوە و هەمووی بە نەوەد و سەد فرۆشتووە!

بەڵێ، بێچووی مشک هەنبانە دەبڕێ...

نسحەتی دەکردم دەیگوت: ئەگەر تۆ لە سەر ئەم خیابانە قەوغایە دەسرەیەک ڕاخەی، لە سەد کەس یەکێک چوار فلسی بخاتە سەر تا ئێوارە زۆرە. دەسا ئەگەر مشتەری بە نرخی تۆ ڕازی نەبوو، چەنەی لێدا، ئەگەر ماڵەکە سەدی یەکیش خێر بکا، بیدە؛ با نەچێتە جێگەیتر. بازاڕ نزیکە و دەیکڕیەوە.

موسڵمان و جوولەکەیەک لە دەم بازاڕی شۆریجە شەمچەیان دەفرۆشت. مایەی قوتووە شەمچە چوار فلس بوو. موسڵمانەکە دەبوو بە پێنج فلسی بدا تا فلسێک خێر بکا؛ جوولەکە دەیدا بە چوار فلس. جووە ڕۆژێ پێنج سندووقی دەفرۆشت و موسڵمان بە حاڵ نیو سندووق. ڕۆژێ بە جنێودان جووەی داگرت و ملی گرت کە: تۆ بۆ کەسادی من ئەوە دەکەی! جووە گوتی: نا برا، من هەموو ڕۆژ دوو دیناری سندووقە بەتاڵەکان خێر دەکەم!

جوولەکەیەک هاتە دوکان. تێری چاک و خۆشی دەگەڵ یەرمیا کرد. گوتی کراسێکم دەیە. کراس مایەی دینار و سەد فلس بوو. یەرمیا گوتی: نۆسەد فلس. من لێم هەڵقورینجاند کە

زەرەرمانە. لێم مۆڕ بۆوە. مشتەری نەیکڕی و گوتی گرانە و ڕۆیشت. یەرمیا گوتی: دەزانم مایەی چەندە. ئەم جوولەکەیەش دەناسم چەند قیرسیچمەیە. ڕاوەستە تەپکەم بۆ ناوەتەوە. سبەی ئەو ڕۆژە ئێواریٚ هاتەوە. جگە لەو کراسە، یەکجار زۆر شتی مالەوەی کڕی و چەقەی نەکرد. کە حیسابم کرد حەوت دیناری زیاد لیٚ ساندبوو!

دەیگوت: ئەگەر ژن مشتەری بوو، سوێند بە چاویان، بە سەری منداڵیان بخۆ! دەنا بە خودا و قورعان بەهرە نادا. ئەگەر مشتەری شووشە عەتر یان شتێکیان کڕی و گوتیان ئەگەر خراپ بیٚ دەیهێنینەوە، قبووڵ بکە! موسوڵمان زۆر تەنبەڵن؛ لە سەتی یەکی حەوسەڵەی نییە بۆت بێنێتەوە. هەمیشە شتێک کەمتر لە نرخی بازاڕ بفرۆشە. لەوانەی لێت نزیکن و زۆریان دەبینی قەت زیاد مەستێنە. ناوی فرۆشیاری ڕاست، سەرمایەیەکی گەورەیە.

خولاسە لە سایەی ئەو مامۆستایەوە زۆر شارەزای ئاڵوگۆڕی دوکانداری بووم. کارەکەم بە گوێرەی دەسمایە کەمەکەم، یان بلێم دەسمایە قەرزەکەم باش بەڕێوە دەچوو. جیٚ خەویشم هەر لای مام حوسێن و دیوەخانی نەقیب بوو.

ڕۆژێک «عەزیزی نانەوا» (منداڵەکەی باسم کرد) هاتە بەر دوکان، زۆر کز بوو. گوتم: وابزانم بیٚ پووڵی. من چەندێکت بە قەرز دەدەمیٚ، دوایە بمدەوە. لەپڕ گریا؛ دەردی دڵی کرد کە لە ماڵە ئیمامی و خوشکی نارازییە و نایەویٚ دەگەڵیان بژی. کوردە؛ سابلاغییە؛ منداڵە؛ بەغدا پڕە لە سەگ و گورگ؛ چۆن بێلم هەڵوەدا بیٚ؟ ڕازیم کرد کە پێکەوە بژین. وازم لە ماڵە مام حوسێن هێنا. ژوورێکم لە ماڵێکی نیزیک دوکان لە ژنێکی کۆنە ئەرمەنی تازە موسڵمان بە کریٚ گرت. ناوماڵێکی قشپیلەم کڕی و دەگەڵ عەزیز تیا ژیاین. حەولی کارم بۆ دا. حەمە عەلیەکەی هاوکاری حوزنی، کاری لە چاپخانەیەک بۆ پەیدا کرد؛ ڕۆژی بە چارەکە دینارێک تا فێرەکار دەبیٚ. قەرار درا حقووقەکەی کۆ کاتەوە بۆ ڕۆژی خۆی و داهاتی من بەشی هەردووکمانی دەکرد. ڕۆژێک کە هاتمەوە ماڵ، بۆی گێڕامەوە کە ئیمامی گوتوویە: لای هەژار بی و نەیەوە لام، وا دەکەم، وابچیٚ! وا بزانم پووڵی لێم دەویٚ. ڕاستی کرد؛ بە شەش دینار سەرانە، هەرا داکوژا و پارەکەم دا. ڕۆژانە من لە دوکان و عەزیز دوای کاری چاپخانە پێویستی ماڵی دەکڕی.

ئیمامی لە هەوالانی «ژیٚ-کاف» بوو؛ هەڵاتبوو. ماوەیەک لە سولەیمانی دەگەڵ قزلجی و سەمەدی -کە ئەویش هەر هەوالێکی سابلاغی و ئاوارە بوو- لە ماڵی شێخ لەتیف ژیابوو. ناردبووی ژنی بۆ هاتبوو. لای موهەندسێک لە بەغدا بە سەرعەمەلە دامەزرابوو. تەنیا عەیبێک کە لەو ئاوارەییەدا لێی پەیدا ببوو، خۆهەڵکێشانێکی بێتام و درۆی زل بوو. لای من دەیگوت: سەرعەمەلە نیم، هاوکاری موهەندیسم! سەعات هەشتی بەیانی، شوفێرێک بە ماشێنی ئاخر مۆدیلەوە دیٚ لە دوام و دەمباتە سەر کار و ئێوارەش دەمهێنێتەوە! بە هەڵکەوت دوو دینارم کەوتبووە سەر کرێکارێک، گوتیان لە مەدینەی مەنسوورە. بەیانیەکی زۆر سارد، سەعات چوار، سواری خەت بووم کە بچمە قەرز ساندنەوە. کابرایەک لە سووچێکەوە لە سەرمان هەڵدەلەرزی، کە دنیا ڕووناک بوو دەبینم ئیمامییە! ناچارە بەو بەرەبەیانە ساردە، بە ئوتووبووسی شەق و شڕی تایبەتی دەرەوەی بەغدا بچێتە سەر کار!

ڕۆژێک بە بۆلەبۆڵ هاتە لام: «بڕوانە ئەو قزلجی و سەمەدییە سەگبابانە چییان بۆ نووسیوم؛ شەرت بیٚ بیانبینم بەر شەقیان دەم!». لە نامەکەدا نووسرابوو: کاکە! نامەکەتمان خوێندەوە. زۆر شادین کە سازی. نووسیبووت من لە بەغدا ڕۆژیٚ دوو پاکەت دەخۆم. نەتنووسیبوو دوو

پاکەت چ دەخۆی، تەواو نیگەرانین!
لەسەر شات و شووتی -کە لە سابلاغ وابووە و واچووە- پۆلیس گرتی و ڕەوانەی ئێران کرایەوە.
ڕۆژێک لەپڕ زەبیحم دیتەوە کە لە ناسرییەوە ڕایکردبوو. پێک شاد و شوکور بووینەوە. ڕۆژی دوایی بەرەو سولەیمانی ڕۆیشت. دوایە بۆی گێڕامەوە کە لە سولەیمانی خۆی کردووە بە دوکانی عەلی مەدهۆشی خەیاتی شاعیردا، دوور و درێژ چیرۆکی هەڵاتنی بۆ گێڕاونەتەوە و تێری باسی کەساسی خۆی بۆ کردووە. گوتی لە جوابما هەر هێندەی گوت: «گوایە ئێستا داماوی!».
«برایم نادری» -کە دەیگوت کرماشانیم و خانەقینی بوو-لە مەهاباد بەرپرسیاری فەرهەنگ بوو. حکوومەت گرتی؛ دوای چوار ساڵ بەرەڵا کرا. هاتە دوکانەکەم لە بەغدا؛ گوتی دەچم دەبمە سەربازی لوژیۆنی فەڕانسی لە ئەفریقا. لە سووریە گیرساوە و پێناسێکی بە ناوی ئەحمەد حەمدی پەیدا کرد و هاتە شام. عەرەبی و ئینگلیزی باش دەزانی؛ لە ئیدارەی لوولە نەفتی عیراق- سووریە بە موتەرجیم دامەزرا. سووریا ئەفسەری بێگانەشی دەویستن کە مەشق بە لەشکر بکەن. دەورەی ئەفسەری لەتاران دیبوو. سەنەدی نیشان دا و بە وادەی ساڵێک بە ڕوتبەی سەروان وەرگیرا. ساڵەودوا بۆی تازە نەکرایەوە. عەرەبستانی سوعوودی ئەفسەری سووری دەویستن کە لە «تایف» دەرس بڵێن. «شیشەکلی» برایمیشی وێڕای ئەفسەران نارد. لە تایفەوە کرا بە حاکمی نیزامی لە «دەممام». پوولێکی زۆر باشی پێکەوە نا و هاتەوە شام و ژنێکی دەوڵەمەندی هێنا کە خانووی هەبوو. عیمارەتێکیشی کڕی. قەرار بوو ببێتە مدیری بانکی عەرەبی، فەرعی قامیشلی؛ لە ڕێگە، دەتەییارەدا سووتا.
یەرمیا کەس‌وکارم بوو؛ بەڵام دایکی لە خۆی بەڕوحم‌تر بوو. ئەوەندە تاسفی سابلاغیگەریەتی هەبوو باس ناکرێ. هەر چێشتێکی سابلاغیانەی لێنابا، ئەگەر من لێم نەخواردایە، دمی لێ نەدەدا. قەت پیرێژنی هێندە نوورانی و دڵسۆز بە کوردم نەدیوە. لە ماوەی دوکانداریمدا زۆر شتی سەرنج ڕاکێشم دەدیت و بە لامەوە سەیر بوون، بەڵام کەمم لە بیر ماون:
لە دوکانەکە رووبەندی ڕەشی ژنانە زۆر دەفرۆشرا؛ بەڵام هەر لە ئێوارانی نیزیک نوێژی شەواندا موشتەریم بۆ دەهات و ئەویش هەموو جار پیاوی تازە لاو بوون. بە لامەوە زۆر پێچەوانە بوو. بۆ پیاو دەکڕن و ژن ناکڕن؟ بۆ هەر لە تاریکی تەنگی نوێژی شەواندا دەیکڕن؟ تێگەیشتم کچ یان ژنی بێ رووپۆش کە دەیانەویست بە دزی کەس وکاریان دەگەڵ عاشقیان دەرکەون و بچنە سینەما و جێگەی نادیاری، چارشێویان بە خۆدا دەدا، بۆ ئەوە دوکاندار نەیانبینێ. کوڕەکەیان دەنارد پەچەشیان بۆ بکڕێ و لە ڕێگە نەناسرێنەوە و کەیفی خۆیان بکەن. شیعرەکانی ئیرەج میرزام هاتەوە بیر کە دەربارەی حیجابەوە گوتبووی...
جارێک شێخ عارەبێکی زۆر بە کەش و فش و سمێڵ بابڕ لە ماشێنی کادیلاک دابەزی و هات. گوتی: سوبغت هەیە؟ (سوبغ واتا ڕەنگ بۆ کەوش و دیوار و هەرچی).
- بەڵێ هەمە. و گورجێ دوو قوتووی ڕەنگی کەوشم بۆ هێنا.
بە مۆڕیکەوە تماشای کردم:
- تۆ کوردی؟
- بەڵێ.
- لە مێژە دوکانداری؟



- نەخێر تازەم.
- وا دیارە زۆر ناشارەزای. ئەگەر وا نەبا دارکاریەکی باشم دەکردی! ڕەنگی کەوشانم بۆ دێنی کە سمێڵی پێ ڕەش کەمەوە؟!
باوەڕ کە تازە زانیم کە سمێڵ و تووکە سەریش ڕەش دەکرێنەوە و دەرمانی تایبەتی خۆیان هەیە!
ڕۆژێک پێش جێژنی کریسمیس، ژنێکی زۆر بەسەروسیما چەند پارچە جلێکی جێژنی لێ کڕیم. دیتم لێوی خۆی گەزت. چوار جووت گۆرەوی مندالانەی دامەوە، گوتی پوولەکەم دەرێناهێنێ. جێژن و مندال بێ گۆرەوی؟ زۆر ناخۆشە.
- خوشکم گۆرەویەکان هەر دەبێ بەری. وا دەزانم لەو سەودایەت قازانجم نەکردووە.
هەرچی گوتی نابێ، بە زۆر ڕازیم کرد بیبا. دوای دوو ڕۆژ پیاوێک هات:
- بۆچی گۆرەویت دا بە ژنێک و پوولت نەستاند؟
- پێم خۆش نەبوو مندال لە جێژنەدا بێ گۆرەوی بن.
- برام تۆ دەبوو شاعیر بی؛ بۆ دوکاندار نابی. جارێکیتر کاری وا مەکە.
پوولەکەشی دامێ.
ژنێکی زۆر بە دیمەن موحتەرەم، کاغەز و پاکەتێکی کڕی. گوتی: قەڵەمت پێیە؟
- بەڵێ.
- ئیجازە هەیە لە سەر جامخانەکەت نامەیەک بنووسم؟
- فەرموو.
نامەی بۆ مێردی نووسی کە ئەفسەرە و لە جەبهەی فەلەستینە. سوپاسی کرد و ڕۆیشت. خانمی موحتەرەم دە ڕۆیشتندا شووشەیەکی گەورەی پڕ لە شوکولاتی دابووە بن چارشێوەکەی و لێی دزیبووم!
مەلایەکی پیری پشت کۆڕی لەرزۆکی ڕیش دوفلیقانە و تەنک، لێی پرسیم: هەل عیندەکە جەورەبوون؟ (گۆرەویت هەیە؟). پێم فەقیر بوو؛ ویستم قازانجی لێنەکەم. گوتم: نرخی سەت و بیست و فلسە.
- وللاهی چونکە کوردی لە تۆ ناکڕم؛ دەستم دەبڕی!
پاش نیو سەعاتێک هاتەوە، جنێوی دەدا:
- ئەو بەغداییە سەگبابە عەرەبی نازانن؛ کەچی گاڵتە بە من دەکەن!
- مامۆستا گیان! تۆی کە چاردە قەرن بە جێ ماوی. ئەو عەرەبیەی تۆ زۆر لە مێژە بە ڕەحمەت چووە!
- دەسا گۆرەویەکەم دەیە!
ئەمجار سەت و سی فلسم لێ ساند!
دێتە بیرم کە تازە دەگەڵ قزلجی لە خانەکەی بەغدا بووین، چووم برینج بکڕم، بەقاڵ گوتی: «شگەت؟». بە غار هاتمەوە لە قزلجیم پرسی، نەیزانی. خۆم گەیاندە مام حوسێن، گوتی: یانی: چەند؟ بە قزلجیم گوت: ئەوە عەرەبی نییە؛ گووخواردنە! گوتی: برام! ئێمە ئیحتیاجمان بەو گووخواردنە هەیە!
دەگەڵ زۆر لە دانشجوویانی شەریعەت ببوومە دۆست. شەوانە کە بچوونایەنە سینەما، فینەی

سوور و جبەکانیان لە لای من دادەنا تا دەهاتنەوە. شـەوێک فەقێیـەکی مزگـەوتێک کـە نـاوی عەزیز شێخانی بوو هەمان کاری کرد. نازانم چـۆن بـوو بـەر لـەوە بێتـەوە، دوکـانم هەڵـگرت و دەگەڵ برادەرێک چوومە گەڕان. سەعات دوازدەی شەو بیرم هاتەوە. گوتیان یەکێک چەند جـار هات لە تۆی دەپرسی. فەقێ عەزیز کە بێ جبە و کلاوە، ناوێرێ لە درگای مزگەوت بدا و مجێـور ببینێ. وەک دز بە دیوار هەڵدەگەڕێ و لە ئاخرین خشتی دیوارەوە بەردەبێتەوە. بە خرمەکەی مجێور دەرکە دەکاتەوە. جگە لە خەجالەتی، دە ڕۆژ لە سەر جێگە کەوت!

ڕەفیق چالاک ببوە یەکێک لە زەلامەکانی حیزبی کومۆنیست و بەرپرسی بەشـی بەغـدا بـوو. ڕۆژێک هاتە دوکان گوتی:

- مزگێنەکم دەیە!

- خێرە؟

- تـۆ دەزانی حیـزبی کومۆنیـست دوو دەرەجەیـە، ئەنـدام تـا دوو سـاڵ دەچێتـە حیـزبی «تەحەڕڕوری وەتەنی»، لە ژێر چاوەدێریدا دەبێ. ئەگەر لە ئـەزموون دەرچـوو، ئـەودەم دکرێتـە کاندید بۆ حیزبی کومۆنیست!

- بەڵێ بیستوومە.

- جا کاکی خۆم! تۆ کە پیـاوێکی باشـی و نەشـەراتی ئێمـەت بـۆ دێ و دەیکـڕی و ڕێگـەی پۆلیس و گوزارشدان نازانی، سەرانی حیزب بـە گـشتی تۆیـان بـە ئەنـدام قبـووڵ کـردووە و دوو ساڵەی پێشەکەیان لە سەر هەڵگرتووی. دەستت بێنە، تەبریکت دەکەم!

- کاکە ڕەفیق! زۆر شانازی دەکەم کە ئێوە باوەڕتان بە من هەیـە و بـە پـاکم دەزانـن؛ بـەلام بڕیارم داوە پاش «ژێ-کاف» نەچمە هیچ حیزبێکەوە. ئەگەر بە بێ بوونە ئەندامی ڕەسمـی پـێم ڕازین باشە؛ ڕازیش نەبن من هەر ئەو هەژارەم کە ناسیوتم...

هەرچی حەولی دەگەڵ دام، نەهاتمە ڕەدایە و بەجێی هێشتم.

بە هۆی مەحموود ئەحمەدەوە بوومـە ئاشـنای جوبرایـل نـاوێکی ئەرمـەنی؛ زۆر هـاتوچـۆی دەکردم و نێوانمان زۆر خۆش بوو. لە داروخانەیەک بە ناو «سەعادەت» کـاری دەکـرد. ڕۆژێـک لێی پرسیم: تۆ لە ئێران ئەفسەرێکی شۆرەویت دەناسی بە ناوی یەعقووب؟

- بەڵـێ لـە بۆکـان بوومـە ئاشـنای؛ دەرەجـەی سـەروان بـوو. لـە ناسـینی ولاتی کـورد و عەشایرەکانیدا پسپۆڕێکی بێهاوتا بوو. جا تۆ بۆ دەیناسی؟

- کوڕە ئەوە دوو ساڵ بوو بە ناوی عەجـەمێکی باغـەوانی ئێـرانی، لـە «قـصرالظهور»ی ماڵـێ پادشادا باغچەوان بوو. تا بیدیبام ئەحوالی تۆی لـێدەپرسـیم. مـن لـە مـەحموودم دەپرسـی و جوابم بۆ دەبرد. ئەو ڕۆژانە ڕۆیشتەوە؛ گوتی سەلامی منی لێ بکە و پێی بلێ من یاقووبەکەم کە لە بۆکان دەیناسیم.

پاش ماوەیەک جوبرائیلیش هەلات و دەرچوو؛ کە داروخانەکە موڵـکی حیـزبی کومۆنیـستی عیراق بووە.

لە سەعات پێنجی بەیانەوە تا دوازدەی نیمەشەو لە گەرمای چلوهەشت و پـەنجا دەرەجـەدا، لە دوکاندا بە پێوە و بە تەنیا ڕامدەبوارد. خواردنی بەیانی و نیوەڕۆم نان و شەربەت بوو. زۆر لاواز ببووم؛ ڕەمەزانیشم گرت. لەپڕ نەخۆش کەوتم. چوومە بیمارستانی «مەجیدیە». پـاش حـەو ڕۆژ بێ ئەوە چا بم گوتیان بڕۆ! تۆمەز سیلمە و پێیان نەگوتووم. یەرمیا گوتی: کارێکی باشـم بـۆ لـە



سەر کەشتی نێوان دەجلە پەیدا کردووی. دوکانەکەی بۆ فرۆشتم؛ پاش قەرزدانەوە هەشتا دینارم بۆ مایەوە. ڕۆژ بۆ ڕۆژ خراپتر دەبووم. عومەر دەبابەی کۆیی لە تەرەف حیزبی پارتەوە هات کە ئێمە ئاگامان لێت دەبێ. ڕۆژانە دەیبردمە لای دوکتور «نەجیب مەحموود» ناوێک، دەرزی و دەرمانی بۆ دەنووسیم. هەر نوسخەیەکی دەینووسی هیچ دارووخانەیەک نەیبوو جگە لە یەک دارووخانە. زۆریش گرانجان بوو. دوایی پێمان زانی کە ئەم دوکتورە خاوەنی دارووخانەکەشە و دەرمانان بە ناوێکی نهێنیێ دەنووسیێ، کەس سەری لێ دەرناکا. ئیجازەی چوونە لوبنانی سیلدارانیش بە دەست ئەو بوو. تا نەخۆش قرانێکی دەما نەیدەهێشت لە دەست دەرچێ!

گەیشتمە ڕادەیەک خوێن دەرشامەوە و چاوم کەمی دەدیت. بردیانمە ئوتێلێک، ڕایانکێشام و بە کۆڵ دەیانبردمەوە سەر حەکیم. کاکە زیادی کوڕی حەمەئاغای کۆیە -کە زۆر کوردێکی دڵسۆز بوو- جگە لەوە کە خەرجی ئوتێل و دەرمانی خستبووە سەر خۆی، حەولی دەدا بمنێرنە لوبنان.

با ئەوەشم لەبیر نەچێ: لەو کاتەوە کە هاتبوومە دیوی عیراق، تەنیا سێ جار شیعرم گوتبوو. یەکیانم لە پشت عەکسێک دەگەڵ سدیق حەیدەری نووسی کە سەرەتاکەی: «بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم»، جوابێکی نامەی بە شیعری قزلجی و لەو ئوتێلەش: «بۆ کێلی قەبرەکەم» و «خۆشی دواڕۆژ».

عەلی حەیدەر سولەیمان -کە کوردێک بوو- ببوە وەزیری لەش‌ساغی. بۆ خاتری کاکە زیاد جێگەی بۆ گرتم و بە پەساپۆرت ناردمیە ئاسایشگای «بەحنەس» لە چیای لوبنان؛ لە سەر حیسابی حکوومەت. بەر لەوە بڕۆم، ناو ماڵەکەم دا بە عەزیزی نانەوا؛ کە بێ‌ماڵ نەمێنێ و کاری چاپخانەکەی بکا.

هێندێک خاولی و ماولی و ئەسپابی سەفەرم لە چەمەدانێک نا و بلیتی قەتاری بەغدا-ئەستەمبوولم تا حەڵەب بڕی و شەو ڕەشید قادر ناوێک -کە دانشجووی حقووق بوو- بردمیە سەر قەتار و لە دەرەجە سێ دامەزرام. ڕەشید لە کۆریدۆری قەتار کابرایەکی ڕووتەکەی دواند؛ ڕۆیشت و بلیتێکی قەتاری بۆ هێنا. گوتی: ئەوە مەلا شەریف بوو کە سەرۆکی حیزبی کومۆنیستی عیراقە. دەیەویست بە قاچاغ سەفەر بکا؛ ڕازی نەبوو بلیتی تا موسڵی بۆ بکرم. دەڵێ دەمەوێ ڕیسک بکەم! بلیتی تا تکریتم بۆ کڕی!

قەتار گەیشتە «تەل‌کۆچەر» کە لە سەر سنووری سووریایە. دەبوایە ئەفسەری سووری تەسلیمی وەرگرن و لە شاری «نوسەیبین» تورکی بە سەر ڕابگەن. پاش نیوەڕۆ بوو دایانبەزاندین کە سەیری پەساپۆرتان بکەن. پاسپۆرتی من سیلدار و بیمارستانی سیلی لێ نووسرابوو. گوتیان دەبێ دوو ڕۆژ ڕاوەستی بە قەتاری باری بڕۆی و سیلدار بەو قەتارە مەمنووعە.

- ئای بیکەن بە خاتری خودا! من ئەوا لە سەر مردنم؛ چۆن لێرە لەو سەحرایە دەژیم؟ هێزی مانەوەم نییە.

بەهرەی نەدا. بەڵام لە تاوان هاوارم بۆ هەر کەسی تووشی بام، دەبرد. جحێڵێک بە کوردی گوتی: کوردی؟

- بەڵێ.

- دادەی پاسپۆرتەکەت، بزانم...

وەریگرت و ڕۆیشت. پاش تاوێک هاتەوە: جێبەجێم کرد، بڕۆ سوار بە!
- ئاخر چۆن؟
- من کارمەندێکی عیراقیم لە ئێزگە. دەگەڵ زۆربەی ئەفسەرانی سووری -کە بە قەتار ڕادەگەن- ئاشنام. ڕازیم کردن ئەوان تا نووسەیبین بتبەن و دەڵێن چونکە پاسپۆرتەکە بە عارەبی نووسراوە -هیچ ئەفسەرێکی تورک جگە لە خەتی لاتینی نازانێ بخوێنێتەوە- دەتوانێ تا حەلەب بڕوا.
- کاکە من ئەو یارمەتیەی تۆم کرد؛ تۆش چاکەیەک دەگەڵ من بکە!
- بە چاوان هەرچی لە دەستم بێ.
- من ناوم مەحموودە. برایەکم لەو بیمارستانەیە کە تۆی بۆ دەچی، نامەیەک دەنووسم بیدەیە.
- خزمەت گران و داوا هەرزان! هەر تۆ و نامە؟ کوا بێنە!
لە قەتاری ئەم جاردا «عەببوود» ناوێکی عارەبی خەڵکی موسڵ و شەش کەسی‌تر -کە دوویان کوردی حەلەبی و دیاربەکری بوون- شەریکی ڕێ بوون. واگۆنی دەرەجە سێی قەتارەکە هەشت نەفەری بوو. دەگەڵ عەببوود بووینە ئاشنا. باسی تەلکۆچەرم بۆ گێڕاوە، ڕوانیە پاسپۆرتەکەم، گوتی: کوڕە تۆ ویزەی تورکانیشت نییە!
- یانی دامدەبەزێنن؟
- تورکی دەزانی؟
- کەمێک.
- کەمێک و زۆری ناوێ؛ بشزانی نەچی قسەی پێ بکەی. ئەگەر گوتیان ویزە، پەڕی پاسپۆرتیان بۆ هەڵدەوە. من دەبمە دیلمانجت ڕزگارت دەکەم. هەر پوولێکت پێیە بیخە ناو گۆرەویت. تەنیا چوار دینار بێڵەوە. پووڵی زۆر لە خەڵک دەستێنن، تا دەگەڕێتەوە سنوور و دەیدەنەوە. من حەواڵەی حەفتا هەزار لیرەی سووریم لە پێچی عەگالەکەمدا شاردۆتەوە.
شێست دینارم هەبوو، پەنجا و شەشم نا نێو گۆرەوی. لە نوسەیبین ئەفسەری تورک بە جەندرمەوە هاتنە پشکنین. تەواو ئێرانی خۆمانم وە بیر هاتەوە: ئەفسەر شۆخ و شەنگ و جل تازە، سەرباز ڕووت و نیوە پێخواس و پینە بە قنگەوە، ئەفسەرێک هاتە واگۆنەکەمان.
- ویزا!
پەساپۆرتم دایە.
- دەڵێم ویزا!
پەڕم هەڵدانەوە:
- ئەوە دە ویزاش پترە!
عەببوود تێی گەیاند کە زۆر گێل و بەستەزمانە، نەیزانیوە دەبێ ویزە وەرگرێ.
- جەریمەی دەکەین.
- چەند؟
- دوو لیرە.
عەببوود دوو لیرەی دا، ویزە درا! (لیرەی ترک حەڤدە فلسی عیراق بوو، یانێ لە چوار قران کەمتر).

کوردەکان دەگەڵ خەڵک و بە ئاسایی، بە تورکی دەدوان؛ لە قسەی خۆیانەدا -کە قاچاغچی مەڕفرۆشتن بوون- بە کوردی دەدوان؛ تا کەس نەیزانێ. کوردێکیان بەوی‌تری گوت: کچێکم هەیە عومری هەشت سالە حەوت زمان دەزانێ: کوردی، عەرەبی، فەڕانسی، ئیتالی، کلدانی، یۆنانی. ماڵەکەمان لە گەڕەکێکە پڕە لە هەموو میللەتێک. کچەکەم لە مەدرەسەی یۆنانیان دەبەر خوێندن ناوە و بۆتە تەرجمانی هەموو جیرانەکانمان.

عەببوود کوببەی موسلی پێ بوو. بە زۆر نانی دەرخوارد دام و هاودەمێکی زۆر خۆش بوو. پێش نیوەڕۆ لە حەڵەب دابەزین. لە ئێزگە بانگیان دەکرد: «تاکسی بۆ بێرووت». بلیتەکەی قەتارم دڕی و خستمە سندووقی زبڵەوە. چەمەدانم دا بە خاوەن تاکسیەک کە بمباتە بێرووت. دیتم عەببوود پەیدا بوو. بانگی لە خاوەن تاکسی کرد: حاجی ئەو کوڕە دۆستی منە!

حاجی وەک جندۆکەی ناوی خوا ببیە، بە ترس و عوزرخوایی چەمەدانی داگرت و بە جێی هێشتم.

- کوا بلیتەکەت؟

دڕاندم و فڕێم دا.

غاری دا سندووقە زبڵەکەی پشکنی، پارچە پارچەی بلیتی دۆزیەوە. دای بە باجەی ئێزگە و بردمیە دەرێ و بە فایتونێک دەگەڵیا چوومە ئوتێل.

- کاکە عەببوود بۆ نەتهێشت بڕۆم؟

- برا ئێمە ڕەفیقی ڕا بووین. ئەم خاوەن تاکسیانە دز و سەگبابن؛ خەڵک لە ڕێگە ڕووت دەکەن؛ دەیانناسم. لەوانە بوو تۆی وا نەخۆش کە شێست دینارت پێیە، هەر بتکوژن. شەو بە قەتار دەتنێرم؛ سەلامەت‌ترە.

لە ئوتێل نەهاری بۆ کڕیم. چووینە کورتە سەیرانێکی مەیدانی بەر ئوتێل. منیش قەرتاڵە پرتەقاڵێکم کڕی، دەگەڵی هێنامەوە ئوتێل. بلیتی بێرووتی بۆ بڕیبووم. دوای شیو خواردن بە فایتوونێک بردمیە ئێزگە و چەمەدان و کەلوپەلی لە سالۆنی چاوەدێری دانا و گەڕاوە. بە هەزار زەحمەت پرتەقاڵەکەم بە جێ هێشت؛ دەیگوت من حەقی زەحمەتی خۆم ناوێ.

بە چاوەنۆڕی قەتار لە ئێزگە ویستم چەمەدان بکەمەوە، قفڵ نەکرایەوە کە نەکرایەوە. ئەفسەرێک و سێ پۆلیس هاتن لە جگەرەی قاچاغ دەگەڕان.

- برا ئەو چەمەدانە چی تێدایە؟

- ئەفەندی هیچ نییە، هێندێک جغارەی لەندەنییە!

- بیکەوە!

- من نەخۆشم، خۆتان بیکەنەوە.

ئەفسەر و پۆلیس شل و کوت بوون بۆیان نەکرایەوە، وازیان لێ هێنا. جگەرەشی تێدا نەبوو. هەر ویستم بۆم بکەنەوە. دوو کیلۆ سجووقم کڕی. واگۆنی قەتار دوور و درێژ و جێگەی پەنجا کەس. هەر دوو کەس لە سەر کورسی تەختەی دوو نەفەرە دادەنیشتن. جیرانم لادێیەکی سووری بوو، دیار بوو زۆر منداڵبار و هەژارە. دوو کیلۆ سجووقەکەم دایە کە بیبا بۆ منداڵان. لە سوپاسی ئەوەدا جێگەکەی خۆشی دامێ و کەولی بەری خۆشی پێدادام و ڕاکشام. قەتار تا شاری «حومس» ڕۆیشت و دەبوایە سەعاتێک وچان بدەین تا دەیگۆڕن. لە حەساری ئێزگە لە کابرایەکم پرسی:



- «مرحاچ» له کوێیه؟
کابرا گوتی: به عارەبی نازانی چت دەوێ؟
ئەی خودایه له بەغدا «مەرحاز» به ئاودەست دەڵێن، لێره دەبێ چ بێ؟
- مەبال؟
- به خوا شک نابەم دەنا دەمدایەی!
- خەلا؟
- کەس لێره خەلا نافرۆشێ!
کابرایەک لەو لاوه تێی‌گەیاند، به تووڕەییەکەوه گوتی:
- ده بڵێ «بیت‌الماى» و ڕزگارم که! هۆ بچۆ لەوێ بمیزه!
سواری قەتار بوومەوه. ئەم قەتارەش واگۆنی هەشت نەفەری بوو. تەنیا کابرایەکم دەگەڵ دەواگۆندا بوو که چوار چەمەدانی پێ بوو؛ حاجیەکی میسری بوو. من به لەهجەی بەغدایی، ئەو به زاراوەی میسری، جا وەره و کەر له قوڕه دەرێنه! زۆر به گران، ئەویش به نیوه ئیشارەتی دەستان تێگ دەگەیشتین.
باران زۆر باریبوو، ڕووخاوی کێو ڕێی قەتاری بەستبوو. حاجی لەو ماوەدا که ڕێی قەتار خاوێن دەکراوه دابەزی که له دەشت گوو بکا. لەپڕ قەتار ڕۆیشت و حاجی به جێ ما. هەر چەند داد و هاوارم کرد دەنگم به کەس ڕانەگەیشت و عەقڵی ئەوەشم نەبوو زنجیری ئاژیر ڕاکێشم. لەو ڕێ بەقوڕگیرانه، قەتار دوو سەعات له وەخت درەنگ‌تر گەییه ئێزگەی بێرووت. قەت تاقه غەوارەیەکی لێ نەمابوو. نه پێشوازیکەر، نه عەنبال. چەمەدانی حاجی لێم ببوونه تۆق. تۆ بڵێی حاجی چی به سەر هاتبێ؟ لەپڕ چوار کەس له ترومبیلێک دابەزین و هاتنه بەر واگۆنەکه.
- کوا چەمەدانی حاجی؟ بۆی دەبەین.
- تا حاجی خۆی نەیه نایدەم.
دەیدەی! نایدەم! هەرام له ئەفسەرێک کرد. هەر بیستیان هەرا دەکەم، خۆیان خستەوه ترومبیل و ڕایانکرد. ئەفسەر هات بۆم گێڕاوه. گوتی: باشت کرد؛ ئەگەر حاجی نەهات له ئامانەتی قەتار هەڵیاندەگرین. لەو قسانەدا بووین حاجی له ترومبیلێک دابەزی. گوتی: که به جێ مام، له سەر جاده دەستم بۆ ترومبیلی چوار کەسەکه هەڵێنا، که زانیان چوار چەمەدان له قەتاردایه، به جێیان هێشتم. تۆ فرشتەی منی! نەتهێشت چەمەدانەکانم بچن. هەرچی دارایی هەمه دەواندایه. نوێژی شەوانه. حەمبال و تاکسی دەس ناکەوێ، چار چییه؟ ناچار منی نەخۆش و حاجی مل‌باریک و لاواز، یەکمان دوو چەمەدان چەند میترێک دوور دەخاتەوه و ئەم جار نۆرەی ئەوی‌تر دێ. زۆر ماندوو بووین و چی واش نەڕۆیبووین. حاجیم بەجێ‌هێشت و سەڵته ڕۆیشتم. له خێوەتێکی دۆمانەوه گوێم لێ بوو یەکێ به کوردی دەیگوت: «ئەمرۆ قەزەتەت خوێندەوه؟» (قەزەته یانێ ڕۆژنامه). بانگم کرد، دوو لاو هاتنه دەر و هێنامن چەمەدانەکانیان له سەر شان دانا. پاش تۆزێک گەیشتینه تاکسیەک و هێنانیه ناو شار. حاجی دەچووه ماڵه ئاشنا. من گوتم دەچمه ئوتێل و نەشارەزام. حاجی سوێندی خوارد تا تۆ به خاترجەمی دانەبەزێنم ناڕۆم. له مەیدانی بورج له ئوتێلێک ژوورێکی بۆ گرتم. سەرمای قەتار و گرانی چەمەدانان زۆری کار تێ کردبووم. له ئوتێل ئەوەنده خوێن ڕشامەوه که لام وابوو خوێنم ده لەشدا نەماوه. ئیشتیام نەبوو، شەو بێ نان خەوتم. بەیانی دەرکەوتم و له ڕستوورانێک داوای کەبابم کرد.

ژنێکی زۆر بە دەعیەی جگەرە بە لالێوانەوە لەو بەرمەوە دانیشتبوو، لە پەستا چاوی لێ دادەگرتم. ئای بە کلکی خێویەوە! کەس نا قینچکە! بە مۆڕێکەوە تماشام کرد و بە قەلسی ڕووی لێ وەرگێڕام.

بە تاکسی چوومە سەفارەتی عیراق کە بزانن من نەخۆشیانم. دوو لیرەم دا بە تاکسی. سەفیر گوتی: پیاوی نەشارەزا دەبێ تاوانی نابەڵەدی بدا. سواری ترام بای پێنج قورشت دەچوو، نە دووسەد. بە ترام بگەڕێوە! بچۆ خەیابانی پشت سەرا؛ تاکسی لێن. بە لیرەیەک دەتبەنە ئاسایشگای سیلداران.

مەگەر خەڵکی سووریا بۆ پووڵپەرستی بگەنە لوبنانیان، دەنا عەجەمیش دەسکیان لە دوو ناکا. لە کابرایەکی بە سەر و سیمام پرسی: خەیابانی پشت سەرا لە کوێیە؟

- چم دەدەیەی پێت بڵێم؟
- چت بدەمێ؟
- چارەگە لیرەیەک.

لێی وەرگرتم، گوتی: ئێرەیە!

لە درگای ئاسایشگاوە لە پاش پرسیار و وەرامی پێویست، بردمیانە تەبەقەی سیلدارانی فەقیر و تەختیان نیشاندام.

### لە ئاسایشگای بەحنەس

«بەحنەس» یان «بحەننەس» گوندێکی مەسیحی‌نشینی لوبنانە. لە ڕۆژهەلاتی بێرووت و هەزار و پەنجا میتر لە بەحر بەرزترە. ئاسایشاگاکە بەو نێوەیە و سەر بە کلیسای کاتۆلیکی فەڕانسەیە. دەیری ژنانی ڕاهیبە و تەرکەدنیایە. ژنێک کە «مامێر»یان پێ دەگوت (واتا دایک) ئیدارەی دەکرد. ژنە تەرکەدنیاکان کاریان بۆ دەکرد و پێیان دەگوتن «ماسێر» (خوشک). هەرچی لە دەرمان کردنی نەخۆشان قازانج دەکرا، دەدرا بە سوپای فەڕانسە. ئاسایشگا سێ تەبەقە بوو؛ تەبەقەی چوارەمی سینەما بوو، تەبەقەی سێهەم تایبەتی دەوڵەمەند و خاوەن پارتی زل بوو؛ مانگی شێست دیناریان بۆ دەدان. خۆراک و دەرمان و ئیستراحەتیان لەوپەڕی چاکیدا. تەبەقەی ناوەڕاست بۆ فەقیر و بێکەسی هەرزان بایی نەخۆشی عیراقی. تەبەقەی خواری بۆ نەخۆشە فەقیرەکانی لوبنانی و شوێنیتر بوو. ئێمەی عیراقی مانگێ بە حەڤدە دینار بەخێو دەکراین؛ بە دەرمانەوە. خۆراک هەتا بڵێی خراپ، دەرمان زۆر کەم و بە دەستەندە. حورمەت؟ خۆزگە بە حالی سەگ!...

دوکتورەکان بە هەتیوی لە کلیسا بەخێو کرابوون؛ لە فەڕانسە پێ‌خوێندرابوون. هەر شەش مانگ دەستەیەکیان دەچووە فەڕانسە بۆ زانین زیاد بوون و کە دەهاتنەوە دەستەکەی‌تر دەچوون. تەنیا شتێکی کە خوداپێداوەکان و داماوەکان تیا شەریک و بەرانبەر بوون، هەوای سازگار و تیشکی خۆرەتاو، دیمەنی جوانی چیای لوبنان و دوکتورەکان بوو.

هەموو ڕۆژ بەیانی، لیستەیان بۆ تەبەقەی سێ دەبرد کە جۆری خواردنی بە ئاواتی خۆیان هەڵبژێرن و بۆیان لێنێن. ئێمەش حەوتەی جارێک شۆربای گۆشت وشتر و هەموو جەمی زستان نیسک و باقلە، لە دوو مانگی بەهاردا زۆربەی جەم کەنگری لە ئاودا کولاو، هەموو هاوین



شۆربای کوولەکە بوو. ساڵێ دوو جار: ڕۆژی کریسمیس و جەژنی فەسح، گۆشت مریشکمان بە برنجەوە هەبوو.

ڕۆژێ چەند جار ماسێر سەریان دەداین. دوو ڕۆژ جارێک دوکتور دەهات بە سەرماندا دەگەڕا. حەوتەی جارێک مامێر و هەموو دوکتور و ماسیرەکان -کە پەرستار بوون- گەشتێکی بە کۆمەڵیان دەکرد و بە سەریان دەکردینەوە. شەوانە باشمان داپۆشین؛ بەلام -زستانیش با- دەبوو سەرمان لە دەرەوە بێ. دەرک و پەنجەرەشیان دەکردنەوە تا لە خەوا هەوای پاک هەڵمژین. زۆر جار بە خرتەی بەفرماڵینی بن تەختەکانمان وە خەبەر دەهاتین کە بە فریان لێ دەباری.

تا چل ڕۆژێک زۆر کەلەلا بووم و گەرمام گەیبووە چل دەرەجە. وردە- وردە هاتمەوە حاڵ و بە پای خۆم دەگەڕام. ئەو دەم چارەی سیل زۆر لە ئێستا کەمتر بوو. تەنیا عەمەلی پەراسوان و هەڵکێشانی ڕیە لە ڕێی لاملەوە هەبوو. دەرمانیش دەرزی «ستروپتۆماسین» بوو؛ ئەویش زۆر گران و دەستی فەقیر نەدەکەوت.

زۆربەی نەخۆشەکانی هەواڵم خوێندەوار و ڕۆشنبیر و مامۆستا و نووسەر و شاعیر بوون. ئەوی دەمانەوە، کۆنە پۆلیس و ڕانندە و تۆزخۆری دەشت و سارا بوون. پلەی ناونجی زۆر کەم بوو.

مەگین چلۆنکایی با، دەنا دەبوو لە سەر تەختەکانمان نەبزوین و خۆ ماندوو نەکەین. چینە نەخۆشەکانی پێش ئێمە وردە-وردە کتێبخانەیەکیان پێکەوە نابوو. پتر لە دوو هەزار جلد کتێبی زۆر چاک و بەتامی تێدا کۆ ببۆوە. بە هەڵبژاردنی نەخۆشان سەرپەرست و ئاگاداری کتێبخانە ناودێر دەکران. پارەیەکی زۆر کەم ئابوونەی کتێب خوێندنەوە وەردەگیرا؛ کە ئەویش دەدرایەوە بە کتێب. ئەگەر جارێک دەوڵەمەندێک بۆ سەردانی خزمی نەخۆش یان بۆ سەیری نەخۆشانی سیل بهاتایە و لە ڕووی خێرەومەندی بیگوتایە: چیتان بۆ بکرم؟ دەیانگوت: کتێب بۆ کتێبخانە. لەو بێکارییە و نەبزووتنەدا، هەموو کەس سەری بە سەر کتێبدا دەگرت. تا ئەو ڕادە نەخوێندەوارەکانیش دەرسیان دەخوێند کە بتوانن بخوێننەوە. تەنانەت کابرایەکی لێ بوو، مستەفا شێخەلی ناو بوو؛ پتر لە شەش ساڵ بوو لە ئاسایشگا مابۆوە. دەلالی هەڕاجە بازاڕی بەغدا و نەخوێندەوار، لە ئاسایشگا خوێندبووی؛ ببوە خوێندەوارێکی عەرەبی، مەلای دەبەزاندن. منی وا تینووی خوێندنەوە، دەستم بەو هەموو کتێبەڕا بگا و جگە لە دانیشتن و ڕاکشان هیچ کارم نەبێ، دەبێ چ بکەم؟ قوربان شانم لێ داخست و ملم لێ نا و ڕیزم لێگرتن؛ وشک و تەڕ، ئایینی و کفرنامە، تاریخی و ئەدەبی، بێوچان و سانەوە، ڕۆژ تا ئێوارە و شەو تا خەو بە لامدا دەباتەوە، چاو لە کتێب ناترووکێنم. نووسرای تەها حوسێن، عەققاد، سباعی، یەزبەک، سەلامە مووسا، حەسەن زەیات، دیوانی حافز ئیبراهیم، شەوقی، دیوان و کتێبی نووسەر و شاعیرانی کۆن، تاریخی کۆن و نوێی جیهانی و مەڵبەندی، زنجیرە نووسراوی قەدری قەلعەچی، کۆمەڵە گۆڤارەکانی دنیای عەرەب... ڕاستیەکەی نازانم چەند و چەند کتێبم خوێندەوە. تەرجەمە لە شکسپیر، ئاناتۆل فرانس، ویکتۆر هۆگۆ، مارک تواین، بالزاک، ماکسیم گورکی، چیخۆف، گۆگۆل، کتێبی کۆنە بەیتی عەرەب، فەلسەفەکان، ئیلیاد و هەر چی لە نووسەرانی ئورووپاوە کراوەتە عەرەبی. خولاسە چیم نەهێشت کە جار و دوو جاری نەخوێنمەوە. تەنانەت کتابی موقەددەسم دوو جار سەر لە بەر خوێندەوە. دوو ساڵ بۆ خوێندنەوە و فێر بوون زۆر دەرفەتێکی زێڕینە. هەم لە مەعلووماتدا، هەم لە عارەبیدا دەسمایەیەکی زۆرم دەس کەوت.

له ناوماندا کەشیشێک و مەلایەکی نەجەفی پەیدا بوون. مەلا ناوی شێخ خەلەف و زۆر وریـا و قسەخۆش. له بیرمه جارێک لێیان پرسی:

- له قورعاندا دەڵێ: «زەوی بە میرات بۆ سالحان دەمێنێ»، یانی چی؟

- مەنزووری قورعان لە سالـح ئـەو کەسـانەیە کـە بـە زەوی دەچـارێن و ئیـسلاحی ئـەرازی دەکەن؛ نەک سۆفیلکە و مەلای دەسبڕ و تەنبەڵـی وەک مـن. لەوانەیـە سـتالین لـەو سالـحانە حیساب بێ. کەشەپیاوێک بوو لە تەمەنی بیستوحەو سالیدا، ناوی «ئوغستین» بوو. تا نـەخۆش نەکەوتبوو بە عومری خۆی لە دێرێکی سەر چیایەکی عیراق دەرنەکـەوتبوو. لاتـینی، ئیـسپانی، فەڕانسی، ئینگلیسی، فارسی، تورکی، عارەبی، کلدانی و کوردی بە هەر دوو زاراوەی کرمـانجی و سۆرانی وەک ئاو دەزانی. زۆریـش ڕووحسـووک و لـە شـانان خـۆش بـوو. لـە خـوای دەویـست پرسیاری لێ بکەی و جواب بداتەوە.

- باوکی ڕووحانی! ئەوی تۆ فێری بووی بە هەزار زانای عەرەب نایزانن. تۆ لەو کێوە کوێڕا ئـەو هەمووە فێر بووی؟!

- کاکە! عەرەب زمانەکەیان بۆتە بەلایان. ئەوەندەیان لە خۆیان گران کردووە بـە سـی سـاڵ فێری نابن. خەتەکەیان ئارامی کـۆنی چـوار هـەزار سالـەیە؛ لایـان وایـە کفـرە بیگـۆڕن. ناچـار گرامێری چەند جلدی بۆ نووسراوە کە ڕاست بخوێنرێتەوە. ئەگـەر وەک لاتـینی بنووسـرایە بـە پەنجا پەڕ گرامێر ساز دەبوو. هەر خەریکن زمان فێـر بـن تـا قورعـان ڕاسـت بخوێننـەوە. ئیتـر نایانپەڕژێتە سەر عیلمی‌تر و بە جاهیلی پیر دەبن.

ڕۆژێک پرسیم:

- بەیانیان ڕاهبەیەک بە چرایە نەفتێکی داگیرسـاوە و کەشـەیەک بـە زەنگوڵـەوە بـە دەوری کلیسادا دەگەڕێن و زەنگوڵە ڕادەژێنن، ئەوە بۆ چییە؟

- چۆن لە کاتۆلیکی ئەوەندەش نازانی؟ ئەوانە شەیتانی دەوری کلیـسا -کـە شـەو هـاتوون- دەردەکەن!

- جا بۆچی دەریان‌دەکەن؟

- بۆ ئەوە ئێمە کەشیشەکان جێگەیان بگرینەوە!

لە سـەر داوای ئـەو، داسـتانی «کرانـک بیـل»ی ئانـاتۆل فرانـسم کـردە کـوردی. هێنـدێک دەسکاری زانایانەی تێدا کرد و پەسندی کرد. نوسخە خەتیەکەم فەوتا و بە چاپ نەگەیشت.

لە ئاخر و ئۆخریەکاندا ویستم ئینگلیسی فێر بم. فەرهەنگی عەرەبی-ئینگلیسی، ئینگلیـسی-عەرەبی و فەرهەنگی لەهجە دەربڕینم لە دەوری خۆم دانا. وشە بە وشە مانا و لەهجە دەردێنم و دەینووسم و لەبەری دەکەم. بـەو زەحمەتـە گرانـەی کـە کێـشام دەمتـوانی داسـتانی هاسـان بخوێنمەوە و کەمتر کارم بە فەرهەنگ بێ. بەڵام بە داخەوە لە پاش چا بوونەوەم لە بەغـدا و لـە پێناوی نانی ڕۆژانەدا، نەمتوانی لە سەری بڕۆم و لە بیرم چۆوە.

زۆر ئاشنای باشم هـەبوون. لـە هـەمووان نزیـک‌تـر «حوسـێن وەتتـار» ناوێـک بـوو خەڵـکی عیمارەی عیراق؛ لە خۆم ڕووت و ڕەجاڵ‌تر. لە دنیادا تاقە برایەکی هـەبوو ئـەویش سـەرباز بـوو. حوسێن زۆر لە ئەدەبی عەرەبیدا زەوقی هەبوو. بـۆ خوێندنـەوەش پرسـی دەکـردم، کتێـبم بـۆ هەڵدەبژارد.

زۆر نێوانمان خۆش بوو. پێکەوە دەگەڕاین. کورد گوتەنی: «وەک گوێی کەر جووت بووین» و

ببووینە خەمڕەوێنی یەکتر.
سینەما لە تەبەقەی چوار بوو. دەبوایە هەر کەسە کورسی خۆی بەرێ و لە فیلم بڕوانێ. کلیسا بوو؛ لە بەر خاوەن سینەمایان دەپاڕانەوە، بە خێر فیلمیان وەردەگرت و سەرو چارەگە لیرەیەکیان لە نەخۆشی تماشاکەر دەستاند! هەر ژوورەی جێگەی هەشت نەخۆش بوو.
کابرایەکی سەرتاشی لێ بوو، ڕادیۆی دەدا بە ئیجارە، مانگی بە شازدە لیرە. من هەر زوو ڕادیۆیەکی کۆنم کڕی و هاووەتاغەکانم لە ئیجارە ڕزگار کرد. کاتێ چا بوومەوە و دەرچووم بە قازانج فرۆشتمەوە.
کومۆنیستەکان حەلقەی دەرسیان بوو. سەبری یووسف ناوێکی کوردی مەسیحی دەرسی پێ دەگوتن. گوتی: حوسێن بۆ نایە شتێک فێر بێ؟ حوسێنم بردە دەرسێ. گوتم: عیلم ئەگەر خۆشیشت نەوێ هەر باشە بیزانی. بۆ نەگبەتی دەرسی ئەو ڕۆژە لە مانیفستی مارکس و ئینگلیس بوو کە دەڵێ هیچ خوایەکی نێر و مێ نەبووە و بەری بیری مرۆیە و ڕاست نییە. حوسێن هەستا ڕۆیشت. کە لێم پرسی بۆ ڕۆیشت، گوتی: برا تۆ گوتت بەهرە لە عیلم دەبینی. من شیعەم؛ حوسێن و عەبباسم زۆر خۆش دەوێ. ڕاست یان درۆ بە خۆشەویستی ئەوانەوە هۆگرم گرتووە و زۆری پێ شادم. سەبری هەر گوز و گومبەت بێ ئەوە هیچم بداتێ مایەی دلخۆشیم لێ دەستێنێ. تا شتێکم نەدەنێ نابێ دە شتم لێ بستێنن. سەبری گوتی: ڕاست دەکا، حەق بەوە. سەبری بۆ دەنگوباسی کوردستان زۆر کۆشا بوو. هەر ڕۆژنامە و گۆڤارێکی ئورووپا و عەرەب، هەرچییان دەربارەی کوردستان نووسیبوو، باسەکانی بڕیبوون و دە بەرگی گرتبوون؛ عەکسی زۆری هەبوون. تەنانەت ڕۆژێک عەکسێکی لە ڕۆژی ئالاهەڵکردنی سابلاغ نیشاندام و ئیشارەی بۆ عەکسێکی بچووکی دوورگیراوی نەناسراو کرد کە لە سەربان لە کن داری ئالا بوو. گوتی: من لام وایە ئەم عەکسە ئی تۆیە. ڕاستی دەکرد و زۆرم پێ زیرەک بوو. تەمرێکی حکوومەتی شێخ مەحموودی بە یادگار دامێ. دوو خەنجەری تێک پەڕیبوو؛ لە سەری نووسرابوو: «حکوومەتی کوردستانی جەنووبی» لەو دیویش نووسرابوو: «چوار ئانە» هێندەم ئەو تەمرە خۆش دەویست و تاقەتم دەکرد کە لێم ون بوو.
شەوێک دەستی هەیکەلی مەسیح شکابوو؛ وردە پووڵی زیارەتکەران دزرابوو. کلیسا زۆر ڕقی هەڵسا. گوتیان تا گوناهبار خۆی دەرنەخا، نانتان نادەینێ. دەمانزانی کێ وای کردووە؛ بەلام هێندە هەژار بوو، بەزەمان پێدا دەهات و پۆشیمان. تا نیوەڕۆ بێ نان ماین و ئەوسا هێندێک باقلەی کولاویان داینێ. ماسێرێکی کیژەعەرەبی مەسیحی زۆر جوانی لێ بوو، بە دواندنم کەیفی دەهات. لە منی پرسی: کێ ئەوەی کردووە و دەستی خودای پەڕاندووە؟ گوتم: لە خودا خۆی پرسن هەموو شت دەزانێ ! بە بزێکەوە گوتی: لەسەر ئەو قسانە خۆت تووشی بەلا دەکەی!
گفتوگۆمان دەگەڵ ماسێر -کە ناوی «ماری لویس» بوو- هەر لە دەوری دین و ڕەب دەگەڕا. من دەمگوت: ئەگەر مێردت بکردایە، دوو مندالت باش پەروەردە بکردایە و مەسەلەن ببوونایەتە دوکتور و دەرمانی هەژارانیان لە مل بایە، لەوە چاتر بوو کە خۆت ئەستێور کردووە و بە سەری تاشراو، بە کراسی جاو، لە زیندانی دێردا دەژی. ئەویش لە جوابما کاری خۆی بە باش دەزانی و دەیگوت خزمەتی ڕەب دەکەم. بەلام زۆر جار دەهاتە لام و دەگەڵما ڕووخۆش بوو. ڕۆژێک گوتم: ماسێر دەچمە بێرووت بۆ معاینەی چاوم، فرمایشت نییە؟
- نا، هەر هێندەم دەوێ قەول بدەی کە خۆت زۆر ماندوو نەکەی!

تێگەیشتم چی لە دڵدایە؛ بەڵام خۆم گێل کرد. گوتم: بە پێ نارۆم؛ ماشین هەیە!
وا دیار بوو هەردووک یەکترمان خۆش دەویست و سەد کێوی شاهۆمان لە نێواندا بوو...
لە سەر خواردنی زۆر خراپ هەموو نەخۆشەکان مانیان گرت. یەکێک ئالایەکی بە لوولاکە وشترێکەوە کردبوو؛ کردیانە هەرا. خەبەر بە بێرووت درا. سەفیری عیراق و دوکتور غوسن (وەکیلی عیراق دەربارەی نەخۆشانی ئاسایشگا) هاتن؛ بوونە میوانی مامێر. گۆشت بەراز و مریشک و پلاو، ئاشی پێ دەگەڕا. خۆ شەرابی کۆنی کلیسا هەر مەپرسە! من لە سەر تەختەکەم نەبزووتم. گوتم مان ناگرم. شکایەت لای سەبری کرا، گوتی: با نەیە؛ من بە پیاوی باشی دەزانم. خەبەر بە مامێر درابوو. گوتبووی: یەکێک هەیە لەو پرسن تا بزانن ئەمانە کومۆنیست و تەشقەلەبازن و درۆ دەکەن. ڕەگەڵ مامێرێک بانگ کرامە لای سەفیر. بە ناو سەفدا کە تێدەپەڕیم، «خاین! خاین!» کەری نێر نەیدەکێشا!
سەفیر گوتی: کوڕم! تۆ بڵێ خزمەت و خواردنتان چۆنە؟
- قوربان! سەگ دەژی و ئێمەش دەژین!... بە درێژی باسم کرد.
رووی کردە وەکیل و مامێر:
- پوولمان لێ دەستێنن و ئەوەش حالی نەخۆشانە؟ ئەوە قبووڵ ناکرێ.
سەفیر هاتە دەر و گوتی: ئەم کوڕە باشی تێگەیاندین کە ئێوە چەند مەزڵوومن. ئەگەر ئەو نەبا لەوانە بوو لێرە بڕۆین و نەتانبینین. خواردن و خزمەتتان چاک نەکرێ، دەتانبەینە شوێنێکی تر.
ئیتر خاین گورج بوو بە برای باش و سەبریش ئافەریمی کردم. حورمەت و خزمەتیش زۆری فەرق کرد.
چل ڕۆژ بوو لە بەحنەس بووم. دەگەڵ ئەحمەد ناوێکی کورد بوومە ئاشنا. زۆری ژمارەی گۆڤاری گەلاوێژ هەبوو. دوای چل ڕۆژ هاتوچۆ کردنی یەکتر، لێی پرسیم:
- ئەرێ کەس نامەیەکی بۆ ئەحمەد نەداویەی؟
- ئای خەجالەت خۆم، نامەکەم هەر دە باخەڵدایە!
لەو تێگەیشتم کە مەحموود و ئەحمەد بەچکە عەرەبن؛ لە سولەیمانی گەورە بوون و بوونە کوردی دڵسۆز.
ڕۆژێک نامەیەکم بۆ هات؛ عەزیز نانەوا نووسیبووی: کاکە هاتوومە شام؛ لە ئوتێل غازیم. حالم خراپە! چ بکەم؟ جوابم بۆ نووسیەوە لە ئوتێل مەبزووا نامەیەکم بۆ برایم نادری نووسی کە فریای کەوە! برایم بردبوویە مەنزلی خۆی. ڕۆژێک عەزیز بە دووچەرخە گەیشتە لام.
- تۆ چی و ئێرە چی؟
- دوای تۆ ناوماڵەکەم فرۆشت؛ بە قەتار هاتمە سنجار. میوانی شێخێکی یەزیدی بووم. ناردمیە قامیشلی، ماڵە جگەرخوێن. خەریک بووم کچەکەی بخوازم، سەری نەگرت. بە دوای تۆدا هاتم، گەیشتمە شام. ئێستا هاتووم بۆ لات؛ چەند ڕۆژێک لە لات دەبم.
- لێرە ڕێگەی میوان نادەن.
- کە وا بێ دەچمەوە، خواحافیز!
بەیانی ئەو ڕۆژە گوتیان لاوێک لە ئوتێل بووە، دەڵێن پارە نادا؛ هەرایە! ڕوانیم عەزیزە و داوای بیست و هەشت لیرەی لوبنانی لێ دەکەن؛ دەڵێ نیمە. لەو بەلایە ڕزگارم کرد و ڕۆیشت. برایم



بۆی نووسیبووم لە ڕێ دووچەرخەی بەکرێ‌گیراو شکاوە و من تاوانەکەم داوە.

عەزیز لە چاپخانەیەکی شام دامەرزابوو کاری دەکرد. جارێک برایم نووسی: «نسحەتی بکە! دەڵێ دەچمە میسر. دەڵێم ئەوە نەخشە، ڕێگەت نییە. دەڵێ من بە نەخشە نارۆم؛ بۆ خۆم دەچم!» لە جوابا نووسیم: «تۆ بزانە عەزیز خۆی لە من بە عاقڵ‌تر نازانێ، تا نسحەتی بکەم؟!»

عەزیز وەرەقەی پەنابەرانی فەلەستینی سازدابوو؛ مۆرێکی بەراوەژوو پێوە نابوو؛ چووبووە ئوردون. گەڕابۆوە لە ڕێ زانیبوویان فێڵی کردووە، خستیانە زیندانەوە. پاش دە ڕۆژ حوسنی زەعیم کوودەتای کرد و جگە لە خۆی -کە کوردێک بوو- حوسێن بەزازی سەرۆک وەزیریشی لە کوردەکانی شاری حەما بوو. عەزیز بەردرا.

ڕۆژێک نامەهێنی ئاسایشگا بانگی کرد:

- کێ عەزیز ناوە و ئێرانییە؟

نامەیەکی بە دروشمی پشیلە و کەلەمی ئێرانەوە هێنابوو. تەواو ترسام! خوایە چ قەوماوە؟ نامەی سەفارەتی ئێران لە لوبنان بوو کە: «ئاغای عەزیز نانەوازادە! کارمان بە تۆ نییە؛ بۆ ناچیەوە میهەنی عەزیز؟!» ئادرێسی عەزیز من بووم. ڕۆژێک لە بەغداوە نامەی عەزیزم بۆ هات: «دەڕۆمەوە وڵات، کارت نییە؟» نووسیمەوە خەبەری ماڵەوەم بۆ بنێرە. پاش ماوەیەک عەکسی کوڕ و ژن و خوشک و برامی بۆ ناردم؛ دەگەڵ چەند ڕۆژنامەیەکی ئێرانی و نووسیبووشی: مەجەللەی هیلال ئەو ژمارەی باسی ڕووسیای سوورە؛ بنێرە فلان ئوتێل لە ورمێ. ئیدی خەبەرم لە عەزیز بڕا. لە ساڵی ١٣٥٤ی هەتاویدا -کە هاتینە ئێران- بیستم کە ناوی دوکتور عەزیزی ژیانە و مامۆستای دانشگایە.

پێنج مانگێک بوو لە بیمارستان بووم؛ ڕادیۆ بەغدا بڵاوی کردەوە کە ڕەفیق چالاکی کومۆنیست گیراوە و ئیقراری لە سەر هەموو ئەندامانی حیزب کردووە و ئەوا هەر ڕۆژێ ناوی چەند کەسێکیان لە سەر ڕادیۆ بڵاو دەکەینەوە. دڵم لەرزی! نەکا ناوی منیش بڵێ و لە بیمارستانەوە بمبەنە زیندانی بەغدا. سەرباریش ڕەفیق دەمناسێ کە لە کۆمەڵەوە هاتووم. خوایە هاوار! هەموو ڕۆژ گوێم بە ڕادیۆوە دەنا؛ ڕۆژنامەی بەغدام دەپشکنین؛ لە ناوی خۆم دەگەڕام. نەخێر، ناو نەهات.

هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵکێشا. ڕەفیقیان کردە گوێندەی ڕادیۆی کوردی بەغدا؛ حقووقی جاسووسی و گوێندەگی وەردەگرت. ڕاستی گوێندە و ئەدیبی وا کەم دەبێتەوە. وای وەسەر زەوق خستم، چەند جارێک ئینتقاد و پێشنیارم بە ناوی «قۆیتاس پەپوولە» بۆ نارد و لە ڕادیۆدا جوابی دەدامەوە.

نەخۆشانی کورد چەند ساڵ بوو لە لایەن مامێر و دوکتورانەوە بە ئازاتر بنیادەم ناسرابوون. بۆ نموونە شێخ عەبدولقەهارێکیان ناو دەبرد کە بۆ عەمەلیاتی پەراسوو بە مشار بڕین نەیهێشتووە بێهۆشی کەن! کە هاتوون خەلاس بن، گوتوویە: دوکتور، پێغەمبەر فەرموویە خوا ڕوحم بەوانە بکا کە سنعاتی خۆیان باش دەکەن! کوردێکی‌تر بە ناوی «سەیدۆ» لە جەنگەی عەمەلیاتدا -کە نەیهێشتووە بێهۆشی کەن- گوتوویە: دوکتور باشی ببڕە، تازە ناتوانم بێمەوە! زۆر داستانی وا لە کوردان ببوە شەوچەرەی دوکتوران. چونکە عەرەب هەر مقەستیان دەدی دەگریان و دەیاننەڕاند و هەزار جوێنیان بە مەسیح و جەد و عابادی دوکتوران دەدا. ئەو ئاوی ناوی ئازایەتییە بۆ کورد ڕژابوو؛ هەر کوردێک بینالاندایە دەیانگوت: تۆ کورد نی؛ کورد زۆر بەغیرەتن!

جا ئێمە چەند کوردێک کە لەوێ بووین زۆریشمان ئێش پێگەیبا، پێمان شەرم بوو هاوار کەین. من لە کەلەکەمدا ئاوی پیس پەیدا ببوو. بە جۆرە ترومپایەک خالیگەیان کون دەکردم؛ ئاویان لێدەکێشا و دەرمانیان تێدەکرد. حەفتەی دوو جار ئەم کارە دەکرا. ڕۆژێک دوکتور هات، وا بە دوو ماسێر تێم بەربوون و کەولم دەکەن. دیتی حالم زۆر شڕە.

گوتی: دەمرێ! دەستی لێ بەردەن! کەس ئەو ئازارەی دەرنابا.

گوتیان: ئەدی بۆچی هاوار ناکا؟

- کورد هاوار ناکا؛ شێخ قەهارتان لە بیر نەماوە؟

جارێک دەبوو دەرزی لە زگم دەن. هەلمکرد، پڕ لە تووک. دوکتور گوتی: وەک زگە بزن دەچێ! گوتم: دوکتور وا دیارە شارەزای نووسراوی داروین نی؛ من وەک باپیرە مەیموونەکان دەچم! ئەم دوکتورە لە ناو هەموو دوکتورەکانی‌تر بەچکە موسڵمان و ناوی حەبیب بوو. ئەویش بە منداڵی مامێر بەخێوی کردبوو. وەک کوڕی خۆی لێ دەڕوانی و کردبوویە سەرۆکی دوکتوران و نازداری باوان. هەرچی بیگوتایە بە قسەی دەکرا. جگە لە دوکتوریەکەشی، زۆر ئەدیب و لە ئەدەبی عەرەبیدا شارەزا بوو.

لە بەحنەس - پێچەوانەی بیمارستانانی‌تر- نەخۆشێ کە حالی زۆر شڕ با و هومێد بە چابوونەوەی نەمابا، ڕەپ و ڕەوان پێیان دەگوت بچۆرەوە ماڵە خۆت؛ تۆ زۆر نازی! جارێک لە سەرداندا بە منی گوت:

- تۆ بچۆوە لای کەس و کارت!

- دوکتور هیچ کەسم نییە و لە عیراق غەریب‌ترم تا لوبنان. لات وایە دەمرم؟

- بە خوا هەرچی بۆت دەکەم حەرەکەت ناکەی؛ لام وایە بەجێمان دێڵی...

- دوکتور بڵێ چا نابی؛ مەفەرموو حەرەکەت ناکەی. چونکە بەرەو پاش گەڕانەوەش هەر حەرەکەتە. وا من بە غار بەرەو مردن پەل دەبم...

تماشایەکی کردم: تۆم پێ شتێکی سەیرە! جا مەگەر ئەو هێزی دڵەت دە هاوارت بێ.

بە ئاشکرا حوکمی ئیعدامم درا. قەت نەمدیوە دوکتور بۆ کەس درۆ بکا. بەڵێ دەمرم. لام وایە ماوەی دە دەقیقەیەک تاسام. تارمایی عیزراییل دەهاتە بەرچاوم؛ وەختە بڵێم گوێم لە فڕەی باڵی دەبوو. لەپڕ هۆشم هاتەوە بەر: هەیاران! من نزیکەی سی ساڵە دەژیم؛ ژیان هەر ئەو شەڕەشەق و کەربازاڕەیە کە دیومە. بە جحێڵی ئەو هەموو دەردەم دیت؛ بە پیری دەگەمە کوێ؟ سینەمایە؛ تماشای خۆت کردووە؛ بە جێی بێڵە و خەمی پێ ناوێ. بەس نییە لە خەم ڕزگارم دەبێ... هاتمەوە سەرحاڵ و ملم لە گاڵتە و گەپی خۆم نایەوە. وەک نە بام پێدا هاتبێ نە باران و هاتمەوە سەر دەقی جاران. شەش ڕۆژ دەرمانیان نەدامێ. گوتم: دوکتور تۆ هیچ نەبێ بەقەستیش بێ شتێکم بۆ بنووسە با پێی بخلافێم. دەرمانیان بۆم نووسیمەوە.

ئەوانەی هاتبوونە ئەو نەخۆشخانە -فەقیر و دەوڵەمەند- یان پارتیەکیان هەبوو یان زۆریان زمان‌لووسی دەگەڵ ماسێران دەکرد و کاری خۆیان پێک دێنا. من کەسم نەبوو؛ نەشمدەتوانی لە بەر پیرێژنە فەڕانسیان مل کەچ کەم و خۆم شیرین کەم. ماسێر سووزانێک هەبوو زۆر تووڕە و زمان‌شڕ؛ خۆشی نەدەویستم. ڕۆژێک دەرمانم بۆ نووسرابوو، نەیدامێ. زۆرم دڵ بە خۆم سووتا. نامەیەکم بۆ دوکتور حەبیب نووسی؛ شیعری شاعیرێکم لە سەرەوە دانا کە بۆ «مەعنی بنی زائید»ی نووسیوە، دەڵێ: «ئەی بەخشندەیی مەعن! دەربارەی من سرتەیەک دەگەڵ مەعن

بکە! جگە لە تۆ هیچ تکاکاریکم نییە». لە باسی ئێرانی بوون و چۆنیەتی هاتنم لە عیراقەوە بۆ لوبنان، چۆن بووە تێمگەیاند. نووسیشم نە پارتیم هەیە، نە دڵم بڕوا دەدا لە بەر پیرێژنان ڕیایی بکەم؛ با ئینسانیەتی خۆت تکاکارم بێ... کاغەزەکەی خوێندەوە، نایە گیرفانی و ڕۆیشت. هاتن گوتیان دوکتور لە وەتاغی خۆی تۆی دەوێ. لای خۆی جێگەی نیشان دام. گوتی: برا من دەبمە کەس‌وکارت. حەبێک تازە پەیدا بووە دەوڵەتی عیراق نایدا بە فەقیران؛ چونکە زۆر گرانە و هەزاری بە شەش‌سەد لیرەی لوبنانە و ڕۆژانە دەبێ بیست‌وچوار دانەی بخورێ. بۆ تەبەقەی سێ هەتا بڵێی زۆرە. من لەوان دەگێڕمەوە و دەتدەمێ. بە دوو هەزار حەب لە خەتەر ڕەخسام و ڕۆژ بە ڕۆژ لە چاکی بووم.

ئاودەرهێنان لە خالیگەمەوە، ڕیەی ڕاستی هەڵقرچاندم و پەردەیەکی وەک ئێسک و لە ئێسک ڕەقتر بە سەردا کێشا و شانی خوار کردم و ئێستاش کە شانم وەک تەرازووی لەنگ تاوتایە، ئاسەواری ئەوسایە و لەوساوە تەنیا سیەکم کار دەکا.

**تەفریحمان**

ئێوارانە دەچووینە قەدەم لێدان لە ناو باغچە زۆر و هەراوەکانی سەر بە کلیسا. ڕۆژانی یەکشەممە دەچووینە کلیسا، لە ڕیزی نوێژکەراندا دادەنیشتین؛ کە زۆر نوێژێکی خۆش بوو. ژن و کچی دێی بەحنەس خۆیان تاس‌ولووس دەدا، جوانترین جلکیان دەبەر دەکرد، پیاویش بە جلکی خاوێن و ڕیشی تاشراو لە کلیسا ڕیز دەبوون. هەموو بۆنی عەتریان لێ دەهات.

لە پشت پەنجەرەیەکی پەردەداری نادیارەوە ئەرگ لێدەدرا و دەستەکچێکی خواپەرست بە گەل گۆرانی کلیسایان دەگوت؛ مردووشی دەخستە زەوقەوە. کەشەی سەرسەکۆی قوربانیش دادەهاتنەوە؛ هەڵدەستانەوە؛ بخووریان بلاو دەکردەوە، منالی چکۆلە لە دواوە داوێنی شۆڕیان دەگرتن؛ دەتگوت «دایە مەمدە بە گورگی» دەکەن! بە ڕاستی سەیرانی خۆش، وا لە یەکشەممەی کلیسای کاتۆلیکانە؛ نەزەریش گوناح نییە و ئازادی.

ڕۆژێک دوای بڵاوبوونی نوێژ، چووبووم لە سەر بەردێکی قەراغ ڕێ دانیشتبووم. کچێکی قەڵەوی جوانی دێ -کە ناوی ڤیکتۆریا بوو- هات ڕابرد. ئاوڕێکی داوە گوتی:

- ئەوە بۆ وا بە وردی و سەرنج دانەوە زەق لێم دەڕوانی؟ نیازت چیە؟!

- دوکتور دەڵێ شەش کیلۆ قەڵەو ببی چا دەبیەوە. بیر لەوە دەکەمەوە: هەر لا سمتت دە کیلۆی زیادە. چ دەبوو شەش کیلۆی بهاتایەتە سەر من؟ تۆ جوانتر دەبووی و منیش دەبوومەوە گوێزی ئازا!

پێکەنی و ڕۆیشت.

چرچ، کەسیف، ڕەنگ‌زەردی تولخ، بێ‌هێز و توان، بە مرخەمرخ، سەر لە ئێوارەیەک لە سەر بەردێک هەڵتروشکابووم، سەیری ڕۆژاوابوون لە دەریام دەکرد. دیمەنێکم بوو، باوەڕ کە بەرازیش بێزی هەڵدەستا بمبینێ. کچێک بە لاما تێپەڕی، ئەحواڵێکی پرسیم. لە وەرامیا گوتم:

- بە ڕاستی کیژی لوبنانی زۆر لە عارەبی‌تر بە ماریفەت‌تر و جوانتریشن.

گوتی: لاوی عیراقیش کە وەک تۆ بچن، لە لاوی لوبنانی جوانترن.

قەت گاڵتەی هێند سەیر نەبووا تێر بە خۆم پێکەنیم.

کیژێکی لوبنانی -کە ناوی سەعدە بوو- دوکانی لە نزیک ئاسایشگا بوو. ڕۆژێک نازانم چم

کرێبوو، لیرەیەکی لوبنانیم دایە؛ قسێکی جوبران خەلیلم لێ نوسیبوو: «کەسێ کە پووڵ بە هەموو شت دەزانێ، هەموو شت لە ڕێی پووڵدا دەکا». گوتی: ئەوە چییە؟

- ببەخشە! کاغەز نەبوو لەوەم نووسیوە؛ هیچ نیازێکم نەبووە.

- زۆر مەمنوونم، ئەو نسحەتە لە سەد لیرەش بەنرخترە!...

قاوەخانەیەک لە ناو باغچەکانی دەوری ئاسایشگا تایبەتی سیلداران بوو؛ ئێواران دەیچووینێ. دەمێک بوو هیچ پووڵم نەمابوو؛ نەمدەتوانی پووڵی چایەک یان کۆکاکۆلایەک -کە تازە پەیدا ببوو- بدەم. زۆر باش دامابووم. ئەو مابەینەش هەرگیز لە عیراقەوە کەس نامەی بۆ نەدەنووسیم. هەر ڕۆژە کە نامەبەر دەهات و نامەی کەس‌وکاری نەخۆشخانەی دابەش دەکرد، دەمپرسی:

- ئەدی ئەمن؟

- نیتە!

زۆر دڵتەنگ دەبووم. تۆ وەرە هیچ کەس لێت نەپرسێ. تەنیا بە هەمووی سێ یان چوار نامەم بۆ هات؛ ئەویش هەمووی پڕ لە خەم و پەژارە. لە یەکیاندا خەبەری مەرگی میرزاوڕەحمان بوو کە گۆیا لە سەرەمەرگیدا چەند لە برادەران لە دەوری بوون. یەکیان پرسیویە:

- مام میرزا وەک لە مەرگ نەترسی وایە؛ ئێستاش هەر قسەی خۆش دەکەی.

میرزا ئیشارەی بە چرایەکی نەفت کردووە کە لە لایەوە داندرابوو، گوتوویە:

- کورم! من ئەو لەغەزەم هەڵێناوە. من وەک ئەو چرایەم؛ تا ڕۆنی تێدا ماوە، دایسێ و زیندووە؛ هەر نەوتەی وشکاوی هات، دەکوژێتەوە؛ بەڵام نەوتی تێ ناکرێتەوە...

ماوەیەکی زۆر بە خەمی لە دەست چوونی ئەو مامۆستا گەورەیەمەوە دژ دامام.

حوسێن وەتاری هەواڵی زۆر خۆشەویستم دەردەکەی وە بنی دا؛ جواب کرا. لە بەغدا لە بیمارستانی عەزل، واتا جێگەی گولی دوورئاوا خەوێندرا. نامەیەکی بۆ نووسیبووم؛ بە درێژی باسی خواربار دزینی دوکتوران و بەرتیل داواکردنی پەرستاران و فەزایحی سەگی بیمارستانەکە و زەلیلی نەخۆشانی نووسیبوو. نازانم چەند ڕۆژ نەیناردبوو؛ چونکە لە حاشیەدا نووسیبووی: تاقە برا سەربازەکەم -کە مانگی بە پێنج دینار دەبوایە دایکم بەخێو کا و یاریدەی منیش بدا- بلیتی بەخت ئەزموونی بۆ دەرچووە؛ دووسەد دیناری دەس کەوتووە؛ هەر دووسەدی لە بن سەنیری من داناوە. ئێستا من دەوڵەمەندێکم! بۆم نووسی: خودا ڕزقی بۆ تۆ نەبڕیوەتەوە. لێم ڕوونە ئەو پووڵە بۆ حوسێن ناوێکی زۆر زگزل هاتووە؛ فرشتەی ڕزق بە سەهو بۆی هێناوی؛ زۆر دەترسم نەیخۆی!

ڕۆژێک نامەیەکم وەرگرت، نووسرابوو: من نەخۆشێکم؛ لە سەرەمەرگا حوسێن گوتی تەنیا کەسێکم لە دنیادا هەیە، ناوی عەزیز قادرە و لە بەحنەسە. خەبەری منی بۆ بنووسن...

لە خەبەری مەرگی وا تاسام، سێ ڕۆژ نان و ئاوم لە خۆم حەرام کرد و تا توانیم بۆی گریام.

جارێک لە ڕمادیەی عیراقەوە کوردێکی کۆنە شووناس بۆی نوسیبووم: حەز دەکەم بزانم تەرزی نەخۆشیت چۆنە. لە وەرامدا گوتم: وەک نالی شاعیرم کە فەرموویە:

وەک توڕڕەیی پیچیدەیی تۆ ساغ و شکستم    وەک دیدەیی نادیدەیی تۆ خۆش و نەخۆشم

زیت و وریا هەڵدەسووڕێم؛ دەڵێن نەخۆشێکی لە مردنی!

لە چیای لوبنان، پەرێشان و سەرگەردان، پووڵی چایەک شک نابەم کە بیکەمە بیانووی لە قاوەخانە دانیشتن و تەختە کردن و ڕابواردن. «کێچ لە باغەڵما ئامانە خانم دەڵێ!». هومێدیشم

براوه که هیچ کەس بە دادم بگا. ڕۆژێک فیس بە سەرێکی تەژەی عەرەب هات:
- تۆی عەزیز قادر؟
- بەڵێ! فەرمایشت؟
- ئەو قەبزە ئیمزا کە! بیست دینارت لە مووسڵەوە لە لایەن کاکە زیادەوە بۆ هاتووە. بەلام من -کە لە حەڵەبەوە بۆم هێناوی- چوار دیناری لێ هەڵدەگرم!
خوایە لە ناو ئەو هەمووە ناسیاوانەدا چۆنە ئەو پیاوە منی وەبیر هاتۆتەوە و ئەو ئاوڕەی لێ دامەوە؟... لە پاش چا بوونەوەم زانیم، کە پیاوی زۆر گەورەی عیراق وەکو ئەمین ڕەواندزی و شێخ لەتیف باربوویان بۆ کۆ کردوومەوە کە بێچارە نەخۆشە با پەکی نەکەوێ. کاتێ بە کاکە زیادیان کوتووە، ڕاستەوخۆ باربووی خۆی ناردووە. ئەگەر بیدایە بەوان -وەک باربووەکانی‌تر- ئاو دەیبرد و بۆم دەکرا بە وشتر!
زۆر لە کوردەکانی شام و جزیرە و دانشجووی کورد لە لوبنان دەهاتن سەریان دەدام و کتێب و میوەیان دێنا. «جەلادەت عالی بەدرخان» و «ڕەوشەن خانم» و «قەدری جان»ی شاعیر و «جەگەرخوون» و «عوسمان سەبری»م لەوێ ناسین. کابرایەکیش لە جزیرە -کە بیستبووی من مردووم- کوڕی خۆی ناو نابوو هەژار.
مەسەلەی مردنیش سەیر بوو: موسڵمان مەلایەکی خۆیان بوو؛ شیعە بوو، فەرقی دانەدەنا و نوێژ و تەلقینی بەڕێوە دەبرد. مەسیحی ئەگەر پرۆتستانت یان ئورتودۆکس با، دەبوایە کەشەی خۆی بۆ بێنن و کەشەی کاتۆلیک خۆی تێنەدەگەیاند. بۆ مردوومراویش فەرق و جیاوازی دادەنرا: ئەگەر نەخۆشێکی مەسیحی لە سەر مردن بە ڕەوانی و ڕووخۆشی دەمەلاسکەی کەشەی لە دوعا و تۆبەدا نەکردایە، نەیاندەهێشت لە گۆڕستانی کلیسا بنێژرێ و دەبوو پیاوی شەهرداری بێرووت بێن و بیبەنە گۆڕستانی گشتی. سەبری یووسف دەردی لێ گران ببوو، کەشە هاتە سەری:
- دەی کوڕم! پێ لە گوناحانت بنێ و لە مەسیح بپاڕێوە.
چاوی هەڵێنا و تێی ڕاخوڕی: هەی دەسبڕی کوڕی دەسبڕ! دم لە منیش خوار دەکەیتەوە؟ لاچۆ لەبەر چاوم! جەحەندەم پڕ لە خۆشت و مەسیحیشت!
کەشە هەر هێندەی پێما بڵێ: لە گۆڕستانی ئێمەدا جێت نییە!
هەر مردووێک بمردایە - تا ئیدارەی کلیسا دەیزانی- نۆکەر و قەلە و قوتەی خزمەتکار هەرچی پووڵ و جلی بوو دەیانڕفاند و شرت و گومیان دەکرد.
عەزیز هەمزە ناوێکی خەڵکی سولەیمانی کە پێش من چووبووە ئەوێ و لە ماوەی دوو ساڵدا بە قەد پشکەڵێک عەرەبی فێر نەببوو. هەر من چووم و بوومە تەرجمانی، ئیتر لێم بوو بە قیلی کەواسپی و هەر دەبوایە تەختی لە تەنیشت منەوە بێ و زمانی حاڵی بم. ئێوارانە قورعانی بەغدام بۆ دەکردەوە. بە کەوای شۆڕ و شەدە و جامانەوە چوار مێردەکی لە سەر تەختەکەی دادەنیشت و تا قورعان خەڵاس دەبوو خۆی ڕادەژاند و ئەڵلا-ئەڵلای دەگوت. یانی زۆرم پێ خۆشە! جارێک گوتم: کاک عەزیز! مەلای قورعان خوێن زۆر دەنگ ناخۆشە؛ دە مانای ئایەتیش ناگەی؛ ئەو خۆ ڕاژاندنەت لە چی؟!
- ئای کاکە وا مەڵێ! بە خودا لە سایەی سەری تۆوە لە سولەیمانی ڕادیۆیەکم هەیە چوار ئەوەندەی ئەو ڕادیۆیە؛ بە سی دینارم کڕیوە!

ئێوارەیەک لەپڕ تەنگی نەفەسێکی وا بوو بە حاڵ هەناسەی دەهات. ناردمانە شوێن دوکتور. سەرم بردە بن گوێی: پووڵەکەت لە کوێ تاقەت کردووە؟ با بزانم نەوەک بیدزن! نەخێر، گوێی لە هیچ نەبووە! دوایی کە هاتەوە سەرحاڵ دەیگوت: هیچم نەدەبیست جگە لە باسی پووڵەکە، نەموێرا نیشانت دەم!

پیرەمێردێک ڕەگەز کورد و بە زمان عەرەب، بە ناوی «جەعفەر بابان» هاوژووم بوو. ڕۆژێک نامەیەکی وەرگرت؛ دەیخوێندەوە، سەرێکی ڕاوەشاند و بزەیێکی تاڵی هاتێ.

- ها عەموو جەعفەر! چییە؟

- کە لە بەغدا بەرەو ئێرە دەهاتم، دوازدە برادەر هاتبوونە بەڕێ کردنم؛ تێکڕا بۆم دەگریان کە مەسلوولی و ناتبینینەوە. هەر بەرەو دوا مردوون. ئەوا نووسراوە دوازدەهەمیش عەمری خوای کردووە؛ کەچی من هەر زیندووم.

«جاسم» ناو کوڕی شێخێکی عارەبی چۆڵی عیراق، هات؛ کەس دە لەهجەی نەدەگەیی. بیوومە تەرجمانی ئەویش. هەرتێگیراویەکی دەبوو من جێگەی هاوار و بانگی بووم. جارێک گوتی: خەبەرم دا بە بابم کە تۆ چەند بە منەوە ماندووی، ئەویش دیاریەکی زۆر خۆشی بۆ ناردووی؛ با بچین لە ناو داران بیخۆین. قوتووە شیرناتێکی دە نایلۆن پێچراوی بە نەوار بەستراوی دەرێنا. دیارە خۆشە! کە هەڵیپچڕی کوللەی برژاوی سوێرکراوە! هێلنجم هاتێ و ڕامکرد.

جاسم نەقڵێکی خۆی بۆ گێرامەوە کە جارێک ئەوەندەی تینوو بووە ناچار ئاوی لە ماڵی سوننی خواردۆتەوە و نەیهێشتووە دایک و بابی بزانن! ئەگەر جنێوی بە کەسێ دابا دەیگوت: ئێسکی سوننی بە قەبری بابی! ڕۆژێک گوتیان جاسم حاڵی شڕە. چوومە لای.

- ها خێرە؟

- سەید عەزیز! ئەو سوننی کوڕی سوننیە بەیانی زوو دیتم وام بە سەر هات!

- سەگباب چەندم پێ گوتووی بەیانی سوننی نەتبینن!

- حەقتە بەڵام چ بکەم؟!

ئەو سوننییە سەیدێکی سامرایی بوو، بە ناوی سەید عەلی. بۆم گێڕاوە؛ زۆر پێکەنی. گوتی: شەرت بێ هەموو ڕۆژێ تولحی بەیانی خۆمی نیشان دەم!

جا هەر وەک جاسم نەیدەزانی من سوننیم، کەمتریان دەیانزانی کە سەبری موسڵمان نییە و مەسیحییە. ڕۆژێک لای سەبری بووم، یەکی سووریایی خۆی بە ژوورا کرد:

- سەبری من لە فلان کەسی هاووەتاغم داوە؛ لە سەرم بکەوە!

- لە سەر چی؟

- ئەو سەگبابە مەسیحییە. من دوای نوێژ دەمگوت خودایا هەرچی موسوڵمانە ڕوحمی پێ بکە! ئەو دەڵێ بۆ ناڵێی چی مەسیحی و موسڵمانە؟!

- چاکت کردووە؛ مەسیحی چ گووخۆرێکە تۆ دوعای بەخێری بۆ بکەی؟!

ڕاهیبەیەک عاشقی عیراقیەکی «فارس» ناو ببوو؛ زگی پڕ کرابوو؛ بوو بە هەرا. هەر چۆنێک بوو کێشە داکوژرا و ڕاهیبەیان بۆ «بێت لەحم» تەبعید کرد. فارس دەیگوت: من هەر خەمی ئەوەمە لە بێت لەحم بە بێ مێرد منداڵی ببێ؛ مەسیحێکی دیش پەیدا دەبێ!

«ئەبوو ئەییووب» - سەرتاشەکەی ئاسایشگا- مەسیحیەکی زۆر قسەخۆش، زۆری نوکتەی



سەیری لە بەر بوو. دەیگێڕاوە کە:

* دوو ژن چووبوونە لای حەکیم. بە یەکیانی گوت: میزت بێنە و دە لیرەش بدە تا بزانم چیتە. ژنەکەی‌تر پیلی ئەمەی ڕاکێشا:

– خوشکم ئەم حەکیمە زۆر گرانجانە. من یەکێ دەناسم بە چوار لیرەی دەکا و میزیش لە خۆی!

* کەشیشێک لە وەعزی خۆیدا گوتی: کلکی ئەسپی مارئەلیاس لە حێفاوە دەگەیشتە بێرووت. کابرایەک لە گوێگران گوتی: ئای لەو درۆیە!

کەشە گوتی: لە حەرشەوە تا ناو شاری بێرووت دەبوو.

– بە خوا جێی باوەڕ نییە!

کەشە بە تووڕەییەوە:

– لەم هینەی منەوە تا ناو گەڵی دایکت چۆنە؟!

– بەڵێ ئەوە ڕێی تێ‌دەچێ!

* کابرایەکی زۆر درێژ لە بازاڕ چاوی بە کاڵەک کەوت. بانگی کرد:

– قەیسی بە چەندە؟!

– ئەحمەق من قەیسی دەفرۆشم؟!

کابرا تا نیوقەدی هاتەوە:

– دەی پرتەقاڵ بە چەند؟!

* کەشیشێک ڕۆژێ نەخۆش بوو. کەشەیەکی‌تری تۆماس ناوی لە بریکاری خۆی نارد، گوێی لە ئیعترافات بگرێ و لە پشت پەردەوە دانیشت. لاوێک هات و هەر لای وابوو کەشەی خۆیانە:

– باوکی موحتەرەم! گوناهم کرد؛ ژنی کەشە تۆماسم وا لێ کرد.

– دەی چیدی؟

– بە خوا کچەکەی و کلفەتەکەشی!

– دەی چیدی؟

– بە خوا خوشک و کوڕەکەشی!

تۆماس قوونی ڕووتی لە پەردە دەرخست:

– سەی کوڕی سەی! وەرە خانەوادەمان تەواو کە!

* کابرایەکی پرتەقاڵفرۆش گلەی بەختی لای هەواڵێکی کرد کە خوا ڕزقی بڕیوم.

– کاکە تۆ بۆ خۆت ڕزقی خۆت بڕیوە! لە کاسبی نازانی. وای دانێ تۆ سەلە پرتەقاڵت لە سەر سەرە و بانگ دەکەی؛ تاجرێک منداڵێکی خوێنتاڵی لە لایە، داوا دەکا. تۆ دەبێ بڵێی: ئەو کوڕە جوانەی کێیە؟ عەمر درێژ بێ؛ چەند خوێن شیرینە! ئەو دەم لە جیاتی پرتەقاڵێک چوارت لێ دەکڕن.

بەیانی سەلە لە سەر سەر، بە ناو بازاڕدا دەچوو؛ وەک کابرای دوێنێ غەیبی زانیبێ، منداڵێکی سەرزلی، چلمنی لوتزلی خوێن‌تاڵ گریا: «پرتەقاڵ!»

تاجر بانگی کرد. سەلەی دانا و لە هەتیوی هەڵڕوانی. بە لا لووتێکەوە پرسی:

– کوڕی کێیە؟

– کوڕی منە چۆنی دەبینی؟

چی بڵێ؟ چۆن ڕیایی بکا؟ پرتەقاڵی لە دەست هەتیو دەرێنا و سەڵەی خستەوە سەر سەر، گوتی: بە دەستی خۆت بینێژی و ڕزقم لە سەر خودا!

* لاوێک لای کەشە گوتی: ببمبەخشە کچەکەتم ماچ کرد.

- کوڕە جا ئەمە چییە؟ من سەد جار دایکتم ئیلاقە کردووە و ناشڵێم بمبەخشە!

* ژنە لادێیەکی سادەی زۆر جوان خزمەتی کلیسا و ئۆدەی کەشیشی دەکرد. ڕۆژێک دیتی کەشیش نووستووە؛ ئەسپابەکەی دەرکەوتووە: لە سەرەوە زەرد، لە ناوەڕاست شین، لە بنەبانەوە سوورە! بۆ مێردەکەی گێڕایەوە، گوتی: هەر چۆنێک بێ ئەو سوورە بپرسە!

لە دەرفەتێکدا بە شەرمەوە پرسی:

- بابی ڕۆحانی، ئی تۆ بۆچی وایە؟!

- کوڕم! ئەوە نهێنیەکە تەنیا لای تۆی دەدرکێنم. هەر ژنێ لە بەشە زەردەکە ئاوس بێ، کەشەی دەبێ، لە زەرد و شینەکە «مەتران»، لە هەر سێ ڕەنگ «ئەسقەفی گەورە»!

ژن و مێردەکە پێکەوە لەبەری پاڕانەوە کە ڕوحمێکیان پێ بکا، بە هەزار دەبێ و نابێ کەشە ڕازی بوو مەتڕانێکیان بداتێ! لە جەنگەی ژنیندا کابرا لە پشتەوە لەپڕ پاڵێکی توندی بە قنگی کەشەوە نا:

- دە ئەگەر ئەسقەفێکمان بدەیەی ماڵت وێران دەبێ؟!

* پیاوێک بە لیرەیەک بەری لە لای دەلاکێک تاشیبوو. هات ژنەکەشی برد و دەلاک بەری تاشی. گوتی: هەقم پێنج لیرەیە.

- چۆن بەری من لیرەیەک و هی خانم بە پێنج؟

- قوربان! ئی تۆ دەسگیرەی هەبوو، ئی خانم زۆری زەحمەت دام!

قسەی خۆش لە ناو نەخۆشان زۆر بوو؛ کەمم لە بیر ماون.

حاجیەکی نەخۆشی کوێتی هاتە بەرانبەرم لە ژوورەکەدا. ناوی «حاجی عەبدوللەتیف بوو». زۆر زوو بووینە ئاشنا. جارێک گوتم: تۆ کە حاجیت چۆنە نوێژ ناکەی؟!

گوتی: ئەوە مانگێکە پێکەوەین. قەت نەتپرسی کارت چییە و بە چی دەژی؟ من گەوادی شەرعیم!

- دوور لە تۆ حاجی، بمبەخشە!

- دوور لە تۆی چی و بەخشینی چی؟! با بۆت بڵێم: ئێمە لە کوێت چەند کەسێکین قاچاغچی. ئەو قەحبانەی لە مووسڵ و بەغدا لە ڕمێن دەکەون و خۆشیان بە گەوادان فرۆشتووە، دەهێنرێنە بەسرە. یەکی بە سی، بە بیست دینار دەیانکڕین. بە سەحرادا باریان دەکەین و بۆ پاتەختی سعوودی. یەکی بە سەد پاوەنی زێڕ بە ئەمیران و کاربەدەستانی سعوودی و ئەگەر زۆریش بەرچاو بن بە خودی ماڵە شایان دەفرۆشین. ناویان ناون: «کەنیزی سپی». کارتمان پێیە، لە هەر کوێ لەو سەحرایە ماشێنمان خرا بێ یان ڕێگەمان لێ بگۆڕێ، پۆلیسی سعوودی یاریدەمان دەدا.

وێڕای قەحبە، جغارەی ئورووپایی، ویسکی و جنسی زۆر دەبەین؛ قازانجی زۆر دەکەین. هەزاران کەس لەو ڕیازە هەن کە هەموو ڕۆژێ هەزاران دینار تەختوبەخت دەکەن، وەک چیرۆکی ئەلف لەیلا دەژین. لەو سەحرایەدا عەشایری وا هەن شەرمیان دانەپۆشراوە؛ ئەگەر زەردە قۆڕەیەک ڕاو کەن جێژنیانە. ڕووتن؛ لە برسان دەمرن؛ بەڵام نایەڵن لە وەختی حەجدا

بێنە مەکە و مەدینە، لە خێرە حاجیان بەشدار بن؛ نەوەکا ئابڕووی دەوڵەت بچێ. بە ناوی ئیسلامی ڕاست و قورعان حوکم دەکەن! ئەوی من دیومە ئەگەر حاجیان بیاندیبا، ئەویش وەک من لە هەموو شت پەشیمان دەبوونەوە. لێم مەپرسە، دڵم پڕ لە برینە...

حاجی دەیدی دیشلەمە دەخۆمەوە، پرسی: ئێرانت دیوە؟

- بەڵێ.

- دەڵێن لە ئێران «نەژەرلەمە» دەخۆنەوە، ڕاستە؟

- نەژەرلەمە چییە؟

- چا بە تاڵی دەخۆنەوە و لە دوورەوە تماشای قەند دەکەن.

- حاجی بۆ نافەرمووی «نەزەرلەمە»، «نەژەر» مانای نییە!

ئەسەد ناوی کرماشانی، کۆنەپۆلیسی عیراق و سەگەوانی ماڵە ئینگلیسیان و بێسەواد، کەوتبووە ئەو بیمارستانە. لە سەگ سوالی دەکرد؛ بۆ چایەک بە حەوادا دەچوو. بەزەم پێدا دەهات؛ بانگم دەکرد چام دەگەڵ بخواتەوە، هەزار دوعای بەخێری بۆ دەکردم. برادەرانی کومۆنیست گوتیان: ئەسەد جاسووسی عیراقە و هەموو ڕۆژ گوزارشێکمان لە سەر دەنووسێ، با هاتوچۆت نەکا. ئێوارە چەند کەسێکم لەو برادەرانە بۆ چا خواردن بانگ کرد. خەبەرم دا بە ئەسەد، هەر بە غار هات. گوتم:

- ئەسەد! حیزمردوو! بنووسە: عەزیز دوو بەڵغەمی گەورەی فڕێ دا. فلان کەس هەژدە جار کۆخی. فلان شەو دەینالاند! جاسووسی سەر سیلداران لەوە زیاتر چ دەنووسێ؟ خۆ تۆ خەتیشت نییە.

ئەسەد لە حیرسان گریا؛ گوتی: بەغیلی بەو چایەش دەبەن کە تۆ دەمدەیەی! خوا هەڵینەگرێ...

جەژنی فەسح بوو؛ بە سەدان ژن و پیاو هەیکەلی مەریەمیان هەڵگرتووە و کەشەیەکی تەپڵە سەرتاشراوی کورتەبالایان لە پێشەوە بە حەساری کلیسادا دەهاتن و کەشە دەیخوێند و ئەوانیش بە دوایدا. جارێ کەشە چووە سەر پلەکانان و بانگی کرد: من چیم گوت ئێوەش بیلێن:

- دۆستانم!

هەموو گوتیان: دۆستانم!

- وش!

هەموو تێکڕا گوتیان: وش!

کەشە دیتی حاڵ خراپە، دابەزی و ملی نایەوە لە دوعای خۆی!

بەوەدا نوکتەیەکم بیر کەوتەوە: گۆیا لە شەرەفکەند مام فەرەج ناوێکی کەلاشکەر، ویستوویە لای مەلا، ژن مارە کا. مەلا گوتوویە: هەرچی گوتم وەدووم کەوە: دەی فەرەج بڵێ.

- دەی فەرەج بڵێ!

- جارێ دەنگ مەکە!

- جارێ دەنگ مەکە!

- بە خوای سەگبابێکی کەرە!

- بە خوای سەگبابێکی کەرە!

مەلا لینگە کلاشێکی لە دمی دەدا؛ فەرەجیش لینگە کەلاشێک بە دەم و فلچی مەلادا

دەکێشێ. مەلا هەڵدێتە سووچی مزگەوت و دەڵێ لێت مارە کرا.

لیی دەپرسن: مام فەرەج مارەت بڕی؟

- کوڕە خۆ مارەبڕین نیوە شەڕێکە من نەمزانیبوو!

حەسەن عەسکەر و حەسەن غەریب دوو تورکمانی دەوری کەرکووک و شیعە بوون و نەخۆشی بەحنەس. حەسەن عەسکەر فێرکاری فێرگە بوو؛ مێشکی لە خەرافات ئاخنرابوو. باسی خەیبەری دەکرد کە دەروازەکەی شەش هەزار تۆن ئاسن بوو. ئیمامی عەلی لە سەر دەستی دانابوو؛ کردبوویە مەتالی شەڕ.

- کاکە حەسەن خۆ ئەو زەمانە کیلۆ و تۆن نەبوون!

ئەو جار دەیگوت: دووسەد هەزار ڕەتلی بەغدایی بوو.

- ئەوسا نە ڕەتڵ هەبوو نە بەغدا.

- سەرم گێژ بوو ناهێڵن قسەکەم بکەم؛ ئەدی چەند بار گوو بوو؟!

سەیدێکی کەڵەگەتی چاو بە کل ڕژاوی ڕیش‌تۆپی لاڕیش ڕێک‌وپێک کراوی کەوا شۆڕی پشتێند و پێچ کەسکی نەجەفی پەیدا بوو. بردیانە وەتاغێک کە پێمان دەگوت وەتاغی کومۆنیستان. سەید مرومۆچ، تەسبیح بە دەستەوە، دەستی بە ورتەورتی بن لێوان کرد. حاڵ تاڵ بوو. «مار سیری دەدزا، لە دەرکی کونێ ڕوا». گاڵتە و گەپ وەستێنرا. کەس بە لایدا نەدەچوو. سەید کە دیتی بیمارستان جێگەی کەرپیرۆزان نییە و نەزان فریوی دەس نادا، گورجێ خۆی کردەوە بنیادەمی خۆمانە و لە هەموو هەرزەکارانیشی تێپەڕاند. شاڵ و مێزەرەی دانا، چەقەنەی لێ دەدا؛ قوونی با دەدا؛ جنێوی پیسی بەم و بەو دەدا تا جوێنی پێ بدەنەوە. دەستیان بۆ قوونی دەبرد و دەیگوت قدیلکەم دێ! تەواو ببوە کەڵلەی شەکر. ئیمانمان هێنا کە «خەربوزە بە ڕەنگ نییە».

عەزیز هەمزەیان مەرخەس کرد و بە منیان گوت مانگێکی‌تر مەرەخەست دەکەین. عەزیز لاقی چەقاند: هێندەم سوێند و قورعانە، فلانم دەگەڵ نەبێ لێرە ناڕۆم. منی زمان‌نەزانی قوڕبەسەر چۆن دەگەمەوە عیراق؟

چاری ناچار هێشتیانەوە و مانگەودوا پێکەوە لە بیمارستان دەرچووین!

تەواو دوو ساڵ و دە ڕۆژ ژیانم لەو بیمارستانە ڕابرد. دوکتور کە مەرەخەسی دەکردم گوتی: نابێ خۆت زۆر ماندوو کەی؛ دەبێ خۆراکت خۆش بێ؛ نابێ سەرما و گەرمان لێت دا و دەبێ و نابێی زۆر...

ئەی خودایە! من ساغ و سەلیم ڕۆژێ بیست سەعات گرانترین کارم دەکرد، قەت نانی وشک و پێخۆرێکم نەدەگەینە یەک. عاسمان دوور و زەوی سەخت! ئەم جار چ بکەم؟ ژان‌والژانم دەهاتە بەرچاو کە پاش زیندان، شەو لەبەر باران دەتلیساوە؛ ئەنوایەکی نەبوو خۆی دەبندا وەشێرێ. دەیگوت: حەبسەکەم چاتر بوو؛ هیچ نەبێ سەربانێک لە بارانی دەپاراستم و ڕایەخم تەختە بوو...

دوو ساڵ و دە ڕۆژ خۆش و ناخۆش هەرچی بوو، کارم خوێندنەوە و فێر بوون و خەو بوو. نان هەبوو؛ تەخت و پێخەف هەبوو؛ چۆن دەتوانم کاری جارانم بکەم و ئەوی بە ساغی بۆم نەدەلوا، بە نەخۆشی پەیدای کەم؟ بۆ نەگبەتیش لە پێشدا کە لاوێکی ڕۆح‌سووک و لەش‌سووک بووم و قورساییم لە پەنجاوسێ کیلۆ نەدەپەڕاند، لە بیمارستان ببوومە هەشتا کیلۆی هەڵیزاوی تەنبەڵ.

لە چیاوە بەرەو بێرووت دەهاتین و من لەو خەیالاتانەدا خنکابووم؛ ئاگام لـە مـەحموودی بـێ زەواد نەمابوو. لە بێرووت چووینـە ئوتێـل. قـەرارمان دا چەنـد ڕۆژێـک وچـان بـدەین و شـاری بێرووت ببینین. شەو لە سەر داوای عەزیز چووینە تیئاتر. تیئاتری عـەرەبیش یانـێ هەڵـپەڕینی ژنی ڕووت لە بەر چاو تماشاچیان. کەیفم نەیگرت؛ زوو هەستام. عەزیز گوتی: زۆر خۆشە! تۆ بڕۆ من شارەزام بێمەوە ئوتێل.

ڕۆژانە بە شاردا دەگەڕاین؛ ئێواران عـەزیز ڕاسـت دەچـووە تیئـاتری خـۆی و مـن دەچوومـە سینەمایەک. گوتمان با بچینە مەتەبی دوکتـور حـەبیب و سـەرو بیـستوپێـنج لـیرەی حـەقی موعایەنەی بدەینێ و لێرەش خواحافیزی لێ بکەین. دوکتور دەزگایەکی هەبوو شاهانە؛ مونـشی و پەرستار و هەیتوهووت. گوتی: من لە ئاسایشگا مەرەخەسم کـردن، هـاتوون پووڵـم بـدەنێ؟ وەرن تماشاتان دەکەم؛ بەلام باسی پووڵ نەکەن!

عەزیز دیاری بۆ مندالانی خۆی دەکڕی، گوتی: دەترسم پووڵی سەفەرم نەمێنێ.

– مەترسە! مـن شێـست لـیرەم لـە لای برادەرێکـی کـوردی شـامی دانـاوە بـۆ ڕۆژێکـی وا؛ هەردووکمان دەگەیەنێتەوە بەغدا.

هاتینە شام؛ سێ ڕۆژ ماینـەوە. چووینـە زیـارەتی جـامیعی ئەمـەوی و قـەبری سـەلاحەدینی ئەیووبی. کە چووینە مزگەوتی ئەمەوی، من شاپۆیەکم لە سەر و کراوات لە مل، مجێور خـۆی دە من نەگەیاند؛ چوو بە لای عەزیزەوە -کە جلی حاجی کوردی سولەیمانی فـشوفۆڵـی دە بـەردا بوو- عەترێکی دە بەری دەستی هەڵسوو؛ بەلام ئەو هیچ پووڵی نەدایە و شوێن من کەوت. کـابرا قسێکی کرد. گوتم:

– ئەوە دەڵێ گووم بکردایەتە ناو دەستی باشتر بوو!

– کاکە حەوز و ئاو لە کوێیە؟

– بۆ چیتە؟

– دەستم لە گووی ئەو کابرایە دەشۆمەوە!

شەوێ کە دەبوو بەیانی لە شام بڕۆین، کاک عەزیز هیچ پووڵی نەمابوو؛ بە تەمای پووڵـی مـن بوو. ئەو شەوە برادەرەکەم دۆزیەوە؛ گوتی: پووڵەکەم بۆ ناردوویەوە.

– هەی نەکەی!

«مریشک هەر قاچێکی هەیە» – بۆم ناردوویەوە.

– بە کێدا؟

– نازانم!

هیچم بە عەزیز نەگوت. چێشتەنگاو چووین بلیتی ئوتووبووس ببڕین، بلیتێکم بە بیـست لـیرە بڕی. دوو لیرەم دا بە ترێ و نان، بۆ خۆم سێ لیرەم پێ ما. عەزیزم بە بلیتەوە دامەزراند.

– ئەدی تۆ؟

– حاڵ و حیکایەت ئەوەیە. تۆ بگەوە، من دە بەحریشم هاوێن تەڕ نابم.

عەزیز فرمێسکی هاتە خوار و بە نیگەرانیەوە دەستی بـۆ هەڵـێنام و ڕۆیـشت. هـەر ئـەو ڕۆژە چوار فێرکاری کوردی شام هاتنە لام؛ نەقلم بۆ گێڕانەوە. هەر چواریان شەو چووبوونە سەر کـابرا و بە چەقە و هەرا چلوپێنج لیرەیان لێ ساندبوو. دوای دوو ڕۆژ منـیش بـەرەو بەغـدا بوومـەوە. «جێگای مێردان قوون تەندوورە»! چوومەوە ماڵی مام حوسێن.

- برای دوور ولات بەخێر هاتیەوە!
دوو ساڵ و چەندێک لە سەر تەختێک ڕاکشێ، بیستوحەوت کیلۆ گۆشتی سست و فشەڵەت لێ زیاد بێ، چۆن دەتوانی کار بکەی؟ چەند ڕۆژێک بیست میتر بڕۆیبام دەبوو دانیشم تا نەفەسم دێتەوە سەرخۆ. ڕۆژێک دەگەڵ برادەرێکا چووینە چاخانەیەک. قوونم خستە سەر کورسی، قرچەی کرد. زۆر بە خۆدا شکامەوە. کابرای چایچی هات، باوەڕ کە من لە کنگیەوە دەچووم! هەر نیخەی دەهات:
- پێم خۆش بوو شکاندت؛ بە قوربانت بێ! من پیاوی وام خۆش دەوێ!
زۆر لە ئاشنایانی پێشوو، تا نەمگوتا من کێم نەیاندەناسیمەوە. وردە- وردە لە سایەی قەدەم لێدانی زۆرەوە تۆزێک هاتمەوە سەر حاڵ و بە دۆست و ئاشنایانەوە گەڕام، کارێکم بۆ بدۆزنەوە. برادەرێک گوتی لە گاراجێکی کوردان نووسەری باریان دەوێ؛ بە غار چووین. خاوەن گاراژ دەستووری کاری نیشاندام. زۆر هاسان بوو.
- زۆر سوپاست دەکەم!
تۆزێکم تێوە ڕاما؛ برادەرەکەی بردە کەنارێک و سرتەیان کرد.
- وەرە با بڕۆین! ئەو کابرایە لێی پرسیم: ئەوە هەژارە؟
- بەڵێ
- بە خوا من ڕێم ناکەوێ هەژار نۆکەریم بکا.
ببوومە سەیدی رووت: پوولی نادەنێ، دەڵێن سەید زەکاتیان پێ ناشێ!
ویستم کۆنەفرۆشی بکەم؛ چوومە لای جوولەکەیەکی کۆنە سابلاغی بە ناوی ئەبووسەلمان. کۆنەی لە ئەمریکاوە بۆ دەهات. تێی گەیاندم کە ئەو کارە بۆ من دەس نادا. دەبێ خەیات و ئوتووچیم هەبێ و دوکانی بۆ بگرم و زۆر شتیتر...
عەکاسە کوردەکەی ناردبوومیە لای شالچی، گوتی فێرە عەکاسی فەوریت دەکەم. کەچە ماشینێکی کۆنی دامێ و دوو سێ ڕۆژ دەرسی دادام و کەوتمە کار. سندووق بە سەر شانەوە بە کۆلاناندا بگەڕێ کێ عەکس دەگرێ. لە پیاوی شەهرداریش بترسە کە نەتگرن و ماشێنت لێ نەشکێنن. ڕۆژی باران و هەور کار نییە. ماشێن زۆر شل کارە. کابرام لە بەرانبەرم ڕاست و پاستە دەکرد:
- بڕوانە ئێرە! بزە بێنە لێوت! یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش!...
کابرا وەڕەز دەبوو لە جێ دەبزووت. من هەر هەتا شەشم گوت؛ جاری وابوو دەبێ بیست یان سی بژمێرم. ڕۆژانی تاوساو هەر لە تاو هەڵاتەوە تا خۆراوا، کەم ڕۆژ چارەگە دینارێک و زۆر ڕۆژان سەد و پەنجا تا سەد فلسم کار دەکرد. ئەویش دەبوو مەسرەفی کاغەز و دەرمانی لێ بدەم. گاڵتەی منداڵ و بێکارانیش لە جێی خۆی. لە هیچ چاخانەیەک نەیاندەهێشت دانیشم چونکە بیست منداڵم بە شوێنەوە بوو. لە سەری کۆلانێک ڕادەوەستام، برادەرێکم دەکردە تەپکەی مشتەری؛ هەر کە کەسێک لەو لاوە دەهات، برادەرەکەم لە بەرانبەرم قیت ڕادەگرت، سەرم دەبردە بن پەردەی ڕەش، دەمگوت: تاریفم بکە تا ڕێبوارەکەش عەکس بگرێ.
دەگەڵ حەمە ڕەشادی کۆنە هاوکارەکەی[ڕیستوورانی] خەیبامم، چاوەخانوویێکمان لە گەڕەکی سابوونکەران بە کرێ گرت و پێکەوە دەژیاین. حەمە ببوە قاوەچی لە سووچێکی تاریکی بازاڕی زێڕینگەران. ڕۆژانە هەر کەس دەچووینە کاری خۆمان و شەوانە دەهاتینەوە

کونەڕەش.

ڕۆژێک هەور بوو، حەمەش نەچووە کار. گوتمان با یارەلماسی بوکلێنین. من چوومە بازاڕ یارەلماسیم کڕی هاتمەوە، حەمە لە ماڵ دەرچووبوو. زۆرم چاوەنۆڕی کرد، نەهاتەوە. نانی خۆم خوارد و چوومە دەر؛ چوومە سینەما. دە گەڕانەوەمدا لە کۆلانێکی تەنگ، ڕەفیق چالاک ڕووبەڕووم دەهات. جا وەرە بگەڕێوە و هەڵێ. بە دڵەکوتە هاتمەوە ماڵ. ماڵی چی؟ کورسی شکاوە، لێفە هەڵدڕاوە، دەتگوت شەڕەگای تێدا کراوە. دەر و جیران هاتن، گوتیان: حەمەیان بە کەلەبچەکراوی هێنا، ماڵیان پشکنی و بردیان. ئای بە خێری ناسەلامەتی! خۆ حەمە حاڵی لە من خراپترە! هەر هێندەم بۆ کرا لێفە و سەنیرێک هەڵگرم و دەرکە داخەم و بەو تەنگی نوێژی شێوانە خۆم بە ماڵە مام حوسێندا کەمەوە. دوای بیست ڕۆژ حەمە گەڕایەوە. پیاوێکیان لە سولەیمانی لە سەر دزی حەبس کردووە؛ دەناو پرسیاراندا گوتوویە کەسێک کە ساڵێک لەمەبەر بۆمبای دەماڵی حاکم سەعید هاویشتووە، نۆکەری شێخ لەتیفە و ناوی حەمەیە. حەمەیان بەرەو سولەیمانی بردووە و زۆریان تێهەڵداوە و پاش چەند ڕۆژ نیشانی دزەیان داوە، گوتوویە هەو نییە؛ بەریان داوە.

ماشینی عەکاسیم بردەوە بۆ کابرای خاوەنی و گوتم بەو کارە بەڕێ ناچم و دەر نابەم.

- ئەی چۆنە ڕۆژانە دوکانەکەم بۆ خاوێن کەیەوە و کاروباری بازاڕ چوون و شت بۆ ماڵ کڕین وەستۆ گری؟ مانگی چوار دینارت دەدەمێ.

کەوتمە سەر پیشەی پێشوو. دوکان گەسک دە! کاشی بماڵە! شووشە خاوێن کەوە! کەوەر و کەلەم و گۆشت و مۆشت بەرەوە ماڵی وەستا؛ جار-جار ئاگاشت لە مندالان بێ و تۆزێکیان بگێڕە و تێر گوێت لە پرتەوبۆڵە و چەقەوشەڕە جنێوی وەستا و وەستاژن بێ!

کونە سەگێکم لە گەڕەکی «فەوزەت عەرەب» گرت کە خانوویێکی کۆنی یەک تەبەقە و چوار ماڵیتری تێدابوو. بەیانی نان و چام دەخوارد. دەچوومە سەر کار. دوکانم پاک دەکردەوە تا وەستا دەهات. لە پاش کاری بێگاری ماڵ، دەهاتمەوە بەرانبەر بە وەستا لە سەر کورسیەک دادەنیشتم؛ خەو دەیبردمەوە. سەعات هەشتی شەو، جاری وابوو سەعات دە بەرەو ماڵ دەبوومەوە. نیوەڕۆیان سەموونێکم بە تۆزێک پەنیرەوە دەکڕی و دەمخوارد؛ شەویش هەر شتێکی وا. مانگێ دینارێکم کرێخانوو دەدا. دەبوایە ڕۆژێ بە سەد فلس کە دەکاتە دوو تمەن بژیم. خودتراش و تیغم هەبوو؛ نەمدەتوانی ئاوێنەیەکی ترن بکڕم. لە بەر ئاوی قاپی بنڕەشی دەرمانی عەکسدا ڕیشم دەتاشی؛ چونکە مەمنووع بوو بچمە بەر ئاوێنەی خۆ لە بەر جوان کردنی مشتەریەکان!

نازانم تاوەنگاز ببووم یان چی، زۆر خراپ نەخۆش کەوتم. وەستا بەزەی پێمدا هات؛ بردمیە ژوورێکی چۆڵ لە ماڵەکەی خۆیدا؛ کۆنە مدبەقێک بوو تاریک. درگاکەی کە دەکراوە جیڕەی مێشکی پیاوی دەزرینگاندەوە. تەختی ژوورەکەش خۆڵەپۆتینە و مشک جلیت بازییان تێدا دەکرد. وا کەساس بووم نەمدەتوانی سەر هەڵێنم. تینووم بوو؛ کەس نەهات سەرم بدا و بڵێم تۆزێک ئاو. لە بەیانی تا ئێوارە بە نۆبەتێ و تینوایەتی مامەوە و کەس چراشی هەڵنەکرد. وەستا کە شەو هاتەوە، هەر لە ڕێوە دەگەڵ ژنەکەیدا تێک بەربوون. خۆی هات، چرای هەڵکرد و ئاوی دامێ و چوو دوکتورێکی هێنا. دوای حەو ڕۆژ ڕاست بوومەوە.

چیرۆکی وەستاکەشم تۆزێک سەیرە: پیاوێک لە «تیلەکۆ» کوژراوە؛ دوو کوڕی نۆ ساڵە و

هەشت ساڵەی لە پاش بەجێ ماوە؛ بە ناوی حەمە و گەردالی. دایکیان مێردی کردۆتەوە و بەرەڵدا کراون؛ کەلاشکەرێک وەخۆی گرتوون. وە دێهاتی خستوون کۆنەپەڕۆ کۆ کەنەوە. لەو کارە وەڕەز بوون؛ هەڵاتوون. یەکێکی‌تر کردوونی بە دواشوان. ئەو جارە کەوتوونە لای خانەقین و میوەیان پێ چنیونەوە. «با بچینە بەغدا، کار زۆرە». بە پێ کەوتوونە ڕێ؛ لە هێز کەوتوون. تووشی عەجەمی گاریەسوار بوون کە دەچنە زیارەتی کەربەلا.

- مامە گیان سوارمان کە!

- کێ جنێو بە عومەر بدا سوار بێ!

حەمە دەڵێ: سا وەللا بشمرم جوێن بە ئیمام عومەر نادەم!

گەردالی دەڵێ: وە قنگ باوک عومەرەوە! ئەگەر پیاگ با کەرێکی بۆ ئەناردم سواری بم!

گەردالی سوار و حەمەی کاکی بە پا دەگەنە بەغدا. هەر یەک لە گەرەکێک دەبنە ئاوکێشی مالان. گەردالی هەشت ساڵە ئاوکێشی گەڕەکە ئەرمەنییە؛ کە زۆر ماڵە ئاشوری و ترک‌زمانیشی تێدایە. ئاوکێشە و سەر بە هەموو ماڵاندا دەکا. زۆر زوو لە ناچاری فێری زمانی ئەرمەنی و ئاشووری و تورکی و عەرەبی دەبێ و کوردیش زمانی خۆیەتی. کاتێ نووسینی پێناس دەبێتە باو، ناو گەردالی دەگۆڕێ و دەڵێ ناوم برایمە. ئیتر لەوێ دەمێنێ و ئاوکێشە تا بە سەرباز دەگیرێ. لە جیاتی ئەرکی سەربازی دەیبەنە دادگای نیزامی، دەیکەنە تەرجومانی سەربازانی عیراقی؛ کە زمانی هەموانی دەزانی. لە دوای سەربازی دێتەوە گەڕەکی خۆی. لوولە کێشراوە و ئاوکێشی نەماوە. دەبێتە نۆکەری ماڵە هەرمەنییەک کە یەکەم عەکاسی بەغدایە. ئەرمەنی دەیەوێ بەهرەی پتری لێ هەڵکرێنێ، پاش کاری ماڵ دەیبا کاری دوکانیشی پێ دەکا. لەوێ فێرە عەکاسی دەبێ و کوێرەخەتێکیش فێر دەبێ و دەبێتە وەستا برایمی وێنەگر. زڕکچی کابرایەکی خانەقینی دەخوازێ و لەو دەمەدا کە من شاگردی بووم کوڕێک و دوو کچی هەبوو. وەستا -کە دەردی بێکەسی و هەژاری زۆر چێشتبوو- پیاوێکی نەرم و نیان و خۆش‌زمان و خاوەن بەزەیی بوو؛ بەلام خات مەلەکی ژنی، ژن نەبوو ژان بوو. کەس لەو ڕووگرژتر، لووت‌بەرزتر، ناحەزتر، خوێڕی و بێکارەتر، پیس و پۆخڵتر، زمان‌شڕتر نەبووە و نابێتەوە. لە بەهانە دەگەڕا کە شەڕێک بە مێردەکەی بفرۆشێ و خۆی لای خەڵک هەڵکێشێ و بە چاوی سووک بڕوانێتە شاگردی مێردی. هەر دەتدی منداڵە چکۆلەکانی پێیان دەگوتم: تۆ شاگردی ئێمەی، ئەتوانین دەرت‌بکەین!

وەستا خانووێکی باشتری بەکرێ گرت؛ وەتاغێکی لە خۆی زیادی تەرخان کرد، کە زڕخەزوورەکەی و من تیا بژین و کرێ نەدەین. مام کەریمی زڕخەزوورەی لە پیرەپیاوەکانی مێشک‌ڕزیوی بیرعەشایری بوو. ساڵەها چەتەیی کردبوو. ببوە کرێکار و پاسدار لە کەمپی لەشکریانی ئینگلیسدا. بە سەری پیری و فەقیری لە بەغدا عەمەلەیی دەکرد. ڕایەخمان حەسیری بۆریا بوو؛ سەرو لێفەمان لە سەر ڕادەخست. مقەلیەکمان دەگەشاندەوە بۆ چا لێنان و پۆلووی قلیانی مام کەریم. قلیانی وەک موسڵمانان نەبوو! دارەکەی سەرەوەی دەناو شووشە دەرمانێکی دەمزل دەنا و دەستی بە قرفشت دەکرد. ئەغلەب شەو لە بیری دەچوو شووشەکەی هەڵبرێ، لە دارەکەی دەنەوی و شووشە دەشکا و پۆلوو بلاو دەبوونەوە. هەی بگەیە تا حەسیر و لێفە نەسووتاون!

- بە خوا بەدبەختی گرتوومی بەرم نادا!



- مام کەریم گیان! شووشەکەت بایی دە فلسە؛ سبەی بۆت دەکڕمەوە!
شەوانە لە چیرۆکی خۆی و باسی چەتە و دزانی تەواو خۆشم دەهات. شەوێک لێی پرسیم:
- باران چۆن ئەباریێ؟ ئێژن لە بەحرەوە ئاو هەڵئەمژێ.
خۆم لێ کرد بە پسپۆڕ و باسی باران بارینم بۆ کرد؛ بۆ نموونەش دەوریەکەم بە سەر هەڵمی کەتریدا گرت و ئاوی لێ چۆڕا و گوتم: ئاوا.
- هەی گووی وە قەور باوک ئەو کەسە ئەمەی وتووە! ئەمە قسەی کافرانە! سا من لە مەلام شنەفتگە لە قورحانا ئێژێ: مەلایەکەتێکی وەقای مێشوولە، وە قامچی هەورەکان پێش خۆی ئەدا، وەک گاگەل ئەیانباتە سەر بەحر. هێندە ئاو ئەخۆنەوە تا ورگیان ئەماسێ. ئەیانهێرێتۆ، وە قامچی لێیان ئەدا کە بوارن. تۆ نازانی هەورەتریشقە چییە؟ قامچی مەلایکە مێشوولەکەیە!
- بەڵێ با وابێ!
شەوێک لە جەنگەی باسی خۆیدا گوتی:
- ئەو ساڵە کە زاڵی زەڕ، باوک ڕۆستەم وەفاتی کرد و فاتیحامان بۆ خۆند...!
- کەی؟
- ئەم ساڵانە کە من لە خانەقین بووم، زاڵ لە ماڵ سیمرخ لە جەوەڵ قاف ئەژیا. خەوەریان هاورد کە عەمری خوای بەجێ هێناوە. ئێمەش لە مزگەوتا ئازیەتباریمان دانا و فاتحامان بۆ خۆند!
- ممبارەکە!
ڕۆژێ لە حەمام مام کەریم لفکەکەی خۆی داناوە و سابوونێ لە سەر و چاوی داوە؛ دەستی بردووە لفکەکە هەڵگرێتەوە، گونی کابرایەکی عارەبی وەبەر دەست هاتووە -کە داهاتۆتەوە خۆی بشوا- کێشاویەتی. عەرەب لە زیقەی داوە:
- ئای گونم!
مام کەریم کە عارەبی نازانێ:
- لەکە ترنی گەماڵ باوک! لفکەی خۆمە و پێت نادەم!
توند گرتوویە. کابرا لە هۆش چووە و لە دەستیان دەرێناوە.
دەبێ ئەمەش بزانین کە کوردی شیعە بە سوننی دەڵێن: «جاف»، سوننیەکانیش بە شیعە دەڵێن: «لەک».
مام کەریم بە نەخۆشی بردبوویانە بیمارستانی دەولەتی؛ سەرم دا.
- ها، مامە! چۆنی؟
- عەزیز گیان! باشم؛ بەڵام شەوانە مەلایکەتان دەس دە گونم وەردەدەن!
بەغدایی بە جنۆکە دەڵێن مەلەک واتا مەلایکەت. چیرۆکی وا خۆشی مام کەریم زۆرن؛ با واز بێنین و باسی خۆم لە دوو دەم.
وەستا کە دەیدی زۆربەی وەخت قڕ و قپ لە دوکان دانیشتبووم و خەو دەمباتەوە، ویستی وەختەکەم بە کار پڕ کاتەوە. لە ژووری تاریکدا بەردەستی پێ دەکردم. وردە- وردە چاوم کرایەوە و چاپ کردنی عەکس فێر بووم و زۆرم زەحمەت لە سەر هەڵگرت. حقووقەکەمی کردە مانگێ حەوت دینار و نیو، شەوانیش لە دوکان لە خواردندا بەشدار بووم. ئەو بەستەزمانە ژنەکەی تێری نەدەکرد؛ لە دوکان بە جەرگی برژاو بەرکولێکی دەکرد تا بە بەشی ماڵ تێر بخوا.

ساڵێک پتر لای مامەوە. لە دوکانیش نەبا کارەکانم بەڕێوە دەبرد؛ ئەمینداری پووڵ و پارەشی بووم. ڕۆژێ گوتی: تۆ باش فێری کار بووی؛ ئەمەوێ مەعاشەکەت بکەمە ڕۆژێ چوارسەد فلس.
- وەستا سوێند و قورعانم وابێ تا لە لاتم چارەگە دینارێک زیاترم نەوێ.
- دەسا دەبێ کار لە لایەکیتر پەیدا کەی. من پێم شەرمە دەستت ببڕم.
ڕۆژی جومعە کار زۆرە و نابێ عەکاسی دابخرێ. وەستاکەم -وەک ئەرمەنیان- یەکشەممە دایدەخست. گوتم: بۆ ئەوە هەموو ڕۆژ دوکان هەبێ، من شەممە بەتاڵ دەبم، یەکشەممە من دوکان دەکەمەوە. هەوەڵ شەممە وچانم دا. تا لای سەعات یازدە گەڕام و سووڕامەوە. وەڕەز بووم؛ هاتمەوە دوکان. هێشتا لەوبەری خەیابان بووم، ئارتین ناوێکی ئەرمەنی -کە ئاشنامان بوو- بە غار لە دوکانەوە هات:
- مەچۆوە دوکان! خەتەرە! برۆ فلان قاوەخانە تا من دێم.
لە قاوەخانە بۆی باس کردم کە سەعات نۆی بەیانی، سێ ئەفسەری ئەمن و شەش پۆلیس ڕژاونە دوکان:
- کوا عەزیز قادری شاگردت؟
- دەمێکە لە لام نەماوە.
دوکانیان پشکنیوە و زۆریان هەڕەشە لە وەستا کردووە. قەولیان لێ‌ساندووە کە ئەگەر زانی لە کوێی خەبەریان بداتێ.
- ئەرێ ئەوە بۆچی لە تۆ دەگەڕان؟
- ئارتین! بەدبەدختی و نەزانی خۆم. ڕۆژێک جگەرەی لوکسی ملووکیم بەراوەژوو داگیرساند؛ عەکسی تاجەکەم سووتاند!
- ئەی ماڵی وێرانم! بە خوا منیش چەند جارێک ئەو خەتایەم کردووە! خوا شوکور پێیان نەزانیوە. باوکم ئاگات لە خۆ بێ!
لەو دەمەدا ئارتین شلەژا و چاوی بە مۆلەق وەستا:
- هەستە برۆ! دەتگەمێ.
- ها! چ بوو؟
ئەو ئەفسەرانەی لە نزیکمانەوە لە قاوەخانە بوون، ئەوان بوون لە تۆ دەگەڕان.
دیار بوو بە ڕوخسار نامناسن.
لەم بەینەدا لە بەغدا مەعاشم چارەگە دینار بوو، وەتاغێکم لە نزیک دوکان لە ماڵە مەسیحیەک بە کرێ گرت و بە تەنیا لێی دەژیام و -بەش بە حاڵی خۆم- تەواو ساز بووم.
زەبیحی کە لە ناسریەوە هاتبووەوە، چووبووە سولەیمانی، ماوەیەک لە سیتەک، لە ماڵی شێخ مابووەوە و دوایە ببوە هاوکاری «هەمزە عەبدوڵلا» ڕەئیسی حیزبی پارتی و لە سولەیمانی دامەزرابوو. جارێک هاتە بەغدا و گوتی: دەمەوێ چاپخانەیەک پێکەوە نێم. لوولەومووڵە مەنگەنەم لێک داوە؛ هێندێک وردەئامراز و حرووف ماوە؛ با بیکڕین. نیازم وایە «نیشتمان»ی کۆمەڵە زیندوو کەمەوە.
نەخشەیەکمان کێشا، چۆن پێمان نەزانن و پێشمان بفرۆشن. چووینە چاپخانەی نەجاح- کە زۆری کتێبی کوردی لێ چاپ کرابوو.
- سەلام! مامۆستا پیرەمێرد زۆر سەلامی دەگەیاندی. چەند شتێکی ڕاسپاردووە کە بۆی

بنێری و ئێمە پارەکەت دەدەینێ.
- دەی خۆ حاجی تۆفیق ساغ و بە دەماغە؟
- لە سایەی سەری تۆوە!
وردەئامرازمان کڕی و گوتی: بەیانی وەرن هەشت کیلۆ حەرف حازرە؛ کیلۆی بە هەشسەد فلس. لیستەی فرۆشراوەکانی گرت و گوتی ئیمزای کەن. ئێمەش کەر-کەر بۆ شوێنەونی دوو ئیمزای شیعانەمان کردووە: «جەعفەر مووسا»، «حوسێن عەلی». سبەی چووینەوە. کابرا گوتی: خەڵکی سولەیمانی زۆربەیان عومەر و عوسمان و کەمالن. ئەو ناوانەی ئێوەم زۆر پێ خۆش بوو؛ بەڵام بە داخەوە حرووفم نەماوە بتاندەمێ! زانیمان چ غەلتێکمان کردووە. چووینە چاپخانەیتر، گوتیان مەمنووعە؛ بەڵام کیلۆی بە دینار و دوو سەد فلس پێتان دەفرۆشین.
زەبیحی لە سولەیمانی دەگەڵ هەمزە عەبدوللا کێشەیان لێ پەیدا ببوو. زەبیحی گوتبووی: تۆ شەوانە دوو بوتڵ ئارەق، چێشت و مەزەی شاهانە و مانگی حەفتا دینار لەو ڕەش و ڕووتانە وەردەگری؛ چۆن وا دەبێ؟! لە داخان چووبووە حیزبی «تەحەڕڕوڕ» و ببوە شیووعی. ژمارەیەک نیشتمانی چاپ کرد و تێری تاریفی شیووعی و غەیبەتی کاربەدەستانی پارتی کردبوو. شیعرێکی منیشی -کە نازانم کامە بوو- تێدا بلاو کردبووە. پارتی گلەیان لێ کردم.
- ئەوەت بۆ کردووە؟
- من ئاگام لێ نەبووە و زۆریش تووڕەم.
نامەیەکی پڕ لە گلەییم لە زەبیحی نووسی، کە بۆچی بێ‌پرسی من شیعرم چاپ دەکەی؟ لە ئێستاوە دەنگت لێ دەگۆڕم. شەوێک یەکێک لە دوکان بە گوێمیدا سرکاند: زەبیحی لە فلان باغچە لە سەر نیمکەتی چەقاو کروشمەی کردووە. هەموو گلە و گازنم لە بیر چوو و غارم دا، زەبیحم دیتەوە. لێم مۆڕ بۆوە و ڕووی لێ وەرگێڕام.
- کاکە وەختی تووڕەیی نییە؛ هەستە با بڕۆین.
چووینەوە ماڵەکەم.
- دەی کاکە بۆم بگێڕەوە!
- دەگەڵ حیزبی کومۆنیست بووم. لە سولەیمانیەوە هاتمە کەرکووک؛ بە نهێنی دەژیام و خەریکی نووسینی خۆم بووم. ئەوانەی دەمناسین گیران و سەرگەردان مامەوە؛ هاتوومە بەغدا... سەرمان پێکەوە نایەوە.
ڕۆژێک لە کار چوومەوە ماڵ، کابرایەکی مل باریکی سەر چکۆڵەی چلکنی پووتەکە، دەگەڵ زەبیحی دانیشتبوو.
- کاکە تۆ کێی؟
- دەمێک بوو لە مامۆستا زەبیحی بێ‌خەبەر بووین، وا ئەمانەوێ «ئیتتیصالی» پێ بکەینەوە. «وەضعی» مادیمان باش نییە؛ ئەگەر باشتر ببێ مانگێ دوو دیناری یارمەتی دەدەین.
وەخت بوو لە داخان بدڕێم:
- ئاخر نالێن ئەم مامۆسایە بە چی دەژی؟ ئەگەر وەزعی مادیتان -خوا نەکا- باشتر بوو، کێ هەر جێ خەوی شەو، بە بێ نان، مانگێ بە دوو دینار دەدا؟ دەی خوا لێتان بە زیاد نەکا. ئەوا من کارێکم هەیە، دەتوانین هەردووکمان پێی بژین. بۆ کاری ئەویش خوا کەریمە.
کابرام تووڕە کرد؛ ڕۆیشت. بەڵام ڕەفیق چالاک گوتەنی: «شیووعی وەک قیر و زەفت وان؛

هەر پێتەوە نووسان تازە بە ئامان و زامان بەرت نادەن»، هاتوچۆی زەبیحی‌یان هەر دەکرد. «وەضعی» مادیش هەر چاک نەبوو!

بە هۆی وەستامەوە کارێک بۆ زەبیحی پەیدا بوو. کۆپیە عەکسی بە ماشین بۆ ئەرمەنیەک دەگرت و مانگی شەش دیناریان دەدایە.

زۆری نەبرد سەر و کەللەی قزلجیش پەیدا بوو. سێ تفەنگداری ئەلکسەندر دووما گەینە یەک. قزلجی لە خانێکی تووتن و مازووکڕین لە لای عەبدولقادر ئەفەندیەک کاری دۆزیەوە. کەسێک «پێکەنینی گەدا»ی خوێندبێتەوە دەزانێ قزلجی لەوێ چۆن ژیاوە و بۆچی دەرکراوە. بەیانی زوو من دەچوومە سەموونی گەرم و پێخۆر کڕین. زەبیحی چای لێ دەنا. قزلجیش هەر خواردنی لە سەر بوو!

نیوەڕۆیان دەچووینە کەبابخانەیەکی زۆر هەرزان لە بازاڕێکی چەپەکدا. باجی ڕەجۆی خاوەن‌ماڵ ڕۆژێک پرسی:

- لە کوێ نیوەڕۆژە دەخۆن؟

- لە کەبابخانەی بازاڕی سەدریە.

- ئەی دەغیلە نەکەن! شەوێ دیم نیوەشەو، لەو ماڵە جیرانەمان -کە فایتونچیە- سرت و خورت دەهات؛ ترسام. لە دیوارەوە ڕوانیم، سەودای ئەسپێکی تۆپیو بوو؛ ئەو کەبابچییە کڕی!

تۆزێک بێزمان هەستا و هێندێک جنێومان دا و بڕیار درا نەچینەوە لای. هەرچی گەڕاین لەو نزیکانە کەبابخانە نەبوو؛ هەر چیەکیشمان بخواردایە، زۆر گرانتر دەکەوت. پاش تۆزێک منجە-منج و مقۆ-مقۆ، وەک تێکوڵە خەیاری فەقێیان خۆمان لێ گێل کرد و ملمان لە کەبابی گۆشت کەر و بارگینی تۆپیو -کە ئیشاڵڵا وا نەبووە- نایەوە.

ڕۆژێک لە دەم بازاڕی گەورە، ڕووبەڕووی ڕەفیق چالاکی جاسووس هاتم. زۆر ترسام؛ بەڵام وەک جاری پێشوو دەرفەتی هەڵاتنم نەبوو. ڕەفیق گوتی: تۆ و قزلجی وا دەزانن ناتانناسمەوە. نە کوێرم، نە هێندە گێژم. قۆیتاس پەپوولەش تۆ بووی! بەڵام هێندەش جاسووسێکی بێ‌نامووس نیم کە خەبەر لە ئێوەی ئاوارەی کوردایەتی بدەم. مەترسن! هەڵمەیەن...

- کاک ڕەفیق سوپاست دەکەم. بەڵام هەر ئێستا ئاشنایەک بمبینێ دەگەڵ تۆ قسە دەکەم، چ فکر دەکا؟ ئەگەر پیاوەتی دەکەی، مەمناسە و نەتناسم.

گوتی: قسەکەت ڕاستە؛ خواحافیز.

بە هۆی «مستەفا کوێر» ناوێکی بە چاوێک! کە خۆی بە خزمی زەبیحی دەزانی، زەبیحی و قزلجی لە کافە ڕستوورانێکی هەرە بەناوبانگی بەغدایە -کە خاوەنەکەی عەبدوڵڵا شەریفی کۆنە سابلاغی و ملیۆنێر بوو- بە نووسەر دامەزران.

زۆر جار شیووعی زەردی مل‌باریک -کە من ناوم نابوون «تۆپیو»- دەهاتنە لای زەبیحی و پێیانەوە ڕاهاتبووم. شەوێکیان هاتمەوە، دەبینم زەبیحی و هەشت کەس لەو تۆپیوانە، بە سەر چینچکان بە هەڵترووشکانەوە، لە سەربان سەریان بە سەری یەکەوە ناوە سرتە دەکەن؛ چراشیان نەکوژاندۆتەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە لێفە شرم پێچایەوە.

- خواحافیز!

- بۆچی بەجێمان دێڵی!

- کاکە! ناترسم بمگرن؛ بەڵام لە سەر کارێک کە خۆم کردوومە. نامەوێ بڵێن زەبیحی

گیراوە؛ هەژاریش چونکە هاوماڵی بووە تووش بووە. نانی خۆم لە سەر سفرەی تۆ ناخۆم.
سیپاڵم هەڵگرت و بوومە هاووەتاغی حەمەی ڕەشادی.
شەوانە لەو ماڵە -کە دەچووینە سەرجێ، لە سەربان- زەبیحی لە سەر یەک «ئارسین لوپین»ی دەخوێندەوە. دەمگوت: چرا بکوژێنەوە! من سەیری ئەستێران دەکەم. دەپاڕاوە: مەلا! هەر ئەوەندەشم لێ گەڕێ؛ هەر ئەم چەند پەڕەم ماوە!. گوتم: چرا بەش دەکەین؛ سەعاتێک بۆ تۆ، سەعاتێک بۆ من! سەری وەخت، ئەو هێشتا «ئەو تۆزە» و «ئەو چەند پەڕەی» هەر دەما، بەشە چرای خۆم بە کیلۆیەک خورمای تەڕ (روتەب) پێ دەفرۆشت؛ بەو شەوە دەبوو بچێ بیکڕێ! لە پاش چرا کوژاندنەوە، کەوتبووینە باسی ڕیشەی وشەی کوردی: بۆ وای ناو نراوە؟ ڕەگەکەی -کە دەبێ دوو حەرف و بزاوێک بێ- کامەیە؟... بە ڕاستی ئەوە زۆری بەهرە هەبوو؛ چاوی ڕوون کردینەوە و زۆر شتی سەیرمان دەبردەوە سەر یەک. قزلجی گاڵتەی پێ دەکردین؛ لە پاشان ئەویش ئەو نەخۆشیەی گرت و یاریدەی دەداین.
لە پاش ئەوەی زانیم پۆلیس لێم دەگەڕێ، نەموێرا لە بەغدا بم. چووم لە مەیدان سواری ماشین بم، جەماڵ ڕەفعەت ناوێکی ئاشنام تووش بوو.
- وەرە سوار بە!
ماشینی مارسیدسی ئاخر مودێل، پشتی پڕ لە ڕۆست و ئابجۆ. لە تەنیشت جەماڵ دانیشتم؛ کەرکووک بگرە و هاتم! لە ڕێگە جەماڵ دەڵێ:
- خەجاڵەتم! جێگەت ناخۆشە!
گوتم: ڕاست دەکەی! ئەو دەم کە سواری بارە گێچ دەبووم و ڕۆژم لی دەبوو بە مانگ، جێگەم لێرە نەرمتر بوو!
لە ڕێگە زۆری حەول دا، نەچوومە سولەیمانی کە میوانی بم. لە بەر دەرکی ئوتێل سیروان -کە هی کوردان بوو- دایبەزاندم و ڕۆیشت. لە ئوتێل بردیانمە وەتاغی ژمارە سێزدە کە لە نەحسی سفریان لێ نووسیبوو. لە دیوار تەقویمێک هەبوو، دیار بوو سێزدەی مانگە. پووڵی گیرفانم بژارد، سێزدە دینارم هەبوو. کۆبوونەوەی ئەو سێ سێزدەم پێ سەیر بوو! لەپڕ میوانێکیتریان هێنا وەتاغەکەم، چاوی چەپی کوێر بوو. سەرباریش کابرا لە درۆ هەڵبەستندا بێوێنە بوو. ئەفسەری تورک بووە، ژنی ژەنەڕاڵی ڕووس لە جەنگەی شەڕدا عاشقی بووە! مۆسیقارێکی زۆر زەبر بە دەست بووە، بەڵام ئێستا لە بیری چۆتەوە و هەزار درۆی سەر بە کوڵکە.
شەو چوومە چێشتخانە شیو بخۆم، کاربەدستی چێشتخانەکەم دەناسی.
- کاکە غەریب! من پووڵم زۆر کەمە؛ تا دەتوانی خۆراکی هەرزانم دەیە. دەترسم زۆر بمێنمەوە و دەری‌نەهێنێ.
- تۆ بمکە وەکیل و حەقت نەبێ.
گۆشت بەرخ و برنجی بۆ هێنام.
- هەتیو ئەمە چییە؟
- بخۆ دڵم مەشکێنە!
سبەی کەرە و هەنگوین.
- تو خوا بخۆ!

نیمەڕۆ مریشک و برینج.

- تکایە مەیگێڕەوە!

پازدە ڕۆژ لەوێ بووم، هەر چی دادم کرد، غەریب بە تکا و «خۆشە» و «لەبەر دڵی من»، ئاوای بە خێو کردم. دوارِۆژ گوتم: حیسابی ئوتێل و خواردن چەندە؟ من تەنیا سێزدە دینارم هەیە، ئیتر گوناح لە خۆتە، چت دەمێنێ با قەرز بێ.

گوتی: ئەو ڕۆژە کە هاتی و جەمال ڕۆیشت، پاش تاوێک گەڕاوە، گوتی: هەزار ئەگەر پارەی بدەمێ لێم توورە دەبێ. هەر چەندی لێرە بێ، هەرچی دەخوا و حەقی ئوتێلی لە سەر من حیساب کەن! برۆ خواحافیزت بێ.

بیستبووم برایم ئەحمەد -کە ئەوسا ڕەئیسی پارتی بوو- لە کەرکووکە. دیتمەوە و چیرۆکی خۆم پێ گوت. خانوویێکی چکۆڵەی دوو ژووری بە کرێ گرت. جیرانێکی دەرکە بە دەرکەوە -کە ناوی مامۆستا «عەلی حەمەدی» بوو- ڕاسپارد کە لە خواردنی ماڵ بەشم بدەن و شتێکیان لە باتیان بداتێ. یانی هەر چەند ئەندامی حیزب نەبووم، بووم بە میوانی حیزب. ڕایەخ و لێفەم بۆ هات. پولی‌کۆپیەکیان هێنا و فێریان کردم. شەوانە برایم دەهات و بە دزی گۆڤاری «ڕزگاری»مان دەردەکرد. لە کاتی چاپ کردندا ڕادیۆم لە سەر دەنگی تەواو دەکردەوە کە ڕێبواران خرەی چاپ نەبیەن. دوو ژمارەمان لە دوو حەوتەدا بلاو کردەوە. تەواوی ڕۆژ لە بێکاری لەشم گران دەبوو. بە عەلی حەمەدی خانەخوێم گوت: بە کاک برایم بلێ کارێکی ڕۆژانەم پێ بسپێرن؛ حەوتەی تاکە شەوێک چاپ کردن زۆر کەمە. نازانم چۆنی پێ گوتبوو، هاتەوە گوتی: کاک برایم دەڵێ جا ئەگەر هەر حەز دەکا با بچێتەوە بەغدا!

دەڵێن جارێک «خدراغای قزلجە» نۆکەرێکی ناردۆتە لای ئاغەیەکی‌تر، کە وای پێ بڵێ و ئاوای تێ بگەیەنە و جوابم بۆ بێنەوە. نۆکەر دێتەوە، جوابەکەی هیچ فری بە سەر سپاردەوە نییە.

- کورە ئەوە چییە؟

- ئاغا لە ڕێگە فکرم کردەوە، فەرمایشتەکانت زۆر بێتام بوون! بۆ خۆم ئەمەم گوت و ئەوەم تێ‌گەیاند؛ ئەویش ئەم جوابەی داویەوە!

لێم نەپرسی تۆ چت گوت؛ بەلام بە بێ خواحافیزی هاتمەوە بەغدا. چوومە ماڵەکەی حەمە. لەو کاتە لە ماڵەکەی کەرکووک بووم، تووشی «سەید ئەحمەدی سەید تەها» هاتم.

- کاکە! چۆن وا دەبێ؟ ئێمە برای کۆمەڵەین. من چەند دێم هەیە. هیچ پۆلیسێک ناتوانێ بێتە ملکی من. بشزانن ناتوانن بتگرن. قورعان بە حەقت بە ساحیبت! سبەی دەگەڵ خۆمت دەبەم.

- کاک سەید ئەحمەد! پولی‌کۆپیەک هەیە با دەگەڵ خۆمی بێنم؛ کە دێی تۆ بۆ شتی وا دەناڵێ و زۆریش خزمەتە بە کورد.

- بە سەر چاو، ئەویشت بۆ دادەمەزرێنم. سبەی سەعات هەشت وەرە بە ترۆمبیل دەچین ماشێن و کەل-پەلت هەڵدەگرین؛ بەلام نەچی پەشیمان بیەوە! لە پیاوی بەدقەول توورەم!

لە برایمم پرسی، گوتی: زۆر باشە. سبەی هەر سەعات حەوت گەییمە ئوتێل. هەیهوو سەید ئەحمەد دەمێکە ڕۆیشتووە! ئێستا و ئێستاش نەمدیتەوە.

ڕۆژێک مامۆستا «عەلی حەمەد»ی جیران و خانەخوێم هاتە لام. دەربارەی مارکسیستییەوە

دەدوا و هێندێک پلیخانۆف-ملیخانۆفی تێدابوو؛ کە دەیگوت فلان ڕیجعی و فلان تەقەددومی بوو. من تێناگەم و هەر دەڵێم بەڵێ. لەپڕ گوتی: من زۆرم مورتەجیع ناخۆش دەوێ.

- بەڵێ بەڵێ! مورتەجیع زۆر سەگبابە.

- ئەرێ هەژار مورتەجیع بە چی دەڵێن؟!

- بە خودا مامۆستا منیش نازانم؛ بەلام ناخۆشم دەوێ.

ئەوەم هاتەوە بیر کە ئەو دەمەی لە تەوریز لە بیمارستانی ڕووسان بووم، مودیری دژبانی تەوریز لە حوکمی پیشەوریدا -کە ناوی «نەمازی» بوو- دەگەڵ مندا لە ژوورێک بووین؛ کە ئەویش نەخۆش بوو. هەر قسە دەقسە دەکەوت دەیگوت: من کومۆنیستم، ئەی تۆ؟

- دیارە منیش کومۆنیستم.

ڕۆژێک دوای ئەوە گوتی من کومۆنیستم، پرسی:

- هەژار! پێم ناڵێی کومۆنیست چییە؟

- نەمازی گیان! حەرام ئەگەر پتر لە تۆی لێ بزانم!

نەدەکرا بچمەوە دوکانی وەستا؛ دیسان بێکار دەخولامەوە و دەمپرسی. بەلام ئەمجار برسی نەمام؛ قزلجی و زەبیحی کاریان هەبوو؛ یاریدەیان دەدام.

ڕۆژێک تووشم هات بە تووشی ئارتینەوە؛ گوتی: ئەرمەنیەکی دەرمانفرۆش دەڵێ بچۆ کەرکووک شاگرد عەکاس بە؛ مانگێ شازدە دینار وەرگرە. من ناچم. تۆ لە جیاتی من بچۆ!

- ماڵت ئاوا بێ!

بلیتی قەتار و دوو دیناری لە ئەرمەنیەکە ساند؛ گوتی: ئەگەر قبووڵیان نەکردی، بەو دوو دینارە دێیتەوە بەغدا و زیان ناکەی. لە سەرڕا چوومەوە کەرکووک. لای ئەرمەنیەک «پۆرتۆیان» لە «ستۆدیۆ سۆنا» بوومە شاگرد. شاگردێکی سوورایی مەسیحی هەبوو، جامی ڕتووش دەکرد و عەکسی گەورە دەکردەوە ناوی «حەننا» بوو. من لە ژووری تاریکا عەکسم چاپ دەکرد. منداڵێکی ئاشۆریشی کردبووە بەردەستم.

پۆرتۆیان موهەندیسی نەفت و لە شرکەتی کەرکووک ببوو؛ دەرکرابوو. لە عەکاسی نەدەزانی و کارەکەی ئێمە بۆمان دەگەڕاند. ئەرمەنیەکی زۆر بەدین بوو. زۆر دەچووە کلیسا و زۆر جار کەشە دەهاتە لای. کارەکەم -کە بە شیعریش باسم کردووە- لە هەشتی بەیانەوە تا نیوەڕۆ، لە چواری پاش نوێژەوە تا حەوت بوو. کەرکووک هاوین لە بەغدا گەرمتر و زستان لە کوردستان ساردترە؛ جەهەندەمێکە لەو دەشتە. لە ژووری تاریکی بێ مەنفەزدا، باوەشێنی بەرقی وەها گەرم دەبوو دەمکوژاندەوە. ڕۆژانە لە دەمی گەرمادا چەند جار فانیلە (ژێرکراس)کەم دادەکەند، دەمکوشی، وەک دە جار دەئاو هەڵکێشرابێ ئارەقی لێ دەچۆڕا.

لە سەر لێواری چۆمی خاسە -کە هەمیشە وشکە و تەنیا لە ڕۆژی باران و سێلاودا ئاوی تێدایە- ژوورێکم لە ئوتێل «سەرجسر» گرت. بەلام چۆن ژوورێک و چۆن ئوتێلێک؟! کۆنەخانوویێکی بە قوڕکراوی دوور و درێژ کە لە ناودا چاوە- چاوە کراوە؛ هەموو دیوار قەڵشاون. ئەو ژوورانەی ڕوو بە خاسە نین، دەبێ بە ڕۆژ چرایان تێدا هەڵکەی. بۆنی تەرەشوح گێژت دەکا. ژوورەکەی من لە ڕووی خاسە بوو؛ ڕووناک بوو. پەنجەرەکانی داری کون چکۆلەی خشتی چوارگۆشەی بێ شووشە بوو. دەرگای وەک دەرگای زەمانی عەبباسیان بە بزماری سەر بە قوببە نەخشابوو. لە گرێژە نەچووبوو؛ هەتا دەتکردەوە جیرەی توومار بە توومار دەڕۆیشت. کرێش

مانگێ دینارێک.

وە ناو بازاڕ کەوتم. گۆزەیەک، کەترییەک، خەڵووز و مقەڵی و گەسک، دوو حەسیر، دوو ئستیکان، مەنجەڵێکی ئەلمونیۆم و دوو قاپ و کەوچکێک و خوێ و شەکر و چا و برینج و ماڵ هەی ماڵ! کابرایەکیش -کە وەک من لە ئوتێل بۆ- ڕۆژانە دەچووە کار، تەختێکی دارینی دامێ بە قەد دوو نیمکەت پان. گوتی من جێگەم نییە لێی دانێم؛ با لای تۆ بێ. لێفە لە سەر تەخت ڕاخە و تەخت خۆت درێژ کە!

جگە لە یەکشەممە -کە وچان بوو- نیوەڕۆ لە چێشتخانە و شەو و بەیانی بە نان و پێخۆرێکی وەک پەنیر و ماستم دەگوزەراند. لە چێشتخانەش -وەک زۆربەی کرێکارانی فەقیر- داوای فۆگەم دەکرد؛ کە هێندێ خۆرشت بە سەر برنج داکەن؛ نەک خۆرشت و برینج هەر یەک بە جیا -کە گرانتر دەکەوت. ڕۆژی یەکشەممان کەتەم لێدەنا و لە جیاتی خۆرشت، ترێ ڕەشکە یان کشمیشم تێ دەکرد. کەوشیشم بۆ خۆم ڕەش دەکردەوە؛ پاتشا بووم و تاجم نەبوو! تەنیا لە زستان و سەرمادا زۆر حاڵم شڕ بوو. نە کونی ژوور دەگیرا، نە ئاگری سۆپەش خەبەری هەبوو. کە دەهاتم بخەوم، ئاوم دەکولاند، دوو شووشەم لێ پڕ دەکرد، دەمخستە ناو تویێی لێفەوە. لێفەکەشم بە پەتێک بە تەختەکەوە دەبەستەوە کە لە سەرم لانەچێ و دەچوومە ناویەوە. ئارەقم دەکرد.لەپڕ بە لەرزەلەرز خەبەرم دەبۆوە؛ شووشە ئاو سارد ببوونەوە. دیسان و دیسان ئاو گەرم کە و دە شووشەی کە! شەوانە سێ چوار جار ئەم کارەم دەکرد.

نیوەڕۆیانی گەرما -کە دەمەویست ئیستراحەت بکەم- واوەیلا بوو. هەڕاجە بازاڕێک و چەند میوەفرۆشێک لە دەم خاسە و بەرانبەر بە ژوورەکەم هاواریان دەکرد: تەنزیلات، شەربەت بە دوو فلس؛ ترۆزی بلاوە؛ خەیاری ئیمام قاسم...» چەققەیەک بوو مێشکی سەرم دەزرینگا.

«مەلا شوکور مستەفا» لە فەقێیەتیەوە گەیبووە بەغدا؛ زۆر زیرەک بوو. لە دانشکەدەی شەریعە قبووڵ کرابوو؛ دانشجوو بوو. دایکێکی فەقیری بوو لە گوندێکی دەوری کەرکووک، مێردی کردبۆوە. هیچی نەبوو یاریدەی کوڕەکەی پێ بدا. دانشجووی شەریعەش جگە لە خواردن و جلی مەلایانە، ڕۆژێ پەنجا فلسی بۆ گیرفان پوولی دەدرایە؛ بەڵام لە چوار مانگی وچانی هاوینەدا دەرگا دادەخرا. نە خواردن، نە پوولی گیرفان. تا دانشکەدەش دەکرایەوە دەبوایە خۆیان بەڕێ بەرن. مەلا شوکور دەچوو دەبوو بە شاگرد قاوەچی، شاگرد نەققاش و هاوینی دەگوزەراند. پێکەوەش ئاشنا بووین. ڕۆژێک لە کەرکووک هاتە لام.

- کاکە چم لێ دەکەی! هەر چی گەڕاوم کەس کاری نەداومێ.

- ئەوەی بۆ چییە؟ وەرە پێکەوە دەژین تا دەچیەوە دانشکەدە. حقووقەکەم لای تۆ بێ. تا لە کار دێمەوە چێشت و نان ساز کە و لێفەیەک بۆ خۆت پەیدا کە و جێگەی هەردووکمان دەبێت.

مەلا چووبوو پریموسێکی لە دایکی ئەمانەت وەرگرتبوو؛ کارمان زۆر بە مقەڵی نەما. مەلا ئاشپەزێک بوو قەت نەمدی برینج و شلەکەی بۆنی دووکەڵی لێ نەیە!

شێخ مارفی بەرزنجی -کە بەعسی ئیعدامیان کرد- هاتوچۆی دەکردم. جار-جار بۆ نەهار دەیبردمەوە ماڵێ. زانیبووی کە من چەند تینووی خوێندنەوەم و ناشتوانم هەموو کتێبێک بکڕم؛ ڕۆژێک کتێبێکی تازە لە چاپ دراوی هێنا، گوتی: نیوان هەڵبرینی پەڕە کتێبم زۆر لە لا زەحمەتە، ئەم کارەم لە باتیان بکە و بیشیخوێنەوە؛ جا بمدەوە! ئیتر هەر کتێبێ دەربچووبایە -میسری یان لوبنانی و عیراقی بوایە- دەیکڕی و من دە پێشدا دەمخوێندەوە.

جارێک حەننا بۆ پازدە ڕۆژ مەرەخەسی وەرگرت کە سەیرانێک لە عیراق بکا. هاتەوە گوتی: برا هەر خوا دامیەوە! لە بەسراوە دە بەلەمێکدا دەگەڵ شازدە کەس دەچووینە دیتنی ئابادان. لە تەنیشت قەسابێکی بەسرایی دانیشتبووم. لێی پرسیم: کوێندەری؟ وتم: خەڵکی شامم.

یەخەی گرتم، ڕاپیەڕاندم، ڕایتەکاندم، چەقۆی دەرێنا زگم بدڕێ. وا حەپەسام هاواریشم بۆ نەکرا. خەڵکەکە دەستیان گرت.

- چیتە بە سەریەوە؟ چی کردووە؟

- چۆن چی کردووە؟ شامییە و ئیمام حوسێنی کوشتووە!

تا دەرنەکەوت کە من مەسیحیم دەستی لێ بەرنەدام!

دەگەڵ وەستاکەم (پۆرتۆیان) جار-جار باسم لە هێندێک خرافاتی مەزهەبی دەکرد. کەشەی هەرمەنی -کە پیاوێکی سی ساڵەی ڕیش دووفلیقانە بوو- هەرگا دەهات دەیدواندم. پۆرتۆیان ڕۆژێ گوتی: ئەبوونا (باوکمان)! دەگەڵ عەزیز مەدوێ با کافرت نەکا!

- شتی وا بۆ دەڵێی؟ زۆر کوڕێکی باشە. ئەوە بۆ وات پێ دەڵێ؟

- ئەبوونا تۆ شوکور جوان و بەهێز و توانی؛ ئەگەر چل مریشکت لەو دەشتە بۆ بەرهەڵدا کەم و بڵێم بیانگرە بۆ خۆت، چەندت بۆ دەگیرێن؟

- خۆم بپسێنم دەم بۆ ناگیرێ.

- ئەدی ئەگەر بڵێن پیاوێک بە تەنیا سێسەد ڕێوی لە دەشت گرت، کلکی هەر دوانی پێکەوە گرێ دا، شاپلیتەی لێ قایم کردن و گەنمی دوژمنانی پێ سووتاندن؛ دەفەرمووی چی؟!

- دەڵێم ئەوە درۆیەکی ئاپریلە.

- دەسا ئەوە لە کتێبی موقەددەسدا دەربارەی سامسون نووسراوە!

- زۆرم کیتابی موقەددەس خوێندۆتەوە؛ بەلام هەرگیز فکرم لەو درۆ زلە نەکردۆتەوە!

پۆرتۆیان گوتی: نەمگوت کافرت دەکا؟!

- پیا! ئەگەر ئیمان باوەڕ کردن بە درۆی وا شاخدار بێ، با هەر نەبێ!

دەگەڵ پیرە ئەرمەنیەکدا ببوومە ئاشنا؛ کوردی زۆر باش دەزانی. ڕۆژێک لێم پرسی:

- ئەو کوردیە چۆن فێر بووی؟

- کوڕە من بیست ساڵ میرزای خانی کەڵهوڕ بووم!

گوتی: ڕۆژێک خان هەر بزەی سمێلی دەهات. چوار مێردەکی قاچی خستبووە سەر قاچ، تەپلە بە لاتیلاگی سەریەوە، فیتووی لێ دەدا. ڕووی تێکردم:

- میرزا! ئاخ خودا ساڵێک منی بکردایەتە شای ئێران!

- لەو ساڵە شایەتیەدا چت دەکرد؟

- وەڵلاهی وا دەڕیامە ئەم مەملەکەتەوە، هەزار ساڵ بیان‌لستایەتەوە پاک نەکراباوە!

لە ئوتێلە بۆردا حاجیەکی مەککەیی میوان بوو؛ هاتبوو خەڵک بە تەپکەوە کا، لە حەج بیکەنە شارەزای خۆیان. ئاوی ئوتێل دەبڕا، بێئاویمان دەکێشا. گوتم:

- حاجی دەگەڵ ئاوی دەسنوێژ چۆنی؟

- باشم. ئەسحابی پێغەمبەر لە تێکولە گوێزێکدا غوسلیان دەکرد!

مەلا شوکور بردمیە دیدەنی «مەلا سەعدوڵلا» ناو کە: «پیاوێکی زۆر بەدینە». لە مزگەوتی شۆرجەی کەرکووک بە خزمەتی گەیشتین. مەلا شوکور پرسی: فەقێیەکت لە لا بوو، کوا؟



- ئەو کەرەم دەرکرد! ئەمن دەمگوت هیتلەر نوێژی بە جەماعەتی لە مەدینەی پیرۆز دەکرد! باوەڕی نەبوو؛ کەچی دەیگوت پێغەمبەر دوعای لۆ ستالین کردیە! کەری وا بۆ من نەدەبوو!

هاوینی گەرم، یان بڵێم جەهەندەم بوو. کابرای خاوەن ئوتێل پانکەیەکی شەق و شڕی بە تێل پێچراوی داینێ باوەشێنی خۆمانی پێ بکەین. مەلا شوکور گوتی: ماڵە دەوڵەمەندی بەغدایە وشترخۆرە بە بەر پەنجەرەوە دەگرن و تەڕی دەکەن، هەوای پانکە ساردتر دەبێ. قەفەسەیەک وشترخۆرەمان دەلای پەنجەرە ئاخنی، تەنەکە ئاوێکمان پێدا کرد؛ دەرکەمان داخست، پانکەمان پێکرد. بە نسیبی دوژمنت بێ! هەڵمێک دە ژووری گەڕا نەفەسمان تەنگ بوو، وەختابوو بخنکێین؛ لای دەرکەمان نەدەدیەوە بیکەینەوە. بە هەڵمەوە یەکێک دەرکەی کردەوە کە بزانێ چ باسە، ڕامانکرد. تاوێکی باش کۆخین و ئاوی چاومان سڕی. وشترخۆرەکەمان تووڕ هەڵدا. لاسای دەوڵەمەندی بەغدامان پێوە نەهات.

ڕۆژێک مەلا گوتی: خوێندوومەتەوە کە میوە هەر تێکوڵەکەی زۆر بە کارە؛ پێستی پیاو ساف و ڕووناکتر دەکا. جارێ کە لە کار دەهاتمەوە لەپڕ گوتم:

- ئەمڕۆ شتێکی سەیرم دیت: زەلامێک بەرانبەر بە چڕوچاوی گامێشێک ڕیشی دەتاشی!

- جا چۆن؟

- گامێش هێندەی تێکوڵە شووتی خواردبوو، نێوچاوانی ببوە ئاوێنە!

مەلا تووڕە بوو؛ گوتی: قەت عاقڵ نابی!

قانیع ماڵی هاتبووە کەرکووک؛ هاتوچۆی دەکردین. بڕیارمان دا کە فێرە بلوێرلێدان بین. هەوەڵ دەرس دەبێ وا پکەی (لە بلوێرژەنیدا) نەفەس بخۆیەوە و نەیبڕی. قامیشمان لە ئیستیکانی پڕ ئاو دەنا و فوومان بەو سەریدا دەکرد. نەفەس خواردنەوە کارێکی گران بوو. ئەگەر ئەحیانە جارێک فوومان بۆ دەخورایەوە، ئەوەندە پێدەکەنین تا لە بیرمان دەچووە. سەرنەکەوتین.

- قانیع! ماڵت چۆن دەسکەوت؟

- بە خوا باوک! پیاوێ خێرەوەمەن وتی تۆ سەیدی و کوڕ شێخ دەلاشی؛ چاوەیەک خانووی داوە پێم.

- قانیع گیان! کابرا هەر کە زانی تۆ وەک بابت ممبارەک نی دەرت دەکا.

- نا باوە پیاوێ خاسە.

ڕەمەزان بوو، ڕۆژێک قانیع بە قاقا هاتە ژوور.

- باوک دەریانکردم! کاورا دیتمی نان دەخۆم، وتی: هەی فاسق ماڵەکەم چۆڵ کە! تێناگەم، من وە پارەی خۆم نان بخۆم خراپیم دەگەڵ کێ کردووە؟!

حەولی دابوو کارێکی دەسکەوێ، نەبوو. گوتمان عەرابە دەستی بگێرە، وردەواڵە بفرۆشە. سندووقە سابوونێکمان بۆ کڕی. مەلا شوکور گوتی: چوار بۆڵبرینگیشی دەوێ.

- باوە! بۆلبرینگ چەس؟

- کارت نییە، بۆت پەیدا دەکەین.

ئیتر وەک تالیلەی دەرویشان لە سەر یەک دەیگوت: «بۆڵبرینگ!». لە سەقەتفرۆشی دەوری خانەقا دوانمان کڕی. چووینە بەری قۆریە بۆ سانەوە، لە چایخانەیەک دانیشتین. دوکاندارێکی ئەرمەنی -کە ئامرازی ترۆمبیلی دەفرۆشت- لە پشتەوە قانیعی ناسیبوو؛ هات.

- مەلا قانیع ماندوو نەبی!
- باوک بۆلبرینگت هەس؟!
- ئەرێ وەڵلا هەسم و ناتدەمێ! تۆ هیچ نەبێ جوابی سەلام و ماندوو نەبیم بدەوە!

بۆلبرینگی دا، عەرابە ساز بوو. مەجید کاکەش –کە عومدەفرۆش بوو– کەل–پەلی بە قەرز دایە کە پاش توانەوە بیداتەوە. دوو دەستە پزدان (تیزانگ)ی بۆ هێنا کە بیفرۆشێ. بۆ تەجرەبە یەکێکی فوو کرد، درێژ و ئەستوور وەک هەرامەی کەرێ! قانیع گوتی: ئای باوک! ئەمە نافرۆشم؛ ئەمە بۆ دایک کوتەک خاسە! (دایک کوتەک خێزانی بوو).

تۆ رەنگە قانیعت نەدیبێ! شتی هێندە ناحەز و ناقۆلا نەبووە: درێژ، لاواز، چاوچکۆلە و پرووش، لووتشۆڕ، لارووەمەت بە کەند و کلۆ، جل بە پینە و کەلاش چەک و بەدنموود؛ لە گاڵتەوگەپدا بتکولاندایە ئۆخژنی نەدەهات. عاقیدەی شێخ سەمیعم بۆ باسی چروچاوی قانیع و گەریدەیی و بێنانی وەرگێرابووە سەر گەپوگاڵتە. رۆژێ دە جار بۆم بخوێندایەتەوە لە پێکەنین رەش و شین هەڵدەگەڕا. دوایە گوتی: باوک بیدڕێنە! بە خوا ئەمەشەم ئەبێتە بەزمێکی منالان! بە داخەوە دڕاندم و لە بیرم نەما. دانە–دانەیێکم لە نزیکەی پێنج سەد بەیت دێتەوە بیر. باسی بەهەشتی شێخ سەمیعم کردبووە باسی چروچاوی قانیع:

باسی روخساری نایەتە گوفتار — هەمووی قولکەیە و شیوە و چقڵجار
دوو کویرەکانی ناونراون چاو — دایم دەتکێنن زەرداوی گەناو
مووی کونەلووتی و دوو کونای وەک غار — جەنناتوون تەجری تەحتیهەل ئەنهار

لە باسی نەسەبیدا بە دمەلاسکەی شێخ سەمیع نوسیبووم:

ئەم شێخ قانیعەی هێندە جوان و قۆز — سەر و سمێل بۆز، نەجیم و پیرۆز
لە کۆلۆس شەریف بە وەلەد بووە — بۆ لای کەرکووکی هیجرەت فەرمووە
باوکی شێخێک بوو لە تەکیەی دەلێش — حەفتا ساڵ ژیا، بێ کەوا و کەلێش
دایکی شێخزادە، نازانم کچ کێ! — دایم دوژداماو لە پشتی دەرکێ
ئابا و ئەژدادی لەم سەر تا ئەو سەر — گەدازادە بوون سوالکەر فەل سوالکەر

قانیع تورکی کەرکووکی نەدەزانی؛ بەلام بە لامەوە سەیر بوو؛ بە تورکی هەجوێکی شێخ جەمیلی کردبوو؛ سەرەتاکەی ئەمە بوو:

شێخ جەمیلن تەکیەسی هەر عەینی ئاودەس خانەدر — هەرکەرێ هیچ عەقلی یۆخدر، یاری ئەو شەیتانەدر

پتر لە ساڵێک لە کەرکووک رامبوارد. سەرەتای هاوینی ١٩٥٣ بوو. باسی فستیواڵی جەوانان لە بوخارێست داکەوت. شێخ مارف گوتی: وا دەکەم دەگەڵ لاوانی حیزبی شیووعی بچیە بوخارێست. ئیتر بەر ئەمریشیان نەبی و بە ئازادی بیروبرواى خۆت بە خەڵکی دنیا رابگەیەنی.

ئاخ چەند خۆش بوو ئەم سەفەرەم بکردایە! دوو عەکسی کاڵی نائاشکرای لێوەرگرتم. رۆژێک پاسپۆرتێکی بۆ هێنام کە بە دە دینار بەرتیل دروست کرابوو. گورجێ کەلوپەلم هەراج کرد. حیسابی خۆم لە وەستا وەرگرت، گوتم دەچمەوە بەغدایە. سێ چەمەدانی تەنەکەی پڕ لە کتێبم هێنا و نامەم لە شێخ مارف وەرگرت و چوومە سەر قەتار. لە قەتاردا کە بەرەو بەغدا دەهاتم، لە سەر کورسی دوو نەفەری، پۆلیسێکی رووتەکەی سیسی پۆخەکەم لە تەنیشت بوو. چایان دەگێڕا، گوتم دوو چامان بۆ بێنە. پولیس زۆری سوپاس کردم. پاش تاوێک هەستا ڕۆیی. زۆری نەبرد ئەفسەرێکی پۆلیس بە دوو پۆلیسەوە هاتن:

- ئەفەندی ئەوانە چەمەدانی تۆن؟
- بەڵێ.
- ماڵی قاچاغ، تووتن- مووتنیان تێدا نییە؟
- خۆتان تماشا کەن و ئەوەش کلیل.
چەمەدان جگە لە کتێب چی تێدا نەبوو. کابرای ئەفسەر لە بەر خۆیەوە:
- ئای تەرەس! ئای بێ ناموس! ئەفەندی بمانبەخشە. ئەو پۆلیسەی لە تەنیشتت بوو، هات گوتی ئەو کابرایە لە من ترسا؛ بۆیە چای بۆ کڕیم. دیارە قاچاغی پێیە! نسحەت بێ لە منەوە: ڕووحم بە بەراز بکە! بە پۆلیس مەکە! هەموو حەرامزادە؛ منیش یەک لەوان!
- دوور لە تۆ! بێ زەحمەت چەمەدانەکانم وەک خۆ لێبکەنەوە و لەو سەرە دایاننێنەوە!
شیاوی باسە، لەو ڕۆژانەوە کە ڕۆژانەم سەد و سەدوبیست فلس بوو، لە نانی خۆم دەگێڕاوە و کتێب و گۆواری کوردی و عەرەبی بە دڵی خۆم دەکڕی و زۆرم شایی پێیان بوو. شێخ مارف گوتی: کتێبان لای من دانێ! ئەگەر نەشهاتیەوە بۆت دەدەم بە کتێبخانەی گشتی؛ با نەفەوتێن. بە قسەم نەکرد؛ لە بەغدا بە ماڵە مام حوسێنم ئەسپارد. نامەی شێخ مارفم گەیاند. گوتیان: سی دینار بدە و فلان ڕۆژ حازر بە! یازدە کەس و من بە سواری ئۆتوبۆسی نێرن، بە ڕێگەی چۆڵی شامدا کەوتینە ڕێ.
لە سووریا حوکمی «شیشەکلی» بوو؛ شیووعی لە جەوهەر قاچاغتر. گەیشتینە هەوەڵ پۆستی ڕێوانی سووریا -کە ناوەکەیم لە بیر نەماوە- وا بزانم ئەبوششەماتە بوو؛ چەمەدانیان پشکنین، پڕ لە عەگالی عەرەبی و کڵاش و خەنجەری کوردی و بەیانات. سوێند بخۆ، بپاڕێوە، ئێمە دەچینە سەیران لە لوبنان و لە سیاسەت دوورین. کابرای ئەفسەر دەیگوت: هەر ئەوە کە لە سەر بەیانەکان نووسراوە «وەتەنی ئازاد و گەلی بەختەوەر» -کە لە جێی بیسمیللایە- لای شیووعیان شایەتی چاکە! بە گیرەگیر نەجاتمان بوو. تۆزێک لە شام ماینەوە و چووینە بێرووت. دەبوایە ویزەی ئورووپا وەرگرین. لە سەفارەتی ئیتالیا پاش پرسیار و وەرامی زۆر، کابرای سەفارەت -کە عەرەبی لوبنانی بوو- پرسی: بۆچی دەچیە ئیتالیا؟
- بۆ سیاحەت.
- کێ دەناسی؟
- کەس!
- نابێ، دەبێ یەکێک بناسی.
- ببەخشە وە بیرم هاتەوە، مەلێک فارووق دەناسم کە لە جزیرەی کاپرییە! دەستی کردە پێکەنین.
لەو بەینەدا سەفەرێکی شامم کرد، کە دوو سەعاتە ڕێیە. چوومە سۆراغی برایم نادری کۆنە هەواڵم؛ دیتمەوە.
- چ دەکەی لێرە؟
بۆم گێڕاوە. گوتی: تۆ هیچ فکر ناکەیەوە، پاسپۆرتی جەعلی دوو ساڵی حەبس لە سەرە؛ من قانوون دەزانم. ئەمجار وەدووی کڵاوی بابردە کەوتووی؛ نەدەبوو دەست لە کاسبی خۆت بەردەی. من خوا شوکور عەقڵم هاتۆتە سەرم و پووڵ پەیدا دەکەم.
- کاکە برایم! لە لەیلە و مەجنوونی وەحشی بافقیدا دەڵێ باوکی مەجنوون نسحەتی

کوڕەکەی دەکرد: دەست لە لەیلێ بەردە و وەرەوە ناو خۆمان! مەجنوون لە وەرامیا گوتی: سەد کێوم لە سەر دڵە؛ چۆن هەستم؟ سەد چقڵم دەپێ چەقیوە؛ چۆن ڕاکەم؟ هێندەم لەو ڕێگەیدا غار داوە کە تازە گەڕانەوەم هەیهاتە! تۆ کە خوا شوکور تازە عاقڵ بووی؛ من تازە سەرەتای کەربوونمە... تا ماوم ناگەڕێمەوە و ئیتر ڕەفیقایەتی عاقڵانیش ناکەم.

کۆت و شاڵوارێکی تورکیا حازر و شاپۆیەکی پووشم کڕی و هاتمەوە بێرووت. سواری دەرەجە سەربانی کەشتی سامسۆنی تورکیا بووین؛ بەرەو ئیتالیا. چاردە لاوی لوبنانیش هەر بۆ فستیواڵ دەهاتن؛ هەواڵی ناو کەشتی بوون. دەگەڵ ئەفسەرێکی تورک قسەی خۆشمان دەکرد. دەیگوت: پێغەمبەر ئەفەندی هەر نەحلەتی لە عەرەب و چینی کردووە!

شەوی حەوتی جولای بوو، بەحر کەوتە فەرتەنە. جگە لە کارکەرانی کەشتی -من نەبێ- هەموو کەس گێژ ببوون؛ دەڕشانەوە. لە پەستا پەتوومان بە سەر نەخۆشاندا بەش دەکرد. عیراقییەک بە دەم ناڵەوە دەیگوت: ئافەریم کەشتی! هەزار پیرێژنە یۆنانی قوون زلی لە سەرە؛ چۆن قوم نابێ!».

حەوت ڕۆژ و هەشت شەو لە بەحرا بووین. ئەفسەرەکە دەیگوت ژیان لە ژیانی ناو کەشتی خۆشتر نییە. گوتم: کەشتی وەک بیابانێکە بێ ئاوەدانی. دەنگی کەڵەشێرێک، حەپەی سەگێک، بۆڕەی مانگایەک، هۆقەی گامێشێک نابیسی؛ خۆشییەکەی چییە؟ دەیگوت من بیرم لەو شتانە نەکردۆتەوە.

بەیانییەک گەینە «ناپۆلی». شوێنمان لە قەتاری ڕۆم گرت و چووینە ناو شار. برسیم بوو چوومە بەر دوکانی سەندوویچفرۆشێک. دە جۆرە گۆشتی لێ بوو. یەکیان گرانتر لەوی دی. بە ئیشارە و عەکس حاڵی کردم کە بە نرخەکە گۆشت کەرە و هەرزانەکە گۆشت بارگینە. پیاو تا بۆی بلوێ دەبێ شتی باش بخوا! دوو ساندوویچی گۆشت کەرم وە بەر گاز دا. هەواڵە عیراقیەکانم گوتیان وەرە بۆ ئێمەش لەو ساندوویچەی خۆت بکڕە. پاش قووت دان و ئاو لە سەر خواردنەوە، گوتم: کوڕینە بە ڕاستی گۆشتی کەر بەلەزەتە! بوو بە هۆق هۆق و هێلنجدان. گوتم: مەترسن! ئەوە گۆشتی کەری قوبروسی بوو!

لە ناپۆلی سێ کەلیمە فێر بووم: پینە (نان)، ئاکوا (ئاو)، لە قەتاریش لە دەرکی ئاودەست نووسرابوو: (ریتی ڕاتا) دەی چیترم دەوێ؟ نان و ئاو و ڕیان دەزانم و دانامێنم!

ڕەئیسی ئێمە عیراقییەکان کوردێک بوو بە ناوی «غەفووری میرزا کەریم»؛ بە کوردی قسەی نەدەکرد کە شۆڤینی نەبێ! عەرەبیشی هەر پەڵخوڕ دەکرد؛ دەتگوت کەرە و گووی شل دەخوا!

حوسێن هەورامانیەکیش بوو؛ ئەویش پێی شەرم بوو بلێ کوردم. ڕەئیس لە بێرووت گوتی: ئەو سەرو سێ دینارەی داوتانە، خەرجی ڕێگامانە و کرێش لە سەر حیزبە. بە برایەتی و بە شەریکی وەک یەک دەخۆین و ڕادەبوێرین؛ لە ناو شیووعیدا فەرق و جیاوازی نییە.

ڕۆژێک لە سەر کەشتی کۆ ببووینەوە، یەکێ لە منی پرسی:

- تۆ لە فستیواڵ دەتەوێ چ بکەی؟

- ئەگەر بتوانم هاوارێک بۆ کورد و کوردستانی لێقەوماو دەکەم.

ڕەئیس هەڵیدایە:

- چی؟ کورد؟! کوردستان؟! حیزب قەت بەوە ڕازی نییە!

- برا لە بەغدا قەرار درا من هەر لە ڕێگە ڕەگەڵتان کەوم. لەوێ ئازادانە بیر و بڕوام دەربڕم.

- دەی دەی! ئەم قسە قۆڕە! ساڵح دیلانیش وایگوت و هەر تا سەر دەریا بڕی کرد. دەمت بجووڵێ بڵێی کوردم، خۆت دەزانی!
- باشە با بزانین چۆن دەبێ...
دەعوەتنامەی ڕەسمی حیزبی شیووعیم پێ بوو کە بەشدار بم لە کۆنگرە؛ قاچاغ بوو دەبوو لە ڕێ بیشارمەوە. زەبیحی لە بەڕێ کردنمدا گوتی: من لە ئارسین لوپینەوە زۆر شت فێر بووم؛ ورد پێچایەوە و دە نێوان توێی پانتۆڵدا، لە پشت قوونمەوە تاقەتی کرد. کەچی بە ناشکوری نەبێ، لە «ئەسکەندەرییە» کە دەچوومە سەر کەشتی، ئەفسەرێک پشکنیمی؛ زۆر زوو دیتیەوە. زۆر ترسام. پێکەنی و دەستێکی لە شانی دام: برۆ بە سەلامەت!...
لە ئەسکەندەرییە بۆ دوو سەعات چووینە شار. بەر لەوە چوار دینارم لە پاش جل کڕین و بێرووت مابوو؛ ئەویشم دابوو بە جەنابی ڕەئیس. دەگەڵ کوڕێک دابەزین نامەی دە پۆستە خست. سواری ترام بووین کە بە شارا بگەڕێین؛ لەپڕ دیتم کوڕ نەماوە؛ نازانم لە کوێ دابەزیبوو. پێنج تەعریفەم -کە دەبێتە قرانێک- پێ نەبوو. بلیتبڕ هات بەلامەوە، خودنویسم لە گیرفان کردەوە، گوتم پووڵم نییە.
- تا کوێ دەچی؟
- تا بەندەر.
- بە خۆرایی سوار بە!
دەستەیەکیان دەگەڵ ڕەئیس کاڵەک و شووتی زۆریان کڕیبوو، خۆیان لە هێندێک برای حیزبی گێل کردبوو! هەر لە ئێستاوە بۆڵەوپرتە پەیدا ببوو؛ کە منیش یەک لە بەشخوراوان بووم. بە هەزار ناری عەلی دوو دینارم لە ڕەئیس ساندەوە؛ کە نەوەک دیسان بۆ بلیت دامێنم.
لە ئێزگەی ڕۆم دەبوایە چاوەنۆڕیمان بکردایە تا سەرۆکی لاوانی ڕۆم دێ لە سەر حیسابی لاوان داماندەمەزرێنێ. چەمەدان و هێندێک پارچە بەرە و شتی وامان لە دەوری خۆمان دانا و لە سەر عەرز تەخت دانیشتین. زۆر وەک خێڵی قەرەچ دەچووین! هەرچی دەپرسی: چن؟ دەمگوت: «جبسی» (قەرەچ).
- کاری ئاومان هەیە، لە کێ پرسین؟
- ئای لە منتان نەکەوێ! ئەی من چیم؟
لە حەنبالێکی ئێزگەم پرسی: ڕیتی ڕاتا (بە شلێکەوە گوتم). نەخێر تێ‌ناگا. دەستم بە زگمەوە نا و خۆم کووڕ کردەوە و نەقاندم. پێکەنی؛ گوتی: ها! ریتی ڕاژا! بە قامک تێیگەیاندم ژمارە یازدە ئاودەستە. لە دەرگاوە ڕوانیم ئاوێنە بەندێکە وەک ماڵی شا! چەند کەسێک لە بەر شێرە ڕیش دەتاشن. ببێ و نەبێ دەلاک‌خانەیە! کە چوومە ژوور زانیم چەند ئاودەستێکیشی لێیە. مزگێنیم دا و بە کۆمەڵ ڕایانکرد. هەی لەوەی زوو بگاتێ و لە خۆ نەڕێ!
پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ هاتن بردیانین لە چاکترین ئوتێلی بەناو «پلازا» دامەزراین. جەمەنان لە سەر لاوانی ئیتالی. شەوانەش یەکێک دەبوو بە سەرگەلە و دەچووینە چاخانە و چایەکمان دەخواردەوە؛ گوێمان لە مووسیقا دەگرت. بە ڕۆژ بە کۆلان و خەیاباندا وێڵ بووین. شاری ڕۆمام زۆر پێ جوان بوو. دەتگوت هەموو ماڵەکانی خەیابانیان بە مشار خشت بڕیوە؛ هەموو جێگا وەک یەک دەچوون. کۆتەڵی زۆر هونەرمەندانە لە هەموو ئاقاران ببوونە خشڵی شار. ڕۆژێک چوومە ڕستوورانێک؛ لیستیان بۆ هێنام. هەر تەقەم لە سەریەوە دەهات. تووشی

وشەی «فراید فیش» بووم؛ دەستم لە سەر دانا. بەڵێ ماسی سوورەوەکراویش خراپ نییە. خوایە ئەو ماسییە من دەمناسی جۆرێکی‌تر بوو؛ ئەوە پارچەی چکۆلە و لێک هالاو، هێندێکیان لە ڕانـە چوێلەکە دەچن. خواردم؛ خۆش بوو. لە هاتنەدەرمدا کوڕێکی لوبنانی گوتی پێکەوە دەڕۆین. لـە ڕێ گوتی: منیش هەر وەک تۆ بۆقم خوارد!

عەبدولکەریم شێخ داود ناوێک -کە حقووقی بوو- لە جیاتی سی دینار، پەنجا دینـاری دابـوو. داوای سابوونی دەکرد کراسی پێ بشوا. قانوون نەیگرت! ناچار من سـابوونم بـۆ کـڕی و ئـەویش هەزار جنێوی بە دزی بەو قانوونە دا.

بە گەل چووین بۆ «واتیکان». سەرم لە کاری کلیسای «سان‌پتروس» گێژ ببوو. چاو بە مۆلەق وەستا و دەمڕوانیە میچەکەی کە دەسکاری میشێل ئەنژێلۆیە و ماشەڵلا و بـەهـ بەهـم دەگـوت. هەتا بە خۆم زانی لە گەل بە جێ مابووم و فەتالیەکیشم پـێ نـەبوو. گێـژ و حـۆل دەخولامـەوە، تووشی هەواڵان نەبووم. تازە قەوماوە قەوماوە؛ با پتر سەیر بکەم. ویستم بچمە مووزەی واتیکان، پارەی دەویست؛ نەمکرا. لە دەرگایەک دوو پاسەوان بە جلی ڕۆمیانی قەدیم، ڕمب بـە دەسـتەوە ویستابوون. ترۆمبیلێک هات. شاژنێکی ڕەشی وەک قیری تێدابوو؛ کرنۆشی بۆ کرا و دەرباز بـوو. منیش ویستم بچم، ڕمب لە دوو لاوە تێک پەڕین و ڕێگەم نـەدرا. دیـار بـوو ژنـەڕەش دەچـووە دیدەنی پاپ. هاتمەوە سەر خـەیابان. سـواری ئوتووبـووس بـووم. بلیت‌بـڕ هـات! فێـر ببـووم؛ خودنویسم ڕاداشتێ. کە زانی چیم پـێ نییـە بلیتێکـی دامـێ. بـیرم لـەوە دەکـردەوە: کـابرای میسری لە دەوڵەتی دزی و پیاوەتی دەگەڵ من کرد، ئیتالیەکە لـە گیرفـانی خـۆی زەرەری بـۆ کێشام.

پاسپۆرتەکەم بە خەتی عەرەبی نووسرابوو کە خاوەنی تـا سـووریا و لوبنـان بچـێ؛ ئەگـەر بـە ئینگلیسی باسی ئوروپایشی لێ نەنووسرابا نەدەبوو. ئیبراهیم عەبدوڕەحمان خـاڵ -کـە ئـەویش هەواڵ بوو- دەگەڵـما هـات بـۆ سـەفارەتی عـیراق. گـوتی: خـۆت بـە دەوڵـەمەند نیشان دە! جلەکانیشت باشە. چووینە خزمەت سەفیر؛ منی زگ‌زلی جل‌باشی بـە ملیـۆنێر هاتـە بـەر چـاو. منیش تا توانیم فرۆفیشاڵم کرد کە: هەتا ئـوتریش دەچـم چەنـد ڕۆژێـک ڕایـدەبوێرم!. «بەڵـێ بەڵێ» کەری نێر نەیدەکێشا! پەساپۆرتی بە ئینگلیسی نووسی و ئوتریشیـشی خـستە سـەر. لـە خواحافیزیدا فەرمووی:

- بێرەدا وەرەوە با دیسان بە خزمەتت بگەم.

- جا چۆن تا دیارییەک بۆ ئاغازادەکان نەهێنم دەچمەوە؟!

چووینە سەفارەتی ئوتریش. کچێک گوتی: بەو نیشانانە سـەری سـەعات پێـنج وەرنـە فـلان ئاپارتمان ویزە وەرگـرن! پێـنج دوو دەقیقـە کـەم چـووین؛ داخرابـوو. ڕاوەسـتاین و دەڕوانینـە سەعات؛ دوو سانیە مابوو، کچ پەیدا بوو. بـرایم گـوتی: وەمـانزانی نایـەی، گـوتی: وەخـتم زایـع نەکرد.

ویزای تایبەتیشمان لە سەفارەتی ڕۆمانی وەرگرت؛ کە لـە پاسـپۆرتا نەنووسـرا؛ تـا لـە عـیراق نەمانگرن. پاش چـوار ڕۆژ یـان سـێ ڕۆژ بـە قـەتاری «تـیری زێـڕین» وەڕێ کـەوتین. چەنـد سەعاتێک لە ئێزگەی «وینیز» ماینەوە؛ بەڵام قانوون نەیگرت بچـین ئـەو شـارە جوانـە ببیـنین. نووشابەش بەر قانوونی سەفەر نەدەکەوت! یاریدەی لوبنانیەکەم دا چەمـەدانم لەگـەڵ گوێزتـەوە، حەنبالیەکەی نووشابەیەکی بۆ کڕیم. شەو درەنگێک گەینە «ویەن». چووینە شوێنێک، لـە لاوان

جمەی دەهات. ناردیانینە یانەیەک کە لەوێ بخەوین. چەققە و هەرا و بلیارد کردن بوو؛ دەرزیت هەڵاویشتایە نەدەکەوتە عەرزی.

- یاڵلا هەستن! چەمەدان هەڵگرن دەتانبەنە جێ خەوێکی باش.

چەمەدان بە دەستەوە، شەو تاریک و سەرما، لە ماندوویی ئارەقمان کردووە؛ گۆرانی ئیسمەهانم هاتبووە بیر کە دەڵێ: «شەوانی خۆش ڕابواردن لە ویەن!». چووینە میوانخانەیەکی قشپیلە لە ناو باغێکدا. نانیان داینێ و نووستین. بەیانی نان و چامان خوارد و گوتیان بڕۆین. بوو بە هەرا:

- تا جەوانان پووڵی ئێوەمان نەدەنێ نارۆن.

تەلەفۆن لە سەر تەلەفۆن. جواب نەبوو. خاوەنماڵ گوتی: یەکێک بە گریو دەگیرمەوە تا پوولم دەدرێتێ. گورجێ چوومە ئەو لاوە گوتم: من بە گریو دەمێنمەوە. بە خەیاڵ گوتم: دوو-سێ ڕۆژێک دەخۆم و دەخەوم؛ با بمنێرنە حەبس! بەلام پاش دوو سەعات ئازاد کرام و بردیانمەوە لای هەواڵان.

ئێمە و لوبنانی و جوولەکە و میسری و ئوردونی و نازانم کێی دیش بە قەتاریک وەڕێ کەوتین. لە سنووری مەجارستانەوە خەلک دەهاتنە پێشوازمان. لە شوێنێک کورێکی لوبنانی گوتی نوتق دەکەم. دەست بلند دەکا، دەنەڕێنێ، بە عەرەبی دەلێ: ئاو ئاوە! هەوا هەوایە! هەرچی باوەڕ ناکا ئاوی سارد بخواتەوە! بوو بە هەرا و چەپلەڕێزانی گوێگرە خۆشەویستەکان و پێکەنینی ئێمە!

شاعیرێکی جوولەکە بە ناوی «حەننا ئەبولحەننا» کە عەرەبی قسە دەکرد، لە نزیکمەوە بوو. زۆر قسەخۆش بوو. جارێک گوتی: ئەو هەمووە دەولەتە عەرەبانە لە هەموو شتدا دژی یەکترن؛ بەلام لە جنێو بە ئیسرائیلداندا یەک قسەن!

لە بووداپێست سەعاتێک لە ئێزگە ماینەوە. سەرو پاکەتێکی سەندوویچ و میوەیان داینێ. گەیشتینە شاری بوخارێست. عیراقی و میسرییەکان لە مەدرەسەیەک مەنزلمان گرت. لە قەتاردا وەرزشکارێکی سەر بێتووکی میسری دەیەویست سەردەرێنێ، نەیزانی شووشەی لە پێشە، شەقۆنێکی دە شووشەی قەتار هەلدا، شووشە خرمەی کرد و سەرە کەچەلەکەی چی لێ نەهات. یەک لە میسرییەکان «تەحیە کاریوا» سەماکەری مەشهوور بوو. دەستەیەکی مووزیکی دەگەل بوو دەتگوت بە دانستە هەلتبژاردوون؛ زۆربەیان ڕەشی ئاولاوی و یەکیان یەک چاویش بوو!

لە قەتاری ڕۆمانیدا دوو ژنەلادێیی هاتنە ناو واگۆنەکەمان؛ مریشک و هێلکەیان دەبردە شار. بە ئیشارە لە مریشک وکەلەبابەوە تا گۆڕستان و ئەو شتانەی لە ڕێ دەماندیت، پرسیارم لە ژنێکیان دەکرد و دەمنووسیەوە. توانیم چەند وشەیەکی زۆر لازم فێر بم. لەو پرس و جوابانەدا پۆلیسێک پەیدا بوو؛ ژنەکان زۆر ترسان؛ دەرپەڕین و دەرسم ناقسی ما!

بەیانیان هەموومان دەچووینە ژووریکی نان خواردن. هەرچی زوو نەگەیبایە بەشی دەبرا. من لە سینەمادا تەحیەم زۆر بە جوانی دەدیت؛ بەلام بەیانیان -کە نەیدەپرژا لە تاوی نانەکەی سووراو سپیاو بکا- شلەزەردێک بوو بێزت لێ هەلدەستا.

نیوەڕۆ و شەو بلیتی نەهار و شاممان هەبوو؛ دەچووینە ڕستووران. دەبوایە بیست و دوو ڕۆژ لەوێ بمێنین. دەبوایە هەموو ڕۆژ کۆ بینەوە هەیئەتی دەولەتێک ببینین؛ کە دەیانگوت هەشتا

و دوو میللەتی لێیە. زۆر زوو من وازم هێنا و لە دیتنی گشتیدا بەشدار نەدەبووم. ڕۆژانە بە شاردا دەگەڕام. تووشی هەر کەس بام چەند کەلیمەیەکی ڕۆمانی لێ فێـر دەبـووم. لـە چاو هـەوالانم زمانزان بووم؛ زۆر کاری خۆم پێک دێنا. شەوانە دەچوومە سینەما یان تیئاتر. بـۆ ئـەو شـوێنانە هەر کەسەی هەقی بلیتێکی هەبوو. من کە بمویستایە یەکێکی‌تر دەگەڵ خۆم بـەرم، بلیتەکـەم دەدا بەو؛ کلاوێکی سوور و شینی سولەیمانیانەم لە سەر دەکرد، هەر زوو ڕێگەیان دەدام و داوای بلیتیان نەدەکرد.

لەو نوێنەرانەی هاتبوونە بوخارێست، ژنی ئایسلاندی و پیـاوی بلژیکـی لـە هـەمووان جـوانتر بـوون. لـەوان بـەرەژێرتر فینلانـدی بـوون. بـۆ ئیتالیایـە جوانـەکانیش، وەک وێنـەگران فکـرم دەکردەوە: خودا لە دروست کردنی نەژادی سپی بە چاوی شین و قژی زەردەوە بۆتەوە، ڕەشـی ئەفریقا و گەنمڕەنگی ئاسیاشی دروست کردوون. تۆزێک لە هەر دوو ڕەنگی لێک داوە، ئیتالی بە چاوی کاڵ و قژی خورمایی و ڕەشی لێ ساز داوە.

عیراقیەکان بەیانێکیان چاپ کرد لە دژی دەوڵەتی عیراق و ئیستیعمار؛ دەبوو بـلاو کرێتـەوە. تا ئێوارە پتر لە دووسەد دانەیان بلاو نەکردبوو. گوتم چەندتان هەیە بمدەنێ. جلی کـوردیم دە بەر کرد و لە سەر پیادەڕەوی خەیابان وێستام. دنیا لە جلکەکەم کۆ بووە. پتر لە هەزار دانەم لـە دوو سەعاتدا لێ وەرگیرا.

ڕۆژێک لە خەیابانی ڤیکتۆریا ڕادەبردم؛ هەستم کرد دەستێک لە سەر شانمە. جـەوانێک بـوو پرسی: تورکی دەزانی؟

- کەمێک.

- منیش تۆزێک ترکیم دەزانی لە بیرم چۆتەوە؛ حەز دەکەم لێت فێر ببمەوە. ناوم میرجەیـە؛ فێرکارم؛ ئەندامی حیزبی کومۆنیستم.

بەو شەرتە کە ئەویش فێرە ڕۆمانیم کا، پێک هاتین. هەموو ڕۆژ میرجە لە بن دارێک چـاوەنۆڕ بوو. سەعات نۆ دەمدیتەوە؛ تا ئێوارە پێکەوە دەگـەڕاین. میرجـە جارێـک بردمیـە ماڵـە خـۆی. خوشکێکی جوان و سەوداخۆش و دایکێکی پیری هەبوو؛ بـە ماشـین خـەیاتی دەکـرد. تـورکی دەزانی؛ زۆری جنێو بە دەوڵەت دەدا. دەیگوت: ئەو هەموو خەلکەیان بـۆ تـەبلیغاتی خۆیـان دە بوخارێست خزاندووە، هەر لە لادێ و لە شارەوە هەرچی پێی بلێن ڕسق خەرجی ئەوانە دەکـرێ و ئێمەش هیچمان دەست ناکەوێ.

لە پڕ پرسی: تۆ کومۆنیستی؟

- بەڵێ مەعلوومە!

- کورم درۆ مەکە! مەترسە! بە خـوا لـەم گەڕەکـە هـیچ کـەس کومۆنیـستی خـۆش نـاوێ؛ میرجەی کوڕیشم درۆ دەکا.

ئەمەی ڕاست بوو؛ چونکە میرجە بە منی گوتبوو کە هەر چەنـد لـە حیـزب دایـە، پەنـسلینی قاچاغ دەفرۆشێ.

زۆر گەرما بوو؛ ئارەقم کردبوو. کراسەکەم زۆر چلکن بوو؛ هەرچی گوتیان کۆتەکـەت داکەنـە! گوتم لە ولاتی ئێمە کۆت داکەندن زۆر عەیبە!

جل شوشتنیش بەزمێک بوو. جلە چلکنەکانمان دادەکەند، دەیانبرد، دەیان شت و هەموویان بە خاوێنی لە سەر مێزێک کەڵەک دەکرد؛ کـە هـەر کـەس ئـی خۆمـان بناسـینەوە. بـرادەران

هەرچی زوو بگەیشتایە، کام کراس باش بوو دەیدزی! جا وەرە گوێ لە قرە و هەرا بگرە! یەکێک ئیعلانی بە دیوارەوە دابوو: زۆر شەرمە؛ کراس مەدزن! ئیمزا: یەکێک لە کراس دزراوان!

کراس دزین تەشەنەی کرد: تیغ، پــوول، تەنانــەت شــەمچەش لــە چەمــەدانی یەکێکدا بـا و دانەخرابا، دەدزرا!

ئەودەم کە لە بێرووت دەچووینە سەیری مەلەکەران لە دەم بـەحر، برادەرێـک -کـە خەڵـکی شاری چکۆلەی «کووت» بوو- لە کومۆنیستیدا زۆر وشک، لە دیمەنی ژنی رووتی مایۆ لەبەر زۆر تووڕە بوو. دەیگوت: ئەوە کاری ئیستیعمارە؛ دەبێ لە دنیا نەمێنێ! لە بوخارێست دەریاچەیەکی زۆر گەورە و خۆش دەناو شاردایە؛ پێی دەڵێن «تشمەجوو» یانی چەشمە و جۆگـە. لـە دەوری سەیرمان دەکرد. کچانی مەلەوان زۆر لەوانی بێرووت ڕووتتر بوون. بانگم کرد: سـەلمان! خـۆی لێ دە خەو کردم. هەڵمساند:

- بۆ ئەوانە چ دەفەرمووی؟ لێم ڕوونە ئەوانەش ئیستعمار رایسپاردوون تەخریب بکەن!

دەوڵەتی ڕۆمانی هەر یەکە پەنجا «لی» پوولیان -گیرفان پوولی- دابووینێ؛ دەگەڵ ئەحمــەد عوسمان تێکەڵمان کردبوو. ڕۆژێک گوتی: بچۆ لە فلان جێ سابوون بکڕە! پارووی بـە پێـنج لی دەدەن. دوو سابوونم کڕی و خستمە گیرفانی پاتۆڵ و لە خۆشیان بە غار هاتمەوە. کـە دەسـتم برد گیرفان دڕاوە و سابوون کەوتوون! تا گەڕامەوە سابوون لە دوکان نەمابوو.

لە کەرکووکەوە کە دەهاتم، کەوشم لای ئەرمەنییەکی ئاشنا بە ڕادان دا. گوتی: کەوشێکت بۆ دەدوورم کەس دە پێیدا نەبێ. کەوش لە نووکەوە یەکسەر کوندار و دەبوو هــەمووی بــە قــەیتان داخەی. ڕۆژ نەبوو جووتێک قەیتان نەپسێنێ! بەڵام قەیتان لە عیراق جووتی بـە شـەش فلس و زۆر هەرزان بوو؛ هەمیشە دە جووتم دە باخەڵدا بوو. لە ڕۆمانیا لێم خەلاس بوو؛ کەوش لـێم بـوو بە ورگە ماسی هەڵدڕاو. پێم دە پێ نەدەنا. «ئای نەحلەت لە بابت بۆ کەوشی بـۆت درووم!». وە دوای قەیتان کەوتم. هەر چی لێی دەپرسم، دەڵێ مغازە.

- مغازە کوا؟

- نازانم!

بە کوتە بەن، بە تێل دەیبەستمەوە، قرت دەپسا. ڕۆژێک ویستم بچمــە بنکــەی ئێرانییــەکان، کۆلانێکم دی.گوتم ڕێگە کورت کەمــەوە؛ بەویـدا ڕۆیـشتم. ئۆخـەی! شـوکور تووشـی مغـازەی قەیتان بووم.

- جووتی بە چەند؟

- بە حەفتا ... (نازانم پووڵە وردەکەیان چ بوو).

- ئەگەر چی زۆر گرانە، حەو جووتم دەیە.

حەسامەوە. بەڵام سەری قەیتان بە چرێش توند کرابوو؛ تەنەکەی تێدا نەبوو!

بە لای دوو بۆیاغچی کەوشاندا ڕابردم. یەکیان گوتی:

- ئاغا فارسی می‌دانی؟

- بڕۆ حیز! تۆ سنەییت، بۆ بە کوردی قسە ناکەی؟!

- ئای قوروان! چۆن زانیت سنەییم؟ من بیست و پێنج ساڵە هام لێـرە؛ واکـسی کـار ئەکـەم. فەرموو وەرە بچینە مزگەفت!

جارێک تووشی یەکێکی پشتێندکەژووی کلاولبادی سپی هاتم. بۆم هات:



- موسوڵمان؟
- موسوڵمان!
ئیشارەی بە خۆی کرد: موسوڵمان! «بسم الله الرحمن الرحیم، اعوذ بالله من الشیطان الرجیم!»
هەر بە ملمەوە نووسا و ملی لە ماچ کردنم نا. تێگەیشتم ئەڵبانیاییە و ناوی عەبدوڕەحمانە.
ئێوارەیەک تووشی پیاوێ پەنجا ساڵە هاتم کچێکی دەگەڵ بوو؛ نە پکەی نە پخۆی، تماشای سای گەردنی کەی. لێی پرسیم: هایک؟ یانێ ئەرمەنیت؟ زۆر جاریتریش خەڵکی بوخارێست بە ئەرمەنیان دەزانیم.
- نەخێر کوردم.
- کورد؟! نەکەی قسە دەگەڵ کچەکەم بکەی؛ نابێ ببێتە ئاشنات. باوکی من جیلۆ بوو، سمایلاغای سمکۆ کوشتی.
- زۆر بە داخەوە! باوەڕ کە من ڕازی نەبووم باپیری جوانی وا بکوژرێ!
شەوێک چوومە کافەیەک کە خەڵک لە حەسار دانیشتبوون. تەنیا لە سەر مێزێک بووم. کچێک -یا ژنێک- هاتە لام و گوتی: ئیجازە هەیە؟
- فەرموو!
داوای بوتڵە شەرابێکی کرد. بە بزەیەکی حیزانە دواندمی؛ گوتی: ناوم کارمێنە، حەز دەکەم ببینە ئاشنا و زۆرتر یەکترمان چاو پێ بکەوێ.
- با بزانین... چونکە من ئەگەر کاری خۆم هەبێ بەجێی نایەڵم؛ بەلام لەوانەیە بێمەوە سۆراغت.
ویستی بچین پێکەوە سەیری سەمای بە کۆمەڵی مەیدان بکەین؛ پێم ناخۆش نەبوو.
- دەی من دەچم پووڵی گارسۆنەکە دەدەم. تۆش کەیفت لێیە وەرە پووڵی خۆت بدە، یان بمدەیە من دەیدەمێ؛ با زوو دەرچین.
بەندەش کەر-کەر! پەنجا لی ڕۆمانیم شک دەبرد، دامە دەستی کە باقیەکەم بۆ بێنێتەوە. تەشریفی ڕۆیشت و ئێستاش نەهاتەوە. گارسۆن هات: بێنە پارە!
- پێم نییە.
خاوەن کافە پێی زانی. سەرێکی ڕاوەشاند، گوتی: داد لە دەست کچە ڕۆمانی! عەفووی کردم و هەڵتەک- هەڵتەک بە گیرفانی بەتاڵەوە هاتمەوە. بیرم لە «ئۆپێرای کارمین» دەکردەوە کە ئەمەی منیش بە خێر بەزمی ئۆپێرای کارمێنێک بوو!
ڕۆمانی چاوڕەشی گەنمڕەنگ بوون؛ خوێنشیرین و ڕووخۆش. ئەو شتەش کە ئێمە ناومان ناوە ناموسپارێزی، نەک هەر لە کن ئەوان، بگرە لە ئورووپا و ڕووسیاشدا کەمتر تەرەفداری هەیە! شەوانە مووزیک لە مەیدانان لێ دەدرا و سەما و هەڵپەڕکێی بە کۆمەڵ دەکرا؛ ئێمەش دەچووینە سەیری. شەوێک ژنێک پیلی کێشام: وەرە بڕۆین! خۆم لە دەستی ڕاپسکاوت! گرتمیەوە. زۆر کەسمان لێ کۆ بۆوە؛ ژنەتیو بەرم نادا! باوەڕ کە لە شەرمان بوومە تنۆکێک ئاو. قەتم ئەوە بە سەر نەهاتبوو. کابرایەک هات زۆری تکا لێ کردم:
- لەگەڵی بچۆ!
- ناچم دەستم لێ بەردەن!

گوتیان: بۆ ناچی، ئەوە مێردەکەیەتی تکات لێ دەکا!
ئاخری ئەرمەنیەک لە دەست ژنەتیوی ڕزگار کردم. بە ڕاستی زۆر زەحمەتە ڕۆژهەلاتی، ئەویش نەخوازا کورد، لەو بێشەرمییە خۆشی بێت.
ڕۆژێک ئەحمەد عوسمان و من تووشی پیرێژنێکی زۆر شڕ و شڕۆڵ بووین؛ سوالی لێ کردین؛ شتێکمان دایە. ڕۆژێکیش لە ئوتووبووسدا سوالکەرێکی مۆدێرن بە کاغەزی کەشەیەکەوە دەگەڕا؛ بەویشمان شتێک دا. بە میرجەم گوت: دوو سوالکەرم دیوە. گوتی: هەیهوو! هەزاران هەیە. لەوەتا ئێوە هاتوون، داکراون نەیانبینن. وەباڵ بەستۆی میرجە.
ئێوارە درەنگێکی تاریکان، پیرەمێردێکی ڕیش سپیم دیت شتێکی لە بەر دەم بوو؛ وەمزانی تۆپی گوللەهاوێژە.
- مامە ئەوە چییە؟
- من فەیلەسووفم؛ ئەوەش تەلسکۆپە. لێیەک بدە و تماشای عاسمان بکە.
لە کاکەشان و ئەستێرەکانم ڕوانی؛ زۆرم بە لاوە سەیر بوو. ئیتر لە عومرمدا تازە تەلسکۆپم تماشا نەکردۆتەوە.
ڕۆمانیا حەوت ساڵ بوو ببوە دەوڵەت؛ نەیتوانیبوو لە هەموو شوێنان کەلخۆز دانێ. گوتیان دوازدە کەلخۆز هەیە. بردیانینە سەیری یەکیان. خانووی چاک و ڕادیۆ، سینەما، کتێبخانەی زۆر جێی ئافەرین بوو. کوێخای کەلخۆز قسەی بۆ کردین و پاشان گوتی: کێ پرسیاری هەیە جوابی بدەمەوە؟
من دەستم هەلێنا. دوکتورێکی عەرەب گوتی: چ دەپرسی؟
- پەڵە توتنێکم دیوە، وەک لە دێم بێ وایە؛ پێم سەیرە. چونکە لە کوردستان هیچ نەبێ توتن ڕۆژێ سێ ئاوی دەوێ.
- بەڵێ کوردستان کوردستانە؛ ئێرە وڵاتی کومۆنیستانە. هەر بە حەوت ڕۆژ بارانی لێدەبارێ!
بەو جوابە جوانەشەوە هەر پرسیم. کوێخا گوتی: ئەم شێوەلە نزار و نمدارە؛ توتن پێدەگەیەنێ و دێمەکارە. لە جێگەیتری ڕۆمانیا بێ ئاو نابێ.

***

- با بۆ ئیدارەی خۆمان ئینتیخابات بکەین. بیر و بروای خۆتان بە ئازادی دەربڕن؛ ڕووبینی مەکەن!
چەند خۆشە با لە کۆمەڵێکی کەمیشدا بێ، هەڵبژاردن ئازاد بێ. با دوو سبەی ئەم کارە بکەین. قوربان بوو بە سرت و خورت و پارتیبازی.
- من هەڵنەبژێری خۆت دەزانی!
- فلان کەس هەلمەبژێرە! دایک و بابی جاسووسی نووری سەعیدن!
- هەر کەس هەڵمنەبژێرێ دایکی وا لێدەکەم و دەڵێم خاینە!
حەوا! خۆ ئەمەش دەسکی دەرهات! ئازادی قوڕبەسەر لێرەش جێگەی نییە...
«سەلیم شاهین» ناوێکی عەرەبی بەغدایی لە پێشدا دوو جار چووبووە فستیوالان؛ تامی خواردنی خۆش و ڕابواردنی خۆشی جحێلانەی هەر لە بن دداندا مابوو. ئەم جارەش کە هاتبوو، خۆی زۆر بە بەختەوەر دەزانی. کە لە سەر کەشتیش گوتیان نابێ بلێی کوردم، ئەو لە هەمووان شێلگیرتر بوو. لە ڕێگەش ببوە کێشەمان و لێک تووڕە بووین. لە هەڵبژاردندا گوتیان توهماسبی

ناوێکی ئێرانی گوتوویە سەلیم جاسووسە. هەڵنەبژێرا و بەزمی سەگی پێ کرا. بە هەڵکەوت توهماسبیم دیت؛ بۆم گێڕاوە. گوتی: بە حەیاتم سەلیم ناناسم و هەرگیز باسم نەکردووە. هاتمەوە بە کۆمەڵ بۆم گێڕانەوە. سەلیم گوتی: ئەگەرچی لێشم قەڵسی، بە شەرەفم هەر تۆ دە ناوماندا بەشەرەفی!...

عیراقیتر لە ئورووپاوە زۆر هاتبوونە فستیواڵ؛ ئێمەی دوازدە ببووینە حەفتا و یەک نەفەر و هەر لە زیادبوونیشدا بوو. کۆنگرە دامەزرا. بەشی عیراقیان بە ئالای عیراقەوە لە دوو ڕیزدا بوو. ڕانکە و چۆغە، مێزەرێکی زل، پشتێند، کەلاشی تازەی هەورامانی، چووم لە ڕیزدا دانیشتم. تەواو ورچی موومیاییکراو! وەک کوندەبوو کە دەڵێن چۆلەکە دەوری دەدەن؛ حەز لە چاوی دەکەن، هەرچی وێنەگر و خەبەرنیگار بوون دەوریان گرتم و بوو بە فچەفچی دووربینان. کێی؟ خەڵکی کوێی؟... لە رووپەڕێک نیوە نەخشەیەکی ئێران و عیراقم کێشابوو، کوردستانی ناسەربەخۆم نیشانە کردبوو. زۆر نوسخەم نووسیبۆوە. هەر کەسە دەنکێکم دەدانێ. هێندییەک بە قەڵەم وێنەی کێشام؛ بەڵام ئەشەدەمبیللا هیچ وەک خۆم نەدەچوو. دوای جەلسە هاتینەوە؛ کۆڕیان بۆ گرتم.

- لە دیسیپلین لات داوە!

- برام من پاژی هەیئەتی عیراقی نیم، قانوونتان بە سەر مندا ناڕوا!

- ئەو قسانە بۆ خۆت باشە! کورد و مورد حەقی نییە خۆی دەرخا!

سبەش چوومەوە جەلسە؛ «هەمان تاس و هەمان حەمام». ئەو ڕۆژە تۆزێک درەنگ هاتمەوە مەنزڵ. گوێم لێ بوو چەققە و هەرایە. هەر چوومە ژوور قروقپ وستەیان لە خۆ بڕی. گوتم:

- بە ڕاستی زۆر مەردن! حەفتا و ئەوەندە کەس لە من دەترسن! چیتان دەربارەی من دەگوت؟

- دەمانگوت ئەگەر بە جلی کوردییەوە بێی و داوای قسەی خۆت بکەی، ئیجرائاتت دەرحەق دەکەین!

- ئێوە نازانن ئیجرائات چییە؟ با من پێتان بڵێم. خۆتان ناتوانن دەرمکەن؛ ناچارن بچنە ئیدارەی دژی جاسووسی بڵێن جاسووسێکمان کەشف کردووە کە دەگەڵمان هاتووە. ئەودەم ئەگەر باوەڕیان پێ کردن، کەلەپچەم دەکەن؛ دەچمە ویەن؛ دەچمە سەفارەت دەڵێم دژی دەولەتم. بە حەبسی بە تەییارە دەمنێرنە بەغدا. لێم دەدەن ڕاستی بلێ! ئەودەم کامە سەگباب ئازایە بێتەوە بەغدایە، لەوێ یەکتر دەبینین!

تۆزێک ترسان:

- کاکە! کێ دەڵێ پیاوی خراپی؟ بەڵام دەڵێین تۆ دەگەڵ ئێمە هاتووی دەبێ بە قسەی ڕەئیس بکەی!

ئێوارە چوومە دەفتەری کۆنگرە؛ کابرایەکی ئێرانی، توودەیی بە ناوی نەمازی هەمەکارەی کاری ڕۆژهەڵاتیان بوو.

- خواهیش دەکەم شتێکم نووسیوە؛ بۆم بە فەڕانسی یان ئینگلیسی تەرجەمە بکەن.

- ئای بە چاوان! تۆ بیهێنە و دەسبەجێ دەکرێ.

هاوار و بانگی خۆم بە کوردی نووسیبوو. شیعری نەشمیلیشم حازر کردبوو؛ شەو دانیشتم کردمنە فارسی. سبەی بردم بۆ نەمازی. گوتی: سبەی وەرەوە، حازرە. سبەی چوومەوە، گوتی:

ئێواره‌. بۆیان گێڕامه‌وه‌ كه‌ عیراقییه‌كان گوتوویانه‌ بۆی مه‌كه‌ و مه‌حته‌لی كه‌! ئێواره‌ چوومه‌وه‌، گوتی: سبه‌ی وه‌ره‌وه‌! گوتم: وه‌مزانی تووده‌ی، له‌ ئێرانیه‌تی شۆراویه‌وه‌؛ به‌ڵام ئێرانی و درۆ بێ یه‌كتریان ناكرێ! ده‌یكه‌ی یان نایكه‌ی؟!

- هه‌ڕه‌شه‌م لێ ده‌كه‌ی؟ نایكه‌م و ناشیه‌ڵم بۆت بكه‌ن!

چاوم عه‌رزی نه‌ده‌دی؛ كراواته‌كه‌م گرت و به‌ر مست و شه‌قم دا. سێ كه‌س له‌وێ بوون هاتن ده‌ستم بگرن، له‌ قه‌ڵسیه‌كه‌م ترسان؛ بانگیان كرد: ئاغای كازمی! كوڕه‌ جحێڵه‌یه‌ك به‌ غار هات. ده‌ستی گرتم.

- ها چ خه‌به‌ره‌؟

گوتم: ئه‌مڕۆ بۆم ته‌رجه‌مه‌ نه‌كرێ واوه‌یلا به‌ حاڵی! من كوردم و گوێ ناده‌مه‌ دواڕۆژ چ ده‌بێ.

كازمی گوتی: نه‌مازی زۆر بێ‌ئه‌خلاقی! ئه‌گه‌ر هیچ پیاو بای درۆت ده‌گه‌ڵ ئه‌و پیاوه‌ نه‌ده‌كرد. ده‌ستی خۆش بێ؛ بریا پتری تێهه‌ڵدابای!

نه‌مازی هه‌ر شان و پیلی ڕاست ده‌كرده‌وه‌ و به‌ كزێكه‌وه‌ گوتی: خه‌تای عیراقیه‌كان بوو! كازمی گوتی: كوا چت پێیه‌ بێنه‌! قه‌ت سه‌عاتێكی نه‌برد ته‌رجه‌مه‌ی فه‌ڕانسی و ئینگلیسی تایپ‌كراوی بۆ هێنام. گوتی هه‌ر كارێكی‌تریشت هه‌یه‌ حازرم.

- ده‌ توخوا سبه‌ی سه‌عات ده‌، وه‌ره‌ كۆنگره‌ بمبینه‌! ببه‌ به‌ ته‌رجومانی قسانم.

سبه‌ی به‌ جلی كوردییه‌وه‌ چوومه‌وه‌ له‌ سه‌فی عیراقیان دانیشتم. كازمی هات. ڕاست بوومه‌وه‌، گوتم: وه‌ره‌! سه‌ركه‌وتین، چووینه‌ لای سه‌رۆكی كۆنگره‌ -كه‌ ئێستا ناوه‌كه‌م له‌ بیر چۆته‌وه‌- فه‌ڕانسی بوو. گوتم: من كوردێكم سه‌ر به‌ هیچ ده‌وڵه‌تێك نیم. هاوارێكم هه‌یه‌ له‌ ته‌ره‌ف ته‌نیا خۆمه‌وه‌. ئایا هومێدم هه‌بێ كه‌ له‌م مینبه‌ره‌وه‌ ڕێگه‌م بدرێ هاواره‌كه‌م بكه‌م؟

من ده‌ڵێم و كازمی به‌ فه‌ڕانسی به‌و ده‌ڵێ. له‌و ده‌مه‌دا «دوكتور سه‌فا حافز» -كه‌ حقووقی بوو- وه‌ سه‌ركه‌وت. هێندێ قسه‌ی ده‌گه‌ڵ ڕه‌ئیس كرد؛ تێنه‌گه‌یشتم. ڕه‌ئیس له‌ جوابما گوتی: ئێره‌ مینبه‌رێكی ئازاده‌؛ ئه‌گه‌ر یه‌كێك بیه‌وێ جوێنیشمان پێ بدا ڕێگه‌ی هه‌یه‌. باشه‌ ناوت ده‌نووسم، هاواری خۆت بكه‌!

سوپاسمان كرد، هاتینه‌ خوار. كازمی گوتی: سه‌فا حافز پێی گوت: ئه‌وه‌ ده‌گه‌ڵ ده‌سته‌ی عیراقه‌؛ عیراقیش قسه‌ی خۆی كردووه‌. به‌ قانوون حه‌قی نییه‌. ڕه‌ئیس پێی گوت: ئه‌و پیاوه‌ ده‌ڵێ من به‌ ته‌نیا قسه‌ بۆ خۆم ده‌كه‌م و سه‌ر به‌ هیچ ده‌سته‌یه‌ك نیم. قانوونی ئێوه‌ لێره‌ كار ناكا!

ڕۆژێك له‌ جه‌نگه‌ی جه‌لسه‌دا، خه‌به‌ر درا كه‌ چینی هێرشیان كردووه‌ و ئه‌مریكایی و هه‌واڵانیان قه‌ڵت و بڕ كردوون و كۆریای شیمالی سه‌ركه‌وتووه‌. بوو به‌ چه‌پڵه‌ڕێزانێكی بێ‌پسانه‌وه‌ و هووراكێشان. لاوێك ده‌یانگوت نیوزیلاندیه‌ چووه‌ سه‌ر كورسی، گوتی: زۆر ساڵه‌ ئاشتی‌خوازین؛ لێره‌ش هه‌ر بۆیه‌ كۆ بووینه‌وه‌ كه‌ دژی شه‌ڕ و خوێنڕێژی خه‌بات بكه‌ین. پێم سه‌یره‌ بۆ هێرش و خوێنڕژاندنی خه‌ڵك له‌ لایه‌ن چینی دۆستمانه‌وه‌ له‌ چه‌پڵه‌ ده‌ده‌ن. شه‌ڕ هه‌ر شه‌ڕه‌؛ نابێ بۆ هیچ پیاوكوژییه‌ك له‌ چه‌پڵه‌ ده‌ین.

له‌ جه‌لسه‌ چۆڵ بووندا كه‌ دیسان وه‌به‌ر حه‌مله‌ی وێنه‌گران كه‌وتبووم، ڕه‌ئیس ده‌ستی له‌ شانم دا، گوتی: دوو سبه‌ی سه‌عات ده‌، نۆره‌ته‌. هاتمه‌وه‌ مه‌نزڵ. هه‌ر كه‌سه‌ له‌به‌ر خۆیه‌وه‌ ده‌ستی ده‌گووشیم:

- تەبریکت پێ دەڵێم! ڕەئیس فەرمووی دادەی بزانین چ دەخوێنییەوە؟!
- کا غەفوور! خوا ئەیزانێ نە ئێستا نە پاش خوێندنەوە، چاوتان بە نووسراوم ناکەوێ؛ خاترجەم بخەوە!

دووسبەی هات. چوومە سەر سەکۆ؛ بە کوردی وتار و شیعرم خوێندەوە. وام دەنەڕاند دەتگوت لە ئەشکەوت دام. لەو کۆنگرە چوار زمان ڕەسمی بوو. دەبوایە وتار تەرجەمە کرابا بەو چوارانە کە بریتی بوون لە: ڕووسی، فەرانسی، ئینگلیسی، ئەسپانی. وەرگێڕ لە پشت پەردەوە کەلیمە بە کەلیمە دەیانگوت. لە مێزی پێش گوێگراندا چەند کونێک هەبوو ناوی زمانەکانیان لێ نووسرابوو. گوێپۆشت لە گوێ دەکرد و سەرەکەی دیت دەو کونە زمانە ڕادەکرد کە دەتزانی. جێگەی ئەوەش هەبوو کە ڕاستەوخۆ دەنگی کابرای وێژەر بە زمانی خۆی ببیسی. دەجا بۆ ورچە قوڵە لە چەپڵە دەن! چەپڵە زۆری کێشا، کیژێک بە دەسکە گوڵێکەوە هات؛ دەستی کوشیم. گوتی: من تورکم. دەزانم دەوڵەتی من چەندی ناهەقی لە کورد کردووە؛ بەڵام تۆ من ببەخشە! زۆر خەجاڵەتم... کە هاتمەوە مەنزڵ گوتم: هیچ نەبێ لەو کچە تورکە شەرم بتانگرێ، چیترتان پێ ناڵێم...

ڕۆژێک، کاک غەفووری ڕەئیس -کە یەکی درێژی شان و پیلخواری تۆزێک پشتکووری مووزەردی چاومەڕی و خەڵکی سولەیمانی بوو- بە عارەبییەکەی کە هیچی لێ نەدەزانی، بانگی کردم:

- پێم خۆشە دەگەڵم بی؛ دەچمە دیدەنی ئێرانییەکان.
- باشە، بەڵام لێرە پێت گوناحە بە کوردی بدوێی، من عەرەبیت بۆ تەرجەمە ناکەم.
- بۆ خۆم فارسی دەزانم؛ تۆم پێناوێ. هەر پێکەوە بین باشە.

ئێرانییەکان دەوری چل کەسێک دەبوون. زۆریان کچ دەگەڵ بوو کە یەکیان لاقی لە خۆپیشاندان‌دا پەڕیبوو (وابزانم ناوی پەروانە بوو). ڕەئیسەکەیان شەلێک بوو ناوەکەم لە بیر نەماوە. کا غەفووری چەنبەری ملی لە شتێک نا بە خەیاڵی خۆی فارسییە. بوو بە پرمە-پرمی کچە ئێرانیان و پرمە بوو بە تریق و هۆڕ! کابرا شەلە کە خۆی وەخت بوو بتەقێ گوتی: بێشەرمینە! بچنە دەر! جەنابم کە گوتبووم ئەوە ڕەئیسی عیراقییەکانە، لە شەرمان ئارەقم کرد. گوتی: ئاغا چی فەرموو تەرجەمەی کە!

- غەفوور! دەو فارسییە جوانە ناگەن؛ ئابڕووشمان چوو. بە کوردی بفەرموو تا پێیان بڵێم؛ کە دەبوایە من بە ئەندازەی عەقڵی خۆم بیانگۆڕم!

من کە ڕۆژانە بە جلکی کوردییەوە دەگەڕام، زۆر کیژ و لاو دەفتەری بیرەوەریان دەدامێ بۆیان ئیمزا کەم. بە ئینگلیسی لە ناو نەخشەیەکی زۆر منداڵانەدا، لە ناوەڕاستەکەیدا دەمنووسی: «کوردستانی ناسەربەخۆ». لە دەوریشی تورکیە و ئێران و عیراقم دەنووسی. لەو دەفتەرانەدا دەمدی بە خەتی فارسی ئیمزا کراوە: «کەریم حیسامی نەغەدە!» ئەو ڕۆژە لە مەنزڵی ئێرانیەکانم دیت. گوتم: برا تۆ هیچ نەبێ تەنیا بنووسە کوردستانی، کەس ناپرسێ نەغەدە لە کوێیە!

ڕەئیسە شەلە لێی پرسی: حیسامی قسەت کرد؟
-بەڵێ!
- بە چی؟

- بە فارسی!

- ئاخر مەردی حیسابی! وا دەبینی چەندین دوکتور و خوێندەواری لە زەبرمان هێناوە و جـل و تەپلەی کەربەلاییە لادێییەکانمان دەبەر کردوون. کەس نەبوو قسەی فارسیم لە ڕادیۆ بـۆ بکـا تۆ نەبی؟!

من گوتم: بچۆ بە کوردی قسە بکە تا بزانن قـەدری کوردمـان لەبـەرە. هەسـتە بچـۆرەوە بـە کوردی بڵێ.

تەلەفۆنیشی کرد ڕادیۆی تێگەیاند.

ئەو دەمە لە وڵاتی دەرەوە کەس جگە لە ئیسرائیل و لوبنـانی نـەدەزانی. مـەنزورم ڕەشـایی کۆمەڵە نە سیاسـی. تەنانـەت میـسر و عـیراق و سووریەشـیان نەبیـستبوو. لـە وەرامیانـدا کـە دەمگوت: « کوردستان»

- ها تورکیستان! عیراک!

سەریان ڕادەوەشاند: بەغدا، ها ها! کەلفە بەغداد! هاروون ڕەشید! ئەویش لە ئاهەنگێکەوە بـە ناوی خەلیفە بەغدادەوە کەوتبووە بەر گوێچکەیان.

ۆژی جەژنی خۆپیشاندانی گشتی دیاری کرا. هەموو کەس، ئافریقایی، ئاسیایی و گەلانی‌تر بە لیباسی میللی خۆیانەوە هاتن. دوکتوری ئافریقاییت دەدی کەوڵە پڵینگێکی دە شـان و پیلـەوە پێچاوە، باس قەنەیەکی درێژی لە پشت ملیەوە قیت کردۆتەوە؛ بەلام عیراقیە کومۆنیـستەکانی خۆمان کە لە بەغداوە چەندین دەست بەرگی کوردی و کلاش و کلاوی سوور و شینیان بـۆ ئـەو مەبەستە هێنابوو، کوردەکان بە لایانەوە دژی ئیمانیانە دەبەری کەن. ئەوانیش وەک عەرەبـەکان عەگال و کەوای شۆڕیان کردە بەر. تەنیا کوردێک کە لە لەندەن هاتبوو دەگەڵ من جلی کوردی پۆشی. چووینە خۆپێشاندان. تەحیە کارێوکـای ماکـەریش لای وا بـوو دەچێتـە سـەر سـەکۆی سەما، لام وایە پووتێک دەبوو؛ زێڕی لە خۆ دابوو؛ وەک ئێستری پێشەنگ هەر زڕەی دەهات! لـە پێش میسریانەوە دەڕۆیشت و ئالای میسری هەڵکردبوو، پێشیان دەگوت: «سیتتی توحەییە!».

خەیاڵ پلاوێکم کرد: هەیاران! مـن کـە لـە سـابلاغ و تـەورێز هێنـدە هێنـدە خۆشەویـستی شۆڕەویەکان بووم، بۆ نەچمە ڕووسیا و لەو شەڕەشەقە ڕزگار بم؟

کوردەکەی لەندەن -کە وابزانم ناوی نەوزاد بوو دەگەڵم هات- چووینە سەفارەتی ڕووس.

- چیتان دەوێ؟

- سەفیر؟

- زەحمەتە بیبینن.

- کاری گرینگمان هەیە.

- ڕاوەستن!

بردیانینە خزمەت سەفیر.

- کاکە بۆم تەرجەمە کە! من شاخم وا و بالم وا؛ فلان و فلان دەمناسـن؛ شـیعر وا، نووسـراوم وا؛ بۆم بپرسە ئەگەر بمبەنە ڕووسیە یان ئازربایجان و باکۆ زۆر مەمنوونم.

سەفیر لێم بوو بە قانوونی:

- هەواڵ! ئێرە ڕۆمانیایە؛ سەربەخۆیە؛ ڕووسیا هەقی نییە باسی شتی وا بکا!

چی بە سەر چییەوەیە؟! دەڵێن بە مەلای مەزموورەیان گوتـووە گوریـسمان دەیـە، گوتوویـە

هەرزنی لە سەر ڕاخراوە.
- یانی چی؟
یانی نایدەم و ببرێتەوە!
دیسان «ئەبلە بە خەیاڵ نەبو بە ماڵ»...
من قۆریەکی ئەلمۆنیۆم و چای عیراقیم پێ بوو. لە سایەی ئەوەوە زۆرم دۆستی عیراقی بۆ پەیدا ببوو. یەک لەوانە دوکتور نەزیهە دلێمی بوو. یەکێکی ڕەش و برش کە لە زەمانی قاسمدا وەزارەتی دەست کەوت؛ بەڵام لەبەر دزێوی مێردی هەر دەس نەکەوت! کوردیشی دەزانی.
چوومە نومایشگای سنعات لە بوخارێست. ژنێکی هیندی زۆر جوان دەگەڵ دوو کەس لەوێ بوون.
مات مام: خوایە وەک ئەو ژنەم دیبێ وایە؛ لە کوێم دیوە؟ لە یەکێک لە پیاوەکانم پرسی: وەک ئەو ژنەم دیبێ، نازانم لە کوێ؟
- چۆن نازانی؟ لە سینەما؛ هونەرپیشەی سینەمایە!
هاتوچۆی مەنزڵی ئێرانییەکانم دەکرد. گوتیان دەگەڵمان وەرەوە لە ڕێگەی ڕووسیاوە دەتبەینەوە؛ نەموێرا. کابرایەکی ئێرانی کە لەگەڵ هەیئەتەکەدا نەمدیبوو، هات پرسی:
- تۆ هەژاری؟
- بەڵێ.
- وەرە کارمان پێتە.
بردمیە کافەیەک، سی کەسیتریشی هەواڵی ئەو لێ بوو.
- ئێمە توودەیی و هەواڵی دوکتور جەعفەری ڕەحمانین. باسی تۆی بۆ کردووین. توودە ئەمڕۆ زۆر بەهێزە و پۆلیس و ئەرتش هەمووی بە دەست خۆمانە؛ دادگا لە تکامان دەرناچێ. ڕۆژ ڕۆژی تۆیە. زۆرمان کار بە تۆیە کە شاعیرێکی کوردی. وەرەوە ئێران، خۆت ئاشکرا کە! دەتگرن؛ بەڵام خاترجەم بە لە حەوت ڕۆژ زیاتر لە حەبسا نابی، بەرت دەدەین.
یەکیان سەری خستە بن گوێمەوە: موسەددیقیش فرێ دەدەین و هەر بینا حوکممان گرتە دەست! ئای برا، کەیفە!
- ئاخر هەر دەبێ بچمەوە بەغدا. جا ئەگەر پێم بکرێ لەوێرا بێم.
- زۆر هاسانە: سبەی دەڕۆن! چوار ڕۆژ دەریا؛ دوو ڕۆژ لە بێرووتەوە تا بەغدا؛ ڕۆژی حەوتەم دەچییە کازمێن؛ کارتی من بە (لیوان تور) نیشان دەدەی. بێ ترسی پرسی پۆلیسی سنوور دەگەیە تاران. ئێمە چاوەنۆڕتین!
ئەی خەنی لە خۆم! کارتم وەرگرت. ئیمزاکەی «حەمەد ڕەزا» یان «ڕەزا عەلی» شتێکی وابوو. نامە تەنکەی باخەڵمەوە. هەر دەڕۆیم و دەستم بۆ دەبرد نەوەک ونم کردبێ. نەخێر دیارە بەخت رووی تێکردووم!
ڕۆژی خواحافیزی لە ڕۆمانیا، هەر یەکەی بیست دۆلار و کراسێکی باشی یادگاریان داینێ و سواری قەتار کراین بۆ سەر بەحر. لە شارێکی کەنار دەریا بە پێشوازمانەوە هاتن. دابەزین. سەما و هەڵپەرکێیەک بوو سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسی. دەهۆڵ و زورنا ئاشی پێ دەگەڕا. شاری کۆنستانییە بوو؛ زۆربەیان موسوڵمان و زۆریش لە بوخارێستیان جوانتر بوون. سواری کەشتی بووین؛ نازانم چەند شەومان پێ چوو. بەربەیانێک بە ئەستەمبووڵدا تێپەڕین بەرەو لوبنان.

بەیانییەک لە ڕستوورانی کەشتیدا خەریکی بەرچا خواردنین، میکرۆفۆن قیراندی:
- خوشک و برایانی بەڕێز! جێژنی قوربانتان مبارەک! داخی گرانم دوو بەلای گەورە ڕووی داوە: مەلیک محەممەدی پێنجەم لە مەراکیش تەبعید کراوە. شای ئێرانیش -کە دەرکرابوو- گەڕاوەتەوە تاران و موسەددیق ڕووخاوە...
لە فیلمێکدا دیتوومە چارلی چاپلین کە دەچێتە شەڕەمست، ڕەشێکی دیوەئێسکێک دە ملی دەساوێ بۆ بەرەکەت. لە بەری دەپاڕێتەوە کە ئەویش بۆ پیرۆزی ڕەملی خا. لەپڕ دەبینێ ڕەشە بە تابووت هەلگیراوە. بە پەلە جێ ئێسکەکە لە مل دەسڕێتەوە! منیش بەر لە هەر شت، کارتە کوێتم لە باخەڵ دەرێنا، ونجڕ ونجڕم کرد و چووم لە پەنجەرەوە بە دەریامدا دا. «ئەمیشم چوو، ئەویشم چوو، بە جارێ مالی وێرانم». ئەم خەیاڵ پلاوەشم کەڕووی هێنا...
کەشتی لە بێرووت لەنگەری گرت. پیاوی ئەمنی لوبنان سەرکەوتن. هەر دەستەیەکی هاوولاتی بە جیا دابەزێ. لە سەر زەوی پۆلیس چاوەنۆڕمانە؛ واماندەپشکنن دەڵێی پشکی کاڵە مستێن تاقەت دەکەن. هەر چی بۆنێکی کومۆنیستی لێ دەهات، کتێب و گۆوار و شتی یادگاری کە نیشانەی سووری پێوەبا داگیر دەکرا. هەر لە بەر خۆشیانەوە دەیانبۆلاند. سەگەل! ستوونی پێنجەم! نەمدەزانی ستوونی پێنجەم یانی چی! تەنانەت من نوسخەی تەرجەمەی «کرانک بیڵ» و ئەلمونجیدی چکۆلەی چاپی بێرووت و دەفتەری شیعرەکانم لێ سێندرا.
- گیانە! ئەو ئەلمونجیدە نووسەرەکەی بێرووتی و چاپی بێرووتە و لە بێرووتم کڕیوە.
- بڕۆ بەو لاوە ستوونی پێنجەم!
میسرییەکان هاتن؛ «تەحیە کاریۆکا» یەک دانە سەمای جانانەی کرد، ئەوانیان نەپشکنی. بە قوربانی چاوی سیت تەحیە بێ! دەبوایە بە دالانێکدا تێپەڕین و ئیجازەی چوونە ناو شار وەرگرین. لە شوێنێک هەموو شتە زەوتکراوەکان بە سەریەکدا درابوون و ئەفسەرێک بە دیاریانەوە بوو. لێی پاڕامەوە کە نوسخەکانم بداتەوە، گوتی نەڕۆی دەڵێم بتگرن. دەفتەرە شیعرەکانم لە سەرەوە دیار بوو. هەر چاوێکی خافڵ کرد پڕم پێدا کرد و دە ساکەکەم ڕاکرد. حەنبالێک گوتی: چ دەکەی؟! لیرەیەکی لوبنانیم نایە مستی: ئەو ساکەم بۆ بەرە دەر!
- بە چاوان!
شیعرم ڕزگار کرد و کرانک بیڵم چوو. پەساپۆرتی عیراقی و ئوردنیان نەدرایەوە. پاش دوو ڕۆژ وەرمانگرتەوە و پۆلیس دەگەڵ چوار پێنج کەس ڕەپێچەکیان داین و گەیاندینیانە وادی حەریر و تەسلیمی نوختەی سنووری سووریا کراین.
با ئەوەشم لە بیر نەچێ: کراسە خەلاتییەکانی ڕۆمانیا لە لای ڕەئیس و معاونەکانی مانەوە کە لە بێرووت دەتاندەینێ. لە بێرووت گوتیان مالی حیزبە و لە بەغدا تەسلیمی حیزبی دەکەین؛ بەلام کلکی کەلەشێر دیار بوو؛ بۆ خۆیان لەو کراسانەیان دەبەردابوو!
ماشێنی یەکجار زۆر لە سەر سنوور بۆ ئیجازەی چوونە سووریا ڕیز ببوون. زۆر سەرماش بوو. زۆر درەنگ نۆرەمان دەهات. دوو ئەفسەری سوورییایی -کە یەکیان لووسکەلەیەک بوو- بە لاماندا تێپەڕین:
- ئێوە عیراقین؟
- بەڵێ.
لووسکەلەکە بە گاڵتەوە پرسی: ئەگەر من لە بەغدا بوومایە چۆن دەبووم؟!



من گوتم: بە ڕاستی ڕۆژێ سەد دینارت دەرامەت دەبوو!

هەردووکیان زۆر پێکەنین. کوڕە جوانەکە غاری دا نۆبەبڕی بۆ کردین. گوتیان هەر دوو ڕۆژ هەقتان هەیە لە سووریە بمێننەوە. دەگەڵ هەواڵەکان وای بۆ چووین کە ئەو پاسپۆرت گێڕانەوەی دوو ڕۆژە بۆ پۆلیسی عیراق بووە؛ ناویان نووسیوین بمانگرن. با نیشانەیەک دانێین ئەگەر یەکێ گیرا خەبەر بدا. ئادرەسی ئەوانەم وەرگرت کە دەچنەوە بەغدا. هەر هاتمە شام، گیر نەبووم چوومە حەلەب. سواری ئوتووبووس بووم. خۆم گەیاندە قامیشلی و لەوێوە چوومە «ترپەسپی» (قبورالبیض) ماڵە حاجۆ. دوای چوار ڕۆژ تێلگرافم بۆ عەبدولکەریم شێخ داود کرد: «حاڵت چۆنە؟» نووسیبوی: «تەنیا سەلیم براوەتە بیمارستان». دەترسام ئەگەر بە پەساپۆرت بچمە سنوور، پۆلیس - قڕ- بمگرێ. دە ڕۆژێک لە ترپەسپی مامەوە. بە جیپێک دەگەڵ یەکێک لە کوڕانی ماڵە حاجۆ، لە ڕێیەکی چەپەکەوە، چوومە گوندێکی عیراقی کە لە سەر سنوور و ناوی «سەعدە» بوو. چوومە دوکانێک، قاوەخانەش بوو.

- کەس هەیە بمباتە مووسڵ؟

کابرایەک کە شۆفێری کامیۆن بوو گوتی: بە چوارسەد فلس دەتبەم.

- باشە.

پشتی کامیۆن چەند بارە دەغڵ و زۆر ژن و منداڵ و پیاوی عارەب و چل- پەنجا مریشک و قەلەموونەی لێ بار کرابوو. لە تەنیشت شۆفێر دانیشتم. ئێوارە درەنگ گەیشتینە چاخانەیەکی سەر ڕێ (چاخانەی گوندی کەسک). پۆستی پۆلیس لە پشتیەوە لە سەر گردێک بوو. شۆفێر گوتی با لێرە شیو بخۆین.

- برا تۆ دەڵێی بۆ مووسڵ بیست دەقیقەمان ماوە، ئێستاش هەر ئێوارەیە. بڕۆ بگەینە مووسڵ، شێوی بە کەیفی خۆت بۆ دەکڕم.

- نەخێر هەر لێرە دادەبەزم.

چووینە قاوەخانە، داوای چام کرد. شۆفێریش داوای شێو. پۆلیسێکی گرووهبان ڕووی تێ کردم: چکارەی؟ بۆ کوێ دەچی؟ کوا پاسپۆرتت؟ بۆ لە تەلکۆچەرەوە نەڕۆیشتووی؟ وەرامم دەداوە، لە ناو قساندا لە جیاتی بڵێم «ماکو» کە عیراقیانەیە و یانی «نییە» گوتم «مافی» وەک خەڵکی سووریا.

- هەهۆ! تۆ جاسووسی جوولەکەی! پێشم کەوە بۆ پۆست. شۆفێر تۆش نابێ بڕۆی.

- دەناو هەرا و چەقەی سوارانی پشت کامیۆن و غەڵبە-غەڵبی چاخانەنشینەکان بە گردیان هەڵگێرام. بردیانمە ژوورێک کە هەم دەفتەری کار، هەم جێ خەوی سێ پۆلیس بوو. سەرگرووهبانێک و چوار پۆلیس دەستیان کرد بە پرسیار کردن. سەرگرووهبان و پۆلیسەکان بێسەواد بوون؛ یەکێ تریان بانگ کرد کە کوێرەسیواتێکی هەبوو. ڕوانیانە پاسپۆرتەکە. عەکسەکەم بریقەی بەرقی لە سەرمدا هەبوو.

- ها هۆ! ئەوە عەکسی تۆ نییە؛ تۆ جحێڵی و لێرەدا سەرت سپی بووە!

کێ تێدەگەیەنی؟! باسەوادەکە گوتی: ئاخر عەکسی شای پێوەیە؛ کەس لە دنیادا ناتوانێ عەکسی شا جەعل بکا!» دەلیلێکی باش بو!

- دەی بۆ گوتووتە «مافی»؟

- لە سووریا فێر بوم.

- تۆ ئەمشەو دەبێ لێرە بمێنی تا بەیانی بە تەلەفۆن لە ئەفسەری تەل‌کۆچەر دەپرسین؛ با خۆی لێت بکۆڵێتەوە.

ماندوو ببووم؛ خۆم هاویشتە سەر تەختی نووستنی پۆلیسێک، گوتم: بە ئیجازەی ئێوە من خەوم دێ. شۆفێر پەیدا بوو:

- جەنابی سەرگرووهبان! ئەم پیاوە زۆر موسوڵمانە؛ بە قورعان قەت نوێژ و ڕۆژووی ناچێ!

ئەی بە بابەوەت بە قوڕێ دابا. شەرت بێ دە سالیشە نوێژم نەکردووە! ڕەمەزانیش نییە تا بزانی بەڕۆژووم. ئەوان خەریکی چەنەلێدانی خۆیانن، دیتم چوار شووتی دە بن تەختەکەدایە.

- برا کێ چەقۆی پێیە، قاشێک شووتی دەخۆم!

- شووتی چی؟!

- برا خۆ پیاوەتی نەبڕاوە. ناکا لە سەر قاشێک شووتی بە گژمدا بێن!

چەقۆیەکیان دامێ و ملم لە شووتی خواردن نا. شەو گەیبووە نیوەشەو، چەقە و هەرا هەر نەبڕاوە:

«جاسووسە؟ جاسووس نییە!».

گوتم: برا جاسووس نیم؛ زگم بەو ژن و مندالانە دەسووتێ کە لە سۆنگەی منەوە قەتیس ماون؛ سەرمایانە. وەرن دینارێکتان دەدەمێ، سێ بوتری ئارەقی پێ بکڕن و لێم گەڕێن بڕۆم!

- بەرتیل دەدەی بە پیاوی دەوڵەت؟ ئەو هەویرە زۆر ئاو دەگرێ؛ دەبێ هەر ئێستە خەبەر بە ئەفسەر بدەم، هەر ئەمشەو بتبەنە زیندان.

- ئەمشەو نا! با لە سەر ئەم تەختە بنووم!

تەلەفۆنی هەڵخڕاند: «ئەلۆ! ئەلۆ!»، مالی ئەفسەر دەست نەکەوت. خڕخڕ! ئەلۆ! ئەلۆ! ئیدارەی پۆلیس خەبەر بە جەناب سەروان بدەن کارێکی زەرووریم هەیە. دەیانەویست قسە بکەن و من تێنەگەم. بە تورکییەکی نیوە عەرەبی و کوردی شەق و شڕ دەستیان پێکرد.

- دەی کاکە ئەگەر ئێوە تورکمانن و لە خۆمانن بۆ دەنگ ناکەن؟!

قوت بوون:

- تۆ خەڵکی کوێی لە عیراق؟

- ئەگەر سیوادتان هەبوایە زوو دەتانزانی من خەڵکی تسینم لە پەنا کەرکووک.

- لە کەرکووک کێ دەناسی؟

- ماڵە ئاوچی!

- لە تسێن کێ؟

- عەموو نەجەف!

- چەند کوڕی هەن؟

- حەسەن و عەسکەر.

- برام نەمانزانی تۆش موسوڵمانی (یانی شیعە)، دەبێ ببەخشی؛ خزمەتکارین!

تەلەفۆن لێی دا، ئەفسەرەکە بوو:

- ها چییە؟

- قوربان کوڕێکی زور باشمان میوانە و لە خۆمانە؛ زۆر سەلامی بۆت هەیە!

- سەگی سەگباب! لە خەو ڕاستم دەکەیەوە تا سەلامم پێ بگەیەنی؟ بۆچی ڕۆژ نەدەبۆوە؟!

قرم داخرایەوە.

- دادەی چەمەدانی بۆ هەڵگرن و بەڕێی کەن!

- برا من ئەمجار دینارەکەت بە مزگێنی دەدەمێ؛ ئارەقەکەی ئەوشەوتان بە سەلامەتی هەر چی موسوڵمانە!

گروهبانەکەی گرتمی، چەمەدانی هەڵگرت و کەوتە شوێنم. لە ڕێ گوتی: تۆ کە تورکمانی بۆ بە زمانی سەگان (یانی عەرەبی) قسە دەکەی؟ ئێمەت تووشی شەرمەزاری کرد! یەکیش کە داوای شووتیت کرد و لە سەر تەخت ڕاکشای و هەر گاڵتەت دەهات، زانیم تۆ کاربەدەستێکی گەورەی! تکات لێدەکەم خاوەن ماڵ و منداڵم، خراپەم مەڵێ!

- خاترجەم بە!

بۆشی گێڕامەوە کە شۆفێر خەبەری لێداوم؛ گوتوویە من حەقم سەد فلس بووە، چەنەی لێ نەدا و چوار سەد فلسی دامێ. دیارە جاسووسە و پووڵی موفتی پێیە! لە جێگەی خۆم سوار بوومەوە. بە شۆفێری گوت: ئەمەی بە سلامەت نەگەیەنیە موسڵ، باوکت لە کەر دەکێشم!

- خواحافیز؛ بەڵام لە بیرت نەچێ لەم ڕێ و بانانە بە زمانی سەگان ماخێوە!

لە ڕێ شوفێر لە پاش «خوا شوکور نەجاتت بوو» گوتی: قەولت دا شێوم بۆ بکڕی.

- تۆش قەولت دابوو شۆفێر بی؛ شۆفار نەبی. بە گرتنت دام و ژەقنەمووتت دەوێ؟ هەیهاتە...

دەبوو تا ئێوارە لە مووسڵ بم و بە قەتار بچمەوە بەغدا. بۆ فراوین چوومە ڕستوورانێک. لە دەرکەوتنمدا کە ویستم پووڵ بدەم، گوتیان دراوە.

- کێ دای؟

- هۆو پیاوە.

مامەحەمەدی حاجیاڵلای سابلاغی کۆنە هەواڵم بوو. دانیشتین و دەنگ و باسی وڵاتم پرسی. گوتی: خوشکت لەو ساوە تۆ ڕۆیشتووی -ئەوە حەو ساڵە- یەک بین بۆت دەگری. ژنت بێوەژن و کوڕێکت هەتیوە؛ چارێک بکە!

- منی وا بەدبەخت و ئاوارە چۆنم چارە پێ دەکرێ؟

- خوشکت چەند جار داوا کراوە؛ مێرد ناکا. من لام وایە ئەگەر ژنەکەت بێتە لات، ئەویش لەوانەیە بێتە ڕەدایە و دامەزرێ. ئێستا کە دەبینێ ژنت بەو منداڵیەوە هەر چاوەنۆڕی تۆیە و بێوەژن کۆشی دەکا، ڕەنگە شەرم بکا ئەو بەجێ بێڵێ و مێرد بکا.

- کاکە! ژن بە چی بەخێو کەم؟

- دەتوانی کار بکەی. ژنەکەت حازرە سوالیشت دەگەڵ بکا! من دەزانم...

- چۆنی بێنم؟

- من بۆت دێنم. نامەیەکیش بۆ خوشکت بنووسە؛ با لەو گریانەی بەس کا.

نووسیم: «خوشکم زێنەب! ئەوا من ژنەکەم دێنمە لای خۆم. ئەگەر تۆش مێرد نەکەی و کارت هەر گریان و نووکەنووک بێ، من برات نیم و لە خوشکایەتیم شۆرایەوە...».

ئێوارە چوومە ئێزگەی قەتار؛ «کوتک لە سەر ڕمبان بوو»! خێزانی ماڵی شا لە کوێستانی سوارەتووکەوە دەچوونەوە؛ نیوەی پتری واگۆنەکانیان بۆ تەرخان کرابوو. فیلم دەویست جێگەی بەرکەوێ. تووشی کۆنە ئەفسەرێکی عیراقی بووم بە ناوی «عەبدوڕەزاق عەبایچی» کە لە بەحنەس ببووینە ئاشنا و لە بەر نەخۆشی سیل بازنشست کرابوو. ئەویش وەک من سەرگەردانی

جێگا بوو.
دوو تەلیس گوێزیشی پێ بوو.
- هەژار! جێ دەس ناکەوێ؛ چ بکەین؟
- تۆ کارتی شوناسایی ئەفسەریت ماوە؟
- بەڵێ لە گیرفانمدایە.
- واگونێکی دوور و درێژ بۆ ئەفسەران تەرخان کراوە؛ کارتت دەرخە.
- چۆن دەبێ؟
- چۆن نابێ؟!
چووینە بەر واگۆنەکە. سەرگرووهبانێک کارتەکەی دیت، چەستێکی جانانەی کێشا: قوربان فەرموو! گوێزیان بۆ بار کرد. منیش خۆم تێخزاند و لە ڕیزی پشت قوربانەوە تەخت دانیشتم. بەر لە ڕۆیشتنی قەتار، سەرگرووهبان پێدا گەڕا بزانێ کێ بە قاچاغ سوار بووە. لە ژنێکی ئەوبەرمی پرسی:
- تۆ چیت؟
- من عایلەی ئەفسەرم.
خۆی تێنەگەیاند. گەیشتە من:
- برا تۆ چیت؟
- من عایلەی ئەم ئەفسەرەم!
بوو بە فلق و هۆڕی پێکەنین! لە واگۆنی ئەفسەراندا هاتمەوە بەغدا. وەک پشیلەی پاشا، ڕاست چوومەوە ماڵی مام حوسێن! مام حوسێن لە دوورەوە بە پیرمەوە هات و گوتی: چووبوون زەبیحی بگرن، ترسمان ڕێ نیشت، کتێبەکانمان سووتاند. بایی چەند بوون پووڵەکەت دەدەمەوە. کزەم لە جەرگەوە هات. قەدەرێک تاسام. گوتم: مامە! ئەگەر کەسێک سەری کوڕت ببڕێ بە چەندی لێ ڕازی دەبی؟ ئەو کتێبانەم زۆر بە خوێنی جەرگ پەیدا کردبوو؛ سیاسی و قاچاغ نەبوون. خۆت سەلامەت بی!
حیکایەت چ بوو؟ شا -کە لە هەلاتندا چووبووە بەغدا- زەبیحی شەو نامەیەکی دابوو بە لاوێکی خەڵکی سولەیمانی، بردبووی لە بەر دەرکی دەربار بڵاوی کردبۆوە؛ گرتبوویان؛ گوتبووی قادر دایمێ.
- کوا قادر؟
- لە کافە عەبدوڵلایە.
چوار ئەفسەری سیڕی دەگەڵ چەند پۆلیس دەچن. لە زەبیحی دەپرسن:
- کوا قادر؟
- نەکا قادرە کومۆنیستەکە بڵێن کە زۆر بەدفەڕە؟ دادەی قاوە بێنن! ئێوە بێدەنگ دانیشن با قوشقی نەبێ. ئێستا دەیهێنم و بیگرن!
- زەبیحی لە جادەی لای ئەبوونەواسەوە ڕادەکا. پۆلیس لە سەر لاق قاوە دەخۆنەوە. لە خزمەتکارێک دەپرسن:
- قادر بۆ نەهات؟
- قادر لای خۆتان بوو؛ بۆ کوێتان نارد؟!



زیانی کتێب سووتان زۆر کاری تێکردم. ئیتر تازە لە کتێب کۆکردنەوە دلم ساردەوە بوو. کە دەمدین -وەک نەزەریان حەرام بێ- ڕووم وەردەگێڕا. بە گفتی مەولانای ڕۆمی: «ماوەیەکی ویست خوێن بۆوە بە شیر»، سالێکی برد تا لەو تاسانە دەرچووم و ملم لە کۆ کردنەوەی کتێب نایەوە.

کاتێ گەیمەوە بەغدا - پاش سەردانی مام حوسێن- چوومە کن یەرمیا. گوتم: دار و نەدار حەوت دۆلارم هەیە. گوتی: بێنە! لە هەڕاجە بازاڕ، لێفە و دۆشەگێکی تەنکی کۆنی دەگەڵ سەنیرێک بۆ کڕیم بە چوار دۆلار. سێ دۆلارەکەی‌تریشی -کە کردبووە دینار- دامەوە. گوتی: تا کار پەیدا دەکەی لە مزگەوتێک، دیوانی نەقیبێک بنوو! ئوتێل بۆ تۆ نابێ.

فەقێ سەیدێکی هەولێریم پەیدا کرد کە لە مزگەوتی مەلیک، بەرانبەری وەزارەتی داخلە دەیخوێند. بڕیار درا لەوێ و لای فەقێ ڕایبوێرم. ناوی فەقێم لە بیر نەماوە؛ بەلام مەلایەکی زگ‌زلی قەپۆزبەرانی شاڵ لە پشت و مێزەرسپی کوردانە، شەوانە دەهاتە حوجرە؛ ناوی شێخ مستەفا بوو. بە ڕاوێژی دەمی هەولێری بوو.

شەوێک حافزێک «حەسیب» ناوی عەرەب هاتە لامان. شێخ مستەفا گوتی: حەسیب! تۆ لەو دنیایش هەر کوێر دەبی. دەڵێن عاقیدەت سستە. حەسیب هەڵیدایە: یا شێخ! لە کتێبدا نووسراوە و بۆیان خوێندوومەوە کە ڕۆژێک ئیسرافیل گوتی خودایە تاسەی میکایلم کردووە؛ ئیجازە بدە سەری بدەم. خوا فەرمووی بچۆ! بەلام زەحمەتە بیگەیەی! ئیسرافیل سەد ساڵ فڕی و ڕێگەی پێوا؛ ماندوو بوو. خودایە! کەی دەیگەمێ؟ خودا فەرمووی: هێشتا مەودای نێوان لچی خوارێ و لێوی سەرووی میکایلت نەبڕیوە! دەڵێم زەحمەتە؛ دەلێی دەچم! یا شێخ! ئەگەر باوەڕ بەو تورەهاتە چاو لە قیامەت بۆ پیاو پەیدا دەکا، سەگم دەو چاوە ڕیاند!

فەقێ زۆر بەتەماح و من زۆر بێ‌پووڵ. هەر دەیگوت: تا دەنێرم ڕۆنم لۆ دێ، هەروو بڕێکی بکڕە، هەڕوو هێلکە بکڕە، هەڕوو گۆشت و... ناچار بارم کرد. شرەم لە سەربانی دیوەخانی نەقیب بە زەویدا دایەوە.

لە کن وەستا برایم دامەزرامەوە؛ ڕۆژێ بە نیو دینار. شاگردێکی کۆیی‌تریشی هەبوو بە ناوی «جەلال بێتووشی». پێکەوە ڕێک کەوتین دوکانێک لە سەر حیسابی خۆمان بکەینەوە. وەستا نەوەد دیناری دەست گرتین. دوکانێکی چۆڵمان لە خەیابانی مەلیک فەیسەڵی دووەهەم گرت و دەستمان کرد بە کار. ستودیۆی تازە کەم کارە؛ ئێمەش فەقیر بووین نەماندەکرا جوان و ڕێک‌وپێکی هەڵخەینەوە. ئەوەندەی لێ پەیدا نەدەبوو هەردووکمانی پێ بژین. سێ جەمە نان و ماستمان دەخوارد؛ ئەویش تێر نا. دەمپاییمان دەپێدا بوو. تەنانەت باوەشێنێکی بەرقیمان نەبوو. گوتم من دەچم کارێکی شەوانە دەبینمەوە؛ هیچ نەبێ نانی شەوت دابین بێ.

بە هۆی قزلجی و زەبیحی -کە عەبدوڵلا نەجاتی دابوون- لای عەبدوڵلا شەریف کارێکم دیتەوە. مەیخانەیەکی هەبوو بە ناوی «جندیان»، ئارەقی لێ دەفرۆشرا و لە سەر خەیابانی سەعدوون بوو. لە سەعات حەوتی ئێوارەوە تا مەیخانە چۆڵ دەبێ، حیسابی ئارەق و خۆراکی فرۆشراو بنووسم. شەوانە بە ڕوبعە دینارێک و شێویش هەرچی بخۆم: جەلال کەیفە! من نیوەڕۆیان کەم نان دەخۆم؛ تۆ خۆت تێر کە! شەوانە تێی‌هەڵدێنمەوە. سەعات دەوری یازدە و نیو- دوازدە دەچوومە ژوورێک کە دەگەڵ حەمەی ڕەشادی لە مالی «عەلی عەزیز» ناوێکی سابلاغیمان بە کرێ گرتبوو. ڕۆژانەش لە دوکان کارم دەکرد.

شەوێک داوای دوو پۆرس جەرگی سوورەوەکراوم کرد بە دوو سەموونی دوو قاتەوە؛ کە دەبووە چوار سەموونی ئاسایی. لە پشت مێزێک ملم لە خواردن نا. مشتەریەک لە نزیکم ئارەقی دەخواردەوە، پرسی:

- ئەرێ ئەوەی هەموو دەخۆی؟!

- بڵێم چی مامە گیان! دوکتور دەڵێ دەبێ شێوت سووکەڵە بێ!

- کابرا -کە پیاڵەی نزیک دەمی کردبوو- لە پرمەی دا و چڵم و لیکی تێکەڵ بوو. لەبەر پێکەنین ژانی کرد!

عەلی عەزیزی خاوەنی ماڵ، لە سەر تەلەفۆناتی ئیدارەی پۆلیس بوو. شەو درەنگ تەلەفۆنی دەکرد.

- کەنگێ دێیەوە ماڵێ؟

- نیو سەعاتی‌تر، سەعاتێکی‌تر، هەروا چەند دەقیقەیەکی دیکە!

- یانی چی؟ تێناگەم.

- کاکە! ئارەق‌خۆرەکانی بەڕێز، ئەگەر تازە کەوتنە گۆرانی گوتن، سەعاتێک هەر دەمێننەوە. ئەگەر دەستیان کرد بە قنگ‌بادان و چەقەنە لێدان، دیارە نیوسەعاتێکی ماوە. ئەگەر بێ‌هێز کەوتن و دەستیان بە سمێڵ ماچ کردنی یەکتر کرد، هەر بینا ڕۆیشتن!

ئەمجار عەلی لە تەلەفۆنی شەوانەیدا دەیپرسی: گۆرانییە؟ یان قنگ بادان؟ یان سمێڵ ماچ کردن؟!

نەمدەهێشت گارسۆن ئارەق بدزن. بە ماوەی پازدە ڕۆژ قڕابەیەک ئارەق لە حیسابی مانگی پێشوو مایەوە. ئافەریمم لە ئاغا وەرگرت؛ بەڵام زۆر لە کارەکە وەڕەز بووم؛ مانگەودوا وەڵام نا. لەم بەینەشدا وەستا داوای قەرزەکەی دەکرد و خات مەلەکی ژنی مێشکی بردبووین. گوتم: جەلال! من دەچمەوە کەرکووک و پووڵت بۆ دەنێرم و تۆش لێرە پەزمەندە بکە تا قەرزەکە دەدەینەوە. مەلا شوکور دەچووە کەرکووک؛ گوتم: بە پۆرتۆیان بڵێ ئەگەر ڕامدەگرێتەوە دێمەوە. مەلا چووبوو گوتبووی هاتووم ببمە شاگردت! کە ئەزمووبووی، هیچی لێ نازانێ، گوتبووی فێرم کە!

- بۆ من مەدرەسەم داناوە؟!

- بەخوا عەزیز گوتی ڕامبگرێ دێمەوە!

- خەبەری بدەیە مانگێ هەژدە دیناری دەدەمێ.

چوومەوە کەرکووک. شاگردێکی ئاشۆری بە ناوی «لازار»م لە بەر دەستا و دەستم بە کار کردەوە. بەڵام ئەمجارە زۆری دەوام نەکرد؛ خەبەریان دامێ کە جەلالی شەریکت لە خۆپیشاندانی کومۆنیستاندا گیراوە و دوکان بێ‌خاوەن ماوە. لەم سەفەرەی دواییمدا ژوورێکم لە ماڵێکدا گرت، کە عومەر ناوێکی نانەوا بە کرێی گرتبوو؛ خۆی بە سەڵتی تێیدا دەژیا؛ ئەویش جەلال تاڵەبانی پێی ناساندم؛ گوتی: زۆر کوڕی باشە؛ کادری حیزبمانە؛ ئاگاشی لێت دەبێ و ئێمەش لە حاڵت ئاگادار دەکا. هەفتەی یەک- دوو شەو دیار بوو چەند کەسێک دەهاتن، عومەر دەرسی سیاسی پێ دەگوتن. عومەر سیواتی نەبوو؛ لە قسە کردنیش بە گێلۆکەم دەدیت. بەڵام کێ دەڵێ لە سیاسەتدا مامۆستا نییە؟!

من ڕادیۆم هەبوو؛ ئەو نەیبوو. بەیانییەک گوتم: کاک عومەر تۆ زانیوتە ئەمشەو ستالین مرد؟



- عومەر قەدەرێک مات بوو، گوتی:
- کاک عەزیز - بە پسکی خۆی- من دەڵێم «ثحەتی» باش نەبووە بۆیە مردووە!
- ئەی ئافەریم! باشی تێگەیشتووی! پیاو سحەتی باش بێ بۆ دەمرێ؟!
- باسی ئەو زیرەکییەی کادری هەڵبژاردەم بۆ جەلال گێڕاوە؛ زۆری پێ سەیر بوو!
ڕۆژێک چێشتەنگاو هاتمەوە؛ وا کا عومەر لە ماڵە.
- ها! خێرە؟
- مانم گرتووە! بە نانەواخانەم گوتووە مەعاشم زیاد نەکا کار ناکەم.
- کاکە لەم بێکارییەدا، ئێستا بێکارێکی ملئەستوور کاری تۆ دەکا و بە کەمتر لە تۆش ڕازییە!
- من دەڵێم مانی کرێکارانم کردووە؛ وەک لە فەرانثە (فەڕانسە) دەکرێ!
پاش نیوەڕۆ هاتەوە گوتی: تۆ «دەذانی» یەکێکیان لە جێگەم داناوە، بچم بە لایەوە ملم دەشکێنێ! ناچارم بچمەوە «ثولەیمانی»!
ئێوارەیەکی هەینی عومەر گوتی: ئەمڕۆ چووبووینە دەشت، ترومبیلێکی «اثتعمار» بە لاماندا ڕابرد. ذۆر هوتافمان کێشا: بمرێ، برووخێ اثتعمار!
تۆمەز ترومبیلی اعمار (ئاوەدانی) بووە!
شەوێک بە بۆڵەبۆڵ و جنێودان هاتەوە. هەر لە بەر خۆیەوە دەیگوت:
- قەحبەی سۆزمانی کێ فریو دەدا؟
- ها کاکە عومەر! خەبەر چییە؟
- مامۆثتا! «ئوممو کولثووم»ی قەحبە دیسان خۆی ناوەتە پیانۆ (بەخت ئازمایی). ئەوە ثالێکیتر وای کرد، بۆ حەمبالێک دەرچوو، شووی پێ نەکرد؛ ئەمجارەش ئەیەوێ بمانخەڵەتێنێ!
دەبوایە بە سەتڵ ئاو لە قاوەخانەیەک بێنین. هەرچی دەروێش و سەیدی نوشتەنووس و پیاوە بە ڕواڵەت سالحەکان بوون، زۆربەیان دەهاتنە ئەوێ. دەرابەکانی هەرگیز هەڵنەدەدرانەوە؛ تاریک و تنووک بوو. لێمان ببوە مەتەڵێکی دژوار. شاگرد چاخانەکەمان بانگ کرد، پەنجا فلسمان دایە ئەو مەتەڵەمان بۆ هەڵێنێ: ئەو هەموو سەید و پیاوچاکە ڕیشدارانە بۆ لە قاوەخانەی ئەوان کۆمەڵ دەبن؟ بۆ هەمیشە تاریکە؟
- هەموویان بەنگ دەکێشن! نابێ پۆلیس پێ بزانێ. وەستاکەم بەنگفرۆشە.
لە خانێکی سەوزەفرۆشی، دەگەڵ کۆنە سنەییەکی تازە تورکمانی کوردینەزان ببوومە ئاشنا. کابرا هەر لە خۆوە ڕۆح و گیانی لە سەر من دەگەڕا. خۆی ئیجارەداری خانەکە و چاخانەداریش بوو. دەبوو هەموو ڕۆژ بچمە چاخانەکەی و چایەک بخۆمەوە. کە زانی لە خانووی عومەر دەرۆم، وەک قیل پێمەوە نووسا: دەبێ هەر بێیە خانەکە؛ کە چەند ژوورێکی لە نهۆمی دوو هەبوو.
- بەرقی نییە.
- هەر ئەمرۆ بۆت دەکێشم.
- ئیجارەی چەندە؟
- هیچ!
- نەخێر نایەم!
- مانگێ دینارێک.

تەواو نەمگوتبوو باشە، حەنبالی هێنا کەل_پەلەکەیان بردم. تا ماڵ هات بەرقی لـە چاخانـەوە بۆ بردبوو. کوڕێکی خزمەتکاری خانەکەی بە ناو جەببار -کە لاوێکی پازدە سالە بـوو- نـارد بـۆم خاوێن کاتەوە؛ تا منیش لەوێم هەموو کارم بۆ بکا.

دەگەڵ هونەرمەندی بەناوبانگی کورد «بەدیع باباجان» زۆر ببووینـە هـۆگری یـەکتر. ئـەویش سەڵت بوو. نیوەڕۆیان لە پاش کاری ئیداری -کـە نەخشەکێـشان بـوو- بـۆ نیـوەڕۆژە خـواردن دەهاتە لام. مەنجەڵـێک ماسـت، لاباوەشـێک کـەوەر، نـانی گـەرم، هێنـدەمان دەخـوارد وەک «دالاشی سەر کەلاک» نەماندەتوانی ببزوین!

وەکیلێکی دادگوستەری کورد بە ناوی «سالـح ڕوشـدی»، هـەر لـەو خانـە لـە نزیـک ژووری منەوە، ژوورێکی کردە دەفتـەر. ڕۆژێـک شـێخ مـارف بـە زۆر بردمیـە ماڵـە خـۆی. بـەدیع بـە دووچەرخە بۆ نان و ماست و کەوەر هاتبوو؛ بە پەلە لە پلەکان سەرکەوتبوو. ئـای ماڵـی وێـرانم! هەیوان پڕە لە پۆلیس. دەرگاکەی من داخراوە. گورجێ دەیگرن و دەیبەنە ژووری سالـح. پ - جەلادی مەشهووری کومۆنیستان- دەگەڵ چەند ئەمنێکی‌تر دانیشتوون. سالحیان بـە بەڵـگەی تاوانەوە گرتووە؛ بەرپرسیاران داوە. دەڵێن: سالح ئەوەش ڕەفیق و میوانی تۆیە؟

- بەڵێ کاک بەدیعی دۆستمە!

جا وەرە و رووح دەرنەچێ! ئەو کابرایە خۆی گیراوە؛ منی بێ‌خەبەری بۆ بـە درۆ پێـوە کـرد؟ نایل دەڵێ: تۆ بەدیع باباجانی؟

- بەڵێ.

- بەدیع! هەر کەسێ تۆی دیوە خۆشی دەوێی؛ بڕۆ خوات دەگەڵ.

- لەو ساوە هاو فراوینەکەم تازە نەهاتەوە و من دەچوومە لای ئەو.

لە سەربانی خانەکە دەنوستم؛ دووپشکی زۆر بوو. خاوەن خانی هەواڵم چوار قەفەسـە میـوەی لە گەلای خورما لێک دا و بۆی کردمە تەخت. لە سەری نووستم. شەو نیوەشـەو وەک چـەترباز بەرەو عەرز دەچم! تەخت قرمەی کرد!

ڕۆژێک کوڕێکی شناسی شیووعی «بەیانی ئاشتی‌خوازانی» بۆ هێنام ئیمزای کەم.

- کاکە ناوێرم و نایکەم!

- ئاخر ئەوانە ئیمزای زۆریان لە من دەوێ! تـۆ هـەرچی دەنووسـی بنووسـە، هـەر ئیمـزا بـێ بەسە! نووسیم: «عەزیزموسی» نوختەیەک مەرەکەب کەوتە سـەر سـینەکە. بـەیان گـیرا و جـا وەرە تێیان هەڵدە: فلان فلان شودە! ئەو عەزیز مووشێ جوولەکەتان لە کوێ پەیدا کرد؟!

زۆرم ئاشنای باش لە مـەلا، دانـشجوو، بـازاڕی و هـی‌تـر پەیـدا کردبـوو کـە زۆر خۆشـم لـێ دەگوزەرا؛ بەلام بە گیرانی جەلال ڕیسەکەم ئالۆزا. کەل_پەلم فرۆشت؛ هاتمـەوە بەغـدا. وەسـتا برایم - بۆ نەفەوتانی قەرزەکەی- سەرجەم دوکانەکەی دابوو بـە نـەوەد دینـار؛ کـە بـە هاسـانی چوارسەد دیناری دەکرد. لە کەرکووک بێ‌بەش مام و لە بەغدا بێ‌کار. چوومە لای کاکە زیاد:

- دەمەوێ دوکانێک دانێم؛ بە سەد دینار پێک دێ. دەس‌بەجێ دایمـێ. گـەڕام، دوکـانێکی چۆڵم لە «ئەعزەمییە» گرت. کەچە ماشینێک و هێندێک وردە ئەسبابم کـڕی. ژوورێکیـشم لـە نهۆمی سەرەوەی بازاڕچەیەکەوە گرت کە سەربانی بەینی پێش ژوورەکـەم و سـەر بازاڕەکـە بـە شیشی ئاسنی لێک بلاو داپۆشرابوو. ئەگەر یەکێک لە بازاڕەکەدا سرتەی بکردایە، من گـوێم لـێ دەبوو. لە ئێوارەوە کە لە کار دەگەڕامەوە تا بـەری بـەیانی، خـەو حـەرام و ئیـستراحەت دەرد و

سندان بوو. نزیکەی بیست ڕادیۆ بەوپەڕی دەنگی بڵند تا سەعات یەکی شەو دەیاننەڕاند. لە یەکی شەوەوە چەققە و هەرا و گۆشت ورد کردنی قەسابان بوو؛ تا وەختی کارم نەدەپساوە. سەر لە هەوەڵەوە پێم وا بوو کەوتوومە ناو جەهەندەم، بەلام دەڵێن جەهەندەمیەکانیش فێر دەبن؛ فێر بووم. بەو هەموو گوڕە و نەڕە و تەقە و ڕەقەشەوە، خرپ خەوم لێ دەکەوت.

«حەمە سەعید کانیمارانی» -کە خاوەن ملک و دەولەمەندی گەورە و بۆ خۆی لیسانسی حقووق بوو- ڕۆژێک برایەکی خۆی بە ناوی «وریا» هێنا کە بیستوومە جێگەت هەیە! با لای تۆ بێ و دەرسەکانی لە دەبیرستان بخوێنێ. «عومەر دەبابە» -کە لە بەغدا دەڕۆی- دوو تەختی نووستنی هەرزانبایی دابوومێ؛ زیلۆی زبرم لە سەر ڕاخستبوون و لە سەر یەکیان دەخەوتم. «ئەگەر بەوە ڕازی دەبێ سەر چاوان». شەو گوتم: وریا با بچین شیو بخۆین.

- مامەستا! بۆ نان و کەوەرێک، نان و خەیارێک نەخۆین؟!

- کاکە! من نە گوندی کانیمارانم هەیە، نە میلیونێرم. من دەچم گۆشتی بڕژاو دەخۆم؛ تۆ کەوەری خۆت بخۆ!

پێم وایە مانگ و نیوێکی نەبرد، کە لێکم دایەوە، زۆرم لە دەسمایەی دوکان زیان کردووە؛ چونکە کۆلانەکەی جێ دوکانم زۆر چۆڵ بوو. ڕۆژێ مشتەریەکم بە حاڵ دەس دەکەوت. ئەی خودایە خەجاڵەتی کاکە زیادم نەکەی! پیاوەتی کردووە و دەبێ بیدەمەوە. ناچار دوکانم بە تەخت و مەختەوە، جگە لە ماشینی عەکاسی سەرجەم بە حەفتا دینار فرۆشت. لە وەتاغی سەر بازاڕەکەشم گوێزتەوە، ژوورێکم لە ئوتێلێک بە دوو دینار بە کرێ گرت. ئوتێل نەبوو، عیمارەتێکی گەورە بوو، مولکی حافزێکی قورعانخوێنی سەر ڕادیۆ بوو. هەموو ژوورەکانی بە پیاوی سەڵت و ڕەبەن -کە زۆریان شۆفێر و شاگرد شۆفێری ئوتووبووسی خەت بوون- بەکرێ درابوو. دوو تەختە شاهانەکەم بردە ئەوێ؛ وریاشم کردەوە هاومەنزڵ؛ کە فەقیرە حەقی خەو نەدات!

دوکانێکی مولکی ئەوقافم لە موزایەدە بەرکەوت کە لە پەنا مزگەوتی فەزل بوو. تابلۆیەکم لێدا: «ستودیۆ سەباح»؛ مانگی چوار دیناری ئیجارە بوو. بیست و دوو دینارم لە موزایەدەکە دابوو. چی وام نەبوو. تەنانەت نەمتوانی ویترینەکەی شووشە تێ بگرم. زۆری نەبرد کارەکەم وە برەو کەوت. لە ماوەی چوار مانگدا سەد دینارەکەی کاکە زیادم بردەوە؛ گوتی من بە قەرزم نەداویەی. لە من کێشە لەو سوێند، هەتا نەوەد دیناری لێ وەرگرتمەوە چەقی ڕەشم کرد. پاییزان و زستان و جێژنان کارم باش بوو، بەلام بەهاران و هاوینان کەمم پەیدا دەکرد. ماوەیەک لە هاویندا وای لێهات بەشی نانی خۆمی لێ پەیدا نەدەبوو. ناچار چووم تا دەمەو پاییز کارێک پەیدا کەم. کاکە زیاد لە لای ڕەشید عارف سەقا -کە موهەندیسێکی کوردی ملیۆنێر و بساز-بفروش بوو- ڕۆژی بە نیو دینار دایمەزراندم کە سەرکارگەر بم. حەوتەی یەکەم گوتیان با حقووقەکەت بمێنێ. هەفتەی دووهەم لە قەراری ڕۆژێ حەوت پەنجاییم درایە. هەرچی گوتم: وا نابێ، خوا هەڵناگرێ، شێلە وا، بێلە وا، بەهرەی نەدا. گڕ-گڕ هاتمەوە سەر دوکانەکەم. تازە ئەو دوکانەم دانابوو، ڕۆژێ ئەحمەد عوسمانی هاواڵی بوخارستیم هات:

- کاکە تۆ ناوێکی چاک و پاکت هەیە. دەڵێن گوتووتە لە ڕۆمانیا سوالکەرم دیوە؛ گوتووتە ژنی داوێنپیسی لێ هەن؛ تۆ بوختانی وا بۆ دەکەی؟

- ئەحمەد گیان! هەر مەرامێک -با ئایینی عاسمانیش بێ- ئەگەر درۆی بۆ بکرێ دیارە

بەتالە و بە فلسێکم ناوێ. هەتیو! نەگبەت! پێکەوە دوو سوالکەرمان نەدیت؟ تۆ نەبووی دەتگوت زۆربەی هەوالان شەو لە مالە ژنە ڕۆمانیان ڕادەبوێرن و نایەنەوە نـاو نـوێنی خۆیـان؟! چـت پـێ بڵێم؟

- ڕاست دەکەی، بەلام نابێ خەلکی ڕەمەکی بیزانن!

سەلت بووم؛ لە دوکان نانم دەخوارد. بـەیانی و نیـوەڕۆ و شـەو دەبـوو بچمـە چێـشتخانە یـا قاوەخانە، کە ئەوەش زۆری تێدەچوو. هـیچ پەسـەندازێکم بـۆ نـەدەکرا. تـەنیا پـارەی ئەسـپاب کرینی عەکاسی و مخارجەکەم دەردینا. بە تەنیا بووم. هەر لە بەیانـەوە تـا سـەعات دە و یـازدە کارم لە ژووری تاریک و لە بەرێ کردنی موشـتەری و پـاک و خـاوێن کردنـەوە و شـتی وا بـوو. ڕۆژانە دەبوایە پتر لە شەش سەعات بە پێوە ڕاوەستم؛ زۆر ماندوو دەبووم. بەلام دلم بەوە خـۆش بوو کە لە نۆکەری و شاگردی ڕزگارم بووە و کاری خـۆم دەکـەم. کـوردێکی نەناسـیاو بـووم لـە گەڕەکێکی هەموو عەرەب و زبر. لاتوپـاتی گـەڕەک سـەر لـە هەوەلـەوە شـەڕیان بـۆ نامـەوە؛ گالتەیان پێ دەکردم و دە عەزابیان دەنام. بەلام زۆری نەبرد کە زۆر لە جیرانانم بوونە دۆسـتم و حورمەتیان دەگرتم.

بە گەپوگالتە یەکترمان دەدواند و پێکەنینمان ساز دەکرد. تابووتکەرێک دیوار بە دیوارمـەوە بوو ڕۆژێک سەیدێکی پشتکووڕ، سەری گەیبووە بەرانبەر ئەژنۆ، دەلـەرزی، داوای خێرێکـی لـێ کردم.

سەید! جلت ناوێ بۆت بکڕم؟

- ئەی خودا ڕاوەستاوت کا.

- بردمە دوکانی تابووتکەر.

- وەستا شاکر! لە حیسابی من دەستێک جل بدە بە سەید!

- فەرموو بۆ پشت دوکان هەلبژێرە!

سەید کە لە پشت دوکان چاوی بە تابووتان کەوت قیتەوە بوو؛ باوەڕ کە تاژی وا هەلنایە! لـەو بەری جادەوە ملی لە جنێودان نا: «دەتانەوێ بمرم؟!» ئای ترسی مردن!...

وەستا شاکری تابووتکەر دەستی مردووی دەبڕی! دەگەڵ مردووشـۆرێکی درێـژ و پـان ڕێـک کەوتبوو خزمی مردووی دێنا.

- وەستا! ئەوە خزمی خۆمە؛ تابووتی باشی بدەیە.

- تابووتی «ئەبوو ئەنگەر» بە شەش دینارە. ئەو پیاوە کاسبە تابووتی دەوێ.

- تابووتی «ئەبووکاسب» بە چوار دینار.

هەر تابووتەش -ئەبوو ئەنگەر و ئەبوو کاسب- چوار سەد فلسی پتر نەدەبرد.

دوای مردوو ناشتن، ڕیشە دەهاتەوە بەشە فێلی خۆی وەرگـرێ. دەبـووە شـەڕە چەقەقەیـەک نەبێتەوە. تا نیو دیناری لە شاکر دەستاند قیر سپی دەبوو.

ڕۆژێک غەنی بلووری [بلووریان]م لێ پەیدا بوو. ماوەیەک میوانم بوو. هاتوچۆی شـیووعیانی دەکرد؛ کە ئەو دەم ببوونە دوو دەستەی دژ بە یەکتر: «ئەلقاعیدە» بە سەرۆکایەتی سەلیم نـازانم چـی و «ڕایەتوشـشەغیلە» بـە سـەرۆکایەتی «جـەمال حەیـدەری» کـە کوردێـک بـوو. غـەنی کەیخودایەتی دەناودا دەکردن، پێکیان بێنێ. کە غەنی هات، وریـام لـە لا نـەمابوو. پێکـەوە لـە ژوورەکەی مندا دەژیاین. هەوەڵ ڕۆژ زۆری لۆمە کردم: بۆ هێندە پـیس و پۆخـلی؟ ژوورەکـەت

تێکـەڵ- پێکـەڵ و نامۆرەتتەبە؛ مـن دەبـێ فێـرت کـەم چـۆن بـژی! لـە پـاش حەوتەیـەک، هەڵمدەستاند: هەستە نان و چا حازرە! هەر لە سەر جێوە دەسـتی بـە خـواردن دەکـرد، دەم و چاوی نەدەشوشت!

کۆنە کوردێکی خەڵـکی «حاجیالـی کەنـدی» لای سـابلاغ، چـل سـاڵ بـوو لـە بەغـدا بـوو؛ کوردیەکەی لە بیر نەمابوو؛ عارەبیش فێر نەببوو. سەرایداری ئەو ساختومانە بوو. زمـانێکی قسە دەکرد، عیفریتم دەویست بیباتەوە سەر یەک! شـەو نـەبوو چەنـد جـار ئیجارەدارەکـان راسـتم نەکەنەوە: بە خێری خۆت وەرە ئەو کەرەمان بۆ تێبگەیەنە!

هەر من لە مام برایم تێدەگەیشتم و کەسی‌تر. ڕۆژێک سـەر بـە ژوورەکەمانـدا دەکـا و چەنـد قسەیەک دەگەڵ غەنی دەکا. غەنی تێناگا، لەپڕ بە تورکی دەڵێ: برۆ دەر! کـەری کـوری کـەر! مام برایم ڕایکردبوو. ئێوارە بە دزیەوە لە منی پرسـی: ئـەو میوانـەت وەختـابوو بمکـوژێ، ئـەوە چییە؟!

- مام برایم ئەوە شێتە و تازە لە شێتخانە دەرچووە!

- هم... م! دەمزانی!

شەوێک خەریکی دوکان داخستن بووم، غەنی هات گوتی: کوا پرێسکەکەم؟

- پرێسکەی چی؟

- چۆن؟ ئەدی ئێوارە کە سەرت بە مشتەرییە کچەکانی مەدرەسەوە گەرم بوو، نەمدایەی؟

- نازانم.

- بگەڕێ.

زۆر گەڕام؛ نەبوو. ئەو شەوە تا لای ڕۆژ هـەدادانی نـەما. بـە خـەیاڵ سـازی دابـوو: مـن بـۆم هاویشتی، یەک لەو کچانە هەڵیگرتۆتەوە. باوکی کچ مودیری پۆلیسە؛ لێی وەرگرتوە. مـەدرەکی گرینگی تێدایە؛ باسی سەرە! جار- جار بە لەپ، شەق لە ناو چاوانی خۆی دەدا، دەگریا:

- ئاخر بێ ئینساف دەسرەی پرێسکەکەش هی دەزگیرانم بوو بە یادگاری دابوومێ!

- دە ئێستا قەوماوە؛ چار چییە. قەدیمی گوتوویانە باسی قەدیم و مەلایـەتیم بـۆ مەکـە! مـن چبکەم؟

- بەری بەیانی دێن لە دوکان دەتگرن تۆش منیان نیشان دەدەی؛ لە زینداندا دەمرزێنن!

بەیانی گوتم: تۆ مەیە! خۆم دەچمە دوکان. ئەگەر پاش چارەگێک نەهاتمەوە، ئەتۆ خـۆت ون کە! بە ترس و لەرزەوە لە دوورەوە ڕوانیمە بەر دوکان، دوو کەس لەوێ ڕاوەسـتابوون. ڕاوەسـتام تا ئەوان ڕۆیشتن؛ چوومە دوکان گەسکم دەدا، تووشی پرێسکەزەرد هاتم. قامکم دەگریکـەکرد و گوتم غەنی نەمدیتەوە. زەق-زەق نیشانیشم دا؛ لە پەشێوی خۆی نەیدەدی! تا پێم گـوت و لـە خۆشیان گەشکە بوو!

جا هەر وەک هاتوچۆی گەرمی دەگەڵ کومۆنیستەکان هـەبوو، هـاتوچـۆی پـارتی و بـرایم ئەحمەدیشی دەکرد و خۆشیان دەویست. گوتی دەڕۆمەوە سابلاغ.

- کاکە! دەتناسن، دەتگرن؛ ئێرەت چاترە.

ڕۆیشت؛ لە سولەیمانییەوە بۆی نوسیبووم: کـوتێکم بـەجێ مـاوە، سـروودێکی کومۆنیـستانی دنیام دەناو قۆڵە دڕاوەکەیدا تاقەت کردووە، بۆم بنێرە! نووسیم: کۆتەکـەتم دا بـە سواڵـکەرێک. وابزانم بە دەردی پرێسکەکەت چووە! ڕەنگە ئێستا مودیری پۆلیس فێـری پۆلیـسانی بکـا! ئیتـر

هەر ئەو گەڕانەوە بوو. بیستم غەنی گیراوە و بیست و چوار ساڵ لە حەبسا مایەوە.

هەر وەک پارتی دەهاتنە لام، دەگەڵ شیووعانیش ڕێک بووم. شەو نامەی هەردووک دەستە (شیووعییەکان و بلاڤۆکی پارتی)م بۆ دەهات. جارێک جەمال حەیدەری بردمیە سەربانە قاوەخانەیەک، دڵی دامەوە کە ڕەگەڵ حیزبەکەی کەوم.

– کاکە جەمال! من کوردم. ئەوا حیزبی توودە کە ئێوە دەڵێن مامۆستامانە ددان بە مافی کوردا دەنێ؛ دە ئێوەش باسێکی ئازادی کورد بکەن تا فریو بخۆم. هەر دەفەرموون زەوی دەدەین بە وەرزێر؛ هەموو دەشتی هەولێرم دەیەی نامەوێ.

– حیزبی توودە مامۆستامانە، ڕاستە؛ بەڵام باسی بەشی کورد کردنی خەتایەکی گەورەیە. ئەمجار با بشنووسێ، درۆ دەکا و حوکمی بکەوێتە دەست بەڵێن پێک ناهێنێ.

– دە کاکە تۆش درۆم بۆ بکە!

– ئاخر بە فەرموودەی ستالین، ڕووپەڕ ئەوەندەی سەتر ئەمەندە، کورد میللەت نییە!

– برا وا من و تۆ بە کوردی قسە دەکەین، دیارە هەین و زمانێکی سەربەخۆمان هەیە. با ستالین نا، بابی لینین بڵێ، چۆن لە میللەتی کورد دەشۆرێمەوە؟... لێت بەزیاد بێ!

دوکان و ماڵەکەم جێگەی قاچاق– قوچاغان بوو. نازانم چۆن بوو کە زەبیحی ڕاو نرابوو؛ خۆی بۆ ماوەیەک لە ژوورەکەمدا شاردەوە. شەو دەیگوت: سبەی خۆم تەسلیمی پۆلیس دەکەم، چ دەبێ با ببێ. دڵی تەواو تەنگ دەکردم.

– مەلا! بۆ زیندان ئەو پرێمسە چکۆڵەی خۆتم بدەیە.

– بۆ تۆ.

– ئەو خاولییەش دەبەم.

– باشە.

– ئەسپابی ڕیش تاشینەکەشت بەرم؟

– بیبە.

سبەی زوو یەکترمان ماچ دەکرد، ئاوم دە چاو دەتزا. تا لای ئێوارە بیرم بە چارەنووسی ئەو خەریک بوو. شەو کە بە سەرکزی دەهاتمەوە، زەبیحی لە ناو دووکەڵی جغارەدا خنکاوە و چاوەکانی کسکە کسکیانە.

– مەلا! ئەمڕۆش نەچووم، سبەی دەچم!

دیسان سەرلەنوێ: فلان و فلان شتەت بۆ من باشە!

– بەڵێ بۆ تۆ!

دیسان هەر بەزمەکەی پێشوو، نەدەچوو. ڕۆژێک سمێڵی تاشیبوو، سوور وەک چەوەندەر؛ کراواتی لە خۆی دابوو.

– مەلا دەمەوێ شەپکەیەک بکرم خۆم بگۆڕم پۆلیس نەمناسێ. ها عەینەکیشم دەوێ!

– بەخوا هەر سەگێکت کەمە فیتەی بۆ لێدەی و دوات کەوێ! با بچین شەپکە بکرین.

سەرمان بە مغازەیەکی زۆر گەورەی شەپکەفرۆشیدا کرد. هەر لە سەری نا و ڕوانیە ئاوێنە و کەیفی نەیگرت، ماندووی کردبووم. شەبکەیەکی ڕەشی لە سەر نا.

– ها مەلا! چۆنم؟

– چۆنی؟ بە خودا هەر لە پیرە هەرمەنی ئیبنە دەچی!

کابرای خاوەن موغازە -کە لامان وابو عەرەبە- لە فلقەی پێکەنینی دا و جۆشی خوارد و خـاو بۆوە.

- دەی نرخی شەپکەکەت چەندە!

- کورە ئەگەر دە دینارم لە هەر شتێکی قدیلکەدەر و دڵخۆشکەر خەرج بکردایە ئەوەندە پـێ نەدەکەنیم. بە شەشسەد فلسی دەفرۆشم؛ بەڵام ئێوە چوارسەتم دەنێ.

قالەی ڕەحمەتی مەنسووری ناوی سابلاغی، شاگرد عەکاسی دەکرد؛ لەوپەڕی نەداریدا بوو. لە ئوتێل دەخەوت. هێنامە لای خۆم کە حەقی خەو نەدا و هیچ نەبێ بەرچاییش بۆ خۆی دروسـت کا.

دوکانەکەم هەموو دەستەیەکی دەهاتێ. تێگەیبوون کە من ئەمینم و خەبەر لە کـەس نـادەم. کومۆنیست، پـارتی، ئیخوانولموسـلمین، عەکـسی قاچاغیـان بـۆ مـن دێنـا. ڕۆژێـک یـەک لـەو شیووعیانە -کە نەمدەناسی- هات عەکسی گرت. جەمال قادر ناوێک هاتـە ژوور، کـابرا ڕۆیـشت گوتی: ئەوە ناوی ئیسماعیل ڕەسوولە؛ لـە کومۆنیـستە زلەکانـە؛ ماڵـی لـە فلانـە سـاختماندایە. شەرتە ئەمرۆ بە گرتنی بدەم. ئیسماعیل ڕەسووڵم دیتەوە، گوتم ئەو کورە وا دەڵـێ. ئەگـەر تـۆ ناوت ئیسماعیل ڕەسوولە خۆ بشارەوە.

- نا کاکە! ئەتوو غەرەتی. ئەمن هەو نیم، ناوم عوسێنە!

سبەی ئەو ڕۆژە پۆلیسێک هات، گوتی: شەو ئیسماعیل ڕەسوڵ گیراوە؛ تکای هەیە وێنـەکانی بە مندا بۆ بنێری!

پیاوێک لە ناو شار فیلمی دەگرت و لە دوکان بۆم چاپ دەکرد. گـوتی نـاوم ئـەبوو باسمەیـە. ئیتر وەک شاگردێکی باش کاری دەگەڵ کردم. ڕۆژێک برادەرێـک گـوتی: ئـەو پیـاوە خەتـەرە؛ مەحکووم بە ئیعدامە، ڕایکردووە. شەو پرسیم: ئەبوو باسمە وا دەڵێن. خـۆم قاچـاغ و تـۆ قاچـاغ پێم وایە وەک دەڵێن: «هێلکەکان دە یەک قەرتاڵەدا بار مەکە!» بۆی دەرکاندم کە ڕاستە. پێـک هاتین فیلمەکان بە منداڵێکدا بنێرێ و بۆ خۆی نەیە.

مـانگی ئاگوسـتی ساڵـی ١٩٥٤، ڕۆژێ لـە دوکـان ڕووتووشـی عەکـسم دەکـرد. پیرێژنێکـی ڕەواندزی -کە دەمناسی- هەر لە دەرگا هاتە ژوور، وەک ژنە عەرەبان لە هلولولوی دا، گوتی:

- مزگێنیم دەیە! مار و مندارت لۆ هاتینە؛ ئەوە لە مارێ خات شەوکەتێنە!

واقێکم بردەوە؛ تاسام. لەو دەمەدا شەش درەم (یانی شەش تمەن) نـەبێ، پـارەم لـە عـەرز و عاسمان شک نەدەبرد. ژن و منداڵ بە چـی بـەخێو کـەم؟... پیرێـژن کـە دیـتی مـات بـووم و ڕەنگێکم هێنا و برد، بێهەست و چرپە لە دوکان دەرکەوت؛ وازی لە مزگێنی ساندن نا! دوکـانم داخست و بە بارێک بیر و خەیاڵاتەوە بەرەو ماڵی خات شـەوکەت دەچـووم، لـە کـۆلان تووشـی برادرێک بووم بە ناوی حەمەی عەزە کوێری کۆنە سـابلاغی کـە لـە پـاش ڕۆیـشتنی یـەرمیا بـۆ فەلەستین لە جێگەی ئەو دەلالی بازاری دەکرد.

- ها! خێرە، پەشۆکاوی؟

- حەمە خراپ قەوماوە...

حەمە دەگەڵم گەڕاوە. چووینە بازاڕ، زیلۆ، پەتوو، قاپ و قاچاغ، هەرچی ماڵـە فـەقیرێکی پـێ ئاوەدان دەبێ بایی سیوشەش دیناری کڕی. حەنباڵ هەڵگرە!

- کاکە خۆت مەخە تەنگانە، هەر وەخت بووت ئەم قەرزەم بدەوە.

ماڵی خات شەوکەت خانووێک بوو لە ئیجارەی «محەممەدی خات زیبا» ناوێکی سابلاغی، ئامۆزای «عەبدوڕەحمانی کەیانی». خات شەوکەتی ژنی بە قسەی خۆی کۆنە بەگزادەی باجەوەند بووە. جا چونکە مێرد هیچ کارە نەبوو، ماڵ بە ناوی خاشەوکەت بوو. ژوورێکمان لێ بە کرێ گرت و سیپاڵمان بە عەرزدا دا. ناو ماڵەکەی زەمانی سەڵتیشم بە قالە بەخشی.

لە هاوینی ساڵی ١٣٢٥ هەتاویرا کە بۆ وتوویژ چوومە سەقز -کە دەبووە ساڵی ١٩٤٦- من ماڵ و منداڵی خۆم نەدیتبوو؛ خەبەریشم نەدەبیستن. مەعسوومی خێزانم کە بە جێم هێشتبوو تەمەنی هەژدەساڵان بوو. تەمەنی شێرکۆی کوڕیشم -کە ناوی کرابووە محەممەد- چوار مانگ بوو. ژن چاوەنۆڕی مێردیەتی و لە ماڵی عەبدوڵلای برام دەژی. چەند جارێک برای هاتوونە لای کە وەرە ماڵی ئێمە! نەچووە. خەریکی بەخێو کردنی کۆرپە تاقانەکەی خۆی بووە. وا لە پاش هەشت ساڵ و شتێک، بە سواری ئەسپ و دەگەڵ مامە حەمەدی حاجیاللا، گەیوەتە سولەیمانی و لەوێوە بە ترومبیل و قەتار گەیوەتە بەغدا. کوڕی چوار مانگە، نۆ ساڵەیە و باوکی ناناسێ. پاش نۆ ساڵ جودایی زۆر تاڵ، پێک شاد و شوکور بووینەوە. هەر چەند هەر پێدەکەنیم و شادیم دەنواند؛ بەڵام لە خەجاڵەتیان کزەم لە جەرگی دەهات. هەشت ساڵ ژنێکی هەژدە ساڵانە بە بێوەژنی چاوەنۆڕم بێ و منداڵێکی بێبابی لە باوەشدا بێ و سەبری کردبێ و تاوانی ئەو هەموو چارەڕەشیەش من بووبم... نەمدەزانی چۆنی دەدوێنم و چۆنی دڵخۆشی دەدەمەوە. بەڵام باش بوو، ئەو هیچ گلەی لە زەمانە و من نەبوو؛ زۆر شوکرانەبژێر بوو کە دووبارە گەیشتووینەوە یەکتر. جا با فەقیریش بین، دڵمان خۆشە و گلە لە دنیا ناکەین. نازانم لە کوێم خوێندۆتەوە، دەڵێ: «پیاوان بۆ ناو دەرکردن حەول دەدەن، ژنان بە فرمێسکی چاو نرخەکەی دەبژێرن...». بەڵێ فرمێسکی خوشک و ژنی من، نرخێکی زۆر گەورەیان بژاردبوو. ئەو نرخ بژێرە فرمێسک هەڵوەرانەش وەک سەربازی بێناو وان؛ کەس بە هیچیان ناگرێ؛ بەڵام لە ڕاستیدا پاڵەوانی گەورەی داستان هەر ئەوانن. ئەگەر کاری دنیا لە ڕووی عەدالەت بوایە، دەبوایە لە جێگەی کۆتەڵی پاڵەوانانی مێژوو، کۆتەڵی دایک و خوشک و ژنەکانیان لە مەیدانی شاراندا بەرز کردایەتەوە. بە داخەوە، کوا عەدالەت؟ کوا دواکەوتنی حەقیقەت؟!

دڵی ژن -هەر ژنێک- لە نەرمی و بەزەییدا دەریایەکی بێبنە و بۆ هیچ مەلەوانێکی بیرەوەر و شارەزا پەی نەداوە و هیچ زانایەک لام وایە وەک هەیە پەی پێ نەبردووە. ئەو کەسانە بە بڕوای من زۆر ساویلکانە و نەزانن کە بە لایانەوە کەمایەتییە باوکی کچانن و کوڕیان ئاواتە. لە سەرچاوەی بەزە و خۆشەویستی لادەدەن و دەم بە گەناوێکەوە دەنێن کە هیچ کەسی تێراو نەکردوە. لە هەزار کوڕ بە دەگمەن هەڵکەوتووە کە بابی پیری پەککەوتەی خۆی بحاوێنێتەوە و بلاوێنێتەوە. بەڵام قەت کچێک یان خوشکێکم نەدیوە کە دەربارەی کەس و کاری بێچارەی خۆی بێزاری نیشان بدا. خۆ دایک هەر باسی ناکرێ. خودای بەزەیی ئەگەر هەبێ دایکە. کە نە من، هەرچی نووسەری کارامەی دنیایە ناتوانن سەد یەکی خۆشەویستی دایک بۆ عەولاد بخەنە سەر کاغەز؛ یان بە دەم -وەک پێویستە- شی کەنەوە.

من براکانم (عەبدوڵلا و سادق) کە هەردووکیان هەمیشە زۆریان خۆش ویستووم، وەک دەڵێن برای نموونە بوون، پاش ئاوارەییم، مانگێک و دوو مانگ یادیان کردووم و دژ داماون؛ بەڵام پیاوانە خەم خواردن و گریانیان وە لا ناوە و مەردانە ملیان لە کار و خوێندن ناوەتەوە و بوونە پیاو لە ڕیزی پیاوان. خوشکم نەوەک پیاوان، وەک هەموو ژنی بە ڕەحم بۆ برای، ساتێک

لە بیری نەچووم و سالەها بۆم گریاوە و من کە نێرینەم، هەمیشە لەو فینگە و مینگە تووڕە و عاجز بووم!

وا دیارە ملم لە فەلسەفەبافی ناوە کە هیچ لە دەم و کاوێژی من ناوەشێتەوە. «چوێلەکە خۆت چی و شۆرباوت چی؟!». با باسی زبری پیاوان و بەزەیی و دلنەرمی ژنان بۆ پیاوی عاقڵ بە جێ بێڵین و بێمەوە سەر باسی ژیانە کلۆلەکەی خۆم...

پێشینیان گوتوویانە: «پیاو فەعلەیە و ژن بەننایە.» بەننا خانوو دروست دەکا. فەعلە هەر کەرستە بێنێ و کەس نەبێ بۆی لە سەر یەک دانێ، جگە لە ولات پیس کردن و تۆز بە با کردن، شتێک دەگۆڕێدا نییە. هەر بۆیەش گوتوویانە ژن و ماڵ؛ واتا: تا ژن نەبێ ماڵ نییە. ئەوە زۆر باش لە من ڕووی دا.

چەند ساڵ ئاوارەی سەڵت و ڕەبەن، ڕۆژ و شەو لە کەری بەربار ماندووتر، تێکۆشابووم؛ گەیبوومە دوکانداری؛ بەڵام هەر ئەوەندە بوو کە ڕۆژ بە ڕۆژ بیخۆم و ئاو بێنە و دەستان بشۆ. جارێکیان بیرم هاتەوە کە لە ماوەی ساڵێکی ڕەبەقدا هیچ میوەیەکم نەچێشتبوو. بەلام کە بوومە خاوەن ژن، زۆر بە پەلە وەزع گۆڕا. چارەگە کیلۆیەک گۆشت، کەمێ ڕۆن و برنج، پیالە ماستێک و نانی بازاڕ -کە سێ کەسە پێمان ڕادەبوارد- بایی ئەو تەنیا جەمەی نیوەڕۆ نەبوو کە بە سەڵتی لە چێشتخانە دەمخوارد. ئێواران کە دەهاتمەوە، میوەیەکیشم دەکڕی. دەرامەتەکەم هەر وەک جاران، ڕۆژانە لە شەش تمەن تا دە تمەن بوو؛ بەلام بەننا بە مشوورە ماڵدارەکەم وای پێک دێنا کە پەزمەندەشمان هەبێ.

سەهۆڵدانێکی تەختەم کڕی کە بۆ گەرمای بەغدا زۆر لازم بوو. وردە- وردە پانکە کۆنێک و ڕادیۆ کۆنێکم لە هەڕاجە بازاڕ کڕی و هەر وا بەرەو پێش دەچووین و ڕۆژ بە ڕۆژ تەیارتر و تێرتر دەبووین. کوڕەکەم زۆرم لێ نەبان و نامۆ بوو؛ هەر دەگریا: «دەچمەوە ماڵی خۆمان»، نیازی ماڵە مامی بوو. بە بێ من لە دایکی دەپرسی: «ئەرێ ئەو کابرایە کێیە؟!».

زۆر کوردم دیبوون -ژن و پیاو- چل ساڵ لە بەغدا ژیابوون و فێرە عارەبی نەببوون. خوایە ئەم ژنەم دەبێ بە چنگ عەرەبییەوە چۆن پێوە بێ! کەچی ساڵێکی تێ وەڕنەسوڕا، وای فێر بوو کە وەک هەموو ژنە بەغدایی دیکە بۆ خۆی دەچووە بازاڕ و کەرستەی ماڵی دەکڕی و زەحمەتی بازاڕ چوونی هەموو ڕۆژەی لە کۆڵ من کردەوە.

- دەی وەرە دەرس بخوێنە!

- حای! تازە بە سەری پیری؟!

بە هەزار چەقەقە و پاڕانەوە لە چەند شەودا جارێک دەرسێکی لە لا دەخوێندم. کەچی بەو هەموو بێزاری لە خوێندنیشەوە فێری کوردی خوێندنەوە بوو. محەممەد لە سابلاغ دەبەر خوێندن نرابوو؛ بە ڕواڵەت پۆلی یەکەمی تەواو کردبوو؛ بەلام هەر دەتگوت خۆمم بە منداڵی: گێل و نازیرەک! تەنانەت حرووفیشی نەدەناسی. وام کرد حرووف بناسێ؛ لێکیان دا؛ وشەی کوردی وەخوێنێ. چیرۆکی قۆڕی منداڵانەی سەیرم بۆ دەنووسی؛ لەویش چاوی کرایەوە.

لە بیرمە جارێک دەستی بۆ ڕادیۆکە برد. دایکی دەستی گرت.

- ڕۆڵە گیان! بابت ئەو هەموو ڕەنجە دەدا، نەوەک ڕادیۆکە بشکێ؛ بۆی ناکڕدرێتەوە!

- لێی گەڕێ بیشیشکێنێ خەم نییە، پەیدا هەر دەکەمەوە...

- کەسێ لە کوێستانەوە بگاتە بەغدایە و نەخوازا هاوین بێ، واوەیلایە. مەعسووم لە گەرمان

وەک بەچکە چوێلەکەی سوورەساقە هەر دەمی پێک دادەدا؛ زۆرم بەزە پێدا دەهات. سالی دوایی دەگەڵ مالی عەبدوللا عەلی کانیمارانی، هاوین چووینە شەقلاوە. باغێکمان بە ناوی «کانی گرووو» بە میوەوە بە چاردە دینار گرت و خۆمان لە گەرما دزیەوە. دوایی بە گەرماشی عادەت کرد و دەیگوت مالە خۆم بە جێ نایەلم. لە هاوینی ١٩٥٥دا مندالێکیترمان لە شەقلاوە هاتە دنیا. ناومان لێ نا «ئاگری» کە ئێستا ناوی مستەفایە.

چەندێک لە مالە شەوکەت ماینەوە. یەحیا چرووستانییەکەی گوتم دەگەڵ حەمە رەشیدخان، لە بەغدا (ئیمام تابوور)، بە زاوابەندی لەوێ دەژیا. رۆژێک چاوی بە کتێبی «دایک» نووسراوی «ماکسیم گورکی» کەوتبوو، لێم کەوتبووە پرتە و بۆلە.

مالم گوێزتەوە. دەگەڵ وریا عەلی -کە ئەودەم ژنی هێنابوو- مالێکمان لە «فەزووت عەرەب» گرت. سیلەکەم لێی هەلدامەوە؛ لە بیمارستانی «تویسەی» رۆژهەلاتی بەغدا کەوتم. بیمارستان دوو نهۆم بوو. پتر لە دە سالۆنی درێژی بۆ نەخۆشان تێدابوو؛ کە ناویان بە عارەبی «قاوش»ە. هەر قاوشەی بیست تەختی تێدابوو. دەرمان و خواردنی باش بوو. تەنیا فەرقی دەگەڵ لوبنان ئەوە بوو ناویان نەدەگوت؛ ژمارەی تەختیان بانگ دەکرد: «ژمارە نۆ دەگەڵ ژمارە شەش وەرن». کتێبێکم خوێندەوە: «یادداشتی کەروێشک». کەروێشکەش فەرمووبووی لە ناو کەشتیدا حەیوان نەماین. بووینە ژمارە و لە سەر پشتمان نوسرابوو. نەخۆشەکانی هاوقاوشم تێگەیاند، پەسندیان کرد کە یەکتریش بە ژمارە ناوبەرین. ئیتر تا لەوێ بووم «عەزیز» ببوە ژمارە نۆ. جگە لە خوێندنەوە، بێسەوادە عەرەبەکانم دەرس دەدا؛ دوانیانم فێرە خوێندنەوە کرد.

گوتیان مەلایەکی کورد لە نهۆمی دوو نەخۆشە.

- مامۆستا منیش کوردم، ئەگەر کارێکت پێم هەبێ.

- برا دامە دەزانی؟

- کەم تا کورتێک.

وردە بەرد و تەختە دامەی لە تاقەی پشت سەری هێنا.

- تۆ کەیفت بە شیعری کوردی دێت؟

- بەلێ نالیم زۆر خۆش دەوێ.

- ئۆخەی من لە یەکی وەک تۆ دەگەڕام!

نالییەکی بە خەتی لە بن سەنیر دەرێنا. ئەو پیاوە چل سال بوو خەریکی ساغ کردنەوەی شیعری نالی ببوو؛ حاشیەی زۆری لێ نوسیبوون. بە راستی لە ناو نالیزاناندا وێنەم نەدیوە. هەموو رۆژ دەچووینە قوژبنێک و بە نالییەوە خەریک بووین. ناوی «مەلا محەممەدی چروستانی» و باوکی یەحیاکە بو. نالییەکی ئەوم بە خەتی خۆم نووسییەوە؛ بە داخەوە پاشان لێم دزرا.

زۆر لە برادەران دەهاتنە سەردانم. رۆژێک مەلا شوکور -کە ئەودەم ببوە دەبیر و کەیفی ساز بوو- گوتی: حیزبی پارتی گوتوویانە سێ دینار بدە! باربووی هەژار دەکەین؛ گوتوومە با لە خۆی پرسم. زانیم دەیەوێ منەتبارم کا.

- نا مەلا گیان! نەکەی بیاندەیەی! دلیم خۆش کرد.

لەو نەخۆشییەم مندالەکانم ناچار بوون مالیان گوێستبۆوە مالە خزمی ئاشنایەکم کە محەممەدی ئیمامی بوو. ژوورێکیان بە کرێ گرتبوو لە ئەحمەد ناوێک. مالەکە لەو پەڕی بەغدا

و نزیک مزگەوت و گۆڕی شێخ عومەر بوو؛ نزیک باتلاغێک. شەوانە لەبەر دەنگی بۆق گوێت لە دەنگی هیچ نەدەبوو. مێش و مێشوولەش باسی ناکرێ. قوڕی کۆلانیش ورچی لێ دەچەقێ. لە بیمارستانەوە هاتمەوە ئەو ماڵە. لە دوکانەکەمەوە زۆر دوور بوو؛ ژوورێکم لە نزیکتر گرت. شەش یا حەوت ماڵی دیکەش لەو حەسارەدا بوون. بە ڕۆژ چەققە و هەرای ژنان و بە شەو دەنگی حەوت ڕادیۆی بلیند تا سەعات دووی شەو. خەوی چی؟ ئیستراحەت کوا؟ سەگیش دەژیا و منیش دەژیام... لەوێوە هاوین چووینەوە شەقلاوە و ئیتر هەر ئەو دەمەو هاوینە دیسان لێم شێوا و سەرگەردانی ملی گرتمەوە.

تازە ماڵ و منداڵەکانم هاتبوون، جەلال بێتووشی کۆنە شەریکم لە حەبس ئازاد کرا و لە کار دەگەڕا. گوتم: هەروەک شەریک بووین، ئێستاش شەریکین. هیچم لێت ناوێ و بە شەریکی کار دەکەین. جا کە چووینە شەقلاوە، ئەویش دەگەڵمان هات و بەدەم هاوینە هەوارەوە عەکاسیشمان دەکرد.

زەبیحی و قزلجی لە «مەحەللاتی عەبدوللا شەریف» گیران و خرانە گرتووخانە. زوو ئیقراریان کردبوو کە ئێرانین؛ ئیتر عەبدوللا شەریف نەیتوانی بەریان دا. نزیک ساڵێک مانەوە و ئاغاکەیان زۆر مەردانە یاریدەی دەدان. دایاننەوە دەست ئێران؛ کە ئەم چیرۆکەش ناخۆش نییە:

سەردەمێک کە من شاگردی وەستا برایم بووم، قزلجیش هاتوچۆی عەکاسییەکەی دەکرد و فێری ڕتووش و وردەکاریتر ببوو. ڕۆژێک سەیدێکی جحێلی کەواشۆڕ، لە دوکانی وەستا ڕووی دە ئێمە کرد: برا من ناوم سەید ئیبراهیمی... نازانم چییە (لە بیرم چۆتەوە). ئەگەر دنیا بوو ڕێگەتان کەوتە قەسری شیرین، سەرم لێ بدەن. لە هەر کەس بپرسن دەمناسێ. عیراقی لە خانقینەوە داویانن بە پۆلیسی ئێرانی و ڕەسیدیان وەرگرتووە. لەو ساڵە حەبس و زۆر لێ پرسینەدا، ناو تێکەڵاو بوون. زەبیحی کە ناوی ڕواڵەتی «قادرە سوور» و لە پاش گیران گوتوویە عەبدوڕەحمانی حەمەدەمینم، ناوەکە بۆتە «حەمەدەمینی قالەسووری»! «سەعید ڕەحیم»ەکەی قزلجیش -کە دوایە بۆتەوە «حەسەن عەلی»- بۆتە «عەلیڕەحیمی سەعیدی»! ئەم ناوانەش وەک دوو گوناحباری سیاسی لە دەفتەری سنووروانانی ئێرانیدا نییە. ئەوانیش وەک ئەو هەموو بۆیاغچییانە حیساب کراون کە لە پەستا عیراقی دەیاندەنەوە بە ئێران. ئەوەشمان لە بیر نەچێ لەو چەند ساڵەدا زەبیحی و من زۆر باش فێرە عارەبی ببووین؛ بەڵام قزلجی -هەرچەند مەلا بوو، عەرەبی ناو کتێبی زۆر باش دەزانی- ئێستا و ئێستایش وەک لازمە فێری عەرەبی بەغدایی نەبوو کە نەبوو! ئەگەر قسەی دەکرد دەتگوت پیرەمەلای عەجەمە و لە سەر مینبەر ڕەوزەخوانی دەکا! زۆر جار جوابی عەرەبانی بە کوردی دەداوە!

زەبیحی کوتی ئەو ڕۆژە کە دایانینەوە بە ئێران، سەرهەنگێکی زۆر بێشەرمی قسەقوت بازجویی لێ دەکردین. بە منی گوت: ئێوە چکاریکتان کردووە کە دەوڵەتی هاوسامانتان تووڕە کردووە؟

- جەناب! ئێمە دەسفرۆشی ناو بازاڕ بووین؛ بێخەتاین.

- باشە ئاقای سەعیدی تۆ قسە بکە.

- نەعەم؟!

سەرهەنگ هەر نەعەمی بیست، ڕاستەوە بوو، چەقەنەی لێ دەدا و قنگی بادەدا:

- قەن نەئەم! ئاغای ئێرانی، ئەم نەئەمەت لە کوێ هێناوە؟!

- کاکه قزلجی گیان! تۆ به کوردی جوابی عارەب دەدەیەوە؛ چۆن بوو لێره عەرەبیت هەستاوه که گاڵتەمان پێ بکەن؟!
دەیانبەنه قەسری شیرین و دەیانخەنه گرتووخانەوە. ناوی سەیدەکەیان بیر دەکەوێتەوە. لە پاسەوانێک دەپرسن: سەید فلانی دەناسی؟ پاسەوان کڕنۆشێک دەبا و دەچێ بانگی ئەفسەرێک دەکا. ئەفسەر دەڵێ: بۆ چیتانه؟
- خزممانه!
- ئێمه خاک بەر پێی ئاغاین، فەرموون بتانبەم.
سەید که تۆمەز شێخی ئەهلی حەقه و زۆربەی خەڵکی شار مریدیەتی، دەڵێ: بەڵێ خزمی منن. شێویان دەداتێ و ئەفسەر ڕادەسپێرێ که زۆری ئاگا لێ بن و دێنەوە گرتووخانە. بەیانی ئەو ڕۆژه دەیانهێننه کرماشان.
- کوێتان دەوێ بتانبەین؟ ئازادن!
- له کرماشان دەمێنینەوە؛ خواحافیز!
به جووته دێنه تاران. دەچنه ماڵی عەولاغای ئێلخانیزاده که پوورزای قزلجیه و زۆر نزیکه له دیوان. عەولاغا دەڵێ عیلاجتان نایه. بڕۆن خۆ بشارنەوە. قزلجی بەرەو کرماشان بۆ لای سەعیدی حافیدی ئامۆزای که «مودەعیلعام» بوو دەڕوا. زەبیحیش دەچێته گوندی شێخ موعتەسەمی شێخ حیسامەددین، له نزیک سنه؛ دەگەڵ سۆفیەکی شێخدا دێتەوە سنووری عیراق؛ دێتەوە شاری سولەیمانی. زەبیحی گوتی: له سەر جادەی کن هەڵەبجه دەستم بۆ جیپێک هەڵێنا، سواری کردم. پۆلیسی ڕێگه لێم وەشک کەوت؛ پرسی ئەوه کێیه؟ شۆفێر گوتی برامه.
- درۆ دەکەی!
- هەر سێک تەلاقەم کەوتبێ برامه و دەیبەمه سولەیمانی.
نەجاتمان بوو. کابرای شۆفێر گوتی: ئەگەر پرسیبای ناوی چییه، چم بگوتایە؟ خۆ هێشتا ناوت نازانم! له سولەیمانی له هەوەڵ کۆلان خۆم به ماڵێکدا کرد:
- خوشکم میوان ڕادەگرن؟
- سەر چاوان فەرموو.
پیاوەکه شەو هاتەوە. تێگەیشت قاچاغم. دەستێ ڕانک و چۆغه و پشتێند و پێچی دامێ. بەیانی وانێتێک هاته بەر دەرکه، ڕایسپارد ئەم کوڕەم بۆ دەگەیەنیه ئەو جێ که خۆی دەڵێ، نابێ بشگیرێ. تا دەشتی کەرکووکی هێنام و بەڕێم کردەوە.
- سەر و کەللەی زەبیحی له بەغدا پەیدا بوو:
- کاکه! هەموو پۆلیسی بەغدا ناسیویانم تەگبیر چییه؟
- بچۆ سووریه لای ئاشنای من!
نامەم بۆ ماڵه حاجۆ نووسی. له سەر بیری زەبیحی دەرەجەی دووی قەتار گیرا که دەیگوت به هی دەولەمەندانی دەزانن و بێشکتره. زەبیحی گەییه مووسڵ و خۆی گەیانده سووریه و له ماڵه حاجۆ دامەزرا. پێناسی مردوویکی به ناو عیسا عەرەفات پەیدا کرد و خۆی گەیانده شام.
ڕۆژێک گوتیان وەستا برایم گیراوە. من و جەلالی شەریکم بڕیارمان دا هەر شەوه یەکێکمان بچینه ماڵی، چییان ویست پێکی بێنین و له پووڵ پەکیان نەخەین. شەوی هەوەڵ جەلال چوو،

نەهاتەوە. ئەویشیان لە کۆڵانەکەدا گرتبوو. ئێستایش نازانم بە چۆن ترس و لەرزێکەوە، هەر شەو بە فیلێک خۆم بە ماڵدا دەکرد. لە بیرمە جارێـک بـە کابرایـەک کـە بـە پۆلیـسم دەزانی و لـە کۆڵانەکە بوو گوت: برا من شاگردی ئەو وەستایە بووم دوو ساڵ پێش. ئـەم سـەگبابە، دەکـەم-ناکەم حەقەکەم ناداتێ. گوتی: بۆ خۆی شیووعی بـوو گـیراوە. بچـۆ بەڵـکو ژنەکـەی پوولـێکت بداتێ! لە جەنگەی ئەو ترس و لەرزەدا، کابرایەک هاتە بەر دوکان بە فارسی پرسی: ئێرە ستودیو سەباح؟ بە عەرەبی گوتم تێت ناگەم. هەر چاوم دەگێڕا لە کوێوە هەڵێم. ئاخری دانیشت:

گوتم: تۆ چی؟

– ئاغا من ئێرانیم. «غەنی» ڕایسپاردووم تۆ بمبەیە لای حیزبی پارتی!

دەک سندانت لە سەری دا غەنی بـۆ دیـاری بـۆت نـاردووم! شـەو، سـەرەڕای ماڵـی وەسـتا، ئەویشم لە حەساری کازمینەوە بردە ماڵی نووری شاوەیس.

ڕۆژێک دوو پۆلیس لە دوکانەوە بردیانمە پۆستی ئیمام تەها، لای ئەفسەرێک. کابرایەک زۆڕ-زۆڕ دەگریا. ئەفسەر عەکسێکی نیشاندام:

– دەیناسی؟

– بەڵێ.

– ناوی چییە؟

– فلان!

– ماڵی لە کوێیە؟

– نازانم

– بۆ دەیناسی و نازانی ماڵی لە کوێیە؟

– من عەکاسم؛ ناوی مشتەری دەنووسم؛ ناڵێم ماڵت لە کوێیە. ئەو عەرەبێک و من کوردێـک، کارم بە ماڵی چییە؟

کابرا گریا و گوتی: درۆ دەکا باشی دەناسێ، دەنگ ناکا!

ئەفسەر گوتی: ئەوە کوردە، وەک ئێوە حیز نییە ڕاستی بە دەمدا نەیە. بڕۆ خواحافیزت.

لە دەرکەی ژوورەکەی هاتمە دەر و کردیانمە تەویلەیەکەوە پتـر لـە حـەفتا کەسـی تێـدابوو. هەی دایکتـان چـاک، بابتـان چـاک، نـەخێر بـەهرەی نـەدا. خواوراسـتان ئەفـسەر سـەری بـە تەویلەکەدا کرد و بەرەلای کردم. دیتم کوردێکی خانەقەینییە.

کابرایەکم دەناسی خەڵکی سولەیمانی بـە نـاوی «مـەلا عـەلی کولتەپـەیی» دەیگـوت کۆنـە ئێرانیم. جحێڵێکی چاو برۆ و سمێڵڕەشی بە شان و باهۆ، زیـرەک و خـوێنشـیرین، کارمەنـدی ئیدارەی ڕێوبان چاکردن بوو. نزیکترین هەواڵی زەبیحی و قزلجی و من بوو. ڕۆژێک لە دوکان هاتە لام: کاکە! دوو ڕۆژ پێشتر خەبـەرم دا بـە قزلـجی و زەبیحـی کـە هەڵـێن، دەتـانگرن، بـە قسەیان نەکردم. ئەمشەو لە قەتار پۆلیسێکی سـیرپریم دی؛ سەرخۆشـم کـرد؛ پـێم درکانـد کـە فەرمانی گرتنی تۆی پێیە. تۆ دوو ڕۆژ مەیە دوکان! لە دوکان خۆم دزیەوە. ڕۆژی پاشتر پـۆلیس هاتبوو لێم گەڕابوو؛ دوکان داخرابوو؛ جیران دوکان بۆیان گێڕامەوە. دەبوو هەڵێم. خۆم گەیانـدە ماڵی عەبدوڵا شەریف، گوتیان ئاغا خەوتووە؛ لەپڕ هاتە دەر. بۆم گێڕاوە و گوتم: چـۆن بـڕۆم بـۆ سووریا؟ زۆری حەول دا کە دەتنێرمە هاوینەهەواری سەلاحەددین؛ بە سەر کافـە ڕسـتورانەکەی ڕابگە؛ قبووڵم نەکرد. بە یەکێکیی گوت حەفتا دیناری بـۆ بێنـە! نەمویـست. کـارتێکی دەرێنـا،

سادە؛ تەنیا ناوی خۆی پێوە بوو. هیچی لێ نەنووسی: ها! لە مووسڵ ئەم کارتە بدە بە «حەسەن تۆحەلە». جەلال حەوت دیناری لە دەخلی دوکان دامێ و ئەنگوستیلەیەکی زێڕی قامکی خۆی دە قامکم کرد کە ئەگەر پەکت کەوت بیفرۆشە. بەڕێی کەرکووکدا هاتمە شەقلاوە؛ کە منداڵەکانم لەوێ بوون. عەبدوڵلا عەلی و عومەر دەبابە -کە لە حیزبی پارتیدا زۆر گرینگ بوون- گوتیان: خەمت نەبێ! حیزب مانگێ دوازدە دینار دەدا بە منداڵەکانت، تا خوا ڕوحمێک دەکا. عەبدوڵلا قەولی دا کە وەک برایەکی عەزیز منداڵەکانم لەماڵەخۆی چاوەدێری بکا و هەست بە بێکەسی نەکەن.

لە شەقلاوەوە چوومە مووسڵ. حەسەن تۆحەلەم دیتەوە؛ لە دەوڵەمەندە هەرە زلەکان. کارتەکەم دایە، گوتی: عەبدوڵلا شەریف زۆر زیرەکە، دەیەوێ هەموو کومۆنیستەکان لە عیراق وەدەر نێ و لە شەڕیان خەلاسی بێت.

- من شیووعی نیم.

- من دەزانم، تا ئێستا پتر لە بیست کەس وەک تۆی بە مندا ناردۆتە سووریە.

تەلەفۆنی هەڵگرت: شێخ شەعلان! یەکێکم هەیە سبەی دەیگەیێنیە کۆمباینەکانی من! نابێ کەسیش بیگرێ. گوتی: ئەمشەو میوانم بە!

- دەچمە ئوتێل.

دەسا سبەی سەعات هەشت وەرە دەفتەرەکەم.

سەعات هەشت و چارەگ ماشینێکی ڕەنگ شەرابی تازە کووره لە دەرگا ویستا. شێخ عەرەبێکی عەگال بە سەر، بانگی کردم: سوار بە! بەرەو سووریە وەڕێ کەوت. بە کن چاخانەی کەسکدا هاتین. پۆلیسەکانی پێشوو گرتبوویانم لە ڕێ ڕیز ببوون و کڕنووشیان بۆ ترومبیلی شێخ کرد. گەیشتینە ڕەشماڵی شێخ؛ نیوەڕۆژم خوارد. بە قولەڕەشەیەکی گوت بە ماشینی من بیبە بنکەی کۆمباینی تۆحەلە. تۆحەلە عیراقی بوو؛ دروێنەی خەڵکی سووریای دەکرد. ئەرمەنییەک وەکیلی بوو، تەحویلی وەرگرتم. چەند کرێکارێکی دروێنە و کۆمباین لەوێ بوون کە چواریان کورد بوون. شەو لە سەحرا مامەوە. هێشتا نانی شیو نەخورابوو، لەپڕ بوو بە شەڕی کرێکاران.

- لەسەر چی شەڕ دەکەن؟

- ئای ئەو سەگبابە نوێژ دەکا؛ یانی ها من لە ئێوە چاکترم! بە خوا دەبێ نوێژی لە بیر بەرینەوە! سبەی بەیانی شۆفێرێکی ئەرمەنی بەناو گەنمانندا، بە بێ ڕێ بردمیە «تربەسپی». ترسی ڕێگە بە سەر چوو. چوومە دیوەخانی حاجۆ. قاوەچییەک لەوێ بوو. بە کوردی خۆمانە پرسیم: کێ لە ماڵە؟ کەی دەتوانم حەسەناغا ببینم؟ زۆر لەسەرخۆ گوتی: ئەز بعەرەبی نزانم!

ئەو ڕۆژە پێنجشەمە بوو. شەوی جومعە هیچ، بەیانی ڕۆژی شەمە بە چەقەقە و هەرا و خرمەی لاقان وە خەبەر هاتم. هەر کەس پارچە چەکێکی ژەنگاویشی هەبوو لە بن عەرزی دەرێنابوو، بەرەو چیا ڕای‌دەکرد.

- خەبەر چییە؟

- قاچاغچی بە پەزی قاچاغەوە لە زەمینی تورکیا دەرچوون و جەندرمە بۆی نەگیراون. هاتوون مەڕی دیرۆنێ (گوندێکی سووریا) بەرن کە مولکی یووسفی حاجۆی برای حەسەناغایە. تەنیا تفەنگێکی هەبووە. تەقەی لە جەندرمەی تورک کردووە، چوار جەندرمە و ئەفسەرێکی کوشتووە و تورک هەلاتوون. دەترسێن بە هێزی زۆرەوە بێنەوە. دەچینە یاریدەی یووسف.



جەمیل حاجۆ کە برای حەسەناغا و کاری ڕەعیەتی لە مل بوو، دەگەڵ یەکێکدا هەرا و چەققەیەکیان بوو مەپرسە. جەمیلاغا گوتی: سەیدا (یانی مامۆستا) بڕوانە ئەم هەتیوە تووتووی چوێلەکەکوژی هێناوە -کە گوللەی بیست میتر بڕ ناکا- دەڵێ دەچمە شەڕی تورکان! وا دەبێ؟

گوتم: برا تورکی دەزانی؟

- چۆن نازانم؟ دوو ساڵ سەربازی تورکان بووم.

- جا کە وایە لە سەنگەردا بانگ بکە: هەوالی جەندرمە! تۆزێک ماریفەتت بێ! وەرە بەردەمم تا چوێلەکەکوژێکت پێوە نێم!

کابرا گوتی: بزانە سەیدا چۆنی خەت کێشا؟! وای گوت و بێئاوڕدانەوە ڕایکرد. چووینە جەبهەکە. پۆلیسی سووریش هاتن. ئەفسەرەکەیان بە پاڕانەوە گوتی: ئێمە خاوەن ماڵ و منداڵین؛ حەیفە بکوژرێین. چەکەکانمان لێ وەرگرن! ئێمەش بەرنە ماڵێک. خوا گەیاندی، بوونە خاوەنی بیستویەک تفەنگ. بەلام شەڕ نەکرایەوە و بە کەیخودایەتی مەعموورانی سنوور داکوژا.

لە پەنا دیوەخانی ماڵە حاجۆ وەتاغێکم بۆ تەرخان کرا. ساڵێک مامەوە. لە ماڵ و منداڵم هیچ خەبەرم نەبوو، حاجی مەلا ساڵحێکیان ڕاسپارد کە منداڵەکانم بۆ بێنێ. مەلا لە بەغدا دیبوونیەوە و هێنابوونیە مووسڵ و لەوێوە بە قاچاغ بۆ سووریە. لە ڕێگە، شەو پۆلیس تفەنگیان پێوە نابوون؛ بەلام دەرباز ببوون. بە ناو عەشیرەتی کۆچەردا تێپەڕیبوو؛ کە مەعسووم گۆتەنی: ژنەکانیان عەگالیان بە سەرەوە بوو!

کە من سووریا و ماڵ لە بەغدا بوو، وەهابی بلووری و مینەی شەرەفی هاتبونە بەغدا و لە منیان پرسیبوو. وەباڵ بەستۆی خەڵک، گوتیان لە لایەن ئێرانیانەوە هاتبوون بتبیننەوە! لە زەمانی قاسمدا نامەیەکی شەرەفیم بۆ هات. سوێندی خواردبوو کە لەو تۆمەتە دوورە و پاکانەی خۆی کردبوو. جارێک مەعسووم گوتی: بە منداڵی بیستوومە کابرایەک چەند ساڵ دیار نەبووە، گەیبووە وڵاتی شەیتانپەرستان؛ ئەرێ لە کوێیە؟ گوتم: ئێمە سێ ڕۆژە ڕێ وڵاتی شەیتانپەرستانمان بەجێ هێشتووە!

ڕۆژێک زۆر بە سەبرۆکە پرسی: ئەرێ ئێمە تا کەی ماڵەوماڵ و ئاوارە دەبین؟ گوتم: تۆ چاوت بەرەوژوور دەڕوانێ. لە ماڵە دۆمان بڕوانە! هەر حەوتەی لە دێیەکن، زۆریش بە ژیانی خۆیان ڕازین. وەبزانە ماڵە دۆمین... ئیتر نەمدیتەوە هەرگیز گلە لە بەختی خۆی بکا.

لەم بەینەدا من لە وەڕەزیان چووبوومە شاری قامیشلی، وەتاغێکم گرتبوو. سووکە ناوماڵێکم بۆ پیاوێکی ڕەبەن هەبوو. ئێوارەیەک کوڕێکی ماڵە حاجۆ هات: هەستە ماڵت بپێچەوە! ماڵ و منداڵت هاتوون و لە ماڵە محێدین حاجۆن. چۆن ماڵێک؟ دایک و دوو منداڵ وەک خۆ ماون. بەلام ماڵ؟ کوا ماڵ! هەرچی هاتبوو باری کەرێک نەدەبوو! بیستمەوە کە دەگەڵ عەبدوللا عەلی برای عەزیز گەڕاونەوە؛ عەبدوللا ئەسپابی ماڵە خۆی جێبەجێ کردووە و ناوماڵەکەی ئێمەی لە حەسار هەڵڕشتووە.

- کاکە! ئەدی ئێمە؟

- دەتوانن چاوە خانوویێک بۆ خۆتان پەیدا کەن!

چاری ناچار پەنایان بە کاک محەممەدی ئیمامی بردووە. لە حەسارێکدا -کە خۆی ئیجارەی کردووە و سێ وەتاغە- خۆی و ژنەکەی وەک خوشکی دایک و بابی لە مەعسووم ئاگادارییان

کردووه و چاویان له منداڵه‌کان بووه. کاک محه‌ممه‌د له زه‌مانی عوورووسی هه‌وه‌ڵیه‌وه که‌وتبووه وڵاتی تورکان. جه‌ندرمه‌یی، قاوه‌چییه‌تی، فه‌عله‌یی و زۆر کاری دیکه‌ی فه‌قیرانه‌ی کردووه. له شۆڕشی شێخ مه‌حموودا به‌شدار بووه. بۆته کرێکار له به‌نزین‌خانه و بازخرید کراوه و دوکانی داناوه و دوکان دزراوه و له‌وپه‌ڕی ده‌سته‌نگیدایه؛ به‌ڵام له پیاوه‌تی و شه‌ره‌ف زۆر بالایه و که‌متر وێنه‌ی دیتراوه. وابزانم شکسپیر ده‌ڵێ: «ئه‌ی شه‌ره‌ف! تۆش وه‌ک پێغه‌مبه‌ران هه‌ر له جێگه‌ی نه‌وی و کۆخی وێرانه‌دا ده‌ژی!». ژنه‌که‌یشی خه‌ڵکی «خه‌فته‌خاری» ده‌وری که‌رکووک بوو؛ به بێوه‌ژنی مێردی به ئیمامی کردبوو. دوو منداڵی له مێردی پێشوو هه‌بوو؛ ئیمامی به‌خێوی ده‌کردن. ناوی ژنه‌که «به‌هیه» بوو؛ پێیان ده‌گوت «دایکی که‌ریم».

دایکی که‌ریم، مسته‌فای وه‌ک عه‌ولادی خۆی و زیاتریش ده‌زانی. کاتێ ئیمامی له‌به‌ر کرێ‌گرانی و ده‌سته‌نگی له خانووه‌که‌ی گوێستبۆوه، منداڵی منیشی بردبووه ماڵی تازه به کرێ‌گیراو، له وه‌تاغێک دایمه‌زراندوون که هه‌میشه ئاگای لێ بن.

- ئه‌دی حیزبی پارتی و دوازده دیناری؟!

- پارتی چی و دیناری چی؟! ته‌نانه‌ت نه‌یانزانیوه له کوێین و چمان به سه‌ر هاتووه! له‌م ساڵه‌دا، ورده- ورده ناو ماڵمان فرۆشتووه و ژیانێکی نه‌مرنه‌ژی گوزه‌راندوومانه و ئه‌وه‌نده‌مان ماوه که هێناومانه...

له ناو گوندی تربه‌سپی -که نیمچه شارۆکه‌یه‌ک بوو- ژوورێکمان له ماڵه کلدانییه‌ک به‌کرێ گرت و حه‌سیر- مه‌سیرمان لێ ڕاخست و دیسان لێک کۆبووینه‌وه. مسته‌فام -که هاته سووریا دوو ساڵانه بوو- تا ماوه‌یه‌کی زۆر ناوی مامه محه‌ممه‌د و دایکی که‌ریمی هه‌ر له سه‌ر زمان بوو. محه‌ممه‌دی کوڕم -که له سابلاغه‌وه هات و له ماڵ ده‌رسم پێ ده‌گوت- پاییزی ساڵی ئاینده بردمه مه‌درسه. ئه‌زموویان، له کلاسی سێهه‌می سه‌ره‌تایی قبووڵ کرا. که هاته سووریا، له کلاسی چوار دامه‌زرا و ساڵی‌تر پێنجی ته‌واو کرد که له جێگه‌ی پێنج و شه‌شی عیراق بوو.

ماڵه‌که‌مان زۆر ڕووت بوو. هه‌ر حه‌سیری لێ ڕاخرابوو. جۆلایه‌کمان دیته‌وه جله کۆنی بۆ ڕیشاڵ ڕیشاڵ که‌ین و به ته‌شی بۆی باده‌ین، میتری به لیره‌یه‌کی سووری ده‌یته‌نێ. کۆنه پاتۆڵ و کراس و هه‌ر جۆره کۆنه‌یه‌کمان باریک دادڕی و جۆلا دوو به‌ڕه‌ی میتر له میترونیودا بۆ ته‌نین. سه‌کۆیه‌کی ده‌وراند‌ه‌ور له وه‌تاغه‌که‌مان بوو، له سه‌ر وێم ڕاخستن. گوتم: «جێگه‌ی میوانه جێ گه‌وره‌کانه!» به‌ڵام ئه‌وه‌ی خراپ بوو که داوه‌کانمان ده‌ناسییه‌وه: «ئه‌وه داوی پاتۆڵی خۆمه! ئه‌وه هی کراسی تۆیه! ئه‌وه و ئه‌وه و...».

نان گه‌نم و پێخۆر ساواره. مه‌عسووم قۆڵی لێ هه‌ڵماڵی و به ته‌ندوور نانی ده‌کرد. هه‌رگیز له‌وێ برسی نه‌بووین. گه‌نم له ماڵه حاجۆ بۆمان ده‌هات و ئه‌وان خۆیان به بێ‌ئه‌وه به من بڵێن به زه‌کاتیان حیساب ده‌کرد. شه‌وانه وه‌ک هه‌موو خه‌ڵکی گوند ده‌چوومه دیوه‌خانی ئاغا. چه‌قه و هه‌رای گوندیان، قسه‌ی قۆڕ و لابه‌لا. هه‌رچی ئه‌بیستراوه ده‌تبیست. ده پێشدا لام وابوو ئاغا هه‌موو وه‌ک ئه‌وانه‌ی موکوریانن؛ به‌ڵام خراپی تێگه‌یبووم ماڵه حاجۆ ڕه‌ئیسی عاشیره‌تی هه‌وێرکان بوون که گه‌وره‌تر عه‌شیره‌تی ده‌وری سعێرت و میدیادن. به شێکی زۆر ده‌گه‌ڵ حاجۆ ئاغا له چنگ تورکان هه‌ڵاتوون و له جزیره‌ی «ئیبن عومه‌ر» -نێوانی ده‌جله و فورات- گیرساونه‌وه. دێمه‌کار و ده‌شتی زۆریان داونێ؛ چه‌ند گوندێکیان ئاوه‌دان کردۆته‌وه و نیشته‌جێ بوون. به‌شی هه‌ره زۆریان له تورکیان. هه‌موویان موسوڵمان نین؛ یه‌زیدی هه‌وێرکیش زۆرن.

حاجۆ ئاغا لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیراندا بێتەرەف بووە و هێندێکیش یاریدەی تورکانی کردووە. بەلام تورکیا لە پاش شکستی شێخ سەعید و هەوالانی، بە ئاغاوەتی کوردەوە گەڕاوە، زۆری ئیعدام کردوون و زۆری لە شوێنی خۆیان کۆچ داون. حاجۆ ئاغای بێتەرەفیش گیراوە و لە زیندانی نوسەیبین خزێنراوە. دادگای تورکان گوتوویانە: تۆ یەزیدی و شەیتان دەپەرستی!

- نەخێر موسولمانم و دنیا ئەوە دەزانێ.
- دە ئەگەر یەزیدی نیت بلێ نەحلەت لە شەیتان.
- نایلێم.
- ئەوە دەردەکەوێ کە شەیتانپەرستی.
- من نوێژ دەکەم؛ ئەوی ئێوەش دەلێن من لە هەموو نوێژێکدا دەیلێم؛ بەلام بۆ ئێوەی نالێم.

یەزیدیەکانی خزمی لە بەری دەپاڕێنەوە: بلێ نەحلەت لە شەیتان! با تۆمان بمێنی.

- نا کوڕم! هەرگیز نامەوێ سەر بۆ زالم دانەوێنم. بۆ کەوچکە خوێنێک ناپاڕێمەوە...

لە زینداندا چاوەنۆڕی ئیعدامە. شەو هەوێرکی یەزیدی و موسولمان پەلاماری زیندان دەدەن و دەینێرنە سووریای بەر حوکمی فەڕانسە. ئەو دەشتەیان پێ دەسپێرن کە لە سەر سنووری تورکیایە. مستەفا کەمال داوایان دەکاتەوە، ژەنەرالێکی فەڕانسی دێتە جزیرە کە تەحویلی تورکیان بداتەوە. حاجۆ ئاغا دەچێتە دیدەنی ژەنەرال؛ لە مەجلیسدا بەر دەمانچەی دەدا. هەوێرکی کە لە دەوری شوێنەکەدا دامەزراون؛ دەیکەنە تەقە و حاجۆ دەپارێزن. فەڕانسە لە تەسلیم کردنیان واز دێنێ و خۆیان تێناگەیەنێ و دەیانکاتە دۆستی خۆی. دەلێن ژەنەرالێکی فەڕانسی هاتۆتە جزیرە، عەشایری کورد و عەرەبی تێگەیاندووە کە خۆیان ڕانێن و ڕێژە بڕۆن. بێوەژنی ژەنەراڵە کوژراوەکە دەمانچەیەکی دەکیفە دەستییەکەیدا بووە، بڕیاری داوە کە تۆڵەی مێردەکەی بکاتەوە. دەپرسێ: کامە حاجۆ ئاغایە؟ کاتێ کە حاجۆ دەبینێ ئەو شۆڕەسوارە ئەسمەرە چاوبرۆ جوانەی بە شان و باهۆی مەردانە و بەهەیبەت، سارد دەبێتەوە، دەلێ: حەیفە پیاوی وا بکوژرێ...

حاجۆ ئاغا کە لە شۆڕشی شێخ سەعید بەشدار نەبووە، پەشیمانە؛ حەول دەدا لە جزیرە ئەمارەتێک بۆ کوردەکانی جزیر دامەزرێنێ؛ بەلام کوردیتر هاوکاری دەگەڵ ناکەن. ئەوانەی بە ناوی ڕەعیەت لەو ناوە بوون، هەموو خزم و لە عەشیرەتێک بوون. لە پاش حاجۆ، حەسەناغای کوڕی سەرۆک عەشیرەت بوو. پێنج کوڕی حاجۆ لە گوندی تربەسپی دەژیان کە بنکەی چەکدارانی فەڕانسی بووە و ئێستاش قشلەکەیان ماوە. کوڕێکی یووسف کە باس کرا لە گوندێکی سەر لێواری سنووری تورکان و دوو کوڕ لە شاری حەسەکە دەژیان. ئاغا و ڕەعیەت هەر ناو بوو، ناوەرۆک نەبوو. گاوانێک بە کەسی نەدەگوت ئاغا، حەسەن، جەمیل، حەمەشەریف، چەچان و هیچیتر . تەنانەت هەلبژاردنی شوان و گاوانیش بە بیری هەموو خەلکی گوند بوو. ئاغاش تاقە ڕەئیەکی هەبوو. ڕەعیەت لینگیان ڕادەکێشا. ئیوا هەبوو پرخەی خەوی دەهات و ئاغاش لە دیوەخان دانیشتووە. ئەرمەنی و کلدانی و ئاشووری زۆر بوون؛ جوولەکەیەکیش هەبوو. چەندم پێ جوان بوو: لە دیوەخانێکدا مەلا، کەشیش، فەقیری یەزیدی، دەگەڵ موسولمان، مەسیحی، جوولەکە و یەزیدی دەبینرا کە هەموو وەک برا یەکتریان دەدواند و کەس دەربارەی دینەوە قەت شتێکی وای نەدەکرد و نەدەگوت کە دلی کەس بێشێنێ. قەت نەمدی موسولمان تف ڕۆکا یان ناوی شەیتان لە مەجلیس بێنێ؛ نەوەک دلی یەزیدی لێ بمێنێ.

ڕۆژێک لە قاوەخانە بووم، کابرایەک بە یەکێکی گوت: برو بێچووی شەیتان! یەزیدیەکـە دڵـی ئێشا و دەنگی نەکرد. کابراش هەوێرکی نەبوو. بانگم کرد: برا! ئـەوە کـوردە و براتـە. دەزانی بـە ناوی شەیتان دەیرەنجێنی؛ حەیفە دڵی فەقیرێکی وا بشکێنی. جنێوی‌تر زۆرن! کابرا پەشـیمان بۆوە؛ هات عوزری لە یەزیدی خواستەوە. پاش چەند ڕۆژ لە ماڵەوە بووم، گوتیان میـوان هـاتن. فەقیرێکی یەزیدی (فەقیر ڕۆحانییە) دەگەڵ چوار کەسان چـوار بـار کۆلـوویان هێنـاوە. فـەقیر ویستی دەستم ماچ کا: «سەیدا تو ناهێلی بسلمان خەلەتان بکەن؛ زۆر منەتبارتین». ئیتر ئـەوە سەرەتای دۆستایەتیم دەگەڵ یەزیدییەکان بوو؛ کە زۆر خەست ببوو؛ زۆریان خۆش دەویستم.

ماڵە حاجۆ زۆریان حورمەتی شاعیر و نووسەری کورد لە بەر بوو. ساڵەها ژیانی «جگەرخوون» لە سەر ئەوان بوو؛ کە چی ببوە چـەپی و جنێـوی پـێ دەدان و هەڕەشـەی کۆمۆنیـستانەی لـێ دەکردن! بەڵام دیسان هەر زۆر حورمـەتیان دەگـرت. ژیانیـان وەک عەشـایری عەرەبـە. تـەنیا بەیانیان چای دروست دەکەن؛ دەنا هەر قاوەی تاڵە. ئێواران قاوەچی دەبێ قاوەی خڕ و کاڵ لـە سەر ساج بۆ بدا، لە دەسکاونگدا بیکوتێ، دەنگی دەسکاونگ بگاتە مـاڵانی دێ، یانـێ وەرن قـاوە بخۆنەوە. دەبێ هەر جار بەشی ڕوژێک ساز دا. ئێوارەی تـریش دووپاتـە دەکرێتـەوە. جگـە لـە قاوەی ئێوارە، شەو لە مەجلیسدا قاوەچی بە فنجانی چکۆلەوە بە خەلکەوە دەگەڕێ و بەری لـێ دەگرێ. بۆ هەر کەسە چەند دلۆپێک تێدەکا و هەر تاو ناتاوێک تازەی دەکاتەوە. مـن کـە تـازە چووبووم، قاوەی تاڵ لـە دەمـم ژەهـری مـار بـوو. هـەرگا قـاوەچی دەگەیـشتە مـن، دەمگـوت ناخۆمەوە. حەسەناغا -کە بە تەنیا بووین- گوتی: سەیدا نازانم تۆ بۆ لە ئێمە عاجزی؟!

- من؟ خوا نەکا. بۆچی دەفەرمووی؟

- پیاوێ لە دیوەخان قاوە وەرنەگرێ، یانی دوژمنایەتیم دەگەڵ خاوەن دیوەخانە.

- بمبەخشە بەڵام زۆر تاڵە! بە قاوەچی بلێ فینجانی بێ قاوەم بداتێ؛ وە بزانن دەیخۆمەوە!

کەچی بۆ خۆم وای فێر ببووم، تـەنیا داوای قـاوەی تاڵـم دەکـرد. شـیعرێکم کـە بـۆ جـەلال تاڵەبانی نووسیوە و لە «بۆ کوردستان»دا چاپ کراوە، باسێکم لەو بارەوە کردووە.

تورک لەو مەڵبەندە، خەتی سنووریان دوور و درێژ مین چاندبوو؛ کە لە قاچاغچی بتـەقێ. زۆر جار کوردی بەستەزمان بەو مینانە دەکوژران. بەڵام زۆربەی قاچاغچی -کە سەربازی تورک یـان کورد بوون- مینەکانیان کۆ دەکردەوە. بەردی دوکاندارانی تربەسـپی، بەشـی زۆری قـاپۆڕەمین بوو. بەرتیلیش زۆری کار دەکرد. جەندرمە مەڕیان بۆ قاچاغچی لێدەخوڕی! تفـەنگیان دەدانـێ؛ لە عەرزی سووریا تفەنگیان وەردەگرتەوە.

مەلا زوبێر ناوێک، لاوێکی خەلکی دەوری شاری «میدیا» دەهاتـە جزیـرە، کتێـب و شـیعری کوردی کۆ دەکردەوە. جارێک درەنگ‌تر لە پێشوو هات؛ بۆی گێڕامـەوە: لـە شـاری نوسـەیبین پشکنیانم. دیوانی جەگەرخوون و چەند شتێکی دیکەیان لێ گرتم. بێسیمیان بۆ دیاربەکر لێـدا. ئەفسەرێکی دەرەجە سەروان هات، کەلەبچەی کردم و خستمیە ناو جێپ بـۆ دیاربـەکر. لـە ڕێ زۆر گریام؛ پاڕامەوە. لە ناو شیوێک دەمانچە بە دەستەوە دایبەزاندم. گـوتم دەمکـوژێ. تـاوێکی باش بەر شەق و زللەی دام. بە کرمانجی گوتی: سەی کـوڕی سـەی! کـەرێکی وەک تـۆ ماڵـی هەزار کورد وێران دەکا. کتێبی کوردی لە پۆستی سنوورەوە دێنیە ژوور؟! برۆ ڕاکە! خۆی بەرەو نوسەیبین گەڕاوە. کە لە میدیا لە پاش سەردانی ماڵەوە بە نوسـەیبیندا هاتمـەوە، جەندرمـەکان دەستیان ماچ کردم: خۆجە تۆمان گـرت عـەفوومان بکـە! جـەناب سـەروان هاتـەوە فـەرمووی

کتێبەکانت هەموو مانای قورعان و حەدیس بوون!
حەسەناغای حاجۆ -کە مەزنی عاشیرەت بوو- بە جحێڵی تەنبوورژەنێکی زانا بووە. گوتم: بریا منیش بمزانیبا. تەنبوورێکیان هێنا؛ ئاغا حەولی دا فێرم کا، بەلام هەرچی کردی و کراندی نەمتوانی قامکی هەر دووک دەستم وێکڕا کار بکا! ناچار وازم لێ هێنا و زۆرم زگ بە نازیرەکی خۆم سووتا.
زۆر لە قەدیمەوە یەکێ لەو ماڵە هەر ناوی «حاجۆ» بووە؛ حاجۆی نازانم چەند پشت پێشوو؛ عەبدی ڕەشی هەبووە و قاوەچی دیوانێ بووە. پشتاوپشت ئەو ڕەشانەش ببوونە کورد؛ هەر ڕەش بوون و هەر قاوەچی؛ بەلام عەبد نەبوون.
تایەفەیەک لە ناو هەوێرکان هەن دەڵێن قەدیم لە هیندووستانەوە هاتووین. بەوانە دەڵێن موتریب یانی بەزمگێڕ. لە ناو خۆیاندا زمانێکی تایبەتیان هەیە. هەموو پیاویان زوڕنا و دنبەکژەنن و ئەگەر دەنگخۆش بن، گۆرانیبێژیشن. یەک لەوانە ناوی «شێخۆ نادۆ» بوو؛ نەخوێندوار؛ قەت نەچووبووە شاران. جگە لە زوڕنا و دەهۆڵژەنی، قسەخۆشێک بوو ئەگەر لە ولاتانی لاوەکی بوایە، ناوبانگی دنیای دادەگرت. لاسای هەموو جانەوەرێکی دەکردەوە و دەبوو بە هەو. چەند نوکتەیەکم لێ کردۆتە شیعر و لە دیوانەکەمدایە. شەوانە کە دەهاتە دیوەخان، مردووی دێنایە پێکەنین. کە من دەمدی: کەچەڵ، پیر، بۆر، دەم و چاو درێژ، بەکۆخەکۆخ بوو. نومایشنامەی پێکەنینی وای دروست کردبوو کە لە بەر دەیگوتن؛ هەر دەبوو ئافەرینی لێ پکەی. شەوێک زۆر کۆخی، یەکێک گوتی: شێخۆ! مردنت هاتووە. گوتی: دەمت ببڕە! نیشانەی مردنی من زۆرن؛ هێشتا پەیدا نەبوون. کە مردنم نزیک بێتەوە، سەگ ناوەڕن، کەر نازەڕن، بزن ناتڕن، قەل ناقڕن، زۆر عەلاماتی دیش پەیدا دەبن کە پێت ناڵێم!
لاسای کەشەی کلدانیانی دەکردەوە، لە خۆوە شتێکی بە مینگەوە دەگوت. کلدانیەکان سوێندیان دەخوارد دەیانگوت تەواو کەشەیە؛ بەلام لە قسەکانی تێناگەین!
- بۆ تێناگەن؟ دەڵێم: ئەی کلدانیە خۆشەویستەکان! ئەگەر پیرەمێردێکی لاوازی بێهێزی حەفتا ساڵە، لە ئاودا قوم بکەن و بە پێلاقە بچنە سەری، لەوانەیە نەفەسی تەنگ ببێ؛ ئامین!
- شێخۆ قەت نەچوویە هیچ شارێک؟
- بەڵێ، جارێک بردیانمە قامیشلی زوڕنا بۆ داوەت لێدەم. کاری ئاوم هەبوو. بردیانمە ژوورێک گوتیان ئاوەدستە. میزێکم کرد، لە قاپێکدا سوری خوارد و چنگێک بۆگەنی کۆ کرد و بە لوتمی دادا! لە تاوان گووم لە بیر چۆوە! هاتمەوە داوەت؛ تەنگەتاو بووم. کوڕینە! من هەر لە دەشت ڕیاوم؛ بە خێری خۆتان بمگەیەننە چۆڵێک! لاوێک پێشم کەوت. دەستم لە سەر شانی بوو کە ون نەبم. لە بازاڕەوە تێپەڕین، لەوبەر لەوبەر دەیانپرسی: ئەرێ ئەوە شێخۆ نییە؟ بە دەست ئیشارەم دەکرد نا!
- جا بۆ بە قسە نەتدەگوت نا؟
- دەترسام هەر لەبزم بگەڕێ لە خوارەوە هەڵڕژێ!
دەیگوت شەوێکی مانگەشەو، لە سەر گردێک چووبوومە سەر پێشاوێ. خەیالات بردبوومیەوە. لەپڕ دیتم ژووژکێک لە پێشمەوە دەڕوا، کەوتمە سەری: بۆ کوێ دەچێ؟ ئەز باڤێ (لە تۆ) مە؛ هەر دەبێ بتگرم! هەر پەلم بۆ دەبرد و بەر دەستم نەدەهات و سەربەرەژێر پەل ببوو. لە خوار گردی پرم پێدا کرد. بە داخەوە شلەگووی نانی هەرزنی خۆم بوو!

چیرۆکی شێخۆ نابڕێنەوە، یەکجار زۆرن. زۆربەی خەڵکی جزیر لە بەریانن و بۆ یەکتری دەگێڕنەوە و دڵخۆشکەرەی شەونشینن.

شەوێک شێخێکی هەموو گیان کەسکی مل بە مت و mورووی ڕیش سپی و عاسا بەدەست، بە چوار مریدەوە دابەزین؛ کە نەناس بوون. شێخ لە تەنیشت حەسەناغا لە لای سەرو دانیشتبوو. هەر یەک دوو دەقیقە شووشەیەکی تەنکەڵەی لە باخەڵی سەڵتە دەردێنا، قومێکی لێ دەخواردەوە. بۆنی عارەقی زەحلاوی دیوەخانی دادەگرت. شێخ دەمیشی لە دوعا خوێندن نەدەوەستا!

- قوربان! ئەوە چییە دەیخۆیەوە؟

وەڵلا من نەخۆشی دڵمە؛ دەرمان دەخۆم. ئێوە نامناسن، من شێخی شەبەکانم؛ دایکم خزمی هەوێرکان بوو؛ هاتووم سەری خزمان بدەم.

کوڕ و کاڵی ماڵە حاجۆ -جگە لە پیاوە پیرەکان- هەموو شەو ئارەقیان دەخواردەوە؛ بەڵام لە شوێنێکی نەدیاری دیوەخان. بۆ شێو گوتیان: یا شێخ فەرموو! هێنایانە ژوورێک، پتر لە بیست بوتری ئارەق لە سەر مێز ڕیز کرابوو.

- فەرموو یا شێخ! ئێمەش هەموو نەخۆشی دڵمانە!

شێخ کە زانیبووی ئارەق دەناسن و فریویان نەخوارد، هەر نیوەشەو ڕۆیشتبوو.

شێخ برایم حەققی شێخی هەرەگەورەی جزێرێ بوو؛ هاتبووە دیدەنی حەسەناغا؛ لە لای سەرووی مەجلیس دانیشتبوو. گوتی: بە داخەوە حەسەناغا پیر بووی!

- بەڵێ یاشێخ! تۆش پیر بووی؛ زەمانەیە.

- ئەرێ برا! پیری لە کەنگێوە دەست پێدەکا؟

- لە پەنجا، لە شێست، لە حەفتا... هەر یەکە قسەیەکیان دەکرد. گوتم: ئیجازە هەیە من کێشە ببڕمەوە؟ شێخ نەیدەناسیم. حەسەناغا گوتی: بلێ!

- پیاو هەر وەخت کە لە خەو هەستا و ئەسپابەکەی پێش خۆی هەڵنەستابوو، ئەوە پیری گەیوەتێ! ئیتر نە بە عومرە، نە بە موو سپیبوونە!

شێخ خۆی بە ویقار کرد و تۆزێک نێو چاوانی تێک نا. لەپڕ لە پرمەی پێکەنینی دا و گوتی: خەبەری ویە؛ ئەو چ کەسە؟! ئەو جار ببوە مێژوو دیتنەوە: «تۆ لە کامساڵەوە ملت لە پیری ناوە؟!».

کابرایەک بوو: «عەبدکێ»، کەردار و نەخوێندەوار؛ بەڵام لە دم بە دەمدا زۆر زیرەک. شەوێک لە دیوەخان، مەلا عەباس -کە بە قەولی خۆی هەم سەید، هەم خەلیفە، هەم هەشت جار چۆتە حەج، مەلایشە- گوتی: عەبدکێ تۆ نوێژ ناکەی، کافری!

-مامۆستا ئەگەر شادەوئیمان بێنم موسوڵمانم؟

- بەڵێ.

- لە بەهەشت، حەفتا حۆری جوانم دەدەنێ؟

- بەڵێ، ئەگەر نوێژ بکەی.

- خزمینە! لە سەر دەستی ئێوە، جگە لە شادەوئیمان هێنان وا دەکەم یەک نوێژم نەچێ. با مامۆستا سەودایەکم دەگەڵ بکا: ژنێکی هەیە لە تەپاڵە پیستر، حەفتا حۆری خۆمی نەزر دەکەم، ئەو ژنەیم بداتێ! مەلا بە گۆچانەوە بۆی چوو. عەبدکێ لە پەنجەرەوە دەرچوو! دەیگوت: ئەویش

باوەڕ ناکا حۆری هەیە؛ دەنا کام بێسەلیقە سەودای وا بە قازانج ناکا؟!

بە ڕواڵەت سەیدێکی ڕدێنزەرد لە تورکیەوە هاتبووە جزیرە. دەیانبردە سەر قەبران، بزانێ مردووەکەیان چۆنە! تاوێک چاوی لێک دەنا و لەپڕ یاهووی دەکێشا: مردووت حاڵی خۆشە؛ مزگێنیم دەیە! مردووت لە عەزاب دایە؛ خێری بۆ بکە! بە هەر دووک باراندا هەر قازانجی خۆی بوو. ڕۆژێک عەبدکی بە سێ بارەوە لە ڕێگەی قامیشلی تووشی سەیدی مردووناس دێ؛ داوێن و دەستی ماچ دەکا.

- قوربان فەرمووو سوار بە!
- نە! حەرامە، کەرت بەبارە.
- قوربان تۆ بەرەکەتی؛ کەرەکەم بە هێزتر دەبێ!

شێخ لە سەر بارەوە سوارە، عەبدکێ کەری بۆ لێ دەخوڕێ.

- قوربان با گرێوێک بکەین.
- گرێو؟ حەرامە!
- نا نا، حەرام نییە. پرسیارێکت لێدەکەم، ئەگەر زانیت کەلەشێرێکم هەیە بۆت سەردەبڕم.
- باشە.
- ئەو بارەی سواری بووی چی تێدایە؟
- دەستی لێدەم؟
- بەلێ.

پاش هەلگلۆفینی جەوال، دەلێ:

- گەنمەشامی.
- نەخێر، نەتزانی! ئەوجاریش خاترت.
- ها، زانیم جۆیە.
- ئەو جاریش قانت بێ.
- ها، تێگەیشتم، هەرزنە.

عەبدکێ بەو کوتەکەی بۆ کەر لێخوڕینی پێیە، یەکێ بە ناوشانی گۆڕناسدا دەکێشێ. سەید بەردەبێتەوە؛ بوکتە کوێندەرێت دێشێ!

خەبەر هات سەید بێهۆش لە قەراغ ڕێ دە ناو گیادا دیتراوەتەوە؛ پوولەکەشیان نەبردووە. جەمیل حاجۆ گوتی: عەبدکێ کارتە! ئەگەر جگە لە تۆ با، پوولەکەیان دەبرد. دەیگوت: گوتم حیزباب! تۆ لە بن دوو میتر گلەوە دەزانی مردوو حالی چییە؛ لەودیو جەوالێکەوە نازانی بە غەلەتیش بلێی گەنمە! ئاخر لە جزیرەی دێم، هەرزن و جۆ و گەنمەشامی چ دەکا؟!».

کۆمۆنیستی «خالید بەکداش» گالەی دەکرد. بە هەزاران لە کوردی جزیرە ببوونە شیووعی و هەر بە قەد زەمانی منداڵی من و نەمازیەکەی لە تەوریز لێی حاڵی ببوون. دەبوایە لە سەر خەرمان چوار تەلیس گەنم ئابوونەی ڕۆژنامەی «نوور»ی عەرەبی بدەن و بۆیان دەهات؛ بە بێ ئەوە کەسیان عەرەبی بزانێ! هەر خۆپێشاندانێ لە شام بکرایە، کوردەکانیان بە گۆپاڵ دەبرد؛ لە بەگژداچوونی پۆلیس و سەرشکاندنا هەر ئەوان بن.

وەکیلیان لە تربەسپی، «ئەحمەد عەنتەر» ناوێک بوو. لە قاوەخانە کۆی دەکردنەوە و ڕۆژنامەی نووری بۆ دەخوێندنەوە. لە سەری ڕووپەڕ بەری لێدەگرت، ستوون ستوونی نەدەزانی؛

ڕاست هەتا ئەو سەر دەچوو! گاڵتەجارێکی وابوو، پیاو لە پێکەنینان دەمرد! جارێک گوتم وا نابێ، نیشانم دا کە هەر ستوونە سەربەخۆیە: بڕوانە لە هێندێکیان نووسراوە: پاشماوەی لە فلان ڕووپەڕ... گوتی: هەهۆ، تۆ منت گێژ کرد! من هەر وەک خۆمی دەخوێنمەوە، کێیە پێم بڵێ خەڵەتە؟!

لە موسکۆ ئەم قسەم بۆ پیاوێکی زۆر زل بە ناوی «ولۆشین» کە ئەندامی سێکا بوو، گێڕاوە، زۆر پێکەنی؛ بەڵام گوتی: تۆ لە نوکتە دروست کردندا وەستای!

ڕۆژێک پێنج کەس گوندی و مەلایێک بە ناوی مەلا سولەیمان لە گوندێکیتـرەوە هاتبوونە لام:

- سەیدای هەژار کێشەمانە، ستالین نوێژی بە جەماعت دەکرد یان نا؟!

- کاکە ئەوە دەبێ هەواڵ خالید بەکداش بیزانێ!

بۆ یەکەم جار کە چوومە قامیشلی، زۆر بە تاسەوە چوومە دیدەنی «جگەرخوێن». ڕەئیسی فەرعی حیزبی کومۆنیستی جزیرە -کە ناوی «ڕەمـۆ» بوو- لە لای بوو. سەیدا جگەرخوێن فەرمووی: ئەمڕۆ زۆر تاریخییە؛ هەژار و جگەرخوێن یەکتر دەبینن. ڕووی کردە ڕەمۆ: هەواڵ هەژاریش لە خۆمانە و لە سەر فکری منە. گوتم: ئیوا هەیە خۆی لە بیر دەچێتەوە لە ڕێگەی کومۆنیستدا. من بۆیە کومۆنیستم خۆش دەوێ کە قازانجی بۆ کورد ببێ. جا نازانم فکرمان یەکە یا لێک جودایە؟... لەو ساوە دەگەڵ جگەرخوێن تەواو بووینە ئاشنا.

جگەرخوێن خەڵکی گوندێک بە ناوی «هەسار»ی بەردەستی تورکان و تا گەورە بووە هەر شوان و نەخوێندەوار بووە. بە گەورەیی چۆتە ناو فەقێیان؛ بۆتە مەلای مزگەوت. لە مەلایەتی بێزارە؛ جبە و شاشکی فڕێ داوە و ملی لە کوردایەتی ناوە. شیعری لە «ڕوناهی» و «هاوار»دا چاپ کراوە و بۆتە خۆشەویستی کوردانی تینووی ئازادی لە سووریە و تورکیەدا. دیوانی -کە بۆ یەکەم جار چاپ کراوە- وا نادر بووە لە دێهاتی ناو کورداندا، دێیەک دیوانێکی بەر کەوتووە. پەڕ پەڕ بەشیان کردووە و بۆ پیرۆزی وەک نوشتە لە سەری منداڵانیان درووە. کەم-کەم لە کوردایەتی پاشەکشەی کردووە، بۆتە هەواڵی کومۆنیستان و شیعرەکانی سوور هەڵگەڕاون! من کە دیتم، هاوکاری لێژنەی ناوچەی شیووعی قامیشلی دەکرد؛ بەڵام بە ئەندام قبووڵ نەکرابوو. لە ژیانیدا زۆری چەرمەسەری دیبوو؛ چەند جار حەبس کرابوو؛ جەزرەبە درابوو. منداڵی زۆر و نانی کەم، لەوپەڕی نەداریدا دەژیا. خۆراکی خۆی و منالی ئاغلەب نانی وشک و چا بوو. جاری وا بوو چاش نەبوو...

ڕەمۆی ڕەئیسی لێژنە، کەچە سیواتێکی هەبوو. هاوکارێکی هەبوو ناوەکەیم لە بیر نەماوە (پێم وایە ناوی برۆ بوو)؛ ڕەش و سپی لێک نەدەکردەوە؛ بەڵام زۆر وشک و دووئاتەشە بوو. هەر دەیگوت: من بە دەلیلی عیلمی پێتان ئیسپات دەکەم! ڕۆژێکی جومعە دوای نوێژ، گەلە سۆفییەکی ڕیشدار، تەسبیح بە دەستەوە، بە دوعا خوێندن دەچنە ماڵە ڕەمۆ. دایکی ڕەمۆ دەڵێ: لە ماڵ نییە؛ کارتان چییە؟

- خودێ، خوها مە، ئەم شوعینە! هاتینە جەم ڕەمۆ، ژمە ڕا بێژێ!

- ئای بەڵا بەم لەو سەر و سەکوتانە! لە نوێژی جومعەوە هاتوونە شیووعی فێر بوون؟ ڕیش‌سەگ! ڕەمۆی من هەزار جنێو بە خودا دەدا!

کاتێ لە قامیشلی دەژیام، زۆر کەس دەهاتنە لام. کوردی زۆر تۆخ، کومۆنیست، مەلا، حاجی

و هەموو بابەتێک؛ مەجلیسی ئێوارانمان خۆش بوو. جارێک یەکێکی زۆر گەرم لە کوردایەتیدا - کە ناوی «عەبدێ تێلۆ» بوو- گوتی: هەر کوێ دە نێوان دەجلە و فوراتدایە لە سەر کوردستان حیسابە و داگیر کراوە. سەیدا جگەرخوون فەرمووی: نەخێر! ئەم جزیرەش مالی عەرەبە و ئێمە بە نارِەوا تیا دەژین. عەبدێ چاوی پەرِیە پشتی سەری، کراواتەکەی گرت و بەر مست و زللەی دا. هەی نەکەن! سەیدامان لە دەست دەرێنا و بە عەبدێم گوت جارێکیتر نایەوە دیدەنیم؛ دەرمکرد. پاش ئەوە بە ماوەیەک، کوردێکی دەولەمەندی حەسەکەیی بە ناوی سەعید، بە ماشێنی خۆی سەیدا و منی بردە گەرِان بۆ ناو عەشایری عەرەبی شەممەرِ. شەوێک میوانی شێخ عوبێد ناو بووین کە شێخی بەرەبابێکی شەممەرِ بو. رەشماڵ و قەسری لە سەحرا و چەندین کادیلاکی لە دەوری رەشماڵ بوو. شێخ دلخۆشی دەدامەوە کە سکرتێری بم، ژنم بۆ بێنێ و دەولەمەندم کا؛ دیارە نەمدەکرد. شەو تووتنم پێ نەما، بەو شەوە ناردی لە شارۆکەیەکی تورکیای نزیک سنوور، هەمو جۆرە جغارە و تووتن و پەرِیان بۆ هێنام. عەرەبێکی شارستانی لەوێ بوو قەدەرێک لە قامیشلی حاکم و ئێستاش لە حەسەکە مەرکەزی ئەستانی جزیرە دەبێتە «موددەعیلعام»، گوتی منیش دەگەلتان دێم. باران و لەنگێزە بوو. شەوێک لە سەحرا ماینەوە. رۆژی دوایی میوانی رەشمالی شێخێکی عەرەبی کۆنە کورد بە ناوی شێخ محەممەد بووین. زمانی بەدەویانە بوو؛ دەیگوت کوردم؛ لە پەستاش جنێوی بە نەسلی عەرەب دەدا. لە بەر پیریان هەر چنگێکی لێ مابۆوە. بۆی گێرِاینەوە: ژەنەرالی فەرِانسی هاتە حەسەکە، لە عەشایری گێرِاوە: هەر سەرۆکێک نەسەبی عەسلە عەرەب بێ، حقووقی بۆ دەبرِێتەوە. نۆرەم هات، چوومە ژوور، خەنجەرەکەم لە سەر مێز دانا، گوتم: ئەوە نەسەبمە و خەنجەری کورد ناوی باپیرمە. حقووقی زیاتری بۆ برِیمەوە. وا دیار بوو عەشایەری جیرانی زۆری لێ دەترسان.

لە دەوری چیای عەبدولعەزیز میوانی عەشایرێک بووین، عەرەبی سەحرانشین. دیانگوت: ئێمە ئەکراد بەگگارِەین (یانی کوردی گاوانی). ببوونە عەرەب و ببوونە سەحرانشین. کابرای شامی هاورِێمان زۆر پیاوێکی رووخۆش، زمانخۆش و لەسەرخۆ بوو. لەم سەفەرەدا لە هەر کوێ باین، دەیگوت منیش کوردم. زۆری هۆگر ببووین. دوامین رۆژی سەفەرمان بوو؛ لە ناو ماشێندا گوتی: ئوستاد جگەرخوون! دەزانم تۆ شاعیرێکی گەورەی کوردی. حەز دەکەم شیعرێکی خۆت بخوێنیەوە. سەیدا سروودێکی خوێندەوە: «بێ دەجلە، بێ فورات، ئەم چنۆ، کوردنۆ»ی تێدابوو. کابرا پێکەنی، گوتی: ئەگەر من پیاوێکی بەدفەرِ بوومایە، ئێستا بە ئیعدام کردنم دەدای. تۆ عەرزی سووریا هەموو بە مالی کوردان دەزانی! عەرزی سەیدام کرد: بە ناشکوری نەبێ تۆ کونی دوعات ون کردووە! ئەگەر ئەمەت بە عەبدێ تێلۆ بگوتایە و قسەی بەوت گوت بە موددەعیعامی عەرەبت بفەرمویایە، هەردووک ئافەریمیان لێ دەکردی!

دەگەل شێخی هەرە گەورەی عەشایری شەممەرِ: «دەهام ئەلهادی» ببوومە ئاشنا. لە چەند جار هاتوچۆ کردنیدا زۆر باش شارەزای دام و دەستووری عەشایری عەرەب ببووم.

کە چوومە جزیرە هیچ کرمانجیم نەدەزانی؛ بە عارەبی قسەیان دەگەل دەکردم. دەفتەر و قەلەمم وەکار خست. رۆژانە لای چەچاناغای حاجۆ -کە هیچ زمانێکی نەدەزانی کرمانجی نەبێ- دادەنیشتم، ئەو دەیگوت و من دەمنووسیەوە. لەم و لەویشم هەر دەپرسی و خۆم فێرە کرمانجی کرد.

منیش وەک هەموو کوردێک زۆر عاشقی مەم و زینی خانی بووم. لە ئێران دیبووم، هەر

فارسییەکانیم دەزانی. کە عارەبی فێر بووم کرمانجیەکەم نەدەزانی. بەلام بە کرمانجی فێربـوون ئەو گرێ کوێرەشم بۆ ڕەها بوو. مەلایانی جزیـری -کـە فارسـییەکانیان نـەدەزانی- زۆری تێـدا کۆڵ بوون. «بۆ نەیکەمە سۆرانی؟» شانم لـێ داخـست. شـەوانە پـاش منـداڵ نووسـتن، چەنـد بەیتێکی مەم و زینم بە پەخشانێکی سادە وەردەگێڕا. کتێبم وەلا دەنا، پەخـشانەکەم بـە شـیعر دەهۆندەوە، تا قافیە و دەقی شیعران دووپاتە نەبنەوە. گوندەکە بەرقی هـەبوو؛ کـە ماڵـە حـاجۆ ماتۆڕەکەیان کڕیبوو. بە ئاسایی سەعات یازدە، پاش دیوەخان چۆڵ بوون دەکـوژاوە، دەبوایـە لـە بەر چرای نەوت بنووسم. بەلام ئەگەر لاوان خەریکی ڕابواردن و ئارەق خواردن بوونایە، نیعمـەت بوو؛ بەرق تا درەنگانی شەو هەبوو.

نەخۆش بووم؛ زۆر دەکۆخیم. شەوانە لە نووسیندا زۆرم سیگار دەکێشا. مەعسووم بە کزێکـەوە دەپاڕاوە: ڕوحم بە خۆت بکە! هێندە مەکێشە! ناچار زوو زوو قونچکە جغارەکانم دەشـاردەوە تـا وا بزانێ کەمم کێشاوە!

دە پێشدا، پێشەکییەکانی -کە سۆفیایەتییە- لە بەر گرانی بۆم نـەکرا. کاتـێ خەلاسـم کـرد، بامدایەوە سەر عیرفانە پێشەکییەکان.

وەک لە چاپی مەم و زینەکەمدا نووسیومە، لە بیستودووی بـەفرانبارەوە تـا بانمـەڕی ١٩٥٨ وەرمگێڕا. زستان کە شەوانە لە ماڵ دەمنووسی، لە بەهاردا ڕۆژانە دەچوومە بـاغی گونـد کـە زۆر شوێنێکی وەک دەڵێن شاعیرانە بوو. سەعات نیوی پاش نیوەڕۆ ڕەشنووسەکەم تـەواو کـرد. لـە خۆشیان دەتگوت فڕیم. هاتمەوە ماڵ، هەر لە دەرکی حەسارەوە قیژاندم: «تەواوم کـرد!». ئـای لەو خۆشییە!

خەریکی نان خواردن بووین، محێدین حاجۆ (کوڕی یووسف حاجۆ) هاتە ماڵ.

- سەیدا! نایەی بچینە گەڕانێک؟ بەهارێکی زۆر خۆشە.

- بۆ کوێ؟

- دەچینە «عێن دیوەرێ».

دەگەڵ محێدین و دوو لاویتری ماڵە حاجۆ، لـە نـاو جێپـدا بـیرم دەکـردەوە: هـەیاران! لـە هاوینی پەنجا و شەشەوە لێرەم. چۆنە زیاد لە هەموو دەمان، ئەمڕۆ دەمبەنـە سـەیرانێ؟! عـەین دیوەر بە ڕاستی شوێنێکی خۆشە. لە سـەر چیایـەکی نـەرمی زۆر بـەرزەوە دەڕوانێتـە ڕووبـاری دەجلە و پڕە لە باغ و باغات. شەو تا پاش نیوەڕۆی بەیانی لەوێ ماین. گوتیان بـا بچینـە شـاری جزیر و بۆتان.

- چی؟ جا ڕێمان دەدەن؟

- بەڵێ، هاتوچۆی سووریەکان بۆ ناو شار ئازادە، شتی خۆیان لە بازاڕی ئەوێ دەکڕن.

مودیری پۆستی پۆلیسی عێندیوەر گوتی: منیش بەرن! دووربینم هەیە سەیری چیای بۆتانی پێ بکەن! گەینە بەستێنی شاری جزیر. لەبەر ئەوە پۆلیسمان دەگەڵە ڕێگەی چوونە ناو شـاریان نەداین؛ بەلام هەموو ماڵی شار و دەوروبەری، وەک هێلکە لێمانەوە دیار بـوو. کـوردێکی تەمـەن چل-چلوپێنج ساڵی هاتە لامان؛ خەلکی شار و زۆر شارەزا بوو. بە ئیشارەتەوە بۆی گوتین:

- ئەوە کۆشکی بەڵەکە کە ماڵی میرانی جزیر بـووە و ئێـستاش سـەربازخانەی تورکانـە. ئـەو کانی و ئاوە لە قەدی گردی پشت ماڵانە، «کانی قەستەلێ»یە؛ کە جێژوانی مەم و زینـان بـووە. بە هۆوە دلێن «نێزگزان»، ئەو دەشتۆکە «وەستان». هۆو نێوان گردانەش کە دەجلـەی بـە نـاودا



تێدەپەڕێ «دەروازە» و ئەو ئاقارە «هۆمەران» و ئەولاتری «مەیدان»ی ناوە...

لەپڕ دڵم گەرم داهات؛ ڕامکرد و دوور کەوتمەوە. چوومە ناو کۆنە قەبرستانێکەوە، سەرم بە کێلێکەوە نا و گریام، ئەمما گریان... سەرم بە هەنیسکانەوە هەڵدەگیرا. لام وایە پتر لە دە دەقیقە کوڵی گریانم لە جۆش نەکەوت. هێدی- هێدی ئارام بوومەوە و چاوم سڕی. ڕوانیم هاوڕێکانم لێم دوور وێستاون و لە عانی گریاندا نەهاتوون سەبەبم لێ پرسن. لەو دەمەدا کە پیاوە جزیرییەکە ناوی شوێنەکانی دەگوت، کەوتە دڵمەوە: من دوێنێ لە تەرجەمەی مەم و زین بوومەوە. تۆ بڵێی خانی لە تەرجەمەکەم ڕازی بووبێ و لە پاداشتا ئەو سەفەرەی بۆ ڕێک دابم؟ کە شارە خۆشەویستەکەی، لانکی دڵداری مەم و زینانم نیشان دا؟ ڕەنگە وابێ... ئیتر گریان ملی گرتم و ئارام و تۆقرەی پێ نەهێشتم. واتا وەک دەروێش جەزمە گرتمی.

زۆرم شیعر لە جزیرە نووسیوە لە دیوانەکەمدا ئیشارەیان پێ کراوە. زۆر جار لە جزیرەوە دەچوومە شاری شام.

دەگەڵ زەبیحی -کە سەرکارگەری دەکرد- ڕامدەبوارد. دەچووینەماڵی «ڕەوشەن خانم» بێوەژنی «جەلادەت عالی بەدرخان» کە مودیر مەدرەسە و ژنێکی زۆر زانا و ئەدیب و کوڕێکی جحێڵی بە ناو «جەمشید بەدرخان» و کچێکی گەورەی بە ناوی «سینەم بەدرخان» هەبوو.

جاری وابوو دوو مانگ لە شام دەمامەوە. هەرگا بۆ مەخاریج دادەمام، بە عەکاسانی ئەرمەنییەوە دەگەڕام، جامم بۆ ڕتووش دەکردن، عەکسم بۆ چاپ دەکردن و حەق دەستێکم دەستاند. مەخاریجم کەم بوو.

لە ئوتێلێک دەژیام هی کوردێکی عەرەب زمانی کوردەکانی شام و ناوی «ئەبوو ئەییووب» بوو. شەوانە لیرەیەکی سووریم دەدا کە دەبووە دوو تمەن. بەر چایی دوو نانی گەورەی خۆماڵی ژنە درووزان کە هەر نانە جوانەکانی سابلاغ بوو، دەمکڕی و دەچوومە دوکانی «فولی مودەممەس» فرۆش. چەندی دەخۆی بە سی فلس. باقلەی کوڵاوی ناو ماست، ڕۆن و پیواز بە سەرەوە، هێندەم دەخوارد هەر درینگەم دەهات. ئیتر تا شەو برسی نەدەبووم. شەوانەش چەند دانە فلێفلە -کە تۆزێک هەویرە و دە تۆز بیباری سوور، لە ڕۆندا سوور دەکرێتەوە؛ خواردنی فەقیرانە و زۆر هەرزانە- دەمکردە شێو. ڕۆژێ دوو تمەن لە سەرم دەهات و لە پێم دەردەچوو؛ بەو شەرتە پووڵی چایخانەشم دەدا. چاخانەیەک هەبوو خاوەنەکەی ناوی «ئەبولعیز» بوو؛ ببوە مەکۆی هەموو پەنابەرانی ئاوارەی عیراقی. چایەک بە چارەگە لیرەیەک (پێنج قران). یەک چات خواردباوە، تازە ئەو ڕۆژە بیست جاریش بڕۆیبای و هاتبایەوە، کەس نەیدەگوت کەرت بە چەند. ڕۆژانە لەو چایخانە دەگەڵ «عوسمان سەبری» شاعیر -کە بە «ئاپۆ عوسمان» دەماندواند- تەختەمان بازی دەکرد. زۆر جار لە سەر فێڵ کردن بە گژمدا دەهات و زوو ئاشت دەبووینەوە. پێکەنینی خۆشمان بە سەلیم ناوەکەی کۆنە سەرۆکی شیووعی عیراق بوو کە هەمیشە چۆرتی دەدا و دەمی ئاوڵە دەکرد و مێش لە زاری دەچوونە ژوور و دەردەکەوتن!

**شێخ عابید:** بە خەیاڵ بێنە بەر چاوی خۆت: درێژێکی باریکی ناقۆڵای شان داتەپیو، ملێکی سیسی چلکن، دەم و چاوێکی درێژۆکە، دوو چاوی پرووش، لووتدرێژی دەندووکە داڵاشی، سەرێکی درێژی کەچەڵ کە یەک تووکی پێوە بێ، لە خەنە درابێ، شلەیەک بێ پڕ لە پەڵەی سپی و خەنەیی، ئەوە شێخ عابید بوو! کوڕی مەلایەکی زاخۆیی، لە ئێران دەگەڵ مەلامستەفا بووە، لە گەڕانەوەی بەرەو عیراق، لە سەر بریندارێکیان بەجێ هێشتووە کە لە بەفردا گیری



خواردووه؛ تفەنگەکەی ڕفاندووه! لە هەولێر ماڵ و منداڵی پێکەوە ناوە، چوار کوڕ و کچی هەیە. لات و سەرسەری و گەللایی ڕایدەبوێرێ. قەدەرێک لە سووریە ماڵیات کۆکەرەوە بووە؛ دزی کردووە و ناوێرێ بچێتە سووریە. کوڕێکی دانشجوو بوو؛ تا خوا حەزکا نەجیب و بەئەخلاق. لەوەوە باوکیم ناسی کە کوڕ ڕۆژی جومعان کاری نەققاشی ماڵانی دەکرد و باوکی لێی دەدزی! شکاتی لای من دەکرد. ڕۆژێک لە جزیرە پەیدا بوو:

- سەیدا چ بکەم؟ لە بەغدا بە تۆمەتی بێکاری چل ڕۆژیان گرتم. هاتوومە ئێرە، لێرەش پێم بزانن قاچاغم...

نامەم بۆ ئەکرەمی حاجۆ لە حەسەکە نووسی: «تۆ دەتوانی پێناسێکی سووری دەگەڵ ڕەعیەتە عەرەبەکانت بۆ وەرگری، تکایە یاریدەی بدە!». تێمگەیاند ڕاست بچۆ ماڵی ئەکرەم؛ لە هیچ کوێ لا مەدە! تەشریفی لە ڕێوە چووبووە قاوەخانە، بە عارەبی عیراقیانە ملی شات و شوت نابوو: سێسەد سەرباز و ئەفسەری ئێرانیم بە ئەسیری گرت و بۆ مەلامستەفام برد؛ تانکێکم شکاند؛ چیم کرد و چیم کرد! پۆلیس قڕ گرتوویە. خەبەری بۆ ئەکرەم ناردووە، ئەکرەم لە زیندانی دەرێناوە؛ جلی بۆ کڕیوە و هاتۆتە شام، بۆتە پەناهەندەی عیراقی. لە ئوتێلەکە دیتمەوە:

- دەی چۆنی؟

- خودێ مانگێ دە دینار وەردەگرم، تێرا ئارەقم ناکا!

- ماڵ و منداڵ چی؟

- گەلەک باشن!

ڕۆژانە کتێبێکی -کە پشتەکەی چەکچ و داس یان عەکسی شیووعیە زلەکانی پێوە با- دەبردە قاوەخانەی کومۆنیستان، لە سەر لا ڕادەکشا کە هەموو پشتی کتێب ببینن؛ یانێ ها منیش شتم! مامۆستا، مامۆستا کەری نێر نەیدەکێشا. نامەیەکی لە بەغداوە بۆ هات؛ هەڵمپچڕی، کوڕەکەی نووسیبووی: بیستوومانە حقووق وەردەگری. تۆ لەوێ ئارەق دەخۆیەوە، ئێمەیان لە سەر کرێ نەدان دەرکردووە. لە ناو کاولێک داین؛ جا وا دەبێ؟ شێخ عابیدم لۆمە کرد: نامەرد وا دەبێ؟!

- سەیدا من سەد لیرەی سووری وەردەگرم؛ چی بنێرم؟

- ئەگەر وەک من بکەی، ڕۆژی بە ئوتێلەوە بە دوو لیرە بەڕێ دەچی. چل لیرەش بۆ منداڵەکانت بنێرە!

- تۆبە لە سەر دەستت: تۆ خۆت پووڵی من وەرگرە، چی دەڵێی وا دەکەم، دەمیش لە ئارەق نادەم. سەری مانگ هەشتا لیرەی هێنا و مەستیش بوو:

- بە خوا بیستەکەم لە قەرز دایەوە!

- ئەمجار قانت بێ؛ ئیتر بەسە.

- تۆبە لە سەر دەستت...

گوتم: بۆ عەریزە نادەی بە دەوڵەت کە من باوکم هەزار تفەنگچی هەیە؛ لە زاخۆیە. نووری سەعید لێی دەترسێ. شیلە وا بیلە وا. عەرەب کەرن؛ لێکی نادەنەوە؛ لەوانەیە حقووقت زیاد کەن.

- دە بۆم بنووسە دەیخەمە پۆستەوە.

- دوای چەند ڕۆژێک بە پەلە هات: سەیدا! سەبری عەسەلی سەرۆک وەزیر داوای کردووم.

- بچۆ!



- قەت وەزیرم نەدیتوون؛ سام دەمگرێ. فێرم کە!

- بچۆ ژوور، کلاوت داگرە، سەرتی بۆ دانەوێنە، بلێ ئەو سەرەم لە ڕێ دایە! ئەگەر گوتی چت دەوێ؟ بلێ قوربان ئارەق و قەحبە زۆر گرانە، بۆ پەناهەندان کۆپۆنمان دەنێ با لە سەر حیسابی دەولەت بێ!

- سەیدا تۆ گاڵتەم پێ مەکە!

گوتم: هەر چی لە عەریزەکەدا نووسراوە بیلێ و بلێ پارەی بابم نامگاتێ، حقووقم بۆ زیاد کەن؛ برایەوە.

شێخ لە وەتاغی چاوەنۆڕی چاوەنۆڕە.

- فەرموو بچۆ ژوور.

گوتی: هەر وە ژوور کەوتم، باسی کڵاو داگرتنەکەم هاتە بیر، لە پرمەی پێکەنینم دا. سەرەکوەزیر ترسا، گوتی: چییە؟ شێتە؟!

- نا قوربان، هەڵامەتمە.

- چای بۆ بێنن.

چام بە دمەوەیە دەیخۆمەوە. پرسی: دەی دەتەوێ چت بۆ بکەین؟ نەقلی کۆپۆنم وە بیر هاتەوە، لە پرمەم دا، لیک و چلمم دەگەڵ چایی تێکەڵ بوو! بانگی کرد: بیبەنە دەر! ئەوە شێتە! دەریانکردم. ئەوەش بەزمی تۆ!

پاش حەوتەیەک بە پێکەنین هات: سەیدا! هەشتا لیرەم حقووق بۆ زیاد کراوە؛ زۆرت مەمنوونم. ئەمجار هەشتام دەدا بە خۆی، سەتم بۆ مندالەکانی دەنارد.

شێخ غەیب بوو؛ نەهاتەوە. ئوتووچی و خاوەن ئوتێل گوتیان پوولی ئێمەی لە سەرە. گوتم لە سەر من. پاش پازدە ڕۆژ شێخ هاتەوە. لە دوورەوە دەیگوت: بەتاڵم کرد! نامەوێ! سەگی سەگباب!

- وەرە سەرسەری! لە کوێ بووی؟ ڕاستی بلێ!

- کوڕە دەگەڵ پیرێژنێکی هەشتا ساڵەی ڕووس، کە لە شۆڕشی ئۆکتۆبر هەڵاتووە، بوومە دۆست؛ چوومە ماڵی. زۆر خۆش دەژیام. شەوانە لەبەر ڕادیۆ گرام ڕەقسمان دەکرد. چاوێکی دەسکرد بوو؛ مەمکی پەڕۆ بوو؛ سەری کەچەڵ بوو -وەک خۆم- پرچی لە بازاڕ کڕیبوو؛ ددانی تاقم بوو. کەچی دوێنێ شەو لە ڕەقسا قنگی لێ کەوت! ئەویشی نەبوو! بەتاڵم کرد و هاتوومەوە ئوتێل!

- دەی سندان لە سەرت دا بۆ ئەو دڵداریەت!

***

لە کوردستان بیستبووم مەرقەدی ئەولیایەک بە ناوی «ئەییووبی ئەکراد» لە شام هەیە؛ لاقێکی لە قەبرەکەی دەرێناوە و هەر هەفتەی لاقەولاق دەکا. بابم کە لە ڕێی حەج چووبووە زیارەتی؛ دەیگوت: ئەو لاقە بە فێڵ دەزانم، ڕەنگە مۆم بێ. چوومە زیارەتی. لە سەر دەرگای مەرقەدی لە بەرد هەڵقەندرابوو: «پونبوغ بابا ئەکرادی ئەییوبییەن ئەولیائەڵلاسی بیری در»: بابەلۆکە یەکێکە لە مشایخی کوردی ئەییووبی. بەلێ لاقێکی سپی و جوان و قەڵەو، دە ناو لۆکەدا لە شباکەوە دیارە. ناهێڵن دەستی لێدەی. بە خاوەن ئوتێلم گوت:

- ئەبوو ئەییووب! ئەم لاقەت پێ ڕاستە؟

- بەڵێ مۆجزاتە.
- جا بۆچی لە قەبرەوە دەریهێناوە؟
دەڵێ: ئەم لاقە بە هینی ژنی ئەو عەرەبانەی لایان وایە کورد ئەولیای نییە!
ئێوارەیەک ئەبوو ئەییووب گوتی: میوانێکی عیراقی زۆر رووتم هەیە؛ دەڵێ لیرەیەکم حەقی خەو پێ نادرێ. بۆ ناچی بیبینی؟ خۆی پێ ناساندم: «جەمال حەیدەری» سکرتێری حیزبی شیووعی عیراقی:
- ئەمساڵ لە پاییزی پەنجا و شەشدا، لە کۆنگرەی حیزبدا، بڕیار درا کوردستان ماڵی کوردانە و کورد حەقی هەیە کوردستانی گەورە درووس کا و ئێمەش یاریدەی دەدەین. بەرهەمی کۆنگرەمان کردۆتە کتێب. دوو نوسخەمان زیراکس کردووە؛ یەکیانم بۆ خالید بەکداش هێناوە.
- سەیرە! ئێوەی نەتاندەهێشت ئەندامی کورد بە زمانی خۆی قسە بکا، چۆنە ئێستا باسی کوردستانی گەورە دەکەن؟!
- ئاخر برا ئێستا کە فشاری دەوڵەت زۆر بووە و برا کوردەکانیشمان هێزێکی باشن، سیاسەتمان دەبێ بگۆڕین!
- بەڵێ: «بۆز بە لەڕی»... ناتوانم بیخوێنمەوە؟
- هەر ئەمشەو دەتدەمێ. بەیانی تاو هەڵات دەبێ بیبەم بۆ هەواڵی خالید.
هەر لە نوێژی شێوانەوە، بەر لەوە هیچ بخوێنمەوە، بە پەلەپەل بە میداد تا بەرەبەری تاوهەڵات سەر لەبەری کتێبە بۆرم نووسیەوە. ژمارەی سەفحەکانیشم نیشان کرد کە باسی کوردی تیایە. کتێبێک پتر لە چوارسەد رووپەڕ بوو. تاو هەڵات کتێبم داوە؛ گوتم: چاوێکم پێدا خشاندووە؛ زۆر باشە! ئەمجار بە کاوەخۆ هەرچی دەبارەی کورد و کوردستان بوو جیام کردەوە؛ کە لە فلان رووپەڕدا وا دەڵێ و لە فلان جێدا، وا.
- ئاپۆ عوسمان فریا کەوە!
- هەر زۆر زوو کردیە نامیلکەیەکی سەربەخۆ. پێشەکییەکی بە عارەبی لە سەر نووسی کە: با بمرن ئەوانەی دەڵێن شیووعی بۆ کوردستان حەول نادەن و باوەڕیان بە قەومیەت نییە!
- چۆنی چاپ کەین؟
پیلی کێشام بۆ چاپخانەی تەرەققی لە گەڕەکی شیعەنشینی شام. گوتی: عەزیز ئەمە چاپ کە؛ ناوی خۆتی لێ مەدە!
- دیارە قاچاغە؟
- بەڵێ؟
- فۆرمەیەک چل لیرەی حەقە کە هەزار نوسخە بێ.
هەر بە چوار رۆژ ئامادە کرا. ئاپۆ و من، جا بە باوەش هەڵگرە و بە چاخانەی عیراقی و کۆمۆنیستانی سووریەوە بگەڕێ. هەر یەکەی سەرو نوسخە بە خۆڕایی وەرگرن. هەواڵی خالید جەمالی هێنابووە داری سەماواتی:
- بە من دەڵێن کەس نەیدیوە و کەس نایبینێ و قسەکە لە ناو خۆماندا دەمێنێ؛ کەچی دەچی پاش ملە ئەو گووکارییە دەکەی؛ کە نرخ و ئیعتوباری مارکسیسمی راستەقینەش لە بەرد دەی؟!
- هەی بە تەڵاق! هەی بە قەبرێ لینینی چۆتێ! عیلم و خەبەرم لێ نییە؛ دیارە پیاوی



ئامریکا ئەم کارەیان کردووە!

بەلام بێبەهرە بوو؛ جەمال ترۆ کرا. وەک دەرمانی چاوێشە لە نوسخەکان دەگەڕان کۆی کەنەوە و بیسووتێنن!

جگەرخوێن و «هاراکێل» ناوێکی ئەرمەنی هاتنە شام، کە بچنە زیارەتی خالید بەکداش. «دوکتور نوورەدین زازا» و منیش ڕەگەلیان کەوتین. چووینە ماڵ لە گەڕەکی کوردان. خالید بەکداش -کە پیاوێکی کەلەگەتی چوار شانەی زۆر بە سەر و سیما بوو- هاتە لامان. بە خێراتنی گەرمی کردین و بە کوردی دەیدواندین. قاوەیان هێنا. بەر لەوە هیچ گفتوگۆیەک بکەین، سرتەیەکیان دەگەڵ کرد، گوتی: کارەکە گرینگە! تکاتان لێدەکەم سەرم بدەنەوە؛ ئێستا دەبێ بڕۆم.

هەر ئەو ڕۆژە تووشی هەر شیووعییەک دەبووم -عەرەب یان کورد- دەستی توند دەکوشیم: تەبریکت عەرز دەکەم! هەواڵی خالید تۆی زۆر پەسند کردووە و دەڵێ زۆر زیرەکە؛ خۆشم دەوێ! سەرم سووڕ ما: خودایە! «بە خێر هاتی، سەلامەت بی، چۆنی؟ خراپ نیم»، زیرەکی چی و تاریفی چی؟! ڕۆژی سێهەم چووینەوە. قسە زۆر کرا، پرسیار دەکرا، وەرام دەدرایەوە. گوتم:

- هەواڵی خالید! ئیجازە بدەی چەند پرسێکم هەیە.
- فەرموو!
- هەرمەنیەکانی سووریا چەند دەبن؟
- دە هەزار کەس.
- یانی دوو هەزار خانەوادە. هەموویان کومۆنیستن؟
- نەخێر، سەتی هەشتا داشناگن، سەتی بیست هەواڵی ئێمە، یان لاگیرمانن.
- هەواڵی کوردی سووریا چەندن؟
- جگە لە دانیشتووانی ئیعزاز و عیفرین، ڕەنگە چوارسەد هەزار نفووس بن.
- سەتی چەندیان لاگیری حیزبی شیوعین؟
- سەتی نەوەد و دوو، ڕەنگە پتریش.
- نەشرەی حیزبی بە چەند زمان بلاو دەکرێتەوە؟
- بە عەرەبی و بە خەتی ئەرمەنی، ئاراکێل دەزانێ!

ئەدی چۆنە بۆ ئەو هەموو کوردە کە هەواڵن و عارەبی نازانن، نەشرەیەک بە کوردی و بە خەتی لاتینی کە زۆربەیان دەیزانن بلاو ناکەنەوە؟!

هەواڵ خالیدی وا گران و سەنگین، وەک دڕووی بن کلک دەی، لە سەر چۆک چەقی، سوور و ڕەش هەڵگەڕا، هەتا هێزی تێدابوو نەڕاندی:

- دیسان کورد! دیسان کورد! ئای چۆن لێم بۆتە بەلا! بۆ ناچن لە ئێران کە نیو ملیۆن کوردی هەیە داوای حەقی کورد ناکەن؟! نەقڵی ئەوەیە پەیامنێری ڕۆژنامەی تایمز وتوویژم دەگەڵ دەکا، باسی ولاتی عەرەبی بۆ دەکەم، دەڵێ: تۆ کە کوردی دەربارەی کوردستان فکرت چۆنە؟!

من ڕەئیسی حیزبی کومۆنیستی سووریە و لوبنانم، قبووڵ ناکەم جگە لە باسی عەرەبم لێ پرسن؛ تێگەیشتی؟!

- هەواڵی خالید! من گوێم گران نییە؛ لاشت وا نەبێ قسەی بەقەوکردن کارم چاکتر لێدەکا.

زۆرم دەنگی بەرز بیستووە. بۆ لەسەرخۆ جوابت نەدامەوە؟ ئەو جار پرسیارێکی دیکەم هەیە؛ تکایە لێم‌گەڕێ عەرزت بکەم.

- بلێ! (وەک لە ئەشکەوتدا بنەڕێنێ!)

- تۆ پیاوێکی، بە شایەتی هەموو خەلکی ولاتی عەرەب، لە هەموو کەس زاناتری بە ئەحوالی دنیا و گەلانی دوور و نزیک. ئێرانی داگیرکەری کوردستانی پادشایەتی کۆنەپەرست ئیقرار دەکا کە کوردی ئێران خۆ لە چوار ملێون دەدەن؛ تۆ کە لێم روونە دەزانی لە شیلی و بەرازیل چەند مریشک هەیە، چۆنە دەفەرمووی کوردی ئێران نیو میلیۆنە؟!

- وام خوێندۆتەوە!

من وا بیر دەبەم تۆ لە «دائیرەتولمەعاریف»دا بۆ ناوی کورد گەڕاوی. لە رووپەڕی هەوەلدا دەلێ کوردی موکریان نیو ملیۆن دەبن. نەشپەڕیویەوە بۆ رووپەڕی بەرانبەری کە دەلێ ئەگەر کوردی لای سەلماس و خۆیە و ورمێ بە موکریانی حیساب کەین، کوردی ئازەربایجان نزیکەی هەشتسەد هەزارن.

نازانم دەیەویست چیم جواب بداتەوە، دوکتور «نورەدین زازا» بە فەرانسی قسێکی کرد؛ هەوال خالید گرژ بوو، ئیتر نقەی لێ نەهات. دیار بوو بەو قسە زۆر رقی هەستابوو. هەستاین خواحافیزیمان کرد. ئێستا و ئێستاش هەر چەند لەبەر دوکتور زازا پاڕامەوە، پێی نەگوتم چی پێ گوتووە. ئیتر لەو رۆژەوە تەبریک عەرز کردن نەما. تووشی هەر شیووعیەک دەبووم لووتی هەلدەکرد. دەیانگوت: هەژار عەلامەتی ئیستفهامی لە سەرە! کە نەمدەزانی مانای چییە؟!

دوکتور زازا گوتی: شەوێک چوومە سەردانی «فوئاد قەدری» کە وەکیلی پارلەمان بوو. خالید بەکداش هات؛ زۆر زوو رۆیشت. فوئاد -کە بۆ بەڕێ کردنی چووبووە دەر- هاتەوە، پێدەکەنی:

- خالید بەکداش دەلێ: نورەددین مەعمووریەتی هەیە و گومانی لێ دەکرێ، خۆتی لێ بپارێزە!

لە بیرم چوو ئەمەش بلێم: لە سەرەتای دانیشتنماندا کوڕێک هاتە ژوور و بە سرتە دواندی. خالید بەکداش زۆر گەشاوە:

- بە خوا خەبەرێکی خۆشە! ئەوە لە کوێدا نووسراوە؟

- لە رۆژنامەی تایمزی لەندەندا.

- وامزانی تاس نووسیویەتی! هیچ نییە!

**چۆن ببوومە سووریایی؟**

که له عیراقەوه هاتمه ماله حاجۆ، گوتیان نابێ بچیه ناو گوند؛ پۆستی پۆلیس لێرەیە؛ دەتگرن. سێ رۆژ ماتەمم هەلگرت؛ خۆم پێ نەگیرا، چوومە قاوەخانە. مودیر پۆلیسەکە گوتی:

- نایەی تەختەیەک بکەین؟

- با بیکەین!

- خەبەری عیراق چییە؟!

- چۆنی خراپە وایە! پۆلیس وا زالمە، نووری سەعید وا سەگبابە، هەر باسی ناکرێ.

ئەو مودیر پۆلیسە ناوی عەبد بوو؛ عەرەبی لای حەلەب. کرمانجی زۆر باش قسە دەکرد. مالی حاجۆ -کە دەگەڵ ئەویان دیبووم- نیگەران ببوون؛ بەلام بەخێر گوزەرا و دەگەڵ عەبد بووینە ئاشنا و هاودەم. دەمەویست پێناس وەرگرم، ببمە خەلکی ولات. عەبد گوتی: چەندی لە دەستم بێ یاریدەت دەدەم؛ بەلام پێناس وەرگرتن زۆری زەحمەت دەوێ.

عەریزەم دا کە من لە تورکیا بووم و خەلکی جزیرەم. پێناسم نییە؛ بمدەنێ. هەموو رۆژێ بچۆ قامیشلی، بچۆ حەسەکە، هەزار کوناوکون بکە. تا پاش نیوەڕۆیان زمانم دەکێشا و هانکەم دەهات. پەروەندە ئەوەندە ئەستوور ببوو لێی دەترسای. بیبە شام. هەزار و پەنجا کیلۆمیتر بە ئۆتووبووس، نیوەی ڕێگا پتری تۆز و خۆلی سەحرا. چەند ڕۆژێکیش لە شام سەرم بە سەد ئیدارەدا کرد و مل‌کز وێستام. بچۆوە قامیشلی، شایەت پەیدا کە قەبری بابت لە گوندی مەعشووقە. پۆلیس دەبێ ئیمزای بکا. چەچاناغا دەیگوت: تێناگەم بۆچی گۆڕی باوکت بۆتە مەرقەدی مووسا پێغەمبەر! دەیانەوێ زیارەتی بکەن! دیسان هەلسووڕێ. ئەوەندە لە نێوان قامیشلی و شاری «دێریک»دا هاتوچۆم کردبوو، پۆلیسەکانی پۆستی «چەلاغا» هەموو دەیانناسیم و بەو جۆلاتەنانەوەم پێدەکەنین. ڕەئیس پۆستی چەلاغا گوتی: بەزەم پێتدا دێ! بێنە من و پۆلیسەکان بۆت ئیمزا دەکەین کە گۆڕی بابت لە مەعشووقە و ئێمە لە شاردنەوەیدا حازر بووین.

بینێرەوە شام. لە شام دەلێن ناقیسە؛ بۆ خۆت بچۆ! دیسان ئەوسەر و ئەوسەر، دوو هەزار و سەد کیلۆمیتر بە ناو گەرما و تۆزدا سەفەر بکەم. لەم دەفتەر بۆ ئەو دەفتەر هەلێ، بگەڕێوە. لە بەیانەوە تا نیوەڕۆ ژان بکە، بگە کارمەندی گەورە.

- پەروەندەت ناتەواوە!

- قوربان چی ناتەواوە؟

- تەمبرەکانی یەک قرشیان کەمە!

- بۆ یەک شایی ئەو عەزابەم دراوە؟! ئاغای موحتەرەم! نەدەکرا بە خێری خۆت -کە دەتزانی چەندم زەحمەت دیوە و چەند دوورم- تاقە شایەک تەمری پێوە نووسێنی؟!

- من بۆ پوولی خۆم خەرج دەکەم؟ خۆت هاتووی تەمری یەک شایی بێنە!

پەروەندەکەت بەرەوە حەسەکە. لە شامەوە چوارسەد کیلۆمیتر تا حەلەب. لە حەلەبەوە تا قامیشلی شەشسەد و پەنجا کیلۆمیتر، هێندێک کۆنە ئیسفالتی بە کەند و لەند و بەشی زۆری بە ناو تۆزی سەحرادا کە بەرازیش دەخنکێنێ. هەر ڕۆژە تەنیا ئۆتۆبۆسێک بە ناوی پۆست وەڕێ دەکەوێ، دەگەڵ بردنی موسافیر نامەی پۆستیش دەبا. بەرەبەیان هێشتا نەبۆتە ڕۆژ، سواری پۆست بووم و پەروەندە کوێت لە باوەشدا، لە قاوەخانەی «ڕەققە» بۆ ئیستراحەت دابەزین.

چووبوومە سەر پێشاو، هاتمە دەر گوتیان پۆستە ڕۆیشت.

- چی؟ ئەی مالی ویرانم! پەروەندەکەی شەش مانگ لە دووی ویلم لە سەر جێگاکەم لە ماشیندا بەجێ ما. ئەو جار چی بکەم؟

بە جادەدا غار دە! هەناسەبڕکەت بگاتێ؛ دەست بلند کە! هاوار کە! ماشین دوورە، دەنگم نایگاتێ و لە پێش کەوتووم. لەپڕ دیتم ماشین ڕاوەستا. وە باو کەوتمەوە: ئۆخەی، گوێیان لە دەنگم بوو؛ ڕایانگرت. گەیشتمە ماشین. بۆیە ڕاگیرابوو چونکە منداڵێکی چکۆلە گووی کردبوو، دابەزیبوون خاوێنیان دەکردەوە. پەروەندەیەکی سەیرە: لە سەر گوو گومم کرد، لە سایەی گوو دەستم کەوتەوە! ئارەقی ڕەش و شینم کردووە. بە دڵەکوتێ و هانکە- هانک سوار بووم. بە شۆفێرم گوت: برا بەجێتان هێشتم؛ خوا هەڵناگرێ.

- لە سەر کام کورسی بووی؟

- هۆوە!

شۆفیر هەستا، شاگردەکەشی هێنا؛ عەرەبێکی کە لە تەنیشتمەوە بوو، ملی گرت و «چت خواردووە ترش و چەوەندەر؟»، بە شەق، بە مست شلی کرد؛ دمی دە خوێن هێنا. لە دەرگای ماشێنەوە هاویشتییە دەر:

- سەگی کوڕی سەگ! دەبێ لەم سەحرایە بەڕەلات کەم. پێش حەرەکەت چوار جار بانگم کرد: موسافیر تەواون؟

- بەلێ. بەو سەگبابەم گوت: کوا کابرای تەنیشتت؟

- ڕۆیشت بۆ شاری ڕەققە، گوتی چیدی نایەم. تۆمەز تەماحی کردۆتە ئەو پەروەندە؛ لای وابووە پوولی تێدایە. ئەگەر ماشین ڕانەوەستایە، ئەو بێچارە چی دەکرد؟

بە تکا و ڕجای من و چەند کەسێک، دزەیان سوار کردەوە و سێ چوار زللە و شەقیتریشی خوارد.

گەرمایەکی سەخت بوو. تۆزی ماشینیش گاڵەی دەکرد. نەفەسم زۆر تەنگ ببوو، پەنجەرەی لای خۆم کردەوە، تۆز هاتە ژوور. لەو سەرمەوە کابرایەک گوتی:

- دایخە!

- لە گەرما هەڵناکەم، دەمەوێ بای بێ.

- دایخە بە تۆز خنکام.

- دایناخەم! وەرە جێمان بگۆڕینەوە، ئەگەر تۆ توانیت خۆت دایخە.

- ما فیکری تە چییە؟

منیش گوتم: ما فکرێ تە چییە؟

ئەم قسە وەک دندووک لە عەرزدانی دوو کەڵەشێران بوو کە دەیانەوێ پێک هەڵپڕژێن.

- هەستم تەنبێت دەکەم!

- تۆ هەستە تا باشت بیراز بکەم!

- ڕابە!

- بۆ وێستاوی؟

کابرا مات بوو؛ سەری هەڵێنا: تۆ هەژار نیت؟

- با.



- خەڵەتی وا ناکەم دەگەڵت بە شەڕ بێم. بەلام پێم ناڵێی: تۆی لە ئێران قاچاغ، لە عێراق قاچاغ، لە سووریا بێکەس و بێعاشیرەت، چۆن دەوێری شەڕ بکەی؟!

- ئاخر هەر بۆیە لە دنیا ڕاو نراوم کە لە سەر خۆم وە جواب هاتووم و دیفاعم لە حەقی خۆم کردووە. بە خوا هەستابای، بە پێلاقە لە سەر زگت هەڵدەپەڕیم!

گەیشتینە حەسەکە. لام وایە پتر لە شێست حەنبالی کوردی مەلئەستوور، بە کورتان و گوریسەوە، هاتبوونە بەخێر هێنانی کابرای تەمامان بوو لێک دەین. شووتی و ترێ و دیاریتریان بۆ هێنابوو. ترسام حەنبالانم لێ دەنگ دا، کەولم داکەن. ئەو پیاوە «برایم مەتینی»، سەرۆکی مەتینیەکانی ئاوارەی لوبنان و سووریا بوو؛ کە عەشیرەتێکن و ئاوارەی ئەو ناوە بوون. ئیتر لەو ساوە دەگەڵیا زۆر بوومە دۆست و ئێستاش کە لە بێرووتە، سەلام بۆ یەکتر دەنێرین.

لە حەسەکە حەوالەی لێژنەی نیزامی کرام، عومرەکەم بەراورد کەن. چوار ئەفسەری گەورەی شان بە بریقە لێمیان ڕوانی:

- درۆ مەکە! عومرت چل ساڵ نابێ؛ دەتەوێ سەربازی نەکەی. ڕاست بڵێ چەندی؟

- قوربان منیان بۆیە ناردۆتە لاتان کە ئێوە هەموو پسپۆڕ و لە تەمەن زانن. خۆتان ئەگەر بە عیلمی خۆتان عەمەل بکەن، دەزانن کە ڕاست دەکەم؛ قسەی من زیادییە.

کەیفیان بەو تاریفە هات. یەکیان هەستا، دەتگوت کەر دەکڕێ: تەماشای پشتی گوێ، لاملی کردم.

- درۆ ناکا! عومری چل و دوو ساڵ و چەند مانگێکە!

نووسرا؛ کەچی عومرم سی و شەش بوو!

- بچۆ دێریک، مەحکەمە قەرار بدا و پێناس وەرگرە.

هاتمەوە تربەسپی. باس و خواسم گێڕاوە.

- من نووسیومە ژنم ناوی مەعسوومە محەممەدە؛ کوڕێکم محەممەد، کوڕی چکۆلەم ناوی ئاگرییە؛ ماڵ و منداڵ لە بەغدایە. چۆن بکەم؟

حەمە شەریف حاجۆ -کە کاری ئیداری لە لایەن حەسەنەغاوە پێک دێنا- خۆی گەیاندە دێریک و هاتەوە.

- حاکمی دێریکم بە بەرتیلێک ڕازی کردووە کە سەنگ و سووکیمان دەگەڵ بکا و بێتە ماڵێک بازجوویی بکا. بەلام دەبێ ژن و منداڵەکان حازر بن، ژنەکە خۆی جوابی حاکم بداتەوە.

- دەی ژن بە منداڵەوە چۆن پەیدا کەین؟

ژنێکیان لە عەشیرەتی کۆچەر دیتەوە، فێریان کرد خۆی بە ناوی مەعسوومەی کچی محەممەد و «نازێ» ژنی «عەبدوڕەحمان» و دایکی محەممەد و ئاگری بە حاکم بناسێنێ. ژن ئەوەندە زیرەک بوو، هەر بە دوو سێ جار گوتنەوە لە بەری کرد و منداڵی باوەشی ئامادە کرد. شاهیدی پیاویش دەبێ دوان بن. حەمە شەریف یەکێک بوو، عەزیز ناوێک کە ئاشنای ماڵە حاجۆیە فێر کرێ و کوڕێکی دە ساڵەی لە جێی محەممەد بێ. ژنێ -کە ئێستاش نەمزانی ناوی چییە- بە منداڵی خۆیەوە.

حەمە شەریف جێپی لێخوڕی، چووینە دێریک، ماڵی عەزیز. عەزیزمان فێرە شایەتی کرد. کوڕێکی دە ساڵەی هەر ناوی محەممەد بوو، فێرمان کرد ئەگەر حاکم پرسی، دەست بۆ من و ژنەکە ڕادێرێ، بڵێ ئەوە باب و دایکمن. حاکم پاش سەعات دوو هات. حەمە شەریف هەر پێم

دەڵێ: سەیدا باش جواب بدەوە، مەشلەژێ. بە ژنەکە دەڵێ: دەترسم دەمت تێک هاڵێ و لە بیرت بچێ کە دەبێ بڵێی چی. عەزیز ئاگات زۆر لە خۆت بێغەڵەت نەکەی.

حاکم قاوەیەکی خواردەوە و فەرمووی با دەست پێ بکەین.

- ناوت؟
- عەبدوڕەحمان
- باوکت؟
- حەسەن.
- دایکت؟
- فاتمە
- عومر؟
- چل و دوو ساڵ.
- لە کوێ تەوەلودت بووە؟
- مەعشووق
کوا ژنەکەت؟
- ئەوەتا!

***

- ناوت؟
- مەعسوومە
- بابت؟
- محەممەد
- دایکت؟
- نازێ
- ژنی کێی؟
- ئەو کابرایە کە ناوی عەبدوڕەحمانە
- منداڵت؟
- محەممەد (کوڕی عەزیز هەرای کرد: من) و ئاگری کە بە باوشمەوەیە.

ژن وەک ئاوی ڕەوان، بێ گرێ گوتی. نۆرەی عەزیزی خانەخوێ هات. ئەویش هیچی لەبیر نەچوو. نۆرەی حەمە شەریف هات کە هێندەی ڕادەسپاردین سەهو نەکەین.

- ناوت؟
- حەمە شەریف حاجۆ
- ناوی ئەم پیاوە؟
- عەبدوڕەحمان
- ناوی بابی؟
- ها، ها! ببەخشە لە بیرم چۆتەوە!
- کوڕە! باوکی عەبدوڕەحمان حەسەن ناوی چ بوو؟
- باوەڕ کە لە بیرم نەماوە!



- حەمەشەریف! تۆ حەمەشەریف حاجۆ، یانێ بابت ناوی حاجۆیە. دەی عەبدوڕەحمان حەسەن، بابی ناوی چییە؟

- قوربان بە سەرت دەمزانی؛ ئێستا لە بیرم چۆتەوە!

حاکم لە قاقای پێکەنینی دا: بابە شایەتیەکەتم قبووڵە و کار تەواوە!

وەرەقەی داینێ بچین پێناس وەرگرین. چەند ڕۆژ هەر بەوە پێکەنیوین ژنە کۆچەر وا زمان ڕەوان و حەمە شەریف ئەم گولەی بە ئاودا دا. بەڵام بەرتیلی کارەکەی ڕاپەڕاندبوو. چووینە ئیدارەی شوناسنامە. لەوێش ئەفسەرێک پێناسی دەنووسی. ناوی «ئاگری» قبووڵ نەکرد، گوتی دەبێ ناوی عەرەبی بێ. گوتم: ئەگەر ناوی بنێم کیلاب (سەگەل) چۆنە؟!

- ناوێکی خۆشە! ناوی یەکێک لە ئەجدادی پێغەمبەرە!

- ئەدی «شێر» چۆنە؟

- شێر چییە؟

- یانی ئەسەد.

- قبووڵ نییە!

- دەسا بنووسە مستەفا.

لەو ساوە ناوم بوو بە «عەبدوڕەحمان حەسەن»؛ بەڵام خەڵکی قامیشلی ناویان نابووم «حاجی».

حەسەناغا مەزن بوو؛ خۆی دەکار و بار نەدەگەیاند جەمیلاغا کاری دەشت و باغ و کاسبی لە مل بوو. چەچاناغا شەرعی ڕەعیەتانی دەکرد. حەمەشەریف پیاوی دەرک و دیوانان بوو. پیاوێکی زۆر قەڵەوی زگزل، ڕووحسووک، قسەخۆش، زۆر لەسەرخۆ و پشوودرێژ، قەت تووڕە نەدەبوو. هەمیشە پێدەکەنی بەڵام بە ڕۆژ لێت بپرسیبا ئەمشەو چت خواردووە، لە بیری نەدەما. لە کن پیاوانی دەوڵەت لە قامیشلی و حەسەکە زۆر خۆشەویست و موحتەرەم بوو. ڕۆژێک تیلگرافێک هات: «حەمەشەریف حاجۆ! دووشەمە سەعات هەشت خۆت بە دادگای حەسەکە بناسێنە». یەکشەممە بوو. حەمەشەریف ڕۆیشت. سبەی ئێوارە هاتەوە.

- ها، خێر بوو؟

- خێری لەوە خۆشتر چۆن دەبێ؟! دادڕەس عارەبێکی عەگاڵ بەسەری نیشان دام:

- ئایا وەختێ کە تۆ لە حەسەکە کلاسی چواری ئیبتدایی بووی، زەوی ژمارە ٢٥٦ لە دەشتی بەرچیای عەبدولعەزیز، بە دەست ئەو پیاوەوە بوو؟! دەڵێ حەمەشەریف شایەتمە!

- برای عەرەب! جگە لە من شایەتی‌ترت نییە؟

- نە بە خوا.

- دەسا دۆڕاندت! جەنابی حاکم! بوومە گاڵتەجاڕی برا و ئامۆزاکانم. بەیانی لێم دەپرسن شەو چمان لێنابوو؟ لە دە جار جارێک نایزانم! سی‌وشەش ساڵ لەمەوبەر، پارچە زەوی ژمارە ٢٥٦، لە دەشتی حەسەکە، خوا ئەیزانێ دەشتی بەر چیام لە بیر نەماوە تا ژمارە و کابرای وەرزێری، چ جای پارچەیەکی بناسم!

حەمەشەریف دەیگوت: ڕۆژێک من و جگەرخوون -کە ئەویش وەک من زگزلە- لە دیوەخان نوستبووین. کابرایەکی گوندی سەری بە ژوورا کرد، گوتی: ححم! خۆزی ئەو هەر دوو گای من بان!!

هەر لە شەقلاوە بەیتی سەرەمەڕ و لاسایی سەگ و مانگەشەوم نووسیبوو؛ کە یەکەم تەرجەمە لە «سەباحەدین عەلی»، نووسەری تورکەوە و دووهەم نومایشنامەیەکی یەک پەردەیی دژی ئەمریکا و شا و «جەلال بەیار» و «سینگمان ڕی» بۆ نووری سەعید بوو. لە شام لە چاپخانە قاچاغاکەی تەرەققی چاپم کرد. چوار فۆرمەیەک دەبوو. دەگەڵ زەبیحی نوسخەمان بۆ چەند کەسێک نارد. باقیەکەیشم -کە هەزار نوسخە و شتێک بوو- بردەوە جزیرە.

حیزبی پارتی خەبەری ناردبوو کە بەلکو چاپخانەیەکی چکۆلەی هەرزان بکڕین و بۆ مووسڵی بنێرین. لە شام هەر چۆنێک بوو کڕیمان. ڕۆژێک من لە جزیر بووم، نامەی زەبیحی هات کە: لوولە سۆپەکانم دەگەڵ باری تیجاری بە ئادرەسی حاجی میرزا بۆ ناردووی؛ بۆ خەبەری گەیشتنت نەداوە؟ ئەی خودا! چاپخانە وا قاچاغ، حاجی کووتاڵفرۆش، چی بە سەر چییەوە؟! چوومە ڕاستە بازاڕی قامیشلی، دوکانی حاجیم دیتەوە؛ تاوێک بە ماتی دانیشتم. نازانم بڵێم چی؛ ناوێرم. حەنبالێکی گاراژ هات:

- مام حاجی دەڵێن کرێ بارەکەی سندووقمان بۆ بنێرێ.

حاجی گوتی: نە ئی منە، نە دەزانم کێ ناردوویە، نە دەزانم چی تێدایە؛ چۆن کرێکە بدەم؟!

گوتم: کرێکەی چەندە؟ حاجی تێگەیشت. دەستی برد شەش لیرەی دا بە کابرا.

- برا! دەگەڵ عەبدوڵلای کوڕم تماشامان کرد. من گوتم ماشینی بەردەهاڕینە؛ ئەو گوتی مۆتۆڕی بەرقە!

- بەڵێ مۆتۆڕی بەرقە؛ بۆ ئەحمەد حوسێنم کڕیوە کە ڕایسپاردبووم!

محێدین حاجۆم بە جیپێکی سەرداپۆشراوەوە هێنا دەرکی بازاڕ؛ چاپخانە قولەمان بار کرد و بردمانەوە تربەسپی. لە ڕێ تێمگەیاند ماشینی چاپە و قاچاغە. بردی لە کادێنێک بن کای دا. کاغەز لە سەر کاغەز بە ڕەمز بنووسە: «وەرن شتەکە بەرن!»، جواب نەدەهات. دوای دوو مانگ یەزیدیەک هات؛ نامەی حیزب و نامەی یەزیدخانی یەزیدی -کە دەمزانی ئەندامی پارتییە- هێنا. حیزب دەڵێ ماشینەکە بدەن بەو؛ یەزیدخانیش دەڵێ دوو گلۆس جگەرە و چوار بوتری ئارەقم بۆ بنێرە. من کە نەمبوو، جەمیل حاجۆ بۆی نارد. محێدین دەبوایە بۆی بەرێتە سەر سنوور و تەسلیمی کا. تکام لێ کرد هەر لە عەرزی سووریا دایبنێ؛ نەچێتە نزیکتر.

- بۆچی؟

- نازانم، هەر وام پێ باشە.

- چاپکراوەکەی خۆشم دەگەڵ چەند کتێبێکی عەرەبی باسی کورد، وێڕای چاپخانە نارد. دوای دوو شەو ڕادیو بەغدا گوتی: چاپخانە و نەشریاتی حیزبی پارتی لە موسڵ گیراوە. وەختێ لە زەمانی حوکمی قاسمدا گەڕامەوە، زاهید محەممەد -کە بەچکە کوردێک بوو، ببوو بە عەرەب و ئەفسەری سنوور بوو- گوتی: من دانیشتبووم، یەزیدخان هاتە لای مودیر ئەمن: قوربان! چاپخانەکەم لە فلان جێ داناوە. من خەبەرم بۆ کەسێک نارد کە لام وا بوو پارتییە: نەچن بە لایەوە ئەوانیش دەگرن؛ یەزیدخان جاسووسە.

هەر ئەو زاهیدە ببوە ئاجودانی سەلام عارف و دەگەڵ ئەودا لە تەییارەدا سووتا. ئیتر هەم کتێبی من، هەم چاپخانە فەوتا. سەیری خۆش لەوە دایە کە ئەمنی سووریا بێ ئەوە بزانن ناوەرۆکی کتێب چییە و چەند گاڵتە بە نووری سەعیدی دوژمنیان کراوە، هەر لە ناوەکەی قوشقی ببوون: بەیتی سەرەمەڕ بە «بی.تی.سی.» زاندرابوو! مراد ناوێکی کورد کە مونشی

بەخشداری دێریک بوو گوتی: نامەی نهێنی هاتووە، دەڵێ: گۆڤاری بی.تی.سی. لە عیراقەوە هاتووە؛ مەنعی بکەن!

زەبیحی -کە گوتمان ناوی عیسا عەرەفات بوو- وەلامی بۆ ناردم دەیەوێ نەقلی مەکان بکا بۆ شام. یانێ شوناسنامەکەی لە سەر شام بنووسرێ؛ تا بتوانێ بە هاسانی داوای پاسپۆرت بکا. چوومە دێریک، لە هەموو ئیدارەکانەوە رامپەڕاند؛ مالیات مابوو.

- کوا مەئمووری ئەو کارە؟

پیرەمێردێکی ملچرچی بە نیخەنیخیان نیشاندام، لە قاوەخانە وەنەوزی دەدا. ئەوراقم لە پێش دانا. کابرا لە پشت عەینەکێکی کلکباریکی مەلایانەوە تۆزێکی لێ مۆڕ بۆوە. چوو نازانم لە کوێ دەفتەرێکی بەرگ‌ڕەشی پەرپووتی زۆر زەلامی هێنا؛ تاویک پەڕپەڕی کرد.

- بەڵێ، بە برای خۆم بڵێم، عەرەفاتی بابی عیسا هەر لە زەمانی عوسمانیدا چل و پێنج لیرەی مالیاتی بە ڕێگەدا ڕۆیشتن لە سەرە.

- مامۆستا گیان! بیستبووم مالیاتی هەوا هەڵمژین هەبووە، ئەوەم نەبیستووە!

- تۆ منداڵی، چت بیستووە؟!

- ئەو عیسایە زۆر فەقیرە، من پووڵی بۆ دەدەم. تکایە سەنگ و سووکی دەگەڵ بکە.

ئۆیان- بۆیان پێک هاتین؛ هەژدە لیرەم دایە و نووسی قەرزدار نییە. نامەم بۆ زەبیحی نووسی: ئەو عەرەفاتەی بابت -وەک سەگی پێ سووتاو- هێندە گەڕاوە، بایی چلوپێنج لیرە مالیاتی تۆز لە وڵاتی ئیمپەراتۆری بە با کردووە!

«عەرەب شەمۆ» لە کتێبی بەربانگدا دەڵێ: «ئەگەر مەئمورێکی تورکان لە هەر ماڵە گوندی یەک نانی خواردبا، دەبوو پووڵێکی بدەن بە ناوی میوانانە!».

ئەوسا کە هەژدە لیرەکەم دا، سێ لیرەم لە گیرفاندا مابوو. لە دێریک هەتا تربەسپی سێ لیرەی کرێ ڕێگا بوو. ڕاست ڕووم کردە گاراژ. کابرایەکی دەلاک پێمەوە نووسا:

- سەیدای بەڕێز! فەرموو لادە، بە خوا چایەکەم لە لا دەخۆیەوە.

هەرچی قونەجۆڕەم کرد، کێشامیە دوکان و لە سەر یەک دەیگوت: «تۆ مایەی شانازی کوردانی»!

- دە قوربان با ڕیشت بتاشم، ئەو فەخرەم بە نسێب ببێ!

- بیتاشە!

چەقۆیەکی بە ڕیشم داهێنا، گوتی: پیرۆز بێ. کوڕێکی دە-دوازدە ساڵەی گوتی: بابە چەقۆی بۆ پێدا بێنەوە، زۆری تووک پێوە ماوە!

- برۆ حەرامزادە! سەیدای وا بەڕێز چۆن هێندە عەزیەت دەم؟!

هەستام، گوتی: سەیدا حەقم چوار لیرەیە! لە شامیش دوو لیرە بووا

سێ لیرەکەم دەرێنا:

- لەوە زیاترم نییە.

- باشە خاتری چاوی تۆ! تۆ فەخری کوردستانی!...

ناچار بە پێ ملی ڕێم گرت. دەبوایە هەشت سەعات ڕێ بپێوم تا دەگەمەوە. برسیشم بوو. نیو سەعاتێک ڕۆیشتم؛ خواوڕاستان تووشی حەمەشەریف حاجۆ هاتم و هێنامیەوە تربەسپی.

ڕۆژێ حەسەناغا گوتی: دا بزانە ئەم نامەیە چییە؟ ئەوی بۆی نووسراوە، نەناسراوە. لە سەر

پاکەت نووسرابوو: «برای بەڕێز مووسا عەرەفات». دیوی ژووری نامە بۆ من بوو. غەفوور کەریمەکەی لە سەفەری ڕۆمانیا سەرۆکمان بوو ئەحوالی پرسیبووم. ئەو کەرە کە زانیبووی زەبیحی ناوی عیسا عەرەفاتە، لای وا بوو من -کە ڕەفیقی ئەوم- دەبێ ناوم مووسا عەرەفات بێ!
لە تربەسپی ئاغاکان کتێبخانەیەکی قشپیلانەیان هەبوو؛ خەلکی دیکەش هەبوون کتێبم لێ وەردەگرتن. سەمعان ناوێکی کلدانی -مدیری پۆستخانەی گوند- جارێ گوتی: وەرە کتێبت بدەمێ بۆ مانگێک بەستە؛ خۆ تۆ دنیات وەڕەز کرد. هەر کتێبێ دەیبەی هەر شەوێکە، دەیخوێنیەوە و دەڵێی ئیدیکەم دەنێ! دەگەڵی چوومەوە ماڵ. باوەڕ کە کتێبێکی شاندام بە هیچ حەمبالێک نەدەبزووت.

- ئەمە شەرحی تەوراتە؛ بۆ تۆ باشە!

نەمویست.

بەقاڵ بەزازێکی ئەرمەنی -کە ناوی سەعید و کوردی تەواو عەیار بوو- گوتی: ماڵمان لە گوندێکی بەر چیای تۆڕس بوو. فەرمانی ئەرمەنی قڕانی سولتان دەرچوو؛ ڕامانکرد. لە ڕێ شوانێک تفەنگێکی ڕاداشتمێ:

- سەعید تۆ فلەهی! خۆت مەگۆڕە دەتناسم؛ دەبێ بتکوژم!
- برا دەزانم دەمناسی و شوانی گوندی خۆمان بووی. ناکرێ چارەیەک بدۆزیەوە و نەمکوژی؟
- بەڵێ شادەوئیمان بێنە! بسلمان بە! ناتکوژم!
- دەی تۆ پێشم کەوە! من نازانم شادەوئیمان چۆنە.
- ها! ها! بە خوا منیش نازانم!
- دەسا وەرە بمکوژە!
- نا، نا، برۆ!!

هەر ئەو گوتی: چەند ئەرمەنیەک -لەو تەق و ڕەوەدا- چەند کوردێک هاتنە سەر ڕێیان. یەکیان بەوانیتری گوت: من دەزانم خۆم بە بسلمان نیشان دەم، هەرچی پرسیان من جواب دەدەمەوە. ئێوە وست بن. ئەگەر هاتوو لە یەکێکی ئێوەیان پرسی ئەرکانی ئیسلام چەندە؟ بڵێ پێنجە. ئەو دەم خۆم لە باتیانی جواب دەدەمەوە. گەینە ڕێگرەکان:

- ئێوە فەلەن!
- قوربان بە سەرت بسلمانین و هەموو داب و دەستووری شەرعی دەزانین.

لە یەکێکی جگە لەوە دەپرسن:

- ئەرکانی ئیسلام چەندن؟
- قوربان حەوت!

لێی ڕادەسێن.

- کاکە! ئەوە ترساوە؛ دەنا دەزانێ پێنجە!

ڕزگاریان دەبێ. کە دوور دەکەونەوە، پێی دەڵێ: سەگی سەگباب! نەمگوت بڵێ پێنجە؟

- هەهۆ! هەهۆ! ئەوە بە حەوتیش ڕازی نەبوو!

یەک لە دۆستانی قامیشلیم «مەلا ئەحمەدی نامی» بوو. کوردی چاک و شاعیرێکی تەبعڕەوان و فەرهەنگێکی کوردی- عارەبی نووسیبوو کە بە داخەوە چاپ نەکرا و دەگەڵ شیعرەکانی وا بزانم فەوتاوە. چاوی لە ماڵی کەس نەبوو. سواڵی لە ئاغایان نەدەکرد. خانووێکی

شری هەبوو؛ باغچەیەکی تێدا بوو؛ بنەمێوێکی تێدا. مایەی ژیانی گەلامێو و تەرەپیوازێ کە دەیچاند و هێلکەی چەند مریشکان بوو کە ڕایگرتبوون. جارێک وەک زۆر جاریتر چوومە مالێ. هەر لە دەرکێوە بانگی کرد:
- هەژار وەرە، جێژنە. دایکی سامی بە هێلکە و شۆرباو منیش و تۆشی کوشت! ئەمڕۆ دوو مریشکت بۆ سەردەبڕێ.
- خێرە؟
- مریشک قڕیان پێوەر بووە؛ دەمرن.
- دوکتوری مریشکان لەو شارە نییە؟
- بەلێ هەیە؛ بەلام چۆن بچم؟ پێم عەیبە.
پەلاماری کەلەشێرێکم دا و دەگەڵ نامی چووینە دوکتور. گوتی تاعوونیانە؛ ئارەقی زەحلاوی عیلاجیان دەکا.
- پەککو! جا چۆن بە سەر و مێزەرێکەوە بچم ئارەق بکڕم؟!
- تۆی ناوێ... چووم نیو بتڵ ئارەقم کڕی. یەک بە یەک مریشکەکانم دەگرت، سەرو دوو کەوچکی چا، ئارەقمان دە گەروو دەکردن. مریشک سەرێک دەتاسان و مات دەکەوتن. لەپڕ بەزمە ئەمما بەزم! مەست ببوون! سەیرێک بوو نەبێتەوە! هەر چی حالی زۆر شڕ نەببوو، چا بوونەوە.
جارێک سەرەتای ڕەمەزان، لە شام دەگەڵ نامی لە ئوتێل بووین. وەتاغەکە سێ تەخت بوو؛ تەختێک بێ میوان ما. بەیانی کە هەستاین، کابرایەکی زگزلی ڕەنگ تولخی تریاکیانەی چاوتەنگی لە سەر نوستبوو؛ فۆتە حەمامێکی سووری وەک بەرهەلبێنە بە قەدەوە بوو. گوتم: نامی! ئەوە خەلکی بەحرەینە. ئەو نوستووە، من باسی بۆ دەکەم: دەلێن خەلکی بەحرەین و هێندێک لەو ئەمیرنشینانەی خەلیج، کوڕ مارە دەکەن! نامی گوتی: تۆ بۆ بەو درۆیەت باوەڕ کرد؟ موسلمان چۆن کاری وا دەکا؟ کابرا وە خەبەر هات.
- برا خەلکی کوێی؟
- بەحرەین. من بێسەوادم؛ دەکرێ نامەیەکم بۆ بنووسن؟
- بەلێ.
کاغەز و قەلەمم هێنا: فەرموو!
نامە بۆ یەکێ بێرووتی بوو کە: مرواری زۆرم هێناوە، بۆ مانگێکیش میوانتم...
- بۆچی مانگێک دەمێنیەوە؟
- لە ترسی ڕۆژوو گرتن. هەر کەس ڕۆژوو بخوا، شەش مانگی دەگرن.
- حەی حەی! لە سەر ڕۆژوو شەش مانگ حەبس، کەچی هەتیو مارە دەکەن و خەبەر نییە!
بە پێکەنینێکی گڕەوە: خۆ نا، لە پاتەختی بەحرەین مارە ناکەن. لە «تویێپە» -کە لە نزیک «مەنامە»یە- شێخی هەتیو مارەکردنی لێیە. پێشی دەلێن «شێخ خەنپ»!
نامی دەمی گەزێک داپچڕاندبوو، زەق لێی دەڕوانی: «پەکو لەوێ عەجێبێ!».

***

سەرەتای هاوینی ١٩٥٧ دەنگ داکەوت، فستیوالی لاوان لە مۆسکۆ دەگیرێ و کێ دەچێ خۆ ساز کا. لێژنەی مەحەللی کومۆنیستی قامیشلی ناونووسی خەلکیان دەکرد. هاتنە لای منیش؛

که به ڕواڵەت هەر دۆست بووین. سروودێکیان پێ دروست کردم. هەر کەس بیگوتایە دەچم، دەبوو شەشسەد لیرە بدا بە حیزب؛ یانی هەزار و دووسەد تمەن. چووبوونە لای عەبدوڵڵای حاجی میرزا کە تاجرێکی دەوڵەمەند و ئەندامی حیزبی کومۆنیست بوو.

- تۆشمان نووسیوە دەتبەینە مۆسکۆ؛ بدە شەشسەد لیرە!

- برا من کابرایەکی نەزان و دەستەوەستانم. چوونی من هەر ئەوەیە خانووی بڵیند و خەیابانی جوان ببینم. شەشسەد لیرە دەدەم، هەژار لە جیاتی من بنێرن؛ هیچ نەبێ هاوارێک بۆ کورد دەکا.

- نەخێر هەژار کەللەشەقە! گوێ بۆ فەرمانی حیزب شل ناکا و هەرایەکمان بۆ دەنێتەوە.

- ئاوا؟! یانی هەر چی گوێ لە مست نەبێ بە کارتان نایە؟ جارێکیتر بە لامەوە بێن سەگتان پێوە دەنێم. هەیدێ لە بەر چاوم لاچن! جارێ ئەوە ئەندامێکت قت...

نامەیەکم لە جەلال تاڵەبانییەوە بۆ هات:

«حیزبی شیووعی عیراقی -بەرانبەر بە قەرارەکانی کۆنگرەی پاییزی ١٩٥٦- هاتوونە ڕەدایە کە دەستەی کوردستان سەربەخۆ بچێتە مۆسکۆ و ئازادانە باسی کورد بکا و ئەوانیش یاریدەیان بدەن. من نەمتوانی پاسپۆرت وەرگرم؛ ئەم نامەیە نیشانی هەواڵانمان لە شام بدە و تۆ سەرۆکایەتی بکە و بچنە فستیواڵ. بەڵام پارەی سەفەر لە سەر خۆت. خۆت پێکی بێنە...».

کەوتمە باربوو کۆ کردنەوە؛ یان بڵێم سواڵ کردن. نزیکەی شەشسەد لیرەم پێکەوە نا. یەک لەوانەی کە گوتیان هیچی نەداوە، «عارف عەبباس» ناوێکی ملیۆنێری قامیشلی بوو؛ کە لە هەموو کەس پتر بەردی کوردایەتی لە سینگی دەدا! کەچی تووشم بوو، دەڵێ: ئەو پارەی بۆت کۆ کراوەتەوە نۆشی گیانت بێ؛ بیخۆ هەر بۆ تۆ باشە!

چوومە شام. نۆ کەسیش بۆ ئەو سەفەرە لە لایەن پارتییەوە گەیبوونە شام و چاوەنۆڕی جەلالیان دەکرد. بە دڵ قبووڵیان کرد کە من لە باتی جەلال بم.

شەوێک سەعات دووی پاش نیوەشەو، لە مەیدانی «ساحه البرجی» چاوەنۆڕی قەراری حیزبی شیووعی بووین و پێکەوە بە کوردی قسەمان دەکرد. کراسشۆڕێکی وەک کوێتی بەوێدا هات.

گوتی: برا ئێوە کوردن؟

- بەڵێ.

- منیش حاجیم و بۆکانیم.

گوتم: تۆ ئەو سمایلە نی کە قەحبەیەکی تەورێزی خۆی بە سەردا بریبوو؟

- بەرێوەللا ڕاست هەوم!

- حاجی لە بۆکان مەڵێ هەژار و زەبیحم دیوە؛ دەتگرن! بەڵام حاجی هەر لە ڕێوە گوتبووی دیتوومن. گرتبوویان و بردبوویانە ڕەزائیە و زۆریان چەرمەسەرە دابوو.

دەگەڵ زەبیحی دانیشتین هەرچی دەمانەویست لە فستیواڵدا باسی بکەین، لە ١٥ رووپەڕدا نووسیمان. بۆ ئەوەش کە نەوەک لە تەرجەمەکردندا بۆ زمانانی دی تووشی زەحمەت بین، کردمانە فارسی کە لە مۆسکۆ فارسی هاسان تەرجەمە دەکرێ. نامانە ناو پاکەتەوە و ئامادە.

دەبوایە هەیئەتی شیووعیەکانی عیراق -کە لە شام بوون لە سەر گفتی حیزب یاریدەمان بدەن تا دەمانخەنە سەر سەفەر؛ ویزە و میزەی پێویستمان بۆ وەرگرن. چووینە بنکەکەیان. هەر گوتم: «کورد سەربەخۆ دەچن»، ئای نەعوزوبیللا! هەر لە دین دەرچوون، شتی وا نابێ!

- کاکە! حیزبی شیووعی -زەلامەکانی- بڕیاریان داوە کە دەستەی کورد لە ژێر فەرمانی پارتیدا بێ و شیووعی یاریدەیان لە سەرەوە بدەن.
یەکیان گوتی: گووم کردە قەراراتی حیزب! دوکتور سەفا حافز -کە لە ڕۆمانیا دەگەڵم ببوو- گوتی: ئەم هەژارە هەزار کەس دەرەقەتی نایە؛ من لە ڕۆمانیا دیومە چەند بەغیرەتە...
هەر چی دەلیلمان هێناوە و قیڕاندمان، «گەزی چی و جاوی چی؟!» هەر ئەوەکانی ڕۆمانیا بوون... لە دەرکەوتندا بە سەفا حافزم گوت: تۆ دەمناسی؛ وا دەکەم باشتریشم بناسی! ڕۆیشتین. لە ناکاو جەلال تاڵەبانی پەیدا بوو. ئیتر جەلال ڕەئیسە و خۆی زانی چ دەکا. جەلال گوتی: شیووعی بە هیچ بارێ قبووڵ ناکەن هەژار و زەبیحیمان دەگەڵ بێ، ئێوە ئەگەر توانیتان بە ڕێگەیەکیتردا خۆتان بگەیێننە مۆسکۆ، لەوێ یەکتر دەبینین.
- مام جەلال! هەرچی دەمانەویست لە مۆسکۆ بیکەین و بیخوێنینەوە، بە کوردی و فارسی نووسراوە. ئەگەر ئێمەش نەتوانین بگەینێ، وەک هاتبین وایە.
جەلال خوێندیەوە گوتی: قەت لەوە باشتر نابێ. من دەیبەم و بەهرەی لێ وەردەگرم. ئەمجار بە هۆی ڕەوشەن خانم بەدرخانەوە،سەفارەتی چیکۆسلاواکی، ویزەی زەبیحی و سینەم بەدرخان
و منی دا. جەلال هێندێک پووڵی بە جێ هێشت. پووڵی سوالی من و پووڵی ڕەوشەن خانم حەقی تەیارەی تا پراگی دابەش کرد. گوتمان لە پراگەوە بە خۆڕایی دەمانبەنە مۆسکۆ. گەڕانەوەش لە سەر شۆڕەویە. ڕۆژنامەیەکی عەرەبی لە شام بە ناوی «ئەلوەتەن» کارتی نوماییندەگی خۆی دامێ؛ کە ئێستاش کەلیمەیەکم بۆ نەنووسی!
جەلال و هەوالانی دەگەڵ دەستەی عیراقی و سووری لە بێرووتەوە بە سواری کەشتی ڕۆیشتن. ئێمەش ڕۆژێک لە بێرووتەوە -ویزە لە باخەڵدا- بە تەییارە چووینە ژنو، زووریخ، شتوتگارت.
شەو لە ئوتێلێک بە سەرمان برد، پادشایانە! سەنیری تووکی قوو، لە دۆشەکدا قوم دەبووین. سبەی سواری قەتار بووین، بەرەو پراگ. زۆر لە دەستەی ولاتانیتریشمان دەگەڵ بوو. بەر لەوە بگەین، لە شاری «پلیزنر» پۆلیسی چکوسلاواکی سەرکەوتن. پاسپۆرت و ویزەیان بردن، پاش دوو سەعات هاتنەوە. زەبیحی و سینەمخان و منیان دابەزاند و قەتار فیکەی کرد و ڕۆیشت.
- ئێوە ویزاتان تەواو نییە.
- هەی داد! هەی بێداد! ویزەمان لە سەفارەت وەرگرتووە.
- قسەی وا مەکەن!
ئەفسەری پۆلیس وەک هەیکەلی بوودا متەقی نایە و هەر بە سەر دەڵێ نابێ. سینەم بە فەڕانسی و ئینگلیسی، زەبیحی بە کەچە فەڕانسیەکەوە: جەنابی ئەفسەر! ڕێمان بدە تەلەفۆنێک بۆ پراگ بکەین؛ شوناسی باشمان لەوێ هەیە. بە کێ دەڵێی؟... تەلەفۆنیان ڕێ نەدا. دەمانەویست تەلەفۆن بۆ قاسملوو بکەین. خستیانینە ناو قەتار، پۆلیسێکمان بە دیارەوە ڕاوێستا تا لە سنوور ئاوای ئەڵمان بووینەوە. ئەگەر لەو قەتارە دانەبەزیباین، تا پاریس و مادریدیش چووباین، کەس نەبوو بڵێ پشتی چاوتان بڕۆیە. سەری شەو لە شتوتگارت دابەزین. لە ئێزگەکاندا وەتاغۆکێکی شووشە هەیە، ژنێک مەنزل بۆ مسافران پەیدا دەکا. نەخشەی ئوتێلەکانیش بە دیوارەوە. کام ژوور لە کام ئوتێل بەتاڵە، یان تەختێک بێ میوانە، بە کارەبا

نیشان دراوە و نرخەکەشی نووسراوە. تەنیا تەختێکمان دەست کەوت کە سینەم چونکە ژنە لەوێ بنوێ، نرخی ١٧ مارک. تاکسی بە قوماربازی، زۆری سووڕاندینەوە؛ ئەویش حیسابی حەڤدە مارک وەرگرت. جێگە بۆ سینەم دابین بوو؛ خۆشمان لە ئێزگەدا سەرگەردان ماینەوە. کیلۆیەک چا، کیلۆیەک قاوەی هاڕاو، چارشێوێکی ڕەشی ژنە عەجەمانمان پێ بوو کە لە مۆسکۆ بیدەین بە ژنە ئەفسەرێکی هەڵاتووی ئێرانی لە مۆسکۆ. ڕیزە سندووق وەک سندووقی پۆست هەبوو بۆ چەمەدان تێنان. بیست «فنیک» باوێ کونەوە، دەکرێتەوە. دایخە و کلیلەکەی لای خۆت بێ. لە قەدەم لێدان ماندوو بووین، خەومان هات. لە سووچێکی ئێزگەوە لە سەر بەردی فەرش تەخت ڕاکشاین. زەبیحی چارشێوە ڕەشی بە خودا دا. تا پرخەی دەهات. تێم کوتا: هەستە!

- بۆ نایەڵی بنووم؟

- هەتیو! تۆ بەو چارشێوەتەوە لە تەنیشتم ڕاکشاوی، ژنە عەجەمم دێتە بەر چاو؛ وازم هەڵدەستێ!

هێشتا خەومان لێ نەکەوتبوو، سەربازی ئەمریکایی دوان ڕاستیان کردینەوە:

- مەمنووعە بنوون.

- بە ئینگلیسیەکی شەق و ڕەق -هەر دەتگوت عەرەبین و بە کوردی قسە دەکەین!- تێمان گەیاند:

- ماندوو دەبین، ئەدی چ بکەین؟

پێشمان کەوت، بردینیە کافەیێکی زۆر خەفە لە ناو ئێزگەدا. گارسۆن هات. بە ئیشارە گوتی: پوولتان پێیە؟ لە پوولی ئاڵمانی چل فنیکمان پێ بوو، پوولی سووریاشی نەدەویست. بە هەردووکمان کۆکایەک و دوو لیوانی بۆ هێنایین. سەعاتێک دانیشە، دوو سەعات دانیشە، وەڕەز بووین. چووینە قەدەم لێدان تا ماندوو بووین. ڕۆژ هەر نابێتەوە! چووینە کافە؛ لە ڕێوە دەریانکردین. ئەوسەر ئەوسەری ئێزگەمان کرد، تووشی سەربازە ئەمریکاییەکان بووینەوە. تێمان گەیاندن دەنگوباس چییە. هێنانیەوە کافە و گوتی: تا سبەی تاوهەڵات لێرە دەبن! ناتوانن دەرتان کەن. بە دانیشتنی کافە و بە قەدەم لێدان ڕۆژمان کردەوە. سینەم خانمان دیتەوە. هەر چۆنێک بوو پانسیۆنێکمان پەیدا کرد. بە دە مارک. غار دە تەلەفۆن بکە:

- قاسملوو دەغیلت عیلاجمان بکە! (ئەو دەم لە پراگ ئوستاد بوو).

ئێوارە تەلەفۆن، بەیانی تەلەفۆن.

- کاکە! خالید بەکتاش لێی تێک داون؛ وا بۆتان لە حەول داین.

جارێک گوتی: لە دوای چوار ڕۆژ وا دەکەین بچنە برلین و لەوێوە ڕاست دەتانبەنە مۆسکۆ. دانیشتین حیسابی دارایی بکەین: حەقی پێنج ڕۆژ پانسیۆن، ئەوەندە؛ کرێ لە شتوتگارتەوە تا برلین، ئەوەندە؛ ئەدی چی بخۆین؟ هیچ! بۆ گاندی مانگێک هیچی نەدەخوارد و گوێشی نەدەدایە؟ بووینە گاندی! چوار دانە ڕۆژ زەوادم نەچووە سەر زار. وام لێهاتبوو لە ڕێ کردندا لینگم دەلەرزی. ئەوانیش هەر وەک من؛ بەڵام تۆزێک باشتر بوون. وام هەست کرد جەمێکیان بە دزیەوە خواردبوو! ئیشاڵلا وانەبوو...

نامەیەکمان بە کوردی و بە خەتی لاتینی بۆ ڕەوشەن خانم تێلگراف کرد. لە پاش هەر دوو دێڕ و دوو دێڕ و لەتێکدا نوختەمان دانابوو؛ یانی ها یەک کەلیمە! تێلگرافچی پاش ناردنی -کە

هەمووی شەش کەلیمە بوو- وتی: زمانێکی سەیرتان هەیە؛ کەلیمەیەکی لە دوو دێڕ زیاترە!
- بەلێ ئێمە زۆر زمان درێژین!
پاش‌نیوەڕۆی ڕۆژی چوارەم گوتم: ئەو قاوە و چایە بۆ نەفرۆشین؟
- فکری باشە. بەلام کێ بیفرۆشێ؟
- من!
- زمان هەر نازانی.
- چش!
کلاوێکی سپی کوردانەم لە سەر نا، بە دەوروبەری ئێزگەدا بگەڕێ، بنەڕێنە:
- ئەرەبیان کافێ!
سەری پاکەتەکەشم هەلپچڕیبوو. تووشی هەر پیرێژنە ئەلمانیەک دەبووم وە بەر لـووتیم دەدا تا بزانێ قاوەی چاکە. قاوە لە مغازان کیلۆی بە پەنجا مارک بوو. کەس لە منی نەکـڕی بیـست و پێنج. ئاخری لە بەر ئێزگەی ئۆتوبۆس بە بیستوسـێ مـارک دام بـە پیرێژنێـک. زگێکـی بـاش سۆسیسی بەرازمان خوارد. چایەکە بێنە:
- ئیندیان تی! ئیندیان تی!
دەتگوت دەلالی هەڕاجە بازاڕی سەقزم. ئەویش کـەس نەیدەکـڕی. لایـان وابـوو تەخلیتـە و خۆی نییە. زۆر سووڕامەوە، فایدەی نـەبوو. لاقـم مانـدوو بـوو، دەنگـم خـەریک بـوو بنووسـێ. بەزمیش ئەوەیە سینەم و زەبیحی دوور بە دوورم دێن و تـا هـاوار دەکـەم لـە پرمـەی پێکـەنین دەدەن! فکرێکم بۆ هات. خۆم کرد بە چاخانەیەکی ناو ئێزگەدا. چام نیشانی ژنە چایچی دا، کـە دەتگوت گامێشە: «ئیندیان تی!»، دەستێکی پێـوە نـا، یانـێ نامـەوێ. بـە ئیـشارە دەسـتم بـۆ قۆریەک برد. چنگێکم لە چاکە دەرێنا، تێم گەیاند ئەوە لێنێ تا بزانێ چۆنە. ژنـەتیو بـە حـەیفی زانی ئەو زیانەی لێ‌بکەوێ، بیستویەک مارکی لە پێش دانام و چای وەرگرت.
مالی خودا ئاوا؛ سۆسیسی شەویش دابینە!
بەیانی پارەی پانسیۆن درا، نان و سۆسیس و پەنیر کڕدرا. پازدە مارکمان بـە بلـیتی قـەتاردا، هێشتا پێنج مارک و شتێکمان –نەغد- مابۆوە! کێ وا سازە؟! قەتار دەڕوا و بـاران دەبـارێ. لـە «لایبزیک» ڕاوەستا. ژنێک دەیروانیە پاسپۆرتان. زەبیحی گوتی: تۆ زمان‌شڕی! هیچ قسە مەکە! سینەمخان جواب داتەوە. ژنەکە پرسی: ئێوە چین؟
من نسحەتم لە بیر چوو؛ گوتم: دەلەگاسیۆن، فستیوال، مۆسکۆ!
- وەرنە خوار، بڕۆنە ئیدارە!
- دەک زمانت بە برین چێ! ئەو تورکیە کێویلکەت لە کوێ بۆ هات؟ بە خوا دیسان دەبـێ لـە برسان قۆڕەی زگمان بێ و لە سەر جادە بخەوین!
- تۆبە! غەلەتم کرد! لە بیرم چوو!
چەمەدان هەلگرە و دە ناو بۆلە و پرتەی هەوالاندا لە بەر باران قوڕ بـشێلە. گەینـە خانووێـک، چووینـە سالـۆنێکی –خـوا هەلـناگرێ- سـارد. ئێمـەش تـەڕوتلیس. زۆری نـەبرد، کابرایـەکی قوتووکەی مل‌باریک هات لە بەرانبەرمان دانیشت. بە فارسی پرسی: کێن؟ لـە کوێـڕا دێـن؟ بـۆ دەچنە برلین؟ ڕاپۆرتی من کارێکی نەکردبوو پینە بکرێ. سینەم ڕاستیەکەی گوت. کابرا گـوتی چایان بۆ بێنن. سەرو چای بێ‌ڕەنگی گەرممان هەلدا. تماشای سەعاتی کرد:



- نیو سەعاتی‌تر بەڕێتان دەکەم. هانێ پازدە مارکەکەشتان بدەمەوە؛ ئێوە میوانی ئێمەن!

- ها، زەبیحی! دە ئەگەر مەردی بکۆخە! زمانشڕیەکەی من پازدە مارکی ساندەوە، چاکم نەکرد؟!

قەتار هات، خۆمان تێخزاند. حۆل- حۆل چووینە واگۆنێکی پڕ لە منداڵی ورد دانیشتین. ژنێکی دەرەجەدار، تەنگە ئەستوور، دم و چاو هەڵپزاو، فیتفیتە بە قەدەوە هاتە ژوورێ. وای گوڕاند باوەڕ ناکەم هیچ مارشاڵێکی هیتلەری وای نەڕاندبێ. دیار بوو دەیگوت: ئێوەی زەلام چۆن هاتوونە ناو واگۆنی تایبەتی منداڵانەوە؟! چەمەدان هەڵگرە و ڕاکە بۆ واگۆنی زەلامان. لە قەتارەوە دەمانڕوانیە دەشت: بە سەدان ژنی وەک پەڕەی گوڵ ناسک، لاقیان تا ئەستوورایی ڕان هەڵمالیوە، قۆڵڕووت، قیرەتاوی جادەیان پێدەکەن. گوتم: سینەم تماشا کە! زۆرتان فەرموو بەرانبەری ژن و پیاو. خوا کەریمە ئاوات ببینمەوە! لە ئێزگەی برلینی شەرقی دابەزین. چەمەدان بە نیخەنیخ هەڵگرە و بڕۆ. سندووقە پۆستەکەش نییە دایانمەزرێنین. لە دەمی مەیدانێک لە سەر عەرز ڕاوەستاین. کەس نییە جگە لە ئەڵمانی بزانێ. ژنێکم دی جحێڵ بوو؛ ناشیرین نەبوو؛ بەڵام برۆی تاشیبوو، بە قەڵەمی شین برۆی بۆ خۆی خەت کێشابوو. شتێکم گوت، لیچێکی هەڵقرچاند و ڕۆیی.

- ئای دایکت لە قنگت خوا! چەند بە دەعیەیە!

دەی ئەدی چ بکەین؟ مۆری لاوانی جیهانیم لە سەر ڕۆژنامەیەکی پەڕ چکۆلە دیت؛ منداڵێک دەیگێڕا. دیتمەوە! ئەو ڕۆژنامە لە کوێ بێ لاوان لەوێن. با بچین. کوڕمان تێگەیاند؛ گەڕاوە، پاش هەژ- نۆ هەنگاو بە دەست نیشانی داین.

- خۆش هاتن! چەمەدانەکانتان بە ئامانەت دانێن.

- لە کوێ؟

- لە هۆو سالۆنە.

یەک دانە ئەفسەری دەرەجە سەرهەنگی پیری لەرزۆک بە سەر ئامانەتی قەتار ڕادەگا. ڕووسییەک دەڵێ، دەڵێی زمانی بە پەلوولەی گەرم سووتاوە! زەبیحی گوتی: لاچن من بە ڕووسی دەیدوێنم. هێشتا چوار کەلیمەی نەگوتبوو، گوتی: مەلا! ڕووسییەکەم لێ خەلاس بوو! سینەم بانکە! نیو سەعاتی پتر کێشا تا چەمەدان تەحویل دران و ڕەسیدمان وەرگرت. لاوێک پێشمان کەوت، بردینیە وەتاغێک لە سەر ئیدارەی ڕۆژنامەکە.

- ئەلۆ کاکە قاسملوو! گەیشتینە برلین، دەی چی بکەین؟

قسە درێژەی کێشا، کوتم بیدە بە من:

- برا هیچ دەکەی، هیچ ناکەی بە قیر و بە توون! تۆ بڵێ نانمان دەنێ، برسیمانە و شوێنێک هەبێ لێی وەرکەوین.

- تەلەفۆن بدە بە یەکێک لە خانەخوێکانتان.

دوای هێندێک «گوت- گوت» و «شلیختن- پلیختن»، کابرا تەلەفۆنی دانا و گوتی فەرموون.

- ئەی خودا ساحیب فەرموودەت کا!

چووینە ڕستوورانێک -بێ‌تۆ ناخۆش- گۆشت بەرازی سوورەوکراو، لیکاوی بابە غەڵیفەشی دەتکاند! بە هەڵپە وەری گەڕاینێ، ئێسکەکانیشمان دەکرۆشت! مرِ، هەر دنبەمان دەهات، دە ماشینیان ناین. بردیانینە مەدرەسەیەک بە ناو «شلێمان شولە» لە سەر جادەی نازانم چی.

سینەم لە لای ژنان، ئێمەش دوو بە دوو لە وەتاغێکی درێژی هەراودا. سەرو دۆشەگ و سەنیری فوودراوی لاستیک و دوو پەتوویان داینێ. بەیانیان سەرو هێلکەی کولاو، دوو جەمەی‌تریش کۆپۆنی یارەلماسی و گۆشت بەراز؛ کە برۆین لە ڕستووران نۆشی گیانی کەین. داوای ئاومان بکردایە نەبوو؛ دەیانگوت زکتان وە ژان دەکەوێ؛ ئابجۆ بخۆنەوە. بە دزی دەچووم لە دەستشۆیی ئاوم دەخواردەوە. هەواڵەکانیشم فێر کرد؛ دیتیان زگیان ژانی نەکرد.

تووشی تاو و لەرزێکی زۆر سەخت هاتم؛ بردیانمە بیمارستان. ژنێکی پسپۆڕم هاتە سەر، گوتی: تۆ لە شوێنێکی پڕ مالاریا هاتوویە دنیایە؛ هەر گا گەیشتیە جێگەیەکی هاوهەوای ئەوێ، لێت دەژێتەوە. منیش کاتێ دیل بووم لە لێنینگراد وام بە سەر هات. دەرمانی بۆ نووسیم و هاتمەوە شوێنی خۆم. لە تاوی تا دەمنالاند. زەبیحی دۆشەکەکەی لێ فش کردبوومەوە. کەوتمە سەر زەوی. ئەویش لەو دەمەدا گالتەی هاتبوو!

کچێکی باریکەلەی گەنمڕەنگی ئەلمانی -کە ناوی «زگریتا» بوو- تەرجومانی دەکردین. فەڕانسی و ئینگلیسی و ئەسپانی دەزانی. هێند ڕۆحسووک و بە دەستەوە بوو کە زۆر خۆشمان لێ دەهات. هەموو ڕۆژ تەلەفۆنمان بۆ پڕاگ دەکرد. گوتیان لە موسکۆ مەلامستەفا بارزانیش بۆمان دە حەولدایە؛ بەلام وەختی فستیواڵ بە سەر چووە. ئێمە هەر لە برلین ماین. زەبیحی فێرە شەترەنجی کردم و ڕۆژمان پێ ڕادەبوارد.

دیبووم کە چا لە ئورووپا کەمە و زۆریش زەرد دەخۆنەوە. قۆریەکم پێ بوو، بۆ خۆمان چای عیراقیمان لێدەنا. چام دەکردە چادان و دەمبرد ئاوی کولیویان بۆ بە سەردا دەکردم. ڕۆژێک کە تام هاتبوو گوتم: کاکە تۆ بچۆ ئاوی کولیو وەرگرە.

- مەلا من نازانم بلێم چی؟
- زمانی ناوێ، کتری لە سەر فرگاز دەکولێ، لێی پڕ کە.
- نامدەنێ!

پرم بە قۆریدا گرت و چوومە حەسار، پیرێژنێکی قوون قەڵەوی تۆپەڵ ڕابرد. غارم دا، دەستم لە شانی دا، گوتم: «شلخن پلخن، ئاوی کولاوخن!». پیرێژن دەست و پێت بڕیبا وەخۆ نەدەهاتەوە! هەر لێی وەرگرتم و پڕی کرد لە ئاوی گەرم.

لاوێکی عەرەبی عیراقی بە ناوی «فالح غەننام» کە لام وا بوو ئەویش وەک «سەلیم شاهین» هەر لە ورگ لەوەڕاندن دەگەڕا، هاتە لامان و بووینە سێ کەس لە وەتاغەکەدا. دانشجووی هەندەسەی میعماری بوو. ڕۆژانە تماشای سمێلمانی دەکرد:

- لا سمێلی چەپت لە هی ڕاستت کورت‌ترە!
- بە ڕاستی موهەندسێکی شارەزای!

زۆری عاقیدە بە زانایی زەبیحی بوو. جارێک لە منی پرسی:

- مامۆستا لە کام دانشگا دەرچووە؟

کوتم: لە دانشگای «ترکەش»!

- بەلێ بەلێ، بە خوای دانشگای چاکە!

خۆ نەدەکرا بلێ ترکەشم نەبیستووە!

پەردەیەک لە ژوورێک هەڵواسرابوو؛ سەرمان پێدا گرت، فالح غەنام دەستی دە ناو گەلی زگریتا دابوو؛ دەمیشیان بە دەمی یەکەوە بوو. فالح هاتۆتە دەر سوێند دەخوا ئەم کچە شیووعیە

و زۆر داوێنپاکە؛ خەیالی خراپ مەکەن!
- نا نا، کاک فالح! دەزانین تۆ دەتەویست هێلکەی لێدەرێنی؛ دەنا فکرێکی‌ترتان نەبوو!
کابرایەکی کورتەبالای مل‌کورتی ئێرانی هاتە دیدەنیمان:
- من ئاغای یەزدیم. ژنێکی ئەڵمانیم هێناوە؛ دەیهێنم بتانبینێ:
- لازم ناکا، خوا پێکتان بێڵێ!
- بە خوا هەر دەیهێنم!
ژنێکی شلەی کەژ، کە چاوی لەبەر تاو هەڵنایە؛ قاچ باریک، لاواز، دەتگوت دار دۆژەنگە، هات و دەستی دە دەستی ناین.
- ئاغای یەزدی کەست دەست نەکەوت ئەو تاژیە ڕووتە نەبێ؟!
- توخوا سەبر قسە بکە! ژنەکەم تۆزێک لە فارسی تێدەگا!
هەر کە چووینە مەدرەسەکە، دوازدە مارکی ئەڵمانی غەربیمان مابوو. بە قەتار چوومە بەرلینی غەربی، گۆڕیمەوە بە چل و هەشت مارکی شەرقی و قاچاغچیەتیەکی باش بوو. ئەوەش زگریتا فێری کردم؛ دیار بوو کۆنەکارە!
هێشتا فێری ئاوخواردنی دەستشۆیی نەببووم. شەو گوتم دەچمە دەرێ لیوانێک ئابجۆ دەخۆمەوە؛ تینوومە. زەبیحی گوتی: زۆر زوو وەرەوە، نیگەران دەبم. تەواو داوای ئابجۆم نەکردبوو، ئاڵمانیەکی سەد کیلۆیی پاڵەوان گوتی: ئەرەب؟ کایرۆ؟! بە سەر گوتم بەڵێ. مەچەکی گرتم؛ دەتگوت شکاندی. بانگی کرد ودکایەکیان بۆ هێنام:
- بیخۆ!
- ناخۆم!
دەستی توند کرد.
- ئای دەستم!
خواردمەوە. باوەڕ کە لە دەممەوە سووتاندی تا ناو زگم.
- یەکی‌تر!
حاسڵ، بەری نەدام تا سێ پیاڵەی بە گەروودا کردم. ئەمە تۆمەز ئێس‌ئێس (S.S.)ی هیتلەر بووە و لە قاهیرە حەبس کراوە و بووینە خزم! بە تکای بارمەنەکە بەری دام. هاتمەوە لاقم مقەستەی دەکرد. زەبیحی تووڕە بوو:
- وامزانی گوم بووی.
- هەتیو خزمم پەیدا کردووە. قسە مەکە!
تەخت نوستم تا ڕۆژ درەنگ خەبەرم نەبۆوە.
ڕۆژێک لەو تەلەفۆن کردنانەدا، قاسملوو ئادرێسی «نەورۆزی» ناوێکی داینێ، گوتی پێم گوتووە کارتان بۆ پێک بێنێ. زەبیحی و من چووین. لە سەر جادە لە ترام دابەزین. زۆر گەڕاین، کۆلانەکەی ئادرەسمان نەدیتەوە. دەسا جارێ با بزانین لە ماڵە؟ تەلەفۆنێکمان لە سەر جادەوە کرد.
- بەڵێ لە ماڵە؛ دەڵێ وەرن!
دایخستەوە.
- بۆ نەتپرسی چۆن ماڵەکەت بدۆزینەوە؟

- ئای ڕاست دەکەی!

گیرفانمان گەڕاین دە فنیکمان پێ نەبوو تەلەفۆن بکەینەوە، دیسان وێڵ بووین. تا دۆزیمانەوە شەیتان گوتی چەق! ئارەق کردوو، ماندوو: «سەلامون عەلێکم!» تارانیەکی ڕەشتاڵەی بالابەرزی لووتبەرانی، چوار تەلەفۆن لە دەورە، دەتگوت عالاعەزرەتە! بە مینگەیەکی تارانیانەوە پرسی: دەڵێن چی؟ لە سەر جواب مەحتەل نەبوو، تەلەفۆنێکی هەلگرت؛ وەختی بۆ کچێک دادەنا!

- بەلێ چتان گوت؟!

ئەو جار بە تەلەفۆن دەگەڵ ژنێکی فارسیزماندا جێژوانیان دیاری کرد.

- ها، چیتان فەرمووو؟!

پاش زمانلووسی و تەعاروفاتێکی خەستوخۆڵ، نووک و بەدی حالی خۆمان بۆ باس کرد؛ بەلام ئەو لەبەر تەلەفۆن هەلگرتن و دانان زۆر کەمی گوێ لێ بوو.

- وا ئێستاش قاسملوو بۆ لای تۆی ناردووین کە باسی ئێمەی بۆی کردووی.

- قاسملوو ناناسم، کێیە؟ لە کوێیە؟!

- کوردە و لە پراگ ئوستادە.

- کورد چییە؟! زۆر تازەگی هەیە بۆ من! قاسملوو بۆ ناچێتەوە ئێران؟ لە پراگ چ دەکا؟!

گوتم با بڕۆین بێفادەیە. زەبیحی دەستی پێ کرد: بە خاتری نەوعپەروەری، ئینسانیەت و چی و چی! کولی پێکەنینم هەستا و خۆم بۆ نەگیرا، دەرکەوتم. زەبیحی بە دوومدا هات:

- مەلا بۆ پێدەکەنی؟

- کاکە! عەینەن سوالکەرێکم هاتە بەر چاو کە بە کافرێک بلێ: بۆ خاتری غەلیفەی ئیندرقاش لیرەیەکی زێڕم دەیە!

زەبیحی لە من پتر پێکەنی! خێری ئەویشمان بەخشیەوە.

لە مۆسکۆ ناهومێد ببووین. دەبێ بڕۆین، بۆ کوێ؟ بە چی؟ قەلیش گوومان ناگەیەنێتەوە شام. سەفارەت مەفارەتێکی سووریا، میسر لە برلین نییە؛ کونسوولگەریشیان دەس ناکەوێ. با بچینە «بۆن». خانەخوێکانمان کیسەیەک نان و پەنیریان داینێ و سەرو سێو. بلیتی قەتاریان بۆ بڕین؛ پێنج مارکیشیان داینێ. بۆن بگرە و هاتم! ئای بەدبەختی! جێ لە قەتار دەس ناکەوێ، دەبێ لە کۆریدۆردا شەشسەد کیلۆمیتر ڕابوێرین. هەر چۆنێک بوو سینەم لە واگۆنێکی شەش نەفەرەی ژناندا خۆی سەپاند. ئێمە جێگەی قنگەلفس دادانیشمان نەبوو. سەرما بوو. بەردەمی خۆم وەک عارەبان هەلپێچابوو. چووم لە بەرانبەری ئاودەست، لە سەر عەرز دانیشتم. زەبیحیش هات. دوو کچی هەژ- نۆ ساڵە لە پەستا دەهاتنە ئاودەس. لێم مۆڕ بوونەوە، فشتێکم لێ کردن، زیراندیان. ئیتر خوا وەتحەسێنێ قەت منداڵێک بە لاماندا نەهات. بەلام بۆنی ئاودەستەکە پیاوی وەڕەز دەکرد. هەر چۆنێک بوو ئەو شەوەشمان گوزەراند.

دەڵێن دوو کابرای سووریایی، بە زستان ڕووت و بە هەردووکیان لێفەیەکیان هەبوو. شەو بە خۆیاندا دەدا، ڕۆژ لە بەر تاو دەشانیانەوە دەپێچا و بە بەریەوە هەلدەلەرزین. بەهار هات؛ یەکیان گوتی: زستانەکەمان ڕابوارد.

- بەلێ، ئەمما بە حالی سەگ!

لە ئێزگەی «کۆلۆن» دابەزین. غار دە سەر تەلەفۆن! تەلەفۆننامە سەر و بن کە! سەفارەتی سووریا لە بۆن نییە. هیچ شتێک لەوە تاڵتر نەبوو. هێزی دڵمان نەما و بە هەناسە ساردی

تماشای یەکترمان دەکرد.
- سەفارەتی میسر چی؟
- هەیە؛ بەڵام کێ جوابی ئێمە دەداتەوە؟
- دەبا تەجرەبەی کەین؛ خۆ لێمان نادەن.
- ئالۆ، سەفارەتی میسر؟
- بەڵێ.
- دەخیلە ئێمە سوورپایی لێقەوماوین، سەفارەتی سووریا لە بۆن نییە. چارمان چییە؟
- من ناوم «عەبدولفەتاح دیدی»یە. لە کوێن؟ ئێستە دێم.
- جا چۆنت بناسین؟
- یەکی درێژی ڕەش وەک قیلم.
ڕەشە هات، گوتی: جارێ هیچ قسە مەکەن. بردینیە ڕستوورانی ئێزگە، بەر چاییەکی شاهانەی داینێ. پێنج مارکی لە سەر مێز دانا:
- ئەوە هەڵگرن!
- بە خوا قبووڵی ناکەین.
- برا چونکە دەزانم بەو پێنجە دەگەنە سەفارەتی سووریا، ئەمەندەم دا؛ دەنا دەبوایە زۆرترتان بدەمێ. لە خەتی ژمارە چوار سوار بن! پێنج ئیزگای ئوتووبووس بژمێرن! دابەزن! باغچەیەکی سێ گۆشەیە؛ سەفارەتی سووریا لەوێیە.
پاش چەند ساڵ بۆمان دەرکەوت کە دیدی داستان‌نووسە و لە زۆر شوێنانیش بۆتە سەفیری میسر.
شارەکە ناوی بادگودزبێرگە، بەو نیشانە گەینە بەر دەرگای سەفارەت.
- ڕاوەستن جارێ مەچن! چووزانن سەفیر بەعسی سەگباب نییە؟ چووزانن دەرمان ناکا؟ چووزانن ئەگەر بزانێ کوردین هەر بە گرتنمان نادا؟
- دەی سا قوڕی کوێ بە سەردا کەین؟ لە سەر خوا! سەری خۆمان دەکەینە کوتک. دەریشمان کا، لە سەر ڕێگای ماشێنەکەی ڕادەکشێن! با بە سەرماندا بڕوا.
بە سەد ترس و لەرزەوە زەنگی دەرکەمان زڕاند. ژنێکی ئەڵمانی دەرکەی کردەوە؛ ساڵۆنێکی شان داین. دانیشتین و چاوەنۆڕی چارەنووسین. کوڕێکی عەرەبی حەڵەبی لەوێ بوو، دەیگوت: عەریزەم داوە پووڵم دەنێ ژن بێنم. ئێوە شتوتگارتان دیوە؟
- بەڵێ.
- نەچوونە سەیری کارخانەی مارسیدس؟
- نەخێر.
- ئای عومرتان بە زایە چووە! کوڕە چۆن پیاو سەیری وا لە کیس خۆی دەدا؟ هەمووی دوو مارکی تێ دەچوو!
هەستم وە بەر شەقی دەم؟! حیزباب! ئێمە نان نەبوو بیخۆین؛ شەش مارکمان دابا بۆ سەیری مارسیدس؟!
لەو دەمەدا بانگ کرا، چووە لایەکی‌تر؛ بوو بە هەرا و جوێن دان بە عەرەبی:
- فلان فلان شودە! بۆ سەفارەت گەداخانەیە؟! هەر ڕۆژە چەند دەسبڕی وەک تۆ پەیدا

دەبن: «قوربان لێمان قەوماوە، پوولمان نەماوە». تۆ بەوەش ڕازی نی، دەتەوێ ژنی ئەڵمانیت بۆ بێنم. هەیدێ لە بەر چاوم گوم بە! تا نەمگوتووە بتگرن!

هەتیو هەڵات. دڵمان کەوتە خرت و پرت. بە خودا ئێمەش بەو دەردە دەچین. کابرایەکی قولەخڕەی دەوچاو چکۆلەی گرد، کە هیچ پێمان وا نەبوو سەفیرە، هات. لە بەری هەڵنەستاین.

- بەخێر بێن!

- سەلامەت بی!

- فەرمایشت؟

- سەفیرمان دەوێ!

دانیشت.

- من سەفیرم، فەرموون!

- جەناب لە بێرووتەوە دەچووینە مۆسکۆ... ئەوە چیرۆکمانە و ناشتوانین بگەینە سووریا.

- هەرسێکتان کوردن؟

- بەڵێ.

- کە وا بێ داوای ئیستیقلالی کوردستان دەکەن؟!

- قوربان! چۆن شتی وا دەفەرمووی؟

- بۆچی؟ هەر ئێستا ئەنگۆ سێ و من یەک. ئەکسەرییەت بەنگۆیە!

- ئێمە لێقەوماوین؛ پەنامان هێناوە؛ چۆن تۆ دڵت بڕوا دەدا ئەو تەرزەمان بدوێنی؟

سەفیر گوتی: من جارێک کوردێک لە ئیعدامی نەجات داوم؛ ژیانم لەو کوردەوە دەزانم. هەر چی بۆم بکرێ تەقسیرتان دەگەڵ ناکەم.

- کوردەکە کێ بوو؟ دەکرێ بیفەرمووی؟

هەناسەیەکی هەڵکێشا:

- جەلادەت عالی بەدرخان بوو. خوا ڕەحمەتی لێ بکا، لە چنگ فەڕانسیان هەڵاتم کە حوکمی ئیعدامیان دابووم. دوو مانگ لەماڵەکەی خۆی شاردمیەوە تا عەفووی بۆ ساندم.

- ئەم خانمە کچی جەلادەت بەدرخانە.

واقێکی بردەوە. بانگی کرد: خانم! وەرە دیاریەکیان بۆ هێناوی!

خانم لە پلەکانان هاتە خوار و چاوی بە سینەم کەوت:

- سینەم! شاگردە خۆشەویستەکەم! کام فریشتە تۆی گەیاندە من؟

بوو بە فلچ و هۆڕی ماچان. خانمی سەفیر لە شام ئوستادی حقووق بووە و سینەم لای ئەو دەرسی خوێندووە. سینەمی برد و ڕۆیی. سەفیر -کە ناوی ئیبراهیم ئوستوانی بوو- گوتی: دەزانم بە سینەمەوە زۆر نارەحەت بوون. ئەو لە ماڵە من دەبێ. ئێوەش دەنێرمە ئوتێل. لە شام دەپرسم هەر گا بڕیاریان دا کە بتانێرمەوە، لە سەر خەرجی دەوڵەت دەچنەوە.

نیوەڕۆژەیەکی زۆر سەفیرانەی داینێ. سەرو بیست مارکی نەغدی داینێ کە گیرفان پووڵی بێ و حەقی ئوتێل لە سەر سەفارەت. پاش نیوەڕۆ بە ترومبیلی سەفارەت چووینە ئوتێلۆکەیەکی خشپیلانە لە سەر لێوی چۆمی «ڕاین». هەر ژوورەی تەختێکی دوو نەفەرەی لێ بوو، هەمووش هەشت وەتاغ بوو. وەتاغێکمان بۆ سینەم گرت کە ڕۆژ لە سەفارەت لای خانمی سەفیر بێ و شەو بە ماشین بیهێننەوە ئوتێل. ئێمەش لە سەر داوای خۆمان بە ژوورێک ڕازی بووین -

بیلامانێ- وەک ژن و مێرد لە سەر تەختێک بنووین.
چووین کە لە دوکانێک قەند و چا و نان و پێخۆرێک بکڕین. شووشە شەرابی ئێلزاسی گەردن بلندی لێ بوون؛ بە چوار مارک. هەرزانە، زۆریشم دەردی ماندوویی و سەرما دیوە؛ یەکێکی دەکرم.
- نایەلم بکری!
- هەتیو بە تۆ چی؟ لە بیست مارکی خۆمی دەکرم!
- مەلا ناهێلم بیکری!
- جا ئەوا دەیکرم؛ تۆ پیاوی ئازای مەهێلە! شەرت بێ پشتت لە زگت نەرمتر دەکەم! بۆ من مندالی بەر دەستی تۆم؟!
کڕیم و بە بێ ئەوە یەکتر بدوێنین هاتینەوە ژوورەکانمان و دەنگمان لێک گۆڕیوە. چوومە سەر تەختەکە، پەتوویکم بە سەر لاقان هەلکێشا؛ سەری بوتلم کردەوە. زەبیحی -کە لێم قەلسە- پشتی دە من و رووی دە پەنجەرەیە. بە پێوە وێستاوە و بەو دەنگە ناخۆشەی کە دەتگوت میز بە تەنەکەدا دەکا! شیعری حافز دەخوێنێتەوە. رووم تێ ناکا؛ لە بەر خۆیەوە:
- مەلا! هەمووی دەخۆیەوە؟
- بە تۆ چی؟
- ئاخر مەلا! ئەو هەمووە حالت تێک دەدا!
- تۆ پێم نالێی چ کارت بە من داوە؟ من خۆم دەکوژم. بە تۆ چی؟!
پشتاوپشت لیوانێکی لە دەستدا، بە پێ دزە لێم نزیک بۆوە.
- مەلا خۆت کەر مەکە! سەری بابت تۆزێکم بۆ تێکە!
- یا خوا ئەگەر بۆت تێکەم غەزەبی عەرز و عاسمانانم لێ بباری!
دەمی بوتلم بە لێومەوە نا و قورت- قورت ملم لێ نا.
- مەلا دەمری! توخوا تۆزێکم بۆ بێلەوە!
قرتەم لە بوتل بری و پەتووم هەلکێشا و نوستم. لە ئێوارەوە تا سەعات دەی بەیانی یەک بین خەوتم و وە خەبەر نەهاتم.
هەفتەی جارێک سەفیر نیوەرۆژەی دەداینێ. وەختی دی دەچووینە چێشتخانە و هەر پەتاتەی کولاو و گۆشت بەراز بوو. جارێک گوتمان با شتێکی دی بخۆین. زەبیحی دەستی لە سەر شتێک دانا، بە گارسۆنی حالی کرد: ئەمە! هەشت هێلکەی نیمروویان بە قاپێک پەتاتەوە هێنا. بە دەست، بە چاو داوای نانمان کرد. دوو گزموولە نانیان هێنا، حەوتی پارویک نەدەبوون. پاراینەوە، ددانمان بۆ چیر کردەوە، دەتگوت تەبلیغاتی خەمیر دەندان دەکەین! رۆیی، جووتێک پشکەلی دیکەی بۆ هێناین و بە سەر گوتی: بەسە!
رۆژێک بیستمان کە عەلی حەیدەر سولەیمان سەفیری عیراقە و لە شاری بادگۆدزبێرگە.
- زەبیحی با بچین.
مونشی گوتی: وەختی نەداونێ؛ مەمنووعە بچن. لە کاغەزێک بە کوردی خۆمانە نووسیم دوو کەسی سووریایی هاتوونە دیدەنیت.
- تکایە بیدەیە!
هاتەوە گوتی: فەرموون!

– نووسیوتانە سووری و کوردییەکەتان عیراقییە.
– من ئەو کەسەم کە ناردتە لوبنان، بەحنەس.
– تۆ هەژاری؟ لێرە چ دەکەی؟
– جەناب! ئەوی خۆت بە لاوەتی دەتکرد، ئێستا من دەیکەم؛ حاڵ و مەسەلە ئەوەیە...

کە هەستاین، ڕوانیە کیسەکەی، سەد مارکی تێدا بوو. گوتی: دەبێ هەر بێنەوە؛ جارێ ئەم کەمەم لێ قبووڵ کەن.

– نامانەوێ.
– دەبێ بتانەوێ.

وەرمانگرت. سەرو سی و سێ مارکمان پێ بڕا. ئیتر نەچووینەوە لای. زەبیحی ڕۆژێ دوو پاکەت جغارەی چیسترفیلدی دەکێشا؛ دەیکردە هەشت مارک؛ نەمدەویست پەکی بکەوێ. خۆم سیغارێکی بەلگم دەکڕی بە مارکێک، دە دانەی تێدابوو حوکمی لێ کردووم: مەلا ئەم جغارەت بۆگەنی دێت! بچۆ لە دەرێ بیکێشە!

– هەی دین سز! من بۆ خاتر تۆ وا دەکەم، تۆ دەرم دەکەی؟!
– کە وا بێ مەلا بمبەخشە!

سەفیری سووریا جارێکیتریش سەرو بیست مارکی داینێ. چەند ڕۆژ بوو هەر دەیگوت دوو جارم نووسیوە، جوابی شامم بۆ نەهاتۆتەوە. تەنانەت گوتی دەترسم خالید بەکداش بۆی تێچاندبن. بانگی نامەبەری سیاسی کرد: دەچیەوە شام، بەر لەوە بچیەوە ماڵە خۆت، بچۆ وەزارەتی دەرەوە؛ بزانە بۆ جوابی نامەی ئەوانەیان نەناردووە! نامەبەر بۆ سبەی ئێوارە هاتەوە؛ یاریدەی ئێمە قبووڵ کرابوو. بە سەفیری گوت: پاکەتەکانت هێشتا هەڵنەپچڕابوون؛ ئەگەر من چووم خوێندیانەوە! سەفیر گوتی: ئەمەش دەوڵەتەکەی من!

ئەو ڕۆژانەی بێکار لەو شارە بووین، کارمان خولانەوە بوو. هەر کەسێکی گەنمڕەنگمان دەدی: «خەڵکی کوێی؟»، جاری وا بوو هیندی دەردەچوون؛ بەڵام زۆر جار ئێرانی دەبوون. یەک لەو ئێرانیانە گوتی: کورد لێرە زۆرن. عەلی قازی لە سەفارەتە. بێچارە چونکە بابیان عەزیەت داوە مەعاشی زۆر وەردەگرێ!

ڕستوورانێکی دانشجوویان هەیە لە بۆن، کوردی زۆری بۆ دەچن. با بچین کورد پەیدا کەین. چووینە بۆن. چۆناوچۆن بوو لە پۆلیسێکی ڕاهنماییمان پرسی: «ڕستوورانی دانشجوویان»، بانگی پۆلیسێکی دی کرد، هاتە جێگەی؛ خۆی پێشمان کەوت. دە دەقیقە دوایی لە کۆڵانێک ڕستوورانی نیشان داین و گەڕاوە. سەرکەوتین. لاوێکی فارسمان دی، گوتی کرماشانی هەن و کوردی عەرەبیش زۆرن. لە پشتەوە سەرێکی کەچەڵم دی.

– ئای دیتمەوە، ئەوە ئوستاد شەهابە. ئوستاد شەهاب!

مدیر مەدرەسە بوو لە مەدرەسەی فەیلی بەغدایە. هاتبوو بژیشکی دەخوێند. جەمێکمان دەگەڵ خوارد و هەموو ڕۆژ بە شارا دەیگەڕاندین.

ئەو شارە گەرماوی لێبوو؛ وەک گراوی ولاتی خۆمان؛ بەڵام هەمووی چاوە-چاوە و شێرە-شێرە کرابوو. چووین لیستێکیان داینێ: بۆ گەڕی، فلان. بۆ خوروی هاسان، فیسار. بۆ ئەعساب، فلان نمرە... زەبیحی گوتی: من ئاوی لەشخورانەکەم دەوێ. گوتم: من ئەعسابم تێک چووە، دەمەوێ تۆزێک عاقڵتر بم! دوو نمرەمان نووسی، پووڵەمان دا. چاومان لێ بوو هەر لە یەک



شێره دوو لیوانیان بۆ تێکردین!
پاش چارده ڕۆژ، بادگودزبێرگمان به سواری قەتار بەجێ هێشت. به ڕێگەی دەریاچەکانی ناو سویسدا گەیشتینە میلان. له بانکی ناو ئێزگە پوولی ئەڵمانیمان بە ئیتالی گۆڕیەوە. پوولە وردەکانیان نەویست. ئەدی چ بکەین؟ گوتم ئێوە زمان دەزانن، بچن لە شوێنێک بیگۆڕنەوە. گوتیان بانک نەیەوێ کێ دەیەوێ؟ با فڕێیان دەین.
- بەشێکم دەنێ بزانم چۆن دەبێ.
چوومە بەر دوکانی دەلاکێک، پوولم نیشان دا و بە ئینگلیزییە شەق و شڕەکەم شتێکم گوت. کابرا لە جیاتی هەر مارکێک، سەد و بیست لیرەی ئیتالی دامێ. دەستی بڕیبووم! سینەم و زەبیحی گوتیان ئەویتریش بەرە. خۆم گنخاند: نەخێر جەنابتان قانوونزانن! بیبەنە بانک یان فڕێی دەن! ئەویشم گۆڕیەوە. شەو لە ژێنەوا ماینەوە. لە بەینی میلان و ژێنەوا، قەتار وێستابوو. دابەزیم، زۆرم تینوو بوو. دەبوو بە ناو ڕیشاڵ-ڕیشاڵی خەتی ئاسندا بپەڕمەوە ئەوبەر، بچم نووشابەیەک بخۆمەوە. وە ناو کەوتم، مەعمووریک هەرای لێکردم؛ دیار بوو دەیگوت لەوێوە مەمنووعە. ڕاوەستام. بە کوردی گوتم: ئەدی لە کوێ لە سەر گۆڕی بابت بڕیم؟! ئیشارەی دا کە بڕۆ، قەیناکا!
ژوورێکمان لە ئوتێلێک پەیدا کرد. سینەم ملی لە فینگە فینگ نا. گوتم: دایکم مەگری! خۆشت بێ ناخۆشت بێ هەر ئەوەیە. دوو برا و خوشکێک دەتوانن لە ژوورێکدا بنوون و کەسیش بای لێ نەبێتەوە! ملی لە پێکەنین نا.
بەیانی چووینە سەر کەشتی. زەبیحی هەر لێم دەڕوانێ و بزەی دێتێ.
- چییە؟
- مەلا حەبی گێژنەبوونم بۆ خۆم کڕیوە؛ تۆ نیتە با گێژ بی!
کەشتیەکەمان ناوی «لیدیا» بوو؛ یۆنانی بوو. بلیتمان دەرەجە دوو بوو. تەختی خەومان دوو تەبەقە لە سەر یەک بوو. چەقە و هەرای ژنە یۆنانی و ئیتالی مێشکی سەری دەبردین. بۆ چاو لێکنانێکیش زمانیان لە کار نەدەکەوت. زەبیحی دەیگوت: مەلا! ئەوە دەرەجە دوو نییە، دەرەجە گووە! بەڵام خواردنمان لە سالۆنی گشتی بوو؛ زۆر باش بوو. ڕۆژی دووهەم تازە تاو هەڵدەهات، دیتم زەبیحی لە سەربانی کەشتی چاوی سوور و دەرپەڕیوە؛ دەڵێی بزنە و شەڕەشاخ دەکا! لاولا دەتلێتەوە؛ سەرەگێژەی بەحری گرتووە.
- حەبەکانت بخۆ سەگم تێ ڕیاندن!
نەخێر حاڵی شڕە. نانی نەخوارد.
- بچم شووتیت بۆ بێنم؟
- کوا دەتدەنێ؟
چوومە ئاشپەزخانە. خوا شوکور سەدی شێستی یۆنانیەکانی سەر کەشتی تورکی دەزانن. لەتە شووتیەکی گەورەم هێنا.
- مەلا ناخۆم!
- چاتر! لە بەر چاوی ئەو قرتەم لێ بڕی! تا دوو ڕۆژ سەرگێژە بەری نەدا.
بەیانیان کابرایەکی خاولی حەمامی سپی بە کلاو دەبەر، لە سەر مێزی نان خواردن دەهاتە بەرامبەرمان. دیار بوو دەبوو لاسای پادشای مەراکیش بکاتەوە. سەفیری مەراکیشە بۆ سووریا

دەچێ. عەرەبی نازانێ، چەند کەلیمەیەکی کۆنی مەلایانە پەلخوڕ دەکا. دەیەوێ بمدوێنێ تا فێرە عەرەبی قسە کردن ببێ. بەزمێکمان بۆ ساز بوو، مەپرسە! جنێوی کوردیم بۆ تێکەڵ بە عارەبی دەکرد؛ هەر دەیگوت: «ئینشائەڵڵا». تەنانەت جارێک گوتم: «رەئسەک بە قوونگم!»، گوتی: «ئینشائەڵڵا»!

دەستە منداڵێکی شەل و سەقەتی ئاتینی دەگەڵ مامۆستاکەیان هاتبوونە سەیران و گەڕان. یەکێکیان تۆزێک تورکی شەق و لەقی دەگوت. لە باتی (ها، ئا) دەیگوت (خی خی!) بووینە هەواڵ. دەیپرسی:

- فلان شت بە تورکی چییە؟
- دەمگوت من زمانی یۆنانی کۆن دەزانم!
- وەک چی؟
- تەرسە کوڕولەی مامی خۆت!
- سەعاتێک ماندوو دەبوو فێری بێ. دەچووە لای مامۆستاکەی:
- پرۆفسۆر! تەسە کولومە خۆی! گریک؟
- نا.

دەهاتەوە: «نۆ گریک!». دەرسێکی دیکەم پێ دەگوت. پێکەنینمان ساز دەکرد.

بەیانیەک سەیری دەریام دەکرد، لە ناخافڵ یەکێ گوتی: «یا خەڕا!» (بە یۆنانی لە جیاتی ڕۆژ خۆشە؛ بە عارەبی یانی: هەی گووا).

گوتم: یا خەڕا و نیوا!

هەواڵەکانم گوتیان تۆڵەی هەوەڵ و ئاخری لێ کردیەوە!

لاوێک هاتە لامان. بە دەنگێک عەرەبی و دوو دەنگ ئیسپانی دەڵێ: عەرەبی حەلەبم. سی ساڵم عومرە. سێ ساڵە لە کاراکاسم. پازدە هەزار دۆلارم پەیدا کردووە. عەرەبیم لە بیر چۆتەوە. توخوا بە خێری خۆتان فێری عەرەبیم کەنەوە؛ سی سی!

- سی سی گیان! بە سێ ساڵ زمانی بیست و حەوت ساڵەی دایک و بابت لە بیر بردۆتەوە؛ ئیستا چۆن بە شەش ڕۆژ و حەو ڕۆژ فێری دەبیەوە؟ لە پووڵ پەیدا کردن وا زیرەک، لە زماندا وا دەبەنگ؟!

- سی سی، سەهیح!

دەگەڵ یۆنانیەکی ئاتینی -پیرەپیاوێک- بووینە ئاشنا.

- تۆ ناوت چییە؟

زەبیحی گوتی: ناوی حاجی عەبدوڕەحمانە!

بە ترکی قسەمان دەکرد؛ لێکی دەهالاند. بەزمی وا خۆش نابێ. قەدەرێک مات بوو، گوتی: ئەرێ حەیوانێک هەیە زۆرم پێ جوانە، عەکسەکەیم بۆ بنێرە.

- کام حەیوان؟

ناعیلاج دەستی لە جێگەی گوێوە هەڵێنا و لەقاندی. گوتم: ها، ئێشەگ!

- بەڵێ بەڵێ دیتتەوە!
- بە سەر چاو! شکڵی خۆت و بابت بۆ دەنێرم!

سەد جاری گوت: خاجی ئەبدورەخمان لە بیرت نەچێ!

لە بەندەری پیرەی ئاتین دابەزین. گوتیان هەشت سەعات کەشتی نارِوا. لە ئوتوبۆسێکمان پرسی:

- ئەتینا؟

- بەڵێ ئەتینا.

چووینە ئەوسەری شار، داوای بلیتی تازەیان کرد کە دەگەڕێتەوە. یەخەی بلیتبرم گرت، بە ترکی دەڵێم: کوا ئەتینا؟ ترکیزانێک لە کۆڵ کابرای کردمەوە و قەتاری بەرقی نیشان داین کە بە هاسانی چووینە ناو شاری ئاتن. لە ناو قەتاری بەرقیدا کوێرێک بە کەمانچە ئاهەنگێکی لێدەدا پیاوی سەرخۆش دەکرد. بیست دراخمەم دە کلاوەکەی هاویشت. زەبیحی گوتی: وەللا قەرەنیاغا گووی وای نەخواردووە!

- کاکە ئەو مووزیکە پتریشی دێنا...

وەک عاشقێک چەند ساڵ لە یاری دوور کەوتبێ و لەپڕ چاوی پێ بکەوێ، هەر گەشکە بووم: ئۆخەی! بڕوانن ئەو هەموو مێشە نازدارە لە سەر دوکانی بەقالان حەلوای بە شەقان دەکەن! بە هەزاران مێش پێکەوە هەڵدەفڕین. شوکور لە بێمێشی ئەڵمان ڕزگار بووین و مێشی ئاتن بۆنی دیمەشق و بەغدای لێ دێ! بەر لە هەموو شت باقلاوەیەکی ئەستەمبوولیمان نۆشی گیان کرد!

سوێند خواردن و درۆ کردنی دوکانداران، دیمەشقی وە بیر دێناوە. بەڵام هەموو شت ئەوەندە هەرزان بوو نەبێتەوە. سینەمخان کراسی کڕی و دیاری بۆ دایکی. زەبیحی گیرفانی پڕ کرد لە پاکەتە جغارە. من سەبیلێکی بە جنجڕ- فنجڕم بە دوازدە درەخمە کڕی. کابرا -کە دەستی بڕیبووم- دە بەردە چەخماغی بە خۆڕایی دامێ. ئەو سەبیلە لە دیمەشق بە پەنجا لیرە بوو، کە پتر لە دە قات گرانتر دەکەوت. چووینە سەیری «ئاکرۆپۆل». بە ڕاستی پیاو سەری لە شارستانیەت و هونەری چوار هەزار ساڵەی یۆنان گێژ دەبێ. لە سەر کەشتی وەکیلێکی دادگوستەری عەرەبی عیراقیمان بوو بە ئاشنا. باسی یۆنانی دەکرد:

- کوڕە ئەو ئەتێنیانە ئەوەندە کەرن نەبێتەوە. من لە ڕستووران داوای هێلکە دەکەم، مریشکم بۆ دێنن!

- چۆن؟

- لە کاغەزێک عەکسی مریشکم کێشا، دام بە گارسۆن.

- دەی جەنابی مامۆستا! عەکسی هێلکەشت لە بن مریشکەکە کێشا و ئیشارەتت لێ دا؟

- جا ئەمەی بۆ چییە؟ ئەو کەرە نابێ بزانێ من چم دەوێ؟!

- بەڵێ، کەری سەیر لە دنیا هەیە!

لە سەر کەشتی سروودێکم دروست کردبوو لە سەر وەزنی: «ئەم جەژنی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە» سەربەندەکەی ئەمە بوو:

ڕۆییم هەتا پلیزنەرۆ، لەولا گەڕامەوە نەیهێشت هەرم پراگێ، شیووعی لە شامەوە

شەش بەیت بوو باسی ئەو ژیانە گواویەی دەکرد کە لەو بەینەدا ڕامانبوارد. من دانە- دانەم دەخوێندەوە و سینەم و زەبیحی کۆرس بوون، سەربەندەکەیان دەگوت. بە داخەوە هەر سێ بەیتیم لە بیر ماوە؛ ئەویش تێکەڵاو، مەسەلەن:

برلین و دۆشەکی لە هەوا، گۆشت بەرازی پیس     ئاودەستی ناو قەتار و بە پێوە سڕ و قەتیس

«دیدی» بە خۆی و فینف و لە ڕێی گۆدزبیرگەوە     ماڵی سەفیر و جووتە لە سەر تەختی وەرکەوە

میلان و جێنەوا و لە سەر «لیدیا»، لە دێک     رووت و ڕەجاڵ و سیس، لە بەریکا نییە درێک
شەو لە دەریادا دیمەنی ئاگرپرژێنی «سترومپولی» بە لامەوە زۆر جوان و تماشایی بوو.
کە لە ئاتین وەڕێ کەوتین فەتالیەکمان پێ نەبوو. کەشتی لە بەندەری ئەسکەندەرییە ڕاوەستا. خەلکێکی زۆر هاتبوونە بەندەرگا. لە سەربانەوە سینەم دەستی بۆ کابرایەکی زەلامی، سەر بێتووکی، زگ‌زل ڕاداشت: ئەوە ئاپۆ حیلمی خۆمانە. ئاپۆ حیلمی! ئاپۆ حیلمی!
ئاپۆ ئاوڕی دایەوە، دایبەزاندین؛ بردینیە ڕستوورانێکی دەم بەحر. بێ تۆ ناخۆش ئەوەندەی ژامبری (قرژاڵی بەحری) و ئابجۆی داینێ، هەڵمساین. سینەم تێلگرافی بۆ دایکی کرد کە پووڵی تاکسیمان پێ نەماوە لە بەندەری بێرووتەوە بێینە ناو شار. بە گومانم نۆ ڕۆژ و هەشت شەو لە بەحردا بووین. نوێژی خەوتنانێک گەیشتینەوە بەندەری بێرووت. تایەکی سەختم هەبوو. ڕەوشەن خانم بە تاکسیەکەوە چاوەنۆڕمان بوو. ڕاست بردینیە شام و ئەمن لە نوێندا کردمە ناڵەناڵ. لە شام، قەدری جانی شاعیر دیتمی؛ پێم پێکەنی، گوتی: تۆ و زەبیحی هەر مل لە خەتەر دەنێن! کوا چیتان کرد؟! لەوە زۆر پەست بووم؛ بەلام جوابێکم نەداوە.
پاش سێ ڕۆژ بەرەو ماڵ هاتمەوە؛ گەییمە حەلەب. میوانی ئوتێل یەرمووک بووم کە خاوەنەکەی (مەجید ئاغا) کوردێکی خەلکی عیفرین بوو. مەحموودی فەقێ محەممەدی هەمەوەندیش لەوێ بوو؛ کە زۆر باسی کوردایەتی بە دڵسۆزی دەکرد. لە گەشتێکی ئەستەمبووڵ گەڕابۆوە. لە دوایی هەوەڵ کەسێ بوو بە جاش لە سولەیمانی، ئەو هەمەوەندە بوو؛ هەوەڵ کەسیش بوو کە پێشمەرگە لە ناو شاردا تیرۆریان کرد.
چێشتەنگاو لە سالۆنی ئوتێل دانیشتبووم شتێکم دەخوێندەوە؛ ئەو سەعیدەی باسم کرد -کە من و سەیدا جگەرخوێنی گەڕاند- هاتە ژوور و لەو لاوە دانیشت. گوتی: هەژار دەگەڵ خالید بەکداش چۆنی؟ ئەو نەیهێشت بە مراد بگەی، وا نییە؟ پێکەنی. گوتم: برا! منی ئاوارەی بێکەس، هیچ هونەر نییە گاڵتەی خۆت بە من بکەی. کارێک بوو، بۆی چووم؛ سەری نەگرت. خەتاش لە کەس نییە، ویزەمان ناتەواو بوو!
- پێت وایە گاڵتەت پێ دەکەم؟
- بەڵێ قەدری جانیش تەشەری لێدام...
کورسیەکەی هێنا بەرانبەرم، گوتی:
- تا ئێستا ساڵ نەبووە دە هەزار لیرە کەمتر باربووی حیزبی شیووعی بکەم. لاقی ئەسپەکەم دەخەمە کوێی دایکی خالید بەکداشەوە. جا بزانە چۆن ئابرووی خۆی و سەگەلەکەی دەبەم؟! تۆ چووبووی لە سەر کورد وە جواب بێی! ئەگەر ئێمە ویجدانمان بێ، دەبێ ئەوەمان دە چاودا بێ و دۆست و دوژمنی خۆمان بناسین...
هاتمەوە تربەسپی و کروشمەم کردەوە.
دوکتور نافیز (برا گەورەی دوکتور نوورەددین زازا) لە پاش شۆڕشی شێخ سەعید لە تورکیاوە ئاوارەی سووریا ببوو؛ لە قامیشلی پزشکی دەکرد. هەر کوردێکی گوندی و فەقیر بچوایە لای، دەرمانیشی بۆ دەکڕی و بە ڕاستی زۆر بەبەهرە بوو. گێڕایەوە: جارێک چوومە گوندێک کە گوتیان نەخۆشێکی فەقیری لێیە و جەوانێکە. قوتوێک شوکولاتیشم بۆ برد. دایکی گوتی: کوڕی من ڕابە! دوکتور جوکلێتی بۆ هێناوی.
- هەیهوو هەیهوو! ئەوە دلم ناچێتە پیوازان دەڵێن جوکلات بخۆ!



گوتم: حەقی هەبووە، منیش پیوازم پێ لە جوکلێت خۆشترە.

شەوێک لە قامیشلی میوانی حاجی میرزا بووم؛ ئەحمەداغایەکی کۆنە ئەفسەری عوسمانی زۆر قسەخۆشیش میوان بوو. شەو جێگەیان لە بەر هەیوان بۆ ڕاخستین و زۆر درەنگ نوستین. تەواو چاوم گەرم نەکردبوو، بە زیرەی چوار میکرۆفۆنی مزگەوت ڕاپەڕیم. ئەحمەداغا دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا، گوتی: با چیرۆکێکت بۆ بێژم: ماڵم لە گوندێک بوو. مجێوری مزگەوت سەید بوو؛ کەرێکی هەبوو کۆلووی لێ بار دەکرد. هەر لە ئێوارەوە یەک بین دەیزەڕاند تا بەیانی. جیرانێکم هات گوتی: تۆ پیاوێکی دنیادیدەی، لەبەر زەڕەی کەری سەید خەوم لێ حەرامە. چارێک بکە! دڵی سەیدیش نەیەشێ.

- بە دزیەوە سەری شەو هێندێک ڕۆنی کەرە بخە ناو قنگی نێرەکەرەوە؛ حەقت نەبێ!

بەیان زوو سەید هات: ئەحمەداغا کەرەکەم مایەی ژیانمە! دەنگی نووساوە. دە خۆی دەنووسێ بزەڕەێ، لەپڕ نووزەیەکی دێ و پەشیمان دەبێتەوە؛ چم لێ دەکەی؟

- مام سەید! ساڵێک لە لای قارس و بایەزیدان کەران تووشی ئەو نەخۆشیە بوون؛ قڕانیان کرد. ئاوی ئەم دێیە بۆ نێرەکەر دەس نادا. ماکەرێک بکڕە و ئەمە بفرۆشە تا نەتۆپیوە!

ئیتر خەڵکی دێم لە زەڕەی کەر نەجات دا!

پەنجا کەسێک لە کوردە شیووعیەکانی جزیرە، سەر و شەشسەد لیرەیان دابوو، دەگەڵ کاروان خرابوون و چووبوونە مۆسکۆ. هەر ڕۆژی هەوەڵ لە مۆسکۆ قسەیان بۆ کردبوون:

- فەرمانی هەواڵی خالیدە: هیچ کەس نابێ بڵێ کوردم. دەبێ ئێوەش بەرگی عارەبی بە عەگاڵ و کراسی شۆڕەوە دەبەر کەن و بڵێن عەرەبی سووریاین. هەر کەس خیلاف بکا دەری دەکەین!

ئەوانە کە گەڕابوونەوە بە تاڵی و قەڵسیەوە گلەییان لە حیزب دەکرد. کە خەبەری سەفەرەکەی زەبیحی و منیشیان زانیبوو، گلەیی بن لێوان تەقیبوو؛ ببوە هەرا و لۆمەی بە ئاشکرا. حیزبیش - وەک زۆربەی حیزبە شیووعیەکانی‌تر- لە هەر کەسێ گلەیی ببیستایە کلیشەی جاسووسی پێوە دەنووساند و دەیگوت پیاوی ئیستیعمارە؛ دۆلاری دە باخەڵدایە. دەس کرا بە پاکردنەوەی حیزب لە ئەندامانی گلەکەر؛ زۆریان دەرکرد. تەنانەت ئاراکێلە ئەرمەنیە قوڕبەسەرەکەش وە بەر کەوت. دەرکراویش وە خۆ کەوتن؛ لەو دەشتەدا ڕاویان لە شیووعیان دابەشی. لە هەر کوێ بیانگرتبان دووچەرخەیان لێ دەستاندن و تێری زگیان پێلاقە دەکردن. لە دێهات نانیان نەدەدانێ. خولاسە ببوە ڕاوە بەراز.

ئێوارەیەک لە قامیشلی ڕەمۆی بەرپرسی لێژنەی قامیشلی بە تکا بردمیەوە ماڵ کە شیو بخۆم. دەستی کرد بە جنێودان بەوانەی دەگژ حیزب ڕاچوون:

- نە هیچ دەدەن، نە دەهێڵن گەنم بۆ ئابوونە کۆ کەینەوە.

- هەواڵ ڕەمۆ! ئەگەر کوانێک لە پێست بێت، دوکتور خوێنی نەخۆش دەزموێ، بزانێ لە دەروونیدا چی هەیە کە بۆتە مایەی کوان و زیپکە. ئەوانەی دەرتان کردوون هەموویان ئەندامی خۆشەویستی خۆتان بوون. قەت بیرتان نەکردەوە کام سەهومان هەیە؟ نەخۆشییەکە لە کوێوەیە؟ کەچی هەر مارکسیەتەکەی خۆتان دەڵێ قەزا و قەدەر درۆیە؛ هەر کەس بە غەڵەت نەچێ، تووشی بەلا نابێ. ئێوە هەزار کەستان کردە پیاوی ئیستیعمار. ئەگەر هەر یەکەی دوو خزمیان هەبێ ئەوە بوونە سێ هەزار. سێ هەزار دەرکراوی دۆلاروەرگر حیزبێکی بەهێزە و

بەربەست ناکرێ.

- زۆربەیان لە سەر تۆ بە گژماندا هاتوون. لایان وایە خەتای ئێمەیە نەگەیشتوویە مۆسکۆ.

- من دەربارەی ئێوە هیچم بە کەس نەگوتووە. هەر گوتوومە ویزەکەمان تەواو نەبوو. ئەگەر ئەوان ئەمەشیان کردۆتە مایەی گلەیی خەتایەکم نییە.

- دە جا چارێک بکە!

ئاغا قۆچ بەگ دەیگوت دەگەڵ یەکێک شەڕمان کرد؛ شەقێکم دە بەر زگی هەڵدا. شەو دایکی هاتبوو:

- قۆچ بەگ گیان! کوڕەکەم تری پێوە بەند نابێ، عیلاجێکی بکە!

- بۆ دایکم من دوعام لێ کردووە؟ جێ شەق چۆن بە من چارە دەکرێ؟!

***

حیزبی شیووعی لە سووریا زۆر بەهێز بوو. پیاو لای وا بوو دەتوانن حوکم بگرنە دەست. باسی یەکبوونی سووریا و میسر پەیدا بوو. حیزبی شیووعی هەموو تەبلیغاتی خۆی بۆ سەرگرتنی ئەو کارە تەرخان کردبوو. چەند مانگ هەموو ڕۆژ لە سەر یەک، وتاری سەرەکی ڕۆژنامەی «نوور» - کە ئۆرگانی حیزب بوو بە تاریفی ناسر و یەکیەتی پڕ دەکرایەوە. یەکیەتی سەری گرت. ناسر لە جوابی تەبریکی خالید بەکداش سوپاسگوزاری کرد. عەبدولحەمید سەراج -کە کوردێکی شامی بوو- کرا بە وەکیلی ناسر لە سووریە. عەبدولحەمید ئەوپەڕی هاوکاری دەگەڵ خالید بەکداش دەکرد. پیاوی دەوڵەت بە وڵاتدا دەگەڕان، ئەندامی گەورەی حیزبیان دەگەڵ بوو: هەر ڕەعیەتێک دۆستی شیووعیانە زەوی دەدەینێ و بە کەسیتر نادرێ. هەر کەسێ بە شیووعی ناسێنرابا، ئادرەس و دوو عەکسیان لێوەردەگرت. لە هەموو شارانیش بەو ئارایە ناسران. لەپڕ لە نیوەشەوێکدا بچن خالید بەکداش بگرن! لە ماڵ نەبوو؛ وە بەر نەهات. هەر چی دەنکە جۆیەکی بە خالید پاشا (!) دابوو، گیرا و لە زیندان توند کرا؛ مەگەر ئەوانەی کە توانیبوویان هەڵێن و خۆ بشارنەوە.

پاش‌نیوەڕۆیەک ڕەمۆ خۆی بە ماڵە مەدا کرد و هەر لە ڕێوە ملی لە جنێودان بە ناسری فاشیستی پیاوی ئیستیعمار دا.

- ڕەمۆ گیان! شتی وا مەڵێ. ناسر پیاوی چاکە! ئەگەر باوەڕ ناکەی ئەوە پەنجا ژمارەی نوور، بزانە چۆنی باس دەکا؟!

جەمیل حاجۆ لێ پرسیم: شیووعی زۆر بەهێز بوون. دەیانتوانی یەکیەتی تێک دەن. خالید بەکداش بۆ وای کرد تا وای لێ بێ؟

گوتم: دەڵێن هەتیوێکی زۆر بەدفەڕ دوعای دەکرد: دایکم بمرێ، باوکم ژنێکی حیز بێنێ؛ منیش پێ فێر دەبووم. باوک مرد، دایکی مێردی بە هەتیوبازێک کرد فریای هەردووکیان دەکەوت! بەکداش سووریای پێ کەم بوو، خەیاڵی کرد ئەگەر میسر بکەوێتە سەر سووریە، حاکمەتی سووریە و میسر زۆر باشە. بەڵام ئیتر...!

زەبیحی لە شام لێیان وە خۆ کەوت. نامیلکەیەکی بە ناوی «کوسمۆپۆلیتیە» بە زمانی عەرەبی دەرکرد. بە قەولی عەرەب «قوڕەکەی تەڕتر کرد». زەبیحی گوتی: ڕۆژێک چوار کومۆنیستی تۆپیوی پایەبەرز هاتنە لای ڕەوشەن خانم،گوتیان: خالید بەکداش دەڵێ: ئەو نامیلکە خانم نووسیویە و بە ناوی زەبیحی دەرچووە؛ گلەیی لێدەکەم. خانم بە کاموا چنینەوە

گوتی: بە هەواڵی خالید بڵێن من نەمنووسیوە. ئەگەر ببیسمەوە گلەیی لێم هەیە، «بەرە لە سەر هەتیوان لادەدەم، زەرەر دەکا.» هەواڵ خالید وست بوو؛ بەڵام ئیستاش نەیگوت چۆن ڕازێکی لە لایە و نایدرکێنێ.

شیووعیەکانی قامیشلی بە ڕواڵەت دۆستم بوون؛ لە بنەوە بلاویان دەکردەوە کە هەژار جاسووسی نووری سەعیدە. شەوێک لە ماڵ دەرکەوتم، تووشی کوڕێکی ماڵە حاجۆ بووم. سەرخۆش بوو؛ گوتی: جاسووسی نووری سەعید! لێرە بمێنی دەتکوژم. دەنگم نەکرد؛ گەڕامەوە ماڵ و نەچووم بۆ دیوەخان. کابرایەک بانگی کردمە دەرێ. هانکەی دەهات و زۆر پەرێشان بوو: سەیدا بگەیە. ئەمشەو حوسێن دەکوژن و دە چاڵێکی دەخەن. حوسێن هەر ئەوە بوو کە هەڕەشەی لێ کردم. غارم دا؛ خستبوویانە ناو ژوورێکی لای ماڵێ. گوێم لێ بوو بابی دەیگوت: ئابڕوومان بۆ نەما! تۆ هەڕەشە لە میوانی غەریبی ئێمە دەکەی؟! پالم بە دەرکەوە نا: بیکە بە خاتری خودا! من هیچ دڵ ئێشاوییەکم نییە. تا حوسێنم خەلاس کرد، زۆر بە زەحمەت. ئەمجار دەگەڵ حوسێن وا بیووینە دۆست، ئاومان بێ یەکتر نەدەخواردەوە.

چەند ڕۆژێ دوای گەڕانەوەمان لە سەفەری ئورووپا، نامەیەکی زەبیحیم بۆ هات:

«برا! دەوڵەت بە چۆرت حیسابی کردووە سینەم و من و تۆ هەر یەک چوارسەد و چلوچوار لیرە و دە قرووش قەرزدارین؛ کە بۆمان خەرج کراوە! خانمی دایکی سینەم -کە مودیر مەدرەسەیە- قەرارە بە ئەقسات بیدا. ڕۆژێک بردیانمە ئیدارە: یان پووڵ بێنە یان بچۆ زیندان. لە ناو مقۆمقۆی هاتوچۆکەراندا فیزماڵکمدایە و خانووەکەم گۆڕی و خۆم دزیەوە. تۆش ئاگات لە خۆ بێ...».

چوار مانگێک بە سەردا ڕابرد. لە بەر دەرکی قاوەخانە دانیشتبووم؛ سێ پۆلیس و ئەفەندیەک هاتن. پۆلیسەکان چوونە قاوەخانەی ئەوبەری جادە. مەعموور هاتە لای من. کورد بوو؛ گوتی من کوڕی فلان کەسم.

- ئای چۆنی؟ چاکی؟ باوکت چۆنە؟!

- ئەرێ سەیدا تۆ قەت چوویە ئەلمان؟

- چۆن نەچووم؟ ئای خودا ئەو سەر چۆمی ڕاینە و ئەو باد...

- سەیدا بەر لەوە باسم بۆ بکەی، ئەوە دوو مانگە لە شوێن تۆ بەو سێ پۆلیسەوە دێ بە دێ دەکەم. کەس نەیگوت عەبدوڕەحمان حەسەن دەناسم. هەر نووسیومە جێگای مەعلووم نییە. بێنە ئێستا چوارسەد و چلوچوار لیرە و دە قرووش نەغد بخە مشتمەوە. خۆ مـن درام هێنـدەی لێت بگەڕێم!

تاسێک بردمیەوە. ئای خوایە چۆن پێوە بووم!

- برا با پێت بڵێم: بە خودا جگە لە هێندێک ساوار و ئارد شک نابەم، ناچاری دەبێ بمگری و حەبسم کەی کە ئامادەم. بەڵام ڕەنگە باوکت کە شەوێک لە گوندی «حاجی ڕەشک» میوانی بووم دڵی لێت برەنجێ. ئیتر خۆت دەزانی!

برێک داما:

- دە باشە تەبلیغەکە ئیمزا کە با من خەلاسیم بێ.

- جا ئەگەر ئیمزای کەم یانی ها وەرن بمگرن! فەرقی چییە؟

- ئەدی چار چییە؟



- چار هەر ئەوەیە بنووسە نەمدیتەوە و بیرێتەوە.
- باشە خۆم ناخەمە بەر نەحلەتی باب و دایکم. خواحافیز!
ئینتخابات بۆ ناسر دەکرا. عەبد، مودیر پۆلیسی تربەسپی هات:
- وەرە هەڵبژاردنێ.
- بە خوا نایەم!
- پێناسەکەم دەیە بۆت مۆر کەم دەنا لە کار دەکەوێ.
وەک هەمیشە ئیعلان کرا! سەدی نەوەد و نۆ و نۆ لە دە (٩٩/٩%) ناسریان هەڵبژارد!
حوکمی ناسر زۆر دەگەڵ کوردی سووریا خراپ بوو. تەنانەت لێدانی سەفحەی کوردی لە قاوەخانان قەدەغە بوو.

ترس و لەرز پەیدا ببوو. خەبەر داکەوت پۆلیس دێهات دەگەڕێن بۆ کتێبی کوردی و هەرچی باسی ئازادی کورد دەکا. ماڵە حاجۆ نیگەران بوون کە تووشی هەرایەک بن. گوتم: ئەو جۆرە کتێبانە مەسووتێنن! دەیانبەمە ماڵە خۆم. ئامادەم ساڵێک لە پێناویاندا زیندان بکێشم. بەو شەرتە کۆمەڵە مەجەللەی هاوار -کە دە بەرگ گیراوە- بیدەن بە خۆم. نابێ، دەبێ، سەودا سەری گرت. کتێبم هێنانە ماڵ، لە سەر تاقە ڕیزم کردن. ژنێک هات گوتی: خێزانی حەسەناغا دەڵێ ئەگەر شتێکی وای هەیە لە فەوتانی دەترسێ بۆم بنێرێ من دەیشارمەوە. دەفتەری شیعران و دەفتەرێکی یادداشتی عومری خۆم نارد. پۆلیس بە دێ وەربوون؛ ملیان لە پشکنین نا. بەڵام بۆ تووتن بوو؛ نە بۆ کتێب. هەر ئەو ڕۆژە بارانێک باری، سێڵاو هات، ئامانەتیەکەی منی برد؛ کە ژنی حەسەناغا لە دەم کەندالی چەم شاردبوونیەوە! مەجەللەکە بوو بە ئی خۆم؛ بەڵام ڕۆژێ کە بەرەو بەغدا دەهاتمەوە، بۆم بردنەوە، گوتم حەیفە لە کتێبخانەکەی خۆتاندا نەبێ.
تا ئەوەشم لە بیر نەچووە: جارێک زستان، لە شام، لە کۆڵانێک تووشی دوکتور ئەحمەد عوسمان هاتم. بەفر دەباری. گوتی هەر دەبێ شەو میوانم بی. لە ڕێگەی چوونەوە ماڵدا، زۆری گۆشتی برژاو کڕی و چوار بوتڵیش شەراب.
- ئەحمەد، ئەوی تۆ کڕیت بەشی چوار کەس پترە.
- قەیناکا.

کە سەرم بە ژووردا گرت: جەمال حەیدەری، ڕەئیسی حیزبی شیووعی عیراقە، کە ڕقی زۆری هەمیشە لە ناوی کورد و کوردستان بووە؛ دانیشتین. بە کوردی قسەی دەکرد! لیوانێکی شەراب خواردەوە، ڕووی کردە من:
- کاک هەژار! تۆ دەبێ شیعری باشمان بۆ بڵێی. ئەوانەی تا ئێستا نووسیوتن باش نین. باسی کۆریا و دنیای دەرەوە بە کارمان نایە. باسی کوردایەتی، ئازادی کوردستان بنووسە!
بێدەنگ لینگم تا پشت ئەژنۆم هەڵکرد، ڕاست بوومەوە و تفە دەستێکم کرد.
- بۆ کوێ؟ چ دەکەی؟
- کاک جەمال! نامەخوا بە پیاڵەیەک شەراب ئەوەندە کەوتوویە سەر میللەت پەروەری، بە خوا وا نەکەم ناتگەمێ!

لە شام دەگەڵ زەبیحی -کە هەمیشە فکری قۆڕ و خەیاڵ پلاومان دەکردەوە- «فوئاد قەدری»مان دیت. چووینە لای عەزیز شەریفیش -کە حقووقی و چەپییەکی بەناوبانگ بوو- زۆرمان بۆ ڕستن: ناسر ئەوەندە دژی نووری سەعید و پەیمانی بەغدایە؛ شەش ملیۆن کورد لە

عیراق و ئێرانە؛ ئەگەر ئەوان لە خۆی دڵخۆش کا و دنەیان بدا، چاکترین چەکی بە کار بردووە... بە هەر فڕ و فیشاڵێک بوو، ئەو دوانە گوتیان فکرێ باشە. فوئاد چاوی بە «سدیق شەنشل» و «فایق سامرایی» کەوتبوو کە عیراقی و دۆستی ناسر بوون و دەگەڵ عەزیز شەریف دەچوونە قاهیرە. خواوراستان تیری کوێری گرتی. بەشی کوردی لە ڕادیۆ قاهیرەوە کرایەوە. ئەمجار خەیاڵمان کرد کە ڕەنگە شای ئێرانیش لەبەر ناسر کێچی بکەوێتە کەوڵی و ڕادیۆی کوردی دامەزرێنێ.

ماوەیەکی پێ چوو ڕادیۆ ئێران گوتی: لەسەر مەنوویاتی شاهەنشا، ڕادیۆی سەد کیلۆ واتی لە کرماشان دادەمەزرێ، کوردی لە سەر بڵاو دەکرێتەوە.

شەوی دەست پێکردنی ڕادیۆ، گوێمان بە ڕادیۆوە نووساندووە بزانین دەڵێ چی؟ ئایەتوڵڵا مەردۆخ بە وتارێک کردیەوە، کە ئەگەر عەرەبیەکەت لێ بژاردبا، فارسیەکی ڕووت دەمایەوە و دوو سێ «کرگە» و «بووگە»ی تێدا بوو. لە قسە و گۆرانیەکانیتریش هەر کوردە و دەمی خوار دەکاتەوە تا وەک فارسی بچێ. بە داخەوە...

نامەیەکی بڵندبالام لەو بارەیەوە نووسی کە: «بابە هیچ کوردێک دەو زمانە دە ناو فارسی هەڵشێلدراوە ناگا. بە هەزاران لە کوردی سووریا چاوەنۆڕی مەرحەمەتن، ئێوە هیچ نەبێ گۆرانیەکان با کوردی بن و مەیانگۆڕن. ئیمزا: موحسین ئیراندوست». پاش چەند شەوێک ڕادیۆ کرماشان لە باسی نامەی گەیشتوودا گوتی: ئاغای موحسن ئیراندوست! نامەکەت گەیشت. دامان بە لیژنەی تایبەتی.

نامەیەکم بۆ «سەعید قەزاز» نووسی کە وەزیری داخلەی عیراق و کوردێک بوو، کە: «فلان! من بیستوومە دەڵێن کوردێکی بەشەرەفی. ڕاستت دەوێ باوەڕم نەکردووە؛ چونکە بەردەستەی نووری سەعیدی. ڕادیۆ بەغدا لە پەستا جنێو بە ناسر دەدا؛ قەت جارێک نالێ ئەو کوردانەی سووریا چەند بە دەستیەوە زەلیلن؛ ناوێرن گوێ لە ڕادیۆی کوردی بگرن؛ سەفحەی کوردی لێدەن. لە باتی ئەوە باسی وشتر بکەن، باسی ئەوەش بکەن کە زۆر کاریگەرە و ئابڕووی ناسری پێ دەچێ. ئەگەر ئەوە بکەی باوەڕ دەکەم کە شەریفی. ئیمزا: بابەکر». لە سەر پاکەتەکەم نووسی: «خسووسی». لە بێرووت خستمە پۆستەوە. وا بزانم پێی گەیشتبوو؛ تەئسیریشی بوو. چونکە زۆر زوو بەغدا لە سەر کوردی سووریا، ناسری وە بەر حەملە و جنێو دا.

فشار تا ئەندازەیەک لە سەر کوردەکانی جزیر سووک بوو. بەڵام لات وا نەبێ ئەو نامانەم بە تەنیا کردووە. زەبیحی و من - وەک مەلا شێخیان- دوومان بە یەک پیاو حیساب بووین.

جەلال تالەبانی و دەستەکەی لە مۆسکۆ گەڕانەوە. گلەم لێ کرد کە بۆچی لە سەر ڕادیۆ مۆسکۆ وتاری بە عارەبی داوە و بە کوردی نەبووە.

- ڕێگەی کوردی خوێندنەوە نەبوو؛ بەڵام وامان کرد، وا بچێ، زۆرمان خزمەت بە کورد کرد...
- کاکە نووسراوەکەی ئێمەت دا بە کێ؟
- ئای بە خودا لە بیرم چوو! ئێستاش هەر لە چەمەدانەکەم دایە!
- دەکرێ بیدەیەوە بە خۆم؟
- بۆ چیتە؟
- وەسیەت دەکەم دەگەڵمی دە قەبر خەن! ئێمە ئەوەندەی پێوە ماندوو بووین، تۆ لە بیرت بچێ!...

عەزیز شەریف کە لە مۆسکۆ گەڕابۆوە. لە ماڵی ڕەوشەن خانم بە سرتە پێ گوتم: لە مۆسکۆ بە دزیەوە مەلامستەفام دیوە؛ گوتوویە: «هەژارم بۆ ماچ کە و سلاوی منی پێ بگەیەنە». پاش یازدە ساڵ، ئەوە هەوەڵ جار بوو خەبەری بارزانی بزانم.

نەجیب خەفاف لاوێکی عیراقی کە چووبووە مۆسکۆ گێڕایەوە - وە باڵ بەستۆی خۆی-گوتی: چووینە لای نازم حیکمەت، گوتمان: چۆن وا بکەین زۆر لە لاوانی دنیا کۆ کەینەوە و دەردی خۆمانیان بۆ بڵێین؟

- ئەوە لە ملی من. من دەعوەتی گشتیان دەکەم. خەرجیش دەخەمە سەر لاوانی شۆرەوی. ئێوە چیتان دەوێ بڵێن، بۆشتان تەرجەمە دەکرێ.

سەری وەخت، سەعات چواری ئێوارە، پتر لە پێنجسەد کەس نوماینەدەی دەستەجاتی ڕووسیا و نامۆ و لاوەکی لە سالۆن کۆ بوونەوە. چاوەنۆڕین مام جەلالی سەرۆکمان تەشریف بێنێ قسەیان بۆ بکا. چارەگێک ڕابرد نەهات؛ نیو سەعات پێچوو نەهات. نەخێر هەرچی تەلەفۆنمان کرد پەیدا نەبوو کە نەبوو. نازم حیکمەت ڕووی کردە میوانان:

- من کراومە وەکیلی کوردەکان قسەتان بۆ بکەم.

تێری هاواری کورد کرد. زۆریان بۆ لە چەپلە دا. یەک لە قسەکانی ئەوە بوو: «من کە بە کوردستانی ئازاددا نەچمەوە تورکیە، لام وایە تورکیە دەوڵەت نییە و بۆنی ئازادی نەکردووە...».

میوان بەڕێ کران و هاتینەوە مەنزڵەکەمان. شەو درەنگێک جەلال هاتەوە.

- لە کوێ بووی؟

- کارم هەبوو!

- کاری لەوە گرینگ‌تر -کە نەهاتی- چییە؟!

- کارم هەبوو، بڕایەوە!

کەوتینە پێ و شوێنی ئەو کارە گرینگە. ڕوون بۆوە جەلال لە ئاسانسۆردا موهەندسێکی مێوینەی دیوە. بوونە ئاشنا و لای داوەتە ماڵی ئەو؛ لە کۆبوونەوە خۆی بواردووە. نازانم نەجیب درۆی دەکرد یان نا؟ خوا دەیزانێ...

زەبیحی هاتە جزیر گوتی: دەمەوێ سەرێک لە عیراق بدەم؛ بزانم بۆ پارتی هیچ نەشرە و مەشرەمان بۆ نانێرێتە شام.

- مەچۆ! خەتەرە!

- نا مەلا! مەلا عەلی کولتەپەیی لە جوابی تیلگرافمدا گوتوویە بشیەی قەیناکا. جاران هەر بۆی دەنووسیم نەکەی بێیەوە.

زەبیحی لە مووسڵەوە تیلگرافی کرد: «ماری لە بیمارستان زا». خوا شوکور بە سەلامەتی گەیشت. پاش شەش ڕۆژ سەر و کەللەی پەیدا بوو:

- مەلا خراپ قەوما! چوومە ئوتێل لە کەرکووک. پیاوێک بردمیە ماڵە خۆی. پۆلیس ڕژابوونە ئوتێل من بگرن. نازانم چۆنیان زانیبوو. بە پەلە لە ڕێی مووسڵەوە هاتوومەوە.

- ئەدی ئەو نەعلە قۆڕە چییە دە پێتدایە؟! کوا کەوشەکانت؟

- شەو لە ماڵی عەرەبێکی چۆڵی میوان بووم. بەیانی گوتی: چون دڵت قبووڵ دەکا مامت پێخواس بێ؟ ئەو کەوشانەم دەیە! نەمدابا دەهات لە ڕێ دەیکوشتم!

- ئافەریم بۆ کەرەمی عەرەب!...

تەواو لەو ژیانە بێتامە و ئەم شەڕە چەققەی شیووعی و بێکاری و سەرباری خۆم وەڕەز ببـووم. هیچ هومێدیشم بە هیچ نەمابوو. بڕیارم دا بە ماڵەوە بچمە میسر و حەولی شاگرد عەکاسی بدەم و هەژاری خۆم بکەم و کەس نەمناسێ. هەر دەو فکرانەدا بووم، شەو ڕادیۆ بەغدا خەبەری دا کـە سبەی نووری سەعید و مەلیک دەچنە تورکیە. بەیانی مەعسووم گوتی: بۆ ڕادیۆ ناکەیەوە؟

- ڕادیۆی چی؟ ئەو سەگبابە دەچنە تورکیە داخوا چ داوێک بۆ کورد دەنێنەوە.

کردمەوە موزیکی مارش بوو، بەستم.

- ها نەمگوت؟ ئەوە خەریکن دەفڕن.

قەسابێکی عەبدۆ ناو، عەرەبی حەڵەبی –کە سی ساڵێک بوو لـە تربەسـپی قەسـابی دەکـرد و کوردیش باش فێر ببوو– لە حەسار وە ژوور کەوت و بە لرفە و هەڵپەوە پیلی کێشام:

- وەرە بڕەقسین! مەلیک و نووری سەعید کوژران و کوودەتا کراوە!

ڕادیۆ دەکەمەوە، ڕاستە. قەدەرێک دەگەڵ عەبدۆ ڕەقسیم. خۆم گەیاندە شام: دەی کاکـە بـا بڕۆینەوە بەغدا. پۆلیس گوتی: تـۆ دەبـێ لـە قامیـشلی پاسـپۆرتت تـازە کەیـەوە. یـان نەقـڵی مەسکەن بکەی بۆ شام. ئەها دیسان وەک پێناسەکەم دەبێ شەش مانگ تۆز بخۆم و مانـدوو بم؛ جا دەمدەنێ یان نامدەنێ. لای کوردێکی شامی ئاشنا، ئەو دەردەدڵەم کرد؛ گوتی: بـەینی خـۆم و خۆت بێ! بچۆ ئیدارەی بەرزی ئەمنی عـام، بـڵێ سـەرهەنگ عەبـدولقادرم دەوێ. پێـی بـڵێ عەبدولقادر ناردوومی؛ کارت بۆ پێک دێنێ.

- جا خۆ تۆ ناوت عەبدولقادر نییە!

- حەقت نەبێ، بچۆ!

لە دەرگای ئەمنی عام گوتم: سەرهەنگ عەبدولقادر؟

- بڕۆ سەرەوە.

بە ئەفسەرێکم گوت.

- دانیشە!

قاوەیان هێنا. گوتیان بـڕۆ ببینـە. پیـاوێکی کەڵـەگەتی چوارشـانە، سـەر زەلام، چاوڕەشـی، بڕۆپڕی، سپی و سۆڵ، جووتێک سمێڵی زۆر لەبار.

- چیت دەوێ؟

- عەبدولقادر ناردوومی، ئەوەش کارەکەمە.

- هەر ئەوەندە؟

- بەڵێ.

لە زەنگی دا؛ ئەفسەرێک هاتە ژوور.

- ئەم پاسپۆرتە بەرە تازەی کەوە! بە کامیلی بیهێنەوە، بەڵام زوو.

- بەڵێ قوربان!

باوەڕ کە، دە دەقیقەی نەبرد پاسپۆرتم وەرگرتەوە.

- زۆر سوپاس، خوداحافیز.

- سەلام لە عەبدولقادر بکە!

گەیمە بەر دەرگای ژوورەکەی. گوتی: بۆ کەس ئەم نەقلە مەگێڕەوە.

لە برادەرەکەی شامیم پرسی مەسەلە چییە؟



- کاکە ئەوە کوردە؛ ئامۆزای منە. کەس نازانێ عەرەب نییە. ئیدارەی ئەمن ئەو هەڵیدەسووڕێنێ!

بە کوودەتای قاسم زۆر شاد بووین. ڕادیۆ بەغدامان دەکردەوە و گوێ بگرە و بەهـ- بەهـ بڵێ! شەوێک قاسم نوتقی کرد. گوتم: زەبیحی خۆمانەین، ئەگەر بوێرم دەڵێم ئەو کابرایە دەلووکارە، نیوە شێتە.

زەبیحی لێم دەرهەڵ بوو:

- مەلا قسەی قۆڕ مەکە! کوا پیاوی وا گەورە و زانا؟

- گاڵتەم کرد، بمبەخشە!

زەبیحی خۆی تێک نا لە شامەوە بڕواتەوە. منیش هاتمەوە ماڵ، شرە و بڕەمان پێچایەوە کە بڕۆین. ڕەمۆی شیووعیم لێ پەیدا بوو:

- سەیدا! بە هیچ بارێکدا ڕازی نین تۆ بەجێمان بێڵی. تۆ زۆر بۆ ئێمە بەفایدەی!

- کاکە هەر بۆیە دەڕۆمەوە تا بزانن من جاسووسی نووری سەعید نەبووم...

بە ماشینی کوڕی حاجی میرزا چووینە «تەلکۆچەر» کە لە سەر سنوورە. جیپێکمان بە دوو دینار بە کرێ گرت بمانگەیەنێتە مووسڵ. دەبوایە ئیجازەی چوونە عیراق لە ئەفسەری سنوور وەرگرین. گوتیان ئەفسەر لە مووسڵە، دوو ڕۆژ سەبر بکەن تا دێتەوە. کابرای شوفێر کە نەیدەویست دەست لە دوو دینار هەڵبگرێ، کاکە و برالەی دەگەڵ سەرگرووهبانێک کرد کە وەرەقەمان بۆ ئەفسەر بداتێ لە مووسڵ پاسپۆرتمان بۆ مۆر کا. بارەکەمان چ بوو؟ دو بەڕە مێژووییەکانی کە جۆلا لە کۆنە پەلاسی بەرمان چنیبووی، دوو سێ پەتووی کۆن، هێندێک قاپ و مەنجەڵی ئەلمۆنیۆم. لە وەختی بارکردندا مەعسووم هێندێک ئارد و پێنج شەش مست نیسکی هێنا.

- ئەمەمان بۆ چییە؟ بارگرانییە. خۆ بە ڕۆژێک دەگەینە مووسڵ.

گوتی: ئەوە لە دەشت ماینەوە و منداڵەکانم برسی بوون، چ بکەم؟... ناچاری کردین ئەویش بار کەین. هەموو بارەکە تێری کۆڵی حەنباڵێک نەبوو. بەر لە نیوەڕۆ گەیشتینە مووسڵ. منداڵم بردنە ئوتێلێکی سەر دەجلە. چوومە ئیدارەی پۆلیسی سەفەر کە بتوانم بچمە بەغدا. کاربەدەست ڕوانیە پەساپۆرت:

- کوا مۆری ئەفسەری سنوور؟

- لە باتیان نامەی سەرگرووهبانم پێیە.

- حەی حەی! سەرگرووهبانی سەگباب حەقی چییە ڕێگەت بدا؟! هەر ئەمڕۆ لە سنوور دەتکەینەوە بەو دیودا.

- من بە ئیجازە هاتووم. ئەگەر گوناحبارێک هەبێ سەرگرووهبانە؛ من نیم.

- نەخێر هەر دەبێ دەرت کەین.

گوتم: لە هەموو عومرمدا ئەوە یەکەم جارە بە قانوون دەبزوومەوە؛ ئەویش تووشی کێشە بووم! دەنا بۆ خۆم بە قاچاغ ئەهاتم؟

- قاچاغ؟ بۆ تەیر دەردەچێ؟ ئێمە باشمان ئاگا لە سنوور هەیە.

- جا با گرێو بکەین: ئەمڕۆ دەڕۆم سبەی دێمەوە و پێشم نەزانن.

- محاڵە!

هاوکارێکی پێکەنی:
- محالە محالە! ڕۆژێ سەد کەس بە قاچاغ دێن و خەبەریشمان نییە. باوکم گریو ناکەین!
پاش هەزار چەقە و چەنە چەن، قەرار درا بچمە لای ئەفسەری سنوور، ئەگەر بۆی ئیمزا کردم لێم گەڕێن. هەر چوومە دەر، تیلگرافێکم بۆ عەزیز شەریف -کە لە قاسم نزیک و لە شام بیووینە ئاشنا- لێدا. هاتمەوە لای منداڵەکان کە نیوەڕۆژە بخۆین. لە ئوتێل چوومە خوار لە دوکانی شووتیفرۆشێک گوتم: شووتیەکم دەیە!
- هەڵبژێرە!
باوەڕ بکە شووتی وای تێدا نەبوو کە بۆم هەڵبگیرێ.
- برا شووتی مووسڵە! تۆ چەند کیلۆت دەوێ؟
- هەشت تا دە.
لەتێکم کڕی. پاش نیوەڕۆ چوومە ماڵی ئەفسەری سنوور «زاهید محەممەد» کە باسم کرد. کە زانی من هەژارەکەی میوانی ماڵە حاجۆ بووم، بە ڕووی خۆشەوە دواندمی و بۆی ئیمزا کردم و تەلەفۆنیشی کرد کە پۆلیسی سەفەر دەستم لێ بەردەن. ئێوارە درەنگ چووینە سەر قەتار و لە واگۆنێک جێمان گرت. دوو کەسم دین لە خوارەوە بە واگۆنانەوە دەگەڕێن و دەڕوانن؛ ترسام. زانیم پۆلیسی نهێنین و لە من دەگەڕێن. بە مەعسوومم گوت: ئێوە خۆ لە من مەکەنە ساحیب. ئەوانە دەرمدەکەنەوە سووریە. بچنە بەغدا. خۆم بە قاچاغ دێمەوە. پۆلیس دیتیانم، گوتیان: دابەزە! کارمان پێتە. برا خۆ دەزانی ئێمە هیچ خراپەمان دەگەڵ نەکردووی. تکایە لە بەغدایە شکایەت لە پۆلیسی سەفەر مەکە! مودیری پۆلیسی گشتی ئەحواڵی تۆی پرسیوە و چاوەنۆڕتە! دیار بوو تیلگرافی عەزیز شەریف کاری کردبوو.
بەیانی گەینە بەغدا. «نووری ئەحمەد تەها» لە ئێزگە چاوەنۆڕی دەکردین؛ کە لە بریکاری حیزبی پارتیەوە هاتبوو. بارمان داگرت. توورەگەی نیسکەکە دڕا و لێی ڕژا. تێری گاڵتە پێ کردین: ئەمە چییە؟ بۆ پێت وا بووە بێکەسی و حیزبی پارتی دە هانات نایە؟! دەگەڵمان هاتە ناو شار؛ بووینە میوانی ئیمامی. نووری ڕۆیشت بە بێ ئەوە بڵێ چیتان لازمە! جەلال بێتووشی شەریکم هات پێنج دیناری دامێ، بووژامەوە. چونکە نیو دیناریشم شک نەدەبرد. جەلال گوتی بیست و سێ دینارم بە واسیتەی مام جەلال بۆ ناردوویە سووریا.
- پێم نەگەیشتووە...
خانوویکمان بە شەریکاتی چایچیەکی کۆیی لە گەڕەکی «بارودیە» -کە نزیک بە دوکانەکە بوو- مانگێ بە پازدە دینار (هەشتی من و حەوتی هاوماڵەکەم) بە کرێ گرت. لە دوکان دەستم کردەوە بە عەکاسیەکەی جاران. چووشمە لای مودیری پۆلیسی گشتی سوپاسم لێ کرد. چوومە لای جەلال تاڵەبانی لە ئوتێل (وابزانم دیانا) وەتاغێکی تەنیای گرتبوو. باسی بیست و سێ دینارەکەم کرد.
- چۆن پێت نەگەیوە؟ داومە بە مەسئوولی پارتی لە مووسڵ، چاوی دەردێنم!
دوای دوو ڕۆژ گوتی: بۆت بە ئەندامێکی خۆماندا بەڕێکراوە، ئەو خواردوویە.
- کاکە تەسلیمی تۆ کراوە؛ وابزانم تۆ دەبێ بیدەیەوە.
دەرهەڵ بوو:
- بۆچی من دزم؟ تۆ بۆ ئەوەندە بە تەماحی؟ دە با ئەو پوولە نەبێ!

- کاکە جەلال! لەو ڕۆژەوە من ئاوارە بووم هەرگیز مخارجی مانگێکم بە قەد مخارجی ڕۆژێکی تۆ لەم ئوتێلە نەبووە. هەردووکیشمان دەڵێین بۆ کورد کار دەکەین، هەزار ئەوەندەی تۆم کوێرەوەری دیوە. ئێستا داوای حەقی خۆم بکەم پیاو خراپم؟! با وا بێ، ئەوا نەمویست...

پیاوی ئەمن، زەبیحی و منیان دیتەوە. گوتیان جاسووسێکی زۆر گەورەی سەر بە ئینگلیسمان گرتووە؛ ئیقراری کردووە کە حقووقی هەموو جاسووسانی ناو کوردستانی عیراق بە دەست ئەو بووە. بەڵام دەڵێ من زۆرم پیاوەتی دەگەڵ پیاوانی باش کردووە و لە گرتنم ڕزگار کردوون. بڕۆن لە زەبیحی و هەژار پرسن تا بزانن من ڕاست دەکەم. جاسووسەکە ناوی «مەلا عەلی کولتەپەیی» و خەڵکی سولەیمانییە. ئای نەگبەت! مەلا عەلی برای گیانی گیانیمان کە هەموو سری خۆمان پێدەگوت؟! دیارە چی کردووە. خەبەری داوە دەتانگرن، هەر خۆی دوای ڕۆژێک و دوو ڕۆژ بە گرتنی داوین! دەرکەوت ئوتێل پشکنی کەرکووکیش، هەر فیتی ئەم برا خۆشەویستە بووە کە زەبیحی بگرن! «کاکە برۆن! نە شایەتین، نە دەیناسین». نزیکەی ساڵێکیان گرت و بەریان دا. کەچی لۆر-لۆر بە زمانی لووس، خۆی کردەوە برادەرمان!

سەفارەتی بریتانیا لە لایەن حەشامەتەوە داگیر کرابوو؛ هەیکەلی «مۆد» شکێنرابوو؛ کاغەز-ماغەز و پەروەندە سووتێنرابوون. پتروس ناوێکی ئەرمەنی نامەیەکی دیبوو ناوی منی تێدایە، بۆی هەڵگرتبووم. کە چوومەوە بەغدا بۆی هێنام. گوزارشێک بوو بە سەفارەتی ئینگلیس درابوو: «هەژار -کە لە ئێرانەوە هاتووە- ناوی عەزیز قادرە و دوکانی لە فلان شوێنە؛ زۆر خەتەرە. ئیمزا: عەبدوڵلا». گومانم پەڕیە سەر چەند عەبدوڵلا ناوێک؛ ئێستاش بۆم ساغ نەبۆوە کێیە. مەلا عەلی گوتی من نەبووم و باوەڕیشم پێ کرد.

ڕۆژێک جەلال تالەبانی گوتی: تۆمارێکی درێژمان ساز کردووە؛ پڕی لە ئیمزای کوردەکانی سووریە. زەبیحی و تۆمان کردۆتە وەکیلیان. داوامان لە قاسم کردووە بۆی بەرین. خۆ ساز کەن برۆین! گوتم: منی وا شڕ و شڕۆڵ بە خوا نایەمە لای زەعیم. ناچار کراسێکی زۆر باش و پانتۆڵێکی حازرم پێ کرین. دە کەسی‌تریش کە جەلال و خوشکە زەکیەی فەیلیمان دەگەڵ بوو- چووینە وەزارەتی دیفاع. زەبیحی تۆمارە درێژی ڕاخست؛ بە عارەبی سووریاییانەش فەرمایشاتێکی فەرموو. ئیتر قاسم ملی لێ نا، سەعاتێک لە سەر یەک نوتقی کرد؛ گێژی کردین. فەرمووی با عەکسێ پێکەوە بگرین. ئیتر بێ ئەوە کەسی‌تر زمانی بگەڕێ، وەخت نەما و هاتینە دەر. داوای کراس و پانتۆلەکەیان لێ‌کردمەوە، جوابم نەدانەوە!

لە شۆڕشی کوردستاندا -کە دەوڵەت ببوە دوژمنمان- کابرایەکی تورکمانی هەولێری دەگرن؛ عەکسەکەی نیشان دەدەن؛ دەڵێن تۆ هەژاری! چەند چین دارکاری دەکەن. تا شایەت پەیدا دەبێ کە ئەو کابرایە بێ ئاگایە؛ ئەو سا بەری دەدەن.

دەگەڵ زەبیحی کەوتینە نیگەرانی: خوایە قزلجی لە ماوەی ئەم سێ ساڵەدا چی بە سەر هات؟ دەیانگوت بۆتە فالچی لە کرماشان، توور و گێزەر دەفرۆشێ. سۆراغمان هەر نەکرد. دوای دوو مانگ کە هاتینەوە بەغدا، قزلجی پەیدا بوو. کە دەگەڵ زەبیحی لێک هەڵبڕابوون، ببوە میوانی حافیدی ئامۆزای و خۆی گەیاندبووە هەڵەبجە. ئەو هەموو مابەینە بۆتە سۆفییەکی ڕیش‌درێژ لە تەکیەی شێخێک و نوشتەی لە باتی شێخ نووسیوە و نان و دۆی تەکیەی خواردووە. تا کوودەتای قاسم چەند مانگی بە سەردا تێپەڕیوە، تازە وێراویە دەرکەوێ. دیسان سێ تفەنگدار گەیشتینەوە یەک!

هەر کە تازە هاتبووینەوە بەغدا، گوتیان مامۆستا گۆرانی شاعیر لێرەیە. هەر دوور بە دوور ئاشنای بووم و نەمدیبوو. چوومە زەیارەتی لە ئوتێل سیروان. فەرمووی: هەژار! جار-جار دڵ خەبەر دەدا. وا کۆمەڵی نووسەران و شاعیران دامەزراوە؛ سەد و پەنجا ئەندامن. داوام کردووە ناوی تۆش نووسراوە. هەر چەند گوتیان کەس نازانێ لە کوێیە؛ تازە نایەتەوە؛ دەدڵم چەقیبوو دێیەوە. دڵم خۆشە کە ناوت نووسرا.

- مامۆستا سوپاست دەکەم؛ بەڵام نایکەم.

- چۆن ئەو شانازیە قبووڵ ناکەی؟

- قوربان! چیرۆکمان چیرۆکی موسوڵمانانی هیندە: بەوپەڕی ئازادیش ڕەئی بدەن، هەر کەمایەتین. پاکستان بۆیە دروست بوو... نۆ کورد دەگەڵ سەد و چل عەرەب چۆن دەربەرێ؟! ئەگەر برادەران ڕاست دەکەن، با فەرعێکی کوردستان بۆ ئێمە دانێن؛ کتێبی کوردیمان بۆ چاپ کەن. ئەوان هەر دەڵێن کوردی بە عارەبی تەرجەمە کەن، بۆتان بڵاو دەکەینەوە. یانی هەر دەبێ نۆکەریان بین و خزمەت بە فەرهەنگی ئەوان بکەین...

ئەو زۆری فەرموو، من کەمم بیست. لە ناو قساندا فەرمووی:

- زۆر کەس دەڵێن تۆ بۆ چوویە حیزبی شیووعی؟ بەوان چی؟

- ببەخشە! منیش یەکێک لەوانم. مامۆستا ئەگەر حیزبی بووی، یەکێکی وەک جەمال حەیدەری پێت دەڵێ: شیعرێکمان بۆ بڵێ! فلان و فلان شتی تێدابێ. ئەگەر خۆی شاعیر بێ بە تۆ نالێ. تۆش ئەگەر خۆت بۆ خۆت فکر نەکەیەوە، شیعرەکەت فەرمایشتی ئەحمەقێکە تۆ هۆندووتەوە. دەبێ شاعیر ماسی بێ کێرد بێ، بۆ خۆی بنووسێ. ئەوسا دەستەیەک هەر لاگیری دەبن. هەر لە خۆت دەپرسم: توخوا شیعری «داوەتی قەرەداغ»، «گەشتێ لە هەورامان» کە ئەوسا حجێل بووی، دەگەڵ شیعری «بت و بتەوان» کە بە پیری فەرمووتە، کامیان باشترن؟

- دیارە ئەوانی پێشوو.

- ئەمەیە تەئسیری حیزبایەتی لە سەر شاعیر...

هەر ئەو جارە، مامۆستا گۆران -کە لە پرسی ئەو، جوابم داوە بە ماڵ و منداڵەوە بە دوو دینار لە تەل‌کۆچەرەوە هاتووینە مووسڵ- سەیر ما:

- چۆن وا هەرزان؟

- مامۆستا ماڵ باوەشێک بوو؛ لات وایە ماڵە قەرەتاژدینم بار کردووە؟!

رادیۆ خەبەری دا بارزانی و هەواڵانی دێنەوە عیراق. ئۆخەی لە پاش دوازدە ساڵ دیسان چاوم بەو پاڵەوانە خۆشەویستە دەکەوێتەوە. برایم ئەحمەدی سەرۆکی پارتی و چەند هەواڵێکی و شێخ سادقی برازای مەلامستەفا چوونە پراگ و لەگەڵیا هاتنە قاهیرە؛ دیدەنی ناسریان کرد و بەرەو بەغدا فڕین. لام وایە بیست هەزار کەس پتر لە فڕگەی بەغدا هاتبوونە پێشوازی. عەرەب و کورد تێکەڵاو، شیعاردان گوێی عاسمانی کەڕ دەکرد. هەر کوردێکی بە جلکی کوردییەوە بوایە، لە سەر شانان دادەنرا و شیعاری برایەتی کورد و عەرەب دەدرا. گوتیان کوردێک کە لە سەر شانان داندراوە، دزێک کڵاشەکانی دزیوە. کوردە هاواری کردووە: «کڵاشەکەم!»، حەشامات لێکڕا گوتوویانە: «کڵاشەکەم! کڵاشەکەم!»، لایان وا بووە ئەمەش شیعارێکە بە زمانی کوردی!

بارزانی لە ئوتێلێک دابەزی. گوتیان بەر لە هەر کەس لە تۆ و زەبیحی پرسیوە. دەیەوێ

بتانبینێ. فەرمووی: «دوو سەعاتم بە دیاری بۆ هێناون. بۆ کەسی‌تر هیچم نەهێناوە...». لەو ڕۆژەوە کە دیتمەوە، ئیتر هەموو برینی دڵم -کە لەو چەند ساڵەدا قرتماخەی بە سەر قرتماخەدا هاتبوو- سارێژ بوونەوە و هەموو دەرد و ئاخم لە بیر چوونەوە.

شەوێک -کە دوو بە دوو بووین- زۆری دڵخۆشی دامەوە کە: بڕیار بێ من و تۆ لە خۆشیدا شەریک بین و تازە خەمی بێکەسی مەخۆ!

گوتم: کاکە بمبەخشە! من لام وایە نەوعە شێتییەکت تێدایە. ئەوە چەند ساڵ و زەمانە کە من ئاوارەم، کەس نەبوو بە ڕووی خۆش جوابی سلاوم بداتەوە. یان ئەو هەموو خەڵکە شێتن، یان تۆ؛ کە چەند ڕۆژێک لە سابلاغ دیتوومی و نەتناسیوم کە چەند نەحسم!

- هەرچی بێ، تازە تا ماوم بڕوات بە ئاشنایەتی من هەبێ! قەولم قەولی پیاوانە...

دوو عەکسی پێکەوەی بارزانی و قاسممان گەورە کردبۆوە، دەمانفرۆشتن. زۆر بەبرەو بوون؛ بەلام یەکیان چەند ئەوەندەی ئەوی‌تریان دەفرۆشرا. سەیرە! هەردووک وەک یەکن؛ خەبەر چییە؟ تێگەیشتین یەکیان «بسم الله»یەکی تێدا دیارە. بۆ بسم الله کەی دەیکڕن، نە بۆ خۆشەویستی زەعیم!

بەندی سێ لە بەیانی قاسم کە «عەرەب و کورد لە عیراقدا شەریکن»، دڵی هەموو کوردێکی میللی شاد کردبوو؛ زۆریان هومێد بە دواڕۆژ هەبوو. حیزبی کومۆنیستیش -کە لە زەمانی پادشایەتیدا هەمیشە لە زیندان و خۆشاردنەوەدا بوون و زۆریان لێ دەکوژرا- بە کوودەتای قاسم زیندوو ببوونەوە؛ ملیان لە جم و جۆڵ نابوو. چونکە مەلامستەفاش دوازدە ساڵ لە ڕووسیای ڕابواردبوو، بە کومۆنیستیان دەزانی و ئەوپەڕی دەستی قەدریان لێ دەنا.

حیزبی کومۆنیست لە هەر ولاتێکدا -با چوار کەسیش بن- بۆ حوکمداری خۆیان لە هەموو کۆمەڵێکی‌تر بە لایق‌تر دەزانن. بە تایبەتی لە عیراقدا کە کوردە قەومیەکانیش هەرچی دوو پیت و لەتێکی خوێندبوو، بە فەرهەنگی کومۆنیستی فرچک کرابوون و هەر کەس چەپی نەبا بە خاین حیساب دەکرا. پارتی دیموکرات، حیزبی کومۆنیستی بە مامۆستای بەڕێز و براگەورەی خۆی دەزانی. مل بە ملەی بوو کە خۆی بە کومۆنیستی دڵگەرم‌تر لە کومۆنیستانی حیزبی نیشان دات. هەر حەولی بوو حیزبی کومۆنیست لێی ڕازی بێ و ڕوو لە قیبلەی مۆسکۆ وەرنەگێڕێ. پەت شل کردنی قاسم، شیووعی بەربەرەلا کرد. وەها غلوور و یەرغە ببوون بە هەزاران لغاو ڕام نەدەکران کە ئەودەم ڕەشمەشیان لە مل داڕنرابوو.

قاسم بەرگری لە کورد نەدەکرد کە بیری خۆیان دەربڕن و تەنانەت مەلامستەفا توانی حیزب بکاتە ڕەسمی و ڕۆژنامە و نەشراتی پارتی ئازاد بێ. مەلامستەفا لە قەسری نووری سەعید جێگیر ببوو؛ ببوە قیبلەی کورد و عەرەب. لای قاسمیش زۆر بە قەدر بوو. کومۆنیستی ڕاستەقینە دژی میللیەتە؛ بەلام کە لە ڕووسیا زمان و عاداتی گەلانی جۆربەجۆر پارێزراوە و زۆریان بە ڕواڵەت جومهووری و خودموختاری تایبەتی خۆیان هەیە، کومۆنیستی عیراق بڕوای بەوە نەبوو. نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێ کە لەوەتا حیزبی کومۆنیست لە عیراق دامەزراوە -جگە لە فەهد ناوێک کە لە مەسیحیەکانی «تەلکێف» بوو- هەمیشە، مەگەر بە دەگمەن، دەنا ڕەئیسی حیزب کورد بووە. ئێستاش کە من شێست و سێ ساڵم ڕابواردووە و ئەم خەتانە دەنووسم، ڕەئیسی حیزبی شیووعی عیراق کوردێکە. دەگەڵ ئەوەشا ناوی کورد و کوردستان بیستن وەک دڕوو وە بن کلک دان وابوو. ئەندامی کورد بە عەرەبی دەدوا؛ بە لایەوە شەرم بوو بڵێ کوردم.

کورد لە سلێمانی لە خۆپێشاندانێکدا داوای خوێندنی زمانی خۆیان و پەرەپێدانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی کردبوو. حیزبی شیووعی لە سولەیمانی شیعاریان دەدا: مەعاریفی قلیاسانمان ناوێ!. بە سووکایەتی کوردستانیان کردبووە «قلیاسان»، کە پرد و ئاوێکە لە خواری شاری سولەیمانی. دەیانگوت پتر لە سەد هەزار ئیمزا -کە هەژدە هەزاری ئیمزای کوردی کومۆنیست بووە- بۆ قاسم هاتووە کە: «نەکەی ئیدارەی فەرهەنگی سولەیمانی بدەی بە کوردەکان! چونکە ئەمە جیاوازخوازییە»! بە ڕاستی شیووعی، حیزبی پارتییان خستبووە مالی کولەوە و هێشتا هەر مامۆستا و برای گەورەمان بوو.

من تاریخی ئەو دەمانە نانووسم و ناشزانم بینووسم. بەلام هێندێک بیرەوەری خۆم وە بیر دێنمەوە -ئەویش زۆر کەم- کە بە پێویستی دەزانم باسیان بکەم:

حیزبی شیووعی لە شار و دێهاتی کوردستان زۆری پەرە ساند. دەستە-دەستە بە وەرزێرانەوە دەگەڕان؛ لە هیچ درۆیەک بۆ دلخۆش کردنی حەشامات نەدەپرینگانەوە. شەرم کردن و درۆ نەکردن ئاسەواری بۆرجوازی بوو؛ دەبوو نەمێنێ! هەر کەس ناوی ئاغای پێوە با - هەر دەرەقەتی هاتبان- گوریس لە مل ڕادەکێشرا تا دەمرد. گوتیان یەکیان لە دەشتی هەولێر کوشت، مجێوری مزگەوت بوو؛ هەر چونکە ناوی عوسمان ئاغایە! لە قەبرستانی کۆیە کێلی مەرمەڕی قەدیمیان وردوخاش کردبووو. تەنانەت کێلی قەبری جەمیلاغا، حاجی قادر ئەو هەموو تاریفەی لێ کردووە. هەرچی لە هەزاران سالەوە ناوی ئایینی و ئەخلاقی باش و پیاوەتی و ڕوحم بە کەس و کار و بەهرە وەرگرتن لە کتێبانی جگە لە کومۆنیستی با، نیشانەی ئیرتیجاع و کۆنەپەرەستی بوو. لە دێهات لە سەر ماشین بە میکرۆفۆن بۆ گوندنشینانیان بلاو دەکردەوە: «ئەی بەدبەختی کلۆل! سالێ نۆ مانگ بە چاندن و دروێنەی گەنمەوە ماندوون. لە ڕووسیا گەنم بەری دارە! وەک دارگوێز و دارتوو! وەرزێرێک هەر چوار داری هەبێ -کە پتریشی هەیە- هیچ خۆی ماندوو ناکا. سالی جارێک دەیانتەکێنێ و شوێنی نامێنێ گەنمی تێ کا! لە شەڕدا پتر لە حەڤدە ملیۆن پیاو لە ڕووسیا شەهید بوون. بە ملیۆنها ژنی بێمێرد هەیە؛ هەموویان دوکتور و موهەندیسن. سەرو ژنتان دەدەینێ! وەرن ناوتان بنووسین. ئێوەش لەو گەنمە بێنرخەی کە لەم دەورانە ڕەشەدا بەرهەمتان هێناوە یارمەتی حیزب بکەن. پوولیش بێنن لێتان وەردەگرین. زوو بن، بگەنێ تا لە کیستان نەچووە!...».

گوتیان کاتێ لە سالی ١٩٥٩دا، عەبدولکەریم قاسم لێیان وەخۆ کەوت و شارەزووریەکانی سەر بە حیزبیان بەرەو حەبسی سولەیمانی دێنا، شارەزوورییەک دەینەڕاند: باوەحیزانە ئێژم خاتەی خۆم بەسمە، ئێژن ژن دوختۆرت بۆ تێرین!

هەموو ڕۆژ لە شاران و لە پاتەختدا خۆپێشاندان بوو. تاریف لە قاسم و سەد لەقەبیان بۆ تاشیبوو: «زەعیمی ئەوحەد»، «موعەللمی ئەوحەد»، «نابیغەی ئەوحەد...»، ئەوحەد و ئەوحەد! قاسم سەر لە هەوەلەوە زۆر نەرم و نیان و خۆی بێدەعیە دەنواند؛ بەلام شیووعی هێندیان ئەوحەد پێگوت و چەپلەیان لێدا، خۆی لە خۆی گۆڕا: (تۆ بلێی ئەو هەزارە زیلە بە خۆڕایی بە نابیغە و یەکەمین پیاوی سەرزەمینم بزانن، نەزان بن؟ نەخێر ڕاست دەکەن!).

یەکێک پێی گوتبوو: زەعیم شکلی تۆم لە مانگدا دیوە! هەموو شەوێکی مانگ دیار با، وەزیرەکانی هەلدەپێچا بە دووربین تماشای مانگ بکەن بۆ شکلی ئەو بروانن. فێلبازێک عەکسی قاسمی بە میدادێکی کەم ڕەنگ لە سەر هێلکە کردبوو، گوتبووی مریشکەکەمان ئەو

هێلکەی بەو شکلەوە کردووە! جایزەی وەرگرت و قاو داخرا کە موجزات ڕووی داوە!

لە بیرم نەماوە کەی بوو، مەلامستەفا فەرمووی: زەعیم نامەیەکی فارسی داومێ کە بۆی بکەین بە عەرەبی و کەسیش نەزانێ. تۆ تەرجەمەی کە و بیدەوە بە خۆم بۆی دەبەمەوە؛ بەلام نوسخەی لێ هەلمەگرە بۆ خۆت! نامەی «دوکتور موسەدیق» بوو، نووسیبووی:

«نووری چاوی بەڕێزم، عەبدولکەریم قاسم!

لە پاش سلاوی گەرم و دۆستانە...

خوا شوکور تۆ سەرکەوتی و پایەی تەختی پادشایەتیت لە بەر یەک برد. بە هومێدم هەر سەرکەوتوو بی. دەمەوێ ئامۆژگاریەکی باوکانەت بکەم: نەکەی بە زمانلووسی و تاریف و هووڕا و چەپلەڕێزانی کومۆنیستان فریو بخۆی! ئەوانە ماری خالدارن و لەپڕ پێوە دەدەن. من دەمەویست خزمەتی زۆر گەورە بە خەلکی ئێران بکەم و کارێک بکەم تامی ئازادی بچێژن، تێر و تەسەل و بێترس و سەربلند بژین؛ بەلام توودە ئەو بەلایەیان بە سەر هێنام. ئەوان وایان کرد کە ئەمریکا، شا بگەڕێنێتەوە و حوکمی من بکەوێ. تکایە زۆرت ئاگا لە خۆت بێ. چەند هەوالێکی من هاتوونە بەغدا. لێم ڕوونە بەخێریان دێنی و لە یاریدەیان درێغی ناکەی.

دۆستی دلسۆزت: محەممەد موسەدیق

ڕەنگە ئەمە تەرجەمەی وشە بە وشەی نامەکە نەبێ؛ بەلام ئەم ناوەرۆکەی دەگەیاند. نافەرمانیم نەکرد و نوسخەم لێ نەگرت.

لە ڕووسیە چییان بۆ ستالین دەکرد، ئەوەش و زیاتریش بۆ قاسم دەکرا. ئەویش کەیفی دەهات. قاسم ببوە تەیرێکی سەیر: هەمیشە نوتقی دەکرد؛ سەلم و تووری لێک دەهالاند؛ لە پاش نوتق دەبوایە چەند جار لە سەر ڕادیۆ بلاو بکرایەوە. هەموو دوکاندارێک -کە گش دوکانداریش ڕادیۆیان لە دوکان هەبوو- دەبوایە ڕادیۆ لە سەر ئاخر دەرەجە بکەنەوە و نوتقی زەعیم ببیسرێ. لەمسەر تا ئەوسەری خەیابان و بازاڕ، هەموو کەس، هەموو دەم، گوێی لە فەرمایشاتی زەعیم، کەڕ و سەری گێژ دەبوو. شەوانە هەموو وەزیرەکانی لە خۆی کۆ دەکردەوە، نەواری نوتقی خۆی بۆ دەکردنەوە. هیچ وەزیرێک تا دەبووە ڕۆژ نەدەبوو بخەوێ و لە پەستا دەبوو گوێ لە نەواری نوتقی زەعیم بگرێ. گوتیان جەنازەیەکیان دەبردە قەبرستانی غەززالی. کابرایەک بە لایدا ڕابرد، گوتی: خۆزگەم بە خۆت کا! لە ئەقوالی زەعیم نەجاتت بوو!

شیووعی وردە- وردە پێیان لێ هەلێنا. دەگەل ئەوحەد ئەوحەد، شیعاری حیزبی شیووعی لە حوکمدا دەدرا. دەستەی زۆریان لە جەوانانی بەناو «مقاوەمەی شەعبی» (پەدافەند) بۆ پارێزگاری لە ئینقیلاب پێکەوە نابوو. هەر کەس بۆنی دژایەتی کومۆنیستی لێ دەهات، لێدان و شەقی زۆری دەخوارد و زۆریشی بە بێ قانوون و بێ پرسی کاربەدەستانی دەولەت، ئیعدامی ئینقیلابی دەکران.

ئاشنایەکی زۆر وریالەم -بۆ مەسلەحەت پارێزی خۆی- ببوە یەکێک لەو جەوانانە و ڕاستی زۆر شتی لە لا دەگوتم؛ یا خودا درۆی کردبێ:

- دوکاندارێک لە کازمێن داوای قەرزی لە جەوانێکی پەدافەند کرد، گوتی نەمدەیەی شکایەتت لێ دەکەم. سبەی ئەو ڕۆژە بە تەزاهورات چووینە سەری، گوتیان تەوتیئەچین دۆزراوەتەوە. پەتیان خستە مل، کوشتیان.

وای بە سەر هات کە لە تەزاهوراتی چەند سەد هەزار نەفەریدا، هەر یەکەی پەتە گوریسێکی

پێ بوو، تا دژی خۆیان بترسێنن. ڕۆژێک دەوری ترۆمبیلی ئەحمەد سالح عەبدییان دابوو، کە ڕەئیسی ستادی سوپا بوو. پەتیان ڕاداشتبوویە. پەت هەبێ خەیانەت سەر ناگرێ... بەریان لە مالان دەگرت، قەت مالێکیان نەدەبوارد. دەبوایە چەندی خۆیان بلێن، خاوەنمال بێ خۆگرتن بیانداتێ، نەکو تووشی پەتپەتێن بێ. ڕۆژێک سەریان بە مالەکەماندا کردبوو، سەری هاومالەکەمیان چا کردبۆوە! سەریان بە مالی ئێمەدا کردبوو، عەکسی مەلامستەفایان بە دیوارەوە دیبوو، بێهەست و چرپە گەڕابوونەوە.

سالح حەیدەری، برای جەمال حەیدەری مەشهوور، گوتی: چوومە لای کاکم دوو دیناری لێ قەرز کەم. شەش تەلیسی خەتسووری بە پێلاقە داگیراو لە دیناری و پێنج و دە دیناری لە گۆشەی وەتاغەکەی لە سەر یەک داندرابوون. گوتی: ئەوە مالی حیزبە و فلسێکم نییە بتدەمێ!

تەنانەت لە هەموو ئیدارانـدا هەر شیووعی حیساب بوون. ڕۆژێک چوومە مەرکەزی «یونیسیف» بۆ لای مودیرەکەی، کە دوکتورێکی زۆر بەناوبانگ بە ناوی جیهاد شاهین بوو. تماشای کردم و دەرمانی بۆ نووسیم. بانگی لە فەڕاش کرد، جواب نەبوو. چووە دەر هاتەوە گوتی: خزمەتکارەکان چوونە بەر تاو لینگیان درێژ کردووە، دەلێن ئێمە جوابی مورتەجیع نادەینەوە! دەبێ لە ڕووسیاش وابێ؟!

مەلامستەفا ئەو کارانەی دەبیستەوە. جارێک گوتی: دوو کوردی لای هەلەبجە هاتوونە لام. یەکیان دەلێ کابرایەک سەر بە شیووعیەکان خەنجەری ڕووتی لە سەر ملم داناوە: سەگباب! بلێ کوردم تا بتکوژم! ئەویتر دەلێ: چەند کەسێک ڕاویان لێ دابەشیم، گرتیانم. جا وەرە بکوتە! بانگیان دەکرد: وەرن بیکوژن! ئەمە ئیژێ کوردیچم و پارتیچم!

مەلامستەفا لەو ئاکارانەیان زۆر نارەحەت بوو. باسی دەکردن، پێی وا بوو کاری زۆر خراپ دەکەن. جارێک جەمال حەیدەری سەرۆکی بالای شیووعیەکان چووبووە لای:

- مەلامستەفا خۆت دەزانی منیش یەکێکم وەک جەنابت...

مەلامستەفا نایەلێ قسەکەی بکا، دەلێ: هەستە دایک فلان! تۆ دەبێ بە بەراز بلێی وەک تۆم، نە بە من...

برادەرێک ئەفسەرێکی پێناساندم کە ئەمە ڕەئیسی پەدافەندە و کوردی هەولێرە و ناوی مەهدی حەمیدە. پێی خۆشە تۆ بناسێ.

- کاکە ڕۆژ باش!

تماشا دەکەم بە عارەبی جوابم دەداتەوە! وای خۆ نواند کە هەرگیز کوردی نەبیستووە! گوتم: گوتیان کوردی، پەشیمانم کە دیتوومی...

گوتیان گۆران و چەند کەسێک چووبوونە ئەرمەنستانیش، لای کوردەکان؛ بەلام -بە قسەی ئەوانەی بۆیان گێڕابوومەوە- نەیفەرمووبوو منیش کوردم؛ چونکە ئەوە لە مەسلەحەتی حیزبدا نەبوو!

جارێکیتر گۆرانم دیتەوە کە بە داخەوە نەخۆشی سەرەتانی گرتبوو؛ دەبوو بیبەنە مۆسکۆ. حەمەی مەلا کەریمیشی لە لا بوو. لە گفتوگۆدا عەرزم کرد: ئێمە تا کورد -بە گشتی- وەقەدر نەکەوێ، ناتوانین گول بکەین. جوولەکەم بە میسال هێناوە کە قەدری سەگیان نەبوو؛ بوونە دەولەت، پاپی کاتۆلیکانیش موخلیسیانە و لەعنەتنامەی نوێژیان بۆ دەردراوێژێ! دیار بوو ئەو قسانەی من قبوول نەدەکران. هەر لەو مەجلیسەدا، مامۆستا گۆران باسی «مەهداوی» حاکمی

مەحکەمەی قاسمی کرد، کە زۆر کەرێکی چەنەدرێژە و نەنگە بۆ دەوڵەتی عیراق. لەپڕ مەهداوی دەگەڵ سالح بەحرولعلوومی شاعیر وە ژوور کەوت. قوتوویێک باقلاوە و دوو گلۆس جغارەی «کاتی» هێنابوو. پاش تاوێک ڕۆیشت. گۆران فەرمووی: بە ڕاستی مەهداوی پیاوێکی نەجیب و عاقڵ و زمان ڕەوان و قانوونزانە! هەژار وا نییە؟!

- مامۆستا تا تۆزێک باقلاوە و پاکەتێک لەو جغارانەیەم نەدەیەی، تەسدیقت ناکەم!!

زۆر پێکەنی.

کە لە ڕووسیاشەوە هاتەوە، دیتم. فەرمووی: بۆ مردن هاتوومەوە. تازە ئیمانم هێناوە کە قسەکانت بە جێ بوون. هەتا کورد خۆی بە گشتی وەقەدر نەکەوێ، نابێ ئێمە چاومان لە حورمەت گرتن بێ؛ بەڵام تازە هەرچی چوو، چوو. فەرمووی: کە ڕووس زانیبوویان قاسم لە حیزبی شیووعی ڕەنجاوە، هیچ قەدرم نەگیرا. ئەگەر قەناتی کوردییێف پێنجسەد ڕووبلی بۆ بە جێ نەهێشتبام، پارەی چایەکی قاوەخانەم نەبوو... ڕۆژێ گوتیان چا بوویەوە؛ بڕۆ! ڕاست خستمیانە تەیارەوە و لە بەغدایان دابەزاندم.

پاش ئەو دیدارە، بە بیست ڕۆژێک خەبەرم بیست کە مامۆستا گۆران لە سولەیمانی وەفاتی کرد.

لە جەنگەی ئەم هەرا و پەتپساوی و بە هێزیەدا، ڕۆژێ بارزانی لێی پرسیم: هەژار چۆنی دەبینی؟

- ئەزبەنی حوکم هی خۆیانە و هەر بینا ئیعلانی دەوڵەتی کۆمۆنیستی کرا.

فەرمووی: تۆ شێتی! ئەگەر ئەمریکا هەزار ملیار دۆلاری لە دژی شیووعی خەرج کردبا، هێشتا ئەوەی بۆ ساز نەدەبوو کە ئەمانەی عیراق بۆی دەکەن. ئابڕووی خۆیان و بگرە مۆسکۆشیان برد...

لێرەدا دەمەوێ بەرەو پاش ئاوڕ دەمەوە و باسی شیووعیەکانی زەمانی پادشایی بکەم:

هەموو خەڵکی شارستانی عیراق، بە تایبەتی ڕۆشنبیران، زۆریان ڕق لە ئینگلیسی داگیرکەر بوو. ئەوانیش وەک ئێمە لە ئێران لە دژی ئینگلیس شەیتانیشیان پێ باش بوو. لە زەمانی هیتلەردا هەزاران لاوی عیراقی لە سەر نازیەتی گیران و خرانە بەندیخانەوە. تەنانەت مامۆستا مەلاجەمیل ڕۆژبەیانیش بە تۆمەتی نازیەتی ساڵێک پتر لە گرتووخانەی عەمارەدا مایەوە. لە سایەی ئەو گرتنە توانی شەرەفنامەی بدلیسی لە فارسیەوە بکاتە عەرەبی. سوپاس بۆ ئەو زیندانە!...

کە هیتلەر نەما، ئیتر لافاوی دڵان ڕووی کردە مۆسکۆ. حیزبی شیووعی نهێنی بوو؛ نەدەناسران. لەبەر ئەو نەناسینە وەک ئەندامانی «ژێ-کاف» خەڵک بە پیرۆز و پیاوچاکی دەزانین. نەک هەر خەڵکی ڕەمەکی و بازاڕی، تەنانەت دەوڵەمەندە هەرە زلەکانیش خۆشیان دەویستن. ئەگەر شیووعیەک لە دەست پۆلیسی نووری سەعید هەڵاتبا، خۆی بە هەرماڵێکدا کردبا دەیانشاردەوە؛ بەخێویان دەکرد. کەس دڵی بڕوای نەدەدا بیانداتە دەست دەوڵەت. ئەندامیان لەوپەڕی فیداکاری و نەداری و بێنازیدا دەژیان. بە جلی شڕ و نانی وشک قنیاتیان دەکرد و شوکری ستالینیان دەبژارد. بەڵام هەستم دەکرد کە لە ئاخر ئۆخریەکانی زەمانی نووری سەعیدادا، زۆر پیاوی دەوڵەتیان دە پاڵ هەڵکێشرابوو. جار-جار ڕەفیق چالاکم لە دوکانی بەشیر موشیر دەدی و ترسم لێی بە سەر چووبوو. مەسەلەن دەیگوت: فلان ڕۆژ،

سەعات ئەوەندە، شیووعی لە فلان و فلان شوێنەوە تەزاهورات دەکەن. ڕاست دەردەچوو.

بەلام ئاخۆ مامۆستا پایەبەرزەکانیشیان لە ژیاندا وەک بۆرەپیاوەکان بوون؟ دەیانگوت ئەوان زۆر خۆش دەژین. چەند کەسێک یان کەسێکیان کە دەبوایە خۆ وەشێرن، مالێکیان بۆ دەگیرا. هەر چی پێداویستی ژیانە دەهاتە بەردەستیان. چەند کچ و ژنێکی شیووعیش خزمەتیان دەکردن و دەگەلیان دەژیان؛ کە ناویان لێ نابوون «مایەی خۆشی مامۆستایان». ئەو خوشکە شیووعیانە مولکی حیزب بوون؛ دەیانتوانی بیانبەخشن! بۆ قەدرگرتنی «مامۆستا محەممەد تەوفیق وردی» کە هەم شاعیر، هەم نووسەر و پتر لە پەنجا نامیلکەی نووسیوە و زۆر کورتەبالایەکی ناحەز و بێفەسال بوو، یەکێک لەو ژنانەیان پێ بەخشیبوو، دەتگوت حۆری بەهەشتە. ژنەکە خوشکی ئەو عوسمان مەجیدە بوو کە باسم کردووە.

جارێک مامۆستا تەوفیق وردی ناردراوەتە تاران کە پەیام و کەلامی حیزب بە توودە بگەیەنێ و شتیان لێ فێر بێ.

- براکان ئەو ژنەم بە تەنیا لە بەغدا چۆن بژی؟

- خەمت نەبێ، برایەکی حیزبی دەنێرین ئاگای لێ بێ و ژیانیشی دابینە.

وردی پاش دوو مانگ دەگەڕێتەوە. لە دەرگا دەدا. ژن سەر دەردێنێ:

- غەریبە تۆ کێی؟

- چۆن کێی؟! هاتوومەوە مالە خۆم!

- پیاوەکە وەرە دوو شەق دەو رووتە- پووتە هەلدە!

برای حیزبی بە دارەوە بۆی دێ! ژن نەما؛ وردی وەخت بوو شێت و هار بێ؛ ملی لە قەسیدە هۆندنەوە نا. باسی هیجران و فیراق و ئەم قسە قۆڕانە. بەلام دلی بڕوای نەدەدا بلێ شیووعی خراپەیان دەگەل کردووم. دەیگوت: ئیوایان تێدا هەیە زور باش لە لینین و لیوشاوشی نەگەیشتووە! ئەو کابرای ژنەکەی وردی بەرکەوتبوو، ناوی عومەر حەمەشین، خەلکی کۆیە بوو؛ دەمناسی. لۆمەم کرد کە ئەو زولمەی بۆ کردووە. گوتی: کاکە! خۆت تەرح و دیداری وردیت دیوە، لە مەیموون ناحەزترە. حیزب ئەو ژنەی پێ بەخشیوە و ناچار بووە مێردی پێ بکا. حیزب قەراری داوە لەوی بستێنێتەوە و بیدا بە من. زولمی چی و حەق و حیسابی چی؟!

من لام وا بوو زۆر لەو قسانە کە بە شیووعیانی عیراقی دەلێن، لە ڕووی غەرەزێکەوەیە؛ زیادیان بۆ وە سەر دەخەن. پاش چەند سالێک، لە شۆرشی بارزانیدا، کە لە گوندی «لێوژە» بووم؛ حەمید عوسمان -کە ماوەیەکی زۆر ڕەئیسی حیزبی شیووعی ببوو- لێ کەوتبوو؛ دەگەلم هاومەنزل بوو. شەوێک زۆری خواردەوە، تەواو سەرخۆش ببوو، نهێنی و سیاسەتی لە بیر نەمابوو. گرێی زمانی کراوە و باسی ڕۆژانی سەلتەنەتی خۆی دەکرد کە ئەوسا لە سەرۆکیدا -کە بە نهێنی لە خانووێکی کەرکووک ژیاوە- دەیگێڕاوە، گوتی: هەر شەو هەوالان کیژێکیان بۆ دێنام. شەوێک تازەکیژ هاتبوو، براکەی هات: مامۆستا ئێمە لە ڕێگەی ئێوەدا سەرمان پێوە نییە؛ بەلام دایک و بابم کۆنەپەرستن. بزانن ئەو کیژە دەسکاری کراوە، سەری دەبڕن. چاکەم دەگەل بکە، خۆم لە جیاتی خوشکم لات دەمێنمەوە! دیتم کوڕەکە زۆر لووس و جوانترە لە خوشکی، قبوولم کرد. ئینسانیەت هەلینام کە تکای بگرم و خوشکی لە بەلایەک نەجات دەم! جا کە دەلێن قسەی ڕاست یان لە شێت ببیسە یان لە مندال، دەبوو بیانگوتایە: «یان لە سەرخۆش!».

لێم ڕوونە ئێستا ئەمە بە حەمید بلێن -ئەگەر مابێ- هەزار تەلاق دەخوا کە نەمگوتووە.

شێخ ڕەشیدی لۆلان لە حکوومەت ڕاپەڕی. شیووعی کوردستان دەستەیەکی سێ کەسییان بە سەرکردایەتی عەلی سەوزەفرۆش ساز کردبوو، کە بە قەولی خۆیان «پرۆلیتار» ئەم ئاگرە داکوژێنن. لە سەر داوای قاسم، مەلامستەفاش چووبووە بەرایی شێخ ڕەشید. شیووعیەکان بە باسک بلندکردن و بژی- بژی دەگەنە جەبهە، لە سەر چەمێک کە مەلامستەفا و بارزانی لەوێن.

- ئێمە تاکتیکی عیلمی بە کار دەبەین و دوژمن وا ڕاو دەنێین بە داستانی بگێڕنەوە. سۆڤیات لە ستالینگراد چیان کرد، ئەوە دەکەین. بژی عەلی سەوزەچی!

لەو دەمەدا، دوو کەلاکە پۆلیس لە چەم دەپەڕێننەوە.

- ئەوە چن؟ بۆ مردوون؟

- کاکە شەڕە! پیاوی تێدا دەکوژرێ، پۆلیسن و پیاوی شێخ ڕەشید کوشتوویانن.

- ها! کە وایە دەبێ ئێمە «ئیجتیماعی موەسسەع» بکەین (یانی بە فراوانی کۆ بینەوە).

پاش تاوێک دێنەوە لای مەلامستەفا:

- ئیجتیماعمان قەراری دا تفەنگەکانمان بدەین بە تۆ. تۆش سێ پیاومان ڕەگەڵ خە تا لە ڕێگە ڕووتمان نەکەن!

- زۆرم پێ خۆشە، بەڵام دوو کەستان دەگەڵ دەنێرم و خاترجەم کەس ناوێرێ بێتە سەر ڕێگاتان!

مەلامستەفا تفەنگەکان دەدا بە بارزانییەکانی خۆی:

- بۆ هەر چوارتان یەکێک. ئەگەر خاوەن تفەنگ کوژرا، یەکی دی هەڵیگرێ.

گوتیان بارزانی تفەنگەکەیان ماچ دەکرد و نێوچاوانیان ڕێدەخست.

مەلامستەفا فەرمووی: زەعیم قاسم گوتوویە: دەڵێن ڕادیۆ کوردیەکەمان زۆر بێتامە، کەسی وات پێ شک نایە پێی ڕابگا و چاکتری بکا؟! گوتوومە یەکێک هەیە ئەگەر ئەو بیکا، من زامن بە کەیفی تۆی ساز دەدا. دەس‌بەجێ فەرمانی بە سەر ڕاگەیشتنی بەشی کوردی بە ناوی تۆ نووسی و خەبەری لە وەزیری ڕۆشنبیری داوە کە چیت دەوێ پێکی بێنێ. ئەگەر ئیشکالێکت بوو، بە فوئاد عارفی وەزیری دەوڵەت بڵێ!

چوومە لای وەزیری ڕۆشنبیری؛ کە ناوی «فەیسەڵ سامر» بوو. زەننوون ئەییووبی چیرۆکنووسی لە لا بوو. وەزیر پرسی:

- بەشی کوردی ڕادیۆکەمان چۆنە؟

- لەوە باشتر چۆن دەبێ؟!

- خۆ نا، دەڵێن زۆر خراپە. دەی دەچیە سەری و چاکتری کەی؟

- بەو شەرتەی دەسەڵاتم هەبێ بە کەیفی خۆم ڕاگرم و دەرکەم.

- باشە تەنیا نابێ زەعیم وەحید دەرکرێ، چونکە زەعیم قاسم کردوویەتە کاربەدەست و چاوەدێر.

- جەناب! ئەگەر دە پێش هەموو کەسدا زەعیم وەحید بامەڕنی دەرنەکرێ، نایکەم. ئەفسەرێکی بێسەواد، خوێڕی، کوردی نەزان، براکەی خۆی (فەخری بامەڕنی) کە هەر دوو چاوی کوێرە و دەنگیشی زۆر ناخۆشە، هەم قورئان خوێن، هەم گۆرانی بێژ، هەم تارزەنی ڕادیۆیە و منداڵەکانیشی کۆرسن. زەعیم وەحیدیش -دوور لە ڕووی تۆ- بە گەواد ناوبانگی دەرچووە.

- ئاخر قاسم دایناوە، دەرناکرێ.

- منیش نایکەم!
هاتمە لای فوئاد عارف بۆم گێڕاوە. عەونی یووسف کە وەزیری ئیسکان بوو لەوێ بوو، گوتی: تۆ مانگی چەند لە عەکاسی پەیدا دەکەی؟
- نزیکەی پازدە دینار.
- دە بە شەرەفم لە ڕادیۆ مانگێ دووسەد دینار پتر پەیدا دەکەی. توخوا ئەوە عەقڵە تۆ هەتە؟!
- کاکە عەونی! ئەگەر نەتوانم بە کەیفی خۆم کار بکەم، هەر بە مانگێک دووسەد دینار و ئابڕوو چوونم دەس دەکەوێ، دەڵێن ئەویش لەو دز و حیزانەیە.
وام خەیاڵ کردبوو هەر کە بوومە بەرپرسی ڕادیۆ، ئەو هەموو گۆرانیبێژە ممبارەکە بانگ کەم: هەر کەس بچێ کەلیماتی گۆرانییەکانیم لە سەر کاغەز بۆ بنووسێتەوە. دەمزانی چەند گووکاری کراوە. بە قەولی زەبیحی دەیگوت: ئەگەر دەستم ڕۆیبا، ئەو گۆرانیبێژانە و قسەکەرانەی ڕادیۆ کوردی بەغدام دەژوورێکدا حەبس دەکرد؛ هەموو ڕۆژ لە کولانکەوە بەسەریاندا دەڕیام تا دەخنکان! خۆ ئەوان زۆر ساڵە بە سەر ئێمەدا دەڕین!
هیچ شتێک لە ڕادیۆ کوردی بەغدا تڕکەنتر نییە. گۆرانیبێژ ئاهەنگ و شیعریش لە خۆیەتی، جا با کەری گێژیش بێ، هەمووی هەر پارتیبازی و خزم-خزمێنە و ئەوی قەدری نەبێ فەرهەنگ و ئەدەبی کوردە. مەسەلەن نەسرین شێروان لە گۆرانییەکدا تەنیا دەڵێ: «ئەز دەست ل نارینێ خۆ بەرنادەم- کراسی زەرد دە بەر ناکەم. سەد جاری دووپاتە دەکاتەوە. ئەگەر کەسانێکی وەک تاهیر تەوفیقیان دە ناودا هەڵکەوتووە، بە هەڵکەوتە و ئیوا بە قابلیەتیش گول ناکا. دەمەویست هەموو زبڵ و زاڵەکان ڕامالم و تۆزێک پاک و خاوێنی کەمەوە. چا بوو شوکور قبوولیان نەکرد.
جەلالی شەریکم چووە ئەڵمانی شەرقی کە لەوێ فێری عەکاسی ڕەنگی و فیلم گرتنی تەلەفیزیۆن بێ. برایەکی خۆی لە لا دانام کە شەریکم بێ. زۆر زوو براکەی -هەر چەند مایەیەکیان تێدا نەبوو- لێم کەوتە تەشقەڵە و توشقەڵە. کێشە کردن فایدەی نەبوو؛ بە پوولێکی کەم دەستم لە بەشی خۆم هەڵگرت.
مەلامستەفا لە مۆسکۆ حەولی دابوو کە لە برلینەوە بچینە مۆسکۆ، بەڵام خالید بەکداش لێی تێک دابووین. مەلامستەفا زۆر لەوە تووڕە ببوو. هەر دەیەویست لە داخی خالید بەکداش تۆڵەی ئەو کارەم بۆ بکاتەوە. گوتی دەبێ بچیە مۆسکۆ، موعالەجەی بکەی.
- کاکە! من نەخۆش نیم.
- هەر دەبێ بچی!
دەعوەتم لە نووسەرانی شۆرەویەوە بۆ هات. مەلامستەفا پاسپۆرتەکەی گۆڕیم، کردیە «عەبدوڕەحمان محەممەد» کە تەواو عیراقی بم. کە پاسپۆرتی بۆ وەرگرتم، سەد و بیست دیناری دامێ، گوتی: بچۆ بلیتی تەییارە بکڕە! هەستام گوتم: بە خوا نەخۆش نیم؛ قەتیش لە سەر یەک سەد و بیست دینارم لە باخەڵدا نەبووە. خواحافیز دەچمەوە ماڵێ! فەرمووی: عوبەید (کوڕە گەورەکەی) پوولەکەی لێ وەرگە! بڕۆ بۆ خۆت بلیتی بۆ بکڕە؛ لەوانەیە نەچێ!
لە پێش ئەوەدا بە ماوەیەک، دیوانی شیعرەکانم نووسیەوە، ناوم لێ نا «چێشتی مجێور». دام بە دەوڵەت کە ئیجازەی چاپی بدرێ. زەعیم وەحیدی ڕادیۆ بە کارەکە ڕادەگەیشت. لە هەر

کوێ ناوی کورد و کوردستانی تێدابوو، له هەر کوێ باسی مۆسکۆ بوو، تەنانەت ناوی چۆمی «می‌سی‌سی‌پی» ئەمریکای قەڵەم کێشابوو، که مەمنووعە چاپ بکرێن. نەقڵم بۆ مەلامستەفا گێڕاوە. شەوێک زەعیم وەحید هاتبووە لای مەلامستەفا. لە وەرامی مەلامستەفادا گوتی: نەمزانیوە، بمبەخشن! هەمووی ئیجازە دەدەم.

گوتم: مەلامستەفا! قەلەڕەشەیەک ڕۆژێک جیقنەی لە سەر ناقووسی کلیسایەکی قامیشلی کردبووو. ڕۆژێکی‌تر پارچە گۆشت بەرازێکی له پێش کەشە ڕفاند. کەشە ئاگری گرت: دەخیلتان ئەو قەلەڕەشەم بە ساغی بۆ بگرن. بۆیان گرت. لاقی گرت و بە داروو‌کەیەک لێی ڕادەوەشاند: ئاخر ئەگەر مەسیحی بای لە سەر ناقووس نەدەڕیای، ئەگەر موسوڵمان بای گۆشت بەرازت نەدەخوارد. تۆی ڕووڕەش لێم ڕوونە کرمانجی، گوێ بە هیچ دینێک نادەی!

زەعیم وەحید تۆ ئەگەر کوردی، بۆ وشەی کورد قەڵەم دەکێشی؟ ئەگەر دۆستی کومۆنیستی، مۆسکۆ بۆ دەکوژێنیەوە؟ ئەگەر دژی شیووعیانی، چت بە سەر می‌سی‌سی‌پی داوە؟! دیوان چاپ ناکەم...

که دەهاتم بچمە مۆسکۆ مەلامستەفا فەرمووی: چیت پێ خۆشە چاپ بکرێ؟ گوتم: مەم و زینەکەم.

– من بۆت چاپ دەکەم. بەڵام کێ ئاگای لێ بێ؟

– زەبیحی و کەسی‌تر نا.

بە فڕۆکەی سووریایی لە ڕێی دیمەشقەوە گەییمە قاهیرە. دەبوایە چوار ڕۆژ ڕاوەستم تا تەیارەی مۆسکۆ دێ. لە ئوتێلێک لە سەر حیسابی شیرکەتی فڕۆکە دامەزرام. یاڵلا وە ناو شار کەوە. ڕاست ڕووم کردە «ئەزهەر». لە ئوتووبووسدا یەکێ قورعانی دەخوێند. لە دەرکی ئەزهەر پرسیم: «ڕەواقی کوردەکان» لە کوێیە؟ شارەزایان کردم. «شێخ عومەر وەجدی» -کە مامۆستای ڕەواق بوو- نوێژی دەکرد. لە نوێژ بۆوە. گوتم: من هەژارم و ناوتم بیستووە، هاتووم بتبینم. کرمانجیەکی زۆر ڕەوان قسەی دەکرد. زۆر کوردێکی دڵسووتاو بوو. پیاوێکی زۆر بە کار، قالبسووک، هەتا خوا حەز کا عالم بوو. جگە لە شێخایەتی ڕەواقی کوردان، ڕادیۆ کوردی قاهیرەشی بە دەست بوو. دەیانگوت بیست و پێنج کاری عیلمی پێک دێنێ کە هی وا هەیە ڕۆژێ دە دەقیقە وەختی دەگرێ.

شێخێکی دیکە لە ئوستادانی ئەزهەر هاتە ژوور و دانیشت. شێخ عومەر باسی کورد و کوردستانی دەکرد و بەوپەڕی دڵ‌گەرمیەوە دەدوا. کابرای میوان گوتی:

– ئوستاد من تێناگەم ئێوە دەڵێن چی، بەڵام وا دیارە بۆ کوردستان تەعەسسوبت زۆرە.

شێخ عومەر گوتی:

– هەر چەند مەلای بەڵام نازانی قسە بکەی. تەعەسسوب غەیری حەقیقەت گوتنە و لە عالمان ناوەشێتەوە.

– ڕاست دەفەرمووی لەم سەهوەم ببوورە!

– مەلا تۆ عاقیدەت بە غەزالی چۆنە؟

– ئیمامێکی گەورەی ئیسلامی و قسەی موعتەبەرە.

– لە فلان کتێبی بڕوانە! دەڵێ: «ئەم دینی ئیسلامە لە سەر سێ کۆڵەکە ڕاوەستاوە: ئامێدی، شارەزووری، دینەوەری». تۆ دەزانی هەر سێک کورد بوون؟ دەڵێم ئەگەر کورد دەوڵەت بوایە و

بە ئازادی، کورد بیانخوێندایە، ئێستا دینی ئیسلام بەو ڕۆژە ڕەشە دوچار نەدەبوو. من بۆ ئیسلام هاوارمە.

کابرا گوتی: بریا زۆری وەک ئەو کۆلەکانەمان هەبوایە.لە فەرمایشتت بەهرەمەند بووم.

گوتم: سەیدا! فەلەیەک لە نزیک قامیشلی چووبووە سەر مالی جیرانێک:

- ئەریَ شامۆشۆ سبەی نایە یاریدەم؟

- بە سەر چاوان لە بەیانییەوە هەر چی بفەرمووی دەیکەم، کارەکە چییە؟

- دەچین قەبری بابم بە گێچ سپی دەکەینەوە.

- ببەخشە بۆ ئەو کارە نایەم، چونکە من هێشتا قەبری بابی خۆم سپی نەکردۆتەوە، خەلک هەزار تف و نەحلەتم دەکەن!

شێخ عومەر پێکەنی، فەرمووی: تێگەیشتم؛ بەلام گوتوویانە هەر کەس بەرانبەر بە عەقلی خۆی بدوێنە...

کە زانی چوار ڕۆژ دەمێنمەوە گوتی دەبیَ قسە لە سەر ڕادیۆ بکەی. بەیانی چوومە ڕادیۆ. کارگێڕەکان دانشجووی کوردی عیراقی بوون، گوتیان شیعرێکمان بۆ هەلبژێرە کە کاربەدەستانی عەرەب قبوولی بکەن. دەفتەری شیعرم دانیَ کە خۆیان هەلبژێرن. ڕۆژی سێهەمی سەفەرم بوو. گوتیان: ئەو شیعرانە قبوول نەکراون، نابیَ سیاسەتیان تێدا بیَ. شێخ عومەر وە ژوور کەوت، قسەکەی بیست؛ گوتی: ئاخر ئێوە نەزانن! عەرەبی میسری چووزانیَ کوردی چییە؟ وا من ڕازی دەکەم. لە کاغەزێک نووسی: «مانگ وای تیشک دابوو، باغ و دەشت وا بوو، وا چوو...». لەم باسانە پڕی کرد و نووسی: «تەرجەمەی شیعری هەژار!». بە منی گوت: کام شیعرت پیَ خۆشە ئەوە بخوێنەوە. حەز دەکەی هەزار جوێن بە عەرەب بدە!

شەو چوومە سەر ڕادیۆ. دانشجووەکان گوتیان:

- بەر لە شیعر خوێندنەوە گوفتوگۆیەکت دەگەل دەکەین و چەند پرسیارێکمان جواب دەوە.

- هەر چەند دەبوو بە ڕۆژ پرسیارەکان بکەن و خۆمی بۆ ئامادە کەم، بەلام دیسان فەرموون.

هەموو پرسیار و جوابەکانم لە بیر نەماون؛ بەلام لە جوابی ئەم پرسیارەدا کە: ئایا ئەدەبیاتی کوردی چەند قۆناغی بڕیوە و ئێستا لە کام حالدایە؟ گوتم:

- هەرگیز لە سەرەتای ئیسلامەوە کورد نەیکراوە بە زمانی خۆی وەک خەلکیتر بنووسیَ. هەمیشە کۆسپی زۆر دژواری هاتۆتە پێش. بەو حالەشڕا کورد لە هەموو بەشەکانی ئەدەبیاتی باوی ڕۆژگاردا بەرهەمی بەنرخی بووە. لە پێهەلگوتنی دەسەلاتداران، شیعری تازیەمانی، بەیت و چیرۆک؛ لەم چەرخەشدا لە باسی نیشتمانپەروەری و قەومیەت، دەستی بالای هەبووە و تەنانەت خانی سێسەد سال لەمەوبەر داهێنەری شیعری نیشتمانی بوو. لە جیرانانی خۆمان بەجیَ نەماوین، بەلام لە غەزەل و دلداریدا لە هەموو عەرەبمان تێپەڕاندووە.

پرسیارکار گوتی: دەتوانی دەلیل بۆ ئەم قسەت بێنیەوە؟

- بەلیَ، لە ئیسلامدا چاکترین کەس گۆشەگیری خواپەرستە، خراپترین کەس ڕێگرە. با بڕوانین «مەحوی» شاعیری عارف چۆنی ئەم چاک و خراپە لێک پیلۆز کردوون، دەلیَ:

نەگەییە دامەنی دەستی دوعا، سا دەبمە خاکی ڕیَ      تەریقەی گۆشەگیری بەردەدەم، ئەمجارە ڕیَ دەگرم

یان خورما کە میوەی تایبەتی عەرەبە، داخوا کیَ بۆ بەربانگی ڕەمەزان خورمایەکی داوە بە



«نالی» کە سوننەتە ڕۆژووی پێبشکێنێ، دەڵێ:

دەخیل! باری نەخیلی یان ڕوتابی  وەها شیرین و سینە نەرم و دڵڕەق
ئاخۆ هەزار ساڵە عەرەبێک عەقڵی بەوە شکاوە یاری خۆی بە خورما بشبهێنێ؟!

شیعرەکەشم «چەپکە گوڵێک» بوو کە لە دیوانەکەمدایە. وا دیار بوو کوردی داواکاری زۆر بوون، چونکە چوار جار لە ڕایۆ بڵاو کرایەوە.

ڕۆژی پازدەی مانگی یازدەی پەنجا و هەشت چوومە فڕگەی قاهیرە. بارزانی ئادرێسێکی دابوومێ کە ئەگەر لە مۆسکۆ دامام، بچمە ئەوێ. لە فڕگە کابرایەک لێی پرسیم: تۆ هەژاری؟

- بەڵێ.

- لە فڕگەی مۆسکۆ چاوەنۆڕتن.

لە تەییارەدا کابرایەکی مووزەردی چاوشینی خوێنشیرنۆکەم لە تەنیشت بوو، گوتی: من ناوم خالید محێدینە، سەرنووسەری ڕۆژنامەی «ئەلمەساء».

- کە وا بێ تۆ برای زەکەریا محێدینی هەواڵی ناسری؟

- نەخێر! منیش هەر کوردم وەک ئەو؛ بەڵام بنەماڵەمان جیایە؛ فکریشمان جیایە. ئەو ئەمریکاپەرستە و من شیووعیم.

لە قاهیرە دنیایەکی گەرم و خۆش. لە ڕێگەدا لە فڕگەی «تیرانا» پاتەختی ئەلبانی دابەزین. چاو نەخۆشێکی ئەلبانیش سوار کرا کە لە مۆسکۆ موعالەجە بکا. بە ڕاستی فڕگەیەکی زۆر رووت و ڕەجاڵ بوو. بە ناو هەتاودا گەیینە مۆسکۆ؛ بەڵام لەوێ بەفر و کڕێوە ڕێگەی دابەزینی نەدا. پاش چەند خولدانێک لە فڕگەیەکی دوور دابەزین. تماشای چەمەدانان دەکرا. چووم لە سەر نیمکەتێک کروشمەم کرد. کیژێکی رووس پەیدا بوو، بە عەرەبیەکی زۆر ڕەوانی میسریانە گوتی:

- ئیشاڵلا تۆ هەژاری؟

- بەڵێ.

بە غار چوو چەمەدانەکەی وەرگرتم. چووینە ناو ماشینێکی بە سۆپە و شۆفێرێک لێی خوڕی.

گوتم: نینا! تۆ ئەو عەرەبییە چۆن فێر بووی؟

- لە مۆسکۆ دەرسم خوێندووە.

- فێڵم لێ مەکە! کەس بە دەرس خوێندن ئاوا فێرە زمان نابێ.

- ڕاستییەکەی پێنج ساڵ لە قاهیرە بووم. مامۆستاکەمان دەیگوت: زمانی عەرەبی زۆر هاسانە؛ هەر حەوت ساڵی هەوڵی تۆزێک دژوارە! عەبدولوەهاب بەیاتی شاعیر دەناسی؟

- بەڵێ.

- جا وا دەبێ؟ دەڵێن ناوی منی لە شیعری خۆیدا گوتووە. زۆری لێ قەڵسم!

- نینا وا بزانم پێت خۆش بووە ناوت لە شیعری عەرەبیدا هاتبێ!

من کە فێری خۆگێل کردن ببووم لە دووم نەدا...

بردمیە ئاسایشگای «گێرتسن» لە حەفتا کیلۆمیتری مۆسکۆ. لەو ڕێگە، شەش حەو کەلیمەی وەک: «ئەوە چییە؟»، «نان»، «ئاو» و شتی وا لە نینا فێر بووم.

«گێرتسن» ناوی شاعیر و نووسەرێکی خۆشەویستە کە ماڵی لەو نزیکە بووە. ئەو ئاسایشگایە کۆنە قەسری ئەمیرێک بووە؛ لێنین کردوویە بە ئاسایشگا و بەردێکی تێ گیراوی ڕۆژی هاتنی لێنینی بۆ کردنەوەی ئاسایشگاکەی لێ هەڵقەندراوە. وەتاغێکی بە تەنیای زۆر سازیان دامێ و

تەلەفۆن و ڕادیۆیەکی گەورەی سێ مەوجیشی تێدابوو دەمتوانی گوێ لە بەغدا و هەموو شوێنێک بگرم.

با جارێ بێدەنگ لە سەر تەختەکەم ڕاست ڕاکشێم و تۆزێک خەیالاتی ڕابردووم بێنمەوە بەر چاو؛ ئەوسا بگەڕێمەوە:

کاتێ لە بۆکانەوە هاتمە سولەیمانی، حیزبی پارتی بە ناوی بارزانی ساز درابوو. هەمزە عەبدوللا بریکاری بارزانی سەرۆک بوو. برایم ئەحمەد -کە ئەویش وەک هەمزە حقووقی خوێندبوو- ببوە وەکیلی دادگوستەری. تا کۆمەڵەی ئێمە هەبوو، لقێکی کۆمەڵەی لە سولەیمانی سەرپەرستی دەکرد؛ دوای تێکچوونمان ئەویش ببوە پارتی. هەمزە تاوانێکی چکۆلەی کردبوو: خوشکی برایمی نازانم چ لێ کردبوو؟! بۆ داکوژانی هەرا، خوشکی برایم درابووە هەمزە، هەمزەش برازایەکی خۆی دابوو بە برایم؛ ببوونە خزم. بەلام لە سەر ڕیاسەت زۆر زوو تێک چووبوون و هەر یەکەی دەستەیەکی بۆ خۆی گل دەداوە. وەک گوتم هەموو لایەکیشیان ڕووی نوێژیان دە مۆسکۆ بوو؛ بە تایبەتی کە بارزانی سەرۆکی کوردانیش میوانی مۆسکۆیە. تەنیا فەرقێکیان دەگەڵ حیزبی شیووعی ئەوە بوو: پارتی بۆ ئازادی کوردستان لە ژێر سایەی شیووعیەتدا حەولی دەدا، حیزبی شیووعی بۆ هەموو دنیا و لە باسی کورد و کوردستان ڕازی نەبوون؛ چونکە بەرانبەر بە پێودانی ستالین، کورد بە میللەت حیساب نەدەکرا! منیش هەر چەند -وەک گوتم- بە بێ عیلم و خەبەر، سووری دوو ئاتەشە بووم، حەزم لە پارتی دەکرد کە باسی کوردستانم بۆ دەکا و دەڵێ دەبێ کورد ئازا بێ و دەولەتی کومۆنیستی دامەزرێنێ. لە ملمڵانەی دوو سەرۆکی پارتیدا هەر جارە یەکێک سەردەکەوت؛ بەلام هیچ کامیان لە ناو دەرنەداوێژران.

لە بەغدا بۆ جاری دووهەم چوومە لای هەمزە و ئیتر نەمدیتەوە. دەگەڵ شیووعیان نێوانم خۆش بوو؛ دەگەڵ پارتی -هەردووک بەرەش- ڕێک بووم. بڕیاریشم دابوو پاش «ژێ-کاف» نەچمە هیچ حیزبێکەوە. کاتێ لە کەرکووک شاگرد بووم، جەلال تالەبانی -کە لە پاش برایم هەمەکارە بوو- جارێ گوتی: بە ئەندامم نووسیوی و ناوی فەرعیت «چەلاک» بێ. بەلام کە هیچ گوێم بە فەرمانی حیزبایەتی نەدا، بێدەنگەی لێ کرا. شیعرەکانم لە بلاڤۆکی پارتیدا چاپ دەکران و هەموو هاوکاریەکم دەگەڵ دەکردن . شیووعیش دەیانەویست ئەندامیان بم، قبوولم نەدەکرد. لە لای هەر دووک لا بە پاک و بێتەرەفێکی بێغەرەز ناسرابووم و بەوە قازانجم کردبوو. جا کە پارتیش خۆیان بە کلکی شیووعی دەزانی و لایان وا بوو وەک سۆفی و دەرویش هەردووک هەر بۆ خوایەکی دەکەن، کەس گلەی لێنەدەکردم: «بۆ دەگەڵ فلان شیووعی دۆستی، یان بۆ شیعرت بۆ پارتی نووسی؟!». کاری باشیشم ئەوە بوو کە چاوم لە پوولی کەس نەبوو. زەحمەتی زۆرم دەکێشا و بە ئارەقی ناوچاوانی خۆم دەژیام. نەدەترسام بلێن وا نەکەی مەعاشەکەت ناگا. «نۆکەری بێخەلات و بەرات، تانجی سەری ئاغای خۆیەتی». لەم بارەوە بەرهەڵدایەک بووم، کوڕی بابی خۆم!

لە پاش ئەوە زەبیحی لە سولەیمانی دەگەڵ هەمزە عەبدوللا نێوانی تێک چووبوو، چووبووە لای شیووعیان و لە کەرکووکەوە هاتبووە بەغدا و پێکەوە دەژیاین. ڕۆژێک هەتیوێکی قوتم لێ پەیدا بوو، بەیانێکی چاپکراوی دامێ و نامەیەکیش. بەیانەکە بە هەزار و یەک دەلیل ئیسباتی دەکرد کە زەبیحی جاسووسی ئینگلیسە! نامەش دەیگوت: «هەژار تۆ نابێ دۆستایەتیت دەگەڵ ئەو جاسووسە حەقیرە بێ کە حیزبەکەمان کەشفی کردووە!».

گوتم: یانی تۆ و حیزبتان دەزانن کە سەری بورج، زەبیحی لە بن دیواری سەفارەتی بریتانی هەڵدەلەرزێ تا حقووقەکەی دەدەنێ؟!

- نەخێر ناوەڵلا.

- دە بچۆ بە مامۆستا بڵێ من بە جاسووسی نازانم! دەشزانم لە سەر ئارەق دڵی لە زەبیحی ئێشاوە. حیزبیش نیم حوکمم لێ بکا. با تێر ئاوی سارد بخواتەوە...

قسەکە لە بەینی خۆماندا بێ: پێم وا بوو هەر کەسێ دەڵێ کومۆنیستم، مەلایکەتێکە و ئەوپەڕی ئەخلاق و ئاکاری باشی گرتۆتە بەر و عەیب دەچاوی مندا هەبێ، لە کومۆنیستدا نییە. لە سەفەرەکەی بوخارێست تۆزێ فکرم گۆڕا: «کوڕە خۆ ئەو کومۆنیستانەش هەر بنیادەمی خۆمانن؛ درۆ دەکەن؛ دزی دەکەن؛ بوختان بۆ یەکتر هەڵدەبەستن!». دیسان دەمگوت: نا هەر ئەوانەی عیراق و سووریە وان؛ کومۆنیستی دیکە زۆر باشن!. بە تایبەتی کیژە تورکەکەی لە بوخارێست دیتم، زۆری کار لێ کردم.

لە سەر کەشتی لیدیا بۆ یەکەم جار بە ئاشکرا خۆم کافر کرد و شیعرێکم لە سەر شیووعیەکانی عیراق دانا. لە تربەسپیش لە ژێر ناوی «شەوێک لە زیندان» بۆرە گلەیییەکم لە رووسیا کرد؛ ئەویش زۆر دە پەردەدا. کە چۆنە هیچ لە حاڵی تاڵی کورد ناپرسن؟! لە بەغدا شیعرەکانی سەر کەشتیم بۆ مامۆستایانی پارتی خوێندەوە کە چاپی بکەن. قبووڵیان نەکرد، گوتیان بڤەیە؛ بەلام هەموو رۆژ دەیانگوت: دا دەی! بە خوا شتێکی خۆشە! ئیتر لە دیداری خالد بەکداش و لەو دوو سەفەرەی ئورووپاوە دڵم لە کومۆنیستی عەرەب ڕەش ببوو. هەر دەمگوت ئەوانە لە ڕێی ڕاست لایان داوە. خولاسە ببوومە نیوە «وردی»یەک.

کە بارزانی هاتەوە و پارتی زیندوو بۆوە، لە یەکەم کۆبوونەوەی پارتیدا، بارزانی هەمزەی وەدەر نا و برایم ئەحمەد کرا بە ڕازداری حیزب؛ واتا سکرتێر. هەمزەش بە پانەوە ڕەگەڵ شیووعیان کەوت. دەبێ ئەوەش بزانی لەو چەند ساڵەدا کە من لە عیراق بووم، هەر کەسێ لە سەر هەر کارێکی خراپ لە پارتی دەرکرابا، شیووعی بە حورمەتەوە وەریان دەگرت. پارتیش بۆ شیووعی دەرکراو، هەر وا بوو. کە لە سووریە هاتینەوە، دەگەڵ زەبیحی بە تەواوی کارمان دەگەڵ پارتی دەکرد. زەبیحی گوتی: پارتی دەڵێ هەژار دەکەینە سەرپەرستی لاوانی پارتی. گوتم: نایکەم؛ کاسبی دەکەم و یاریدەش دەدەم.

**لە ئاسایشگای گێرتسن**

جگە لە دوو دوکتوری پیاو، هەموو دوکتور و پەرستار و خزمەتکاریتر ژن بوون. دوکتورێکی ژن بە ناوی «نیکۆلا یەڤنا» بە سەر چەند وەتاغێک ڕادەگەیشت کە من یەکێک لە نەخۆشەکانی بووم. سەعات شەش و سێ چارەگی بەیانی دەچووینە وەرزش، سەعات حەوت بەرچایی، سەعات دوازدە نیوەرۆژ، سەعات شەش شێو؛ ئیتر تەنبەڵ و بەرەلا... دەستم کرد بە رووسی خوێندن لە کتێبی منداڵان. ژنێک -کە دوکتوری منداڵان بوو- بۆ ئیستراحەت هاتبووە ئاسایشگا؛ خۆی کردە مامۆستام و بە هەزار زەحمەت شتێکی تێدەگەیاندم. ڕۆژانە پتر لە دوو سەعات خۆی دەگەڵ ماندوو دەکردم. دەیگوت: دوو کوڕم هەبووە؛ خوشکم کوڕی لە شەڕدا کوژرا و تەنیا مایەوە؛ کوڕێکی خۆم دا بەو. ئێستا کوڕێکم هەیە و مێرد.

تەلەفزیۆن و پیانۆ دەگەڵ عەکسێکی گەورەی بالانومای «مارشاڵ کۆتوزۆف» لە ساڵۆن بوو.

سینەماش هەبوو؛ حەوتەی چوار فیلمی نیشان دەدا. تا زستان بوو، وەرزشی زۆر خۆشیان سەمای سەر سەهۆڵ بوو. لە پاش بەرچایی تا شل دەبوون لەبەر دەنگی سەفحە مووزیکی خۆش، سەرگەرمی ئەم بازیە بوون. بۆیە دەڵێم «بوون» و ناڵێم «بووین» چونکە هەوەڵ جار کەوشی بن چەرخم ساز کرد و چوومە سەر مەیدانی سەهۆڵ، تەختی پشتم عەرزی ماچ کرد و درینگە لە سەرمەوە هات! ئیتر تازە هەر لە دوورەوە تماشام دەکردن. هەر ئەو ڕۆژە کە گەییمە گێرتسن، باڵتۆیەکی تایبەتی دووبەر و کەوشێکی ناو بە کولکەم پێ بوو -کە لە بەغدا بۆ سەرمای سەختم کڕیبوون- گوتیان ئەوانە بە کار نایەن. پۆتینێکیان دامێ، لە کن خودا درۆ نەبێ لە چوار و پێنج کیلۆ قورس‌تر، باڵتۆیەک ئێستر هەڵینەدەگرت! کوڕێکی عەرەبی بەغدایی‌شی لێ بوو بە ناوی «عەسکەر ئل عیبی». ڕۆژێک پێکەوە لە سەیری سەمای سەر سەهۆڵ وێستابووین. هەوا بە ڕواڵەت زۆر خۆش بوو. دیتم هەر دوو گوێچکەی عەسکەر وەک بە گوێزان چورتمیشت کردبێ خوێنیان لێ هاتووە.

- عەسکەر گوێت بۆ بریندارە؟

دەستی لێ دا و ڕایکرد! دەیگوت هیچ نەدێشا. گوتیان: هەهۆ! ئەوە سەرمای رووسیایە، پیاو لە دەرەوە دەبێ هەر دەست بە گوێ و لووتی دابێنێ؛ دەنا بێ ئەوە ئاگا بکا، خوێنیان وشک دەبێ و هەڵدەوەرن.

هەر کە زستان و بەفر نەما، دەشتی دەوروبەرمان -کە هەمووشی جەنگەڵی چوغور بوو- بەهەشتێک بوو بە هەموو مانا. دار هەموو سەریان لە عاسمانێ، دەر و دەشت دارماڵ لە وەنەوشە و سوێسنی زەرد و سوور و گوڵی هەمە ڕەنگە. بەڵام پێم سەیر بوو: ئەو هەموو گوڵە جوانانە جگە لە یاسەمەنە و تەنیا گوڵێکی تۆپی سووری ئاگری ڕەنگ -کە ئەویش دەسچێن بوو- بۆنیان نەدەدا. ئیتر سەر لە بەیان و ئێواران و پاش شێوخواردن تا دەمی نوستنان، لە ناو جەنگەڵ و دەشت دەگەڕاین و خۆشمان ڕادەبوارد. زۆربەی ئەوانەی لە ئاسایشگا بوون -کە لام وایە نزیک بە سەد و پەنجا کەسێک کیژ و لاو، نێوان ساڵ و پیر بوون- هەموو زۆر تەیار و ساز و جلک جوان بوون. وا دەبوو بە ماشینی خۆیانەوە دەهاتنە دوویان بیانبەنەوە سەردانی ماڵ. ڕۆژێک لە کوڕێک «شوڕا» ناوم پرسی: ئێرە جێگەی بۆرژوازی مۆسکۆیانە؟ پێکەنی، گوتی: نا، بەڵام کەس و کاری موحتەرەمەکان لێرەن.

لە نزیکمانەوە کەمپێکی مندالانی پێشەنگ هەبوو. نزیکەی دووسەد منداڵی لە نێوان هەشت ساڵە و دە ساڵەی تێدا بوو. چەند مامۆستایەکی ژنیان بە سەر ڕادەگەیشت؛ بەڵام هەموو کار دەبوایە بە دەستی منداڵان پێک بێت؛ ئەویش بە نۆرە. هەر دوو سەعاتی شەو یان ڕۆژ، دوو منداڵ لە بەر دەرکە پاسەوان، بۆ لە خەو هەستان و چوونە وەرزش و جەمە نان و خەوتن، منالی شەیپوورژەن شەیپووری لێ دەدا. هەموو منداڵ فێری هەموو کارێک دەبوون. ژنەکان هەر ئامۆژگاری کردن و فێر کردنی کاریان لە سەر بوو. جمهووریەتێکی چکۆلە بە دەستی منداڵانی چکۆلە بەڕێوە دەچوو. بە نۆرە لە مەجلیسی سەرۆکایەتیدا بەشدار دەبوون. ئەوپەڕی تەکووزی و نەزم و تەرتیبیان هەبوو. لە سەعات یازدەی ڕۆژەوە دەیانبردنە مەلە. جێگەی خۆیان لە چۆم دیاری بوو. ڕۆژێ دیم کچۆلەیەک دەمەقاڵەی دەگەڵ کوڕیژگەیەکی هاوکەمپی بوو. دەیگوت: تۆپەکەم تۆ بە ئاوت دادا و چۆم بردی. ئەویش حاشای دەکرد. کە زۆری بۆ هات گوتی: بە شەرەفی پێشەنگیم سوێند دەخۆم من خەتام نەبووە. کیژۆلە گوتی: بەسیە! باوەڕم کرد.

دەستیان کردە ملی یەکەوە و ئاشت بوونەوە.

لە وچانی هاوینەدا منالانی پێشەنگ ئاوایان ڕادەبوارد و دەهاتنە کەمپی هاوینی لە دەشت. دوورترێک لە ئێمە چەندین قەسری هاوینەهەواری کرێکاران هەبوون؛ کە مانگی مەرەخەسی لە دەشتیان ڕادەبوارد. سێ یەکی مخارج لە سەر کرێکار و دوو بەش لە سێ بەشی، یەکیەتییەکەیان دەیدا.

شیر و گۆشت گا و ماسی زۆر بوو؛ کە دەیاندایێ. خواردن زۆر لە خواردنی باشی کوردستان دەچوو. بۆقیان پێ پیس بوو؛ بەلام دەیانگوت زۆر لە گۆشت کیسەڵ حەز دەکەن! جگەرە و مەشرووب لە ناو ئاسایشگا مەمنووع؛ بەلام لە دەری ئاسایشگا مەشرووب قەیدی نەبوو. ناو ناوە ئیجازە دەدرا شەو لە جەنگەڵ تا درەنگێ دەستەجەمعی بیگوزەرێنین. بیست یا سی کەس، هەر کەسە پارەیەکی دەدا، خواردن و خواردنەوەی پێ دەکڕدرا. لە جەنگەڵدا ئاوریان دەکردەوە و لە دەوری ڕایاندەبوارد. لە خوار ئاسایشگاوە چەمی مۆسکۆ بوو. کەڵخۆزێکی قەوغا -کە سەد ماڵێک دەبوو- لەوبەری چەم بوو. شەوی وا هەبوو کۆمەڵێک دەچووینە ئەوێ. لە بیرمە شەوێک دوو کیژ چوونە بەر دەرکی ماڵێک گوتیان یاسەمەنمان پێ بفرۆشە، پیرەمێردێکی ڕیش‌درێژ بە دارەوە ڕاوی نان کە نافرۆشم. بە منیان گوت تۆ بچۆ بۆمان بکڕە. بە ڕووسە لەت و پەتەکەی خۆم داوای یاسەمەنم کرد. کابرا باوەشێکی بۆ هێنام. هەرچی کردم پووڵی نەویست.

- تۆ غەریبی! میوانی! من یاسەمەن نافرۆشم؛ پێم جوانە. بەلام بۆ تۆ دەیبەخشم.

پیاو هەق بڵێ ئەوەندەی من رووسم دیتن، هیچ وەک خەڵکی ئورووپا و بە تایبەتی ئەڵمانی و فەڕانسی ناچن، کە لە ڕاست غەریبان زۆر بە دەعیە و لووت‌بەرزن. لادێی رووس وەک لادێی کوردستان میوان ڕادەگرن؛ با نەشیناسن. ئەخلاقیانم زۆر کەیف گرتبووی. زۆر دڵڕەحم و بە ڕوحم بوون. ڕۆژێک هەشت ژن و کیژ لە دەوری دارێک هالابوون، دەیانڕوانیە هێلانەیەک.

- خەبەر چییە؟

- ئەو جووچکە لە هێلانەوە کەوتووە. دار زۆر بەرزە، چۆنی بەرینەوە لای دایکی؟

- جووچکی قەلە سابوونەی بەدفەڕی سابوون دز! فرێی دەن!

تێکڕا بە تووڕەیی گلەیان کرد:

- تۆ ئینسانی! دەشڵێن شاعیری! چۆن دەتوانی هێندە زاڵم بی؟

گوتم: بچن تەلەفۆنچی بانگ کەن، بۆتان سەردەخاتەوە.

- ئافەریم! فکری چاکە، تۆڵەی قسە ناخۆشەکەت کردەوە!

لە ناو لێرەواردا زۆر لۆدە گیای زۆر زلم دەدیت. پرسیم: بۆ نایانکێشنەوە ماڵ؟ گوتیان: خەڵک بە زیادە دەیدروون و جێی دێڵن تا زستانان ئاسک و مانگای جەنگەڵ لێی بلەوەڕێن و لە سەرمان نەمرن.

ڕۆژێک لە زستاندا، هەموو خەڵکی کەڵخۆزەکە -پیر و لاویان- هەر یەکە هێلانەیەکی لە تەختە درووس کراویان دێنا، لە سەرووی دارانیان دادەکوتا؛ تا ئەگەر باڵدار لە گەرمێن هاتنەوە، هێلانەیان ساز بێ. ئەوە زۆر فەرقی دەگەڵ خەڵکی لادێی لوبنان هەبوو کە لەو هەموو باغ و دارستانەدا قەت دەنگی تەیرێک نەدەهات؛ هەموویان دەکوشتن. تەنانەت جارێک یادداشتی لوبنانیەکی باغەوانم لە ڕۆژنامەدا دەخوێندەوە کە چووبوو لە سوارتوکەی عیراق بە باغی پادشا ڕابگا؛ نووسیبووی: ئەو عیراقیانە ئەوەندە ئەحمەقن، لەگلەگ لە سەربانی ماڵان هێلانەی

کردووە، نایخۆن!

من میوانێک بووم، لە خارجی مۆسکۆ، تەنیا کەڵخۆزێکم دەدی کە پاژێکی زۆر بچووک لە گەلێکی دووسەد و پەنجا ملیۆنی بوو. دەشزانین کە پێش ئینقیلاب، ڕووسیا لە حاند دەولەتانی ئوروپا و ئەمریکاوە زۆر لە پاش بوو. تازەش بە برینداری لە شەڕی هیتلەر ڕزگاری ببوو؛ خەریکی ساز کردنەوەی وێرانی و مەڵحەم دانان لە سەر برینەکانی بوو. ئەو کەڵخۆزەش، ئەڵمان -جگە لە جێ ناقووسی کلیساکەی- خاپووریان کردبوو؛ سەر لە نوێ درووس کرابۆوە. سەنگەری ئەڵمانانی هەر لێ مابوو.

دیارە من ناتوانم وەک پێویستە باسی حاڵ خۆشی و ناخۆشی خەڵکی ئەو دەولەتە گەورەیە بکەم. جا مەگەر درۆ دروست کەم؛ یان بێخەبەر - وەک شیووعیەکانی عیراق- مل لە فڕ و فیشاڵ نێم و کێچ بکەم بە گا؛ یان وەک ئامریکاپەرستەکان بە باشەکەشیان بڵێم خراپ. تەنیا نیازم وایە من ئەو ڕۆژە کە دەبێتە بیستوپێنج ساڵ لەمەوبەر (ساڵی ١٩٥٩)، ئەو کەمەی دیوومە باسی بکەم. حەزیش دەکەم وەک کابرا نەبین کە دەیگوت: لە وڵاتی کومۆنیستی هەموو هەفتە باران بۆ تووتن دەبارێ! یان لامان وا بێ هەر ئیعلانی دەولەتی کومۆنیستی کرا، دەسبەجێ شیر و هەنگوین لە عاسمان ڕۆدەڕژێ. دەبێ بزانین وڵاتێکی فەقیر کە ڕژیمی گۆڕا، دەبێ ئەو فەقیرانە زۆر ماندوو بن، وردە-وردە حاڵی خۆیان خۆش کەن. «کەس لە پڕێ نابێتە کوڕێ».

مەلامستەفا -کە تازە لە ڕووسیا هاتبۆوە- دەربارەی ژیانی وڵاتی ڕووسیان لێ دەپرسی. جارێک گوتی: حاڵی گوندنشینەکانی دەشتی هەولێر لە حاڵی گوندنشینەکانی ڕووسیە خۆشترە. دیار بوو نەیدەویست درۆ بکا. شیووعی و پارتی لچیان هەڵدەقرچاند و دەیانگوت هەڕەی لە بڕە نەکردۆتەوە؛ هیچی لێ تێناگا.

بزنەگەلێکی کەم و گارانێکی زور لە کەڵخۆزەوە دەردەچوو. بۆیان گێرامەوە کە هەر گوندییەک بیەوێ مانگا ڕاگرێ، دەبێ لە دەولەت وەرگرێ؛ ڕۆژێ ئەوەندە شیر و ئەوەندە ڕۆن بدا. مانگا و گوێلک ساغ بن، ئەگەر بمرن، دەبێ شایەتی دوکتوریان لە سەر بێ کە بە فلان نەخۆشی فەوتاون. دەبێ ساڵێ ئەوەندەش گۆشت بدا. ئەگەر مانگا و گوێلک سەر نەبڕێ، گۆشت لە چی بدا؟ دەبێ لە بازاڕ بیکڕێ و بیدا بە کاربەدەستی کەڵخۆز. ئەم قسانەم لە غەیر بیست؛ ڕاست یان درۆ وەباڵ بەستۆیان. بەڵام خۆم ڕۆژێک لە سەر گۆلاوێک شەش مراویم دیت، پیاوێکیان بە دیارەوە بوو. گوتم: تۆ کاسب نیت! مراوی هیچ زەحمەتی نییە. ئەگەر زۆرترت ڕاگرتبا باشتر بوو. سەرێکی لێ ڕاوەشاندم: برا! بە دەست ئەوانەش پێوە بووم. ئەوەندە هێلکەی لێم دەستێنن هیچم بۆ نامێنێ. جا ئەگەر ئەو شتانە ڕوو بدەن، دیارە حاڵی ئەوانەی لە کوردستان حەیوان بە دۆخە وەردەگرن، خۆشترە. دوکانێک لە نزیک دەروازەی ئاسایشگا بوو؛ خەڵکی کەڵخۆزەکە دەهاتن، سەفیان دەکێشا، تا ماشین لە مۆسکۆوە نانی دەهێنا؛ ئەوسا بە نۆرە نانی خۆیان دەکڕی. دیار بوو خەڵکی گوند بۆ خۆیان ئارد ناکەنە نان. ڕۆژێک لە یەکێکم پرسی: زەوی ئەگەر تەڕی و قوڕی بێ، لەوانەیە ماشین بچەقێ. ئەو خەڵکە بۆ نان چ دەکەن؟ گوتی: قەت ماشین ناچەقێ و نان هەر دێت!

ڕۆژنامەم لە بەغداوە بۆ هاتبوون. لە «اتحادالشعب» ئۆرگانی حیزبی کومۆنیستی عیراقدا لە شوێنێکدا نووسرابوو: «خانەوادەی وەرزێران لە زەحمەتی چێشت و نان کردن و قاپ شتن ڕزگار بوون. هەموو شت ئۆتۆماتیکە: زەنگێک لێ دەدا، فلان خواردن بنێرە! سفرەیەک دێتە سەر مێز

ڕادەخرێ، قاپە شێوەکان بە شوێن یەکدا ڕیز دەبن. پاش نان خواردن، زەنگ لێ دەدرێتەوە، سفرە و زەرف سەربەخۆ دەچنەوە مدبەقی مەرکەزی گوند، لەوێ دەشۆرێن». باوەڕ کە لەو دەمەدا کە ئەمەم دەخوێندەوە، سەفی نان کڕان سەدان میتر لە دیاری دوکان وێستابوون؛ تا ماشین دێت و نان دەکڕن!!

ڕۆژێک دەگەڵ کیژێکدا «ناتاشا» ناو، لە دەری جەنگەڵ لە بەر هەتاو لە شوێنێک دانیشتبووین. ئەو ڕووسی فێر دەکردم؛ من ئازەربایجانیم بەو دەگوت. کابرایەک هات، وەک جەریمەی موخالەفەی ماشین بنووسێ، دەفتەرێکی دەرێنا:

- ناوت؟

ناتاشا زۆر ترسا، ناوێکیتری گوت.

- لە کوێ دەژی؟

شوێنێکی نەناسراوی گوت.

ڕووی کردە من.

- ناوم هەژار، خەڵکی عیراق، لە گێرتسنم.

- ئێرە کەمپی منداڵانە، نازانن مەمنووعە زەلامی بێنێ؟

- نەمانزانیوە.

کابرا ڕۆیشت. ناتاشا هەر دەیگوت: لەوانەیە لە ئاسایشگا دەرمکەن. تۆ بۆ جێگە و ناوی خۆت گوت؟ ئێوارەی ئەو ڕۆژە، خانم دوکتور لێی پرسیم: کێت دەگەڵ بوو؟

- نامەوێ درۆت بۆ بکەم؛ بەڵام پێت نالێم.

- پێم بڵێ، شەرتە هیچ نالێم.

- ناتاشا بوو.

- چونکە تۆ دیارە پیاوێکی ڕاستبێژی، ئەوا ئەویشم بەخشی.

ڕۆژێک خانم دوکتور گوتی:

- یۆنانی زمانێکی قوبروسی هاتووە، کەس تێی ناگا. حەولم داوە، فەرهەنگی ڕووسی یۆنانیش نییە. وەرە بزانە دەڵێ چی؟

- خانم، من و یۆنانی؟ بەو هەموو چەرمەسەرە ئەو دەنکە ڕووسیە فێر بووم؛ ئەویش دەڵێی ئەرمەنیم عارەبی داخێوم!

- تۆ هەر وەرە!

فکرم کردەوە لەوانەیە لە تورکی سەری دەرچێ. بەڵێ ئەلحەملای ترکیە کێویلکەیەکی دەزانی. وەک مەلای خۆمان کە فارسی دەڵێن وا بوو. دوکتور گوتی: من دەمزانی تۆ هەموو شتێک دەزانی! ئیتر زۆری عاقیدە بە من پەیدا کردبوو، حورمەتی زۆر دەگرتم.

کابرایەکی لە قیر ڕەشتر، ددان و چاوزەرد، باریک و درێژ، سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکی «کولکوتە» بە زمانی بەنگالی، «نیپاڵ» ناو، هاتە وەتاغی تەنیشتم. زۆر ڕووحسووک و خوێنشیرین بوو. زۆر باش هۆگری یەکتر بووین. ئینگلیسی بە لەهجەی هیندیانە دەزانی؛ خوداموزی ڕووسیشی هەمیشە بە دەستەوە بوو. پێکەوە دەگەڕاین؛ شەو تا دەمی خەو لە لای یەکتر بووین. جغارەکێشێکی لە زەبر بوو؛ لێی مەنع کرابوو. ڕۆژێک لە خانم دوکتوری پرسی:

- من هەقم هەیە دەگەڵ کچان بچمە گەڕان؟

- نەک هەقت هەیە، زۆریش باشە. بە کەیفی خۆت بگەڕێ.
- دەسا دوکتور من عاشقی شازادە خانم نیکۆتینم؛ با دەگەڵیا ڕابوێرم!
- شازادە لە ڕووسیا جێگەی نییە. نابێ بکێشی!

کوردەکانی مۆسکۆ و لینینگراد دەهاتنە لام. «پرۆفسۆر قەناتی کۆردیێف» و «کۆلۆزی شەرۆ» و چەند کەسێکی‌تریشم لەوێ ناسین.

زەمانی نیکۆلا، لە ئەرمەنستان، کورد –کە هەموو شوانزادە و فەقیر بوون– نەیانتوانیوە بچنە مەدرەسە و ئەرمەنیش ڕکیان لێ بوونەوە. لازار ناوێکی زۆر خێرەومەند، منداڵە کوردی کۆ کردوونەوە و کردوونیە منداڵی خۆی و دەبەر خوێندنی ناون. چەندین پیاوی گەورەی پێگەیاندوون کە «قەناتی کوردیێف»، «حاجی جەندی» و چەندێکی‌تریش لەوانەن. کۆلۆزی شەرۆ لە کوردە یەزیدییەکانی تفلیس بوو. لە زەمانی مولوتۆفدا کرابووە بەرپرسی بەرنامەکانی ڕۆژهەڵاتی (وەک عەرەبی، فارسی، تورکی، هیندی). بەڵام خوا هەڵناگرێ هیچیانی نەدەزانی! لە زمانی گورجی و ڕووسیدا زۆر شارەزا و کوردی کرمانجیش زمانی خۆی بوو. ئەوسا کە من دەمدی، ڕۆژنامەی ئۆرگانی گورجستانی چاوەدێری دەکرد. ڕۆژنامەی «کوردستان» -کە لە ئێران ساواک دەریدەکرد– ژمارەیەکی دەدرایە کە لە چل و هەشت سەعاتدا تەرجەمەی بکا. بەغار دەچووە لای سەلماسی، تەرجەمەی دەکرد. بیست‌وچوار سەعاتەکەی‌تریش من دەمخوێندەوە.

کۆلۆز گلەی لە دوکتور عەزیز شەمزینی هەبوو کە: من لە ئەرشیوی وەزارەتی دەرەوە، سووژەی تێزەکەیم بۆ هێناوە؛ کەچی ئەو بێ‌ئینسافە هەر باسیشی لە کتێبەکەیدا نەنووسیوە! لە سابلاغیانیش «کەریم ئەییووبی»، «ڕەحمانی حاجی باغر»، «مستەفا سەلماسی» و «سوڵتانی وەتەمیشی» سەریان دەدام. هەمووشیان لەقەمی دوکتوریان هەبوو. کەریم ئەییووبی هاوگاڵتەی کۆلانی سابلاغم بوو. لێم پرسی: تۆ دوکتوری چی؟

- زمانشوناسی.
- ڕووسی، کورد باش فێری دەبێ؟
- نا.
- حاڵی نابم، شتێکم بۆ بڵێ.
- لە کوردستان وشەی «گ» ( لە گافی ژێر) نییە، لە زمانی ڕووسیدا هەیە.
- هەتیو! «گی» لە کوردی لای کەرکووک و کفری هەیە؛ بە «گوو» دەڵێن!
- ئاخر تۆ لە سەرانگویلکی تەرەغە بەخێو کراوی، چۆن لە من حاڵی دەبی؟!

خانم دوکتور، مێردی لە شارێکی دوور و بۆ خۆی لەو ئاسایشگایە بوو. ڕۆژێ گوتی: مێردەکەم هاتۆتە مۆسکۆ. نیپاڵ و تۆ بە ماشێنی خۆم دەبەمە مۆسکۆ؛ بەڵام پاش سەعاتێک دەبێ بێنەوە؛ من گیر نابم. منی بردە بەر ئادرەسێک کە گوتبووم. کوڕگەلی سابلاغی-کە دوانیان لە باکۆشەوە هاتبوون- گوتیان پلاوی لێدەنێین و نابێ تا ئێوارە بڕۆی. گوتم: دوکتور! خوا هەڵناگرێ بە سەعاتێک ئەو مێردە هەناسەساردەت بەجێ بێڵی! ڕازیمان کرد پاش چوار سەعات بێتەوە شوێنمان. نیپاڵ چووە سەفارەتی هیند و من دەگەڵ سابلاغیان مامەوە. باس دامەزرا کە ئێمە کارێک بکەین هەموو کورد یەکتر بگرن. گوتم: برا! ئێوە هەموو شەش کەس نابن. لە نێو دووسەد و پەنجا ملیۆن ڕووسدا غەریبن. هەر یەکێکتان دیار نەبێ هەمووتان جوێنی پێ



دەدەن. جارێ بۆ خۆتان یەک بگرن؛ بۆ کوردان خوا کەریمە!

ئێوارە دەگەڵ دوکتور دەگەڕاینەوە. لە ڕێ پرسی:

– میستر نیپاڵ! بە تۆ و هەژارم گوتووە نابێ هیچ مەشرووبێک، تەنانەت ئابجۆش بخۆنەوە. بە قسەتان کردووم؟

– بەڵێ! جا چۆن فەرمانی تۆ لە عەرزی دەدەین؟ قەترەیەکیشمان نەچۆتە دەروونەوە.

– هەژار تۆ چۆن؟

– چت عەرز کەم؟ تەنیا دوو جار دەگەڵ نیپاڵ ئابجۆمان خواردۆتەوە؛ لە فلان دوکان!

نیپاڵ گوتی: ئای خەجالەت خۆم! تۆ بۆ گوتت؟

دوکتور گوتی: بۆیە دە پێشدا لە تۆم پرسی بزانم هیندی درۆ دەکەن؟ دەمزانی هەژار -بە زیانیشی بێ- درۆ ناکا. ئەگەر هەردووکیش حاشاتان بکردایە، دوکاندارەکە سەعات و دەمی ئابجۆ خواردنەوەکەتانی خەبەر پێ دابووم!

نیپاڵ باسی شاعیرێکی بەنگالی بۆ کردم کە لە تەمەنی بیست ساڵیدا بە سیل مردووە. لە یەک لە شیعرەکانیدا دەڵێ: «هەزاران کەس هاتوونە سەیری مانگی چاردە، شاعیران بە دڵبەری خۆیانی دەشبهێنن، دەوڵەمەندان ئارەزوویانە هەزار سکە زێڕی وایان بوایە، زۆر لە رووت و ڕەجاڵەکان پەڵەی ڕەشی ناومانگ دەناسن کە وەک پارچە نانە سووتاوەکانی خۆیان دەچن...».

ڕۆژێک لە بەر دەرگا وێستابووین؛ ژنێک بە نیپاڵی گوت: لە ڕۆژنامەکەتدا بە ئینگلیسی فکر دەکەیەوە و بە بەنگالی دەنووسی! هەردووکمان پێکەنین.

– نا، من جۆکم نەگوت. کەسێک هەر لە منداڵیەوە زمانێکی خوێندبێ، جوملەی نووسینی بەو زمانە لە مێشکدا گەڵاڵە دەبێ و تەرجەمەی دەکا.

نیپاڵ گوتی ڕاستە. من وەک لە خەو ڕامپەڕێنن: «بە خوا شتێکی سەیرە: هەموو کوردێکی نووسەر، یان بە عەرەبی، یان بە فارسی و تورکی جوملە لە مێشکی دادەڕێژێ. بۆیە هەر چی دەینووسن فرێ بە سەر کوردییە ئاساییەکەوە نییە». دەرسێکی گەورە بوو...

لە رووسیا زۆر دەرمانی قەدیمی -کە ئێمە دەڵێین دەرمانی پر و پیرێژنان- بە کار دێنن. تەنانەت ئەو کۆنە حەکیمانەیان کردوونە مامۆستا لە دانشگای بژیشکی. پیاڵە لە پشت گرتن [حیجامەت] زۆر باوە. ڕۆژێک لە ڕێی مەلەی چۆم، باران تەڕی کردم؛ لەشم ڕەق ببوو. چەند پارچە مشەممایەکیان دە لەشم گرت، بە چارەگە سەعاتێک چا بوومەوە. دوکتور گوتی مشەممای خەردەلمان بە کار هێناوە.

نیپاڵی ئاودەنگم ڕۆیشت. خەمم بوو، لە ژوورەکەمدا کز دامابووم؛ بیرم لێ دەکردەوە؛ گوتیان پیاوێک بانگت دەکا. کە دەچم «هەمزەی خوشکنابی»یە. لە تەوریز نووسەری ئازربایجانی زەمانی پیشەوەری بوو. لەو دەمەوە برادەر بووین؛ چاردە ساڵ بوو لێک هەڵبڕابووین. لەو ڕۆژەدا کە نیپاڵم نەمابوو، هەمزەم دەسکەوت کە هاتووە بۆ دوو مانگ لەو ئاسایشگایە ئیستراحەت بکا؛ شۆرەتیشی «فەتحی» بوو. ئای لەو خۆشیە! هاتە وەتاغی نیپاڵ.

بڕیار درا فەتحی و من ڕۆژێ دوو سەعات لە چەمدا بەلەم لێخوڕین کە وەرزشێکی زۆر باشە. من دە پێشدا دەچووم بەلەمێکم وەردەگرت و دوور دەکەوتمەوە. فەتحی دەهات: کوا بەلەمی من؟ بەلەمەوان دەیگوت: ئای بە داخەوە دەگەڵ ڕەفیقەکەت نەهاتی تا پێکەوە بەلەمێکتان بدەمێ. ناچار ئەویش بەلەمێکی دەستاند و یەکترمان دەگرتەوە. هەردووکمان سنگ و سەرشان

و پشت پڕ لە تووکی ڕەش، بە ڕووتی تەواو دەتگوت گۆریلاین! پیاوی ڕووس هەموو بێتووکن. ببووینە سەیرێک مەپرسە! بە سەدان لە ژن و کیژی ڕووس دەپاڕانەوە سواریان کەین و سەیرمان بکەن!

ڕابواردنی هەرەخۆشی ڕووسان ڕاوەماسی بوو. شەممە و یەکشەممە دەیان هەزار مەسکەوی و خەڵکی لادێ لە دەم ئەو چۆمە -کە لە چۆمی سابلاغ پتر نەبوو- یەک لە پەنا یەک قولاپیان داویشت و بە دیاریەوە سیس دەبوون. هەر ئەگەر یەکێک ماسیەکی بە قەد قامکەتووتەی بگرتبا، دەبووە هەرا و هوریایەک دەشت و دەر دەنگی دەدایەوە: «گرتی! گرتی!».

فەتحی پیرێکی ڕیشداری بەدی دەکرد، بە ئانقەست بەلەمەکەی بە لای ئەودا لێدەخوڕی و ئاوی لێ دەشلەقاند. پیرە جوێنی دەدا. فەتحی دە باری جوێنی ڕووسی لە بەر بوو، ملی دەگەڵ پیرە لە شەڕە جنێو دەنا و دنیای دەهێنایە پێکەنین.

لە دەمی بێبەفریدا، تۆپی سەرمێز و والیباڵ هەبوو؛ شەترەنج هەبوو. گەمەی هەرە لە بڕەو، دۆمینە بوو. هەموو پیاوێک داشی دۆمینەی دە باخەڵدا بوو. دەتگوت گوللەبەندی کاک ئەحمەدی شێخیان پێیە! هەر دەبوونە چوار کەس و ملیان لێ دەنا. کە گوتم دۆمینە نازانم، گوتیان نابێ پیاو لە ڕووسیا بێ و دۆمینە نەزانێ! هەر دەبێ فێر بی. گیانێکم بە قوبروسیە یۆنانیەکە بوو کە لەبەر زمان نەزانین ببوە کلکم. دۆمینەی لە هەمووان دەبردەوە دزی لێدەکردن و من و ئەو شەریک دەبووین. ناوی میخایل بوو؛ پێم دەگوت میخایلۆس. دەمگوت نابێ یۆنانی بێ (ئۆس) بێ!

پڕایی خەڵکی جغارەکێش، سیغاری «بیلۆمورکەنال»یان دەکێشا و هەرزان بوو. جارێک لە دوکان، میخایل جغارەیەکی دیت عەکسی «لایکا» سەگەکەی فەزاپەیمای تێدا و دووقات گرانتر بوو. دوو پاکەتی کڕی. لە ڕێگە جگەرەیەکی دامێ؛ بە ڕاستی زۆر ناخۆش بوو. گوتی: ها، چۆنە؟ گوتم: تووتن نییە؛ گووی لایکایان تێکردووە! هێندە پێکەنی لە سەر بەفر درێژ ببوو دەحیلکاوە!

لە نزیکمانەوە دیوارێکی بلند و زۆر درێژ بوو؛ کە ئەودیوی شارۆکەی فڕۆکەوانان بوو. لە هەموو دەمی ڕۆژ و شەودا، بێپسانەوە مەشق کردن بە فڕۆکە بوو. وا دیار بوو شوێنێکی زۆر تایبەتی بوو؛ چونکە کەمتر لە سەرانی وڵاتە کومۆنیستەکانیشیان دێنایە سەیری ئەو شارۆکە. گرمەی مەشقی فڕۆکان، خەوی دەزڕاندین؛ بەڵام وردە-وردە گوێمان لێ ڕاهاتبوو.

ها ئەوەم لە بیر نەبوو: کە فەتحی هاتە ئاسایشگا، لە یەکشەممەی ئایندەدا، دوو ئازربایجانی کە یەکیان ناوی مەدحەت و ئەویتریانم لە بیر نەماوە، هاتبوونە دیدەنی فەتحی؛ کە دیتبوویان منیش هەم. مەدحەت گوتی: من هاتوومە لای تۆ، میوەم بۆ هێناوی. چووینە دەشت بۆ گەڕان. مەدحەت و من پێکەوە لە پێشەوە، فەتحی و کابرایتر لە دواوە دەڕۆیشتین. فەتحی بانگی کرد: مەدحەت وەرە قسێکت پێ بڵێم! سرتەیان کرد. گوێقوڵاغ بووم، گوتی: هەژار زۆر کەرە؛ تازە لە عیراقەوە هاتووە. کومۆنیستێکە ئاو دانادا. لای وایە ئێرە عەرزی موقەددەسە و هەموو شت پیرۆز و مبارەکە. تۆ لە هەوای ئەو قسە بکە تا بۆ خۆم وردە- وردە عاقڵی دەکەم! گوتم: کوڕی سەگ! کێ کەرە؟

- ڕاستەکەی تۆ! هەتیو ئێرەش وەک دنیایترە. ئەو هەموو بەهـ- بەهەت لە چییە؟!

کچێک لێی پرسیم: فەتحی دەڵێ من کوڕی فیئۆدالم. میترۆی گوندەکەمان لە ئازربایجان، لە میترۆی مۆسکۆ چاکترە!



- فەتحی ئەو درۆیانە بۆ دەکەی؟
- کاکە هەوەڵ جار کە هەلاتین، بە باریکی دیکەدا درۆم دەکرد کە بە خەیالم حورمەتم بگرن. دەمگوت: بابم لە سەر کومۆنیستی کوژرا؛ خۆشم دە ساڵ لە زینداندا ئەشکەنجە کراوم؛ خزم و کەسم لە برسان مردوون و... دیتم کچان بێزم لێدەکەن. ئێستا کە بەو بارەدا خۆم هەڵدەکێشم نانم کەوتۆتە ڕۆن!
هەمزە گوتی: بابم (کەربەلایی فەتحوڵلا) شوانێک بوو لەو هەشتەرۆییە رووتانەی کە وەک ورچ دەچن! نانی شەوی شک نەدەبرد. من خوێندبووم؛ گوتم: بابە دەچمە تەوریز پوول پەیدا دەکەم. بوومە نووسەری ڕۆژنامە. ڕۆژێک گوتیان کابرایەکی شڕی پیسەکە ناوت دەپرسێ! باوکم بوو:
- هەمزە کوا چت کردووە؟
چنگێک ڕۆژنامەم نیشان دا:
- ئەوە کاری منە.
هەتا هێزی تێدا بوو تێلایەکی بە ناو شانم کێشا:
- سەگباب ئەوە پوولە؟!
ملی نا لە ڕۆژنامە دڕاندن. هەر دەیگوت: ئەوە پوولە؟!
بیست تمەنم نا دەستیەوە؛ خاو بۆوە:
- هەمزە! کورم، وەرە ماچت کەم!
قسەی شاعیری عەرەب «عومەر ئەبووڕیشە»م بیر کەوتەوە کە نووسیبووی: لاوێکی دانشجوو بووم. هەوالانام تاریفی شیعریان دەکردم. چاکترین شیعری خۆم بۆ باوکم خوێندەوە کە: پێت چۆنە؟ لێی وەرگرتم؛ نایە باخەڵی؛ جوابێکی نەدامەوە. گوتی: عومەر وەرە بچین باقلەی کوڵاو بخۆین. دوای باقلە خواردن، باوکم بە باقلەفرۆشی گوت: حیسابت چەندە؟ کابرا سوێندی خوارد کە هیچی ناوێ و فەخر دەکا کە پیاوێکی وا گەورەی بۆتە میوان. بابم شیعرەکانی لە باخەڵ دەرێنا، گوتی: دەبێ هەر بتەوێ؛ ئەو شیعرانە بۆ تۆ! کابرا کە دیتی بابم گاڵتەی پێ دەکا زۆر ناڕەحەت بوو. کاغەزی شیعرەکانی فڕێ دا:
- قوربان گاڵتەم بۆ پێ دەکەی؟ ئەوانەم بۆ چییە؟!
بابم ڕووی دە من کرد:
- کوڕم چاکترین شیعرت چنگە باقلەیەک ناکا؛ تۆ بە چییەوە خەریکی؟!
نەقڵی کەریم ئەییووبیم بۆ فەتحی گێڕاوە. یەکشەممە هاتە دیدەنیم. فەتحی لەو لاوە هات تەعزیمی بۆ کرد. بە «ئوستاد، ئوستاد» دواندی. کەریم قوت ببوو. فەتحی پرسی: دوکتور نافەرمووی زمانشناسی چییە؟ حەز دەکەم تێبگەم.
گوتی: ناسینی هینەکەی دایکتە! تێگەیشتی؟
- بەڵێ باش تێگەیشتم!
ڕۆژێک لە گەڕانی ناو جەنگەڵدا تووشی گۆڕستانێک بووین. ژنێک عەکسی ژنێکی بە قەبرێکەوە دیت. گوتی: ئەوە هاوعومری من بووە کە مردووە. ڕووی کردە من:
- تۆ بڕوات بە خودا هەیە؟
- بەڵێ.

- لاشت وایە پاش مردن زیندوو دەبیەوە؟
- بەڵێ.
- من بڕوام نییە؛ کامیان باشترن؟
- هی من کە بڕوام بە زیندووبوونەوە هەیە. چونکە ئومێدە؛ هی تۆ ناهومێدییە.
- نا، هی من باشترە. چونکە لام وایە هەر ئەم ژیانەیە و یەکجاری دەبڕێتەوە. حەول دەدەم لەم ژیانە کورتەدا زۆر لە دنیا بزانم. بەڵام تۆ بە هیوای ئەو لا، زۆر گوێ بە خۆشی دنیا نادەی و کەم فێر دەبی.
- دەی باشە؛ هەر کەس لە سەر دینی خۆی!

پێم سەیر بوو: ڕووسەکانی ڕۆشنبیر و زۆر خوێندەواریش لە سەبر هاتن (پشمین) دەترسان. ڕۆژێک لە ناو جەنگەڵدا پەپووسیمانەیەک دەیخوێند. هەواڵە ڕووسەکەم بە قامک دەیبژارد.
- نیازت چییە؟
- پەپوو سێزدە جاری خوێند. وا دیارە من سێزدە ساڵم تەمەن ماوە!

گوتم: نا، ئەوە حیسابی عومری منی دەکرد؛ نە ئی تۆ!

لە ڕادیۆ زانیمان «شەوواف» و چەند ئەفسەرێک، بە دنەدانی ناسر لە قاسم هەڵگەڕاونەوە؛ قاسم بە سەریاندا زاڵ بووە. ڕۆژنامەی مۆسکۆ نووسیان: «بارزانی توانی هەرای شەوواف لە ناو بەرێ».

شیووعی وە خۆ کەوتبوون؛ دادگای گەلیان لە مووسڵ پێک هانیبوو. عەبدوڕەحمان قەساب ناوێکیان کردبووە دادستانی دادگای پرۆلیتاری. بە سەتان کەسیان لە خەڵکی مووسڵ پاش دوو دەقیقە محاکمە بە داری چرابەرقدا هەڵاوەسیبوو. لە کەرکووک وە ناو شار کەوتبوون، هەر تورکمانێک و کوردێکی ناحەزیان بەر چنگ هاتبوو، بە گوریس ڕایانکێشابوو؛ قەتڵوعامێکی زۆر بەسامیان کردبوو. بۆ نموونە: هەر دوو لاقی ناحەزیان بە دوو جێپەوە بەستووە، جیپەکان هەر یەک بۆ لایەک لێخوڕاون تا کابرا لە بەر یەک هەڵقلیشاوە. ئیتر قاسم گەیوەتە ئێسکانی؛ چەند زەلامێکی لێ گرتوون و لە سەر ڕادیۆ هجوومی بۆ کردوون.

جەلال بێتووشی نامەیەکی لە برلینەوە بۆ ناردم؛ نامەی جەودەت مەلا محەممەد ناوێکی شیووعی کۆیی بوو. دەڵێ: «...جەلال نازانی چەند خۆش بوو! هەر چی لە مووسڵدا دەمانگوت و دەمانزانی هەواڵ نییە، بەر شەقمان دەدا؛ دارکاریمان دەکرد؛ دەماندا دەست مەحکەمە، دەسبەجێ دەیگوت بیبەن بە داری داکەن. بەو سەرە شیرینەت سوێندە کە هێندەم شەق دە مورتەجیعان هەڵداوە ئێستاش لاقم دێشێ!...».

کچێکی زۆر جوان و زۆر ناسک و نازدار، کە دەمدی جار-جار دەگەڵ «عەسکەر ئل عێبی»دا دەگەڕا، بە منی گوت: من حازرم دەگەڵ عەسکەر بچمە بەغدا، خۆی لێ تووڕە کردووم. تۆ پێی بڵێ!
- عەسکەر ئەو کیژە لە باب و باپیریشت زیادە! بۆ نایبەیە بەغدا؟
- کاکە بەزەیم پێدا دێتەوە. ئێمە لە بەغدا زاغەنشین و یەکجار فەقیرین. ئەو کچە حەمامی دەوێ؛ ئاوی خاوێنی شێرەی لازمە؛ فێری سینەمایە؛ هەر دوو ڕۆژ ماڵ و حاڵی من ببینێ دڵی دەتۆقێ. گوتم ئافەرین بۆ ویجدانت...

پاش گەڕانەوەم بۆ بەغدا -بە چەند مانگێک- کوڕێک هاتە لام؛ گوتی: عەسکەر گلەییت لێ

دەکا. بۆچی کارتی دەعوەتم بۆ ناردووە نەهات؟

- کارتم نەدیوە، دەعوەتی چی؟

- خەبەرت لە چییە؟ قەسری لە گەڕەکی وەزیریە کڕیوە. ژنی هێناوە؛ پتر لە پێنجسەد کەسی لە ئوتێل بەغدا -کە جەمێکی بە پێنج دینارە- دەعوەت کردبوو!

- ئاخر ئەو دەیگوت زاغەنشینم و زۆر رووت و ڕەجالم.

- بەڵێ، ئەوسا وا بوو، ئێستا وایە. عەسکەر خالی منە.

تێگەیشتم زاغەنشینی کرێکاری سادەی کارخانەی جگەرە، خوا بۆی ڕەخساندووە بگاتە مۆسکۆ، بۆتە حاجی و لای شیووعیان وە قەدر کەوتووە؛ دەستی بە کونی پوولدا چووە. ئێستا بۆتە ئەو پیاوە و ناویشی نراوە: «مامۆستا عەسکەر».

هەستم دەکرد رووسەکان هیچ خۆشیان لە نەژادی زەرد نەدەهات. ئەگەر فیلم چینی با - کەس جگە لە نامۆکان- نەدەچوونە تماشای. چوار چینی و ژنە ژاپۆنییەک و یەکی ڤیێتنامی لێ بوون. کوڕە چینییەکان هەر چەند هاتبوونە ئیستراحەت، هەمیشە سەریان بە سەر کتێبەوە بوو. نەیاندەپەرژا هەوالەتی کەس بکەن. ڤیێتنامییەکە لە عەکاسی دەزانی. من کە لە عەکاسیم دەزانی پارووم کەوتبووە ڕۆن. هەوالانی ئاسایشگا دەبوو دەرمان و کاغەز و فیلمی نەگیراوی خۆیان بێنن، وەک دوکتوری تارانی وەختم بۆ دادەنان! ئەگەر ڕۆژی باران بێ، فلان سەعات بۆیان چاپ دەکەم، بەوە زۆر مەمنوون دەبوون. کوڕە ڤیێتنامیەکە بە دووربین و فیلمی خۆی عەکسی دەگرت و بە کاغەزی خۆی بۆی چاپ دەکردن. لە جوابی مندا کە بۆ وەک من ناکەی گوتی: من زەردم؛ تۆ ئەسمەری چاوڕەشی. بەو حالەش هەر چەندی دەکەم لێم رازی نین و هەوالەتیم ناکەن! لە ئاسایشگادا ژووری تاریک و ماشینی عەکس گەورە کرنەوەی تێدابوو.

فەتحی گوتی: لە سەر بابەکی خوڕەمدینی شتێکم نووسی؛ چاپ کرا. ئێستا دەمەوێ شتێکی لێ زیاد کەم کە دیسان بۆم چاپ کەنەوە. لە تەورێزەوە کاروان بە کوردستاندا بەرەو بەغدا بڕوا، تووشی چەند جێ دەبێ، بۆم بنووسە! دەیگوت: ئای ناوی «گەنەدار»، «ئافان» و «دۆڵەسیر»یان چەند پێ گرینگ بووە؛ بۆیان چاپ کردەوە!

دوکتور ڕەحمانی حاجی باغر نامەیەکی ڕەسمی لە «ڤۆلۆشین»ناو -کە لە کومیتەی مەرکەزی حیزبدا و بە سەر سیاسەتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ڕادەگەیشت- بۆ هێنام: «تکایە حال و ئەحوالی عیراقمان دە مەقالێکدا بۆ بنووسە». بە کوردی نووسیم:

- دەی دوکتور بە ڕووسی تەرجەمەی کە!

- کوردیەکە نازانم؛ بریا فارسی با.

کردمە فارسی.

- بە خوا ڕوسیەکەش نازانم!

سەلماسی تەرجەمەی کرد. لە مەجەللەی «ئەدەبیات و ژین»دا چاپ کرا. چوار هەزار ڕووبلیان بۆ ناردم. بەلام لە جیاتی ناوی نووسەر، ڤۆلۆشین داندرابوو!

زۆریان لە ئاسەواری نووسەرانی ڕووس بە عارەبی بۆ هێنابووم. لە ناویاندا نامیلکە شیعرێکی «ماياکۆفسکی» هەبوو؛ لەزەتم لە خوێندنەوەکەی نەبرد. مەسەلەن «هەور لە پاتۆلدا» بە لامەوە قسێکی سەیر بوو، وەک «زیقەی مۆر» دەچوو! داوام کرد فارسییەکەیان بۆ هێنام؛ فەرقێکی نەبوو. خوایە چۆن ئەو کابرایە دەبێ وەک گۆگل و ماکسیم گۆرگی و چیخۆف و کێ و کێ

حیساب کرابێ و زیاتریش؟! لام وایە هەر چونکە دەڵێ: «شانازی دەکەم کە لاوێکی کۆمۆنیستم» ئەو ڕێزەی لێ گیراوە و کۆتەڵی لە کۆتەڵی هەموو نووسەرە بەناوبانگەکانی ڕووسی بەرزترە. ڕەنگیشە من وەک لازمیەتی تێی نەگەیشتبم و عەقلم هەر ئەوەندەی بڕ کردبێ...

ڕۆژێک دوو زەلام، بە باریک دووربین و زەبتی سەوتەوە وە ژوور کەوتن:

- جێژنی ئۆکتۆبرە؛ شتێک بلێ لە ڕادیۆدا بلاو بکرێتەوە.

- دەبێ شیعرێک بنووسم. سبەی وەرنەوە! سبەی لێم پەیدا بوونەوە گوتم شیعرەکەم کوردییە.

- تۆ فارسی یان عەرەبی نازانی؟

- لە فارسیدا مەلەوانم؛ لە عەربیدا تام لە دنیادا نییە.

- جا چونکە کوردی جێگەی لە ڕادیۆ مۆسکۆدا نییە، بە عەرەبی تەرجەمەی کە.

- برا من کوردم! بە کوردی دەتانەوێ ممبارەکە، دەنا کەسمان لە کەس.

هەرچی قونە جوڕە و منجە-منجیان کرد فایدەی نەبوو. ڕۆینەوە. دوای دوو ڕۆژ هاتنەوە:

- باشە بە کوردی بلێ.

- ئاخر پێشەکیەکی پەخشانیشم بۆ نووسیوە کە خەڵک دە شیعرەکە بگا.

- باشە ئەویش بلێ!

شەوێک لە ڕادیۆ بلاو کرایەوە. تێگەیشتم بۆچی تاڵەبانی بە عارەبی قسەی کرد!

دەعوەت کرامە سەفارەتی عیراق؛ کە جێژنی دامەزرانی کوودەتا بوو. بە جلکی کوردییەوە چووم. جلکی کوردی سیحرە! ئەوەندەم لێ کۆ بوونەوە و ئەوەندەیان عەکس گرتم و پرسیار لێ کردم کە سەفیری عیراقی عەبدولوەهاب مەحموود گوتی: بە ڕاستی تۆ سەفیرێکی لە من چاکتری بۆ عراق ناساندن. لەو جێژنەدا کوڕێکی عیراقیم دی بە ناوی حەمە فەرەج کە دەیانگوت لەو سوورانەیە بە ناوی کورد و کوردستان جووتە هەڵدەخاتەوە! هات بە لامەوە، ڕووم لێ وەرگێڕا. گریا، گوتی: هەژار ڕاستە من دژی میللەتی خۆم بووم، بەلام هەمیشە دڵم بۆ کورد و کوردستان سووتاوە و نەموێراوە ڕاستی دڵی خۆم بڵێم. گوتم: برادەر تۆ زۆر سەرخۆشی؛ سبەی لە بیرت دەچێتەوە و پەشیمان دەبیتەوە کە باسی خۆشەویستی گەلی خۆت کردووە!

هەشت مانگ لە گێرتسن زۆر بە خۆشی ڕامبوارد. هاتمە مۆسکۆ لە سەر حیسابی نووسەران لە ئوتێل میترۆپۆل دامەزرام. ڕۆژێک بردیانمە بنکەی یەکیەتی نووسەران. سەرۆک ناوی میدویدۆف بوو؛ تەمەنی سی ساڵ دەبوو نەدەبوو. پیاوێکی یەکجار ڕووخۆش، قسەخۆش و زۆر زیرەک بوو. لەو مەجلیسەدا نینا عەرەبیزانەکەی هەوەڵ جار لە فرگە دیبووم لەوێ بوو. تورسونزادە -کە شاعیرێکی مەشهووری تاجیکە- زۆری خۆشی و بۆشی دەگەڵ کردم.

گوتی: من کوردم هەمیشە خۆش ویستوون و ئێستاش هەر زۆرم خۆش دەوێن. من چوومە عیراقیش، وا تازە گەڕاومەوە.

گوتم: میرزا تۆ کە هێندە کوردت خۆش دەوێ، چوویە بەسرا نەچوویە سولەیمانی و هەولێر. لە بەغداش زۆر نووسەر و شاعیری کورد هەبوون هیچیانت نەدیت. شیووعیەکان نەیانهێشت خۆشەویستەکانت ببینی، یان ئارەق و ڕەقسی بەغدا و بەسرا لە کورد خۆشتر بوو؟

گوتی: ئەوە ئیهانەتە بە من؛ دەبێ عوزرم لێ بخوازی.

میدویدۆف لە نینای پرسی: دەڵێن چی؟

- نازانم. بە فارسی قسەیان کرد.
من بە عەرەبی بۆ نینام شەرح دا. میدویدۆف گوتی: تورسونزادە! تۆ دەبێ عوزر لەو کارەی خۆت بخوازی. یان دەبوو نەڵێی کوردم خۆش دەوێ، یان دەبوو بچیە لای کوردانیش. حەقی هەژارە.
هەر لەو مەجلیسەدا یەکێک پرسی:
- تۆ کومۆنیستی؟
- نەخێر ناسیۆنالیستم.
دیسان میدویدۆف گوتی: هەژاری ناسیۆنالیستم پێ لە زۆر کومۆنیستان باشترە. شیعری ئەو زۆری هاوار بۆ چینی چەوساوە کردووە. شولوخۆفیش کومۆنیست نەبووە و پیاوی چاکیشە.
زۆر جاری‌تر میدویۆفم دیتەوە. جارێک لێی پرسیم:
- چوویە بازاڕ؟ پێت چۆن بوو؟
- شت زۆر گرانە.
گوتی: یانی هەیە و گرانە. برا لە زەمانی شەڕدا و دوو ساڵیش دوای شەڕ، پووڵ لە گیرفاندا هەبوو، بەلام هیچ نەبوو پێی بکڕین. شوکور بکە کە ئێستا هەیە و گرانە. لە کۆپینەوە دوو جووت گۆرەویم بەرکەوتبوو، لە بازاڕی ڕەش فرۆشتم. من کە حیزبی بووم، ناچار چووم ئیقرارم بە گوناه کرد.
جارێک گوتم: تۆ پیاوێکی زۆر زیرەکی! پێکەنی، گوتی: جا با بۆت بگێڕمەوە: ئەزموونی کلاسی شەشم دابوو. فەڕاشی مەدرەسە گوتی هەر کەس دوو ڕووبڵم نەداتێ، کارنامەی نیشان نادەم. بە هەزار گێرە و بە تکای دایکم دوو ڕووبڵم لە باوکم ساند و بردم. لە کارنامەکەمدا هەوەڵ بووم؛ بەلام هەوەڵ لە تێشکاوەکان! لە نمرە کەم هێناندا، لە هەمووان لە پێشتر بووم! دوو زللەی جانانەم لە باوکم خوارد کە دوو ڕووبڵەکەی بە خەسار چووە!
ژنێکی نووسەر و جوولەکە شیعرەکانی منی بە ڕووسی تەرجەمە دەکرد، ئەویش بە یاریدەی مستەفا سەلماسی. وەختە بڵێم بوودجەی وڵاتی شۆرەوی نیوەی لە نووسەر و شاعیر و هونەرمەندان و بە تایبەتی هونەرمەندانی سەر شانۆ خەرج دەکرێ. زارکی کیسە ئاواڵەیە... بە هەر دێڕێک -کە لەتە بەیتێک بە دێڕ حیساب دەکرێ- چاردە ڕووبڵیان دەدا بە خاوەنی و چاردە ڕووبڵیش وەرگێڕ وەریدەگرت! پووڵ بۆ من دەباری. پتر لە شێست هەزار ڕووبڵ نرخی شیعر و نووسراوی پەخشانم پێگەیشت. ویستم چاپخانەیەک بکڕم؛ سەلماسی زۆری دەرک و دیوان کرد، گوتیان بۆ دەرەوە بە ڕووبڵی نافرۆشین. لەوی ناهومێد بووین. دە هەزار ڕووبڵیان بۆ بە هەزار دۆلار گۆڕیمەوە، بەو شەرتە کە لە بەغدا بمدەنێ.
ئەو هەموو پوولە -کە لە ڕووسیا نەبێ، ناچێ- چ لێ بکەم؟ ملم نا لە تەخشان پەخشانی! دەعوەتی ئاشنایانم پێ دەکرد. ڕۆژێ میدویدۆف و ژنەکەیم دەعوەت کرد. هەزار و دووسەد ڕووبلم لە جەمێکدا بژارد. سەرەڕای پوولی زۆریش، حەقی ئوتێل و خواردن و سەفەرم لە سەر نووسەران بوو.
گوتیان: دەمانەوێ بتگێڕین؛ کارخانەی ماشینسازی و ئەمانەت نیشان دەین. گوتم: هیچی تێناگەم و ناشچم. حەزم لە مووزە و نەققاشی هونەرمەندانە و هیچی‌تر. بە زۆر مووزاندا گەڕام و ڕاستی زۆرم کەیف پێ دەهاتن.

لە ئیدارەی ڕۆژنامەی پڕاڤدای جەوانانەوە داوام لێ کرا کە مەقالێک دەربارەی ئاشتی بنووسم. مەقالەکە وا بوو:

«لە میسری قەدیمدا -کە سنعات لە شاران پەرەی سەندبوو- وەرزێران و ماسیگران دەهاتنە کرێکاری بۆ شاران. گەنم و ماسی زۆر لە کەمی دا. کاهینانی ئایینی وە ناو خەڵک کەوتن: کە بابە ئێوە نازانن دنیا لە سەر پشتی گا و ماسی بەندە؟ ئەگەر گەنم و ماسی بەرهەم نەهێنن، دنیا تێک دەچێ و خەڵکی شار لە برسان و بێگۆشتیان دەمرن. کارناسانی دنیاش دەڵێن: ئەو سەربازەی لە جەبهەی شەڕە، بەرهەمی یازدە کارگەر دەخوا، خۆشی یەکێک، ئەوە دوازدە کەس لەوانەی گەنم و گۆشت بەرهەم دێنن لە کار دەکەون...» ئەودەم لە سەر باشی ئاشتی و خراپی شەڕ دوابووم. مەقالەکەم لە ڕۆژنامەدا چاپ کرا. دەعوەت کرام بۆ ئیدارە. سەرنووسەر گوتی: زۆرمان تەلەفۆن و تێلگراف بۆ هاتووە، دەڵێن شەش مانگە لەو مەقالەیە بەهێزتر لە سەر ئاشتی چاپ نەکراوە. تۆ نووسەرێکی باشی.

گوتم: هەڵە مەبە! من نووسەرێکم هەر ناوم نییە؛ بەڵام فەرق ئەوەیە لێرە بۆ نووسەران فکر دەکەنەوە. من بۆ خۆم فکر دەکەمەوە و دەینووسم. پووڵی زۆر دەدەن بە نووسەر، پێی دەڵێن لە فلان باسدا ئەوەندە کەلیمە -نە زیاد نە کەم- بنووسە! نووسەر بۆ پووڵەکەی خواخوایەتی کاربەدەست لێی ڕازی بێ؛ نەک بۆ خۆی لە نووسینەکەی خۆی. بۆ نموونە کتێبێکم بە عەرەبی خوێندۆتەوە چوارسەد سەفحەیە؛ لە داستانێکی ڕووسی تەرجەمەیە بە ناوی: «کەنارەی ڕووناک». هەمووی بە پوختی باسی گوێلکێکی ڕەسەنە! کەڵخۆز بە کەڵخۆزی فرۆشتووە و پاشان لێی ساندۆتەوە. ئەگەر من تەرجەمەم بکردایە بە سەفحەیەک تەواو دەبوو.

لێم ڕوونە قسەکانی منی پێ ئەحمەقانە بوو، بەڵام گوتی: تکایە شتیتریشمان بۆ بنووسە.

گوتم: من لە بنی مەقالەکە نووسیبووم: «هەژار شاعیری کورد»، ئێوە نووسیوتانە «هەژار شاعیری عیراقی»، یانی چی؟

گوتی: وامانزانی وات پێ خۆشە!

- مامۆستای بەڕێز! تۆ بمنێریە بازاڕ بڵێی شووتیم بۆ بکڕە، من بچم سنجووت بۆ بکڕم، بڵێم وامزانی سنجووت پێ خۆشترە! نەخێر لە ناوی کورد خۆت پاراستووە؛ ئیتر بۆتان نانووسم.

دەگەڵ سەلماسی و نینا جوولەکەکەی وەرگێڕی شیعرەکانم چووینە دیدەنی نازم حیکمەت. پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانە، چاوشین، مووزەرد، هەتا بڵێی خوێن‌شیرن. لە سەر تەختی پشت لە سەر تەخت ڕاکشابوو. نەخۆشی دڵی بوو؛ نەدەبوایە زۆر ببزوێ. گوتم: زۆر بە داخەوەم ئەو دڵەی کە لە گۆشەیەکەوە کوردی تێدایە ژان بکا.

گوتی: یاهو! ئەوە قسەی شاعیرانەیە. کورد لە ناوەندی دڵمدایە نە لە گۆشەدا. من بە منداڵی لە ماڵی بەدرخانیان ژیاوم و مەمکی کوردانم مژیوە. خۆم لە تۆ بە کوردتر دەزانم... خەڵک لە عیراق و شوێنیتری عەرەب چۆنم باس دەکەن؟

- هەموو کەس دوور بە دوور عاشقتە و ناوبانگت زۆر بەرزە. بەڵام کۆمۆنیستەکانی عیراقی (کورد و عەرەبی) و کۆمۆنیستەکانی سووریا لێت ڕازی نین؛ ئەویش هەر لە سەر ئەو قسانەی کە باسی کورد دەکەی.

- چم پێ دەڵێن؟

- چت عەرز کەم؟ دەڵێن های لە دایەی نازم حیکمەت بەین! بەڵێ شتێکی وا!

زۆر پێکەنی. گوتی: ئەوانە کەرن؛ با جنێو بدەن. هەر کەس بتوانێ و یاریدەی ئەم گەلە بەستەزمانە لێقەوماوە نەدا، نابێ بە خۆی بڵێ بنیادەمم. دڵم بەم خەبەرەت خۆشە...

دوو ژن خزمەتیان دەکرد. گوتی: تا فراوین نەخۆی نابێ بڕۆی. ئەوسا مووزەی خۆمت نیشان دەدەم. دوای فراوین، بە سەبرە- سەبرە پێشمان کەوت. هەرچی لە هەموو دنیاوە دیاریەکیان بۆ هێنابوو، مووزەیەکی لێ پێک هێنابوون.

گوتم: ئوستاد! دەفەرمووی کوردم خۆش دەوێ، ئەدی کوا شتێکی کوردانە؟

- ئای چەند بە پەلەی! وەرە...

لە سەر تاقەیەک مەخمەری سەوز ڕاخرابوو، جووتێک کلاشی هەورامی، چەند کەوچک و ئەسکوێی دار، چەند سەبیلەی کلکدار و گڵین، زۆر بە جوانی ڕیز کرابوون و نووسرابوو: «دیاری برا کوردەکانم». گوتی: بەر لەوە لە تۆ پرسم، بیستبووم کە کومۆنیستانی سووریە مەقالێکی منیان تەرجەمە کردبوو؛ ناوی کورد و کوردستانیان دەراوێشتبوو کە من نووسیبووم.

عەکسێکی خۆی و چەند کەوچک و گوڵدانێکی داری زۆر جوان کە دەسکاری ئەمریکای لاتین بوو- بە دیاری دامێ؛ کە لە بەغدا وەک عەزیزترین یادگار هەڵمگرتبوون؛ بەعسی بە تالانیان برد. کە ویستمان بڕۆین گوتی: دوو نومایشم لە مۆسکۆ نیشان دەدرێ، چەند بلیتت دەوێ؟

نینا گوتی: دوازدە.

گوتم: ئوستاد ئەوە جوولەکەیە؛ دەیەوێ بیفرۆشێتەوە! لە سێ پترم ناوێ.

گوتی: نا، دوازدەت هەر دەدەمێ.

تەلەفۆنی کرد بۆ ژنێک: «چۆنی؟ لاچاوت ماچ دەکەم. دوازدە بلیت بە ناوی هەژار بنێرە»، ڕووی دە من کرد: ئاوا دەبێ ژنان بدوێنی، فێر بە! دوایە هەر خۆی گوتی: بە خوا پێم وایە لە من شەیتانتری؛ دەزانی چۆن خەڵک بدوێنی!

چوومە تماشای یەکێک لە نومایشنامەکانی؛ بە ڕاستی بە شاکارم زانی.

بڕیار درا بچمە لینینگراد. زۆر لە دۆست و برادەران هاتبوون بەڕێم کەن. قەتار سەعات دووی پاش نیوەشەو دەڕۆیشت. گوتیان بۆ سێ ڕۆژ ئەو چەمەدانە گرانەت بۆ چییە؟ یەکی چکۆلەی سووکت پێ بێ بەسە.

- ئاخر نیمە.

«کۆلۆزی شەرۆ» کە لە کوردەکانی گورجستانە و چاوەدێری پراڤدای بە زمانی گورجی دەکرد؛ گوتی من دەچم بۆت دێنم. ساکێکی گوڵ چندراوی بۆ هێنام. چووینە ئێزگە. ئاغای قیامی ناوێک، پیاوێکی حەفتا و پێنج ساڵەی کۆنە وەزیری ئێرانی و دۆستی نزیکی بارزانی لە مۆسکۆ، هاتبووە ئێزگە بۆ بەڕێ کردنم.

- ئاغای قیامی زۆر شەرمەزارت کردم.

- نا تۆ دۆستی بارزانیی، لازم بوو بێم...

دوکتور سوڵتان وەتەمیشی پتر لە دە جاران دە بن چنگی کوتام: «دیسان بچۆ تەشەککوری لێ بکە، بەو پیریە زەحمەتی کێشاوە». کچێک کە لە ئاسایشگا دەمناسی و ناوی «گالە» بوو، دەگەڵ خوشکی هاتبوون. گوتم: تکایە تۆ و خوشکت لە باتی من سوپاس لە قیامی بکەن. هەردووک چوون و قۆڵیان کردە قۆڵی. گوتیان: چونکە تۆ زەحمەتت کێشاوە، ئێمە دەگەڵت



دێینەوە ماڵێ. قیامی گوتی: ئەگەر جەوان بام نەدەهاتن؛ مەمنوونم!
خاولی و ماولی و ئەسپابی ڕیش تاشینم لە ساک دایە، دەگەڵ «عەلی ئۆف» ناوێکی ئازەری - کە دیلمانجم بوو- لە واگۆنێک دایــن. تاو هەڵات گەیشتینە ئێزگەی لینینگراد. زۆر لە نووسەرانی ئەوێ هاتوونە پێشوازی شاعیری کورد! یەکێک هاتە دەرکی واگۆن:
- کوا چەمەدانت؟
ساکە ڕەشم دا دەستی. لە فلقەی پێکەنینی دا و یەکی‌تر لێی وەرگرت. هەر فلق و هۆڕ بوو!
- خەبەر چییە؟
عەلی‌ئۆف گوتی: تۆ ساکی خانمانت هێناوە!
دوکتور کەریم ئەییووبی پەیدا بوو. گوتم: بگەیە، وەریگرە و بیبەوە بۆ خانمەکەت تا ئابڕوومان بە یەکجاری نەچووە!
سێ ڕۆژ لە لینینگراد بووم. پێش نیوەڕۆیەک لە مووزەی ئەرمیتاژم ڕابوارد، کە بە ڕاستی مانگێکی دەوێ تا هەمووی بە باشی ببینی. بە سەدان تابلۆی وای تێدایە کە سەرت لە کاری خودا سوڕ دەمێنێ. لە ناو ئەوانەدا، تابلۆیەک یووسفی نەججاری زڕباوکی مەسیح دارتاشی دەکا، مەسیحی دە-دوازدە ساڵە شەمێکی بۆ ڕاگرتووە. ئەو دڵپاکی و خۆشەویستییە کە لە ڕووی مەسیح نیشاندراوە، وەک بزمار دایکوتام. چەند جار بە جێم دەهێشت و دەگەڕامەوە و سەیرم دەکرد. گوتیان ئەم کۆشکە چوارسەد وەتاغی تێدایە. هەموو لێواری بانەکانی بە دەیان هەیکەلی لە سەر چەقابوون. بیرم دەکردەوە پادشایەک بە خۆی و ژنی و کوڕێکەوە، ئەو هەموو خانووبەرەی بۆچی بووە؟!
چوومە مزگەوتی لینینگراد. مزگەوتێکی زۆر جوان و خۆش و فرەوانە. پڕە لە مافوورەی جوان. مەلایەکی ملئەستوور- دەتگوت تەگەی دابەستەیە!- بە پیرمەوە هات و لە بەر خۆیەوە بە عارەبی مەلایانە دەیگوت: «شوکور بۆ خوا نوێژ کردن ئازادە!». بە عەلیۆفی تەرجمانم گوت: وا دیارە نوێژ کردن لێرە ئازاد نییە؛ چونکە مەلای ئێمە ئەم قسانە نازانن. فێر کراوە بۆ میوانانی لاوەکی ئەمە بڵێ. عەلیۆف گوتی: «لام وایە ڕاستی بۆ چووی!».
قورعانێکی یەک پەڕیم دیت. مەلاکە ناوی عەبدولباری بوو، گوتی: ئەوە دیاری جەمیل ڕۆژبەیانییە؛ سەلامی لێ بکە! تۆش کە چوویتەوە بەغدا ناوم لە مەجەللەی ئادابی ئیسلامیدا بنووسە!
لە پاش گەڕانەوەم بۆ بەغدا، لە ماڵی مەلامستەفا، مامۆستا مەلاجەمیل ڕۆژبەیانیم دیت. گوتی: چوویە مزگەوتی لینینگراد؟ مەلا عەبدولباریت دیت؟ چۆنە؟ گوتم: مامۆستا باسی ئەو بێناموسە مەکە! دەیگوت مامۆ مەلا جەمیلم گاوە! گوتی: هەتیو تۆ بۆ لێرە قسەی وا دەکەی؟ مەگەر من ئەوم گابێ! بارزانی زۆر پێکەنی.
ئەوی سەرنجی ڕاکێشام، لە دەرکی ئاودەستەکان بە تورکی و بە خەتی عەرەبی نووسرابوو: «ژنانە- پیاوانە». نەمزانی بۆ ناکرێ ئاودەست بە ڕووسی بنووسرێ؟ کام زیانی هەیە؟!
چوومە دیدەنی کلیسای «یاکوبسکی گورود» کە گۆیەکی تێدا دێ و دەچێ، حەرەکەتی زەمینت نیشان دەدا. چوومە دیدەنی خانووی پووشکین؛ ئەڵمانی ناشیرینیان کردبوو. زۆر جێگەی جوانی‌ترم دیتن کە ئەڵمانان خراپیان کردبوون. ئەڵمانم وەک عەرەبان هاتە بەر چاو کە دژی جوانی و هونەرن...

چوومە ئۆپێرای حەوت پەیکەری شاعیر «نیزامی» کە مۆسیقاری گەورەی ئازەری «قەرە قەرەیۆف» کردوویەتە ئۆپێرا. رووس بۆ گوێ گرتن لە مووزیکی بەنرخ وەک سۆفیلکەی ئێمە بۆ قورعان بیستن وان. بە سرتە ویستم شتێک لە عەلی‌یۆف پرسم، لە دە جێوە پتر «وشت، وشت»یان کرد. یانی با گوێمان لێ بێ، قسە مەکە!

چوومە بنکەی رۆژهەلاتناسی، بەشی کوردی لە لینینگراد. «ئوربێلی» ئەو پیاوە گەورە و بەرێزەی ئەرمەنی کە بە فەرمانی ئەو، خرۆشۆف ئیجازەی کردنەوەی ئەو ئامۆژگایەی دابوو؛ دەرسی کوردی لێ دەخوێندرا و کتێبی کوردی چاپ دەکرد؛ بە زیارەتی سەرفراز بووم. خۆ نەخوازا کە بیستی من مەم‌وزینم وەرگێراوەتە سەر سۆرانی، هەر تەواو کەیفی هات.

ئۆربێلی لە زانا هەرە بەناوبانگەکانی رۆژهەلاتناسی شۆرەوی بوو؛ بە دڵ و گیان عاشقی ئەحمەدی خانی و نیزامی گەنجەوی. دەیانگوت لە رۆژێکدا ئۆربێلی ویستوویە دەربارەی نیزامی قسە بکا، کە بۆمبارانی شار کراوە. بۆمبای ئەلمانان دە سالۆنەکە کەوتووە و بانەکە لایەکی رووخاوە. دانیشتووان ویستوویانە هەڵێن، گوتوویە: باسی نیزامیتان بۆ دەکەم؛ پیاو دەبێ شەرم لە نیزامی بکا. ئێوە چۆنی بە جێ دێڵن؟! هەموو گەراونەوە جێی خۆیان.

قەناتی کوردیۆف یەکێک لە مامۆستایانی ئامۆژگاکە بوو کە زۆر شاگردی کوردی‌خوێن و کوردنەژادی پێگەیاندوون. خانم سێدا رۆدینکۆ -کە مەم‌وزین و بەیتی شێخی سەنعان و چەند کتێبی‌تری بە شەرحی رووسیەوە لە چاپ داوە- لەوێ بوو؛ دەگەڵیا بوومە ئاشنا. ئەو خانمە لە دایکێکی ئەرمەنی و باوکێکی گورجی بوو. کرمانجی وەک خەڵکی بۆتان و فارسی زۆر باش دەزانی. خوایشتی کرد چەند رۆژێک بمێنم، دیوانی شێخ سەنعانەکەی دەگەڵ وە خوێنم کە خەتە مەلایانە زۆر ناخۆشەکەی بۆ ساغ نەدەبۆوە. نەمدەتوانی بمێنم. قەرارمان دا لە مۆسکۆرا دەعوەتی لێ بکەم کە ئیجازە وەرگرێ و لە مۆسکۆ دەگەڵی بخوێنمەوە. دوکتور کەریم ئەییووبیش هەر لەو ئامۆژگایە زمانشناسی خوێندووە. ژنەکەشی «ئیرا» فارسی دەزانی.

چوومەوە مۆسکۆ. رۆژێک ڤۆلۆشین -کە باسم کرد- هاتە لام کە پرسیارم لێ بکا؛ سەلماسی تەرجمانمان بوو.

پرسی: رادیۆ یەریوان بە کوردی، لە کوردستان نرخی چۆنە؟

گوتم: راستت دەوێ تەنیا کەسیک هەیە لە هەموو کوردستان کە تێی بگا. ئەویش ئێستا لەوێ نەماوە. ئەو کەسەش منم!

پرسیاری کرد: ئایا لە خاوەن زاراوەکانی کوردستان کامیان بەشی زۆرن؟

گوتم: کرمانج، پاشان سۆران.

گوتی: نا، یەکی‌تر لە هەمووان پترە!

– جەناب من باشتری دەزانم.

– نەخێر نایزانی!

هەر دەستی بە ناوچاوانیەوە دەگرت و لە پر لە رانی خۆی دەدا و فیتەیەکی دەکێشا:

– ئەی! بۆ وە بیرم نایەتەوە؟!

گوتم: دەزانم تۆ مەنزوورت زازایە.

– ئەرێ دیتتەوە، راست دەکەی!

– کاکی خۆم! بە داخەوە بە هەڵەیان بردووی. زازا کۆمەڵێکی کەمن. عیراقی بە هەرچی

سۆرانی نەبێ دەڵێن بادینی، یان زازۆکی، یان زازا.
من پرسیارم لەو کرد:
- ڕۆژنامەی حیزبی شیووعی عیراق چاپخانەی ئێوەیە، پووڵی دەدەنێ. ڕۆژنامەی «خەبات» (ڕۆژنامەی پارتی) هەر بە خۆڕایی هەموو ڕۆژ دوو ئەوەندەی شیووعیەکان لە سەر ئێوە و لە سەر چینی کومۆنیست دەنووسێ و پێتان هەڵدەڵێ. هەموو ڕادیۆ مۆسکۆ لە «اتحادالشعب» نەقڵ دەکا، بۆچی قەت باسی خەبات ناکەن؟
بە مۆنێکەوە لێی ڕوانیم:
- خەبات؟ ئیبراخیم ئەخمێت؟! نووری ئەخمیت تەخا؟!
پشتەدەستی ڕادەوەشاند؛ یانی هەر باسی مەکە!
دانیشتم عەریزەیەکی زۆر بە ئاب و تابم بۆ لێژنەی مەرکەزی لە کرملین نووسی، بە هەزار و یەک دەلیل ئیسباتم کردبوو کە ئەگەر ڕادیۆ مۆسکۆ بەرنامەی کوردی هەبێ چەند باشە و چەند بە قازانجی شۆرەوی تەواو دەبێ. ئەمجار هەر کوردێکی دەرەوە هاتبا مۆسکۆ، دەگەیمە سەری و داوانامەیەکم پێ دەنووسی و بە تەرجەمەکراوی دەمنارد، بەڵکو بەختە کوێت بیگرێ و مۆسکۆ بە کوردی بەرنامەی هەبێ؛ بەڵام کەس گووی بە کلاومان نەپێوا...
دوو کەس هاتنە لام گوتیان: لە ئەنساکلۆپیدیای شۆرەویدا ناوی هەژار وەک شاعیری کورد و ناوی جگەرخوون چاپ کراوە. لە گۆرانیشمان پرسیوە کە جگە لە خۆی کێ هەیە لە چاپی تازە دا -کە هەر بە دە ساڵ جارێک چاپی تازە دەکرێتەوە- بنووسرێ؟ گوتوویە: هەر من هەم!
گوتم: ڕەنگە تێتان نەگەیشتبێ؛ دەنا ئەو دەزانێ زۆر کەسی وامان هەیە. نەخوازە نەماوەکان وەک خانی و جزیری و نالی و مەولەوی و زۆریتریش کە دەبوایە ڕووپەڕی ئەنساکلۆپێدیان داگیر کردبا. من بۆتان دەنووسم. گوتیان زۆرمان پێ خۆشە. وادەمان دانا. وێکەوتم ناوی حەفتاویەک شاعیر و نووسەری کوردم ڕیز کرد و دامنێ. دوای چەند ڕۆژ هاتنەوە لام. گوتیان: دوکتور کەریم ئەییووبی دەڵێ ئەوانە مەعلووم نییە ڕاست بن، دەلیلی دەوێ!
- بەڵێ ڕاست دەکا! لە مۆسکۆ دەلیلی چی بێنمەوە؟! «دار، هۆڕەی لە خۆی نەبێ، ناقەڵشێ»! ئەویش چوو...
کەریم ئەییووبی تێزی دوکتورای لە سەر «شاعیر هەژار» وەرگرت. دیار بوو دەبوایە لە شیعرەکانم شایەت وەرگرێ. ڕۆژێک لە ئاسایشگا نامەیەکم بۆ هات، دەڵێ: برا «پەڕووعە» بە چی دەڵێن؟ ئەوە کوردی کوێیە؟ نووسیم: نازانم. تۆ شیعرێکم بۆ بنووسە کە ئەمەی تێدایە. بەیتەکە ئەمە بوو: «تووتن و پەڕ و عەتر و بۆن». نووسیم: برا تۆ مانای «تڕ و بۆن» لێدەوە، ئەو دەم پەڕووعە ڕوون دەبێتەوە!
کەریم ئەییووبی بردمیە ئامۆژگای عەرەبی لە مۆسکۆ، گوتی: دەبێ لەوێ بە عارەبی قسە بکەی، من وام گوتووە، خەجاڵەتم مەکە! مامۆستای هەرە گەورەی دەرسی عەرەبی «سولتانۆف» ناوێک بوو. دەستی ناوە دەستمەوە و «ئەخلەن وە سەخلەن» بە خێری هێنام. بۆ خاتری کەریم بە عەرەبی فەسیحی قورعانی نوتقێکی دوور و درێژم کرد. هەموو مامۆستا و شاگردەکان سەر دەجووڵێنن. پاش ماندوو بوون بەسم کرد. تێریان لە چەپڵە دا. ئەو جار بە کەریمیان گوت: تکایە بۆمان بە ڕووسی تەرجەمە کە، چونکە هیچی تێنەگەیشتین! کەریم دەڵێ: جا منیش لە عەرەبی نەگەیشتووم! ناچار لە سەرڕا من بە کوردی و ئەو بە ڕووسی ملمان

له چەقەچەق نایەوە!

چوومە مووزەی پیتری گەورە. کۆتەڵی پیتری گەورەم لە جوانترین شوێن، لە سەر لێواری چەمی «نیوا» دیت. لە چەند جێ کۆتەڵی مەلەکە کاترینم دی کە زۆر بە حورمەت بە یادگار ماون. شیووعی خۆمانم دەهاتنە بەر چاو کە کێلی قەبری پیاوە گەورەکانی کوردیان دەشکاند...

**تەرزی ژیان**

ڕەنگە بە هەزاران کتێب و مەقالە لە سەر ژیان لە شۆڕەویدا نووسرابێ؛ کە نووسەرەکانیان پەیامنێری ڕۆژنامە جیهانیەکانی موحتەبەر، یان زانا و دوڕناسی بەناوبانگ بوون. لێرەدا من -کە وەک لە بەسەرهاتی پێشووم تێگەیشتووی- لە لێکدانەوە و زانینی مارکسیسمدا وەک کوێر و کەڕی ناو زەماوەندم؛ تۆ چەند لە گۆرانی و شیعری ژاپۆنی دەگەی، منیش لەو بارە وام و کۆڵیتریش. بەلام من وەک دیومە باسی دەکەم و ئەگەر خوار و خێچیشت تێدا دیت، بە لێنەزانییەکەمی ببەخشە! من چیرۆکی خۆم دەنووسم؛ نە شی کردنەوەی مارکسیسم.

چۆن لە عیراق و ئێران -مەسەلەن- ئۆتۆبۆسی ناو شاران مالی دەولەتە و پوولی بلیت بە دەولەت دەگا و شوفێر و کارکەران سەری مانگ حقووق لە دەولەت وەردەگرن، لە شۆڕەوی هەموو شت کراوەتە مالی دەولەت. بەهرەی کاری هەموو کەس بە دەولەت دەگا و هەموو کەس حقووق لە دەولەت وەردەگرێ؛ هەر کەس بە پێی کاری خۆی. هەیە مانگێ پێنسەد ڕووبل، هەیشە مانگێ خوا دەزانێ چەند وەردەگرێ. واتا لە ٥٠ دۆلارەوە تا نازانم چەند. کارم بەوە نییە کە زانایانی ئاتۆم و پایەبەرزەکانی عیلمی چیان دەدرایە؛ بەلام نووسەری وا هەبوو سالێ ملیۆنێک ڕووبلی داهات بوو. چونکە جگە لەو پوولەی دەولەت بۆ هەقی نووسینەکەی دەدا، نووسراوەکەی چەند جار لە چاپ بدرایەتەوە، نیوەی بۆ ئەو بوو. کەوا بوو ئەگەر تەبەقەی دەولەمەندی زەمانی نیکۆلا لە ناو چووبوو، تەبەقەیێکی‌تر بە داهاتی زۆرەوە پەیدا ببوو. بەلام فەرقەکە لێرەدا بوو کەس هەر چەندی پوولی هەبا، نەیدەتوانی خەلکی دی بخاتە بەر کار و خۆی بە تەنبەلی بە سەریان ڕابگا. کابرای کە زۆری پوول پێ دەگەیشت هەر دەیتوانی ئەسپابی ناومالی زۆر بەنرخ بکڕێ؛ خۆش بخوا و خۆش ڕابوێرێ. دەولەت کە خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، نرخی هەموو شتی دیار کردووە. کارێک کراوە کە هەر پوولێکی دەگەڕ دایە، ڕاست بڕژێتەوە ناو داخلەی دەولەت. نرخی شتی زۆر پێداویستی ژیان، وەک نان و پێخۆرێ کە لە مال دروست بکرێ، هەرزان و شتی زۆر ناپێداویست و دەولەمەندانە، لەو پەڕی گرانیدا بوو. ماشینی مۆسکۆویچ -کە لە بەغدا بە شازدە هەزار ڕووبل دەفرۆشرا- بۆ خەلکی ناوخۆ پەنجا هەزار بوو. کاری بێ ماندوو بوون هەرزان و کاری گران، گران قیمەت بوو. بژیشک حەوت سەد و پەنجا، موهەندیسی وەرزێری [کشتوکال] هەزار و سەد، کارگەری کارامەی کارخانە دوو هەزار و سێسەدی وەردەگرت. کاری شاعیر و نووسەر و هونەرمەند و هونەرپیشەی تئاتر و سینەما، لە کارە زۆر بەنرخەکان بوو. وەک دەیانگوت: ئەندامانی حیزب لە خەلکی ڕەمەکی زۆر خۆشتر دەژین. تەنانەت جۆکێک هەبوو کە لە قەتاردا دوکتورێکی هاوڕێمان گێڕایەوە:

«پۆلیس شەو بە کۆلان و خەیاباندا دەگەڕان، هەر سەرخۆشێک تووش بوونایە، دەیاناردە گرتووخانە تا بەیانی. چەند کەسێکیان گرت و ناردیان. چوونە سەر یەکێکی کە لە بەفردا درێژ ببوو. ئەفسەر بۆنی بە دەمیەوە کرد و گوتی: ڕەفیق بە تاکسی بەرنەوە مالی؛ چونکە بۆنی

کۆنیاکی گرانی لێ دەهات!».

ڕادیۆی چند مەوج بە دوو هەزار و پێنج سەد تا سێ هەزار بوو؛ یانی کرێی چوار مانگی بژیشکێک. ڕادیۆی یەک مەوج هەبوو -کە هەر مۆسکۆی دەگرت- بە بیست و پێنج رووبڵ؛ کە دەیکردە هەقی بوتلێک ودکا، یان دوازدە ئیستیکان چای لە چاخانە. ئەو خەڵکە کە لە دە هەزاری یەکێکی زمانی لاوەکی نازانێ، کاری بەو ڕادیۆە هەرزانە پێک دەهات.

خوا هەڵناگرێ دزیش لە دەوڵەت و میللەت دەکرا. بۆ نموونە: خەیاتە، بۆی دیاری کراوە دەستێ جل بە دووسەد رووبڵ بدروێ. مشتەری کە دەچوو، دەفتەرێکی زەلامی لێک دەکردەوە:

- ناوت؟ ئەندازەت؟ فلانت؟... باشە پاش حەوت مانگ وەرەوە!

- کاکە ئەوە زستانە، سەرمامە، چۆن حەو مانگیتر؟!

- ببەخشە، هەموو شت بە نۆرەی خۆی. ئەوەندەت خەڵک لە پێشەوەیە.

- دایکت چاک، بابت چاک، فکرێک، چارەیەک. وەک تۆ دەڵێی «قەل گووم ناگەیەننە بەهار!».

- ها! لەبەر خاتری تۆ دەبێ لەماڵەوە بۆت بدرووم؛ بەلام دەبێ هەشسەد رووبڵ بدەی!

خۆ ئەگەر نەشتدابا و حەوت مانگەش ڕاوەستابای، جلکێکی بۆ دەدرووی لە تاژی کەن بتۆرێ!

سەدان تەلەویزیۆن لە مغازەیێکە، نرخیان لە سەر نووسراوە، بەلام دیسان دەفتەرەبۆر هەیە:

- هەر وەخت نۆرەت هات، چونکە ئەوانە هەموو گیراونەوە.

- ئەدی ئەگەر زیاترت بدەمێ؟

- باشە یەکێکیان هەڵگرە، خاوەنەکەی ڕازی دەکەم!

لای دەلاکێک سەرم تاشی، شەش رووبڵی ساند. سەلماسی پرسی:

- ئۆدکلۆنیان لێ دای؟

- بەلێ.

- نرخی دوو رووبڵە. بەلام چوارەکە حەقی ئۆدکلۆنەکەیە کە بۆ خۆی بردووە!

لە ماشینێکی تایبەتی وەزارەتی لەشساغیدا چوومە وەزارەت. لە خەیابانی گۆرکی پۆلیس ڕایگرت. شۆفێر دابەزی و سرتەیێکی کرد، هاتەوە. سەلماسی پرسی:

- چەندی لێ ئەستاندی؟

- پێم گوت میوانی لاوەکیم پێیە، دوایە پێنج رووبڵت دەدەمێ! هیچ موخالەفەشم نەبوو؛ بەلام ناوی نووسیبام چەند ڕۆژێک لە کار دەکەوتم.

جارێک خاوەن تاکسیەک گوتی: پۆلیس تەشقەڵە بە هەموو تاکسیەک دەکەن. لە ڕێدا ئەم پرس و وەرامە لە نێوان شۆفێر و سەلماسیدا ڕابرد:

- حقووقت؟

- چوار سەد رووبڵ.

- جا چۆن پێی دەژی؟

- پیاوی پووڵدار نەبێ سواری تاکسی نابێ. حیسابی تاکسیش لە سەر میتراژە. پێم دەڵێن لە سەرمان ڕاوەستە، نیو سەعات، سەعاتێک. ئەوسا بەخششێکی باشم دەدەنێ.

- ئەگەر تاکسیەکەت شتێکی شکا چ دەکەی؟

- دەچم لە ئیدارە دەینووسم، نمرە و تاریخێکم دەدەنێ. ئەو جار خۆم دەچم چاکی دەکەمەوە لە سەر حیسابی خۆم؛ چونکە لەوانەیە لە ئیدارەکە دوو مانگ مەحتەلم کەن. ئەوان بۆ خۆیان پووڵی چا کردنەوەکەی لە سەر دەوڵەت حیساب دەکەن و دەیخۆن؛ منیش کارم پەکی ناکەوێ.

بەڵام هەر چەند دزی بکرێ لە دارایی دەوڵەت زیانێک ناکەوێ؛ چونکە هەمووی هەر دێتەوە گیرفانی خۆی. ئەگەر ملیۆن رووبلت هەبێ، لە دەرەوەی رووسیا بە فلسێک ناچێ. لە ماڵەوەی دانێی، لەوانەیە لێت بدزن؛ لە بانکی دادەنێی، لە ژێر چاوەدێری دەوڵەت دای: «بۆچی خەرجی ناکەی؟ مەنزوورت چییە رایدەگری؟...»؛ لێت دەبێتە بەلا و ناچاری خەرجی کەی، شتی لووکسی پێ بکڕی. ئەویش وا گران کراوە وەک مار پێتەوە دەدا. دەبێتە ئاگر پوولە زیادیەکەت دەسووتێنێ.

لە ڕستووران تا سەعات یازدە و نیو کرێکاران جەمێکیان بە دوازدە رووبڵ دەخوارد. هەر ئەو ڕستوورانە لە نیوەڕۆوە موزیکالی دەهاتنێ، جەمێک خۆی لە سەد و دووسەد رووبڵ دەدا. جەمی ئەعیانانە زۆری پێ دەویست. ئەگەر کەرستەت بکڕیبا و لە ماڵ لێت نابا، زۆر هەرزان دەکەوت.

لە شۆڕەوی کەسێ کارێ دەوڵەتی نەکردبا، بە زۆر نەدەخرا بەر کار؛ بەڵام حقووق نەبوو. وەستای تەلەفۆن و تەلەویزیۆن و ڕادیۆ چاکردنەوە هەبوون کە ئازاد بوون و لە ماڵان کاریان بۆ پەیدا دەبوو. ژن هەبوون، دەبوونە کارەکەری ماڵان، بەڵام دەبوایە وەک کرێکاری دەوڵەت ڕۆژێ هەشت سەعات کار، هەفتەی دوو ڕۆژ وچان، ساڵێ مانگێک مەرەخەسی بە حقووقەوە وەرگرن. سەلماسی کلفەتێکی وای هەبوو کە وەک فیرعەون حوکمی دەکرد. شەوێک لە دانشگای گردی لێنین چووبووینە دەعوەتی خوێندکاران. مەشرووب هەبوو، نان نەدرا. سەعات دوازدە هاتینە دەر، زۆرم برسیبوو؛ گوتم: سەلماسی تازە نان دەس ناکەوێ. دێمەوە ماڵە ئێوە نان دەخۆم و هەر لەوێش دەنووم.

- جێگەی خەومان نییە.

- کاکە دەچم لە ژووری کلفەتەکە دەخەوم؛ لێم روونە دەرمناکا.

گوتی: نایەڵم بێی، دەتبەمەوە ئوتێل.

بەیانی ئەو ڕۆژە هات:

- کاکە چم لێ دەکەی؟!

- خێرە؟

- کوڕە غەلەتێکم کرد، بۆ کلفەتەکەم گێڕاوە کە تۆ چت گوت. ئەوا لێم بە قین داچووە؛ دەڵێ: پیاوێک حورمەتی منی لە بەر بووە تۆ نەتهێشتووە بێ؛ هەر ئێستە دەڕۆم!

- مستەفا گیان هاسانە، بمبە بۆت ئاشت دەکەمەوە!

- ها! لە بەغدا بڵێی گەوادیم پێ کردووە؟! نایەڵم!

سێ کاری زۆر گرینگ لە رووسیا پێک هاتووە: بیمەی هەموانی، کار بۆ هەموو داخوازی کارێک، خوێندن بۆ هەموو منداڵێک؛ کە ئەم سێ شتە بێ‌خەمن. مەسەلەی مەسکەنیش لە ڕێگەی حەل کردندا بوو. قەرار وا بوو تا ساڵی هەزار و نۆ سەد و حەفتا ئەو گیروگرفتەش نەمێنێ. چوومە سەیری خانوو کردن: لادیوارێک لە قالب دراو دەگەڵ سێ لادیوار و سەربانی ساز، لێک دەدرا و هەر هێندەی بڵێی یەک و دوو دەبوو بە وەتاغێک. دەیانگوت وا هەیە

نهۆمێک له زەوین لێک دەدەن و دەیبەنە سەر نهۆمێک؛ کە من ئەوەم نەدیت. خانوو زۆر گەورەن. هی وایە جێگەی سەدان ماڵە. ئاسانسۆر هەیە؛ تەلەفۆن بۆ چەند ماڵێک هەیە؛ گاز لوولەکێشی کراوە. دەوڵەت لە سەدی شتێکی کەم لە حقووق دەبڕێ، وە بەری دەخا. ماڵەکان چکۆلەن؛ لە وەتاغێک و ئاشپەزخانەیەکەوە تا سێ وەتاغ هەیە؛ بێ ساڵۆن. چەند ماڵ لە کۆریدۆرێک دان؛ درگایان بەرانبەری یەکە. کابرا دەبێ هەمیشە درگا پێوەدا، ئەگەر نەیەوێ ژووری ماڵی ببینن. کە ئەمە ڕەنگە بۆ خەڵکی دەرەوەی خاوەنماڵ زۆر ناخۆش بێ. بەڵام لەوێ ئەگەر ئەمە دەست کەوێ نیعمەتە.

لە سەرمای زۆر سەختدا و لە گەرمادا، بازاڕ و میترۆ و ئوتێل لە مەرکەزەوە گەرم و فێنک دەکرێنەوە. ڕووس بە گشتی و مەسکەوی و لینینگرادی زۆر تەرپۆشن و جلکی جوانیان زۆر حەز لێیە. هەرچی دەستیان کەوێ لە پۆشاکی جوانی خەرج دەکەن. سینەما و تیئاتر مایەی سەرگەرمی هەموانیە. نەخوازا بالشۆی تئاتر کەسێک بە دوو مانگیش بلیتی دەس کەوێ، شانازی بە بەختی دەکا. چوومە بالشۆی تئاتر، بالیەی «پشت کووری نۆتردام» بوو.

خوێندنەوە یەکجار بەرمێنە؛ زۆریش هەرزان دەست دەکەوێ. تیراژ هەرچەند بێ، کتێب زۆر زوو لە بازاڕ نامێنێ. شەوێک لە بەر دەرکی تئاترێک کتێبێکم دیت: (چەند چیرۆکی کوردان)، سەلماسی نەیهێشت بیکرم: «لە پاشان دەیکرین...».هاتینە دەر نەمابوو. گرۆم گرت هەر دەبێ پەیدای کەی. زۆر شوێنان گەڕابوو دەستی نەکەوتبوو. بە ڕۆژێک خەلاس ببوو.

بە تێکڕایی خەڵکی شار دەگەڵ خەڵکی لادێ زۆریان فەرق هەبوو. خەڵکی لادێ جلشڕ و پێخواسی زۆریان هەبوو. بەڵام ئەوی ڕاست بێ خانووی دێنشینەکان -کە لە دار کراوە و لە ناو باغچەدا هەڵکەوتوون- بە چێژەی من زۆر لە خانووی شارستانییەکان خۆشتر بوو. دەمگوت: ئەگەر ماڵم لە ڕووسیە با، لە خانووی لادێدا دەژیام و کاری شارستانم دەکرد!

ئازادی قەڵەم و بیر و ڕای تاکەکەسی دەربڕین وەک وڵاتانی عەرەبی و میسر و ئێرانە، کەس ناتوانێ ڕەخنە لە دەوڵەت بگرێ. خەڵکەکەش زۆر ساڵە فێری بوون و پێیەوە گەورە بوون، گوێ نادەنە ئازادی فەردی، هەیە یان نییە.

بۆ جحێڵان -کوڕ و کچ- ئەوپەڕی خۆشییە؛ بەو شەرتە نان و بەرگیان دابین بێ. من دیتوومە کچ پێش بە کوڕێک بگرێ و لە نێو هەوالان و خەڵکدا بڵێ: «تۆم پێ جوانە، وەرە با پێکەوە بگەڕێین»، کە هیچ بە عەیب حیساب نەکراوە. لاوێک بە هەر ژنێک بڵێ: تۆم خۆش دەوێ و دەعوەتی بکا، ئیتر پێی نالێ: «دە دمی بابت ڕیم!» ئەگەر نەیەوێ بە پێکەنینەوە دەڵێ: «من کارم هەیە، ناتوانم، ببەخشە!».

جگە لە سیاسەتمەداران و هێندێکی کەم لە ڕەشایی گەل، هەموو زۆر لە دنیای لاوە بێخەبەرن؛ لایان وایە ژیان هەر لە شۆرەوی دایە و خەڵکی وڵاتی سەرمایەداری، یان لەو خاوەن کارخانانەن کە بە هەزاران کارگەر وە بەر قامچی دەدەن و لەسەر کەمترین بیانوو دەیانکوژن، یان کرێکارە بەر قامچییەکەیە؛ ناونجی تێدا نییە. لە منیان دەپرسی: تۆ کرێکاری؟

- نەخێر دوکانی خۆم هەیە.
- چەند هەزار کرێکارت دە بەردەستدایە؟!
- هیچ، هەر تەنیام.
- باوەڕ ناکەم! دەی چەند پەیدا دەکەی؟

- ڕۆژێ هەقی پیاوێکی کولبەر.
- ئای لەو قسە درۆیە!

ڕۆژێک لە باغچەی ئاسایشگا، ژنێک -کە بژیشکی مندالان بوو- پری بە چنگێ گیادا کرد، پرسی: لە عیراق شتی وا هەیە؟!

- نەخێر! لەوێ ڕژیم سەرمایەدارییە؛ گیا شین نابێ!
- ڕاست ئێمە لە بەهەشتاین، ئەو هەموو گیایەی دەبینی!

فەتحی گوتی: بۆ درۆی دەگەڵ دەکەی؟

گوتم: نامەوێ لەو خەوە خۆشەی ڕاپەڕێنم...

فەتحی گوتی: یەکێ لەو ئەفسەرانەی ئێرانی کە لە قەلعەمورغییەوە ڕفێنرابوون، بۆی گێرامەوە: کە هاتینەوە مۆسکۆ، هەر یەکەی دەگەڵ شارەزایەک دەگەڕاین. شارەزاکەم گوتی: شتێکم هەیە دوگمەی بادە، گوێت لە تاران و زۆر شوێنان دەبێ؛ دەسکاری شۆڕەوییە. وەرە نیشانت دەم.

بردمیەوە ماڵ، پێچی ڕادیۆی با دا، دەنگ نەهات. لە خەجالەتیان مات بوو: دیارە باوەڕم پێ ناکەی! کۆتەکەم داکەند، گوتم: جەڕبادەرێکم بۆ بێنە! ڕادیۆم بۆ چاک کردەوە. گوتم: من وەستای ئەو شتانەم!

نومایشگایەکی سەنعەتی ئەمریکا هاتە مۆسکۆ، زۆر کەس لە ئاسایشگاوە چوون. دەیانگوت: زۆر سەیرە، خۆ ئەمریکاش دەتوانێ هیلیکۆپتەر دروس کا!

ڕۆژێ کە هەوەڵ مانگی دەسکردی شۆڕەوی لە سەر مانگی عاسمان نیشتەوە، بە دوکتورێکی ئەرمەنیم گوت: بە ڕاستی مایەی شانازییە. گوتی: ڕاستە؛ بەڵام بریا لە جیاتی ئەوە کارخانەیەکی سرونجی باشیان بۆ دروست بکردینایە!

لە مارکسیسمدا کە دین هیچ جێگای نییە، پێم سەیر بوو کە لە شۆڕەوی دینێکی سەربەخۆ پەیدا بووە؛ ئەویش بە پیرۆز زانینی لێنینە. لاشەکەی دە نێو قەبرە شووشەکەیدا مۆمیایی کراوە و ماوە و بۆتە جێگە زیارەتی هەموو کەس. لە زستان و هاویندا، هەمیشە بچۆ، بە درێژایی کیلۆمیترێک خەڵکە بۆ نۆرە زیارەت ڕاوەستاوە. دوو-دوو دەچنە ژوور، چاویان بە لێنین دەکەوێ و لە دەرکێترەوە دەردەچن. قەت لە وڵاتی موسوڵمانان ئەوەندە ڕێز لە گۆڕی پیاوچاکان نەنراوە. کە دەرسی ڕووسی مەدرەسەی مندالانم دەخوێند، زۆر فەرمایشتی لێنینم دەهاتە بەر کە زۆر ساڵ بوو لەبەرم بوو؛ حەدیسی پێغەمبەر کرابووە وتەی لێنین!

ڕۆژێک چوومە کتێبخانەی لێنین لە مۆسکۆ. لە دەرگا جزوەیەکیان دامێ، نووسرابوو جگە لە مەجەللات، بیست ملیۆن کتێبی تێدایە. ساڵۆن ساڵۆنە، هەر کەسە بە زمانێ کتێب دەخوێنێتەوە، لە ساڵۆنی تایبەتی دادەنیشێ، فیشی ناوی کتێبان و فیشی ناوی نووسەرانی کتێبان دەس بەجێ پەیدا دەکرێ. کارتێک بە شمارەی کتێب دەخەنە بەر لاقی خۆیانەوە کە کونێکە. پاش مدەیەکی زۆر کەم، شتێ وەک قەتاری چکۆلە کتێبەکە دێنێ و لێی وەرگرە. پاش خوێندنەوە، قەتارەکە دەیباتەوە شوێنی خۆی لە ناو عەنباری تایبەتیدا، کە هەرگیز مۆرانە و شە کاری تێ ناکا. ئەگەر میکرۆفیلمت لە کتێب بوێ، ئەو داوا دەکەی، زەڕەبینێت لە سەر مێزەکە لە بەر دەمە، بە درشتی نیشانت دەدا.

من چوومە بەشی فارسی، گوتم بەشی کوردیم دەوێ. لە بەشی کوردی، ژنێکی سەرسپی



وەک چۆرِی شیر، زۆر بە سەر و سیما، بەخێری هێنام. گوتی: کورد لە کتێب ناردن تەنبەڵن. کتێب لێرە تا هەتا دەمێنێ، بەڵام نانێرن. گوتم: ئاخر عەیبی خۆشتان بڵێ. زۆر کەس کتێبی کوردی دەنێرێ؛ بەڵام بە واسیتەی ئاشنایان لە شۆرەوی، ئەوان نایدەن بە کتێبخانە. بۆ نموونە من چەند کتێبم بۆ هێناوی لە مۆسکۆ بە پووڵ کریومەتەوە و خاوەنەکانیان بۆ ئێرەیان ناردووە و دزراوە. وای دانێ کتێبم بە ناوی تۆ نارد، کێ دەڵێ تۆش بەو دەردەی نابەی؟!

گوتی: دەبێ لە سەر ئەو قسەت عوزرخواییم لێ بکەی. من کوردم؛ زۆر حەز دەکەم بەشی کوردی زۆر دەوڵەمەند بێ. من ناوم زێنەب کەریم ئۆڤایە. باوکم خەڵکی شارێکی کوردستان بە ناوی سابلاغ بوو. زۆری زمان دەزانی، تاجران لەوێوە دەگەڵ خۆیان دەهێنا بۆ تەرجومانی. ئاخری لە تاتاریا دامەزرا و دایکی منی هێنا. نابێ قسەی وا دەربارەم بکرێ.

گوتم: سەد جار عوزرخواییت لێ دەکەم؛ بمبەخشە!...

سەیری خۆش ئەوە بوو، بەیتی سەرەمەڕەکەم -کە گوتم تەنیا سێ نوسخەی نەفەوتابوو- لەوێ هەبوو!

چوومە سیرکی مۆسکۆ. چوومە سینەمای «پانێراما» کە زۆرم پێ سەیر بوو؛ هەر ئەو جارەشم دیتووە. چوومە مووزەی تەبیعی، نامەیەکم بۆ فەتحی نووسی کە: «مەرحوومی کەربەلایی فەتحوڵلام زیارەت کرد!» تێگەیبوو کە مەنزوورم ئێسکلێتی قەدیمی گۆریللایە بووە!

لە سەر داوای خۆم، عەلیۆفیان ڕەگەڵ خستم، چوومە تاشکەند. ئادرێسی سابلاغیەکم پێ بوو. کارمەندێکی شەهرداریم دەگەڵ هات، زۆر گەڕاین نەماندیتەوە. لەم سەر دەچووین، کەرێک بە زین و لغاوەوە لە بەر دەرکێک بوو. گوتم: ئەوە کەری ئاخوندە! کە دەگەڕاینەوە، ئاخوندێک سواری کەرە شین ببوو. کابرا پرسی: ئەوە چۆنت زانی؟! گوتم: زەوقی مەلا دەناسم!

بە ناشوکری خودا نەبێ، لە هەموو شوێنان موسولمان و مێش و چڵک وەک برای ئاوال دوانەن و بێ یەکتر نابن! تۆ کە لە لێنینگراد و مۆسکۆ مێشێکت بۆ دەرمان دەس نەدەکەوت، لە بازاڕی تاشکەند سەد هەزارت بە قۆشەیەک بکڕیبا! مەنجەلە شۆربا و پلاو لە سەر لێوی جادە داندراون و هەرا و چەقەی فرۆشیارە و لە ناو تۆز و غوماری کامیۆن و بارەبەردا موشتەری ڕیز بوون. دەتگوت عەلاویل حیللەی شاری بەغدایە! قاوەخانە هەمووی سەکۆیان دەوراندەور هەبوو؛ بە چەکمەوە چوار مێردەکی لە سەر سەکۆ دادەنیشتن، چای سەبزیان دەخواردەوە. پیاڵەیەکی چینی پڕ لە ئاوی کوڵاو، هێندێ گەڵا چای بۆ نەدراوی بە سەرەوە؛ بە حاڵ ڕەنگی دەگۆڕا، فڕ دەکرا.

ئۆزبەکی جۆرە ترکیەک بوو زۆر کەمی تێدەگەیشتم. شەو چووینە ئۆپێرای «میرعەلی شیری نەوایی» کە زۆر دەزگایەکی جوانە. نومایشنامە و سەما و گۆرانی کیژە ئۆزبەکانم زۆر پێ خۆش بوو. بەڵام هەرا بوو: سەودای بزن و گاجووت و چەقەقەی ئەحواڵ پرسیەک بوو، وەک بازاڕی قەباکەندی!

ڕۆژی دوایی، کابرایەکی شارەزای شار لە ئیدارەی سیاحەتەوە بە ناو شاری دا گێڕاین. هەستم کرد کە دەگەینە پیرێژن میرێژنی بە ڕووبەند و چارشێوی ڕەشەوە، خۆی دەدا بەر چاوم کە نەیانبینم. گوتم: برا ئەمەی پێناوێ؛ ئەمە بەڵگەیە کە شۆرەوی بە زۆر کەس مەجبوور ناکا بەرگیان بگۆڕن.

چووینە سەمەرقەند. شارێکی کۆنم دیت، زۆربەی گەڕەکەکانی خانووی خشتی بە قوڕ سواغ

دراو بوون؛ وەک سابلاغی زەمانی منداڵیم. بەڵام چەند گەڕەکێکی تازەی کارگەرانی لە تەرزی خانووبەرەکانی مۆسکۆ لێ کرابوو؛ کە زۆر ڕێک و بەرچاو بوون. پیاوێکی زۆر خۆشیان ڕەگەڵ خستم بە ناوی «شەهیدۆف»؛ فارسی زۆر چاک دەزانی. چووینە زیارەتی قەبری «قوسەم بن عەباس» کە سەرداری ئەسحابان بووە و لەوێ شەهید کراوە. بە سەدان ژن بە منداڵەوە هاتبوون چڵدانەیان دەگرتەوە؛ نیازیان لێ دەخواست.

شەهیدۆف گوتی: بێچارە دایکم ئەوە چوار چوارشەمۆیە دێتە ئێرە و نیازی ڕەوا نابێ!

- چۆن؟

- ئەو پلەکانانەی بۆ مەرقەد دەچن، بیست و یەک پلەکانن. ئەگەر لە سەرکەوتن و دابەزیندا هەر بیست و یەک بن، نیاز ڕەوایە. لەم سەرە ژمارە بیست و یەک تەواوە، لەو سەر چونکە لە بیست و یەکەکە پێ دەنێنە سەر عەرز، حیسابیان لێ تێک دەچێ، دایکم بۆی ساغ نەبۆتەوە!

چووینە سەر قەبری تەیمووری لەنگ. گونبەزێکە، تابلۆیەکی لە بەرد هەڵقەندراوی بە سەر دەرگاوەیە. لە ساردەوی گونبەزدا گۆڕی تەیموور و بە ئەقلم دە کەس لە خزم و مامۆستای دینییەکەی (تاج‌الدین) نێژراون. بە هەنگاو دەوری گۆڕەکەم پێوا. شەهیدۆف پرسی: نیازت چییە؟

- ئەو کابرایەی بە ئاوات بوو زەمینێکی دیکەش هەبوایە ئەویشی داگیر بکردایە و بیخستایەتە سەر سەمەرقەند؛ ئێستا لە دە هەنگاو زەمیندا قیرەی لێ نایە!...

چوومە سەیری ڕەسەدخانەی «شاروخ میرزا»، کوڕی تەیموور. قەبری زانایەکی ڕووس لەو نزیکە بوو. شەهیدۆف بۆی گێڕامەوە: شاروخ لە زانست و زانایان خۆشی دەهات؛ ئەم شوێنەی بۆ ئەستێرەناسان دروست کرد. مەلایان گوتیان کوفرە و حەشامەتیان دوای خۆیان دا و تێک و مەکان درا. ئەم عالمە ڕووسە ئاسەوارناسە، لێ براوە شوێنەکە بدۆزێتەوە. هاتۆتە سەمەرقەند، بیست‌وپێنج ساڵ لەوێ نیشتەجێ بووە، سۆراغی نەکردووە. ڕۆژێک لە مەحکەمەی شەرعیدا قەباڵەیەک دەخوێندرێتەوە کە فلانە زەوی خۆراواکەی تا ڕەسەدخانەیە. دەچێ ئەو شوێنە دەکۆڵێ و پەیدای دەکاتەوە. لە سەر وەسیەتی خۆشی لە نزیکی نێژراوە. بە داخەوە ناوی زاناکەم لە بیر نەماوە؛ بەڵام ئافەریم بۆ ئەو هەموو حەوسەڵەیە لە ڕێگەی زانستدا...

لەو دەمەدا کابرایەکی شڕۆلی تۆپنەی گردەڵ پەیدا بوو، بە فارسیەکی تێکەڵاوی ڕووس و ئۆزبەکی فەرمووی: من بابایۆفم، زۆر باش لە مێژووی ئەم ڕەسەدخانەیە دەزانم. قەدەرێ چەنەی لێدا. من هیچ، شەهیدۆفیش دەنکێکی لێ تێ نەگەیشت. پوولێکمان نایە مستی و زۆر سوپاسمان کرد. چووینە دیتنی «ڕیگستان» کە دوو مزگەوت و مەدرەسەی فەقێی زەمانی تەیموور بووە؛ یەکیان ژنەکەی دروستی کردووە. شووورەوی ویستوویە پاش وێران بوون ئاوایان کاتەوە تا دنیاگەڕان بەهرەی لێ ببینن. دوو دامودەزگای زۆر جوان و بەرچاون. لەو دەمەدا وەستا و فەعلە کاریان لێ دەکرد. بە قسەی شەهیدۆف وەستا لە کشمیرەوە هێنراوە کە کاشی‌کارییەکان ساز کاتەوە و کرێکاران فێری سنعاتەکە بکا. داستانێک دەناو ئۆزبەکاندا هەیە کە: «بی‌بی خانم ڕیگستانی بنیات ناوە تا کە تەیموور لە هیندووستان گەڕایەوە پێشکەشی بکا. کار تەواو بووە. بە وەستای کوتووە: هەقت چەندە؟ گوتوویە: ماچێکم دەیە هەقم ناوێ! گوتوویە: جاریەیەکی جوانت دەدەمێ، قبووڵی نەکردووە. خانم ماچێکی لە لاڕوومەتی داوەتێ. جێ ماچ بووە بە خاڵێکی ڕەش و پان و زۆر جوان. وەستا لە ترسی ئەوە کە تەیموور پێ

بزانێتەوە، چۆتە سەربان و لە شەقەی بالانی داوە و فڕیوە؛ کەس نازانێ بۆ کوێ!».

شەهیدۆف گوتی: پەیامنێرێکی ئەمریکایی هاتبووە سەیری ڕێگستان. کاتێ گوتم: بی‌بی خانم، نامیلکەیەکی لێک کردەوە گوتی: دی‌دی خانم نووسراوە، تۆ دەڵێی بیبی خانم! هەرچی کردم ئەو هەر باوەڕی بە من نەکرد!

چوومە بوخارا، ئەویش وەک سەمەرقەند لە شارە هەرە کۆنەکان و هەر وەک خۆی مابوو. جگە لە گەڕەکی کارگەران، بازاڕی قەیسەری تاریک و تنووک، بە ڕۆژ دەبوو چرا لە دوکانانـدا هەڵکەن. ئەوەندەی مزگەوت و منارە لێیە، پیاو خەیاڵ دەکا کە هەر بە دە ماڵ مزگەوتێکیان هەبووە. کۆڵان سەنگ‌فەڕش و تەنگ و بە تەقەتەق. زۆربەی مزگەوتەکان کرابوونە ماڵی ڕەش و ڕووتان. هەر حوجرەیەکی فەقێ ماڵێک و پانایی مزگەوتیش بۆ چەند ماڵ تیغەی قوڕ و دار کرابوو.

کاتێ کە تازە چووبوومە ڕووسیا، لەشی ستالین دەگەڵ لینین بە مۆمیایی‌کراوی داندرابوو؛ بەڵام لە دواییدا -زەمانی خرۆشۆف- لاشەکەیان نازانم چ لێ کردبوو؛ کۆتەڵەکانیشی لە مەیدانی هەموو شاران لابرابوو. لە مزگەوتێکی بوخارادا، کۆتەڵێکی مەڕمەڕی ستالینم دیت بە دیواری مزگەوتەوە هەڵپەسێرابوو. گوتم: «سەگ و مزگەوت؟!».

شارەزامان لە لایەن شەهرەدارەوە پیاوێک بە ناوی «شاهیدۆف» سەرپەرستی کتێبخانەی شار بوو. فارسی باش دەزانی؛ تا ئەندازەیەکیش کوردی سولەیمانیانە فێر ببوو. دەیگوت: زۆرم گوێ لە ڕادیۆ کوردی بەغدا گرتووە و لە خۆمەوە فێر بووم. لە مزگەوتێکیشدا جحێلان بیلیاردیان دەکرد! گوتیان مەدرەسەی دینی بە عارەبی لە مزگەوتی میرعەرەب هەیە؛ بیبینە. چێشتەنگاوێک دەگەڵ شارەزاکە و عەلیۆف چووین. چەند مەلایەکی مل‌ئەستووری گوێ‌ڕەپ و تێکسمراو، لامل بە دەرەوە، لە دەرکە سەفیان بەستبوو بۆ بەخێرهێنانم. چوومە ژوورێک، نزیکەی بیست لاوێکی پتەوی بەشان و باهۆی هەژدە و بیست ساڵە، هەر کەسە کتێبێک لە پێش، مامۆستاکەیان بە سەرەوە هەڵوێستابوو.

گوتی: من خەریکی دەرس بووم، ببەخشە بە پیریتەوە نەهاتم.

- دەی مامۆستا تێکی مەدە! دەرسەکەت بڵێ!

- دەی کوڕم! بسم الله، «بێ» حەرفی جەڕ، موزاف بۆ ئەللا، ئەللا موزافون ئیلەیهی...

دەستم هەڵێنا:

- مامۆستا ڤیتۆ! قوربان وا دیارە هەر ئەمڕۆ دەس کراوە بە تەدریسی عەرەبی. ئەو موزاف و جەڕ و مەڕە دەبێ دوای دوو ساڵ تەدریس بۆ منداڵ بگوترێ. بە بڕوای من، ئەو پاڵە پاڵەوانانە بچن لە مەزرا کار بکەن لەوە چاترە کە لێرە گوێ لەو جادووە بگرن!

مامۆستا بە مینگە شتێکی فەرموو؛ نازانم جوێنی پێدام یان چی؟ تێرمان چا و شیرینی خوارد و دەرکەوتین.

بازاڕی گوندیانم پێ سەیر بوو. لە ڕۆژێکی حەوتوودا، بە هەزاران گوندی دێن و لەوێ دەفرۆشن و دەکڕن. زۆرم ژنی بە چارشێوی ڕەش و ڕووبەندەوە دەدیت؛ بەڵام دیمەنی ژنێکم پێ سەیر بوو کە لەو بازاڕە، لە بن ڕووبەندەوە، کە ڕووبەندەکە وەک حەسیری دیواری وایە، جگەرەی دەکێشا. دووکەڵ بە کونی ڕووبەندەکەدا دەردەچوو، دەتگوت کارخانەیە و کار دەکا!

دوو کەسم لێ پەیدا بوون، گوتیان: زێڕت هەیە لێت بکڕین؟ لەو دەمەدا عەلیۆف هات؛ نازانم

چۆن هەلاتن و خۆیان ون کرد. گوتیان ئەوانە دیارە قاچاغچی بوون. سەری شەو دەگەڵ عەلیۆف چووینە ترێ کڕین. ترێی زۆر خراپ هەبوو، کیلۆی بە هەشت ڕووبڵ. گوتم: ئەگەر ترێی چاکترم بدەیەی زیادت دەدەمێ. ترێی هەرە چاکی حوسێنی و ساحیبی لە پشت دوکان هێنا، کیلۆی بە دوازدە ڕووبڵ!

شەو لە عەلیۆفم پرسی: تۆ تێزەکەت چییە؟ گوتی: زمانی تاتم هەڵبژاردووە؛ بەلام هیچم بۆ بە هیچ ناکرێ. کەس نییە مانای وشەکانی کۆم کردوونەوە بزانێ. ئەگەر تماشام کرد. کوڕە ئەوە هەمووی ئەگەر فارسی نەبێ، کوردی و کرمانجی و لوڕی تێکەلە. عەلیۆف لە خۆشیان گەشکەی کرد و ئەو شەوە هەمووی بە ماناوە نووسینەوە.

لە ناو بازاڕ دەگەڕاین. نەجارێک بلوێری لانکی کچانی دەفرۆشت. یەکێکم هەلگرت، گوتم: بە چەند؟ گوتی: یەکی ئینگلیسی وەک تۆ هەلیگرت و مژێکی لێ دا؛ وەیزانی سەبیلەیە! گوتم: نا، ئەوە سنعاتی ولاتی خۆمە!

پیرێکی ڕیش درێژ چەند شتێکی وەک مووکێشی زمانەداری لە پێش بوو.

- مامە ئەوە چییە؟

- چەنگ.

- یانی چی؟

هەر پری دا یەکێک، زمانەکەی خستە سەر زمانی و ملی لێ نا؛ مووزیکێکی زۆر خۆشم دیت.

- فێرم کە لێت دەکڕم!

هەر دەلێ و فێر نابم. دنیایەکمان لێ کۆ بۆتەوە پێمان پێدەکەنن. گوتم: شاهیدۆف فەرمووادیار بوو لە پیاوە موحتەرەمەکانی شار بوو. گوتی: چۆن من لە بازاڕ چەنگ لێ دەم؟ گوتم: منجەمنجی ناوێ، بە خودا منیش دەبێ بە تۆ پێ بکەنم! ئەویش بە دەردی من چوو؛ بەلام زۆرتر بەو پێکەنین!

لە شارەزاکەم پرسی:

- ئەرێ شێخێک لێرە مردووە بە ناوی «بەهائەددین محەممەد»، نایناسی؟

- ناکا شاهی نەقشبەندت نیاز بێ؟

- بەلێ خۆیەتی، دەچمە زیارەتی.

تەلەفۆنی بۆ شەهردار کرد، گوتی: مەرقەد سی کیلۆمیتر لە شار دوورە. دەلێن چونکە خارجی سنووری شارە، ناتوانین ڕێگەی بدەین. گوتم: بە تەلەفۆن پێی بلێ کوردێکە میوانی نووسەرانی شۆرەویە. دەلێ ئیجازە بدا و نەدا هەر دەچم! تەلەفۆنی کردەوە، گوتی: شەهردار دەلێ من دەرەقەتی شتی وا نایەم! ئەوا ترۆمبیلی خۆم نارد پێی بچن. لە ڕێگە چاوم بە قەبری ئەمیر ئیسماعیلی سامانی کەوت کە گونبەزەکەی لە تەرزی منارەی سامرا و قەبری «ستە زوبەیدە» دروست کراوە. گوتیان زیارەتگایە. تەکیەی شاهی نەقشبەند سێ بەش بووە؛ دوو بەشی چۆڵ و لە کار کەوتووە؛ بەشێکی ئاوەدانە و مالێکی زێرەوانی تێدایە. قەبرەکە لە ناوەڕاستی حەسارە؛ بە سیمان بلند کراوە؛ بالا پیاوێک پتر. گۆیا حەوزێکیش لە حەسار بووە؛ خەلک ئاوەکەیان بۆ متفەڕک بردووە. دەولەت لە ترسی میکرۆبی ناو ئاو، پری کردۆتەوە و شێرەی لە جێ داناون. بۆ یەکەم جار لە ڕووسیا سوالکەرێکم لە درگای مەرقەد دیت. سندووقی نەزرێکیشی لێ بوو، سەد ڕووبلم تێ هاویشت. شۆفیرەکە -کە ڕووسێک بوو- بیست‌وپێنج ڕووبلی تێ هاویشت. شاهیدۆف

پرسی: ئەوە موسوڵمانە، تۆ چی کە ڕووسێکی؟. گوتی دەگەڵ زۆر کەسان هاتووم، هیچیان پووڵیان دەو سندووقە نەخستووە. بە کاری ئەمە دڵم گەرم داهات؛ منیش بەشی خۆم تێ خست.

لە ناو جادەی بوخارا دووەمین سوالکەرم دیت کە بە زمانی ڕووسی دەیگوت: هاونیشتمانی یاریدەم بدە! ئیتر ئەوەندەی لە ڕووسیا بووم تازە چاوم بە گەدا نەکەوتەوە.

لە ولاتی ئۆزبەکستان -کە گەرم و نەرمان و بەراوە- زۆربەی حاسلاتی پەمۆ و ترێ و مەڕداری و دەغڵ و دانی ولاتی شۆرەوی لەوێ پەیدا دەبێ. خەڵکەکەی لە چاو ڕووسەکان زۆر دەولەمەندن؛ بەلام بە ناشوکری نەبێ وەک عارەبان پیس و چلکنن. دەڵێن پووڵیان دەدەن بە زێڕی ژنان و مافوورەی باش. لە هەر کویش کام کاری زۆر گرانە، کارگەری ڕووس دەیکەن، موسوڵمانەکان زۆر تەنبەڵترن. پێم وا بوو کە دەڵێن ڕووس برا گەورەن جێی خۆیەتی؛ زۆر بەکار و زۆر خاکی و بێدەعیەن.

لە بوخاراوە تێلگرافم بۆ حەمید خوسرەوی کرد کە بەیانی سەعات یازدە وەرە ئوتێل تۆریست لە تاشکەند. سەعات دوازدە تەلەفۆنێک لێی دا:

- ئەزبەنی ئەز حەمیدم. کاک هەژار تە چاوانی؟!
- کاکە ببەخشە! حەمیدەکەی من سابلاغیانە قسە دەکا؛ جەنابت کێی؟
- کوڕۆ ئەزم ئەز!

حەمید دەگەڵ بارزانیان ژیابوو، زاراوەی ئەوانی هەلگرتبوویە و هی خۆی لە بیر چووبۆوە. حەمید گوتی: موهەندیسی وەرزێری [کشتوکاڵ]م. هەموو ڕۆژ کە دەچمە مەزرایە چەمەدان دەگەڵ خۆم دەبەم؛ چونکە نوێژی جومعەیان دەگەڵ دەکەم، خۆشیاندەوێم و چەمەدانەکەم بۆ پڕ دەکەن لە بامیە و باینجان و سەوزەوات، یانی لە دەولەتی دەدزن و دەیدەن بە من!

لە تاشکەند شەوێک ماینەوە. ژنێک لە لایەن ڕادیۆوە هات کە قسەیان بۆ بکەم. گوتم بە کوردی خۆم قسە دەکەم. پێک نەهاتین. پاش ماوەیەک هاتەوە، گوتی: زۆر تکات لێ دەکەن بە فارسی قسە بکە؛ چونکە کەسی وامان نییە کوردی تەرجەمە بکا. بە فارسی هێندێک قسەم کرد کە: من بە منداڵی لە کوردستان لە چیرۆکی کوردانەدا زۆرم باسی سەمەرقەند و بوخارا بیستبوو؛ ئارەزووم بوو ئەو دوو شارە ببینم. کە هاتیشم تێگەیشتم کە ئەم ولاتە جوانە ساڵەهای ساڵ وەک کوردستانی خۆم ژێرچەپۆکەی بێگانە بووە؛ وەک کورد بە دیلی ژیاون. با جەوانانی ئەمڕۆ داستانی کۆنەپیاوان لە بەر کەن و کارێک نەکەن بگەڕێنەوە ژیانی دیلی و کەساسی و بە دەردی کورد نەچن... سوپاسیشم لە شارەزاکانی بوخارا و سەمەرقەند و شۆفێرە ڕووسەکە کرد. ژنەکە ڕۆیشت و چوارسەد ڕووبلی بۆ هێنام. گوتم بۆ خۆت. عەلیۆف وە تەماح کەوت؛ پێی گوت: زەبت و دووربینەکەت بۆ هەلدەگرم؛ قورسن. دەگەڵی ڕۆیشت. کە هاتەوە گوتی: پیس دەستی بڕیم! تا بەر دەرگای ماڵەوەی چووم؛ کە زۆر دوور بوو. لە دەرکە شتەکانی لێ وەرگرتم، ماچێکی دامێ و گوتی سوپاس! دەرکەی داخست و کاڵەم دڕا، چم پێ نەبڕا!

کە بەرەو مۆسکۆ گەڕاینەوە، دیار بوو بەفر ڕێگەی نەدابوو. لە فڕگەی تفلیس دابەزین. هەموو حەنباڵ و گەسکلێدەرەکان کورد بوون. لە کافەی فڕگە سێ کەس کە عەلیۆفیان دەناسی هاتنە لامان. عەلیۆف بە یەکیانی گوت: تۆ تاتارێکی زۆر قابیلی، بەلام بە داخەوە زمانی خۆت لە بیر چۆتەوە. کابرا یەخەی عەلیۆفی گرت و جوێنی پێ دا: چۆن ئەو تەوهینەم پێ دەکەی؟

قبووڵ ناکەم! تاسوفەکەیم پێ سەیر بوو، چونکە تەنانەت گەسک‌لێدەری کۆڵانی بوخاراش پێکەوە بە ڕووسی قسەیان دەکرد. هەمیشە گەلانی کەمینە لە ناو زۆرینەی بە دەستەڵاتدا دەتوێنەوە؛ جا با گەورەش وای نەوێ.

شەو درەنگێک گەیشتینە مۆسکۆ. لە باکۆڕا نووسیبوویان سەرمان بدەن، میدیۆف گوتی: هەر یەکیەتیەک لە شۆرەوی بوودجەی سەربەخۆی خۆی هەیە. زیاد لەوەی کە سەری ساڵ بۆی داندراوە ناتوانێ خەرج کا. جگە لە تۆش زۆر میوانی نووسەران لێرەن کە ئەرەسکین کالدویلی ئەمریکایی یەکێکە لەوان. هات‌وچۆ بە فڕۆکە زۆری خەرجە، تەرجومان جگە لە مخاریجی ڕۆژانە، سی رووبڵی زیادی دەدرێتێ. بوودجەمان کز بووە، ئێمە ناتوانین بتنێرینە باکۆ. بەڵام ئەگەر ڕەسمەن لە باکۆ دەعوەتت بکەن و لە سەر حیسابی ئەوان بچی زۆرمان پێ خۆشە، مەسرەفی موتەرجمیش دەدەین.

لە سەر کارتێکی چکۆڵەی سپی، نامەیەکی دوور و درێژم بە خەتێکی زۆر ورد نووسی و دە پۆستەم هاویشت. بە دە دەقیقە کۆپی نامەکەی من بە دەستی ڕەحیم قازی گەیشتبوو. دەوڵەتی باکۆ ڕەسمەن بۆ پازدە ڕۆژ بانگهێشتنی کردبووم. گوتم: چونکە خۆم ئازەربایجانی دەزانم و کوردیش زۆر لە باکۆن، تەرجومانیشم ناوێ.

جا هەتا خۆم بۆ سەفەر تێک دەنێم، با مستەفا سەلماسیت پێ بناسێنم:

کوڕی حاجی ئەحمەدی شەلماشی کە لە «شەلماش»ی لای سەردەشتەوە هاتبوونە سابلاغ و تاجرێکی گەورە بوو. نازانم چۆن بوو شەلماشی ببوە سەلماسی. مستەفا لە زەمانی کۆمەڵەدا چووبووە باکۆ، گەیشتبووە مۆسکۆ، ببوە دوکتوری دڵ؛ بەڵام کە من دیتم دوکتوری نەدەکرد؛ یارمەتی پەناهەندەییشی وەرنەدەگرت. سووری چاوشین، سەرتاس، کورتەبالای باریک، تەواو ڕووس بوو. هەموو کەلێن و قوژبنی مۆسکۆی پێ دەزانی. دەگەڵ زۆر لە پیاوانی لاوەکی وەک سەفیری عیراق و هیندووستان و ئەفغانستان ببوە دۆست. هەر کوردێکی بگەیبایە مۆسکۆ، مستەفا دەیدیتەوە و زۆری یارمەتی دەدا. مەلامستەفا زۆری خۆش دەویست. لەو ساوە کە من چوومە ئاسایشگای گێرتسن تا هاتمەوە عیراق، هەموو کاروبارێکی دیوان و ناو شارم، ئەو پێکی دێنا؛ تەرجەمەی بۆ دەکردم. ڕێگەی ماڵەکەی ڕێگەی سەعاتێک لە ئوتێلی منەوە دوور بوو. ئەگەر لە شەویشدا تەلەفۆنم بۆ بکردبا، خۆی دەگەیاندمێ. ژنێکی ڕووسی «ڤیرا» ناوی هێنابوو، تەرحی لە مەیموون دەچوو! دوو کوڕی زۆر جوانی بوون بە ناوی ژیان و سیامەند. ژنەکەش دوکتوری منداڵان بوو. ئەویش کاری نەدەکرد؛ بگرە کلفەتیشی هەبوو.

کاسبییەکەی قاچاغفرۆشی بوو. دەگەڵ ڕەئیسی دانشگای کابول ببوە دۆست؛ هەر ئەفغانییەک لە کابولەوە بهاتبایەتە مۆسکۆ، لەسەر سپاردەی ڕەئیسی دانشگا، سەلماسی دەدیتەوە. ئەفغانی زۆریان قەدر دەگیرا؛ چەمەدانیان نەدەپشکنین. ماڵی قاچاغ وەک زێڕ، پاڵتۆ و ئەسپاباتی دیکەیان دێنا، سەلماسی بۆی دەتواندنەوە. هەر بەینابەینێک لە براکانیەوە پارچە فاسۆنیای بە ناوی «دیاری بۆ دانشجوو» بۆ دەهات کە ئەویش قازانجی زۆری دەکرد. سەرەڕای ئەوەش، سەروکاری دەگەڵ زۆر لە قاچاغفرۆشانی وڵاتانی دیکەی شۆرەویدا هەبوو. لە هیچیش نەدەترسا. بچووبایە ماڵەکەی بیست پاڵتۆ، دە زەبتی سەوت، بە دەیان سەعات و هەیت و هووتی لە سەر تاقە و بە دیوارانەوە بوو. تەنانەت جارێک لە زمان سەفیری عیراقەوە، دەرمانی بەهێزبوونی جنسی لە سەفیری هیند وەرگرتبوو؛ فرۆشتبووی!

ساڵێک پاش گەڕانەوەم بۆ عیراق بیستم کە گرتوویانە و شێست هەزار دۆلار و زۆریان کەلوپەل لێ گرتووە و حەوت ساڵیان حوکم داوە. کە پاش گیران و بەربوونەکەی ئیتر نازانم چی بە سەر هات و چ دەکا؟

بەر لەوە بڕۆم بۆ باکۆ، گوتی: هەمزە عەبدوڵڵا (کۆنە ڕەئیسی پارتی) دەگەڵ جەمال حەیدەری (سەرۆکی کومۆنیستی عیراق) هاتوون و چوونە لای سولسۆف کە هەمەکارەی دەولەتە. تکاشی کرد گوتی لە باکۆ بەم تەلەفۆنە سەلام لە فلان ئەرمەنی بکە!

- بە چاوان!

لە نیوەڕۆیەکدا لە فرگەی باکۆ دابەزیم. حەشامەتێکی زۆر بە گوڵەوە هاتبوونە بەخێرهێنانم. وەتاغێکیان لە ئوتێل توریست دامێ. کوردەکانی وڵاتی خۆمان لە باکۆ: دوکتور ڕەحیم قازی، عەلی گەلاوێژ، دوکتور قادری مەحموودزادە و ژنە سابلاغیەکەی، عەبدوڵڵا (برازای دوکتور مرادی ڕەزماوەری کرماشانی)، حەمەدی مەولوودە چرچ -کە کۆنە هەواڵی زەمانی کۆمەڵەم بوو- یەکجار زۆری ئازربایجانی هەواڵیشم دیتنەوە کە لە تەورێز ئاشنا بووین. فەتحی خۆشکنابیش هاتبۆوە ماڵەخۆی لە باکۆ. وەک لە سابلاغ و تەورێز بم وا بوو. پیاوێکی بە ناوی ڕاوێژکەری شۆڕەوی لە مەهاباد، بە ناو «ئەسەدۆف» هەبوو. برادەرێکی عیراقی (باقی بامەڕنی) هەر پێی دەگوت: «کوڕی خەجەکوڕێ!»، دەیگوت فایتونچییەک لە عەقرە بەو ناوە هەبووە؛ ئەمەش ڕەنگە لە باکۆ فایتوونچی بووبێ! کە چووبوومە باکۆ، ئوتێلچی بوو. لەو پیاوە زلانەی کە باکۆیی بوون و لە تەورێز دەمناسین «میرزا ئیبرایمۆف» کە ئەودەم وەزیری فەرهەنگی ئازربایجانی شۆڕەوی بوو، دوایە ببوە ڕەئیسی دەولەت و ئەو کاتە کە چوومە باکۆ بە ناوی نووسەرێکی زۆر بەناوبانگ ناسرابوو. «جەعفەر خەندان» کە لە تەورێز شیعری منی تەرجەمە دەکرد، پلەی پرۆفیسۆری پێ درابوو.

دڵم بە دیداری ئەو هەموو دۆست و ئاشنایانە گەشایەوە. شەوانە تا سەعات یەک و دووی شەو دەورم چۆڵ نەدەبوو. کە خەڵک بلاوەیان دەکرد، تازە حەمەی مەولوود سەرپێکی قسانی فت دەکرد و قەت نەیدەهێشت تا وڵات ڕووناک دەبوو چۆرتێک بدەم. قسەی ڕابردووی خۆی بۆ دەکردم؛ دەشیگوت: «نەوەک بمرم، تۆ لە بیرت نەچێ، بینووسە...». وا بیست و چوار ساڵ لەو دەمە ڕابردووە؛ حەمە مردووە؛ منیش زۆرم سەرگوروشتەی ئەو لە بیر نەماوە. بەلام هەرچۆنێک بێ سەرچڵ بۆت دەگێڕمەوە.

جارێ با بزانین حەمەم لە کەیەوە ناسیوە: حەمەی مەولوود، پیاوێکی نەخوێندەوار، دز، زۆر سەرشێت و شەڕفرۆش بوو. سابلاغی وە زالە هێنابوو. دزی بە ئاشکرای دەکرد. جارێک دەچێتە ژوور لە ماڵە جوولەکەیەک. جوولەکە دەگەڵ ژنەکەی نوستوون. حەمەد دەستە نوێنێک هەڵدەگرێ، پانەوپان لە دەرکەوە ناچێ؛ جوولەکە بانگ دەکا: کاکە هەمەد گیان، تیلاوتیل! ئاوا بۆت دە دەرکەوە ناچێ!

لە دامەزرانی «ژێ-کاف»دا هاتە حیزبەوە. پیاوێکی بەبڕشت و موخلیس بوو. «ژێ-کاف» کە دە پێشدا خەڵکی دەترساند، تفەنگ هاویشتن و ترساندن لە عۆدەی حەمەد بوو. دەگەڵ هێزی چەکداری کۆمەڵە لە هاوکارە هەرە ئازا و بە کارەکان، لە شەڕی مەکلاوێی دەوری سەردەشت، لە ئەترافی سەقز ناوی دەرکرد. پڵینگێک بوو لە بەر هەزار کەس نەدەپرینگاوە. هەموو زۆرمان خۆش دەویست.

ئارەق‌خۆرێکی بێوێنـە بوو. پیرە پێشمەرگەیەک بۆی گێڕامەوە کە حەمەد لـە مـەکلاوێ، دە ناو ماڵێکدا قەتیس مابوو؛ دوژمن دەوری دابوو؛ ئاگریان بە ماڵەکەوە نـابوو. چەنـد کەسـێکی گیانباز خۆمان گەیاندێ. دیوارمان بڕی:

– حەمەد وەرە خۆت خەلاس کە.

– ئارەقتان بۆ هێناوم؟! ئەگەر نەتانهێناوە بڕۆن، من هەڵنایەم!

دوای ئەوە قازی خۆی تەسلیم کرد و بارزانی بەرەو شنۆ کشانەوە، حەمەد ڕەگەڵیان کـەوت و لە هەموو شەڕەکانی دەوری قاڕنە و دەشتی شنۆدا زۆر بە ئازا ناوی دەرکرد. ئەویش وێڕای شـێخ ئەحمەد و بارزانییـەکانی کـە چوونـەوە عـیراق، خـۆی تەسـلیمی عـیراق کـرد و دوو سـاڵ لـە کەرکووک گیرا. پاش حەبس ماوەیەکی زۆر سەرگەردان مایەوە. بیستبووی کە شێخ لـەتیف بـۆ ناسـرییەی لای بەسـرا دوور خراوەتـەوە، خـۆی گەیاندبوویـە. بـە خێـری ناسـەلامەتی ببـوە چێشتلێنەر و پیاوی بازاڕی شێخ. شێخ لەتیف دەیگوت دەماڵـی کـولی کردبـووم و نەمـدەوێرا هیچ متەق بکەم. زۆرم شێخە عەرەب و پیاوی گەورەی کورد لێ میوان دەبوو. چێشت یـان زۆر سوێرە، یان زۆر بێ‌خوێیە!

– کاکە حەمەد بۆ وات کردووە؟

– ئەو میوانانەم پێ خوێنتاڵ بوون!

کاڵەکی دەکڕی، هەمووی قاش دەکردن. کامی بێتامە لە بەر من و میوانانی دادەنا!

ڕۆژێک ئیشتیای گونە بەرانم کرد. حەمەد ڕۆیشت پڕی بوغچەیەکی هێنا.

– ئەو هەمووە چییە؟

– کوڕە هەر لێی گەڕێ! چووم بە قەسابەکەم گـوت: «گـون!»، تـێم نەگەیـشت. هـەر دووک دەستم کردە گوێ و باڕاندم و دەستم بۆ گونی کابرا برد! چەنـدین قەسـابی بانـگ کـرد و بـۆی گێڕانەوە. هەر کەسەیان چەندی گون لە لا بوو هێنایان و قەرارە هـەموو ڕۆژ بـۆم کـۆ کەنـەوە و پووڵیش نەستێنن!

لە بەغدا شاگرد عەکاس بووم؛ ڕۆژێک لە بەر دەرگای دوکان وێستابووم؛ حەمە پەیدا بوو:

– هەزار دینت وا لێ دەکەم! دنیات بۆ گەڕام. وازم لە شێخ هێنا!

بردمەوە مەنزڵەکەم کە دەگەڵ حەمەی ڕەشادی پێکەوە بووین. شـەوێک حەمـەی ڕەشـادی چوار برادەری‌تری لە سەر شەرەفی حەمەی مەولوود دەعوەت کردبوو. سفرەی ئارەقیان ساز دا.

– کا حەمەد فەرموو.

– کاکە ئەم جیقنە-جیقنە ئارەق خواردنەوەم بە کەیفێ نییە. ئێوە بخۆنەوە، تـا نـۆرەم هـات بۆم دەو قاپە قوولە بکەن!

پتر لە نیو بوتڵ ئارەقی بۆ کۆ ببۆوە. بە یەک بین بە سـەریەوە نـا و یـەک جـێ تـەخت لێـی کەوت و تا بەیانی درەنگ وە هۆش نەهاتەوە!

چەند ڕۆژێکی زۆر خۆشمان پێکەوە ڕابوارد. ئێوارەیەکی سەرما کە چوومـەوە، حەمـەد خـۆی ساز کردووە دەڕوا. ڕەشادی گوتی: دەترسم دڵی لە ئێمە ئێشابێ. گوتم: نا، حەمەد چەند ساڵـە دزی و چەتەیی نەکردووە، فیل کەوتۆتە یادی هیندووستان! حەمەد گـوتی: ئـای ڕەحمـەت لـە بابت، بە خودا بۆیە دەڕۆم!

لە گونـدی خـەلان، لـە نزیـک سـنووری ئێـران ببـوە میـوانی شـێخ عەلائـەددین. وەزارەتی

دەرەوەی ئێران چەند جارێک لە عیراقی خواستووە کە حەمەی مەولوودە چرچ زۆری سەرباز و پۆلیسی ئێمە کوشتووە و دەگەڵ بارزانیان هاتۆتە عیراق، بماندەنەوە، فایدەی نەبووە. کە زانراوە وا لە خەلانە، قولیخانی قەرەپەپاغ و سەرهەنگێک دەنێرنە ڕەواندز، دەنێرن حەمەد دەگرن. حاکم لە ڕەواندز کوردێکە.

- کوڕە تۆ ئێرانیت؟
- نەخێر قوربان خەڵکی خەلانم و عیراقیم.
- ئەو قولیخانە دەڵێ دەیناسم و هاوسەنگەرم بووە.
- قوربان هەر سێک تەلاقم کەوتبێ، بە حەیاتم نەفەسم لە تریاک نەداوە!
- یانی چی؟
- یانی ئەگەر ئێرانی بام وەک جەنابی سەرهەنگ ئاو بە لووتمدا دەهاتە خوار و ملم چرچ و باریک و ڕەنگ تولخ دەبووم!

حاکم دەڵێ: برۆ، تۆ عیراقیت، ناتگرم!

کابرایەکی زینوەیی ناوی حەمەی مەولوود، دەچێتە دیوی ئێران چا بفرۆشێ؛ دەیگرن:

- ناوت چییە؟
- حەمەی مەلوود!

بیبە ورمێ و ڕۆژێ دوو جار دارکاری بکە تا دوو مانگ.

- ڕاستی بلێ!
- نازانم.

قولیخان دەبەن کە: ئەوە کوشتوومانە لە بن دارانـدا؛ دەڵـێ ئـەوە نـیم کـە ئێـوە دەڵـێن. قولیخان کابرا دەبینێ، دەڵێ: خوا هەڵناگرێ ئـەو بەدبەختـەتان بـۆ گرتـووە؟ ئازادیـان کـرد و هاتەوە زینوێ. منیش وەک خەڵکیتر پێیەوە چووم.

- دەی کاکە حەمە چۆن گیرای؟
- کوڕە هەر لێی گەڕێ، نازانم چ سەگبابێک ناوی وەک نـاوی منـە، دەڵـێن زۆری پـۆلیس و ئەفسەر کوشتووە. دوای دوو مانگ لێدان و تێهەڵدان بەرەلا کرام. ئاخ ئەو سەگبابەم گیر بێنایـە و خوێنیم بخواردایەتەوە!
- چم دەدەیەی پێت بلێم؟
- هەرچی تۆ بڵێی.
- بوغچە جغارەیەک بێنە!
- ها بە قوربان!
- کاکە ئەم برایەی خۆت بوو! منم ئەو حەمەدی مەولوودەی تۆیان لە باتیان گرت!
- دەک ماڵت بە سێ چەپی قوڕێ گیرێ! جا ئێستا بلێم چی؟!
- هیچ مەڵێ، تۆزێکیش تووتنم بدەیە و چایەکەش بلێ دەم کەنەوە!

لە کەرکووک شاگرد عەکاس بووم. حەمەم لێ پەیدا بوو:

- کاکە لە کەرکووک کاسبیەک دەکەم...

ماوەیەک فیشەکی بە قاچاغ دەبـردە سـولەیمانی. بـە هـۆی مەجیـدی کاکـەوە کـارێکم لـە بیمارستانی گەورەی کەرکووک بۆ دۆزیەوە، شەوانە پاسدار بێ و بە ڕۆژ ئازاد. حقـووقیش مانگـێ



ده دینار. زۆر زوو خۆی خۆشەویست کرد. دوکتور عەبدورەزاق (سەرۆکی بیمارستان) گوتبووی: شەهادە جنسیەت بۆ وەردەگرم تا بتوانم حقووقت زیاد کەم.

ڕۆژێک گوتی: قەرزێکم لە سەر عەبدولخالقی حاجی ئەللایە -کە سابلاغیەکی قاچاغچی بوو- قەرار بووە دەمانچەم بۆ بکڕێ، پوولەکەی خواردووە. ئێستا بە قەتار لـە بەغـداوە دێـت. دەڵـێی چی؟

- حەمەد شەڕ و هەرا ساز مەکە! تۆ بۆ خۆت قاچاغی.

ڕۆیشت. هاتەوە گوتی: لە قەتار هێنامە خوار پوولەکەم لێ ساندەوە.

جارێکی‌تر هات گوتی: من دەچمە ڕووسیا، تۆ نایەی؟

- نەخێر.

هەر ئەو شەوە تفەنگی دابۆوە بە بیمارستان و ڕۆیشتبوو. ئیتر لەو ساڵەوە کە هەزار و نۆسەد و پەنجا و یەک بوو، نەمزانی چی بە سەر هات. لە ساڵی شێست سەفەرەکەی بۆ گێڕامەوە:

«لە کەرکووکەوە هاتمە دزەی مەرگەوەڕ، حـاجی سـەید عەبدولـلا ئەفەنـدی گـوتی: منـیش پیاوێک دەنێرم خەبەرێکی سەید عەزیزی کوڕم بزانێ. کابرا سەیدێکی تووتن‌فرۆش بـوو. بارێـک تووتنی قاچاغی هێنا و ڕۆیشتین. لە ڕێ نسحەتی کردم: تۆ شکاکی نازانی لێت دڕدۆنگ دەبـن؛ خۆت لاڵ و کەڕ کەی باشە. دەچووینە هەر ماڵێک ببوومە بەزمی ژنـان! ئاویـان پـێ دەکێـشام؛ دەستیان بۆ قوونم دەبرد! بەو حاڵە بە ناو جەلالیاندا گەیـشتینە نزیـک سـنوور. خانەخوێکـەمان دەمانچەیەکی لێ ساندین کە شارەزایی سەر ئاراسمان بکا. دەگەڵ سەید، بەرە-بەرە خۆمان لـە ناو گیشەگیادا شاردەوە کە بە ڕۆژ ئێرانی نەمانبینن. شەو کـە خەبـەرم بـۆوە، عاسمـانی پـڕ لـە ئەستێرە، نازانم چ وەختە:

- سەید! سەید!

نەخێر خەبەر نییە. بە تەنیا هاتمە سەر چۆمی ئـاراز. جلـەکانم نایـە نێـو ڕانکەکـەم، قوتـووی تووتن و پەڕم دە کەناری سەرکلاوە چەقاند. خۆم بە چۆمدا دا. لە نێرینـەی چـۆم مانـدوو بـووم، ڕفاندمی، بێهۆش بووم. بەرەبەیانێکی تاریک چـاوم هەڵـێنا: ڕووت، نـە ڕانـک نـە کـلاو، لـە ڕان بەرەژوورم لە سەر ڕەمڵ و لاقم لە ئـاو دایـە. چـرا دیـارن. خوایـە ئێـرە ئێرانـە یـان ڕووسـیایە؟ سەگبابێک جارێک فێری دوو کەلیمە ڕووسی کردبووم، ملم لێ نا:

- ئیدی سودا! (وەرە ئێرە)

لە پڕ شەش سەربازی ڕووس ڕووی تفەنگیان تێ کردم و دەستیان بەستم. دەلەرزیم، یـەکیان پالتۆکەی خۆی بە شانم دادا. هاوارم دەکرد: سـیغار! سـیغار! چەنـد نەفەسـێکیان بـە دەمـەوە کردم. بردیانمە باکۆ، دە حەبسێکی تاریکـدا خـۆم دیتـەوە. تاقـە یـەک نەفـەری تێـدا بـوو؛ لـە سووچێک کروشمەی کردبوو. سیغار! سیغار! کابرا پاکەتێکی تووتنی ماخۆرکا کە هەمووی قسڵ و زەرنیخە، بۆ هێنام. لەتە ڕۆژنامەیەکیشم دیتەوە. وەک چای بەقالان پێچامەوە و کـابرا ئـاگری بۆ پێوە نام. یەک مژ کێشام. هەر ڕاست بوومەوە و ملم دە ملی کابرا نا، یەکترمان وە بەر شەقان دا! پاسەوان لە فیتەی دا، هاتن:

- خەبەر چییە؟

- هیچ قوربان گاڵتەمان دەکرد!

کابرای هاوزیندانم جوولەکە بوو؛ گوتی: بە تۆمەتی دزی لە بانک گیراوم، ئەدی تۆ؟

- جارێ نازانم...
بردیانم بەر لە هەموو شتێک بە زەڕەبینی درێژۆکە لە قوونمەوە تماشای ناو ڕیخۆڵەیان دەکردم کە وەرەقەم نەخواردبێ.
- چکارەی؟
نەقلی خۆم گێڕاوە.
- دەی بۆ دەڵێی ڕووسی نازانم؟ ئەدی بۆ لە سەر چۆم بە ڕووسی دەدوای؟
- هەر ئەو دوو کەلیمەم دەزانی، ئەگەر ئەو کابرایەی فێری کردووم تووشی بم دەبێ بیکوژم!
- نەخێر تۆ جاسووسی ئینگلیسانی، شێخ عەبدوللا تۆی ناردووە.
- دە ئێوە دە تەیارێکم نێن، بۆمبام بدەنێ؛ تا بچم بە سەید عەبدوللای دادەم!
- ئەو قسانە بۆ خۆت باشە...
جوولەکەی هەوالم بەو شەڕەشەقە زۆر کەیفی هاتبوو؛ هەموو ڕۆژ حەلوایەکی بە شەقانمان دەکرد. ڕۆژی یەکشەممە خزم و قەومی هاتبوونە دیتنی، گوتی: هەمووتان بچن جغارە بێنن! باوەشێک جغارەم بۆ هات و بوومە شای لە سەر تەخت!
لە باکۆڕا ڕایانگوێزتم بۆ زیندانی فلان، لەوێوە بۆ فلان شار... (ڕەنگە ناوی پەنجا شاری گوتبێ کە لە بیرم نەماون). لە زیندانێکدا ئەفسەرانی ئەلمانیش هەبوون؛ زۆر خۆش دەژیان. لە تاو هەلاتەوە دەهاتنە بەر تاو؛ وەرزشیان دەکرد؛ جگەرەی باشیان هەبوو. دوای ئەوان بۆ نیوسەعات ئێمە دەچووینە حەسار، قونجکە جگەرەکانیانمان هەلدەگرتەوە. زیندانیەکی ڕووسمان دەگەل بوو، نەقیزەی دروست کردبوو؛ تا من دوو قونچکم هەلدەگرتەوە، ئەو هەمووی دەچنینەوە. خاکئەندازێکی ئاسنم لە سەری دا، نوقمی خوێنم کرد. لەوێش ڕایانگوێزتم. نزیکەی دوو ساڵ لەو زیندان بۆ ئەو زیندان ڕاگوێزرام، تا ستالین مرد. باریان کردم هێنامیانە سەحرای کەرەکەلپاق، چەندین ملیۆن حەشامەتی‌تری لێ بوو کە لە سیبریا و هەموو زیندانەکانی شۆرەویەوە هێنرابوون. دەتگوت حەشری نێرەکەرە! برسی و ڕووت و سەرگەردان بە ناو ئەو هەزارە زیلەدا دەخولامەوە بەلکو یەکێک پارچە نانێکم بداتێ. کابرایەکی ئەرمەنی، دیار بوو پوولی زۆرە، گوتی: ئەرێ تۆ لە ئاشپەزی دەزانی؟
- عەجەب کەرێکی! بەدبەخت من ئاشپەزی کوڕی شێخ مەحموود پادشای کوردستان بووم!
چێشتم بۆ لێدەنا و خزمەتم دەکرد و لە خێوەتەکەی دەنوستم. گۆلاوێکی گەورەی لێ بوو، قاپەکانم لێ‌دەشوشت. هەتیوێکی قوتەم لێ پەیدا بوو، بە تورکی تێی ڕاخوڕیم:
- ناوت؟ کوێندەری؟ چکارەی؟
هەر تۆقیم. ببێ و نەبێ ئەوە پۆلیسی سرییە و دەمبەنەوە زیندان.
- برا من فەقیرم، کوردم، هاتووم بەڕێم کەنەوە بۆ عیراق.
بانگی کرد:
- مارف وەرە ئەوە حەمەدی مەولوودە لە من ترساوە!
قادری مەحمووزادە و مارفی فەرهادی، هەردووک سابلاغی، کە سێ ساڵ پێش هاتبوون دەربارەی دروست کردنی حیزبی لاگری ڕووسان قسە بکەن؛ هەر لە سنوور گرتبوویانن و بردبوویانە سیبریا. ئەو مابەینە بە ڕۆژ داریان پێ‌شکاندوون و بە شەو دە حەبسیان کردوون. ئەوانیشیان هێناوەتە لای من. قاپ و قاچاغم هەر لەوێ بە جێ هێشت و چوومە لای سابلاغیان.

ئەوانیان قبووڵ کرد بچنە باکۆ، هەوڵیان بۆ منیش دا، بریانمە ئازەربایجان لە گوندێک بە ناو «کووبا» لە سەد کیلۆمیتری باکۆ کرامە پاسەوانی باغاتی دەوڵەت. ئەوێم زۆر خۆش بوو. بەلام ڕەحیم قازی ناچاری کردم بێمە باکۆیە. حقووقی پەناهەندەگی وەردەگرم؛ خانووم دراوەتێ. ئەوە تۆم لێرە دیتەوە...

- باشە کاکە حەمە، وەختێ لە بەغداوە چووینە خەلان بە هەوای دزی و چەتەیی کردن- چت بە چی کرد؟

- لە خەلانەوە تفەنگێکم پەیدا کرد. دە پێشدا بە تەنیا دەچوومەوە دەوری سابلاغ. لە هەرکوێ ئەمنیەیەک، ئەفسەرێکم دەس کەوتایە دەمکوشت و کەڵوپەلەکە و ئەسپ و چەکەکەم دێناوە بە دزی دەمفرۆشت. پۆلیس وەک چاوئێشە لێم دەگەڕان. ڕۆژێک خۆم کرد بە چایخانەی قازیاوا؛ کە لەو بەری چۆم بوو. قاوەچی گوتی: نامە خۆت بشارەوە! دەستەیەک ژاندارم و شارەبانی هاتن لە تۆیان دەپرسی و ڕەنگە بگەڕێنەوە. غارم دا لە بن کەندالێک، لە ناو سپینداراندا خۆم درێژ کرد. شارەبانیەکی کوردی سابلاغی هاتە سەر کەندال، ڕاست بە سەر مندا میزت! لێی ڕاست بوومەوە:

- سەگباب دەتکوژم!

- حەمەد دەغیلە ڕاکە، ئەوە لە تۆ دەگەڕێین!

بۆ شەریکە چەتە، «بلوت» ناوەم ڕەگەڵ کەوت کە ئازربایجانی و زەمانی پیشەوەری ناوبانگی هەبوو؛ قەدەرێکیش چەتەی مستەفاخانی خورپاوا بوو. ئەویش لە حەبسی کەرکووک ئازاد کرابوو. ئەو جار دەگەڵ قالە تەگەرانی و چەند چەتەیێکیتر کە ببووینە هەژدە کەس لە ئێران کەوتینە کار. جارێک برایمەسووری قاچاغچیمان ڕووت کرد کە دەیانگوت خەبەر بە دەوڵەت دەدا. دوو باری بارگین کووتاڵمان لێ ساند، هێنامانە وزەندەرە، لە دەشت دە ناو گیشە گیامان خست. سبەی هاتینەوە بارمان کرد و چووینە پشتی دەرمانی. لەوێ زانیمان کە گیا خراوەتە جێگەی کووتاڵ و چەند تۆپێکمان لێ دزراوە. هاتمەوە تەشقەڵەم دە خەڵکی وزەندەرێ هالاند. ئاخری بە تفەنگێکی تاپڕ دەستم لە شەڕ بەردا. ماڵمان بردە قاراوا. دایکە دزێکمان پەیدا کرد کە لە بۆکان بۆمان بفرۆشێ. ماڵی برد و نەهاتەوە. مایەباش دەرچووین!

شەوێک لە پشت تورجان لە کێوی وەستا مستەفاوە ناردمانە ماڵی حاجی بابەشێخ کە نانمان بۆ بنێرێ. بۆ هەژدە کەس نۆ نانی ناردبوو! قەرارم کرد تۆڵەی لێ بکەمەوە.

بڕیارمان دا ئاغای زەلام زەلام ڕووت کەین. چووینە سەر شەهابی بەردەزەرد، دەست و لاقمان بەست؛ بردمانە ئەشکەوتێک. «پەپوولە زێرم دەیە بەرت دەدەم»، داوای پەنجا هەزار تمەنمان کرد. مەلا هات و پاش چەقەی زۆر پێک هاتین بە شەش هەزار ڕازی بین. پوولمان وەرگرت و ئاغا ڕۆیشت و پتر لە چوارسەد تفەنگچی کورد و ئێرانی دەوریان داین. کردمانە شەڕ، پیاوێکمان لێ کوژرا. لە تاریکایی شەودا -کە دەورەمان گیرابوو- یەک لە دوژمنەکان گوتی: وەرن لە لای منەوە دەرباز بن! ڕێگەی داین و کەلاک بە کۆڵەوە دەرچووین. ئیتر لێک بلاو بووین. خۆم و سێ کەس هاتینە قاوەخانەی گردە بەردان. هەژ- نۆ بارگین و ئێستر بە بارەوە بەسترابوونەوە. گوتیان جیازی بووکی حاجی بابەشێخە. دەمم هەڵبەست و بارمان برد و ڕۆیشتین. گەڕامەوە گوتم: بە حاجی بابە شێخ بڵێن حەمەی مەولوود ماڵەکەی برد؛ چونکە ئەو بۆ هەژدە کەس نۆ نانی ناردبوو! ماڵمان لە عیراق فرۆشت. نامەی حاجی بابەشێخ بۆ شێخ

عەلائەدین هات. گرتیانم، ئاخر پووشکەیان لێسـاندمەوە. نەمـدەزانی شـێخ لـە سـەر یـەکتری دەکەنەوە!

کاک هەژار! من لە دنیادا زۆرم تاڵ و سوێری دیوە؛ با ئەوەشت بۆ بگێڕمەوە:

نازانم کام ساڵ بوو، ڕەنگە تۆ لە بیرت بێ، زۆریان سابلاغی بە تۆمەتی قاچاغچیەتی بـۆ شـیراز دوور خستنەوە؛ منیش یەکێک لەوانە بووم. نە حقووق، نە بژیو، بەرهەڵـدا، بـڕۆ کـار پەیـدا کـە! دەچووم لە مەیدان دەگەڵ فاعلان ڕادەوەستام، جاروبار کاری قوڕەکاریم دەسـت دەکـەوت. لـە ماڵێک فەعلە بووم؛ پیرێژنی خاوەن‌ماڵ گوتی وەرە ببە نۆکەرم! ئیجازەی لـە شـارەبانی سـاند و پێناسەکەمی لای خۆی گل دایەوە؛ بوومە نۆکەر. گەسـک لێـدە! کاروبـاری ماڵـە بکـە! پاشـان دەگەڵ دوو منداڵان بچمە دەر بیانگێڕم. شاییەک پوولی گیرفانی نەدەدامێ. منـداڵ یـەکی دوو قرانیان ڕۆژانە دەدانێ؛ شتێکم لەوان دەدزی بۆ جگەرە. جگە لە ماندووبوونی زۆر و بـێ‌پوولـی و ئاتاجی، بۆڵە و جنێوی پیرێژن لە گیان وەڕەزی کردبووم. بڕیارم دا خۆم لـە پـۆلیس بدزمـەوە و ڕاکەم. خۆ ناشکرێ بـە جـادەدا بـڕۆم. ڕێگـەی لادێم گرتـە بـەر؛ نابەڵـەد. بـە خـەیاڵ دەچمـە ئیسفەهان، جارێک چوار شەو ڕۆیشتم، کۆچـەری قەشـقایی تێیـان گەیانـدم کـە ڕێگـەم هەڵـە کردووە؛ گەڕامەوە. بە شەو دەڕۆیشتم، بە ڕۆژ خۆم دەشاردەوە کە ئەمنیە نـەمبینن. لـە دێهـات سواڵی نانم دەکرد. بەیانییەک لە بن بەردێک نوستبووم؛ ئەمنیەک بە سواری تێی ڕاخوڕیم:

- تۆ چیت؟!

- ئاغا گیان دەگەڵ کابرایەک لە ئیسفەهان پێکەوە کرێکار و شەریک بووین، پوولەکەی منی دزیوە؛ لەو دەگەڕێم!

- درۆ دەکەی! تۆ ڕەنگە لە هەلاتووەکانی شیراز بی؛ بەلام هێندە ڕووت و کەسیفی ناتگرم!

- ئاغا گیان خێرێکم پێ بکە!

- مردووت مرێ کێ بیستوویە سواڵ لە ئەمنیە بکرێ؟!

قرانێکی دامێ. جلەکانم هەمووی بە دڕووانەوە چووبوون. وا شڕوشڕۆڵ ببووم هەموو لەشم بـە دەرەوە بوو. ئەمجار نەمدەوێرا بچمە سواڵی نانیش. منداڵە ورکە بەردیان تێدەگرتم و بە «شـێتە شێتە» شوێنم دەکەوتن. ئێوارەیەک لە لای هەمەدان گەییمـە قاوەخانەیـەی سـەر ڕێگـا. کـابرا خەریک بوو دایخا. هەرام لێ کرد: دایمەخە! درگای بۆ کردمەوە. گوتم: چای دەم کـە! پتـر لـە دە چام خواردەوە. نان و هێلکە بێنە، زوو بە! نانم خوارد. کـابرا گـوتی: مـن دەچمـەوە دێ، تـۆ شەو لێرە بخەوە و دەرکە داخە.

- ناترسی دزیت لێ بکەم؟

- نەخێر ناترسم.

- بەیانی لە بیرت نەچێ قەیماغ بێنی، نانی تازەش خراپ نییە!

- بەڵێ بە چاوان!

بەیانی کابرا بە باوەشێک نان و قەیماغ و پەنیرەوە هاتـەوە. تێـر لـەوەڕام و پتـر لـە دە چـای شیرنم خواردەوە. ڕووم تێکرد:

- بەڵێ دەزانم، یەک شاییت پێ نییە و حوکم دەکەی بێنە بخۆم!

دە بوغچەیەکدا دوو نردوو نان و دوو سەلکە پەنیری بۆ پێچامەوە، دوو قرانیشی دامـێ کـە لـە ڕێگە بە چای بدەم. هێندێکیش قەند و چای وشکی دامێ.



گەیبوومە ناو کوردان. ئێوارەیەک لە قەراغ دێیەکەوە لامدا؛ لە ماڵێک داوای کەتریم کرد. ژنەکەی کەتری دامێ و لە سەر کوچکاورم دانابوو بکوڵێ. مێردەکەی هاتەوە؛ شەقێکی لە کەتری هەڵدا و بە پاڵەپەستۆ دەری کردم.

سەرت نەیەشێنم! چل و پێنج شەو و ڕۆژ بە ڕووتی و سواڵکەری ئەو ڕێگایەم پێوا. چوومە گوندی دەرمان. گوتیان «میرزا قادر» کوڕی حاجی ساڵحی موشیری -ئەو هەرە پووڵدارە هەرە خەسیسە بەناوبانگەکەی سابلاغ کە ئەو گوندەشی هەبوو- لێرەیە. هەر دوور لە دەرگای حەسارەوە دیتمی تمەنێکی بۆ ناردم؛ گوتی: بڕۆ لێرە مەمێنە! لە عومرمدا هەر ئەو جارە فرمێسکم بە چاودا هاتووە... تمەنم بۆ فڕێ دا و دەرکەوتم. هاتمە گوندی زگدڕاو؛ کە ئاغاکەی میرزا کەریمی شاتری بوو. ئەویش وەک میرزا قادر سابلاغی و دەیناسیم. مەیدان ئەسپێک منداڵی دێ بە قۆچەقانیەوە بە پیرمەوە هاتن: «شێتە شێتە» ڕاویان نام. لە تاوان خۆم بە ئاودەستخانەی مزگەوتا کرد. بەختی من کوێخا لە ئاودەست بوو، منداڵی لێ دەرکردم. چوومە باغ کە گوتیان ئاغا بە ماڵەوە لەوێیە. هەر کە دیتیانم مات مان. حوسنی خانمی ژنی ئاغا بانگی کرد:

- سەرت دە قوڕێ نێی! خۆ ئەوە گەڵوگونت هەموو بە دەرەوەیە، بچۆ پشت دارێک!

جاجمێکیان بۆ هێنام دە خۆمەوە پێچا. هەر دەسبەجێ مەنجەڵێ پڵاوی هێنا. بە یەک هەڵپە خواردم. زۆر زوو یەکی‌تری لە پێش دانام؛ ئەوسا تێرم خوارد. خانم ناردی دەستێ جلکی تازەیان بۆ هێنام. ئاویان گەرم کرد؛ خۆم شوشت. بە ڕاستی حوسنی خانم لە هەموو پیاوان پیاوتر دەرچوو...

دە ڕۆژ وای بە خێو کردم، تەواو بووژامەوە. کە گوتم دەچمەوە سابلاغ، جلکی ژن و منداڵەکانم و چل تمەنی پووڵ دامێ. لە سابلاغ هەموو ڕۆژ پۆلیس لە منی پرسیبوو؛ کە هەڵاتووە دەبێ بگیرێت. هەر ئەو شەوە بوومەوە چۆڵنشین و یاریدەی قاچاغچیانم دەدا و جار-جاریش دزیم بە بەرەوە دەکرد. لەو ڕێگەیە فێرە گەدایش ببووم. ئەگەر لە گوندێک دەمزانی دزیم بۆ ناکرێ، سواڵم دەکرد. دەربەدەر مام تا ڕەزاخان تێک چوو. هاتمەوە و بوومە خزمەتکاری کوردایەتی و دەگەڵ تۆدا بوومە ئاشنا. هێشتا کۆمەڵەی «ژێ-کاف» دانەمەزرابوو، ڕۆژێک چوومە زگدڕاو. بە سەر تەقەدا کەوتم. ئاغایانی دەوروبەر هاتبوون زگدڕاو تالان کەن. تفەنگێکم وەرگرت و بەربوومە گیانی دوژمنان. هەڵمقەندن و کەوتمە دوویان. یەکیان هەرای کرد: ئەو سەگبابەتان نەدیوە دەڵێی بەرگری لە ماڵی بابی دەکا!

با ئەوەش لە حەمەد بگێڕمەوە:

لە کەرکووک چووبووە چاخانەیەک، گوتبووی کەباب دەخۆم. ناردبوویان کەبابیان بۆ هێنابوو. کە هەستابوو بە خاوەن چاخانەی گوتبوو:

- کاکە دەست خۆش!

- یانی چی؟

- لە وڵاتی مە، پیاو ئەگەر پووڵی نەبوو دەڵێ دەس خۆش!

- جوابەکەی چییە؟

- سەر خۆش!

- بەو شەرتە سەر خۆش، هەموو ڕۆژ بێیەوە لام «دەس خۆش، سەر خۆش» بکەین!

ڕۆژێک لە چاخانە دانیشتووە، پۆلیسێک دێتە بەردەمی:
- مام قادر دنیات لێ گەڕام، ئەم ئیحزارە ئیمزا کە.
- بڕۆ من مام قادر نیم!
- بە خوا دەتناسم، مام قادری و دەبێ ئیمزای کەی!
- کوڕە هەر سێک تەلاقم کەوێ من حەمەدی مەولوودە چرچەم، بە تۆمەتی قەتلی پـۆلیس و ئەفسەری ئێران لە عیراق و ئێران لێم دەگەڕێن بمگرن!
کابرای چاخانەدار ڕاست پیلی پۆلیس دەگرێ:
- کاکە ئەوە برای منە، تازە لە شێتخانەمان هێناوەتەوە، تا نەیکوشتووی ڕاکە!
زۆر لۆمەی حەمەش دەکا کە ئەو سەرگەرمییە بە هیلاکت دەبا...

***

دەوڵەت زۆری قەدری نیزامی شاعیر گرتووە. کۆتەلێکی زۆر بڵندی لە مەیدانێکـە و مـووزەی نیزامی هەیە. بردیانمە سەیری مووزە. یـەکجار زۆر ئاسـەواری نیزامـی لـە خـەتی و چـاپی زۆر بەقیمەت تێدا هەڵگیراوە. کیژێک شارەزایی دەکـرد «دلارا» نـاو؛ بـەڵام لـە ڕاسـتیدا دلارا بـوو. دەتگوت عیزرایل لە گۆشەی چاوە ڕەش و بادامییەکانیدا خۆی مات داوە گیانی لاوان بکێـشێ! من لەبەر تماشای ئەو باوەڕ ناکەم دە هیچ گەیبم! تماشای نوسـخەیەکی خەمـسەم دەکـرد، بـە دەنگ لە نزیک کچەکە خوێندمەوە:

دل شیشه و چشمان تو هر گوشه برندش مستند، مبادا که به شوخی شکنندش

زانی دەگەڵ ئەومە، ئادرێسی لێ خواستم. ئێوارێ تەلەفۆنی کرد گوتی: نـاوێرم بێمـە ئوتێـل. گوتم: وەرە ماڵی عەبدوللا ڕەزماوەری کە لەوێ دەعوەت کراوم. هات. بەڵام ژنی عەلی گـەلاوێژ گاڵتەی پێ کرد و تۆراندی. دوایی کە لۆمەی ژنی عەلیم کرد گوتی: بۆ تۆ نابێ؛ سووکە!
لە کۆڕی شاعیران و نووسەران بانگ کرام. زۆرم قسە کرد؛ مێـشکی سـەریانم بـرد! هێنـدێک خەونووچکە دەیبردنەوە! سەر لە هەوەڵەوە ڕەحیم قـازی موتـەرجیم بـوو؛ دەری نـەبرد؛ عـەلی گەلاوێژ جێگای گرتەوە. گوتیان بە ئازەربایجانی قسە بکە! دەمزانی ناتوانم وەک پێویستە مرازی خۆم دەبڕم. بە کوردی دەمگوت و تەرجەمەی ئازەری دەکرا. لە بیرم نەماوە لە ماوەی سەعات و نیوێکدا -کە بێوچان چەنەم لێداوە- چم گوت؛ بەڵام پوختەکەی بە سەرچڵی ئەمە بوو:
جارێک لە شیعری خۆمدا گوتوومە: خوێنی کورد و ئازەری بۆ پارێزگـاری نیـشتمان دەڕژێتـە تەشتێکەوە؛ جارێکیتر گوتوومە: ئێمە وەک دوو کاکڵەبادام لە تێکولێک داین؛ ئێستا کـە زۆرتـر شارەزاتر بووم، دەڵێم: ئێمە دوو گەل نین، یەکین. ئێوە لە تاریخی خۆتاندا دەڵێن لـە عـەولادی مـادی بچـووکین؛ زەردەشــت لــە خۆمانــە. کــوردیش هــەر وا دەڵــێن و مێژوونووســان و ڕۆژهەڵاتناسانیش بۆ کورد وا دەڵێن. کە وا بوو بێژین: ئێمە لە بنەڕەتدا یەک بـووین. جـا یـان ئێوە کوردیتان لە بیر براوەتەوەو بە ترکی قسە دەکەن، یان ئێمە ترکیمان وە لا ناوە و بەو زمانـە کوردییە داخێوین. بەر لە زەمانی سەفەوی گەلێک لە مێژوودا بە ناوی ئازەری و زمانێکی تورکی بە ناوی زمانی ئازەربایجانی نەناسراوە؛ بەڵام لە زەمانی گەزەنفونی یۆنانییەوە نـاوی کـورد هەیـە کە لە دانیشتووانی چیای زاگرۆسە و زمانێکی سەربەخۆیان هەیە. دەشزانین کە سەفەوی بنیچـە کورد، ئەم ترکیەیان کردۆتە زمانی مەزهەبی و بە سەر خەڵکی بەردەستی خۆیانـدا سـەپاندووە. تەنانەت شێخ سەفی بۆ خۆی شیعری بە زاراوەیەکی کوردی گوتووە. جا ئێـستا قـسەی ئێمـەی



کورد ڕاست بێ یان قسەی ئێوە، بە هەر دووک باراندا ئێمە یەکێکین و لێکیان هەلاواردووین. ئەگەر مامۆستا «سەمەد ورگون» ئەو هەمووو زەحمەتەی کێشاوە و دەڵێ: «نابێ بڵێین دایکی نیزامی کچە ئاغای کورد بووە؛ دەبێ بڵێن ناوی «ڕەئیسە» بووە. لە برسان دەمرد؛ لە ناچاری ڕازی بووە مێرد بە یووسف کوڕی زەکی موئەیەد بکا؛ کە ئازەربایجانی بوو. دەنا ئێستاش نە هەر ئاغا، هیچ کوردێک کچی خۆی نادا بە بێگانە. ئەوسا دەبێ بڵێین باوکیشی هەر کورد بوو؛ کە نیزامی لە ئازەربایجانەتی دەشۆرێ»، پێم وایە خۆی بە خۆڕایی زەحمەت داوە. ئەگەر وەک من لێکی داباوە کە ئێمە هەر یەکین و زمانمان گۆڕاوە، ئەوسا تێدەگەیشت کە ئەلیاس ناوی کوردانەیە و جگە لە پێغەمبەرەکەی ناو قورعان، نەمبیستووە ئەلیاسێکی غەیرە کورد هەبێ. تەنانەت لام وایە دایکی نیزامی کوردی یەزیدی بووە؛ چونکە دەڵێ: «خالۆ عەمێ ئەو خالی من بووە»، «عەمێ» ناوی یەزیدیانە. قەتیش نەبیسراوە ژنە کوردێک ناوی ڕەئیسە بووبێت. لە هەموو مێژووەکانیشدا هەمیشە «گەنجە» و «ئاران» بە کوردستان ژمێراون. نەخێر، نیزامی کوردە و ئازەربایجانی؛ کە ئەو دوو ناوە ئێستا بە سەر گەلێکی لێک هەلاواردوو دابڕاوە. وا من یەکێک لە خۆتانم و ئێوەش دەتوانن کتێبی خۆتان چاپ بکەن. داواتان لێ دەکەم لەو بەشە بەرەبابەتان بێخەبەر مەبن و هاوارێکمان بۆ بکەن...

نازانم چەند دیکەشم ڕست. هەرچەند ڕەحیم بە ترسەوە تەرجەمەی دەکرد و لای وا بوو زۆریان پێ ناخۆشە، بەرعەکس یەکجار زۆریان پەسند کرد و چەپلەی زۆریان لێ دا و ڕۆژی دوایی نامەیەکم بۆ هات کە بە تێکڕایی کردمیانە ئەندامی فەخری لە کۆڕی شاعیران و نووسەرانی ئازەربایجاندا. لە پاش قسە درێژەکەم، وچانێک درا و چامان دەخواردەوە. چەند کەسێک چەند پرسیارێکیان لێ کردم؛ بە ئەندازەی ئاقڵی خۆم جوابم دەدانەوە. یەکێ پرسی:

- بیر و ڕات دەربارەی سمکۆ چییە؟

گوتم: سمکۆ ئاغایەکی کوردی سەرڕەق بووە. بەزەی بەوانەدا نەهاتۆتەوە کە لای وا بووە چونکە سەر بە دوژمنن نابێ بیانکوژێ. زۆر کەسی بێتاوانی ترکزمانی کوشتووە کە هیچ لەو کارەی ڕازی نیم. بەلام لەم قەرنەدا ئەو ڕچەی بۆ کێشاین کە دەکرێ چاو دە گژ شووژن ڕاچێ و بیشیشکێنێ. ئەگەر عەقڵی سیاسی تەواو با، بۆ یەکجاری ڕیشەی دەوڵەتی لاساری پادشایانی ئێرانی لە بنەوە دەردێنا. کە وا بوو قەدری ئەو مامۆستایەتیەی دەگرم.

یەکێتر پرسی:

- لە تاریخی ئەرمەنیدا نووسراوە: دوژمنی ژمارە یەکمان کوردن؛ کە لە قەتلوعامەکەدا ئەوان یاریدەی سولتانی ڕۆمیان داوە. تۆ دەڵێی چی؟

- من باوەڕ ناکەم شتی وا هەبێ. ئەوە لەوە دەکا ڕووس لە تاریخی خۆیاندا بنووسن: دوژمنی هەرە گەورەمان ئەمڕۆ تاتارن؛ چونکە مۆسکۆیان گرت و قەتلوعامیان کرد. ئەو سوارە کوردانەی لەشکری حەمیدیە بوون و بە فەرمانی سولتان شەڕیان کردووە. چی بە سەر کوردیترەوە داوە؟! دەشبێ ئەرمەنی ئەوەیان لە بیر نەچووبێ کە زۆر خانەدانە کورد، هەزاران ئەرمەنی هەلاتوویان ئەودەم پەنا داوە و ڕزگاریان کردوون. چەند تەتاری ئەمڕۆ تاوانباری تەتاری پێشوون، کوردی ئەمڕۆش هەر ئەوەندە...

پرس و جوابەکانیترم لە بیر نەماون.

لەو شاعیرانەی لە باکۆ دیتمن، «عوسمان سارویللی» زۆر شاعیرێکی بەرز بوو. شیعری ئەو دە

قاتی شیعری «سەمەد ورگون» بەهێز و جوان بوون؛ بەڵام چونکە سەمەد دۆستی نزیکی ستالین بوو، ناوی شاعیری هەرە گەورەی لێ نرابوو.

چاوم بە «مەدینە گولگوون» کەوت کە لە تەوریز کیژۆلەیەکی جوانکەلە و شاعیر بوو؛ من و هێمن دەمانناسی. ببوە ڕەشێکی زۆر دزێوی گنجاوی. یەکێکی سەر تەواو سپیم دیت نەمناسیەوە. گوتی: من «شاعیر عەرەب ئۆغلیم». هەر چونکە لە تەوریز ڕێگەم نەدا یەک لەو کیژە سروودخوێنانە بۆ ئەتاکشیێف (فەرماندەی هێزەکانی شۆڕەوی لە ئازەربایجان) بەرن، هەر کە هاتمە باکۆ گرتیانم و چاردە ساڵ لە حەبسدا مام. پاش نەمانی ستالین و باغرۆف و دەستە و دایەرەیان، هاتوومە دەر.

بۆیان گێڕامەوە کە پیشەوەری لە ئێران ڕەویوە، ڕێگەی نەدراوە بچێتە مۆسکۆ. نامەیەکی گەیاندۆتە ستالین، باسی شکانی ئازەربایجانی ئێرانی بۆ نووسیوە. ستالین پرسیویە: نەقلی ئازەربایجان چییە؟ من قەت نەمبیستووە. بۆچی لەوێ چی ڕووی داوە؟! با ئەو پیشەوەریە بێتە لام؛ زۆر بێخەبەرم. پیشەوەری کە ساز بووە بڕوا، بە فەرمانی باغرۆف [باقرۆف] کامیۆنێک لە ڕێگەی فڕگەدا خۆی لە ترۆمبیلەکەی داوە و کوژراوە و ئێستاش ستالین هەر بە بێخەبەری ماوە تا مردووە. ئای بە کلکی خێویەوە! وا دیارە من و مام هێمن کەری تەواو بووین: نە ستالین زانیویە چییە حاڵمان و نە فەرموویەتی: «یەمان پرسیسکی، کوردیسکی خەرەشۆ!» (فارس خراپە و کورد باشە!)، ئێمە لە عیشقا سووتاوین و مەعشووقە ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبووە!...

وەک باسی باغرۆفیان دەکرد، قەت چەنگیز هێندە خوێنڕێژ نەبووە. گۆیا لە محاکەمەدا بێپەروا گوتوویە: پەنجا و سێ هەزار کەسم بە دزیەوە بە دەستی خۆم کوشتووە و بە شوفێرەکەم ناشتووە. هەر ژنێک کە ئەو ویستبێتی و نەچووبێتە لای، بە مێرد و منداڵەوە حەواڵەی سیبریا کراوە و فەوتاون. ئەو زوڵم و زەلالەتەی لە دەزگای باغرۆف و یارانیدا کراوە، سەد کتێبی دەوێ. جا ئەگەر کلفەت وا جوان بووبێ، دەبێ خانم چۆن بێ؟! دەبێ فەزایحی ستالین گەیبێتە کوێ؟

جارێک لە ئاسایشگا، نایبێکی شوورای عالی، شوکرانەی ئازادی زەمانی خرۆشۆفی دەکرد. دەیگوت: ئێستا نامە بۆ باکۆ بنووسم جوابم بۆ دێتەوە. ئێستا دەتوانین شەوانە بچینە ماڵی دۆستان. قەدیم نەماندەوێرا نامە بنووسین کە سەد جار تماشای دەکرا. هەر ئێوارە سەعات پێنج، هەر کەس نەچووبایەوە ماڵە خۆی، دەگیرا و شرت و گوم دەکرا...

لەگەڵ چەند کەسێک لە نووسەرانی باکۆ -کە دەیانگوت ئێمە کوردین و کوردی نازانین و یەکیان «ڕەحیمۆف» شاعیرێکی بەقەدر بوو- ڕۆژێک لە ماڵی میرزا برایمۆف بووین. گوتیان: ئێستا بولبول (ئەو گۆرانیبێژە بەناوبانگەکە) دێتە ئێرە. ئێستاکە لەقەبی پرۆفسۆری دراوەتێ. گۆرانی نالێ؛ داوای گۆرانی لێ مەکە! بولبول هات. پیرەمێردێکی حەفتا ساڵەی زۆر جوان و بالابەرز بوو.

گوتم: ئوستاد ئەگەر منیش داوا بکەم گۆرانییەک نالێی؟

- هەژار من دایکم کوردە و کوردم زۆر خۆش دەوێ. دادەی دەفێکم بۆ بێنن!

بە ڕاستی دڵی سیسی تێراو دەکرد. میرزا برایمۆف گوتی: هەژار! لەوەتا هاتووی، نیوەی نووسەرانت لێ کردووینە کورد. تەنانەت نیزامیشت لێ ساندووین. تکایە زوو بڕۆوە تا منیشت

نەکردۆتە کورد!

لەو مەجلیسەدا قسە کرا؛ یەکێ گوتی: کوردستان ئازاد دەبێ؛ ڕەحیم قازی ڕەئیسە و هەژار وەزیری فەرهەنگە.

گوتم: ڕەنگە ڕەحیم بەوە دڵی خۆش بێ؛ بەڵام من دەزانم تا چینی من و دوای منیش لەم ڕێگەیەدا نەمرین، ئەو خەونە وە دی نایە. هەرگا کوردستان ئازاد بێ، پیاوی وەکو من و ڕەحیمی بە پووشێک ناوێ. ئێمە خۆمان کردۆتە بوتی زەمانی جاهلی. وا من هەر لە ئێستاوە ئیستیعفام لە وەزارەت دا...

بێجێی نازانم کورتەباسێکی ڕەحیم قازی بکەم:

بنامۆزای پێشەوا قازی محەممەد، برای حەمەحوسێن‌خانی سەیفی قازییە؛ لە سابلاغ دەمناسی. لاوێک بوو، ئەویش دەگەڵ چەند لاوێکی دیکە هاتبوونە باکۆ کە فێری ئەفسەری بن یان بخوێنن. کە سابلاغ شکا زۆریان هاتنەوە. چەند کەسێکیان وەک کەریم ئەیووبی، مستەفا شلماشی و عەلی گەلاوێژ و سولتان وەتەمیشی و ڕەحیم قازی نەهاتنەوە. دە پاڵ دەرس خوێندندا -بە ناو- حیزبی دیموکراتی کوردیان بۆ ساز داون و ڕۆژنامەیەکی دوو پەڕی بە کوردی و ئازەرییان حەوتانە نووسیوە. نازانم ڕەحیم چی خوێندووە؛ بەڵام ناوی دوکتور ڕەحیم بوو.

بەر لەوە بێمە مۆسکۆ نامەیەکیم پێگەیشت؛ ڕەحیم نووسیویە و دەڵێ: وەرە ئێرە! پوولی تەرجەمەی شیعرەکانیشت -کە نزیکەی بیست و هەشت هەزار رووبڵ-ە وەردەگری... بۆم نووسی: دەعوەتێکی سەیرە! تۆ لە عاسمان سفرە ڕادەخەی و ناردیوانیشت سووتاندووە! چۆن دەتوانم بێم؟

لە ئاسایشگا هاتە لام. پاش چاردە ساڵ یەکترمان دیتەوە. هەر دووکمان قەڵەوتر ببووین و ئەو زگی لە من زلتر بوو. لە قسانی بۆنی ئەوە دەهات کە لە جێی پێشەوا بکرێتە سەرۆکی کورد. گوتم: کاکە! بارزانی لە مۆسکۆ بوو؛ لە جزیرەی سووریا ڕۆژێک شوانێکی یەزیدی و خاوەن مەڕێک چەقەیان بوو کە فلانە مەڕت دزیوە! درۆ دەکەی گورگ نەیخواردووە. شوانەکە زۆر سوێندی بە شێخ هادی و بولقاسم خوارد، بەهرەی نەبوو، گوتی: «سوێند بە سەری مەلامستەفا بارزانی، من نەمدزیوە». کابرا گوتی دڵم پابۆوە... ئەمڕۆ لە سەرانسەری کوردستاندا ناوی بارزانی لە سەرووی هەموو ناوانە. باوەڕ ناکەم تۆ بتوانی ئەو شوێنە بگریەوە.

دەعوەتی باکۆیەشم هەر ئەو پێکی هێنا. هەر گەییمە باکۆ، ئازەربایجانی و کورد باشیان باس نەدەکرد. دەیانگوت پیاوی دەوڵەتی مەرکەزییە و زۆر کەس لە هاووڵاتیانی ئازەربایجانی بەگرتن داوە کە لە حەبسدا فەوتاون. سەرەڕای ئەوەش، ئەو ئازەربایجانییانەی -کە لە بارەی نامووسپارێزیەوە زۆر شێلگیرن- دەیانگوت: ژنەکەی جوولەکەیەکی رووسە؛ ئابرووبەرەیە. تۆ نسحەتی بکە با دەست لەو ژنەی بەردا. دەمگوت: من حەقم چییە؟ خۆ من قازی مەملەکەت نیم.

پاش سوبحانە خواردنێک، یەکێ هات گوتی: ژنەڕاڵ «غولام یەحیا» دەیەوێ بتبینێ. خستمیە ترۆمبیلێکی سەرداپۆشراو. لە ماڵێک دابەزی. تاوێک بە دالانێکی تاریکدا ڕۆیشتم؛ بردیانمە ژوورێکی زۆر تاریک. غولام یەحیا لەوێ بوو. گوتی: لە ترسی ڕەحیم ئاوام تۆ هێناوە. هەر بزانێ منت دیوە واوەیلا بە حالم! زۆری دەردی دڵ لە حیزبی توودە هەڵڕشت: «ئەگەر جارێکی دیکە بگەمەوە ئێران و چەکێکم بە دەستەوە بێ، هەر چی بڵێ توودەم بۆ بابی تەنبێ

دەکەم...».
چەند پەیامێکی بۆ مەلامستەفا نارد.
لە ئوتێلەکە خەبەرێک لە من درابوو کە ئەوسا باوەڕم کرد ڕەحیم چاوەدێری بزووتنەوەی خەلکی باکۆیە و کە لێی دەترسن بە خۆڕایی نییە. خەبەریش ئەوە بوو: پاش ئەوەی ژنی عەلی گەلاوێژ دلارامی لێ تاراندم، ڕۆژێک تەلەفۆنی کرد:
- دلت لێم ڕەنجاوە؟
- کارێکی نالەبارت کرد...
- دەسا وا دێم ئاشتت دەکەمەوە.
- کەنگێ؟
- سەعات چوار دێم، بە تەنیاش دێم.
نەهات. شەو دەگەڵ عەلی هات؛ زۆریش کز و تووڕە دیار بوو. حەمەد گوتی: ڕەحیم گوێی لە قەول و قەرارتان گرتووە، هەڕەشەی لە سیویل کردووە بۆیە نەیتوانیوە بێتە لات.
- چۆنی زانیوە؟
- هەر کەس لە تەلەفۆنی ئوتێلەکە قسە بکا دەبێ ئەو بیزانێ.
لە یەکەم دیتنەوەیدا، زانایی و عیلمێکی وام لێ هەست نەکرد کە بەرچاو بێ. بەلام کە عەلی گەلاوێژم دیت، وای بۆ چووم کە عەلی وەک مەولانای ڕۆمی زمانی شەمسی تەبریزییە و بە دەردی بەشیر موشیری بەغدایە گۆتەنی: «تۆ بنووسە و من تەئلیفی دەکەم!»، عەلی هەم شاعیر، هەم نووسەر، هەم کوردی‌زانی باش، دوکتورای لە ئیقتیسادی سیاسی هەبوو.
شەوێک ڕەحیم تا سەعات دوازدە لام بوو. گوتی: ئەگەر تەلەفۆنم بۆ کرا، با لە مالەوە قسەم دەگەڵ بکەن.
سەعات یەک، سولتان وەتەمیشی بە تەلەفۆن گوتی: هەمزە عەبدوللا دەگەڵ جەمال حەیدەری چوونە لای سولسۆف، زۆریان خراپەی بارزانی کوتووە! مزگێنی بە ڕەحیم بدە!
- هەر خۆت بە تەلەفۆن پێی بلێ...
لە ئاسایشگای گێرتسن نامەی ڕەحیمم بۆ هات، بیست و هەشت هەزار ڕووبلەکەم ببوە بیست و دوو! لە نامەیێکی دیکەدا هەژدە بوو، جاری سێهەم ببوە دوازدە، تێ نەدەگەیشتم چییە؟! بەلام کە لە باکۆ دیتم و باسیان کرد کە چۆن هەموو ژیانی سەرفی ژنان و مەشرووب دەکا، پێم سەیر بوو کە دوازدەکە بۆ نەچۆتە ژێر سیفرەوە!
من هەر ڕۆژە حەقی نووسینی مەقال لە ڕۆژنامەی ئازەری و ئەرمەنی دام بۆ دەهات. پوول وەک کا وا بوو. کە دەهاتمەوە بۆ مۆسکۆ، شەش هەزار ڕووبلم دایە خزمەتی و ئەوی‌تریشم بۆ حەمەدی مەولوودی بەجێ هێشت. کە ڕەحیمیش چەند پارچە دیاری جوانی دا بە من و دیار بوو بە گرانی کڕیون.
دەعوەت‌نامەیەکم بۆ هات کە: دەولەتی ئازەربایجان کۆبوونەوەیەکی ساز داوە و تۆش دەبێ لەوێ بی! دەعوەتێکی زۆر گەورە بوو. سەرانی حیزبی توودە: ڕادمەنش، ئیرەج ئەسکەندەری، ئەمیر خیزی و جەودەت لەوێ بوون. دەبێ ئەوەش بزانی کە لە پێشدا -هەر وەک بە ناو کۆمەلی کوردان هەبوو- فیرقەی ئازەربایجانیش -بە ناو- تەشکیلاتێکی لە باکۆ هەبوو. بەلام کە من لەوێ بووم، ڕووسیە لێی مەنع کردبوون و خستبوونیە سەر حیزبی توودە؛ کە زۆربەی

ئازەربایجانییەکان لەوە نارازی بوون و نەیاندەوێرا قسە بکەن. سەرۆکایەتی کۆبوونەوە درا بە ڕەحیم قازی؛ ئەو نۆرەی قسەکەرانی دیاردە دەکرد. گوتی: لە دوای هەموان نۆرەی تۆ دەدەم. چەند کەس لە ئازەربایجانییە ئێرانییەکان قسەیان کرد. هەموویان وتاریان بەوە دوایی دێنا کە: «ئازەربایجان یەکپارچەیە و دەبێ ڕۆژێک ببینەوە یەک، لە ژێر حوکمی هاوبەشی شۆڕەویدا...». نۆرە گەیشتە ئیرەجی ئەسکەندەری. بەوپەڕی فەساحەت و بەلاغەت نوتقێکی زۆر ڕێک و جوانی کرد و چەندین شیعری حافز و سەعدیشی دە ناودا بە شایەت هێنایەوە. لە باسی کورد گوتی: «قازیها لە ڕێگەی ئازادی ئێراندا گیانیان فیدا کرد». دەربارەی ئازەربایجانی گوتی: ئێمە فارس و ئازەری و کورد وەک سێ مندالی بێباب واین، نانەکەمان لە سندووقێک دایە، لاسارێکی ملئەستوور قفلی داوە و لە سەری دانیشتووە. دەبێ هەر سێکمان پێکەوە لە سەر سندووقی فڕێ دەین و ئەوسا نانەکەمان دەست کەوێ و پێکەوە تێر ببین. ئێستا باسی جیابوونەوەی ئازەربایجان و کوردستانێک نابێ بکرێ. ڕۆژی خۆی باسی دەکەین و بزانین دەبێ چۆن دەبێ...

کاتێ نۆرە درا بە من گوتم:

- مامۆستا ئەسکەندەری کارێکی کرد کە پیاو شەرم دەکا لە ڕووی ئەودا هیچ بلێ؛ بەلام دوو ملاحەزەم هەیە: لە فیداکاری کورددا هەر فەرمووی «قازیان»، چونکە ڕەحیم لێرەیە و خاتری گرت؛ بەلام ئەو سەدان کارگەرە کرماشانی و لوڕانەی لە بیر چوو؛ ئەو هەموو لاوانەی سابلاغی هەلبوارد کە لە پێناوی حیزبی توودەدا کوژراون. چەند شەو لەوە پێش چوومە ئۆپێرای کۆرئوغلو، هاوکارانی دەستیان ڕادەکێشا و سوێندی وەفاداریان دەخوارد. کوردێک هات جگە لە دەست ڕاکێشان چۆکی دادا و سوێندی خوارد. بەلێ کورد سوێندی وەفاداری لە لا زۆر پیرۆزە و هەرگیز پاشگەز نابێتەوە. هەزار سال پتر، بە سەد هەزاران پالەوانی کورد لە ڕێگەی ئیسلامدا خۆیان فیدا کرد؛ گوتیان عەرەب و ئێرانی و تورک -کە موسلمانن- هیچ قەدری کورد نازانن. کومۆنیستی زۆر باشە کە فەرقی نەژادی لە لا نییە. زۆرمان بەو بانگەوە هاتین؛ زۆرمان خۆمان بە کوشت دا. ئەوا ئێستا دەبینین کوردی عیراقی لە یەریوان قسە دەکا؛ لێی دەپرسن کورد چۆنن؟ کومۆنیستە؛ بە گوناهی دەزانێ بلێ کورد هەیە. دەلێ: لە عیراق -جگە لە عەرەب- ئەرمەنی و تورکومان هەن؛ کە زۆر حالیان خۆشە! لێرەش جەنابی ئەسکەندەری دەفەرمووی: جارێ باسی ئازەربایجان و کوردستان مەکەن! وەختی نییە. من دەلێم: نا هەر ئێستە وەختییە! با بلێین ئەگەر نانمان لە بن کابرای لاسار دەرێنا، هەر کەس بەشی خۆی پێ دەگا. ئەوسا ئەگەر زانیان کەس تەما دە بەشە نانی ئەوی‌تر ناکا، پێکەوە لە سەر سفرەیەک دادەنیشین. بەلام ئەگەر یەکێک دە بەشی ئەوانی‌تر ڕۆبێ، حەقیان هەیە نانی خۆیان بەرن و هەر کەس لە مالە خۆی بیخوا. کە عەدالەتیش هەر ئەمەیە...

بوو بە هەرایەک لەو کۆڕەدا:

- هەژار ڕاست دەکا! دەمانەوێ بەشمان هەر لە ئێستاوە دیار بێ! نامانەوێ توودەش وەک شا بەشمان بخوا!

لە پاش تەواو بوونی قسان و دیتنی فیلمی ئارشین مالالان، مامۆستایانی توودە هاتنە ژوورێک کە ڕەحیم و من لەوێ بووین. ڕەحیم گوتی من دەڕۆم. من مامەوە و ئەوان. ڕادمەنش گلەی کرد:

- لەو مەجلیسە گەورەدا نەدەبوو قسەی وا بکەی.
- ئێوە دەبوو کارێک بکەن من قسەی وام بۆ نەیە.
- هەژار ڕێگەی ئێمە ڕاستە. بۆ بە ڕێگەی ئێمەدا نارۆن؟ دەردی قاسملوو کە ئێستا بۆتە دژمان و لە ڕێگەی ئێمە لای داوە، گۆیا مللیەت دەکا...
- مامۆستا! مەرحوومی خالید بەکداشیش هەر ئەو فەرمایشاتەی دەفەرموو!
- بۆ خالید بەکداش مرد؟!
- ئەدی ئەگەر نەمردووە کوا؟! مامۆستا گیان ڕووپەڕی مێژوو هەڵدەوە! هەمیشە عەشایری غەرب سەربەخۆیی ئێرانی پاراستووە. ئەو عەشایری غەربە ئێمە پێیان دەڵێین کورد؛ ئێستا زۆر تینووی ئازادین. ئەگەر ئێوە بە هیچیان نەگرن، ئەمریکایی و ئینگلیس بیانەوێ تەشقەڵە بە دەوڵەتی ئایندەی توودە بکەن، هەر بەوانە -کە تۆزێک دڵخۆشیان بکەن- هەڵتان دەدێرن. لەو گوێ بە کورد نەدانە، هەزاران قاسملووتان لێ پەیدا دەبێ. ئێوە ئێستا تەنیا کەچە ڕادیۆیەکتان لە بولغار هەیە، بەرنامەی بە فارسی و ئازەری هەیە؛ بەشێکی عەشایری غەربی تێدا نییە -کە هیچ نەبێ بە درۆ- دڵخۆشی کورد بدەنەوە. هەر لە بیریشتان نییە کورد هەیە!
- لە ڕادیۆی پەیکی ئێراندا، نە وەختی زیادیمان هەیە، نە گوویەندەمان هەیە!
- قسە بۆ منداڵ دەکەی! لە سەعاتێک فارسی، چارەگێک و لە سێ چارەگ ئازەری پێنج دەقیقە ببڕن، ئەوە وەختی فەننی. کوردیبێژیش، هەزار بێکار لە ئورووپا هەیە بە حەقێکی نەمرنەژی کارتان بۆ بکا. ئەگەر کەستان دەس نەکەوت من دێم بە نانەزگ قسەتان بۆ دەکەم.
- باشە حەول دەدەین ئەو گلەییەش لابەرین.

«ئەسعەد خۆشەوی» کە لە مۆسکۆ دەگەڵ بارزانی لەماڵێکدا ژیابوو، گێڕایەوە:

ڕادمەنیش و ژنەکەی -کە زۆر جوان بوو- چەند جارێک هاتنە لای مەلامستەفا و بوونە ئاشنا. ڕۆژێک ژنەکە بە تەنێ هات. پاش تۆزێک لەپڕ دیتم مەلامستەفا دەرکەی کردەوە و پاڵێکی بە ژنەکەوە نا، وەخت بوو لە پلەکانان ملی بشکێ. ژنەکە داوای لە بارزانی کردبوو، بیلامانێ حەزی لێ بکا، تا بە یەکجاری ببێتە دۆستی ڕادمەنشی ڕەئیسی حیزبی توودە! وەباڵ بەستۆی ئەسعەد.

لە نێوان پەردەی کۆبوونەوەکەدا مووزیک و ڕەقس و گۆرانیش هەبوو. «سارا قەدیمۆفا»ی بەناوبانگ -کە ئەوسا تۆزێک پیر ببوو- ڕەقسی کرد، گۆرانی گوت. شەوێکیش چوومە ئۆپێرای «لەیل و مەجنوونی فزوولی» کە «روبابە» ناوی گۆرانیبێژ دەوری لەیلای دەگێڕا و بە دەنگی خۆشی خۆی دنیای ئیحیا کردەوە.

جەعفەر خەندان ڕۆژێ زۆری تاریفی بابا تایەر کرد، بە تایبەتی ئەو بەیتەی کە دەڵێ:

ئەگەر با مۆ سەرێ یاری نەدێری چرا هەر نیوە شەو ئایی بە خوابوم؟

گوتم: مامۆستا، شاعیری عاشق دەڵێین من خواردن و خەوم لێ حەرامە. بابا تایەر دیارە شەو تا ڕۆژ پرخەی هاتووە؛ بۆیە هەموو نیوە شەوێ خەونی بە یارەوە دیوە!

گوتی: ڕاستی بیرم لەوە نەکردبوو!

لە حاڵی «بێریا» شاعیری تەورێزی زەمانی پیشەوریم پرسی، گوتیان لێرە ببوە مەزهەبی؛ دەیگوت: «دەبێ لە جێگەی کۆتەڵی ژنەراڵ کیرۆف، کۆتەڵی پێغەمبەر دانێین!». بە تۆمەتی شێت بوون بەرەو سیبریا براوە.

شاری باکۆ لە سێ لاوە دەریا باوەشی پێدا کردووە. دەیانگوت ملیۆنێک خەڵکی تیایە.

کۆتەڵی کیرۆف لە سەر گردێک بەرەو دەریا چەقیوە. بە داخەوە گەنجەی ژێگای نیزامی -کە بە «گەنجەوی» مەشهوورە- بە ناوی ئەو ژنەڕاڵەوە کە لە شۆڕشدا فەرماندەی قەفقاز بووە، ناو نراوە؛ ئێستا «کیرۆفاباد»ی پێ دەڵێن!

باکۆ تا ڕەشەبای نەیە شارێکی خۆشە؛ بەڵام ڕۆژانی ڕەشەبا دەبێتە سندان و ژەهری مار. گۆیا ئەو ناوەش: «بادکووبە»یە یانێ با دەیکوتێ.

لە ئوتێلەوە تەلەفۆنم بۆ کابرای ئەرمەنی کرد؛ کە سەلماسی سەلامی هەبوو.

- بەڵێ ئێستا دێم!

- دێیە چی؟ سەلام و برایەوە!

دیتم هات. گوتی: ئەو دەمانچەی بدەیە؛ فیلم و یاقووتیش جارێ ساز نەبووە!

- هەتیو دەمانچە و یاقووتی چی؟! برۆ وازم لێ بێنە!

لە ڕۆژێکی ڕەشەبای زۆر سەختا، لە فرگەی باکۆ خواحافیزیم کرد و هاتمەوە مۆسکۆ.

بەر لەوە باکۆ بەجێ بێلم، ئەو جۆکە دەگێڕمەوە:

ئەحمەدۆف ناوێک کە وەزیرێکی باکوویی بوو گوتی: ماڵمان لە گوندێکی نزیک تەوریز بوو. منداڵێکی هەشت ساڵە بووم؛ دەگەڵ بابم و خانەوادە هاتینە تەوریز سەری خزمان بدەین. شەو بوو. ئەو زەمان دەبوو ناوی شەو بزانی دەنا دەگیرای. ئەمنیەیەک لەو سەری کوچەیەکەوە هەرای کرد:

- گێلان کیم؟ (کێیە دێت؟)

بابم گوتی: ئاشنا!

- ئیسمی شەب؟

بابم -کە ئاگا لە هیچ نا- دەستەپاچە ببوو، لە خۆیەوە گوتی: تەبریز!

- زرت! بیلمە دن: تیهران! (زرت! نەتزانی: تاران!)

گوتی: بەڵێ، تاران!

- ئافەریم، وەرن برۆن!

جێگەی ئەم جارە لە ئوتێل ئوکراینا بوو؛ کە وەک لە بیرم بێ بیست و سێ نهۆمە و من لە نهۆمی هەشت بووم. سەلماسی خۆی گەیاندمێ.

- کوڕە هیچ شەرمت نەکرد قاچاغچییەتیم پێ بکەی؟ ئەو سەلامەت زۆری مانا هەبوو!

- دەی جا چ بوو؟ چەمەدانی تۆ ناپشکنن!

تێلگرافم بۆ سێدا ڕۆدینکۆ لێ دا؛ هات و چوار ڕۆژ شێخی سەنعانیم دەگەڵ خوێندەوە.

ئەگەر دەڵێن وەخت لە زێڕە، لە مۆسکۆ وەخت لە خۆڵەمێش بوو. بە سەف ڕاوەستان بە بەر دوکانانەوە، مەحتەل بوون لە ڕستووران تا خواردنت بۆ دێنن، تاقەتی فیلی دەویست. لە ئوتێل دەیانگوت: نیوەڕۆ چ دەخۆی؟ لە بەیانییەوە بیلێ. گۆیا تۆ هەرچی داوا دەکەی بە تایبەتی بۆت لێ دەنێن. ڕۆژێک دەگەڵ چەند کوڕێکی عیراقی دانشجوودا لە ڕستووورانی ئوتێل ئوکراینا زۆر چاوەنۆڕ بووین؛ نان هەر نەهات. هەر دەشیانگوت ئێستە. یەک لەو کوڕانە گوتی: خەتای منە. من داوای گۆشت کەوم کردووە -کە لە مینۆتەکەدا نووسرابوو- تا دەچن لە چیای قەفقاز ڕاوی دەکەن، دەبێ چاوەنۆڕ بین! پاش سێ سەعات چاوەنۆڕی نانمان خوارد؛ بەڵام گۆشت کەو هەر نەهات!

ڕۆژانی شەممە و یەک‌شەممە کە دەیان‌هەزار مۆسکۆیی دەهاتنە دەشت و دەم چەم، هەر کەس ئاوی سارد و نۆشابەی خۆی پێ نەبا، دەبوو ئاوی گەرمی چۆم بخواتەوە. نازانم ئەگەر نۆشابەفرۆشی لێ هەبا و دەوڵەت بە ملیۆن‌ها ڕووبڵ قازانجی بکردایە چ دەقەوما؟!

ئەوی پێم سەیر بوو، لە زستانی سەختی مۆسکۆدا سەفی بەستەنی‌کڕ دوور و درێژ بوو. چوومە قەسری کرملین؛ کە ئێستا مووزەیە و هەموو کەل‌وپەلی ماڵە شای لێ داندراوە. پیاو سەری سوڕ دەمێنێ کە ئەو شایانە چۆن ژیاون!

لە دیواری کرملیندا -کە کۆنە قەڵایەک بووە- زۆر قوتووی زەردی بە قەد خشتێکی تێ گیراون کە خۆڵەمێشی پیاوە ناودارەکانی ڕووسیای تێدایە و لە سەریان نووسراوە.

چوومە گۆڕستانی پیاوە گەورەکانیش کە بە ڕاستی ئەویش مووزە ئاسایی بوو. عەکسی مردووەکە لە مەڕمەڕی کێل دیتە بەر چاو. کۆتەڵی ماکسیم گورگی، کوڕێکی بە سەر باوەشەوە لێ بوو کە نووسرابوو: «چاکترین تالیفاتم...».

قەبری لاهووتی، شاعیری کوردی کرماشانیم دیت کە بە خەتی فارسی زۆر جوان و درشت پێناسەکەی نووسرابوو. دەگەڵ سەلماسی چووینە ماڵەکەی. ژنەکەی تاتار و زۆر لای دەوڵەت بە قەدر بوو. دەیگوت لاهووتی ئەغلەب گۆرانی بە شیعری لوڕی دەگوت.

لە ئاسایشگاوە چوومە مووزەی «ئارخانگلیسک»؛ کە ماڵە ئەمیر یووسف ناوێک بووە. لە عاجباتییەکانی دنیا بوو. تەنانەت لەو ماڵەدا شانۆی هونەرشاندان هەبووە؛ کە هەقی چوونە تماشای لیرەیەکی زێڕ بووە. خانم دوکتور گوتی: لە دنیادا تاکە.

گوتم: شوێنێکی سەیرترم دیوە.

گوتی: مەگەر واتیکان.

- بەڵێ واتیکانم دیوە.

ڕۆژێک چووینە شەڕگەی ناپلیۆن و ڕووس. کۆلەکەیەکی بەردین کە ناپلیۆن بە نیشانەی سەرکەوتن چەقاندوویەتی و هەڵۆیەکی بە سەرەوەیە، هەر لە جێی خۆی ماوە. کابرای شارەزا وای باس بۆ دەکردین و وا گەرم داهاتبوو، دەتگوت بۆ خۆی لە شەڕەکەدا بووە. تۆپ و گوللە و چەکی ئەو ڕۆژە ڕاگیراون. شەڕ و لەشکری هەر دووک لا بە بەرق نیشان دەدرێن.

بە سەدان داستان و دیوانی شیعری ئازەری -کە بە دیاریم درابوویە- بە بار ناردمەوە. سەیرم دەکرد لە هەر کوێ ناوی ستالین هەبوو، قەڵەم کێشرابوو. فەرهەنگێکی گەورەی تاجیکی ڕووسیم هەبوو؛ دام بە سەلماسی بۆم بنێرێ؛ چا بوو نەینارد!

ڕۆژی خواحافیزیم هات. میدیۆف لێی پرسیم: بە گشتی شۆرەویت چۆن دیت؟

گوتم: زۆر شتی باش و کەمێک شتی نەباشم دیت. بەڵام حاڵی شۆرەوی -کە دەوڵەتی کرێکارانە- وەک مۆدی پاریس، بە ڕۆژ و سەعات دەگۆڕێ. لەوانەیە تا دەگەمەوە بەغدا، زۆر لەو شتانەی من دیومە گۆڕابن و لە چاکەوە چاکتر بووبن...

شەو کە بە ڕێی دەکردم، کەپێکێکی هەڵدا ناو بەفر؛ گوتی: ڕووس لایان وایە کەسێک ئەوە بکا دووبارە سەفەر کردووەکە دەبینێتەوە.

لە پاش یازدە مانگ و نیو، مۆسکۆم بە جێ هێشت. لە فڕگەی شاری «ڕیگا». لە پاتەختی لێتونی نیوەڕۆژم خوارد و بە فڕۆکەیەکی ئەلیۆشنی ٢٤ نەفەرە، هاتمە «ستۆکهۆلم» پاتەختی سوێد. لە فڕگە کەوچکی زیوم دیتن؛ سەودام کرد. ژنەکە شتێکی گوت، گوتم: بە کرۆن تێ

ناگەم، چەند دۆلارە؟

- دوو دۆلار.

- شەشی بە دوو دۆلار؟!

زمانێکی لێ دەرهێنام و لاسای دەکردمەوە:

- شەشی بە دوو دۆلار!

ئەو باش بوو تۆزێک ڕووسی دەزانی. شەو چووینە «کۆپنهاگ». لە ئوتیلێک دامەزرام؛ لاڵ و کەڕی تەواو. شەو لە ژووری قاوەخواردنەوە کابرایەک بە ئینگلیسی دواندمی؛ منیش لەتوپەت جوابێکم دەداوە. باسی سەیاحەتی سویس و قومارخانەی مۆناکۆ و ئەو شتانەی دەکرد. گوتم: من پیاوێکی فەقیرم؛ لەو شتانە ناگەم.

گوتی: منیش زۆر فەقیرم؛ هەموو داراییم ناگاتە بیست ملیۆن دۆلار!!

- ئەی بەستەزمان! جا چۆن ژیاوی؟!

- چ بکەین، ژیان ئەوەیە!

بە فڕۆکەی K.L.M. هاتمە ویەن. لە ئوتێل دوازدە بەغداییم دیتەوە کە لە بولغاریاوە دەگەڕانەوە. دوانیان هەر ئاشنای قەدیمم بوون؛ هەموویان عەرەب. ئیتر هاوزمانم بۆ پەیدا بوو. لەوێوە گەیینە بێرووت. گوتیان چونکە موسافیر کەمن، دەبێ شەو لێرە بن. بەیانی بە فڕۆکەیێکی دی دەڕۆنەوە. جا وەرە بە عەرەبی بیکە بە هەرا: هەی دزینە! هەی دەستبڕ! ئێمە کاری تیجارەتمان دوا بکەوێ چەند زەرەر دەکەین... بە هەزار زمانلووسی گوتیان: دەتانبەینە چاکترین ئوتێل و بە کەیفی خۆتان بلەوەڕێن. ئێمەش کێشەمان هەر بۆیە بوو! چووینە ئوتێل ڕیڤیرا لە سەر بەحر. ئەمیرێکی سعوودی لەوێ بوو؛ هێندەی سلسلە و پلپلە پێوە بوو هەر بریقەی دەهات. دەتگوت تاوسەکانی باخچەی بوخارایە! موفتی فەلستینیش (شێخ حوسێنی) -کە تەشریفی لەوێ بو- هەمیشە دوو پاسداری دەست لە سەر دەمانچە لە خزمەتیدا بوون.

چوومە تێلگرافخانە گوتم: برا من بەیانی زوو دەگەمەوە بەغدا. ئەگەر تێلگراف پێش من دەگا، باشە؛ دەنا با پوولێک خەرج نەکەم.

- ئای بێ قەزا بی! پاش دە دەقیقە تێلگراف لە ماڵە خۆتانە.

نوێژی سبەینە گەییمە فڕگەی بەغدا. بە تاکسیەک هاتمەوە ماڵ. پاش عەسر تێلگرافەکەیان دایە دەست خۆم!

کاتێ کە لە ڕووسیا بووم خەبەریان دامێ خوا کوڕێکی داوە؛ ناوی «زاگرۆس»م لێ نا. شیرینیم بۆ میدیۆف و چەند هەواڵێکی کڕی. گوتیان: چەند ساڵە لێرەی؛ وا کوڕت بووە؟!

گوتم: لە ناو کورد ئەگەر لە نۆ مانگ تێپەڕی قبووڵ نییە.

پێکەنی گوتی: پەیامنێرێکی پاریسی ڕۆژێک شیرنی داینێ؛ گوتی: من سێ ساڵە لە ماڵ نیم؛ خەبەرم بۆ هاتووە کچێکمان بووە!

ڕوبڵ زۆر و لە دەرەوە هیچ ناکا. زەبتی سەوتێکم پێ کڕی دەگەڵ یەخچالێک ناردمەوە. لە مۆسکۆ، لە لینینگراد، لە باکۆ، لە بوخارا و سەمەرقەند، لە نومایشگای سنعاتی مۆسکۆ، هەرچی جوان و شیاوی دیاری بوو کڕیبووم. بە دوو چەمەدانی گەورەوە هاتمەوە. ڕۆژێک محەممەد گەڕابوو دەستە عەکسێکی پەیدا کردبوو، گوتبووی: دایە وەرە! بابم دەگەڵ ئەو هەموو ژنە رووتانەی مایۆ دە بەرانە لە دەم چۆم عەکسی گرتووە! دایکی گوتبووی: هەر نیشانم مەدە! من

بابت باش دەناسم. هەرچی بکا هەر دێتەوە لای خۆمان و نامەوێ لۆمەی بکەم... لە هەموو دیاریەکانم بەنرخ‌تر، عەکسی چەند کەسێکی دۆستی باکۆیی، عەکسی «نازم حیکمەت»، «بولبول» و هی‌تر بوو کە بە خەتی خۆیان بۆیان نووسیبووم: «دیاری بۆ هەژار».

ئەو بەینە کە لە ڕووسیا بووم، قزلجی لە جێگەی من کاری لە ستۆدیۆ دەکرد و ببوە هاوکاری برای شەریکەکەم. ڕاست چوومەوە سەر پەت و سنگی پێشووم و ملم لە عەکاسی نایەوە. ماوەیەک قزلجی هەر دەگەڵ خۆم کاری کرد. کابرایەکی قەرەقشلاغی -کە ناوی ئەحمەد بوو- لە ئەرتەشی ئێرانەوە بە ژنەوە لە تارانەوە هەڵاتبوو؛ پووڵێکی دەگەڵ خۆی هێنابوو. گوتی: هیچ کاسبیم نییە و پووڵیشم سەد و پەنجا دینار ماوە، چی بکەم؟ ستۆدیۆیەکی ڕووتەکەم بە سەد و چل دینار بۆ کڕی. قزلجیش ببێتە شەریکی؛ فێری عەکاسی بکات. کارێکی تەرجەمە لە عەرەبی بۆ فارسیشی لە ڕادیۆ بەغدا پەیدا کرد.

کە من ڕۆیبووم بۆ ڕووسیە، بارزانی بە قزلجی گوتبوو: حیسابی بکە چاپی مەموزین چەندی تێ دەچێ بتدەمێ. حیسابی کردبوو؛ سەد و بیست دیناری وەرگرتبوو. تا من هاتمەوە شێست و چوار سەفحە لە چاپ درابوو؛ پووڵیش خەلاس ببوو. پێشەکیەکی بۆ نووسیبوو زۆر جوان بوو؛ بەڵام نووسیبووی خانی لاسای مەجنوون و لەیلای نیزامی کردۆتەوە. بەوە ڕازی نەبووم؛ لەیل و مەجنوونم لە سەرڕا خوێندەوە. هەر کەس هەردووکیان لە بەر یەک ڕاگرێ، دەزانێ خانی زۆر بەهێزتر لە نیزامی ئەو بەیتەی گوتووە. دیارە خانی حەوسەد ساڵ لە دوای نیزامی هاتۆتە دنیا و ئەدەبیات ڕێگەیەکی زۆری بەرەو چاک بوون بڕیوە.

مەموزینم چاپ کرد و شێست دینارم لە سەر دانا. چوار سەد دانەیەکم بە دیاری دا بە ئاشنایان؛ دووسەدێکم دا بەو ئێرانییانە کە لە سولەیمانی کۆمۆنەیان هەبوو. کە گوتیان لە ڕۆژێکی ترس و لەرزدا حەمامیان پێ گەرم کردبوو! ئەوی‌تریش لە سەدا حەفتای کتێب‌فرۆشان خواردیان و لە عەسڵی مایە چل دیناری خۆشم زەرەر کرد!

جەلیل ناوێک خەڵکی پیرۆلی باغی نزیک سابڵاغ، ئەفسەری مخابەرات و بازنشەستە کرابوو؛ بسازبفرۆش بوو. بە زمانێکی زۆر لووس پووڵەکەی دام بە خانوویەک. پاش ماوەیەک کە فرۆشتمەوە، تێگەیشتم دووسەت دینارێکی لێ دزیوم! دەستی زۆر کەسی دیکەشی بە زمانی خۆش بڕیبوو کە یەک لەوانە عەلائەددین سەججادی بوو. بەڵام پاشەڕۆژێک دیتمەوە، ژنەکەی ڕەدوو کەوتبوو؛ ماڵ و زێڕی بردبوو. بۆ خۆشی لەرز ببوو؛ بەزەییم پێدا دەهاتەوە. دەستی زەمانە تۆڵەی خوار و خێچی لێ کردبۆوە.

بارزانی گوتی: دێمە ماڵەکەت. گوتم: ڕاستی من تاقەتی حەلۆ و جەلۆی تۆم نییە؛ بە چل-پەنجا حەرەستەوە دێیە کوێ؟! گوتی هەر دێم. شەو هاتە ماڵەوە. دیتی جێگاکەم تەنگەبەرە. پاش چەند ڕۆژ خانوویێکی دەوڵەتی لە سی خانووی کە بۆ پارێزەرانی ئەو دیاری کرابوو، دامێ و گوێستمەوە گەڕەکی «ئیسکان» لە دەرەوەی شاری بەغدا. خانوویێکی چل‌ونۆ میتری، چوار وەتاغ لە سەر یەک، وەتاغێکی گەورە و درێژ بۆ نشیمەن و میوان تێدابوو؛ حەسارۆکێکی چکۆلەشی هەبوو. دەبوو تا بیست ساڵ، ساڵێ سەد دینار بدەم و ببێتە مولکم. وەتاغێکیشم لێ دروست کرد. قیستی پێنج ساڵم مابوو کە بەعسی داگیریان کرد.

وەک دە پێشدا باسم کرد، برای جەلالی شەریکم ملی لە تەشقەڵە و فێڵ و فەرەج نا. بەشە دوکانی خۆم بە پووڵێکی هەرزان پێ فرۆشت. لە ئیدارەی «مەبانی عام» ڕۆژێ بە دینارێک

دامەزرام. کارەکەم لە سەعاتی هەشتی بەیانەوە تا دووی پاش نیوەڕۆ بوو. ڕۆژێ ئەوپەڕی کارەکەم سەعاتێک بوو. نامەی وارد و سادرم لە مل بوو. دەبوایە تا سەعات دوو بێکار دانیشم. ملم لە کتێب خوێندنەوە نا. ڕۆژێ بە لانیکەم داستانێکم دەخوێندەوە. ڕۆژێک کوتیان مدیرکول دێ. کارمەندان -کە قەت کاریان نەدەکرد- وەخۆ کەوتن؛ هەر کەسە پەروەندە لە پێش و چاویان بەسەردا گرتووە؛ من نەبێ. مدیرکول هات، گەیشتە من. گوتی: تۆ کارت چییە؟

- ڕۆژێ نیو سەعات نووسین و پێنج سەعات و نیو وێژنگ دان بۆ دەولەت!

پێکەنی و ڕۆیشت.

هێشتا لە دوکانەکەم بووم، پیاوێک بە ناوی عەبدولکەریم -کە زۆر سال کارمەندی شرکەتی نەفت بوو، ئینگلیسی زۆر باش دەزانی- هاتوچۆی دەکردم و دەرسی پێدەگوتم. جارێ گوتی:

- حەز دەکەی کتێبی دینی بەهایی بخوێنیەوە؟

- بەلێ، هەموو شتێک دەخوێنمەوە.

زۆری کتێب بۆ هێنام. تەواو شارەزاییم لەو بارەوە بۆ پەیدا بوو. ڕۆژێک گوتی:

- ئێستا عەقیدەت پەیدا کردووە کە دینێکی باشە؟

- مامۆستا من ئەگەر دەست لە ئیسلامەکەم هەلگرم و لام وابێ بەتالە، چۆن عەقلت باوەڕ دەکا لام وابێ ڕۆژی قیامەت عەبباس ئەفەندی شەفاعەتم بۆ دەکا؟! نا، فریوت نادەم. مەمنوونتم کە شارەزات کردووم؛ بەلام وەک دین قبوولم نییە.

مامۆستا لێم ڕەنجا؛ ئیتر هاتوچۆی نەدەکردم. چەند مانگێکی پێچووبوو، ڕۆژێ لە مالەوە گوتیان پیاوێکی درێژ، کالەکێکی ئالتوون کۆپری بۆ هێناوی و لە مال نەبووی. بە نیشانە مامۆستاکە بوو. ئێوارەیەک لە چاخانەیەکی ئەبوونەواز یەکێک بانگی کردم؛ خۆی بوو. گوتی: فلانی من بەهایی بووم؛ بەخوا منیش وازم لێ هێناوە. با ئاشت بینەوە!

لە ئیدارەی مەبانی عام، کوڕێکی کورد بە ناوی «زیا خورشید» ڕەواندزی کارمەند بوو؛ گوتی: تۆ کتێبی ئەرواح دەخوێنیەوە؟

- دیارە...

زۆر کتێبی دەربارەی عیلمی ئەرواحەوە بۆ هێنام. کتێبەکان زۆر بەنرخ بوون؛ بە من نەدەکڕدران. زۆر زۆرم بەهرە لێ دیتن. بە ڕاستی مەوزووعەکانی بۆ داستانی گالتە نووسین، شتی وا نەبوون! کاک زیا بە دل و گیان عەقیدەی پێ بوو. قەت نەیدەگوت: «فلان مرد»، دەیگوت: «نەقل بوو». بە پێی ئەو عیلمە، ڕووحەکان کە لە لەش دەردەچن، دەچنە حەوا و لەوێ بە ئازادی دەگەڕێن؛ باخچە دەچێنن؛ شیعر دەلێن؛ ئیختراعات دەکەن؛ خۆشی ڕادەبوێرن...

لە جێگەیەک تووش بووم: ڕووحی کەشەیەکیان حازر کرد؛ لێیان پرسی: حالت چۆنە؟

- زۆر شڕ بوو؛ ئەوا خەریکم باش دەبم. کە مردم دیتم هەر چی لە عومرمدا بە مریدانی کلیسام گوتووە، هەمووی درۆ بووە. هەر یەکیان کە مردووە، چووم عوزرم لێ خواستۆتەوە و عەفوویان کردووم. تاقە کەسێک لە سەر زەوی ماوە، ئەویش ئەوا لە حالی مردندا، ئەویش بمبەخشێ حالم خۆش دەبێ و لە عەزابی ویجدان ڕزگار دەبم!

شەوێک لە خەونمدا هەشت کەس هاتنە سەربانی مالێ کە مندالەکانم نووستبوون. گوتیان:

- ئێمە ئەرواحین؛ یەکیەتیمان هەیە. تۆ مانگانە یاریدەیەکمان بکە.

گوتم: مانگێ نیو دینار باشە؟

یەکیان گوتی: زۆریشە، زۆر سوپاس!

گوتم: دەغیلە با منداڵەکانم هەست نەکەن کە ئێوە لێرەن؛ وا دەچم میوەتان بۆ دێنم.

گوتیان: ئەوە میوە!

لابارێک سێو هەڵڕژا!

بەیانی ئەو خەونەم بۆ کاک زیا گێڕایەوە. هەر دەیگوت: ئای لەو بەختەی تۆ هەتە! چەند ساڵە من حەول دەدەم هێشتا ئەوەندەیان بە سەر نەکردوومەوە!

ئیعلانێکی پەیدا کردبوو: «کۆمەڵی سێ زەنگوڵە لە شاری ئۆکسفۆردی بریتانیا لە بەرانبەر هەژدە شلینگدا ژیانی ڕابردووی خۆت پێ دەڵێ کە چەند جار قالبت گۆڕیوە». کاک زیا پووڵی نارد و بۆی هات. دەڵێ: «تۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر موغی زەردەشتی بووی. مردی. ئەمجار بووی بە ڕاقیسە لە مەعبەدی فیرعەونانی میسر. پاشان مردی. بووی بە کاهنێکی بوودایی لە چین. جاری چوارەم لە کوردستان پەیدا بووی. ئێستا کارمەندی!». گوتی: ئیمانم پێ هەیە، تۆ چی؟

گوتم: ڕەنگت سوورە. ڕەنگە ئەگەر ڕاقیسە بووبی کەس لە چنگت نەجاتی نەبووبێ!

گوتی: هەیهوو؛ تۆ هەموو شتت پێ گەمەیە!

جگە لە کاری ئیدارە یاریدەی پارتیم دەدا. پووڵم لە خەڵک بۆ کۆ دەکردەوە؛ نەشرەم بۆ بڵاو دەکردەوە. ڕۆژێک برایم ئەحمەد گوتی: کاکە وەرە حیسابێک بکەین: خەڵک چاپخانەیەکیان هەیە، چەندماڵی پێ بەخێو دەکەن. ئێمە (پارتی) دوو چاپخانەمان هەیە. بڕۆ ئیستیعفا بدە لە ئیدارەکەت؛ وەرە لای حیزب کار بکە! ڕۆژنامەی کوردستان -کە جەلال تاڵەبانی وەریگرتووە- تۆ دەریخە. حەوتانەیە و لە هەشت ڕووپەڕدا. حقووقت لە ئیدارەکەت پتر بێ.

بە مودیری کارگوزینی جەماڵ بابانم گوت حیکایەت ئەوەیە و ئیستیعفا دەدەم. گوتی: تکایە مانگێک سەبر بکە! من لە نیوەڕۆیانەوە مەرەخەست دەکەم. ئەگەر نەتتوانی ڕۆژنامەکە لە حەوت پاش نیوەڕۆدا دەرخەی، ئەوسا ئیستعفا بدە.

لە دوازدە دەچووم تا شەو درەنگ خەریک دەبووم. پێنج حەوتە پێنج ژمارەم دەرخست. ئەوەندەی ڕمێن لە سەر بوو، کە لە ژمارە چوارهەزاری هەوەڵەوە، بوو بە هەشتهەزار و هەر بەشی نەدەکرد. هەر ژمارەش دەمەتەقەیەکم تێدا دەنووسی. لە ئەلف هەتا یێ، بە ئیعلانەوە خۆم دەمنووسی و کوڕێک «جەودەت» ناو پاکنووسی بۆ دەکردم. جارێک یا دوو جار زەبیحی شتێکی بۆ نووسی. ڕۆژێک جەماڵ شالی -کە وەکیلی بڵاوکردنی نووسراوی پارتی بوو- لە سولەیمانییەوە هات. بەوپەڕی شانازییەوە گوتم: ها؟ ڕۆژنامەی کوردستانت دیت کە لە خەباتە عەرەبییەکە زۆرتر مشتەری هەیە؟

گوتی: هیچ فەخر مەفرۆشە! بە خودا مشتەرییەکانی هەموو دێنشینی شارەزوورن؛ هیچیان سیوادیان نییە. دەمەتەقە بە زاراوەی ئەوانە. دێن دەکڕن؛ بە یەکێک دەڵێن بۆمان بخوێنەوە! قاقا پێدەکەنن. کەسیان ناڵێن ڕۆژنامەی کوردستان؛ هەر دەڵێن: ئا باوە دەمەتەقەیەکمان بەرێ!

چەند مەقالێکم تێدا نووسی دەنگی بڵاو بۆوە. ئەوی لە بیرم ماوە مەقالێکی درێژم لە سەر عەرەب و تورک و ئێرانی نووسیبوو کە هەرسێکیان دەڵێن کورد لە خۆمانە و تێرم گاڵتەی سەیر

پێ کردبوون. مەقاڵێکم لە سەر بەرنامەی ڕادیۆ کوردی بەغدا هەبوو؛ زەعیم وەحیدی هەڵتۆزاندبوو. لەو سەروبەندانەدا عەبدولکەریم قاسم لێمان کەوتبووە فەندەڵ فێڵان؛ دنەی ڕۆژنامەی «الثورە»ی دەدا ئیسباتی بکا کورد بنیچە عارەب بن. پیسی بەگژدا چووم و دەمەتەقەکانم قاسمی دەگرتەوە. پاش پێنج ژمارە داخرا.

ڕۆژێ کە چوومە بارەگای خەبات، زەبیحی لە دەرگا گوتی: مەلا بۆ هاتووی؟ خۆ ڕۆژنامەت نەماوە!

تاسێک بردمیەوە؛ جا بەس نەبوو جەمال بابان نەیهێشت ئیستیعفا بدەم! ئێستا چیم بکردایە؟

سبەی چوومە ئیدارە. سەعات چواری پاش نیوەڕۆ هەر لەوێ مام. جەمال بابان هات:

- ئەوە بۆ نارۆی؟

بۆم گێڕاوە. گوتی: من خۆم دەستم بە کار و حقووقی حیزبانەوە سووتاوە، چاکت نەجات بوو...

بە داخەوە ژمارەکانی کوردستانەکەم نییە؛ بەڵام دەمەتەقەکانی لە بۆ کوردستاندا چاپ کراوە. دوو بەستە شیعریشم لە ڕۆژنامەی «دەنگی کورد» بلاو کردەوە کە یەکێکیان بە ناوی «خالیدە» دەستم نەکەوتەوە و فەوتا.

لەسەر داوای یەکیەتی فێرکارانی سولەیمانی، مەقالێکی شازدە ڕووپەڕیم لە سەر باری ئەدەبی کوردی و شیعری کۆن و تازە نووسی. لە لایەن هێندێک لە شاعیرانی تازەوە چەند جنێوێکی جانانەم بۆ هات. ئەویشم لە مەجەللەی ڕووناهیدا -کە خۆم بە سەری رادەگەیشتم- چاپ کرد. بەڵام مەقال هەرایەکی نایەوە، ڕۆژنامەی ژین و قانیع و زۆر کەسی‌تر لە سەر منیان کردەوە. جنێودەرەکانیان کردە کەری نیوەزەڕ!

بۆ مانگی ڕەمەزان بارزانی چووبۆوە بارزان. قاسم زۆری زۆری بۆ حیزب هێنا؛ نەیدەهێشت ڕۆژنامەی خەبات لە وڵاتەکانی جەنووبدا بلاو بێتەوە. ئەندامانی پارتی لە ڕێگەوبانان ئەزیەت دەکران. ڕۆژنامەی خەبات شکاتی دەنووسی، کەمتری گوێ دەدرایە. حیزب قەراری دابوو بە هیچ جۆرێک دەگەڵ دەولەتی تێک نەدا و تا زۆر تەیار و ساز و ئامادەی کار نەبێ، پشووی سوار نەبێ. حیزبی شیووعیش لە بەغدا ئەو کوڵ و کەفەی نەمابوو. بەعسی لێی وەخۆ کەوتبوون، ڕۆژ نەبوو یەک و دوانیان لێ ترۆر نەکەن. هەر ئەوەندەیان بە دەستەوە مابوو لە ڕۆژنامەکەیاندا دەیاننووسی: چۆن وا دەبێ؟ هەموو ڕۆژ شەهید دەدەین. سیاسەتی ئێمە مارکسیستان پیاوکوشتنی تێدا نییە!

وەک لە بیریان چووبێتەوە لە وەختی دەسەڵاتداریاندا چییان دەکرد.

لە سەر خۆپیشاندانی خەڵک لە دێهات، بە دنەدانی شیووعییەکان -کە لە کوردستاندا هەر خۆیان حیساب بوون و پارتی زۆر کەمهێز بوو- زۆریان لە خەڵکی سەیدسادق گرت؛ کە شێخ قانیعیش بەرکەوت و خەبەریان دامێ لە بەغدا گیراوە. بارزانی لە ماڵ نەبوو. ڕۆژێ کە هاتەوە، هەر سەلامی کرد و دانیشت، گوتم قانیع گیراوە؛ دەست بەجێ هەستا. چووبووە لای ساڵح عەبدی ڕەئیسی ستاد گوتبووی یان ئێستا منیش حەبس دەکەن یان قانیع بەردەدەن. قانیعیان هێناوە. لە جیاتی سوپاس دەڵێ:

- بە خوا لەم حەبسە هەموو ڕۆژ لاوەکان پرتەقاڵ و مۆزیان دەدامێ، تۆ نەتهێشت تێر بخۆم!

قاسم لە لاسارە سەیرەکانی دنیا بوو؛ ببوە تەیرێکی عەجایب. دڵی هەڵینەدەگرت ناوی هیچ

کەس بە هونەرمەند و ئازا بێنن. بۆ نموونە: منداڵێکی پۆلی پێنجی سەرەتایی بە ناوی فەیسەڵ شەعلان، خەڵکی شاری کووت لە سەر تەلەفزیۆن نیشان درا؛ کە مێشکی وەک کامپیۆتەر ژمارەی لێک دەدانەوە. زۆر تاجر بە تەلەفۆن دیارییان بۆ نارد؛ کە کورە بێوەژنێکی فەقیر بوو. قەرار وا بوو چەند شەوی‌تریش لە تەلەفزیۆنەوە ئیمتیحان بکرێ. لە سبەی ئەو ڕۆژەوە ناوی نەما. قاسم بەغیلی پێ بردبوو!

بارزانی کە هاتەوە گوتی من بە سەربازێکی خۆت حیساب کە! قاسم سوور دەیزانی بارزانی درۆ ناکا و هاوکارێکی پاڵەوانی بێ‌وێنەی دەبێ؛ هەر وەک شەڕی شێخ ڕەشید و هەرای شەووافی بۆ لە ناو برد. بەڵام ئیحساساتی خەڵک بەرانبەر بە بارزانی و بژی- بژی دەستەجەمعی، قاسمی پڕ کردبوو لە ڕک و کینە. بۆ دەرفەت دەگەڕا کە ئەو دڕکە لە سەر ڕێی خۆی لابەرێ. بارزانی زۆر خاکی و بێ‌دەعیە بوو؛ خۆپەرستی ڕووی تێ نەکردبوو. هەر لەو ڕۆژەوە کە هاتەوە، لە هەموو کۆبوونەوەیەکدا زۆر لەوانە قەڵس بوو کە تاریفی دەکەن. جارێک لە جێژنێکدا -کە بە هۆی هاتنەوەی، لە سالۆنی گەل (قاعەی شەعب) گیرابوو- جەلال تالەبانی بە وتارێک و من بە شیعرێک باسی هاتنەوەی ئەومان کردبوو؛ بە تاریفەوە. گوتیان بارزانی گوتوویە هەردووکیان تەنبێ دەکەم؛ خۆتانی نیشان مەدەن! ڕاست چووینە بەر دەستی. زۆری لۆمە کردین و بەخێر گوزەرا...

عەشایری زێباری زۆر لە مێژ ساڵە دوژمنی سەرسەختی بارزانن. هەرچەند کچی مەحمووداغای مەزنیان ژنی بارزانی و دایکی کاک مەسعوود بارزانییە، بەڵام دیسان هەمیشە دژایەتی هەر هەبووە. لە شەڕی بارزان و دەوڵەت لە ١٩٤٥دا، بارزانی هەواڵیان بە دوژمن [دەوڵەت] فرۆشت.

قاسم لە بنەوە چەک و پووڵی بۆ زێبارییەکان نارد کە بە بارزان هەڵڕۆشێن. بۆ جێژنی ئۆکتۆبر، بارزانی دەگەڵ چەند وەزیر و پیاوماقووڵی عیراقی بۆ مۆسکۆ دەعوەت کرا. لە هاتنەوەدا قاسم گوتبووی: بیستوومە غەیبەتی منت کردووە. بارزانی گوتبووی: حەز دەکەم ئەوی بۆی گێڕایەوە بێتە ڕووبەڕووم؛ چونکە من لە بیرم نەبووە بە چاکەش باست بکەم. هەر ناوی تۆم وە بیر نەهاتەوە... جارێک بە قاسمی گوتبوو: تۆ لە خۆتەوە دوو ملیۆن و نیو دینار بە شێخی زوفار دەبەخشی، گەلی عیراق ڕازییە؟ ئەو تەرزە ڕەفتارە و قسانە، قاسمی تەواو شێت و هار کردبوو. چۆنی لە کۆڵ خۆی کاتەوە؟!

زێباری وەک عەشایر ملیان لە شڕەخۆری و دەستدرێژی بۆ بارزان دەکرد. مەلامستەفا ماوەیەک بوو لە بارزان بوو. لەم بەینەدا دەزگای دەوڵەت زۆری تەشقەڵە بۆ پارتی نایەوە. ڕۆژنامە داخران؛ برایم و جەلال خۆیان لە بەغدادا شاردەوە؛ بەڵام کاری حیزب پەک نەکەوت.

حیزبی شیووعی دنەی فەلاحانی سولەیمانی دا کە دژی مالیاتی زەوی خۆپێشاندانێک ڕێک خەن. زانیمانەوە کە حیزبی پارتی لە سولەیمانی سەرۆکایەتی خۆپێشاندەرانی کردووە و هاتوون ڕێگەی دەربەندیخانیان گرتووە و بۆتە تەقە و پیاو کوژراوە و حیزب و خۆپێشاندەر شکاون. قەدەرێک پاش ئەو شکانە، نووری شاوەیس هاتە بەغدا کە لە لایەن حیزبەوە وتوویژ دەگەڵ قاسم بکا. دەگەڵ عەبدوڵلا کانی‌مارانی چووینە لای. چۆنمان لێ بیست، پوختەکەی دەگێڕمەوە:

«بە هەزاران وەرزێر و خاوەن مولک بە چەکەوە کۆ بوونەوە. دژی باجی زەوی شیعاریان

دەدا. حیزب هەر چەند بڕیاری دابوو خۆی تووشی شەڕ نەکا، مەلامستەفاش هەرگیز بە شەڕ دەستپێکردن ڕازی نەبووە، بەڵام دیتمان ئەگەر ئێمە سەرکردایەتی ئەو گەلەکۆمەگییە نەکەین، حیزبی شیووعی دەیباتەوە و ئێمە بە یەکجاری شکست دەخۆین. ناچار خۆمان لێ کرد بە ساحیب. کەچی هەر دەگەڵ تەقە قەوما و پیاو کوژرا، هەرچی ئاغا و ڕەعیەتن، هەر کەسە بوونە دزی گای خۆیان و غەیب بوون. حەفتا کەس ئەندامی پارتی نەبێ کە لە مەیدان چەقین و لە تاریکایی شەودا سەنگەریان چۆڵ نەکرد. شەڕێکی خۆترین بوو، بە زۆر بە ملماندا هات...».

بیستمەوە کە شەوی شکانەکە، جەلال تاڵەبانی و نووری ئەحمەد تەها، بە سواری جیپ بە دەشتی سولەیمانیدا گەڕابوون، جوێنیان بە مەلامستەفا دابوو: «خۆی لە بارزان مانگێ پێنسەد دینار وەردەگرێ و ئێمەی فرۆشت. ئەدی بۆچی نایە شەڕ بکات؟!».

قاسم هەلی بە دەرفەت زانی و لە ناخافڵ بارزانی بۆمباران کرد. بە ئەمری شێخ ئەحمەد، بارزانی لە دەوڵەت ڕاپەڕی. هەمەباهەم سێسەد و پەنجا پارچە چەکی کۆنی لە سێ تیر و پێنج تیر و کەوکوژی ژەنگاوی بە دەست بارزانییانەوە بوو؛ بەڵام وەک ئاگری بە قودرەتێ کەوتە گیانی دوژمن. ڕۆژ نەبوو مەڵبەندیک ئازاد نەکا. ڕۆژ نەبوو سەدان ئەسیر و تفەنگ و تۆپ نەگرێ. هەرکی، شێخ ڕەشید و عەشایری زێباری لە وڵات تەرە کرد. وڵاتی زاخۆ و دهۆک و برادۆست و باڵەکایەتی و دەشتی بێتوێنی خستە دەست. هەرچی پۆلیسی کوردە لەو کوردستانە -بە هەزاران بە چەک و هەموو کەلوپەلەوە- ڕایانکرد و چوونە پەنای بارزانی. لە هەموو کوردستاندا هەمیشە دووکەڵ داوەستان بوو؛ تۆپباران بوو؛ تانکشکان بوو؛ بۆمبارانی تەیاران بوو. تەنانەت ڕۆژێک قاسم داوای جۆرێ مووشەکی لە ڕووسیا کردبوو کە ئەگەر بە چوار سەعات نەمگاتێ حالم شڕە! لە ئەرمەنستانەوە بە عاسمانی تورکیەدا بۆیان نارد و لە بەرانبەر تووڕەیی تورکیادا عوزریان خواستەوە.

شەڕ هەڵگیرسا. من هەر لە بەغدا مامەوە و کاری نهێنیم بۆ پارتی دەکرد. یەک لەو کارانەم: گوتیان دەوری سەفارەتی میسر هەمووی بە جاسووس گیراوە؛ دەمانەوێ سەفیر ببینین و ڕێگە نییە. گوتم من دەچم. عەریزەیەکم نووسی: «بیستوومە ڕادیۆ قاهیرە گوویندەی فارسی دەوێ؛ ئەگەر حقووقێکی باشم بدەنێ ئامادەم». نامەم نا ناو پووشەیەکەوە. لە دەرگای سەفارەت پرسیان: بۆ دەچی؟ عەریزەم نیشان دا. سکرتێری یەکەمی سەفیرم دیت. لە زمان بارزانییەوە ڕامگەیاند: «ئەگەر ناسر کارێکی وا بکا شەڕی قاسممان لە کۆڵ کاتەوە، تۆزێکیش چەکی دژی تانک و فڕۆکەمان بداتێ، دەگەڵ ئێران شەڕ دەکەین و ئەو بەشەش لە پەیمانی بەغدا تووشی سەرێشە دەکەین...». چوار جاریتریش هاتوچۆم کرد. هەر گوتیان: «بە ناسری ڕادەگەیەنین، داوای تەوفیقتان بۆ دەکەین». هیچی لێ شین نەبوو.

جارێک لەو جارانە دەبوو بچمە ماڵی وابەستەی نیزامی؛ لە عیمارەتێک بوو. دەمزانی سەرایدارەکە جاسووسی قاسمە. چوومە لای سەرایدار: سەلام مامە! سەگبابێکی میسری دەڵێن لێرەیە. من فەقیرم؛ عەکسم بۆ شتۆتەوە؛ پوولەکەی نەداومێ. بۆم بستێنە! سەرایداریش چەند جنێوێکی تەڕ و تازەی بە میسر و ناسر دا. ڕۆیشت و هاتەوە گوتی: ئابڕووم برد. بڕۆ پوولی خۆتی لێ وەرگرە! کابرا پێی سەیر بوو! جارێک لەو جارانەی سەفارەتی میسر، ئەحمەد تەوفیقیشم دەگەڵ بوو؛ کە دوایە باسی دەکەم.

لە ئیدارەکەدا بەعسی، شیووعی و پارتی هەبوون؛ بەڵام کەس خەبەری لە یەکتر نەدەدا.

نەشرەی هەرسێک لا دەدرا بە هەمووان. هەموو پێکەوە نێوانمان خۆش بوو؛ شەڕە چەققـەشمان نەدەکرد. فەرمانی گرتنی «فواد عەسکەری» ناوی بەعسی دەرچووبوو؛ خۆی شاردبۆوە. داوام لـە برادەرێکی کرد بیبینم. باوەڕی پێم هاتبوو، چووم لە ماڵێک دیتم: فواد! تۆ بەعسی، کـەس بـیر نابا لە ماڵە کورد خۆت شاردبێتەوە؛ وەرە ماڵە من. زۆر سوپاسی کرد؛ گوتی ئێرەشم باشە.

عوبەیدوڵڵا، کوڕە گەورەی مەلامستەفا خۆی شاردبۆوە. تووشی کابرایەکی هەولێری بووم کـە ماڵـی لـە بەغدا و کارمەنـدی ئیـدارەی ماڵـیە بـوو؛ بـە نـاوی عەبدولواحیـد، زۆر دڵـگەرم لـە کوردایەتیدا. گوتی: حەز دەکەم عوبەید بێتە ماڵـە مـن؛ کـەس فکـری ناکـا؛ دوورە لـە هـەموو شتێک. بە سەید عەزیزم گوت. عوبەید گوتی: مـن نایـەم؛ دوو هەواڵـم هەیـە بـا ئـەوان بچـن. چووینە لای کابرا. کە زانی عوبەید نایە، گوتی: ماڵە من لە هـەموو شـوێنان خرابتـرە. هەمیـشە پۆلیسی نهێنی لە کۆڵانەکەماندایە؛ ڕێو نادەم!

شەوێک دووربین و فلاشم هەڵگرت، دەگەڵ سەید عەزیز شەمزینی چووینە ماڵەکەی عوبەیـد لە «مدینەالسلام» کە عەکسی بۆ بگرم و کارتێکی ساختەی بۆ ساز کـەین و لـە بەغـدا دەرچـێ. عەکسم گرت؛ هاتم بڕۆم، ڕوانیم سەرێک لە سەر دیوارەکەوە دەڕوانێتە حەسار. گەڕامەوە:

– پێتان زانراوە، خۆ خەلاس کەن!

بێنە بەر چاوت: دوانی زگـزل، بترسن، بە دیوارێکی بەرزی حەسـار هەڵـگەڕێن، یـەک بچێتـە سەر شانی ئەویتر و لەپڕ بەربنەوە؛ بە هانکەهانک چنگ لە دیوار قایم کەنەوە. بـەزمی وام قـەت نەدیوە! لەبەر پێکەنین هۆشم نەمابوو. بە ناهومێدی مانەوە. گوتم: کار هاسانە. من دەچمە دەر، بەهانەیەک دەگرم و دەگەڵ کابرا بە شەڕ دێم و توند ملی دەگرم. ئێوە لەو دەرفەتەدا ڕاکەن. بـۆ ئەو شەڕە چوومە دەر. سەرە پۆلیس، پشیلەیەکی ڕەش بوو لە سەر دیوار ماتەی دابوو! هاتمـەوە گوتم: نەخێر زۆرن؛ چاریان نایە! دیسان نیو سەعاتێک ئەو مەشقەم پێ کردن و پێم نەگوتن!

بەعسی زۆر شڕ و دڕ بوون. زۆریان شیووعی تیرۆر دەکرد؛ زۆریان ڕق لە کوردان بوو. دەوڵەت پێی بەربەست نەدەکران. شەوانە سەردەرکی ماڵە کوردانیان سوور دەکرد؛ یانی دەبێ بکـوژرێن. دەرکی ئێمەش سووری بەرکەوتبوو. چەندین شەو زۆر بە ترسەوە پاسی ماڵم دەگرت و لە سـەر هەست بووم. تفەنگێکی ڕاوم لە دوکتور مراد ڕەزماوەری وەرگرتبوو؛ لە بن سەری خۆم دادەنا.

ڕۆژێک لاوێکم لێ پەیدا بوو گوتی: خەڵکی تورکیەم. لە ماڵە حـاجۆ کوڕێـک ئادریـسی تـۆی داومێ کە بمنێریە کەرکووک. ڕێگە زۆر سەخت بوو. هەر کەس لە بەغدا بەرەو کوردستان ڕۆیبـا لە چەند جێ دەیانپشکنی. کارتی شناسایی دەبوو پێ بێ. عەکـسم بـۆ گـرت. بـە خـەتی خـۆم کارتی شناساییم بۆ نووسی؛ مۆری کارخانەی خشتسازیم -کە لە لا بوو- لێدا؛ ئیمزای ڕەئیـسی کارخانەم کرد و دامێ. ڕۆیشت.

– ئەی بێچارە! خۆ من هەر بە خەتێک ئیمزای خۆی و ئیمزای ڕەئیسی کارخانـەم نووسـیوە. کە دەبوو ئیمزای ڕەئیس بە مەرەکەبی کەسک بێ و لە خـەتی نـاو کـارت جیـاواز بـێ. یـەقین دەیگرن.

پاش ماوەیەک کوڕ -کە ناوی یووسف بوو- هاتەوە گوتی: هویف لەو کارتەی تۆ! بەخوا شتی چاکە؛ هەر دیتوویانە گوتوویانە بڕۆ! لە کەرکووکەوە چوومە لای بارزانی. گوتم: تفـەنگم بـدەنێ. گوتی: ئەگەر هەژار بۆت بنووسێ دەتدەمێ. دەی بۆم بنووسە با بچمەوە!

– کاکە من ناتناسم؛ ناتوانم. ها ئەوە سێ دینار و بچۆوە سووریە.

لە سووریەوە نامەی سوپاسی نووسیبوو بۆ ئەو کارتە باشەت!

کە بارزانی لە شەڕەکانیدا سەرکەوت، ئەندامان و لاگرانی حیزب لە لیوای سولەیمانی و هەولێریش بووژانەوە و بە چەکەوە دایانە چیا و شەڕ هەموو ولاتی گرتەوە. کەسانێ کە نەناسرابوون، لە بەغدا مابوونەوە و کار لە بەغداش زۆر باش بەڕێوە دەچوو. من مانگانەم لە کوردەکانی ئیدارە کۆ دەکردەوە؛ خەبەرێکم هەبا، دەمنارد. جارێک گوتیان کۆمەڵێک لە کۆنە ژنەراڵ و پیاوماقوولانی بەغدا پەیامێکی گرینگیان بۆ حیزب هەیە؛ ناوێرن بە نامە بینووسن. دەبێ یەکێک تەواوی قسەکانی بێ زیاد و کەم لە بیر بێ و بە شوێنی خۆی بگەیەنێ. تۆ بۆ ئەو کارە باشی. پەیامم وەرگرت و چوومە کەرکووک. زەبیحی مەسئوولی کەرکووک بوو. لەوێ نووسیمانەوە و ناردیە چەمی ڕێزان بۆ مەکتەبی سیاسی. بۆ سبەی ئێوارە جوابی هاتەوە. هاتمەوە بەغدا. هەر گەیمەوە گوتیان: ڕۆژنامەت نەخوێندۆتەوە؟

- نا، چی تێدایە؟

- لە زمان تۆوە نووسراوە: «بارزانیم پێ پیاوێکی خراپە. پارتی پیاوی ئیستیعمارن و دژی جمهوورین. من حاشایان لێ دەکەم».

- هەی نەبێ!

سبەی برادەرانم دیتەوە؛ جوابەکەم گەیاند. گوتیان: ئەو بوختانە بۆ چەند کەسێکی دیکە نووسراوە؛ دەتوانی ئینکاری بکەی. چووینە ڕۆژنامەیەک. گوتی: بەڵێ بۆت دەنووسین. بەلام دەبێ بنووسی من موخالیفی جمهووری قاسمم. گوتم: بوختانێکم پێ کراوە، ویجدانم ناڕازییە. بەلام ئەگەر ئەو درۆیە بنووسم، هەمیشە ویجدانم عەزابم دەدا، ئینکاری ناکەم.

دووبەیانی، بەیانێکی چاپ کراوی حیزبی پارتیم نیشان درا کە نووسیبووی: دەولەت بە حیلەسازی دەیەوێ پیاوە چاکەکانمان لەکەدار بکا. نووسراوی دەربارەی هەژار ڕاست نییە و لەو دەمەدا ئەو لە سەفەردا بووە وکاری حیزبی ڕاپەڕاندووە. گوتیان بلاوی دەکەینەوە.

- ئای دەغیلە! ئەگەر دەتانەوێ لە بەغدا بمێنم و فایدەیەکم هەبێ، ئەوە مەکەن. چونکە هەر ئەمڕۆ دەمگرن!

پاش چەن ساڵێک کە دەگەڵ جەلال تالەبانی و برایم ئەحمەد نێوان ناخۆش ببوو، منیش لای بارزانی بووم، هەر ئەو پیاوە مەردانەی کە بەیانەکەیان نووسیبوو، لە ڕۆژنامەی «نوور»دا نووسیبوویان: «هەژار ئەو ساڵە تۆبەی بۆ قاسم کرد و هەر خاینە!». بەڵێ سیاسەت نابێ دایک و بابی هەبێ!

وێکەوتم کێ ئەم بوختانەی نووسیوە. ساغم کردەوە کە مامۆستا تەوفیق وردی شاعیر بووە!

- کاکە وردی تۆ بۆ وات کردووە؟

قەدەرێ حاشای کرد؛ بەلام شاهیدم بۆ پەیدا کرد کە لە وەختی نووسینیدا لەوێ بوون. گوتی: ڕاستت دەوێ گوتم ئەگەر هەژار ئابڕووی بچێ و سووک ببێ، من وەک شاعیری گەورەی کورد ناوبانگ پەیدا دەکەم!

بزەیەکم هاتێ. چونکە دەمناسی و دەمزانی عەقلی تۆزێک پارسەنگی دەوێ. لێی خۆش بووم و بووینەوە برادەری جاران.

ڕۆژێک سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ، وردی دەگەڵ لاوێکی کوێیی هاتنە ماڵ؛ بە سەر نانـدا کەوتن. ماسی و برینجمان هەبوو. لای زۆر کەس گوتبووی: هەژار جاسووسی ئەمریکایە؛ دەنا

چۆن وا بورژوازیانە دەژی هەموو ڕۆژ ماسی و برینج بخوا؟!

- هەتیو وردی! ئەم نەوارەت چۆن پڕ کردەوە؟

- بە خوا کاکە زۆرم خۆش دەوێ. گوتم ئەگەر بڵێم جاسووسە، خەبەری لێ نادەن و نایگرن. بە خەیاڵم پیاوەتیم دەگەڵ کردووی!

جا چونکە لە ڕووسیاوە بۆیان دەنووسی «پرۆفسۆر وردی»، با چەند نوکتەیەکی لێ بگێڕمەوە:

* بەیتی سیامەند و خەجی نووسیبوو کە ئەمە لە ئەدەبیاتی ئەرمەنی وەرگیراوە. لۆمەم کرد:

- برا! سیامەند و خەج هەر دووک ناوی کوردانن. بەیتەکە سەدان ساڵە بە هی کورد ناسراوە؛ بە کرمانجی و سۆرانی هەیە. چۆن تۆ شتی وا دەکەی کە مامۆستایەکی کوردی؟

گوتی: دەسا بە حەقی خودا ئەو حیزبابە ئەرمەنیانە تەنیا پێنج دیناریان حەقی تەرجەمە داومێ. ئای لەو دەسبڕانە!

* لە کۆلانێکدا ڕووبەڕووم دەهات و جنێوی دەدا.

- ها، خێرە؟

- کاکە! کتێبم بۆ دراساتی کوردی غەڵەتگیری کردووە؛ لە باتی شتێکم دەنێ، دەڵێن هەژدە دینار قەرزدار بووی! بزانە کارێکم بۆ ناکەی؟

کە پرسیم نیشانیان دام. هەر غەڵەتەی دەبوایە غەڵەتگیر ڕوبعە دینارێک جەریمە بدا. پاش حەقەکەی خۆی، ئەوەندەی دەکەوتە سەر. بە هەزار گیرە مایەباشم کرد؛ هیچی ئەم و هیچی وان!

* ڕۆژێک گوتی: دوو دینارم بە قەرز بدەیە، دووسبەی دەتدەمەوە. چلوپێنج ڕۆژێ پێ چووبوو. گوتیان وردی لێت دەپرسێ.

- ها؟

- کاکە! ئەو ڕۆژە کە پارەم لە تۆ وەرگرت، چوومە بنکەی چاپی فرانکلین. گوتم: کارێکتان نییە بیکەم؟

- ناوت؟

- تەوفیق وردی.

- تۆ چل و دوو دینارت لامانە. ها وەریگرە!

ئەو سەگبابە ئەو پوولەی لەپڕ دامێ، هۆشم لە خۆم برا؛ بە ناوەڕاستی خەیاباندا دەڕۆیشتم. ترومبیل خۆی لێ دام. لەو ساوە لە بیمارستان بووم!

* وردی لە دوکانی بەشیر گوتی: شیووعی و پارتی و دەوڵەت دەیانەوێ ترۆرم کەن! جەمال عارف -کە دوکتوری بەیتاڵ بوو- گوتی: وا بزانم تۆ جۆرێ نەخۆشی ڕەوانیت هەیە؛ دەنا تۆ لە مەدرەسەیەک فێرکاری و دیاری. دەتوانن پەیدات کەن.

گوتی: نەخێر من نەخۆش نیم. ئەوانە نەخۆشن کە مانگێ سەد دینار وەردەگرن و جاسووسن!

دوکتور جەمال گوتی: جارێ حقووقەکەم سەتوسی و دوو دینارە! نەخۆشییەکەی تۆش، من کە بەیتاڵم دەبێ قسەی لێ بکەم، نەک خۆت!

زۆر جار ناوی «بەشیر موشیر» دەبیەی! خراپ نییە بیناسی:

خەیاتێکی نەخوێندەوار، تەواو نەیدەتوانی ئیمزای خۆی بنووسێ، زۆر ساڵان لە لەشکری

عوسمانیدا ئیستیوار بووە. جگە لە عەرەبی بەغدایی، ترکی و هێندێک هیندی دەزانی. مەقالـە و کتێبنووسینی لێ ببوو بە نەخۆشی. هێندەیان بە گاڵتە پێ گوتبوو مامۆستا و بـاش دەنووسـی، خۆی لە خۆی لێ گۆڕابوو. خەیاتیەکـەی چووبـوو. دوکـانێکی هـەبوو، ببـوە کلـووپ و باشـگای ئەدیب و پیاوانی لە کارکەوتە. کێت بوویستایە، لەوێت دەدیتەوە. بە یەکێکی دەگوت: تـۆ فـلان شت بنووسە، من تەئلیفی دەکەم! تەنانەت جارێـک شـیعری منیـشی تـەئلیف کـرد! ئـەوی لـە تەئلیفاتەکەی لە بیرم ماوە: فالنامەی ناپلیۆن کە دەیگوت: تەجرەبە بکەن! بـۆ خـۆم تەجرەبـەم کردووە، دوو مانگ نەخۆش کەوتووم! دەیگوت: چوار هەزار سـاڵ لەمەوبـەر شـیعەیەک -نـاوی ڕۆبین بوو- چنگێک برنجی لە چین دزی لە هەمەدان چاندی؛ برنجی ئێرانی لێ کەوتەوە!

نەخۆش بوو گوتی: ئەگەر مردم بمبەنەوە کوردستان. گوتیان شەڕە، ئەو کارە ناکرێ. گـوتی: دەسا بە خوا من لە قەبرستانی بەغدا دەگەڵ ئەو عەرەبە سەگبابانەدا ناتوانم بـژیم! کـەچی چـل ساڵ بوو لە بەغدا دەگەڵ عەرەب ژیابوو!

کتێب و ڕۆژنامەی کـوردی دەفرۆشـت؛ بـەلام ئەگـەر خاوەنیـان داوای پوولـەکەی بکردایـە، جنێوی پێ دەدا؛ دەیگوت: جا وەرە بۆشی بفرۆشە! داوای پوولیشم لێ دەکا؟! هەر چۆنێک بـێ، ئەحمەقێکی خوێنشیرین بوو.

هەر لەو جۆرە شەخسیەتانەی کە لە بیر نـاچن: مـام حـەکیم، پیرەمێردێکـی تـووتنفرۆشـی کەرکووکی بوو. خۆی بە پێغەمبەر دەزانی. سالح ئەفەندیەکـەی باسـم کـرد -خـۆی بـە خـودا دەزانی- جنێوی پێ دەدا؛ دەیگوت: ئەوە هیچ کە نەمکردۆتە پێغەمبەر، هەر مەخلووقی منـیش نییە و ناشیناسم!

خەبەرێکم بۆ هات: « مەکتەبی سیاسی حیزب دەڵێ یـەکجاری بێتـە کوردسـتان. ڕادیۆمـان پەیدا کردووە؛ ئیدارەی بکا». بۆ خۆ ئامادە کردن و دابین کردنی ماڵ و قەرزوقۆڵە ڕێـک کـردن، حەوتەیەک مۆڵەتم خواست. دەبوایە شەممە بڕۆم، جومعە کوودەتای بەعسی قەوما. لە سـەربانی ماڵەوە زۆر باشمان دەدی کە بۆمبارانی وەزارەتی دیفاع (بنکەی قاسم) دەکـرا. مـن بـە هـەموو عەقڵی خۆم پێم وا بوو لەشکری کوردی خۆمان هەلی بۆ هەلـکەوتووە و زەربـەتی خـۆی چـاک دەوەشێنێ. هەر کە خۆم ئامادە دەکرد، چوومە لای جەلال بابانی کارگوزینی ئیدارە. گـوتم: لـە ئیدارە دەرم بکە با حقووقی مانگێک لە زیادی وەرگرم، دەچمە شـۆڕش. گـوتی: پەروەندەکـەت هێند پاکە ناتوانم هیچ بەهانە بدۆزمەوە. تۆ تەنانەت ئیجازەکانیشت دەکار نەکردووە.

بەغدایی زۆریان عەبدولکەریم قاسم خۆش دەویست. هەر خەلکی بازاڕ و کۆلان، بـە هـەزاران ڕژابوونە وەزارەتی دیفاع کە چەکمان بدەنێ شەڕ دەکەین. بەلام غللووری و سەرسـەختی قاسـم لەوانە نەبوو؛ هەر گوتبووی: هیچ نییە؛ ئیستا خەلاسیان دەکـەم. خەلـکەکەیان دەرکردبـوو؛ لـە مەیدانی پێش وەزارەت کۆ ببوون و بژی قاسمیان دەگوت. چەند تانکێک بە عەکـسی قاسمـەوە هاتبوون؛ خەلک بە خۆشییەوە بە پیریانەوە چووبوون؛ تانک لێیـان وە خـۆ کـەوتبوون؛ سـەدان کەسیان بەر تیربار دابوو. بۆ ڕۆژی دوایی -چێشتەنگاو- قاسم گیرا و کوودەتا سـەری گـرت. لـە ڕادیۆوە لە سەر یەک فەرمانی قەتلوعامی شیووعیان بلاو دەکرایـەوە. زۆر لـە شـیووعیان دە بـن زنجیری تانکی دەسکردی ڕووسیادا پان و فلچ کرانـەوە. زۆر کەسـیان بـە مـشار دەسـت و پـێ بڕیەوە؛ بە تەور و نێزە لەتوپەت کرد. گەڕەکە کوردە فەیلییـەکانیان -کـە لـە دەوری بارەگـای غەوس بوو- شەلم، کوێرم، ناپـارێزم، وە بـەر تـۆپ و گوللـە تانکـان دا. ئـەوی بەعـسی دەگـەڵ

شیووعی و لاگیرانی شیووعیانیان دەکرد، ڕەنگە تەیموور لەنگ و هۆلاکۆش لە دەستیان نەهاتبێ. قاسم و چەند کەسێک لە وەزیرەکانی لە مەرکەزی ڕادیۆ بەر گوللە دران. لەو جەهەننەمەدا تووشی نووری ئەحمەد تەها بووم. گوتی: خەم مەخۆ! بەعسییە زەلامەکان کە دەگەڵ مامۆستایانی ئێمە لە حەبسدا بوون؛ قەولیان پێداوین کە ئیستیقلالمان بدەنێ و لە عیراقمان جوێ کەنەوە!

- کاکە نووری! ئەوانەی کە نەژادپەرستی وا توندوتیژن، بەلام ڕوحم بە هاونەژادانی خۆیان ناکەن، چۆن بۆ کورد جێگەی متمانەن؟ من قەت بەو دۆعایە نالێم ئامین.

- کاکە تۆ هەمیشە بەدبینی؛ ناشزانی سیاسەت مانای چی!

- یاخوا وا بێ...

وا بزانم سێهەم شەوی کوودەتا بوو، مامۆستا سالح یووسفی -کە لە زەلامەکانی پارتی و لە حوکمی قاسمدا گیرابوو- هاتە سەر ڕادیۆ. مبارەکبادەی لە برایەتی کورد و عارەب کرد و تێری دۆعای بەخێر بۆ بەعس کرد. لە هەموو بەعسییەکان توندتر و تیژتر و دژی شیووعی و کوردیش «عەلی سالح سەعدی» بوو کە کرابووە وەزیر. کوڕە کوردێکی خەلکی قوشتەپەی پەنا هەولێر بوو. برایەکی بە ناوی نەدیم سالح سەعدی لە «مەبانی عام» بوو؛ هەزار جار ناوی بابی دینا. هەروەها «تەها ڕەمەزان جەزراوی»؛ ئاجودانی هەمیشەیی سەدام «سەباح میرزای ئەردەلان» کورد بوون و دوژمنی سەرسەختی کورد!

چەند لاوێکی پارتی وێکەوتن حەبس کراوە کوردەکان لە حەبس دەرخەن. زۆر ئەفسەر و کوردی دیکەش لە حەبسان دەرچوون. خەبەر هات کە جەلال تالەبانی لە جەبهەی شەڕەوە هاتووە بۆ تەبریک و گفتوگۆ. لە ئوتێل بەغدا دیتم. لە ناو قسەی باسی جەبهە و پالەوانەتی پێشمەرگەدا، ئەم چەند پرسیارەم لێ کرد:

- ئێوە کە وا سەرکەوتبووون، حوکمی بەغداش چلوهەشت سەعات لە بەر یەک هەلوەشابوو، کەس ئاغای کەس نەبوو، بۆچی هجوومتان نەکرد دەو پاشاگەردانییەدا کەرکووک بگرن؛ کە لە هەموو شوێنان حەساس‌تر بوو؟ ئەودەم ئەگەر قاسم نەکەوتبا، دەیگوت بە گژ دوژمنمدا چوون؛ ئەگەر وەک ئێستا بەعس سەروکەوتبا، دەتانگوت بە گژ هێزەکانی قاسمدا چووین. با ئێستا وت‌وویژی بەشی کوردی بکەین.

لە بیرمە بە حیرسێکەوە گوتی: قسەی بێتام دەکەی! سەرباز دە ناو سەنگەردا، کلاوخودی ئاسنی بە سەرەوە، تفەنگ و تۆپی ڕووی دە منە؛ چۆنی بگرم؟

- کاکە! ئەگەر لەشکرێک فەرمانی لە بەغداوە بۆ نەیە و نەزانێ سەر بە کام دەستەیە بۆت نەگیرێ، ئەگەر فەرماندەی بۆ دیاری کرا و چەک و فەرمانی لە سەرەوە بۆ هات، زۆر زەحمەت‌تر دەبێ.

- نا کاکە! ئەگەر خەتایەکیش هەبێ لە بارزانییەوەیە؛ ئەو گوتی شەڕ ڕاگرن. برا ئەو پیاوە هەر سواری سەری خۆی دەبێ. لە باتی سیاسەت خەون دەبینێ!

- دە بە خودا خەونەکەشی ڕاست بوو؛ دوو ڕۆژ پێشتر گوتی قاسم دەڕووخێ.

- ها، نازانی بۆچی گوتمان تۆ وەرە؟ بۆ ڕادیۆ نەبوو. ئێمە نێوانمان دەگەڵ بارزانی ناخۆشە؛ تۆی خۆش دەوێ. وا بکەی نێوانمان خۆش کەیەوە. دەبێ هەر دەگەڵ خۆم بێیەوە.

داوای لە پیاوی دەولەت کرد -کە لە بیرم نەماوە کێ بوو- لە تەیارەدا جێگەی منیش

بکەنەوە. پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە گوتی: ڕێگەی تۆ لە تەیارەدا نادەن.
تووشی یووسف میران بووم -کە برادەرێکم بوو؛ ڕوتبەی سەرگورد و لە حەبس بەردرابوو- گوتم: کاک یووسف دەترسم بتگرنەوە. با هەتا دەرفەت ماوە ڕاکەین. کاک یووسف جلکی ئەفسەری کردە بەر، بە تاکسییەک هەر ئەو ئێوارە بەرەو کەرکووک هاتین. لە سایەی جلکەکانییەوە ئیجازە دراین لە دەروازەی بەغدا دەرکەوین. لە ڕێگە جلەکانی گۆڕی و شەو هاتینە ئوتێل سیروان لە کەرکووک.
لێرەدا دەمەوێ تۆزێک بەرەو دوا بگەڕێمەوە:
چەند جار ناوی «عەبدوللا کانیمارانی»م گوتووە. لەدوای هاتنەوەم لە سووریا کەس وا دۆستم نەبووە؛ وەک گوێی کەر، جووت بووین. بە منداڵی تا کلاسی چواری سەرەتایی خوێندبوو؛ چەند ساڵێک کاسبی لادێ و ڕەژیفرۆشی کردبوو. لە کەرکووک ملی لە خوێندن نایەوە تا لە حقووق دەرچوو. لە دەورانی قاسمدا کاری حیزبی لە بەغدا دەکرد و هەمیشە پێکەوە بووین و تەنانەت پووڵی من لای ئەو بوو کە بۆم خەرج کا. زۆر جار دەیگوت: من دەچمە خاریج بۆ دوکتورا وەرگرتن، خەمم نییە چونکە تۆ برای بە ڕاستمی و ئاگات لە منداڵی من دەبێ؛ هەر وەک منیش بۆ تۆ وام. بە ڕاستی زۆرم دڵ پێ خۆش بوو.
ئەو ڕۆژانەی کە حیزب ناردبووی بچمە شۆڕش، هاتە ماڵ گوتی:
- برا تۆ کە لە بەغدا دەڕۆی نەچی بە تەمای من بی! بە خودا قەت ئەحواڵی منداڵەکانت ناپرسم!
وەک گۆزێک سەهۆڵێوم بە سەردا کەن تاسام؛ گوتم: کاکە من خودا بە هومێدی تۆی خەلق نەکردم؛ هەر وا دەزانم ئەو ڕۆژگارەیە کە تۆم نەدەناسی...
شەو لە کەرکووک بە ترس و لەرزەوە بە سەرمان برد. بەیانی بە تاکسییەک ڕۆیشتین و جادەی گشتیمان بەجێ هێشت و لە ڕێگەی دبسەوە چووینە هەولێر، ماڵی خاڵی کاک یووسف (عەبدولقادر ئەفەندی)؛ کە لە بیبیجەک چەند ڕۆژێک پێکەوە بە نهێنی ژیابووین. بەیانی بە ڕانک و چۆغە و جلکی کوردییەوە چووینە کۆیە، بووینە میوانی بنکەی حیزب. سەعید مەسیفی ناوێکی پێ ڕادەگەیشت. باسی ئەوەی کرد کە چەند مێزەر سوورێک هاتوون، ڕاینەگرتوون. تێگەیشتم کە دەبێ نێوانی حیزب و بارزانی وا خۆش نەبێ وەک من بیرم لێ دەکردەوە.
دەمەو ئێوارە گەیشتینە پشتی کانیماران؛ کە مەلامستەفا لەوێ بوو. لە بەهاری ١٩٦١را نەمدیبوو. ئەو ڕۆژەش کە دیتمەوە مانگی سێهەمی ساڵی ١٩٦٣ بوو. بێ ئیختیار فرمێسکم داباریـن. پاش بەخێرهێنانم گوتی: هەژار! من تۆ و وەهاب ئاغا -کە هەر دووک وا زگزلن- لە شۆڕشدا چ لێ بکەم؟! گوتم: ڕاستت دەوێ من لە ترسی مردنی بەغدا هەڵاتووم. قەبرهەڵقەن بیستوپێنج دینار دەستێنن و دوای دوو ڕۆژ قەبرەکە دەفرۆشنەوە بە یەکی دی. هەر هاتووم لێرە بمرم کە قەبر بە خۆڕاییە! بەڵام تکا دەکەم دەگەڵ وەهاب ئاغام حیساب مەکە! ئەو لە هەموو کەس تەنبەڵترە!
شەو لە مەجلیسی بارزانیدا گوتم: تۆ نازانی لە ڕۆزنامە و ڕادیۆ بەغدا چەندم جنێو پێ داوی؟! گوتی: بەڵێ گوێم لێ بوو. ئەرێ کێی دیکەش لێرە بوو؟ من چم گوت؟ شەوکەتی مەلاسمایل - کە ئەفسەرێکی موخابەرات بوو- گوتی: فەرمووت ئەگەر بۆ خۆم چاوم لێ بوایە کە هەژار ئەمە دەنووسێ و بۆ خۆی بۆی خوێندبامەوە، هەر دەمزانی درۆیە؛ چونکە من هەژار باش دەناسم.

گوتم: بمبەخشە! من بە عەقڵی خۆم چاکترین فرسەتی زێڕینتان لە دەست دا کە لەو چلوهەشت سەعات شێواویەی بەغدادا، هێرشتان نەکردە کەرکووک.

بارزانی گوتی: جارێ لەو باس و خواسانە گەڕێ!

سبەی پاش نوێژ دەگەڵ جەلال تاڵەبانی دەرکەوتینە گردی پشت مالان. زۆری پیاوماقووڵانی عەشایری پژدەری و دەوروبەر لێ بوو. جەلال قسەی بۆ کردن:

- کاکی خۆم بەعسی ڕەگەزپەرستن، لە بەر ئەوە ناسر یاریدەیان دەدا. یانێ لەشکری میسر و سووریا و عیراق دەبنە دژمان. ڕووسیاش یاریدەی ناسر دەدا. ئێران و تورکیش دوژمنی سەرسەختمانن. ئەمریکا و ئینگلیس یاریدەی تورک و ئێران دەکەن. لە هەموو لایەکەوە خەتەری زۆر زلمان لە سەرە. خوا بکا شەڕ نەبێتەوە...

ئاغایانی عەشایریش وەک دەڵێن: «سەرچۆپی بدەی بە گامێشێ، هەر بەرەو کادێنی دەکێشێ»، ملیان لێ نا: ئێمە تووتنەکێمان بۆ نەفرۆشراوە؛ وە پکەین چەند قرووشەکن پێ بگا؛ وە پکەین شتاقەلا دلی نەئێشێ، چلتووکەکێش بفرۆشین! خولاسە لەو قسانە کران و بلاوەیان کرد.

گوتم: مام جەلال تۆ ڕەئیسی شۆڕشی؛ ئەو قسانە دلی شەڕکەران سارد دەکاتەوە. واش بێ نابێ لە تۆی ببیەن. تۆ هەر دەبێ دلیان گەرم کەی. تاریفی ئازاد بوونیان بۆ بکە...

گوتی: کاک هەژار! تۆ حەرفێکت لە ئەلفبای سیاسەت نەخوێندووە!

- بەلێ ڕاستە نەمخوێندووە، بەلام بفەرموو چ بوو کارەکەی دەتفەرموو من پێکی بێنم؟!

- بارزانی نەخوێندەوارێکە؛ ڕووحی عەشیرەتی هەیە؛ لە حیزبایەتی نازانێ؛ گوێ بە فەرمان و دیسپلین نادا. ئێمە دەمانەوێ دەستەلات بە حیزب بێ؛ ئەو هەر فەرمان ئیجرا بکا. وەک فەرماندەیەکی لەشکری دەوڵەتان. تا وابێ بۆمان تەحەممول ناکرێ.

- بەلێ جەلال، منیش دەزانم ئەو خوێندەواریە مارکسیستەی نییە کە حیزب هەیەتی. جا یان نایزانێ، یان نایەوێ بیزانێ. حیزب لەوەدا خەتایەکی کردووە کە لە یەکەم کۆنگرەی بەغدا، دوای هاتنەوەی بارزانی، هەر چەن گوتی نابمە سەرۆکی پارتی، ناچارمان کرد و کردمانە سەرۆک. ئیجازەی حیزب و ڕۆژنامەمان بە هۆی ئەو لە قاسم ساند. لە پاش شەڕی دەربەندیخان گوتتان شەڕی بۆ نەکردین؛ بەلام ئەو کە بە بارزانیەکانی خۆی ڕاپەڕی، ئەوەی کرد کە کردی. حیزب لە شەڕێکی دەگەڵ سۆفی شێخ ڕەشیددا، چوارسەد کەسمان لەبەر سی کەسی سۆفیان شکا؛ کە سەرداری لەشکری ئێمە عومەر دەبابە بوو. بارزانی هەر سۆفیەکی لە کوشتن و بە دیل گرتن لە دەستی دەرچوون، ئاوا بوونە دیوی تورکیە. لەشکری عەشایری جاش و سوپای دەوڵەتی ڕاو نا. تا نەهات بەم دیوەدا حیزب نەبووژایەوە و لە سایەی ئازایەتی و شەڕکەری بارزانیەوە ئێستا بووینە ئەو قووەتە. کەسێکی عەشایری کە توانیبێتی ئەم فەتحە بکا باوەڕ ناکەم ڕازی بێت هەموو دەسەلاتی خۆی بداتە دەست من و تۆیەک و برایم ئەحمەدێک کە هیچ هونەرێکمان لەم هەموو شەڕانەدا نەنواندووە. بەلام وەک من بیناسم باوەڕ ناکەم بە زۆر خۆیمان بە سەردا بسەپێنێ. ڕەنگە ئەگەر داوای لێ بکەین بچێتەوە بارزان و حیزب بۆ خۆی شۆڕش بەڕێوە بەرێ، دلێی چی؟ ئەمەی پێ بلێم؟

- چۆن دەوێری؟ بە شەرەفم هەر لە دەمت دەرچێ دەس بەجێ بەر گوللەت دەدا!

- ئەگەر بەر موللەشم دا پێی دەلێم: کورد تۆیان ناوێ؛ بچۆرەوە بارزان!

«ناوێری، دەوێرم» درێژەی کێشا. هەستام گوتم: هەر ئەمەشەو پێی دەڵێم. تۆزێک دوور کەوتمەوە. بانگی کرد: ڕاوەستە! هاتە لام گوتی: وا گریمان تۆ وێرات پێی بلێی، ئەویش گوتی باشە دەڕۆمەوە بارزان، بارزانیەکانیش دەگەڵ خۆی دەبا؟!

– نا کاکە لەبەر چاوی ڕەشی من و تۆ، گوناهی وا ناکا! خۆت دەزانی ئەو بارزانییە چەکدارانە نە دەیالکتیکیان خوێندووە، نە دەزانن حیزب و میزب یانی چی. لە ژێر فەرمانی بارزانیدا نەبن، بۆ عیفریتیش شەڕ ناکەن. لە ئەلفبای سیاسەتدا زۆر لە من کۆڵەوارترن! ئەگەر بڕوا دیارە ئەوانیشی دەگەڵن.

– ئای دە بە خوا ئەگەر وا بێ ئێمە تێدا دەچین! نا بابە پێی مەڵێ! پێشی بلێی دەڵێم من نەمگوتووە!

شەو لە مەجلیس گوتم: کاکە بارزانی، ئەم کورد و حیزبە تۆیان ناوێ، تۆ بۆ ناچیەوە بارزانەکەی خۆت و لە کۆڵمان ببیەوە؟!

گوتی: دەربارەی من دەڵێن چی؟

– حیزبایەتی نازانی؛ خوێندەوار نیت؛ بە قەولی شێخ ڕەحیمی شێخی بورهان: دیکتاتۆری! لاساری!...

– کێ وا دەڵێ؟

– من! ئاخر ماویەتی: دەڵێن دزە، پوول کۆ دەکاتەوە...

– تۆ بۆ ئەوانەت نەگوت؟

– لە بیرم چوو!

– ئەگەر بڕۆم ئەوانە شۆرش بەڕێوە دەبەن؟

– بەو شەرتە هێزی بارزانیان بۆ بەجێ بێلی!

– هەزار تۆ زۆر لە دنیا تێناگەی! ئەو مامۆستایانەی دەیانەوێ پوول و پلەیەک لە دەولەت وەرگرن و بچنەوە ماڵی خۆیان. قەت وا ناکەم بەو ئارەزووە بگەن...

– کاکە! باوەڕ ناکەم نیازیان وا بێ.

– ئاە دەیبینی! بە هومێدم تۆ خۆت شێت نەکەی و تووشی ئەو نەخۆشی خۆپەرەستییە نەبی! لەمە گەڕێ! دوو قسەی سەیری بەغدا بگێڕەوە!

لە کانیمارانەوە چووینە «چوارقوڕنە». حەشامەتێکی زۆر بوو. کۆبوونەوەی تووتنەکێ و چەلتووکەکێ هەر هەبوو؛ بەلام بە دزی بارزانی. پێشمەرگە داوەتیان دەکرد؛ بە نیشانە داکردنی بە بەرد سەرگەرم بوون. چەند ڕۆژێک بوو دەگەڵ لەشکر بووم. خاوەن ماڵ –کە ئەغلەب ئاغا گوند دەبوون– گۆشت و پلاویان دەداینێ. پێشنیارم کرد: کە زۆر وێدەچێ شەڕی ئێمە زۆر بکێشێ. هەر گوندێکی دوو جاری میوان بین، خواردنیان نامێنێ. بۆ ئێمە نەیکەینە جەم و دەمی حیسابی؟ لە هەفتەیەکدا برینج، دەنا نیسک و نۆک و ساوار و ئەو شتانە بخۆین. هەر کەسیش لە خەلکی گوندان، ئەگەر بلێین تۆ لە سالێدا چوار یا پێنج دینار بۆ نانی پێشمەرگە بدە! زۆریشی پێ خۆش دەبێ. چەند کەسێک –کە یەک لەوانە ئەحمەد تەوفیق بوو– گوتیان: نەخێر خەلک بەو میوانداریە فەخر دەکەن و ئەگەر بیگۆڕین دلیان دەشکێ. پێشنیارەکەم قبوول نەکرا.

بنکەکانی حیزبی بە حیساب و دەستندە بوو. تەنانەت هەر کەسە ڕۆژێ سێ دەنک نۆک،

نازانم چەند دەنک نیسک و خولاسە بە وردە حیساب دەیاندرایە؛ کە من ئەوم بە لاوە پەسند بوو. هەر چەند دەشمبیستەوە کە مامۆستا گەورەکان پارووە چەورەیان هەیە...

**ئەحمەد تەوفیق**

بۆ هەوەڵ جار «ئەحمەد تەوفیق» یان بڵێم «سەید عەبدوڵلا ئیسحاقی»م لە شام دیت. لاوێک بوو دوازدە ساڵ لە من کەم تەمەنتر. گوتی دەچمە چیکۆسلۆواکیا.

وردە کێشەمان کرد: ئەو کە زۆر مارکسی زانا بوو، لای وا بوو ئەو دەوڵەتانەی لەوبەری دەریاوە دێن ولاتان داگیر دەکەن، ئیستیعماری و سەگ و سەگبابن. من دەمگوت: فەرقی چییە لە وشکانی و لە دەریاوە بێ؟ ئەگەر بمخوا، سەگباب و زاڵمە. خواردن خواردنە؛ بە کەوچک و کێرد و چەنگاڵ بێ، یان بە چنگ و نینۆک و گاز بێ! دەیگوت: ئێمە دەبێ وێرای ئێرانییەکانیتر وەبەر ڕەحمەتی شیووعی کەوین و کوردی عیراقیش وێڕای عەرەب و کوردی تورکیا وێڕای هەموو تورکەکان. من دەمگوت: برا! من بڕوام وا نییە کورد، ئێرانی و عیراقی و تورکیایی هەبێ. من خەڵکی ولاتێکی گەورەم ناوی کوردستانە. سێ-چوار دەوڵەت داگیریان کردووە، دەیخۆن. دەوڵەتە گەورەکانیش یاریدەیان دەدەن کە بە زاری ئەوان بمانخۆن. با ئێمە خۆمان لە بیر بێ، گەلانی هاوساش ئەگەر یاریمان بکەن سوپاسیان دەکەین... زۆرمان لەو قسانە دەکرد. نە ئەو لە بیری خۆی دەهاتە خوار، نە منیش بەرەو عیلمەکەی ئەو سەردەکەوتم!

لە پاش هاتنەوەی بارزانی، لە بەغدا تووشی بوومەوە. وا دیار بوو لە سابلاغ لە سەر کوردایەتی، خۆی لە گرتنێک ڕزگار کردبوو؛ هاتبووە عیراق. بە نەناسیاوی لە سولەیمانی خۆی گرتبۆوە؛ چەند برادەرێکی کوردی ئێرانی هەڵاتووی دەست ژاندارم و پۆلیسی ئێران، لێی کۆ ببوونەوە. بە ناوی «کۆمۆنە» کۆمەڵێکیان پێکەوە نابوو؛ ئەحمەد سەرۆکیان بوو. دیار بوو سەرۆکایەتی حیزبی دیمۆکراتی کوردی ئێرانیشی دەکرد. لە سولەیمانییەوە بە دزی هاتوچۆی دیوی ئێرانیان دەکرد. مودیر ئەمنی سولەیمانی (حوسێن شیروانی) -کە کوردێکی باش بوو- لە گرتنی عیراقی دەپاراستن. بە هاتنەوەی بارزانی زۆرتر خۆیان ئاشکرا کرد. لە بەغدا دەمدیتەوە و بووینەوە ئاشنا.

شەڕی بارزانی و قاسم گەرم ببوو. ئەحمەد هاتە بەغدا و پێم سەیر بوو چۆن توانیویە لەو ڕێگە دژوارە خۆی دەرباز کا. گوتی هاتووم جلک و دەرمان بۆ بارزان بەرم؛ کە هیچیان نییە. ویکەوتین جلک و دەرمانی زۆرمان پەیدا کرد. ئێستاش نازانم چۆنی گەیاندنەوە بارزان کە بە ڕاستی کارێکی ئازایانە بوو. هەروەها چووبوو لە بێرووتەوە «دانا ئادام شمیت»ی پەیامنێری ئامریکایی گەیاندبووە لای بارزانی؛ کە لە کتێبەکەی (سەفەرێک بۆ ناو پیاوە ئازاکان)دا زۆر بە چالاکی و نەترسان و کارزانی ئەحمەد تەوفیق هەڵدەڵێ. جارێکیش لە بەغدا پێکەوە چووینە سەفارەتی میسر؛ وەک باسم کرد. عەرەبی نەدەزانی من تەرجومانیم دەکرد. لە قسە کردنی سیاسیدا بە وریام هاتە بەر چاو. لە چوارقوڕنەش دیتمەوە؛ بەلام ئەمجارە ئەو فەلسەفە و فلتە-فلتەی پێشوو نەمابوو؛ کە من تێی نەگەم. ببوە کوردێکی خۆماڵی و هاتبووە سەر ئەو بڕوایە: هەر کەس کوردستان لە کورد داگیر بکا، لە بەراز و ئیستیعماریش پیسترە...

لە کۆبوونەوەیەکی دەشت، چەندێک لە هاوکارانی ئێرانی خۆی پێ ناساندم کە «سەلاحی موهتەدی» (بە ناوی مستەفا)، «محەممەدی سمایلی مەحمووداغا» (بە ناوی کاوە)، «سولەیمان

موعینی» (بە ناوی فایق ئەمین)، «مینە شەم» و چەند کەسێکی‌تریش بوون.

ئەحمەد گوتی: ئەگەر لە خۆمان بی زۆرمان پێ خۆشە.

گوتم: ئەگەر مەتلەبت ئەوەیە لە حیزبی دیمۆکراتی ئێران بم، نابم. چونکە من ئەوا بیست و ئەوەندە ساڵە لە ئێران دوور کەوتوومەوە؛ هیچ شارەزاییم نەماوە. من لە کوردستانی عیراقدا وەختە بڵێم ورد و درشتیان هەموو دەناسم و دەشزانم بە چەند مەنزڵدا تێپەڕیون. لە بەر ئەوە وەک هەواڵێکی ناحیزبی بە دۆستم حیساب کەن! گوتی زۆر ڕازین.

***

قەرار درابوو هەموو حیزبی و لاگرانی شۆڕش -لە ئاغاوەت و ڕۆشنبیران- لە کۆیە کۆ بنەوە و لە سەر باسی حەقی کورد قسە بکەن و دەگەڵ دەوڵەتی کوودەتای بەعس بکەونە وت‌ووێژ. چووینە کۆیە. مەلامستەفا لە گوندی «تۆپزاوا» لە نزیک شار، مەنزلی گرت. ڕۆژانە دەچووە سەر ئاوی حەماموک. ئەگەر کارێک هەبوایە دەهاتەماڵی «کاکە زیاد» لە شار. ئێوارەیەک دیتم مەلامستەفا لە سەر کێوێکی ڕژدی کوڕی ڕۆژاوای حەماموکە. بە پێ، وردە-وردە پێ هەڵگەڕام. کە سەرکەوتم، دیتمی؛ گوتی: خوا شوکور تۆ لە وەهاباغا زۆر باشتری، دیارە دەگەڵمان دەردەبەی!

لەشکر و میوان لە ماڵانی شار دامەزران. زەبیحی و من چووینە ماڵی مام قادری باغەوان؛ کە لە پێشدا لە مەهاباد ناوی سەید حەمەقالە بوو. لە پاش زۆر حەبس و جزیاکێشان کەوتبووە کۆیە و باغەوانی کاکە زیادی دەکرد. تاهیر یەحیای سەرۆک وەزیر و کۆمەڵێک لە پیاوماقووڵانی بەعس بۆ وت‌ووێژ هاتنە خەلەکان (ژێگەی ئیبنو خەلەکانی مێژوونووس). وت‌ووێژ دامەزرا. بەر لە هەر شت گوتیان جێژنی نەورۆزتان بۆ دەکەینە قانوونی. گوتیان ئێوە واز لە خودموختاری بێنن، لامەرکەزیتان دەدەینێ. قسە زۆر هات و چوو؛ کە من هیچ ئاگاشم لێ نەبوو تا بڵێم چۆن بوو. حیزب قبووڵی کرد و قەرار درا بیخەنە بەر بیروڕای گشتی و کۆنگرە لە کۆیە تەشکیل بدەن. هاتینە «ڕانیە». نازانم چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە، ئەوەندە دەزانم کێچ نەیدەهێشت بخەوین. کەوشە لاستیکەکانیشیان لێ دزیبووم! لە ڕانیەوە بەرەو کۆیە هاتین.

لە سابلاغیش کە ناوم شاعیری میللی و لە نزیکانی پێشەوا بووم، لە پاشانیش هەتا ئێستاش، کەیفم بە دەعوەت کردنی سیاسی نەهاتووە و نایە. پیاوە دەوڵەمەندەکانی کۆیە دەعوەتیان دەکردم. دەیانگوت: چت پێ خۆشە بۆت لێ نێین؟

- دۆکلیو! لە دۆکلیو زیاتر ناخۆم!

خوا بتحەسێنێتەوە! تووڕە دەبوون و دەیانزانی چەند نانەجیبم! زۆربەیان وازیان لێ دێنام. جەنگەی کەنگر و گیا بوو. بەیانیان مام قادر دەیگوت: دەچمە بازاڕ چ بکڕم؟

- کەنگر و ماست، گیا دۆکلیو!

ئەویش بە قەد منی حەز لێ دەکرد.

ڕۆژێ لە سەر جادەی کۆیە میرانی سالحبەگ -لە میرانی شەقلاوە- بانگی کرد:

- هەزار وەرە! گەنجێک هاتییە دەرێ سابراغیمە. هیچ دە زمانی ناگەم. هەر دەرێ: «مەزوورم! مەزوورم!»، ئەتۆ بزانە دەرێ چی؟

بەلێ گەنج ناوی حەسەنە؛ برازای ئەحمەد تەوفیقە. لە مامی خۆی دەپرسی. خۆشناوێک و سابلاغیەکی دەق نەشکاو، تێک نەگەیشتوون. حەسەن وشەی «مەنزوورم» بە کار دەبا، ئەو لای



وایە مەزوورم دەبێ چ بێ!
لە کۆیە تۆپێنمان دەکرد؛ تۆپێکم لە پشتی مەسعوود بارزانی دا. بارزانییەک هات:
- چۆن تۆپ لە پشتی مەسعوود دەدەی؟
- کاکە ئەوە تەقلەیە؛ ئاغا و نۆکەری تێدا نییە. لێدەدەم و چاتریش!
زۆری پێ سەیر بوو!
زەبیحی لەم بەینەدا بۆی گێرامەوە کە ڕۆژی کوودەتای بەعس، پادگانی کەرکووک خەبەریان داوەتێ: بە تۆپ و تانک و هەموو چەکێکەوە دەبنە یاریکاری شۆرش و قبوول ناکەن ژێردەستی بەعس بن. بەلام حیزب قبوولی نەکردووە؛ گوتوویە: ئێمە لە حەبسدا قەول و قەراری خۆمان دەگەڵ بەعس بڕیوەتەوە؛ بە گژیاندا ناچین. جوابی پرسیارەکەم لە جەلال -کە لە بەغدا لێم کرد- دەست کەوت.
هاتوچۆی بارزانیش و کاک برایم ئەحمەدیشم دەکرد. ڕۆژێک یەکێک بە برایمی گوت: کابرایەک لە هەردووک لاقان سەقەت، بە سواری کەر لە دێهات چەرچیەتی دەکا. زۆرمان خەبەری زۆر گرینگ بۆ دێنێ؛ هیچیشی لە حیزب ناوێ. دەڵێ کاربەدەستان دەڵێن تۆ دەبێ حاشا بکەی لە حیزبی پارتی، دەنا ڕێگەی کاسبیت نادەین. دەڵێن چی بۆ مەسلەحەت بنووسم من پارتی نیم؟
برایم گوتی: ئێوە پێتان چۆنە؟
- زۆرمان پێ باشە ئەو حاشا بکا، چونکە زۆر بەهرەی هەیە.
بە قامکی شادەی ڕاسا: دەبێ ئەو سەگبابە ئیعدام کرێ!
- چۆن؟
- با بۆ مەسلەحەتیش بێ سەر بۆ دوژمن نەوی دەکا!
جارێک دووبەدوو بووین. گوتم: برا حەیفە ئێوە دڵی بارزانی بشکێنن. هێز و هەیبەت و فەرماندەیی ئەو بۆیە نابێ بە کاری هیچ و پووچ لە دەست خۆتان بدەن.
- وەک چی؟
- وەک ئەوە ئێوە دەچن لە بنەوە پووڵ دەدەن بە «عەبدولواحیدی حاجی مەلۆ» کە دەگەڵ خۆمان بە و لە بارزانی بتەکەوە. قوماربازی کۆیە هەر ئەو شەوە پووڵەکەی ئێوەی لێ دەبەنەوە و ئاشکرا دەبێت. وەک ئەوە «کەکۆ»ی بارزانی -کە مریدێکی گیانفیدای بارزانە- بانگ دەکەن، پێنجسەد دیناری دەدەنێ کە واز لە بارزانی بێنێ. کەکۆ پووڵەکە لە ناو دەسرەکەدا لە پێش بارزانی دادەنێ دەڵێ: ئەزبەنی ئەڤی دانە من، نزانم چەندە، دبێژن تە بمەڕا بە! بارزانی دەڵێ: بۆ خۆتی هەڵگرە. لەوەش پیستر: شەللاتی سولەیمانی چەکداری ئێوە دەڵێن: منداڵێکی مێزەر سووری عەقراویمان بردۆتە حەمام؛ هەر چونکە وەک بارزانیان دەچێ...
برایم حاشای لەوانە کرد. بەلام گوتی: بارزانی بۆتە چقڵی چاوی حیزب، کوێری کردووە. ئەگەر چقڵەکەش دەربخەین هەر کوێر دەبین.
- کاک برایم! ئەوانەی بۆم گێڕایەوە بارزانی هەمووی بیستوون. ئەگەر وەک دەفەرمووی ناتوانن خۆتان کوێر کەن، ئاگاتان لە خۆتان بێ...
ڕۆژێک دووبەدوو دەگەڵ زەبیحی چووینە حەمامۆک بۆ لای بارزانی. قسەکانی مەجلیسەکەم لە بیر نەماوە؛ بەلام هەر لە دەوری کێشەی فکری مامۆستایانی پارتی و بارزانی دەگەڕا. زەبیحی

گوتی: ئەگەر کەس لە دەوری بارزانی نەبێ، من تەنیا٭کەسێکم کە بە جێی نایەڵم. یان گوتی: ئەگەر بە تەنیا لە سەر بەردێک بمێنێتەوە، دەچمە تەنیشتی، چونکە دەزانم حەق بەوە.

ڕۆژێکی دی عەبدولحوسێن فەیلی و یەدوڵلا فەیلی -کە هەردووک لە لێژنەی مەرکەزیدا بوون- لە حەمامۆک بە مەلامستەفایان گوت: ئەمانە (مەنزووریان برایم و دەستە و بەستەی بوون) خەیانەت بە مەسەلەی کورد دەکەن. تۆ وەک سەردارێکی بە بڕشت محاکەمەیان بکە و شایەتی لە ئێمە و ئەوانەی وەک ئێمە شارەزا بخوازە. ئەگەر بە گوناهبار دەرچوون گوللەبارانیان کە! کە بە گوناهباریش دەردەچن.

من -کە نە پارتی بووم و نە ڕەسمیەتێکم هەبوو- لە خۆمەوە هەڵمدایە:

- جەناب بە بیری کورتی من، دوور بە دوور یەکتر موتەهەم مەکەن! ڕاستە پرس و وەرامێک با لە ناوتاندا بێ. ئەگەر خەیانەت ناکەن خوا هەڵناگرێ بە خراپیان بزانی. ئەگەر خەیانەتیش بکەن با کۆمەڵی شایەت بزانن و لە ڕیز دەرکەون. لام وایە هیچ شۆڕشێک ئەگەر لە سەر زەویەکی سەخت و بە متمانە ڕانەوەستێ، بنی بۆش بێ، تێک دەڕووخێ.

بارزانی گوتی: بە قسەی هیچتان ناکەم. بیانکوژم دەبنە شەهیدی ئازادی و دەکرێنە پیاوی گەورە لە لای دڵپیسان. بەڵام لێم ڕوونە بۆ خۆیان ئابڕووی خۆیان دەبەن. من خۆیان تێ ناگەیەنم، چ دەکەن با بکەن.

لە بیرمە شەوێک «عومەر دەبابە» هات، چەمەدانێکی ڕەشی پێ بوو؛ دای بە مەلامستەفا. دوای دوو ڕۆژیش گوتیان دوازدە تفەنگی برنۆی هێناوە. وەک من گوێبیست بوومەوە: حیزبی پارتی، بە بێ پرسی مەلامستەفا، دەگەڵ ئێرانییەکان پەیوەندی گرتووە. عیسا پەژمانی ساواکی هاتۆتە لایان، بڕیاری داوە ئێران بە دزیەوە یاریدەیان بدا؛ بەو شەرتە بارزانی -کە دوژمنی سەرسەختی شا و کومۆنیستی مۆسکۆیە- لە ناو خۆیان دەراوێن. پووڵ و تفەنگیان هێندێک وەرگرتووە.

بارزانی بەوەی زانیوە. بۆ ڕازی کردنی بارزانی هێندێک پوولیان هێناوە و گوتوویانە ئەمە بەشی تۆ بۆ لەشکرکێشی و ئێمە فێڵێکە لە ئێرانی دەکەین و هەر موخلیستین. کە بارزانی گوتوویە: تفەنگەکانتان چ لێ کردووە؟ چوون ئەو دوازدە تفەنگەشیان هێناوە.

وا دیار بوو ئێرانی لە عەقیدەی کومۆنیستی پارتی ڕازییە؛ بەڵام لە بارزانی دەترسێ. چونکە پارتی برایم بەرنامەی حیزبەکەشی هەمووی بڕوا بە سیستمی مارکسی بوو. هەموو تەکیەشی لە سەر ئەوە دەکرد کە عەرەب برامانن و مۆسکۆش قیبلەمانە. ئەو هەموو چەکەی رووسیا کە بە دەستی عەرەب لە دەورانی قاسمدا لە کوردستان دە کار کرابوو، تۆزقاڵێک لە ئیمانی حیزبی کەم نەکردبوو.

گوتیان کۆبوونەوەیەکی گەورە لە دەشت دەکرێ بە موناسەبەی جێژنی نەورۆزەوە. شێعرێکم بە ناوی «کاوەی مەزن» نووسی کە لە دیوانەکەمدا چاپ کراوە. لە حەمامۆک بۆ بارزانیم خوێندەوە. بە تووڕەیی گوتی: ڕازی نیم بیخوێنیەوە! نابێ کەس تاریفی من بکا؛ بیدڕێنە!

گوتم: باش گوێ بگرە! بیشیدڕێنم لە بەرم کردووە. نەشهێڵن بیخوێنمەوە، ڕۆژی جومعە دەچم لە سەر میکرۆفۆنی مزگەوتی گەورە بۆ خەڵکی دەڵێم. ئەو دەم دەتوانی دەرمکەی! دەتوانی بەر گوللەم دەی!

زۆری گوت و هیچم نەگوت. کۆبوونەوە کرا. مەلامستەفا نەهاتبوو؛ بەڵام تەواوی خەڵکی

میوان و حەشاماتی شاری کۆیە و چەکداران لە دەشتی لای «گێستهاوس» (میهمانسەرا) کۆ بیوونەوە. سەکۆیەک لە دار و تەختە بەرزەوە کرابوو. هەموو سەرانی حیزب کورسی و نیمکەتیان بۆ داندرابوو؛ بە نیودایرەیەکی پان ڕۆنیشتبوون. خەڵکیش لەو نیودایرە زلەدا لە پشتیانەوە بە چەندین سەف ڕاوەستابوون. من لە گێستهاوس بووم. یەکێک گوتی: تۆ هیچت نییە بیخوێنییەوە؟

- نەخێر، بە داخەوە.

چونکە دەبوو هەر کەس چی دەڵێ، نوسخەی بدا کۆنترۆڵ بکرێ؛ بەرانبەر بە سیاسەتی حیزب بێتەوە؛ ئەوسا ئیجازە بدرێ. وتاری حیزب خوێندرایەوە. چەند وتارێکی دیکەی بە شوێندا هات. ئەو دەمە کە هەموو کەس ببوونە گوێ و دنیایەکی کڕ و مات بوو، سەبرێک بەرەو خەڵک چووم و بە کاک برایمم گوت: ئەرێ بۆچی شیعرێکی خۆم نەخوێنمەوە؟ نە لای وا بوو شیعری تازەیە، نە وەختی ئەوەش مابوو بلێ تا کۆنترۆڵ کرێ. ئیشارەی دا بە کەمال محێدین کە بگێڕی جێژنەکە بوو. ئەویش لە سەر میکرۆفۆنەوە بە دەنگی بەرز گوتی: ئیستا کاک هەژار لە شیعرە باشەکانی خۆی شتێکمان بۆ دەخوێنێتەوە. فەرموو کاک هەژار!

سەر لە هەوەڵەوە هەر بەیتێکم کە دەخوێندەوە، دەنگی ئافەریم و بارەکەڵلای مامۆستایان بەرز دەبوو: «دەی توخوا دووپاتەی کەوە...»، تا گەیشتمە بەندی سێهەم و گەییمە ئەو دوو بەیتە:

«عەرەب حەزیای خواردنمان بوو داواکاری مردنمان بوو
لە سەر خاکی کوردەواری ڕەش و پاپەتی داباری»

وەک «بسم الله» لە جندۆکە بکەی، قەت تاقە مامۆستایەک نەما، کورسی و نیمکەت بەتاڵ و حەتاڵ مانەوە. نازانم عاسمان هەڵیکێشان؟ عەرز قووتی دان؟ چۆن وا لەپڕ غەیب بوون؟! بەلام چەپلەڕێزان و هوورای حەشامەتەکە حەشری دەکرد. هەمووی داخ لە دڵ لە عەرەب، لە بۆمبا و تەیارەی ڕووس، نەشیانوێرابوو گلەش بکەن؛ ئەوا من بە زمانی دڵی ئەوان دەڵێم. هەر دەیانگوت: بیلێوە! ئەی ڕەحمەت لە بابت! دیسان بیلێ!... زۆری کێشا تا شیعرم خەلاس کرد. کەمال محێدین کە دە پێشدا زۆری تاریف کردبووم: «مامۆستای هەڵکەوتوو و شاعیری بێوێنە...»، چووە پشت میکرۆفۆن گوتی:

- برایانی عەزیز! ئەو قسانەی هەژار بیر و بڕوای حیزبمان دەرنابڕێ. ئەو بۆ خۆی مەسئوولی ئەو قسانەی خۆیەتی.

هەموو بیسەرێکی زۆر دڵخۆش کردبوو. بە دەیان کەس چووبوونە ماڵی مام قادر گوتبوویان: شیعری کوڕەکەی تۆمان زۆر پێ خۆش بوو! ئەمەش ببوە گاڵتەی خێزانی مام قادر، دەیگوت: هەژار کوڕی تۆ بێ، دیارە زۆر پیری!

ئیتر بوو بە سرتە و خورتی حیزب کە هەژار تێکدەر و گێرەشێوێنە و زیانی بۆ پەز هەیە. بارزانیش لەوە کە دیبووی خەڵک بە گشتی لە شیعرەکانم ڕازی بووە، لە لۆمە دەستی هەڵگرت و بە ڕوویدا نەدامەوە.

شەوێک لە تۆپزاوا گوتم: حەزم دەکرد بە تەنێ بتبینم. چووینە ژوورێکی چکۆلەی خۆڵی تەندوورە شکاوێک و لانک و جل و جۆڕ تێدا، لە سەر بەڕەیەک دانیشتین. گوتم: برا! لە مێژ ساڵە هەر ئاواتم بووە لە نزیکتەوە بژیم. دەمیشم شڕە؛ ناتوانم بێدەنگ بم. با قەرارێک بدەین:

ئەگەر بە خەیاڵی خۆم عەیبێکم دیتەوە و گوتم، بە هاسانی و بێدەنگ بڵێ بەرن دوو گوللەی پێوە نێن! بەڵام بە هیچ جۆر دەرم مەکە. پەشیمانم کە ئەو ڕۆژە گوتم دەتوانی دەرم کەی. «با لە سەر زوێڵە چەرم بێ»، بە قسەم مەکە و دەرم مەکە! گوتی: باشە قەرار بێ. ئیتر لەو ساوە ئەوەندە ساڵەی دەگەڵیا بووم، هەر کە دەهات لێم توورە بێ، دەمگوت: «ها، لە سەر زوێڵە چەرمە!»، ناچار پێدەکەنی و ئەوپەڕی دەیگوت: ئاخر تۆ بۆ کاری وا دەکەی؟!

ڕۆژی کۆبوونەوەی کۆنگرە هات. لە ساڵۆنی مەدرەسەیەک کۆنگرە گیرا. بگێڕی کۆنگرە جەلال تاڵەبانی بوو. برایم و باقی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بە ڕیز لە سەر شانۆ دانیشتبوون. بارزانیش لەوێ بوو. من بە ئەحمەد تەوفیقم گوتبوو ئەگەر هەلم دەس کەوێ لەوانەیە قسە بکەم. چووبوو زەبتی سەوتێکی هێنابوو. دیارە مەمانان -کە بۆرەپیاگ بووین- دەگەڵ بۆرەپیاگان بە پێوە ڕاوەستابووین و من و ئەحمەدیش لە پشت هەموو ڕیزانەوە بووین.

قسە زۆر کرا، هەر مامۆستایەی بە نۆرەی خۆی. حیزبی پارتی کە قەراری قەتعی دابوو هەرگیز لە خودموختاری دەس هەڵناگرێ، ئەو شەوە بارەکە گۆڕا. کاک برایم دوور و درێژ لە سەر ئەوە دوا کە: دەوڵەت دەڵێ لامەرکەزیتان دەدەمێ. لامەرکەزیش دەگەڵ خودموختاری ناوەرۆکی یەکە و ناوەکان جیان! مەعلووم بوو قسەکەرەکانیتریش ئیسباتیان کرد کە وەختە لامەرکەزی لە خودموختاری چاتریش بێ! جەلال هەرای دەکرد: «کێ موافیقە؟... بەڵێ تەسویب کرا!». قەت دە سانیە نێوان نەدەکەوتە «کێ موافیقە؟» و «تەسویب کرا». وەک سەحنەسازیەکی زۆر گاڵتەجارم دەهاتە بەرچاو. لە هەلێکدا لە پشت ڕیزەکانەوە هەرام کرد: ئەگەر ئیجازە هەبێ قسێکم هەیە.

جەلال گوتی: دە ناو لیستی قسەکەراندا نەنووسراوی، وەختیش خەلاس بووە!

ڕووم کردە بارزانی: یانی چی؟! مەسەلەی سەرنویشتی کورد -کە منیش کوردێکم- باس بکرێ و نەتوانم قسەیەک بکەم؟

بارزانی گوتی: قسەی خۆت بکە! ئەحمەد بە دزیەوە زەبتی لە بن مێزێک وە کار خست. گوتم: ئەوانە هەمووی قانوونزانن؛ دەڵێن لامەرکەزی هێندە و هێندە باشە. من کە لە قانوون سەرم دەرناچێ. دەوەندە گەیوم لامەرکەزی یانێ دەوڵەت بە ئەستانداران هێندێک کار دەسپێرێ کە بۆ هەموو شت چاوەنۆڕی فەرمانی پاتەخت نەبن. لێرەدا ئێمە و بەسرە و مووسڵ و ئەستانەکانیتری عارەبنشین دەبینە یەک خاوەن حەق. تەنانەت کوردستانیش لە کەرکووک و هەولێر و سولەیمانی و دیالە دەبێتە چوار لامەرکەزی کە هیچ دەخلمان بە سەر یەکەوە نابێ. ئەستانی سولەیمانی لە بوودجەی خۆی جادە ئیسفالت دەکا، ئەستانی کەرکووک کارخانەی جووجەکەشی پێ باشترە... سەرباز و پۆلیس و دادگا و چی و چیش حەقی مەرکەزە.

خولاسە زۆرم ڕست، گوتم: ئەگەر لامەرکەزی و خودموختاری هەر یەکن، من لام وایە خودموختاریمان بدەنێ. هەم ناوەکەی خۆشترە و ناوەرۆکەکەشی بە قەولی حقووقزانان هەر یەکە. ئەمجار ئەمن نازانم ئێمە لە زەبوونی و بێهێزیە قسە دەکەین یان لە هێز و دەسەلاتیکەوە؟ ئەگەر لە زەبوونیەوەیە، قسەم نییە و بە لامەوە کۆبوونەوەکەمان زیادییە؛ دەوڵەت هەرچی گوت وا دەکەین. ئەگەر لە هێزەوە قسە دەکەین و لە بریەتی ئەو هەموو خوێنە ڕژاوانە و ماڵە سووتاوانە و لە زینداندا ڕزاوانە داوای حەقێکی شەرعی دەکەین، چونە کە هێشتا ئابلۆقەی ئیقتیسادی لە سەر سولەیمانی و هەولێر هەڵنەگیراوە و هێشتان تەنەکەی نەفت بە

دوو دیناره و هێشتان له ڕێگه و بان هەموو ماستفرۆشێکیش چەند جار دەپشکنرێ؟ ئێمه لێره لامان وایه دەوڵەت ئەوپەڕی بەزەیی و پیاوەتی دەگەڵ نواندووین کە هێشتوویه کۆ بینەوه و هەموومان قۆڵ له سەر لامەرکەزی ئەسپاردەی ئەو بکێشین. بۆ دەبێ ئێمه «سەری ڕەش»، ئەو کێوه گرینگه لەشکرییه بەجێ بێڵین -کە نیشانەی نییەت باشیمان بێ- ئەما ئەوان حەساری ئیقتیسادی لا نەبەن؟ ئەم جار دەوڵەت به سەتان تەیاره و هیلیکۆپتەری هەیه. بۆ دەبێ ئێمه بۆ گفتوگۆ بگەینه بەغدا؛ ئەویش ئیجازەی سەفەر له پۆلیسی دەرگای شاران وەرگرین؟ بۆ مەرکەزی وتوویژ له کەرکووک نەبێ کە هەموو وشەیەک به بێسیم و تەلەفۆن دەتوانن به بەغدا بڵێن؟ ئەگەر له بێهێزیەوه قسه ناکەین، ئەم ئاغایەتی و نۆکەریەته پڕ له سووکایەتییه یانی چی؟ با ئەوان هەنگاوێک بێن، ئێمه «الحکم لله» دوو هەنگاو دەچین...

گەرم داهاتبووم؛ لەم بارەوه بۆم دەهات. کابرایەک به ناوی «سەمەد مەنجەڵ» -کە له بەغدا به سەر ئیدارەی مریشک و جووجکی دەوڵەت ڕادەگەیشت و خۆشەویستی پارتی بوو- ئەو شەوه لەوێ عەبایەک به شانەوه، دانیشتبوو؛ بڕی به قسەکەم دادا. جەلال گوتی: کاک سەمەد قسەی هەیه. سەمەد گوتی: ئەم قسانەی هەژار هەمووی زیادین. ئێمه کە له سەر دۆشەک، له ماڵی گەرم ڕامانبواردووه، حەقمان نییه تەداخول بکەین. ئەوانەی له مەیداندا بوون حەقیان هەیه!

گوتم: کاک سەمەد! چونکه خەیاڵم نییه باسی خۆم و دیفاع له غەیری ئازادی کوردستان بکەم جوابت نادەم؛ ئەگینا ئێستا شەرمەزارم دەکردی.

بگێڕ ڕایگەیاند: جەلسه دوایی هات و دەستەی وتوویژکەران دەچنه بەغدا.

بارزانی لەم ناوەدا قەت بیروبڕوای به «ئا» یان «نا» دەرنەبڕی و کۆڕ بڵاوەی کرد. شەو درەنگێ کە هاتینەوه، به منی گوت: بەعسی ده ئێوارێدا سەمەدیان به تەیاره ناردۆته کەرکووک، به هیلیکۆپتەر هاتۆته هەولێر، به پەله گەیاندوویانەته جەلسه کە؛ نەوەکا باسی لامەرکەزی تێک درێ. پوولێکی باشیشیان داوەتێ. هەمووم خەبەر هەیه.

ئەحمەد تەوفیق زۆر ماندوو بوو. زۆربەی کاروباری چەک کڕین و دامەزراندن و پێ ڕاگەیشتنی چەکدارانی له مل بوو. نەیدەکرا سەری خۆی بوخرێنێ. سەرباری ئەوەش، ئەندامانی حیزب له ئێرانەوه دەهاتن و به وانیشەوه سەری قاڵ بوو.

بۆ یەکەم جار شەوێک سەلاحی موهتەدی منی تاقی کردەوه و ملی له خراپەی ئەحمەد نا. یەک له گلەییەکانی ئەوه بوو کە: ئێمه له ئێرانەوه یارمەتی پووڵ، گۆرەوی و دەستکێش و شتی وامان بۆ پێشمەرگه هێناوه؛ نازانین ئەحمەد چی لێ دەکا؟ گۆرەوی داوه به هەباساغا...

گوتم: کاکه! من کە دەگەڵتان نیم. نه قسەی تۆ به ئەحمەد دەڵێم نه به بارزانی. بەڵام ببەخشه! تۆ و چەندێکی وەک تۆ به پیاوی خوێڕی دەزانم؛ هاتوون نانی پێشمەرگەی بێچاره دەخۆن. ئەگەر له وڵات، هەر خۆت بکردایەته عەجەم و دۆستی دەوڵەت بوایەی، بەڵام بتتوانیبا چەند مەدرەسەیەک به دەوڵەت له دێهاتەکاندا بکەیەوه، زۆر لەوه به شەرەفتر بوو.

بنکەیەکی چەکدارانیشیان له گوندێکی نزیک کۆیه بوو، ئەوانیش گلەی ئەوەیان هەبوو کە ئەحمەد کەمتریان پێ ڕادەگا. هەر چەند جوابی ئەوانیشم هەر دەداوه کە من حەقم به سەر ئەو کارانەوه نەداوه، دیسان دووبەدوو ئەحمەدم دواند. گوتی: له سەلاح به شکم؛ دەترسم ساواک ناردبێتی. بەڵام بۆ بنکەکه چۆنت پێ باشه وا دەکەم. گوتم: هەموویان به کاوه ڕازین، بیکه به

وەکیلی خۆت! کردی. لە سەر ساواکی بوونی سەلاح زۆرم لۆمە کرد کە: ئەم کوڕە ئاغا نازدارە وەک مەیتەر و کەردارێک کار دەکا و بە نانی وشک ڕازییە، چۆن وای پێ دەڵێی؟ گوتی: بەخوا من وای دەزانم هاتبێ کارمان لێ تێک دا.

ها، تا ئەوەشم لە بیر نەچووە:

لە چوارقوڕنە بووین. مامۆستا سالح یووسفی کە سەربەخۆ پیرۆزبایی ڕەسمی لە تەرەف کوردانەوە لە بەعسی کردبوو، هات. چووە لای مەلامستەفا. دەمانزانی بارزانی زۆری لێ قەڵسە. ڕێگەش نەبوو بچینە ژوور. هەمزەی حەسەناغای مەنگوڕ لەوێ هاتە دەر.

- دەی هەمزاغا باس و خواس؟

- وەڵلاهی بە سەری تۆ مەلامستەفا حەجەمەی دە مالێ کول کردبوو. حەجەمەش هەر تفی قووت دەدا و ملی درێژ دەکرد و دەیگوت: پوولم یۆخ!

ئەو هەمووو کۆت و شەڵوار لەبەرێکی بە عەجەم دەزانی! لە کرمانجیش تێنەگەیبوو؛ لای وا بوو بە ترکی قسە دەکەن. کە ترکیش نازانێ!

لە کۆیە بووین، پەیامنێرێکی فەڕانسی بە ناو «فڕانسوا» لە تەمەنی بیستودوو ساڵەدا پەیدا بوو کە عەکس و خەبەر بۆ چەند مەجەللەیەک بەرێ بکا. ئینگلیسی باش دەزانی. موتەرجمێکی ڕەگەڵ خرابوو ئەنوەر میرزای ناو بوو. دەیگوت لە سەدی کەرەج کارم کردووە. لە منی خواست کرمانجی بۆتانی فێر کەم. باوەڕ بکە لە سێ دەرسی هەوەڵیدا -کە مەعلوومە مێشکی سەریشی دەبردم!- تەواوێک باش تێک دەگەیشتین. قەت زیرەکی وام نەدیوە؛ زۆر بووینە ئاشنا.

دەستەی وتووێژکەران بە سەرۆکایەتی سالح و جەلال تاڵەبانی چوونە بەغدا. ئێمەیش دوای مانگێک لە کۆیەمان گوێزتەوە، بە ڕێگای «جەلی»دا، ڕوو بە وڵاتی «خۆشناوەتی» و لەوێوە بۆ دۆڵی «هەرووتیان». هەر شەو یا چەند شەو لە گوندێک بە پیادەیی ملمان لێدەنا.

جا با وەک چیرۆکی شەوانەی نوێن پڕ لە کێچ، بادەمەوە سەر چەند وردەباسێک:

دەستەی ئەحمەد تەوفیق -کە لە زەمانی قاسمدا هاتبوونە دیوی عیراق- لە سنووری لای بانە گیرساببوونەوە؛ کە لە ئێران دوور نەکەونەوە. پارتی بۆ تێک نەدان دەگەڵ ئێران، مەنعیان کردبوون؛ چەند کەسێکیان لێ گرتبوون کە تەحویلی ئێرانیان دەدەینەوە. بارزانی دوور لە وڵاتی بادینان بوو. هەرچۆنێک بوو هاواریان گەیاندبوویە؛ بەریان دابوون. ئەحمەد دەگەڵی تێک دابوون. نەشرەیەکی بە پولیکۆپی بە ناوی «دیسان بارزانی» دەردەکرد. پارتی زۆر لەوە تووڕە بوون. جارێک کوڕێکیان بەو نەشرەوە گرتبوو -ناوی «عومەر نیگلی» لاوێکی سنەیی بوو- زۆریان لێدابوو؛ نازانم چۆن بەردرابوو. بەو حاڵەش بەو هەمووو ترس و لەرزی ڕێگەوە، نەشرەکانی هێنا بەغدا. لە بەغدا زۆرم بە ئەحمەد گوت: هەر شتێ کەمترین کێشە و دووبەرەکی بنێتەوە زۆر زەرەرە. دیارە ئەویش کاری خۆی بە باش دەزانی و دەیگوت: تۆش ئەگەر وەک من لە ناو جەرگەی کارەکەدا بای، حەقت بە لاما دەدا...

جا کە گەیبوونە بارزانی، دیسان پارتی و ئەحمەد یەکتریان دەدزا. پارتی لای وا بوو ئەحمەد بوختان و درۆیان بۆ هەڵدەبەستێ و بارزانییان لێ تیژ دەکا. نازانم تا کوێ ڕاستیان دەکرد؛ بەڵام -وەک چەند شتێکم لێ گێڕانەوە- لە زۆر جێدا حەق بە ئەحمەد بوو. ئیتر لەو کاروانەدا من و فڕانسواش دەگەڵ دەستەی ئەحمەد کەوتینە ڕێ.

بارزانی زۆر ساڵان بەر لەوە بشچێتە ڕووسیە، قەت بە شەو نەدەنوست. لە دوای وڵات ڕووناک

بوون دەخەوت. کەسیش نەیدەزانی خۆی و پارێزەرانی تایبەتی -کە بارزانی بوون- بەرەو کام گوند دەڕۆن. چەندین قۆڵی جیا-جیا بەرەو شوێنێک و مەڵبەندێک دەچوون کە بۆیان دادەنرا. لە هەر کەست پرسیبا، بارزانی لە کام شوێنە؟ بیشیزانیبا نەیدەگوت. شەو لەشکر لە هەر گوندێک با -کە دیارە پاش تاریکان دەچوون- بەیانی هێشتا تاریک بوو دەردەکەوتن، جێگەیان لە چۆل و چیا دەگرت. دووکەڵ کردن بە ڕۆژ مەمنووع بوو. تەنانەت بە شەویش جگەرە داگیرساندن بە ئاشکرا نەبوو. جا کە دەمانەویست لە یەکێک پرسین بۆ فلان گوند چەندی ماوە، ئەگەر بیگوتایە نیو سەعات، بە حەوت سەعات نەدەگەیشتینێ. ئەگەر بیگوتبا سەحاتێک، مانای هەمووی ڕۆژی دەبرد!

ئەحمەد جنێوی دەدا: بە خودا خۆشناو کەرن! نازانن بە پیاو بڵێن تا فلان جێ چەندە؟

گوتم: بە خوا جەنابمان کەرە! ئەوانە سەعاتیان نییە، ڕۆژ لای ئەوان یەک سەعاتە، بۆ ئێمە فێری نابین؟!

تا شەڕ نەبوو، بە ڕۆژ بە ڕێدا دەچووین و شەو دەحەساینەوە. لە کاتی شەڕدا، شەو دەبووە جموجۆڵ و بە ڕۆژ خۆمان مات دەکرد. ڕۆژێک لە گوندی «سکتان» ڕا دەبوو بە هەورازی «هەورێ» هەڵگەڕێین. من و «هەمزەی حەساناغای مەنگوڕ» لە تەنبەڵیان بەجێ مابووین. زۆر سەرنەکەوتبووین تووشی کابرایەک بووین شەش کەری بەتاڵی پێ بوو؛ سەردەکەوت. هەمزاغا گوتی: کاکە دەبەر ژنێت مرم سوارن کە! کابرا گوتی: ئەو پاڕانەوەی بۆ چییە؟ سوار بن! گەیشتینە نزیک سەرکەوتن، کابرا گوتی: جا لێرە من لا دەدەم؛ دەچمە داران. دابەزین و زۆر سوپاسمان کرد.

هەمزاغا گوتی: کاک هەژار! بە نمەکی شێخی بورهانی، ئەو کەرانە خدری زیندە بوون دە فریامان هاتن! ئەتۆ دەڵێی چی؟

- دەڵێم چی؟ تۆ بە شێخی بورهان سوێند بخۆی و کەرت لێ ببێتە خدری زیندە؟ تێ ناگەم!

گەیشتینە «چێوە»؛ پڵنگێکی تازە کوژراو لە هەیوانی ماڵی کوێخا سەعید هەڵواسرابوو؛ کای تێ ئاخنرابوو. کابرایەک بە تفەنگێکی شینکەی زۆر قەدیمەوە (ئەوانەی بە باروت و پەڕۆیان دادەگرتن)، هەر دەیگوت: قرمەی خۆم بە برنۆیەک نادەم.

ئەو ڕۆژە شوانێک لە ڕەوەزەبەردێک پڵنگ دەبینێ، دێ بەو کابرایە -کە هاتۆتە ڕاوە کەو- دەڵێ: بچۆ ئەو منداڵانەی هاتوونە گیا دۆکلیو دوور خەوە، پڵنگ هەیە.

- کوا پڵنگ؟

- وا لەو ڕەوەزە.

بە تفەنگی قرمەوە بۆی دەچێ، چاوی لێ دەگێڕێ. لەپڕ پڵنگ لە ژوورەوە خۆی داوێتێ.- لە بەینی عاسمان و عەرزا تۆپە پەڕۆی دە نێو چاوانی پڵنگ دەکا، وە سەر یەکی دەگێڕێ. نازانم ئەو غیرەتە لە کام جەرگەوە هاتبوو؟! «کافی نەبەوی» -کە ئەفسەرێک بوو- لێی کڕی بە پێنج دینار کە بیخاتە سەر زین. مەلامستەفا پەیدا بوو، تماشایەکی کابرای کرد؛ گوتی: حەیفە ئەو بەهرەی پاڵەوانەتیە بفرۆشێ. گوتی: دە دیناری بدەنێ و کەوڵیش هەر هی خۆی بێ.

یەکێکمان دەگەڵ بوو «مەلا قادری لاچینی»، شەو دانیشتبووین، قالۆچەیەکی پێ هەڵگەڕا؛ لە زیرژنی دا و دڵی بووراوە. هەمزاغا گوتی: شۆڕش ئەمەی خۆشە: یەک بە قرمە پڵنگ دەکوژێ، یەک لە قالۆچە دەترسێ! جا هەر ئەو مەلا قادرە لە ئێران گیرا و بردیانە «جەلدیان»



شایەتی لە سەر هەزار کەس پتر دا کە یاریدەی حیزبی دیمۆکراتیان کردووە.

پێش نیوەڕۆ لەو گوندە لای مەلامستەفا بووم، بە چاپچییەکەی (یاسین)ی گوت: دەزانی چ دەکەم؟

- چ زانم؟

- ڕێگەی سپیلکی دەگرم. سوورچی ڕوحیان لە حەیواناندایە. ڕێگەی کویستانیان نادەم، مەگەر...

لەگەڵ منا دەدوا، گوتم: کورد جگە لە حوکمی زاتی (خودموختاری) بۆی مەسلەحەت نییە داوای زیاتر سەربەخۆیی بکا.

فەرمووی: بۆچی؟

- چونکە لە سەر بەحر نییە. دەوڵەتێکی لە سەر بەحر نەبێ و وەک ئێمەش فەقیر بێ، ناتوانێ بژی.

- کێ دەڵێ لە سەر بەحر نین؟

- من و هەموو دونیا.

- هەژار! تۆ هیچ نەبێ شەرەفنامەت خوێندۆتەوە. کوردستان لە تەنگەی هورموز و لە ئەسکەندەروونە دەکەوێتە سەر دەریا، ئێمە دوو ڕێگەی دەرییاییمان هەیە.

***

چەند قسەی خۆش: دەڵێن والیەکی تورک هاتۆتە بەغدا، ویستوویە خۆی دەوڵەمەند کا، بزنێکی زین و لغاو کردووە، لە ژوورێکی ڕاگرتووە. ناردوویە تاجری شار هاتوون، یەک-یەک بردوونی نیشانی داون:

- ئەمە چییە؟

- قوربان بزنە.

- ها، بە کەرم دەزانی؟ زین و لغاوت نەدیوە؟ نازانی ئێسترە؟ بیگرن دووسەد لیرەی جەریمە بکەن!

یەکی‌تر گوتوویە: قوربان ئێسترە!

- ها، بە کەرم دەزانی؟ ڕیش و شاخ و گوانت نەدیوە؟!

هەروەها پێدا چووە. جوولەکەیەک هاتووە، بە دەوری بزن- ئێستردا سووڕاوە.

- ها خواجە! ئەمە ئێسترە، یان بزنە؟

- قوربان بە سەرت قەسەم نە ئێسترە، نە بزنە؛ بەڵای ڕەشە و خوا بۆی ناردووین!

لە «چێوە» مەلامستەفا گوتبووی ئەسپێک بۆ هەژار بکڕن! ئەسپێکی سپیلکی پولیسانیان بۆ کڕیم. ئەسپ نەبوو، بەڵای ڕەش بوو! تووشی هەر ئەسپ یان ماین یان ئێستر یان کەر بوایە، سواری دەبوو؛ حیلەحیلی دنیای گێژ دەکرد. ناچار ببوومە گولی دووراوایە، دەبوایە شوولی ئەستوور بە دەستەوە و هۆگانە جووتێک، لە پێش یان لە دووی هەموو کەسەوە بڕۆم. لە ناو قورێکی زۆر چەقدا تووشی فرانسوا بووم کە بە پێخواسی قوڕی دەشێلا.

- وەرە سوار بە!

- کۆنترۆڵ و ڕۆلەکەی چۆنە؟!

- هەتیو ڕۆلی چی و کۆنترۆلی چی؟ من لە سەر بەردی بلندەوە خۆی داوێمە سەر، ڕکێف

نادا؛ ئەویش دەبێ سەرێک سەر هەڵگرێ تا ماندوو دەبێ؛ جا وەک ئەسپی موسوڵمانان بەرێدا دەڕوا. ئەگەر تووشی بەردێکی بڵند بووین، لەوێوە خۆت باوێ سەر تەرکی!

لەو قوڕەوە وزاقی بەست، ڕاست لە پشتمەوە سوار بوو. گوتی: من سواری چاک نیم، ژیمناستیکی چاکم!

* شەوێک لە گوندی هەرووتیان میوانی ماڵێک بووین. ناوی کابرا «مەلا سەید عیساموددین» بوو. تەکیە کەلامی «مەخت عەیب نەبێ» بوو. مەسەلەن: مەخت عەیب نەبێ کەرەکێم جل کردا مەخت عەیب نەبێ چوومە قەلادزێ! مەخت عەیب نەبێ شەکرم کڕی!

- کاکە تۆ مەلای؟

- نا!

- سەیدی؟

- نا!

- عیساموددینی؟

- نا!

- دەی ئەو ناوە درێژە چییە؟

- مەخت عەیب نەبێ، بابیم مەلا سەید عوساموددینی، مەخت عەیب نەبێ خۆش دەویست. منی مەخت عەیب نەبێ بە ناوی ئەوەوە کردووە!

* مەلامستەفا زۆر لە هەر لەقەبێک و بە تایبەتی لە وشەی مامۆستا تووڕە بوو. دەیگوت: ناوم مەلامستەفایە و هیچیتر. ئەویش بە منداڵی ناوم نراوە مەلامستەفا، دەنا مەلاکەشم قبووڵ نەدەکرد.

شەوێک لە گوندی «خەتێ»، ژێگای «مەلای خەتێ» کە دەڵێن فتوای ئەو بۆتە سەبەبی رووخانی دەوڵەتی میری گەورەی ڕەواندز، لای مەلامستەفا بووم. مەلایەک پێی گوت: «مامۆستا»، بارزانی خۆی لێ تووڕە کرد. کابرا لەرزی و زۆر ترسا. گوتم: دەگەڵ منی بوو!

گوتی: تۆ بە مامۆستا تووڕە نابی؟!

- نا، حەز دەکەم پێم بڵێن شاهەنشاهی موعەززەم!

مەلام لە ترس نەجات دا.

* مەلا ڕەحمانی حاجی مەلای عەزیزکەند -کۆنە هەواڵەکەی زەمانی تەرەغەم؛ کە ئێستاش ماوە و لە بۆکانە و مەلای کۆسەی پێ دەڵێن- هاتە سرێشمە. لام وایە نامە و پووڵی بۆ مستەفا و کاوە هێنابوو. گوتی: قەتم بارزانی نەدیوە؛ دەشڵێن ناتوانی ببیینی. زۆر حەزم لێیە چاوم پێ بکەوێ.

- وەرە با ئەمشەو بچین.

گوتم: ئەوە کۆنە ڕەفیقێکی منە. بارزانی تماشایەکی کرد:

- مەلا من تۆم لە کوێ دیوە؟

- قوربان قەت بە خزمەتت نەگەیوم.

- هەوەڵ جار کە هاتینە ئێران، شەوێک لە ماڵی کەریماغای قوونقەلا تۆم دیوە.

مەلا وە بیری هاتەوە: بەڵێ قوربان من لەوێ بووم!

* شەوێک لە گوندی «بناویە» دەگەڵ برا کوردەکانی ئێرانی چووینە مزگەوت. گەرم بوو؛

شله ساواریشیان بۆ هێناین؛ بەیانی کەیفمان لە چایی بوو. دەروێشێکی سوورچی لـە سـەربانێک بە دەفەوە شتێکی دەگوت کە تاریف لە شێخ ئەحمەدی چاوبەلەکی سوورچی بوو.

گوتم: دەروێش دەنگ هەلێنە، زۆر خۆشە. گوتی: برا دنیا دوو عرووفە: «بی، تی»!

- ئای هەزار ئافەرین بۆ فەرموودەت!

- چات خواردۆتەوە؟

- نە بە سەری تۆ! هەوالەکانیشم وەک منن...

دەروێش چای و نانێکی حیسابی داینێ. دیار بوو ئەو قسەی لە مەلایـەک بیـستووە کـە دنیـا «بەدء» و «تەم» پتر نییە: دەست پێکردن و تەواو بوون.

* سەیر ئەوە بوو هەموو خەلکی گوند حاجی بوون. منداڵ مووی لێ نەهاتووە، کەشـیدەیەکی زەرد بە سەرەوە! هاتمە لای مەلامستەفا، گوتی: ئەم گوندە حاجی زۆرە؛ وە نییە؟

- کاکە! ئەوانە فێلبازن. پیرێک، دوانیان چوونە حەج، هێلکە حاجی زۆریان کڕیوە و لێـرە لـە سەری کورک بوون و جووچکیان هەلێناوە!

***

لەو ئەسیرە کوردانەی کە زەمانی شەڕی قاسم لە سوپای عیراق گیرابوون، یـان بـە ئانقەسـت خۆیان بە گرتن دابوو، دەزگای مخابەراتێکی زۆر ڕێکوپێکمان هـەبوو؛ کـە بەشـی لای پـارتی و مەکتەبی سیاسی «سمایل سەرهەنگ» و بەشـی لەشـکری دەگـەڵ بـارزانی، «شـەوکەتی مـەلا سمایل» -کە ستوانێک بوو- سەرپەرشتی دەکرد. ڕۆژێ چاودێری بێسیم بوو، هـەرچی ڕەمـز و جفرەی عیراق بوو دەستبـەجێ حـەلی دەکـرد. ڕۆژی وا بـووە موخابـەراتی دەولـەت دە جـار ڕەمزی خۆی گۆڕیوە، ئەو لە بەری حاسیە نەدەبوو. هەمیشە بارزانی لە هـاتوچـۆی لەشـکریانی عیراق خەبەردار دەکرد، کە گەیوونە فلان، ئێستا لە فلان جـێن... دەولـەت بـە ڕەمـز فـەرمانی تۆپ یا بۆمبارانی فلان شوێنی داوە؛ زووتر شوێنەکە چۆڵ دەکرا. وا دیار بوو خەبەرێک هەبوو کە شەوێک بە لەشکریان گوت بێدەنگ و مات لە جادەی «خەلیفان» بپەڕنەوە. ئەو شەوە عومەراغا ناوێکی سوورچیمان دەگەڵ بـوو. لـە ڕێگـە گـوتی: زگـم دێـشێ دەچمـەوە مالـە خـۆم. دوای ڕۆیشتنی ئەو بە دە دەقیقە دەنگی تفەنگێک هات؛ بێدەنگی شەوی شـەق کـرد. ئـەو جێگـەش نزیکی پادگانی گەورەی خەلیفان بوو. نەزانرا کێ هاویشتی. من لام وا بوو عومەراغای سـوورچی بووە بە بیانووی زگ‌ئێشە خۆی وە دوا داوە و خەبەری بە پادگـان دا کـە بـزانن ئێمـە لـە جـادە دەپەڕینەوە. گوتیشم، گوتیشیان زۆر وێ دەچێ، بەلام باسیان نەکرد. هەر ئـەو عومەراغایـە زۆر زوو هەلات و بوو بە جاشێکی زۆر پیس.

لە بیرم نەماوە ئەسپە سپیلکم لە کوێ بەجێ هێشتبوو. بە پێ دەڕۆیـشتم و دنیـا زۆر تاریـک بوو. خەوم دەهات؛ هەر ڕەتم دەبرد. بە سەر ڕوودا کەوتم و خەو بردمیـەوە؛ کەسیـشم لـە دواوە نەبوو. وە خەبەر هاتم: بەجێ ماوم، نەشارەزام، دنیا پڕە لە پنچک، ڕێگە و مێگە نییە، بەرەو کـام لا بڕۆم؟ ڕووم لە کام لا بوو کە خەوتبووم، بەرەو ئەوێ چووم. لەپڕ شتێکی بۆر لە بـن پنچکێـک سەری هەلێنا:

- کێی؟

- هەژارم.

- کاک هەژار بەجێ ماوی؟ وەرە بێرەدا بڕۆ.

تا لە چەم پەڕیمەوە سەر جادە، لە چوار جێگەی‌تر بۆری شارەزام بۆ پەیدا بوو. کە لە چیا سەرکەوتم، بارزانی و جەماعەت لەوێ بوون، چەند کەسیان ناردبوو پەیدام کەنەوە. دیار بوو ئیحتیاتی گەورە لە دەوری پادگان کرابوو کە هەر دەست ببزێون تێیان سرەوێنن.

- دەی قۆڵ-قۆڵ بن و هەر قۆڵ بە ڕێگەکەیدا بگەنە «سرێشمە».

ئێمە ڕەگەڵ قۆڵی «عەمەراغای دۆلەمەڕی» کەوتین. شەو زۆر تاریک و قوڕ بوو؛ ڕێگەش نەبوو. زۆر ڕۆیشتین؛ ماندوو ببووین. لەپڕ عەمەراغا گوتی: ڕێگەمان هەڵە کردووە؛ کەوتووینە ناو سوورچیان -کە دوژمنی سەرسەختمانن- با بگەڕێینەوە؛ گەڕاینەوە. لە گوندی «سەرچیا» کابرایەکمان لە خەو ڕاست کردەوە:

- کوا ڕێگەی سرێشمە؟

گوتی: چارەگە سەعاتێکە لێرەوە بڕۆن.

- جا ئەگەر وا نزیک و هاسانە وەرە پێشمان کەوە!

- ئەی بە خوا دوورە و لەو قوڕە ناتوانم!

- دێی یان بتبەین؟!

ناعیلاج پێش کەوت. لە قوڕ و سەرەوژێرێک هاتینە خوار، کەس نەبوو دوو جار نەکەوێ. هەر هەڵخلیسکان و سەر بەرەو ژێر بوون بوو. بۆ خۆم هەر سێ جار کەوتم. لەو تاریکییەدا کابرایەکی پیری بارزانیم لە پێشەوە دەڕۆیشت، کراسێکی سپی درێژی لە سەر جلانەوە دە بەردا بوو. ئەها خدری زیندەم دیتەوە! ڕاست لە دوو قوونی دەڕۆیشتم؛ لە کوێ ئەو دەکەوت لام دەدا. هەڵدەستاوە، دەچوومەوە پشت قوونی. دەردە دڵی لەو هەموو قوڕ و تاریکییە بوو. گوتم: مامە خۆزگە ئێستا تەرزەیەکی درشتمان لێ باریبا، کەیف بوو! وەک من مەلایکەتە مێشوولەکەی باران بم، لای وا بوو ڕاست دەبارێ. زۆر بە تووڕەیی:

- کوڕۆ تشتێ ڤە نەبێژە، خودێ ئەمێ بمرن!

دیتم بەزم خۆشە، هەر دەڵێم دەبێ بباریێ، دەڵێ وا مەڵێ! پاش سێ سەعات کەوتن و قوڕ شێلان، لە کازیوەی بەیاندا گەیینە سرێشمە. هەموو کەس ببوە گۆڵی قوڕاوی. هەر کوێ دەست کەوت خۆمان لێ بە عەرز دادا. فرانسوای ناسکیش سەر تا پای ببوە قوڕ؛ کەچی بە من پێدەکەنی! دوای نوستنێکی کەم خۆمان شتەوە. من و فرانسوا و ئەنوەرمیرزا بەر ماڵێک کەوتین. ئەحمەد تەوفیق و باقی برادەران بەر دوو یا سێ ماڵ کەوتن. بارزانی میوانی «ئەحمەد شاباز» بوو کە پیرەمێردێکی سەدوبیست ساڵەی زۆر بەگورد و تاقەت و باوکی هەموو خەڵکی گوندەکە بوو. نەدیدەی خۆی دیبوو؛ شێستوپێنج پیاوی چەکهەڵگری -لە کوڕ و نەوە- هەبوو. مەڕ و ماڵات و ڕەوەی یەکجار زۆر بوو. گەرمێن-کوێستانی دەکرد. لە ئەحمەد شاباز نەقڵی کوژرانی سمایلاغای سمکۆم بیست. گوتی: لە کوێستانەوە چووبووین لە شاری شنۆ خوێ بکڕین. تووشی خورشیداغای هەرکی بووم، گوتی: ئەحمەد لە شار دەرکەوە، پاشان وەرەوە!

- ئاغا خوێمان لازمە.

- دەڵێم بڕۆ دەر...

لە شار دەرکەوتین. دوای چەند سەعاتێک خەبەر هات کە سمایلاغا و خورشیداغا بەر گوللە دراون و کوژراون. پاش چەند ڕۆژێک پیاوێکی خورشید بۆی گێڕامەوە: سمایلاغا سوێندی خواردبوو نەچێتە شاران. خورشید کە دۆستی هەرە نزیکی بوو، قەولی چوارسەد لیرەی لە

عەجەمان ساندبوو، کەوتە بن کلیشەی سمایلاغا کە بە هێندە سوێند و قورعانە عەجـەم فکریـان خراپ نییە و ناچاری کرد بچێتە شنۆ. بۆیە ئەویشیان هەر کوشت کە کارەکە سەر بـە دەرخۆنـە بکرێ و چوارسەد لیرەکەش نەدرێ.

فرانسوا زۆری حەز لە چارەی ئەنوەر نەدەکرد. ئەویان بردە مالێکیتـر و دووبـەدوو لـەو مالـە ماینـەوە. ڕۆژانـە بێکـار و بـار دەچووینـە دەری دێ و لاسـای تارزانمـان دەکـردەوە: بـە دار هەلدەچووین و بەو ڕەوەزانەوە دەگەڕاین و دەمانقریواند. تا لای ئێوارە بەرەو مـال دەبووینـەوە. شەو دەچووینە لای بارزانی. بۆ خەو دەهاتینەوە مالەڕەش. ئەو کیسەخەوێکی هـەبوو، بـێ‌خـەم تێ‌دەخزا. منیش تا بەرەبەیان دەگەل کێچان ڕاز و نیازمان دەکرد.

مەلامستەفا زۆری ڕق لە کەسانێک دەهات کە بلێن ئارەق دەخواتەوە و کەس زاتی نـەبوو لـە شۆڕشدا بخواتەوە. شەوێک فرانسوا گوتی: بوترێـک کۆنیـاکی فەڕانـسیم هەیـە؛ بـا بیخۆینـەوە. تێمگەیاند کە لە ناو خەلکی گوند شتی وا ناکرێ؛ بەلام لە دەشت فکرێکی بۆ دەکەمەوە. لـە نـاو دارستانێکی زۆر چوغوردا، کانی و ئاوێکی زۆر خۆش هەبوو، هیچ ڕێگەشی بۆ نـەدەچوو، چووینـە ئەوێ. خۆمان ڕووت کردەوە و بە تای دەرپێ لە دەم کانی دانیشتین کـە هـەم تـاوی بـەهارمان وێ کەوێ، هەم کۆنیاکیش بخۆینەوە. لەپڕ لە بن دارانەوە «کـافی نەبـەوی» کـە سـەرهەنگێکی تۆپخانەی عیراقی و هاتبووە شۆڕش و زۆر لە بارزانی نزیک بوو، سەری دەرێنا:

- ئەوە چ دەکەن؟ بەشم نادەن؟!

- فەرمووا!

دەگەلی خواردینەوە. ئێوارە درەنگی ئەو ڕۆژە چوومە لای بارزانی. کافی لەوێ بوو.

بارزانی گوتی: هەژار ئەمڕۆ لە کوێ بووی؟ تا کوێ چووی؟

دلم ئاگای کرد خەبەر چییە. گوتم: ئەمڕۆ دەگەل فرانسوا چووینـە سـەر کانیـەک لـە دیـوی خەلیفان، بوترێ کۆنیاکی هەبوو کە بیخۆینەوە. کاک کافی لێمان پەیدا بوو، نیـوەی ئـارەق ئـەو خواردیەوە، نەیهێشت بە گیانمان بکەوێ!

باوڕە کە کافی وەک جاو سپی هەلگەڕا. قەت پێی وا نـەبوو مـن حاشـا ناکـەم و ڕاسـتی ئـەو گوناهە لە خۆم دەلێم، مات و بێدەنگ پالی بە دیوارەوە دا.

بارزانی بە بزەیەکەوە پرسی: جا ئەم سەگە ئەم ژەهرەمارەی لە کوێ بوو؟

- نازانم، بەلام پێم وایە هەر ئەوەندەی هەبوو کە لێمان خەلاس کرد!

کافی هەر زۆر زوو گوتی: قوربان تۆزێک نەخۆشـم، لـە خزمـەت مەرەخـەس دەبم. ڕۆیـشت.

بارزانی تەنیا ئەوەندەی گوت: چەند خۆشە کەس دووڕوو نەبێ!

کافی کە دەگەل ئێمە خواردبوویەوە، لای بارزانی شەیتانی لە من کردبوو کـە هـەژار بـە دزی تۆ ئەم کارە خراپەی کردووە؛ تا خۆی بە باش نیشان دا!

لە فرانسوام پرسی: تۆ ئەو کۆنیاکەت لە کوێ بوو؟ گوتی: هەر لە کۆیە ژنەڕال ڕایسپاردبوو بۆم بکرن.

لەو حەمام گرتنی هەتاوەدا تاو بردمی. فرانسوا قوتووێک نیوای دامێ، چا بوومەوە و فێر بـووم بەر لە خۆ وەبەر تاودان پشت و شانم پێ دەهەنوو.

فرانسۆ بە قەولی خۆی بەختی نەیهێنابوو لەم ماوەیەدا تووشی شەڕ بـبین و عەکـسی شـەڕی ڕاستی بکێشێ. بەلام لە کاروانی لەشکرچی و هاتوچـۆی چەکـداران و شـتی وادا زۆر عەکـسی

گرتبوو که دەیگوت دەتوانم بە پوولی ئەوانە خانوویێک لە پاریس بکڕم.

ڕۆژێک گوتی: تۆ زۆرت حەز لە پیوازە، ئەوە باش نییە.

گوتم: تۆ ڕەنگە قەت کیتابی موقەددەست نەدیتبێ.

- چۆن نەمدیوە؟ خوێندوومەتەوە.

- پرسیارێک: خودا بەر لە هەر شتێک چی خەلق کرد؟

- کەلیمە.

- نەخێر. نەتزانی. پیواز! کە تەبەقە تەبەقەیە و خڕە وەک زەمین و ئەستێرەکان؛ ئەمەی کردە نموونە و شتی‌تری لە گوێرەی هەڵخستەوە!

هەر پێدەکەنی و دەیگوت: ئافەریم بۆ کەشفی باشت!

لە سرێشمەوە بارزانی ناردیە جەلدیان کە بیگەنەنە سەفارەتی فەڕانسە لە تاران. لە جەلدیانەوە بە خەتی لاتینی و بە کرمانجی نامەیەکی بۆ نووسیبووم تەواو ڕێک‌وپێک بوو. نووسیبووی: زۆرم تۆ خۆش ویست. ئەگەر هاتییە پاریس بەم ئادرەسە بمدۆزەوە. دایکمت لێ مارە دەکەم؛ جوانە!

چەند ڕەمزێکی بێ‌سیمی دەوڵەتی ڕایگەیاند کە: «ئێمە هەموو ئەسپابی هێرش بردنمان سازە و دەبێ لەپڕ بە سەر بارزانی دادەین». لە ڕەمزێکا دەڵێ: «ڕۆژی نۆی مانگ ئامادەی هجووم بن». پێشمەرگە کار قایمی خۆی کرد و لە گوندان دەرکەوتن و چوونە پشت بەرد و سەنگەرانەوە. لەو بەینەشدا دەستەی وت‌وویژکەرمان لە بەغدا هەر ڕۆژە بە جۆرێک تەفرە دەدرا: فلان وەزیر نەخۆشە، فلان لە ماڵ نییە، دەبێ عەرەبی دیکە ڕازی بن کە ئێمە حەق دەدەین بە کورد... جەلالیان بردە قاهیرە، نیشانی ناسری بدەن. جار و بارەش لە بەعزە شوێنێک عەسکەر و پێشمەرگە تووشی یەکتر دەبوون و تەقەیان لێکتر دەکرد؛ کە یەکێک لەو جارانە «هاجەر» ناوێکی بارزانی لە سەر کێوی «گولەکن» لە نزیک جادە نوێژ دەکا، «بێجان جندی» -کە شکاکێکی عەبدوویی بوو؛ دەگەڵ ڕەوی بارزانیان لە کوتولەوە دەگەڵیان چووبووە رووسیا و لە دانشگای تاشکەند زمانی رووسی خوێندبوو؛ لە بەغدا ببوە مامۆستای رووسی لە دانشگا و هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە دەگەڵ لەشکری بارزانی بوو- لە دیاری هاجەر دانیشتووە تا نوێژ خەلاس دەکا. چەندین کامیۆنی پڕ لە عەسکەر بە جادەدا دێن؛ دەیانبینن. دادەبەزن و بەر تیرباریان دەدەن. بێجان لێیان دێتە دەست؛ خۆی دەگەیەنێتە پەنا جادە؛ جا وەرە بکوژە! سێ کامیۆنی سووتاندبوو؛ پەنجاوسێ تفەنگ و دوو تیرباری گرتبوو؛ باقی هەلاتبوون. لە پەنجا پتر کوژرابوون.[1] لە چەند شوێنێکی‌تریش لەو تووش‌بوونانە ڕووی دابوو؛ کە هەموو جار دەوڵەت زیانبار ببوو.

لە بیرمە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٧ تێلگرافێکی سالح یووسفی هاتبوو کە: «ئێمە لە بەغدا زۆر سەرکەوتووین و کارمان بە ئارەزووی دۆستانە. تاهیر یەحیا لە بەریشم هەستاوە؛ چاشم دەگەڵ خواردۆتەوە. دەستی بۆ بە قورعاندا داوم کە نیەتیان دەگەڵ کورد باشە. تکایە ئەم تەقەتەق و گێرەشێوێنیە ڕابگرن تا خۆم دێمەوە». بەیانی ئەو ڕۆژە سەیدای ممبارەکیان گرتبوو؛ لەباتی چا و سوێندی بە قورعان، دە زیندانیان پەستاوتبوو؛ بە پانکەیاندا کردبوو؛ پانکەیان سووڕاندبوو؛ دوو هەزار شەقیان تێ‌هەڵدابوو. ئیتر گیرا کە گیرا!

---

[1]. بێجان لە شەڕ دەگەڵ سوپای پاسدارانی ئێران، ساڵی ١٩٨٣ز. (١٣٦٢ک.) لە سەلماس کوژرا.

ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٩ عەسکەری هێرشبەر -بە بێ ئەوە بزانێ کەسی لە سەر ڕێگەیە- لە سپیلکەوە حەرەکەت دەکا. دەستەویەخە تووشی پێشمەرگە دێت و تەقە دادەمەزرێ. «حوسێنی حەمەداغای مێرگەسووری» دەگەڵ پێشمەرگەیەکی ئێرانی، خەڵکی ڕەحیمخان -کە دەیگوت ناوم عەبدوڵلایە- بێخەبەر بە ڕێدا دێن و هەست دەکەن لە پێشیانەوە شەڕ و تەقەیە. لە دوای عەسکەرەوە ئەوانیش مل لێ‌دەنێن. من ئەوەم دیت کە عەبدوڵلا نۆ سەربازی عەرەبی وە پێش خۆی داوە، وەک گاران لێیان دەخوڕێ و هێنانیە بنکەکەمان لە «هاودیان». لەشکری هێرشبەر شەق و شڕ کرابوو.

- دەی کاکە عەولا تۆ چۆن بە تەنیا ئەم نۆ کەسەت هێنا؟!

- دەگەڵ حوسێناغا لێک هەڵبڕاین؛ نازانم ئەو بە کوێدا چوو. من لە پشت بەردێکەوە شەڕم کرد. نازانم چەندم کوشتوون؛بەڵام ئەوانە کە دەستیان هەڵێنا و تفەنگیان دانا، چەخماخی تفەنگەکانم دەرێنا؛ ئەوەتا لەو دەسرەیە دان. گوتم هەرکەسە تفەنگی خۆی دەشان کاتەوە و پێشم کەوێ و لە دواوە لێم خوڕیون.

با بزانین ئەو پاڵەوانە بێ‌ناوە نەناسراوە کێ بوو: وەرزێرێک لە ڕەحیمخانی نێوان بۆکان و میاندواو، پیاوێکی بە دەست زایە بووە؛ هەڵاتووە خۆی گەیاندۆتە لای شێخ ئەحمەد لە بارزان: «غەریبم و دەمەوێ لێرە بژیم...»، داری سووتانی بۆ ماڵی شێخ هێناوە. داوای تفەنگێکی کردووە، شێخ ئەحمەد گوتوویە تفەنگ نادەین بە غەریبە؛ ئەگەر بۆ خۆت پەیدا کەی قەیدی نییە. لە بارزان ڕۆیشتووە چۆتە لای شێخ ڕەشیدی لۆلان. لەوێش کاری دارکێشی و نۆکەری کردووە. لە ڕێگەی هاوینەهەواردا سۆفییەک تفەنگی بە بەردێکەوە هەڵپەساردووە، میز دەکا. عەولا پڕی پێدا کردووە؛ سۆفی کوشتووە؛ تفەنگەکەی ڕفاندووە و هاتۆتەوە بارزان؛ بە چەکدار قبووڵ کراوە. لە شەڕی سەر عەقرە زۆری ئازایەتی نواندووە. لە سەنگەریشدا تا یەکێکی لە دوژمن کوشتووە، هەرای کردووە: «خولامی حوسێنی حەمەداغام!»، وەک ئەو نۆکەرانەی تەماڵی کەروێشک دەبیننەوە. حوسێن ڕەگەڵ خۆی خستووە. ئیتر تا ما، ئازایەتی و بەجەرگی ئەو کوڕە ببوە چیرۆکی ناو پێشمەرگە. لە شەڕی «چیای پیرس» شەهید کرا. زۆر مرۆیەکی سادە بوو. جارێک لە بارزان هاتە لای مەلامستەفا،گوتی: قوربان نیازێکم هەیە.

- بلێ، هەرچی بلێی بۆت دەکەم.

- با کەس ئەو کلاشینکۆفەم لێ نەستێنێ؛ زۆرم خۆشدەوێ...

بە هۆی هاووڵاتی بوون، زۆر جار دەهاتە لای ئێمە، زمانەکەشی گۆڕابوو. کە دەمانگوت: «کاکە عەولا خەبەر و باس چییە؟»، دەیگوت: «خودێ ئەز مرۆیەکە سەوریمە، عەقل-مەقل نینە؛ تو تشتا نزانم!».

من کەوتبوومە بنکەیەک لە چالێییەکدا لە پشت «گەلی عەلی‌بەگ»، کە شەڕی زۆر سەخت لە سەر پادگانی گەورەی خەلیفان بوو. کانی و ئاوێکی خۆشی لێ‌بوو؛ تۆپی لای ڕەواندز و دیانا نەیدەگرتەوە. کەچی وەک مامەندی چواردیواری گوتەنی: «زیندەوەر بە حەنجەڵە»، ڕۆژێک نیوەڕۆ لەبەر تاو، کۆزیلکەیەکی چاردە نەفەری خەریکی چێشت‌لێنان و جل‌شوتن بووین و یەکێک ڕانکەکەی خۆی پینە دەکرد، گوللە تۆپێکی قەوس هات -لە ناوەڕاستی هەمووانماندا- کابرای ڕانک پینەکەری پێکا و ئێمە هیچمان لێ نەهات. لە ناو هەموو پێشمەرگەدا، دوو تۆپی خومپارەئەندازی دوو گرێ و سێ گرێ هەبوو؛ کە تەنانەت یەک گوللەشیان نەبوو. ئەگەر هەر

تاقه تۆپێکمـان بـه گوللـهوه هـهبا، بـه هاسـانی پادگـانی خـهلیفانمان دهگـرت، کـه ئێمـه لای سهرووومان لێ گرتبوو.

ئێوارانه خهبهری شهڕی ئهو ڕۆژهم که له نزیکمانهوه دهکرا دهنووسی و دهمنارد. ڕۆژێک نـاوی چوار شههید ههبوو که یهکیان «شهرۆی خهربهنده» (کاروانکەر) بوو. نووسیم خوا عافوویان کـا و نامهم نارد. ڕۆژی دوایی نزیـک نیـوهڕۆ دوو پێشمهرگه هـاتن، لاشـهی برینـدارێکیان بـه سـهر شانهوه. شهرۆیه و بینێره دهرمانگای شۆڕش. شهرۆ چا بۆوه، بهلام لـه ڕانیـدا دهشـهلی. جـا بـا بۆخۆی بیگێڕێتهوه:

- باری ئێسترێک فیشهکم برد، دام بـه پێـشمهرگه. ویـستم گـوریس ههلـوێزنم و بـڕۆم، لـه خرمهی شێست تیر ئێستر ڕهویهوه؛ دهرپهڕی. گوریس ده لاقم هالقا. سـهرهکهی بـه کورتـانی ئێسترهوه بوو. ڕایکێشام به سهر بهردهلان و به ناو دارستانی گهلیدا. بێهۆش بووم و ئاگام له دنیا بڕا. له شهودا هۆشم هاتهوه بهر خۆم. کراسهکهم بـه لهشمـهوه نووسـابوو، خـوێنی پێـوه وشـک هەلاتبوو. ویستم ههستم، لاقم له دوو نههات؛ بنی ڕانم ژانێکی دهکـرد نهبێتـهوه. زۆرم تینـووه؛ خورهی زێ دیته گوێم؛ بهلام چۆنی بگهمێ؟ دهستم کوتا ڕێزهله مارانهم وه بـهر دهسـت هـات: «دهمرم!... با بمرم!». ملم له ڕێزهله خواردن نا، تینواتیم شکا. ورده-ورده به قوونهخشکه خۆم بهرهو زێ خزاند. ژانی ڕان برستی لێ بڕیبووم. به قنگهخشکێ گهییمه سـهر لاتـه بـهردێک زۆر بلند؛ دهمروانیه چۆم: «ده جا با بمرم، ئهو ژانه ههر دهمکوژێ...». خشکهم کرد و سهرهونخوون ده زێیه کهوتم. بێهۆش بووم. بهرهبهیان چاوم ههلێنا: نیوهی خوارووم ده ئاودا تهکـه تهکیـهتی، له سنگهوه له سهر ڕهملم. ژانی ڕانم کهم بووه، بهلام پشتم دهزوورێتهوه و چلک دهدا. دهمهوێ له ئاو بێمه دهر، ڕانم له دوو نایه. ئاوا مام. تاو تازه ههلدههات گوێم له غهلبهغهلبێک بوو. نزیک بۆوه، به کوردی قسهیان دهکرد. «دیاره جاشن که دوێنێ لهم ناوهدا بـوون». مـن کـه لـه ژیـان وهڕهزم، ملم له جنێوان نا: «ههی جاشی بێنـامووس! بـێشـهرهف وهرن! ئـهز شـهرۆمه، شـهرۆ بارزانی! وهرن ئهگهر حیز نین بمکوژن!».

هاتنه سهرم؛ ههوالی خۆمان بوون. دیار بوو له شهڕی دوێنێدا سهرکهوتبوون و لـه زۆر جێگـه گهلی کهوتبووه دهست خۆمان.

جهعفهر ناوێک، لاوێکی کهلهگهتی زۆر جوان چاک، بیست و پێنج ساله، به ئێسترهوه له سهر پردی گهلیهوه شهو کهوتبووه ناو زێیه، ئاو بردبووی. ئێستر ههر چوو، بهلام جهعفـهر بـه سـاغی دهرکهوتبوو. پاش چهند ڕۆژێک ئهو جهعفهره له ئێواره درهنگێکـدا چۆتـه سـهر بـهردێکی بـلند بڕوانێته شهڕگه، گوللهیهکی وێل پێکای و کوژرا!

«بێجـان جنـدی» بـه چهنـد پێـشمهرگهیهکهوه لـه نزیـک ئێمـه بـوو. ڕۆژێـک مندالـێکی یازده-دوازده سالانهی وردی به دواوه و هات:

- کاک ههژار! ئهم ههتیوه هاتووه دهلێ بمکه پێشمهرگه. ئهگهر لانکێکتان ههیه بمدهنێ تـا تێیدا بخهوێ!

مندال گریا، گوتی: ناوم حوسێنه؛ بابم نییه؛ ههتیوم. لـه قاوهخانـهی دیانـا شـاگردم. هـاتووم بمکهنه پێشمهرگه؛ مامه بێجان گالتهم پێ دهکا!

گوتم: لێره بمێنهوه و نان و ئاوێک ههیه؛ بهلام ناتوانین تفـهنگت بـدهینێ. تـۆش هێـشتا زۆر مندالی...

کوڕەکە بە دڵشکاوی ڕۆیشت. وا بزانم شەش یا حەوت ڕۆژی پێ چووبوو، کێشک‌گری لای دیانا هەرای کرد:

- یەکێک بەرەو ئێمە دێ، تفەنگی پێیە و کورتە بالایەکە.

- چاوەدێری بە و دەنگی مەدە! با بزانین...

حوسێنی چکۆلە بە تفەنگێکی برنۆی درێژ و دوو فیشەکدان بە سەر شانەوە، هانکە هانک پەیدا بوو:

- کوا مام بێجان؟

- چۆتە بارزان.

- بە خوا چووبێتە عاسمانیش دەبێ خۆمی نیشان دەم. لانکم دەوێ؟! ئەدی ئەو تفەنگە چییە؟!

- ڕاستی لە کوێت بوو؟

- چوومەوە سەر کارەکەم لە قاوەخانە. ئەم بەیانە تازە سەماوەرم ئاگر کردبوو، گەسکی قاوەخانەم دەدا، سۆفیەکی جاشی شێخ ڕەشید هات گوتی: ئاگرێک پێکە دەچم لە کانی مەلە دەکەم؛ ڕۆیشت. بانگم کرد: مامە! ناترسی چەک و جلەکانت لە سەر عەرز تەڕایی بکێشن یان خوا نەخواستە یەکێک پڕیان پێداکا؟ بۆ لە قاوەخانەیان دانانێی؟ ئەگەر هاتییەوە بە کاوەخۆ دەبەریان کەوە! ئەوە چاش دەگەیەنمێ. گوتی خەبەری تەیە. هەر ئەو جارێک خۆی لە کانیدا قوم کرد، دوو فیشەکدان و تفەنگەکەم هەلگرت و دامە چیا. تا سۆفی پێی زانی زۆر وە سەر کەوتبووم. چەند تفەنگێکیان پێوە نام؛ بەڵام من دەرباز بووم و ئاوا بووم و ئەوا هاتووم. دەی بەڕێم کە بگەمە بێجان!

خۆی گەیاندبووە بێجان لە بارزان و زۆر بە دڵخۆشی دەگەڵیا هاتەوە. دوای ئەوەش کە لێک هەڵبڕاین، تا بێجانم دەدی زۆری تاریفی ئازایەتی حوسێنی دەکرد. دوایی خەبەرم لێ نەما.

ماوەیەک بوو لە ئەحمەد تەوفیق و هەوالانی تۆزێک دوور بووم و کەمتر یەکترمان دەدیت. لە هاودیانەوە بەرەو پشتی خەلیفان هەڵکشام و تووشی یەکتر هاتینەوە. هەر لە چەندێک پێشەوە کوڕێکی سابلاغی بە ناوی قادر -کە ئێمە پێمان دەگوت «قەدۆ»- لە سەر فەرمانی ئەحمەد تەوفیق ببوە پاسەوانی من. زەلامێک، جووتێک سمێڵی بابڕ، مێزەرێکی سووری بارزانیانە لە سەر، سەر تا پا نوقمی چەک؛ پیاو کە ئەو سەر و سیمایەی دەدیت لای وا بوو بەفر بە کاڵی دەخوا! قسەشی بارزانیانە دەکرد تا بە ئازای بزانین. قرۆشکەیەکی چا خواردنەوەی لە باتی ئیستیکان بە قەدەوە بوو، قۆریەکی چا دەبرد.

ڕۆژێک کە بەرەو بەرزایی چیای «براندۆست» سەردەکەوتین، وەک هەمیشە من لەبەر تەنبەڵی بەجێ مابووم؛ قەدۆم دەگەڵ، سەردەکەوتین. چەند جارێک تەقەی گوللە دەهات. گوتیان: چاکێکە لە بلندایی کێو بە ناوی «پیری خەڵ»؛ زەمانی خۆی ڕاوچی بووە. هەر کەس بە لایدا بڕوا دەبێ تەقەی بۆ بکا. ماوەیەک سەرکەوتبووین، دوو تەقە لە سەر یەک هات. شتێکی وەک گریانم بیست؛ کەمێک بە پەلەتر سەرکەوتم. بریندارێک لە بن دارێک ڕیخۆڵەی ڕژاونە سەر عەرز و ژنێک بۆی دەگریا.

- چ بووە؟

- ئەو پیاوە خالمە، هۆو دوو کەسە کوشتیان و ڕایانکرد.

ڕاکردووەکان هێشتا نەدیو نەببوون.
- قەدۆ ڕاکە، ئەگەر ڕانەوەستان بیانکوژە.
قەدۆ ڕایکرد ولەپڕ گەڕاوە:
- کاکە بە خوا لەوانەبوو منیش بکوژن، نەموێرا!
ڕەنگە بڵێی ئەدی بۆ خۆت بۆ هیچت نەکرد؟ من چەکم پێ نەبوو. تا درەنگیش هەر بێ چەک ڕەگەڵ کەوتبووم. خەڵکی‌تریش کۆبوونەوە. کابرامان بە داربەست نارده خەلیفان و لە ڕێگە گیانی دەرچووبوو. هاتینە سەری چیا. دەگەڵ هەوالان شوێنمان گرت. گوتم: مام عەلی (مام عەلی عەجەم کە بە تەنیا باسێکی دەوێ) بچۆ پیری خەڵ تالان کە! لە سایەی تەقە کردن بۆ ئەوی پیاوێکی فەقیر کوژرا.
مام عەلی هاتەوە. کۆڵکە و چەکوچ، کەللەونیویک قەند، توورەکەیەک شەکر، دیناریک و سەد فلس پووڵ، یەک دوو مست چا، قۆری و ئیستیکان و ماشە و مقەلی و چەند وردە کەل‌ـپەلێکی هێنا. گوتم: قەدۆ هەر ئەم جەمە دەگەڵ منی! کاک ئەحمەد ئەو خێروبێرە هەر بۆ خۆت!
پیرەمێردێک بە ناوی «مەلا باقی» لە عەسڵی خۆیدا خەڵکی سنە، پەڕەوازەی وڵاتی موکریان، لای سەردەشت بووە؛ هاتۆتە دیوی پژدەر. زۆر ساڵان میرزای شێخ حوسێنی بۆسکێنی و پژدەری دیکە بوو. تەواو بە زاراوەی پژدەری قسە دەکا. کاری بۆ حیزبی دیموکراتی ئێران کردووە. لە کۆمۆنەی ئەحمەد تەوفیقدا لە سولەیمانی ژیاوە. بۆ حورمەت لە پیریەکەی ناویان ناوە «باوکی کۆمۆنە». جا ئەگەر لەوانە یەکێک زۆر قەڵسی کردووە کوتوویە: «بەر پدەری جاکەشی کۆمۆنە!». فارسی دەزانی. بە ڕاستی جواگرافیایەکی زیندووی کوردستانی موکریان و ئەردەڵان و بەشە سۆرانییەکەی عیراق بوو. هەموو شوێنێک و هەموو ئاغایەک و بن و بنەچەکەی هەموو عەشیرەت و هەموو ماڵانی دەناسی. کەسی واشم نەدیوە ئەوەندە بەرگەی ناخۆشی و برسیایەتی و بە پیادە ڕۆیشتن بگرێ. کەوا و پاتۆلی خاکی دەبەردا، کورتەباڵا و چاوێکی داقلیشابوو. ڕادیۆیەکی دەبەرگی خاکی‌گیراوی هەمیشە بە لاشانەوە بوو. لاواز، ڕەنگ‌زەرد، مووی پێشەوە وەریو، کڵاو جامانەیەکی پژدەریانە لە سەر، لایتێکی سێ پیلی دەبەرگی خاکی‌گیراوی دەگەڵ خەنجەرێکی کرووز بە قەدەوە بوو. قوتوویێکی شوکولاتی دەبەر پشتێندە شڕە چوارقەفەکەی دەچەقاند. ئەو قوتووە وەک عاسای مووسا وا بوو: تووتن و پەڕی تێدا بوو، چای تێدا لێ دەنا، گۆشتی دەست کەوتایا تێیدا سوور دەکردەوە. لە پاش چا یان چێشت، بە دەسرەیەکی چوار گۆشەی زەلامی سووری قەت نەشۆراو دەیماڵیەوە و تووتن و پەڕی تێ‌دەکردەوە. قرۆشکەیەکیش بۆ چا خواردنەوە بە خۆیەوە هەڵواسیبوو. توربینێکی قوماشی خاکیشی هەبوو لە کۆڵی قایم دەکرد. پێشمەرگە ناویان نابوو «ئێزگە شڕە». زۆر دەم‌شڕ بوو؛ هەمیشە غەیبەتی خەڵکی دەکرد و پاش‌ملە جوێنی دەدا. زۆر دڵ‌ناسک، بە کەمترین شت توورە دەبوو. منیش گیانێکم بەوە بوو؛ سەرم دەخستە سەر، قەڵسم دەکرد؛ بەڵام بە تێکڕایی زۆری خاتر دەگرتم.
چیای براندۆست ئەشکەوتێکی زۆر گەورەی هەبوو، ساڵۆن-ساڵۆن، لە شوێنێک ئاوی تێدا بوو. نەمانزانی تا کوێ ڕۆیوە؛ چونکە پیاو ئەگەر زۆر چووبا نەفەسی تەنگ دەبوو، پشووی لێ دەبڕا. پتر لە سەد پێشمەرگەیەک لەو ئەشکەوتەدا دەژیان؛ کە ئەگەر ناچاری با، جێگەی چوارسەتیشی تێدا دەبوو. دوو-سێ ئەشکەوتی پچووکی‌تریشی لێ بوو کە زۆر تەنگەبەر و لە

بارانەدا دڵۆپەیان دەکرد. لە تاوساودا لە دەرێ دەژیاین و هەر چەند کەسێک لە بن دارێک، سیپالی بە زەوی دادەدا. ڕووناکایی شەومان ئاگر بوو. لەبەر ئاگر نانمان دەخوارد و ڕۆدەنیشتین تا خەوتن. بە نزیکەی چوارسەد پێشمەرگە، فانووسێکی کەچمان هەبوو؛ بێشووشە. نەوتی تێدابوو؛ سەری جێ نەوتەکەش نەبوو. هەر کەس چەخماخی ئاگری جگەرەی بێنەوت بوایە، دەچوو لەو کونەوە دە نەوتەکەی هەڵدەکێشا. سەیر لەوەدا بوو ڕادیۆ بەغدا بەیانی ڕەسمی بڵاو دەکردەوە کە بە حیسابی کیلۆمیتر بەنزین و بە حیسابی خێزانی ماڵ نەوت بدەن؛ نەوەک یاغیەکان بەهرەی لێ ببینن!

ڕۆژێک باران دایدا. با بگەڕێین و ئەنوا پەیدا کەین. دەگەڵ مستەفای کاکە ڕەحمان بۆ ئەشکەوت دەگەراین؛ مەلا باقیش دەگەڕا. کونێکم دۆزیەوە بە حاڵ جێگەی هەڵترووشکانی دوو کەس دەبوو؛ ئەویش دڵۆپەی لێ دەهات. گوتم: وەرە با بە لای مەلا باقیدا بڕۆین و تووڕەی کەین! بە سرتەیەکی وا کە گوێی لێ بێ گوتم: ئەوە شوێنی من و تۆ، نابێ کەسیتر بێ!

مەلا باقی گوتی: بەڵێ، ئێوە نەجیمزادەکان جێتان هەبێ، ئێمە بە جەهەننەم! شەرتە لە داخی ئێوە ئەمشەو لەبەر باران بنووم!

– مامۆستا مەلا باقی بە قورعان دەبێ ئەو ئەشکەوتە ئی تۆ بێ؛ تووڕە مەبە!

پیلمان کێشا، ماڵی نەجیمزادانی دیت. لە داخان پێکەنی:

– ئەگەر خێری تێدابا وە بەر منوو نەدەخست؛ ممبارەکی خۆتان بێ!

دەگەڵ دوو هەوالان –ئێستە نازانم کێ بوون– کونە بەردێکمان دیتەوە؛ تێی خزاین. زۆر نەوی بوو. جارێک هەستام دانیشتم، سەرم شکا.

مەلامستەفا خزابووە کونە ئەشکەوتێکی لەوەی گوتم خراتر؛ دڵۆپەی دەکرد؛ خۆی هەڵوێزنیبوو دڵۆپەی وێنەکەوێ. لەو دەمەشدا کابرایەکی ڕاننده تاکسی هەولێری دەینەڕاند:

– دەبێ هەر بچم شکایەت لای مەلامستەفا بکەم؛ زوڵمم لێ کراوە.

لە دەرکی ئەشکەوتەوە گوتم:

– ئاخر گاڵتەی لەوە خۆشتر چۆن دەبێ؟ بارزانی دەیەوێ شکایەت لە دەستی دڵۆپە بکا و ئەم کابرایەش شکایەت لای بارزانی.

بارزانی زۆر ڕۆژان بەمە پێدەکەنی.

لە زۆر لە مێژەوە کە سوورچی و سۆفی شێخ ڕەشید دوژمنی بارزان بوون، شێخەکانیان مریدی خۆیان وا تێگەیاندبوو: هەر کەس تووشی مێزەر سووران –یانی بارزانی– ببێ و بتوانێ و نەیکوژێ، کافر دەبێ. ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین ناو جەرگەی سوورچی بوو. نەیاندەتوانی بمانکوژن، لێمان دەترسان؛ بەڵام لە شەیتانیان ناخۆشتر دەویستین. گوێم لێ بوو ژنە سوورچیەکی ڕەوەندی ددان کەوتووی چرچ دەیگوت: خوایە بۆ خاتری مەرقەدان و شێخی چاوبەلەک! تەیارە بێن و ئەو کافرانە بکووژن؛ با حەویانی دەمیش بەرکەون!

سروودێکم لە زمان جاشانەوە نووسی کە لە دیوانەکەمدا چاپ کراوە و سەربەندەکەی «جاشین کوری کەرانین»ە. بۆیان گێڕامەوە کە جاشەکان داوەتیان بووە و ئەم شیعرانەیان بە گۆرانی گوتووە و لەبەری هەڵپەڕیون!

ڕۆژێک لەگەڵ ئەحمەد چووینە جل شوتن؛ شوانێکمان بەلادا هات:

– کاکە! بڕێک شیرمان نادەیەی؟

- دەفرم وێ نییە.
- ئێمە وێمانە!
- نازانم بدۆشم.

من ملی مەڕێکم گرت و ئەحمەد ملی لە دۆشین نا؛ قەت ژنە بۆلی وای حەیوان نادۆشن.

- ئەویش دەزانی؟!

ئەحمەد تەوفیق دەستە پیاوێکی بەلەبارێکی جوان چاک، سپیلکەلە، مووی لە ڕەشیان بریقەی دەهات. قەت لە کار کردن ماندوو نەدەبوو. زۆر پاک و خاوێن و مورەتتەب بوو. کەس بە پێ دەگەڵی دەرنەدەبرد. ڕۆژ و شەو بێوچان بە شاخ و کێو هەڵگەڕابا، نەفەسی تەنگ نەدەبوو. نەیدەهێشت بەردەستانی ساتێک بێکار و تەنبەڵ ڕابیبوێرن. لە غاردانا پێم وا بوو کەروێشکی لە بەر دەرناچێ. جارێک جاشێکی دیل هەڵاتبوو. جاش وەک تاژی ڕایدەکرد؛ ماوەیەکی زۆریش دوور کەوتبوو. ئەحمەد کەوتە سەری؛ گرتی. تفەنگچی چاک بوو؛ نەیدەزانی ترس چییە. هەموو گیانی هونەر بوو. عەیبی ئەوە بوو زوو تووڕە دەبوو. زۆر سەختگیر بوو؛ خەتایەکی چکۆلەی لە ژێردەست قبووڵ نەدەکرد؛ نەیدەبەخشی. بە چاوی بەدبینی دەیڕوانیە زۆر لە هەوالەکانی ئێرانی؛ زۆر دەترسا کە ساواک ناردبنی. کە لە سەر ئەو وردە عەیبانەی لۆمەم دەکرد؛ جاری وا بوو لە سەر ئەو لۆمە کردنە لێم دەرەنجا؛ بەڵام زۆر زوو ئاشت دەبووینەوە. پێشمەرگەکانی بارزانی و هی‌تریش -کە دەیانناسی- زۆر لەبەر ئازایەتییەکەی خۆشیان دەویست. ئەگەر پشووکورتی و زوو تووڕەبوونی نەبوایە، بۆ کاری زۆر گەورە زوو ئامادە بوو. دیسان لام وا بوو لە ئایندەدا دەبێتە پیاوێکی گەورە؛ بەڵام زەمان مۆلەتی نەدا...

لەو هەواڵە ئێرانیانە، «مام عەلی عەجەم» شتێکی زۆر سەیر و خۆش بوو. درێژێکی باریکی بە جووتێک سمێلی شاعەباسی سپی و دەم و چاوێکی سووری بریقەدار. وەک «متوشالحی تەورات» کەس نەیدەزانی عومری چەندە! بە خەیاڵ بە هەشتا ساڵمان دادەنا. وا دیار بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان ترکی ئازەربایجانی بووە. کوردیەکی زۆر چاکی دەزانی بەڵام ترکانەی دەگوت. ترکیشی باش لە بیر نەمابوو. خوا دەزانێ چەند ساڵ بوو لە کوردستانی موکریان و لە کوردستانی عیراق ژیابوو. لە کێو نەبا نەدەژیا. دەگەڵ پێشمەرگەی جمهووری سابلاغ لە لای سەردەشت بووە. پاش شکانی جمهووری، دەگەڵ «عەلە گاور» و «سەمەدی چەتە» شەو بە کێو ژیاوە. لە سەرەتای شۆرشی بارزانیشەوە هەر دەگەڵ بووە. قەت لە کار کردن ماندوو نەدەبوو. کاریشی چێشت لێنان و ڕێک‌وپێک ڕاگرتنی بنکە بووە. لە هەموو تەمەنی، شەو بە کێوی دا و هەموو گیانیشی هەموو دەم درۆ و فرەوفیشاڵ بوو. درۆی وای دەکرد کە دە قوتووی هیچ عەتارێکدا نەبێ. ناوی هەر کەسی بیستبا -جا با چوارسەد ساڵ لەوە پێشیش مردبا- دەیگوت دەمناسی و زۆری نەقلی دۆستانە لێ دەگێڕاوە! بەڵام درۆکانی ئەوەندە بەڕێ و جێ دەکرد، زۆر کەسی پێ هەڵدەفریوا و تا درەنگانێک بە ڕاستی دەزانین:

* لێنین؟ ئەی بە ڕەحمەت بێ! لە مۆسکۆ دیتمی سەری چەنەگەی ماچ کردم، فەرمووی عەلی بەرنە مووزە بە کەیفی خۆی چی دەوێ هەڵگرێ! گەڕام، گەڕام، جووتێک کلاشی هەورامیم هەڵبژارد. هەموویان بۆیان لە چەپلە دام!

* گاگارین گوتی: مللیەت باش نییە!

گوتم: ئەگەر تۆ لە عاسمان دەگەڕای لە کوێ دڵت خۆش بوو؟

- له سەر مۆسکۆ.
- ها، ئەوە تۆش میللی!
له چەپڵەیان دا!

* مارشاڵ تیتۆ؟ ئەویٚ ساڵیٚ ئەمن له وارشەو نوتقم دەکرد، منداڵێک بوو جلی مارشاڵییان دەبەر کردبوو. زۆر منداڵێکی خوێن‌شیرین بوو!

* مۆشیٚ دایان؟ ئەو سەگبابە ئێستاش تووتن و پەرِم پیٚ قەرزدارە! فەعله بوو له جادەی گەلی عەلی‌بەگ، گوتی: مام عەلی بۆ جغارە چبکەم؟ تووتن و پەرِ و چەخماغم دایە. ئەمما ئەودەم ناوی مووسا دایان بوو!

* کوێر بم، پاش سمایلاغای سمکۆ من گەدرم نەماوەتەوە! هەر پێی دەفەرموومەوە: «دایی ئەلی!». ئەودەم ئەو تفەنگە برِنۆیەم هەر بە دەستەوە بوو!

ئەوەی له کن من و ئەحمەد دەگێراوە کە من تفەنگەکەم بۆ له ئەحمەد ئەستاندبوو!

* باپیرم -بابەکی خورِەم دیلی!- کورد بوو. شەشسەد، حەوسەد، هەشسەد ساڵ پێش، هیزبی سوسیال دیموکراتی درووس کردا!

* له تەورێز لەشکرچی سەتارخان بووم. ساچمەی تۆپمان نەمابوو. رِەحمەتی مەشتی مەمەدالی‌خان، کۆلی پەنجا حەنباڵی دوو گرانی و پێنج گرانی نارد، کردمانە ساچمەی تۆپ!

جارێک دەیگوت مودیر پۆستی ئەمنیە، جارێک سەرلەشکر؛ ئیتر هەرچۆنی بۆی هاتبا!

* جزیرەی خارک چوار دەورەی بەحرە؛ پرِە لە تیمساح. کیٚ بچێتە دەم ئاو، تیمساح دەیخوا. تاقە پردێکی هەیە؛ تەنیا زیندانییەک لە دنیادا توانیویە لەویٚ هەڵیٚ؛ ئەویش من بووم! دیتم یەکێک لە بن کامیۆن تەکەتەک دەیکاتەوە، منی بە لیباسی هەبسی دیت؛ گوتی: ئەلی! ئەوە لێرە چ دەکەی؟! جلی شاگردی دامیٚ؛ دەگەڵی سوار بووم. هێنامی تا نزیک شیراز. لەوێوە بە پیٚ، بە سەهرادا دوو مانگ بە رِێزی دارتێلاندا هاتم تا گەیشتمە ئابادان. چوومە گاوەخانە؛ یەکێک گوتی: ئەلی! لێرە چ دەکەیەوە؟! گۆران بوو. بردمی دوو مانگ لە سەرداو -لە پەنا کووپە شەرِابان- بەخێوی کردم!

ئەم درۆ زلانە و هەزارانی دیکەی وای دەنەخشاند هەر حەزت دەکرد گوێی لیٚ بگری. گیانێکمان بەو درۆ نەخشینانەیەوە بوو. هەر باسێکیشی بکردایە کە لە زەمانی جمهووری سابلاغدا با، دەیگوت: «ئەوە هەژار دەزانیٚ!»؛ دەمویٚرا بلێم نا؟! کەلیمەی «سەگباب» لە کن ئەو قسەی خۆش بوو بۆ هەر کەسیٚ کەمترین رِەخنەی لیٚ بگرتایە.

چێشتی لێدەنا، بەڵام دەگەڵی نەدەخواردین. رِۆژێک برنجی سی کەسی لێنابوو، خوێی تیٚ نەکردبوو. کاکەحمەد گوتی:

- مام عەلی وا بزانم کەمێک بیٚ‌خوێیە!
- ئافەریم! هەر دەمگوت بزانم سەگبابێک دەزانیٚ خوێم تیٚ نەکردووە؟ تەجرەبەم کردن؛ تۆ زۆر زیرەکی!

بەڵام بە پاڵ ئەو هەموو درۆ نەخشینانەشەوە، یەکجار زۆر چیرۆکی ناو کوردان و مەسەل و رِابردەی گەورەپیاوانی دەزانی. زۆر جار وا بووە نەمزانیوە بە کوردی بە شتێک دەڵێن چی، ئەو دەیزانی. هەر ئەگەر دەمدی تۆزێک کزە، دەمگوت: خەم مەخۆ، با شۆرش خەلاس بیٚ، دووبەدوو دەبینە چەتە بە شاخانەوە، هەر حاجیان رِووت دەکەین! وە کەیف دەهاتەوە. ناتوانم

هەموو باس و ڕەفتاری مام عەلی لێرەدا بنووسم، چونکە کتێبێکی گەورەی دەوێ. ئەمانەم بۆ چەند نموونەیەکی -کەم لە زۆر- گێڕاوە کە بزانی چەند وەرزێرکە و ئاودەنگیەکی خۆش بوو لەو چیا و چۆلە.

سەلاحی موهتەدی (مستەفا) زۆری شیعری فارسی لە بەر بوو. کاوە سەرەڕای زۆر ئازایەتی و بەکاری، لە لاساکردنەوەی هەر کەسی دیبووی وێنەی نەبوو. بەو دووانەش زۆر کەیفم دەهات.

ڕۆژێک «مەلا حەسەن ڕەستگار» و «مەلا ڕەسوولی پێشنمازی» دوو کەسیان دەگەڵ خۆیان هێنا کە تازە لە سابلاغەوە هاتبوون. دوو جحێڵ بوون، یەکیان ئاولاوی بوو، گوتیان گوێ بگرە زۆر خۆشە. یەکیان بە توورەیی هەڵیدایە:

- ئاغا گیان ئەمە بە شەو، بە بیراهە، بە هەزار جان کەندەن، بە نێو دڕوواندا هاتووین، لاقمان زەخمی بووە، ئەو گاندەرانە پێمان پێ دەکەنن!

منێکی ئەو هەموو ساڵە لەو زاراوە خاوە دوور، چۆن پێنەکەنم؟!

لای کابرایەکی سوورچی دانیشتبووم. لەپڕ پرسی:

- ئەتو خدری مە ناناسی؟

- نا.

- لۆ؟ خدر، خدر، کو نایناسی؟!

- بەڵێ دەی...

- خدر جنێوی بە سەید دابوو ببوە گورگ. پاش بیست ساڵان شەوەکی دە قولکەی کەوتبوو، ببۆوە بە خدری جاران. بەرام ددانەکانی هەر گورگی بوون؛ هەستی ستووری پێ دەشکاندن. خواردنی هەر هەستی بوون!

- ئەی ماشەڵلا!

هەر ئەو سوورچییە گیایەکی دامێ، لاسک درێژی گەڵا وەک کەوەری درێژۆکە، تامی لاسکەکەی زۆر ترش و خۆش. گوتی: ئەوە مام ڕێواسە، دەرمانی هەموو کرمانە. بۆ دوکتور مەحموودم برد و پێم گوت؛ گوتی: کەرە، درۆ دەکا! هەر جۆرە کرمە دەرمانی تایبەتی خۆی هەیە. پاش چەند ڕۆژێک دوکتور گوتی: بە ڕاستی کابرا ڕاست دەکا؛ هەموو کرمێک دەکوژێ.

مەلا باقی کونە ئەشکەوتێکی پەیدا کردبوو، بە تەنیا تیا دەژیا. نازانم بۆ کوێیان نارد. دوو داری وشکی سەر دوفلیقانەی ئەستوورم لە دەرگاکەی چەقاند و دارەڕام کرد و گیامان خستە سەر، تەواو خۆش ببوو. ناوم نابوو «کونە باقی»، کردمە ماڵی خۆم. تا نیوەڕۆ بەر سێبەرێکی خۆشبوو؛ دەنووستم، دەمخوێندەوە، دەمنووسی. دوو سەرمازەڵە کە «خەمەگرو» یان «قمقمۆ»ی پێ دەڵێن دەهاتنە بەرانبەرم بە بەر دەرکەوە سەریان ڕادەوەشاند، دەتگوت دەروێش زیکر دەکەن. تەواو سەبووریم پێیان دەهات. ڕۆژێک دوو بارزانیم لە لا بوون، چاویان پێ کەوتن:

- های دەبێ بیانکوژین!

- ئەوانە دۆستی منن، هەر چی دەستیان بۆ بەرێ خوا هاوار!

دەبێ ئەوە بزانین کە بارزانی لایان وایە کوشتنی سەرمازەڵە خێرێکی گەورەیە و کێ دە سەرمازەڵە بکوژێ، وەک کافرێکی کوشتبێ وایە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر چیرۆکێک کە لە هێندێک کتێبی قەدیمدایە: ئەگەر برایم پێغەمبەریان خستۆتە ناو ئاگر، سەرمازەڵەی فاسق فووی لێکردووە تا ئاگر خۆشتر کا! تەنانەت وا بزانم شێخ مارفی نۆدێیی کردوویە بە شیعریش،

دەڵێ:

فاسقی خەمسە دیارە: دووپشک و مشک و مارە سەرمازەڵە و کوڵلارە
بە ڕیوایەتێکیش: قەلەبازەڵە و کوڵلارە

کە قەلەبازەڵە قشقەڵەیە و بۆ خۆشم کە فەقێیەکی منداڵ بووم، قشقەڵە کوشتنم بەخێر دەزانی. ڕۆژێک بە بارزانیم گوت: ئەگەر شۆڕش خەلاس بێ، کەرێک و دوو سەبەتە دەبەمە لای کۆیە. هەر سەرمازەڵە دەگرم و دێنم لە بارزان دەیفرۆشمەوە، دانەی بە نیو دینار!

کوڕێکی مەلامستەفام دی ڕاوی سەرمازەڵەی دەکرد. گوتی: هەر تەنیا یەکێکم کوشت. گوتم: هەر باشە کەپۆی کافرێکت دە خوێن هێناوە!

ئەوا لە ئەشکەوتی کونەباقیدا خەریکی نووسینەوەی شیعری مەلا ئەحمەدی نالبەندم، ئاگام لە دنیا براوە، تەپەی پێ لە سەربانەکەمەوە هات، هەرام کرد: تێ دەکەوی مەیە! لەپڕ دەستە کەرێک شۆڕەوە بوو. دیار بوو بۆ دەست کوشین درێژ کراوە! کەر هاتبوو گیای سەربانەکەم بخوا، تێکەوتبوو. تا ڕامانکێشا چەقی مەرگمان کرد.

پاش‌نیوەڕۆیان ئاوی تێ دەکرد، دەچوومە ئەوبەر کە سێبەر بوو. لە بن دارێک جێگەم خۆش کردبوو؛ کاری نووسینەوەم لێ دەکرد. ڕۆژێک خشەیەک لە پووش هات؛ ڕوانیم مارێکی ڕەشە. سەرم داخست. قەدەرێک دوو دڵ ما؛ پاشان هات بە بەر دەممدا، نزیک میترێک دوور ڕۆیشت. پاش ماوەیەک هاتەوە؛ ڕاست بە شوێنەکەی خۆیدا گەڕاوە. دەگەڵ مار بوومە دۆست. هەموو ڕۆژ سەعات چوار پێنج دەقیقە کەم دەهات؛ سەعات چوار و حەوت دەقیقە دەگەڕاوە. قەت شوێنەکەی تێک نەدەدا. دەچوو ئاوی لە شیوەکە دەخواردەوە. ئەمەم بۆ مستەفا گێڕاوە -کە ئاشنایەکی وام پەیدا کردووە- هاتە لام. دەمانڕوانیە سەعات، سەری وەخت مار هات. مستەفای نامبارەک پلارێکی تێگرت و مار چووە بن وشکە دارێکەوە. هەرچی گوتم فایدەی نەبوو. پووشی کۆ کردەوە و داری ئاگر دا. ترێکیشی پەیدا نەکرد؛ بەڵام ئاشناکەمی تۆراند.

تا بارزانی بۆ خۆی لە چیای براندۆست بوو، بنکەی فەرماندەیی بالا بوو. هەموو باس و خواسی شەڕ -کە لە هەموو ئاقاران گەرم بوو- دەهاتە ئەوێ و فەرمان لەوێوە دەدرا. وەک هەمیشە بەیانییەک دیتمان بارزانی و هەوالانی چەکداری پاسەوانی نەماون. شەڕ لە بارزان توند ببوو، بۆ خۆی چووبوو. هەرچەند هێشتا زۆر بنکەی لەوێ مابوون و کاری جەبهەی ئەو ناوەیان بەڕێوە دەبرد، دەگەڵ ئەحمەد بڕیارمان دا ئێمەش بچینە بارزان. ڕۆژێک چوومە گوندی خەلیفان. دوکانێکی لێ بوو، هەشت پاکەت قاوە و قاوەجۆشێکم کڕی و هێندێک کەلوپەلی‌تر کە نەوەک دەسمان نەکەون. شەو هەموو هەواڵە ئێرانییەکان لە ئەشکەوتێک کۆ بووینەوە کە چۆن بڕۆین و چ بکەین؟ «سولەیمان موعینی» کە ناوی «فایق» بوو، زۆر بە دلگەرمی باسی فیداکاری دەکرد و دەیگوت: دەبێ ئێمە خۆمان لەو شەڕەدا نیشاندەین.

ئەحمەد بە سرتە پێی گوتم: فایق ناوێرێ بێ، ئێستا بە فێڵێک خۆی دەدزێتەوە.

گوتم: دیسان بەدبینی؟! بەسیە...

پاش وتووێژێکی زۆر، فایق گوتی: کاک ئەحمەد، ئێمە هەموومان بچینە بارزان و هێندە لە ئێران دوور کەوینەوە، ئەدی کێ دەرمانێک، قەند و چایەک، جلکێک، شتێکمان بۆ بنێرێ؟

ئەحمەد چاوی لێ داگرتم:

- ڕاست دەکەی؛ جا کێ بچێ ئەو کارە بکا؟

- من دەگەڵ چەند برادەرێک دەچینەوە قەلادزە. ئاگامان لێتان دەبێ، کە زۆر لازمە.

ئەحمەد گوتی: فایق زۆرم تەجرەبە کردووی! پیاوێکی زۆر خوێڕی و ترسەنۆکی! ئەو جارەی کە دەگەڵ هەباساغا دەمەقالەم بوو، جنێوم پێ دا. ئەویش سێ کەسی ناردبووە سەر ڕێگەم کە لێمدەن. تۆ دەزبەجێ هەلاتی و بەجێت هێشتم. من دەگژیان ڕاچووم و تفەنگم لە یەکیان ستاند و بە پاڕانەوە دەستم لێ هەلگرتن. ئەوە جگە لە چیرۆکی هاتنەکەت بۆ عیراق کە مینەشەم و کاوە باشی دەزانن... برۆ لە قەلادزە دانیشە! ئێمە دەڕۆین. بەلام برادەرە ئازاکانمان مەبە!

فایق سەری داخست و بێدەنگ بوو. ئەحمەد دوو کەسی دەگەڵ بەجێ هێشت و هەستاین.

- برا خواحافیز!

فایق دەستی دە دەستی دەناین و دەیگوت: «هەر خوایە نامرێ»!

ئەوەش من بۆ قەبری مەحموود کاوانیم نووسیبوو؛ یانی ئێوە بەرەو کوشتن دەچن.

دوایی لە کاوەم پرسی چیرۆکی هاتنی فایق چۆن بووە. بۆی گێڕامەوە و ئۆبال بە ملی خۆی:

«چەند کەسێک بووین دەگەڵ فایق بەرەو عیراق دەهاتین. لە ڕێگە ڕەمزمان دانا کە بە لایت یەکتر لە شەوا تێ بگەیەنین ئەگەر لێک بلاو بووین. شەو لە کێوێک بووین؛ خرمەی ولاغان هات، دەنگمان دان، لە چەخماخی تفەنگیان دا و ئێمە لێک بلاو بووین. تەقەیان لێ کردین و ئێمەش تەقەمان کرد. ئەسپێکیان لێ کوژرا، یەکیان بریندار بوو. هاواریان کرد: ئێمە قاچاقچین، لێمان گەڕێن دەڕۆین. ڕۆیشتن. بلاوبووەکان هاتنەوە. فایق دیار نییە. زۆرمان هەرا لێ کرد، پاش تاوێ جوابی داوە:

- ئێوە کێن؟

- چۆن؟ ئێمە هەوالی خۆتین و دەنگمان دەناسی و ئەوەش ڕەمزی لایت.

هەرچی کردمان لە کون نەهاتە دەر. بەجێمان هێشت. مینەشەم بۆی گەڕاوە، هەڕەشەی لێ کردبوو:

- نەیە دەر دەتکوژم!

بە هەزار گێرە و نیرە و سوێند کە ئێمە هەوالی خۆتین، دەریهێنا و هاتەوە لامان!»

بەرەو دوای یەک لە چیای براندۆستەوە داگەڕاین؛ دامانە سەر کاروانەڕێ. لە گوندێک بە ناوی «سۆران» دوو پیرەمێرد پێکەوە داوەتیان دەکرد. گوند چوار مالە. جحێل لە جەبهەن. کوڕێک هاتۆتەوە بووکی بۆ بگوێزنەوە. کوڕ خەریکی ئامادە کردنی نانی میوانە؛ دەگەڵ ژنان و باب و مامی داوەت دەکەن. یەک دوو گەڕیان دەگەڵ هەلپەڕین و ملی ڕێمان گرت.

لە تیئۆری «داروین»دا ئالقەیەکی گوم هەیە کە بۆی نەدۆزراوەتەوە. وەختە بلێم ئەسپە سپیلکی منیش لە مێشکمدا ئەو ئالقە ونەیە! لە ناو خۆشناوەتی پێم بوو. لەو شەوەوە کە لە جادەی خەلیفان پەڕیومەوە، پیادە بووم تا لە چیای براندۆست هاتوومە خوار. ئێستا ئەسپە سپیلک بە بێئەوە هیچ عاقل بووبێ لە لامە! خۆزگە برادەرێکی هاوڕێی ئەو دەم ئەو ئالقە گومەی بۆ بدۆزیبامەوە کە ئەم شەخسییەتە گرینگە کام دەوری گێڕاوە؟!

حەسەن برازای ئەحمەد تەوفیق دەلێ: ئەسپەکەت درابوو بە مەلا باقی، پێی چووبووە دەرگەلەی گوندی سلێمان بەگ؛ پاش چوار ڕۆژ بۆیان هێنایەوە!

شەو لە دەشت ماینەوە. بەیانی لە گوندی «سلێمان» ساوارێکمان خوارد و -بە تیری- لای

نیوەڕۆ، گەینە «ڕێزان»؛ کە ماڵە مەلامستەفا -یا دەبێ بڵێم ئیدریس- لەوێ دەژیا. دێ -وەک هەموو دێهاتی بارزان- بە ڕۆژ چۆڵوهۆڵ لە ترسی تەیارە؛ کە هەمیشە بە عاسمانەوە دەخولانەوە و هەر جانەوەرێکیان دیبا، بەر بۆمبا و مووشەکیان دەدا. لە قەبرستانێک چووینە بن دارمازوێکی زل. مێشوولە وردە کارێکی دەکرد نەعووزوبیللا! هێندێک تەرسی وشکمان کۆ کردەوە و ئاگرمان دا کە دووکەڵ مێشوولە بڕەوێنێ و بتوانین چاو هەڵێنن. ئەحمەد تەوفیق و حەسەنی برازای ڕۆیشتن. ئەحمەد گوتی: ئێوە لێرە بن بزانم کەسێکی وا پەیدا ناکەم خەبەر و باسێکی لێ پرسم. هەر ئێستا دێمەوە. ئەو ڕۆیشت و نەهاتەوە. مستەفا و من و خدر ناوێکی گەورک بە دیار دووکەڵی تەرسەوە چاوەنۆڕ ماین. زەلامێکمان لێ پەیدا بوو:

- مەمنووحە ئاگر، تەیارە دەتانبینێ.

ئاگری پێ کوژاندینەوە، مێشوولە هێرشیان هێنایەوە.

- برا تا کوێر نەبووین با بچینە ناو ئەو ماڵە چۆڵانە.

- تەیارە لێمان دەدا.

گوتم: کاکە! یان تەیارە لەو خانووە دەدا، یان نادا. ئەگەر لێی دا، چووزانن لەو شوێنە دەدا کە ئێمەی تێداین؟ ئەگەر لەوێ دا، چووزانین ڕاست وە ئێمە دەکەوێ؟ هەر چییەک بێ بۆمبام پێ لەو مێشوولە کوێرانە باشترە. ئەوا ڕۆیشتم.

مستەفا و خدریش هاتن. لە پشت خانووەکەوە -کە دەرگاکانی داخرابوون- کونێکمان پەیدا کرد. چووینە ناو وەتاغێک، تەختە دامەی لێ بوو. «با دامە بکەین». گرەی تەیارەش ناپسێتەوە. کا خدر لەو لاوە کرووشمەی کردەووە. بایەکی توندی هەڵکرد؛ لوولەی کوورەی بەشی سەربان ورەی دەهات؛ گورەی تەیارەی زیاد دەکرد. لەپڕ با دەرگایەکی شەق پێوەدا.

گوتم: ئەها! بە خوا لێیدا!

کا خدر قوت بوو، گوتی: بۆ نەچینە دم چۆم؟ نان و چا لەوێ بخۆین!

مستەفا دەیزانی چ باسە:

- لە دم چۆم مێشوولە زۆرە و تەیارەش دەمانبینێ. توزێکی تر...

دیسان لوورەی لوولە کوورە و تەقەی دەرکە هات. خدر گوتی: دەچمە سەر چۆم بۆ دەسنوێژ! ڕۆیشت و تا شەو نەهاتەوە. پاش نوێژی شەوانێکی درەنگ، ئیدریس و پێشمەرگە و ئەحمەد تەوفیق و مەلاباقی داوەرینەوە. تا سەعات دووی پاش نیوەشەو چەقە و هەرا بوو. باسی دروێنەی بە شەو، سووتانی دەخڵان بە تەیارە و خۆ شاردنەوەی بە ڕۆژ بوو. لە بیرمە پیرەمێردێک گوتی: «سوێند بە خودا هەر کەس بە دڵ ماڵی خۆی بە هی شۆرش بزانێ و دەخڵەکەی بە نیەتی نانی پێشمەرگە بدروێتەوە، بەر تەیارە و سووتان ناکەوێ...».

درێژ بووین کە بنووین، دوای سەعات دوو ڕاستیان کردینەوە:

- بڕۆن لە دەرەوە خۆ بشارنەوە.

دەگەڵ مەلاباقی و مستەفا هاتینە بن کەندالێک لە پەنا پردی ڕێزان کە لە سەر «ڕۆکچک» دروست کراوە. لە سەر خیزی دەم چۆم ڕاکشاین. زینی ئەسپەکەم کردە سەرین؛ کەشفێکی تازە بوو! نازانم ئەم خان و ئاغا و پادشایانە چۆن عەقڵیان بەوە نەشکاوە؟! زین هەر سەرینە و بەس؛ ناهێڵی سەرت بە هیچ لایەکدا خوار بێتەوە. مەنجەڵێکی پچووک چێشتی برنج، نانمان دەگەڵ خۆ هێنابوو. پاش نوێژی شێوان -کە هاتنە شوێنمان- گوتم: بۆ دوو سەعات ڕاکشان

نایەمەوە گوند؛ جێ لێرە خۆشتر نابێ. مەلاباقی و مستەفاش مانەوە. برنج شەو لێمان خوارد، مابوو؛ سبەی پڕ ببوو لە مێرووله. مەلاباقی لە ئاوی ڕووباریدا نوقم کرد، مێرووڵەی قڕ کرد و دەستی بە خواردن کرد.کە ئێمە دەمانگوت ناخۆین...

- بەڵێ، ئێوە نەجیمزادەن؛ دایکتان خۆرشت و پلاوی بۆ هەلگرتوون!

باوڕ کە چوار جەمی‌تری لێ خوارد؛ هەموو جارێ مێرووڵەی لێ دەردەکرد!

قرۆشکەی چا پێ خواردنەوەم لێ ون ببوو؛ بە هەزار پاڕانەوە مەلاباقی قرۆشکەیەکی تێکوڵ لێ هەڵبووی دامێ. بە بەنێکمەوە کرد، وەک فیشەکدان دە ملمدا بوو. چام پێ دەخواردەوە، لە ملم دانەدەڕنی. دەرزیلەیەکم کردە قولاپە ماسی، بەنێکم تێ خست و لە سەر چەم ماسیم دەگرت. چونکە نووکەکەی نەچەمابوو، لە دە ماسی، یەکێکی خۆی لێ ڕزگار نەدەکرد. دیسان هەر جارە شەش-حەوتێکم دەگرتن؛ بەلام بچووک. مەلاباقی دەیبرژاندن.

مەلاباقی چای لێدەنا. یانێ کەتریەکە ئەو دەیخستە سەر ئاگر. تا بۆخۆی تێری نەخواردایەتەوە نەماندەتوانی بلێین: «ئەدی ئێمە؟»، ئەمجار خۆی دەیگوت: «ئەمەش بۆ ئێوە!»، هێشتا نیو سەعاتی شەو دەما چای لێدەنا. چەند سالێک -کە زۆر جار بەیەکەوە بووین- فێری ببووم؛ هەر کەس بیگوتایە: «دا چایەکم دەیە» تووڕە دەبوو. دەبوایە خۆی بلێ: «ها ئەو چایە بخۆوە!». جغارەی هەڵدەپێچا. دەگەڵ تووتن و پەڕ لە قوتووە موجزاتەکەیدا بوو. بتگوتایە: قوتووم دەیە بۆخۆم یەکێ هەڵدەبەستم، بە ڕووحسووکی دەیدا. کێ بیگوتا: دا یەکێک لەو هەڵپێچراوانەم دەیە، واوەیلا بوو!

سێ یا چوار ڕۆژ لەو بن پردەمان گوزەراند. دەردی گەورە بۆ ئەسپە سپیلک بوو: لە مێرگێک دەبەسرایەوە؛ فیلم دەویست بوێرێ ڕایگوێزێ! تەیارە هەمیشە لەو ناوە بوو؛ نازانم بۆ وە بەر نەکەوت. بەلام تەواوێک لە توونیان دابوویە کزی؛ ئەو شەلاتییەی نەمابوو؛ لە خوڕین و گوڕین کەوتبوو. فەیلەسووفانە ڕۆژێ هەر فکری دەکردەوە و بۆ مێش دەرکردن سەر و کلکی ڕادەوەشاند. شەو هاتبووینە گوند. ئەحمەد و هەوالانی ساز دەبوون لە زێ بپەڕنەوە کە بارزانی لەوبەر بوو.

- منیش دێم...

ئەحمەد و ئیدریس و گشتیان دەڵێن قەیاغ و کەلەک خەتەرن؛ نابێ بڕۆی تا لە بارزانی نەپرسین. لەوانەیە لێمان تووڕە بێ. گوتم: هەر دەچم. ئەمجارە بۆ تەجرەبە؛ شەرت بێ ئەگەر ئاو بردمی و خنکام، تازە ناپەڕمەوە!

بە کن گۆڕستانی «بلە»دا ڕابردین؛ قەرەبالغ بوو. پێنج شەهیدی شەڕی ئەو ڕۆژەیان دەناشت کە یەکیان «مەلا شێنی» ئەو قارەمانی بەناوبانگ بوو؛ لە پیرس شەهید کرابوو. نوێژی بەیانی بە قەیاغ پەڕینەوە. لە ڕووتەن دەڕۆیشتین، نزیک بە لێرەوار بووین. تازە گزینگ لە سەرانی دەدا، پێنج تەیارە لە عاسمان پەیدا بوون. تا ئەوان چەرخیان خواردەوە، خۆمان گەیاندە ناو داران و بەر موشەکیان داین. لە بن دارێکی زۆر زلی پڕ لک و پۆپدا ستار بووین. تەیارە دەستیان هەر هەڵنەدەگرت. بەلای گەورە ترسێکی زۆری «جەمیل» ناوێک بوو - پێم وایە بانەیی بوو- ئۆقرەی نەدەگرت. لە جێ دەردەپەڕی و مەیدانێک ڕایدەکرد و دیسان لە ترسان دەهاتەوە بن دارەکە؛ کە تەیارە هەستیان پێدەکرد لە کوێ خۆمان حەشار داوە. لەو گوللەبارانەدا قاپووڕە مووشەکێک (فیشەکێکی زل) لە بەردێک هەڵبەزیەوە و کەوتە ناومان. مام عەلی دەستی بۆ برد،

گوتی: وەی سەگبابە دەستم سووتا! لە دانیشتنی بن بەرد وەڕەز بووم. دەرکەوتم چوومە سەر ئاو. گۆمێکی لێ بوو؛ مەلەم تێدا کرد. دارتوێکم دیتەوە، خەریکی توو خواردن بووم. چاوم لێ بوو ژنێک بە ماتە-ماتە بە بن دیوارە بەردێکدا دەڕۆیشت. لە بن ئاو هەڵدێرێکەوە بە بەرد هەڵچوو. لە کونە بەردێک لەو بەرزەوە بوخچەیەکی دەرێنا و هاتە خوار. سەری کابرایەک لە کونەکەوە دەرچوو، دەیەویست بێتە خوار؛ شێوابوو. هەرام لێ کرد:

- بچۆرەوە ژووری کون، دە پێشدا لاقان بەرێ کە! دەنا بە سەر تۆقی سەردا دەکەوی!

ئێوارە گوێزتمانەوە شوێنێکیتر لە بن چیای پیرس؛ کە «بن‌گەر»یان پێ دەگوت. لە گۆڕاییەکی ناو دار و بار و سەر جۆگە، بنکەمان دانا. شەوانە مێشوولە وردە و تەپۆ کوێرە حەشریان دەکرد. حەجمین هەڵگیرابوو؛ دەست و چاومان لە ترسان دادەپۆشی. لە سەرەوە کە دندووکیان تێدەچەقاند، خوێنیان دەردێنا. تەپاڵە و تەرس - بۆ دووکەڵ کردن دژی مێشوولە- ببوە دەرمانی چاوان. بە کڵاوەکەم بە بنکە پێشمەرگاندا دەگەڕام:

- کاکە! سندووقی سەری خۆتان بە هێندێک تەرس دەستمان بگرن! ئەگەر تەرسی ئەسپە سپی وشک بێتەوە دەتاندەمەوە!

وەک تارمایی بابی هاملێتی شەکسپیر دەگەڵ بەری بەیان و کەلەشێر خوێندن، مێشوولە دەرەوین و ئەمجار نۆرەی تەیارە و بۆمباران و مووشەکباران بوو. هەمیشە دوازدە تەیارە و پتر خولیان دەخوارد. ئێران و تورک دەگەڵ بەعس هاوکار بوون. دوو دەستەی ئێرانی و تورکی بنکەیان لە کەرکووک بوو. دەیانگوت ڕۆژانە تەیارەی ئینگلیسیانیش لە قوبروسەوە دێن و بەشی خۆیانی تێ دەخەن. تەیارەی مێگ و هوکرهەنتەر و بە مارکی ڕووسی و ئینگلیسی و تورکیمان دەدی. بە سەدان تۆپی گەورە و پچووکی سەحرایی وێکڕا دەتەقان و بە قسەی ئەفسەرێکی عیراقی چوارسەد تۆپیان وێکڕا ئاگر دەدا کە سەد و پەنجایان تۆپی گەورە بوون. ڕادیۆ مۆسکۆ هەموو شەو تاریفی لە بارزانی پاڵەوان دەکرد و بە مەدحی پێشمەرگەدا دەهاتەوە خوار و دەیگوت: شۆڕەوی ناتوانێ قبووڵ بکا ئەم شەڕە زاڵمانەیە دژی میللەتێک لە جیرانەتی ئەودا بکرێ. مەنگوولیاشی ڕاسپارد شکایەتمان بۆ بکا. وا دیار بوو تورک و ئێران لەو فڕ و فیشە ترسابوون؛ دەستیان لە یاریدەیی بەعس بەردا.

ڕۆژێک گوتم: ڕووس زۆرمان بۆ باشن. بارزانی فەرمووی: من دەگەڵ زۆریان دۆستم؛ خرۆشۆفیش دەناسم. ئەوانە کە جنێو بە بەعس دەدەن و لە سەر ئێمە دەکەنەوە، بۆیەیە دەترسن بەعسی چەکیان لێ نەکرێ و ڕێگەیان نەدا وەک زەمانی قاسم بێنە عیراقەوە. ئەگەر بەعسی سەودایان لێ بکەن، نە لە سەر شیووعی دەکەنەوە و نە لە سەر ئێمە. کە ڕاست دەرچوو: هەر کە سەلام عارف خۆی کردە دۆستی ناسر و دەگەڵ ڕووس ئاشت بۆوە، دنیا گۆڕا!

هەشتا هەزار جاش و سەرباز بە تیربار و تفەنگ دەسرێژیان دەکرد. هەموو چەکداری پێشمەرگە لەو ناوەدا بە حاڵ دەگەیشتە پێنج سەد کەس. ئاگرباران و جەنگەڵ سووتان و دووکەڵ داوەستان، ڕۆژی حەشری دێنا بەر چاوان.

بەیانییەک یەکێک بە گەرمی ئەحواڵی پرسیم، نەمناسی. گوتی: مەلا حەسەنی بارزانیم. چوار ڕۆژ بوو نەمدیبوو؛ لە دووکەڵی بارووت و لە توونیان وا زەرد و ڕەش هەڵگەڕابوو کە نەمناسیەوە. نان زۆر کەم بوو. ڕۆژێ دوو نانی زۆر چکۆلەی تەنک کەسی تێر نەدەکرد. لە برسان هێزی ئەژنۆ شل دەبوو. ئاوی جۆگە زۆر گەرم و گران بو. نانی وشکمان بەو ئاوە دەخوارد. پێشمەرگە پتر لە

هەزار سەر مەڕی جاش و دەوڵەتیان بە تالان هێنا. بە داخەوە تەنزیم و ڕێک‌وپێکی لە دابەش‌کردندا نەبوو. بە چوار ڕۆژ بۆ هەشت کەس حەیوانێک هەبوو. نە قاپ و مەنجەڵێک، نە جێگەی هەڵگرتنێک؛ دەبوایە بە یەک جەم ئەو هەشت کەسە لاشێک بخۆن. شیش لە دار بتاشن و لە سەر پۆلوان ببرژێنن. چێشت هەڵگرتایە لە گەرمان بۆگەن دەبوو. لە جەمێک ئەوەندەیان گۆشتی برژاو دەخوارد زۆربەیان نەخۆش دەکەوتن. تا چوار ڕۆژی‌تر و جەمێکی‌تر نانی وشک و ئاو، دەست پێدەکرایەوە. دەمگوت: برا ئەگەر مەنجەڵ و قاپی فافۆن هەبا، هەر ڕۆژێ بە سی و دوو کەس حەیوانێکتان بدایە، هەموو جەمان هەموویان گۆشتیان دەخوارد؛ دەیانکردە قاورمە. سەر و پێ جەمێک، جەرگ و دڵ زیادی؛ بەلام بە داخەوە نەبوو.

مام عەلیە عەجەمەکەی خۆمان مەنجەڵۆکێکی پێ بوو تەواوێک حەساندبووینەوە. دەمانتوانی دوو یان سێ جەم پێخۆرمان هەبێ. ڕۆژێک قەدۆی کۆنە حەرەسەم هێندەی بەز و چەوری خواردبوو حالی تێک چووبوو؛ هیقی دەهاتێ و دەینالاند. تا دەینالاند مەلاباقی دەیگوت: سەگ دایک! کای خۆت نەبوو، کادێنی خۆت بوو! چای وشکمان پێ بوو. شەکر و قەند نەبوو. چای بێ شەکرمان دەخواردەوە و فێری ببووین. ڕۆژێک پیاوێکی زۆر پایەبەرز کە ئامیرلیوا بوو (وا بزانم دەبێتە سپەهبودی ئێران)، بە ناوی «عەبدوڕەحمان قازی» دەگەڵ بارزانییەک هات. گوتی: «مەلامستەفا فەرمووی بە هەژار بڵێن کاک عەبدوڕەحمان با میوانی ئەو بێ؛ قەدری بگرێ».

- ئای سەر چاوان!

پەتوێکی سەربازی تەنکم هەبوو، بۆم ڕاخست.

- مام عەلی چای لێنێ!

قرۆشکە چایەکیان لە پێش دانا، هەر تماشای دەکرد. دیار بوو وای بۆ چووبوو کە شەکری تێکراوە و لێک دراوە. فرێکی لێ خواردەوە و تفی کردەوە.

- ئەوە کوا شەکر؟!

- ببەخشە نیمانە، ئێمەش هەر وای دەخۆینەوە.

- لایبەن ناخۆمەوە!

- نەچی بفەرمووی قەدریان نەگرتم! لەوە زیاتر دەست ناڕوا.

ڕۆژی دوایی کەللەقەندێکیان بۆ هێناین، هەمووی بە دڵۆپە زەرد ببوو؛ یان دەبێ بڵێم ڕەش هەڵگەڕابوو. مام عەلی ڕۆژتە! بە کۆلک و قەندشکێنی تالانی پیری خەڵ، هەمووی وا ورد کرد عەینەکی زەڕەبینی دەویست لێکیان جیا کاتەوە! زۆر بە حەوسەلە و دانە- دانە عادلانە بەشی کرد و هەر کەس بەشی خۆی بخاتە گیرفانی. حەز دەکا بە جەمێکی خەلاس کا، حەزیش دەکا بە مانگێک.

سەرم زۆر هاتبوو؛ مستەفا و کاوە گوتیان بیخووسێنە بۆت بتاشین. بە خۆتراشی ڕیش کەوتنە سەرم؛ بە چوار جێ بریندایان کرد! گوتم: ئێوە لە سەری من خۆتان فێر دەکەن؛ جا بڕوانن من چۆن سەرتاشێکی کارامەم!خوا لە خێری دەرنەکا، پتر لە دە جێم لە سەری هەردووکیان دە خوێن هێنا و تۆڵەم لێ کردنەوە!

بەرەو چێشتانێک بەرەو زێ دەگەڕام؛ ژنان دروێنەیان دەکرد. هەر کە تەیارە پەیدا دەبوو هەرایان لێک دەکرد: «تەیارە کوڕە هات!» مات دەبوون. تەیارە دەڕۆیشت دەستیان پێ دەکردەوە. لە نزیک گوندی «زۆڕە گوان» ژنێک لە بن دارێک مەشکەی دەژاند.

- خوشکا من! تۆ سەروپێت ناوێ؟
- ئەی بە قوربان چۆنم ناوێ.
- کەسیتریش هاوسات هەیە؟
- ژنێکە بە چوار زارۆکەوە.
- سبەی زوو وەرە چەندی دەتەوێ ببە. وا من لە سەر ڕێگەتم.
- ئەدی کاکە تۆ دۆت ناوێ؟
- ئەگەر هەبێ...
- هەیە و پیوازی شینیش هەیە.

دەمکەیەک دۆ و دەسکە تەڕە پیوازێکم دەگەڵ خۆ هێنایەوە. لەو کاتەدا هەژدە کەسەکە ببووینە چەند جێ. کاوە و مستەفا و مام عەلی ناوێکی گەورک و من لە بن دار چنارێکی دەم رووبارێکی پچووک بووین. دەمکە دۆ بە دار داکە سارد ببێ و تەڕە پیواز بکە بابۆلە و بە پادشا بڵێ هەتیوە! ئێوارە عەسرێک بارزانی بە پارێزەرانیەوە بەوبەرماندا هات:

- هەژار! ئەوە چ دەخۆی؟
- کاکە نان و تەڕە پیواز بە دۆی سارد.
- هەژار تۆ لە من سازتری، من نان و ئاو دەخۆم...

بە کابرای سەلاخی حەیوانانم سپارد کە لەباتی ئەوە سەر و پێ و پێست فڕێ بدا، لە سەر یەکیان کۆ کاتەوە بۆ من. ژنەکە هات. پیواز و دۆی هێنا، هەتا کۆڵی گرتی سەر و پێ و پێستی بردەوە. ئیتر پیواز و دۆمان مشە بوو.

ئێوارەیەک بارزانی بانگی کردم: هەژار! با بچینە قەدەم لێدانێک. بە ناو دۆڵێکی زۆر وشکارۆی زۆر لێرەواری چوغوردا ڕۆیشتین. تووشی دار بەڕوویێکی زۆر ئەستوور بووین؛ مێشەنگوین لە قەدیدا هێلانەیان کردبوو. دیار بوو کلۆرایی دار زۆر پڕ لە مێش و هەنگوینە. حیلەی پلنگ دەهات. پاسەوانەکانی مەلامستەفا گوتیان: وا لەو ڕەوەزەیە، بیکوژین؟ فەرمووی: نا، جاشان بە جێگەتان دەزانن. لە دۆڵەکە سەرکەوتین و لە بێدار دەرۆیشتین. نەقلێکم بۆ مەلامستەفا دەگێڕاوە، دوو تەیارەی هوکرهۆنتەری سەگباب گۆزوگوممەت پەیدا بوون و بێ سەلام و کەلام بەر تیرباریان داین. فەرمووی: «دانیشن»، حەرەسەکان دانیشتن. فەرمووی: هەژار دانیشە! مات بە!

- تۆ خۆت دانەنیشی دانانیشم!
- دەڵێم دانیشە!
- بە قسەت ناکەم!

تەیارە ئەوسەر و ئەمسەریان کرد و چوار جاریان لێ پڕژاندین و چوون. حەرەس هەستان و کەوتینە ڕێ.

- دەی هەژار نەقلەکە تەواو کە.
- قوربان لە ترسان لە بیرم نەما!
- درۆ مەکە، نەترساوی دەنا دادەنیشتی. دەبێ تەواوی کەی!

لە سەر بەردێک دانیشتین. فەرمووی: تۆ ئێستا ئارەزووت لە دنیادا چییە؟

- تەییارە لێم نەقرمێنێ و لە پەنا سەماوەرێک دوو چای بە ئیستیکانی شووشە بخۆمەوە!

فەرمووی: تەییارە بە دەست من نییە؛ بەڵام ئاواتی چای سەماوەرت ئێستا هەرچۆنیە بۆ پێک دێنم.
حیکایەتی قەدەم لێدانەکەم بۆ هەوالانم گێڕایەوە. مام عەلی بایەزیدی گەورک -کە مردووی شیرنایەتی بوو- گوتی با بچینە زگ هەنگوینەکە.
- مامە گیان! دۆڵێکی وشکارۆیە؛ پلنگی لێیە. من ناوێرم بچم. ئەگەر تۆ بە تەنیا دەچی وەرە پێت نیشان دەم.
- بە خولای خۆش بوو بە هەنگوین هێندێک مێشکمان بهاتایەتەوە سەرخۆ؛ بەڵام زەحمەتە!
ڕۆژانە دەچوومە نزیک زێی گەورە. لە سەر بەرزییەک دادەنیشتم، گوێم لە دەنگی هاویشتنی تۆپ خەمسە-خەمسە (پێنج-پێنج) دەگرت کە لەودیوی چیای پیرسەوە دەیانتەقاند. ١٨ سانیە بە حەوادا وژەی دەهات. جارێک نەبێ نەمدی وە کەنارەی لای (بلێ) بکەوێ، هەر دەکەوتنە ناو چەم. مەلامستەفا فەرمووی: جارێکی دیکە ئەم کارە بکەی حەبست دەکەم؛ ئەوە هیلاکە...
ڕۆژێک بە ناو دڕوواندا بەرەو چۆم ڕۆیشتم مەلە بکەم. دڕووەکان زۆر بەرز و تێک سمڕاو بوون؛ بە زۆر زەحمەت خۆم گەیاندە پۆلە سپینداریک. بە ڕواڵەت تەڕی کەم ئاو بوو. ویستم بە ناویا ڕەد ببم، هەر چوومە ناو، ڕۆچووم. خۆم بزواند تا ئەژنۆ چوومە خوار. دیسان لە ترسی گیانی خۆم تەکانێکم دا خۆم، تا لای سەرووی ئەستوورایی ڕانم ڕۆچوو. نەخێر گیان هاتە سەر لێوان؛ ئێستا گۆڕم گوم دەبێ. وەک پەلەقاژەی مەلی سەربڕاو تەکانێکی زۆر بە تەوژمم دا؛ نەمامە سپیدارێکی بە قەد دەسکە پێمەڕەم وە بەر دەست هات. خۆم گرتەوە و خۆم کێش کرد. توانیم پاش دە دەقیقەیەک لە زەلکاو دەرچم و بێمەوە بەری پێشووم کە پڕ لە دڕکی بلند و نارەحەت بوو. خۆم بە ناو دڕکاندا خزاند. لە چەند جێ دەست و دەم و چاوم دە خوێن هات. گەییمە سەر لێواری چەم؛ لە کەوشەوە تا کلاوی سەرم لیتە و قوڕ بوو. خۆم ڕووت کردەوە و بە ناوی زێ شتمنەوە و هەڵمخستن؛ مەلەیەکیشم کرد. هەتا جل و کەوش کزر بوونەوە زۆری پێچوو. لە برسان حالم نەما. شوێنێکی هاسانترم لە ناو دڕووەکان بەدی کرد و هەر چۆنێک بوو دەرچووم. تووشی بێستانێک هاتم؛ وە ناو کەوتم؛ تالکەیەکم لێ کردەوە. قوزەلقورت چۆنە ئاوا. تێکولەکانیم خوارد. کابرایەکم لێ پەیدا بوو؛ کردیە هەرا:
- ئێستا دەتبەمە کن مەلامستەفا. ئێوە ماڵی منتان وێران کرد.
- برا زۆرم برسییە. نانێکم دەیە ئەو دەم بمبە لای بارزانی؛ یان خۆت لێرە بمکوژە!
کابرا خاو بۆوە. نانێکی بۆ هێنام؛ بە یەک هەڵپە خواردم.
- دە فەرموو! من ئامادەم، چۆنت دەوێ با وا بێ.
گوتی: نا نا برۆ؛ خوات دەگەڵ!
زۆر جار گوتوومە، بروای تەواوم وا بوو: هەر کەسێکی زۆر بە غیرەتیش، هەر دڕندەیەکی وەک شێر و پلنگیش، هەر گا هەست بە خەتەری مەرگ دەکا، جۆرێک ترس -جا با زۆر کەمیش بێ- دایدەگرێ. کێیە لە بەرانبەر مردندا هیچ نەبێ کەمێک تێک نەچێ؟ خوا لە هەموو ئافەریدەیەکدا کەم یا زۆر ترسێکی داناوە. بەڵام مەلایکەی ترس بە دەست، مەلامستەفای لە بیرچووبوو؛ ترس بە لای ئەودا نەهاتبوو. لە وەتاغی دیوەخانی بەغدا، لە ناو دۆست و ئاشنایاندا چەند ڕووگەش و خاترجەم بوو، لە جەنگەی گوللە و ئاگربارانداندا هەر ئەو پیاوە بوو. نە ڕەنگی دەگۆڕا، نە قسەی تێکەڵ دەبوون، نە وەیدەزانی مێشێکیشی لە دەورەیە. بەڵێ بە هۆی بەخێوکرانی لە کۆمەڵگای

شێخانی بارزاندا، لە خودا دەترسا؛ لە ئابڕوو نەمان و ناوزڕان دەترسا؛ بەلام ترس لە مەرگ و دوژمن؟ هەرگیز. هەر ئەوم دیت گاڵتەی بە مردن بێت. ئازایەتی و نەترسانەکەی لەو هەموو سالانەی ڕابردووی و لەو هەموو شەڕانەدا کە کردبووی، وەک ئەفسانەیەکی خەیالّی لێ هاتبوو. کە ئەو مابەینە لە نزیکەوە دەگەلّی بووم، بڕوام هێنا کە هێشتا کەس نەیتوانیوە و کەسیش ناتوانێ ئازایەتی و نەترسانی مستەفا بارزانی -وەک هەیە- دە یەکیشی پەی پێ بەرێ و بزانێ باسی بکا.

ڕۆژێک لە جەنگەی ئەو شەڕانەی بنی دەلاش، ئاگر بەر ببوە هەر چوار تەرەفمان. تەقە و گرمەش گوێی عاسمانی کەڕ دەکرد. ئاگری پووش و داران هەر دەهات و نزیک دەبوو. مەلامستەفا پالّی بە بەردێکەوە دابوو؛ سیغاری دەکێشا. ڕووی کردبووە من، حیکایەتی ڕاوەبەرازێکی دەگێڕاوە کە سالێک دەگەلّ شێخ ئەحمەدی برایدا تووشی ڕاوە بەراز هاتوون. زۆر بە وردی و هێمنی باسی هەموو وردەکاریەکی ئەو ڕاوەی دەکرد. چەند کەسێکیش لە حەرەسەکانی لە دەوری ڕاوەستابوون. «زورار» ناوێک بە هەناسەبڕکە و شێواوی هات گوتی: ئەزبەنی، جاش گەیشتنە گوندی «سەفتێ» و ئاگریان تێ بەردا.

فەرمووی: هەژار، سواراغا لەو ڕاوەدا لە هەمووومان چێتر بوو...

ڕیزە گوللەیەک هەر وا دوو بست بلندتر لە سەری مەلامستەفا وە بەردەکە کەوت و گوللەکان داوەرینە ناومان.

- جا سواراغا...

گوتم: قوربان سواراغا چی و ڕاوە بەرازی چی؟! بۆ من لە ترسان گوێم لە قسان دەبێ؟! ئێستا ئاگرمان دەگاتێ.

فەرمووی: سواراغا گوتی ڕاوە بەراز زانینی دەوێ!...

حاجکی حەرەس بە دەنگێکی لەرزۆکەوە کە دیار بوو زۆر لەوە دەترسا مەلامستەفا لە ڕێژنەیەکدا بکوژرێ گوتی: ئەز بەنی خەبەری هەژارە؛ لێرە لاکەوی باشە...

فەرمووی: سواراغا لە دواوە بەرازێکی کوشت. بەو کارەی...

حوسێنی حەمەداغای مێرگەسووری بە هەڵەداوان و پشوو سواری هات گوتی: ئەز غولام سەفتێ سووتا؛ جاش دێنە ئێرە. سەفتێ هەزار میترمان لێ دوور نەبوو.

فەرمووی: هەڕنێ! (یانی بۆی بچن). بەلێ، هەژار! گوێت لێیە؟

- نەخێر نەوەللا!

- سواراغا یەکە-یەکەی لە دواوە دەکوشت، پێشەوە نەیاندەزانی کە بە توندی بڕەون...

باوەڕ کە ئاگر لە هەر چوار لاوە لام وا بوو بیست میتری نەمابوو بمانگاتێ؛ تینی دەهاتە سەر و چاومان. ئەو پیاوە دەتگوت لە دیوەخان پالّی بە دەستە نوێنەوە داوە و چاوەنۆڕە قاوەچی و قەنەدار قاوە و قەنەی تێکراوی بۆ بێنن. لە چیرۆکی ڕاوەکە وازی نەهێنا و لە جێگەی خۆی چرکەی نەکرد. خواوراستان ئێستا با، دەمانگوت هیمدادی غەیبییە. ئاگر دامرد و نەمانگەیشتێ! خەبەر هات گوتیان جاشمان لە سەفتێ هەڵقەندن و کەلاکیان بە کۆمەڵ لەو دەشتە کەوتووە.

لەو ڕۆژانەدا کەیف کەیفی من بوو. لەوەتا بارزانی لە ڕووسیاوە گەڕابۆوە، هەمیشە دەوروبەری جمەی دەهات. نە شەو نە ڕۆژ قەت نەبوو سەت و دووسەتی لە دەورە نەبن. بە ئاواتەوە بووم جارێک -بۆ دە دەقیقەش بێ- بە تەنیا یان دەگەلّ سێ چوار کەسدا لای بم؛ دەستی نەدەدا.

بەڵام لەو ڕۆژانەدا کە چەکدار لە شەڕێن و خەڵکی‌تریش کاری ئیداری و پارتی‌بازی و هیچ نەبێ خۆ تێ‌هەڵقوتاندن و خۆ خوێن شیرین کردنی منافەقانەیان نەمابوو، کەس لە لاوە نەدەهاتە لای؛ تەنیا من و من. هەر لە فێنکی ئێوارەوە ڕادیۆم دەبرد و ئەخبارم بۆ دەکردەوە و قسەی قۆڕم دەکرد و زۆری کەیف پێ دەهات. گوێ قولاغی ڕادیۆ کوردی بەغدا بووم، هەر کە «شاهین تاڵەبانی» دەستی کرد بە جنێودان بە بارزانیان، دەمکردەوە؛ لە پێکەنین حەواسی دەچوو!

باسی سەفەر خۆی بۆ ڕووسیا گێڕایەوە کە وەختێ چوونە باکۆ، ئەفسەرێکی تورکیان ڕەگەڵ خستوون کە ئاگای لە کاروباریان بێ. پاش ماوەیەک تێگەیشتوون تورک نییە و عەلی گەلاوێژە؛ ناردراوە بزانێ لە ناو خۆیاندا دەڵێن چی. زانیویە کە عەلی بەردەستی ڕەحیم قازییە. ڕەحیم باغرۆفی وا تێگەیاندووە کە بارزانی بە هۆی باوکی سەید عەزیز (حاجی سەید عەبدوللا ئەفەندی) ڕاسپاردەی ئینگلیسانە و زۆریان لە سەر ئەوە زەحمەت دیوە. باغرۆف بۆی داناوە کە دەگەڵ ڕەحیم حیزبی دیمۆکراتی کورد لە باکۆ دروست کەن -وەک فیرقەی ئازەربایجان- مەلامستەفا قبووڵی نەکردووە؛ چونکە زۆری بێ ئەخلاقی ڕەحیم بیستۆتەوە. لە سەر ئەوە باغرۆف لێی غەزریوە و هەموو بارزانییەکانی هەڵداشتوون بۆ سەحرای قەرەقەڵپاق و هەر یەک و دووانیان لە دێیەک کردۆتە کارگەری کەڵخۆزان. مەلامستەفا نەیگوت بۆخۆی چکارە بووە، بەڵام لە خەڵکی‌ترم بیست کە ماوەیەک لە دوکانی قەسابییەک و قەدەرێک لە ئاشێکی ئاگر کارگەری کردووە. وەرەقە و بلیتی سەفەری لە ژنێک کڕیوە و خۆی گەیاندۆتە مۆسکۆ. لەو دەمانەدا کە ستالین نەماوە، چۆتە کرملین. لە دەرگا ڕێگەی نەدراوە؛ دەگەڵ ئەفسەری پاسدار بە شەڕ هاتووە و دوانی بە مست کوتاوە. لە کاخەوە پێ زانراوە؛ ڕێگە دراوە و شکایەتی خۆی کردووە. بڕیار دراوە بێتە مۆسکۆ. ئەوانی دەگەڵیشی هاتوون کێ پێی خۆشە بخوێنێ؛ دەنا لێکیان کۆ کەنەوە و کاری باشتریان بدەنێ. زۆریان خوێندوویانە. هێندێکیان -بە قسەی شێخ سولەیمان- لە مەلامستەفا تەکیونەوە و خوێندنیان قبووڵ نەکردووە.

***

ئەحمەد تەوفیق و کاوە لە سەر چیای پیرس لە شەڕدا بەشدار بوون؛ بارزانی تاریفی ئازایەتی هەردووکیانی دەکرد. ڕۆژێک لە نوێژی شێوانێکدا -کە تازە سێرە هەڵدەگیرا و گرمە و ناڵەی تۆپان هەر دەهات- گوتی: هەژار هەموو پەلکی دارانیش سووتاوە؛ ئەو هەموو دوژمنەمان لە سەرە؛ لەوانەیە کەس دەرنەچێ.

هەرچەندی بۆ خۆم چەند جار ئەو فکرەم بە دڵدا هاتبوو، گوتم: تکایە شتی وا مەفەرمووە! فەرماندە نابێ باسی شکانی بە دەمدا بێ. دەسا من بڕوام وایە بەو حاڵەش و لەوەش خراتر بێ، هەر خۆمان سەردەکەوین.

فەرمووی: لات وایە دەترسم؟!

- نە. من کە کوڕە مەلایەکم؛ باوکم چەکی هەرە بەکاری گۆچان و سیواک بوو، نەترسم، دەزانم تۆ کە هەموو تەمەنت لە مەیدانی شەڕدا ڕابواردوە ناترسی؛ بەڵام نامەوێ شتێکی وا بفەرمووی کە دڵی دڵ زەعیفانی پێ بترسێ.

فەرمووی: لەم گەڵی و نواڵانەی بارزاندا، هەر بەردێک و هەر پنچکێک یادی پاڵەوانانی شەهیدی پارێزگاری حەقی شەرعی خۆیانم بیر دەخەنەوە. هیچ هەنگاوێک نانێم کە مرۆیەکی ئازای ئێمەی لێ نەکوژرابێ. ئێستاش کوژرانم بە لاوە شتێک نییە کە قابیلی بیر لێ کردنەوە

بێ. ژیان هەر دەبڕێتەوە. دەست دانانێم. بە هومێدی خودا -وەک تۆ گوتت- ئەمجارەیش سەردەکەوین...

لە ناو پێشمەرگەی وڵاتی سۆران، هەر کەس قەڵەمێکی بە گیرفانەوە با، ناوی ماموستای دەگرتەوە. لە لوبنانیشی تێپەڕاندبوو کە بە هەموو موسافیرێک دەڵێن ئوستاد. ماموستای سادە قەدری نەمابوو. ڕۆژێک لە بارزان، نامەی کە بۆ بارزانی هاتبوون، دەمخوێندنەوە. یەکێک نووسیبووی: «پچووکتان: مامۆستا ڕوکن جەلال!» (ڕوکن یانی ستاد). دیار بوو وەک ئەفسەی ستاد فەرقی دەگەڵ ئەفسەری دیکە هەیە!

وا ئێمە لە بارزان قەتیس ماوین و بە و هەزارەزیلە جاش و عەسکەر و توپ و تەیارە، دەورە دراوین و شەڕکەرمان لە پێنسەد تێناپەڕێ و نان وا کەم و حاڵ وا شڕ. خەبەر و باسی جەبهەکانی لای سۆران، واتا کەرکووک و سولەیمانی و هەولێر چییە؟

لە ڕۆژی نۆی مانگی جوونی ١٩٦٣ -کە هێرش بۆ سەر سپیلک دەستی پێ کرد- دەولەتی بەعس فەرمانی کوردقڕانی لە کەروکووک و سولەیمانی دەرکرد. «زەعیم سدیق» ناوێک -کە لە زەمانی قاسمدا سەرلەشکر و فەرمانەدەی جەبهەی سولەیمانی بوو- لە کاتی کوودەتای بەعسدا بە سەرلێشێواوی گەڕابۆوە و دەتوانرا تۆڵەی لێ بکرێتەوە و لەشکرەکەی بە هاسانی چەک بکرێ، پارتی زۆر بە ئیحتیرامەوە بەخێریان هێنا و بە سەلامەتی بۆ بەغدایان بەڕێ کردەوە. کوردە و پیاوەتی دەکا! زەعیم سدیق شیوێکی لە نزیک شاری سولەیمانی ناو نا: «شیوی مەرگ». دوو سەد و هەشتا لاوی کوردی لەو شیوەدا ئیعدام کرد و دە چاڵی خستن. لە تێلگرافێکدا بۆ بەغدا، ئایەتێکی قورعانی گوتبوو کە: «لە سەر زەوین دانە کافرێکیش مەهێڵەوە». ئەمەش وەفاداری عەرەب لە بەرانبەر چاکەدا!

لە کەرکووک چەند گەڕەکە ماڵێکی کوردانیان وە بەر بلدۆزەر دا و خاپووریان کرد و نەیانهێشت کەس تیتۆلێک بەرێتە دەر. بە هەزاران ماڵە کورد ئاوارەی چۆڵان کران. خەبەر هات کە سێ کەس لەو گیراوانەی زەمانی قاسم -کە لە سەر هەرای کەرکووک گیرابوون- ئیعدام کراون. جەمال حەیدەری یەک لەوان بوو. ئەوی زۆر داخی بە دڵمەوە نا، ئیعدامی «شێخ مارف بەرزنجی» و «شێخ حوسێن»ی برای بوو کە بە ڕاستی زۆرم خۆش دەویستن. ئیتر لەو ترس و لەرزەدا هەر چی توانی هەڵێ و چەک بە کار بێنێ، دایانە چیا. لەشکری پێشمەرگە لە ئەستانی سولەیمانی و کەرکووک و هەولێر بوونە چەند قات. لە موحاسەرەی بارزاندا -کە دژواری شەڕمان لە سەر بوو- چەکداری پێشمەرگەی پارتی دە هانامان نەهاتن. دەولەتیش کەمتر خۆی دە وان دەگەیاند و دەیەویست بارزان بنەبڕ بکا.

جارێک بۆ مەلامستەفایان گێڕایەوە کە پێشمەرگەی لای هەولێر کە دیتوویانە ئەو هەزاران کامێۆنە لەشکرە و ئەو هەموو توپ و تۆپخانەیە بەرەو بارزان دەچن، گریاون، هاواریان بۆ برایم ئەحمەد کردووە: کەی ئەوە شەرەفە برایانی ئێمە بکوژن و ئێمە دەست لە سەر دەست تماشا کەین؟ برایم گوتوویە: ئێوە نازانن! ئەگەر بارزانی نەمێنی، فەرمانەدەیی دەبێتە یەک. ئەمجار عەکسی بارزانی وەک شەهید دەفرۆشن؛ پارەی زۆر دەکا!

هەر لە سەرەتای کوودەتای بەعسەوە کە شیووعی قەتلوعام کران، ئەوی توانیبوویان ڕاکەن و خۆ لە دەست بەعس ڕەها کەن، دابوویانە کێو کە سەری خۆیان بپارێزن. پارتی بەردەستی برایم ڕووتی دەکردن و تفەنگی لێ دەستاندن. هاواریان بۆ بارزانی دێنا. ئەویش نامەی دەنووسی کە

تفەنگیان بدەنەوە؛ لێیان گەڕێن با دیفاع لە خۆیان بکەن. شکایەت و نامە چەن پاتە بوونەوە، هیچیان لێ شین نەبوو. لە بیرمە ئاخر جار بوو؛ بارزانی بە کابرای شیووعی گوت: ئەوانە جوابی نامەی من نادەنەوە. ئەگەر بمێنم تفەنگەکانتان بۆ دەستێنمەوە؛ بەلام بە وەختی خۆی.

زۆر کەس لە هەموو لاوە، ئەرزاق و دەرمان و شەکر و چای دێنا؛ بە تایبەتی: ئەحمەد تەوفیق بە هەوالانیەوە زۆری خزمەت کرد. زۆر چالاکانە خۆی دەگەیاندە سنووری ئێران و کەل-پەلی لازمی پەیدا دەکرد و دەگەڕاوە. لە سەرەتاکانی شەڕدا، شەوێک دەگەل بارزانی چووینە دەم چۆم. چەند ئاغایەکی زەلامی پژدەری هاتبوون، شکایەتیان لای مەلامستەفا کرد کە ئێمە ویستوومانە دەرک و پەنجەرەی مەدرەسەکانی قەلادزە تالان کەین، پێشمەرگە نەیهێشتووە! بارزانی زۆر بەوە تووڕە بوو، گوتی:

- شێخ جنید! خەبەرم هەیە تۆ حەوت ڕۆژ لەوە پێش چوویە سولەیمانی و فەرماندەی دەولەتت دیوە. ئێستا دەو ئاگربارانەشدا هاتووی دەرک و پەنجەرەی مەدرەسە بەری؟!

شەو درەنگێک هاتینەوە. لە ڕێگە بۆم گێڕاوە کە: سالێک خەبەر بە سولتان عەبدولحەمید دەدەن والی بەغدا خەلک دەگەزێ. پیاوێک بە هەلەداوان دەنێرێ: ئەگەر ئەم قسە ڕاست بێ، والیم بۆ دە کلکی ئێستر بخە و بۆم بێنە. کابرا دەگاتە بەغدا. والی خەبەرەکەی زانیوە؛ زۆر ترساوە. مەجلیس دەگەل پیاوی سولتان گەرمە؛ عەرەبێک دێتە ژوور:

- جەنابی والی چوار لیرە بە کابرایەک چایچی قەرزدارم. جارێ نیمە بیدەمەوە. لە سەر ڕێگەی کارمە. هەموو ڕۆژ داوام لێ دەکا. جەندەرمە بنێرە بیگرن با دە حەبسدا بێ، تا من پوولم دەبێ و قەرزەکەی دەدەمەوە، ئەوسا بەریدە!

والی ڕوو دەکاتە پیاوەکەی سولتان:

- تۆ ئەو شەرعە بکە!

کە بۆی تەرجەمە دەکەن. کابرا ئاوقای عەرەبە دەبێ و گاز لە لاملی دەگرێ! بە بێ والی دەچێتە لای سولتان. نەقلەکەی دەگێڕێتەوە، کە دەگاتە ئەوەی «با جەندرمە بیگرن»، سولتان بە گوێی کابرادا دەنووسێ دەلێ: نەتانگەزت؟

- بەلێ قوربان گەزتم!

***

جارێک «سەید عەزیزی شەمزینی»، دەگەل ڕۆژنامەنووسێکی درێژی ریشداری مووخورمایی هاتبوو کە وا بزانم «دانا ئادەم شمید» بوو. بۆ جاری دووهەم هاتبۆوە کوردستان. بە ڕووسی قسەی دەگەل بارزانی دەکرد. سەید عەزیز تاقی کردمەوە و زۆری دلخۆشی دامەوە کە دەست لە بارزانی هەلگرم و بچمە لای ئەوان؛ کە مەنزووری مەکتەبی سیاسی حیزب بوو. گوتم: کاکە! من بە تەمای گەورەیی نیم؛ بە ژێردەستی بارزانی زۆر دلم خۆشە. بە خوا کلکم دە زێڕ گرن لێرە نابزووم.

حوسێن حاجی ناوێکی سوورچی -کە جاشێکی زۆر پیس بوو- کاتێ کە لە چیای براندۆست بووین، بە ئاشکرا خۆی و کوڕی دەچوونە پادگانی خەلیفان، تیربار و تفەنگیان لە دژی ئێمە وەردەگرت. بە بەر چاوماندا دەهاتنەوە کە گز و فتمان بدەن. کاتێ لە بارزان بووین، خۆی و کوڕی گیران. بیستمەوە کە هەموو ڕۆژ مریشک و پلاویان دەدەنێ. ڕۆژێک کە بە تەنیا بووین، عەرزی بارزانیم کرد:

- کاکە ببەخشە ئەم بێئەدەبییە دەکەم! تۆ وەک سەلاحەددینی ئەییووبی و پیاوە گەورەکانی قەدیمی کورد دەبزوویەوە؛ کە ئێستا باوی ئەو شتانە نەماوە. ئێوە سەرسەختترین دوژمنانتان کە شێخی سوورچییە بە هەزار شەڕ و زەحمەت دەگرن؛ پاش ئیحتیرامی زۆر، بە سواری ئێستر دەینێرنەوە ماڵە خۆی. دەی ئەگەر من بوایەم دەمگوت هێندە زیڕ و هێندە تفەنگە نەدەی دەتکوژم؛ دەشیدا. حوسێن حاجی دەڵێن تا ئێستا دوازدە بارزانی کوشتووە، لە حەبسا مریشکی بۆ دەنێری؛ بۆ خۆمان نان و ئاو دەخۆین. ئەگەر بەریدەی ناڵێ مەمنوونم، دەڵێ گرتیانم و تۆڵەی ئەو سووکایەتییە دەکەمەوە؛ لێمان هارتر دەبێ...

هەر چەند سەربازی عەرەب دەگیران، زۆر لە خۆمان خۆشتر دەژیان. کاریان پێ نەدەکردن، لیباسیان بۆ دەکرین، پووڵیان دەدانێ و بە لای مووسڵدا بەڕێ دەکرانەوە وڵاتی خۆیان. جگە لە تفەنگ و چەک، هیچ شتێکیان لە کەلاکی دوژمن نەدەکردەوە. من، «بێجان» و «حادێ» ناوم ڕاسپاردبوو -کە هەردووک سەرقۆڵەی لەشکر بوون- گیرفانی کەلاکان بپشکنن، جغارەکانیان بۆ من بێنن و بە بارزانی نەڵێن.

مەلا باقی مەئموورییەتی درایە کە بچێتە گەلاڵەی باڵەکایەتی. گوتی: ئەو ئەسپەت لە برسان دەمرێ، کەس ناوێرێ بە ڕۆژ رایگوێزێ. بمدەیە بۆت دەبەمە کوێستانان قەڵەوی دەکەمەوە و ئاگام لێ دەبێ. ئەسپی برد. لە پاییزی درەنگدا مەلا باقیم دیتەوە، گوتی: ئەسپەکەتم لە بۆ فرۆشتی بە پێنج کەللە قەند و ئەویشم بە دیشلەمەوە خواردەوە!

- ئەی بە سندانت بێ!

کۆمەڵێ ئاغاواتی لای دهۆک هاتبوونە بارزان. بارزانی فەرمووی دەگەڵ ئەوانەت دەنێرم کە چاوەدێر بی و نەهێڵی کێشە لە ناو خۆیاندا بنێنەوە. تەحسین یەزیدی هەر چەند جاشە و مەعاش لە دەوڵەت وەردەگرێ، بیپارێزە و کارێکت بۆ شاران دەبێ بوت دەکا.

نیوەڕۆژە گۆشتمان هەبوو. سفرەیەکی خامی دوور و درێژ ڕاخرا. بارزانی پاڵی بە تاشە بەردێکەوە دابوو. ئاغاوەت لە هەر دوو بەر ڕیز ببوون و دەستیان بۆ خواردن برد. مارێکی جنجیر -لام وایە میترێک درێژتر دەبوو- بە ناوەڕاستی سفرەدا هات، ڕاست بۆ ئەوسەر، بەرەو بارزانی. قەت یەک لە ئاغاوەت نەما، هەموو هەڵاتن! گوتم: بیگرم و بیکوژم؟ فەرمووی: نا. مار لە پێش بارزانی لای دا و چووە بن بەردەکەی پاڵەوپشتی. بانگی کرد: وەرنەوە نانەکە سارد دەبێتەوە! زۆر بە خەجاڵەتی گەڕانەوە.

دەبێ ئەوە بزانین کە لە بارزان جگە لە «کۆرە مار» -کە مارێکی سەر سێ سووچی پیسە و بۆرەلۆکەیە و لای کلکی زۆر باریکە و سەممە- هیچ مارێک ناکوژن. نەخوازا ماری ڕەش -کە پێوە نادا- لە زۆر ماڵان وەک پشیلە ئازادانە دەگەڕێ و مشک ڕاو دەکا و منداڵ گاڵتەی پێ دەکەن؛ وەک ئەسپابازی. ڕاوەکەویش بە تفەنگ ناکەن. کەو لە پیاو ناترسێ. کە گوتیشم بیگرم، بۆیە بوو هەر بە لاوەتی فێر ببووم: ملی مار تا ئەندازەی چوار قامک و پتر ڕەقە؛ ئەگەر ئەوێ بگیرێ لە پێوەدان دەکەوێ. زۆر جار لە تەرەغە دەمگرتن و لاشم وا بوو مارگران هەر ئەو فێڵە دەکەن و دوایی ددانی ژەهریان دەکێشن.

پاش نیوەڕۆ ئێسترێکی شینیان دامێ کە زۆر ئێسترێکی چاک بوو. دەگەڵ ئاغایانی سوار و هاوڕێیانی پیادە ڕۆیشتین. شەو لە شیوێکی بن چیای پیرس ڕامانبوارد کە چەند بیرێکی کەم قووڵی کوێستانچی لێ بوون. تاوهەڵات بە چیا هەڵگەڕاین. ڕێگەیەکی یەکجار سەخت و

بەرداوی و دژوار بوو. جێگەی وا هەبوو دەبوو ئێستر نزیک میترێک خۆی هەلاوێتە سەر بەردێک؛ یان باز داتە خوارێ!

بە نزیکەی سێ سەعات سەرکەوتین. ئاغاکان گوتیان: ئێمە هەر چاومان لە تۆ بوو دابەزی تا ئێمەش دابەزین. سەیرە کە ملمان نەشکا و هەپروون بە هەپروون نەبووین!. گوتم: باوەڕ کەن منیش هەر چاوم لەوە بوو ئێوە دابەزن تا دابەزم؛ بەلام گوتم ئەگەر من دابەزم دەلێن شارستانی و ترسەنۆکە. مل شکان لە گالتە پێ کردن چاکترە!

لە بیرم نەماوە چەند شەو لە ڕێگە ماینەوە. ڕۆژێک گەیشتینە گوندی «نەسرێ» کە لە پەنا گوندی «ڕەبەتکێ»یە. مولکی «حاجی مەلۆ» بوو کە غازی و عەبدولواحید خاوەنی بوون و دەگەلمان بوون. شەو تا پاش نیوەڕۆی سبەی لەوێ ماین و ڕێ کەوتین. لە ڕێگە پێشمەرگەیەک هەر تماشای دەکردم و دیار بوو کارێکی پێم هەیە. خۆم دوا خست:

- ها برا چت دەوێ؟

- کاکە! دیتم قەند لە دەمت دەنێی، چای بە سەردا دەکەی. بیکە بە خاتری خودا خەلکی ئەم ولاتە فێری ئەو کارە مەکە!

لە شاری کۆیە خەیاتێک کراسێکی نیوقۆلی لە فاسونیای ئەفسەری بۆ درووبووم؛ گیانێکم بەوە بوو. لە ڕێگە زۆرمان ئارەق دەکرد و تۆز دەخوارد. دەگەیشتینە هەر دەم چۆمێک کراسم لە ئاو هەلدەکێشا؛ بێ سابوون پاک دەبۆوە و تا مەلەمان دەکرد وشکەوە دەبوو.

پێم وایە نۆ ڕۆژی کێشا تا گەیشتینە «خورکێ» لە نزیک دهۆک. حەوت بۆمبای یەک تۆنی پێدا درابوو؛ پێنجیان تەقیبوون و قەت تاقە مالێک نەمابوو وێران نەکرابێ؛ چۆل و هۆل. بەرهەیوانێک و نیوە حەسارێک مابوو؛ کرا بە جێگەی ئاغایان. لە گوند دەرکەوتم؛ بیست دەقیقە ڕێ ڕۆیشتم، تووشی کانی و گۆلێک بووم؛ زۆر خۆش و بە سپیندار. دار هەنجیرێکم پەیدا کرد، دەتگوت خێوەتە. هاتمەوە گوند گوتم جێ خەوی شەوانەم پەیدا کرد. حەسیرێکی نیوە شڕم لە ناو مالان برد و شەوانە تا درەنگ دەگەل پێشمەرگە ڕامدەبوارد. وەختی خەو دەچوومەوە بن دارە هەنجیر؛ حەسیر، ڕایەخ و سەنیر، بەرد. بەیانی کە چاوم هەلدێنا، دنیایەک هەنجیری زەردی زەلامی گەیشتوو چاویان لێ دادەگرتم. لە پالەوە تێرم دەخوارد و ئەوسا دەچوومە دم و چاو شتن. بەیانییەک بە فیتە و عەوی شوانێک وە خەبەر هاتم کە هاتبوو مەڕ لە گۆلەکە پاراوکا.

- هۆ کاک! شیرت نییە منیش هەنجیرت بدەمێ؟

- چم نییە تێی بدۆشم.

هاتم لە ناو وێرانەی دێدا گەڕام، کەترێەکی ڕووکەشی سوورم دۆزیەوە، سەرەکەی نەمابوو. شوان هەر دیتی گەشکە بوو. گورجێ پڕی کرد لە شیر و بەردێکی تەنکمان لە سەر دانا و شیری کولاو بە هەنجیرەوە. سولتانی ڕۆمیش وای ڕانەبواردووە!

کوڕێکی شازدە سالان بە ناوی «مەلا عەزیز دهۆکی» -کە باوکی سەعات ساز بوو- لە ترسان هەلاتبوو؛ لە گوند خزمەتی دەکردم.

مەلامستەفا پیاوێکی زۆر بەوەفا بوو. ئەگەر دەلێن وەفا لە دنیا نەبووە یان نەماوە، لە لای ئەو بە تەواوی هەبوو؛ مابوو. کە لە سەر ئەم وەفادارییەش زۆر جاری زیان دیتبوو؛ بەلام دەستی لێ هەر بەرنەدا. کابرایەک بە ناوی «تاهیر حەسەن» لە سالی ١٩٤٥دا لە گوندی «بلە» بە تۆمەتی

هاوکاری بارزانی ئیعدام کرابوو. برای بە ناوی «هاشم حەسەن عەقراوی» -بە وەفاداری بۆ تاهیر- زۆری قەدر لێ دەگیرا. لەویش خوێڕی و بێناموس‌تر -لە عەرەب و عەجەمیشدا- هەڵنەکەوتووە. چەند جار لە شەڕ هەڵات؛ چەند جار دژی لە شۆرش کرد؛ بەڵام قەدری هەر دەگیرا. تا ئاخری بە یەکجاری بوو بە جاش و کە ئەمە دەنووسم، بە ناو، ڕەئیسی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی سەر بە بەعسیانە.

«عەبدولعەزیز حاجی مەلۆ» دۆستی بارزان بووە. ماڵە شێخی بریفکان لە سەر ڕەواندنی ژنێک کوشتوویانە. ماڵە حاجی مەلۆ بوونەتە خۆشەویستی بارزانی و بە وەفاداری بۆ عەبدولعەزیز مەڵبەندێکی گەورەیان پێ سپێراوە و تۆڵەیان بۆ لە ماڵە شێخی بریفکان کراوەتەوە و گوند سووتاوە و دانیشتوانی ئاوارە کراون. «غازی حاجی مەلۆ» لاوێکی زۆر نەترس و لە شەڕ ئازا بوو؛ بەڵام برای گەورەی -کە عەبدولواحید بوو- چەند جار ببوە جاش و گەڕابۆوە؛ دەیانگوت حیزیشە. چەند ئامۆزا و خزمی‌تری غازیش هەبوون کە زۆر کەیفم پێ نەدەهاتن. نزیکەی نەوەد گوندیان دەخوارد؛ بەڵام پێخۆریان نەدەدا بە پێشمەرگە؛ جلکیان بۆ نەدەکڕین. شەوانە لە مەجلیسیاندا، باس باسی جاشان بوو کە چەند خۆش دەژین و چەند پارە وەردەگرن: «بیستوومە فلان جاش یەک جێ دوازدە کراسی کڕیوە، فلانە ترومبیلی هەیە...».

شەوێک گوتم: ئێوە چونکە لە لادێ گەورە بوون و شارتان نەدیون نازانن پارەی زۆر لای کێ هەیە. ژنێکی گەوادە، پازدە ژنی خراپی لە بەر دەستدایە لە بەغدا، دەڵێن دە ملیۆن دیناری لە بانکدایە و چەندین قەسری هەیە. بۆچی فکر لە کاری وا بە قازانج ناکەنەوە؟!

- ئای سەیدا هەژار! ئەوە بێشەرەفیە، چۆن وا بکەین؟

- گیانە! ئەو ژنە بە شەرەف‌ترە لەو کەسەی نیشتمان و هاونیشتمانانی خۆی بفرۆشێ...

غازی دارکاری پێشمەرگەی دەکرد؛ نەمدەهێشت. وا دیار بوو زۆر لە من قەڵسە و لەبەر بارزانی نەیدەوێرا.

عەشیرەتی غازی (مزووری) لە هەموو عەشایری کورد ئازاتر و موخلیس‌تر بۆ کوردستان بوون. هەر یەکەی بەرانبەری سەد غەنیم بوو. پێشمەرگەی چاک و ئاغای خراپ. چەند کەسێکیان خەبەرچینم بوون؛ هەرچی لە ناو ئاغایاندا ڕادەبرا دەمزانی. جاسووسێکی دەوڵەت بە ناوی «ساقی» گیرابوو. شەوێک غازی گوتی ساقی هەڵاتووە. زانیمەوە کە بە دوو هەزار دینار بەرەڵدای کردووە. چەند گوزارشێکم دەربارەی ئەو کارە خراپانەیان بۆ بارزانی نووسی کە: «ئەوانە لە جاش بەزیان‌ترن؛ چارێکیان لێ بکرێ باشە». جواب دەهاتەوە کە سەبر بکە و بمێنەوە!

بیست‌وحەوت هەزار دۆلارم پووڵ‌هێنابوو؛ خەبەرم بۆ تەحسین یەزیدی -میری یەزیدیان- نارد کە دۆلارەکان بە دینار بگۆڕێتەوە. تەحسین جاشی دەوڵەت بوو؛ بەڵام لە بنەوە دەگەڵمان دۆست بوو. خەبەری بۆ ناردم کە دۆلار بە دووسەد و شێست فلس. گوتم بیگۆڕەوە. دەبوو بۆ خۆم بچمە لای، حیسابەکە وەرگرم. ڕاشمسپاردبوو کە چەندی دەستی دەکەوێ بووزووی ڕانک و چۆخە بکڕێ.

ڕۆژێک دەگەڵ دە پێشمەرگە بەرەو دەشت وەڕێ کەوتین. نیوەڕۆیەکی زۆر گەرم بوو؛ لە دەم چۆمێک لاماندا. هەر کەسە بڵاو بووین مەلە بکەین. دیتم یەک دنیا تووترک لەوبەر چەم هەیە. جلەکانم نایە بن گیا و بە ڕووتی چوومە تووترک خواردن. لە پاش تاوێک دیتم هەر وا

پێشمەرگەی مزوورییە و دەست لە سەر پەلەپیتکەی تفەنگ ڕادەکا. بەرەو گرد دەچن و پەکوو-پەکوویانە. لە نێو تووتڕکەکان هەرام کرد:
- چتانە؟!
- ئایماڵت ئاوەدان! خوا ئـەیزانێ گوتمـان ڕفاندوویانـە. ئـەوە دوو سـەعاتە بـە شـوێن تـۆدا ڕادەکەین!
- کاکە تووتڕک زۆر خۆشە؛ لە بیرم چووبوو چەندم پێچووە. دە بڕۆنە ئەولا، ڕووتم، تا جلکـان دەبەر دەکەمەوە.
دەبوو پاش نیوەشەو بچینە ماڵی تەحسین؛ چونکـە تـا ئـەو دەم ئەفـسەری عیراقـی میـوانن. چووینە ماڵی میری یەزیدیان. مریشکی سوورەوەکراو بە پێی فـیلان بـوو. بـە ئـەدەبیات گـوتن گوتم: میرم تۆ کە لە ناعیلاجی بوویە فورسان... گوتی: نا، ئەز بوومە جەحش؛ مەبێژە فورسان!
پیاوێکی لە لا بوو؛ میرزای بوو (عەلی چۆقی) لە بەغدا بۆی ببوومە واسیتە، حقـووقی مـانگێکم زیاد بۆ ساندبوو؛ هەواڵی حیزبیش بوو. بە سرتە گوتی: تۆ تووتن و پەڕ دەکێـشی، داوای جگـەرە بکە و حەقت نەبێ. دانیشتەوە، گوتم: کاک عەلی! پاکەتێک جگەرەم بۆ بێنە. هەر ڕاستەوە بـوو، دوو گلۆسی جگەرەی «گریفن ئەی» بۆ هێنام. لەبەر خۆوە گوتی: ماڵی ئەو جاشە سەگبابانە بـۆ تۆ باشە!
حیسابمان کرد، پەنجا دەست بوزووم وەرگرت و باقی دیناری عیراقـی؛ لـە قـەراری دۆلار بـە دووسەد و شێست فلس.
میر تەحسین فەرمووی: وا من لە گیرفانی خۆم سێسەد دینار دەدەم بە شۆرش.
گوتم: عەلی چۆقی میداد و کاغەزم دەیە.
گوتم: میرم! دەڵێن کابرایەکی گوندی چۆتە لای پینەچییـەک لـە بـازاڕ گوتوویـە: دۆشـاوت هەیە؟ پینەچی ئاوی کەوشانی داوەتێ، نانی تێ کوشیوە و خواردوویە. پاشـان گوتوویـە: نـەیژی کورد بوو فامی نەو؛ دۆشاو پار بوو تامی نەو! مەلامستەفا بە مـنی گوتـووە نابـێ تەحـسین بـەگ برەنجێنن؛ چەند جارێک ڕووتە و پووتەی عەشیرەتی «زێدکی» گوتوویانە با دەستێک بـە مـیردا بێنین، نەمهێشتووە. تۆ دۆلارت دا بە دووسەد و حەفتا و دوو فلس؛ کە ئاگـام لـە نرخـی هەیـە. یانی دەگەڵ ئەو پووڵەی تۆ بە دیاری دەمدەیەی، سێسەدوبیست و چـوار دینـاری فەرقـە. ڕۆنی خۆم دە سەری خۆم هەڵدەسووی، هێشتا تەواویش نا! نەچی بڵێی هەژارم فریو دا!
تەحسین هەر ناوی «زێدکی» بیست، ڕەنگـی پـەڕی؛ دەیـزانی چەنـد دز و دڕ و خوانەناسـن. دەمی تێک هالا و ملی لە سوێندان نا کە: مـن وا موخلیـسم و وادەکـەم و وا بچـێ؛ زێـدکی زۆر بەرازن؛ پیسن؛ نزیکیان مەکەوە! فەرمووی: پەنجا باریش گەنم، دوازدە تەنەکە ڕۆن و گەلێکیش نیسک و دانەوێڵەتان بۆ دەنێرم.
- ئەی ماڵت ئاوا!
گوندی «باڵەتە» لە جێ خەوەکەمەوە ڕێگەی سێ چارەگە سەعات بوو. عەبدوڕەحمان قـازی، ڕەشاد باڵتەی موهەندیس، ناجی باڵەتە -کە دوکتـوری ئازمایـشگا بـوو- و حـافز مـستەفا قـازی موهەندیس لەوێ دەژیان. شەوانە پاش سەرێک خەو کـردن، ملـی چیـام دەگـرت و دەچوومـە لایان؛ بە قسەی قۆڕ ڕاماندەبوارد. وا فێر ببوون، لێفەی منیان ڕادەخست تا ئەگەر درەنگ چـووم جێم هەبێ.

شەوێک لەو شەوانە لە خەو هەستام، ڕوانیم کابرایەکی بڵندبالای بۆشناخ، تفەنگ بە شانەوە لە کۆلانێکی باڵەتەوە ڕادەبرێ . دەنگم دا:

- کێی؟

- ئەز غولام ئەز جەحشم!

- کوڕە قسەی باش بکە! دا وەرە بزانم!

هەوالانم گوتیان بەڵێ ئەوە جاشی یەزیدییە؛ پیاوی چاکە. هەر چییەکمان بوێ لە مووسڵ بۆمان دەکرێ.

پێڵاوەکانم «شەکال» بوون. یانی لاستیکی ترومبیل سەریان بە بەند چندرابوو. وەک کاڵەی خاو، بە بەن بە لاقەوە دەپێچران. هەموو ڕۆژ دەبوو تا و تایان کەم؛ خوار دەبوون. پاش پانیەم بریندار ببوو. گوتم: کاکی جاش! بوزووی ڕانک و چۆغەیەکی خەت خەت بە چەندە؟

- چوار دینار.

- ئەی کەوشی نەرمی کەتانی کە وەرزشکار دە پێی دەکەن؟

- دینارێک، کەمتریش.

- دە ئەو پێنج دینارە بەرە و ئەو دووانەم بۆ بکڕە!

پاش چوار ڕۆژ ڕانک و چۆغەکەی بە یەکێکدا ناردبوو؛ دینارێکی دەگەڵ بوو. گوتبووی: کەوشەکەم دەس نەکەوت. ئەوا ئەمشەو دەبێ بچینە شەڕ دەگەڵ ئێوە؛ نەمتوانی بێمەوە، بمبەخشن!

جاشی وا ئەمینم پێ زۆر سەیر بوو!

خەبەرمان وەرگرت کە چەند ستوونێکی دەوڵەتی و جاشی زۆر لە چەند جێوە هجووم دەکەن. دەبوو بە پەلە خەبەر بە هەموو بنکەکانی ناوچەکە بگا و هووشیار بن. من بڕیارم دا خەبەر بۆ بنکەی «ئەلقووش» بەرم. بە ڕۆژ سەفەر کردن لەبەر تەییارە -کە هەمیشە بە عاسمانەوە خولیان دەخوارد- نەدەکرا. لە سەری شەوەوە دەگەڵ دوو پێشمەرگە -کە من سواری ئێستر بووم- ڕۆیشتین. تاو هەڵات گەیشتینە بنکەی پێشمەرگە. هاتن بە پیرمانەوە. لە ئێستر دابەزیم و چوار تەیارەی بۆمبا هاوێژمان وەک جندۆکە گەیشتنە سەر. زمب و ڕمب بکوتە! دنیا بوو بە تۆز و خۆڵێک هەر تاریک داهات. سەد بار خۆڵمان بە سەر و چاو هەڵپڕژا. هەشت بۆمبایان هاویشتبووینێ؛ بەڵام کەسمان لێ بریندار نەبوو. هەر تۆز بوو بەرز ببۆوە. بە ڕاستی پێشوازیەکی گەرم بوو! لە بەر خۆڵی چڕوچاومان ڕێگەی کونە بن عەرزەکەمان نەدەدۆزیەوە. ئاویش زۆر دوور بوو. پاش تاوێک چاو هەڵگلۆفین و قرخەقرخ کردن، ئاو هات و دەموچاومان شتەوە.

چووینە کونە ڕەشەوە گوتیان: چا بوو ئەمڕۆ هاتی! ئەمشەو چووینە ئەوبەری بەشی عارەبی جاش، کامیۆنێکمان بار کردووە، ١٦ مەڕی قەڵەو، هەموو دەرمانی دەرمانگایەک کە لەوێ بووە؛ بیست و حەوت پارچە تفەنگ و دەمانچە، زۆر کەلوپەلی‌تریش. خاوەن کامیۆنمان هێناوە هەتا بن ئەو گردە؛ کامیۆنەکەمان پێ فرۆشتۆتەوە بە شێست دینار. جا ئێستا کەیفە؛ گۆشت مەڕ مشەیە! بێ تۆ ناخۆش نیوەڕۆژەیەکی شاهانەمان کرد.

شەوێک دوژمن لە لای «چەمانکێ»وە هجوومی کردبوو. پاسەوانەکانی پێشمەرگە نوستوون و خافڵگیر کراون. پێشمەرگەیەک «بەحری» ناو ڕادەپەڕێ؛ دوژمنیان گەیشتۆتە سەر. هەرا دەکا

و دەیکاتە تەقە. پێشمەرگە دێنە دەست و پاش دوو سەعات شەڕ، دوژمن دەشکێنن. بەحری زۆر بە برینداری هێنرایەوە «خورکێ». باسک و سنگ و سەر و چاوی پێچرابوو. یەکێک گوتی: لەوانەیە نەژی.
لە بن پەڕۆیانەوە بانگی کرد:
- دەمرم، بە قوربانی کوردستان بم! ئەمن زەربەتێکی گەورەم لە دوژمنان دا؛ خەمی خۆم نییە.
ڕۆژێک چەند پێشمەرگەیەک لە دەوری یەک دانیشتبوون قسەیان دەکرد. یەکیان هەستا و بانگی کرد:
- سەیدا هەژار! خواحافیز. من چیدی پێشمەرگە نابم!
- برام کێ دڵی ئێشاندووی؟ بە خوای نایەڵین بڕۆی! لە سەر چی دەڕۆی؟
- سەیدا ئەوانە باسی شەهید دەکەن. ئەمن ناوم «قریاقۆس دنخە»یە. تۆ و ئینسافت، ناوی من بۆ شەهید دەست دەدا؟! چۆن قبووڵ دەکەم لە سەر قەبرم بنووسن: «شەهید قریاقۆس دنخە!».
- کاکە مەڕۆ! لەعنەت لە بابی ئەوە بۆت بنووسێ شەهید!
گوندێک لە لای دهۆک هەیە (سپیندارە)، خەڵکەکەی لە ناو جیرانان بە بێعەقڵ مەشهوورن. لەوان دەگێڕنەوە کە زەرگەتە بە منداڵێکیەوە داوە، دەستیان داوەتە تفەنگان: زەرگەتە حەدی چییە بە کوڕمانەوە بدا؟! چوونە ڕاوە زەرگەتە. زەرگەتەیەک بە سەر لووتی یەکێکەوە نیشتووە. فیتەی بۆ ئاوالان لێداوە و ئیشارەی بۆ سەر کەپۆی خۆی کردووە؛ یانی ئەوەتا، تا نەڕۆیوە تفەنگی پێوە نێن!
پێش تاوهەڵاتێک یەکێکی سپیندارەیی تووتن دەدێرێ. دەبینێ وا سەرباز و جاش لە گرد وە سەر دەکەون. دەڵێ: ئەی بەخێر بێن سەر چاوی من، دەست دەداتە تفەنگ و بەرەو سەری گرد ڕادەکا. زۆر جار بە گوللە قوڕی پێ هەڵدەپرژێ ڕاناوەستێ و سەری گرد دەستێنێ. نۆ کەس لە دوژمن دەکوژێ و بە دە تفەنگەوە دەچێتەوە سەر ئاوداشتن کە دوژمن هەڵاتووە.
ستوونێکی سەرباز بە سێ تانکەوە هجوومی کردە گوندی سپیندار. بە تفەنگ (تفەنگی ڕاو)، بە داس و خەنجەر بۆی چوون. تانکێک دە قولکە کەوت، ڕێگەی دووەکانیتر برا. خەڵکەکە بە ژن و منداڵەوە هێرشیان کرد. دوو تانک هەڵاتن. تانکی دە قولکە کەوتوو ناچار تەسلیم بوو. سەرنشینەکانیان بە دیل گرت و تانکیان ئاگر دا. لەو شەڕەدا سێ کەسیان لێ کوژرا و دوازدە کەلاکیان لە دوژمن خست و هەر دەتگوت چوونە سەر شایی.
شەڕ لە هەموو لا گەرم بوو. بە ڕۆژ نەدەکرا بگەڕێم. ئەگەر کارم لە خورکێ هەبا، شەو دەچووم و بۆ خەو دەهاتمەوە باڵەتە. هەر تاریکان لە دێ دەردەچووین بۆ ناو پۆلە هەنارێک، تا ئێوارە لەوێ دەماین و نان و چامان لەوێ دەخوارد. تەنەکە نەوتێکی بەتاڵمان کردبووە مێزی نووسین، بە کاغەز و کاربۆن نەشرەمان دەنووسی.
بەیانیەک حافز مستەفا قازی درەنگ وە خەبەر هاتبوو. تاو هەڵاتبوو؛ لە دێوە بەرەو ئێمە دەهات. دوو تەیارەی مێگ هاتن؛ دیتیان، بۆی گەڕانەوە. لە بن بەردێک دانیشت، دیار بوو لە بەر چاوی تەیارەچی ون ببوو. چەند سوورێکیان دا و ڕۆیشتن. حافز دەیگوت:
- زۆر ترسام. هەر دەمگوت دەی سەگباب لێمدەن با نەجاتم بێ! لێیان نەدام!

خەڵکی باڵەتە هەموویان خزمی ئەو برادەرانە بوون. زۆر جار دەعوەتیان دەکردین؛ خەیار و تەماتەیان بۆ دێنایین. شەوێک گوتیان موهەندیسەکان بانگت دەکەن. بە گەرمایەکی زۆر، دەرگایان لە سەر خۆ داخستبوو؛ ئارەقیان لە پێش بوو. ترۆزی زەلام مەزە بوو. گوتم: کاکە ئەمەش ناو دنێن زەوق؟ کوڕە هەستن تا نەپیشاون!

دەستم پێ لە جەژنی ئارەق بەردان و ماوەیەک بەو بەزمە پێدەکەنین.

**سەفەرێك بۆ لالەش**

گوتمان با بچینە «لالەش» کابەی یەزیدیان. عەبدوڕەحمان قازی پێشمان کەوت. بە بێ ڕێگە، بە ناو دروەوە زەردەدا تاوێکی باش ڕۆیشتین؛ هەموو بەلەکمان برینـدار بـوو. دامانـە چیـا. پێشڕەوەکەمان ڕوتبەی ئەمیر لیـوای هـەبوو؛ ئەفـسەرێکی بـەناوبانگ، لـە ڕێ ڕۆیـشتن مانـدوو نـەدەبوو. هـەر فەرمانیـشی دەدا: «دوا مەکـەون!». حـافز و مـن شـرۆڵتـرین و تەنبـەڵتـرین پێشمەرگەی دنیا بووین؛ هەناسەمان سوار ببوو، دوعامـان دەکـرد یـاخوا تـەییارە بـێ و بتـوانین دانیشین. بۆ یەکەم جار دوعامان قبووڵ بوو. پێشڕەو ئەمری کرد:

- دانیشن تەیارە هات.
- ئۆخەی!
- هەستن تەیارە ڕۆیشت.

لـە چیـاوە سـەرکەوتین و تووشـی سـەرەولێژێکی زۆر کـووڕ بـووین. ڕادیۆکـەم بـە کـاک عەبدوڕەحمان بوو. بەردێکی لە بن پێ دەرچوو، ڕەتی برد و سێ چوار سەرمەقولاتی دا و تـەخت لە عەرز درێژ بوو. من بێ ئەوە فکر بکەمەوە گوتم: خۆ ڕادیۆکەم نەشکاوە؟!

- ئای ماڵت وێران کەی دەبێ؟ ئەوە من دەمرم، ئەو دەڵێ ڕادیۆکەم!

گەیشتینە دەشتایی، ڕوومان کردە گەلی لالەش.

مەلای جزیری فەرموویە:

دل گەشتەمە ژ دیرێ، ناچم کەنشتەیی قەت میحرابی وێ بە من ڕا وەر دا بچینە لالەش

لە کتێبەکانی باسی مەشایخاندا و بە تایبەتی لە «تەزکەرەتولئەولیای عەتار»دا باسی شـێخێک بە ناوی «عەدی بن مسافر» هەیە کە لە ڕەفیقانی خۆشەویستی غەوسی گـەیلانی بـووە. ژیـانی شاران و زۆری یارانی لە بەر چاو کەوتووە و لە چیـای هـەکاری، لـە کوختەیەکـدا دوور لـە دنیـا ژیاوە. مریدە کورد دەوریان داوە. لەوان زەماناندا دەستەیەک لەو سۆفیانە گەیشتوونە ڕادەیـەک کە لایان وایە خودا هەمووی هەر ڕەحمەتـە و بـەزەیی، ڕەحمـەت و عـەزاب هـەرگیز دانوویـان پێکەوە ناکولێ. لەبەر ئەوە جنێویان بە شەیتانیش نەداوە و لایان وایە بـوونی شـەیتان ئـیرادەی خوایە و بە زاراوەی ئەمڕۆ: تاکتیکی تایبەتییە؛ کە «مەنسوور هەللاج» و «جونەیدی بەغـدایی» و «شبلی» و زۆر کەسیتریش لەوانە بوون. تەنانەت ئەحمەدی خانی خۆشمان لـە «مـەموزیـن»دا عوزر بۆ شـەیتان دەخوزاێتـەوە و لاگـیری لـێ دەکـا. دەڵـێ: «خوایـە! شـەیتان هـەر چونکـە سەجدەی بۆ ئادەم نەبرد و گوتی جگە لە تۆ کەس ناناسم و بۆ بێگانە سەر نەوی ناکـەم، وات بـە سەر هێنا؟».

لە دوای مەرگی شێخ عەدی، چەند چین خەلیفەی ئـەو هـاتوون و ئـەم ئیرشـادەیان بـەڕێوە بردووە. مریدی نەخوێندەوار و دلگەرم -کـە باشـیش تێنەگەیـشتوون- وردە-وردە پێیـان لـێ

هەڵبڕیوە، تا وای لێهاتووە کە شەیتان بە دۆستی نزیکی خوا بزانن و ناوی بنێن «مەلەک تاوس». موسڵمانانی جیرانیان بە کافریان لە قەڵەم داون و زۆر جار قەتڵوعامیان کردوون و سوڵتانانی عوسمانیش دنەی خەڵکیان لێ داون، کە کورد بە کورد بە کوشت بدەن. کار گەیوەتە ڕادەیەک، هەموو یەزیدیەک ڕقی زۆری هەر لە موسوڵمانە و موسوڵمانیش لای ئەوان هەر کوردە موسوڵمانەکەی هاوسایانە. ئیتر هەرچی موسوڵمان بیکەن لای ئەوان خراپە. وا دەردەکەوێ کە موسوڵمانان ناوی «یەزیدی»یان بە سەردا بڕیبن؛ کە یەزید زۆر خراپە. بەڵام خۆیان دەڵێن ئێمە «ئێزەدین»؛ واتا خودایی. زۆر کتێب دەربارەیانەوە نووسراوە و سەدها چیرۆکیان بۆ ڕێک خراوە؛ کە هیچیان یەکتر ناگرنەوە. هێندێک دەڵێن پاشماوەی زەردەشتیەکانن؛ هێندێک دەڵێن میتراییین و زۆر شت. بەڵام من بە تێکەڵی و ئاشنایەتی و هاتوچۆ کردنی شوێن و پیاوە زلەکانیان وای بۆ چووم کە لکێکن لە موسوڵمانان و لایانداوە. هەر وەک چۆن موسوڵمانەتی پێغەمبەر یەک تەرح بووە و ئێستا ماشەڵڵا هەزار لکی لێ بۆتەوە و هەمووش یەکتر بە کافر دەزانن و هەمووشیان ڕاست دەکەن!

ئەو شیو و دۆڵەی کە خانەقای شێخ عەدی بووە، ناوی لالەش و چونکە ممبارەک و پیرۆزە، قەت کەس دارێکی نەبڕیوە، سەر تا پا کەسکە و بە ڕاستی بەهەشتێکی سەر رووی زەمینە. گەلی لالەش زیارەتگای هەرە گەورەیە. پیاوە دینییە گەورەکانیان- کە هیچیشیان سیوادی نووسین و خوێندنیان نییە، جگە لە بابە شێخی ڕەئیسی دینی هەرە زل کە لە شاری «شێخان» دەژی و ساڵێ چەند مانگێک دێتە وێ- زۆریان تەرکە دنیا لە لالەش دەژین.

ڕێگەی ڕوو بە لالەش و مەرقەدی شێخ عەدی -کە یەزیدی پێی دەڵێن شێخ هادی- چەورێژێکی باش کراوە. من پاش پانیەم بە شەکالە خوارەکەم بریندار ببوو. کە گەینە سەر ئەم ڕێ خۆشە، شەکالم داکەند و بە پێخواسی ملی ڕێم گرت. بە سەر پردێکی سیمانیدا پەڕینەوە کە چەمێکی چکۆلەی بە ژێردا دەچوو. هەر گەیشتینە ناو ئاوایی، «فەقیر شەمۆ» کە یەکێک لە پیاوە ئایینییە گەورەکان بوو، دەگەڵ بیست کەسێک لە دوورەوە بە پیرمانەوە هاتن. گوتمان دیارە جەنەڕاڵ عەبدوڕەحمان قازییان ناسیوە بۆیە هاتوون. نەخێر زۆر بە هەڵە چووبووین، هاتبوون بە پیر منەوە. سەرزارەکی بەخێرهاتنی هەواڵەکانمیان کرد. فەقیر و سۆفییەکان فلچ و هۆڕ ملیان لە ماچ کردن و لە باوەش گرتنی من نا. هەزار جاریان گوتبێ «تە بخێر هاتی سەر چاڤا، سەر سەرا»، هێشتا کەمە. بە ڕاستی واقمان ورمابوو: خوایە خەبەر چییە؟ بە پاڵەپەستۆ وە پێش ژنەڕاڵیشیان خستم و چووینە دیوەخان. هەر کەس لە کیسە تووتنی خۆی جغارەی بۆ دەپێچامەوە و تا چایەکیان بۆ برادەرانم دێنا، دوانیان لە پێش من دادەنا. «سەیدا هەژار، سەیدای دەلال» کەری نێر نەیدەکێشا!

- فەقیر شەمۆ، ئێمە هاتووین زیارەتێک بکەین و ئەمڕۆ بڕۆینەوە.

- ئەم قسە چییە؟ سوێند بە ئەبولقاسم و شێخ شەرەفەدین و بە گۆڕی پیرۆزی شێخ هادی، سێ ڕۆژان میوانی ئێمەن.

دوای نانی نیوەڕۆ چووینە سەر «ئاوی زەمزەم» کە حەوزێکی سەر داپۆشراوە و سەکۆی لە دەورە هەڵبەستراوە و حەسیر و بەڕەی لێ ڕاخراوە. سەرچاوەی کانییەکە لە ژوورێکی دیکە دایە کە دەرگای داخراوە. ئاش گێڕێک ئاو، سارد وەک تەرزە، سووک وەک ئاوی حەیاتێ فڕ دەکا و دێتە حەوز و لەوێوە بۆ ئاودێری باغ و دەغڵ دەڕوا. ئەو کیژ و لاوانەی دڵیان دەچێتە یەکتر و

دەبن بە دەزگیران، لە سەفەری حەج بۆ لالەش دێن لە دەوری ئەم حەوزە دادەنیشن. «فەقیر شەمۆ» یان «بابی چاوێش» یان «بابە شێخ» بۆ خۆی دوان دەباتە ژووری سەرکانی و فۆتە لە ئاو هەڵدەکێشێ و لە سەریان دەبەستێ و لێک مارە دەکرێن. ئیتر بەو جۆرە تا هەموو دڵبەر و دڵدار پێک دەگەن.

- فەقیر شەمۆ، یانی چی ئاوی زەمزەم؟

- سەیدا ئەم ئاوە ڕەگی لە ئاوی زەمزەمی حەجی بسلمانانەوە دێ!

- های قسەی هیچ! ئاوی زەمزەمی مەکە سوێرە، تاڵە، بۆگەنە، لە بەری نارِوا، حەدی چییە چاکترین کانیاوی کوردستان لە ڕەگی ئەو بێ؟!

دیار بوو بزەی سمێلی دەهات؛ بەڵام دەیگوت: وا مەفەرموو، وا دەڵێن!

فەقیر شەمۆ پێشمان کەوت بۆ زیارەتی شێخ هادی. لە حەسارێکەوە ڕەد بووین. دەرگای مەرقەد، گەورە و دارین و سپی بوو. ڕەسمی مارێکی بە ڕەش لێ هەڵکەندرابوو. لە دالانێکەوە ڕۆیشتین، لە دەستی چەپ دەرگای ژووری مەرقەد بوو. ئاشکرا دیارە مزگەوت بووە، شوێنەواری میحرابی هەر ماوە. شباکی سەر قەبر سندووقێکی زۆر زەلامی دارینە. هەر فەقیر ماچ دەکا و ئێمەش بە شوێنیدا. تێرمان هەموو گۆشەی مەرقەد ماچ کرد. فەقیر دوعای بۆ کردین و دوعای بۆ بارزانی و شۆڕشەکەی کرد و ئامینمان گوت.

لە خەڵکم بیستبوو کە شەوێکی تایبەتی لە ساڵدا، مەلەک‌تاوس لە پشت پەردەوە قسە دەگەڵ بابە شێخ دەکا. چاوم گێڕا پەردەیەکی سووری کاڵەوە بوو، لە سووچێکی مزگەوت لە بەرانبەر دەرگاوە هەڵێوەسراوە. پرسیم: ئەمەش زیارەت کەم؟ فەقیر خۆی دا دوای هەموان. گەڕامەوە سوێندم خوارد کە من پێش تۆ ناکەوم. ناچار پێشم کەوت. گەییمە پەردە سوور، هەڵمدایەوە. کورسیەکی لێ داندرابوو؛ هیچی‌تر. مەلەک تاوسیشم نەدیت!

بردیانینە چەند زیارەتی‌تریش. دارتوویەکم دیت کە دەبوو ماچ کرێ. دار زۆر زل بوو، بەڵام لەو شوێنەی دەمی پیاو بیگاتێ، لە ناو قەددا، وا باریک ببوو کە نزیک بوو لەبەر بای بەهێز بشکێ؛ هەمووش لە لای جێ ددانان بوو. چەند نەمامە تووی دیکەشیان لە پەنا چەقاندبوو کە ئەگەر گەورەکە شکا، خەلیفەی ئەو بن. لە مێرگۆلەیەکدا ڕەنگە چوار پێنج هەزار سینگۆلکەی دار دە عەرز چەقێنرابێ. بەردێکیشمان ماچ کرد کە گۆیا شێخ هادی لە سەری دانیشتووە و تەیر و توور هاتوون لە سەر شانی هەڵنیشتوون.

ئەو ڕۆژەمان بە زیارەتانەوە ڕابوارد. پێش نوێژی ڕۆژی دواییش لە سەر کانی زەمزەم —کە زۆر فێنک بوو— چا و نانی نیوەڕۆمان خوارد. ئەمەت لە بیر بێ کە خواردنی هەرە باش و ماقووڵ لە هەموو بادینان و جزیریش، ساوار و گۆشتە؛ برنج هیچ قەدری نەگیراوە. ژەنەراڵ قازی -کە هەر خۆمانە بووین- گوتی: من هیچ بە دڵ ماچی مەرقەدانم نەکرد، بەڵام نەشدەکرا نەیکەم.

گوتم: جەناب وا دیارە منافقی. من لە تەهی دڵ ماچیشم کرد و چیش نەقەوما!

دەمەدەمی عەسر، حافز مستەفا قازی و من کەوتینە شوێن فەقیر شەمۆ؛ چووینە قەدی کێوی پشت مەرقەد. بۆ ئیستراحەت لە بەر سێبەرە دارێک دانیشتین. گوتم: فەقیر شەمۆ! من حەسرەتێکم لە دڵدایە: زۆر حەیفە ئەو هەموو عیلمەی دە سینگی جەنابت و بابە شێخ و بابی چاوێشدایە نەنووسرێتەوە و خوا نەخواستە کە ئێوە وەفات بفەرموون لە بەین بچێ.

حافز بەو قسە قۆڕە پێکەنینی هات. دەستی بە دەمیەوە گرت و گوتی: من دەچمە هۆو بن

دارە، جغارە دەپێچمەوە؛ نەوەک ئێوە بە تووتن بپشمن. تۆزێکمان لێ دوور کەوتەوە کە ڕووشمان دەو نەبێ. فەرمووی: ڕاست دەکەی؛ بەلام پیاو خراپان کار خراپ دەکەن. مەلا خەلیلێک هەیە لە شێخان، ئەو نامەردە چەند سالە هەوالی بابەشێخە؛ کتێبێکی لە سەر ئیزدیان نووسیوە، هەمووی درۆ و بوختانە. نابێ کەس بینووسێتەوە.

- یانی باوەڕ بە منیش ناکەی؟

- چۆن باوەڕ بە تۆ ناکەم؟! هەر هەوالان مە لە جزیرێ خەبەری تۆیان پێداوین کە چەند مرۆیەکی باشی. پێرێ کە دەهاتن چاومان لێتانەوە بوو. زیاد لە هەمووان تۆ قانوونی ئیزدیانت بە کار برد: شەکالی خۆت داکەند و بە پێخاوسی هاتی. زانیمان تۆ تمام لە خۆمانی و هاتینە پێشوازیت!

- بەلێ ڕاستە لە خۆتانم؛ خوێندەواریشم؛ بەلام هیچ لە ئۆلێ نازانم (ئۆل: دین). دەمەوێ چەند پرسیارێک بکەم، ناشینووسمەوە.

- بەلێ سەر چاوا، بێژە!

- چیرۆکی ئەم خۆ پێخواس کردنە چییە؟

- مرۆیەک هەبوو ناوی مووسا بوو، تە ناس دکی؟!

- بەلێ باشی دەناسم!

- مووسا ژ بیناهیا چاڤا پسیار کرد: خودێ! تە وێ کەنگێ بمری؟ چەند عەمرێ تەیە؟ بیناهیا چاڤا گۆت: مووسا! دەروێشەک ل گەلێ لالەش هەی، تنێ ئەو زانت چقاس عەمرێ من مایە؛ هەڕە ژی پرسە. مووسا هات خورجیک سەر ملێ وی بوو. گەها نک پلا سلاتێ (پردی سیراتێ)، خورج ئێگر گرت. مووسا گۆت: خودێ چما ئێگر کەتە خورجێ من؟ خودێ گۆت: «خەلع حیزا!». نازانی یانی چی؟

- نەخێر.

- یانی شەکالا خۆ پاوێژە! مووسا شەکالا خۆ ئاڤێت، ئاگر ڤەمرد. لڤێ گاڤێ ڕە، هەر کەس گهایە ڤێ دەرێ، دبە شەکالا ژ خۆ کا و خواس بمەشە.

لەبەر مرقەی پێکەنینی حافز نەموێرا بپرسم دەی خوا چەندی عومر مابوو؟ ترسام فەقیر قوشقی ببێ و بەجێم بێلێ. بە داخەوە نەمزانی خودا کەی لە دنیا دەردەچێ!

- دەی ئەزبەنی، تە پلا سلاتێ مە دیت؟

- بەلێ، وە بال بەستۆم پرد وا دەبێ؛ جێپی بە سەردا دەڕوا. پردی سیراتی موسولمانان لە موو باریک‌تر، لە ئەلماس تیژتر، ڕێگەی سەد سال دوور، هیچ تەنافبازێکی لۆتی بیجاڕیش ناتوانێ لێی بپەڕێتەوە!

- هێندێک وەک کەلە بەردم لە دەوری پردی سیرات دیت؛ ئەوانە چ بوون؟

- برا سیخوڕ زۆرە، بێستانان ناهێلن. لاوەکانمان لە پشت ئەو بەردانە شەوانە خۆ مات دەکەن سیخوڕان دەکوژن!

- ئافەریم پردی سیرات! هەم زیارەت و هەم ڕاوە سیخوڕ! ئەگەر چووینە زیارەتی مەرقەد، شکلی مارم لە دەرگا دیت. چەند شتی وەک لینگە تەرازووی بە زنجیر هەلواسراوی لێ بوو؛ ئەوانە چن؟

- شکلی مار مەپرسە! بەلام بە خودا بە دل دەمزانی ئەو پرسیارە دەکەی! ئەو لینگە

تەرازووانە ڕۆن و پلیتەیان تێدەکرێ بۆ ڕووناکایی. نابێ نەوت بچێتە بارەگای شێخ هادی.

- بەڵێ نەوت شتێکی بۆگەنیوی پیسە. ئەو سێ کێوەی دەوری گەلی داوە ناویان چیە؟

- ها، ئەم کێوەی لێی دانیشتووین: «عورفەت»، ئەوی بەرانبەر: «شەهدەت»، ئەوی لای ڕۆژاوا: «عەزرەت». وەختی خۆی لە بەغدایەڕا عەبدولقادر گەیلانی، جونەیدی بەغدادی، شبلی، حەسەن بەسری و گەلێکیتر لە ئەولیا هاتنە شەڕی شێخ هادی. گەیبوونە بن چیا، شێخ هادی بە کەرامەت زانی ئەوان هاتوون. یەزیدیەکی سواری گاشەبەردێک کرد و بە هاڕەهاڕ، وەک هەور بگرمێنێ، گەیشتە پێشیان لە سەری چیا. خەبەری پێدان کە شێخ هادیش دێت. شێخ هادی سواری شێر بوو؛ ئاوزەنگی زینی شێر دووپشک بوون؛ مارێکی زەلامی کردە قامچی و چوو...

- دووپشکەکانی ئاوزەنگی نەدەپسان؟!

- نا، دووپشکی گەلەک مەزن بوون! چاوی بەو شێخانە کەوت. بە خێری هێنان. لە بن سێبەرە بەردێک دانیشتن. دنیا گەرم بوو؛ هەموو میوانەکان گوتیان: تینوومانە؛ بۆ ئاو چ بکەین؟ شێخ هادی بە گۆچانەکەی دەستی لە بەردەکەی دا. باوەشێک ئاوی سارد لە بەردەوە فرکەی کرد. تەزبیح و عاسایەکیش بە ئاوەکەدا هات. عەبدولقادر گوتی: ئۆ خودێ! ئەوە عاسا و تەزبیحی منن لە بیرم کردبوون! ئیتر لە دیتنی ئەم موعجیزە هەموویان شادەیان دا کە شێخ هادی لە هەمووان شێخترە. ناوی کێوەکە بوو بە «شەهدەت». لەوێوە هاتنە گەلی؛ وە سەر ئەم چیایە کەوتن. زۆر باش یەکتریان ناسی و بوونە ناسیار. «عارف، عورف» بە عارەبی یانی ناسیاری؛ ئەم کێوەش ناوی «عورفەت»ی لێ نرا. مەلا ئۆبەکری جزیری لە جزیر و بۆتانەوە زۆر عاشقی شێخ هادی بوو؛ هات کە زیارەتی بکا. گەیشتە سەری ئەو چیایە، بە دیوی گەلیدا ڕۆحی دەرچوو، عەزرەتی دیداری پێ ما؛ بۆیە ناو نراوە «عەزرەت»!

- مەلا ئەحمەدی جزیری لە شیعرێکیدا باسی لالەش دەکا.

- نەخێر ناوی ئەحمەد نەبوو، ناوی مەلا ئۆبەکر بوو!

- بەڵێ ڕەنگە من بە غەڵەت چووبم!

فەقیر لە منی پرسی:

- دەڵێن لە حەجی بسلمانان، ئەو خەلکە بەلەنگازە خۆیان ڕووت دەکەنەوە، لەو سەحرا گەرمەدا ڕادەکەن؛ ڕاستە؟

- ئەی جەنابی فەقیر! چت زانیوە؟ ئەو هەموو ڕووتە لەو دەشتەدا گرێوە غارێکیانە، سەدیان وە بن پێ دەکەون؛ زۆریان لە بەر تۆز دەخنکێن؛ خوا بە نسیبت نەکا!

- دە بزانە حەجی ئێمە چۆنە: سێ شەوان هەموو کیژ و لاو، ژن و پیاو، خۆ دەخەملێنن، جلکی جوان دەبەر دەکەن، لە سەر چیای عورفاتێ لە بەر دەنگی شمشاڵ (شەباب) دەرەقسن تا ماندوو دەبن و خەو بە لایاندا دەباتەوە.

- دە ئۆباڵ بەستۆم حەج وا دەبێ! با عارەبی پێخواسی بێدەرپێ، لە ناو خۆڵدا بگەوزن؛ گۆڕی گیانیانە!

بەو قسە خۆشانە سێبەر شۆڕ بوون و هاتینەوە گوند. حافز شین و ڕەش ببۆوە لەبەر پێکەنین؛ دەیگوت: تۆ چۆن پێکەنینت نەدەهات و دەتگوت پیرە یەزیدی سەد ساڵەی وا کابرات گەرم داهێنابوو؟! گوتم: کاک حافز! زۆر ساڵە لە من کەرتری دەس نەکەوتبوو ئاوا گوێی بۆ ڕاگرێ و بەڵێ بەڵێی بۆ بلێ!

شەو لە مەجلیس گوتم: کوردەکانی ڕووسیا لە ئەرمەنستان و گورجستان پتر لە سێسەد هەزار دەبن و هەمووش یەزیدین.

فەقیر شەمۆ قوت بوو:

- پارەی ئەوان چییە؟

- ڕووبڵە.

- ئای بچیە ناویان و ڕووبڵ کۆ کەیەوە!

- ڕووس کافرن، ڕێگە نادەن بەرەکەتی وەک تۆ بچێتە وڵاتیان!

بە خزمەتی بابی چاویشیش گەیشتین. ئەگەرچی هەموو پیاوی ئایینی یەزیدی جلکیان و مێزەریان ڕەشە، ئەو سەر تا پای سپی بوو. پرچی هۆنیبوونەوە؛ هاتبوونە سەر پشتی. تەرکەدنیایەکی زۆر پاک و خاوێن بوو. دەیانگوت هەرامەکەی خۆی بە چەقۆ بڕیوە تا تەماحی لە ژنان ببڕێ! سێ ژنی تەرکەدنیا خزمەتی دەکەن. لە پاش «میر» و «بابەشێخ» لە هەموو کەس پایەبەرزترە. بابی چاویش جگە لە بەخێرهێنان، هیچ قسەی خۆشی بۆ نەکردین. باسی سینگۆلکە و کرووز بوونی دارتووشم پرسی، گوتیان: هەر یەزیدیەک بێتە زیارەت، لە حەجدا سینگێک لەو مێرگە دادەکوتێ کە ڕۆژی قیامەت ئەسپی خۆی لێ ببەستێتەوە. هەر کەسەش تیسمالکێک لە دار توو دەکاتەوە، بۆ بەرەکەت دەیخاتە کەندووی ئاردەوە.

حەجیان دەگەڵ جێژنی قوربانی ئیسلام بەرانبەرە. ڕۆژی دوای جەژن چەند لاوێکی زۆر بەتاقەت و چالاک، هەر یەک بە گۆپاڵێکەوە، دەچن لە بەر دەرکی حەسارێک ڕادەوەستن و گۆپاڵ لە سەر شان ئامادە، گوێلپارێکی دابەستراو لە ژوورەوە حەبس کراوە؛ میر و بابە شێخ و پیاوانی ئایینی لە سەربان سەفیان بەستووە و سەیر دەکەن. یەکێک دەچێتە ژوور و دێ لە دەرگا هەرا دەکا: «ئەوا هات!»، هەموو وشیار دەبن و حازر؛ بەلام نایە. دوو جار ئەم پرۆڤەیان پێ دەکا و سەری سێ جارە دەڵێ هات و گوێلپار دەردەپەڕێ و کوڕگەل بە گۆپالێنان دەکەونە سەری و هەرچی بیگاتێ دەیکوتێ تا دەیکوژن. چەندین مەنجەڵی گەورەی ساوار لە سەر ئاگرە؛ گۆشتەکەی بە سەر مەنجەڵەکاندا بەش دەکەن. دبێ هێندە کولابێ تا ڕیزاڵ - ڕیزاڵ دەبێ. ئەمجار یەکێک هەرا دەکا: «بگەنێ!»، هەی لەوەی مەزبووت و بەکار بێ و پارچەیەک لە گۆشتی گوێلپاری قوربانی دەست کەوێ؛ ئیتر ئەوە بەختەوەرە. ئەمجار وێکڕا نانی جێژنە دەخۆن و حەجاج بلاوەی دەکەن.

لە بیرم چووبوو لە سەر ئەو بەردە دانیشتبووم کە پیرۆزە و نشیمەنی شێخ هادی بوو. فەقیر شەمۆ گوتی: مەمنووحە! گوتم: مام فەقیر! سالێ ئەو هەموو دینارانە لەو یەزیدیانە وەردەگرن، ناکرێ دە دینار بدەن بە شیشی ئاسن و دەوری ئەو بەردەی پێ بدەن، تا کەسی‌تر وەک من لە بیری نەچێ و لە سەری دانەنیشێ؟! گوتی: ڕاستە؛ دەبێ ئەوی چێکەین.

پێویستە ئەمەش بزانین کە یەزیدی کورد، ئەوانەی لە شەنگال و دەشتی مووسڵ و جزیرەی سووریا و لە تورکیا دەژین، چوار تایفەن: میر، پیر، شێخ، فەقیر. هیچ تایفەیەک ناتوانێ ژن لە تایفەیەکی‌تر بخوازێ. شیربایی یەکجار زۆرە. زۆر کەس هەیە پیر بووە، هێشتا قیستی شیربایی دایکی لە سەر ماوە و دەبێ ساڵ بە ساڵ بیدا! تەلاقیش زۆر زەحمەتە. چونکە کابرا زۆر دەوڵەمەند نەبێ ناتوانێ دووبارە ژن بێنێ. یەزیدیەک لە تایفەی «میر»، گاوانێک بوو لە سووریا، ژنەکەی پێیەوە دانەدەنیشت. پازدە هەزار لیرەی سووریان دەدایە تەلاقی نەدەدا؛ چونکە بەو

قیمەتە ژنی لە تایفە دەست نەدەکەوتەوە!

پیاوانی دینی بریتین لە «میری گەورە» کە لە ماڵە میوانن و کەیخودایان قوڵی بۆ دەکێشن و میر دەسەڵاتی یەکجار زۆرە. ئەگەر لە مریدێک تووڕە بێ و بڵێ حەرامم کردی، کەس هاتوچۆی کابرای حەرام کراو ناکا؛ قسەی دەگەڵ ناکەن؛ تەنانەت نابێ مریشکیشی بچێتە ماڵی جیرانان. ناچارە بە دیاریەکی باش میر ئاشت کاتەوە. لە میر بەرەژێر «بابەشێخ»ە کە کاروباری شەرع و ڕێوشوێنی یەزیدیانی بە دەستە. دەرەجەی سێهەم «کۆچەک» دێت کە لەقەبێکی ئایینی گەورەیە. دەرەجەی چوارەم «فەقیر»ە، دەرەجە پێنجەم و لە هەمووان نەوی‌تر «قەووالە» کە بەیت و باوی دینی لەبەرە و بە دێهاتدا دەگەڕێ و پووڵ بۆ میر و پیاوانی ئایینی کۆ دەکاتەوە و سمێڵی خۆشی چەور دەکا و بەشی خۆی پاشقل دەدا. لە پاییزی درەنگدا، میر دێت و گەڕاندنی «تاوس» کە هەیکەلە تاوسێکی لە مس یان زەردە بە هەڕاج دادەنێ. قەووالان لە سەر یەکتری زیاد دەکەن. کێ دەیباتەوە، دەگەڵ چەند کەسێکدا دەڕوا بۆ گوندان و تاوسە مسە لە تێڕێک دایە. خەڵکی دێ -ژن و پیاو- بە پیر تاوسەوە دێن، دەیکەنە موزادەیە کە کێ تاوس بباتە ناو دێ. کێ بەری کەوت، تێڕی تاوسی تێدا دەخرێتە سەر ملی و دێتە گوند. هەموو خەڵکی گوند (پیاوەکانیان) دەوراندەور لە ژوورێکی گەورە دادەنیشن. قەووال لە پاش گوتنی چەند بەندێکی دینی، بە دەنگ بانگ دەکا: فلان کەس تاوس رووت تێ ناکا، چەندی دەدەی؟ مەڕێک؟ کەمە! دوو مەڕ... تا پێک دێن و هەر کەس بە ئەندازەی دارایی خۆی. ئەو دەم ڕووی تاوسی تێ دەکا پاش سەر چاکردنەوەی پیاوان، ئیجازە بە ژنان دەدرێ بچن زیارەتی تاوس بکەن و بەشە دیاری خۆیان بەرن. قەووال قازانجی خۆی دەبا و ئەو پووڵە بە میر دەگا؛ کە ساڵانە خۆی لە هەزاران دینار دەدا.

پیاوی بە دین نابێ قەت موویێک لە لەشی بقرتێنێ؛ نابێ نینۆکی بکا؛ نابێ تارەت بکا؛ یان دەم و چاوی بشوا. بەرەبەیانان لە خەو کە هەستا، ژێرپیالەیەک ئاو تێدا دێنێ، سەری هەردووک قامکی شادە کە بەو ئاوەیان تەڕ دەکا، بە قولینچکی چاوی دادەماڵێ کە ڕیپۆقی لێ بکاتەوە. بەڵام میر لەو قەید و بەندانە ئازادە؛ دەتوانێ ڕیش بتاشێ؛ خۆی بە ئاو بشوا؛ بە کاڵەی موویینەوە لە پردی سیراتەوە بێتە مەرقەدان. میر زۆربەی مانگی ساڵ لە لەندەن و ئورووپا ڕایدەبوێرێ و زۆر خۆشگوزەرانە.

نوێژیان، بەیانیان تاوهەڵات ڕوانینی هەڵاتنی ڕۆژە و لە بن لێوان دوعا کردنە. ڕۆژوویان سێ ڕۆژە. وەک دەڵێن خودا بانگی محەممەد و مەلەک تاوسی کردووە، گوتوویە ڕۆژوو سی بێ؛ محەممەد چونکە عارەبە و بە تەماحە گوتوویە سی ڕۆژوو باشە! مەلەک تاوس زانیویە محەممەد بە هەڵە چووە گوتوویە: با ئێزدی سێ ڕۆژوو بگرن؛ خودا نەیگوتووە سی، گوتوویە سێ! بەڵام بابەشێخ دەبێ دوو مانگ لە سەر یەک ڕۆژوو بێ. ئەمما ئەگەر میوانی بێن، دەبێ لەبەر خاتری میوان ڕۆژوو بشکێنێ و بۆی بە ڕۆژوو حیسابە! فێڵە شەرعییەکیان بۆ دۆزیوەتەوە: لەو دوو مانگەدا هەر ڕۆژە چەند کەسێک بە کاوڕ یان گیسکێکەوە دەبنە میوانی بابەشێخ و ناچارە ڕۆژووەکەی بشکێنێ! دوو مانگەکە بەو فێڵە دەرباز دەبێ. بۆ مایەی ژیانی بابەشێخ و پیاوانی‌تری ئایینی، بە پێی کتێبەکەی «مەلاخەلیل سولەیمان»ی شێخانی -کە لام وایە ڕاست‌ترین شتە کە لە سەر یەزیدی نووسرابێ- بیست و حەوت جۆر ماڵیات و سەرانە لە یەزیدی دەستێندرێ.

گوتنی کەلیمەی «شەیتان» هەر نییە و کفرە. تەنانەت هەر وشەیەک شین و تێی گەورەی

تێدابێ خۆی لێ دەبوێرن. بە زاراوەی یەزیدیان بە خلیسکان دەڵێن: «شەمگین»، لە ترسان دەڵێن فلان لە قوڕ چەقی. نابێ کەس تف ڕۆ کا؛ نابێ ئاو دە لوولێنە بکرێ. لە جزیرێ حەسەن ناوێکی یەزیدی لە ترسی حکوومەتی تورک هەڵاتبوو، لە ماڵە حاجۆ دەژیا. ڕۆژێک دڵخۆشی منی دەداوە:

- سەیدای هەژار غەم مەخۆ! دەزانم ئاوارەیی ناخۆشە. ئەوا منیش ئاوارەم و جاری وا هەیە مەجبوورم بە مەسینە دەست بشۆم؛ بڵێم چی دنیا وایە!

- حەسەن گیان! بە ڕاستی هەر تۆ لێت قەوماوە!

کاهوو نابێ هەر ناویشی بڵێن؛ کە پێی دەڵێن «خەس». چونکە وەختێ کە ئادەم لە بەهەشت دەرکراوە و خودا لە مەلەک تاوس ڕەنجاوە، مەلەک تاوس خۆی لە ترسان لە بن چڵەکاهوو شاردۆتەوە. چڵەکاهووی زمانشڕی بەدفەڕ جاسووسی کردووە و ڕاستی گوتووە: «ئەوەتا لە بن من دایە!». کە ئەم چیرۆکی کاهووە لە کتێبی «قصص الأنبياء»ی تورەهاتی خۆشماندا هەیە.

ئەگەر نینۆکیان لە درێژیان بپەڕێ، یان موویان بڕژێ، دەبێ بینێژن؛ لە قیامەت حیسابی هەیە. ئێستا زۆر کەسی وایان تێدا پەیدا بووە کە ڕیش دەتاشن؛ هەیشە خوێندوویانە و فاسق بوون! ئەو عەلی چۆقیەی باسم کرد، ببوە موعەلیم و کارمەندی ئیدارە. پێشمەرگەی یەزیدی - کە زۆریش ئازان- لە شۆڕشەکەی بارزانیدا زۆریان چاویان کرابۆوە. گوێیان زۆر لەو خرافاتە نەدەگرت.

مەسەلەی nامووس زۆر گرینگە. پیاوێک ژنێکی بە مێرد هەڵگرێ یان ئیلاقەی بکا، جەزای هەرکام کوشتنە. درۆ کردن زۆر گوناهێکی گەورەیە. بەڵام دزی کردن -نەخوازە لە موسوڵمان بێ- عافووی لێیە و پیاوەتییە. دەڵێن لە چیای شەنگالی هەر پیاوێک نەتوانێ حەیوانی قاورمە بدزێ، بە پیاو حیساب ناکرێ. دەیانگوت جارێک یەزیدیەکی خەڵکی جزیرە زاتی ئەوەی نابێ بچێ حەیوانی قاورمە بدزێ. ژنەکەی زۆری سەرکۆنە دەکا کە تۆ پیاو نی و ئابڕووت نییە. ناچار دەچێتە لای فەلەیەک بزنێکی قەڵەوی لێ دەکڕێ بە وادەی مانگێک بەهار. شەو درەنگێک گوێی بزنی گرتووە و بە دزیەوە هێناویەتەوە ماڵ و بە ژنەکەی گوتووە:

- ئەوا قەڵیم دزی!

- ئافەریم ئێستا پیاوی!

مانگێک بەهار چووە. فەلە بۆ قەرزەکەی هاتووە. کابرا لە ژنەکەی زۆر ترساوە، هەر خاوەن قەرز هاتووە قسە بکا بڕی بە قسەکەی داوە و باسێکی جیاوازی کردووە تا فرسەتی هێناوە و ڕایکردووە و چۆتە گردی ئەوبەری ماڵان و بە سەر خوراندنەوە بانگی کردووە:

- کریڤۆ (خزمەکەم) بە ئەبولقاسم نەنە، نەنە!

ژن زانیویە چ باسە و بە تێلا کەوتۆتە سەری و نەیگەیوەتێ!

قەبری شێخ هادی لە عەرزەوە چۆتە زوهرە. قەبری شێخ ئەبولقاسم و شێخ شەرەفەددین - کە دوو پیاوی موقەددەسن- لە مانگە. ڕۆژێ کە ڕووسان مانگی دەسکردی خۆیان ناردە سەر مانگ و لە مەجلیسی دیوەخانی تربەسپی باسی دەکرا، عەمەری خێلتکێ -کە یەزیدیەک بوو- گوتی: خودێ ئۆلا مە چووا (بەخوا دینمان نەما)!

- بۆچی عەمەر؟

- ئەگەر ئەوانە بچنە سەر مانگ، دەچن لە سەر قەبری ئەبولقاسم دەمیزن!

ئەو عەمەرە دڵسادەیەکی قسەسەیر بوو. جارێک گوتی: مـن دەڵـێم خـودا پیـاوێکی فێـڵزان بووە. زوو خۆی لە عاسمانان جێ‌کردۆتەوە و حوکم لە ئێمە دەکا!

ڕۆژێک دەگەڵ زەبیحی بە ڕێدا دەڕۆن؛ دەڵێ: لە کن ئێمە یەزیـدیان هـەر دوو شـت پیـسە: قەرزداری و موسوڵمان!

یەزیدی خۆیان دەڵێن دوو کتێبی عاسمانییان هەیە کە یەکیان «مەسحەفا ڕەش» و ئەوی‌تـر «جلوە»یە. مەسحەفا ڕەش لای بابەشێخە؛ ئەگەر لە سندووق بێتە دەر، تاعوون هەموو کەس قـڕ دەکا. جیلوەم دیـوە؛ چەنـد حیکایـەتێکی کـەراماتی شـێخ هادییـە کـە لـە زۆر کـتێبی باسـی مەشایخاندا خوێندوومنەوە. دەڵێن مەسحەفا ڕەش کرمانجییە؛ بەڵام جیلوەکەی من دیومـە بـە عارەبییە. بە قسەی مەلاخەلیل کە چل-پـەنجا سـاڵ جـیرانی بابەشـێخ و نێـوان خـۆش بـوون، مەسحەفا ڕەش درۆیە و هەر نییە.

ژنە یەزیدی زۆر ناحەزن؛ لە عارەبی دەشت دەکەن؛ کراسیان سپییە. کە قەتیش خۆ ناشـۆن، دەڵێن بۆگەنیویان لێ دێ. قسێکیان هەیـە دەڵـێ: «ئـەم ئێزدینـە، جـل سـپینە، بوهیـشتینە. هەرچی فلنە لە ژێریا مەنە. ئەمما بسلمان: مان و مان!».

ئارەق خواردنەوە لە ناو پیاوانیاندا زۆر عادەتە. من شێخ ناسرێکم لە جزیرێ دەناسی هەمیـشە مەست؛ هەمیشە بەتحە عارەقی لە باخەڵـدا بـوو؛ پیـاوی ئـایینیش بـوو. ڕۆژێـک لـە دەم کـانی نوستبوو، مار پێوەی دابوو. مارەکە ڕەق هەلاتبوو، شێخ ناسر وە خەبەر نـەهاتبوو! گـوتی: هـەژار ئەوە جەددی من مارەکەی کوشت!

- بەڵێ یا شێخ ئەو جەددەت کە لە ناو گیرفانت دایە! خوێنت بۆتە ژەهر!

لالەش چەند زیارەتێکی جگە لە شێخ هادی لێیە: شەمسی تەبریزی، نەزەرگەی بارزان و مەلا ئۆبەکری جزیری؛ کە دەبێ زیارەت بکرێن. شـێخ عـەدی وەک دەڵـێن ئەمـەوی یـان سـەر بـە ئەمەویان بووە. دوژمنانی مریدەکانی کە ناویان ناون یەزیدی، بۆیـە بـووە کـە بـە یەزیـدی بـنی معاویەیانەوە بنووسێنن کە بە ڕابردنی زەمانی زۆر، خۆیان (یەزیدیەکانیش) ئەم باسەیان لێ بووە بە ڕاست. ناوی یەزید و معاویە لە ناویاندا زۆرە. ناوی عومەر، عـەلی، حەسـەن و حەسـۆش زۆرە؛ هەر محەممەد ناویان نییە. بەیتی سیامەند و خەجێ بە کرمانجی قەووالی یەزیدی دەیـڵێن. لـە وێدا دەڵێن: سیامەند خۆی گەیاندە قەتەنە و بۆ شەڕی حوسێن ڕەگەڵ لەشکری یەزید کـەوت. ئەگەر سیامەند نەبوایە حوسـێنیان بـۆ نـەدکوژرا! جلکـی ئاغـا و دەوڵـەمەندەکانیان عارەبییـە و عەگاڵ و چەفتەیان بە سەرەوەیە. جلکی خەڵکی ڕەمەکی، کوردی و ڕانک و چۆغە و جامانەیە.

دوای سێ شەو بەهەشتی لالەشمان بـەجێ هێـشت. چـووین لـە چیایـەک میـوانی عەبـدێ زێدکی بووین کە ڕەئیسی زێدکیان بوو. تەواو شکلی موزەفەرەدین‌شا ببینە و عەبدێ بـە جووتـە سمێڵەوە ببینە! زەلام و چوارشانەیەک بە دیمەن زۆر بە سام. ماڵەکەی لە ئەشکەوتێکدا بوو کـە پێنج وەتاغی زۆر ڕێک و جوان لە بەرد تاشراوی لێک و لووس‌کراوی تێدا و جێ حـەوزە ئـاوێکی تێدا. ڕەنگە هەزاران ساڵ لەمەوبەر ماڵی پادشای دەوری بەرد بووبێ و لە شـوێنەوارە کۆنەکانـە. ئەو عەشیرەتە زۆر کەمن؛ بەڵام بە دز و دڕ مەشهوورن. عەبدێ هەموو سەر و بنی قـسەی داوای پووڵی لێ دەکردم. هێندەی گوت تا عەبدوڕەحمان قازی جنێوی پێ دا: تۆ بۆ هێندە خوێڕی؟!

شەو کە جێگەیان بۆ ڕاخستین، کوڕێکی عەبدێ بە ناوی فـەتاح -کـە لاوێکـی پـازدە سـالانە بوو- دوو سەنیری زۆر گەورەی بۆ دانابووم. گوتم من یەکم بەسە.

دەڵێ: بەخوا باڵگەهەک تنی تیرا کەلەخێ تە ناکا!

دوو کوڕی عەبدێ پێشمەرگە بوون و زۆریش ئازا. یەکیان کە ناوی دەرویش بوو، دوای هاتنەوەم بۆ خورکی هاتە لام، نامەیەکی دامێ؛ جوابی باوکی بوو لە دەوڵەتەوە بۆی هاتبوو کە هەر وەخت بێی چاوەنۆڕتین. گوتم بابت دەبێتە جاش؛ چارێکی لێ بکە. خەبەرم بۆ بارزانی نارد. ناردیە شوێنی کە وەرە کارم پێتە. عەبدێ پاش چەند ڕۆژێک هاتەوە. تفەنگێکیشی خەڵات کرابوو. لام وایە پوولێکیشیان دابوویە. دوایی کە چووموەوە بارزان لەم کارە ئیعتیرازم کرد. دیسان ناردیان هاتە بارزان. ماوەیەک مایەوە و چۆوە ماڵە خۆی و چووبوو ببوە جاش و لە شەڕێکی نێوان خۆی و جاشی عەرەبدا کوژرا.

تێلگرافێکم بە بێ‌سیم بۆ هات کە هەژار بێتەوە بارزان. من کە خەریکی خۆساز کردن بۆ سەفەر بووم، ڕادیۆ بەغدا کردیە هەرا کە بارزانمان پاکسازی کرد و سەری مارمان پاک کردەوە و مەلامستەفا کوژراوە. خەبەرێکی زۆر دڵتەزێن بوو؛ بەڵام چونکە زۆرم درۆ لە بەغداوە بیستبوو کەوتینە پێ و شوێنی. نەخێر بارزانی شوکور ساغە و تەنیا دەوڵەت لە چیای پیرس هاتۆتە خوار و بەری ڕۆژاوای زێیەی لە جێ شەڕەکە داگیر کردووە و شەڕ بەردەوامە.

لە زەمانی قاسمدا، مامۆستایەکی کوردی سووریا بە ناوی «محەممەد عەلی خۆجە» زۆر پیاوێکی موحتەرەم! پێنج هەزار دیناری شۆرشی درابوویە کە شمەک بۆ پێشمەرگە بکڕێ. حەمە عەلی خۆجە چووبووە حەلەب و پوولی خواردبوو، نەهاتەوە...

ئەی خودایە! من پێنج هەزار و چەند دینارێکی شۆرشم لایە؛ جگە لە فیشەک و بوزووی کە کڕیومە. دنیاش وا شێواوە خۆ ئەگەر ئەو پوولە نەگاتەوە خاوەنی شۆرش و حەتتا لە ڕێگەدا بشکوژرێم، ئابرووم دەچێ و دەڵێن ئەویش وەک حەمەعەلی خۆجە خواردوویە. خوایە هەر ئەمجار بژیم تا ئەمانەتییەکە تەسلیم دەکەمەوە. چەند پێشمەرگەیەکم دەگەڵ دەهات. هەشت ئێسترمان لە فیشەک بار کرد؛ ئێسترێک من سواری بووم. لە باڵەتەش ڕا ڕەشاد باڵەتەی موهەندیسی جەنگەڵبانی و دوو- سێ پێشمەرگەی ترمان ڕەگەڵ کەوتن.

جا هەتا لەو ڕێگە دوور و سەختە داین با ئاورێک بدەمەوە لای خورکێ. کە هاتبووم، مەلامستەفا فەرمووی نەچی توخنی «عەبدوڵڵا شەڕەفانی» کەوی کە جاشێکی زۆر پیس و نامەردە و دەتکوژێ. بەڵام تەماحی من بۆ گەدایی کردن دە ڕێی شۆرشدا لێم نەگەڕا. لە لایەن خۆمەوە کەسێکم ناردە لای؛ زۆری بەخێر هێنابوو؛ پەنجا تەنەکە ڕۆنی دابوویە؛ چل سندووق فیشەکی پێ فرۆشتبوو؛ دە سندووقیشی بە پێشکەشی شۆرش دابوو. بە کابرای سپاردەی منی گوتبوو: بەڵێ من جاشم؛ دوژمنی بارزانیشم؛ بەڵام دەزانم لە سایەی ئێوەدایە کە دەوڵەت پوولم دەداتێ. هەر گا ئێوە نەمێنن، دەوڵەت ئەگەر نەمکوژێ -وەک تاژی لە ڕاو کەوتە- خوێڕیم دەکا. ئەوا بە ڕەعیەتی خۆشم گوتووە تا پێشمەرگە گەنمیان لازمە نابێ کەس دەنکە گەنمێک بەرێتە مووسڵ. ماڵی جاشی وا هەر ئاوا!

چەند جارێکیش فیشەک و خوێمان لە حەرەس قەومی کڕی؛ کە بە کامیۆنی خۆیان دەهاتنە دەشت و قاچاغ فرۆشییان دەکرد.

مەلا عەزیزە منداڵەکەی دهۆکی زۆر پاراوە دەگەڵ خۆمی بەرمە بارزان. دەیگوت غازی هەموو ڕۆژ دارکاری دەکردم؛ لەوەتا تۆ لێرەی ئاسوودەم. بەڵام نازانم بۆچی دڵم نەهات دەگەڵ خۆمی بەرم. منداڵ بوو؛ دەترسام شتێکی بە سەر بێ. بارزانی ڕایسپاردبووم کە ئاگات لە



«مەحمووداغای چەمانکێ» بێ؛ زۆرم خۆش دەوێ. ئەو خۆشەویستییەش وەفادارییەک بوو کە وەختێ قاسم عەفووی بۆ پێشمەرگە دەرکردووە -جگە لە بارزانی- بارزانی فەرموویە: کێ دەڕواتەوە ماڵە خۆی بڕواتەوە. مەحمووداغا گوتوویە: من بەجێت نایەڵم. دەمەوێ کە کوژرام تۆ پەلکی چاوم بە پەنجەی خۆت لێک بنێی. بەلام کە ڕوانیم لە ڕاستیدا زۆر پیاوێکی خوێڕی و پووڵەکییە. ئەوەندە داهاتی دەغڵ و موڵکانە هەبوو دەیتوانی هەزار پێشمەرگە بەخێو کا؛ دەشیدیت کە من سواڵی گەنم و پێخۆر لە جاشان دەکەم، لە بەرم دەپاڕاوە دە تەنەکە گەنمی بدەمێ. ئەگەر لەبەر بارزانی بمویڕایە، ساف لە سافم تالان دەکرد.

لە گەڕانەوەمدا دوای دوو ڕۆژ تووشی خێوەتێک بووین لە سەر ڕێگە هەڵدرابوو. مەحمووداغای مبارەک دوو ڕۆژ بوو لەوێ چاوەنۆڕم بوو:

- دەبێ هیچ نەبێ دوو هەزار فیشەکم بدەیەی!

- مەحمووداغا یەک فیشەکیشت نادەمێ؛ دەیبەمەوە بارزان کە ئەو شەڕە گەورەیەی تێدایە.

وەک چەرچی مەیدانی مەنگوڕان هەر ئەو دیتە خوار و من دەڵێم نا. هاتبووە سەر سێسەد فیشەک، ئەویشم نەدایە!

جاری پێشوو کە بەرەو دهۆک دەهاتم، لە «دووپردێ» میوانی بنکەی پێشمەرگە بووین کە حەسۆ میرخانی پێ ڕادەگەیشت. پاش نیوەڕۆ لە چۆم چوومە ئەوبەر. پردەکە دوو کاریتە بوو؛ پەڕینەوە کاری تەنافبازان بوو. سێبەرە بەردێکی خۆشم پەیدا کرد کە لە زۆر بەرزییەوە دەیڕوانیە زێ. پەتوویەکی تەنکم هەبوو، دامە بن سەرم و نووستم. حەسۆ دەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک هات؛ گوتیان: سەیرە هەڵنەدێراوی لە سەر ئەو لێوارە باریکە بەردە چۆن دەنووی؟ خەتەرە؛ هەستە! حەسۆ پەتووەکەی لێوەرگرتم. «هورمز چەکۆ مەلەک» -کە لە فەرماندە هەرە ئازاکانی شۆرش و سەرۆکی پێشمەرگە مەسیحییەکان بوو- لە حەسۆی وەرگرت. یەکیتر لە هورموزی وەرگرت کە چۆن جەنابت هەڵیدەگری؟ هێندەی دەستاودەست کرد تا پەتوو ون بوو. ئێستاش نەمانزانی چی بە سەر هات! قەرار درا تا دێمەوە بۆم پەیدا کەنەوە. ئەمجارە کە هاتمەوە:

- کاک حەسۆ کوا پەتووەکەم؟

- بە خوا نەدۆزرایەوە. کاکە نەوەک شیعرێکم بۆ دروست کەی، ئەم چەقۆ سینگرەت بدەمێ چۆنە؟!

- ڕازیم!

حەسۆ میرخانی دوپرێ لە حەسۆ میرخانی ژاژۆکی جیایە؛ کە دوایی لە قەلادزە حوکمی دەکرد و دزێکی زۆر پیس بوو. حەسۆ میرخانی دوپرێم زۆر وە بەر دڵ کەوت. هەم عاقڵ، هەم زۆر ئازا. هەم زۆر بە نەزم و تەرتیب. نۆبەتێیەکی سەختی بوو؛ دەرمانیان بۆ هێنا نەیخوارد؛ ناردی بۆ پێشمەرگەیەکی نۆبەتی داری هەواڵی!

زۆربەی شەوانە لە ناو چیا و لێرەوار دەماین. ئەگەر ئێوارە بگەیبانە بنکەی پێشمەرگە، میوانی دەبووین. پووڵە ئەمانەتییەکەم کردبووە ناو چەمەدانێکی چکۆلەی ڕیش تاشین کە زۆر کۆن و بەدنوما بوو. دەمگوت ئەمەم بۆ بخەنە سەر باری ئێسترێک. بۆ خۆشم چەمەدانێکی باشم بە دەستەوە قفڵ دابوو، هەمیشە بە باوەشمەوە بوو؛ کە هیچی تیدا نەبوو. تا ئەگەر تەماحیان کردە پووڵەکە، ئەمەی دەستم بدزن. کەس بیری چەمەدانی ڕیش تاشینەکە نەدەبرد.

تاریف ناکرێ ڕێگامان چەند سەخت و بەرداوی و هەڵەموت بوو. پێم سەیر بوو ئێستر چۆن دەردەچن. ئێوارەیەک بە کێوێک هەڵگەڕاین هەمووی دەتگوت پلیکانی دیوانە، ماوەیەکی زۆر کەممان بە پێنج سەعات بڕی. چووینە گوندێک بە ناوی «هەنارە». ماڵی لێ نەمابوو. بنکەی هورموز لەوێ بوو. شەو درەنگێک گەیینێ.

- ئای بەخێر بێن. وەختێکی باش هاتوون!

- خەبەر چییە؟

- سێ ڕۆژ لەمەوبەر بە سەر گوندێکی جاشانماندداوە، شەش سەد مەڕی دەوڵەتی و ئاغامان هێناوە. دوازدە سەرباز و ئەفسەر و چوار جاشمان کوشتووە؛ پەنجا مریشکیشمان بە تالان هێنا. مەڕەکانم بە سەر بنکەکاندا بەش کرد و دووسەدم نارده بارزان؛ بیست سەرم بۆ خۆمان گێڕاوەتەوە. دادەی کوڕە گۆشت سوور کەنەوە! بەڵام بە داخەوە خوێمان نییە!

- کاکە هورموز ئەدی مریشک کوا؟

- بەخوا هەمووما خوارد!

گوتم: دە جا وەرە فەلە بکەوێتە سەر مریشکی جاشی موسوڵمان چۆن ئینسافی لە لا دەمێنێ؟!

جەمێک گۆشتی بێخوێمان خوارد. بەری بەیانی پێشمەرگەیەکی هورموز هاتەوە و خوێی هێنابوو. هورموز بە لیوان بەشی کرد و هێندێکیشی وە لا نا بۆ بنکە:

- ئەم نیوەڕۆیەش میوانی منن!

بێ تۆ ناخۆش ئەو جەمەش لە گۆشت جاش مر بووین. پاش نیوەڕۆ گوتی: هەستن بڕۆن!

- نا، تۆ بە سەری مەلامستەفا و مەسیح با ئەو شەویش میوانت بین!

- دەڵێم هەستن بڕۆن کارتان هەیە، نەڕۆن دەرتان دەکەم!

چاری ناچار دیسان دەم لە پووش وە چیا هەڵگەڕاین. سەرت نەیەشێنم دوازدە شەو و ڕۆژی برد تا گەیشتینە ڕووکاری زێی بادینان، لە باریکایی دۆڵێکی تەنگەبەردا لە وڵاتی زێباریان.

تا ئەوەشم لە بیر نەچووە: خۆشترین مەڵبەندێ کە من دیتوومە دۆڵی «نەهلە» بوو کە گوندی مەسیحییە کوردەکانی لێن. دێهات هەمووی لە بەردی تاشراو، خاوێن، وڵاتێکی پڕ لە دەغڵ و دان و بەرەکەت؛ هەر دەبوو سەیری بکەی. لە هەموو ئاقاران ڕەز و باغی میوە بوو.

هەموو دژواری سەفەرەکە بەو تاوە نەدەبوو کە لە سەر چیاوە بەرەو زێ سەرەو لێژ هاتینە خوار. زۆر جار دەبوایە بە دوو کەس یاریدەی ئێستر بکەین کە لە بەردی ڕێگە باز بدا. ڕەشاد باڵتە دەیگوت: نەحلەت لە بابی ئەو کەسەی هەوەڵ جار ئێرەی کردۆتە ڕێ! شەو درەنگێک چووینە گوندێک لە سەر زێ. ناوەکەیم لە بیر نەماوە؛ بەڵام حەیدەر بەگ ناوێکی بە سەر ڕادەگەیشت کە دەمناسی. دوو سەعات شەوی مابوو؛ دەبوو بپەڕینەوە. جانتای پوولەکەم خستە ناو چەمەدانە گەورەکە. هاتینە سەر زێ. کەڵەکی بە کوولەکە سەراوی، جێگەی دوو کەس بە حاڵ دەبێتەوە. ئاو زۆر خوڕە، کەڵەک ئاو دەیبا و لە دوای دوو کیلۆمیترێک وردە کەڵەکەوان دەیباتە بەری ئەوبەر. نۆرەی من و ڕەشاد باڵەتە پێکەوە هات.

کەڵەکەوان گوتی: نابێ چەمەدانت پێ بێ؛ دوایی بۆت دێنم.

گوتم: یان خۆم و چەمەدان بە تەنیا بپەڕینەوە، یان نایەم.

ناچار قبووڵی کرد. ڕەشاد و منی لە سەر چینچکان لە سەر کەڵەک جێ کردەوە و چەمەدان

لە پێشمە. گوتی: نابێ هیچ ببزوون؛ خەتەرە. کەڵەک وە ڕێ کەوت. ڕەشادی ممبارەک دەیەوێ حورمەتم بگرێ، خۆی لادا گوتی: ئەزبەنی جێگاکەت ناخۆشە! کەڵەک لارەوە بوو، ئاو هاتە سەر پشتێندمان؛ بەڵام کەڵەکەوان زۆر ماهیر بوو؛ وە خۆ کەوت و بە سەوڵ لێدان و لە سەر یەک ڕاستی کردەوە. زۆری خۆ توورە کرد کە سەیر بوو نەخنکان! پەڕینەوە. تەڕ و تلیس، سەرمای بەربەیان، دنیا تاریک، کەوتینە پەل کەوتن. هێندێک چیلکە و پڕ و پووشمان کۆ کردەوەو ئاگرمان دا. ڕانک و دەرپێ داکەنە و بە گونی ڕووت لە دەوری ئاگر خۆت وشک کەوە و هەڵیشلەرزە. هەوالانی‌تریش پەڕینەوە و ئێستر بەجێ مان؛ کە بە دەراوێکی دیکەدا بۆمان بنێرن. بە چیای شیرین هەڵگەڕاین. تاوهەڵاتێ گەیشتینە هەوارگەی ماڵی شێخ ئەحمەد لە «بێرکی بەستریان». «شێخ نوورۆ»ی کوڕی شێخ ئەحمەد لەوێ بوو. بەرچاییەکمان خوارد و هەر کەسە لە سەر بەردێکی پان خۆمان لەگەز دا و تێر نووستین. پاش نیوەڕۆ ئێسترەکانیان بۆ هێناین. شێخ نوورۆ تەماحی کردبووە بوزووی ڕانک و چۆغەکان، بەڵام ئەو زۆری فەرموو من کەمم جواب داوە و گوتم تا نەیدەمەوە بە بارزانی کەس نایانبینێ. ئەو شێخ نوورۆیە زۆر پیاوێکی خوێڕی و بەتەماح بوو. لەو هەموو لێقەومان و شەڕانەدا هەر خەریکی قاچاغچییەتی خۆی بوو.

چیای شیرین -کە بە سەر گوندی بارزاندا دەڕوانێ- هەوارگەی ماڵی شێخانە. چاڵە بەفری تەبیعی زۆری هەیە. مەڕ لە ئاوی بەفران پاراو دەبێ و ئەو چاڵە بەفرانە تا بەفری نوێ هەر دەمێنن. بە قسەی ڕەشاد -کە موهەندیسی جەنگەڵ بوو- لە هەزار و شەشسەد میتر بلندی بەو لاوە دار ناڕوێ. ئەو شوێنەی ئێمەی لێ‌بووین کیفار و درووی زۆری هەبوو؛ داری نەگەیشتبووویە. شێخ نوورۆ ڕۆژنامەیەکی عەرەبی هێنا گوتی: پێم نالێی ئەو «کوناکەرێ»یە لە کوێیە؟! کۆناکری لێ‌ببووە بە قوونی کەرێ!

لە پشت چیای شیرینەوە هاتین. ئێوارە عەسر گەینە «لێرە بیرێ» کە لێرەوارێکی چوغور و چیایەکی بلند و بنکەی بارزانی بوو. لە پێشمەرگەیەکی بارزانیم پرسی: کوا مەلامستەفا؟

- چۆتە ئەودیوی چیا؛ بە دووربین سەیری شەڕگە دەکا.

- وەرە کاکە! دانە- دانە پووڵەکەم بۆ سەعید بژارد. هەناسێکی ئاسوودەم هەڵکێشا. خۆم لە سەر خۆڵ ڕاکێشا و کەیف ساز... نوێژی شیوان بارزانی هاتەوە؛ چوومە خزمەتی. فەرمووی: ئەو پووڵ بە سەعید دانەت لە چی بوو؟ گوتم: هیچ قسەی لێ مەکە! مارێک دە باغەڵمدا بوو، فڕێم دا. سبەی ئەو ڕۆژە کە لەو شوێنەوە چووبووینە جێگایەک دەیروانییە دۆڵی «زووراوان»، فەرمووی: کە تێلگرافم بۆ کردی بێیەوە، لە بەر دوو شت بوو: یەکێک دەترسام غازی بە دزیەوە بتکوژێ؛ دووهەم عومەر دەبابە دەگەڵ یەکێکی ئێرانی کە ناوی جەلال بوو هاتبوون. مەکتەبی سیاسی حیزب داوای تۆیان لێ کردووم کە بچی و لە ڕادیۆکەیاندا -کە تازەیان پەیدا کردووە- کار بکەی. خۆت حازر کە سبەی دەتنێرم.

پاش تۆزێک مات بوون گوتم: ئەوە ئەمرە لێم دەکەی یان پرسە؟

فەرمووی: نەخێر تۆ ئازادی ئەگەر پێت خۆشە بچۆ. دەشزانی ئێرە چەندە خەتەر و ئاگربارانە و هەموو ڕۆژ شەڕ و لێکدانە؛ من لە بەر تۆ دەڵێم.

- قوربان ناچم. ئەگەر تۆ ئەمرم پێ بکەی خۆم دە ناو ئاگریش داوێم؛ بەڵام بە خۆشی خۆم دەمەوێ لەم خەتەرەدا لە تۆ دوور نەکەومەوە. فەخر بەو مەرگە دەکەم کە لە نزیک تۆ بمگاتێ. یەکیش من کابرایەکی زمان‌شڕ و خوێن‌تاڵم، لێم ڕوونە دە ڕۆژ دەگەڵ ئەو مامۆستایانە ناژیم؛

مۆری جاسووسی و خەیانەتم لێ دەدەن و دەرمدەکەن. من خۆشم دەناسم و ئەوانیش دەناسم.
فەرمووی: بمێنەوە!
تەیارە بە ڕۆژ هیچ مەودای نەدەدا. بەیانی لە شوێنەکەی خۆمان دەگوێزتەوە و دەچووینە ڕووکاری دۆڵی زووراران -کە بەردەلانێکی پڕ گاشە بوو- تا ئێوارە. شوێنەکەی خۆمان کانی و ئاوێکی لێ بوو. زۆر لە پێشمەرگە لە ئێوارەدا لەوێ جلیان دەشوشت. بەیانییەک کە دەڕۆیشتین پێشمەرگەیەکم دیت لە بن دارێک لە نزیک کانی دانیشتبوو. گوتم تۆش وەرە بڕۆین! گوتی ئێرەم خۆشە و نایەم. ئەو ڕۆژە بۆمبایەک وە دارەکە کەتبوو لە ڕەگ و ڕیشەی دەرهێنابوو؛ پێشمەرگەکە شەهید بوو.
ڕۆژێک شەڕی گەورە کەوتە دۆڵی زووراران. تەیارە و تۆپ و قرمەی تیربار و تفەنگیان گاڵەی دەکرد. مەلامستەفا لە شوێنێکەوە -کە باوەڕ کە تفەنگی دەگەیشتێ- بە دووربین دەیڕوانییە شەڕ و تاریفی دەکرد:
- ئەها پیاوەکانی ئێمە لە فلان شوێن شکان؛ هەلاتن؛ خۆیان گەیاندە فلان ئەشکەوت؛ ئەی ئافەریم! لە ئەشکەوت هاتنەوە دەر، هجوومیان کرد. ئەها چوار کەسیان کوشت، ئەها جاش هەلاتن. (بە پێکەنینەوە) سەرباز هەر خۆ ناگرێ...
وەختی نیوەڕۆ لە بیری چووبوو نان بخوا؛ بە دووربین دەیڕوانی و شەرحی دەدا. ڕۆژێک ئیجازەم خواست لە چیا بچمە خوار و سەری بنکەی بێسیم بدەم. کاک شەوکەت و هەوالانی لە دەم چەمی «چامە» کەپرێکیان کردبوو. قولاپێکم لێ ساندن کە ماسی بگرم. قولاپم خستبووە گۆم، ماسی پێوە نەدەهات. تەیارەش لە سەرمان دەخولایەوە. بە هەر دووک دەست ئیشارەم بۆ تەیارە دەکرد، گوتیان: دەغیلە ئەوە خەریکی چی؟ گوتم: ماسی سەگباب نایەنە سەر قولاپەکەم! دەڵێم تەیارە پێ بزانێ و بۆمبایەک باوێژێتە گۆم؛ ماسیان قڕ بکا و خڕیان کەمەوە!
مەسەلێکی کوردانە دەڵێ: «چاو ترسەنۆک». بەلام من بە عەکسەوە چاوم بە غیرەتە و ناترسێ، خۆم ترسەنۆکم و کەم وایە سەر کەوم. هەورازێک دەبینم، لام وایە زۆر هاسانە سەری کەوم، کەچی لە نیوەی ڕێ پەکم دەکەوێ. گۆمێک هەبوو هەر سووری دەدا و کەسک و شین دەینواند. بە چاو پێم وا بوو دەتوانم بە هاسانی بە مەلە لێی بپەڕمەوە. خۆم تێهاویشت و لە ناوەڕاستی گۆم کەوتمە پەلەقاژەی ماندوو بوون. پێشمەرگەکانی بێسیم غاریان دا پشتێندێکیان بۆ حەوا دام، گرتم و کێشایان و لە خنکان خەلەستم.
گیسکێک هەر باعەباعی بوو.
- ئەوە چییە؟
- لە خێڵ بە جێ ماوە و شەلە، دەمانەوێ چاک بێتەوە و بۆ خاوەنی بەرینەوە.
- بە خوا کاکی خۆم بە فتوای من بیخۆین بە خێری ساحیبی!
ئەویشمان خوارد!
چاییمان نەبوو. شەوێک لە سەر بەردێک ڕاکشابووم. گوتیان سبەینێ شەڕ دەکەوێتە ئێرە؛ دەبێ بگوێزینەوە. خەریکی سازبوون بووین، یەکێک هات گوتی: کاک هەژار! ئەیووب کوڕی شێخ بابۆ دەڵێ بێتە لای ئێمە چاییمان هەیە. گوتم: کاک شەوکەت ئەوا تۆم بە چایی گۆڕیەوە؛ خواحافیز! گەییمە بنکەی ئەیووب، هێشتا هەر شەو بوو. گوتی با لێرە بڕۆین لە شوێنێکی باشتر چا لێ نێین. دنیا ڕووناک بوو. لە ناو چەند پنچکێکدا کەتری وە سەر نرا. چووم لە بن بەردێکی

که سێبەری تا نیوەڕۆ دەمێنێ خۆڵەکەم ساف کرد و ڕاکشام تا چا دەگاتێ. بانگیان کرد: وەرە بڕۆین! دەچینە شوێنێکی ئەمینتر.

- کاکە بڕۆن من نایەم.

مەلا عەولا ناوێک بارزانی هات گوتی: ئێستا دەبێتە هجوومی دەولەت، ئێرە زۆر خەتەرە! گوتم: تا جاش پیلم نەگرن و ڕاستم نەکەنەوە دەست لە خەوی ئەم بن بەردە بەرنادەم. ئیتر لە سەری مەڕۆ! تاو کەوت و تەقە پەیدا بوو. لە عاسمانەوە بۆمبارانی دوازدە فڕۆکە، لە هەموو لایەکەوە گرمەی تۆپان، دەنگی تفەنگ و تیربار وەک بریشکەی سەر سێڵ، دووکەڵ دنیای پڕ کرد. باوەڕ دەکەی یا ناکەی کەیفی خۆتە! لەو تەقە و هەرا و دووکەڵەدا خەوم لێکەوت و ماوەیەکی زۆر باش نوستم. خەبەرم بۆوە؛ گرمە و هەرا زۆر توندترە. هەمیشە ئەو دیمەنە جوانەم دێتەوە بەر چاو کە شەش منداڵی چکۆلەی چوار پێنج ساڵانە نیشانە بەردیان داکردبوو، گەمەیان دەکرد. هەر کە تەیارە دەهات کیژێکیان دەیگوت: «روونێن»! هەموو دادەنیشتن. هەر تەیارە دەچوو هەڵدەستانەوە گەمەی خۆیان دەکرد. پیرێژنێک لە نزیکمەوە تێپەڕی هەر دەیگوت: جەرگم ڕەش بێ بۆ ئەو هەمووە گەنجانە کە بە کوشت دەچن. تووشی پیاوێک بوو، گوتی: خەبەر چییە؟

- دنیایەکە کڕە! (یانی بێدەنگ و سەدایە).

ژنەکە گوتی: هەی داوەشێی! ئەو پیاوانەمان شەڕ دەکەن تۆ لێرە چ دەکەی؟ گوتی: دایە هاتووم ئاویان بۆ دەبەم.

تا تاوم هاتێ لە بن بەرد نەبزووتم. ئەوسا پاش نیوەڕۆ چوومە بنکەی مەلا عەولا لە دەم چەم. جێگاکەی تەیارە نەیدەدیت. نانێکم خوارد، مەلەم کرد. نەقلی چای ئەیووبم بیست، ئەو ڕۆژە پتر لە دە جار جێگەی گوێزتبۆوە و ئۆقرەی نەگرتبوو. ئاخر جار کەتری وە سەر ئاگر نراوە کە ئەمجار هەر دەبێ چای بخواتەوە. ئەی گوللە تۆپ تۆ وەرە ڕاست لە کەتری بدە و ئاگر هەڵپرژێنە؛ چا ئێستاش نەخورایەوە!

بۆمبای ماسیانیان دە چۆم هاویشت. منداڵە بارزانی -کە هەموویان وەختە بڵێم وەک ماسی مەلەوانن- خۆیان دە ڕووباری شێتە هاویشت و دنیایەک ماسیان گرتەوە. زۆرم شەڕ دیتن، بەڵام شەڕی دۆڵی زوراران و شەڕی چەمی چامەی ئەو ڕۆژە دیتم لە سینەماشدا مەنزەری وام نەدیوە. بریا فیلمی لێ گیرابا و بتدیبا!

تەنگی نوێژی شێوان بوو خرمەی سواران هات. چوومە سەر ڕێ. مەلامستەفا بوو جێگەی لێرە بیری دەگوێزتەوە. گوتی هەژار وا ئێستا ئێسترت بۆ دەنێرم؛ لێرە بە!

منداڵێکی دوازدە ساڵانە بەخێراتنی مەلامستەفای کرد. گوتی: ساغ بی زیخو (یانی ئازا). پاشان فەرمووی: ئاغا چت لە من دەوێ؟

- ئەزبەنی تفەنگ!

فەرمووی: بیدەنێ، کوڕی بابی خۆیەتی.

ئەوان ڕۆیشتن و منیش بە چیا هەڵگەرام. زۆر سەرکەوتم. خرمەی سواران هات و دەنگیان دام. بارزانی فەرمووی: ئێسترم بۆ ناردی تووشت نەبیوون. یەکێک دابەزێ با هەژار سوار بێ.

گوتم: هێندەم نەماوە سەرکەوم، بە پێ دێم.

گوتی: یەکێک دەگەڵی بگەڕێتەوە، زۆر تاریکە و ڕێ نازانێ.

حەسەن ناوێک لە بنەوە دەڵێ: توخوا بڵێ ئەوم دەگەڵ بێ، چونکە من فل بووم! حەسەنم دەگەڵ گەڕاوە. لە گوندی «بیە» دەرکەوتین. تارماییەکمان لە پێشەوە بوو؛ لایتی قەڵەمیم لێ دا، کیژێکی جحێلی زۆر جوان بوو بە تەنیا بەو تاریکە سەلاتەدا دەڕۆیشت.

- کێوە دەچی؟

- دەچمە لای مەلامستەفا لە دەلاشێ؛ ئەو سوارانە دەگەڵ ئەو بوون.

- بۆ دەچی؟

- قەولم بە «مستەفا عەبدوڵڵا» داوە مێردی پێ بکەم؛ نازانم بۆ نایە بمخوازێ؟ حەرەسی بارزانییە؛ دەچم شکایەتی لێ دەکەم!

حەسەن گوتی: تە دینی!

گوتی: ئا دین نیمە، حەقێ منە شکایەت بکەم، دەبێ بمخوازێ!

حەسەن گوتی: بۆ نایەی مێرد بە من بکەی؟!

گوتی: دەم خۆ ببڕە، ئەو پیاوەی لەگەڵتە عاقڵە، قسە ناکا، تۆ چاو لەو کە! من مستەفا عەبدوڵلام دەوێ.

هاتین بە ڕووکاری دەلاشدا کە بنکەی بارزانی (ماڵەوەی) لەوێ بوون. کچ ڕۆیشت بۆ ماڵ و لە حەسەن جیا بوومەوە بەرەو مەقەڕ. زۆر شەکەت ببووم؛ بڕم نەکرد سەرکەوم. خێوەتێکی هەڵنەدراو تووش بووم و دەمەوڕوو لە سەری تخێڵ بووم. بەرەبەیان بە دەنگی حەمایل خانی دایکی کاک مەسعوود وەخەبەر هاتم، جنێوی بە خەربەندەکان دا کە چۆن هەژار لێرە نووستووە لێفە و سەنیرتان بۆ نەهێناوە؟ ئەوانیش سوێندیان دەخوارد کە هەر نەیانزانیوە لەوێ نوستووە. دیار بوو حەمایل خان چووبوو نوێژی سبەینە بکا و تووشی کەلاکی من هاتبوو. زۆر زوو لێفەم بۆ هات و خەوتمەوە.

لەوەتا شێخانی بارزان لەو مەڵبەندەن، قانوونێکی تایبەتی لە بارزان هەیە: کچ بە شوو دان بە زۆری هەر نییە. کچ و کوڕ کە قەولیان بە یەکتر دا، بە شێخ دەڵێن؛ دایک و باب ڕازی بن و نەبن، شێخ دەیاندا بە یەکتر و بە ئەندازەی دەست ڕۆیشتن، مالیان بۆ پێکەوە دەنێ. ئەو کیژەی شەو دەگەڵمان هات، چووبووە لای حەمایل خان. پێی گوتبوو ئێستا شەڕە و تەنگانە، لە «بیە» داتدەمەزرێنم. وا دەکەم ئاگایان لێت بێ؛ نایەڵم ئاتاج بی. تا شەڕ سووک دەبێ و دەتدەم بە مستەفا عەبدوڵلا. جلکی زۆریشی دابوویە و ڕازی کردبوو کە شکایەت نەکا.

ڕۆژێک چوومە مەلە؛ وە ناو هێندێک داران کەوتم؛ هەنارێک و دوو گوێزم پەیدا کرد. کە هاتمەوە، بارزانی زەنگاڵەکەی خۆی بە سووژن و بەن دەچنیەوە. کە باسم بۆ کرد گوتی: ئەو جێگەیە مولکی منە، هەنار و گوێزەکانت حەرام خواردووە! گوتم: دەوڵەت هەموو ماڵی تۆی موسادەرە کردووە. ئەو زەنگاڵەشت ماڵی خۆت نییە؛ چ جای گوێز و هەنار! باوەڕ کە ئەو مولکەی مەلامستەفا پەنجا دیناری نەدێنا؛ کەچی ڕۆژنامەی دوژمن دەیگوت فیئودالە!

شێخ بابۆ (براگەورەی مەلامستەفا)، لە کونە ئەشکەوتێکدا بوو. پیاوێک بوو قەتی تفەنگ نەهاویشتبوو. هەمیشە هەر نوێژی دەکرد. ئەگەر بڵێن پەپوولەی بەهەشت بوو، درۆیان نەکردووە. ڕۆژێک لە مێرگێک دانیشتبوو، سەد میترێک درێژایی دەبوو؛ سێ سووچ. گوتی: هەژار! ئەوە مولکی منە. گوتم: جەناب! من سەد ئەوەندەشم هەبوو، نەمگوت مولکم هەیە! دەعوەتی کردم بۆ ماڵە ئەشکەوتەکەی. نان و چام خوارد، ئەو هەر نوێژی نەپساندەوە؛ بەجێم

هێشت.

گۆیا جارێک زەمانی شێخ سەدیقی برای، حەوت مەڕ لە شێخ بابۆ دزراوە. دزە گیراوە. شێخ بابۆ بەزەی بە دزدا هاتۆتەوە، چوار دیناریشی داوەتێ! گوتوویە: ئەم کابرایە دەستی کورت بووە بۆیە دزی کردووە. چونکە ماڵی دزیەتی بووە دیارە بە هەرزانی فرۆشتوون. ڕەنگە بەشی ئیحتیاجی خۆی نەکردبێ!

حەمەدەمین ناوێکی خەڵکی ولاتی پژدەر -کە ژنی خۆی کوشتبوو- لە بارزان دەست بە سەر بوو؛ کرا بە خزمەتکارم. زۆرم کەیف بە ساویلکەییەکەی دەهات. پاش چەند ڕۆژێک، بن دارە قەزوانێکم خۆش دەکرد، گڵم لێ ڕۆ کرد و تەختم کرد و کردمە جێگەی یەکجاریم. شەو مانگەشەو بوو. گوتم: کاک حەمەدەمین بزانە بەردێکی نەرمم بۆ پەیدا کە، دەیکەمە سەنیر!

زۆری پێ چوو نەهاتەوە. هەرام کرد: ئەوە چت لێ هات؟

- وەڵلاهی ئەگەر مەلامستەفا بەر گوللەم دا تازە خزمەتی تۆ ناکەم؛ دەستم لە هەزار بەرد داوە هیچی نەرم نییە!

- کاکە! مەنزوورم بەردی لووس بوو کە سەرم نەقرینجێنێ!

جگە لەو دار قەزوانە، دوو دار قەزوانیتریشم کردبووە هی خۆم! جەنگەی قەزوانی فەریک بوو. ڕۆژانە زۆرم میوان دەهات. دەمگوت: کاک حەمەدەمین هێندێک قەزوانی جوانیان بۆ بێنە! ئێوارانە چەند پیر و پاتاڵی بارزانیم لێ کۆ دەبوونەوە، مانای شیعری مەلای جزیریم بۆ لێدەدانەوە و حەقی فێرکردنیش ئەوە بوو کە بە دەنگ بیخوێننەوە. ئیتر گەڕەلاوژە بوو! ڕۆژێک ئیدریس بارزانی هاتە لامان. گوتم: گوێ بگری، دەبێ بە گۆرانیش بیڵێی! زۆری حەول دا، عەفو نەکرا. ناچار شتێکی بە دەنگێکی زۆر ناخۆش بۆ خوێندینەوە!

ئێوارەیەک حەمەدەمین وێڕای شێوی برینج، کوتە گۆشتێکی نەرمەی زلی هێنابوو. بنی چەمەدانی ڕیش تاشینەکەم گەڕام، چوار قلە سیرم پەیدا کرد. گۆشت و سیرمان هەنجنی و تێکمان هەڵپشاوت، بە لکە دارێکماندا کرد و بەیانی بە ئاگری پۆلوانمان برژاند؛ کەم شتی وا خۆشم خواردووە.

مێزەرێکی ڕەشی گوڵ-گوڵم هەبوو؛ ئەویش وەک قوتووە تووتنی مەلا باقی، عاسای مووسا بوو: شەوانە لێفەم بوو، بە ڕۆژ لە سەرم دەنا، ئێواران بە لای تاومەوە دەگرت بۆ سێبەر. ڕۆژێک باران دایدا، لە بن دار ڕۆیشتم کەلێنێک پەیدا کەم. پێ هەڵگەڕام، ئەشکەوتێکم دیتەوە کە پتر لە کونە ڕێوی دەکرد. لە سەر بستوێ وە زۆرم بانگ لە حەمەدەمین کرد کە وەرە! نەیبیست. ڕوانیم تووتن و پەڕ و ئاگرم پێیە. چیلکەم کۆ کردەوە و ئاگرم کردەوە و شەو تا بەیانی ڕامبوارد. بەیانی کە دەڕوانم هەر وا پیاوە و بەولا و لادا ڕادەکا. هەرام لێ کردن، گوتیان ئەمشەو هەر لە تۆ گەڕاوین؛ حەمەدەمین گوتوویە نازانم چی بە سەر هات.

ئەحمەد تەوفیق -کە هەمیشە لە سەفەردا بوو- لە لای قەڵادزە و سنووری ئێرانەوە بە چەند بارێک چا و خام و خاکییەوە هاتەوە و مستەفا و کاوەشی دەگەڵ بوون؛ دیسان لێک کۆ بووینەوە. شەوێک نازانم چۆن بوو هەر ئەحمەد و من لە پشت چیای شیرین بە ڕێدا دەڕۆیشتین. دنیا تاریک و قوڕ بوو؛ ڕێگەمان هەڵە کرد. لە ماڵێکی دەم ڕێگەمان پرسی، کچێکی زۆر جوان فانووسی هێنا. فانووسەکەی بەرانبەر دەموچاوی ڕاگرتبوو؛ کە با نەشزانێ کێین، بزانین جوانێک هەیە... ڕێگەی شان داین و هاتین. بە سەر کەندالێکدا کەوتین. پازدە

پێشمەرگە لە بن کەندال دەوری ئاگریان دابوو؛ بووینە میوانیان. بردیانینە لای سەرووی مەجلیس. دەبوایە پاڵ بە کەندالەوە دەین کە تازە داڕوخێنرابوو. دووپشکێکم دیت بەرەو گڕی ئاگر دەهات؛ کوشتمان.

گوتم: ئەحمەد من لە مار ناترسم؛ بەلام لە دووپشک ڕۆحم دەچێ.

گوتی: لە چاو من ڕۆستەمی! نازانی من چەند لە دووپشک دەترسم!

دووپشکێکی‌تر لە پشتمانەوە لە کەندال دەرچوو بەرەو ئاگر. نەخێر یەکی دی و یەکی دی؛ ناشوێرین بلێین ترسەنۆکین! ئەحمەد گوتی: ئێمە فێر نەبووین لە نزیک ئاگر بنووین، دەچینە ئەولا! دایانە تای کەلامەللایە دەبێ هەر لە جێی خۆتان بن؛ چۆن جێگەتان لە لای سەروو نەبێ؟! چاومان لێ قووچاند و نوستین و خۆمان تەسلیمی دووپشک کرد. بەلام وا دیار بوو دووپشک بە پیاویان نەزانیبووین؛ پێیانەوە نەداین و ئێمەش لە ترسان نەخەوتین! بەرەبەیان هەستاین بڕۆین، گوتیان تا چای نەخۆن نەڕۆن. گوتم: کاکە دووپشکەکان ڕازی نین لێرە بین! خۆمان گەیاندە بنکەی میرانی سالح بەگ. پێشمەرگەیەکی هاتەوە، گوتی: میران لە بەر ماران جێگەم پەیدا نەکرد؛ هەموو مارن!

گوتم: مەرگی ئەو سەر و سمێلەت بێ! پیاو چۆن لە مار دەترسێ؟!

میران گوتی: کوڕە ئەو بە ماڵ دەڵێ مار! چووبوو بنکە پەیدا کا، دەڵێ ماڵ زۆرن؛ شوێنی چۆڵ نییە!

دیسان بارانی پاییزە دایدایەوە. دەگەڵ کاوە و مستەفا و مام عەلی بایەزیدی بە کێو هەلگەڕاین شوێنێک بدۆزینەوە. کەلینە بەردێکمان پەیدا کرد، باران نەیدەگرتەوە. کەلێن تەسک بوو؛ دوو کەس ئەگەر وەک کاکلە بادام لە تێکولێک خۆیان پێکەوە بنووساندایە، تازە نەدەبوو هیچیان ببزوونەوە. مام عەلی بۆ خۆی جێگایەکی تایبەتی پەیدا کردبوو، ئێمە مابووین سێ کەس. کونێک لە بنەبانی کەلێنەکەدا بوو؛ تۆ بلێی گورگێک، ڕێویەک، خوانەخواستە پلنگێکی تێدابێ؟ گوتم من تاقی دەکەمەوە و بۆ خۆم ڕاکشام و لاقم بەرێ کرد. تا ئەستوورایی ڕانم جێگەی بۆوە؛ کردمە جێگەی خۆم. ئەوانیش با پێکەوە بچەسپێن. باران زۆری هێناوە، غارمان داوە دەرەوە. کۆلکە ڕەزی کۆنی لە بن بوو -کە بە دەست هەڵدەقەنران- زۆرمان کۆ کردووە و لە بەر دەرکی کەلێن ئاگرمان دا. تەلیسێکمان پێ بوو، هەر تاو ناتاوە تەلیس لە کۆڵ، دەچووینە کۆلکەڕەز کۆکردنەوەی بە نۆرە. چا و شەکرمان پێ بوو، کەتریمان وە بەر چۆڕاوکەی ئاوی بارانە دەدا؛ کە لە بەر دەرکەوە دەهاتە خوار؛ چامان لێدەنا. سێ ڕۆژ و شەو باران وچانی هەر نەداین. لە دووکەڵدا دەتگوت خنکاین. نانمان خەلاس ببوو؛ لە وردکەی ڕەقهەلاتوو دەگەڕاین بە چای بخۆین. بەلام ئەو سێ شەو و ڕۆژە بە قسەی قۆڕی کاوە پێکەنین.

ڕۆژی سێهەم تاو هەلات. گوتم: وا من دەڕۆم شوێنێکی باشتر پەیدا دەکەم؛ ئێوەش بە دوومدا وەرن بۆ گوندەکانی بۆتێ. لە کێو داگەڕام؛ بەرەو دێ چووم. تووشی کانییەک بووم کە چەند ژنێکی لێ بوو. لە دوور وێستام تا دەڕۆن و بچمە سەر کانی. ژنان هەر فلقوهۆڕیان بوو! یەکێک بانگی کرد: هەژار! ئەوە بۆ نایەیە سەر کانی خۆت دە ئاودا ببینی؟! چوومە سەر ئاو، ڕوانیم تەواو قولەڕەشەیەکی زۆر پیس، هەر چاوم بزەی دێ! تۆمەز سێ شەو و ڕۆژ دووکەڵ وای لێ کردووم و ئێمە پێمان نەزانیوە. تاوێک هەر ڕەشاو لە چڕوچاومەوە هات. گوتیان بەو شکلەی تۆ پێدەکەنین!

ژوورێکم لە نهۆمی سەرووی خانوویێکەوە پەیدا کرد کە گاشەبەردێکی زۆر زەلام لە سەربانی کون کراو ڕا کەوتبووە بەر هەیوانەکەی! تەیارە بۆمبایەکی بە ماڵێکی نزیک ئەو ماڵە دادابوو، کردبوویە چاڵێکی زۆر قووڵ. بەردی بناغەی خانوو، سەربانەکەی ئەم ماڵەی کون کردبوو؛ کەوتبووە بەر هەیوان. خاوەن ماڵ لاوێک بوو تەهای ناو بوو؛ مۆدنەی کەوەتی دەسمی و نەخش دەکرد. گوتم: تەها نەخشەکان جوان نین!

- وەڵلا کاکە دە پێشدا هی زۆر جوانم دەزانی، لەوەتا ئەو بۆمبایە هاوێژراوە لە بیرم چوونەوە!

- دەی ئەمجار نەخشی بۆمبا و تەیارەکەی لێ بکە!

پیرێژنی دایکی تەها وەختی خۆی دەگەڵ بارزانیان هاتبووە شنۆیە. یەک لە نەقڵەکانی ئەوە بوو کە لە شنۆیە گوتوویانە بۆ نوێژ ناکەی؟ گوتوومە نوێژ ناکەم، خودای عالەمێ (شێخ ئەحمەد) شفاعەتم دەکا! کاوە زۆر سەیر لاسای ئەو پیرێژنەی دەکردەوە.

ڕۆژێک لە «بن گەریان» تایەکی زۆر سەختم هەبوو؛ گوتم: حەمەدەمین هێندێک ئاوم فریا خە! تینوومە.

گوتی: مام هەژار تەیارە بە عاسمانەوەیە، ناوێرم!

گوتم: ڕاوەستە! لێفەیەک سوورم هەبوو، بردم لە دەشتایی ڕووتەن -کە لە تەیارە دیار بم- ڕامخست و لە سەری درێژ بووم. هاواری لێ بەرز بوو. گوتم: تا ئاو نەهێنی لێرە نابزووم! بە غار خۆی گەیاندە کانی و ئاوی هێنا. چووبوو حەولی دەرمانی دابوو، لەتێک حەبی ئیسپیرینی دەس کەوتبوو؛ بۆی هێنام!

دەرمان لە لای دوکتور مەحموود هەبوو؛ بەڵام دوور بوو؛ نەیدەگەیشتینێ. بە ڕاستی دوکتور مەحموود نیعمەتێکی گەورە بوو. بارزانی وایان عاقیدە پێ پەیدا کردبوو کە هەر برینداریک بگاتە دوکتور مەحموود نامرێ. لە باتی تەختی بیمارستان گەلای بەرووی ڕادخست. ڕۆژ و شەوی نەبوو. کەسی وا بە سەبر و ڕازی بە هەر جۆرە ژیانێکم نەدیوە. ئێوارەیەک دەگەڵ عەبدێ زێدکی -کە سمێلی بە قەد باسکی من دەبوون- لە سەر کەندالێک هەڵتروشکابووین. غەیبەتی ئەوانەی دەکرد کە لە تەیارە دەترسن و خۆی لە بەر دەشارنەوە. لەو دەمەدا خوتوخافڵ تەیارەیەک بەر تیرباری داین. عەبدێ ئاغا لە تاوان ڕێگەی نەدی، دەمەوڕوو کەوتە کەندال و چەپکێک پڕ و پووشی لە سمێلی هالا:

- ئەشەدەمبیللا تۆ لە تەیارە ناترسی؛ بەڵام ڕەنگە دەستنوێژت سووک بووبێ!

ڕۆژێک بەردی چەخماخم نەمابوو:

- حەمەدەمین بچۆ سەر ڕێگە بزانە بەردێکم بۆ سوال بکە!

جارێک هەرای کرد:

- مام هەژار ئەوە ڕێبوارێکە، دەڵێ جغارەکەی بنێرێ بۆی داگیرسێنم!

- با بڕوا!

ئەمجارە هاتەوە، بەردە چەخماغێکی بۆ لە یەکیتر سوال کردبووم.

ڕۆژێک بارزانی فەرمووی: هەژار بەینی خۆمان بێ! هیچ پووڵمان نەماوە. هەرچی هەیە ناگاتە سەد دینار؛ بەڵام خودا ڕێکی دەخا...

پاش نوێژی ئەو ڕۆژە یەکێک لە لای زاخۆوە هاتبوو. بارزانی حاڵی «ئەحمەد نالبەند»ی شاعیری پرسی؛ گوتی حاڵی باش نییە. سی دیناری بۆ نارد؛ فەرمووی: بە ئەسعەد خەبەر دەدەم

ئاگاداری بکا. بارزانییەک هاتە لای، لێی پرسی: حالت چۆنە؟
- ئەز غولام! ئەم بێ سەر و بەرین.
پێنج دیناری دایە. گوتم: لە سەر ئەو حالەڕا، ئەم حاتەمیەم کەیف نایگرێ.
فەرمووی: مەلا نالبەند شاعیری کوردە. ئەمەش ئەگەر هیچی شک بردایە نەیدەگوت بێ سەر و بەرم. خودا تۆڵە دەکاتەوە مەترسە!
ماوەیەک دوای ئەوە خەبەری سەرکەوتنی پێشمەرگە لە چیای مەتینا هات کە بە جارێک هەنگێکی دەوڵەتیان لە ناو بردبوو. بەڵام بە داخەوە مەلا ئەحمەدی نالبەند هەر کە دیتبووی جاش هجوومیان کردۆتە گوندەیان، بە کێرد ورگی خۆی دڕیبوو؛ خۆی کوشتبوو.
قەرار وا بوو دەوڵەت لە جێگەیەکەوە هێرشێکی بەرپان بکا. مەلامستەفا چەند سەرقۆڵەیەکی کۆ کردبۆوە بۆ تەگبیر لەو شەڕە.
فەرمووی: لە هەر قۆڵەی بە جەرگ‌ترین پیاو هەڵبژێرن کە بیست‌وپێنج تا سی کەس بن؛ بێدەنگ لە بن ملەی کێو خۆ مات دەن! دەوڵەت بەر لە هجووم پێشە خۆی بە تۆپان دەکوتێ تا خاترجەم دەبێ کەسی لێ نییە؛ ئەوسا هجووم دەکا. ئەو کەسانە ئەوەندە خۆڕاگر بن، گوێ نەدەنە تۆپ بارانەکە. تەنانەت ئەگەر خوا نەکا یەکێ بشکوژرێ، ئەوی‌تر بۆی نەچن و لە جێی خۆ نەبزوون و خۆ مات کەن. هجوومی پیادە کە هات، لە نزیکەوە دایانگرن. هەر لەشکرێک لە جەبهەدا هەوەڵ جار نۆ یا دە کوشتەی دا، دەشکێ.
هورموز گوتی: من یەکێک لەوانە. فەرمووی: نا، تۆ بە کاری ئەوە نایەی. زۆر ئازای؛ بەڵام زوو هەڵدەچی و هەر مل پێوە دەنێی. پیاوی زۆر بەسەبرم دەوێ.
هەر کەسە ناوی چەند پێشمەرگەیەکی گوت؛ هێندێکی پەسند کردن. ڕاستیش ئەوە بوو ئەو هجوومە کرا و دەوڵەت زۆر پیس شکا. لەشکری سووریاش هاتبووە یاریدەی لەشکری عێراق و شەڕی دەگەڵ دەکردین. جەبهەی لای سووریا هورموز گرتبووی، پەت‌پەتێکی بە لەشکری سووریا کرد بە داستان بیگێڕنەوە. چەند جاری ڕاو نان و کوشتنی و تالانی لێ گرتن. بەڵام هورموز پیاوێکی ئەوەندە نەترس بوو گاڵتەی بە شەڕ دەهات. سەنگەری نەدەگرت؛ بە پێوە بەرەنگاری دوژمنان دەبوو. بە داخەوە لە شەڕێکدا شەهید کرا؛ کە بارزانی زۆری بۆ خەمگین بوو. تا بەم دیوەشدا هاتین، منداڵ و خوشک و دایکی هورموزی وەک کەسی زۆر نزیکی خۆی چاوێری دەکرد.
هجوومێکی زۆر گەورەی دیکەی حکوومەت لە لای مێرگەسوورەوە کرا. شەڕی تەن بە تەن و بە نێزە قەوما. عەمەراغای دۆڵەمەڕی ئاوقای جاشێکی یەزیدی تەژەی زەلام ببوو. جاشەکە پڕی دابووە گونی و بایدابوو؛ بەڵام جاش کوژرابوو. عەمەراغایان بە گونی بادراوەوە گەیاندە دوکتور مەحموود. لەو شەڕەدا جگە لە سەدان سەرباز و ئەفسەر، سەد و چوار کەلاکە جاش لە مەیداندا بەجێ مابوو. ئیتر لەو شەڕەوە دەوڵەت کەوتە پاشەکشە و زمان لووسی کە با گفتوگۆی ئاگربەس بکەین.
ئەوی لەو ماوەیەدا زۆری ناڕەحەت دەکردم، دیمەنی ژن و منداڵی بارزانیان بوو کە لە بەر باران و لە بن داران دەژیان. مالیان هەر ئەوە بوو کە بە کۆڵیانەوە بوو؛ بەڵام ئەوان قەت گلەیان لە بەختی خۆیان نەدەکرد. ڕاستی حاڵێکی پەرێشانیان هەبوو.
ئەو کاتە کە لە «بن‌گەریان» بووین و هێشتا نەناردرابوومە خورکێ، بارزانییەک بە ناوی «ئاغا»

که «ئاغای زوڕەگوان»یان پێ دەگوت، خەریک بوو لە جێ گوندی «زوڕەگوان» خانوویێکی بە وشکە بەرد دروس دەکرد؛ دیواری تا نیوە بەرز کردبوو، گوتی: لە عومرمدا جارێ پێنجەمە دێم خانوو بکەم و بەر لە تەواو کردن پێم بەجێ دێلن. بێستانۆکێکی کردبوو هەر دەیگوت: هەژار با خەیار و ترۆزی و تەماتە بگەنێ، پێخۆری تۆ لە سەر من!

ڕۆژێک دیتمەوە:

– ئاغا دەزانم خانووەکەت بەجێ هێشت؛ بەلام بێستانەکەت چی لێ هات؟

– بێستان هەر لە گولدا بوو، ڕاویان ناین. ڕۆژێک گوتم بچم سەری بدەم، کە دەچم دوو دانە جاشی زێباری لە ناوی دان. خۆم لێ داگرتن، هەردووکم کوشتن. لەباتی ترۆزی دوو تفەنگم بە ڕەختە فیشەکەوە هێنا.

لەو شەڕانەی بارزاندا زۆر پیاوی زۆر ئازا کوژران و بریندار بوون. ڕۆژێک بۆمبایەک کەوتبووە ناو سەنگەرێکەوە، لە دوازدە کەسان «کەکۆ» دەرچوو. کەکۆ کە لە شەڕی مامەشەی دەوری سەقز ناوبانگی کرد و بە سێ جێ بریندار بوو. لە شەڕی دەوری شنۆیە دیسان بریندار کرابوو؛ لەو بۆمبایەش هەرچەند نەمرد، بەلام لە زمان و دەست و پێ کەوت.

عەمەراغای دۆلەمەڕی لە لای سەری حەسەن بەگی چووبووە زگجاشان، ڕەوەیەک زۆر گەورەی لێ بڕ دابوون. لە ڕێگە مار پێیەوە دابوو؛ بەو حالەش توانیبووی سێسەد سەر دەرباز بکا. ئەحمەد تەوفیق -کە لە دوای ئەو بە ڕێدا هاتبوو- تووشی سێ ماین و ئەسپ و دووبرێکی ماچە ئێستر ببوو کە لە ڕەووەکە هەڵبڕابوون؛ هێنابوونیە بارزان. ماچە ئێسترەکە زۆر جوان بوو؛ دەتگوت بە قەڵەم کێشاوتە. ئەحمەد دەیگوت بۆ خۆم؛ شەوکەتی بێسیم داوای دەکرد؛ هەرچی دەیدی عاشقی دەبوو. نەمزانی دووبڕی هێشتا بارنەکراو بۆ بۆتە فەڕۆخ لەقا و ئەو هەموو دلدارەی هەیە! ئاخری شێخ بابۆ داوای کرد و درا بەو.

دەگەڵ «میرانی سالح بەگ» ئێوارەیەک چووینە سەیری کۆنە قەلای میری ڕەواندز کە لە دیاری کانی بۆتە. قەلایەکی زۆر قایمە؛ بە بەردی زۆر گەورەی ڕەش دامەزراوە کە دیارە بەردەکان بە کۆتان گوێزراونەوە. عەنباراوی گەورەی تێدابوو. کە گەڕاینەوە، بە ناو کۆلانی گونددا هاتین. من سەرکلاوەم لە سەر بوو. منداڵێک دیتمی، زیڕاندی؛ زۆر ترسا. میران گوتی: ئەو فەقیرە هەر بارزانی سەرسووری مل بارکی دیتووە. تۆی بە ورچ زانی؛ بۆیە لێت ترسا!

سازدە پاییز بوو. شەڕ لە جەبهەکان ویستابوو، بەلام ئالقەی موحاسەرە هەر مابوو. بڕیار درا بەرەو سۆران بڕۆینەوە. دەگەڵ ئەحمەد تەوفیق و هەوالانی و میرانی سالح بەگ و دوو پێشمەرگەی کەوتینە ڕێ. شەوێک لە نزیک سنووری ترکان ماین. هێندێکمان چوونە گوندی «زێتێ» کە تورکیەیە. کەوش و پەتووی کولکن و وردە ئەسپابیان کڕیبوو. زۆرم حەسرەت بوو کە سێ دینارم شک نەدەبرد لە پەتووەکان بکڕم. ڕۆژی دوایی کەوتینە ناو سنووری کوردستانی بەردەستی تورکیە و شەش سەعاتێکی برد تا لێی دەرچووین، بەلام تووشی جەندرمە نەبووین. لە ڕێگە وە پێش کەوتم کە تا ئەوانیتر دێن گێوژ بخۆم. لە بن دارە گێوژێک بووم، پلارم تێ دەگرت. پیاوێک دوو کەو بە دەستەوە، کچێکی زۆر جوانی دەگەل بوو؛ لێی پرسیم:

– تۆ بازرگانی؟ کووتالت پێیە؟

گوتم: نا برا! من موشتەری شەکە مێی جوانم!

گەیشتبووە هەوالەکان گوتبووی: ئەوەی پێش کەوتووە شێتە! هیچ وەک چۆدار ناچێ و

دەڵێ شەکە مێ دەکرم!

لە گوندی «کاکلە»وە لە زێ پەڕینەوە و هاتینەوە ناو عەرزی عیراق. شەو لە قەبرستانێکمان خست. یەک دنیا داری وشکی تێدابوو؛ بەلام لە دێکەی نزیکی -کە هێلکە و ماستمان لێ کرین- گوتبوویان داری قەبرستان بسووتێنن، دەمرن! دەگەڵ ئەحمەد تەوفیق بەربووینە داران و ئەوانیتریش غیرەتیان هاتە بەر. ئاگری ئەو شەوە تا بەیانی گڕی بلند بوو. ئەم جار پاش یەک دوو سەعات ڕێ کەوتینە دەشت. ئەحمەد تەوفیق کەسی نەدەگەیشتێ؛ هەر هەیدیشی لێ دەکردین: «دەی خۆش بڕۆن!». گەینە سەر گۆماوێکی زۆر خۆش، چەند دارە بی لە دەورە، سێوەڕەی دەتگوت نێوەڕاست بەهارە. مام عەلی بایەزیدی دەڵێ: «ئاخ! ئێستا گامێش بام و تێرم لەو سێوەڕە خواردبا و لەو گۆمەدا بنووستبام!». زۆرم برسی بوو. ئەحمەد هەر دەیگوت بڕۆن! دەمزانی ئەوانیتریش برسیانە و لەبەر ئەحمە ناوێرن دەنگ بکەن. هەر چۆنێک بوو پێش کەوتم. گەییمە شوانێک:

- کاکە نانت پێیە؟

- نە بە خوا.

- شیر چۆن؟

- کاکە قاپەکەم هێندە پیس و چلکنە کەس بێزی نایە شیری پێ بخواتەوە، ئاویش نییە بیشۆم.

- دە تۆ بۆم بێنە بزانە چۆنم!

لە قاپێکی ڕەشهەڵگەڕاوی موو پێوە نووساودا شیری بۆ هێنام. چاوم قوچاند و یەکسەر بە سەرمەوە نا؛ ئاهێکم هاتەوە بەر. ئەگەر بۆت بڵێم قاپەکە چۆن بوو ئێستا هێڵنجت دێتێ!

ئەحمەد تەوفیق کاوڕێکی قەڵەوی لە کابرای شوان کڕی و پەتمان کرد کە لە کوێ بنەمان گرت، بیکەینە شیو. هەموانی زۆر شەکەت کرد؛ تا لە ناو چەند بیەکدا بنەمان گرت و کاوڕمان سەربڕی و کەوڵمان کرد و بە زگی زۆر برسییەوە چاوەنۆڕی برژاندنین؛ لەپڕ لە پێشمانەوە بوو بە تەقە. شەو بوو گوللەی لایەکی شەڕکەرانمان دەدیت سوور ڕادەخوشین، پیاو لە تەقە کەڕ دەبوو. خەبەر چییە؟

- کورینە ببێتە بەیان تەیارە لە دەشتی «هێرتێ» شرمان دەکا؛ جێگەی خۆشاردنەوەش نییە.

هەر بە پەلە تۆزێک گۆشت هەڵدەپرووزا و قووتمان دەدا. کەوتینە ڕێ. شەوێکی سارد لەو دەشتە وەک مێوژووکە هەڵدەلەرزین. بۆ بەری بەیانی گەیشتینە ناو گوندی «سیدەکان». چووینە ناو دوکانە چۆلێکەوە، ئاگرێکمان کردەوە و ماتەمان هەڵگرت. سبەی خەبەری ئەو شەڕە گەورەی شەومان پرسی، گوتیان جاشەکانی چیای «سەری حەسەن بەگ» بە قەستی تفەنگیان بەرەو یەکتر تەقاندووە. بە دەوڵەتیان گوتووە بارزانی هاتبوونە سەرمان؛ تا فیشەکی زۆر وەرگرن. ئەمەش فێڵی جاشان!

بە ناو گوندەکانی موهاجیراندا سەرکەوتین بۆ «گربیشێ» و بۆ شەو چووینە «ڕۆستێ». سبەی بۆ نیوەڕۆ لە گوندی «گرتگ» بووینە میوانی مەلا وەیسی و پاش نیوەڕۆ بەرەو ڕۆست هاتینەوە. لە قەبرستانێکی سەر ڕێ، دار گێوژێک هەبوو، گێوژی زەردی درشت، دەتگوت بۆ هەتیوی بەر گرتووە:

- های لەو گێوژەم!

مەلا وەیسی گوتی: کاک هەژار! هیچ کەس تا ئێستا نەیوێراوە پووشێکیش لەم قەبرستانە بەرێ؛ دیارە شەخسێکی زۆر تووڕەیە!

- ماموستا ڕاوەستە قسەی حیسابیم هەیە!

ڕووم کردە قسنەکە:

- ئەی شەخس! گێوژەکانت گەیشتوون؛ فەرموو بیانتەکێنە و بیانخۆ! دەنا دەوەرن و دەڕزن. ئەگەر نا ئیجازە بدە من بیانخۆم. خۆ تۆ گولی بەخیل نی، نە خۆت بخۆی و نە بیشیدەی بە کەس!

چووم بە لای گێوژەوە. مەلا و دوو سۆفی هاوڕێی دەڵێن: نەکەی! گوناحە! حەرامە! پێلەقەم لە دار دا، گێوژ داباری. باوەڕ کە مەلا و سۆفی کە گوناحەکەیان بە من کردبوو هیچیان وە بەر من نەهێشت؛ گیرفانیان لێ ئاخنی!

دۆلی گرتگ و ڕۆست -کە گوندی «سمیلان»یشی لێ هەیە- لەبەر باغات وەک بەهەشتە. لە بەفری زستانیشدا سێوە سوورە بە دارانەوە چاو لە پیاو دادەگرن. کەوتوونەتە ملی نزاری حەسارۆست کە بلندتر چیای عیراقە و بە هەموو کێوەکە دەڵێن «هەڵگورد». لەوێوە لێک هەڵبراین. من ڕەگەڵ میرانی سالح بەگ کەوتم کە بچین سەرێک لە ولاتی «خۆشناوەتی» بدەین. ولاتی خۆشناوەتی بە تایبەتی لە پاییزاندا بە سەر میوەدا وێران دەبێ. هەموو دێهاتی - کە یەکجار زۆریشن- پڕە لە هەنار و هەنجیر و هەرمێ و سێو و هەموو بەرێکی دار و هەموو جۆرە ترێیەک. میرانی سالح بەگ لە میرانی خۆشناوی شەقلاوەیە. هەر چەند ڕووت بوو، دەسەلاتی ئاغایەتی و میرایەتی نەبوو، بەلام بیر و بروای میرانەی هەر وەک خۆی بوو. ڕۆژانە پێشمەرگەیەکی دەنارد: بچۆ لە مالی فلان میران بلێ میوانی دەبین! جاری وا بوو میرانی خانەخوێ ڕووت وەک سلق، نانی شەوی نەبوو.

ڕۆژێک بە پێشمەرگەیەکی گوت: شێخ حوسێن هەروو مالی کوێخا حەسەن لە زێوەی، بلێ میران میوانتە! گوتم: میران زۆر عەیبە بۆ ئێمە میوانی کوێخا بین. کۆنە میرانێک نییە لەو نزیکانە بچینە مالی؟! تێنەگەیی گالتە دەکەم، گوتی: نا کاک هەژار! کوێخا حەسەن هەر لە مالە مندا گەورە کراوە و بەخێوم کردیە. وەک مالە خۆمانە.

بە ڕووکاری زێوەدا دەچووین؛ چ دیمەنێک؟... بێنە بەر چاوت بە هەزاران دار هەنار لە ساردی پاییزدا گەلای زەردێکە وەک زێڕی بێخەوش. گەلای مێوی ڕەز سوورە و لە هەناران هالاوە. خودا تابلۆیەکی نەخشاندووە هەموو هونەرمەندی دنیا گێژ دەکا. زۆر وێستام و ڕوانیمە ئەو دیمەنە دلڕفێنە. چووینە مالی کوێخا حەسەن؛ یەکی زیتی قوتی زیرەک؛ دەڵێی لە کونە تفنگی شەیتان دەرچووە! ڕووخۆش؛ قسەخۆش. زۆر عاقل بوو؛ پێم سەیر بوو! هەر دانیشتین سینییەکی مێوژ و کاکلە گوێز لە پێش دانایین، بەشی پەنجا کەسی دەکرد. میران گوتی: دەچمە سەراوێ؛ تا دێمەوە چایەکە ساز بێ! کە ئەو ڕۆیشت، کوێخا بە منی گوت: ئەرێ میران نەیفەرموو کوێخا حەسەن هەتیوی خۆمان بووە؟!

- جا بۆ وا بلێ؟

- کوڕە لوولاکی ئاغا بشکێنە گووسەگی تێدایە؛ سەگم لەو تێرترە. سالێ دە جار دەنێرێ تووتن و میوەی بۆ بنێرم. دەلێ هەتیوی خۆمان بووە؛ لە مالە مە بەخێو کراوە!

شەو زۆر خۆشمان لێ گوزەرا. میران توورەکەیەکی گەورەی تووتنی بۆنداری داگیراو لێ

ساند. بە چەند ماڵە میرانی بێ نانی ترەوە ڕامانبوارد تا گەیشتینە «هیران»، مەرکەزی شێخانی هیران کە لە باتی شێخ پێیان دەڵێن «کاک». سافی شاعیر -کە دەروێشان شیعرەکانی بە دەفەوە دەخوێننەوە- کاکی هیران بوو.

بووینە میوانی شێخ سەبری کە برای میرانی ساڵح بەگ و تیمسارێکی بازنشستە بوو. ماڵی لە هەولێر بوو؛ لە ترسی دەوڵەت بە تەنیا لە حوجرەیەکی هیران دەژیا.

شێخ گوتی: ئێستا شیوێکتان لۆ لێدەنێم زۆر خۆش. گۆشت و ئاوی تەمامە و تڕ و تەوێڵەی کردە ناو شتێک و لە سەر کوورەی دانا و چووە دەر. کە هاتەوە، گوتی: هەوا تەشتۆکەی نایلۆن بوو؛ لە سەر ئاگر هەڵقرچابوو. ببووە تۆپ و چێشت حەبس کرابوو! فڕێمان دا.

«کاک» ئەو دەمە پیرەمێردێک بوو بە ناوی «کاک عەلی»، تا بڵێی پیاوێکی ممبارەک بوو. لەو دێیە کە هەموو دنیای دار و ئاو بوو، شوێنێک بۆ کاک هەیە لە دەوری حەوزێک لە بن سێبەری شۆڕەبییان، کە بە ڕاستی شاعیرانەیە. کاک لە قسەی قۆڕی من خۆشی دەهات. هەموو ئێواران دەبوو بچمە لای.

ڕۆژێک گوتی: وا نۆ ڕۆژ بۆ ڕەمەزان ماوە. هەژار دەبێ مانگی ڕەمەزان لای من بی.

- بە خوا کاکە بمبەخشە من بەڕۆژوو نابم. خۆشم بە تۆ، بە لێدان نادەم!

- بابە بەڕۆژوو مەبە! شەرتە بۆ خۆم نانی بەیانی و نیوەڕۆت بۆ دێنم...

پیرەمێردێکی دیکەی برای کاک بە ناوی «مام نوور» هەبوو، دەموچاو چرچی لووت ئاولاوی شل و شەویق، ئەوەندە قسەخۆش بوو نەبێتەوە. پیاو مردووی لە گۆڕێ با، مام نووری دیبا، دەهاتە پێکەنین. زۆرم قسەی خۆش لێ بیست؛ زۆریشیان بۆ دەگێڕامەوە کە بە داخەوە لە بیرم چوونەوە. دوو سێ شتم لە بیر ماون:

* مام نوور لە ناو ئاغاوەتی دزەیی لە دەشتی هەولێر میوانە. پیاوێکی هیرانی دێ، لێی دەپرسی:

- توو نەگەیوە؟

- بەڵێ قوربان «سەخۆرە» بووە (تازە دەگا).

مام نووری دەڵێ: هەتیو وس بە! ئێستا ئاغایانی دزەیی هەموو هجووم دەبەنە سەر تووی هیران!

* لە خانەقای سەید ئەحمەد لە کەرکووک، مام نووری دەچێتە ئاودەست. دیواری ئاودەستەکان نەوییە و بە حاڵ تا نیوەی لەشی پیاو دادەپۆشن. ئاغایەکی بۆشناغیش دەچێتە ئاودەستی تەنیشتی. مام نووری دەڵێ: بەخێراتی بابە! خەڵکی کوێی؟

جغارەیەکی پێشکەش دەکا و لە سەر دیوارەوە بۆی دادەگیرسێنێ و مل لە چاک و خۆشی و باسی کاسبی و کار دەکەن! بە سەید ئەحمەد دەڵێن دوو شێت لە ئاودەست چەقە و هەرایانە. دەزانێ فیکی مام نوورە.

- مام نوور ئەوە چت کردووە؟

- قوربان بە خودا پیاو شەرم لە میوانی خۆی دەکا نەیدوێنێ و جغارەی نەداتێ!

سەید دەڵێ هەر ئەمڕۆ دیوارەکان بڵند کەن!

* کۆمەڵێک ئاغای دزەیی دەگەڵ مام نوور دەچنە مەلە لە جۆگەی گەورەدا. لیباسی مام نوور دەفڕێنن. تا دەیەوێ دەرکەوێ خۆڵی پێدا دەکەن. مام نوور ماندوو بووە، زمانی کێشاوە و

قاقاش پێدەکەنێ.

- بە چی پێدەکەنێ؟

- خۆم هەر وەک بەرازێک دێتە بەر چاو پەنجا سەگ دەوریان دابێ و دە قوڕ و لیتەی وەردەن!

***

لە ڕۆژی ١٨ی مانگی یازدەی سالی ١٩٦٣ سەلام عارف -کە سەرکۆماری بەعسییەکان بوو- لە بەعسیان هەلگەڕایەوە و دەمی لە پووشی کردن. ئەو دەمە لە هیران بووم. لە پاش پێنج ڕۆژ دەگەل میران - بە لەوەڕ و دێ بە دێ- خۆمان گەیاندە «دۆلە ڕەقە» و بووینە میوانی هەباساغای مامەنداغا. هەباساغا ڕەئیسی عەشیرەتێکی گەورەیە و پتر لە پەنجا گوند مولکی هەبوو. سەرەڕای ئەوەش عەشایری بۆلی و بابۆلی -کە لە لای قەندیل گەرمێن کوێستان دەکەن و یەکجار زۆرن- دە بەر حوکمیدا بوون. هەر لە شاری ڕانیەوە تا گەلالە، ڕەعیەت و ئاغا خۆیان سەر بە هەباساغا دەزانی؛ نیمچە پادشایەک بوو. هەوەلین ئاغای کە ببوە یاریکاری شۆڕش، ئەو بوو؛ بەلام هیچ خووی قۆڕەدەماغی ئاغایانەی نەبوو. زۆری حەز لە گالتە و پێکەنین بوو. هەتا بلێی ڕۆحسووک و خوێنشیرین؛ زەلامێکی زۆر بلندبالای جوانچاک. سەخییەک بوو کە باوکی حاتەمی تەی دەبوو ورتکەی مالی ئەو بچنێتەوە. زۆری میوان بووم، قەت نەمدی لە سەد میوانی کەمتر هەبێ. ڕۆژی وا هەبوو پتر لە دووسەد میوان لە سەر سفرەی ئەو کۆ دەبوونەوە. نەخوێندەوارێکی یەکجار زیرەک و سیاسی بوو. کەچەسیواتێکی کەمی هەبوو. حیزبی شیووعی و پارتی و قولە حیزبیتر هەمووی لێ ڕازی بوون و تاریفیان دەکرد.

جارێک جەلال تالەبانی لێی پرسی: هەباساغا تۆ بە نەخوێندەواری ئەوەندە زیرەک و بەکاری، ئەگەر خوێندەوار بای، چ دەبووی؟

من گوتم: وەک حیکایەتی «سەماشی سۆمرست مۆم» ئێستا مجێوری کلیسا دەبوو!

بە چاوەنۆڕی مەلامستەفا، لە دۆلەڕەقە ماینەوە. میران پەتووە تووکنی تورکیای بە دیاری دایە؛ هەباساغا هەر لە مەجلیسەکە گوتی: کاک هەژار ئەوە لە بۆ تۆ!

گوتم: من نامەوێ.

گوتی: ئاخ لە داخی تۆ وەزگم داوە! هەموو کەس حەتتا مامۆستا گەورەکان شتم لێ دەخوازن. من لە کۆیە پێچت دەدەمێ، ناتەوێ؛ ڕادیۆم پێشکەش کردی نەتەویست؛ پەتووی میرانت ناوێ؛ وا دیارە تۆ لە دلدا شیووعیەکی زۆر غەلیزی؛ دەلێی مالی فئودالی گلاوە!

عەونی یووسفی وەزیری قاسم، هەمزە عەبدوللای کۆنە سەرۆکی پارتی و عوسمانی ڕەئیسی پێشووی حیزبی شیووعی میوانی بوون و ماوەیەک بوو دایانکوتابوو. ڕۆژێک عەونی گوتی: کاکە باس بلێ کراسێکم بۆ بێنن!

- کوا کراست دڕاوە؟

عەونی کۆت و جلیقەی داکەند. کراسێکی شڕی چلکنی نیشانی مەجلیس دا.

- کاک عەونی! خانوویێکت لە هەولێر هەیە، پێنج هەزار دینارت دەدەمێ بمدەیە!

- هەر چەند دەولەت داگیری کردووە بەلام بە دە هەزاریشی نادەم.

- ماینێکت هەیە، پێنسەد دینارت دەدەمێ بمدەیە.

- حای! بە خوا موشتەری هەزار دیناری هەیە!

- پۆله سپیندارت له گەلاله هەن، به چوار هەزار دینار لێت دەکڕم نەغد و تۆ دینارێکی لێ بده به کراس!

- قسەی هیچ! سپیندارەکانم بایی دوازده هەزار دینارن!

گوتی: جا ئەو جار موستەحەقی!... هەڕوون دوو کراسی له بۆ بێنن!

گلۆسه جگەرەی جمهووری له پێش بوو، بەشی میوانانی لێ دەدا. هەمزه داوای کرد، پاکەتی بۆ درێژ کرد. هەمزه دەستی بۆ دەبرد، دەستی دەکێشاوه و پێی پێدەکەنی! تاوێکی مشک و پشیلەی پێ کرد، ئەو سا دایه. سەرم برده بن گوێی: تازه تێدەگەم چۆنت ئەو قوڕه دەماغانه وا ڕام کردووه. دەتەویست به ڕادیۆ و پەتوو، ئەو دەردەش به سەر من بێنی! زۆر پێکەنی.

زۆر دەگەڵ من گەرمی گرتبوو. پێکەوه دەچووینه ڕاوێ. شەوانه میوانی هەر گوندێک دەبووین له مزگەوت دەنووستین. دەگەڵ ڕەعیەتان وەک برا چووکه دەجوولا و دەدوا.

ڕۆژێک به دووی کەروێشکا ئەسپمان تاو دابوو. ئەسپەکەی من -که ئەویش ئی هەباساغا بوو- ویستی له کەندالێک باز دا، به ڕوودا هات و بەر لەوه بکەوێ خۆم هەڵداشته قەراغ کەند و جووت پێ چەقیم. هەباساغا پێی سەیر بوو؛ دەیگوت: من تۆم به شارستانی خاویلکه دەناسی که ناوێری سواری کەریش بی؛ بەلام هەرچی بیرت لێ دەکەمەوه وا دەرناچێ!

شەوێک له گوندێکی پشت ڕانیه بووین، چوار ئاغای پژدەری -یەکیان جوانمێراغای ناو بوو- هاتن و کاریان به هەباساغا بوو. شەو که ڕاکشابوون، هەباساغا له خەوی هەستاندم و گوتی: با قسەی قۆڕ بکەین! حەمید عوسمانیشی ڕاست کردەوه، ناردی چوار مریشکان ببرژێنن. قسەی قۆڕمان دەکرد و دەحیلکاینەوه. ئاغای پژدەری که به قەلانگیش گوویان ناگاته دەم! به تووڕەیی سەریان هەڵێنا، بزانن کام بێشەرمه خەوی لێ تێک داون؛ که هەباساغایان دی خۆیان مات کردەوه.

گوتم: هەباساغا، ئێستا له بەر خۆیانەوه دەڵێن هەباسی مامەنداغای سەگباب به ڕەفیقایەتی سەر ڕووتی حیزبی شارستانی، پیاوەتی خۆی له دەست داوه! ئێمەش که کارمان کەوتۆته ئەو، هەم ئابڕوومان دەچێ، هەم لەوانەشه ئەو شەلاتییه بۆمان پێک نەهێنێ!

پیره ئەرمەنییەکی فەقیر له سابلاغ، کار و کاسبی ڕەژی دابێژتن بوو. گوتیان «تلیش» موسولمان به! پوولت بۆ کۆ دەکەینەوه، خانووت بۆ دەکڕین، ژنت بۆ دێنین. هەر که شادەوئیمانی هێنا، سوننەتیان کرد. بەلام ژن و ماڵ و خانوو نەبوو. تلیش زۆر به کوڵ له سووچی دوکانەکەی دەگریا، دەیگوت: «کیرەکەشم چوو، دینەکەشم چوو!».

هەباساغا -که زۆر پێکەنی- گوتی: ده جا شەرته کارەکەشیان بۆ نەکەم تا تەواو ببنه تلیش!

شەو بوو؛ ده سوار بووین. کابرایەک له کۆخێکەوه -که تەنیا ماڵی له چۆڵ بوو- هەرای کرد:

- هەباساغا دابەزه! قاورمەم هەیه.

دابەزین. قاورمەی کابرامان خەلاس کرد. له ڕێ گوتم: ئاخر ئەو بەستەزمانه قاورمەی ساڵی له کیس چوو، نەدەبوایه لا دەی.

گوتی: نا به سەری تۆ، لام نەدابا دڵی دێشا!

چەند ڕۆژێک دوای ئەوه، کابرا له دۆلەڕەقه بوو. هەباساغا گوتی:

- فلان تۆ ئەو ساڵ چەلتووکت لێ نەکڕیوم، دیاره دەستت قوچاندووه.

- ئاغا جارێ پارەم بۆ هەڵنەسووڕاوه.

لە کاغەزێک شتێکی نووسی و دای بە نۆکەرێکی. نووسیبووی شازدە تەنەکە برینجی بدەنێ و هەقەکەی گەیوە!

ڕۆژێک لە دۆلەڕەقە چوومە ڕانیە. شەو لە ماڵی مام قادر باغەوان بووم. سبەی ویستم بە پێ بچمەوە دۆلەڕەقە؛ چەمەدانێکم پێ بوو. مام قادر گوتی: بازاڕی دارفرۆشان هەموو خەڵکی دۆلەڕەقەن. چەمەدانەکەت بۆ بەرنەوە؛ خۆت بە پێ بڕۆ.

چوومە مەیدانەکە، لە کابرایەکم پرسی: کاکە! خەڵکی دۆلەڕەقە نیت؟

- نا!

- ئەدی کەسی دۆلەڕەقەیی ناناسی؟

- بەڵێ دەیانناسم؛ بەڵام کەس ئەمڕۆ نەهاتووە.

گەڕامەوە. بانگی کردم:

- خەڵکی دۆلەڕەقەت بۆ چییە؟

- جا کە لێرە نین هیچ.

- ئاخر بڵێ.

- گوتم: جانتاکەم بۆ بەرنەوە.

- خەنجەرت پێیە؟

- بۆچیتە؟

- دە ورگمی ڕاکە بزانە خوێنی لێ دێ؟! کوڕە هەژدە ڕۆژە لە دۆلەڕەقە کێ چات بۆ دادەنێ؟ کێ جێت بۆ ڕادەخا؟ کێ ئاوت بۆ دێنێ؟ کوێرا بە ڕۆژێک نامناسیەوە؟!

- ئای ببەخشە، ڕاست دەکەی! چۆنی؟ چاکی؟!

- دەی ناوم چییە؟

- ها، چی، ببەخشە؟

- برایم!

- ئای کاک برایم گیان چۆنی؟!

- برایم نا و قوزەلقورت! دەتەوێ ئێسترت بدەمێ و دەتەوێ جانتات بۆ بەرمەوە.

چەمەدانم دایە و دەگەڵ جەعفەری کوڕی مەنافی کەریمی سابلاغی -کە زەلامێکی بەهەیکەل بوو- بە پێ بەرەو دۆلەڕەقە چووین. شەو داهات؛ گوتم با بچینە پلنگان.

- ئاخر سەگ هەیە و من لە سەگ دەترسم.

- کاکە من سەگت لێ دەردەکەم.

خۆمان لە سەگان خەلاس کرد و چووینە ماڵی مەلاعوسمان. قیرەی مریشکم بیست، گوتم هەرچی هەتانە ئەوە دەخۆین و نەمهێشت مریشک سەر ببڕن. دۆکلیوی کەشکانی سەر بە ڕۆنیان دەگەڵ هێلکە و ڕۆن هێنا.

- جەعفەر تۆ کامیان هەڵدەگری؟

- دۆکلیو ناخۆم.

نزیک هەژدە ساڵ بوو دۆکلیوی کەشکم نەخواردبوو. ئەوەندەم خوارد شەو خەوم لێ نەدەکەوت.

جەلال تاڵەبانی هاتە دۆلەڕەقە کە چاوەنۆڕ بێ تا چاوی بە مەلامستەفا دەکەوێ. لە



سەربانێکی گوند هاتوچۆ و قسەمان دەکرد. دەستی پێ کرد کە بارزانی لە حیزبایەتی توورەیە و دوژمنی تەنزیمە، چەند کەس لە هەوالانی حیزبی لە لای گەلالە دەرکردووە. بە دوور و درێژی حیکایەتی کارە خراپەکانی حیزبم بۆ گێڕاوە کە دڵی بارزانی ئێشاندووە و هەموو گوناهێکیش لە برایم ئەحمەد دەزانێ. ئەگەر برایم ئەحمەد بە ڕەئیسی حیزب نەمێنێ و هیچ نەبێ وەک مستەفا کەماڵ ناوی بنێن باوکی کورد و لە ماڵە خۆی دانیشێ، بارزانی لە یاریدەدانی حیزب دریغ ناکا؛ قەول دەدەم حیزب بە تۆ دەسپێرێ کە تۆی زۆر خۆش دەوێ.

گوتی: ئەگەر ڕاست بکەی بە شەرەفم من هەوەڵ کەس دەبم کە دژی برایم ئالا هەڵکا و لە حیزبی لا با. دەبێ شەخسێک -هەرکێ بێ- بکرێتە قوربانی دە پێناوی مەسلەحەتی گشتیدا...

بارزانی گەیشتە جێ. شەوێک دوور و درێژ باسی هاتن و قسەی خۆم و جەلالم بۆ کرد. گوتی: من موافیقم برایم لادەن، جەلال لە جێگەی ئەو بێ و بە دڵ یاریدەی حیزبەکە بدەم.

جەلال بە دڵخۆشی و قەولی مەردانە ڕۆیشت؛ بەلام نەک هەر هیچی لەو بارەوە نەکرد، بگرە لە دژایەتی بارزانی کۆشاتر بوو. وەباڵ بەستۆی خەڵک، دەیانگوت جەلال عاشقی «هێرۆ»ی کچی برایمە و هێرۆ حەزی لێ ناکا. دیارە برایم قەولێکی پێ داوە. لە دواییشدا ئەمە وە ڕاست گەڕا. برایم هەڕەشەی لە هێرۆ کردبوو: ئەگەر مێرد بە جەلال نەکەی خۆم دەکوژم. ئێستا چەند ساڵە جەلال زاوا زێڕینەی برایمە...

هەباساغا تکای بۆ هاشم عەقراوی کرد کە لە خۆڕا بنکەی بێتواتەی چۆڵ کردبوو؛ هەڵاتبوو. بارزانی عەفووی کرد.

«سەید عەزیزی شەمزینی» نامەیەکی بۆ «حاجی محەممەدی شێخ ڕەشید» -کە دوژمنی سەرسەختمان بوو- نووسیبوو: «تۆ وەرە با پێکەوە مەلامستەفا لە ناو بەرین و تۆ سەرۆکمان بە!...». کاغەز گیرا و سەید عەزیز و چەند کەسێکی دیکەی وەک عەلی حەمدی گیران. دوایی لەبەر خاتری سەید عەبدوللا ئەفەندی، سەید عەزیز بەردرا. عەلی حەمدی کوژرا.

شەوێک دەگەڵ مەلا باقی و ئەحمەد تەوفیق لە «سپیاوێ» بووین کە گوندێکی چکۆلەیە لە دۆڵەڕەقە. مەلا باقی هەر شەوی زۆر مابوو چای لێنا. خانەخوێکەمان (کوێخا ڕەسوو) شێتۆکەیەک بوو:

- مەلا باقی ئەوە چییە دەیخۆیەوە؟

- هەهوو چەند فزوولی! دەرمانە زگە و دوکتور بۆی نووسیوم!

- دە بە خوا منیش زگ ئێشەمە، لۆ منیش تێکە!

- زۆر بێسەلیقەی، دەرمانی نەخۆشێک بۆ یەکی‌تر نابێ!

- بە خودا دەبێ و دەبێ بۆم تێکەی!

ئەحمەد گوتی: مەلا باقی گەیشتوویە گون ڕەشی خۆت! بۆی تێکە تا بەو بەفر و سەرمایە دەری نەکردووین!

کوێخا دوانی خواردەوە و هەر دەیگوت: دەڵێی چای خۆمانە!

پێنجسەد چەکدارێک دەگەڵ بارزانی بوو ڕۆژانەش خێزەرەی میوان بۆ دیتنی بارزانی نەدەپساوە. گۆشت و پلاو و نوێنی هەباساغا بنەی نەدەهات و قەت نەمدی ڕووی گرژ بێ. زۆر ماینەوە و لەوێوە بەرەو ڕانیە هاتین. مەلامستەفا مەدرەسەی سەنگەسەری کردە بنکەی خۆی. گوتیان خەڵکی ئەم گوندە زۆر برسین. بۆیان کەوتە سواڵی گەنم؛ زۆر زوو لە برسایەتی ڕزگاری



کردن.

له بەغداوه پیاوی دەوڵەت به سەرۆکایەتی حاجی عەبدوڕەزاق ناوێکی ئەستانداری مووسڵ هاتنه ڕانیه بۆ وتووێژ کردن. سەرەتای گفتوگۆ دامەزرا و درێژەی کێشا و حیزبیش له وتووێژدا بەشدار بوون و له ئەنجامدا گەینه بڕیاری ئاگربەس و دەوڵەت قەولی زۆر شتی دا؛ جگه له خودموختاری. بەیانییەک له هەر دوو لا بلاو کرایەوه و بڕیار درا بارزانی و سەرانی شۆڕش کۆ بنەوه و بڕیار بدەن که بچنه بەغدا و حەقی خۆیان داوا کەن و بیخەینه سەر قاقەز و مۆر کرێ.

من که ماموستای حیزبی نەبووم و له وتووێژی سیاسیدا بەشم نەبوو، نازانم درێژەی قسەکان چۆن بوون؛ تەنیا چەند شتێکم لەو بارەوه له بیره که خۆم ئاگاداری بووم: شەوێک له گوندی «دووگۆمان» کۆبوونەوەیەکی گەوره له مزگەوت پێک هاتبوو. قسه لەوه دەکرا که کێ بچێته بەغدا؟ چەند کەس بن؟ کێ دەچێ و کێ ناوێرێ بچێ؟ یازده کەس بن یان نۆ؟... من له خوار مەجلیسەوه هەڵمدایه:

- پێشمەرگه سەربازه، هەر کەستان پێ باش بوو ناتوانێ بلێ دەچم یان ناچم. یازده و نۆ و حەوت له حیسابدا فەرقێکی وای نییه، ئێوه ڕوونی کەنەوه چیتان له دەوڵەت دەوێ، داوای چی بکەن و له سەر چی پێک بێن. مەسەلەن داوای نیوەی نەوتی کەرکووک بکرێ، بەلام به چوار یەکی ڕازی بن و لەوه نەیەنه خوار. هەروەها هێزی چەکدار و هەموو شتیتر که خۆمان بۆ به کوشت داوه...

کاک برایم گوتی: ئەوەی تۆ دەڵێی دەبێ ده پێشدا به گشتی و به تەفسیل هەدەفی حیزب ڕوون کەینەوه و ئەمەش هیچ نەبێ سێ مانگ وەختی دەوێ و دەو پەلەپەلەدا ناکرێ.

گوتم: عەجایب دەمێنم له حیزبێکی سیاسی که چەند ساله کار دەکا و ئەوه سێ ساله شەڕیەتی، هێشتا ئامانجی خۆی دیار نەکردبێ و نەزانێ تەواو چی دەوێ...

بارزانی دەمەتەقەکەمانی بڕی، گوتی: یازده بێ و نۆ بێ بڕوا ناکەم هیچیان له دەست بێ. دەی قسه بکەن کێ بچێ.

«دووگۆمان» دێیەکی خێلەکیان بوو که هەر له پاییزەوه ئاوەدان و له بەهارا چۆل دەکرا. ماڵەکانی هەمووی زۆر زەلام و به وشکه بەرد داندراوی وەک یەک دەچن. دەگەڵ میرانی ساڵح بەگ و چەند برادەرێک له ماڵێک دامەزرێنرابووین. بەیانی که له ماڵ دەرچووم، بۆ ئەوه له گەڕانەوەدا لێم تێک نەچێ، قیتایەکم له سەربانێ کرده نیشانه. شەو درەنگ که ویستمان له کن بارزانی هەستین، میران گوتی: پێشمەرگەکانم دەوێن بمبەنەوه ماڵەکە.

- بێ قەزا بی منت دەگەڵم، شارەزام!

ڕۆیشتین، نیشانەم نەدیتەوه. سەرم به حەسارێکدا کرد و له دەرگای ژوورەوەمدا، گوتیان ئێمه هیچ میوانمان نییه.

- ئاخر ئەدی ماڵه مام نەبی له کوێیه؟

- مام نەبی لەم دێیەدا نییه!

میران تووڕه ببوو: ئابڕووت بردووم!

میران بەو تاریکه کەس نەیدیتووی، دەنگیشت نەکرد تا بتناسن و له ڕۆژنامەدا بنووسن ڕێگەی لێ تێک چووبوو!

دیسان گەڕاین. ڕووناکییەکم له ملە گۆزەیەکەوه دیت که ده دیوار گیرابوو، ڕوانیم

هەواڵەکانمان بوون. بە خاوەن ماڵەکەم گوت: ئەرێ من نیشانەم کردبوو، بۆ نەمابوو؟
- کاکە نیشانە چی؟ بەیانی من بووم فەرەنجیم دە خۆمەوە پێچابوو، سەیری حەیوانانم دەکرد!
- باشە ئەدی ئێرە ماڵە مام نەبی نییە؟
هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا: ئەو کوڕە یەک مانگیلەمان ناوی نەبییە، چۆنە تۆ ناوی ئێمەت لە بیر چووە و ئەوەت لە بیر ماوە؟!
- کاکە گیان زیرەکییەکەم سەر دەکا!
ئاوی خەڵکی گوند و گاڕان و خۆشمان (میوانەکان) گۆماوێک لە بارانی داوێستاو بوو؛ کەلاکە کەرێکی تۆپیویشی تێدا بوو.
شەوێک لە «گربداغ» کۆ ببووینەوە. مەلامستەفا قسەی کرد و زۆر بە گژ حیزبی پارتیدا چوو، کەس لە مامۆستایان قسەیان نەکرد. لە خۆمەوە خۆم تێخست، گوتم:
- شتێکی کە مەعلوومە حیزب بۆ سەرکردایەتی و شارەزاکردنی گەل لە خەباتی ئازادیخوازیدا زۆر لازمە و بە بێحیزبێکی ڕێکوپێک هیچ کار بەڕێوە ناچێ. ئەگەر بارزانی لە حیزبی پارتی و سەرکردەکانی تووڕەیە، با بیانگۆڕێ؛ بەڵام حیزبێک هەر دەبێ دامەزرێ. با نێوی پارتی نەبێ؛ حیزبی تەنەکە بێ! ناو شەرت نییە؛ ناوەڕۆک پێویستە...
کاکە زیاداغا هەستا و تەسدیقی بیر و بڕوای منی کرد. بیستم کە مەلامستەفا لە دوایە بە کاکە زیادی گوتبوو: هەژار فێری کردی ئەم قسانە بکەی و لە سەر بڕایم و جەلال وە جواب بێی.
حاشای لەوە کردبوو، گوتبووی قسەکانیم بە باش زانی و تەسدیقم کرد.
کە لەو مەجلیسە دەرچووین، سەلیم فەخری -کە ئەفسەرێکی ڕوتبە سەروانی عەرەب بوو دەگەڵ شۆڕش کەوتبوو؛ کوردیش زۆر باش فێر ببوو؛ پێمان دەگوت کاکە حەمە- گوتی: بە شەرەفم پیاوی وەک تۆ لە حەق گوتن ئازاترم نەدیوە. ئەوانە کەسیان نەیانوێرا دیفاعێک بکەن؛ تۆ وا بە دەم بارزانیدا چوویەوە...
جەلال کە دەگەڵمان بوو گوتی: کاک هەژار! بە ڕاستی پیاوانە دیفاعت لە حیزبی خۆت کرد؛ ئێمە بە خۆڕایی تۆمان بە دژی خۆمان دەزانی.
گوتم: مام جەلال! ئێستاش حیزبی خۆم نییە؛ چم بە چاک زانی گوتم. ناشمەوێ کەس مەمنوونم بێ...
شەوێک لە «بەردەسپیان»ی لای قەڵادزە دیسان کۆ بوونەوە. ئێستا نازانم قسێکی چۆن بڵاو کرابۆوە کە دژی بارزانی و شۆڕشەکەی بوو؛ مەعلوومیش بوو چ کەسانێک بڵاویان کردۆتەوە.
بارزانی ئەو شەوە زۆر تووڕە بوو؛ فەرمووی: دەبێ ئەو کەسەی ئەو قسەی بڵاو کردۆتەوە پەیدای کەن و جەزای بدەن.
گوتم: قوربان ئەگەر بۆت پەیدا کەم قەول دەدەی بیکوژی؟
- کێیە؟ ئەگەر دەیناسی بۆ نالێی؟
- من هەژار ئەم قسەم بۆیە هەڵبەست تۆ تاقی کەمەوە. هەر کەس خراپەت دەگەڵ دەکا گورجێ عەفووی دەکەی. خراپی وامان لێ پەیدا دەبێ سەد جار ئیعدام کرێ تۆ خەڵاتی دەکەی! بەڵێ منم گوناهبارەکە. دە بفەرموو با بمبەن لە سەر بەفر و دوو گوللەم پێوە نێن،

فێری تەنبێ کردنی خاینان ببی!

گوتی: تۆ ئەمشەو زۆر تووڕەی؛ چیتر لە سەر ئەو باسە ناڕۆم.

ڕۆژێک لە گوندی «سارکێ» لای بارزانی بووم. ڕادیۆ باسی ئاغایانێکی لای دهۆکی دەکرد کە چاویان بە تاهیر یەحیای سەرۆک وەزیر کەوتووە و بوونە جاشی دەوڵەت. ناوی غازی حاجی مەلۆ، عەبدولواحیدی برای و چەند کەسێکی گوت. سەرم بردە بن گوێی هەباساغا گوتم:

- برادەرە خۆشەویستەکەی مەلامستەفاش (مەحمووداغای چەمانکێ) ماوە؛ گوێ بگرە!

بارزانی پرسی: چییە؟

گوتی: قوربان قسەی خۆمانە.

لە پڕ ڕادیۆ گوتی مەحمووداغای چەمانکێ قسە دەکا. تاهیر یەحیا گوتی: جا بتبینم چۆن بە گژ ئەو سەرکەشانەدا دەچی و چۆنیان دەترسێنی.

هەباساغا گوتی: هەژار باسی ئەم پیاوەی دەکرد کە لای وا بووە جاشە و تۆ هەر پێت پیاوی باش بووە.

ئەوانە زۆریان خراپە کرد. لە ئاخریدا مەحمووداغا کوڕێکی کوژرا، ماڵی سووتا و هاتەوە بەر دەستمان و تۆبەی کرد. غازیش چاوێکی بە گوللە کوێر کرا و ئەویش هەر هاتەوە و خۆی کردەوە پێشمەرگە.

حیزب بڵاوی کردبۆوە کە بارزانی کوردستانی بە چەند سندووق پرتەقاڵ و چەند کراسێکی دیاری عەبدوڕەزاقی وتوویژکەر فرۆشت. وای لێ هاتبوو ئەگەر پارەمان دەدا بە دوکاندارێک دەیگوت بۆنی پرتەقاڵی لێ دێ! بە ڕاستی منیش ئیمزای ئەو ئاگربەسەم زۆر لا گران بوو. ڕۆژێک لە سەنگەر دەگەڵ مەلامستەفا لێمان بوو بە کێشە. گوڕە وای لێ هات کە حەرەسی بارزانی هاتە ژوور؛ وەیزانی شەڕی بە ڕاستە. بارزانی بە حەرەسەکەی گوت: بچۆ دەر!

گوتم: کاکە! تۆ زۆر ساڵت زەحمەت کێشاوە؛ بە پاڵەوانی ڕێگەی ئازادی کورد ناسراوی؛ پیر بووی. زۆر حەیفت کرد ئەو ئیمزایەت کرد. ئەگەر بتگوتایە بیست ملیۆن دینارم حەقی ئیمزا کردن دەوێ، دەیاندایەی. من چاوەنۆڕ بووم ئەگەر نەسلی دوای ئێمە پرسیان ڕێگەی ئازادی بە کوێدایە؟ لە عیراق جێ قەبری تۆی نیشان دەن و لە تورکیە قەبری شێخ سەعید و لە ئێران قەبری قازی محەممەد. قەبرتان نیشانگەی ڕێگەی ئازادیخوازان بێ؛ نەک بچێ ئیمزای ئاگربەسێکی وا بکەی کە خەڵک گاڵتەی پێ بکا و بڵێن کوردستانی فرۆشتووە...

لە تووڕەییان گوتی: کوردستانی چی؟

گوتم: کوردستانی هەموو شت. من و هەزارانی وەک من بۆیە تۆ وەک بت دەپەرستین کە خەمخۆری کوردستانی. وەک لە قورعاندا دەڵێ: لە ئێستاوە جیایی نێوان من و تۆیە؛ خواحافیز! هەر ئەمڕۆ دەڕۆمەوە بەغدایە و فەقیری خۆم دەکەم...

دەرکەوتم؛ لە حیرسانیش دەگریام... سواری جیپێکی کرێ بووم و چوومە ماڵە مام قادری باغەوان لە ڕانیە. سەعاتێک شەوی مابوو، لە دەرگایان دا. گوتیان هەژار وەرە کارمان پێتە. دوو چەکداری بارزانی بوون. خواحافیزی یەکجاریم لە ماڵە مام قادر کرد و لێم ڕوون بوو لە سەر ئەم بێ ئەدەبییەی دوێنێ گوللەبارانم دەکەن: گەیشتینە پشت ڕانیە. چوار جیپ لە دووی یەک وێستابوون؛ مەلامستەفا وێستابوو. گوتی: هەژار تۆ لەگەڵ جێپی مەلا برایم سوار بە! چووینە «سەروچاوە» بووینە میوانی خێوەتی «ئەحمەد شاباز». پاش نانی نیوەڕۆ گوتی: حەرەس بە

جیپەکان بڕۆنەوە دۆڵەڕەقە، ئەسپی من زین کەن و ئێستره شینیش بۆ هەژار زین کەن! ئێمە بە سواری دێین.

لە ڕێگە تاوێکی چاک هیچ دەنگی نەکرد. لەپڕ بێدەنگی شکاند:

- هەژار تۆ هەر خۆت بە کورد مەزانە! زۆر پیاوی وا ماون کە گیانیان بە قوربانی ئازادی کوردستان بکەن. من لە تۆ دڵسۆزترم؛ چۆن بەجێم دێلی و دەڕۆی و دەڵێی «هذا فراق بینی و بینک؟» قەرارمان وا نەبوو «لە سەر زوێلە چەرم» بێ؟ لە بیرت چۆتەوە؟ هەژار تۆ نازانی! وەختێ هاتمە سەنگەسەر، چەند کەسێکم نارد لە حالی خەڵک بپرسن. تەنیا لە ژاراوە یەک تەنەکە گەنم لە ماڵێکدا هەبوو؛ کەسیتر نانی دوو ڕۆژی شک نەدەبرد. بەر لەوە شەڕ لە بارزان بوەستێ، مردوو لە مێرگەسوور لە برسان مردووە، کەس لە برسان هێزی نەبووە بینێژێ. من دەبوو نان بۆ ئەو هەموو برسیانە پەیدا کەم. ئیمزام کرد و گەنم و پارەی زۆریشم ساند و لە ئازادی کوردستانیش واز ناهێنم، خەم مەخۆ!

ئەمجار کردیە گاڵتە و گەپ، گوتی: چۆن سوارێکم؟

- وەباڵ بەستۆم زۆر سوارێکی خراپی، هەر لێی نازانی!

- بۆ؟

- خۆت بە سەر زینەوە کووڕ کردۆتەوە و ئەسپت هەزار دینار دێنێ، وەرە من بە ئێستره شین و تۆ بەو ئەسپەت گرێوە غار بکەین!

- نایکەم... دەی ئەو ڕۆژە بە عەرەبی قسەم دەگەڵ ڕۆژنامەنووسانی میسری دەکرد بۆچی لە بەر خۆتەوە بزەت دەهاتێ؟ وا دیارە پێت وایە عەرەبی نازانم؟ لە تۆی باشتر دەزانم.

- قوربان عەرەبی دەزانی؛ بەڵام لە سەر دەستووری نەحوی ناڵێی!

- جا نەحو چییە؟

- چۆن چییە؟ پیاو بچێتە ماڵێک و بڵێ لە دیوار باز دەدەم، دەرگا چییە؟! چۆن دەبێ؟ نەحو دەرگای عەرەبییە. جار-جارەش کوردی تێکەڵ بە عارەبیەکەت دەکەی. هەموو کەس دەزانێ حەرب یانی شەڕ؛ تۆ لە بیرت چووبوو، هەر دەتفەرموو شەڕا...

بەو وردە گاڵتانەوە چووینە دۆڵەڕەقە و گەشتێکمان بە لای بێتواتە و دیهاتیتردا کرد و هاتینەوە سەنگەسەر.

زۆرتری وەختم لە قەلادزە ڕادەبرد. دەگەڵ مستەفا و کاوە ببوومە هاومەنزڵ. خاوەن مەنزڵەکەی ناوی ئەحمەد هەرمێ بوو؛ گوتی: من هاتمە کۆمەڵەی سابلاغ و بوومە پێشمەرگە و لە سەربازخانە دەژیام. ڕۆژێک گوتیان نەیروو (لەشکری ئێران) دێتەوە. بەیانی کە وە خەبەر هاتم دیتم سابلاغییەکان هەموویان لێم چووبوونە سەر ڕەشی هەوەڵێ! هەر ئەمن قوت لەو نێوە مابووم. بە خوا منیش ناچار هەڵاتم و هاتمەوە عیراق!

ئەحمەد تەوفیق و فایق موعینی و جەماعەتیان لە مەنزڵێکی دیکە بوون و هەمیشە هاتوچۆمان هەبوو. زۆر جاریش سەرم لە بنکەی مامۆستایانی مەکتەبی سیاسی دەدا. عەبدوڵڵا عەلی -کە باسم کرد و یەخەی لە دۆستایەتیمدا دڕی- گلەی لێکردم کە بۆ ناچم سەری ماڵی نادەم؟

- کاکە عەولا! کورد دەڵێ «نان ئەگەر لەت بوو یەکتر ناگرێتەوە»...

ڕۆژێک دەگەڵ مەلا شوکور مستەفا بە ڕێدا بەرەو هەولێر دەهاتین، گوتی: عەبدوڵڵا

کانیمارانی دەڵێ هەژار زۆر بێوەفایە! گوتم: کاکە تۆ خوێندەواری! توخوا پێم بڵێ وەفا چییە و بە چی دەڵێن؟ مات بوو، گوتی: ئابڕووی خۆشمی تێدا دەچێ؛ کە تۆ ئەو هەموو چاکەت دەگەڵ کردم و لە بیرم نەما...

میرزا برایمی چاوشینی سابلاغی بە شەو حیکایەتی ئەسکەندەرنامەی لە قاوەخانە دەگوت. بە ڕۆژ ئیعلاناتی حیزبی بە دەنگ بۆ خەڵک دەخوێندەوە. لە سابلاغیان و هەموو ئێرانیان زۆر دوورەپەرێز بوو. ڕۆژێک ڕەحمانە شێتی جەلیل کەلەباب -کە هاوشاری کۆنی میرزا برایم بوو- دەچێ سلاوی لێ دەکا و دەڵێ: ئاغا میرزا برایم! تۆ خۆشەویستی پێشەوا بووی؛ چۆن قبووڵ دەکەی حیزب بتکاتە زوڕنا!

- بڕۆ سەگباب! نابێ هیچ سابلاغییەک بە لامەوە بێ!

شەوێ چەندێک لە سابلاغییەکان چووبوونە قاوەخانەی «سەید نەسیم» کە گوێ لە حیکایەت بگرن. میرزا برایم -کە ئەسکەندەری لە قەلایەکدا بە گرتن داوە- داوای چای کردووە، نەفەسێک بدا؛ لە دیتنی ئەو سابلاغییانەش دڵی خورتە. پاش چایەکە دەڵێ:

- جا ئەگەر حەزرەتی ئەسکەندەریان گا!...

خەڵک پێدەکەنن، دەڵێ: تا ئەو هەتیوانە دەر نەکەن بۆتان ناڵێم!

ڕۆژێک لە قاوەخانەی قەلادزە، مامۆستا تەوفیق وردی -کە زۆر چەور و چلێک و چلکن بوو- بۆی گێرامەوە: لە بەغدا لە کار دەریان کردم. چوومە وەزارەتی ئامووزش و پەروەرش شکایەتم کرد. معاونی وەزیر گوتی: ڕەنگە تۆ وەزیری دەریایی بارزانی بی!

گوتم: کاکە وردی! سیامەند و خەجت کردنە ئەرمەنی، دەنگمان نەکرد. چۆن بە سەفەرێکی تاران بۆ لای حیزبی توودە -کە ژنەکەت لە سەر دانا- وا فێری فارسی بووی کە نووسراوەی ماکسیم گورکی لە فارسییەوە بکەیە عەرەبی؟!

- نا کاک هەژار تۆ غەرەتی! فارسی زۆر باش فێر بوویمە!

دەچووموە مەنزڵ، وردی بە غار بانگم دەکا:

- کاکە ئەرێ بە فارسی «دیشب» مانای چییە؟!

- یانی دوێشەو!...

ڕەسووی وسێنی سابلاغی بوو، ماڵی چووبووە کۆیە. دوو کوڕی بوو کە یەکیان دڵشادی ناو بوو. لە پاش سێهەمی ناوەنجی، چووبووە دارولموعەلمینی موقەدیماتی ببوە موعەلیم. لە پاش بیستی شەهریوەر هاتبوونەوە سابلاغ . دلشاد ڕەسووڵی -کە لە عیراقی خوێندبوو- لە نووسین و خوێندنەوەی کوردیدا زۆر لە سەر بوو؛ لە کۆمەڵی دیمۆکراتی سابلاغ زۆر لە ڕوو بوو. لە ڕێی ورمێ دەگەڵ زەبیحی و قاسمی قادری گیرا و برایە حەبسی تاران و لە پاش سەرکەوتنی پیشەوەری بەردرا و لە سابلاغ بەرگی ئەفسەری دە بەر کرا. مەقالاتی جوانی دەنووسی؛ سیوادی عەرەبیشی زۆر باش بوو. تۆزێک داوێن پیس و مەشرووبی بوو. شەوێک زۆر بە سەرخۆشی هاتە ماڵمان لە سابلاغ . ویستی بڕوا، گیرفانی گەڕام نەوەک بە سەرخۆشی دزی لێبکەن. وەرەقەیەکم بەر دەست هات کە پووڵێکی لە سەر حیزب جەعل کردبوو. حیزب بەخشی. دەگەڵ زەبیحی و سەید ئەحمەدی سەید تەها ڕای کرد بۆ عیراق. چونکە عیراقی بوو نەیانگرت و هاتەوە کۆیە. حیزبی پارتی لێی دڕدۆنگ بوو؛ لە قەلادزە ڕۆژێک گوتیان مامۆستاکان وان لە دەعوەتی دڵشاد. ئیتر دەگەڵیا ئاشت بوونەوە و برایەکی عەزیز بووا تێگەیشتم کە گۆشت

قەلەموونە و پلاو ئەگەر هەبێ، زۆر دوژمنت بۆ دەکا بە دۆست...

وەکیلی شێخ حوسێن بوسکێنی بوو کە ملیۆنێرێکی وەجاخکوێر بوو. دەبووە وەکیلی تووتن فرۆشتنی پژدەریان. دەرامەدێکی زۆری هەبوو؛ بەلام پیس فێرە قومار ببوو. ئەوسا کە لە قەلادزە بووم زۆری کوردایەتی دەکرد. بەلام لە پاشەڕۆژدا لە قومار خانووی دۆڕاندبوو؛ فەقیر ببوو؛ چووبوو ببوە جاش؛ جاش لای حکوومەت. چەند مەقالێکی دژی کوردان لە مەجەلاتی بێرووتیدا بلاو کردەوە. ئاغایەکی پژدەری بە ناوی عەلیاغا شەوێک ڕفاندی و دایە دەست پێشمەرگە و ئیعدام کرا. جا تا ئەوانەی نەکردبوو، کۆنە هەوال و هاوسەنگەری شەڕی دەوری سەردەشتیشم بوو؛ لە قەلادزە تەواو سەبووریم پێ دەهات. کە ڕفێنرابووش، لە خوار گوندی «سلێ» لە ناو دەشت دیتم:

- دلشاد بۆ وات کرد؟

پێکەنی گوتی: سەفەرێک بوو کردم...

گوتم: عەرەب دەلێن هەموو جارێک جەڕڕە بە سەلامەتی لە ئاو نایەتەوە. من و ئەحمەد تەوفیق لە هەموو کەس بۆت نارەحەت‌تر بووین؛ لەبەر ئەوەی تۆ سابلاغیت هەر لە ئێمەیان دەپرسی: دلشاد بۆ وای کرد؟ وەک خۆشکمان ڕەدوو کەوتبێ وا بوو...

کەچی هەر ئەو عەلیاغایەش لە دوارۆژدا ببوە جاش و ئەویش ڕفێندرا و کوژرا!

زستانی سالی ١٩٦٤ سەرمایەکی زۆر سەخت بوو. کەمتر سەرمای وایان لە بیر بوو. جارێک چەند کەسێک چوونە «سندۆلان»، گوتیان لاوان چوونە ڕاوێ. کە هاتنەوە گوتیان بە هەزاران ڕیشۆلە و قاژوو سەرما بردوویە و هیچمان دەست نەکەوت. چیرۆکی کاری سەرما زۆر لە ئەفسانەی تێکەل کرابوو؛ بەلام من بۆ خۆم دیم شاهۆیەک بە سەهۆلی گۆلاوێکەوە نووسابوو، لاقی بەر نەدەبوو. خەلکی زۆری لێ هالابوو، بۆیان ڕزگار نەکرا!

شەوێک لە قەلادزە لە دەعوەتی ڕەسوول مامەند بووین. دەگەل دوکتور سدیق ئوتروشی و سەلیم فەخری چوونە دەر. کولەبالێکی هەورامی بە زیپم دە بەردا بوو؛ دەتگوت لەشم دەرزی ئاژن دەکەن. لام دایە مەنزلی کاکە زیاد. پاش چارەگێک هاتن گوتیان دوکتور مردووە؛ سەرما سەکتەی پێ کردبوو.

چاردە مانگ بوو لە مالە خۆم بێئاگا بووم. مەرەخەسیم ساند و لە ڕێگەی سولەیمانییەوە ڕۆیشتم. بوومە میوانی ڕەحمانە شێت. ڕەحمانە شێت لە سابلاغ ناوی بە باشی نەڕۆیوە؛ بەلام بلێم چی؟! مالێکی لە سولەیمانی گرتبوو، هەر لێقەوماوێکی ئێرانی بچووبایە سولەیمانی، میوانی ئەو بوو. سەرەڕای نان و پێخۆری زۆر و تەسەل، ئارەقیشی بۆ دەکڕین. نیوە ئوتێلێکی هەبوو، هەرچی لە مالەکەی جێگەی نەدەبوو، دەیناردە ئەوێ کە بە مفت بخەوێ. بە ڕاستی سەربازی گومناوێک بوو کە قەدری نەزانراوە. لە مالەکەی هاتمە دەر بچمە بازاڕ، لاوێک لە سەری کۆلان وێستابوو؛ گوتی: هەژار! حیزب ڕازی نییە تۆ لەم مالە میوان بی. گوتم: تۆ بمبەوە مالە خۆتان. سەری داخست و ڕۆیشت.

لە سولەیمانییەوە گەییمە کەرکووک و گەڕامەوە بۆ هەولێر کە کاک محەممەد مەولوودی هەوالم ببینم. پیاوێک بە ناوی مەولوود لە سالی گرانیدا لە شنۆوە چۆتە شەقلاوەی عێراق، زوو مردووە. مندالێکی ساوای بە ناوی محەممەد و بێوەژنێکی لە پاش بەجێ ماوە. ژن فەقیری کردووە و منالە هەتیوەکەی کوڕی پێگەیاندووە. پێی خوێندووە، بۆتە نووسەرێکی داستانی کورد

که هێندێک داستانی به عەرەبی و ڕووسی و ئینگلیسی چاپ کراون به ناوی (مەم)؛ بە تایبەتی چیرۆکی «پەنجا فلس» که زۆری ناو پەیدا کردووه. پوختەی ئەمەیە:

بە هەتیوی و زۆر نەداری، لە ڕێگەی مەدرەسە، پەنجا فلسییەکی دیوەتەوه، بە لایەوه گەنجێکی زۆر بەنرخە. موعەلیم لە پۆلدا ڕاستی دەکاتەوه و لە سەر کەشفی ئەمریکا پرسیاری لێ دەکا، به دەنگی بەرز دەڵێ: پەنجا فلس!

لە شەقلاوه، لە ساڵی ۱۹۵۵دا ناسیم. زۆر خۆم به بەختەوەر دەزانم که تا ئێستاش که دەکاتە نۆزدە ساڵ، تووشی ڕەفیقی لەو ڕاستتر و بەوەفاتر و مەرد و مەردانەتر نەبووم. ئەو ساڵە لە شەقلاوه مونشی فەرمانداری بوو. دوایی لە هەولێر دەژیا و کارمەندی ئیدارەی شەهرداری بوو.

من بیر و بڕوام وایە پیاو دەبێ زۆر دۆست بگرێ. ئەگەر لە هەزاریان یەکیان دەگەڵت ڕاست و بەوەفا دەرچێ و ئەوانیتر هەمووی خوار و خێچ و فێڵباز بێ، هێشتا تۆ قازانجتە. محەممەد بارتەقای هەزار دۆست پتر دەهاتەوه...

محەممەد مەولوود گوتی: ماڵەوەتان شوکور ساغن؛ خەبەرم پرسیون. چی تریشی نەگوت. دایکی منداڵان گوتی: لەوەتا تۆ چوویە شۆرش، هەموو سەری بورج کاک محەممەد مەولوود هەر که حقووقی وەرگرتووه، نەچۆتەوه ماڵه خۆی؛ ڕاست هاتۆتە بەغدا، لەگەڵی بەش کردووین و مانگێ پازدە دیناری نیوەی حقووقەکەی بەجێ هێشتووە. کرێی ڕێگەشی لە گیرفانی خۆی داوه...

«مەم» که ببوە هەمووکەس و کارێکی من، لە ڕۆیشتنم بۆ کێو -هەر چەند دەست کورتیش بوو- لە یاریدە و سەردانی ماڵ و منداڵم درێغی نەدەکرد. جارێکیان که ماوەیەک بوو لە شۆرش بووم، نێوانی حیزبی برایم و جەلال دەگەڵ بارزانی تێک چووبوو. ئەوان لە دژی تەرەفدارانی مەلامستەفایان دەنووسی و ئێمەش لە دژی ئەوان. نامەیەکی کاک مەم هات؛ نووسیبووی: «زۆر لە کۆنە برادەران گلەیان لێت هەیە. لایان وایە بوویە شاعیری دەرباری بارزانی و گەلی کوردت لە بیر نەماوه و زۆر شتیتریش. زۆر بەوە نارەحەتم که به خراپە باست بکەن...»

لە جوابی نامەکەیدا نووسیم:

«کاکە نازانم چۆن سوپاسی ئەو هەموو چاکەیەت بدەمەوه که تۆ تا ئێستا دەگەڵ منت کردووه. بەلام تۆ دەزانی ئەمڕۆ ئاشنایەتی دەگەڵ من، ئەویش بۆ کەسێکی وەک تۆ خاوەن منداڵ که لە دەزگای دەوڵەتا دەژی، به ڕاستی خەتەرە و من باش دەزانم هەرچی لە شارانن و منیان دەناسی، ئێستا نایانەوێ بمناسن و نایانەوێ دەوڵەت بزانێ که دۆستی شاعیرێکی نزیک لە بارزانین؛ که هەرچی خراپە، به دەوڵەت و دۆستانی دەڵێ. تکایە تۆش منت لە بیر بچێتەوه؛ وا بزانە نەتناسیوم. ئەگەر کەوتینەوه بێترسی، یەکتر دەگرینەوه و ئێستاش که خۆتم لێ نەناس و بێگانە بکەی، زۆر ڕازیم و هیچ ناکەم. با کۆنە برادەرانیش لێت دڕدۆنگ نەبن و لە سەر من نامەوێ تووشی هیچ تەگەرە و بەرهەڵستێک ببی...»

زۆری نەبرد نامەیەکی هات، دەڵێ: «هەژار! تۆ ناهەقت نەبوو که ئەمەت بۆ من نووسیوه. چونکە هەر کەس تۆ ناسیوتە و به مەردت زانیون، لە لێقەوماندا دیتووتن که هەواڵی لێقەوماوان نین. به داخەوه منت نەناسیوه! من خۆم لە خەڵکیتر به مەرد و خاوەن قەولتر دەزانم. که گوتووشمە خۆشم دەوێی، ڕاستم گوتووه. تۆ کەیفت لێیە جنێوم بۆ بنووسە! خراپەم بڵێ! دوژمنایەتیم بکە! بەلام لێت ڕوون بێ تا مردن دەست لە دۆستیت بەرنادەم؛ ئەگەر لە سەر تۆ

بمبەنە پای ئیعدامیش. خراپ حالی مەبە! من هەر ئەو کەسەم کە ناسیوتم...».
نازانم بلێم «مەم» چۆن دۆستێکم بوو...

***

- هاشم کوردی سابلاغیش -کە لە هەولێر دوکاندارە- قەرزەکەی تۆی بۆ هێناوینەوە.
- قەرزی چی؟
- چۆن؟ گوتی سی دینارم قەرزی هەژار لە سەرە؛ لێم وەرگرتەوە. جگە لە و دوانە هیچ ئاشنا و برادەرێکت ئەحوالی نەپرسیوین و هەروەک نەبووبێ وا بووە. بەڵێ جارێک عەبدوڵلا هات، مستەفا و زاگرۆسی برد، عەکسی کێشان و پیاوەتی کرد.

ئەم عەبدوڵلایە، یووسفی ڕیزوانی سابلاغی بوو؛ لە دەست دەوڵەت هەڵاتبوو؛ هاتبووە بەغدا. ڕۆژێک کە دەگەڵ جەلالی شەریکم لە دوکانی عەکاسی بووین، جحێڵێک ڕەنگ‌زەرد، زۆر بە کزێکەوە گوتی: کاکە ئێوە کوردن؛ منیش لێم قەوماوە. کارێکم بۆ پەیدا کەن خێرتان دەگاتێ. دەنا لێرە لە برسان دەمرم.

- کاکە خەم مەخۆ! کاریشت دەدەینێ و تا ئێمە لە برسان نەمرین تۆش برسی نابی.

کردمانە شاگردی خۆمان کە هیچی لێ نەدەزانی، وردە-وردە فێری عەکاسیمان کرد. دەستی دەگەڵ دەستمان بوو؛ چمان بخواردایە، چمان بپۆشیبا، ئەویش وەک برایەکی هاوبەشمان. پووڵی شاگردیشمان دەدایە؛ تا باش فێری عەکاسی بوو. ئەودەم گوتی: زۆرم زەحمەت داون. شوێنێکم دیتۆتەوە دەگەڵ عەکاسێک، دەمکاتە شەریکی خۆی.

- چ لەوە چاکتر؟ هەر کارێکت بە ئێمە بێ شەرم مەکە! برای خۆتین...

جا ئەو عەبدوڵلایە بوو کە عەکسی بۆ کوڕەکانم گرتبوو، لاواندبوونیەوە و بە وەفادارم هاتە بەر چاو. زۆر زوو دیتمەوە و ئەحوالم پرسی؛ گوتی: شەریکایەتییەکەم نەماوە؛ ئێستا شاگردم. کابرای وەستام زۆر دەم پیس و خەسیسە. خۆزگە نەجاتم بوایە و چیدی شاگردی ئەرمەنیانم نەکردبا.

- کاکە ڕیزوانی هیچ خەم مەخۆ! دوکانێک پەیدا کە! مایە لە من و کار لە تۆ، بە نیوەیی.
- کاک هەژار چۆن لە چاکەی تۆ دەرچم؟ تا دەمرم نۆکەری کەوشەکانتم...

دوکانێکی لە «تل محمد» کە زۆر دوور لە ماڵی ئێمە و لەو پەڕی بەغدایە پەیدا کرد. سەدوپەنجا دینار دەسمایەم دایە و خۆشم کارم دەگەڵ کرد. تا دوکان کەوتە کار. گوتم: ڕیزوانی تا شش مانگ هەرچی لێ پەیدا بوو بۆ خۆت؛ چونکە ستودیۆ لە هەوەڵەوە مشتەری کەمە. لەوە بەو لاوە ئەگەر منیش نەبووم، نیوەی قازانج بدە بە ماڵەوە کە من باوەڕیم بە تۆ هەیە.

ئەو لە سەر دوکانی بە نیوەییمانە، ڕۆژێک کوڕێکی پێ ناساندم بە ناوی«عەبدوڵلای قالە سەرشکاو» کە باوکی مردووە و خەڵکی سابلاغە و زۆر ئەمینە و دەسمایەیێکی بۆ پەیدا کە دوکانێک دەکاتەوە. سەد دینارشم بە بڕوا بە ڕیزوانی بۆ کابرا قەرز کرد. ماوەیەک هەڵسووڕا و دوایی ڕیزوانی گوتی: شێست دیناری زەرەرکەی لە پای من ...

زۆر بە خاترجەمی ئەمجار ماڵەوەم بەجێ هێشت. بە ڕیزوانیشم گوت چونکە من کارت دەگەڵ ناکەم، تۆ ئەگەر مانگێ دە دیناریش بدەی بە ماڵەوە ڕازیم و زیادی بۆ خۆت. دیسان زۆری ئیزهاری مەمنوونیەت کرد. چونکە بە قسەی ئەو، دوکان زۆری لەوە پتر لێ پەیدا دەبێ.

ڕۆیشتم بۆ شۆڕش و دوای چەند مانگ هاتمەوە:
- ها، ڕیزوانی چۆنە؟
گوتیان: دوو مانگ. مانگێ دە دیناری داوە، ئێستا دەڵێ دوکانی خۆمە و نایدەم!
- هەی نەبێ؟...
- دەڵێ ئەگەر دەتوانن شکایەتم لێ بکەن! ئێوە خۆتان قاچاغن! بۆ خۆی ژنی هێناوە، ماڵی پێکەوە ناوە و زۆر سازە!
- ئاغای ڕیزوانی ئازادیخواز ئەمەی لێ پەیدا بووە!... ڕاست دەکا، من خۆم قاچاغم شکایەت چۆن دەوێرم بکەم؟!
ئاخری هەر کاک محەممەد مەولوود چووبووە سەری، جوێنی پێدابوو، گوتبووی: دەزانم تۆ دەگەڵ پیاوی ئەمنی بەغدا کار دەکەی؛ بەلام من هەژار نیم قاچاق بم. وا دەکەم زنجیرت کەن و بتدەنەوە بە ئێران. جا خۆت دەزانی... خولاسە بە قیرەی کاک محەممەد، سەت و پەنجا دیناری مایەکەی هەوڵی دابۆوە؛ کە دوکانەکە ئەودەم شەشسەد دیناریشی دێنا. چەندم پێ سەیر بوو کە لەم حیزبی دیمۆکراتی دواییەی ئێراندا ڕیزوانی هاتەوە و گورجێ کردیان بە سەرپەرستی هەمو مەڵبەندی هەوشار و قەرار وابوو بیکەنە وەکیل لە مەجلیسی شورای ئیسلامی! دەبێ کام سیحری کردبێ کە وا لەبەر چاویان ببوە مەلایکەت؟! ئێستاش نازانم چکارەیە.
دەمەو پاییز هاتمەوە شۆڕش. شەو لە نزیک چوارقوڕنە، جیپ دە قوڕ گیرا و بە تاریکی بە ڕێدا دەهاتین. لاقم دە قولکەیەک کەوت و وەرگەڕا. قەدەرێک بە کۆڵ هەڵیانگرتم. قوڕ خلاس بوو. سواری جیپیان کردمەوە. لاقم تا ئەستوورایی ڕانیشم هەڵمسا؛ وەک مار پێوەی دابێ. گەیینە حەساری سەنگەسەر، بارزانی دیتمی، گوتی بیگەیەننە قەڵادزە.
- قوربان کاغەزم بۆ هێناوی!
- کاغەزم ناوێ؛ بە پەلە بیبەن!
مام حارسی بارزانیشی دەگەڵ ناردم کە شکەستەبەندێکی زانا بوو. بۆ بەیانی ئەحمەد شابازیش هات. لاقیان هێنامەوە جێ؛ بەلام نزیکەی دە ڕۆژان کەوتم.
لەم بەینەدا زۆر شت ڕووی دا کە ئێستا بۆم ناچنەوە سەر یەک. ئەوەم لە بیر ماوە کە ڕۆژێک لای بارزانی بووم لە سەنگەسەر، برایم ئەحمەد و جەلال و سەید عەزیز شەمزینی و عومەر دەبابە و چەندێکی‌تر لە مامۆستایان کە لە بیرم نەماون -ها، یەکێکیشیان عەلی مام ڕەزا بوو- لەوێ بوون. سەید عەزیز گلەیی کرد کە چەند ڕۆژە لە قەڵادزەی! بۆ نەهاتوویە لامان؟
گوتم: من لاقم وەرگەڕابوو، کەس لە منی نەپرسی؛ بێمە چی؟
مەلامستەفا گوتی: هەژار بۆ گۆشت مریشک نەبێ نایە، دەعوەتی بکەن دێ!
- بەڵێ سبەی لە ماڵی تاهیری برای عومەر دەبابە میوانی...
زانیم قسەی مەلامستەفا مانایەکی دیکەی هەیە. سبەی پێش نیوەڕۆ چووم. قسەیان دامەزراند:
- بارزانی دوژمنی حیزبە؛ وەتەنی فرۆشت؛ هەربینا بە یەکجاری خۆی تەسلیمی دەوڵەت کرد و چەکی دانا و شۆڕش لە بەین چوو...
هەر کەسە قسەی خۆی دەکرد. عەرزم کردن:

- برا! من نالێم وا نییە؛ ناشلێم لە کاری ئێوە ڕازییە. ئەگەر ئێوە کوردستانتان خۆش دەوێ و ناتانەوێ شۆڕشەکەی لەناو بچێ، وەرن شتێک بکەن: ئێوە گوێتان بۆ بارزانی شل کردبوو؛ هەر دەتانگوت بەڵێ قوربان وایە. کەس ئیعتیرازێکی نەبوو. هەستن بچینەوە لای بارزانی، بلێین کاکە ئێمە بۆیە شۆڕشمان دەکرد لامان وابوو خزمەتێکمان پێ دەکرێ، ئێستا کە تۆ لێمان نارازیت، گوندێکمان بۆ دیاری بکە لێی دادەنیشین. کێ لە جێی ئێمە دادەنێی ڕازین. وەک خۆشتان دەڵێن، هەزاران پێشمەرگەی سەر بە ئێوە هەیە و هەزاران پارچە سیلاحتان لایە. ڕاسپێرن دوو هەزار تفەنگ و تیربارێک بشارنەوە و پاشقلی دەن، ولاتی سولەیمانی بە قسەی خۆتان هەمووی سەر بە ئەمری ئێوەیە و بە هاسانی ئەو کارە دەکرێ. بارزانی بە بێ ئێوەی هێندە بە تەجرەبە، کاروباری سیاسی بۆ هەڵناسووڕێ. هیچ دوو مانگی پێ ناچێ بانگتان دەکاتەوە و دەڵێ بۆ خۆتان تەنزیمی حیزب و پێشمەرگە بکەن. ئەگەر -وەک ئێوە دەڵێن- خۆی و چەکی تەسلیمی حکوومەت کرد، چەکی وەشاردووتان و پێشمەرگەی هەواڵتان وەکار کەونەوە و مەهێڵن ئالای شۆڕش بکەوێتە عەرزێ. ئەگەر خۆتانی ئێستا لێ یاغی کەن، وە بزانن شۆڕش فەوتا...

عومەر دەبابە و عەلی مام ڕەزا و بابەکر پژدەری گوتیان قسەی هەژار بەر دڵ دەکەوێ. سەید عەزیز شەمزینی گوتی: قسەکانی زۆر خراپە و ئێمە چەندین فەوج پێشمەرگەی بە بیر و باوەڕ و فیداییمان هەیە کە دەتوانین جوابی مەلامستەفا نەدەینەوە و دەریکەین. جەلال گوتی: سوێند و ئیمزای پێنج هەزار پێشمەرگەم لەو باخەڵەدایە. برایم ئەحمەد کەمی قسە کرد. کە چووبوومە دەر، گوتبووی: ئێوە هەژار ناناسن؛ هەرچی دەیلێ ژەهرە بلاوی دەکاتەوە. دوژمنی سەرسەختی حیزب هەژارە...

هاتمەوە لای بارزانی، ئەو قسانەم بۆ نەگێڕایەوە؛ بەڵام گوتم: پێم زۆر ناخۆشە کە دووبەرەکایەتی بکەوێتە شۆڕش. تا نەڕۆیون تۆ دڵیان خۆش کە! دەترسم بڕۆن و کارمان بە یەکجاری تێک چێ...

- پێت وایە کەنگێ دەڕۆن؟

- لەوانەیە ئەمشەو، سبەی بڕۆن. تا نەڕۆیون چارێک بکە!

- با بڕۆن بزانم چ دەکەن؟!...

بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە، زۆر لەو مامۆستایانە ڕۆیبوونەوە بنکەی خۆیان لە ماوەت. لە سەر ڕادیۆکەیان بەیانێکی حیزبی و ڕەسمی دەرچوو کە بارزانیمان لە حیزب دەرکرد و کەس نابێ بە قسەی بکا. بارزانی بەوە زۆر تووڕە بوو و گوتی: دەبێ ئەو پاتەختەیان لێ تێک دەم و خەزێنەکەیان بدەم بە فەقیران. لوقمانی کوڕی بە دووسەد بارزانییەوە نارده سەریان. هەر هەستی خەتەریان کرد، شێوابوون. قەراریان دابو هەڵێن بۆ ئێران. بە سەتان سندووقە چا و تەلیسە شەکریان دە چۆم هاویشتبوو. بە سەتان تفەنگی بڕنۆ و کلاشینکۆفیان شکاندبوو؛ دە ڕووباریان خستبوو. بابەکر گوتی: لەو دەست و پێ ون کردنەدا، گوتم: کاک برایم پێم وایە قسەی هەژار ژەهر نەبوو! گوتی: بەڵێ بریا بە قسەی ئەومان بکردایە. بەڵام تازە هەموو شت چوو...

مامۆستایان بە سەتان پێشمەرگەوە گەیبوونە سنووری ئێران؛ چەکیان تەسلیمی ساواک کردبوو. گەورەکانیان لە تاران و چکۆلەکانیان لە هەمەدان دامەزراندبوون. ئەو هەزاران پێشمەرگەی جەلال دەیگوت سوێند و ئیمزایان لە باخەڵم دایە، دەستە-دەستە دەهاتن، هەر

یەکەی پێنج دینار و دە دیناریان لە بارزانی وەردەگرت و بۆ کوێی دەناردن، دەچوون. زۆر پیاوی رۆشنبیر و دوکتور و پیاوی زۆر دڵسۆز لەو لەبەریەک هەڵوەشانە دڵیان لە شۆرش سارد بۆوە و چوونەوە ماڵی خۆیان؛ یان چوونە خاریج. بەراستی بەڵایەکی زۆر گەورە بوو بە سەر ئەو شۆرشە گەورەیە هات. زۆرم لەبەر گران دەهات کە پێشمەرگەی -بە قسەی برایم، دڵسۆز و رۆشنبیر- هەتا دوێنێ، هەموو گیانیان ئیخلاس بوو بۆ سەرانی حیزب، دەهاتن جنێویان بەو مامۆستایانە و تەنانەت بە حیزبی پارتی دەدا. هەر بۆ ئەوە چەند دینارێک وەرگرن...

«برووسکە» ناوێک پێشمەرگەی حەرەسی جەلال بوو، هەمیشە لە دوایەوە دەرۆیشت. دیتم هاتە حەساری بنکەی سەنگەسەر:

- کاک هەژار! بە بابەگەورە بڵێ: جەلال -هەی دایکی وا- زۆری خراپە دەگەڵ کردووم.

گوتم: برووسکە! جەلال تۆی زۆر خۆش دەویست. لای من پێی گوتی من پووڵت دەدەمێ، تۆ دەچی دەیدەی بە کەباب بۆ پێشمەرگان؛ ئاخر بۆ خۆشت شتێک بکڕە! ئێستا من پێنج دینارت بۆ وەردەگرم؛ بەڵام ناپیاوییە تۆ جنێو بە جەلال بدەی...

دیسان چوومەوە قەڵادزە. کاروبارێکم نەبوو. لەو سەفەرەی دواییدا سمایلی شەریفزادەم ناسی. لام وابوو ئەو لاوە ناسک و نازدارە ناتوانێ مانگێک لەو کێوە هەڵکا؛ کەچی زۆر زوو بوو پێشمەرگەیەکی مەزبووت.

مەلا باقی لە سەنگەسەر کاروباری ئەو خەڵکەی -کە دەهاتنە لای بارزانی- بەرێوە دەبرد. دیار بوو خەڵک زۆریان گلەیی دەکرد کە ئیوا هەیە بیست رۆژ زیاتر مەحتەل دەبێ و جواب وەرناگرێ. بارزانی گوتی با هەژار یاریدەی مەلا باقی بکا. مەلا باقی تووڕە بوو. کارەکەی بۆ من بەجێ هێشت. سێ رۆژ من کارەکەم کرد. هەر کەس نامەی پێ بوو، بەیانی لێم وەردەگرتن، هەمووم لە وەرەقەیەکدا خولاسە دەکردەوە: فلان داوای پووڵ دەکا؛ فلان ئێستریان لێ ساندووە؛ فلان قەرزی نادەنەوە؛ فلان... دەمبردە ژوور لای بارزانی، بەرم بە قسەی خۆی و میوانانی دەدا، یەک-یەک بۆم دەخوێندەوە و جوابەکەم لێ وەردەگرت. سەعاتی چواری ئێوارە پێیانەوە دەگەرام: بۆ تۆ پێنج دینار؛ تۆ بچۆ لای فلان کەس؛ تۆ... بەو تەرزە هەمووم بە یەک رۆژ بەرێ دەکرد. بەڵام دیتم کارەکە بڤەیە: بارزانی نەیدەزانی لە پێنج دینار کەمتر بۆ کەس حەواڵە کا؛ بۆ زۆرانیش دە و بیست بوو. دەمروانی لات و دەسبڕی قەڵادزە و رانیەش فێر ببوون هەر بە دوو رۆژ بە عەریزەیەکەوە دەهاتن داوای پووڵیان دەکرد. بە یەکێکم گوت: تۆ دەڵالی بازاڕی؛ حاڵت خۆشە؛ پووڵت نادەمێ. گوتی: نەبێ رووبعێکم دەیە (پێنج تمەن). دامێ، چەقەی لێ دەدا! ئەوەشم دەرێنا! سەودام دەگەڵ دەکردن؛ پێنج دیناری بە نیو دینار رازی دەبوو. ئەو پووڵی بەرانبەر بە ئەمری بارزانی وەرمدەگرت، ئێواران هێشتا هەتا سەت دینارم دەگەراندەوە. گوتم: قوربان زۆر دەترسم فێری دزی کردن ببم؛ ئەو کارە ناکەم.

فەرمووی: دەست هەڵمەگرە! وەسوەسە مەکە!

- بە خوا نایکەم!

ناچار کارەکەمیان دا بە «تەها بامەڕنی» ئەفسەر و دوای حەفتاودوو سەعات ئیستعفام دا.

لەو نامانەی کە دەهاتن و هەمووی من دەمخوێندەوە، یەکێک نامەی دابوو بە حاچکی حەرەسی بارزانی کە ئەویش هەر دەبوو بیداتە دەست من. ئەوەم خولاسە نەکردەوە، هەمووم بۆ بارزانی خوێندەوە: «هەژار بە تۆ خاینە؛ فەرقێ دەکا. پووڵی داوە بە ئایشە ناوێک کە ژنێکی

سووکە لە قەلادزە و سرتەشی دەگەڵ کردووە...»!

بارزانی فەرمووی: ئەو سەگبابەم بۆ پەیدا کەن! گوتم: ڕۆیشتووە؛ نایناسم. لە ڕاستیدا ئەسڵەن قەت ژنێک نەهاتبوو تا پوولی بدەمێ یان نەیدەمێ.

عەریزەیەک نووسیبوی: «من مەلا فلانی سنەیی، دەمەوێ پرسیارت لێ بکەم؛ تاریخی کوردستان دەنووسم...». بارزانی گوتی: ئەوەم لە کۆڵ کەوە! هەر بە تاریخ نەمنووسێ؛ بە هەر چی ڕازی دەکەی ڕازیم! کابرام لە قاوەخانە دیت، چاویلکە بە چاوێکی ڕیش تۆپی ڕەش، میزەر سپی بە ڕیشو.

- ئوستاد با تەختەیەک بکەین!

لە بازیدا لێم پرسی: چۆنە تەشریفت لێرەیە!

- ئەیژم تاریخ بنووسم.

- یانی تاریخ بۆ تاریخ، یان بۆ پوول؟!

- تارێخ چە باوا؟ پوولم گەرەکە!

- پێنج تمەنت پێ بەم چۆنە؟

- بەخوا نامگەینێتە سولەیمانی!

- نیم دینار خاسە؟

- مەمنوونم!

- پوولی چاییەکەشت خۆم ئەیدەم.

- فرە مەمنوون!

مەلام بەرنەدا تا بەڕێم کرد.

قانیع -کە حیزبی پارتی لە سولەیمانییەوە دەریکردبوو- لە مەریوان بردبوویانە تاران و ساواک هەڵیپێچابوو کە تۆ چۆن لە شیعری خۆتدا گوتووتە خوسرەوی پەرویز گەواد بووە؟

- بە فەرهادی گوتووە کێو کون کە، ئەم ژنەی خۆمتە ئەدەمێ؟!

خراوەتە حەبسەوە. عیسا پەژمان گوتوویە: ئەمە لە عیراق دەریانکردوە؛ زۆر سووکە؛ ئەگەر ئێوە بیگرن دەبێتە پاڵەوانی میللی و قەدری بۆ پەیدا دەبێ. خستبوویانە ماشێنەوە و لە حدوودی عیراق بەرەلایان کردبوو. ئەویش هاتە لای بارزانی، دووسەد دیناری دایە. قانیع گوتی: ئەمە بیدەم بە کێ؟

- بە کەس؛ هەر بۆ خۆت.

- دینم نەبێ ئەگەر باوەڕ بکەم! قەت لە حەیاتمدا چوار دینار پێکەوە نەکەوتوونە گیرفانمەوە!

کوڕێک دەگەڵمان لە چیای براندۆست بوو. کچێکی هەڵگرتبوو کە لە سەر بێشکە مارەی لە کەسێکیتر برابوو. بارزانی عەقیدەی وابوو مارەی پێشووی نەهاتووە. چونکە بە ڕەزامەندی کچ نەبووە و باوکیش بۆ مەسلەحەتی خۆی، نە بۆ مەسلەحەتی کچ ئەمەی کردووە. کچەکە لە ماڵە وەهاباغای حەمەدی عەلیاغا بوو. لە سەنگەسەر وەهاباغا دەیەویست کارەکە رووبەڕا بکا. مەلا مەعسوومی کۆیە -کە مەلایەکی بەناوبانگ بوو- هاتبووە دیدەنی بارزانی، نەقلی بۆ مەلا مەعسووم گێڕایەوە و گوتی تۆ ئەو کچە لەو کوڕە مارە کە. مەلا مەعسووم گوتی: کوو ئیمانێ خۆ لۆ تۆ دەفرۆشم؟ مارەی لە مێردی پێشووی هاتیە و ئەو خواگیریەی ناکەم!

کە مەلا مەعسووم ڕۆیشت گوتم: قوربان تێکت دا! ئەگەر کوڕەکە بۆ خۆی بیست دیناری بۆ

ببردایه دەیکرد. بەڵام خۆی لە لای تۆ بە دیندار هەڵدەگێڕێتەوە؛ یانی ها بۆ خاتری بارزانیش شەرع ناشکێنم!

- باوەڕ ناکەم وابێ.

- تەجرەبەی کە!

کوڕیان بە تەنێ ناردە کۆیە؛ بیست دیناری دابوو بە مەلا؛ ژنەکەی لێ مارە کردبوو!

ئیجازەم لە بارزانی خواست بچمەوە بەغدایە. نیازم وابوو تازە نەیەمەوە شۆڕش و مل لە کاسبی و کاری خۆم نێمەوە. چونکە بەو لە بەریەک هەڵوەشانە زۆر پەست ببووم و هومێدم لە کزی دابوو.

هاتمەوە بەغدا. ملم لە عەکاسی نایەوە و جار و بارە دەچوومە هەڕاجە بازاڕێک شتم دەکڕی و دەمفرۆشتەوە و ژیانی ئاسایی «ماندوو بە و بژی»م بە سەر گرتەوە. بەغداش بۆ من ناخۆش ببوو؛ حیزبی و مەلایی پەیدا ببوو. زۆر لە هەوالانی پێشووم لە دەست دابوو. زەبیحی کەوتبووە بەرەی دژی مەلامستەفا و هێشتان کاری بۆ حیزبی پارتی برایم و جەلال دەکرد. بەڵام نێوانی خۆمان تێک نەدا. هەرکە دیتمەوە گوتم:

- کاکە من و تۆ هەر لە منداڵییەوە پێکەوە ژیاوین و زۆریشمان کوێرەوەری و دەربەدەری پێکەوە دیوە. ئێمە لە خزمیش بەولاوەترین. بیلاتەژبی وەک ژن و مێرد لە سروتری یەکتر دەزانین. هەردووکیش لە بیر کردنەوەدا ئازادین. مەلامستەفا هەر خەتایەکیشی هەبێ لە کن من موقەددەسە؛ حەقت پێ نادەم لە کن من خراپی باس بکەی. هەر وەک منیش کارم بە خراپەکاری هەوالانی تۆ نییە.

بببووینەوە ئاشنا و هات‌وچۆمان لە ناودا بوو. دوو ڕۆژ نەمدیت، گوتیان بە خواردنی خراپ ژاراوی بووە. چووم لە ماڵە تەنیاییەکەی خۆی کەوتبوو. هێنامەوە ماڵی خۆمان و بیست ڕۆژێک - تا چاک بۆوە- لام بوو.

هەر وا وردە-وردە نێوانی بارزانی و حکوومەت ناخۆش و ناخۆش‌تر دەبوو. کابرایەکم دەناسی بە ناوی خەلیل، دەلالی ناو بازاڕی گەورە و کەرکوکی بوو. پێم گوت: خەلیل ترس و لەرز پەیدا بۆتەوە. من بە تەما نیم بچمەوە شۆڕش؛ بەڵام ڕەنگە لێرەش بمگرن. چت بە خەیاڵدا دێ؟

خەلیل دوای دوو ڕۆژ پێی گوتم: مودیر پۆلیسێکی هەولێری هەیە کە تۆش لە زەمانی دانشجوویەوە زۆر باش دەناسی. باسی تۆم بۆ کردووە کە فەقیری خۆی دەکا و کاری بە کاری کەس نەداوە. ئاگات لێ بێ؛ با لە هیچ و خۆڕایی گێچەڵێکی تێ نەهاڵێنن. زۆری سەلام لێ دەکردی، دەیگوت ئەو تانجی سەری منە؛ کەس باسی ناکا. بەڵام ئەویش دەبێ ئەگەر مەعلووماتێکی بە فایدەی لابێ، بە منی بڵێ و یاریدە بدا!

گوتم: خەلیل من ئەو کەسە نیم کە بیرتان بۆی چووە. خەیانەت بە کورد کاری من نییە. سەد جار بمرم و منداڵم لە بەر چاوم لە برسان بمرن، ئەوی تۆ و فوئاد دەڵێن، لە من بەدوورە...

زۆر دڵم گەرم داهات. شیعری هەڵۆکەم هۆندەوە کە لە دیوانەکەمدا چاپ کراوە. لە ناو ترس و لەرزیشدا، کاسبی خۆم هەر دەکرد و چاوەنۆڕی قەزا و قەدەر بووم. مانگێک و دە ڕۆژ لە زستانێ ١٩٦٥ ڕابردبوو، شەڕ دەس پێکرایەوە. منێکی کە خەیاڵم کردبوو تازە ناچمەوە هەرا و ئاوارەیی چیا و بۆ منداڵی خۆم دەژیم، وەک نۆبەتی داریکی سەخت، گەرم داهاتم؛ هۆش و حەواسم پێ نەما؛ خەوم لێ نەدەکەوت. شەو لە سەر جێگە هەر جینگڵم دەدا... مەعسووم

هەستی پێ کردبوو لە چ حاڵێکدام؛ گوتی: لام وایە ئەگەر نەچیەوە شۆرش خراپ نەخۆش دەکەوێ... دیسان هەر دوودڵ بووم: زۆر حەیفە ئەگەر کوشتن و ماڵ وێرانیش بێ، دەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستانەم نەبم کە ئەو هەموو دەردەمان پێکەوە دیوە. ماڵ و منداڵیشم لە بێکەسی و وڵاتی غەریبایەتیدا زۆر جێگەی بەزەیین؛ ئەویش لە بەر دەستی دوژمندا. ناشکرێ بیانبەمە ناو شۆرش کە دەبنە بارێکی گەورە بە سەر خۆم و شۆرشەوە. لە ناو ئەو خۆف و ڕەجایەدا دەژیام؛ بەلام ژیانی سەگ...

بڕیارم دا هەر چۆنێک بێ دەگەڵ تەرەفدارانی بارزانی لە بەغدا کار بکەم و یارمەتی و دەرمان بۆ لەشکر کۆ کەمەوە و بە دوور لە چاوی دەوڵەت و پۆلیس بژیم.

لە بیست و سێی مانگی مارسدا، خودا کوڕێکی دا. بەر لەوە ببێ ناوم دۆزیبۆوە: ئەگەر کوڕ بێ ناوی دەنێم «پیرس» یان «پیران»؛ ئەگەر کچ بێ ناوی دەنێم «چامە» بە یادی ئەو ڕۆژانەی کە لە بارزان بووم. ئەو شەوەی کە منداڵەکە دەهاتە سەر دنیا، ناوی «خانی» مێشک و دڵی ئاخنیم: هەر دەبێ ناوی خانی بێ...

- چووزانی کچ نابێ؟

- نەخێر کوڕ دەبێ و دەبێ خانی بێ...

باوەڕ کە بە دەم خەوەوە هەر دەمگوت: خانی. کوڕ بەرەبەیان هاتە دنیا و ناوی بوو بە خانی؛ بە ناوی ئەحمەدی خانییەوە. نەمتوانی تێر کوڕی تازەهاتووم ببینم؛ پۆلیسی سڕی لە دەوری ماڵەکەم دەسووڕا تا بزانن چ دەکەم و هاتوچۆی چ کەسانێک دەکەم. ئەمەش دوکانداریکی کۆنە ئیستیواری عەرەب «ئەبوو یاسین» ناو کە بەرانبەری ماڵمان بوو پێی گوتم. کابرای نیشان دامێ کە دەڕوانێتە دەرگای ماڵمان. ڕۆژێک بەیانی لە ماڵ دەرچووم. کابرای تاین وردە-وردە بە دوومدا هات و لە دوورەوە گومی نەدەکردم. چوومە ئێزگەیەکی ئوتووبووس. ئەو چووە ئێزگەیەکی پێشتر لە من کە لێک دیار بووین. من سواری ئوتووبووس بووم؛ تا ئەویش هات سوار بوو. لە فرسەتێک خۆم هەڵداشت و گورج بانگی تاکسیەکم کرد و مەودای ئەوم نەدا دابەزێ، دوور کەوتمەوە؛ خۆم گەیاندە ماڵەکەی زەبیحی. بیست ڕۆژێک شەوانە لای ئەو بووم و ڕۆژانە لە جەنگەی پاش نیوەڕۆدا دەهاتمەوە ماڵ؛ کە دەمزانی پۆلیسی سڕی بەغدایە حەوسەڵەی نییە بەو گەرمایە لە کۆڵان ڕاوەستێ. بەڵای گەورە لەوەدا بوو کە لەو ئاگربەس و ئاشتییەدا، زۆر پێشمەرگە چووبوونەوە لای دەوڵەت و لە سەر ڕێگایان داندرابوون. هەرکەسیان بناسیایە، بە گرتنیان دەدان. خۆ منیش وەک گای قەشان وا بووم؛ پێشمەرگە نەبوو نەمناسێ.

خەبەری چەند کەسێکم زانی کە چووبوون لە بەسراوە بە عەرزی ئێراندا هاتبوونەوە کوردستان، هەر لە ترسی ئەو ناساندنە. بەر لەوە خۆم لە ژوورەکەی زەبیحی بشارمەوە، ڕۆژێک کوڕێکی سابلاغی (عەلی عەزیز) -کە لە موخابەراتی پۆلیسی گشتیدا بوو- گوتی دەڵێن بارزانی بە تۆپ لە ڕەواندزیان داوە. بۆ زەبیحیم گێڕاوە، گوتی: درۆیە؛ تا مامۆستایانی پارتی بە ئێران نەڵێن، ئێران فیشەکێکیش نادا بە بارزانی. گوتم: کاکە با هێندە سادە فکر نەکەینەوە. ئەگەر ئێران یان غەیری ئێران یاریدەی کورد بدا، لە خۆشەویستی کوردەوە نییە؛ بۆ مەسلەحەتی ڕۆژە. ناسر و زۆر لە عەرەبان دەڵێن خووزستان عەرەبستانە و دەی ئەستێنین. ئێرانیش بە بێ خووزستان ناژی. ئێستا یاریدەی هێزێک دەکەن کە لە شکری عیراقیان بۆ مەشغووڵ کا و

عەرەبستانیان لە بیر بەرێتەوە. ئەو هێزەش ئەمڕۆ بارزانییە؛ نە ئەوانەی هەلاتونە تاران و هەمەدان.
- باوەڕ ناکەم! هەستە بچینە لای عەلی عەزیز.
- چووینە ماڵەکەی، گوتی: بەڵێ ئەوە دوو شەوە بێسیم لە سەر بێسیم باسی تۆپی بارزانییە کە لە دەوری ڕەواندز دەدا.
شەوێک گوتم: زەبیحی! من هەر دەڕۆمەوە کێوان. لە کوێ ناسیانم و گرتیانم تۆ سەلامەت؛ بەڵکو دەربازیش بووم...
گوتی: مەلا! ڕێگە زۆر خەتەرە، وەرە دەگەڵ من بچینە تاران!
- یانی دەتەوێ عەجەم ئیعداممان کەن؟!
- نا، مەلا! سیاسەت زۆر گۆڕاوە. من خۆم جارێک چوومە تاران و میوانی شاهەنشا بووم. ئێستاش من خەبەر دەنێرم ماشێن دێتە سنووری خانەقین. لێرەوە دەچینە خانەقین؛ کە ڕێگەکەی ئەمینە. لەوێوە دەمانگەیەننە تاران!
گوتم: کاکە زۆر جار بە گاڵتە پێم گوتووی من لە تۆ نەترس‌ترم. بەلام بەڕاستی تۆ نەترسێکی سەیری! چوونە تارانی ئێمە ئابڕوو دە تای تەرازوو نانە. من ناوێرم شتی وا بکەم.
هەر چەند پێم وا بوو ناگەمە نیوەی ڕێگەی کەرکووک و پێشمەرگەی تۆبەکار بە گرتنم دەدەن، دیسان چاوم لێ قووچاند و هەر چی دەبێ با ببێ... چوومە مەیدان کە ماشین بگرم بۆ هەولێر، کاک محەممەد مەولوود پەیدا بوو:
- ئەوە لێرە چ دەکەی؟
- دەمەوێ بچمەوە شۆڕش. هاتووم ماشێن بگرم.
- کاکە هیچ قسەی لێ مەکە! من دەگەڵ مەحمووداغای خەلیفەسەمەد و حاجی محەممەدی شێخ ڕەشیدی لۆلان هاتووم؛ سبەی دەڕۆینەوە هەولێر. خۆ هیچیان ناتناسن؟
- نەخێر نەمدیون.
- وەرە دەڵێم ئەوە خاڵمە و دێ سەری خوشکی دەدا؛ کە دایکمە. دیارە دەگەڵ ئەو دوو جاشە زلانە کەس ناتوانێ لە ڕێگە ڕامانگرێ.
- ئویف چەند شتی باشە!
قەرارمان دا بەیانی بچمە ئوتێل و ڕەگەڵ کەوم. ڕۆژی عاشوورا بوو. تەواوی دوکان و تەنانەت نانەواخانەش داخرابوون. سەعات حەوت و نیوی بەیانی چوومە ئوتێل؛ کاک محەممەد گوتی:
- ئەوەیە خاڵە عەبدوڕەحمانم!
- زۆر بەخێر هاتی.
حاجی محەممەدی شێخ ڕەشید ڕەنگی زەرد ببوو؛ دەینالاند و دەستی بە زگیەوە بوو. گارسۆنی ئوتێل هات گوتی عاشوورایە؛ هیچ دەرمانخانە لەو ئاقارانە نییە.
گوتم: حاجی خێرە؟
- کاکە لە شەوەوە زگم زۆر کار دەکا و دێشێ؛ حەجمینم لێ هەڵگیراوە.
بە گارسۆنم گوت: قاوە و جەوهەری لیمۆتان هەیە؟
- بەڵێ.
دەمە کەوچکە چایەکی چکۆلە جەوهەری لیمۆم لە فینجانە قاوەیەکدا تواندەوە. دە پێشدا

کەوچکێکم لێ خواردەوە نەوەک خەیاڵ بکا کە دەرمان داوی دەکەم. خواردیەوە؛ دوای نیو سەعاتێک گوتی ژانی زگم شکا و زگیشم وێستاوەتەوە. مەمنوون بۆ ئەو دەرمانەت.

دوو کامیۆنی سەربازی پڕ لە سەرباز و ئەفسەر هاتن. کاک محەممەد و من دەگەڵ مەحموودی خەلیفەسەمەد -کە جاشێک بوو زۆر دەبەنگ و کەر- کوڕێکی مەحموودبەگ سواری سوارییەک بووین و ڕانندەیەکی خۆیان لێی دەخوڕی. حاجی محەممەد و سێ کەس لە خزمانی لە ماشێنی سواریەکی‌تردا. دوو ماشێنی‌تریش هەر چەکداری ئەوان لە بەغداوە بەرەو هەولێر هاتین. نیوەڕۆ گەیشتینە کەرکووک. لە ئوتێل «شرق‌الاوسط» دابەزین. کاک محەممەد و من چووینە ژوورێک.

گوتی: با بچین لە ڕستووران نان بخۆین. گوتم: کاکە! من چەند ساڵ شاگرد عەکاس بووم لە کەرکووک؛ زۆر کەس دەمناسن. لەوانەیە پێشمەرگەی پەشیمانیش تووشم بن. تۆ بچۆ! گوتی باشە نانت بۆ دەنێرم. نانیان بۆ هێنام؛ لە ژوورەکە خواردم. لە سەر تەختێک ڕاکشام کە تا دەرۆین بنووم. دەرگای ژوورەکەم کرایەوە. کابرایەک لە هەوالانی حاجی محەممەد هاتە ژوور:

- کاک هەژار دەبێ عەفووم بکەی من تۆم نەناسیبوو!

- جا ئێستا بۆ دەمناسی؟! من تۆم قەت نەدیوە و هەژاریش نیم. لێت تێک چووە.

- ئەی بێ‌قەزا بی! ئەو ڕۆژەت لە بیر نەماوە کە شەڕ لە سەر«سەفتێ» بوو؟ تۆ خۆت لە حەیدەربەگ و حوسێناغای مێرگەسووری تووڕە کرد، گوتت: ناموستان دە خەتەردایە. هیچ نەبێ ژن و خوشکی خۆتان بپارێزن تا جاش نەیبردوون... من چۆن تۆم لێ دەگۆڕێ؟

- باشە جەنابت بۆ لەوێ بووی؟

- ئەز غولام من لە شەڕی لۆلان بە ئەسیر گیرابووم و لە بارزان دەست بەسەر بووم و ئەو ڕۆژە لە نزیک تۆ و بارزانییەوە چووبوومە بن بەردێک و سەیرم دەکرد. ناوم عەمەری شێخەولایە. حاجی محەممەدیش هەر تۆی نەناسیبوو.

- دەی جا ئێستە ناسیومی؟

- بەڵێ من پێم گوت!

- دە باشە بچۆ دەر! من دەمەوێ بخەوم.

عەمەر چوو. خوایە ئەجەل لە کوێم دەبینێتەوە؟ چۆن بە پێی خۆم کەوتوومە داوی مەرگەوە؟ مەحموودی خەلیفە سەمەد، مامی محەممەدی شێخ ڕەشید، کە بە شیعر و نەسر هەزار جوێنم بە باب و باپیری داوە؛ دەشزانن هاونشینی بارزانی بووم. ئێستا چبکەم؟

چوومە سەر تەختەکەم، لە پەنجەرەی بڵندەوە ڕوانیم بەڵکو بتوانم خۆم فڕێ دەم و هەڵێم، نەخێر نە دەگەمە پەنجەرەکە، نە دەتوانم باز دەم، پتر لە شێست میتر بەرزە تا عەرز. نا، باشتر وایە بە بیانووی دەست شوتنەوە بڕۆمە لای پلەکان و هەرچۆنێک بێ تا حاجی محەممەد نەمگەیوەتێ لە دەرگای ئوتێل دەرچم و بە ناو کۆلاناندا ڕاکەم؛ بەڵکو ڕزگارم بێ. لەو فکرانەدا بووم حاجی محەممەد هاتە ژوور:

- کاک عەبدوڕەحمان حەز دەکەی بڕۆین پێکەوە قەدەمێک لێ دەین؟

- بەڵێ بۆچی...

بە دڵمدا هات: لە کەرکووک زۆر شارەزام؛ لە پێچی کۆلانێک هەڵدێم و خۆم ون دەکەم. دەرکەوتین. چوار سۆفی چەکدار بە دوامانەوە و ڕاست بە سەر پردە تازەکەی «خاسە»دا

ڕۆیشتین کە ڕێگەی هەڵاتن نەبوو. لە ڕێ زۆر باسی شیعری کوردی کرد و بە قسەی خۆشی ڕابوارد، هیچ باسێکی‌تری نەکرد. لەوسەری پردەوە گەڕاینەوە ئوتێل. بردمیە ژوورەکەی خۆی. بە سۆفیەکی گوت، دوو کورسی هێنا سەر بالکۆن کە دەیڕوانیە خەیابان. بانگی عەمەری کرد؛ سرتەیەکی دەگەڵ کرد. عەمەر پەنجەرەی پێوەدا و چوو لە دەرگای ژوورەکە وێستا. حاجی محەممەد لەپڕ سەری هەڵێنا و پرسی:

- تۆ هەژاری؟

- بەڵێ.

- تۆ دەزانی چەندت دڵی ئێمە ئێشاندووە و چەندت جنێو بە خۆم و بابم داوە و خەڵک چونکە شیعرە لەبەریان کردووە؟ ئاخر بۆچی وات دەگەڵ کردووین؟

- حاجی! تۆ دەڵێی موسوڵمانم. ئەگەر بڵێن وا دوژمنێکی دین دەیەوێ مەککە و مەدینە وێران کا و هاوارت بۆ بێنن، دەچیە هاواری و بە دڵ دیفاعیان لێ دەکەی؛ ئەگەر کەسێک ڕێگەت لێ بگرێ و نەهێڵی لە پاراستنی قیبلەکەتدا بەشدار بی و سەرکەوی، ئایا چاکەی دەڵێی؟ یان بەر لەعنەت و جنێوی دەدەی؟ من لە عەشیرەتی بارزان نیم. هەزارانی وەک منیش چەند تۆ کابەت لە لا پیرۆزە، کوردستانمان پتریش لە لا بە قەدر و پیرۆزە. ئازادی دەپەرستین. بارزانیمان بۆیە خۆش دەوێ کە یاریدەمان دەدا قیبلەکە بپارێزین. تۆش و کەسانی‌تری وەک تۆ دەتانەوێ ئازادیەکەمان سەر نەگرێ و بەرەو پاشمان ڕادەکێشن. لێت ڕوون بێ ئەگەر شێخ ڕەشیدی بابت لە جێگەی بارزانی با و بۆ ئازادی حەولی دابا، بارزانیش شەڕی دەگەڵ ئازادی‌خوازان کردبا، ئەو جنێوانە بە بارزانی دەدرا و تاریفی بابتمان دەکرد. من لێرەدا حەق دەدەم بە خۆم، تۆش کەیفی خۆتە چۆنت پێ باشە وا بکە...

- ئێستا کە بەر چنگمان کەوتووی پێت وایە چت دەگەڵ دەکەین؟

- نازانم، بەلام تۆ وەک پیاوێکی کوردی عاشیرەتی ببزوویەوە پیاوانە و پەسندە. مەمدەنە دەست دەوڵەت؛ بۆ خۆتان لەو دەشتە بمکوژن و گەردنتان ئازا بێ. بۆ کەوچکە خوێنێک ناپاڕێمەوە؛ ناهەقیشتان ناگرم. پیاو بەو مەمدە دەست عارەبان؛ دەشمدەی بڵێم چی؟

- ئەوە دیاری دا کە محەممەد مەولوود دەستی ئێمەی بریوە و تۆ خالی ئەو نیت. بەلام پێم بڵێ بۆ کوێ دەچووی؟

- دەچوومەوە بۆ لای بارزانی، ئەگەر لە ڕێ دەرچووبام.

- کاک عەبدوڕەحمان! جگە لە عەمەر و من کەس نەیزانیوە تۆ کێی. بە عەمەرم گوتووە باست لای کەس نەکا. هەر خالی کاک محەممەد بە و لە هەولێریشەوە وا دەکەم بگەیەوە ناو پێشمەرگە و هێندێک ڕاسپێریشم هەیە پێت دەڵێم. عەمەر دوو قاوەمان بۆ بێنە!

قاوە خورایەوە. محەممەد مەولوود هاتەوە؛ حاجی بە چاوی ئەویشدا نەدایەوە. دەوری سەعات چوار کەوتینە ڕێ؛ بەلام ئەمجار کاک محەممەد و من لە ماشێنی حاجی محەممەددا سوار بووین. لە دەرکی مالی مەحموود بەگ، مەحموود بەگ گوتی: کاک عەبدوڕەحمان دەبێ میوانی من بی. حاجی محەممەد گوتی: با زوو بچێ چاوی بە خوشکی بکەوێ. کاک محەممەدیش وای پێ خۆشە. دەگەڵ کاک محەممەد هاتینەوە مالێ و لە ڕێ کارەساتەکەم بۆ گێڕاوە:

-کاکە دەڵێی چی هەڵێم؟

- نا، تازە نەجاتت بووە. هەڵێی خراپە. حاجی محەممەد بە پیاوێکی پیاو دەناسم، فریـودان و درۆی نییە.

سێبەر شۆڕ ببوون، تەقە قەوما، غارمان دا سەربان. لە دەشتی خوار هـەولێرەوە شـەڕێک بـوو کەس شتی وای نەدیوە: تەیارە بـە بۆمبـا و تیربـار، تـۆپ و تانـک و عەسـکەر، تەقـە و گرمـە و قرمەیە. دووکەڵ دەشتی داگرتووە. تەییارەیەک پێکرا و لە نزیک مالان کەوت و گڕی لـێ بـەرز بۆوە. هەموو خەلکی هەولێر، ژن و پیـاو لـە سـەربانانەوە سـەیریان دەکـرد و دەنگـی «ئافـەریم پێشمەرگە» لە هەموو لایەکەوە بلند بوو. منداڵە هەولێری هەر مەپرسە چ قیـڕە و هەرایـەکیان بوو. هەر حەزت دەکرد گوێت لێ بـێ. هـەتا سـێرە هەلـگیرا، شـەڕ هـەر بـەردەوام بـوو. شـەو ماشێنێک لە دەرەکی ماڵ وێستا؛ حاجی محەممەد بوو. بەر لە هـەر شـت باسـی ئـەو شـەڕەی گێڕاوە گوتی: کوڕە سەیر لەوەدا بوو سۆفییەکانی ئێمەش -کـە دوژمـنی پێـشمەرگە و هەوالـی دەوڵەتن- لە سەربانەوە ئافەریم و چەپلە لێدانیان بوو بۆ ئازایەتی پێشمەرگەکان!

ئەمما چیرۆکی ئەم شەڕە چ بوو؟

«برایم ئەفەندی» کە سەردەستەی پێشمەرگەکانی ناوشاری هەولێر بوو- لە کێو بە کـن ژن و منداڵی ئاوارەی پێشمەرگەدا تێدەپەڕێ، ژنان زۆری جنێو پێ دەدەن کە پێخۆرێکی وامـان نییـە و هەر خۆت قەڵەو دەکەی. برایم ئەفەندی دەزانێ شەوی عاشوورا لەبەر خاتری سـەربازان -کـە زۆربەیان شیعەن- گۆشت زۆر سەردەبردرێ بۆ ڕۆژی عاشوورا. شەو دەوری قەسابخانەی پادگان دەدا. دوازدە پۆلیسی لێیە، چەکیان دەکا و حەپسیان دەکا لـە ژوورێکـدا و دەرکـەیان لـە سـەر گاڵە دەدا. کەلاکی شێست مەڕ، بیست مانگا و گا، دوازدە گامێش لـە کـامیۆنی قەسـابخانە بـار دەکا و دەچێ دەڵێ ئەوە پێخۆر و دابەشی دەکا. سبەی ئاشپەزخانەی پادگان چاوەنۆڕی گۆشتە و نییە. کە دەچن جێ تەڕە و گامێش نەماوە! پۆلیس حەپسن و قەساب بـە سـاتوور و کێـردەوە دەگەڵ کامیۆنە گۆشتان براون کە کەلاکان شەق و پەق کەن. لەشکر لە بـرایم ئەفەنـدی دەنـگ دەدەن، دەچنە سەر «بنە سلاوە» کە بنکەی پێشمەرگەیەتی و ئەو شەڕەی ئێـوارە قـەوماوە کـە پتر لە شێست سەربازی دەوڵەت کوژراوە، دوو تانک شکاوە و تەیارەیـەک بـە تیربـاری گرینـۆف پێکراوە و سووتاوە و لەشکری دەوڵەت بە سەرشۆڕی گەڕاوەتەوە.

حاجی محەممـەد گـوتی: بـە دووربـین دەمـڕوانی، تانکێـک کەوتـە سـەر پێـشمەرگەیەک. پێشمەرگە لە بەری هەلات؛ لە زورکانێک خۆی هاویشتە کەنداڵێک و دامەزرا و بە بڕنـەو تەقـەی لە تانک کرد. تانک لە بەر کابرا هەلات و لە پشتەوە پێشمەرگە ڕاوەدووی نا!

ئەگەر بۆ گەلانی بێکەسی وەکو کوردیش وەک گەلانی خوداپێداو تاریخ بنووسرابا، ناوی بـرایم ئەفەندی لە ڕیزی ئازا و کارزاناندا بە ئاوی زێڕ و بە درشتترین خەت دەنووسرا. بەلام ئاخ و سەد داخ کە ئەو جۆرە پیاوانە ناویان لە بیر دەچێتەوە و کەس ئاوڕیان وەسەر نادا... بەلام ئەوەنـدەی من لێی دەزانم زیانی نییە تۆش بیزانی و جار و بار وە بیرت بێتەوە:

برایم ئەفەندی بە دەرەجەی ستوان دوو لـە ڕشـتەی پۆلیـسدا بـوو؛ هـاتبووە ڕیـزی شـۆڕش. هەولێری بوو. پیاوێکی بە قەلافەتی چاوبرۆ ڕەشی جوان چاک. لەوەتا هاتبووە کـۆڕی خەباتـەوە، ناوی برایم ئەفەندی زراوی ئەفسەر و چەکـداری دەوڵـەتی عیراقـی بردبـوو. دوژمنـانی کـوردی نیوەشەو لە ماڵە خۆیان دەردێنا و دەیڕفاندن و کەس هەستی پـێ نـەدەکرد. جارێـک دە پـاش نوێژی شێواندا، پۆلیس هەموو ڕێگەی هـەولێر-شـەقلاوە، هـەولێر- کۆیـەی بەسـتووە و هـەموو

ماشێنان دەپشکنێ؛ زۆر کەسان دەگرێ؛ تا بەیانی نەزانراوە کە ئەو پۆلیسانە پێشمەرگەی برایم ئەفەندی بوون و جل و زمانیان گۆڕیوە!

سەرهەنگێکی عەرەبی ئەستێرە (قوپکە) لە سەر شان دەگەڵ دوو ستوان لە جیپێکی دەوڵەتیدا، دوو کامیۆنی زیلی سەربازی بە دواوە، سەرباز و پۆلیس و جاشە عەرەبی عەگاڵ بە سەر تێدا، تەرجومانێکی کورد دەگەڵ، بە ناو مەڵبەندی عەشیرەتی گەردیدا دەگەڕێن. لە هەر دێیەک خەڵک کۆ دەکەنەوە: فەرمانی شەڕ دەگەڵ بارزانی دەرچووە؛ کێ ئامادەیە بێت. سەرهەنگ دەڵێ و کابرای کورد تەرجەمە دەکا.

- قوربان من ئامادەم! ئەوەش تفەنگم.

- برۆ لاچۆ تۆ بە کار نایەی، ئێمە پیاوی سابقەدارمان دەوێ. خۆ پووڵی دەوڵەت بە خۆڕایی نییە!

- قوربان وەڵلا گەنمی پێشمەرگەم سووتاندوە؛ لە فلانە جێ شەڕم کردووە؛ شایەتم هەیە...

- دە برۆ سوار بە!

بیستوهەشت دانە جاش لە ئاغایانی گەردی کۆ دەکەنەوە و بەرەو هاوینەهەواری سەلاحەدین بە شۆسەدا دێن. هەر کەسیش سوار بووە، پۆلیس تفەنگی لێ وەرگرتووە و هەڵیپەساردووە کە لە مەیدانی شەڕدا وەریدەگرنەوە. لە سەلاحەدینەوە لادەدەن بەرەو هێران.

- قوربان دەچینە سەر بنکەی کام پێشمەرگە؟

- قوربان و سندان جاشی سەگباب! دەتانبەمە تەویلە! من برایم ئەفەندیم!

ئەو دەمە کە دەگەڵ میران لە هیران بووم، ئاغا جاشەکان لە تەویلەوە داوایان لە من کردبوو تکایان بۆ بکەم لە تەویلە دەرکەون. بڕیار درا هەر یەکی شازدە عەلبە گەنم بدەن و لە جێ مەدرەسەیەکدا حەبس بکرێن.

دەوەری وانێتێک لە ژوورەوەدا بە تەلیسە خۆڵ هەڵچنراوە؛ پێشمەرگە سەنگەری تێدا گرتووە. پاشەوپاش بۆ سەر سەنگەرێکی پڕ لە جاش چووە و تەقەی کردوون و جاشی گرتوون. وانێت، سەربازان هێنابوویانە هەولێر، منداڵە ورکە بە شوێنیەوە هەرایان دەکرد: حوکمات تانکی برایم ئەفەندی گرتووە!

ماوەی پتر لە چوار ساڵ، نیوەی بێسیمی ڕەمزی دەوڵەت، داد لە دەستی برایم ئەفەندی بوو. تا وای بە سەر هاتبوو شەوانە تووشی ئەفسەری خۆشیان بوونایە، دەیانگوت برایم هات و هەڵدەهاتن.

جارێک تاریفم کرد کە پیاوێکی ئازا و بە جەرگ و فێلزانی. گوتی: بە خوا من نیم، کوردی هەولێرن ئەو کارە دەکەن. شەوانە هەموو ماڵێک دەرکەی کراوەتەوە. هەر گۆشتەکەی عاشوورا، قەسابی هەولێر خەبەریان بۆ ناردم و دەگەڵیان بار کردم. ئێواران بە سواری دووچەرخە بۆ ئارەق خواردنەوە خەڵکی هەولێر دێنە دەشت و خەبەری ناوشارم دەدەنێ...

بە داخەوە ئەو پاڵەوانە تاقانەیە بە دەستی جاشی پژدەریان کوژرا کە چووبوو ناوبژی شەڕیان بکا. بە سەتان حیکایەتی سەرسووڕێنەر لە ئازایەتی برایم ئەفەندی لە هەولێر و مەڵبەندەکانی‌تری عیراقا لەبەر کراوە و من ئەمانەم بۆ نموونە باس کرد.

حاجی محەممەد -کە سەید عومەری کوڕی شێخ عوبێدیللاشی دەگەڵ بوو- دایمەزراند کە: برا زۆر بە داخنەوە ماڵە لۆلان بوونە مەلعوونی تاریخی میللەتی کورد؛ بارزانیش بوو بە

موقەددەس. نازانم بابم چۆن بوو، بەڵام خوا شاهیدمە من ئەوەندە بەو جاشەتییە نارەحەتم کە هەتا تەماشای خۆم دەکەم بێزم لە خۆ دەبێتەوە. سۆفی و بارزانیش زۆر لە مێژساڵە دوژمنی خوێنی یەکترن و تا تووشی یەکتر بن، ئەگەر یەکتر نەکوژن لایان وایە کافر دەبن. ناتوانین و بە قسەشم ناکەن کە ئێمە دەگەڵ بارزانیان بین؛ بەڵام ڕێگەمان بدەن دەچینەوە وڵاتی لۆلان؛ یاریدەی شۆڕشیش بە ماڵ دەکەین. پیاوێکی بارزانیش لە ناومان بێ بۆ ئاگاداری لە ئیخلاسمان. دەگەڵ دەوڵەت بە شەڕ نایەین؛ بەڵام ناشچینە یاریدەی. تۆ ئەم پەیامەم بۆ بگەیەنە بە بارزانی و جوابەکەم بۆ بنێرەوە.

گوتم: حاجی محەممەد! وەک پەیامەکەم گەیاندبێ و جوابم هێنابێتەوە وایە. بارزانی هێندە ساویلکە نییە ڕێگە بدا ئێوە دۆستی حکوومەت بن و بچنەوە مەڵبەندی لۆلان، ببنە دیوارێک لە نێوان وڵاتی سۆران و بادیناندا و لێکمان بڕ بدەن. ئەگەر دۆستی دەوڵەت بی، ناچار دێتە سەردانت؛ تۆپ و تانک و زرێپۆش دێنن، پشتی هەڵگوردمان لێ دەگرن. ئەگەر ئێوە لە دیانا چەند ئەفسەرێک بکوژن و بڕەون، وەک دەڵێن پردان بڕووخێنن، بارزانی ڕازی دەبێ کە شەڕیشی بۆ نەکەن و لە ماڵە خۆتان دانیشن. بەڵام ئەگەر لە سەر ئەو مەبەستەی خۆت سوور بی، وتوویژی منی ناوێ و لە ئێستاوە بفەرموو بمگرن!

– بە خوا متمانەیان نایە کە ئەودەم بارزانی قرمان ناکەن؛ بەڵام تۆ سەعی خۆت بکە و بەڵکو جوابێکی باشم بۆ بنێری.

– باشە تۆ هەرچی گوتووتە بە بارزانی دەڵێم و شەرتە زیاد و کەمی نەکەم و بیر و بڕوای خۆشم دەرنەبڕم.

سبەی بۆ پاشنیوەڕۆ ماشێنێکم لە دوو هات و چوومە ئەو گەڕەکەی حاجی و سۆفییەکانی لێ دەژیان. دەستێک چۆغە و ڕانکی دەلنگ فشی جاشانەی زۆر عالی -کە ڕەنگی سپی بوو- دەگەڵ پشتێندێک و دوو جامانەی سەری بەستراو -کە وەک عەمامەی ئاخوندی شیعە بە شەش مانگ بڵاو نابێ و ئەگەر بڵاو بوو دەبێ وەستاکار بۆت ببەستێتەوە- کرا بەرم. وەرەقەیەکی بە ئیمزای فەرماندەی فیرقەی کەرکووک و هەولێریان دامێ، نوسیبووی عەبدوڕەحماناغا لە فورسانە بەڕێزەکانی دەوڵەتە! مۆری پێوە نرابوو. تفەنگێکی یازدە تیری تازەیان بە دوو ڕەخت فیشەکەوە لێ بار کردم؛ قەت جاشی وەک خۆم شیکم نەدیوە! سواری ماشێنێکی سواری بووم و عەمەری شێخەولا -بێ چەک- کە تفەنگ و فیشەکدانەکانم هی ئەو بوون، دەگەڵ سێ سۆفی هەرکی ڕیش پانی چەکدار دەگەڵما سوار بوون. ڕانندەیەکی کوردیش لێی دەخوڕی. ڕاننده دەبێ بچێتە بانزینخانە بانزین وەرگرێ؛ منیش لە پێشەوە سوارم. ئەی خودا! ئەی ئایەتولکورسی! کەسی ناسیاو نەمبینێ کە بوومەتە جاش! بەڵام نەخێر تووش بووم: برادەرێکی پێشمەرگە بە ناوی «یوونس عەقراوی» -کە زۆر پێکەوە هەواڵ بووین- جامانەیەکی ڕەشی جاشانەی لە سەرە و لە سەر کورسییەک دانیشتوە سەیری بانزین وەرگران دەکا. لێرە چۆن نەجاتم دەبێ؟ بە خودا بێ و نەبێ یوونس بۆتە جاشی دەوڵەت؛ ئێستا خەبەرم لێ دەدا؛ منیش دەگرن و حاجی محەممەدیش تووش دەبێ. دڵم لە سەر سەت و بیستی لێ دەدا، یوونس چاوی بە من کەوت. هەستا و ڕووی کردە پشتی بانزینخانە و لە بەر چاوم ون بوو. نەخێر گیرام و تازە ڕزگارم نابێ. وەڕێ کەوتین؛ هەر ئاوڕ دەدەمەوە: لە کام نوختە دەمگرن؟ نازانم. گەینە نزیک شەقڵاوە بە عەمەرم گوت لامەدەن! گوتی حاجی پێی گوتووم. لە خوار

شەقلاوە سەرباز ڕایانگرتین، ماشێنیان پشکنی، هێندێک شەکریان دۆزیەوە کە دووسەد گرامێک دەبوو. گرووهبانێک پرسی: ئەوە چییە؟

عەمەر گوتی: خۆت دەزانی ئێمە فورسانی دەولەتین. بارزانی شەکری نەماوە چای پێ بخواتەوە، ئەوەندەی بۆ دەبەین خێرمان دەگاتێ!

گرووهبان گوتی: گاڵتەم پێدەکەی؟!

- ئاخر برا تۆ -بە قەولی بارزانیان- ئەو تۆزە شەکرە بە چوار پێنج جاش ڕەوا نابینی! من چ بلێم؟

گوتی: برۆن! لە ڕێگە سۆفییەکانی پشتەوە بۆ خۆیان قسەیان دەکرد. یەکیان دەیگوت: مێزەرسوورێکم کوشت، خەزایەکی باش بوو! پاش نوێژی شەوانێکی درەنگ، زۆرمان نەمابوو بۆ شاری دیانا، لە دەشت عەمەر گوتی: بوێستن. بە منی گوت: دابەزە! بە ڕاننده و سۆفییەکانی گوت: ئێوە بچنە دیانا تا منیش دێم. ماینەوە عەمەر و من. وە دوای کەوتم کە بە شیوەرێکدا لە ڕێگەی لادا. تاوێک دوور کەوتینەوە، دەشتە و چۆل و تاریک و لە ڕێ بە دوور، وێستام؛ گوتم: عومەر نیازم وایە بتکوژم! تفەنگم هێنا سەر پێ و ڕامداشتێ. عەمەر زۆر ترسا؛ دەمی تێک هالا؛ بە لەرزۆکی و کزی گوتی: خودێ تە من ناکوژی!

- بۆ ناتکوژم؟ دەشتی لەوە چۆلتر نابێ. دەتکوژم و تفەنگەکەت دەبەم و بە پێشمەرگە دەلێم سۆفییەکی شێخ ڕەشیدم کوشتووە؛ خەلاتم دەکەن. هەلی وا بۆ کێ هەلدەکەوی؟!

- خودێ تە من ناکوژێ!

- ئاخر بۆچی ناتکوژم؟!

- چونکە تۆ لەوە پیاوتری کە من بە غەدر بکوژی.

- یانی هەر لات وایە ناتکوژم؟

- بەلێ دلم بڕوا ناکا تۆ من بکوژی.

- دە ئەگەر دلت باوەڕ ناکا، ئەو بارە قوڕەت بۆ بە من هەلگرتووە؟ ها بگرە تفەنگی خۆت بۆ خۆت هەلگرە، شانم هاتە خوار!

نازانی کە تفەنگەکەم دایەوە چەند وە کەیف هات! هەر دەیگوت: پیس تووش ببووم. بەلام دلم باوەڕی نەدەکرد بمکوژی! گەیشتینە گوندێکی چوار پێنج مالی بە ناوی «سلێماناوا». چووینە مالێک، عەمەر سرتەی دەگەل ساحێبمال کرد؛ دایانکردین و زۆریان قەدر گرتین. عەمەر ئەمجار دەمی کرایەوە:

- سەیدا! بە بێجان بلێ ئەم حەفتەیە کەوش و قوماشەکەی بۆ دەنێرم؛ بە میرۆ بلێ ئاگای لە شکارتەکەم بێ؛ بە فلان بلێ کارم بۆ پێک هێناوە...

- عەمەر ئەوە تۆ وەک قرژاڵ بە دوو سەر دەڕۆی: جاشی سۆفیشی و دۆستی پێشمەرگەش!

- با وا بێ!

عەمەر ڕۆیشت. شەو درەنگێک کابرایەکی کورتە بالای بۆرەلۆکینەیان ڕەگەل خستم کە بمباتە گوندی «گوان». مانگ هەلاتبوو؛ مانگە شەوێکی زۆر خۆش. کابرا لە سەر چنگان دەڕۆیی؛ دەتگوت سەی بۆرە!

- ئەوە بۆ وا دەکەی؟

- وست! لە سەنگەری جاشان زۆر نزیکین؛ دەمانبینن دەمانکوژن!

- هەتیو من دوو ئەوەندی تۆ درێژم. سپیم وەک کەلک. دە پێشدا من دەبینن. هەستە لە سەر دوو پێ برۆ! دەنا قدیلکەم دێ و ناچارم پێبکەنم و جاش پێ دەزانن.
ڕاستم کردەوە؛ بەلام بە ڕۆیشتنەوە دەلەرزی. گەیاندمیە گوندی گوان؛ تەسلیمی حاجی حوسێن ناوێکی کردم و گەڕایەوە. حوسێن گوتی: ئەمشەو لێرە بە! لەبەر تۆپان ناوێرم دەگەڵت بێم. سبەی شەو دەگەینە پێشمەرگە.
- کاکە گیان سبەی شەویش تۆپ هەر هەیە! وا بزانم هەر ئێستە خۆتم لێ خەلاس کەی باشترە. یان ڕێگەم نیشان دە! بە تەنێ دەڕۆم.
ناچار گوتی با برۆین. نزیکەی سەعات و نیوێک پێ هەلگەڕاین. لە بناری «زۆزک» پێشمەرگە دەنگیان داین:
- کێن؟
- کاکە خۆمانین، دۆستین.
بێجان جندی گوتی: کاک هەژار خودێ من دەنگێ تە ناس کر، تۆ چۆن هاتی؟
گەیمە بێجان و کابرا گەڕاوە. لە بن دارێک دەگەل پێشمەرگەی بێجان مەجلیسمان گەرم کرد. یەک لەو سەرگەرمیانەمان: تفەنگێکیان بەرەو پادگانی ڕەواندز داویشت، بە هەزاران فیشەک و گوللە تۆپیان لە جوابی ئەو تاقە فیشەکەدا دەتەقاندەوە!
شەوم لەوێ ڕابوارد. سەعیدی حەمەد عەلیاغامان دەگەل بوو؛ کە پێمان دەگوت «سەعیدە کوێر». هەتا تۆپ لە ڕەواندز داوێژرا، زوو پەتووی دە خۆیەوە دەپێچا!
- کاکە بۆ پێت وایە پەتوو زرێی دژی گوللە تۆپە؟!
نەقلێکی گێڕاوە کە لە دەشتی شنۆ دەگەل ئێران شەڕمان بوو؛ ڕۆژێک چوومە دەم چۆم جل بشۆم، تەیارە هات. کونە ڕێوییەکم لە کەندال بەدی کرد و خۆم خزاندە ناوی. پێلەقەیەکیان لە سەرم دا، شێخ سولەیمانی بارزانی بوو گوتی: پەکوو لێرەشم لێ ناگەڕێن؟!
بۆ بەیانی چووینە بنکەی بێجان. پێشمەرگەیەکی زۆر زوو ناردبوو کە خەبەر بدا و جیپێک بێ بمبا. تا ئێوارە عەسر خەبەر نەهاتەوە؛ گوتم خۆم بە پێ دەڕۆم تا تووشی کابرای ڕاسپارە دەبم. شەوم بە سەردا هات و درەنگ بوو. لە پەنا ڕێوە لامدا ناو پنچکان و لە قەراغ چۆم ڕاکشام. سەرمایەک بوو هەلدەلەرزیم. بەو حالەش هێندێک خەوتم. تازە ئاسۆی عاسمان ڕوون دەبوو، هاتمەوە سەر جادە و ملم لێنا. گزینگ لە سەرانی دا گەییمە «بەرسیرین». بنکەی حەمەداغای مێرگەسووری لەوێ بوو؛ لە بن دارێک نان و چایان دەخوارد. ئەگەر ناشارەزا نەبوومایە شەو دەگەیمە بەرسیرین و ئەو سەرمایەم نەدەچێشت. لەوێ تا ئێوارە مامەوە. سوارێک هاتبوو لە دووم، بردمیە گەلالە؛ عەبدوللاغای پژدەری پێ ڕادەگەیشت. میوانی وەتاغەکەی ئەو بووم. چەقە و هەرایەک بوو دەتگوت حەمامی ژنانە. یەک دەڕۆیشت و دوو دەهات؛ خەوی چی و جەهەندەمی چی؟! سەعات دووی پاش نیوەشەو عەولاغا گوتی دەچمە فلان جێ تا بتوانی بخەوی. ئەمجاریش نە خەو نە تەرەماش. هەر دەهاتن: عەولاغا چی لێ هات؟!... نەخێر بێفایدەیە. پەتوویێکم هەلگرت و لە دێ دەرچووم. بە دۆلێکدا ڕۆیشتم، تووشی حەسەنی برای عەولاغا بووم لە سەر تاقەکانیەک دوو لبادی ڕاخستووە و نوستووە. بەه-بەه! ئیتر حەسامەوە و گەرمای تاو خەبەری کردمەوە. چوار شەوان بۆ نان خواردن لای عەولاغا و بۆ نوستن من و لباد و پەتووی سەرکانی و حەسەن!



- خەبەرمان داوە بە بارزانی، بچۆ لە گوندی «بن دایزا» ببینە و ئەسپ حازرە.

سالح بامەڕنی، یەکی تۆپنەی زۆر قەڵەو کە لە دەزگای بێسیمدا کاری دەکرد و دەمناسی و جەوانێکی بیست و دوو- سێ ساڵە بوو؛ بە خەیالیش چەند ساڵ بوو عاشقی «مریەمێ سابلاغی» بوو کە لە ڕادیۆوە مامڵێ پێی هەڵگوتبوو! هاتە لام:

- مام هەژار کارێکی زۆر دژوارم کەوتۆتە تۆ؛ چارم لێ بکە! ماینەکەم منداڵە؛ بە قسەم ناکا. منیش دەگەڵ تۆ دێم. تۆ پێی بڵێ بڕوا؛ شەرم لە تۆ دەکا!

- ئەی بە سەر چاو!

ڕۆژی دووهەم بوو کە لە گەلالە بووم؛ تەیارە بۆمبایەکی هاویشت؛ لە مێرگێکی دا. شەفیعی ئەحمەداغای نزیکەی سێ میتر فڕێ دابوو؛ دە قوڕی چەقاندبوو؛ بەلام چی لێ نەهات!

دەگەڵ سالح و ماینەکەی چووینە «بن دایزا». شەو چووم بارزانی ببینم، کۆلان زۆر تاریک بوو، دەگەڵ پیاوێک سەرمان دەسەری یەکتر کوتا؛ یونس عەقراوی بوو. جا وەوە و پێ بکەنە؟

یوونس کە تۆم لە بانزینخانەی هەولێر دیت لە ترسان ڕۆحم پێ نەما!

- ئاگات لە من نییە، کە تۆم دەگەڵ سۆفیان دیت گوتم ئێستا بە گرتنم دەدا!

لە تفەنگی بەتاڵ دوو کەس ترسابوون!

بارزانی لە جوابی پێشنیاری حاجی محەممەد، هەر وەک خۆم بە حاجیم گوتبوو، وای گوت کە هەتا خۆی دەگەڵ دەوڵەت نەکاتە دوژمن، هیچ ناکرێ؛ بەلام فەرمووی کاری چاکی هەر ئەوە بووە کە تۆی ڕزگار کردەوە. جوابی حاجی بە حەمەداغای مێرگەسووردا بەڕێ کرایەوە.

ئەو شەوە لە ناو قساندا باسی جاشێک کرا کە لە باوکی خۆی خراترە. بارزانی گوتی: کابرایەک تووتەڵە سەگێکی دەگەڵ سەگێکی گەورە بردبووە بازاڕ، دەیگوت: زەلامەکە بە پێنج درەم، توتەڵەکە بە دە درەم.

- یانی چە؟

- ئەم زەلامە هەر سەگە، ئەمما چکۆلەکە سەگی کوڕی سەگە و نەجیبترە!

ئەو نوکتەیەم بیر کەوتەوە کە گۆیا حەمەڕەزا بە ڕەزا شای باوکی کوتبوو: تۆ هەر شای، من شای کوڕی شام؛ دەبێ لە تۆ سەخیتر بم!

ماوەیەک لەو ناوە مامەوە. شەوێک لە گوندی «شێخ وەتمان» میوانی مەلاتەها بووم کە پیاوێکی زۆر قسەخۆش بوو. بەیانی کە دەڕۆیشتم گوتی: برا مەلایەک میوانی مەلایەک ببوو؛ بەیانی کە ڕۆیشت دەیبۆلاند و تفی لە ڕدێنی خۆی دەکرد: ئاخر ئەگەر ئەو مەلایەت نەدەناسی خۆ خۆت دەناسی؟ چۆن بوویە میوانی مەلا؟ تۆش ببوورە ئەگەر خزمەتت نەکراوە، خۆشت مەلای!

لە کتێبی «ئەلئەغانی»دا باسی شاعیرێکی عەرەب دەکا کە ناوی «ئیبنولحەمام» (کوڕی کۆتر) بووە. لە گوندێکی لای حەلەب لا دەداتە ماڵێک؛ خاوەن ماڵ دەڵێ: میوان ڕاناگرم.

- تۆزێک ئاوی ساردم دەیە.

- ئاوکێشی بابت نیم!

- لێم گەڕێ لە بن سێبەری دیوارەکەت بحەسێمەوە.

- دیوار بۆ نەناسان بەرز نەکراوەتەوە!

- دیارە تۆ من ناناسی! من ئیبنولحەمامەی شاعیری بەناوبانگم.

- برۆ یەخەم بەردە و کوڕی قەلەڕەشە بە!

مەلامستەفا لە کوێستانی «کیکان» بوو؛ لە چادری مام تەها ناوێک. نووری ئەحمەدتەها گوتی: دەگەڵ سەرهەنگ مودەڕیسی ساواکی -کە ناوی خۆی نابوو عەلی- بە ڕێدا دەچووین، گوتی:

دەتناسم، تۆ هەژاری! گوتم: دیارە ساواکییەکی زیرەکی!

مەلا باقی سەرەتانی بوو؛ ناردبوویانە تاران. ساواک دەوریان دابوو، خستبوویانە بەر پرسیارانەوە. مەلامستەفا خەبەری دانێ کە دەبێ دە بیست‌وچوار سەعاتا بیهێننەوە.

مەلاباقی گوتی: هەژار! لە تۆیان لێ پرسیم؛ گوتم ئەو لە لیۆژەیە و ڕۆژنامەمان بۆ دەنووسێ.

- جا بۆ ڕاستیت گوت؟

- کاکە زۆرم درۆ لەبۆ کردن؛ گوتم با ڕاستیەکێشی تێدابێ!

لە لیۆژە لاوێکی زۆر بالا بلندی بە سەر و سیمایان ناردبووە لام کە ئێرانی کرماشانییە و پەنای هێناوە؛ ناوی داریووش بوو. پاش چەند ڕۆژێک ڕۆیشت. دەفتەرێکی لێ بەجێ مابوو؛ بە خەتێکی زۆر ناخۆش چەند خاتراتی خۆی نوسیبوو کە سەر و بنی خاتراتی مەدحی دەزگاری شاهەنشاهی ئێران و گاڵتە بە گەلی کوردی ڕووت و کەسیف بوو. پاش قەدەرێک گوتیان داریوش گیراوە و ساواک داوای دەکاتەوە. گوتم: ئەو خێر و بەرەکەتەیان بدەنەوە؛ ڕەنگە خۆیان حەز بکەن نەیاندەنەوە!

پێویستە ئەمەش بڵێم: دوای جیابوونەوەی برایم و هەوالانی، حیزب کۆنگرەی بەست و سەرلەنوێ مەکتەبی سیاسی و تەنفیزی و مەرکەزی پێک هێنا. چەند کەسێکی باشی وەک دوکتور مەحموود و حەبیب محەممەد کەریم و هی‌تری تێدابوو. بەلام زۆربەیان پیاوی بێ‌کارە و ئامرهێزی عەسکەری بوون. «لەبەر بێ‌مەلایی بە کەلەشێر گوترابوو بولقاسم...»؛ چونکە -وەک باسم کرد- زۆربەی ڕۆشنبیران و پیاوانی لێ‌زان لە دووبەرەکیەکە ڕەنجابوون و شۆرشیان جێ هێشتبوو.

ڕۆژێک لە «بن دایزا» دەگەڵ دوکتور مەحموود و سمایل عارف و ڕۆژنامەچییەکی ئامریکایی میوانی ماڵێک بووین. سمایل -کە لام وایە لە هیچ هەڕاجە بازاڕێک بە پووڵە سووتاوێکیان نەدەکڕی- ملی لە باسی حیزبی جەلال و برایم نا کە زۆر کەر و نەزان بوون... گوتم: هەر ئەوەندە کە تۆیان بە ئەندام قبوڵ کردبوو بەسە بۆ شایەتی ئەحمەقییەکەیان!

دوکتور گوتی: خۆ ئێمە بۆ مەکتەبی سیاسیمان هەڵبژاردووە!

دەگەڵ بارزانی چووینە سەیرانێکی چیای هەڵگورد. لە خوارەوە گەرما و لەو بەرزە سەرمایەکی زۆر سەخت بوو. پاش بیست و چەند ساڵ تووشی ڕێواسان بووم کە وەک زەمانی فەقێیەتیم بۆ خۆم هەڵکەنم. فرمێسکێکم لە چاو داوەری و بیری زەمانی جوانی و منداڵیم وەک فیلمی سینەمایی هاتەوە بەرچاو...

نیوەڕۆ بوو، لە سەرمان دەلەرزیم. غارم دا ناو کونە چارداغێکی چۆل. جلە مایێکم دیت، پاڵووەکەم کردە ملمەوە و جل وەک پەستەک پشتی داپۆشیم و ڕاکشام. مەلامستەفا سەری کێشا؛ وای دیتم زۆر پێکەنی.

- قوربان سەرمامە؛ ئیجازە بدە برۆمەوە!

داگەڕام گەییمە بەرانبەری «ناوەندێ». خەلکی دێ هاتبوونە پێشوازی بارزانی. چلەدارێکی

خواری باریکیان به سەر ڕووباردا ڕائەنگاوتبوو، پێت لە سەر دادەنا دەلەرزی، دەبوو ئەوسەری بگرن تا دەپەڕیەوە. بارزانی و هەوالانی گەیشتینە سەر ڕووبارەکە و بە سەد دەرد و ئەللا- ئەللا پەڕینەوە. بە مەلاکەی ناوەدێم گوت: مامۆستا ئافەریم بۆ تۆ! مەشقی پەڕینەوە لە پردی سیراتت پێ کردین!

لە چیای هەلگورد بارزانی گوتی: دەیانگوت هەژار نایەتەوە شۆرش. من لام وابوو هەر دێیەوە. ڕۆژێکی دیش کە تازە هاتبوومەوە پرسی: زەبیحی چ دەکا؟

گوتم: موخالیفی تۆیە!

- دەلێن بردووتە مالە خۆت؟

- بەلێ ڕەفیقی چەند سالەم بووە؛ نەخۆش بوو. بەلام لێت ڕوون بێ نەیتوانیوە فکری من بگۆڕێ...

ڕۆژی دوایی من و مەلاباقی بەر لەوانی‌تر داگەڕاینە سەر جادەی لای «چۆمان». دنیایەکی چۆل بوو. لە بن دیواری کۆنە قاوەخانەیەک خۆمان دابووە بەر سێبەر. کوڕە جحێلەیەک هات ڕابرێ، ئیشارەی بۆ لایتەکەی مەلاباقی کرد کە دە بەرگی خاکی گیراوە و بە پشتێندیدا شۆڕ بۆتەوە:

- مامۆستا مەلا باقی ئەوە چییە؟

- هەهۆ- هەهۆ! لاو وایە سیلاحێکی سیرڕیم پێیە؛ بڕۆ!

گوتم: بۆ دلی دەشکێنی؟ جحێلە؛ دلتەڕە؛ وایزانی زوڕنات پێیە و ئەگەر حەیرانێکی بۆ لێدەی دلی خۆش دەبێ!

زیرەکییەکی خۆم: تازە لە بەغدا دوکانم دانابوو. دەگەل دانشجوویێکدا بە ناوی مەزهەر دۆست بووین. چەند سالێک بوو لێک هەلبڕابووین. ڕۆژێک کوڕێک هاتە لام. زۆر بە گەرمی چاک و خۆشی دەگەل کردم.

- ئای کاکە چۆنی؟ خەبەری کاک حەمیدی برات؟

- حەمیدی چی و برای چی؟!

- کاکە تۆ مەزهەر نیت؟

- های قسەی قوڕ چەند پێکەوە هەوال بووین؟ چۆن نامناسیەوە؟ کوڕی شێخی دارە خورمام!

- ئای ڕاست دەکەی؛ ببەخشە!

- بەخوا دلم زۆر لێت ئێشاوە. ئیتر نەچی ئەوجار منت لە بیر بچێتەوە!

- نەخێر خاترجەم بە!

ڕۆژێک لە ئیدارەی مەبانی عام یەکێک هاتە لام. لە دلی خۆمدا گوتم: بڕوانە من چەند نازیرەک بووم. ئەوە مەزهەرە چۆنم لێ گۆڕابوو. هات سەلامی کرد، کۆکایەکم بۆ بانگ کرد.

گوتم: کاکە چۆنی؟ خەبەری کاک حەمیدی برات چییە؟

هەستا گوتی: شەرتە کۆکات ناخۆمەوە! تۆ دیارە دەتەوێ من ئاشنات نەبم، گالتەم پێ دەکەی! پێم گوتی من کوڕی شێخی دارە خورمام! ڕۆیشت و نەگەڕاوە.

لە شۆرشدا ڕۆژێک لە شەقلاوە نانی نیوەڕۆم خوارد. کوڕێکی مەسیحیشم کردبووە میوانی خۆم. گوتیان پوولەکەتان ئەو ئەفەندییە داویە. لێم ڕوانی بە پێکەنینەوە هات:

- کاک هەژار چۆنی؟

- جارێ توخوا پێم بڵێ تۆ کوڕی شێخی دارە خورما نیت؟
- یانی چی؟ ئەگەر وابێ نامناسیەوە. من مەزهەرم!
- دەی کاک حەمیدی برات چۆنە؟!
- زۆر باشە و سەلامت لێ دەکا.

نەقلی خۆم و شێخی دارەخورمام بۆ گێڕاوە. تێر بە زیرەکییەکەم پێکەنی!

دەگەڵ سەرهەنگ نافیز چووینە «زینوێ»ی شێخ و بووینە میوانی شێخ عوبەیدیللا. شێخ بۆ ڕۆژێ ڕەشماڵێکی دەورە بە کەڵەکە بەرد گیراوی هەڵدابوو. بە شەویش دەهاتینەوە گوند. شێخ عوبەیدیللا مامی شێخ عەلائەددین و نەوەی شێخ کەمال بوو؛ شێخایەتی نەدەکرد. پیاوێکی زۆر میواندۆست و بە نان‌وخوان و زۆریش قسەخۆش و لەبەردڵان بوو. سێ کوڕی گەورەی بە ماڵ و ژنی بوو: عومەر -کە خوارزای حاجی محەممەدی شێخ ڕەشید بوو- دەگەڵ سۆفیان دەژیا. سەید عەلی فەقیرۆکەیەکی سادە بوو. مستەفا کە هەمەکارەی کاری ئاغایەتی زینوێ بوو. شێخ ئەو کاتە کچی کاکە ڕەزای دایماوی ژن بوو؛ کە نزیکەی پەنجا ساڵێک لە شێخ کەم تەمەنتر بوو. منداڵی لە شێخ نەببوو؛ بەڵام زۆر کابان و خانم بوو؛ دەست و پوختی لەوپەڕی پەسندیدا بوو. نافیز و من پێمان سەیر بوو کە شێخ لە سەر ئەو هەموو میوانداری و سەخاوەتەی، زۆری حەز لە دەعوەت دەکرد. هەر ڕۆژە بە دوکاندارێکی دەگوت: کەی دەعوەتم دەکەی؟ تاجیری زینوەییش بە ناوی دەعوەتی شێخ، گیسکێکیان لێدەنا و پەنجا کەسیان پێوە دەعوەت دەکرد.

دوای پازدە شەو بە نیازی کوێستانی بەردە پانەی بناری قەندیل چووین و میوانی شێخەی حاجی ڕەسووڵ بووین کە ئاغای گوندی قەمتەرانی بیتوێن و خاوەن مەڕێکی قەوغا بوو. پێنج ڕۆژ لە هاوین ڕابردبوو؛ هەر چەند شەو لە ناو خێوەتێکی زۆر کیپدا و لە بەر ئاگر و بە پێخەفی زۆر نوستین، تا بەیانی لە سەرمان لە بن چنگی خۆمان دا. بەیانی هەموو ئاو ببوونە سەهۆڵ؛ دەست و چاومان بۆ نەشۆرا. بە سوێند و قورعانی خاوەن ماڵ، دوو شەو ماینەوە. گوتیان ئەگەر بەرەو قەڵادزە دەڕۆن، بە کوێستانی قەندیلدا زۆر نزیکە؛ بەڵام چوار سەعاتێک بە سەر بەفردا دەڕۆن. بچین؟ نەچین؟... ناچین! سبەی کە وەڕێ کەوتین تووشی شیوە پەڵەیەکی پڕ بەفر بووین کە مەودای بیست میتر نەدەبوو. پلەکانی لێ پکە! کەوش داکەنە! بە نیو سەعات بە قیرە دەرچووین. هەڵی کردە ورە؛ دنیا لە مژ تاریک داهات. لە سەرمان دەلەرزین. هەمووی سەعاتێکی نەبرد بە دیوی «ئینێ» و «مژدینان»دا هاتین. لەو دیو زستانی سەخت، لەم دیوی عەینی کێو، لەبەر مێش و مەگەز و گەرما وەڕەز بووین. هەردووکمان ئێستر سوار بووین. نیوەڕۆ چووینە «خۆشکان» و شەو گەینە «وەلزێ»، بووینە میوانی شێخ ڕەزای گوڵانی کە کۆنە ئەفسەری پۆلیس بوو. ئێسترەکەی من سواری بووم، فێرە بازدان بوو؛ قەت لە دەراوی ئاسایی نەدەپەڕیەوە. ئەم حیزباب خێوە مانی دەگرت؛ دەبوایە کەنداڵە جۆگەی زۆر هیلاک پەیدا کا و باز بدا. لە سەر بەرەژێرانیش بە ئانقەست بەردێکی بڵندی دەدیتەوە، خۆی هەڵدەدا! ئەو سەفەرە گەییمەوە قەڵادزە. جگە لە ئەحمەد تەوفیق و دەستە و دایرەکەی، زۆر کەسی دیکەی سابلاغیم دیتن. دەگەڵ مینەشەم چووینە «هێرۆ» بۆ لای کاک سەعدی حاجی بایزاغا و سەید محەممەدی ئاجیکەند و چەند کەسێکی‌تر لە خزمانیان. سەیدە شینەی خاڵۆزاشم لەوێ دیت و نۆ ڕۆژان مایەوە و زۆرم خەبەر لێ پرسین کە بۆ من تازە بوون. بەڵام ئەمەی خۆش بوو هەر کەسی لێم دەپرسی چۆنە، دەیگوت: پێرێ یان دوێنێ دیتوومە. نۆ ڕۆژ ڕابرد، تاریخ لە لای ئەو

نەگۆڕا!

چەند جارێک چووینە کوێستانی جەمالەددین بۆ ماڵی حاجیاغای مەحمووداغا. ئێوارانە دەگەڵ کاک سەعد دەگەڕام و شەوان و ڕۆژانمان بە گاڵتە و جەفەنگ ڕادەبرا. عەونی یووسفی کۆنە وەزیری قاسم لە کوێستانی جەمالەددین بوو. ڕۆژانە دەچووە سەر ڕێی قەلەڕەشەی سوێسنیان، هەر کەر و بارێکی کوردی ئێرانی دەدیت، تاریفی شاهەنشای لە لا دەکرد. گوتیان ئەوە چۆتە تاران میوانی ساواک بووە؛ ڕۆژانە سێ بوتڵ ویسکی لێ دزیون. لە سەر ئەوە دەریان کردووە. ئێستا کە تاریفی شا بۆ کەرداری سوێسنی دەکا، بە هومێدە شا بێتەوە و دووبارە بچێتەوە سەر ئەو ئاخوڕە چەورە!

حەسەنی کوڕی ڕەحیمی قازیم دی تازە ببوە پێشمەرگە، لای وا بوو پێشمەرگە دەبێ پیس و چلکن و ڕووت بێ. کالە شڕەیەکی دە پێدا بوو سەگی لێ دەتۆرا! بە هەزار گیرە کەوشەکانی خۆمم دایە کە هەر لە کالەکانی چاکتر بوو. چووبوو لە قەلادزەوە جووتێک کەلاشی تازەی هەورامی بۆ ناردبووم.

ڕۆژێک لە کوێستانی جەمالەددین بووم. کاک یووسف میران -کە ڕوتبەی سەرگوردی لە ئەرتەشدا بوو- دەگەڵ بابەکر پژدەری هاتن لە کێو دیتیانم. گوتیان: حیزب دەڵێ کارمان دەگەڵ بکا. گوتم: نەهاتوومەوە بۆ کار کردن؛ دەمەوێ بێکار ڕایبوێرم. گوتیان مەئموورین هەر دەگەڵ خۆمانت بەرین.

چوومە مەکتەبی سیاسی لە «هەڵشۆ». حەبیب و دوکتور مەحموود گوتیان دەبێ لە ڕۆژنامەی خەباتدا کار بکەی! گوتم: من لە غەڵەتگیری ڕۆژنامەی عارەبیدا زۆر ماهیرم. ئەگەر قبووڵ دەکەن غەڵەتگیر دەبم. ئەگەر خۆشم بە کوردی شتێکم نووسی، لە سەر حیسابی کارەکەم نەبێ؛ چونکە لەوانەیە ئەوی من دەینووسم ڕازیتان نەکا و مەجبوور نیم بە هەوای کەس بنووسم. ئەوی نەتانەویست «ماڵی قەڵب سەر وە ساحیبیەتی!». پێک هاتین و بە ناوی غەڵەتگیر ئەمرم بۆ نووسرا. قەراریش درا مانگێ پازدە دینارم لە بەغدایە بۆ بدەن بە منداڵەکانم. چاپخانە لە «سونێ» بوو؛ چوومە ئەوێ. بنکەی ئەحمەد تەوفیقیش لەوێ بوو. شەریفزادە، سالاری حەیدەری، سولەیمانی موعینی، حەمەدەمین سیراجی، مەلا سەید ڕەشید، حەسەنی ئیسحاقی، مەلا قادری لاچینی، مام عەلی عەجەم و زۆری تریش کە ئێستا لە بیرم نین لەوێ بوون.

سونێ زۆر گوندێکی خۆش و بە ڕەز و دار و بارە. کارگەری چاپخانەش شەش نەفەر بوون. بەر لەوە من بچم، یەکێ‌تری بە ناوی ئاوڕەحمانی مەلامەحموود بە سەرڕا گەیشتبوو. ڕۆژێک مەلایەک لە قەلادزەوە هاتبوو، چووبوون جێگەی چاپخانەیان نیشان دابوو. وە سبەیرا تەیارە بۆمبارانێکی خەستی کردبوو، بەلام بە سەلامەت دەرچووبوو.

لە سەر جۆگە ئاوێکی پڕ لە دار و بار، سەکۆیەکی زۆر خۆش لە بەرد هەڵبەسترابوو؛ بە ڕاستی شاعیرانە بوو. ڕۆژانە جگە لە کاری ڕۆژنامە، بۆ خۆم شیعرم دەنووسی و فکرم دەکردەوە؛ حەزم نەدەکرد کەس بێتە لام. بەلام کوڕگەل لە کۆڵم نەدەبوونەوە. تەرجەمەی خەییامم لەوێ تەواو کرد. سەرەتای بەرەو موکوریانیشم لەوێ هۆندەوە و لە پاشان لە شوێنێکی‌تر تەواوم کرد. چەند مەقالە و شیعریشم بۆ ڕۆژنامە نووسی و چاپ دەکرا. شیعری «مارمێلکە نیم» یەکێک بوو لەوانە و مەقالاتەکەم نەماوە.

ڕۆژێک خاوەن ملکەکەی دەوری جۆگەکە هات. گوتم: مام حەمەد بایی ڕوبعە دینارێک ترێمان بدەیە! سەر دارێکی زۆر بەرز و باریک کەوت کە مێوی لێ هالابوو.

- مامە دەکەوی! هیچ نەبێ کلاشەکانت داکەنە!

پێکەنی: بۆ پێتان وایە منیش وەکو ئێوەم؟ ئەو دارە بۆ من وەک جادە وایە!

تۆزێکی‌تر سەرکەوت؛ دار داهات و مام حەمەد کەوت و دەنگی لە بەر نەهاتە دەر. خوا عافووی کا!

زۆر جار دەمدی پێشمەرگەکان دەهاتن نانی وشکیان وەردەگرت و چێشتیان نەدەخوارد و دەڕۆیشتن. کەوتمە شوێنیان، خۆیان بە ناو دڕکە تووتڕکاندا دەکرد و هەنگوینی شەمە ترێلکەیان دەخوارد کە شانەی بە دڕکانەوە هەڵدەبەست.

لە سونێوە هاتوچۆی هەڵشۆیەم زۆر دەکرد کە مەکتەبی سیاسی لێ بوو. تەیارە حەجمینی لە هەموو کەس هەلگرتبوو. کەشیشێکی ئاشووری زۆر پیرمان دەگەڵ بوو، زۆر لە تەیارە دەترسا؛ کونێکیان بۆ کۆلیبوو. ڕۆژێک تەیارە هات و «ئەبونا بیداری» ڕایکرد بۆ کون. پێش ئەو سەگێک خۆی تێ خزاندبوو؛ لێی مڕاندبوو. هاواری کرد: ڕەمەزان عەقراوی وەرە سەگم لە کۆڵ کەوە!

عەلیە سوورێک خەڵکی گوندی «کانی سێوێ» گەورکان، پێشمەرگەی هەڵشۆ بوو. پیاوێکی زۆر ئازا بوو کە لە دواییدا دەگەڵ سەید فەتاح و چوار کەس لە کێوی «حاجی کیمی» پشت قەرەگوێز شەهید کران. عەلی ئاگای لە کەپران دەبوو. بۆی گێڕامەوە: شێخ محەممەدی هەرسینی -کە عەلی دەیگوت: نەسرینی!- عەلی و چەند پاسەوانێکی دیکەی کەپرانی کۆ کردۆتەوە، سوخەنرانییان بۆ بکا:

- کوڕم! پێشمەرگە نابێ بترسێ؛ نابێ هەوالی خۆی لە تەنگانەدا بەجێ بێلێ. وای دانێن ئێستا تەیارە بێ دەسڕێژ بکا، یەکمان بریندار بێ. نابێ ڕاکەین؛ دەبێ بریندار ڕزگار کەین و گوێ بە تەیارە نەدەین...

لەو دەمەدا تەیارە هات. شێخ لە پێش هەمواندا هەڵات! دەتگوت کەروێشکە و تاژی تێ بەردراوە. چووە پشت دارە بەڕوونێەک و هەرای دەکرد:

- هەڵمەیەن!

- کاکە شێخ بە خوا ئێمەش چاو لە جەنابت دەکەین! هەلاتین...

مامۆستایانی مەکتەب سیاسی و تەنفیزی لە ناو دڕک و دالی زۆر چوغوردا کەپرێکیان کردبوو کە هەرگیز تەیارە نەیدەدیت. نیوەڕۆیەک لایان بووم، تەیارە قرماندی. لە کەپرەوە هەلاتن بۆ ناو بەردەلانی ناو چەم. هەرام کرد: تەیارە ڕۆیەوە؛ وەرنەوە! کاک سامی وەک تیتری سەرمەقالەیەکی ڕۆژنامەی کە من نووسیبووم دەیگوت: «بە قورعان نایەینەوە!».

شەوێک لە کەپری سالح یووسفی بووین، گوتم دڵم خەبەر دەدا کە شتێکی نائاسایی هەیە. هەستام حەسیری بنەخۆم هەڵدایەوە، مارێکی تێدا بوو!

شەڕ لە دەوری قەلادزە ڕۆژبەڕۆژ توندتر دەبوو. بڕیار درا مەکتەبی سیاسی و چاپخانە بگوێزنەوە بۆ لای ناو دەشت. دەستە-دەستە بەڕێ دەکران.

بەیانییەک هاشم عەقراوی بە هانکە هانک هاتەوە کە شەو تووشی لەشکری عیراق بووین و هەوالەکانم بێ سەر و شوێنن. لە کن سەنگەسەر جیپەکەی یووسف میران و خۆی تێدا بووە،

تووشی چرای جیپێک ببوون که ڕووبەڕوویان دێ. دابەزیون کە ئەگەر دوژمن بوو شەڕ بکەن. هاشم بە یەک هەڵاتن شەش سەعات بێوچان هەڵاتبوو؛ کە ئەو خەبەرەی دا. کەچی نە دوژمن، نە تەڕەماش!

بارمان کرد. مەکتەبی سیاسی چووە «سلێ» و مـن و کـاک سامیش بەڕێ کـراین بـۆ لای باڵەکایەتی. سالح یووسفی کرابووە سەرپەرستی ڕادیـۆ؛ کـە تـازە پەیـدامان کردبـوو. لـە پـشت «وەلاش» لە ناو جەنگەڵێکدا کە «گۆڕی گاجووتان»یان پێ دەگوت چووینە کەپرانـەوە. دەگـەڵ عوسمان سەعید و دڵشاد مەسرەف و جەلال عەبدوڕەحمان -کـە هـەر سـێ گۆینـدەی ڕادیـۆ بوون- لە کەپرێکدا بووین و چەند کەپرێکی‌تریش هـەبوون. نـان هـەبوو، پێخـۆر نـەبوو. دەور و بەرمان هەموو ڕەز بوون؛ خاوەنیان ببوونە جاش و بەجێ مـابوون. جـا وەرە تـرێ ڕەشـکە بخـۆ! هەمیشە سەوەتەیەک ترێ لە کەپر بوو. کەس نەبوو ڕۆژێ چەند جار زەرگەتەی پێوە نەدا!

لە ترێ ڕەشکە وەڕەز ببووین، گوتمان با بچین ترێی سپی پەیدا کەین. لە ڕەزێـک پەیـدامان کرد و قەرتاڵەمان داگرت. کابرایەک بە تێلایەوە لەو لاوە هـات. گـوتم: کوڕینـە تـووڕەی کـەن تێلاکوتمان دەکا. من جوابی دەدەمەوە. کابرا سنگی دا سەر تێلا: ئەرێ کاکـە! ئـەو ڕەزەشـتان بە ڕەزی جاشان زانیوە؟

- نەخێر، گوتمان ڕەزی پیاوانە و بە تێرادیوی هاتووینێ!

- دە ئەگەر وا بێ نۆشی گیانتان بێ؛ ڕەزی خۆتانە!

ترس و لەرز لە ورچ پتر بوو تا تەیارە. شەوانە ورچ دەهاتنە ناو کەپران و لێمان دەقووڵاندن.

ڕۆژێک تازە تاو سەری کێوانی زەرد هەڵدەگێڕا، پێنج تەیارە خوت و خـافڵ هاتنـە سـەرمان و بەر تیرباریان داین. قەت دیمـەنی هێنـدە جـوانم نـەدیوە: زەردایـی ئـاگری مووشـەکان وا بـە هەندەسە و ڕێک بۆمان دەهاتن کە نەبێتەوە...

سەیدا سالحی سەرپەرستمان فەعلەی گرت و چەند قولکێکی هەڵقەند کە لە ئایندەدا ئەگـەر تەیارە هات خۆی تێدا وەشارین. قولکەیەکیان نیشان من دا کە ئەمە بۆ تۆیە: قـەبرێکی تـەنگی باریکی تاریک. گوتم: سەد جار بە تەیارە بکـوژرێم ناچمـە نـاو ئـەو قـەبرەوە. ڕۆژانـە دەچـووم، شوێنێکم پەیدا کردبوو لـە نـاو ڕەزێکـدا. کـەس پێـی نـەدەزانیم. بـە ئاسـوودەیی دەمنووسـی، تەیارەش نەیدەدیتم. شیعری بەرەو موکریانم لەوێ تەواو کرد و زۆرم شیعر و مەقالـە بـۆ ڕادیـۆ دەنووسی.

قەرار درابوو بەرنامەیەکی تورکمانیشمان هەبێ. مامۆستا جەلال عەبدوڕەحمان، یەکی نووسی و بۆ خۆی خوێندیەوە. بە ڕۆژ بەرنامە زەبت دەکرا و شەو لە ڕادیۆ گوێمان لێ دەگرتەوە. جـەلال زۆر خۆ بە زل زان بوو؛ نەدەکرا گاڵتەی دەگەڵ بکرێ. کە گوێمان لێ گـرت گـوتم: خودایـە بـۆ خاتری ئەم مەولوودنامە مبارەکە ڕوحمێک بە کورد بکەی!

هەموو پێکەنین و جەلال تووڕە بوو؛ دەنگی لێ گۆڕیم. وە سـبەی شـەو کـە دەسـتی پێکـرد، بێدەنگ دەستمان بۆ دوعا هەڵێنا و هیچمان نەگوت. بۆ خۆی لە فلقەی پێکەنینی دا، گوتی: برا ڕاست دەکەن، هەر وەک مەولوودنامە دەچێ!

جگە لە نان و جار و بارە چێشتێکی ساوار، یان برینج کە ماڵە «خدرمەنگوڕ» ناوێک بۆیان ساز دەکردین، ڕۆژانە یەکی بیست فلس، یانی چوار قرانمان خـەرجی دەدرایـە کـە بەشـی تـووتن و پەڕی نەدەکرد.

«ئەلبێر» ناوێکی ئاشووریمان دەگەڵ بوو؛ حقـووقی بـوو؛ سـەدوپەنجا کیلۆیـەک وەزنی بـوو. چووبووە دەنگی شەڕ زەبت کردن. شەو هاتەوە و زەبت و ڕادیۆی پێ نەبوو.

- ها، مامۆستا؟

- تاریک بوو؛ زۆر ترسام؛ دابەزیم. بە بیرمدا هات لە سەر عەرز مار هەیە، سـواری ئێـسترەکەم بوومەوە. زەبت و ڕادیۆم ون کردن!

دوو مندالی هەش-نۆ ساڵە لـەوێ بـوون. گـوتم: بچـن! هـەر کـەس دۆزیـەوە سـەد فلـسی دەدەینێ. زۆری نەبرد شتەکانیان هێنایەوە کە لە دەم ڕێ بەجێ مابوون.

- مامۆستا ئەلبێر! بتخەینە تەرازوو بارتەقای دە مندالی کورد دێیەوە. بۆ دەبێ ئەوان نەترسن و تۆ بترسی؟!

باران دایدا و ژیان لە کەپراندا زەحمەت ببوو؛ پەنامان بـە گونـدان بـرد. کۆمەڵـێک لـە ئێمـە چووینە «مێرگێ» ژوورێکمان پەیدا کرد. دەچووینە «گـوڕێ گاجووتـان» نانمـان دێنـا. ڕۆژێـک بانگیان کردین و هەر یەکە سێ دیناریان داینێ. پەک لەو خۆشییە! کاک عەبدولخالقی مـدیری هەندەسەی ڕادیۆکەمان، ڕادیۆیەکی خۆی فرۆشت بە هەشت مریشک. پووڵمان نارد لە «خانـێ» گۆشت و میوە و ڤۆدکای زۆریان هێنـا؛ جـەژنێکی شـاهانەمان سـاز دا. جـەلال عەبـدوڕەحمان ناردبووی ڤۆدکای کڕیبوو بەلام نەیدەخواردەوە. لێمـان قـەرز کـرد کـە بـۆی دەکڕینـەوە. ئـەو دەیگوت دەگەڵ نەهار و شام هەر جارە نیو ئیستیکان دەخۆمەوە. دوای دوو ڕۆژ سالح یووسـفی بانگی کردین کە:

- سێ دینار بە سەهو دراوە؛ بمدەنەوە!

- هەیهوو سەیدا! هەزمیش کراوە!

حەبیب محەممەد کـەریم گـوتی: دەڵـێن لـە مێرگـێ ئـارەق خوراوەتـەوە؛ ڕاسـتە یـان نـا؟ هەواڵەکان سوێندیان دەخوارد کە شتی وا نەبووە. گوتم بەڵێ بووە و نووک و بـەدم بـۆ گێـڕاوە. گوتی: وا دیارە مامۆستا جەلال ویستوویە گوناهی خۆی پێ داپۆشێ.

حەز دەکەم باسێک لە کاک عەبدولخالق بکەم کە لەوەتا دیومە تا ئەو ڕۆژە دەمرم لـە دۆسـتە هەرە خۆشەویستەکانمە:

فەقێ بووە؛ بۆتە مەلا. لە سەربازی کراوەتە ئیمام تابوور (قازی عەسکەر). هەر لەبەر خۆشیەوە بە ئیشتیبا دەسکاری ڕادیۆی کردووە. گەیشتبووە ڕادەیەک فرستندەی ڕادیۆی زۆر بـە هاسـانی و نرخێکی زۆر کەم دروست دەکرد. ڕادیۆی نیوکیلۆ واتیمان بە پەنجا هەزار دینار کڕیبوو؛ کە لە کەم جێ دەبیسرا. عەبدولخالق ڕادیۆیەکی مەوجی ناوەڕاستی لە سـیم و بـوتری بـەتاڵ و چەنـد لامپێک لێک دەدا کە سەد دیناری تێ نەدەچوو؛ لە هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاسـت دەبیـسرا! لـە شۆڕشدا ناردیان بۆ چێکوسلاڤاکیا؛ گوتبوویان تۆ لە هـەموو موهەندیـسان مـاهیرتری! بـەلام لـە کارخانە کار بکە و شتی تازە فێر ببە! دوای شەش مانگ هاتـەوە. پێـنج موهەندیـسی ڕادیۆمـان هەبوون کە لە خاریج خوێندبوویان؛ دەبوو عەبدولخالق فێریان کـا! لـە مەلایەتیـدا زۆر زانـا بـوو. کەمتر مەلا لە موجادەلەدا دەگەڵیان دەردەبرد. ئاغلەب گاڵتەی بە عەقڵ و سـەوادیان دەکـرد و مەلا ناخۆشـیان دەویـست. قـەت نەمـدی دەم بـە پێکـەنین نـەبێ. لـە عیـشقی کوردسـتان و ئازادیخوازیدا سووتابوو. چاوی لە ماڵی دنیا نەبوو. بە گاڵتە پێم دەگوت: ئـاخر تـۆ لـە سـەربازی مردوو شوتن، ئەو عیلمی ڕادیۆیەت لە قنگی کامیان دەرهێناوە؟!

بە هەموو هێز و توانای خۆی هەتا شۆڕش هەبوو هەر دەگەڵ بوو؛ وازی لە ماڵ و منداڵ هێنابوو. بۆ شۆڕش لە لەشکرێکی دە هەزار کەسی بە بەهرەتر بوو. لە شکانەکەشدا هاتە سابلاغ، لە تارانەوە چووە ئەڵمانیا. زۆر لە ژیان ناهومێد ببوو. لە ئەڵمانەوە ڕاست چووبووە بەغدا و لە فروودگا گوتی من فلان کەسی موهەندیسی ڕادیۆی شۆڕش بووم و هاتووم ئیعدامم کەن. بەلام ئیعدامیان نەکرد و هاتەوە هەولێر و دوکانی تەلەفزیۆن چا کردنەوەی دانا. زۆر بە داخەوە لە سالی ١٩٨٤دا لە هەولێر تیرۆر کرا و بە ڕاستی گەورەترین زیان لە کورد کەوت...

***

بنکەی ئەحمەد تەوفیق لە پشت گوندی شێخان بە چیایەکەوە بوو؛ کانی و ئاوێکی زۆر خۆشی لێ بوو. هەرچەند لە هەموو بنکەکان دەرهەم بەرهەمی زۆر بوو، کار زۆر بە نارێکی ئەنجام دەدرا، بەلام ئەحمەد پیاوێکی زۆر بە زاکوون و مورەتتەب بوو. پێشمەرگەی ئەو دەرسیان دەخوێند، هەمیشە کاریان دەکرد، کەس زاتی نەبوو لە خەت لادا. نەجار با، دارتاشی پێدەکرد. هەر کەس هەر سنعاتێکی هەبا دەبوو بیکا و بەهرە بە شۆڕش بگەیەنێ. زۆر جار میوانی دەبووم و بەو تەنزیم و ڕێکوپێکییەی زۆرم دڵ خۆش دەبوو. جارێک لەو جارانە لای بووم، ناردبووی لە «خانێ» گۆشت جوانە گایان کڕیبوو. هەر دەمانخوارد و ڕەحمەتمان بۆ گا زەرد دەنارد! لە بنەکەدا ئەحمەد و هەوالانی نیوەڕۆ لە سەر جێگە ڕاکشابوون، منیش لە پاش خۆشوشتنێک -کە ئەحمەد ناچاری کردبووم و پێشمەرگەکانی ششتبوویانم- بە تای دەرپێ لە سەر جێگەکەم دانیشتبووم. کابرایەکی دێهاتی هاتە ژوور، گوتی: کاک هەژار! ئەوە نەخۆشی؟ گوتم: برا ئەوانە بەو حیسابە مردوون. چۆنە هەر لە نەخۆش دەپرسی؟! بوو بە پێکەنین. کابراش قرتەیەکی کرد؛ یانی قسەیەکی سەیرە!

لە پاش ماوەیەک ڕادیۆمان گوێزتەوە بۆ کێوی «گردێم» کە ئەشکەوتی زۆر گەورەی تێدابوو. ڕادیۆ لە ئەشکەوت دامەزرا. کارگەرانیش وێ کەوتین، لە ئەشکەوت و کەپردا جێگەی خۆمان کردەوە. کەلێنە بەردێکم دیتەوە، دیوارێکم لە پێش کرد و دەرگایەکم تێ خست. ئەوەندە تەنگ بوو، ئەگەر تێیدا ڕادەکشام کەسیتری نەدەبرد. دەبوایە دانیشم کە یەکێک بهاتبایە دیدەنیم. نێوم لێ نا «قەسری شایۆ»! کە لە فەڕەنسا مەشهوورە. هەوەڵ ڕۆژ کە لێم ڕوانی، کەلێنە بەردەکە بەرەو ژوور تەنگ و تاریک بوو. چووم سێڵێکی پڕ لە پۆلووم هێنا، مستێک دەرمانی «دی.دی.تی.»م بە سەرەوە کرد و دەرکەم داخست. پاش تاوێک سەرم دایەوە؛ دوو دووپشک و چەند جاڵجاڵۆکە و هەڵەپەزەی تێدا مردبوو. لەتە دەرکێک تەختی نوستنم بوو. فانووسێکم هەبوو. قەدەرێک تا شەو درەنگێک لەبەر فانووسم نووسی و لە سەر دەرگا -کە لێفەم لە سەر ڕاخستبوو- نوستم. بەیانی کە هەستام ڕوانیم مارێک -کە بە دەرمان شل بووە- هەر هێندەی بۆ کراوە بە گێژی و شلی گەیوەتە سەر جێگاکەم. قورسایی منی کەوتۆتە سەر و لە بنمدا مردووە.

لە چیرۆکی کۆندا دەڵێن فلان جێگە شای مارانی لێ بوو؛ بە هەزاران ماری لێ کۆ ببوونەوە. بە ڕاستی «گردێم» شوێنێکی وا بوو. کێوەکە خۆڵە پۆتینەیەکی بۆر بوو، ئەوەندەی مار هەبوو نەبێتەوە. مارەکانیش هەموو کۆرەمار (کوڵەوەیباب)؛ بۆری سپی واشی زگزلی کلک زۆر باریکی سەر سێ سووچ بوون کە پێوەدانیان یەکاویەکە و گامێشیش فەراق لێ دەبڕێ. نیوەڕۆ و شەو دە چووین لە ئەشکەوتێک نان بخۆین، قەت نەبوو لە ڕێگە کەسمان تووشی مار نەبێ. ڕۆژێک لە

سەر بەردێک لەبەر تاو ڕاکشابووم، عەبدولخالق هاتبووە لام، هەرای کرد: کوڕە هەڵێ مار پێتەوە دەدا! هەستام، مار لە بەر دەرکەوە خزیە خوار. گوتم: کاکە بە خوا من زاڵم بووم، جێگەی ڕۆژانەی ئەوم داگیر کردبوو!

جارێک بیلامانێ لە کەلێنە بەردێکا دەستم بە ئاو دەگەیاند، کە ڕوانیم مارێک لەو کولەوەیبابانە، نیو میترێک دوور لە بەرانبەرم پاپۆکەی خواردووە. گوتم: خاترجەم بە! تازە تا کاری خۆم نەکەم هەڵناستم! هەر تماشای یەکترمان دەکرد، تا ئەو شەرمی لە من کرد و هێدیکا جێگەی خۆی بۆ بەجێ هێشتم. پێشمەرگەکان سێزدەماریان لە ڕۆژێکا کوشتبوو، نابوویانە ناو زەنبیلەیەکەوە و پووشیان بە سەر دادابوو، بردبوویان بۆ مەکتەبی سیاسی:

- فەرموون میوەی گردێمە، بە دیاریمان بۆ هێناون!

سەری پووش هەڵگرە و سەیری مامۆستایان بکە چۆن ڕادەکەن!

زۆر بێ پێخۆری بوو. ڕۆژێک جوانە گایەکی زۆر قەڵەومان بۆ هات کە بارزانی ناردبووی. جا وەرە گۆشت ببرژێنە! بە دووکەڵ تەیارە زانیبوویان. چوار تەیارەمان هاتە سەر؛ لێدە و بوکتە! گوتیان ڕاکەن و خۆ بشارنەوە! گوتم: هەزار بۆمبام وێ کەوێ، دەست لە گۆشت بەرنادەم! هەر چی کردیان نەبزووتم و گۆشتی بەشی خۆم برژاند. بۆمبای ناپاڵمیان پێدا دابووین، تەختی فەنەری لە ناو ئەشکەوتدا ببوونە چنگێک گوراسن؛ لە گەرما توابوونەوە. چەند ڕۆژان بەردی ئەشکەوتێ کە ڕادیۆی تێدا بوو گڕی هەر بەرز بوو. قەسری شایۆی منیش کەس نەیدەزانی جێگاکەی لە کوێ بوو. ئیتر تەیارە فێر بوون و هەموو ڕۆژ سەریان دەدایـن. شەوانەش تەیارە هەر لە عاسمان خولیان دەخوارد و بۆمبایان دادەباراند.

شەوێک دەگەڵ سێ پێشمەرگە لە گەلالە بووین. بوو بە قرمەی تەیارە. چرا کوژابوونەوە، دەرکەوتین بڕۆین، من جغارەی داگیرساوم بە لێوەوە بوو. کابرایەک جنێوێکی دا و خرەی لە چەخماخ هێنا بمکوژێ.

- کاکە فرێی دەدەم و مەمکوژە!

بەو شەوە -کە زۆر تاریک بوو- بێ ڕێگا بە «گردێم» هەڵگەڕاینەوە. چەند جارێک دەکەوتین و ترسیش هەبوو بە سەر ماردا بکەوین. عوسمان سەعیدی (وێژەری ڕادیۆ) بەڕێ دەکرا بچێ دەنگی شەڕ زەبت کا. گەردنازایی خواست کە مەبادا نەیەتەوە. دڵشاد مەسرەف گوتی: مامۆستا سەعید! خوا نەکا مەرگت ببینم؛ بەڵام قەزا و قەدەرە. ئەگەر نەهاتیەوە لێفە و سەرینەکەت چ لێ بکەین؟

- دڵشاد با بۆ تۆ بێ.

- دە بڕۆ یا خوا نەیەوە! خۆ من دوو مانگە پەتووێکیشم نییە!

خەمی ڕۆژانەمان بە گاڵتە و گەپ سواغ دەدا. یەکێکمان نامەیەکی زۆر ناسک و دلدارانەی لە زمان کچێکی ڕەواندزی بە ناوی «ڕووناک» بۆ عوسمان سەعید نووسیبوو، عوسمان لە هەموو بەرنامەیەکدا خوشکە رووناکی ڕەواندزی باس دەکرد کە کیژە کوردی ڕاست ئاوا دەبێ!

پێشمەرگەی بە ناو خزمەتکاری ڕادیۆ زۆر لە لازم پتر بوون. هەر بێکارێک دەچووە لای ئیدریس -کە لە گوندی قەسرێ بوو- دەیگوت بچۆ ڕادیۆ. دەگەڵ عەبدولخالق شەو چووینە «مقەسرێ». شێتێکیان لە بارزانەوە هێنابوو بە گوریس بەستبوویان. ئیدریس گوتی: دە ئێستا من چ لەوە بکەم؟ گوتم: بینێرە بۆ ڕادیۆ، ئێمە جێگەمان زۆرە!...

کاک خالیداغای حیسامیش هاتە «گردێم» بۆ ڕادیۆ. چەند شەوێک کە لـە سـەفەردا دەبـووم، قەسری شایۆم دابوویە. شەو لەبەر فانووس کتێبی خوێندبۆوە، مارێک لە حـەواوە کـەوتبووە نـاو پەڕی کتێبەکەی!

بۆی گێڕامەوە: منداڵێک مەنجەڵێک ماستی بۆ خالیداغا هێناوە کە مەحمووداغا ناوێـک بـۆی ناردووە. تەنیا ناوی ئاغایەتی دوور بە دوور کردوونیە دۆست! منداڵەکە دەڵـێ: مەنجەڵـەکەم بـۆ بەتاڵ کە! پێی دەڵێ: سەرێک برۆ، وەرەوە!

قاپی نییە. نیشتۆتە سەر مەنجەڵە ماست و لیسی داوە و شەش ڕۆژان نەخۆش کەوتووە!

دەگەڵ کاک سامی عەبدوڕەحمان ناردراین بۆ «لێوژە» لە ناو دەشت، کە بە سـەر چاپەمـەنی ڕابەگەین.

بێ جێ نییە بگەڕێمەوە سەر باسی هەڵاتووەکان بۆ تاران و هەمەدان:

مامۆستا لە تاران خۆش ژیاون. پێشمەرگەیتریش لە هەمـەدان، لـە پادگانێـک کـۆ کراونـەوە مەشقی سەربازی دەکەن؛ کە ڕۆژێک دژی بارزانی بێنەوە مەیدان. جێژنی بیـستویـەکی ئـازەر دەبێ بە شادمانی ئەو ڕۆژەی کە جمهووری مەهاباد تێک چووە، جێـژن بگـرن. دەبێتـە هـەرای پێشمەرگەی دلسۆز:

– چۆن ئەوە ڕەوایە؟ ئەگەر ئەم جێژنە بگرین دەبێ لە هەموو بێ ئابڕووێک ڕیسواتر بین...

مامۆستا عومەر دەبابە نوتقیان بۆ دەکا:

– دەی جێژن گرتن چییە؟ بۆ ئابڕوومان دەچـێ؟! لای کـێ ئابـڕوومان دەچـێ؟! هـەر وەک جـەنابی تیمـسار نەسروڵـلاهی فـەرمووی: ئەگـەر ئەعلاحـەزرەت بفـەرموێ گـوو دە ڕیـشتان هەڵسوون! ئەیکەین. دوایی بە سابوون و ئاو ئەیشۆینەوە، سابوون فرەیە و ئاویش فرە...

ئەوانەی ئابڕووی کوردایەتیان لە لا گرینگ بووە، گوتوویانە خۆمان ڕیش بە گوو ناکەین؛ کێشە کەوتبووە نێوانەوە. هێندێک هەر لە گەڵ جوێ ببوونەوە. «مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی» -کە لە سەر زۆر شتیتر تووڕە ببوو- هەر چەند لە «ماوەت» قـازی شـۆڕش و ڕەگەڵـیان کـەوتبوو، هـاتبووە تاران و سەربەخۆ ببوە پەناهەندە و لە ڕادیۆ دامەزرابوو.

ڕۆژێک لە هەڵشۆ دەمڕوانیە کێو. ڕەشاییەکم دیت؛ هات و نزیک بۆوە. «سەفەر» ناوی فـەیلی بوو کە پێشووتر تفەنگێکی فرۆشتبوو؛ دەبوایە محاکەمە بکرێ.

– ها سەفەر، خێرە؟

– کاکە! لە هەمەدان ڕامکردووە؛ هاتوومەوە با محاکەمەم بکەن و بمکوژن.

– حالتان چۆن بوو؟

– حالی سەگ! پێشمەرگەیەکمان لە ناو مەنجەڵی دە عەرزی گیراوی پادگان -کـە ماشـیان تێدا لێنابوو- کەوت و بوو بە شەهیدی ماشێنە!... مام هەژار! ناوێکیان لێ نابووین ئەوەندەی پێ قەڵس بووم، تا دەیانگوت، دەتگوت هەزار جوێن بە باوکم دەدەن!

– ناوی چی؟

– لە بیرم نەماوە.

– دلاوەر؟

– نەخێر.

– چریک؟

- بریا چریک با!
- جەوانمەرد؟
- کوڕە نەخێر زۆر ناوێکی پیس بوو...
- سەفەر ئەو دەم کە من لە ئێران بووم، بە هی وایان دەگوت: غەیرە نیزامی.
- ئای دەم خۆش! ڕاست ئێژی. غەیرە نیزامی زۆر لە جاش پیسترە! من لە داخ ئەم ناوە هەڵاتم!

کاتێ کە شەڕمان لە ساڵی ١٩٦٥دا ڕۆژ بە ڕۆژ توندتر و خەستتر دەبوو، مەلامستەفاش دەگەڵ ئێران ڕێک کەوتبوو، تاران حوکمی لەو غەیرە نیزامیانەی خۆی کرد کە دەبێ بچنەوە و لە شۆڕشدا بەشدار بن. واشیان کرد کە بارزانی عەفوویان بکا. هاتنەوە؛ برایم ئەحمەد لە تاران مایەوە. مامۆستاکان هێندێکیان چوونە گوندی «وەڵزێ» و بەشێکیان -کە جەلال تاڵەبانی دەگەڵیان بوو- لە «دۆڵەڕەقە» لای هەباساغا مانەوە. پێشمەرگە چەکدارەکانیشیان، بەشی هەرە زۆریان هاتنەوە ناو لەشکر و لە شەڕاندا بەشدار بوون. کاک عەبدولخالق -کە دە پێشدا موهەندیسی ڕادیۆکەی ماوەت بوو- دەگەڵیان چووبووە هەمەدان. لە گەڕانەوەدا هاتە ڕادیۆی شۆڕش و پێکەوە بووینە ئاشنا.

دەگەڵ کاک سامی ڕۆژنامەی «خەبات» و «ئەخباری کوردستان»مان وەک مەجەللەیەکی هەفتانە دەنووسی. شەو تا ڕۆژ لە بەر چرا زەنبووری کارمان دەکرد. بە ڕۆژ دەبوو خۆ لەبەر تەیارە وەشێرین. کە لە بەغداوە هاتبووم، چاوم زۆر بە حوکم بوو؛ لە جحێلی بیست ساڵە چاکترم دەدیت. چاوم لە شۆڕش زۆر کز ببوو. دوکتور پێی گوتم هەمووی خەتای چرا زەبنوورییە؛ کە لە نزیک چاوتەوە بووە و لە بەرت نووسیوە. حوکمی چاوم نیواونیو هاتبووە خوار و بێ عەینەک چم بۆ نەدەکرا.

لەم بەینەدا کە لە «لێوژە» بووین، شەوێک باران دەباری؛ پاش نیوەشەوێکی درەنگ، چوار پێشمەرگەی بادینانی خۆیان کرد بە ژووردا کە ئێمە بە فەرمانی دەروێش‌بەگی سەرۆکمان پیاوێکمان گرتووە؛ لە ڕێگە هاتوون لێیان ستاندووینەوە. ئەمری کوشتنمان پێ نەبووە. ئێوە دەڵێن چی؟ کاک سامی گوتی: ئێمە ڕۆژنامە دەنووسین؛ کارمان بە سەر ئەو کارانەوە نییە. گوتم: برا هیچ مەوەستن! بڕۆن ئەوانە بکوژن کە هاتوونە سەر ڕێتان. غاریان دا. سامی گوتی: حەقت چییە فتوای وا دەدەی؟ گوتم: کاکە ئەوانە دیارە زۆر خوێڕین. ئەگەر هیچ غیرەتیان هەبا حەبسییان لێ نەدەستاندنەوە. ویستیان بڵێن لە چاپخانە گوتوویانە: نابێ شەڕ بکەن! دەیانەویست پینە بە سەر ترسەنۆکی خۆیاندا بگرن. بەڵێ هەر وا بوو. نەچوونە شەڕ و چووبوونەوە بنکەی خۆیان!

ژنێک چەند قوتوو مەرەکەبی چاپی بۆ هێناین.

- سەیرە ئەمەت لە کوێ بووە؟

دەرکەوت «ئاورەحمانی مەلا مەحموود» -کە بەر لە من سەرپەرستی چاپخانە بوو- دزیویە و کەس نەبووە لێی بکرێ؛ داویە بەو ژنە بۆمان بگەڕێنێتەوە.

گوندی لێوژەم جارێکی‌تریش دیبوو؛ ئەویش لە سەرە بەهاری ١٩٦٥دا دەگەڵ کاک نافیز کە باسم کردووە. لە «قەسرێ»وە بە ڕۆژێکی باران هاتین. لە چۆمی «وەسان» سێلاو هاتبوو؛ بوار نەبوو. من بە سواری ئێستر لێم دا. ئاو تا نزیک سینگم هات و چی وا نەمابوو ئێستر بخنکێ،

گەڕامەوە. ناچار دوور کەوتینەوە و لە پردی «بەرگرکە» پەڕینەوە. ئێوارە بوو؛ من پێش کەوتبووم. ئێسترەکەم لە نزیک پۆلە سپینداریک، لاقی چەقاند: نارۆم! بە شوولی تەڕ کەوتمە گیانی، بێ فایدە بوو. کە ڕوانیم ژنێکی قەڵەو وەک دێڵەدێو، ڕووتە و خۆی دەشوا. بانگم کرد:

- دایکم! من و ئێسترەکەت تۆقاند!

ڕایکردە پشت داران و ئێستر بە فشقەفشق ڕۆیشت!

نابەڵەد بووین، شەومان بە سەردا هات و کەوتینە ناو پنچک و داری دەم چەم. نافیز هەر هەرای دەکرد: «کەنگێ دەگەینە لێو گووی؟!» ئاخری چرایەکمان بەدی کرد. منالێکمان دەگەڵ هات و بردینیە ناو گوند. بووینە میوانی شێخ ڕەزای گوڵانی. ئەو ڕۆژە لە جەنگەی باران و تەڕیدا، لە هەورازی وەسان، تووشی لاوێک هاتین، باریک و ڕەنگ زەرد؛ بوخچەیەکی پێ بوو؛ بۆم هەڵگرت. گوتی خەیاتم لە کەرکووک و دەچمەوە. تووشی پڕایی جەنگەڵێک هاتین؛ لاوەکە گوتی: لەو سەر کە هاتم، شەو لێرە ئیستراحەتم نەبوو.

- ها، دیارە لە دێ بووی و کێچ هەبووە و تۆ شارستانی و ناسکی!

- نەخێر، دێی چی؟ لێرە لەو لێرەوارە بارانم لێ دەباری؛ ڕێگەم نەدەزانی؛ چوومە سەر ئەو دارە زەلامە نەوەک تووشی ورچ بم. زۆر تەڕ دەبووم؛ جارجارە دەهاتمە خوار، خۆم ڕادەژاند ئاوم لێ بتکێ و دەچوومەوە ناو لک و پۆپی دار. تا سبەینە وڵات ڕووناک بوو، ڕۆیشتم.

من پێشنیارم کرد کە حەیفە جەلال تاڵەبانی لە دۆڵەڕەقە بێکار دانیشێ؛ قەڵەمی باشە. با بێتە لامان و لە نووسیندا هاوکاریمان بکا. نامەیەکیان بۆ نووسیبوو کە وەرە مەکتەبی سیاسی کارمان پێتە! وا تێگەیبوو کە دەیکوژن. شەوێک دەگەڵ هەواڵانی دۆڵەرەقەی ڕایکردبوو؛ چووبووە بەردەستی حکوومەت و بردبوویانە بەغدا. ڕۆژی ١٩٦٦/١/١ بوو. برووسکەمان بۆ هات کە جەلال ڕایکردووە. ناومان لێ نان: «جاشی مودێل ٦٦»، کە تا ئێستاش ئەو ناوەیان لە کۆڵ نەبۆتەوە. ئیتر جەلال و هەواڵەکانی لەو ساوە بوونە چەکداری دەوڵەت و زۆر بێڕوحمانەتر لە سەربازانی عەرەب شەڕیان دەگەڵ دەکردین. تەنانەت «عومەر دەبابە» ببوە شارەزاکەری تەیاران و دێهاتی دۆستی شۆڕشی بۆ دەستنیشان دەکردن. دەوڵەت ناوی لێنابوو: «برا عومەری قارەمان».

ڕۆژێک لە گەلی بەدران، تەیارە -وەک هەموو ڕۆژانیتر- بۆمبارانی کرد. زیاد لە خەڵک، لاوێک بە ناوی فەتاح، سەری نابووە کونە بەردێکەوە و لەشی بە دەرەوە بوو. ساچمە بەردێکی کە بۆمبا بڵاوی کردبوو وێکەوت و شەهیدی کرد.

«عەرەب کەلەکس» ئەفسەرێکی ئەرتشی عیراق و زۆر قسە سەیر بوو. خۆشیمان ئەوە بوو چەند کەسێک لە دەم کەنداڵ لێی کۆ دەبووینەوە کە ئەو سەرگوزەشتی خۆی بگێڕێتەوە و پێبکەنین. ڕۆژێک «عەلی سنجاری» -کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو- هاتبوو لە پێکەنیندا بەشدار بێ، تیلگرافێکیان بۆ هێنا؛ خوێندیەوە و ملی لە نووکە و گریان نا:

- باوکم مردووە.

بە سەرکزی ڕەگەڵی کەوتین و هاتینە لای سکرتێر «حەبیب محەممەد کەریم»:

- ها، خێرە؟

- کاک عەلی باوکی مردووە.

- دەی جا چ بووە؟! دەڵێن باوکت سێ ژنی هەبوو. تێری کەیف کردووە! دەمرێ جێگەی

خۆیەتی!

گریان کرایەوە بە پێکەنین.

من لە شۆڕشدا لەبەر تەیارە خۆم نەدەشاردەوە. خەڵک لایان وا بوو ئازایەتییە و لەوان بەغیرەتترم. بەڵام لە ڕاستییەکەیدا من تەنبەڵتر بووم؛ تاقەتی خۆ شاردنەوە و ناو کون چوونم نەبوو. دەمگوت هەرچی دەبێ ببێ و مردن هەر جارێکە...

گردێکی بە ئەشکەوت و دارستان هەبوو، تا تەیارە دەهات، خەڵکی دێمان دەناردە ئەوێ. ڕۆژێک کە دەمانزانی تەیارە دێت، هەموو چووبوونە گردەکە. من لە سەر تەختە فەنەریەکەی خۆم نوستبووم، ژنێک «ئایشێ مەلا» ناو، زۆر بە ترساوی و شێواوی خۆی بە ژوورەکەمدا کرد:

- مامۆستا چ بکەم؟ ناگەمە گرد، ئەوا تەیارەش بۆمبای هاویشتووە و دەشهاوێ؛ دەخیلە فکرێکم بۆ بکەوە.

- خاتوایشێی بەڕێز! یان دەبێ خۆت بگەیەنیە گرد، یان وەرە سەر تەختەکەی من!

- ئەیرۆ لەو تەنگانەیەدا قسەی چۆن دەکا!

دەرپەڕی و خۆی گەیاندە بن داران. تا بۆمبای داویشت، تەختەکەم و دیوارەکان دەلەرزین؛ بەڵام چم وێ نەکەوت.

شەوێک چەند میوانێکمان هات، دەبوو لە سەربان بین. گوتم: چرا زەنبووریەکە هەڵدەکەم. لە سەر من؛ خاترجەم بن تەیارە نایە! یەکێ نەیگوت چۆن بە قسەی تۆ خاترجەم بین؟! چرام هەڵکرد و تەیارە هات؛ جا وەرە هەڵێ!

ڕەمەزان هات. ئێمە کە شەو تا ڕۆژ کارمان نووسین بوو، پارشێوان مەلامان خەبەر دەکردەوە کە هەستە سەلا بکە. مەلا دەیگوت: هەر چەند بۆ خۆتان بەڕۆژوو نابن، بە قورعانی لێم خوێندووە خێری ڕۆژووی ئەم گوندە نیوەی بۆ ئێوەیە!

«عەولای مەلا» ناو - مێردی ئایشێ مەلای باسم کرد- ڕاوچی بوو؛ بە شوێنی کارگیشی دەزانی. خۆی زۆر خەسیس بوو؛ چی بوایە بە ئێمەی دەفرۆشت: کەو بە سێ تمەن و کۆتر پازدە قران. شەوانی سەرما سۆپەمان نێل دەدا؛ کە دەبووە پۆلوو، تەنەکەیەکی دوو کیلۆیی ڕۆنی شاپەسەندی بەتاڵمان پڕ دەکرد لە کۆتر یان کەو، سەرمان دەگرت و لە ناو پۆلوومان دەخست. شەوێک تەقیەوە، لامان وا بوو بۆمبای وێ کەوتووە!

حەمید عوسمان -کۆنە ڕەئیسی حیزبی شیووعی- ناردرابووە لامان هاوکاریمان لە نووسیندا بکا. شەو کە من خەریکی کۆتر پیشاندن بووم، گوتی: نە تۆ، نە سامی نازانن شتی باش بنووسن؛ من فێرتان دەکەم.

- وەک چی؟

- پێویستە نامیلکەیەکی تایبەتی دەرکەین، مەسەلەن: «چۆن دەبییە پێشمەرگەی چاک» و شتیتریش...

گوتم: کاکە حەمید، تکایە هەوەڵ نامیلکە بنووسە: چۆن کۆتر دە سۆپەدا دەپیشێنی؟!

تووڕە بوو، گوتی: ئێوە گاڵتە بە هەموو شت دەکەن!

ئێوارەیەک سالاری حەیدەری، سمایلی شەریفزادە و چەند پێشمەرگەیەکی تری ئێرانیم میوان بوون. شەو کە جێگەم نیشان دان، لە سەر لباد و حەسیر کێشەیان لێ پەیدا بوو؛ سالار بە تووڕەیی ڕۆیشت. بەیانی هاتەوە، گوتی: چوومە ماڵە جەواداغا؛ کەس لە وەتاغ نەبوو. نوێنم

دیتەوە و نوستم! بە ڕاستی قەت پێشمەرگەی هێندە وریا و بەپێم نەدیتبوو.

مەکتەبی سیاسی لە گەڵی بەدران بوو؛ کە نزیکی لێوەژەیە. زۆرمان هاتوچۆی گەلی بەدران دەکرد. گەلی لە نێوان دوو کێودا ئەوەندە تەنگە، ڕۆژی بەهاری سێ سەعاتە. لای ڕۆژاوای ئەوەندە بەردەلان و سەختە، ورچی پێ هەڵناگەڕێ. پلنگی زۆرە. چەند حەپسیەکی عەرەب شەو هەڵاتبوون؛ لە ترسی پلنگ هاتبوونەوە ناو حەبس.

جارێک میوانی «گردێم» بووم، تەیارە هات. من دەگەڵ سامی تازە خواحافیزیمان کردبوو. لە ڕێ کە دەمروانیە تەیارە، بریقەیەکی لە کلکی دەرچوو. گوتم ئەها پێکرا! هەر گەیشتینەوە «لێوژە» خەبەر هات کە تەیارەیەکی سۆخۆی کەوتووە. ئەو ڕۆژەش سەید ڕەسوولی بابی گەورە و چەندێک لە هەوالانی ئێرانی میوانم بوون؛ کە لام وایە شەریفزادە و سالاری حەیدەریش دەگەڵ بوون. بە پەلە هاتینەوە بەرەو «چۆمان» کە تەیارەی کەوتوو تماشا کەین. لە ڕێگە تووشی تاقە ماڵەیەک هاتین لە زار گەلی؛ کە ڕێگە و قونەبانی ماڵەکە یەک بوون. سەگێکی زۆر دڕی بۆرەلووکە شالاوی هێنا. بە گۆچان بۆی چووم. هەر ئەو هێرش دەهێنێ و من گۆچانی لێ ڕادەوەشێنم و کەم-کەم پێ‌دزە دەکا کە گۆچانی بەرنەکەوێ. پاشەوپاش لەو سەربانەوە کەوتە خوار و قوڕاندی. خۆمان گەیاندە کەلاکی تەیارە. ئەحمەد تەوفیق و چەند کەسێکی‌تریش لە شێخانەوە هاتبوون. کەلاکی خەلەبان سووتابوون؛ کە دوان بوون؛ ببوونە خەڵووز. هێندێک نیشانەی تەیارە کەوتنمان کۆ کردەوە و شەو بووینە میوانی ئەحمەد. «کاخدر» ناوێک خەڵکی گرشەیتانی بەری مێرگان، لە شووشە تەیارەکە -کە پلاستیکێکی ڕوونی ئەستوور بوو- دەسکی خەنجەری تاشیبوو؛ بە دیاری دای بە من؛ کە ڕۆژنامەنووسی ئورووپایی دەیانگوت: «خەنجەرەکەت شیعری هەرە چاکتە!...». ئێستاش ئەو خەنجەرە یادگاریەم هەر ماوە.

لە مانگی ئاپریلدا «سەلام عارف» وێڕای زاهید محەممەدەکەی باسم کرد، لە تەیارەدا سووتا. براکەی (ئاوڕەحمان عارف)، بوو بە جێ‌نشینی و «بەزاز» کرا بە سەرەکوەزیر؛ بەلام شەڕ هەر نەوەستا. پێشمەرگە لە زۆر شوێنان زۆریان شکست بە دوژمن دا. دوژمن لە لای ڕەواندزەوە هاتە پێش؛ سەری چیای هەندرێنی گرت و تۆپیان تا نزیکی گەلالە دەهات.

مەلامستەفا هاتە مەکتەبی سیاسی لە گەلی بەدران. لە ڕەشمالێکدا بوو؛ چوومە لای. تاوێک مابووم، چای نەبوو. گوتم: دەڵێن جافر سوڵتانی هەورامی لەشکری لە ئێران کردبوو؛ کابرایەکی هەنبانە بە کۆڵ لە دوای لەشکر دەڕۆیشت. لە جوابی پرسیاردا کە چت پێیە؟ گوتی: «تووی وشکە و تۆشەی سوڵتانە!»؛ تۆ بە ناشوکری ناڵێم چاییشت نییە! سبەی ئێوارە چووم بیبینم، لە شێوەڵەیەکدا دەگەڵ هەباساغا بوو. بە هەباساغای گوت: دەزانم لە شۆڕش ماندوو بووی و بێ پرسی من دەگەڵ ئێران و عیراق وتوویژ بۆ مەسلەحەتی خۆت دەکەی! من مستەفام؛ بمناسە! بە گوللە داتدەبێژم! ئەو هەباساغا فیلەتەنە لنگی دەلەرزی...

خەبەری سەرکەوتنی دوژمنیان دایە کە هاتووە بە دیوی بالەکایەتیدا. قەراری دابوو زۆر لە ئاغایانی ولات لە گەلی بەدران ببینێ. عەسر بوو؛ گوتی دەچم و دێمەوە. بە سواری ئێستر ڕۆیشت. خۆی چووبووە جەبهە. حەفتا کەسی بە سەرکردایەتی «فاخری حەمەداغا» ئامادەی هجووم کردبوو؛ کە هەر دەبێ ئەوی لێیان گیراوە بیسێننەوە. شەڕ هەڵگیرسابوو. هەوەڵ تۆپمان -کە ستوان خدر ناوێکی لە سەر بوو- سەنگەرێکی دوژمنی لە ڕیزی پێشەوە پێکابوو؛ ئەوسا هجووم کرابوو. بێسیمی دەوڵەتمان لە ڕادیۆ دەبیست کە چۆن شکانێک شکاون.

ڕۆژنامەگەرێکی زەلامی فەڕانسی خۆی گەیاندە شەڕگە. بە قسەی ئەو پتر لە دوو هەزار کلاوخودی سەربازان لە شەڕگە بەجێ مابوو. کەلاک هەر باسی ناکرێ... لەشکری دوژمن قلب بۆوە. خۆیان کوتایەوە ڕەواندز. جگە لە سەدان تفەنگ و دەیان بێسیم، چوار تۆپی زۆر گەورە و بە هەزاران پەتوو، جلکی سەربازی، بە دە هەزاران فیشەک، بوو بە تالانی. تەنانەت کۆتی فەرماندە بە ئەستێرەوە و جەواڵێکی نایلۆن پڕ لە نەخشەی شەڕ دەس کەوت. سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو. لەو هەموو شەڕەدا دوو پێشمەرگە شەهید کران کە یەکیان عوسمانی ناو بوو؛ ئەوی‌تریشم لە بیر نەماوە.

ئیتر دەوڵەت لە شەڕی هەندرێنەوە زاتی شکا و «عەبدوڕەحمان بەزاز» بەیانی بڵاو کردەوە کە لە ڕێگەی گفتوگۆوە مەسەلەکە حەل بکرێ. گوتیشی عاقڵەکانی کورد لە بەغدا تێدەگەن کە من مەسلەحەتی کوردم دەوێ. مەنزووری لە برایم ئەحمەد و جەلال و هەوالانی بوو.

برایم کە لە تارانەوە نەهاتە شۆڕش، لە زەمانی عەبدوڕەحمان عارفدا بە تەیارە چووبووە بەغدا. گوتیان ڕۆژێک چووبووە لای ڕەئیس‌جمهوور، ژمارەیەک خەباتی ئێمەی بۆ بردبوو؛ شیعرێکم کە لە سەر برایم نووسیبوو؛ نیشانی دابوو؛ بۆی تەرجەمە کردبوو؛ گوتبووی: ئاوا ئەوان ئابڕوومان دەبەن. تۆ ڕۆژنامەیەکمان نادەیەی جوابیان بدەینەوە.

ڕۆژنامەی «نوور» و مەجەللەی «ڕزگاری» وەرگرتبوو، کە من بە ڕۆژنامەکەم دەگوت «نەوەر» (قەرەچی) و بە مەجەللەکە: «ڕزگاری لە ناموس»!

لە ڕۆژنامە و مەجەللەکەیاندا هجوومی هەرە گەورەیان بۆ سەر من بوو؛ کە شاعیری دەرباری بارزانییە و هەر قەسیدەیەک پەنجا دینار وەردەگرێ! خزمەتکاری تریستات و کۆمپەرادۆرانە! باوەڕ کە ئێستاش نازانم تریستات و کۆمپەرادۆر بە چی دەڵێن! هەر خودی ئەو برایم و جەلال تالەبانییە چەن جار گوتوویانە جاسووسە؛ پاشان پەشیمان بوونەوە و پێیان هەڵگوتووم.

جارێک لە بەغدا -کە ستودیۆم لە «ئەعزەمیە» بوو- بە حاڵ نانی خۆم دەردێنا؛ نازانم چۆن جەلالم لێ تووڕە ببوو، گوتبووی: ئەگەر جاسووس نییە بە چی دەژی؟! کەچی هەر جەلال مەقالێکی بە عارەبی دە خەباتدا لە سەر نووسیبووم کە هەژار گەورەترین شاعیری میللی ئەم چەرخەیە و جێگەی فەخری کورد و کوردستانە. کە لەسەر ئەو مەدحە بە گژیدا هاتم؛ گوتم: کوردێک گۆرانی شاعیر بێ، نابێ باسی ئێمەمانان بکرێ...

هاتوچۆ و گفتوگۆ لە پاش بەیانێکی بەزاز کە لە ڕۆژی ١٩٦٦/٦/٢٩دا بڵاو کرایەوە، دەستی پێکردەوە. لە بەغداوە دەهاتن، لە کن شۆڕشەوە دەچوون. تا گەیشتە ئەوە کە سەرەک جمهوور (عەبدوڕەحمان عارف) بۆ خۆی هات کە چاوی بە بارزانی بکەوێ. بەلام لە ڕووی ڕەواندز، لە دەشتاییەکی دامێنی چیا دابەزی؛ کە قەراری پێشوو وا نەبوو. ئەو شوێنەش دەیتوانی تەڵەیەکی زۆر خەتەر بێ بۆ گرتن و کوشتنی مەلامستەفا. بە تایبەتی کە لەشکرێکی زۆری بە ناوی گاردی پاسەوان دەگەڵ خۆی هێنابوو. هەموو دۆست و خۆشەویستێکی بارزانی نەیاندەویست بارزانی لەو شوێنەدا بچێ عارف ببینێ و ئاشکرا حیکایەتی دەداو کەوتنی سمایلاغای سمکۆ و هەمزاغای مەنگوڕ دەهاتەوە بەر چاو. بارزانی بۆ خۆشی هەستی دەکرد کە گۆڕینی جێگەی چاو بە یەکتر کەوتنەکە فێڵێکی ئاشکرایە و هەر لە پاشگەز بوونەوەی سەرەک‌جمهوور -کە شوێن گۆڕکێی کردبوو- زۆر قەڵس بوو؛ بەلام پیاوە دەوڵەمەند و کاربەدەستە گەورەکانی کوردی بەغدایی -کە هێنانی سەرەک‌جمهوور و شەڕ وێستانیان بە مەسلەحەتی خۆیان دەزانی- سوور ببوون کە

بارزانی ئەو هەلە لە دەست خۆی نەدا و بچێتە ئەو دەشتە ڕووتە و بکەوێتە بەر خەتەرەوە. تا وای لێ هات بارزانی ڕقی هەستا و گوتی نابێ هەر چەکداریشم دەگەڵ بێن و بە تەنیا بە سواری جیپێک دەچم. ڕۆژێکی زۆر تاڵ بوو بۆ دۆستانی دلسۆزی بارزانی و چاریش نەدەکرا. «حوسێنی حەمەداغا» بە دزیەوە قۆڵەیەک چەکداری برد، لە خوار خێوەتەکانی سەرۆکجمهوور و هەوالانی، گردێکی دارستانی گرت و بەرانبەر بە گاردی حەرەس وێستا و چاوەنۆڕ بوو کە هەرگا دەستیان بزاوت، تێیان بسرەوێنێ. چەکدارانی بارزانیش بە دزی بارزانییەوە خۆیان خزاندە ناو پنچکی لای چیای زۆزکەوە و دەوری خێوەتانیان دا. زۆر کەس لە پیاوانی نزیکی بارزانی، زور لەو ڕۆژە نیگەران بوون. یەک لەو خەلکە من؛ دلم زۆر توندی لێ دەدا...

چوومە ناو خێوەت کە تەنیا بارزانی و عارفی تێدابوو؛ عەمەراغاش هات. دوگمەی بەرگە دەمانچەمان ترازاندبوو؛ دەمانچەش لە سەر پێ بوو. کە ئەگەر لە دەرەوە هەرایەک ڕووی دا، عارف بکوژین. نانی نیوەڕۆ لە لایەن دەستەی سەرۆکجمهوورەوە دەدرا. دیار بوو ئەو چەکدارانەی نزیک بوون و لە ناو خێوەتەکاندا چاوەنۆڕ بوون، نەچوونە نان خواردن. هەر وەک منیش وێڕای عەمەراغا گوتمان تێرین؛ نان ناخۆین. ڕەئیسی ستادی ئەرتەشی عارف -کە ڕیش و سەر سپیەک بوو بە ناوی «شاکر محەممەد»- هاتە ژووری خێوەت، سرتەیەکی دەگەڵ عارف کرد. زۆر گوێ لە سەر هەست بووم، تێگەییم پێی گوت: خراپ تووش بووین؛ ئەوانە لە هەموو لاوە دامەزراون و قەستیانە سوارمان بن. بە سرتە بە عەمەراغام گوت: ئێستا ئەوان لە ئێمە دەترسێن؛ وابزانم ناوێرن پەل ببزێون. لە مێژ بوو هەر لە مووسڵ و بەغداوە پیاوێکم دەناسی بە ناوی «کاکە»؛ فیلمبەردار بوو. ئەویشیان دەگەڵ خۆ هێنابوو. بە لامدا تێپەڕی گوتی: ئەوانەی بە ناوی فیلمبەردار دەگەڵمان هاتوون، هەموویان پیاوکوژ و لاتن و زۆرتان ئاگا لە خۆ بێ! تا لای عەسر دەو دڵە تەپەیەدا ماین. عارف ماشینێکی سواری خۆی پێشکەش بە بارزانی کرد و خواحافیزی کرا. بارزانی سواری ماشینەکە نەبوو؛ بە جیپەکەی خۆی هاتەوە. من حەولم دەدا یەکێک دەگەڵ خۆی سوارم کا، بارزانی تووشم هات و فەرمووی وەرە دەگەڵ من بڕۆینەوە.

لە ڕێگە زۆر بە دڵ پڕی گوتم: چوونەکەت کارێکی زۆر خراپ بوو، هەزاران جار ئەو دەولەتە بێناموسانە بەو فەندەڵفێل و سوێندانە کوردیان لە بەین بردوون. فەرمووی: بەڵێ خەتەر بوو؛ بەلام ئەو پیاوە زلانە زۆریان پێ داگرت و من ڕقم هەستا و هەر خوا حیسابە...

گفتوگۆ و هاتوچۆی نە شەڕ نە ئاشتی درێژەی کێشا. زۆر جار پێک هەڵدەپرژاین و زۆر جار هێمنی و تەرکی شەڕ بوو. ئەم ماوەیە دوو ساڵ و سێ مانگی کێشا. لە مانگی جووڵای ساڵی ١٩٦٨دا هێندێک ئەفسەری ئاجوودان و نزیک لە سەرۆکجمهوور دەگەڵ بەعسیان ڕێک کەوتبوون و کوودەتایان دژی ئاوڕەحمان عارف کرد و هەڵیانداشت. پاش سێزدە ڕۆژ بەعسی بە سەرکردایەتی سەدام و ئەحمەد حەسەن بەکر کۆدەتاچییەکانیان دەرکرد و دووبارە بەعس حوکمی عیراقی گرتەوە دەست.

لە سەرەتای بەهاری شێست و هەشتدا، خێزانم بە دزیەوە هاتبووە سەردانم. منداڵیشی هێنابوون؛ جگە لە محەممەد. خانی کوڕم کە لە تەمەنی چل ڕۆژەدا بەجێم هێشتبوو، خڕکەڵە و نزیک بە سێ ساڵان بوو. هەستی کردبوو کە بابی نییە و دیار بوو زۆری بۆ بەپەرۆش بووە. هەر کە گوتیان ئەوە بابتە! دەستی کردە ملم بەری نەدەدام. هەر دەیگوت: ئەی بابی خۆم! تازە بەجێت نایەڵم! من بابی خۆم هەیە!... ڕاستی کەم وا بووە ئەوەندە دڵم بگیرێ و خەمگین بم؛

کە ئەو دیمەنە دڵتەزێنەم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە...

لێرەدا دەمەوێ باسێک لە خۆم و منداڵەکانم بکەم:

محەممەد کوڕم عومری چوار مانگ کەمتر بوو کە بەجێم هێشت. لە ماڵی عەبدوڵڵای بڕام بەخێو کراوە و دایکی وەک دەڵێن بە بێوەژنی چاوەدێری کردووە. کە هاتنە بەغدا، کوڕ عومری لە نۆ ساڵدا بوو، نەیدەناسیم. زۆر جار کە من دیار نەبوومایە، لە دایکی دەپرسی: ئەو پیاوە کێیە دەگەڵمان لە ماڵێکدایە؟! هەر کە قەڵس دەبوو، دەردەپەڕی: «دەچمەوە ماڵی خۆمان!» کە مەنزووری ماڵی مامی لە سابلاغ بوو. مستەفام -کە لە شەقڵاوە ببوو- تەمەنی لە ساڵێک کەمتر بوو بەجێم هێشت و چوومە سووریا. پاش ساڵ و نیوێک کە دەگەڵ دایکی هاتن بۆ لام، نەیدەناسیم، پێی دەگوتم: «عەموو» (مامە). کاک محەممەد ئیمامی و دایکی کەریمی لە بیر نەدەچوون و لای وا بوو ئەوان کەس و کاری ئەون. کاتێ زاگرۆسم هاتە دنیا، لە مۆسکۆ بووم. ئەوەش بەختی من دەگەڵ منداڵانم... ئەو چەند ساڵەش لە بەغدا کە چوونەتە مەدرەسە، زۆر کەم دیتوومن، من هەر بە شاخ و کێوانەوە بووم و تەنیا دایک ئاگای لێ بوون. جا ئەگەر ئولفەتیان دەگەڵ من زۆر نەگرتبێ، حەقە و کەمتر توانیومە هەستی خۆشەویستی باوکانەیان بۆ دەربڕم. ئەو حاڵە تا بڵێی تاڵ بوو، بەڵام عیشقم بە ئازادی کوردستان لەوە بەهێزتر بوو کە خۆم تەنیا نەزری خۆشەویستی و سەرپەرستی ماڵ و منداڵ بکەم...

لە ماوەی ئەو دەربەدەرییەمدا -کە ئەگەر دە سەر یەکی خەیەوە، پتر لە پازدە ساڵ لە ماڵ و منداڵ دوور کەوتوومەوە- وا بووە بە مانگ و دوو مانگ لایان بووم و دیسان بەجێم هێشتوون. ئەوی بێ‌پسانەوە بووە: هەشت ساڵی هەوەڵ کە لە سابلاغەوە بۆ عێراق چووم. ساڵێک لە مۆسکۆ، ئەوی‌تر لە شۆڕش. کە هەوەڵ جار چاردە مانگ نەمدیتنەوە و جارێکیش دوو ساڵ و چەندێکی خایاند.

تا بیرم لە حاڵی خۆم و منداڵم دەکردەوە، دڵم تەنگ دەبوو؛ نەخوازا ڕۆژانی جێژن کە بە بیرمدا دەهات کەس نییە جێژنانەیان بداتێ و دڵیان خۆش کا و ژن، بێوەژن و منداڵ، بێ باب. بەڵام دیسان دڵم بە کۆشان لە ڕێگەی ئازادی میللەتەکەم سەبووری دەهات و هەموو لاوە کوردێکم بە منداڵی خۆم دەزانی. زۆر کەسی وا هەبوون لایان وا بوو من قەت خەم ناخۆم؛ بەڵام ئەوان ئاگایان لە دڵ و دەروونی من نەبوو. من پێکەنینم کردبووە سواغی غەم خواردن و هەمیشە گاڵتە و قسەی قۆڕم دەکرد و خەم و کوڵی دڵی خۆم پێ دادەپۆشی. ئەمما پیاو لە هەق لا نەدا، هونەری گەورە، هونەری مەعسوومی خێزانم بوو. دەکرێ بڵێم فریشتەیەکی خودا ببوو ڕەفیقم... برسی باین، ڕووت باین، بەو پەڕی ڕەزایەتەوە، بێ ئەوە گلە لە بەخت و زەمانە بکا، وەک دایکی هەرە دڵنەرم و بابی هەرە دڵسۆز، چاوەدێری منداڵی خۆی دەکرد و دوور لە مێرد دەژیا و قەت گلە و لۆمەیەکم لێ نەبیست. ئەگەر تەنیا نانی وشکی هەبا، یان ساز و تەیار با و بیتوانیبا زۆر خەرج کا، هەرگیز فەرقت پێ نەدەکرد و هەمیشە ڕووخۆش و شوکرانەبژێر بوو. هەر ژنێکی دیکە لە جێگەی ئەو با، ساڵێکیشی دەگەڵ دەرنەدەبردم. هەرچەند من بڕوام بە بەخت هاتن و نەهاتن نییە و لام وایە چارەنووس هەڵکەوتێکە و دێتە ڕێ، بەڵام بەو حیسابەی کە دەڵێن فلان بەدبەخت و فلان خۆشبەختە، من ئەگەر لە زۆر شت خراپم بۆ هاتووە، لە ژن و شەریکی ژیاندا بەختەوەر بووم.

ژنی پێشووم هەر زۆر باش و ژنی دوایيم لە باشیش باشتر و لە وەفاش وەفادارتر بووە و

ئێستاش لە پیریمدا مایەی هەموو دڵخۆشی ژیانمە...

***

هێندێک لەساڵی ١٩٦٥ و نزیکەی هەشت مانگ لە ساڵی ١٩٦٦ لە «لێوژە» لە سەر چاپەمەنی شۆرش مامەوە. کاک سامی هاوکارم بوو. پێشمەرگەی چاپخانەمان: «سەعید ئەبووشامیل» -کە مەسیحییەکی عەرەب بوو- زۆر لە کاری چاپ زانا بوو؛ «سەفەری فەیلی» -کە باسم کرد- شیعە بوو؛ «مەجید کەساس» -کە ئەوسا منداڵێک بوو- ئێستا لە شاری سولەیمانی لە چاپخانە کار دەکا و چەند جارێک ناوم لە پشت کتێبی کوردییەوە دیوە کە سوپاسیان لێ کردووە. بەختەوەرم کە بە هۆی منەوە فێری پیشەی چاپگەری بووە؛ «شێخ نووری ناوێک» و چەند کەسێکی دیکە.

سەفەر زۆر تووش و جینگن بوو، مەجید لەو قووت و جینگن‌تر! ڕۆژ نەبوو شەڕێک نەکەن. وەک دەرسی مەدرەسە لیستەم بۆ نووسیبوون: شەمە: مەجید و سەعید، یەکشەممە: سەفەر و مەجید، دووشەممە: شێخ نووری و سەفەر یان مەجید پێکەوە شەڕ بکەن! ڕۆژی وا بوو سەفەر دوو شەڕی دەکرد؛ دەیگوت: مامۆسا، با ئەمە قەرز بێ لە سەرم!

ڕۆژێک دیتم سەفەر دوو مریشکی بە دەستەوە.

- ئەمە چییە؟

- لە ژنێکم کڕیوە لە گوندی «یندزە». یەکی بە دینارێک.

- غەزەبت لێ بارێ! مریشک یەکی بە حەوت درەمە! (حەوت تمەن)

- نا مامۆسا، ژنەکە وتی هەر یەکی حەڤدە جووجەڵە هەڵدێنن. سی و شەش مریشک بە دوو دینار هەرزانە!

پاش چەند ڕۆژێک، «سەفەر» تفەنگ لە شاندا بەرەو یندزە.

- بۆ کوێ؟

- مریشکم لای ژنێک نایەوە، ئیسە ئەوشێ خاکان گشتیان فاسد بووە. ئەچم ئەو ژنە ئەکوژم!

- سەفەر جارێک بە کەریان زانیوی بەسیەتی! مریشکەکانت بکە قەسابی!

دوایی گوتم: من بە دینارێک لێت دەکڕم، بۆ بنکە سەریان ببڕە.

- مامۆسا خۆیشم لە گۆشتەکەیان ئەخۆم؟!

- ئەی چۆن.

- کە وا بێ خاسە!

لە مەقالێکی «خەبات»دا نووسیبووم: درۆکانی دەوڵەت وەک ئەوە وایە کە گوتوویە حەسەن و حوسێن دوو کچی معاویە بوون؛ عەلی لە بەغدا کوشتوونی! مەقال حرووفچینی کراوە، نموونەیەکی لێ دراوە، سەفەر دیتوویە:

- سەعید ئەم غەڵەتە چییە؟ تۆ مەسیحیت نازانی، من کە شیعەم دەزانم: حەسەن و حوسێن کوڕ عەلی بوون؛ وە دەست یەزید شەهید کراون! بێنە بیگۆڕە!

سەعید ناچار گۆڕیبووی. پەنجا ژمارەیەک لە چاپ درابوو کە دیتم. جا وەرە سەفەر حاڵی کە و لە سەرڕا حرووفچینی غەڵەت بکەوە!

دوو سەربازی عەرەبی ئەسیری زۆزکییان بۆ هێنایین کە خزمەتی بنکەیان پێ بکەین. یەکیان سەید عەلی، خەڵکی حیللە و ماسیگرێکی شیعە بوو؛ یەکیان حەمەد، خەڵکی لای دیوانیە،

فەلاحێکی سوننی بوو. کە هاتن زەرد و زەعیف و لاواز، لووتت گرتبان گیانیـان دەردەچـوو. زۆر زوو لای ئێمە قەڵەو بوونەوە و زۆر وە کەیف هاتن. تەلیسێکی پڕم تـووتن دەگـەڵ پـەڕە جغـارە لای حەمەد دانا. هەر دۆعای بەخێری دەکرد، دەیگوت: تێرە تووتن بووم؛ خـوا ڕاوەسـتاوت کـا! زۆرمان خۆش دەویستن. حەمەد زۆر گێژووکە بوو؛ دوو ئیستیکان چـای بهێنایـە بـە سـەلامەت نەدەگەیشتن! گوتمان تۆ کە وەرزێر بووی، بێستانمان بۆ بکە! باوەڕ کە بێستانێکی نموونـەی بـۆ ساز کردین.

ڕۆژێک چووبووینە ڕاوە ماسی، زۆرمان ماسـی گـرت بـەڵام چکۆڵـە بـوون. بڕژانـدمان. ئێمـە دەگەڕاین دڕوو بژێری بکەین، سەید عەلی -کە کۆنە ماسیگر بـوو- قاقـا پێمـان پێدەکـەنی کـە ئێوە فێر نەبوون ماسی بخۆن. دیار بوو ئەویش هونەرێک بوو. هـەر کلکـی ماسـی دەگـرت و بـە ددان دایدەماڵی. قەت دڕوێکی دە گەرووی نەگیرا! بەڵام ئێستاش فێری فێڵەکەی نەبووین.

حەمەد کە هیچ، سەید عەلی چەند دەنکێ کوردی فێـر ببـوو؛ نـاردبووم گوێلپارێـک بگرێـت. هەرای دەکرد: مامۆستا هشار! ئەوە شێتە! شێتە!

دوای پێک هاتن و گفتوگۆ دەگەڵ بەزاز و عەبدوڕەحمان عارف، ئەسـیرەکان ناردرانـەوە. مـن بەیانییەک لە سەربانی گوندی قەسرێ بووم، ئەم دوانە هاتنە خواحـافیزیم. هـەردووکیان زۆر بـە کوڵ دەگریان کە لێمان جوێ دەبنەوە و دەیانگوت بریا دە ساڵیتـر ئەسـیری بەردەسـتی ئێـوە باین...

«عەبدولحوسێن فەیلی» پیاوێکی کورتەباڵای لاوازی زۆر زیت و زیرەک، لـە بەغـدا لـە نزیـک مەدرەسەی موستەنسرییەی قەدیم، دوکانێکی خەیاتی و جل و فەرشفرۆشی هـەبوو. کـوردێکی زۆر موخلیس بوو؛ بە تایبەتی دەگەڵ ئەحمەد تەوفیق و من. تا لە بەغـدا بـوو، زۆر سـاز و تـەیار بوو. بە تۆمەتی تیرۆری «بەدرەددین عەلی» ئەسـتانداری هـەولێر، ئـەویش تێـوە درابـوو. پـاش حەبس و جەزرەبەدانی زۆر، بەردرابوو؛ هاتبووە ناو شۆڕش و ماوەیـەکی زۆر لـە لای سـولەیمانی کرابووە ئەمینداری دەغل و دان و داهاتی پێشمەرگە. دیار بوو جارێک بـە سـەفەرێک نـاردرابوو، لەم بەینەدا دزی زۆریان لێ کردبوو. هاتە لێوژە کە بچێ دادی خۆی لە مەکتـەب سیاسـی بکـا. مەجیدە منداڵەکەی دەگەڵ بوو. گوتی: ئەوە منداڵە و زۆریش جوان و بەرچاوە، باوکی بـە مـنی سپاردووە کە ئاگاداری بم. منیش دڵم هەر بە تۆ متمانەی دێ. با لای تۆ بێ و لە چنـگ پیـاوی خراپ و بێ ئەخلاق بیپارێزە!

پازدە شەوێک حوسێن میوانم بوو. شەوانە باسی بۆ دەکردم؛ کوردی ئێمەشی باش نـەدەزانی. کە باسی یەکێکی دزی بێ ئاکاری بکردبا، دەیگوت: بەڵێ مامۆسـا، ئـەم پیـاوێ خـەراوە، هـەی لەعنەت لە قەبری بابت بەم! دەمگوت بەڵێ فەرمایشتەکەت ڕاستە!

ئەو دەمە جەنگەی ڕێواسان بوو. مەجید دەگەڵ پێشمەرگەکان چووبوونە چیـا. خەبـەر هـات مەجید دڵی لە خۆ بۆتەوە؛ خوێی بۆ بەرن. بەستە زمانە کـە منداڵـی شارسـتانی بـووە و دیویـە ڕێواس بێ پووڵ لە کێو زۆرە، بێ خوێ هێندەی خواردبوو بوورابۆوە!

ڕۆژێک بە دەستی گەڵ دەچووین مەلە بکەین. زۆر دوور لە پشتی گونـد، منداڵـی جەوهـەر هیرانیم دیتن لە بن بەردێکی گەورەدا بوون. گوتم: کاک جەوهەر! بن ئەو بەردە هیلاکە، ئەگـەر خوا نەکا تەیارە لێی بدا، هەر بە تلیشە بەرد منداڵەکانت بەردەکەون. با لە ناو هۆو مێرگە، لە بـن ئەو دارە گەورەیە بن، کە ئەگەر بۆمبا وە مێرگ کەوێ، ناتەقێتەوە و بـشتەقێ پریـشکی زۆر لـێ

بڵاو نابن. نوێژی شێوان که له مه‌له گه‌ڕاینه‌وه، هه‌موو ماڵی دێ باریان لێناوه و ڕوو به کوێستان ده‌چن:

- به‌و شه‌وه بۆ کوێ؟

- ئای، خۆت به جه‌وهه‌رت نه‌گوتووه ئه‌مشه‌و بۆمبارانتان ده‌که‌ن! خۆتان ڕزگار که‌ن؟!

- نه‌مگوتووه و خوا ڕووی درۆزن و زمان هه‌ڵه ڕه‌ش کا!

له گوندی لێوژه گیانێکم به «پله»ی دایکی سه‌رگورد یووسف میران بوو که بنکه‌ی کوڕه‌که‌ی له ئێمه نیزیک و له‌وبه‌ری دۆڵێک بوو. (پله یانی پووری). ئه‌و ژنه لێم ڕوونه له هه‌موو شێخ و مه‌شایخی گه‌وره‌ش ساڵحتر و له هه‌موو که‌س به‌ڕوحم‌تر و له هه‌موو مه‌ردازایان مه‌ردتر بوو؛ خاله خه‌مه بوو.

جارێک له هه‌ولێر، دوکتورێک ڕۆژێک سه‌ری چوار نه‌خۆشان ده‌دا، له هه‌مووان پله‌ی له بن سه‌ری نه‌خۆش ده‌بینێ که میوه‌ی بۆ هێناوه و دڵداری ده‌داته‌وه. دوکتور گووشییه‌که‌ی فڕێ ده‌دا، ده‌ڵێ: پله! ئه‌گه‌ر تۆ دوکتوری من چکاره‌م؟! وه‌خته بڵێم منی به قه‌د تاقانه‌که‌ی خۆی خۆش ده‌ویست. هه‌ر چێشتێکی خۆشی لێنابا، ده‌ینارده دوام. که ده‌چوومه ماڵ جێگه‌یه‌کی نوستن ڕاخراوه.

- پله! ئه‌وه چییه؟

- قه‌له‌نده‌ر ده‌تناسم، هه‌ر نانت خوارد خه‌و به لاتا ده‌باته‌وه. نانت بخۆ و بنوو!

ڕۆژێک پێش نیوه‌ڕۆ له ماڵی پله بووم -کاک یووسفی کوڕی له ماڵ نه‌بوو- ته‌یاره هات. پێشمه‌رگه‌کان -که جێگه‌یان ڕووته‌ن و پێش ماڵان بوو- هه‌ڵاتن خۆ بشارنه‌وه. پله ده‌رپه‌ڕی گوتی:

- هه‌ی داوه‌شێن! تفه‌نگه‌کانو بده‌ن به من، ئێوه بۆ پیاو نابن!

له خه‌جاڵه‌تیان گه‌ڕانه‌وه و کردیانه ته‌قه له ته‌یاره.

که‌م پێشمه‌رگه هه‌بوو ناوی پله نه‌زانێ و به حورمه‌ته‌وه باسی نه‌کا. ته‌نانه‌ت کوڕه‌که‌ی خۆشی وه‌ک هه‌موو پێشمه‌رگه‌یه‌ک پێی ده‌گوت پله. من که هه‌میشه و ئێستاش له خۆشوشتن به سابوون و ئاوی گه‌رم زۆر ته‌نبه‌ڵم، ڕۆژێک پله -که ده‌عوه‌تی کردبووم- هه‌ڵیپێچام ئاو گه‌رم کراوه ده‌بێ خۆت بشۆی. چاری ناچار پاش قیره و هه‌رای زۆر چوومه ژوورێک، ته‌نه‌که ئاوێک له سه‌ر ئاگر و به‌ردێکی بۆ شۆرکه لێ بوو. پێم له به‌رده‌که نا، ته‌نه‌که ئاو وه‌رگه‌ڕا ناو ئاگر. به وشکی جلم ده به‌ر کرده‌وه و هاتمه‌وه گوتم باشم خۆ شُشت! هه‌ر ده‌یگوت به قه‌سته‌ن وات کردووه!

هه‌باسی مامه‌نداغا و شێخ له‌تیفی شێخ مه‌حموود هاتنه لێوژه و میوانی جه‌واداغا بوون. شه‌و چوومه لایان. هه‌باساغا گوتی ده‌بێ ده‌عوه‌تێکمان بکه‌ی. دوو گیسکم کڕی و ده‌عوه‌تم کردن. مه‌جلیسێکی گه‌وره بوو. قسه ده‌کرا و «به‌ڵێ قوربان» ده‌گوترا. سه‌رم برده بن گوێی هه‌باساغا:

- کاکه ئێوه پیاوه گه‌وره‌کان له ناو ڕه‌عیه‌ت و ژێرده‌ستاندا هه‌ر قسه ده‌هاوێن؛ درۆی زۆر گه‌وره ده‌که‌ن. ئه‌وانه زۆر زیره‌کن. هه‌رچه‌ند له ترسان به‌ڵێ قوربانتان بۆ ده‌ڵێن، که دیار نه‌بوون لیچتان لێ خوار ده‌که‌نه‌وه و به بێ ئابڕووتان ده‌زانن. تۆزێک ئاگات له خۆ بێ! درۆیان بۆ مه‌که!

هه‌باساغا له پێکه‌نین شین ببۆوه، گوتی:

- یه‌قین ڕاست ده‌که‌ی. به‌ڵام شوکور شێخ له‌تیف له من درۆزن‌تره و درۆی زلتر ده‌کا!

لەوەتا دەگەڵ ئێران نێوان خۆش ببوو، حاڵی ئێمە ئێرانییەکان کەوتبووە خەتەرەوە. دەوڵەت داوای لە مەلامستەفا دەکرد کە ئێمەی تەسلیم کاتەوە. مەلامستەفا حاشای دەکرد کە ئەوانە لای من نین. تەنانەت شەوێک چوومە لای «حاجی ئۆمەران» بارزانی ببینم. لە کۆڵان تووشم هات، گوتی: زوو برۆ! ئێستا کێشەی تۆ بوو. ئێرانی دەڵێن لای تۆیە و دوژمنی دەوڵەتی شاهەنشاهییە. ئەگەر تۆ دۆستمانی، دەبێ بماندەیەوە. من گوتوومە لە کوێت دەژی. خولاسە وەک چاوێشەدار لێمان دەگەڕان. بە تایبەتی داوای ئەحمەد تەوفیقیان لێ دەکرد کە ڕەئیسی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێرانە و هەمیشە پێشمەرگەی بەردەستی ئەو دەچنە ئێران و تەقە لە سەرباز و پۆلیس دەکەن و کەڵەگایی لە ئێران دەکەن؛ دەبێ هەر بماندەنەوە. کە یەکجار زۆریان زۆری هێنابوو، بارزانی ناچار ئەحمەدی بەڕێ کرد بۆ سنووری تورکیە لە گوندی «کانیماسی» لە «برواری باڵا» بمێنێتەوە و لە سەر سنووری ئێران دوور کەوێتەوە. کە وەک دەڵێن نە شیش بسووتێ و نە کەباب. ئەحمەد هەرچەند بەو دوور خستنەوەیە لە چالاکی و حیزبایەتی دژی ئێرانی داگیرکەری کوردستان دەکەوت، ناچار ملی دا و دەگەڵ چەند هەواڵێکی ئێرانی باری کرد و لێم دوور کەوتەوە. ئەحمەد بە ڕاستی شێری میسری بوو؛ دە کالان نەدەوەستا. بەڵام چ دەکەی؟ فەرمانی بارزانییە و وای بە مەسڵەحەت زانیوە. ئەگەر لێکیش دوور کەوتبووینەوە، نامەی دۆستانەمان بۆ یەکتر دەنارد و لە بەرامبەر دەردەدڵیەکانی دڵداریم دەداوە کە سەبر بکا، بەڵکو ئەوە خوایە ئەم گیر و گرفتە بە سەر بچێ و بە خۆشی تووشی یەکتر بینەوە. لەو سنوورە دوورەش کە دەستی لە ئێران کۆتا کرابوو، لە کاروباری بەفایدە نەوێستابوو. سەرەڕای دەرس بە پێشمەرگە گوتن و سەواد فێرکردنیان، دوو باغی بەجێ ماو لە جاشانی زیندوو کردبۆوە. ڕاستی باغدارێکی زۆر بە سەلیقەش بوو؛ کە من نەمدەزانی. چەند جارێک سێو و میوەی باغەکەی بۆ ناردم؛ دەبوو هەر بێیە سەیریان.

کوردێکی سابلاغی بە ناوی «سدیق ئەنجیری» ماوەیەک بوو لە تارانەوە هاتبووە «دەربەند» لە «باڵەکایەتی». هەوەڵ جار لە شاری قەلادزەم دیت. دوایی لە دەربەند چەند جارێکم دەدیت. تاریفی خوێندەواری و زاناییان دەکرد. پیاوێکی هێدی و هێمن و لەسەرخۆ بوو. لەو سەردەمانەدا کە ئەحمەد دوور خرابۆوە بۆ سنووری تورکیە و ئێمە لە «لێوژە» بووین، دەگەڵ سەعید ناوێک -کە بە چاوێک بوو- بوونە میوانی بنکەکەمان؛ پازدە ڕۆژ مانەوە. ڕۆژانە خۆی و سەعید دەچوونە دەری دێ، بۆ جەمی نیوڕۆ و شەو دەهاتنەوە و تەواو هۆگری سدیق ببووین.

چەند جارێک لە مەکتەبی سیاسییەوە -کە زۆرمان لێ نزیک بوو- خەبەریان داینێ کە ئێرانی ناوی ئەویان پرسیوە؛ با لەو نزیکە نەمێنێ. سامی و من حاشامان کرد و جوابمان نەدانەوە. ڕۆژێک دەبوایە دوو ڕۆژنامەنووس و فیلمبەرداری ئەڵمانی بێنە لامان لە لێوژە. کاک سامی بە سدیقی گوت: ئەمڕۆ مەچنە ئەو سەکۆیەی ناو دارانە کە هەموو ڕۆژ لەوێ دادەنیشن؛ چونکە نازانین کێ دەگەڵ ئەو ئاڵمانییانە دێ. لەوانەیە جاسووسی ئێرانی ڕەگەڵیان کەوتبێ. سدیق لەو قسە ناڕەحەت بوو؛ گوتی: دیارە دەتەوێ ڕام نەگری! ئیتر بێ خواحافیزی کردن دەگەڵ سەعیدە کوێر ڕۆیشتن. چووبوونە جێگەی ڕادیۆ لە «گردێم»؛ ببوونە میوانی خالیداغای حیسامی. گوتبووی هێلکەم هەیە چۆنی دروست کەین؟ سدیق گوتبووی: دەچم لەو دەم چەمە پنگە دێنم، کووکی دروست دەکەین. ئیتر ئەو ڕۆینە بوو، نەهاتەوە و بێ سەر و شوێن چوو؛ کەس خەبەری نەزانی. سدیق زۆر جار سەفەری دەکرد و بە هەواڵانی خۆی نەدەگوت بۆ کوێ

دەچم. هەموو کەسێ کە دەیناسی لای وا بوو عەقلی بڕیوە چۆتەوە ئێران و تاران بۆ لای هەوالانی توودەیی خۆی. پاش ماوەیەکی زۆر، باوکی سدیق لە قەسرێ هاتە لای مەلامستەفا، باسی کوڕەکەی کرد کە لەم ناوە شرت و گوم کراوە. بارزانی گوتی: هیچ وەخت کوڕی تۆم نەدیوە و ناشزانم کێ دەڵێی. تاقیق دەکەم، تۆش بپرسە بەلکو شتێکی لە چارەنووسی بزانی. ئێستاش کەس نەیزانی سدیق ئەنجیری چی بە سەر هات.

لە پاش ڕۆیشتنی ئەحمەد تەوفیق بۆ سنووری تورکیە، «سولەیمان موعینی» خۆی کردە جێنشینی لە حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێراندا. ڕەنگە ئەوانەی زۆری دەگەڵ ژیاون چاتری بناسن؛ بەلام هیچ وە بەر دڵی من نەدەکەوت. دەیانگوت داوێن پیسە، دەیانگوت فەرقی گیرفانی خۆی و هەوالانی لە بەرە، دەیانگوت ترسەنۆکە و... کە من هەر دەمبیست و خۆم وەک پێویستە نەمدەناسی. هەر هێندە بوو مەرحەبا و چاک و خۆشیمان پێکەوە هەبوو. چونکە من کارم بە سەر کاری ئێرانییەکانەوە نەبوو؛ بەلام وەک دۆست و برادەر خۆشم دەویستن. دەمبیستەوە کە موعینی و هەوالانی پێشمەرگەی دەچنەوە ئێران و چالاکی دەنوێنن. موعینی برایەکی لە خۆی بچووکتری هەبوو بە ناوی «عەبدوللا»، کوڕی پەسند و ڕند ئەو بوو؛ بە ڕاستی زۆر پیاوێکی بەقیمەت بوو. کە بە داخەوە لە نێو گەورکان دەگەڵ «مینەشەم» -کە ئەویش مالم هەقە پالەوانێک بوو- شەهید کران.

بنکەی موعینی و پێشمەرگەی هەوالی لە «سونێ» بوو؛ پاشان هاتبوونە دۆلەڕەقە. یەک لەوانەی هەوالی موعینی و شەریفزادە بوو، کوڕێکی حقووقی بە ناوی «حەمەدەمین سیراجی» بوو کە زۆر کومۆنیستێکی توودەیی دووئاتەشە بوو. پیاوێکی زۆر زیرەک و قسەزان و لەبلەبان و زمانلووس بوو. بە داخەوە هەرچەندی کردم نەمتوانی بە دڵ خۆشم بوێت؛ نازانم بۆچی؟... دیارە من ئەحمەق بووم و دوای هەستی ئەحمەقانەی خۆم کەوتبووم؛ دەنا هەرچی دەمدی تاریفی دەکرد. یان پێم وایە بۆیە نامۆییم لێ دەکرد کە من لەو کومۆنیستیە تەکیبوومەوە کە ئەو بڕوای پێ بوو.

«مەلا ئاوارە» ناوێکم لەو برادەرانە دیت، زۆرم کەیف گرتی. بیری یەکجار تیژ بوو؛ زۆربەی شیعری من و یەکجار زۆری شیعری کوردی لە بەر بوو. کە قسەی دەکرد دلسۆزی بۆ کورد و کوردستان لە قسەکانی دەباری و زۆریان کار لە دلی گوێگر دەگرت.

ڕۆژێک لە «دەربەند» لەگەڵ مام عەلی عەجەم بووم. نامەیەکم بۆ هات، سولەیمان موعینی نووسیبووی: «ئێمە هەوالانی ئێرانی -کە چەند ڕۆژێکە لە زینوێ و خەلان ڕایدەبوێرین- بە عام بڕیارمان داوە تۆ بکەینە ڕەئیسی خۆمان و بە موو لە قسەت لا نەدەین. تۆش دەبێ قبووڵ بکەی و دەبێ چاومان پێت بکەوێ». خەبەرم نارد هاتە دەربەند. بە مام عەلیم گوت نیوەڕۆژەیان بۆ ئامادە کات. دەگەڵ سولەیمان بە قەدەم لێدان ڕۆیشتین، هەر من و ئەو. ناوەڕۆکی نامەکەی دووپاتە کردەوە و بە چەند سوێندێکی زۆر زل قایمی کرد. گوتم: ئەگەر من قبووڵ بکەم ڕەئیستان بم، نابێ هەر لە ئێستاوە قەت درۆم دەگەڵ بکەن. دەبێ هەموو شتێکتان بزانم. گوتی قبووڵمە.

- کاک فایق تۆ لەو سەفەرانەی کە بۆ کوردستانی ئێرانت کردووە، تەقەتان لە دێی «شێلم جاڕان» کردووە و منداڵێکتان کوشتووە؟ حاجییەکت گرتووە، تا چوار هەزار تمەنت لێ نەستاندووە بەرت نەداوە و دارکاریت کردووە؟ گیشەی وەرزێرانت سووتاندووە چونکە پوولیان

نەداویەی؟ ڕادیۆت لە پشت بەرد شاردۆتەوە و ئانتێلەکەت بڵند کردووە، وات نیشان داوە کە بە بێسیم قسە دەگەڵ بارزانی دەکەی و گوتووتە: قوربان! حاجی فلان هەر پێنج هەزار تمەن دەدا. لێی وەرگرین؟ بەڵێ باشە. خوا ڕاوەستاوت کا! دەستت ماچ دەکا؟! ئەو کارانەت کردووە یا نا؟ نابێ درۆم دەگەڵ بکەی...

گوتی: بەڵێ هەمووم کردوون؛ بەلام لەوە بەولاوە لە قسەی تۆ دەرناچین.

- کاک فایق با قسەکەت تەرجەمە کەم: تۆ دەفەرمووی من بۆشکەیەکی پڕ لە پیساییم؛ بۆنی دەرچووە. هەژار وەرە بتکەمە سەرپۆشێکی بێ کەلێن، ئەو بۆگەنە داپۆشە! برام نە چاوم لە گەورەیی و سەرۆکییە، نە ئەو کارانەشم بە دڵە. ئێمە لە باتی دڵسۆزی بۆ میللەتەکەمان ببینە چەتە و ڕێگر و باجەستێن لە سەریان، پێم کارێکی بە ناموسانە نییە. خۆت چۆنت ڕابواردووە حیساب بۆ من مەکە! کارم بە کاری کوردستانی ئێران نەداوە.

ئیتر خەبەرم لەو برایانە بڕا؛ نەمدەزانی چ دەکەن. جار و بارێک کە تووشی یەک یان دوانیان دەبووم حاڵێکم دەپرسی و جوابێکم وەردەگرتەوە کە نەمدەزانی تا کوێ گەیون.

ڕۆژێک لە گەلالە بووم. پیرێژنێک هاتە لام گریا، گوتی کوڕەکەم (سەید...؟) گیراوە لە سەر ئەوە کە دەڵێن ئێرانییە. تکام بۆ کرد بەریان دا. سەید چووبوو چەند کەسێکی ڕەگەڵ خۆی خستبوو، گوتبووی مام هەژار دەڵێ بچنە ئێران چەتەیی لە عەجەمان بکەن! چەند تەقەیەکیان کردبوو؛ پۆلیسێکیان کوشتبوو؛ هەڵاتبوونەوە ناو چیای قەندیل؛ کە بە هیچ جۆر ئاگاشم لێ نەبوو.

ڕۆژێک -کە ماڵە مەلامستەفا لە «قەسرێ» بوو- گوتیان بارزانی بانگت دەکا. گوتی: نۆ پێشمەرگەی ئێرانی -کە سالح لاجانی و هەوالانی ئەون- لای ئێمە گیراون. ئەوانە لە ئێران زۆریان عەزیەتی دەوڵەت داوە. ئێستا ئێرانی سوورن لە سەر ئەوە کە بیاندەینەوە. تۆ دەڵێی چی؟

گوتم: قوربان! حیکایەتیان دەزانم. ئەوانە لە لای قەلادزەوە هاتوونە ئەم دیو. ئیدریس کوڕی تۆ قەولی پێداون کە نایانگرێ و دەیاننێرێتە جەبهەیەکی دوور لە سنووری ئێران. من ڕەوای نابینم بدرێنەوە بە ئێران. ئەگەر هەر بۆ مەسلەحەتی ڕۆژە، من ئامادەم -کە زۆریش منیان لە لا گرینگە- لە بەرانبەر تۆپێکدا کە بیدەن بە تۆ، خۆمیان تەسلیم کەم؛ بەلام هەرگیز ئەو فتوایە نادەم. خۆشت کاری خۆت دەزانی...

گوتی: ئێمە لەو لێقەوماویەدا هەموو لامان لێ بڕاوە، ڕێگەی ئێران نەبێ. چۆن دەتوانین ئەوانەیان نەدەینەوە؟ چۆن برایم و جەلال بە سەرماندا زاڵ نابن؟

- من فتوا نادەم؛ هیچکارەش نیم. خۆت دەزانی...

پیرە پیاوێک بە ناوی «حەسەن حەوتەوانە»، لاجانی -زۆر ساڵ بوو پێشمەرگە بوو- دەئێوارێدا هاتە لام کە عومەری کوڕی تازە لاوێکە و دەگەڵ ئەو نۆ کەسە گیراوانەیە. زۆرم بەزەیی پێدا هات. چوومە تکای ئەو کوڕە. شەو بەریان دابوو؛ گوتبوویان هەڵاتووە. عومەر -کە لە مردن ڕزگارم کردبوو- زۆر جار دەهاتە لام و دەردی دڵی خۆی دەکرد. جارێک دەگەڵ فایق موعینی چوونەتە سەر ڕێگای نێوان سەردەشت و خانێ. گوتی: کاروانێکی کامیۆنی سەربازان -کە چاردە کامیۆنی بارکراو بوو؛ هەر یەکەی سێ یان چوار پاسەوانی لە سەر بوو- بە بەردەممان هاتن. ئێمە لە ناو دارستانێکی چوغوردا دەوروبەری ڕێگەمان گرتبوو. دەمانتوانی بە

تەنیا دەسرێژێک بیانکوژین و کاروان ڕووت کەین. کاک فایق -کە سەرکردەمان بوو- فەرمانی ئاگرکردنی نەدا:

- کاک فایق لەوە چاتر قەت هەڵناکەوێ!

- نەخێر ڕازی نیم تەقە بکەن، خەتەرە!

جا توخوا ئەگەر کاکەحمەد بوایە، دە سەر ئەو پارووە چەور و نەرمە دەچوو؟ چۆنت دەوێ تا خەتەر نەبێ؟ بەجێم هێشتووە و هاتوومەوە...

کوڕێکی‌تری ئەم مام حەسەنە (برایم)، لە پشت شێلم جاڕانی لاجان کوژرا. ئەو عومەرەش لە شەڕی «دۆلی خدراوێ» دیمۆکراتی ئێران -کە دەگەڵ دەوڵەتی خومەینی کرا- بە تەیارە کوژرا.

ڕۆژێک ئێوارە ئەحمەدی بارام میرزام دی کە لە دەستە و دایرەی جەماعەتی موعینی بوو. گوتی قەراریان داوە بچنەوە ئێران و شۆرش هەڵگیرسێنن؛ بەلام من ڕامکردووە و دەگەڵیان ناچم. گوتی مام عەلی عەجەم لە بنکە بەجێ ماوە و هێشتا نەچووە. خەبەرم بۆ مام عەلی نارد کە ئەگەر ناچێ بۆ ئێران با بێتە لای من. هاتە لام و تا ئاخری شۆرش لێک هەڵنەبڕاین و بنکەم تەسلیمی ئەو دەکرد؛ وەک گوڵ پێ ڕادەگەیشت.

بیستمەوە کە دوای ئەوەی لە بارزانی و شۆرشەکەی ناهومێد بوون، ویستوویانە بۆ خۆیان لە ئێران کارێک بکەن. حەمەدەمینی سیراجی لە هەموان دلگەرمتر بووە کە دەبێ هەر بچین. شەوێک لە دۆڵەرەقەوە ڕۆیشتوون و حەمەدەمین تا سەر سنوور دەگەڵیان بووە، گوتوویە برا وا باشە من بچم دەگەڵ دەوڵەتی عیراق قسە بکەم و چەک و ئەسپاباتان بۆ وەربگرم. خۆی لێ دزیبوونەوە و خۆی گەیاندۆتە بەغدایە و ماتەی هەڵگرتووە. پێشمەرگە ئێرانییەکان کەوتوونە چیاوە و تووشی شەڕ و بە کوشت چوون هاتوون و سیراجی هیچ خەبەری نەبووە و بێ‌سەر و شوێنە. جا ئێستاش تا باسی شەهید بوونی سمایلی شەریفزادە و مەلا ئاوارە دەبیسم، گورجێ چرۆچاوی پڕ لە فێڵ و فەرەجی سیراجیم دێتە بەر چاو. لام وایە هۆی بەکوشت چوونیان ئەو کابرا زیرەک و بێبارەیە، کە ئەوانی هەڵناوە و خۆی لێ دزیونەوە. من بڕوام وایە؛ ڕەنگە واش نەبێ. ئەوە خوا دەیزانێ... لەم بەینانەدا کە ئەو برادەرە ئێرانییانە لە دژی ئێران خەبات دەکەن و لە شۆرشی بارزانی تەکیونەوە و پێشمەرگەی شۆرشی عیراق بە کارتێکدەریان دەزانن، ژن و کوڕی فایق موعینی لە سەنگەسەرە و لە ماڵی حەسۆ میرخانی ژاژڵەییە. فایق چۆتە سولەیمانی؛ چاوی بە فەرماندەی ئەرتەشی پێنجەم کەوتووە، قەولی چەک و یارمەتی لێ ساندووە. چۆتە بەکرەجۆ لای جەلال تاڵەبانی کە چەکداری دەوڵەتن و دژی بارزانین. هاتۆتەوە شاری سولەیمانی، میوانی شێخ لەتیف بووە. نامەیەکی بۆ حەسۆ میرخان نووسیوە کە: ئێوە ژن و کوڕی منتان داگیر کردووە؛ کارێکی زۆر نامەردانەیە. ئەگەر نەتانگرتوون، بیاننێرنە سیتەک؛ بۆ ماڵی شێخ لەتیف. ویستوویە لە سنووری بانەوە بڕواتە دیوی ئێران؛ لە سەر چوار ڕێیانی سیتەک-چوارتا، جێپەکەیان ڕاگرتووە کە فایقی تێدایە. «سدیق ئەفەندی» ناوێکی لە کۆنەوە پێشمەرگە و خەڵکی سولەیمانی، کە هەموومانی باش دەناسی دایدەبەزێنێ:

- کاک فایق کارم بە تۆیە.

فایق بە لیباسی فەقێوە، بێچەک دەڵێ من فایق نیم و ناوم مەلا قادرە.

- هەر چییەک بێ ڕەگەڵم کەوە!

ڕۆژێک کە بۆ کاری چاپخانە -کە ئەودەم لە سوورەبان بووین- چوومە ماڵی بارزانی، گوتی:
- ئەگەر بتەوێ دەتوانی فایق موعینی ببینی و قسەی دەگەڵ بکەی. با هەرچی دەیزانێ دەربارەی قاید فیرقەی پێنج و جەلال و جاشەکانی بەکرەجۆ، پێمان بڵێ؛ دەنا ئەوە ئێرانی داوای دەکەنەوە و لە خەتەردایە.

چوومە «وەسان» فایقم دیت کە دەگەڵ پێشمەرگەیەک بە ناوی «خەلیل شەوباش» لە ماڵێکی چۆڵدا حەبس کرابوو. دوو چەکداری بارزانی لە دەرک و سەربان بوون. پێکەوە دانیشتین، کاک فایق نەقڵی گیرانی خۆی و شەوباشی بۆ گێڕامەوە. کە گوتم ئەگەر هاوکاری دەگەڵ شۆڕشی بارزانی نەکەی، زۆر لە چارەنووست دەترسم، گوتی: ئەوانە یاریدەمان نادەن. تەنانەت بریندارێشمان بۆ دەرمان ناکەن. حازر نیم هیچ هاوکارییەک بکەم...

گوتم: کاکی خۆم! دەڵێن تەیری گۆشتخۆر دندووکی خوارە. تۆ پیاوی ئەو کارانە نەبووی! بە زۆر بە ملە خۆتدا هێنا و نەشتزانی چ دەکەی. ئەگەر من بوومایە لە جیاتی تۆ، کە دەمزانی دوژمنایەتی بارزانی دەکەم و بە وڵاتی بەردەستی ئەودا دێم و دەچم، هەر بە شەو، بە بێ ڕێ، بە ناو دارستاندا سەفەرم دەکرد. هەمیشە چل تفەنگچییەکم دەگەڵ دەبوو؛ لە سەر هەست و دەست لە سەر پەلەپیتکە. تووشی هەر ڕێبوارێک دەبووم، نەمدەهێشت بڕوا و خەبەرم لێ بدا، دەمبەستەوە تا زۆر دوور دەکەوتمەوە. بۆ چەند کیلۆمیتر لە پێشەوە ڕێگەیان بۆ تاقی دەکردمەوە و هەمیشە دەستەیەک لە دواوە دەیانپاراستم. لە کوێ دەنگ درابام دەمکردە تەقە و خۆم ڕزگار دەکرد. لێم ڕوونە ئەحمەد تەوفیق لە جیاتی تۆ ئەمەی بکردایە، زۆر بە هاسانی پێکی دێنا و دەگیر نەدەکەوت. تۆ دەزانی «حەسۆ» شیری کەریشی خواردبێ، تێدەگا کە تۆ داوا دەکەی ژن و کوڕت بچنە «سیتەک»، مانای وایە خۆت لەو ناوەی و دەتەوێ بیانبینی. جوابت بۆ دەنووسێتەوە کە ژنی تۆ خوشکی منە و کوڕی تۆم لە کوڕی خۆم هەڵناواردووە؛ ئەوا بۆم ناردیە سیتەک. سدیق ئەفەندیت لە سەر ڕێگە دادەنێ کە باشت دەناسێ و دەتگرێ. تەنانەت دەمانچەیەکیشت پێ نییە دیفاع لە خۆت بکەی. چۆن کەسێک بە ئاشکرا دژی بارزانی بجووڵێتەوە و هەموو کەسیش بیناسن، دەچێ سواری جێپی مسافربەری دەبێ و بە نێوەڕاستی جادەدا سەفەر دەکا و دەیەوێ بچێ بە چەک و ئەسپابی دوژمنانی بارزانی لە ئێران کار بکا و بە عەقیدەی بارزانی زیان لە شۆڕشەکەی ئەو بدا؟! زۆر بە داخەوە پیاوی ئەو کارە نەبووی. خۆزیا ئەحمەد تەوفیق با. زۆریش بۆ ئایندەت دڵتەنگم؛ بەلام دەستم ناڕوا. ئەوەندەی بتوانم حەولی خۆم دەدەم کە لە کوشتن ڕزگار بی.

ئەوە دوامین دیدارم بوو دەگەڵ موعینی. بە مەلامستەفام گوت: ڕاستە لە ناچاری خۆی چۆتە بەکرەجۆ و لای قاید فیرقە، بەلام شتێکی وا لە هیچیان نازانێ کە ئێمە نەمانزانیبێ. ئەو داوای یارمەتی کردووە، قەولیان داوەتێ و هێشتان هیچی وەرنەگرتووە. ڕاستە کارەکەی دژی کاری تۆیە کە دەگەڵ ئێران دۆستی؛ بەلام بە بڕوای من بە هیچ جۆر نابێ ئەو دوو کەسە نە بکوژی، نە بیاندەیەوە بە ئێران. لە جێگەیەکی دووردەست، لە سنوور حەبسیان کە! بڵێ ناتاندەمەوە؛ بەلام گرتوومن و نایەڵم دژی ئێران بجووڵێنەوە. بیانکە بە پەڕی بەرندەی قومار. هەر وەخت ئێرانی کەوتنە بڕ و بەهانە دۆزینەوە، دەفەرمووی من فایق و ئەحمەد تەوفیقم پێ بەخێو ناکرێ؛ بەرهەڵدایان دەکەم و ئازادن چ دەکەن بکەن. ئێرانی زۆر مەمنوونت دەبن کە ئەوانەیان دە گژڕا نەکەی و نەبنە مایەی دەردی سەریان. کە لە حەبسی تۆشدا بن، هەموو ڕۆژ ئەگەر بە پێویستت

زانی دەتوانی فەرمانی کوشتنیان بدەی. بەلام بە هیچ جۆرێک دلم فتوا نادا کە تەسلیمی ئێران بکرێنەوە. چونکە لە دژی تۆ تەبلیغاتی پێ دەکەن؛ وەک چەند جار کردوویانە...

دوایی بیستمەوە کە فایق و شەوباش کوژراون و لاشەکانیان دراوەتەوە بە ئێران. ڕاستە فایق بە شەهیدێکی میللی لە ناو کوردستانی ئێران حیساب دەکرێ؛ بەلام بە بڕوای من عەبدوللای برای لەو پتر شیاوی ئەو ناوە بووە؛ مەلا ئاوارە و شەریفزادە زۆرتر جێگەی ئیحتیرامن. نەدەبوایە سیراجیش لە بیر بچێ و حیسابی دەگەل نەکرێ. بەلام کەم وایە تاریخ عادل بووبێ و هەقی هەر کەسی بە پێی کار و زەحمەتی خۆی دابێ...

شێخ لەتیف بۆی گێڕامەوە کە فایق لە سولەیمانی میوانی بووە. کاتێ گوتوویە دەڕۆم، پێم گوتووە بە هیچ جۆر وا مەکە «قالە تەگەرانی» بزانێ کەی دەڕۆی و بۆ کوێ دەڕۆی. چونکە قالە جاسووسی سێ سەرەیە: بۆ بارزانی و بۆ ئێران و بۆ عیراق کار دەکا. گوتی باشە. بەلام بەیانی کە هاتە خواحافیزی، گوتی قالە تەگەرانی ماشێنی بۆ گرتووم و بەڕێم دەکا!

لە قەلاتی بالەییان بووین، «مونتەقیمی قازی» -کە لە پێشیشدا دەمناسی و برادەر بووین- هات گوتی: دەچمەوە لای مەهاباد هەوالان دەبینم؛ کارێکت نییە ڕامسپێری؟

گوتم: خەمیر ددانێک و فرچەیەکم بۆ بێنە!

تەواو خۆی قەلس کرد کە من بۆ باسی سیاسی دەگەل ناکەم!

جارێک بە سەفەر چووبوومە هەولێر، میوانی مالی شێخ مستەفای کوڕی شێخ عوبەیدیللا بووم کە ئەوسا لە هەولێر بوو. سالاری حەیدەری و مونتەقیم لەوێبوون:

- بۆ هاتوون؟

- بۆ سەیاحەت!

ڕۆژێ گوتیان مونتەقیم گیراوە. گوتیان خەبەر بە شۆرش دراوە کە مونتەقیم دەگەل کوڕی شێخ عوبەیدیللا چۆتە مەرکەزی فەرماندەی سوپای عیراقی لە هەولێر. کە لە نوختەی سنووری شۆرش لێیان پرسیوە، گوتوویە ناوم عەبدوللایە و ناسیویانە کە مونتەقیمە. سالاری حەیدەری کە هاتبۆوە و زانیبووی مونتەقیم گیراوە، چووبووە گەلالە و گوتبووی منیش بگرن کە دەگەل مونتەقیم لە هەولێر بووم. گوتبوویان کارمان بە تۆ نییە کە تۆ ئاگات لە کاری مونتەقیم نەبووە. بیستمەوە کە مونتەقیم دراوەتەوە بە ئێران و لەوێ حەبس کراوە.

تا هاوین لە «لێوژە» ماینەوە. هەموومان تووشی زگ ئێشەی زۆر سەخت بووین. مێشوولە کوێرەش حەشری دەکرد و حەجمینمان نەمابوو. دوکتور مەحموود گوتی ئاوی کانییەکەی گوند خراپە و جیوەی تێدایە. خەلکی گوند لە مندالییەوە پێیەوە ڕاهاتوون؛ بۆ ئێوە سەممە. ئاوی گەرمی چەمەکەمان دێنا دەمانکولاند و ساردمان دەکردەوە. بەلام چاری مێشوولە نەدەکرا.

قەرار درا بار بکەین بۆ گوندی «سوورەبان» کە هەشت مالە و لە «وەلزێ» جوێ بۆتەوە. چەند ڕۆژێک لە گوندی «قەسرێ» مامەوە تا جێگەی چاپخانەمان پەیدا کرد و ڕێکمان خست. لە هاتوچۆی نێوان قەسرێ و لێوژە، جارێک لە ڕێگە لە برسان هێزم نەما. لام دا ناو پۆلە سپیندارێک، ڕاکشام. قشقەلەی سەگباب قرەقڕ لە دەورەم، زۆری تووڕە کردم. دەمانچەم لێ هەلکێشا، دوو دەمانچەم پێوە نا. هەر چەند دە میتریش دوور نەبوو، تازە بە تەقەوە فڕی! دیار بوو زۆر ئەنگێوەی چاکم! ڕاکشامەوە. پاش تاوێک خرمە و تەپەی پیادە و سوار هات. هەرام

کرد: برسیمە!، دەنگی پلە هات، گوتی:

- ئەوە هەژاری قەلەندەرە! دادەی بیگەنێ!

بێ تۆ ناخۆش، یەک مریشکی سوورەوە کراوی بە نانەوە دامێ، قرتەم لێ بڕی!

هەر دەو ڕێگەیەدا شەوێک دەگەڵ دوو پێشمەرگە بوومە میوانی شێخی «بەرگرکە». شێخێکی جحێلی زۆر دڵتەڕ و خۆش مەشرەف، دەفی هێنا و بە دەنگێکی زۆر خۆش شیعری «سافی» کاکی هیرانی دەخوێندەوە.

پێشوو هەر لە لێوژە گوێ ئێشەیەکم پێوە نووسابوو، گوێم وە ژان هات و زۆری نارەحەت کردم. شێخ هەر بە پەلە پیوازێکی نایە سەر ئاگر تا پێستەکەی سووتا. نێرتکی پیوازەکەی -کە پیشابوو- خستە ناو کونی گوێم و ژانی شکا. باش بوو ئەو دەرمانەش فێر بووم. کە هاتین بڕۆین دوو پیوازم نایە باخەڵم نەوەک لە ڕێ گوێم وە ژان بێتەوە! گەییمە ناوپردان، دوکتور حەسەنێکی عارەبی لێ بوو؛ خۆی تووڕە کرد: چۆن تۆ دەرمانی لادێ دە کار دەکەی؟

گوتم: دوکتور زۆری لە سەر مەڕۆ! زوو دەرمانم دەکەی یان پیواز لە گیرفانم دەرێنم؟!

بەر لەوە تەواو لە لێوژە جێ بکەینەوە، سەرێک چووینە دۆڵی «باڵەییان» کە مەکتەبی سیاسی و تەنفیزی لەوێیە و زۆر ئاو و هەوای خۆش بوو. دۆڵێکە نزیک بە بیست گوندی تێدایە و پڕە لە باغات و میوە. چۆمەکەی لە نزیک بەفرانە؛ بە هاوینی سووریش هەر سەهۆڵاوە و ناوێری مەلەی تێدا بکەی! چەند دیمەنێکی جوانە کە ئەو هەموو دار بەڕوانە و دار مازووە گەورانە، هەموو مێوی ڕەزی لێ هالاوە و بە هەزاران هێشووە ترێ لەو بەرزاییانەوە خۆ دەنوێنن.

میوانی کەپری شێخ ڕەزای گولانی بووم. پێشمەرگەیەکی هەبوو (کەریمە کەچەڵ)، چێشتی لێ دەنا. ئێوارەیەک چوومەوە کەپر؛ کەریم دەمەوڕوو لە سەر خۆڵە پۆتینە درێژ بووە؛ هاوار دەکا:

- مردم! بمگەنێ!

دووپشک بە قامکیەوە دابوو؛ بن هەنگلیشی خڕ ببوو. گوتم: ماست هەیە؟ پیالەیەکی چکۆڵە ماست هەبوو؛ نامە سەر ئاگر، تۆزێکم گەرم کرد. قامکی کەریممان گرت بیخەینە ماستەوە، لە تاوی خۆی دەستی ڕاوەشاند، ماست ڕژایە ناو خۆڵ. هاوارمان بۆ دارشکێنێک برد، تەنیا دۆی هەبوو. دۆم گەرم کرد و فەورەن کەریممان چا کردەوە.

ئەو دەرمانی ماستی گەرم بۆ دژی دووپشک، زۆر جار بە کار هات. باسم بۆ حاجی محەممەدی شێخ ڕەشید کردبوو. لە پاشەڕۆژدا کە لە زینوێ دیتمەوە، گوتی:

- نەقڵێکی خۆش: چوومەوە لۆلان و بە سۆفییەکانم گوت ئەو دەرمانە فێر بووم کە زۆر هاسانە و ماست هەمیشە هەیە.

- کێ پێی گوتی؟

- لاوێکی ئەفەندی شارستانی.

سۆفییەک گوتی: پاش شێخ ڕەشید تۆ دەمێنی، ئیمان بە سەر رووتی شارستانی دەهێنی؟ بە خوا بە قسەت ناکەم!

قەبرێک هەیە لە لۆلان، دەڵێن هەر کەس بەردێکی چکۆڵە لەو سەر قەبرە هەڵگرێ و بیخاتە گیرفانی، دووپشک پێوەی نادا. سۆفییەکە چووبووە سەر ئەو قسنە، دەستی بۆ بەردۆکە بردووە و دووپشکێک پێوەی داوە! بە دەست و سەر ڕاژاندن هات:

- حاجی محەممەد چم لێ دەکەی؟ ئەوا دەمرم!
- ماستی گەرم کراوی سەرڕووتی شارستانی عیلاجت دەکا!

ڕۆژێک لە پردی زەردەوە دەمەویست بچمە دۆڵی بالەییان؛ بە چاو پێم وا بوو زۆر هاسان دەتوانم بگەمێ. چەمەدانێکم بە دەستەوە بوو؛ بە پێ ملم لێ نا. گەییمە قەسرێ، ماندوو ببووم و گەرمام بوو. ئیستراحەتێکم لە سەر جۆگە کرد و خۆم فێنک کردەوە و ملم لە هەوراز نا. بە هەزار دەرد گەییمە سەر هەورازی وەسان. لینگم دەلەرزی؛ وەک سەرخۆشان تلاوتلم بوو. ئاخری گەییمە سەرەوژێرە و باوی قاچم خۆش بوونەوە. شوانێک هەرای کرد:

- هۆی کاک! پەڕی سیغارم وێ نییە؛ ئەگەر هەتە بڕێکم بدەیە.

نیو دەستەیەک پەڕە سیغارم لە سەر بەردێک لە پەنا دانا؛ بەردێکیشم لە سەر دانا، با نەیبا. گوتم وەرە بیبە. خۆم گەیاندە ناو گوندی وەسان. ماڵ هەموو لە چۆڵ بوون. چەند لاوێک لە سەربانی مزگەوت بوون. سەلامم کرد و لە سێبەرێک دانیشتم. گوتم تووتن و پەڕ و ئاگرم هەیە و ئەمشەو لەم سەربانە ڕایدەبوێرم. یەکێ گوتی: میوانی من بە!

- ماڵت نزیکە؟

ماڵێکی نیشان دام، لە هەورازێک کە هەر تۆقیم.

- نایەم کاکە!

یەکی‌تر گوتی: میوانی من بە!

- کوا ماڵت؟

- لەوبەری چەمە و پردیش هەیە.

رەگەڵی کەوتم. لە ڕێ تووشی یەکێ‌تر بووین، گوتی: کاکە میوانی من بە!

- کوا ماڵەکەت؟

- ئەمەتا لە ناو ئەو بەردانەدایە.

- باشە دەبمە میوانی تۆ!

کردیانە کێشە کە چۆن میوانم لێ دەستێنی؟ گوتم: کاری من بە گەز و بستە؛ ئێرە نزیکترە و تۆم ناوێ! بوومە میوانی ناو بەردان. سەیر دەکەم ژنیان هەر یەکەی بیست و پازدە میتر شاڵیان لە پشتایە کە لە عیراق باو نییە.

- ئەرێ ئێوە چین؟

- ئێمە سەیدی کولیجین. سەید عەبدوڵڵای کوولیجی نەوە و خوارزای ئێمەیە کە لە سابلاغە.

- کوڕە ئەگەر وا بێ خزمین!

شەو کابرایەک هاتە ئەو ماڵە، گوتی: ماشەڵڵا لە دنیادا پیاوی عاقڵ هەیە و ئێمە نازانین. ئەمڕۆ بە ڕێبوارێکم گوت پەڕە سیغارم دەیە! بۆی لە سەر بەرد دانابووم؛ بەردیشی لە سەر دانابوو کە با نەیبا. بڕواننە ئەم عەقڵە! گوتم: کاکە تۆ چت دیوە؟ عەقڵی وام هەیە لە لینگەکلاش درشت‌تر!

- ئەوە تۆ بووی؟ شەرت بێ سبەی بە ئێستری خۆم بتبەمە ئەو شوێنەی دەتەوێ!

لە ڕێگە گوتی ناوم مەلای بۆرە. باسی سەید عەولای کوولیجی بۆ کردم کە ئێستا شوکور پیاوێکی دەوڵەمەند و زۆر پیاوە. بۆ من خەبەرێکی تازە بوو. زۆرم دڵ خۆش بوو؛ چونکە سەید

عەولام کە بەجێ هێشتبوو، منداڵێکی فەقیر و هەتیوبار بوو. ئیتر لەو ساوە بوومە خاوەن خـزم و تووتنی جغارەم هەر ئەوان بۆیان دێنام.

لە «لێوژە» دەگەڵ سامی ملمان لە کاری چاپەمەنی نایەوە. ڕۆژنامەی خەبات هەفتەیـەک بـە عارەبی و هەفتەیەک بە کوردی دەنووسـرا. پاشـان کـاک سـامی چـووە مەکتـەب سیاسـی لـە ناوپردان و تەنیا من مامەوە و بەرپرسی چاپخانە و ئیدارە کردنی پێشمەرگەکان بووم. جار و بـارە دەرفەتم دێنا، دەچوومەوە بەغدا سەری منـداڵانم دەداوە و یـەکێکم لـە جێـی خـۆم دادەنـا تـا دێمەوە بە سەر ڕابگا. جـار و بـارەش منداڵـەکانم خۆیـان دەگەیانـدە نـاو شـۆڕش و چـاوم پـێ دەکەوتن. هاوینێک کە مەدرەسە وچانیان بوو، هاتن. خانی چکۆڵەم کە هەوەڵ جار لـە گەلاڵـە لە ژووری ماڵەکە دەرکەوت و ڕوانی، گوتی: ئای دایە! باخچەی بابە چەند گەورەیـە! لای وا بـوو ئەم هەموو جەنگەڵ و شاخ و داخە باخچەی منە!

کەپرێکمان لە چیای پشت گەلالە کرد و کردمانە ماڵە خۆمان. چەنـد کـەپری تریـشمان لـێ نزیک بوون. ڕۆژانە لە «سوورەبان» کاری چاپخانەم دەکـرد، شـەوانە درەنـگ کـە تـا «گەلاڵـە» ڕێگەی دوو سەعاتێک دەبوو، دەهاتمەوە ماڵ. ئێوارەیەک زووتر چوومەوە، مەعسووم گـوتی: دوو مارم دیتن لێک هالابوون؛ هاوارم لەو جیرانانە کرد کەسـیان بـە دادمـەوە نـەهاتن. گلـەییم لـە جیرانان کرد، گوتیان بە خوا نەیگوتووە، هەر گوتوویە: «ئـەوەتا مـار»، «مـار هـاتوون». لـەوان وا بووە دەڵێ ماڵی دیکە هاتوون!

– کاکە قسەی قۆڕ! ئەو مارەی دیوە کە پێوە دەدەن.

– دە جا داکی محەممەد دەبوو بیگوتایە: «ماری گوریس» هات!

گەلێکم ڕوانیە ئەو بن گاشەبەردە کە دوو مارەکانی چووبوونە بن، پەیدام نـەکردن. دڵخۆشـی مەعسوومم دەداوە کـە هـەر ئـەو مـارە بـوون و ڕۆیـشتوون. مەترسـە! چیـدی نایـەن. کتێـبم دەخوێندەوە و دەمگوت مار نەما. لەو دەمەدا مارێک بە نێوەڕاستی پـەڕی کتێبـدا خوشـی و لـە کەلەکدا خۆی شاردەوە. جوان بە درۆزن دەرچـووم! شـەو لـە کـەپردا چرامـان کوژانـدبووە، بـا خشەی لە گەلا دێنا، مەعسووم دەیگوت ئەو مارە خۆی لێ مات کردووین تا دەنـووین. جـا وەرە و سوێند بخۆ کە مار بە شەو ناگەڕێ و ئەویش ئیستراحەت دەکا!

ئەمجار سەعید ئەبووشامیلی چاپخانەچی بە لایەوە شـتێکی زۆر عـەجایب بـوو کـە چـۆن بـە نیوەشەوی تاریک، بە ناو ئەو دارستانە پڕەدا بە تەنیا دەچمەوە ماڵێ و ناترسم؟ دەمگوت: کاکـە! لە دڕندە ناترسم؛ لە بنیادەمی خراپ دەترسم کە بۆ تەماح بمکوژێ و ئـەویش بـە ڕێـدا نـاڕۆم و تووشیان نابم...

لێوژە خەڵکێکی زۆر سادە و بەستەزمانی تێدابوو. ژنێک ئاوی بۆ دێنـاین بـە نـاوی «مێـرێ»، ورچ ببینە و مێرێ ببینە! ئەگەر ئاوی دەهێنا و دەیدی میوانی نامۆمـان هەیـە، کۆڵـوانەکەی بـە سەر دەم و چاویدا دەدا و دەهات.

– مێرێ! ئەوە بۆ وا دەکەی؟

– ئای بە قوربان! ئا شەرمێکم لە میوانان!

مەلایەکی لێ بوو «مەلا نیـسک» - پـێم وایـە نـاوی عەسـڵی «سـەعید» بـوو- ئـەو بێچـارە نەیتوانیبوو دوو سێ سلاوەت و «مەولایەسەللی» لـە بـەر کـا و لـە مەولوودنامـەدا بەشـدار بـێ. سەیدێکی نەخوێندەوار فێریان ببوو، پلاوی مەولوودی دەخوارد و مەلا بێبەش بوو!

گوتیان «مەلا نیسک» چاویلکەیەکی هەیە دە قیمەت نایە! گوتم: مامۆستا دەکرێ ئەو شتە عەنتیکەیە ببینم؟

- بەڵێ بۆ تۆ قەیدی نییە.

قوتوویێکی هێنا پڕ لە پەڕۆ، هەر پەڕۆی هەڵکرد تا گەیشتە لۆکە. لە ناو لۆکە، عەینەکە کۆنێکی دەرێنا لاسکەکەی بەن بوو. ڕاستی قڕانێکی نەدێنا؛ لە مەلا ببوە بت! دڵم نەشکاند، گوتم: نیشانی کەسی مەدە! زۆر گەنجێکی بەقیمەتە!

گیایەک بە زۆری لەو ناوە دەڕوێ بە ناوی «گۆرمزە»، زۆر لە ئەسپەناخ خۆشترە. ڕۆژانە بیست فلسم دەدا بە کچۆلێکی مێرێ، دەچوو چارۆکێک گۆرمزەی دێنا. ڕۆژێکی جومعە بانگم کرد: فاتمۆکێ وەرە بچۆ گۆرمزە!

مێرێ گوتی: ئەیرۆ! فەقێ ئایشێ ژنی مەلانیسک دەڵێ جومعان گیا زیکرێ دەکەن؛ گوناهە هەڵیانقەنی!

- خات مێرێ! ئەدی بۆچی مانگا و بزنەکانت ناردوونە دەشت گیای بە دەم زیکرەوە بخۆن؟!

بەیانیان «مێرێ» هەر ئاوێکی شەومەندە بوو، دەیبردەوە کانی و لەو سەر ئاوی تازەی دێنا.

- ئاخر تۆ بەو هەورازە هەڵدەگەڕێی ئاوی شەو بۆ دەبەیەوە؟!

- قوربان! فەقێ ئایشێ دەڵێ ئاوی شەو نەچێتەوە ناو کانی شکایەت لای خودا دەکا!

جارێک مێرێ شکایەتی کرد کە ئەگەر تۆ لە ماڵ نابی، پێشمەرگە تەنەکەی بەتاڵم نادەنێ.

- چەندی دەتەوێ بەرە، بەڵام بۆچیتە؟

- بە قوربان نیوە ڕۆنی خۆماڵی و نیوە ڕۆنی شاپەسند لێک دەدەم و بە پیرەی مێردمدا دەینێرمە ڕەواندز!

های بە کلکی خێوی! لە هەموو عیراقدا ڕۆنی ڕەواندز بە خالیس و چاک بەناوبانگە؛ کەچی ئەویش فێڵی تێدا دەکرێ!

بەزمی خۆشمان لە سوورەبان «نزار» ناو، کوڕی «سەبری بۆتانی» بوو. لە کەرکووکەوە هاتبوو. منداڵێکی ١٦-١٧ ساڵە بوو. ڕۆژ تا ئێوارێ دەگەڵ سەگەلی ناو دێ هەڵدەسووڕا؛ دە باوەشی دەگرتن؛ ماچی دەکردن. خەڵکی دێ شتیان پێ نەدەفرۆشتین، دەیانگوت گڵاو دەبین. هەرچی دەگەڵ نزارم دەکرد، بێفایدە بوو. باوکی لە خۆشی زیرەکی «نزار» پێی بە عەرزەوە بەند نەدەبوو، هەمیشە تاریفی دەکرد.

ڕۆژێک گوتم: نزار لەغەزێکت لێ پرسم: دوو بزن یەکیان ڕووی دە ڕۆژهەڵاتە و یەکیان ڕووی دە ڕۆژاوایە؛ لەسەر باقە گیایەک دەلەوەڕێن. ئەوە چۆن دەبێ؟

قەدەرێک مات ما، گوتی: بزن نابێ، ئەسپ دەبێ؛ کە پارویەک هەڵدەگرێ و ئاوڕ بۆ پاش قوونی دەداتەوە!

گوتم: شتێکی کە پێشوو بیستووتە و زانیوتە بلێ؛ ئەتۆ ئەوەت دەزانی!

ملی لە سوێند نا کە بە زیرەکی خۆی حەلی کردووە!

نزار کوردی نەدەزانی و کلاسی شەشی خوێندبوو. هەر زوو گوتی ئیجازەم بدە بچمە لای باوکم.

- بچۆ بەڵام زوو وەرەوە.

چووبوو هەر لە دوورەوە بانگی کردبوو:

- بابە لەغەزێکم بە زیرەکی خۆم حەل کرد!
کە بۆی گێڕابۆوە باوکی جوێنی پێدابوو:
- هەتیو ئابڕووت بردووم!
حاڵی کردبوو کە زۆر هاسانە. نزار شەو نەهاتەوە. بەیانی خۆم لێ تووڕە کرد کە بۆ درۆی کردووە.
گوتی: سەگەلم بۆ هات، بە لایتەکەم لە دم و چاوی خۆم دا، گوتم من نزاری ئاواڵتانم، بەلام قبوولیان نەکرد و نەموێرا بە شەو بێمەوە!
جا نابێ لە بیرمان بچێ کە لایت [چرا قوە] بۆ سەگ لێدرێ لە شەودا، هەرگیز ناوێرن نزیک پیاو کەونەوە.
دەگەڵ نزار بە ڕێدا دەڕۆیشتین، تووشی پیاوێک بووین کووپەڵە ترشیاتێکی لە سەر باردا بەستبوو.
- مامۆستا ئەو کابرایە یان ترشیاتەکەی بۆ ماڵی خۆیەتی، یان بۆ ماڵی جیرانان، یان دەیفرۆشێ!
گوتم: یانی چوارەمیشی ماوە؟ یان دە قەبری بابی ڕادەکا!
شەوێک لە ژوور دەرکەوت و بەفری دیبوو. هاتەوە گوتی: شتێکی زۆر سەیرە، بەفر لە عەرزدایە و ئەستێرەش لە عاسمان دیارن!
تەختی نوستنم لە ناو چاپخانەدا نزیک کوورە بوو. قەراخی لوولە کوورە لە سەربان دڵۆپەی دەکرد. نزارم نارد هێندێک گڵی تێ پەستێوێ. دڵۆپە وێستا، لەپڕ باوەشێک بەفر و ئاوم بە سەردا کەوت.
- نزار تۆ چت کردووە؟
- مامۆستا دیتم بەفر لە خۆڵ پاکترە، بەفرم تێ پەستاوت!
شەوێک چەند سۆفیلکەیەکی دێ لام بوون. نزار باسی سەگێکی لێ پرسین کە نایبینم، گوتیان کوشتمان.
- ئای خودا ڕەحمەتی بکا جەننەتێ، بە خوای ڕەحمەتی زۆر سەگی چاک بوو!
لە سوورەبان ماوەیەکی زۆر خالیداغای حیسامیشمان دەگەڵ بوو. جارێک مام عەلی پڵاوی لێنابوو، کاکڵەی گوێزی تێ کردبوو. خالیداغا پرسی: ئەوە لە کوێ گوێز دە پڵاو دەکەن؟ من لە جیاتی مام عەلی گوتم: لە ئێران! مام عەلی سوور هەڵگەڕا و بە سەریدا نەڕاند:
- ئاخر ترم شێخالی! دوو بست عەرزە و بیست ئاغای هەیە! تۆ کەی دنیات دیوە؟ لە هەموو ئێران یەک کاکڵە گوێز بە بێ پڵاو ناخۆن!
خەڵکی دێ زۆریان من خۆش دەویست؛ دەهاتنە لام و قسەی خۆشم دەگەڵ دەکردن. جارێک چووبوومە بەغدا و خالیداغا لە جێی من بوو. چووبووە سەر بانی پیرێژنێک گوتبووی:
- زولێ! ئەوە بۆچی کەرە و ماستت بۆ مام هەژار دەهێنا و بۆ من ناهێنی؟
- خالیداغا! مام هەژار قسەی خۆشن لۆ دەکا. ئەتۆ وەک بەراز غەزریوی لێن چوویە کونێوە!
خەڵکی گوند هاواریان بۆ هێنام کە خەڵکی «وەلزێ» هاتوون دارە پاوانەکانیان دەبڕن. مەلا سەید ڕەحمانم نارد، هاتەوە گوتی: دەڵێن دەیبڕین و جوابی کەسیش نادەینەوە. گوتم وەرن ڕێگەیان لێ بگرین. هەرچی هات، بارە دار و بارە بەرمان لێ ساندن، ڕووتمان کردن. پیاوێک بە

سێ بارەوە دەرچووبوو؛ دوور کەوتبووەوە. گوتم سەعید و مام عەلی بچن ئەویشم بۆ بێنن. سەعید ڕایکرد و بە دەمانچە لە کابرا ڕاسا. کابرا تفەنگیشی پێ بوو؛ شەڕی نەکرد و تەسلیم بوو. مام عەلی کە هەموو دنیای بە چیرۆکی خۆی کوشتبوو، زۆر بە شلی دەرۆیشت. تا سەعید کابرای هێنا، ئەمجار مام عەلی جوێنی پێ دەدا و هەڕەشەی لێ دەکرد.

- مام عەلی مەرگی ئەو سەر و سمێڵەت بێ! خۆ نەتوێرا بچیە پێش!

- نا، گوتم دیهگانە، فەکیرە، بۆچی بیکوژم؟!

ئەمجار چوومە «دیلمان» و بە مەلامستەفام گوت وەکیلی تۆ لە وەلزێ ڕێگەی داوە زوڵم لەو فەقیرانە بکەن. ناردی نەعمانیان گرت کە وەکیلەکە بوو. لە تەویلەیان کرد تا بە تکای من پاش چوار ڕۆژ بەریان دا. سووختی ئەو زستانەمان لەو دارە تالانییانە پێک هات.

دەگەڵ مەجید و مەلا سەید ڕەحمان سەفەرێکمان بەرەو «زینوێ» کرد. شەو لە «ناوبەرگە» میوانی مەلا محەممەد ناوێک بووین. بەیانی هەر لە مالان ئاوا بووین، دوو تەیارەی هوکرهەنتەرمان هاتنە سەر. گوتم خۆ بشارنەوە! جێگەکەم ڕووتەن و خیزەشینە بوو؛ لە ڕاست خۆم دانیشتم، قوتووی سیغارەکەم دەرێنا، سیغارێکم پێچاوە و دامگیرساند. گوتم با ئاخر سیغار لە ژیانمدا بکێشم. تەیارە لێیان قرماندم، چەند مەڕێکیان لە کەرکە مەڕێکی دەوری من کوشت؛ من وەبەر نەهاتم. تەیارە چوون و من بانگم کرد: وەرن بڕۆین! مەجید هات. مەلا ڕەحمان نەبوو. هەرامان کرد، نالەیەکی هات. لەم سەرە چووبووە ناو دڕوە شیلانێکەوە، لەو سەر دەرنەدەهاتەوە. بە لاق کێشان دەرمان کێشا. هەموو دەست و سەر و چاوی بە دڕوە شیلان دەخوێن هاتبوو.

قەدەرێک ئەنوەر دڵسۆزم لە جێگەی خۆم دانا تا لە بەغدا دێمەوە. پێم وایە باسم کرد کە چۆن کومۆنیستێک بوو. ئێستاش لە یەمەنی جەنووبی هەمەکارەیە. ناوی مەلا برایم بوو. کە هاتمەوە، هەرا بوو. کاری بە خەڵکی دێ کردبوو، پووڵی نەدابوونێ. سابوون و پەڕە جغارە و تیغی ڕیش تاشینی پێشمەرگەی بۆ برای ناردبوو. دەرزییەکی بە مریشکێک لە فەقیران دابوو. زۆر زوو گوتم تۆ لێرە مەمێنە. پووڵی کرێکارانم لێ وەرگرتن و دامنێ. مەلا برایم بە سووکایەتی ڕۆیشت.

دەمێک بوو کە لە سوورەبان بووین. هەر دەبوو کە لە دێ دوور کەوینەوە و لە دەشت بڕین. ویستم ئاودەستێک دروست بکەم. مام داودی مێردی مێریی ئاوهێنمانم بانگ کرد:

- ئاودەستێک بکۆڵە پووڵت دەدەمێ!

تووڕە بوو: عەیب نییە من ئاودەست بکۆڵم؟ هەر ناشزانم کۆی دەکۆڵن!

- مام داود ببەخشە! مەنزوورم ئەوە بوو ئەگەر ئەنوەر (مەلا برایم) بمردایە، تۆ چۆن قەبرێکت بۆ دەکۆلی؟

- کوا خوا ئەوە دەکا؟ ئەگەر ئەو سەگبابە بمرێ، قەبرێکی لۆ دەکەم قەتی لێ دەرنەچێتەوە!

- دە باشە برۆ بیکۆڵە بزانم چۆنی دەکۆلی؟

قولکێکی زۆر دوور و درێژ و قوولی کۆلی کە ئەنوەری زگزلی بە هاسانی تێدا بنێژرێ. وتم دارەڕای کە و کونێکی تێدا بێڵەوە، ئەوە بوو بە ئاودەست!

پێشمەرگەیەکمان بە ناوی عەلی -کە خەڵکی ئێران بوو- بە گاڵتە پێیان وتبوو سەید ڕەسوولی بابی گەورە کوژراوە. ئەویش چل دیناری لە کن سەید ڕەسووڵ داناوە، لە تاوان شێت

بوو؛ دایە کێو. دوای سێ ڕۆژ پەیدامان کرد و هێنامانەوە. گوتمان دەینێرینە بەغدا. خزمێکی لە زینوێوە هات گوتی دەیبەمە ماڵە شێخی قەرناقەوێ. عەلیان کە بردەوە، شێخ هاتووە و گوتوویە: ناوی جنۆکەکانت هەڵدە تا بیانکوژم! ئەمن ئەمشەو بە قلیج (شیر) پێنجسەد جندۆکەی کافرم کوشتووە و بەری بەیان لەو خەزایەدا هاتوومەوە. عەلیە شێت دەڵێ: ئای بە قوڕت دابا ملئەستووری زگزل! ئەگەر تۆ هێندە مەردی، دە بچۆ ئینگلیس و عەرەبان بکوژە و نەوتی کوردستانمان بۆ بستێنە! شێخ دەڵێ: ئەم هەتیوە کافری دڵ ڕەشە، بە من چاری ناکرێ!

لە دەرفەتێکیتردا -کە لە بێخۆلان بووین- بردمە بەغدایە. قەرار وا بوو دوازدە جار لە بەرقی بدەن، پاش شەش جار هەلاتبوو. کە هاتمەوە جوێنم پێ دا:

- بۆ نەتهێشت باش عیلاجت بکەن؟

گوتی: بە خودا ترسام هێندە عاقڵ بم، بە کاری ئەم ولاتە نەیەم!

جێژنی ڕەمەزان بوو؛ خەبەرم نارد بۆ مەلا قادری قازی گەلالە کە بە هۆی جێژنەوە شتێ بنووسە بۆ ڕادیۆ. نامەیەکی دوور و درێژی نووسیبوو؛ کە قەڵەمی کۆپیەی بە زمان تەڕ کردبوو:

«لە مەدینەوە «پوعلوبە» دوازدە ڕۆژە ڕێ چووبووە مەککە، بە پێغەمبەری گوت: مانگم دیوە، فەرمووی: «وەیلون لی پوعلوبە» یانی: وەیل لە بۆ پوعلوبە...». کاغەز هەمووی بەو توورەهاتە پڕ کرابۆوە. ناچار جرم دا و خۆم بێ فتوای قازی گوتم جێژن لە هەموو لایەکتان پیرۆز بێ.

لە سوورەبانەوە لە سەر داوای کاک عەبدولخالق چووم بوومە کارگێری ڕادیۆ شۆرش لە «شیناوێ»، لە خوار قەسرۆکێوە. جێگەی تێدا ژیانمان نەبوو. فەعلەمان گرت و چەند ژوورێکمان دروست کرد. ژوورێکم بۆ خۆم کرد؛ زۆر تەنگەبەر؛ بە حاڵ جێگەی دوو تەختی تێدا دەبوو. لە بەرد و قوڕ بوو؛ ژوور و دەری سواغ نەدرابوو؛ هەموو کەلێنەبەرد بوون. مشەممایەکی نایلۆنم بە بەر میچەکەیەوە دابوو کە خۆڵ نەوەرێ. هەوالانی سەر ڕادیۆ زۆر بوون؛ کە دوو لەوانە شێخ عەزیزی شێخ ڕەزای باسەرە، موهەندیسی ڕادیۆو بەرق، لە چیکۆسلاواکیاوە هاتبوو؛ ئەویتر ڕەفیق چالاکی هونەرمەند و گۆیندە و نومایشنامەنووس بوو.

کەوتمە سەر ئەو فکرە کە شەرەفنامە بە کوردی تەرجەمە بکەم. بەلام کتێب لە کوێ بێنم؟ سالح مەحموودی بارزانی (خوارزای مەلامستەفا) -کە کرمی کتێبە- شەرەفنامەی فارسی چاپی میسر و شەرەفنامەی عەرەبی تەرجەمەی «عەلی عەونی» و شەرەفنامەی عەرەبی تەرجەمەی «مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی» بۆ هێنام و ملم لێ نا. لە پاش کاری نووسینی کەرەستەی ڕادیۆ و بە بنکە ڕاگەیشتن و نووسینی مەقالات بۆ ڕۆژنامە و شتیتر، وەختێکم دەدزیەوە، یا لە بن دارێک، یان شەو لە سەر جێگە، خۆم بە تەرجەمەوە خەریک دەکرد.

بەهاری ١٩٦٩ مەلامستەفا چووبووە گەڕان لە لای دەشتی شلێر و سولەیمانی و لە «ماوەت» ماوەیەک دەمایەوە. ویستم سەفەرێکی بەغدا بکەم. دەبوایە دەربارەی کاری چاپخانەشەوە بازانی ببینم. بە ڕێگەی هەولێردا هاتمە کەرکووک. چوومە کاراژێک گوتم: ترۆمبێل بۆ شەدەلە هەیە؟ کابرای کاراژدار تماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، گوتی: دانیشە و دەنگ مەکە! کە خەڵکی لە دەورە نەما، گوتی: کاکە تۆ قسێک دەکەی باسی سەرە! لەوەتا مەلامستەفا هاتۆتە ئەو ناوە، هەر کەس بەرەو ئەوێ بڕوا دەوڵەت بەهانەیەکی پێ دەگرێ و دەیگرێ. تۆ بۆ دەچی؟

- ڕاستییەکەی دەچم چاوم بە بارزانی بکەوێ.

ناردی کەبابیان بۆ هێنام. ڕانندەیەکی بانگ کرد و سرتەیەکی دەگەڵ کرد. گوتی دەگەڵ ئەم

ڕانندە برۆ. هاتینە کن «چەمچەماڵ». جاشەکانی جەلال و برایم ئەحمەد لە «بەکرەجۆ»ڕا هێنابوویاننە چەمچەماڵ و لە ئوتێلێک دامەزرابوون کە لە سەر چەقی ڕێگا بوو. نەشموێرا بە ڕانندە بڵێم لێرە لامەدە ئەو جاشانە دەمناسن. بۆ خۆی زۆر بە پەلە لە شار دەرکەوت. گوتم: حەزم کرد لات نەدا. گوتی: ئەمین گاراژدار تێی گەیاندم کە نابێ جاش بتبینن. گەینە سەر چوارڕێی «تەنیال». ڕەمەزانیش بوو. بە کابرای تەنیاڵی سپاردم و ڕۆیشت. چایچی نان و چای دامێ. زیلێکی پڕ لە سەرباز هات. دەستی لێ هەڵێنان، گوتی: ئەم خزمەی من تا بەرانبەری سووورداش بەرن! لە ڕێگە تێرمان قسەی خۆش کرد. لە بەرانبەر سووورداش دابەزیم و بە پێ ملی ڕێم گرت. دوو کەسی بە تفەنگەوەش گەیشتنە من، گوتیان پێشمەرگەین. دوای تۆزێک گوتم: برا من شارستانی و تەنبەڵم ، ئێوە برۆن، من وردە-وردە دێم. گوتیان: نەخێر بە پێی تۆ دەڕۆین و بە جێت ناهێڵین. وانێتبارێک بە ڕێدا هات، پڕ لە ژن و منداڵ و مریشک و قەلەموونە. ڕایگرت:

- وەرن سوار بن.

لە پشت وانێت سوار بووین. نوێژی شێوان گەیینە گوندی «ئۆمەرقۆم». ساحیب کامێون گوتی: ماڵم لێرەیە و بەربانگە؛ میوانم بن!

- پووڵەکەت چەندە؟

- بە خوا هیچم لێتان ناوێ. بە خۆڕایی سوارم کردوون.

- دە کاکە بمانگەینە «شەدەڵە» نیو دینار وەرگرە!

بردینیە بەر قاوەخانە. لە باتی نیو دینار سێ ڕوبعە دینارم دایە. چووینە قاوەخانە. سۆفییەک هات گوتی: فەرموون بۆ تەکیە! شێخ عەبدوڕەحمان بەخێری هێناین. پیاوێکی زۆر عاقڵ، زۆر ڕووخۆش، زۆر کوردپەرەست. لەو وەتاغەی ئێمەی لێ بووین، بە سەتان کتێبی تەفسیر و حەدیسی لە سەر تاقە بوو کە لەبەر دووکەڵ زەرد و ڕەش هەڵگەڕابوون و دیار بوو زۆر لە مێژە نەخوێندراونەوە.

لێم ڕوونە دەربارەی شێخ و دەروێشی شەدەڵەوە شتهایەکت بیستووە! منیش وەک تۆ:

لە زەمانی مەولانا خالیددا، شێخ ئەحمەدی سەردار یەکێک لە خەلیفە خۆشەویستەکانی بووە و سەیدی بەرزەنجییە. نازانم کەی تەریقەتەکە لە ڕێگەی نەخشبەندی لای داوە، بەلام بەر لەوە بچمە عیراق، «حەمەسوور» ناوێک لەو تایەفە داوای پێغەمبەرایەتی دەکا و ژن و مێردی مریدی ئەو تێکەڵاون و هەموو ژن بۆ هەموو پیاوان حەلاڵن و کەس گوێ بە شەرع نادا و زینایان لە لا گوناح نییە. دەوڵەت حەمەسووری گرت و بردیە حەبسی کەرکووک. بە سەتان لە مریدان -کە نیشانە و دروشمیان قوڵەدارێکی دەست بوو- چوون لە دەوری کەرکووک، ژن و پیاو و منداڵ مانیان گرت، تا حەمەسوور بەردرا. زۆر لە مەلایانیش چووبوونە ناو ئەو تەریقەتە. دەیانگوت هەر کەس چەند ڕۆژێک لە شەدەڵە بێ، عەقڵی دەگۆڕێ. من خۆم مەلا تەها ناوێکم لە لوبنان دەگەڵ بوو. لە نەخۆشخانە مرید بوو. دەیگوت هاوبەشیەکی زۆر زۆر عادلانە بوو؛ کەس لە کەس تێرتر و برسی‌تر نەبوو. ئەو دەمە کە من چوومە شەدەڵە، حەمەسوور مابوو؛ بەلام داموودەزگاکە نەمابوو. حەمەسوور لەو بەری دێ کە شیوەڵەیەکی نێوان بوو دەژیا. چەند کەسێکی‌تریشیانم دەناسی کە ئاغایانە دەژیان و دەگەڵ پێشمەرگەدا بوون. بە قسەی «مەلا باقی» -کە تاریخێکی زیندووی کوردستانی عیراق بوو- وەختێ بەهائوللا لە سەرگەلوو بووە، کاری کردۆتە سەر بڕوای

ئەو شێخانە و لە ڕێگەی پێشووی لاداون.

سۆفییەک خزمەتی دەکردین کە لە سەر یەک قرپی دەهاتێ. دیار بوو لە کۆنە مریدەکانی زەمانی جەزم بوون بووە. شێخ عەبدوڕەحمان دەڕۆیشت، گوتم: خواحافیزیت لێ دەکەین نەوەک نەتبینینەوە. گوتی: دەبێ سبەی نان و چا بخۆن. گوتم: یا شێخ! ئێمە بەڕۆژوو نابین. تۆ پارشەومان بۆ بنێرە و بەرەبەیان دەڕۆین.

دوای پارشێو خواردن بارگینێکی جل کراو حازر بوو. گوتی: سوار بە تا «هەلەدن». گوتم: لازمم نییە. گوتی: تۆ لێم مەبە بە مام حەسەنی فەیلی کە دوێنێ سەرما بردی! کابرای خاوەن بارگین لە ڕێگە گێڕایەوە:

مام حەسەن -کە دوکاندارێکی فەیلی بەغدایی بوو- هاتبوو سەری عەبدولحسێنی کوڕی بدا کە لە هەلەدن بە بنکەی پێشمەرگە ڕادەگا. شێخ عەبدوڕەحمان لە شەدەڵەوە منی ڕەگەڵ خست کە لە کوێستانێ بە تەنێ نەبێ. کاتێ سەرکەوتینە ملەی چیای پیرەمەگروون و مام حەسەن زانی کە من خەلکی سەرگەلووم، هەلەدنیشی لێ دیار بوو، گڕنەی گرت کە تۆ بچۆرەوە مالە خۆت. هەرچەند گوتم پوولی تا هەلەدنم ساندووە و کوێستان بۆ نابەلەد خەتەرە، بەهرەی نەدا و بە جنێو لێم جیا بۆوە کە من خۆم بە پیاو دەزانم و و بە تەنیا دەڕۆم. لە دامێنی چیا لێی هەلکردە کڕێوە و سەرما بردی.

کە گەیشتینە شوێنەکە، جێ پێ و جێ کەلاکی مام حەسەن لە بەفردا مابوون. دیار بوو زۆری لە کڕێوە سەر لێ شێوابوو؛ زۆر لە نزیک مالان سەرما بردبووی. بە سەر سەرەخۆشی مام حەسەندا هاتم. میوانی عەبدوڕەحمان قازی بووم. «مامۆستا هەردی» شاعیر لەوێ بوو. بە داخەوە لەبەر ناهومێدی خۆی مێشکی داخرابوو؛ هەموو شتی لە بیر چووبۆوە. دلخۆشی دانەوەی من بەهرەی نەدا. بە زۆر وام کرد سەر و ڕیشی بتاشن. پاش نیوەڕۆ چوومە «مالوومە». کابرایەکم بە کرێ گرت بە سواری بمبا بۆ ماوەت. شەو نوێژی شەوانێکی درەنگ گەیینە ناو دێی «ولاخلوو». بەفر بوو؛ سەرماش سەخت. کابرا گوتی: تۆ بچۆ مالی مەلا، منیش خزمێکم هەیە. گوتم: ڕەمەزانان میوان خوێنتالە؛ دانابەزم. تۆ بچۆ بە مەلا بلێ میوانێکت هەیە. ئەگەر ڕووی ناخۆش بوو، زوو وەرە دەچینە مالە خزمەکەت. هەر چۆنێ بێ شەوێکە، ڕایدەبوێرین. مەلا هاتە دەر و گوتی: فەرموو. ژوورێکی زۆر گەرمی پاک و خاوێنی هەبوو. هەر تماشام دەکا و دەلێ: حەیفە پیر بووی، بە داخەوە زۆر گۆڕاوی!

- مامۆستا من تۆ ناناسم. تۆش قەت منت نەدیوە؛ لێت گۆڕاوە.

- کاک هەژار تۆ شتت لە بیر چۆتەوە! من ناوم مەلا عەبدوللایە. چەند لە سابلاخ پێکەوە ئاشنا بووین و لە کۆمەلەدا هەوال بووین؟!...

کاوێژی ژیانی کۆمەلەمان کردە شەوچەرە و زۆر خوش ڕابرا. پارشێو کەوتینە ڕێ. چێشتەنگاو گەیمە ماوەت. دوو شەو لای بارزانی و شێخ محەممەدی هەرسین -کە بەرپرسی ئەوێ بوو- مامەوە. پاش دوو شەو دەگەل کامیۆنێک بەرەو سولەیمانی ڕێ کەوتم. زۆر جار کامیۆن لە قوڕدا گیری خوارد. بە حالەحال، گا بە سواری کامیۆن، گەلێک بە پێ و بە قوڕ شێلان، شەو گەیشتینە قاوەخانەی قەدی چیای «ئەزمڕ». لەبەر سەرما و بێپێخەفی نەمانوێرا بنووین. شەوی مابوو کەوتینە ڕێ؛ مەلا بانگدان گەیینە شار. خۆم کوتایە پاچەخانەیەک، نان و چام خوارد. نەمدەوێرا دەرکەوم؛ شاگردێکم نارد جێگەم لە ترۆمبیل بۆ پەیدا کا تا کەرکووک. بۆ

نەمدەوێرا دەرکەوم؟ لە کوردی جاش دەترسام.

بانگیان کرد: مسافری کەرکووک سوار بن! جێگەم لە پێشەوە بۆ داندرابوو. عەینەکی ڕەشم کردە چاو. گوتم: برا من لە پێشەوە گێژ دەبم. گورجێ یەکێ لە دواوە دابەزی جێگە بگۆڕینەوە. خۆم لە ناوەڕاستی پشتەوە خزاند. لە ڕێگە لە دڵدا پێکەنینم بە خۆم دەهات: سی و ئەوەندە ساڵە بۆ کورد و کوردستان ماندووم و دەردم دیوە و ئاوارەی وڵاتان بووم و حەبس و شەوبێداریم چێشتووە؛ ئێستا وەرە لە عەرەب نەترسی، لە کوردی خوێندەواری هاومەسلەکت بترسی کە بتبینێ، بتکوژێ!... دیسان بە ترس و ئایەتەلکورسی لە چەمچەماڵ دەرچووین. جاشێک کە هات لە ماشینەکەی ڕوانی، خۆم و بەختم نەیناسیم. لە کەرکووکەوە هاتمەوە هەولێر سەری کاک محەممەد (مەم) و تایەر تەوفیقم دا و ئەوسا چوومەوە بەغدا.

وەک دەزانین لە مانگی جونی ١٩٦٧دا شەڕی ئیسرائیل و عەرەب قەوما. ئێمە کە لە شەڕدا زۆر باومان خۆش بوو، پیاوی دەوڵەت هاتن -کە شێخێکی عارەب و فەرماندەی دوو سوپای عیراقی لە هەولێر و کەرکووک بوون- داوایان لە مەلامستەفا کرد کە لەو شەڕەدا یاریدەی دەوڵەتی موسوڵمانی عیراق بدا بە دژی جوولەکە. من لەو مەجلیسەدا حازر بووم. مەلامستەفا گوتی: شێخ عاسی دەڵێی با شیر هەڵکێشین و بچینە جیهاد. زەمانی شیر هەڵکێشان بەسەر چووە. بڕواشم وایە عەرەب دەرەقەتی جوولەکە نایەن؛ کە ئیسرائیل دەوڵەتێکی عەسری و سەنعاتکارە و دنیاشی لاگرە. بەڵام چونکە شەڕی موسوڵمان و جوولەکەیە، من شەڕ دەوەستێنم و موسوڵمانەتی وام ئەمر پێ دەکا کە لە ڕۆژی وا تەنگانەدا نەبمە خەنجەرێک لە پشتەوە لە موسوڵمان دەم و جوولەکەش هەر بیانکوژن... من کە خۆم لام وابوو چاکترین فرسەت هاتووە شەڕەکە گەرمتر کەین و بەغدا ناچار بکەین بەسەر چۆکدا بێ، ئەو جوابەم هیچ بە لاوە پەسند نەبوو؛ بەڵام دەسەڵات چییە؟

فەرماندەی هێزی هەولێر لە ناو قساندا گوتی: نازانم کێ فەرماندەی سوپای ئیسرائیلە؟

بە لەهجەیەکی پڕ لە گاڵتەوە گوتم: مووشی دایانی مەشهوور کە دنیا دەیناسێ چ بەڵایەکە!

سبەی ئەو ڕۆژە -کە وتوویژکەرەکان ڕۆیبوون- من دەستی مستەفا و زاگرۆسی کوڕم گرتبوو، لە پشت گوندی ڕێزان دەمگێڕان؛ مەلامستەفا ڕادەبرد؛ بانگی کردم:

- خەبەر چییە؟

گوتم: خوا شوکر عەرەب و ئیسلامەتییەکەیان زۆر کزە! چوارسەد تەیارەی میسری لە سەر فڕگە سووتاوە و جوولەکە گاڵەیان پێ دەکا.

دەنگی نەکرد و ڕۆیشت. چووبووە گەلالە؛ جەوهەر هیرانی لە قاوەخانە گوتبووی: ئیشاڵڵا جوولەکە هەموو عارەبان قڕ دەکەن. گرتیان و دوو مانگیان حوکم دا!

زۆرم حەز کرد کە جوو بە سەر عەرەبدا زاڵ بوون. عەکسێکی مووشێ دایانم لە ژوورەکەم بەرانبەر بە خۆم هەڵواسیبوو.

چەند ڕۆژێک ئاشپەزمان نەبوو؛ حاڵمان شڕ بوو. کوڕێکی عەرەبی پێشمەرگە هات گوتی: من ئاشپەزی چاکم؛ ئاشپەزی بۆ کردین. دوای چەند ڕۆژ گوتی: نەمکەنە گوویندەی ڕادیۆ، ئاشپەزی ناکەم! تاقیمان کردەوە، دەنگی بە کار نەدەهات. ئەویش پێی چەقاندبوو هەر دەبێ گوویندە بێ. گوتم: ئەبووتالیب! لەوەتا هاتووی جنێو بە کۆمۆنیست نادەم لەبەر خاتری تۆ؛ عەکسی مووشێ دایانیشم لابردووە. بڕۆ ئازادم کە و هەر نانی وشک دەخۆم!

چەند ماڵە کوردێکی تورکیایی لە عەشیرەتی «قشووری» لە دەوری بنکەکەمان بوون کە هەموویان عەولادی پیرەپیاوێک بوون؛ ئەویش ماڵی سەربەخۆی بوو. دەگەڵ ئەوەشا کە کوڕەکانی چوار کەس و پێشمەرگە بوون، شیناوەردیشیان کردبوو.

کوڕێکیان لەگەڵ خوشکێکیدا لە ژوورێک دەژیان، لاوێکی بێگانەشیان وەک ڕەنجبەر دەگەڵ بوو، شەوانە لەو ژوورە دەنوست. جاری وا هەبوو چەند ڕۆژ هەر ئەو بێگانە و کچەکە بە تەنیا شەو لە ماڵدا دەمانەوە.

دایکی کچ ڕۆژێک هاواری بۆ بنکە هێنا: کچەکەم خوێنڕێژی دەکا، ئەوە دەمریّ.

کاک عەبدولخالق جیپێکی پەیدا کرد و بردیە خانیّ بۆ سەر حەکیم؛ هێنایەوە. براکانی کچ لە حەکیمیان پرسیبوو، گوتبووی حامیلە بووە و بەری هاویشتووە.

شەو بە تەنیا لە ژوورەکەم دەمنووسی، پیرەمێرد و کچەکەی هاتنە ژوور. پیرە گوتی: کوڕەکانم بە زۆر ئەو کچەم دەدەن بەو ڕەنجبەرە؛ تۆ قبووڵ مەکە! لەپڕ چوار کوڕ بە تفەنگەوە هاتن دەنگی باوک و خوشکیان دا کە هەستن! من دەرکەوتم کە نەهێڵم بیانبەن. قایشی تفەنگی یەکیانم گرت، بە دوان ڕۆ هاتنە قایش و کێشایان؛ دەستم برینداربوو. هەرام لە هەوالانی مەقەڕ کرد، کەس بە دەنگمەوە نەهات. هیچ دەرفەتیان نەدا و لە دەرکەوە کچیان بە تفەنگ کوشت. پیرە مامیش هەلات؛ قاتلەکانیش هەلاتن.

ژوورەکەم عەرزەکەی پڕ بوو لە خوێن. کە دیتم هەوالەکانم تازە پەیدا دەبن و بە دەنگی تفەنگەوە هاتوون. لاشەکەمان بردە دەوری کانی؛ دایک و خوشکی بە شیوەن بردیانەوە ماڵ. بە سولەیمانم گوت بزانە ئەو شتانەی خوێناوی بوون لە سەر کانی بیانشۆرەوە. سولەیمان کە هەر دە خەیالاتی ئەو کارەساتەدایە و سەر دۆشەکێکی شتووە و لە سەر پلووسکی کانی داناوە و خەریکی شوتنی شتی دیکەیە، سەردۆشەک تەپ دە کانی دەکەویّ؛ جا وەرە و هەڵیّ! وەیزانی مردوو هاتۆتەوە سەر کانی!

ژوورەکەم زۆر دیمەنێکی خراپی بوو: لە زەمین ئەو هەموو خوێنە، پەڵەی خوێن بە دیواران هەلپڕژاوە، جیّ گوللە لە دیواران دیارن. هەرچی گوتیان بە تەنیا لێرە مەنوو، چرام کوژاندەوە و لە سەر تەختەکەم ڕاکشام. بەلام تا خەوم لیّ دەکەوت، کچەکەم دەهاتە خەونەوە؛ دەپاڕاوە کە: زولمیان لیّ کردووم، مەزلوومم، خوا هەڵینەگریّ... چەند جار بەو خەونە ڕاپەڕیم و زۆری کار لیّ کردبووم. کە دوایی ویّکەوتم، پیرە، گەوادێک بووە؛ قەولی بەو ڕەنجبەرە داوە کچەکەی بداتیّ لە باتی شەرتی ڕەنجبەری. دەنگی نەکردووە کە بۆ بە شەو لەگەڵ کچەکەیدا پێکەوە دەژین. ئێستا کە کار نەماوە، لیّی پەشیمان بۆتەوە و ئەو کەتنەیان گێڕاوە. شکایەتی سووکایەتی بە سەر بنکەی پێشمەرگەم گەیاندە کوڕانی بارزانی. قاتلەکەیان چەند ڕۆژێکی کەم حەبس کرد و بەرهەڵدا کرا و هەر بە پێشمەرگەیی مایەوە.

بەهاری ١٩٦٨ بوو، خەبەریان دامیّ کە «هێمن» و چەند کەسێک لە لای قەلادزەوە هاتوون و ئێستە لە تەرەفی ماوەتن. هەر خەبەرم دەپرسی و دەستم پیّ ڕانەدەگەییشتن. گوتیان هاتوونە ناو دەشت و بەرەو «وەسان» چوون. دەگەڵ پێشمەرگەیەکدا کەوتمە پیّوشوێن. لە گوندی وەسان لە ماڵە سەیدی خزمم پرسی، گوتیان چەند لاوێک و سەیدێکی ئیختیاری زۆر پیر شەو میوانمان بوون و چوونە دۆڵی باڵەییان. لە گوندی «قەلاتیّ» تووشیان بووم. ئای لەو خۆشییە! لە پاش بیستوسیّ ساڵ دووری، مام هێمنم دیتەوە. بەلام سەید ڕاستی دەکرد ببوە ئیختیار.

جا وەرە چەنە لێدە و باسی دەردی دووری بۆ یەکتر هەڵڕێژە و شوکری خوا بکە کە سەرمان گەیشتەوە یەک. سبەی ئەو ڕۆژە بزنێکم کڕی و ئەو دوو جەمەی‌ترمان پێ ڕابوارد. دیار بوو هەواڵەکانی کە حاجی شێخ عەولای کولیجە و خالیدی شێخ ڕەحیمن، دەڵە- دەڵیانە بڕۆنەوە. قەرارمان دا کە ئەگەر ئەوان ڕۆیشتن یەکتر بگرینەوە و پێکەوە بژین. زۆری نەبرد کە «هێمن» هاتە شیناوێ و لە ژوورەکەمدا تەختێکی دانا و بووینەوە هاودەمی هەمیشەیی.

من هێمنم پێ لە هەموو شاعیرانی کورد شاعیرترە؛ بەو شەرتە بۆ خۆی شیعری خۆی نەخوێنێتەوە! شیعرێکی بۆ خوێندمەوە لە سەر شۆڕشی نووسیبوو؛ لای وا بوو باش نییە. لێم وەرگرت و لە سەر ڕادیۆ خوێندمەوە، زۆریان پەسند کردبوو. تەنانەت خۆی دەیگوت تا تۆ نەتخوێندبۆوە نەمدەزانی هێندە شیعری چاکە! کە خەبەری هاتنی هێمنم بە مەلامستەفا دا، زۆری پێ خۆش بوو؛ ڕایسپاردم کە تا مومکینە خزمەتی بکرێ و دڵی ڕابگرن.

ژوورەکەمان سەرەڕای تەنگی و تاریکی، ئەوەندەی مشک هەبوو شەوانە خەومان لێ حەرام بوو. بە کۆمەڵ مشک ڕمبازییان تێدا دەکرد. شەوانە لە پاش کاریش چرا زەنبووریمان نەدەکوژاندەوە کە مشک بە ڕووناکی کەمتر دێنە دەر؛ بەڵام خرمە و ڕمبەی مشک دە وەدا نەبوو. ڕۆژێک من دەمنووسی، خرتەخرتێک لە نایلۆنەکەی بن میچ دەهات؛ لام وا بوو باران لێی دەدا. هێمن گوتی: کوا گۆچانەکەت؟ ئەوە مارە بیکوژە! مارێکی جنجیری درێژ کەوتبووە سەر نایلۆنی بن میچ، بە حاڵ دەیتوانی بڕوا کە نایلۆنەکە لووس بوو. گوتم: کاکە ئەوە بولبولی خۆمە نایکوژم! مار هات تا خۆی لە نایلۆن خەلاس کرد و لە دیوارەکەدا نیو میترێک لە بەرەژووری جێ سەرم لە تەختەکە چووە کونێکەوە. هێمن دەڵێ: بیکوژە! دەڵێم نایکوژم. گوتی: یاخوا ئەمشەو پێتەوە بدا، وەک ڕەشکە کا هەڵتئاسێنێ!

- با بە منیشەوە بدا!

تا ڕۆژی دووهەم مارمان نەدیت. جارێک سەری دەرهێنا، نەخێر ئێمە سەیری ناکەین. وردە- وردە سامی شکا؛ هاتە دەر؛ چووە بن میچ. زیکەی لە مشک هەستاند. هەی جانمی تاژیە جنجیر! دەی مشک ڕاو کە! قەت مشکێکی بن میچ نەما. ئەمجار بۆیان هاتە خوار. لە بەر چاوی ئێمە ڕاوی مشکی دەنا و دەیگرت. خوا وەتحەسێنێ، قەت تاقەمشکێکی بۆ دەرمانیش نەهێشت. ورکە نانمان بۆ دەرشتە بن تەخت، کرتەکرت دەیخوارد. دەچووە ئاو خواردنەوە و دەهاتەوە ماڵەکەی خۆی لە پشت سەرم. زۆر لە مێژ ساڵە بڕوام وایە هیچ مارێک ئەگەر ئازار نەدرێ زیان نادا و لە خۆڕا بە کەسەوە نادا. ئەو مارە بڕواکەی منی ئیسبات کرد. ببوە پشیلەیەکی پاکی خۆشەویستی بێ‌پیسایی و میاومیاو. پاش چەند مانگێک کە ئەو شوێنەمان بە جێ هێشت، پێشمەرگەی «فارس باوە»ی چووبوونێ. باسی ژوورەکەم کرد. فارس باوە گوتی کردوومەتە ژووری خۆم.

- تو خوا کاک فارس مارێکی لەو ڕەنگەی تێدایە، ئاگات لێ بێ نەیکوژن!

فارس زەرد هەڵگەڕا، گوتی: هەر ئەمڕۆ دەبێ چۆڵی کەم؛ چۆن پیاو دەگەڵ مار لە ژوورێکدا دەژی؟!

باسی ژیانی ئەو ڕۆژانەی شیناوێ، هێمن لە پێشەکی شەرەفنامەکەدا زۆر جوانی نووسیوە. چەند جارێک لە شیناوێ زۆر پیس بۆمباران کراین و بە سەلامەت دەرچووین؛ چونکە لە مانگی ٩ی ١٩٦٨دا کە بەعسی هاتبوونەوە سەر کار دیسان شەڕیان پێ فرۆشتینەوە. ڕۆژانە هەر

گرمەی تەیارە و قرمەی شێستیر و زرمەی تۆپان و ناڵەی بۆمبا بوو.
شەوێک دەوروبەری ڕادیۆ بۆمباران کرا. من لە ژوورێکدا بووم، فانووسێکم لە پێش بوو، دەمنووسی. لاوێک لە ڕیزی موهەندیسەکانی ڕادیۆ خۆی بە ژووردا کرد. من خۆڵ و گڵی سەربانم لە تەوژمی بۆمباوە بە سەردا باریبوو، خۆڵەکەی مێزی نووسینم خاوێن دەکردەوە. گوتی: مام هەژار! لە بۆمبا زۆر ترسام، بە سەر سیمی خارداردا کەوتم برینداربووم. بیکە بە خاتری خودا فێرم کە تۆ چۆن لە تەیارە ناترسی؟! گوتم: کاکە من هەر لەشم دژی تەیارەیە؛ وەک سەعات کە دژی ئاو تێچوونە!
مام هێمنم لێ دوور کەوتەوە کە لە گەرما و مێشوولە خۆی ڕزگار کا و بەرەو کوێستان چوو. منیش لە بەر چەند شتێک دڵم لە ڕادیۆ هەڵقەندرا و لە سەر داوای خۆم چوومەوە سەر چاپخانە. ڕەفیق چالاک -کە لە حکوومەتەوە پەنای پێ هێنابووین و کاری ڕادیۆی دەگەڵ دەکردین- هەر خەریکی شەیتانی کردن لە عەبدولخالق بوو. جاری وا بوو خەبەری لە من دەدا کە خاینم. جارێک گوزارشێکی کە لە سەر من و عەبدولخالق نووسیبوو، ڕاست بۆ منیان ناردبۆوە. «دوکتور مەحموود» لە سەری نووسیبوو: «ڕەفیق گوو دەخوا خراپەی ئێوە دەڵێ!» ڕەفیق نامەکەی خوێندبۆوە و چەسپاندبوویەوە و دای بە من.
گوتم: ڕەفیق! ئەگەر عەبدولخالق نەبێ تۆ دەتوانی کاری موهەندیسی ڕادیۆ بەڕێوە بەری؟
- نا وەڵلا؛ ئەوە بەو نەبێ بە کێ دەکرێ؟
- ئەگەر من نەبم، تۆ زۆر قازانج دەکەی؟ قازانجەکەت کامەیە؟
- خوا نەکا تۆ بڕۆی. بە خوا بە کەس کاری تۆیان بۆ ناکرێ.
- من خراپەم دەگەڵ کردووی؟
- بە عەکسەوە، تۆ لە گیرفانی خۆت زۆرت زەرەر بۆ من کێشاوە و تۆ نەبی هەر ناتوانم دوو ڕۆژ لێرە بژیم.
- دەی برا ئەو کاغەزبازییە و شەیتانی کردنەت لە چییە؟
- کاک هەژار ڕاستت پێ بڵێم: لەو ساوە بوومە جاسووسی سیڕی عیراق وا فێر بووم. ئەگەر ڕۆژێ دوو گوزارش لە سەر خەڵک نەنووسم شەو خەوم لێ ناکەوێ. خۆە فێری بووم؛ بۆم تەرخ ناکرێ!
گەرەکە ئەمە بڵێم کە کوردی عیراقی (خوێندەوارەکانیان) زۆر گوێ بە ئەخلاقی باش نادەن. پیاوی زۆر باشیان تێدا هەڵدەکەوێ؛ بەڵام کەمێک لە ناو زۆری ناڵەبار و بێباردا. تەبەقەی سادە و کەمخوێندەواری کوردی عیراقی لە کوردی هەموو شوێنەکانیتری کوردستان -کە دیومن- پیاوتر و ڕاستتر و بێفێڵتر و سەخی و خۆڕاگرترن. پیاو هەق بڵێ، زۆر لە ڕاییی کوردی ئێران نەجیبتر و بەوەفا و ئەمەگترن...
ماوەیەکیتر لە سووروەبان مامەوە. ئەو جار چاپخانەمان گوێزتەوە بۆ «بێخۆڵان» کە جەنگەڵێک بوو لە نزیک «چۆمان». خانووێکمان لە نزیک خانووێکی کە بۆ کارکەرانی ڕادیۆ کرابوو، بۆ چاپخانە دروست کرد و دەگەڵ کاک عەبدولخالق و هەوالانی ڕادیۆ بووینەوە جیران. جێگەی دەزگای ڕادیۆ و جێگەی چاپخانەش لە کێو لێک نزیک کرابوون. کاری من ئەمجار ببوە دووسەرە: هەم بۆ چاپخانە هەم بۆ ڕادیۆ دەمنووسی و ئیدارەی بنکەی چاپخانەشم لە مل بوو.
مام هێمن ساردی پاییز هاتەوە لام لە چاپخانە و لە ژوورێکا دەژیاین. خانووەکەمان چوار ژوور

و دالانێک بوو. دەرگام بۆ دالان کرد، بوو بە سالۆنێک. سۆپەیەکم لە سالۆن دانا، هەم چێشتی لە سەر لێ دەنرا، هەم ژوورەکانی گەرم دەکرد. لە مەکتەب سیاسییەوە بیستوشەش وانێت داری سووتەمەنی بۆ بنکەی چاپخانە و سیودوو وانێت بۆ بنکەی ڕادیۆ هاتبوو. ئەوان هەشت سۆپەیان دایساند هێشتا دالانیان سارد و ئاشپەزخانەیان لە دەرەوە بوو. نیوەی زستان داریان لە من قەرز دەکرد؛ ئێمە بەهاریش هەر زۆرمان مابوو.

زەوی دەوری خانووەکەم لە خاوەنەکەی -کە خەلکی گوندی «مەمیخەلان» بوو؛ قەتیش نەچێنرابوو- بە وادەی دە سال بە سی دینار ئیجارە کرد و پوولەکەمان دایە. لە سەرە بەهارەوە لێی وەخۆ کەوتین: جۆگەمان بۆ کێشا؛ ناردم گولی گولاویان لە خەلان هێنا؛ بە لەتی زۆر ورد بە دەوری جۆگەدا چاندم. زۆرم داری میوە لێدا، زۆرم مێوی ڕەز لە بەر دەرگا و لە بن دار مازوان چەقاند. بێستانی زۆر چاکمان بە هۆی مام عەلی بۆ هاتە بەر. قەت سێ سالی پێ نەچووبوو ببوە بەهەشتێک. کۆتر و کەروێشکم ڕاگرتبوو، هەر دەبوو سەیری بکەی!

هەموو ڕۆژ تەیارەمان دەهاتنە سەر؛ زۆر جاریش بە شەو مەودایان نەدەدایین. بەلام فێری ببووین و لێمان ببوە شتێکی ئاسایی. زۆر جاران دەگەل کاک عەبدولخالق کە تەیارە دەهات، دەچووینە دەشت و زەبتمان دەبرد، دەنگی بۆمبارانمان زەبت دەکرد.

من لە بنکە نەبووم، شەوێک هەوالانم کابرایەکیان لە کوردی ئێرانی گرتبوو کە لەو ناوە گەڕابوو. هەلیانپێچابوو، لێیاندابوو، گوتبووی: ڕاستییەکەی ئەمەیە ساواک ناردوومی و دەمانچەی داومێ، ئەگەر مام هەژار بە دزیەوە بکوژم دووسەد هەزار تمەنم بدەنێ...

ڕۆژێک دەگەل خالیداغا دەستمان لە جیپێک هەلێنا کە تا ناوپردانمان بەرێ. جیپ ڕاوەستا و لە دواوە سوار بووین. خالیداغا بە چاو و برۆ تێیگەیاندم کە مەعمووری ساواکن. گەینە ناوپردان. گوتم ڕایگرە! پێم وایە ڕانندە نەیبیست؛ هەر ڕۆیشت. دەستم خستە سەر دەمانچەکەم، گوتم ڕایگرە! ڕاوەستا. دابەزین و ئەو ڕۆیشت. خالیداغا گوتی: چا بوو نەیانڕفاندین. گوتم: هەر ئەو جار ڕاینەگرتایە دەمکوشت و گوێم نەدەدا بارزانی ڕازییە یان نا.

شەوێک لە گەلالە چوومە مالی عەولاغا. ڕەشیدی حەسەنزادەی ساواکی لەوێ بوو. خەلکەکە حەپەسان کە نەیاندەویست ئەو ساواکییە پێم بزانێ. گوتم: وا دیارە ئەو ئاغایە خەلکی خانووە قوڕەکانە! بە زمانی خەلکی سولەیمانی یانی حیزە! دەمبیستەوە کە ڕەشید لە ئێران زۆر خراپی باس دەکردم و دەیگوت وەتەنفرۆشە.

شیعری من قەت بە کەیفی مامۆستایانی مەکتەبی سیاسی نەدەهات. چونکە من لام وا نەبوو عەرەب و کورد برایە و بە هەوای ئەوانم شیعر نەدەنووسی. بەلام خەلکەکەی دیکە زۆریان حەز لێ دەکرد. ناچار بوون کە لە کۆبوونەوەکاندا ئیعلان بکەن کە شیعری هەژاریش هەیە و بە ئانقەست دەیانخستمە دواوە کە دەیانزانی خەلک بە چاوەنۆڕی شیعری من بلاوە ناکەن و تا لێم نەبیسن ناڕۆن. ئەوان بە سیاسەتی خۆیان دەکرد و من تەرجومانی ناو دلی گەلە ڕەشاییەکە بووم.

کاک عەبدلخالق فرستندەیەکی دروست کردبوو بە قەد قوتووە سیغارێکی چکۆلە؛ بە بزمارێک لە ژووری مالە خۆی دابوو. هەمیشە شیعرەکانی منی -ئەوی لای مامۆستا سیاسیەکان مەمنووع و باسی دوژمنایەتی عەرەب و کورد و زولمی حکوومەتی دەکرد- لەو ڕادیۆ چکۆلەوە بلاو دەکردەوە کە ڕەسمەن نەیاندەتوانی ئیرادی لێ بگرن. ئەگەر گلەشیان لە کاک عەبدولخالق

دەکرد، دەیگوت: ڕادیۆی خۆمە. ئەگەر تووڕەم کەن وەک دەرویش بە سواری کەرێک دەیگێڕم و بۆ خەڵکی لێ دەدەم.

داوام لە مەکتەب کرد دیوانی شیعرەکانم بۆ چاپ کەن؛ جوابیان نەدامەوە. بە بارزانیم گوت؛ ئەمری کرد چاپ بکرێ. ئەویشم لە چاپخانەی خۆمان چاپ کرد. وەرگێڕاوی خەییامیشم -کە لە «سۆنی» تەواو کردبوو- هەر لەوێ بە چاپ گەیاند. لە شەڕێکدا لە دەشتی هەولێر، جاشەکانی جەلال و برایم چوارسەد جلد لە دیوانەکەمیان بە تالان برد و سووتاندیان. ئەوەندەی مابوو بەر نەدەکەوت و زۆر زوو خەلاس بوو. لە ١٩٧٠دا بۆ جاری دووهەم چاپم کردەوە؛ بەو زیادیانەوە کە لە ١٩٦٦ڕا لێم زیاد کردبوو. بەڵام بارزانی ئیجازەی نەدا بڵاوی بکەمەوە. چونکە زۆری هجووم بۆ عەرەب و ئێران تێدابوو. لە سەد نوسخەیەکی پتر بڵاو نەکرایەوە.

لەم بەینەدا یەک دوو جار عەبدوڕەحمانی قاسملوو، کەریم حیسامی و برادەرانی دیکەی ئێرانی هاتوچۆیان دەکرد و چاویان بە بارزانی دەکەوت و چەند ڕۆژێک خۆشمان ڕادەبوارد. هاوین ماڵ و منداڵم هاتنە بێخۆڵان. خێوەتێکم لەو لای خانووەکە هەڵدا. سولەیمان -کە ناوی عەسڵی «بابەکر» و خەڵکی «گەرگول» و چەند ساڵێک بوو پێشمەرگەی بەردەستی من بوو- کاری بۆ دەکردین. گیا و گژی دەوری خێوەت زەرد ببوو، گوتم: سولەیمان ئاوی لێ نێ با شین بێتەوە و دیمەنی خۆشتر بێ. ئێوارە هاتمەوە ماڵ، هەرا بوو. مەعسووم گوتی: لەو ئاو لە دەشت نانە، سولەیمان پێنج ماری کوشتووە. ناوێرم لێرە بم! گوتم: دە هەر ئەو پێنجە بووە و ئەویش کوژراون. ئیتر تازە مار نەما. وامگوت و خانی گوتی: ئەوەتا مار! مارێک سەری لە بن حەسیرەوە دەرێنابوو. گرتم دە شووشەیەکم هاویشت و گلم دە پاڵ کرد و سەرقاپی شووشەم بۆ کون کرد کە ڕایگرم. لەپڕ مارێکیتر لە لای سولەیمانەوە سەری دەرێنا! سولەیمان ویستی لاسام بکاتەوە، پری پێدا کرد و دەستی کێشایەوە. کە من پێکەنیم، حیرسی بزووت و ئەویش گرتی و خستمانە شووشەیەکیترەوە. بەڵام هیچیان لە سێ ڕۆژ پتر نەژیان و لە ناو شووشەدا مردن.

سولەیمان زۆر ئەنگێوەی چاک بوو. تەیرێک هەیە لە کوێستانان ناوی کەودەرییە؛ زۆر لە قەلەموونە مێوە دەکا؛ زۆر لە سەر هەستە. هەمیشە لە ناو بەفراندا دەژی؛ کەمتر دەکەوێتەوە بەر سێرەی تفەنگ. سولەیمان یەکێکی لەوانە کوشتبوو. گۆشتێکی زور چەوری هەبوو. شەوێک لە غوراوبی خەودا بووین، تەقەی تفەنگ هات؛ ڕاپەڕین. سولەیمان پشیلە کێوییەکی کوشتبوو کە هاتبووە زگ ئاشپەزخانە.

دوو بەچکە کەویان بۆ لە قەندیلەوە هێنابووم. زۆر زوو وەک مریشک فێر ببوون، دەچوونە دەشت بۆ لەوەڕ و ئێوارە دەهاتنەوە. گوتیان بیانخەنە قەفەسەوە دەخوێنن. جووتە کەوێکی ڕاویان لێ پەیدا بوو. حاجی محێدینی بازرگانی زینوەیی جووتێک قالیچەی دامێ، نەمدایە. ڕۆژێک سولەیمان پێنج کەوی نێری پێ ڕاو کردبوون؛ هەمووی خستبوونە ژوورێکەوە. کەوە کێوییەکان سەری هەردووکیانیان لە قەفەس کولیبوو؛ مردن.

لەو دوو کەوانە ڕۆژێک یەکیان بەر بوو، دایە کێو؛ بۆمان نەگیراوە. قەفەسی هەواڵەکەیان لە سەربان دانا. خوێندی، هەڵاتووەکە جوابی داوە. قەفەسەکەمان بردە ئەو نزیکە کە کەوە هەڵاتووەکە لێی دەخوێند. سەربەخۆ خۆی خزاندەوە ناو قەفەسەکەی! دیار بوو فێری ژیانی زیندان ببوو؛ بە لایەوە ناخۆش نەدەهات.

هێمن ددانەکانی دەسکرد بوون. دەیگوت: ددانم زۆر مابوون؛ دوکتور ئەبریشەمی لە سابلاغ

گوتوویه شاعیری وەک تۆ بە قیمەت حەیفە ددانی خراپ بن! کێشاویە و ددانی بۆ دروست کردووم! بەڵام چۆن ددانێک؟ هەمیشە لە گیرفانیدا بوون! دەمی نان خواردن دە دەمی دەکردن و پاش نان خواردن بە بێ شوشتن دەیخستنەوە گیرفانی و لە قسەدا هەر پلتەی دەهات. ڕۆژێکی زستان هەوای ئاغایەتی قەدیم هەڵیگرت؛ دەگەڵ سولەیمان چوونە ڕاو. زۆر گەڕابوون کەرویشکیان دەست نەکەوتبوو، پاش نوێژ هاتنەوە.لەپڕ هێمن گوتی:

- ددانم لە کێو بە جێ ماون، بڕۆن بۆم بێننەوە!

- کاکە بەفر چۆتەوە، ئەو هەموو دنیایە گەڕاون، چۆن دەبینرێنەوە؟

- نەخێر هەر دەبێ سولەیمان بچێ لێیان بگەڕێ!

- مام هێمن تۆ بڵێی لە ژوورەوە بەجێت نەهێشتبێ؟!

- ئا، ئا، شێتم؟! یاڵلا سولەیمان تۆ بچۆ کێو! یەکیش بچێتە گەلالە، کۆنە دەستە ددانێکم لای حاجیەحمەد هەیە بۆم بێنێ!

- بەڵێ بچن...

خۆم چوومە ژوور، ددان لە بن سەنیردا بوون! هێنام و هەرام کرد: وەرنەوە! ددان دۆزرایەوە!

شەوێک لە سەر جێ ڕاکشابووم. مام هێمن و چەند پێشمەرگە لە سەربان نوستبوون. دیتم گڕەئاگرێک بەرز بۆوە و کوژایەوە. پرسیم: چییە؟ گوتیان هیچ نەبووە. بەیانی زانیم هێمن جغارە بە دەستەوە خەوی لێ کەوتووە و لێفە ئاگری گرتووە و مام عەلی کوژاندوویەتەوە!

پێویستە ئەمەش لە هێمن بگێڕمەوە:

کاتێ هەوەڵجار گەینەوە یەک، شەوانە حەبێکی خەوی دەخوارد کە دەمێکە ئەگەر شەوانە نەیخوا خەوی لێ ناکەوێ. دوکتور گوتی بە حەبی خەوهێن لاوازتر دەبێ. بڕیارمان دا حەبێکی ڤیتامینی بە ڕەنگی حەبە والیۆمەکەی بدەینێ. ساڵێک ڤیتامینم دایە و گوتم حەبی خەوە! زۆر باش خەوی لێ دەکەوت و پەسندی بوو. ساڵەودوا گوتم: کاکە تۆ ساڵێکە تەرکی حەبی خەوت کردووە! خوا شوکور لێی خەلاس بووی. چووبوو خۆی لە دوکتور تووڕە کردبوو کە تۆ و هەزار فێڵتان لێ کردووم؛ گەڕایەوە سەر والیۆمەکەی خۆی!

هێمن ویستی بچێتە بەغدا لای قاسملوو و هەوالانی. بارزانی گوتی: ئازادە بۆ کوێ بچێ؛ بەڵام دەترسم دوور لە ئێوە خۆشی لێ ڕانەبرێ. هەر وەخت بێتەوە ئێمە حازرین بۆ خزمەتی. پارەیەکی بۆ نارد و هێمن بەجێی هێشتین. ئەوەش شیاوی باسە: جارێک کە من لە بێخۆڵانەوە چووبوومەوە بەغدا، هێمن لە جێی من بە سەر بنکە ڕادەگەیشت. ڕۆژێک کارگەرەکان ببوو شەڕیان. سەفەر گونی مەلا سەید ڕەحمانی بادابوو دڵی بوورابۆوە. شکایەت گەیبووە مەکتەبی سیاسی، ناردبوویان هێمن چووبوو.

- دەی مامۆستا! خەتای کێ بووە؟

- کاکە تا تابلۆی چاپخانە لانەبەن و لێی نەنووسن «خەساس‌خانە» من قسە ناکەم! لەو بە قوڕێ گیراوە، پیاو، پیاو دەخەسێنێ!

لەو چەند ساڵەی پێشمەرگەییدا بە هەزاران ئاشنا و دۆستم بۆ پەیدا ببوو کە بە زۆربەیان زۆر دڵخۆش بووم؛ بەڵام بە تایبەتی دەگەڵ «عەبدولخالق» و «فرانسوا حەریری» -کە موعەللمێکی حەریر و مەسیحی بوو. لەو سەردەمانەدا بە سەر گەلالە ڕادەگەیشت و زۆر لە شۆڕشدا موحتەرەم بوو- زیاد لە خەڵکی دی عەلاقەم دەگەڵیان هەبوو؛ پتر لە هەموو برایەک بە گیان و

دڵ دۆست بووین. فەڕانسوام بۆ هەوەڵجار لە بارزان دیت و بووینە ئاشنا؛ لە مەنتیقەی باڵەکیش پێک گەیشتبووینەوە. هەر کارێک من و عەبدولخالق پێمان بوایە، قەت لە پێک‌هێنانی دریغی نەدەکرد. کاک عەبدولخالق لە «مەلای وەلزێ» دوو کتێبی فتوای شەرعی وەرگرتبوو، دەمانخوێندەوە. تووشی مەسەلەیەک بووین دەربارەی خواردن لە شەرعدا، دەڵێ: «ئەگەر موسڵمانێک برسی بێ، هیچی دەست نەکەوێ، بە شەرع دەتوانێ مەسیحیەک -خۆی یان کوڕ و کچ و ژنی- بخوا!». زۆر جار عەبدولخالق لیستێکی باڵابەرزی دەنارد: کاک فرانسوا! مریشک، گۆشت، عەرەق، مەزە، میوە و چی و چی نەنێری، بیستوومە قەڵەویش بووی، گۆشتت بە پێی فتوای کتێب حەڵاڵ و زەڵاڵە و خۆت ئامادە کە! لە ڕاستیدا فرانسوا زۆر بە دەرد و مەرگمانەوە بوو. هەرچی لە دەستی هاتبا لە یاریدەدانمان دریغی نەدەکرد.

ڕۆژێک ڕەمەزان بوو، مام هێمن لە هەولێرەوە بەرەو باڵەکایەتی دێت. لە ناو ماشێندا جغارەیەک دادەگیرسێنێ. هەرچی دە ماشینەکە دان -ڕانندەش دەگەڵ- بە گژیدا دێن:

- پیرەمێرد! پێت لە سەر لێوی قەبرە! لە خودا ناترسی و بەو ڕەمەزانەتییە ڕۆژوو دەشکێنی؟
- بۆچی کاکە ئێوە پێتان وایە من کێم؟
- چووزانین؟ پیرەمێردێکی و بەڕۆژوو نیت.
- کاکە من فەلەم؛ باوکی فەڕانسۆ حەریریم! کوڕم حاکمە لە گەلالە و دەچم سەری دەدەم!
- ئەی، مامە دەبێ بمانبەخشی! نەمانزانی!

هێمن دەیگوت ئەو جار جغارەیان بۆ دادەگیرساندم و دەیاندامێ؛ ئاویان بۆ دەهێنام کە نەوەک حاکمی کوڕم بزانێ و لێیان تووڕە بێ! فەڕانسوا نەقڵەکەی بیستبۆوە و ببوە مایەی پێکەنین و ئێستاش هەر دەڵێ: «هێمنی باوکم!».

هێشتا هەر لە سوورەبان بووم و نەهاتبووینە بێخۆڵان، جارێک نامەی ئەحمەد تەوفیقم بۆ هات کە ئەو چەند ساڵە دوور لە کاروباری سیاسی و دوور لە سنووری ئێران ڕایبواردووە. ئێستاش هیچ هومێدێک نییە کە بارزانی ڕێگە بدا کارێک لە دیوی ئێران بکەین و هەر دێ و دەسەڵاتی ساواک لە سەرمان توندتر دەبێ. ئەمجار لەم سنووورە دووردەستەش هیچ حورمەتێکمان نەماوە و بە ئانقەست کاری وا لە وەکیلانی شۆڕش دەبینم کە دیارە حەز لە چارەم ناکەن. نەخۆشیشم؛ پشت ئێشەمە. ئەگەر بارزانی دڵی نەڕەنجێ دەمەوێ بچمە خاریج؛ هەم بۆ مداوا، هەم بەڵکو بتوانم کارێک بۆ کوردی ئێران بکەم...

قسەکەم گەیاند و زۆریشم لاگیری لێ کرد. بارزانی گوتی: مەسلەحەتی شۆڕشەکەمان وای ویستووە ئەحمەد لەم نزیکانە نەبێ. من دەسپێرم کە بە دڵی ئەو بجووڵێنەوە. ئەگەر بشچێتە خاریج موافقم و چی دەوێ بۆی دەکەم. پاش ماوەیەک لە جوابی نامەکەمدا، پێشمەرگەیەکی ئەحمەد هاتە سوورەبان و بە منی گوت: کاک ئەحمەد قەراری داوە تا سەری مانگ برواری چۆڵ کا و بچێتە بەغدایە. چونکە تەواو وە گیان هاتووە و پێشمەرگەی ئەوێ بە سەرۆکایەتی ئەسعەد خۆشەوی، زۆری دەگەڵ خراپن و ژیانی لە تەنگانەدایە. ئەگەر دەکرێ کارێک و چارێک بکەن! بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە حاجی ئۆمەران. بە پەلە گوتم دەمەوێ مەلامستەفا ببینم. گوتیان کەسێکی لە لایە؛ ڕاوەستە!

- ڕاناوەستم، هەر ئێستا دەبێ بیبینم.

کەسەکە «قالە تەگەرانی» بوو کە دەمبیست دوژمنی ئێمەیە. دیار بوو قسەی شێخ لەتیف

-كە بە فایقی گوتبوو- ڕاست بوو؛ جاسووسی سێ سەرە بوو. بە تەنیا دانیشتین و دوور و درێژ باسی ئەحمەدم كرد كە حەیفە، زۆر لە ڕێگەی كورد و بە تایبەتی شۆرشی تۆدا زەحمەتی كێشاوە؛ ئێستا بچێتە لای دوژمنانی كوردستان. تا سەری مانگ حەوت ڕۆژی ماوە، وا بكە دڵی بدەنەوە. با نەڕوا. گوتی: تۆ درەنگ خەبەرت زانیوە؛ ئەحمەد ڕۆیوە بۆ بەغدا و لە دەست دەرچووە... تیلگرافێكی بێسیمی نیشان دام كە ئەسعەد بۆی ناردبوو. دوایی كە دەگەڵ دەوڵەت ئاگربەسمان كردبوو، چاوەنۆڕی حوكمی زاتی بووین، ڕۆژێك لە بەغدا تووشی ئەحمەد هاتم. بردمیە مەنزڵی خۆی كە دەگەڵ چەند هەواڵێكی ئێرانی و خزمی خۆی تیا دەژیا. تێی گەیاندم كە هەرچەند لە شۆرش ڕۆیشتووە و دەگەڵ بەعسی بۆتە ئاشنا، بەڵام هەرگیز خەیانەت بە بارزانی و كوردستان بە دڵی ئەودا ڕانەبردووە و ڕاشنابرێ... ئیتر خەبەرم لە ئەحمەد بڕا. لە كێو دەمبیستەوە كە دەگەڵ دەستەی قاسملوو نێوانی خۆش نییە و شەڕە دندووكەی یەكتر دەكەن. گوتیان لە پاش كوودەتای سەرنەكەوتووی «نازم گزار»، زۆر كوردی دۆستی دەوڵەت كوژراون كە یەكیان قالە تەگەرانی بووە، دەگەڵ هەشتا و دوو كەسیتر؛ بە تۆمەتی ئەوە كە ئاگایان لە بزووتنەوەی نازم گزار بووە و دەنگیان نەكردووە، بەر گوللە دراون. بیستمەوە كە ئەحمەد تەوفیق گیراوە. ئەفسەرێكی كورد خەبەری دامێ كە لە زیندانی «قصرالظهور»ە. پاش چەند جارێك كە خەبەری گرتنی دەدامێ، گوتی بردوویانەتە زیندانی «ابوغریب» و ئاگام لێ بڕاوە.

جارێك لە كێو لە دەربەند بووم، دوو پێشمەرگە لەو لای منەوە قسەیان دەكرد. یەكیان گوتی: من لە زیندانی ئەبووغەریب بووم. سلوولەكەم دەگەڵ سلوولێكی دیكە كەلێنێكی هەبوو. پیاوێكی تێدا حەبس كرابوو، ڕۆژانە یەكترمان لەو كەلێنەوە دەدواند. دەیگوت نێوم ئەحمەد تەوفیقە، خەبەرم لێ دراوە كە دەگەڵ كارداری سەفارەتی ئەمریكا لە سەفارەتی سویس قسەم كردووە و بوختانێكە بۆم هەڵبەستراوە. هەموو ڕۆژ دیانبردە دەرێ شكەنجەیان دەكرد و بە كەلەلایی دەیانهێناوە ناو سلوولەكەی. جارێك بردیان و نەهاتەوە. وا دیارە كوشتوویانە...

زۆر بەو خەبەرانە دڵم تەنگ ببوو؛ بەڵام دیتم مەسعوود و ئیدریس، كوڕانی مەلامستەفاش بۆ خەبەری نەمانی ئەحمەد زۆر دڵتەنگن. وام لێ مەعلووم بوو كە لە بەغداشەوە عەلاقەی دەگەڵ مەركەزی فەرماندەیی بارزانی هەر نەپساندۆتەوە و بە خەبەر بۆ ناردن یاریدەی شۆڕشی داوە. بە بڕوای من بەعسی هەستیان بەوە كردووە و بەهانەیەكی دیكەیان بۆ تاشیوە و لە ناویان بردووە. ئیتر خوا دەیزانێ... هەر چییەك بێ، من برادەرێكی زۆر خۆشەویست و زۆر ئازا و بەكارم لە دەست دەرچووە...

یەك لەوانەی كە دەگەڵ ئەحمەد چووبوونە بەغدا «مەلا سەید ڕەشید» بوو كە خەڵكی بووبەكتانی لای سەقز بوو. پیاوێكی زۆر پاك و كوردی چاك و زۆریش بە دەست و تفەنگی خۆی ئازا بوو. لە بەغدا لە چینی دووهەمی خانووەكەی من دەژیا. دە پێشداش هەر دەمناسی؛ لە سونێ و زۆر شوێنیتر دیتبووم. لە شەڕێك كە دەگەڵ دەوڵەت لە «سەروچاوێ» كرا، ناوبانگی ئازایەتی دەركرد. ئەو بەینە كە پێكەوە لەماڵێكدا بووین، هەمیشە زۆر بە ئیحترامەوە باسی ئەحمەد تەوفیقی دەكرد و بە كوردێكی نموونەی دەزانی. مەلاسەید ڕەشید پاش شكانی شۆڕش هاتە سەقز؛ بە دارتاشی بەڕێ دەچوو. لە ئینقیلابی ئیسلامیدا لە دەوری دیواندەرە دەگەڵ كۆنە ئاغایان تێك گیرا و بە دوامین فیشەك خۆی كوشت.

وەك باس كرا، بەعسی كە بۆ دووەم جار حوكمیان گرتەوە دەست، زۆری نەبرد لە مانگی ٩ی

١٩٦٨را شەڕیان بە سەردا سەپاندینەوە. ئەو شەڕە تا سەرەتای سالی ١٩٧٠ هەر بەدەوام بوو. یاریدەی چەک و کەل‌وپەلمان زۆر لە ڕێگەی ئێرانەوە بۆ دەهات. دەولەتی عیراق ڕۆژ لەگەل ڕۆژ لە کزی و کەنەفتی دەدا. سەدام حوسێن ئیعلانی کرد کە خودموختاری دەدا بە کورد، خۆی هاتە لای بارزانی لە ناوپردان. دەیانگوت شا لەو پێکهاتنە زۆر ناڕازییە؛ بەلام گوێ بە قسەی ئەو نەدراوە. دەست کرا بە کۆبوونەوە و وتوویژ. پێک هاتن کە لە ماوەی چوار سالدا حوکمی خودموختاری بە یەکجاری سەقامگیر ببێ. چوار وەزیرمان لە کابینەدا جێ کرانەوە: نووری شاوەیس (وەزیری ڕێگەوبان)، سامی مەحموود (وەزیری کاروباری شیمال)، ئیحسان شێرزاد (وەزیری بەلەدیات)، سالح یووسفی (وەزیری مشاور و مدیری ڕۆژنامە و چاپەمەنی).

ڕۆژێک لە چۆمان مەلامستەفا دەگەل ئیدریسی کوڕی لە مەدرەسەیەکی ئەم بەرەی چۆم دانیشتبوون؛ بانگیان کردم. گوتی: هەر وا خەلکە و لە بەغدا و شاران دادەمەزرێن؛ دەمانەوێ تۆش کارێکت بە دلی خۆت بۆ پەیدا بێ. گوتم: من چەند سالە زۆر بە ئازادی ژیاوم؛ گلەییم لە ژیان نییە. حەز دەکەم هەر دەگەل ئێوە لە چیا و چۆل بم. گوتیان: نا، دەبێ بچی و کاک سامی ببینی. ڕامسپاردووە کارێکت بۆ بکا کە بە دلی خۆت بێ.

هاتمەوە بەغدا. ڕۆژێک بە ماشینی کاک سامی دەچوومەوە مالێ، لە ڕێگە گوتی: من حەولم بۆ تۆ داوە؛ بەلام بەعسی ناتناسن. پێویستە کارێکی وا بکەی وەک شاعیرێکی موحتەرەم - مەسەلەن وەک جەواهیری- بتناسن! هەر بە پەلە، بەیانی ئەو ڕۆژە هاتمەوە شۆرش. لە ناوپردان چوومە لای مەلامستەفا:

- کاکە نەقل ئەوەیە... ئەو هەموو سالە دەرد و دەربەدەریم هەر بۆیە بووە دوژمنانی کوردستان نەمناسن و نەیانناسم. قسەی سامی مانای ئەوەیە بە چەند قەسیدەیەک تاریفی بەعس بکەم تا کارێکم بدەنێ! تۆش لای خۆت ڕامنەگری لە بەغدا دەچمەوە عەکاسی کردن.

سەدام بە تەیارەی هیلی‌کۆپتەر هات. لە حاجی‌ئۆمەران دیسان یەکتریان دەگەل بارزانی دیت. ئاجودانەکەی (سەباح میرزا)م دیتەوە کە بەچکە سنەییەک و بەعسییەکی توندوتیژ و ئاجودانی سەدام بوو. وەختی خۆی لە ئیدارەی مەبانی عام پێکەوە کارمەندی قەراردادی بووین و ئێستا ببوە ئەفسەری سێ ئەستێرە. یەکترمان ناسیەوە. سبەی کە سەدام ڕۆیشتەوە، منیش دەگەلی دە تەیارەدا سوار بووم. دەگەل سەباح قسەمان دەکرد، بۆی گێڕاوە کە لە مێژەوە شوناس و دۆست بووین. بە ڕووی خۆشەوە دواندمی و گوتی: لە سەر فەرمایشتی بارزانی ئێمە مانگی سەد دینارت بازنشەستەیی بۆ دەبڕینەوە و خۆشت هەر کارێک دەکەی ئازادی. سەباحیش -ئەگەر ویستت- یارمەتیت دەدا. ئیتر هاتمەوە بەغدا؛ حقووقی بازنشەستەگی بێ شەرت‌وشرووتی «ناسین» - بە گفتی کاک سامی- بڕایەوە.

یەکیەتی ئەدیبانی کورد لە بەغدا دادەمەزرا کە تێکەلاو لە ئەدیبانی شیووعی و پارتی و بێ‌لایەن بوو. لە هەلبژاردنا منیان بۆ سەرۆک کاندید کرد. بۆ ئینتیخابات دەبوو بە ڕەسمی و لە بەر چاوەدێری حکوومەت (وەزارەتی ڕۆشنبیری) دابێ. سالۆنی «خولد» دیاری کرا کە لەوێ ئینتیخابات بکرێ. دەبوایە لە حیزبی خۆمان چەند وەزیر و مدیرکول و پیاوی گەورەمان لەوێ بن؛ لەو مەجلیسە گرینگەدا شیرکەت بکەن. دامانابوو کە قسەی حیزب، قسەی ڕۆژنامەی خەبات، قسەی پیاوانی وەکیلی بارزانی بخوێندرێتەوە؛ بەلام زۆر بە داخەوە زۆرم خۆ ماندوو کرد، کەسیان بە ڕاستی ئامادە نەبوون. دوو کەس لە لایەن حیزبەوە هاتن؛ بەلام لە سەر

نووسینی شتێک بە عارەبی نەیانتوانی دروستی کەن؛ خۆیان دزیەوە! مودیری ڕۆژنامە و چەندێک لە وەزیر و پیاوە گەورەکان گوتیان لە سەفارەتی کووبا دەعوەت کراوین. ودکای ئەوێیان پێ باشتر بوو...

لە کاتی هەڵبژاردنا، شیووعی ملیان لە گێرەشێوێنی نا و کەمی مابوو ببێتە شەڕ. بۆ یەکەم جار لە تاریخی بەغدادا، لە وەختی ڕەئی خوێندنەوەدا چرامان لە سەر کوژاوە. حاکم لە بەر لایت ڕەئیەکانی جوێ دەکردەوە!... من بەر لەوە دەست بکرێ بە ڕەئی وەرگرتن، وتارێکم خوێندەوە کە ئەوە هیچ باسی چاکەی بەعسم نەکرد، ئەوەندە توندوتیژ بوو کە زۆر کەس لایان وا بوو دەگیرێم. باسی ئەوەم کرد کە ئەو حەقەی قەرارە وەریگرین سەد یەکی خوێنی ئەو شەهیدانەش نییە کە لە ڕێگەی ئازادی کوردستان دراوە؛ بەلام بە هومێدم کە پیاو عاقلانی عەرەب ئەو شەرتە بەرنە سەر و چیدی تووشی براکوشتن نەبینەوە. وتارەکەم دە دەقیقەیەک توولی کێشا. هەر خۆشم خۆم کردە وەکیلی بارزانی و حیزب و لە باتی ئەوان تەبریکم لە کۆبوونەوە کرد. بە زۆربەی ڕەئی، من بە سەرۆک هەڵبژێرام.

زۆر لەو ئەدیبانە هەر ئەوەندە کارتی ئەندامەتیان وەرگرت، ئیتر چاومان پێ نەکەوتنەوە. ئەوەندەیان بەس بوو شانازی بکەن کە ئەندامی یەکیەتی سەرکەوتنن!

بۆ جێگە و ڕێگە و ئەساسیە و پێداویستی یەکیەتی، کەوتینە باربوو کۆ کردنەوە لە دەوڵەمەندانی کوردی بەغدا. خۆمان تەیار کرد و دەستمان بە کار کرد. زۆرمان زەحمەت کێشا تا ئیمتیازی مەجەللەیەکمان بە ناوی «نووسەری کورد» وەرگرت. بۆچی زەحمەتمان کێشا؟

کاتێ بەعسی و بە تایبەتی سەدام خۆی هاتە کوردستان، قەولی دا بە بارزانی و مەکتەبی سیاسی و سەرانی شۆڕش کە هەرچی ئێوە بە ئاواتن گیرتان کەوێ، من زۆر پترتان دەدەمێ. چیتان دەوێ بڵێن تا پێکی بێنم و زیاتریش. کۆبوونەوەی زۆر کرا کە چی لە دەوڵەت بخوازین؟ لە بیرمە من لە یەک کۆبوونەوەدا بەشدار کرام، کە خاوەن کارەکانی شۆڕش جگە لە مەلامستەفا، هەموویان حازر بوون. باسی کاروباری چاپەمەنی و فەرهەنگی کرا، کە وا ڕۆژنامەمان لە بەغدا بە ئازادی دەردەچێ. من گوتم:

برایان! کابرا دەڵێ هەر چی دەتانەوێ بڵێن! میللەتی کورد زۆر دوورە فەرهەنگە. بە تایبەتی لە خوێندەوارانیشیدا کەمیان کوردی دەزانن بخوێننەوە و بنووسن. بناغەی بوون و زیندوویەتی هەر میللەتێکیش بە فەرهەنگ و گەشەکردنی ئەدەبیات و زمانەکەیەوە بەندە. ڕادیۆ دامەخەن! جاران کە جنێوتان پێ بە عەرەب و بەعس دەدا، ئێستا -تا پیاوی چاکن- تاریفتان دەکەین و ئەدەبیاتی خۆشمانی لە سەر بلاو دەکەینەوە. سەدام دەڵێ ڕادیۆی گەورەتان بە خەرجی زۆرەوە بۆ لە هەولێر دەکەمەوە. هەرگا ڕادیۆی وا لە هەولێر ئامادە کرا، ئێمەش دەچین لە سەر ئەوێ قسە دەکەین؛ ئەوسا ئەوەی خۆتان عەزڵ کەن. داوا بکەن کە ئەستانداری کورد لە شارە کوردەکاندا بتوانێ ئیمتیازی مەجەللەی بە کوردی و ڕۆژنامەی بە کوردی بدا؛ دژی سیاسەتی دەوڵەتی بەعسی تێدا نەنووسرێ. خەلک فێرە کوردی بکەن و با لە زمان و ئەدەبیاتی خۆیاندا شارەزا بن. داوا بکەن کە هیچ نەبێ نیوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری عەرەبی، ئێمەش ڕۆژنامە و گۆڤارمان -لە بەغدا و شاران- هەبێ؛ یانی بەشێک بە دوو بەش...

زۆر لە سەر ئەم قسانە ڕۆیشتم؛ بەلام پێم سەیر بوو کە زۆریان تووڕە بوون و گوتیان قەت ئەوەمان بۆ ناکەن.

- کاکە ئێوە داوا بکەن، با ئەوان بڵێن نایکەین.
- نا کاک هەژار! زۆرمان کار هەیە کە بەو شتە بێمانایانە لە دەستمان دەچێ!...
جا کە لە بەغدا داوای ئیمتیازی مەجەللەی کوردیمان دەکرد، دەوڵەت دەیگوت ئێمە ئیمتیازی سەت و سێزدە نەشرەمان داوە؛ ئیتر جێگە نەماوە! هەر چی دادمان دەکرد کە سەت و سێزدەی بە عارەبی دەبێ چواری کوردیشی دەگەڵ بێ! هەر چۆنێک بوو ساندمان. ئەویش نە بە یاریدەدانی دەوڵەت، نە بە ئیعلان. ناچار بە باربوو کۆکردنەوە چاپمان کرد. ئەو ساڵە لام وایە توانیمان هەشت ژمارە دەرکەین. کە وا دەبوو، ژمارەیەکمان دەکردە هی دوو مانگ.
لە زەمانی سەرۆکایەتیم لە یەکیەتی نووسەرانی کورددا، «حەمەدەمین مەنگوڕی» -کە وەختی خۆی لە «سەرا» دەگەڵ حەمە ڕەشیدخان و ئێستا مامۆستا بوو- لە ڕانیە پەیدا بوو.
- فلان کەس! خەڵکی ڕانیە بە عام بە شوێن مەلادا، بە دار و بەردەوە هاتنە سەرم؛ بە هەزار ناری عەلی ڕزگارم بوو؛ هەڵاتم. دادم بپرسە!
- چیت لێ قەوماوە؟
- کتێبی «چۆن چوومە مریخ» نووسراوی عەبدوللا بەگی ناهیدم کردۆتە کوردی و چاپم کردووە. مەلای ڕانیە -کۆلەوەژ لە سەر شان- دەنگی خەڵکی لێ داوم: ئەو کافرە کوفری کردووە! ژن و پیاو لە مریخ نییە. وەرن بیکوژن؛ خەزایە! لە ترسان خۆم نەقڵ کردۆتە «تەویڵە».
گوتم: کاکە پیرۆزباییت لێ دەکەم! مەلا ڕەسوولی سادقی کە شاعیرێک بوو بە ناوی «ئەدیب»، لە پەسوێ مامۆستای کوڕانی قەرەنیاغا بوو. ببوە مریدێکی وشکی خەییام و لای وا بوو تازە مردوو زیندوو نابێتەوە. لە پەسوێ بە فیتە و بەردەباران دەریان کرد. هەر چەند خۆی بە ڕەحمەت چووە، ئێستاش زۆر ئۆمەتی هەیە و بە نیمچە پێغەمبەرێکی دەزانن.
هەر بینا تۆش بوویە شتێکی وا و دەڵێن لە سەر دینی مەنگوڕییە!
شەوێک بە ناو، شەوی شیعرمان بوو. من کە گوایە سەرۆکی یەکیەتیم، خۆم کێشاوە و گوێگرێک بووم. هەر شاعیر و نووسەرە، شیعری یەکێتری هەڵدەسەنگاند. «شێرکۆ بێکەس» شیعرێکی منی خوێندەوە «لە دەمی نەهەنگدا» کە لە دیوانەکەمدا چاپ کراوە، گوتی: ئەمە چیرۆکە بۆ منداڵ نووسراوە؛ ماناشی تێدا نییە. بەڵام ڕەنگە منداڵ حەزی لێ بکەن! من وە جواب نەهاتم، تەنانەت سەعید ناکامیش کە دە پێشدا لای خۆم زۆری ئەو شیعرە بە لاوە پەسند بوو، پێشی وا بوو زۆر باش چۆنیەتی ئەمڕۆی کوردم دەبەر دەستی بەعسیدا باس لێ کردووە، دیفاعی لێ نەکردم. هەرچەند خۆم لام وابوو ئەم شیعرەم بۆ منداڵی بیست هەتا نەوەد ساڵە گوتووە، ئەمما دیسان دڵم خۆش بوو کە شاعیر شێرکۆ و گوێگران بە شیعرێکی منداڵانەیان زانی...
دەڵێ «مەیموون بۆ خۆی جوان بوو، ئاوڵەشی لێهات». کە دەگەڵ سەدام هاتمەوە، ساڵح یووسفیش لە تەیارەکەدا بوو کە لە کەرکووکەوە هێلیکۆپتەر گۆڕدرا و بە تەیارەی دیکە هاتین. لە فروودگاوە دەگەڵ حەردان تکریتی سواری ماشێن بووین کە بمانگەیەننەوە ماڵ. لە ڕێگە حەردان پرسی:
- دیارە هەژار شاعیرێکی بەناوبانگە؛ بارزانی زۆری تاریف کرد.
ساڵح یووسفی گوتی: نەخێر! من لە کورداندا لە هەموو کەس شاعیرترم و ناوبانگم یەکجار زۆرە!

جا کە بزانی ئەو فەقیرە لە عومریدا تاقە شیعرێکی بە ناوی «هەوارە» نووسیوە و ئەویش هەر دەبێ خۆی بزانێ چۆن «میعرێکە» سەیر نامێنی!

سالح یووسفی -کە هەم کرابووە وەزیر مشاور، هەم باشی دەزانی دەم لە بەر عەرەبان پان کاتەوە و کلکەسووتە بکا- نەیدەکرا هێندە تەنازول بکا بێتە یەکیەتییەکەوە کە خۆی ڕەئیس نەبێ، ئیجازەی «کۆمەڵی ڕۆشنبیرانی کوردی» لە دەوڵەت وەرگرت و گورجێ پازدە هەزار دیناریان دایە. هەر شیووعیەکی کەیفی بە ئێمە نەهات لەو کۆبوونەوە.

ئەوانەی کە لە یەکیەتی ئێمەدا بوون، کۆمەڵێک بە ناو دوکتور وەک «عیزەددین مستەفا»، «مەعرووف خەزنەدار» و چەند کەسێکی تر لەو بە ناو گەورە و بە ناوەرۆک وێرانانە بوون کاروباریان هەڵدەسووڕاند. هەرچی ناوی ئەخلاق و فەرهەنگ و ئەدەبە لایان نەبوو. تێک هەڵدەچوون، جنێوی وایان بە یەکتر دەدا کە لە ناو شەلاتییانیشدا زۆر عەیبە! زۆر جار دەمگوت: برا ئێوە شەرم لە لەقەب و ناوتان بکەن! ئێوە بە خەیاڵ هەڵبژاردەی هەرە زانای ئەم میللەتەن کە دەبێ خەڵکی ڕەمەکی چاوتان لێ بکا و لێتان فێری ئەخلاق و مەردایەتی بێ. کەچی ئێوە ئەوندە سووکن و ئەوەندە ئابڕوو بەرەن!... ئیتر دڵم لە هەموو ئەو خوێندەوارە خاوەن ناوانەی کە هیچیان دە بارانەدا نەبوو ڕەش ببوو، ئاواتم بە ڕەفیقایەتی گوندیە دڵ سادەکانی کورد دەخواست کە لە ڕەفیقایەتییاندا چەند ئاسوودە بووم.

لەم ساڵەدا چوومە سولەیمانی و لە کۆبوونەوەی ئەدەبیاندا -کە لە کتێبخانەی گشتی گیرا- بەشدار بووم وتارم خوێندەوە.

با جارێ باسێکی «سالح یووسفی» بکەم کە بیناسی:

خەڵکی لای زاخۆ بوو. مەلا ببوو؛ ببوە پارتی. زەمانی نووری سەعید گیرابوو؛ جارێکی تر لە زەمانی قاسمدا گیرا. نامەی کە بۆ برایم و جەلال دەنووسی، هەر پاکەتەکەیان دەدیت پێدەکەنین: بزانین کابرا شێتە دەڵێ چی؟! لە کوودەتای بەعسەوە - وەک باسم کرد- سەربەخۆ تەبریکی لە حوکمی تازە کرد؛ بە ناوی کورد و کوردستانەوە! زۆر کابرایەکی دڵسادە و ئەحمەقۆکە بوو. هەر بۆ خاتری دوو جار گیرانەکەی بوو کە دەکرا بە هەیئەتی گفتوگۆ دەگەڵ بەعس. وەک گوتم، پاش نامەکەی کە نووسیبووی: «تاهیر یەحیا چای داومێ و سوێندی بە قورعان بۆ خواردووم...»، دیسان گیرایەوە و زۆری جەزرەبە درا. ئەمجارەش کرابووە وەزیر موشاور و پاشان ڕۆژنامەی «التاخی» (برایەتی) هەڵدەسووڕاند. بە قەولی ڕەفیق چالاک هەمیشە تەلەفۆن لە لای دەستی ڕاستی و بە گوێی چەپیەوە دەنا! قەت نەبوو قەیتانی تەلەفۆن بە سەر کەپۆی دانەیە! کوڕی خۆی لە بەرانبەری قسەی دەگەڵ دەکرد وەیدەزانی تەلەفۆنە، ئەلۆ ئەلۆی بۆ دەگوت! خولاسە مەڕی پێغەمبەر بوو. وەک ئیمام عوسمان کە لە هەموو هونەریدا هەر دەڵێن زۆر بەدین بوو، ئەویش هەر دەیانگوت پیاوێکی فەقیر و بێئازارە، قەت نەیانگوت لە هیچ کارێک سەری دەردەچێ.

تازە وتوویژی هاتنەوە بەغدا و پێکهاتن لەگەڵ سەدام دەکرا، لە دیلمان بە بارزانیم گوت: بیستوومە سالح یووسفیت بۆ وەزیر ناو بردووە؟

- دەی جا چ بوو؟

گوتم: کاکە! ئەگەر من لە تەرەغە سالح یووسفی دە ڕۆژ لە بەرم بپاڕایەوە، نەمدەکردە گوێلکەوانی دێ؛ چونکە لاقی بیستانی دەشکاند!

جارێک حیسابمان کرد سیوشەش کاری گرینگی شۆرشی لە بەغدا لە ئەستۆ بوو، یەک لەوانە تەنزیمی کوردی بەغدا بوو کە ڕەنگە سەدهەزار ماڵ ببێ. ڕەفیق چالاک لـە بـەر دەسـتی ئـەودا بوو؛ مەجەللەی برایەتی بە کوردی دەردەخست. مەجەللە دەبـوو سیاسـی بـێ. دوو جـار دیـتم مەقالی سەرەکی باسی «شێخ فەرخ» بوو. چوومە سەری:

- ڕەفیق ئەو گووکاریە چییە؟

گوتی: غەلەتێکم کرد لە ڕووپەڕێکی برایەتیدا تۆزێک باسی شێخ فەرخم نووسی. سەیداسالـح بانگی کردم، گوتی: ئەوە زۆر خۆشە. دایکم بە ڕەحمەت بێ بە مندالی بۆی گێڕاومەوە. تـۆ وەک من دەڵێم وای چاپ بکە! لە داخان من هەموو جار دەیکەمە مەقالی سەرەکی!

رەفیق گوتی: ویستم خۆم لای خۆشەویست کەم. دوو کارتۆنی گەورە هێلکەم نـاردەوە ماڵـی سەیدا. هاتم خۆم نیشان دا کە تەشەککورم بکا. دەنگی نەکرد.

گوتم: ئاخۆ هێلکەکان گەیشتن؟

جوابی نەبوو.

- سەیدا من هێلکەم بۆ ماڵەوە نارد. ئەگەر نەگەیون تا حەممالەکە هەڵپێچم.

- زەرتک نینە!

پرسیم لە یەکێک: یانی چی؟

گوتی: دەڵێ زەردێنە نەبوو!

- مامۆستای بەڕێز! خۆ ئەوانە هێلکـە مریـشک نـەبوون؛ هێلکـەی کارخانـە بـوون. لەوانەیـە کرێکاری دز زەردێنەیان تێ نەخستبن!

- ها، ڕاست دبێژی! ل بەر ڤێ هەندێ زەرتک نینە!

دەبێ بزانی کە ئەم ئەحمەقە تەواوی ماوەی شۆڕش هەمیشە کاری زۆر گرینگـی بـە دەسـت بووە. «سەبری بۆتانی» لە دایـرەی مخابـەراتی نهـێنی پۆلیـسی عـیراق بـوو؛ کـەس نـەیزانیبوو کوردە. ئەخباری زۆر باشی -کە بۆ ئێمە بە بەهرە بوو- دزیوە و ناردوویە؛ کەوتوونە دەست سالح یووسفی. بەڵام مامۆستا نامەی سەبری نەسووتاندووە و جارێک لە گیرفانیدا گیراوە و سـەبری تـا سەر مردن ئازار دراوە و بە هەزاران ناری عەلی لەو ئاگربەسانەدا بەردراوە.

لە کن بەعسیان خراپەی شۆڕشیانی دەگوت کە هاتوچۆی ئێران دەکـەن و مـن کـە عیراقـم زۆر خـۆش دەوێ هـەرگیز نـاچم و نەچوومـە ئێـران. ماشـینی دەنـاردە ئـوردون لای کـوردی دەوڵەمەندی ئەوێ کە ئەوە ئی مەلامستەفایە و ماتۆڕی لێ بگۆڕن. خانوویێکی باشی لە بەعـسی ساند. لە ساڵی ١٩٧٤ کە شەڕ هەڵگیرساوە، دیسان لە شـۆڕش زۆر کـارە بـوو. ڕەمـەزانێک دوو هەزار دیناری حەقی باقلاوەی بەربانگی مەلایان لە شۆڕش ساند! کە هاتینە ئێـران، ئـەو گـەڕاوە بەغدا و بە ناوی «عیراقم خۆش دەوێ» لە ماڵە خۆی دانیشت. بەعسی - کە دە سـەر کەسـەوە ناچن - بۆمبایەکیان دە ناو قوتوێکدا بە دیاری بۆ نارد و کوشـتیان. لـەو سـاوە بۆتـە مامۆسـتای پایەبەرزی شەهید لە تاریخدا...

هەر چۆنێک بوو بە هـەزار عـەزاب و دڵـتەنگی، ساڵـم لـە سـەرۆکایەتی یەکیـەتی ئەدیبانـدا گوزەراند. لەم بەینەدا دەوڵەت دەعوەتی بۆ ناردین کە وەرن لە کۆنگرەی ئـەدیبانی عـەرەب لـە «ئیربید» لای بەسرە بەشدار بن! گوتم: من ناچم. جێگەیەک باسی کورد و ئەدیبانی کوردی لێ نەبێ، من نازانم تاریفی شیعری عەرەبان بکـەم و سـلاوەت لـە دیـداری بـەعس بـدەم... ناچـار

یەکی‌تر لە ئێمە چوو. دیارە ئەگەر بە تەمای یاریدەدانێکی پارەی دەوڵەتیش بووبین، بە یەکجاری هومێدەکە فەوتا. سەری ساڵی دووەم گوتیان لە هەولێر کۆ دەبینەوە و هەڵبژاردنی نوێ دەس پێ دەکەینەوە؛ بەڵام پووڵمان نییە. پێنجسەد دینارم لە مەلامستەفا وەرگرت کە هەڵبژاردنی ئەدیبانی کورد بەڕێوە بچێ. لە هەولێر زۆر بە حیساب و کیتاب کۆنگرەم ساز کرد. دەیانەویست هەڵمبژێرنەوە؛ لە وتاری پێش دەمی هەڵبژاردنا گوتم: ساڵێکمان ڕابوارد و ئەوەندەش بەرهەممان بوو. برا من نەمتوانی دەوڵەت لە خۆم دڵخۆش کەم. ناشتوانم پووڵتان بۆ لە سەدام بستێنم. حەز دەکەم سالح یووسفی هەڵبژێرن کە دەتوانێ پووڵی زۆر پەیدا کا و کاری مەجەللە و مخارجتان پێک بێنێ. ئیتر خۆم خەلاس کرد.

بۆ تۆزێک نموونەی ئەخلاقی هاوکارەکانم، ئەم چیرۆکەش ناخۆش نییە: شەوی دوای هەڵبژاردنی ئەندامانی تازەی دەورەی دووهەم، دەگەڵ کاک محەممەد مەولوود لە باشگایەک دانیشتبووین. ناردمان لە شوێن دوکتور مارف خەزنەدار کە سەرێکمان بدا، گوتبووی: من هەر دووکیانم ناخۆش دەوێ، نایەم! گوتم: عەرزی بکەن پەنجا دینارم لە گیرفاندایە؛ هەرچی بخوات و بخواتەوە لە سەر من! فەورەن هات و زۆر بە ڕووخۆشی دەگەڵی ڕابواردین!

هێشتا هەر ڕەئیسی یەکیەتی ئەدیبان بووم کە دەوڵەت قبووڵی کرد «کۆڕی زانیاری کورد» دابمەزرێ؛ منیشیان دەستنیشان کرد کە ببمە ئەندام. چەند کۆبوونەوەیەکی بۆ کرا. «سامی» - کە وەزیری کاروباری کوردستان بوو- عاشقی ئەوە بوو کە خاوەن کارنامەی دوکتورای زۆر تێ بچن. من زۆرم حەول دەگەڵ دان کە کوردیزانی باشی بۆ هەڵبژێرن؛ نەوەک ئەوانەی دوکتورایان لە زمانە خاریجیەکاندا هەیە. من یەکی وەک حەمەی مەلاکەریم و شوکورمستەفام پێ لە دوکتوراکانی کوردی‌نەزان چاکتر بوو. دیارە قسەی ئەوان لە سەر بوو.

کۆڕ دامەزرا. دە ئەندامی دامەزرێنەری بۆ دیاری کرا:

١- ئیحسان شێرزاد، وەزیری بەلەدیات، کە موهەندیسی میعماری و حقووقییە.

٢- شێخ محەممەدی خاڵ، کە نووسەرێکی مەشهوورە و قازی شاری سولەیمانییە.

٣- کاک مەسعوود محەممەد، کوڕی جەنابی مەلای کۆیە کە هەم حقووقی و هەم عالمێکی عەرەبی زۆر بە ناوبانگە.

٤- دوکتور کەمال مەزهەر، کە لە لینینگراد دوکتورای لە سەر تاریخی کورد لە قەڕنی بیستەما وەرگرتووە.

٥- هەژار، کە کرا بە ئەندامی پێنجەم.

٦- دوکتور عەبدوللا نەقشبەندی، کۆنە مەلا و ڕەئیسی کوللی حیسابداری عیراق.

٧- دوکتور پاکیزە ڕەفیق حیلمی، کە دوکتورای لە ئالمان لە سەر زمان و ئەدەبی عیبری هەبوو.

٨- دوکتور عەبدولحەمید ئوترووشی، کە قازی سوننی بوو لە بەغدا و زمانی کرمانجی دەزانی.

٩- عەلائەدین سەججادی، کە نووسەری «مێژووی ئەدەبی کورد» و زۆر کتێبانە.

١٠- دوکتور ناجی عەبباس، کە دوکتورای لە جوغرافیادا هەیە و خەڵکی کەرکووکە.

ئەم دە کەسە بە ڕەسمی ناوی دەستەی دامەزرێنەر و سەرەکیمان لێ نرا و ڕیاسەتی جمهووری بە بەیانێکی ڕەسمی قوڵی بۆ لە سەر کێشاین. ئێمە لەقەبی «ئەندامی کارا»مان درایە. زۆر کەسی‌تریش لە خاوەن کارنامەی دوکتور و ڕۆشنبیری کوردمان دەگەڵ خۆ خست

که له لیژنه جۆربەجۆرەکانی فەرهەنگیدا بەشداریمان بکەن. هەفتەی دوو یا سێ جار کۆبوونـەوە دەکرا؛ کاری فەرهەنگستانمان بەڕێوە دەبرد. «ئەحمـەد حەسـەن بـەکر» چـل هـەزار دینـاری بوودجە بۆ ناردین. ئیحسان شێرزاد - کە ڕەئیسمان بوو، وەکیلی شـرکەتی «گولبـەنگییان» بـوو لە عیراقدا- وای کرد گولبەنگییان عیمارەتێک لە سەر حیسابی خۆی بۆ کۆڕی زانیاری دروست کا؛ کە پتر لە دووسەد هەزار دیناری تێ چوو. چاپخانەیـەکی لاینۆتایپمـان سـاز دا. یـەک دنیـا کتێبی زۆر بە نرخی لە سەر کـورد و شـتیتـر کـۆ کـردەوە. کتێبخانـەی کـۆڕی کـورد زۆر لـە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری عارەبان -کە تەمەنی بە چـل سـاڵ دەگەیـشت- دەوڵـەمەندتر بـوو. چەند کتێبێکی کوردیمان چاپ کرد.

من شەرەفنامەکەی خۆم -کە دوو جار نووسیبۆوە- نیشان دان چاپی کەن. کێ تماشای کا و ئەگەر پەسەندی کرد لە چاپ بدرێ؟ گوتیان دوکتور نـاجی عـەبباس. گـوتم: ڕاوەسـتن! ئـەوە نووسینی منە. خەییامم چاپ کردووە. ئەگەر ناجی عەبباس توانی پێشەکییەکەی مـن لـە سـەر خەییام بە ڕەوانی وەخوێنێ، قبووڵمە. دوکتور کوردی نازانێ! گوتیـان ئـەدی کێـت پـێ باشـە؟ گوتم: عەلائەدین سەججادی فارسی باش دەزانێ و کوردیشی زۆر باشە. بەرانبەری نێوان مـەتن و تەرجەمە بکا. دوکتور کەمال خۆی لە شەرفنامەی تەرجەمەی ڕووسیدا یاریدەی موتـەرجیمی کردووە و تەشەککوری لێ کراوە. کاک مەسعوود هەمووتان بە ئەدیبێکی گەورەی دەزانن. هـەر یەک لەو سێ کەسە پەسندیان نەکرد بۆم چاپ مەکەن! ئەوان هەر سێ پەسندیان کرد. ئەو جار هەرا لە سەر هەقی تەئلیف پەیدا بوو:

- سەدی دە بدەین؟ سەدی دە لە قازانج یان لە گشت؟

هیچ متەقم نەکرد. قـەرار درا سـەدی دە لـە قیمـەتی گـشتی وەرگـرم. ئیمـزا کـرا. گـوتم: زەرەرتان کرد! ئەگەر جگە لە هیچ حەقێک داوای پووڵتان لە خۆم بکردایە، حازر بـووم پێنـسەد دینارتان بدەمێ هەر بۆم چاپ بکرێ!

ئیعلان کرا کە کام چاپخانە بـە کـەمتری دەکـا؟ هـەر چاپخانەیـەک دەیـدی دەیگـوت ئـەم خەتەمان بۆ ناخوێنرێتەوە. بۆ جاری سـێهەم ناچـار پتـر لـە پێـنج هـەزار ڕووپـەڕم شـەرەفنامە نووسـیەوە. زۆر شـەوان گـوێم لـە بـانگی سـبەینە دەبـوو، مـن هـەر دەمنووسـی... دەگـەڵ چاپخانەیەکی بە ناوی چاپخانەی «نوعمان» لە شاری نەجەف پێکهاتین، بەو شـەرتەی کـە هـەر ڕووپەڕێکی من بە ئیمزای خۆم لە سەری نەنووسم «چاپ بکرێ»، ئەو حەقی نەبێ چاپی کا. دوو فۆڕمەیان دەنارده کتێبخانەیەک لە خەیابانی «موتەنەببی»، غەڵەتگیریم دەکـرد و دەمنـاردەوە. جاری وابووە فۆڕمەیەکم چاردە جار غەڵەتگیری کردووە. کە دەهات بۆ چاپ ئامادە بێ، خۆم لـە بەغداوە دەچوومە نەجەف، ئاخر نموونەم بە چاپکراوی دەدیت. جاری وا بوو دوو شەو لە نەجەف دەمامەوە. گوتیان دوو هەزار نوسخە بێ. زۆرم داد کرد کە پتر بێ؛ گوتیان چەند کتێبمان چـاپ کردوون هەزاریشی نەفرۆشراوە. هێشتا چوار فۆڕمەی چاپ کرابوو گوتم من پووڵم ناوێ! سـەدی دە کتێبم بدەنێ! بە قیڕ و هۆڕ توانیم پێیان بکەم بە دوو هەزار و پێنجسەد نوسخە کـە دووسـەد و پەنجای خۆم بێ و دوو هەزار و دووسەد و پەنجایان بۆ بمێنێ. نرخی دینـار و ڕوبـع دانـرا کـە دەبووە بیستوپێنج تمەن. کتێبفرۆشی هەولێر و کەرکووک و سولەیمانی نەدیدە کـڕیان و تـا سەدی بەرگ دەگیرا، بۆ ئەوانمان دەنارد. بازاڕی ڕەشی پەیدا کرد؛ زۆر زوو بە پێـنج دینـار هـەر فڕکەی دەهات. دووسەت و پەنجا نوسخەی خۆم وەرگرت، دەبوایە بە قانوونی کۆڕ سەد نوسـخە

بۆ نووسەر بەخشش بێ؛ نەیاندامێ. لە پاییزی ١٩٧٢ درابوو بە چاپخانە، لە سەرتای هاوینی ساڵی ١٩٧٣ تەواو بوو.

دەعوەتێک بۆ کۆڕی زانیاری کورد لە فەڕانسەوە هات کە لە کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسانی دنیادا - کە هەر بە چوار ساڵ جارێک دەبەسترێ- بەشدار بین. دوکتور کەماڵ مەزهەر و منیان دەستنیشان کرد. بە تەیارە گەیشتینە فڕگەی «ئۆرلی» . خانم «جۆیس بلۆ» دەگەڵ لاوێکی سەرخڕ چاوەنۆڕی دەکردین. بیست و حەوت ساڵ بوو برایەکم لە کلاسی دووەمی ئیبتیدایی لە بۆکان بەجێ هێشتبوو، ئیستا لە فەڕانسەیە و بۆ دوکتورای شیمی دەخوێنێ. بە سەرە خڕەکەی لە دوور ناسیمەوە؛ بە دیتنەوەی گریانم هات. ژیانی ئەو چەند ساڵ لێک هەڵبڕانەم وەک شریتێکی سینەمایی هاتەوە بەرچاو...

سادقی برام کە بە ناو مەولانای خالی باوکمەوە کرابوو، تەمەنی هەشت مانگ بوو باوکم مرد. من هەم باوکی بووم هەم دایکی؛ چونکە دایکی لە پاش ساڵێک مەرگی بابم، مێردی کردەوە و بەجێی هێشت. منداڵێکی زۆر خوێنشیرین بوو. جاری وا هەبوو ژنانی دێ لێیان دەدزین؛ شێت دەبووین تا بۆیان دەهێناینەوە. هەموو دڵ و گیان و ئیمانم بە سەر خۆشەویستی ئەودا ساغ ببۆوە... کە ببوە چوار ساڵە، کەمێک دەرسم پێ گوت؛ زۆر زیرەک بوو. کە هاتینە بۆکان لە مەدرەسە دامەزراند. هەمیشە لە نمرە کۆکردنەوەی حەوتانەشدا هەر یەکەم بوو. لە بیرمە جارێک لە ماڵە «سالحی شاتری» بووم لە سابلاغ، گوتیان سادق لە بۆکان نەخۆشە. لە بیرم چوو کەوش دە پێ کەم؛ بە تای گۆرەوی ڕامکردە دەر. لە کۆڵان کەوشەکانیان بۆ هێنام و بە پەلە خۆم گەیاندەوە لای. شەقی زەمانە وای هەڵداشتم کە سادقم لە کلاسی دووهەمی سەرەتایی بەجێ هێشت و لێم ببوو بە داخ و حەسرەتێکی گەورە. تەنیا جارێک کە لە جزیری سووریا دەژیام، یانی پاش یازدە ساڵ دووری، نامەیەکی سادقم لە تارانەوە بۆ هات. نووسیبووی: پارەکە خەبەری تۆیان داومەتێ کە لە «قبورالبیض»ی. باسی خۆی کردبوو کە دوای دیپلۆم وەرگرتنی، لە دانشگای بژیشکی قبووڵ کراوە، بەڵام چونکە عەبدوڵلای برای دەستی باش ناڕوا و بژیشکی مخارج و ماوەی زۆری دەوێ، وازی هێناوە و لە دارولموعەلیمینی بەرزدا دامەزراوە. ئیتر خەبەرم لێ بڕابوو. ئەوا دیسان لە فەڕانسە دەیبینمەوە. زۆرم سوپاسی خانم «جۆیس بلۆ» کرد کە ئەم دیارییە بە قیمەتەی نیشان داوم.

«جۆیس بلۆ» ژنێکی جوولەکەی فەڕانسی بوو کە بە منداڵی لە میسر ژیابوو. عەرەبی میسریانەی وەک بلبل دەزانی. کاری لە سەر ئەدەبیاتی کورد دەکرد. دەرسێکی باسی کوردی، لە «سۆربۆن» دەگوتەوە. دەگەڵ دوکتور کامران عالی بەدرخان و خانمەکەیدا - هاتبوونە ناوپردان لە شۆڕش- ببووینە ئاشنا. هاتبووە بەغداش و دەعوەتم بۆ کردبوو. لە کۆڕی زانیاریشدا چەند ڕۆژێک پێکەوە بووین و دەگەڵ دوکتور کەماڵ و مندا زۆر نێوانی خۆش بوو. وا بزانم هەر ئەویش سپاردبووی کە لە کۆڕی زانیاری، کەماڵ و من بانگ کەن.

سادق ماڵێکی گرتبوو لە تەبەقەی هەمکەفی خانوویێکی حەوت تەبەقەدا لە نزیک «سۆربۆن». قەرار درا من میوانی ئەو بم. جۆیس خانوویێکی بەتاڵی پێ سپێرابوو کە خاوەنەکانی بە سەفەر چووبوون. ئەویش درا بە کەماڵ کە لێی بنوێ و پارەی ئوتێل نەدەین. خوشکێکی جۆیس لە نۆروێژەوە بە ماشێنی خۆیەوە هاتبوو. ئیتر ماشێنی جۆیس و خوشکەکەی - کە ئەویش عەرەبی لەهجەی میسری باش دەزانی- هەمیشە دەبەر دەستماندا بوون.

لەو ڕۆژانەدا کە تازە چووم، سادق چاوەنۆڕ بوو ژنەکەی بە منداڵێکی ساواوە بێتە فەڕانسا لە تارانەوە. ڕۆژانە دەچووە فرگە و تا نیوەڕۆ نەدەهاتەوە. ڕۆژێک گوتی: تۆ لە ماڵ بە! تەلەفۆنم کردووە یەخچاڵم تازە کڕیوە؛ لە کار وێستاوە. دوو جار موهەندیس هاتووە لە ماڵ نەبووم. ئەو ڕۆژە موهەندیس نەهات. سادق لە داخان شەقێکی دە یەخچاڵ هەڵدا؛ وە کار کەوت! موهەندیس هات گوتی هیچ عەیبی نییە. گوتی: بەڵێ فێرە شەق تێهەڵدان بوو؛ نەمزانیبوو!

لەم تەبەقەی هەمکەفە حەمام هەبوو؛ بەڵام لە تەبەقەکانی باڵا نەبوو. دەیانگوت لە ماڵە فەڕانسیاندا حەمام زۆر کەمە. حەمامی وەک وڵاتی خۆشمان نییە. دەیانگوت ئەو هەموو عەترە کە لە فەڕانسا دروست دەکرێ و سەدان ساڵە عەتری هەرە باشە، هەر بۆیەیە کە بۆگەنیوی خۆنەشۆران داپۆشێ!

ژن و منداڵی سادق هاتن. ئیتر لە بابەت چێشت و نانیش حەساینەوە. خوا تازە کوڕێکی دابوو بە ناوی «شاهین»، کە من گوتم دەبێ ناوی «شاهۆ» بێ؛ بە ناوی کێوی کوردستان. ژنی سادق، کچی سەید عەبدوڵلای ئەییووبیانی خاوەن دەرمانخانەی مەهاباد بوو؛ کە پیاو هەق بڵێ زۆر کابان و دەستاوخۆش بوو؛ بە ناوی «نوسرەت خانم» کە ئێستاش هەر ژنیەتی و دایکی سێ منداڵانە بە ناوی: «شاهۆ» و «ڕامین» و «سارا» و لە تاران دەژی.

ڕۆژانە پەنجەرەی کۆڵانم دەکردەوە؛ گوتیان لە فەڕانسە کەس پەنجەرە ناکاتەوە. ڕەنگە جیران پێ توورە بن! گوێم نەدایە! کەچی چەند ماڵە جیرانێکی‌تریش چاویان لە من کرد و پەنجەرەیان دەکردەوە و هیچ دنیاش خراپ نەبوو!

کە لە سەری کۆڵان باتدەداوە بەرەو میترۆ، دوکانێک جووچکە مریشکی یەک ڕۆژە و دوو ڕۆژەی لێ دەفرۆشرا؛ پشیلەیەکی زەلامی زەردی مل و کلک ئەستوور پاسەوانی جووچکان بوو؛ لە ناو ویترینەکەدا دەنوست. جووچکە بە سەر دەم و چاو و کلک و لاقیدا هەڵبەز-هەڵبەزیان بوو؛ ئەو پرخەی دەهات! ئەگەر کەسێک دەستی لە شووشەی ویترین دەدا، ڕاستەوە دەبوو؛ کلکی قنج دەکرد و دەیەویست بە گژ دوژمنی جووچکاندا بچێ. زۆرم پێ سەیر بوو. زۆر جار لە دیاری دەوێستام.

میترۆی پاریس زۆر دوور و درێژە و زۆر کلکی لێ دەبنەوە؛ بەڵام بە جوانی و ڕێکوپێکی میترۆی مۆسکۆ نییە. شەوانە بە سەدان لە ئاوارە و بێ‌ماڵ و حاڵان لە ناو میترۆدا دەنوستن. سادق نەخشەیەکی چکۆڵەی میترۆی دابوومێ کە گوم نەبم. کوێم بویستایە، بە ئیشارە نیشانم دەدا و دەچووم. جۆیس زۆر جێگەی وای پێ دەزانی کە نەهار و شامی هەرزان و بۆ دانشجوویان بوو؛ زۆرمان لەو بەهرە دەبرد. ڕۆژێک دەگەڵ جۆیس بە بەر موغازەیەکدا ڕابردین. لە سەر باڵتۆیەکی ژنانە —کە نازانم کەوڵی چ بوو- نوسرابوو: «سەدوسی هەزار فرانک» کە دەیکردە سێزدە هەزار دیناری عیراقی. جۆیس قسەی دەگەڵ ژنە موغازەدار کرد، گوتی: گوتوومە بۆ وا گرانە؟ دەڵێ: ئەوە بۆ ژنە فەڕانسی نییە. ژنێکی ملیۆنێری ئەمریکایی کە دەیبینێ، بە هەرزانیشی دەزانێ و چەکێک دەنووسێ و دەیکاتە بەر!

لە هەموو زمانی فەڕانسیدا «سیل ڤو پلێ» فێر ببووم کە یانی «تکایە، خواهیش دەکەم». شەوێک لە میترۆدا سەرم لێ شێوا، هەر چەند سادق گوتبووی پرسیار کردن لە کەس باش نییە و قبووڵ ناکەن، ملم لە پرسیار نا، تا هاتمەوە ماڵ. پرسی چۆن هاتییەوە؟ گوتم: هەشت سیل ڤو پلێم خەرج کردووە!

بە ڕاستی کە دەڵێن پاریس بووکی جیهانە، ڕاست دەکەن. شارێکی زۆر جوانە؛ پڕە لە باخچە و سەیرانگا. شینایی و کەسکایی ئەوێم پێ لە کەسکایی گیا و مێرگی ولاتی‌تر کەسک‌تر دەهاتە بەرچاو. لە جوان کردنی شاردا هیچ درێغی نەکراوە و بووکی ڕازاوەی خەیاڵە. جار و بارە لە هێندێک شوێن تووشی خانووی ڕەش بە دووکەڵ، دیواری ناقۆڵای نیوە ڕووخاو دەبی؛ بەڵام زۆربەی شارەکە زۆر جوان و پاک و خاوێنە. قاوەخانەی یەکجار زۆرە کە لە شوێنانی‌تر وا نییە. بە تایبەتی لە نزیک دانشگای سۆربۆن هەر یەکجار زۆر بوو. تا ماندوو دەبووم دەچووم قاوەیەکی تورکیم دەخواردەوە و ئیستراحەتم دەکرد.

کۆنگرە بۆ حەوت ڕۆژ دامەزرا. لە هەموو دنیاوە زانایانی ڕۆژهەلاتناس هاتبوون. شکڵی زۆر سەیرت دەدی. ئیوا هەبوو کراسێکی ئاودامانی سوور بە ڕەنگی خوێن دە بەردا، پێخواس، سەرقژن! هی وا هەبوو بەشی بەرماڵی مزگەوتێکی کردبووە مێزەر! کەشیشێک هەبوو بە ناوی «تۆما بوا»، چەند ساڵان لە لوبنان ژیابوو؛ عەرەبی باش دەزانی. لە لایەن زانایانی فەڕانسییەوە زۆر بەقەدر بوو. ئەو پیاوە چەند ساڵ بوو ژیانی خۆی بۆ خزمەت و یاریدەدانی گەلی بەدبەخت و کلۆلی کورد تەرخان کردبوو؛ چەندین کتێبی نووسیبوو؛ لە ناو عالمانی دەرەوەشدا ناوبانگی هەبوو. پیرێک بوو ڕیش سپی، زۆر جوان و بە سەر و سیما. کلیسایەکی بە دەستەوە بوو لە پاریسدا. ئەو پیاوە چاکە خۆی لێ کردین بە کەس و کار. «پرۆفیسۆر لازار» ناو کە لە سۆربۆندا زۆر دەستی دەڕۆیشت و زۆر پیاوماقووڵ بوو؛ فارسیشی دەزانی، بە ڕاسپێری «تۆمابوا» قەولی پێداین کە کارێکی وا بکا ئێمەش بتوانین خۆمان وەک گەلێکی سەربەخۆ نیشان بدەین. ئێمە نوێنەری هیچ دەولەتێک نەبووین. گەلی کورد لە هیچ دنیایە بە ڕەسمی نەناسراوە؛ هەقمان نییە بە ناوی عیراق یا ئێران قسە بکەین؛ کە ڕۆژهەلاتناسانی تورک و ئێرانی و عیراقیشی لێ بوون. بەڵام نفووزی کەشە «تۆما بوا» و ماندووبوونی «جۆیس» و بەزەی «پرۆفیسۆر لازار» بەرانبەر بە کورد، کارێکیان کرد کە ڕۆژێک لە سەعات نۆڕا تا دوازدە، جەلسەیەکی بە تەنیا تایبەتی کورد ڕێک بخرێ و هاواری کورد بکرێ. حەولمان دا تا بتوانین زانایانی کوردی زۆر لێ کۆ کەینەوە کە قەدرێکی پتری هەبێ. گوتیان «دوکتور کامران عالی بەدرخان» لە جەنووبی فەڕانسایە و ژنی نەخۆشە. «دوکتور مەکینزی» ئینگلیسیمان هاتە لا، کە زۆر کوردی‌زان و شارەزای کار و بار و حاڵی کوردستانە. «دوکتور شەفیق قەزاز»، «دوکتور محەممەدی وەرزێر» خەڵکی سولەیمانی، ژنی وەرزێر کە کیژێکی چیکۆسلواکی و کوردی‌ناسێکی باش بوو، دانشجوویەکی عیراقی بە ناوی مەزهەر، سادقی برام، کەشیش «یووسف مەتا» - کە خەڵکی سولەیمانی بوو- ساز بوون.

بە جۆیسم گوت: دەڵێن دوکتور محەممەدی موکری ئێرانی لە پاریسە؛ با بەویش بڵێین.

وەک بە دە کەسان قدیلکەی بدەن لە پرمەی پێکەنینیدا و هەر خاو نەدەبۆوە.

- جۆیس گاڵتەم نەکردووە، بۆ پێدەکەنی؟

- ماڵاوا لەوە جۆک خۆشتر چۆن دەبێ؟! دوکتور موکری نەخۆشی خەیالات و ئەوهامە. دەردی ئەو لە موعالەجە دەرچووە؛ بە کەس چاری ناکرێ؛ لە سێبەری خۆی دەترسێ. هەر کەس زەنگی دەرکەی لێدا یان تەلەفۆنی بۆ بکا لای وایە هاتوون بیکوژن! خۆی لە حەوت کوناندا تاقەت دەکا. جنێوی گەورە لای ئەو ئەمەیە کە بلێن تۆ کوردی. ئێستا چۆنت ئەو قسە قۆڕە وە بیر هات کە ئەویش لەم کۆبوونەوە بەشدار بێت و دیفاع لە گەلی کورد بکات؟!

مەقالێکم نووسیبوو کە بیخوێنمەوە؛ سادق بە فەڕانسی تەرجەمەی کرد. جۆیس و تۆمابوا هەر چەند زۆریان پێ سەیر و دڵتەزێن و ئیحساس بزوێن بوو، بەڵام گوتیان بۆ ئەو کۆبوونەوە دەس نادا. پێویستە دەربارەی گەلێکی شەرقی بە جۆرێک کە نەزەری ڕۆژهەڵاتناسان بەرەو خۆی بکێشێ قسە بکرێ. لە سالۆنێکی سۆربۆن کۆ بووینەوە. زۆر لە عولەمای ڕۆژهەڵاتناس هاتبوون گوێمان لێ بگرن؛ کە پرۆفسۆر لازار پێی ڕاگەیاندبوون. کەشە تۆمابوامان بە ڕەئیسی کۆ بوونەوە هەڵبژارد. بەیاناتێکی زۆر عالمانە و دڵسۆزانەی دەربارەی کورد و کوردستان گوت. دوکتور کەماڵ مەزهەر بە زمان ئینگلیسی دەربارەی تاریخی کورد و شەڕەکانی ئازادیخوازی قسەی کرد. زانایەکی ورگزلی تورک هەستا گوتی: لە تورکیا کورد و مەسەلەی کورد نییە؛ هەموو تورکن و بێگانەی تێدا نییە! دوکتور کەمال مەزهەر جوابی دایەوە کە لە تورکیادا هەموو کێوەکان شایەتی بوونی ملیۆنها کورد لە تورکیەن. کابرای تورک دەستی هەڵێنا، ئیجازەی خواست دیسان قسە بکا. تۆمابوا بە لەپی دەست ئیشارەیەکی زۆر سووکایەتی هێنی بۆ کرد کە ئیجازەت نییە. بۆ خۆی گوتی: چۆن پێم وابێ ئەم کابرایە عالم و ڕۆژهەڵاتناسە؟ یان پێم وا بێ دەرسی خوێندووە؟ من ئەگەر نەڵێن تەعەسسوب بە خەرج دەدا، دەتوانم بڵێم لە تورکیادا تورک هەر نییە. حەیفە پیاوی وا نەزان لە کۆبوونەوەی عیلمیدا بەشدار بێ! کابرای تورک هەستا و ڕۆیشت. بە عەرەبی، تۆمابوا بە منی گوت: ئەو سەگە چۆن لە ڕووی هەڵات گووی وا بخوا؟ ئینکاری شتێک بکا کە لە ڕۆژ ئاشکراترە؟! زۆر لە هاوبەشان قسەیان کرد و جەلسە تەواو بوو.

ڕۆژی ئاخری کۆنگرە —کە هەموو میوانان و خانەخوێی فەڕانسی لە سالۆنێکی گەورە کۆ ببوونەوە- کاروباری کۆنگرە و بڕیارەکانیان ڕاگەیاند. لە سەر تریبوونەوە ئیعلان کرا کە میوانانی کورد لە جەرگەی زانایانی ڕۆژهەڵاتناسدا بە ڕەسمی ناسران و ئیدارەی سۆربۆن قەراری دا مەرکەزێک بۆ پەرەپێدانی تاقیق لە سەر مەسەلەی کورد و ناساندنی کوردستان و گەشەدان بە فەرهەنگ و تاریخی، لە سەر بودجەی خۆی بکاتەوە و کوردیش وەک میللەتی‌تر حیسابی بۆ بکرێ. ڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەمان دەس کەوت؛ ئەویش لە سایەی تۆمابوا، پرۆفسۆر لازار و جۆیس بلۆ بوو. هەزار ڕەحمەت لە تۆمابوا کە دەمێکە وەفاتی کردووە؛ بەڵام بیستوومە پرۆفسۆر لازار و جۆیس شوکور ماون. دەیانگوت پرۆفسۆر لازار پتر لە پازدە زمان دەزانێ، کە بە فارسی قسەمان دەکرد گوتم: خۆزی کوردی فێر بای! گوتی: لە وەتا ئێوەم دیوە زۆرم ئارەزووە زمانەکەتان فێر بم. ئەوا جارێ خەریکم زمانی ژاپۆنی فێر دەبم؛ پاشان خەریکی کوردی دەبم.

لە کۆنگرەدا جایزەی کۆنگرە درا بە کابرایەک، سووری سەر و دم و چاو بێ‌تووک، دەتگوت چەوەندەری سوورە و پاک کراوە! شکڵێکی زۆر ناشیرنی هەبوو؛ تەنانەت برۆشی مووی پێوە نەبوو. کابرا جوولەکەیەک بوو؛ هەر لە کەتیبەی قەبرانەوە خەت و زمانی فینیقی ساز دابۆوە و کردبوویە کتێب و مردووی سێ-چوار هەزار ساڵەی زیندوو کردبۆوە. ئەوەندەی بۆ لە چەپڵە درا نەبێتەوە.

حەوت ڕۆژی کۆنگرە نانی نیوەڕۆژەمان لە سەر سۆربۆن بوو؛ دەچووینە ڕستوورانێک و پارەمان نەدەدا. ڕۆژێک کە لە ڕستووران هاتمە دەر، «فەردیناند میش» چاوەنۆڕی دەکردم. یەکترمان ماچ کرد و لە قاوەخانە دانیشتین. فەردیناند میش لاوێکی خەڵکی «لوکسەمبورگ» بوو؛ زۆر عاشقە کورد و کوردی بوو. چەند جارێک لە شۆڕش دیبووم. کرمانجی وەها دەگوت کەس نەیدەزانی کورد نییە. تەنانەت جارێک گوتی: ئێوە کە پێشمەرگەم ڕەگەڵ دەخەن بۆ

سەفەر، هیچ خزمەتم ناکەن و جوابم نادەنەوە؛ چونکە لایان وایە منیش کوردێکم وەک ئەوان! ئەو لاوە چووبووە کوردستانی تورکیە؛ جەندرمە گرتبوویان؛ بردبوویان لە زیندانی واندا حەبسیان کردبوو. کوردی زیندانییان لێ فێر کردبوو کە ئەوە کافرە! لێیدەن خێرە! کوردەکان زۆریان لێدابوو؛ پشتیان شکاندبوو. بەختی ئەو، زیندانیەکانی کورد دوو دەستەی دژ بە یەکن. دەستەکەی‌تر لە رقی ئەوانە، لە سەریان کردۆتەوە و پارازتوویانە. بۆچی گیراوە؟ چونکە چەند کتێبێکی کوردی لێ گیراوە. لە پاشان کە زانیویە کەس بە دەنگییەوە نایە، نامەیەکی بە ئینگلیسی لە ئەستانداری «وان» نووسیوە: ئێوە منتان گرتووە، نازانن من کێم. شەرت بێ وا بکەم دەوڵەتی گەورەی من بەزمی سەگتان پێ بکا! دەیگوت: وا دیار بوو ئەستاندار نەیدەزانی لوکسەمبورگ لە دەوڵەتە گەورەکان نییە و نفووسی بە حاڵ دەگاتە چوارسەد هەزار. ترسا و عوزری لێ خواستمەوە و بەریان دام. هاتمەوە لوکسەمبورگ شکایەتم لای وەزیری دەرەوە کرد. وەزیرەکەمان -بەرازەکە مەزنە!- گوتی تۆ کێشەمان بۆ ساز دەکەی! ساڵێ بایی نیوملیۆن دۆلار سەودا و مامڵەمان دەگەڵ تورک هەیە. کەنگێ ئەو کوردەی تۆ دەڵێی مەزلوومن توانیان ساڵی بایی شەش سەد هەزار دۆلار مامڵەمان دەگەڵ بکەن، دەڵێم هەقتە و لە سەرت وە جواب دێین...

جا «فەردیناند» هاتووە لە پاریس منی پەیدا کردووە، هەڵیپێچابووم دەبێ بچینە لوکسەمبورگ دایکم شێوت بۆ لێنێ!

- کاکە فەردیناند! پیاو شەش سەد کیلۆمیتر بۆ شێوی دایکت سەفەر ناکا!

فەردیناند گوتی: خەریکم فارسی لە لوکسەمبورگ دەخوێنم تا بچم لە ئەفغانستان بگەڕێم.بەڵام مامۆستاکەمان کوردێکی بیژووە!

- بە چی دەزانی؟

- رۆژێک وشەیەکی کوردی گوت.گوتم: ئەوە کوردییە، تۆ کوردی؟ گوتی: نا، فارسم؛ بەڵام تۆزێک کوردی فێر بووم.گوتم: فارس بە لایەوە عەیبە فێری زمانی کوردی بێ. تۆ کوردی و لات وایە عەیبە ڕاستی لە خۆت بڵێی. ڕاستی ئەویش بەرازەکە!

ڕۆژانی دوای کۆنگرە و ڕۆژانی پێش کۆنگرە بە پاریسدا دەگەڕاین. چووینە «بورجی ئیڤل»، چووینە «کاتدرالی نۆتردام». لە نۆتردام کۆتەڵی کەشەیەکم دیت لە زێڕ بوو. بە خوشکی جۆیسم گوت: ئەوە کۆتەڵی مامی خۆمە! دەبێ بیسێنمەوە! هەرای لە جۆیس کرد:

- وەرە! کەشە فلان مامی هەژار بووە!

جۆیس گوتی: ئەحمەق! هەژار گاڵتەت پێدەکا؛ تۆ لێت بۆتە ڕاست!

چووینە مەقبەرەی ناپلیۆن. لە جیاتی هەڵوا و خێرمان بدەنێ، یەکی سێ فرانکیان پوول لێ ساندین! ڕاستی مەقبەرەیەکی دیدەنییە. چەک و ئەسپابی سەربازانی ئەو زەمانە وەک خۆی ڕاگیراوە. چووینە مووزەی «لووڤر»، چەند سەعاتێکی تێدا گەڕاین کە لێم ڕوونە مانگێکی دەوێ تا ئەو ئاسەوارە هونەرییە ببینی.

ڕۆژێک تووشی کاروانێکی قەرەچی بووین لە نزیک چۆمی «سێن». چەند کەرێکی بە کورتان و چوار ئەسپی چکۆلەی تۆپەڵ کە گەورەترەکەیان نەدەگەیشتە ئەستوورایی ڕانم. ئەسپێکیان لەوانە عەرابەیەکی تێخرابوو؛ پێیان بوو. زۆرم لا سەیر بوو. پرسیمان، گوتیان: ئەم جسنە ئەسپە هی سکۆتلاندە. ئەو کەر و ئەسپ و عەرابە، پاریسی بۆ سەیران سواری دەبن و پوولمان دەدەنێ.



بە سادقم گوت: دەڵێن لە لەندەن مووزەی «مێو» هەیە؛ گوتی لێرە نییە. ڕوانیە کتێبی شارەزای پاریس، گوتی هەیە و من نەمزانیوە. چووینە «مووزەی مێو» کە بە مووزەی «مادام بواری» بەناوبانگە. هەتا بڵێی سەیر بوو. یەکجار زۆر لە پیاوانی تاریخی و دەستەڵاتداریان لە مێو دروست کردووە. تەنانەت شا و شاژنی ئێرانیشی لێ بوو. شاعیرانی مەشهووری فەڕانسە و زۆر لە پیاوانی تاریخیمان دیت. دەچووین سەیری کۆمەڵێک بکەین کە لە پشت شووشەوە بوون؛ پاسەوانێک لەوێ وێستابوو؛ تەواو زیندوو. تەنانەت وردە مووی پشتی دەستی دانە بە دانە دیار بوو. زەق تماشای دەکردین. کەچی ئەویش هەر کۆتەڵی لە شەم بوو! کابرایەک لە سەر نیمکەتێک ڕۆژنامەی دەخوێندەوە؛ سادق لێی پرسی بە کوێدا بڕۆین؟ ئەویش هەر بە مێو دەرچوو! هەموو شتمان لێ ببوە مێو! ئەوجار بێ پرس بە لای کۆتەڵێکی مێودا ڕۆیشتین. کەچی گوتی: بێرەدا قەدەغەیە! ئەویم پێ زۆر سەیر بوو.

دار خەیزەرانێکم دیت لە باخچەیەکدا، پتر لە شازدە میتر بەرز و قەف-قەف، کەسک، قەت ڕووشێکی تێدا نەبوو. داری دەوری خەیابانی شانزەلیزەم زۆر پێ جوان بوو. کە ڕوانیم هەمووی داربەڕووە خاسەی خۆمانەیە.

کەشە یووسف زۆری هاتوچۆ دەکردین. کوردی سولەیمانی بوو؛ چەند ساڵ پێشمەرگە بوو؛ هاتبووە فەڕانسا. لە دوو مانگدا توانیبووی پێش‌نوێژی سێ کلیسا پەیدا کا. گوتم: کاک یووسف تا جارێکی‌تر دێمەوە، یان دوکانی عەکسی ڕووت فرۆشتنت دەبێ یان دەبی بە پاپ لە ڕۆم!

دەعوەتی کردم بۆ کلیسایەک؛ بانگی کرد چوار بوتڵ شەراب بێنن. گوتم بە خوا من لەگەڵتا ناخۆمەوە. گوتی: باشتر! من ئەمانە بۆ خۆم دەدزم! گوتیشی ئەگەر دەگەڵ کەمال دەچنە گەڕەکی «سان دۆنی» - کە گەڕەکی بێ ئابڕووی پاریسە- من بەرن نەوەک لات و پات ڕووتتان بکەن! گوتم: شوکور پارەی جێگەی وامان پێ نییە!

شەوێک لە بەر قاوەخانەیەک لە سەر کورسی دانیشتبووین. کابرایەکی زۆر مەست تلاوتل هات داوای پووڵی کرد کە ئارەقم نەماوە. فرانکێکم دایە؛ گوتم: بڕۆ خۆشی ڕابوێرە! شەفیق و کەماڵ زۆر پێکەنین:

- ئاخر بە تاقە فرانکێک چۆنی خۆش لێ ڕادەبرێ؟!

دوکتور کەمال گوتی دەچمە هولەند؛ جلک لەوێ هەرزانە. جۆیس تێی گەیاندم کە مەچۆ! کەمال ڕۆیشت. دەگەڵ جۆیس سواری قەتار بووین و بە «لیۆن»دا چووینە قەدی چیای «مۆن بلان». لە شارێکی چکۆلە بووینە میوانی کلیسایەک. کەشەیەکمان دیت. من باسی کوردی بۆ دەکەم و جۆیس تەرجەمە دەکا. کەشە گریا و فرمێسکی بە ڕیشە سپیەکەیدا هاتنە خوار. چوار کەشیشی‌تریش هاتن؛ دیار بوو ئەو لە دووی ناردبوون. شەرحی ئەحواڵی کوردی ماڵ وێران و کوڕ کوژراوم بۆ دەدان. ئەوانە نوماینەدەی کلیسایانی عالەمی بوون. بڕیاریاندا کە بە هەموو توانا لە مەڕ دەرمان و کۆمەگی نەغدەوە یاریدەمان بدەن. گوتیان هەر ئێستە هێندێک پووڵت دەدەینێ! گوتم من نامەوێ. وەکیلی شۆڕشمان لە فەڕانساوە دێتە لاتان؛ یارمەتی بەودا بنێرن. کەشەی خانەخوێمان بە ماشینی خۆی بردینیە سەر چیای مۆن بلان. بەرامبەر بە دیمەنی ژنێوی سویس، نەهارێکی زۆر باشی داینێ. جۆیس دەیگوت کە گریاندووتە وایزانیوە ئێستا بۆ خۆت برسیتە! شەو لەو شارە لە ئوتێل ماینەوە. سبەی هاتینەوە و بە قەتار بەرەو پاریس. لە ڕێگە بە مەزرادا کە دەڕۆیشتین، لە هەموو مەزرایان لام وا بوو توتن کراوە. لە شوێنێک قەتار

وێستا کە پاش سەعات و نیوێک دەڕوا. چوومە مەزرا. دیتم ئەوی من بە تووتنم زانیبوو ڕەزی مێون! هەر مێوەی کەمتر لە میتر بڵیند؛ زۆر ئەستوور و پڕ لک؛ زۆر ڕێکوپێک. پێم وایە هێشتووی بیست کیلۆیی لە زۆربەی مێوەکانەوە کەوتبووە سەر زەوی. جگە لە ڕەز، زۆربەی چێندراویان نیسک بوو کە سەرەکەیان بە ماشین بڕیبوون و کایەکەیان بە ماشین دەدرووەوە. نەقلی ئەو سەفەرەم بە کەمال نەگوت. دەگەڵ ئەویشدا زۆر جێگەی وا چووین کە داوای یارمەتیمان بۆ کورد لێ کردن. زۆریان جوابی دلخۆشکەرەیان داینەوە.

لە چەند مالێک دەعوەت کراین کە تێگەیشتم جوولەکەی زۆر پایەبەرزی فەڕانسان. بە تایبەتی یەکیان کە پیاوێکی پەنجا سالە دەبوو؛ عەرەبیشی زۆر باش دەزانی؛ زۆری لاگیری لە کوردان دەکرد. قسەمان دەکرد، گوتی:

– خەلکی شەرقی هەموویان تەنیا ئیحساساتین. ئورووپایی سەریان لە زمانی ئیحساسات دەرناچێ. ئورووپا تەنیا ژمارە و ئامار دەزانێ. تۆ هەزار سال بلێ دێهاتمان سووتاوە؛ گەلمان، ژن و منالمان لە برسان مردوون؛ بەر بۆمبا دراون؛ هەموو بێ داودەرمان کەوتوونەوە؛ هیچ بەهرە نادا. بلێ دوو هەزار و سێسەد و شازدە دێمان کە ئەوەندە مالە و ئەوەندە سەرخێزانە و لەوانیش ئەوەندە پیاو، ئەوەندە ژن، ئەوەندە منداڵ، عومریشیان بلێی؛ ئاگر دەگرن و سەری کیسە ئاوالە دەکەنەوە. بۆ نموونە: وێتنامی هاواریان لە خەلکی فەڕانسا کردووە، هەموو شت بە ژمارە و ئەرقام. گوتوویانە دوازدە هەزار منداڵی دە تا سێزدە سالەی خەلکی پایتەخت بە دەنگی تۆپ و بۆمبا کەڕ بوون. ئامرازی بیستنیان لە فەڕانساوە بۆ بەڕێکراوە؛ لە بازاری سایگۆندا فرۆشراوە...

شەوێک لەو دەعوەتانەدا باسی نەمانی ئیستعمار دەکرا کە بەم زووانە خەلاس دەبێ. ئەو جوولەکەی دەلێم گوتی: ڕەنگە ئیستیعماری خاوەن چەک و لەشکر لە ناو بچێ، بەلام ئیستیعماری پووڵ هەرگیز لە ناو ناچێ... بۆ داکوتانی قسەکەی خۆی، نەقلی جوولەکەیەکی دەولەمەندی پاریسی گێڕاوە کە پار لە سەرەتای زستاندا هەرچی بەری دارستان و باغاتی یوگۆسلاویایە کڕیویە و خۆی و بەختی پوولی نەغدی داوە. ئێستا یوگۆسلاویا -کە هیچی بۆ نامێنێتەوە- سەدی پەنجا قازانجی پوولەکەی دەداتەوە بە سەرمایەوە، کابرای جوولەکە هێشتا ڕازی نییە!

چەند ڕەفیقێکی سادق هەبوون زۆرم کەیف پێدەهاتن؛ کە سادق تاریفی مەعلووماتی دەکردن؛ ئێرانی بوون. ڕۆژێک سادق، کەمال و منی بردە چلۆکەبابخانەیەکی ئێرانی کە زەرفەکانیان هەمووی کاشی شین و سەماوەر ئێرانیانە بوو. بەلام ئەوەندەیان پووڵ لێ ساند کە لە دەرەوە دەمانتوانی سێ جەمی باشی پێ بخۆین. دەگەڵ کەمال چووینە مغازەیەک دەفتەر و کیفی دەستی بکڕین؛ هەردووکیش فەڕانسی نازانین. کابرایەکم دی ڕیشێکی فەڕانسیانەی سەرچەنەگەی هەبوو. بە عارەبی بانگم کرد، بە میسری دەرچوو. بە ئارەزوو شتی خۆمان کڕی. ڕۆژێک سەرمان بە موغازەیەکی جلی حازردا کرد، دەستە کۆت و شەلوارێکی پڕ بە بەرم هەلبژارد. کەمال تەرجمانم بوو کە بە ئینگلیسی قسەی دەکرد:

– بە چەند؟

– چوارسەد فرانک.

– گرانە.

– لێرە معاملە کردن نییە.

- ناکرم. ئەگەر بە سەد و پەنجای دەدەن دەمەوێ.

کابرا تەلەفۆنێکی کرد، گوتی باشە هەڵیگرە. کەمال وە تەماح کەوت، ئەویش دەستێکی هەڵبژارد:

- بە چەند؟

- چوارسەد فرانک.

- منیش سەد و پەنجا فرانک دەدەم.

- مسیۆ هیچ کەس نییە تەواو بە قەد و گیپاڵی ڕەفیقەکەت بێ؛ لە ناچاری فرۆشتمان. بەڵام بزانە لێرە سەودا کردن نییە!

کە هاتبووشینەوە بەغدا هەر کەس دەیدیتم دەیگوت: ئای لەو دروونە چاکەی ئەم دەستەی پێ دوراوە!»

ژن و پیاوی فەڕانسیم زۆر بە شیکپۆشی دەدیت. دروونی جل کارێکی گەورە دەکا. باوەڕ کە ژنێکم دیت کۆت و شەڵوارەکەی خامی سپی بوو، بەڵام جوان دروابوو هەر حەزت دەکرد لێی بڕوانی.

دەگەڵ سادق چووینە بازاڕ و گەڕەکی «مۆنمارتر». بە سەدان دوکانی بە حەسیری بوریا و تەنەکە، پڕ لە پیاوی ڕەش و سووری موسڵمان، پڕ لە کتێبی دوعای عارەبی، شاخە مار، شتی جادووگەری و تڕ و تەوێڵەیان دەفرۆشت. بۆ سادق لەوێ لە دوکانێکی جل فرۆش دەستێک کۆت و شەڵوارمان کڕی، کە لە ئێران با، نرخی نەدەهات؛ هەمووی بە سەد و شێست فرانک.

شەوی چاردەی ژوولای چووینە سەیرانی جێژنی ئازادی فەڕانسە. سەیری فەوارە و تۆپ تەقاندن و بەزم و شایی ئەو گەلە سەربڵیندەمان کرد. جۆیس گوتی:

- ژەنەراڵ دیگۆل لە نوتقی جێژنەدا گوتی مەسەلێکی کوردان هەیە دەڵێ: پیاوان قەڵایان دەگرن، کلیلەکە بە ژنانە و لەوان کلیلی قەڵا کردنەوە وەردەگرن...

بیستوحەوت ڕۆژ لە فەڕانسە ماینەوە و بەرەو بەغدا گەڕاینەوە. لەم سەر کە چووبووین، لە فڕگەی قاهیرە پێنج پاکەت چای «لیپتۆن» و چوار بوتڵ ویسکیم بە دیاری بردبوو؛ دەسبەندێکی زێڕیش بۆ جۆیس. لەو سەر چەمەدانم پڕ کردبوو لە جگەرەی «ژیتان» و زۆر گۆرەوی ژنانە و پیاوانە و سۆغاتی جوانکیلە بۆ ماڵەوە.

ئەوەشم لە بیر چوو بڵێم کە «پول» و «ئێدیت» ژن و مێردێکی ڕۆژنامەچی کە چەند جاران لە کوردستان و لە ناو شۆرش دیتبوومان و لە بەغدا دەعوەتم بۆ کردبوون، دەعوەتیان بۆ کردین؛ دوکتور قاسملووشیان میوان بوو. قەرتالەیەکی پڕ لە نانیان لە پەنا دانایین؛ گوتیان کورد زۆر حەز لە نان دەکەن! هەر ئەو پۆلە کتێبێکی زۆر چاکی -بە ناوی «کریس کوچیرا»- لە سەر کورد نووسیوە و کتێبەکە مەشهوورە. ژنەکەشی ئالبوومی زۆر گەورەی پڕ لە عەکسی پێشمەرگەی نیشان داین و یادگاری سەفەرەکانیان بۆ کوردستان.

لە ژنێو دابەزین. بە بن پردکۆکێکدا دەبوو تێپەڕین. منیان ڕاگرت؛ لەشم گەڕان. قوتووە سیغارم پێ بوو. دەزگای پشکنین ئیشارەی دابووە ئاسنم پێیە؛ وەیانزانیبوو چەکم هەڵگرتووە. لە ئیتالیا لە فڕگە سەعاتێک ماینەوە. ڕوانیم لە سەعاتێک نووسرابوو نرخی هەشت هەزار لیرە؛ فیتەیەکم بۆ لێدا. کابرایەکی عیراقی لەو لامەوە گوتی: فیتەی ناوێ، بایی چوار دینارە؛ زۆر هەرزانە!

لە فڕگەی بەینەلمیلەلی قاهیرە دابەزین. هەموو زەوق و خۆشی دیمەنی پاریسیانم لە بیر چۆوە. گارسۆن بە کراسی شۆڕی عارەبی، ڕەش وەک قیل، بۆ قاوەیەک دەبوو لە چوار جێ فیش ئیمزا کەن. کەمال کیفدەستییەکی کڕی بە پێنج دینار؛ من نەمکڕی. کە هاتینە بەغدا نرخی حەڤدە دینار بوو.

ئیحسان شێرزاد و چەند لە هاوکارانمان لە فڕگە چاوەنۆڕمان بوون؛ جگە لە ماڵ و منداڵی خۆشمان. بە دەردی کورد گوتەنی زۆر بە دەستی پڕ هاتبووینەوە و زۆریان کەیف بە بەهرەی سەفەرەکەمان هات و کۆڕی زانیاری قەدرزانی لێ کردین. چووم خەبەری کلیسای عالەمیشم بە بارزانی دا. فەرمووی کارێکی بە فایدەت کردووە و پەیوەندیان دەگەڵ دەگرین. کە بیستمەوە لە بابەت دەرمان و کۆمەکیترەوە زۆریان چاکە کردبوو.

لە بەغداوە هاتوچۆی کوێستان و شۆڕشم زۆر دەکرد. دەمدی کە ئەوانەی دوێنێ هاوسەنگەری پێشمەرگە بوون و ئێستا لە دەوڵەت دامەزراون و پلە و پایەیان دەست کەوتووە، چۆن هەموو شتێکیان لە بیر چۆتەوە و هەر حەولی پووڵ و ماشین و قەسر پەیداکردنی خۆیانن. شیعرێکم بە ناوی «حەللەق-مەللەق» نووسی لە مەجەللەی «هەولێر»دا -کە لە هەولێر دەردەکەوت و کاک محەممەد مەولوود (مەم) سەرپەرستی دەکرد- چاپ کرد. هەر چی وەزیر و ئەستاندار و فەرماندەی هێزی کورد بوون و ملیان لە دزی و پووڵ کۆ کردنەوە و پێشمەرگە لە بیر چوونەوە نابوو، زۆری پێ تووڕە بوون. حیزب لە کۆبوونەوەکانی خۆیاندا، داگیرکەر و عەرەب و ئیستیعماریان لە بیر کردبوو؛ دەرس ئەوە بوو: «دوژمنایەتی هەژار دەگەڵ حیزبمان!». ئەستانداری هەولێر «عەبدولوەهاب ئوتروشی» شکایەتی لای ئیحسان شێرزاد کرد. کاک محەممەد مەولوودیان موعەللەق کرد. پەڕی شیعرەکانیان لە مەجەللەکە دڕاندبوو. پتر لە سەد شکایەتم لە لای مەلامستەفا لێ کرابوو. بارزانی گوتی: ئەوە چت نووسیوە؟ بۆم خوێندەوە؛ گوتی: تۆ ناوی کەست نەبردووە. دیارە هەرچی دزە و حیزە وادەزانن دەگەڵ ئەوانتە... نەقلێکی گێڕاوە کە کابرایەکی مووسڵی کەڵەبابێکی دزیبوو؛ کەس شکی لێ نەکردبوو. سەربەخۆ لە بازاڕدا تووشی هەر کەس دەبوو دەیپرسی: نەقلی کەڵەبابەکە چ بوو؟! گوتی: هێندەتان دزی و فزی کردووە، تاقەتی بیستنی لۆمەیەکی چکۆلەشتان نییە، با ناوی کەسیش نەبرابێ...

ڕۆژێک لە حاجیئۆمەران زۆر لەو پیاوە زلانە لە دیوەخان بوون. «فارس باوە» -کە فەرماندەی هێزی هەولێر بوو- گوتی: کاک هەژار! تۆ جنێویشم پێ بدەی قبووڵمە. بەڵام دیتم یەک لە پێشمەرگەکانی هاوکارم بە ماشینی مارسیدس ڕابرد. کابرایەک لە قاوەخانە پێکەنی، گوتی: ئەوەتا بە مارسیدس بە جێت هێشتم! دەبوایە بیکوژم؛ بەڵام سەرم داخست و بە سەرشۆڕی ڕۆیشتم. گوتم: کاک فارس! بە شەرعی ئیسلام قاپ و قاچاغ و ناڵی ئەسپ لە زێڕ و زیو حەرامە؛ بۆ ئەوە فەقیرە بێبەشەکە زگی بە خۆی نەسووتێ. ئێوە کە شوکور پووڵتان زۆرە، لە بانکی دابنێن! خۆتان لە سەر ئەو پێشمەرگە ئازایانەی -کە هەر ئەوان لە سەنگەردا بوون و ئێوە بەری فیداکاری ئەوانتان خواردووە و ئێستا خۆتان لێ بواردووە و کاری قوڕەکاریشیان دەست ناکەوێ- مەنوێنن و گز و فتیان مەدەن! نەوەک دیسان کارتان بکەوێتە ئەوان و بە دەنگتانەوە نەیەن...

«نافیز» کە کرابووە وەزیری کشتوکاڵ، گوتی: ئەو شیعرەت هەر دەگەڵ من بووە! کە خانووم لە بەغدا دروست کردووە. گوتم: کاکی خۆم! چەند ساڵ پێکەوە ژیاوین؛ هەمیشە پێم گوتووی شیعر بۆیە نابێ تۆ قسەی لێ بکەی. لەو بارەدا زۆر کەودەنی!

حاسڵ بە فەرمانی بارزانی کاک محەممەد مەولوود ڕزگاری هات؛ بەڵام قبووڵی نەکردەوە کە سەرپەرستی مەجەللەی هەولێر بکا.

جارێک بەر لەو هەرا و چەققەیە، مەقالێکم هەر بۆ مەجەللەی هەولێر نووسی بەو مانایە کە: «لە بەر دوکانێکی بەغدا ڕادەبردم، چەقەڵێکی موومیایی کراو لە بنی نووسرابوو نرخی بیستوپێنج دینارە. بە بیرمدا هات کە بێ و نەبێ ئەو چەقەڵە بە زیندوویی شاعیری کورد بووە کە پەنجا چەقەڵی زیندوو قرانێک نایەنێ و بە مردوویی نرخی ئەوەندە بالا دەچێ»! زۆر لە شاعیر و هونەرمەندانی کوردم بە نموونەی ئەو چەقەڵە باس کردبوو.

شیعری «حەللەق- مەللەق»م بۆ «سەعید ناکام» خوێندبۆوە؛ لە بەغدا زۆری تاریف کرد. کە هاتمە ناوپردان و دیتی دوکتور مەحموود و مامۆستایان پێی قەڵسن، هەر خۆی -کە زۆری تاریف کردبوو- گوتی زۆر خراپە و زیانی هەیە و نەدەبوایە شتی وا بڵێی!

هاوینان کۆڕی زانیاری وچانی بوو. بە ماڵ و منداڵەوە دەهاتمەوە کوێستان و لە لای زینوێ و حاجی ئۆمەران دەژیاین. ڕۆژێک سەید عوبەیدیللای ئەییووبیم لێ پەیدا بوو، پازدە ڕۆژێک لام مایەوە. لە ڕێی تورکیاوە هاتبوو. لە سەر داوای ئەو، دەگەڵی چوومە لای بارزانی. بە بارزانی گوت: دەمەوێ بچم لە فەڕانسە بخوێنم. گوتی: هەزار تۆ بە مەکتەب سیاسی بسپێرە کە هەرچی دەیەوێ بۆی بکەن. پێکەوە هاتینە ناوپردان. گوتم سەید عوبێد نانی نەخواردووە. پێشمەرگەیەک هات گوتی: فەرموو نان بخۆ! عوبەید کردیە هاوار:

- بۆ دەمکوژن؟ چمکردووە؟!

زانیم نەوعێ نەخۆشی هەیە. خۆم دەگەڵی چووم تا نانی خوارد و کەس نەیکوشت! کاغەزی لە لایەن بارزانییەوە بۆ دوکتور کامران عالی بەدرخان نووسرا و چوو. ئیتر نەمدیتەوە و نەمزانی چی کردبوو.

ئەحمەدی بارام میرزا لەو ساوە فایق و جەماعەت چووبوونە دیوی ئێران، جیپێکی پەیدا کردبوو؛ ڕانندەگی دەکرد. ئەغڵەب لە ماڵە من دەنوست و دەیخوارد. شەوێک نزیکی بەربەیان سێ سوار لای خێوەتەکەم دابەزین. لە سەید ڕەسووڵی بابی گەورەیان دەپرسی. خەبەرم دانێ کە لە «سەرگەی نێل» دەژی و ڕۆیشتن. ئەحمەد چووبوو خەبەری بە مەسعوود بارزانی دابوو کە هەزار چەک بۆ چەتەکانی ئێرانی دەنێرێ و شەو هاتن و بە بارە چەکەوە بەڕێی کردنەوە! بە ڕوومدا نەدایەوە و هەر لە سەر من دەژیا. تا لەپڕ لە ڕێ گرتیان و بردیانە زیندانی بەغدا و لە پاشان دەگەڵ جاسووسانی گیراوی خۆیان گۆڕیانەوە و دایانەوە بە ئێران و کرا بە ڕانندەی شارەوانی مەهاباد. ئێستەش لە کەرەجە و ڕانندەیی دەکا و هاتوچۆم هەر دەکا.

کاک ئەمیری قازی زۆر جار سەری دەدام و پێکەوە دەژیاین. بە ڕاستی زۆرم کەیف گرتبووی و هیچ عەیبم تێدا نەدیت.

لە کۆڕ مەجەللەیەکمان دامەزراند کە ساڵێ جارێک یان دوو جار دەرچێ. لە ژمارەی یەکەمدا فریا نەکەوتم چی بۆ بنووسم. لە ژمارە دووەدا مەقالێکم نووسی دەربارەی وشەی عەرەبی کە ڕەگەزیان فارسی، یان کوردی، یان زمانیتر بوون. مەقالەکە چل و چەند ڕووپەڕێکی گرت. بوو بە هەرای مامۆستایانی «کۆڕی زانیاری عەرەبی» کە ئەم کوفرە بۆ کراوە. ئیحسان شێرزادی ڕەئیسمان زۆر ترسابوو؛ گلەی لێ کردم کە چاری ئەو کارە چۆن بکەین؟ گوتم حازرم بۆ محاکمە و جوابدانەوە. مەجلسێکی زلیان تەشکیل دا، پیرە زانای عەرەبی زۆر ڕەگەزپەرستی



مێشک وشک کۆ ببوونەوە.

ڕەئیسەکەیان گوتی: تۆ چۆن ئەو هەموو وشە عەرەبیانەی کە لە قورعاندا هاتوون دەڵێی لە فارسی و کوردییەوە وەرگیراون؟ نازانی ئیمامی شافیعی فەرموویە: هەرچی لە قورعاندا هاتووە هەمووی عەرەبی ڕەسەنە و زمانی بێگانەی تێ نەهاتووە؟!

- جەناب! شافیعی بۆ خۆی ئەو فەرمایشتەی کردووە؛ لە لوغەتی بێگانە هیچ خەبەری نەبووە.

هەموو تەفسیرەکان دەڵێن وشەی «مشکوە» عەجەمییە. ئەو جار کە من نزیک حەوسەد کەلیمەیەم پەیدا کردووە، تەنیا ڕوانیومەتە سێ کتێب: «وشەی فارسی بە عارەبی کراو» نووسینی کەشەی ماردین «ئەددای شێر» کە لە ۱۹۰۹دا چاپ کراوە؛ دووهەم: «المعرب للجوالیقی» کە لە چەرخی چوارەمی کۆچی نووسراوە و چەند جار چاپ کراوە؛ سێهەم: «المنجد» کە سەر لە بەرم پشکنیوە. ئێوە هەرچی نووسیومە ئەگەر لەم سێ کتێبەدا نەتاندیتەوە لە سەر منی حیساب کەن. ئەگەرچی بۆ خوم پتر لە هەزار و چوارسەد وشەی عەرەبیم دۆزیوەتەوە کە لە کوردی و فارسی و ئیتالی و حەبەشی و عیبری و ئارامی و فیرعەونی و فەڕانسی و ڕووسی وەرگیراون؛ بەڵام من ئەوانی خۆم نەنووسیوە.

کێشەیان لە بیر چووەوە؛ ئەمجار دەیانگوت چۆن باوەڕ بکەین کە تۆ حەوسەڵەت هەبووە هەموو «المنجد» بخوێنیتەوە؟! بە سەلامەت لە کێشەیان ڕزگارمان بوو.

لە سەر شافیعی شتێکی دیشم لە بیرە: لە خێوەتی شێخ عوبێدیللا چەند مەلایەک میوان بوون. باسی خوتبەی جومعە و تەڵقینی مردوو کرا کە شافیعی دەڵێ دەبێ بە عارەبی بن.

گوتم: شافیعی وەک ئەو بەعسیانە ڕەگەزپەرستێکی عەرەب بووە؛ دەنا لە پێش خوتبەی جومعەدا حەدیسێک دەخوێنرێتەوە کە دوو خوتبە لە جێگای دوو ڕکاتی جەماعەتە. ئەگەر وتاربێژ چووە سەر مینبەر، کەس قسە نەکا؛ گوێ بگرن! کەسێ قسە بکا پڕ و پووچە. کێ پڕوپووچ بڵێ، نوێژی جومعەی بەرناکەوێ. یانی نسحەتتان دەکەن. کابرای کورد یان تورک کە نازانێ باس چییە، گوێ بگرێ و نەگرێ هەر هیچە. کە وا بێ قەت نوێژی جومعەی ئەوانەی عارەبی نازانن بەرنەکەوتووە. تەڵقین بۆ مردوو نییە؛ بۆ ئەو زیندووانەیە کە هاتوون مردوو بنێژن. دڵیان نەرمە و مردنیان لە بیرە؛ نسحەتیان دەکرێ کە ئەگەر پیاوی چاک نەبن پاشەڕۆژیان خراپ دەبێ. کە وا بوو دەبێ بە زمانی خۆیان نسحەتیان بکرێ.

مەلایەکم لێ ڕاست بۆوە: تۆ چۆن بێ ئەدەبی دەگەڵ ئیمامی شافیعی دەکەی؟!

زۆریان خۆیان لێ تووڕە کرد کە قسەی هەژار حیسابییە و ئێمە بیرمان لێ نەکردۆتەوە...

لە کۆڕ نامیلکەیەکم دەربارەی «عەشیرەتی گاوانی کورد» - کە لە زەمانی عەبباسیدا خاوەن ناو بوون و شاری حیلەیان دروست کردووە لە عەرەبییەوە کردە کوردی و چاپ کرا. هەفتەی دوو جار یان سێ جار کۆ دەبووینەوە؛ ئیستلاحاتی عارەبیمان بە کوردی دەدیتەوە. هەر کەسەش دەبوایە ساڵیانە حیسابی بەرهەمی بکرێ بزانین لە ساڵێکدا چی کردووە کە خزمەت بە کۆمەڵ بێ.

دوکتور پاکیزە ڕەفیق حیلمی لەو کەسانە بوو کە هەر دەزانن باسی خەڵک بە نەزان و بێکارە بکەن و گاڵتەی بە هەموومان دەکرد. دوای دوو ساڵ کە لێکیان داوە، قەت تاقە دوو دێڕێکی بەرهەم نەبوو. بۆی نووسرا یان خۆت بکێشەوە یان دەرت دەکەین. ئەو ڕۆیشت. عەبدوڵلا نەقشبەندیش کە مدیری کوللی حیسابات بوو، نەیدەکرا دوو کار بکا؛ کشایەوە. «جەمال بابان»،

«شوکور مستەفا» و «محەممەدی مەلا کەریم» بوونە هاوکارمان. مام هێمنیش لە کۆڕ بەشدار بوو؛ توحفەی موزەفەریەی درایە کە بیخاتە سەر خەتی خۆمانە.

قەرار درا لە ماوەی پێنج ساڵدا فەرهەنگێکی کوردی بە کوردی زۆر تەواو دەرخەین؛ «دوکتور ئاوڕەحمانی مەلا مارف» کە شەش ساڵ لە لینینگراد دەرسی فەرهەنگ ساز کردن فێر ببوو بە سەری ڕابگا. «مەلا عەبدوڵلا حەیباکی» پێی سپێرا فەرهەنگی مەردۆخ بکاتە فیش.

لەو ماوەیە کە لە بەغدا بووم دوکتور قاسملوو، مەلا عەبدوڵلا حەیباکی و حەسەن ڕەستگار و مەلا ڕەسووڵ پێش نمازی و مام هێمنم زۆر دەدی و هاتوچۆمان زۆر بوو. زۆرجار قاسملوو دەهاتە ماڵ «مەعکەرۆنی» بۆ لێ‌دەناین؛ زۆر دەستاوی خۆش بوو. قاسملوو ماوەیەک مامۆستای دانشگا بوو. پاش سەفەری ئورووپای، جارێکی‌تر کە هاتەوە، لە وەزارەتی «تخطیط» (تەرح‌ریزی) دامەزرابوو؛ مانگی سێسەد دیناری وەردەگرت و دەیکردە مخارجی هەواڵانی حیزبی خۆی.

وێ‌کەوتین بیست‌وشەش فەرهەنگی کوردی بە زمانانی غەیرە کوردمان پەیدا کرد. کەوتینە فیش سازدان. گوتیان مەلا خەلیل سولەیمان لە «شێخان»ی پشت مووسڵ، فەرهەنگێکی بادینی نووسیوە و لە سەر یەزیدیەکانیش بە عەرەبی کتێبی هەیە. خەبەرمان بۆ ناردووە، قبووڵی نەکردووە هاوکاریمان دەگەڵ بکا. من ئەو کارەم وەستۆ گرت. لە ڕێگەی هەولێرەوە چوومە مووسڵ. شەو بوو؛ ڕانندە حازر نەبوون بمبەنە شێخان؛ کە شەوانە ڕووت دەکران. گوتم برا من کەس ڕووتم ناکا. دڵم دانەوە و دەگەڵ دوو پۆلیس بردیانمە شێخان. بوومە میوانی فەرماندار کە ناوی «حاجی ڕەسووڵ» و خەڵکی سولەیمانی بوو. ناردم لە دووی مەلا خەلیل. دەمێک بوو دەمناسی؛ شاعیرێکی زۆر پیر و زۆر فەقیر. شەو زۆر خۆشمان ڕابوارد و سبەی مەلاخەلیل بردمیەوە ماڵە خۆی. لە ڕێ باسم کرد کە فەرهەنگەکەت زیراکس دەکەین؛ لە فەرهەنگی گەورەدا سوپاست دەکەین کە لە تۆ بەهرەمان وەرگرتووە. کتێبە عەرەبیەکەی سەر یەزیدیانیشت لەوانەیە بە ناوی تۆ چاپ بکەین؛ هیچ نەبێ نافەوتێ و تۆ کە چەند جار ماڵت سووتێنراوە و کتێبت فەوتاون، ئەوانەت بۆ دەمێنن. باش وایە بمدەیەی بیانبەم. پووڵێکیشت دەدەمێ.

گوتی: دەتوانی سی دینارم بدەیەی؟!

[ئەی مامۆستای بێچارە! پووڵی دەوڵەت نەدرێ بە تۆ، بە کێ بدرێ؟]

- دووسەد دینارت نەغد دەدەمێ؛ کتێبەکانیشت هەر مولکی خۆت بێ.

- هەزار کە وا بێ دەتوانم خانووییک درووس کەم!...

بە فەرماندارم گوت. قەولی دا کە هەم عەرزی بداتێ، هەم کەرستەی خانوو. فەرهەنگ و کتێبەکەم هێناوە کۆڕ.

قەرار درا یادبوودێکی حاجی قادر لە کۆیە بگیرێ. کرامە ڕاسپاردەی کۆڕ و چووم. وتارێکم خوێندەوە، مژدەم دانێ کە کۆڕ قەراری داوە کۆتەڵێکی نیوەلەش بۆ حاجی لە کۆیە دامەزرێنێ و ڕایانسپاردۆتە ئیتالیا؛ بەو زووانە دەگاتێ. بۆ ڕۆژێ دامەزرانی کۆتەڵی حاجی من لە دەستا نەبووم؛ مام هێمن لە لایەن کۆڕەوە چووبوو، شیعرێکی هەرە باشی خوێندبۆوە.

مانگێ سەد دینار بازنشستەگی، بیست‌وپێنج دینار حەقی ئەندامەتی کارا لە کۆڕدا، لە هەر جەلسەیەکی هەفتانەدا سێ دینار هەقی کۆبوونەوەی دوو سەعاتە، سەرەڕای ئەوانەش تەرجەمەی کتێبی دەرسی کوردی -کە یەکێک بووم لە سێ کەسی پشکنی هەرە بالا- فۆرمەی

کتێب شێست دینار دەدرا؛ داهاتم یەکجار زۆر بوو. لە ساڵێکدا لێکم دایەوە پتر لە حەوسەد دینارم هەرماڵیاتی دەرامەد دابوو. زۆر دەوڵەمەند ببووم. زێڕی ژنان و پووڵی نەغدم زۆر بوو. هەموو شت هەرزان. مخاریج کەم و دەرامەد زۆر. بەوپەڕی تەسەلی دەژیام و بە هەموو توانا یارمەتی دۆستانی دەسکورتی خۆم دەکرد. ئەم ئیحترامە زۆرە و داهاتە زیادییە و بەشدار بوونم لە هەموو کاروباری ئەدەبی و تەرجەمەدا، ببوە مایەی حەسوودی و ئێرەیی زۆر کەسی عیراقی کە بە ناو زانا بوون و دەگەڵ منیان دەرنەبرد: «چۆن کوردێکی ئێرانی لە کوردی عیراقی بە برەوتر بێ؟!...». زۆر کەس لە خۆڕا دژایەتیان دەکردم. دوکتور عیزەددین مستەفا هەر لە خۆوە ببوە دوژمنم. تەنانەت خەبەری بە حکوومەت دەدا کە ئێرانییە و دەبێ بیگرن! بەلام لەبەر مەلامستەفا پارێزرابووم.

کاتێ شەرەفنامەم ئامادەی چاپ دەکرد بە دوکتور مارف خەزنەدارم گوت: تۆ شەش ساڵ لە لینینگراد ڕووسیت خوێندووە؛ پێشەکیەکی خانم «یەڤگینا واسیلیڤا» بە ڕووسی لە سەر شەرەفنامەی تەرجەمەی ڕووسی نووسراوە؛ بێزەحمەت بۆم بخوێنەوە تا ئەگەر شتێکی تازەی تێدا بێ نەقلی بکەم.

- باشە، جا ئەوە چییە؟ هەمووت بۆ تەرجەمە دەکەم.

نەهارێک دەعوەتم کرد، هەرچی کردی نەیتوانی دوو دێڕ بخوێنێتەوە.

- دوکتور گیان دیارە بە شەش ساڵ فێری ڕووسی خوێندنەوەش نەبووی!

کەمال مەزهەر بۆی تەرجەمە کردم.

ڕۆژێک «دوکتور کاوس قەفتان» دەعوەتی کاک مەسعوود محەممەد و کەمال و منی کردبوو. گوتی: هەژار! دەزانێ من لە کوردی نووسیندا چەند زەبر بەدەستم.

گوتم: کاکە! تا نەچووبوویە ڕووسیا باش بووی. لەوەتا هاتوویەوە عەسلەن کوردی نازانی و شایەتم ئەو داستانانەیە کە نووسیوتن.

کە لە دەعوەتەکە دەرچووین، کاک مەسعوود محەممەد فەرمووی:

- هەژار تۆ موجامەلە و تەعارف نازانی! نەدەبوو ئەمە بە کاوس قەفتان بڵێی.

- کاکە مەسعوود! من ڕووبینی و موجامەلە بە نیفاق دەزانم. ئەمەش نەزەریەی خۆمە. ڕەنگە پاش پەنجا ساڵێک مەعلووم ببێ کە موجامەلەش هەر نیفاق و دووڕووییە...

ڕۆژێک لە کۆمەڵی دراساتی کوردی بووم. گوێم لێ بوو «ڕەسووڵ هاوار» - کە شاعیرێکە- لە ژوورێکیتر بە مودیری دەگوت: مامۆستا عەبدولا شالی! سەگبابی وامان لێ پەیدا بوون دەڵێن دەبێ کوردی لە شوان و ڕەنجبەری نەخوێندەوار فێر بن! ئەدی چەند ساڵە ئێمە چیمان کردووە؟ چۆن زمانە ئەدەبیەکەمان تەرک بکەین و شوێن وەرزێڕ و گاوانان کەوین؟! کە ئەو جوێنەی دەگەڵ من بوو. هەمیشە من شەڕی ئەوانەم دەکرد کە زمانی پاکی کوردی تێک دەدەن و دانە بە دانە عەرەبی وەردەگێڕن و ئەویش بە ئیشتیبای نەزانی خۆیان... گاڵتەم پێ دەکردن. لە بەر ئەوە زۆریان زۆر ڕقیان لە من دەبۆوە. نەبەزینم لە بەرانبەر ئەو نەزانە خۆ بە زانا ناسانە سەرەنجام کارێکی وای کردبوو کە زۆریان بیر لە حاڵی خۆیان و قسەی من بکەنەوە و ئەگەر چی خراپەیان دەگوتم، بێنە سەر قسەکانم. پێم وایە لەو شەڕ و هەرایانەدا توانیم تا ئەندازەیەکی باش گەشە بە زمانەکە و نووسینی کوردی بدەم.

جارێک لە جەنگەی ئەوەدا کە «عیزەددین» لە هەموو جێ دژی من دەدوا، تووشم هات. زۆر

بە ڕووی خۆش دواندمی، گوتی: مامۆستا! ئەگەر من و تۆ یەک بین و یاریدەی یەکتر بدەین کەسمان پێ ناوێرێ؛ با ببینە دۆست.
گوتم: کاکە گیان! ئەوی هەموو کەس دەیزانێ تۆ تا ڕیشت هاتووە باشیان باس نەکردووی؛ لە پاش ڕیش هاتنیشت دەبینم هەر خەریکی فێڵ و دەستبڕی و دووڕوویيت. بە بیری من دوژمنایەتییەکەت بۆ من لە دۆستایەتی دەگەڵت باشتر بێ. چونکە کەسانێک بزانن کە من و تۆ ڕێگەمان جیایە، تاریفە بۆ ئەخلاقی من...
ڕاستی شتێکی عەجایب بوو: زۆر لەو کوردانەی لە ڕووسیا خوێندبوویان - جگە لە دوکتور کەمال مەزهەر- زۆر نەزان و گێل هاتبوونەوە.
لە ئاخر و ئۆخری پاییزی ساڵی ۱۹۷۳دا لە لایەن کۆڕی زانیاری (ئاکادیمی عیلمی) شۆرەویەوە دەعوەتنامەیەک بۆ کۆڕی زانیاری عارەبی و کوردی هات کە شەش کەس بنێرن. چوار پیرە عارەب لە لایەن کۆڕی زانیاری عەرەبی و کەمال و من لە لایەن کۆڕی زانیاری کوردییەوە دەستنیشان کراین. هەر وەک کە چووبوومە پاریس، چەند دانەیەک شەرەفنامەم برد و پێشکەش بە شوێنەوارە زانستیەکان و پیاوانی وەک «تەوفیق وەهبی» و «ئەدمۆنس» و «مستر مەکنزی»م کردبوو، دوازدە نوسخەم شەرەفنامە دەگەڵ خۆم بۆ شۆرەوی برد. بۆ جاری دووهەم پاش چاردە ساڵ دیسان لە ڕۆژێکی پڕ بەفردا گەییمە مۆسکۆ لە ئوتێل «کۆنتینتاڵ» لە «مەیدانی سوور» -کە ئوتێلێکی قەدیمی و زۆر جوان و بە شان و شکۆ بوو- دابەزین. دیار بوو زۆر میوانی بە قەدرین. هەر کەسە ژوورێکی زۆر ساز و تەیار و جوانمان هەبوو.
جاران کە میوانی نووسەران بووم، ئەم جار میوانی ئاکادیمی علووم بووم. چاکی هێنابوو: عەرەبەکان -کە هەمووی مێشک پووچەڵی ڕەگەزپەرست و دژی کورد و دژی ڕووسیە بوون و زۆربەیان ساڵەها مەعاشخۆری ئینگلیسان و سەفیری زەمانی نووری سەعید و پادشایی بوون- هیچیان کەلیمەیەک ڕووسییان نەدەزانی؛ تەرجومانی هەمووان دوکتور کەمال مەزهەر بوو. هەر قسێکی بێتامیان دەکرد و هەر عەرەبایەتییەکیان دەنواند، کەمال بە ئارەزووی خۆی تەرجومەی دەکرد. وای بە سەر هاتبوو کە عەرەبەکان ببوونە گاڵتەجاڕی زانایانی مۆسکۆ. بە تایبەتی «دوکتور پۆلیڤۆی» کە سەرپەرستی میوانداری ئێمەی پێ سپێرابوو، هەر بە دڵ عەرەبەکانی ناخۆش دەویست و حەزی لە چارەیان نەدەکرد. دوو جار بەبێ ئەوان هەر دەعوەتی بۆ ماڵە خۆی کردین.
سێ جەلسە لە ئاکادێمی شۆرەوی دەگەڵ زانایان کۆبووینەوە، قسە لە پەیوەندی دۆستانەی ئاکادێمی عیلمی عیراق و شۆرەوی دەکرا. لە مەجلیسێکدا زانایەک گوتی: وا دەردەکەوێ کە کوردستان پێش لە هەموو شوێنێکی ڕۆژهەڵات زۆر ئاوەدان بووە. زانایانی ئاسەواری شۆرەوی لە مەڵبەندی «سنجار» شوێنەواری گوندێکیان لە بن عەرز دیوەتەوە کە خانووەکانی بە زنجیر و بە دەورەی مەیدانێکدا دروست کراون؛ کە ئەوە نیشانەیە کورد پەنجا هەزار ساڵ لەوە پێش فکری دیفاعی مونەززەمیان هەبووە و خەڵکی گوند توانیویانە بەرانبەر بە دوژمن، گوندیان وەک قەڵا هەڵخەنەوە و دیارە تەمەددونێکی گەورەیان هەبووە.
گوتم: زۆر بە داخەوە شۆرەوی و زانایانی، هەر بە مردووی پەنجا هەزار ساڵەمانەوە خەریکن؛ بەڵام ئەوانەی ئێستا زیندوون و لە سەر زەوین و قەتڵوعام دەکرێن، هیچ نرخیان بۆ دانەنراوە! بریا نیو ئەوەندە کە بە ئاسەواری کۆنمانەوە خەریکن، بە زیندووەکانمانەوە خەریک بوونایە و لە

مردن ڕزگارتان بکردایه...
شەرەفنامەم بۆ کتێبخانەی لینین و زۆر لە کتێبخانەکانیتر نارد، نوسخەیەکیشم پێشکەش بە ئەنستیتۆی ڕۆژهەلاتناسی کرد کە «غەفووروٚف» ناو بە سەری ڕادەگەیشت.
وەختی میوانیەکەمان تەنیا حەفتەیەک بوو. بردیانینە لینینگراد، دوو شەوماینەوە.
ڕۆژێک میوانی «کەریم ئەییووبی» بووین؛ هەر من و دوکتور کەمال. کەریم زۆر گۆڕابوو؛ سەر و سمێلی بۆز ببوو. ببوە چاکەرەوەی دەزگای دەنگ هەلسەنگ؛ وازی لە زمانشوناسی هێنابوو.
شەو تەلەفۆنم لە خانم «سیدا ڕۆدینکۆ» کرد. ئادرێسی دامێ کە هەر دەبێ بچم میوانی بم. دیتمەوە؛ پیر ببوو؛ چاوی بێحوکم ببوو. دوو کوڕی لاوی هەبوو کە لە مەدرەسەی مووسیقی بوون و کاریان نەدەکرد. مێردی نەمابوو. زۆر مالێکی فەقیری هەبوو. وا دەرکەوت لە ڕووسیاش کەسانێ کە لە کاری زۆر بەجێ دەمێنن لە بیر دەچنەوە. داوای مەم و زینم لێکرد کە خۆی بە چاپی گەیاندووە و بە ڕووسی مانای لێ داوەتەوە. سوێندی خوارد کە هەر تاقە نوسخەیەکی هەیە، گوتم لێت ناستێنم.
لە لینیگرادەوە من و کەمال چووینە یەریوان. عەرەبەکانیش چوونە تاشکەند کە چاویان بە مەلای ئوزبەک و کتێبی عەرەبی بکەوێ و لە باکۆ یەکتر بگرینەوە. زۆر لە کوردەکان بە پیرمانەوە هاتن. شەو «جاسمی جەلیل» بردینیە مالە خۆی کە شاممان بداتێ و شەو بمانهێنێتەوە ئوتێل. دەتوانم بلێم مالی جاسم مالی هونەر بوو: ئوردوخانی کوڕی دوکتورای لە ئەدەبیاتدا هەبوو؛ جاسم بۆ خۆی شاعیر و نومایشنامەنووس بوو؛ جەمیلەی کچی مۆسیقارێک بوو بژاردە؛ دووهەزار ئاهەنگی زۆر ڕەسەنی کوردی خستبووە سەر ئەلفبای نۆت و چاپ کرابوو. ڕادیۆ یەریوان بەو مالە کاری دەگەڕا. شەو جەمیلە بە پیانۆ هەوای هەلپەڕکێی شێخانی لێدا. جاسم و کچ و کوڕی هەستان بڕەقسن، کەمال گوتی من نازانم، من هەستام و تاوێکی باش دەگەلیان ڕەقسیم. من باوم لە کەمال خۆشتر بوو کە کرمانجی ئەوانم دەزانی.
بەیانی ئەو ڕۆژە چووینە ئاکادیمی علوومی ئەرمەنستان. دەگەل «حاجی جەندی» شاعیر -کە زۆر پیر ببوو- بووینە ناسیاو. کوڕە جحێلەیەکی کورد سەرۆکی کاروباری ڕێکخراوی کومۆنیستی لە ئاکادیمی بوو. زۆر بە لامەوە بەقیمەت بوو کە گوتی: سپاردوومە لە ماوەی شەش سالدا تاریخێکی زۆر پان و بەرین و هەموو لایەنەی کورد و کوردستان ساز بدرێ. ئەو پیاوەشم دیتەوە کە باسم کرد لە بۆکان ئەفسەرێکی ڕووسی بە ناوی یاقووب و لە بەغدا باغچەوانی مالی شا بوو! زۆر کەیفمان پێک هات. «عەرەب شامیلۆف»م دیت - نووسەرەکەی کتێبی «شوانی کورد» و «بەربانگ» و «قەلای دمدم»- زۆر پیر ببوو. بە خەیالم وەخت بوو بخەرفێ... گەلێک میدالی گەورەی شۆڕەوی بە سینگەوە بوو. دەگەل جەمیلە عەکسمان گرت، هەروەها دەگەل عەرەب شامیلۆف و جاسم و حاجی جەندی و زۆر کەسیتر.
لە ئاکادیمی کەمال بە ڕووسی و من بە کرمانجی وتارمان دا کە کرمانجیەکەی من کوردێک تەرجەمەی بە هەرمەنی دەکرد. پاش نوێژ بردیانینە سەیری ئاسەواری کۆن. کابرایەکی پیری عەینەک لە چاو خەتی میخی دەخوێندەوە، قەت تۆ فارسی و کوردی وا بە ڕەوانی ناخوێنیەوە! تەرجەمەی بە تورکی پێ دەگوتین. جارێکیان سەرۆکی ئاکادیمی لەوحەیەکی نیشان دام؛ گوتی ئەوە فلان شتە. پیرە لێی مۆڕ بۆوە:
- چووزانی؟ خۆ تۆ نازانی خەتی میخی بخوێنیەوە!

- ئوستاد بە ئەرمەنی نووسرابوو. دەنا من و خەتی میخی تۆ، هەزار گەزمان نێوانە!

کوردێک بانگێشتنی کردین بۆ گوندێکی کوردنشین لە نزیک چیای «ئارارات». ژن و پیاوەکانی جلکیان تەواو وەک یەزیدیەکانی چیای «شەنگال» بوو. لەوێش بە دەهۆڵ و زوڕنا ڕەقسێکمان کرد. نانێکی ئێوارەیان داینێ.

چووینە نیشانگەیەک کە بە یادی ئەو دوازدە عەشیرەتە ئەرمەنیانەوە چەقاوە کە تورکان قەتلوعامیان کردوون. نیشانگەیەکیش لە نزیک چیای ئارارات هەبوو، نووسرابوو: «بە یادگاری برایەتی کورد و ئەرمەنی کە لێرە بە گژ تورکاندا چوونەوە و نیشتمانی خۆیان برایانە پاراستووە».

لاوە کوردێکم تاق کردەوە کە حەز دەکەم بەبێ درۆ و دووڕوویی وەزعی کورد لە ئەرمەنستان چۆنە بۆم باس بکەی. گوتی: ڕاست ئەوەیە میللەتی ئەرمەنی زۆر دەگەڵ کورد چاکن. جگە لە حقووقی قەومی، ئەوەندەی شۆڕەوی قەراری داوە، ئەرمەنی پتر لەگەڵمان بە چاکە دەبزووونەوە. ئەگەر دە کەس لە یەک ڕادەی خوێندەواری و بە یەک جۆر کارنامەوە داوای کارێکی دەوڵەتی بکەن، یەکیان لەو دەیانە کورد بێ، لێت ڕوون بێ کوردەکە قبووڵ دەکەن، چونکە سەر بە میللەتی کەمینە و ئەقەللیەتە. حورمەتمان زیاد لەوە دەگرن کە چاوەنۆڕین.

من قسەم کرد، گوتم: سەیرە بانێک و دوو هەوا هەبێ: کورد لە گورجستان حەقی نییە لە پاش کلاسی حەوت -کە ئیجبارییە- بچێتە مەدرەسە و بگاتە خوێندنی باڵا. ناچار ئەوی بیەوێ بخوێنێ، دەبێ هەڵێ بۆ مۆسکۆ یان لینینگراد. کوردی ئازربایجان زمانی خۆیان لە بیر براوەتەوە و هەموو بوونە تورک! کەچی لە ئەرمەنستان هەم دەرس بە کوردی هەیە، هەم ڕادیۆ و ڕۆژنامە. جل و زمانی کوردیش ئازادی ئازادە. من وادەزانم ئەوە نەجیبایەتی ئەرمەنیانە، نە قانوونی شۆڕەوی؛ دەنا چۆن دەبوو بەرانبەر بە کورد فەرقی گورجستان و ئازربایجان و ئەرمەنستان هەبێ؛ لە حاڵێکدا کە کوردی گورجستان دوو ئەوەندەی کوردی ئەرمەنستانن! کەمال گوتی ناوێرم ئەو قسە تەرجەمە بکەم، لاوێکی کورد گوتی: «تۆ بە کرمانجی بڵێ تا ئێستا تەرجەمەی کەم!». کە تەرجەمەی کرد کابرای ئازربایجانی هەستا دەستی خستە دەستم، گوتی: لێم ڕوونە تۆ ڕاست دەکەی و ئەرمەنی زۆر لە ئێمە ئینسانیترن و کەیفیشم بەو غیرەتیەت دێ کە ڕووبەڕووی من ئەمەت گوت...

ها، بەیانی ڕۆژی دووەم چووینە سەیری کتێبخانەی گەورەی «یەریوان». زۆر گەڕاین. خاوەن و سەرپەرستی کتێبخانە گوتی: هەر چەند تەبەقەی ژێروو بۆ میوانان مەمنووعە ببینن، بەڵام من دەتانبەمە ئەوێش. بە چەند پلەکانێکدا چووینە ژێرزەمین؛ هەمووی کتێبی خەتی بوو. ئینجیلێکی نیشان داین گوتی ئەوە کوردییە و هەشت سەد و پەنجاساڵی عومرە. دوو کتێب لە ناو شووشەدا بوون، یەکیان زۆر پەڕگەورە، یەکیان زۆر پچووک و خرپن. گوتی ئەوانە هەردووک ئینجیلن لە پێستی ئاسک نووسراون. پێشوو بیستبووم کە ئاوێستا لە پێستی ئاسک نووسرابوو؛ بەڵام لام وا بوو لە دیوی ژووری پێستەکەوە نووسراوە و بە کولکەوە هەڵگیراوە. گوتم: دەتوانم دەستی لێدەم؟

- نا، مەمنووعە.

- کوڕە دەستی لێ نەدەم لێم دەبێتە مەراق و خەوم لێ ناکەوێ!

مودیر پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و خوێنشیرین بوو. چوو کلیلێکی هێنا و نووسراوی سەر پێستە ئاسکی دەرێنان. دەستم لێ دا؛ چاکترین کاغەزی تورمەی قەدیم چۆن بوو، ئاوا ساف؛ بەڵام بێ

بریقه و نەرم. تازە تێگەیشتم نووسین لە پێستی ئاسک یانی چی. شەرەفنامەیەکی نیشان داین بە جوانترین خەت نووسرابوو؛ دەورەی زێرکفت و نەقاشی کرابوو. چل ساڵ دوای هەوەڵین شەرەفنامە نووسرابۆوە کە دەیگوت لە قیمەت نایە. ژمارەیەکی پێ یادداشت کردم کە بەو ژمارەیە تاریخی جووڵانەوەی شێخ عوبێدیلای نەهری لە «کتێبخانەی قودسی ڕەزەوی» لە مەشهەد هەیە؛ نە میکرۆفیلم، نە نوسخەمان دەدەنێ. بەڵکو تۆ لە عیراقەوە پەیدای کەی. کە هەم ژمارەم ون کرد، هەم نازانم هەیە یان نا؟!

کاتێ دەچووینە گوندی کوردەکان و سەیری نیشانە یادگاریەکەمان دەکرد، ئالای تورکان لە دامێنی ئاراراتەوە دیار بوو. هیچم بۆ نەمابوو، دوو جنێوی سەر بە کولکەم بە جسن و ڕەگەزی تورک دا!

زۆریان دیاری دامێ کە لە گشتیان عەزیزتر دوو تابلۆی بەرجەستە بوو، دیمەنی هەردووک چیای ئاراراتی پڕ لە بەفری دەنواند.

ئێوارەوەختە، لە یەریوانەوە چووینە باکۆ. شەو گەیشتین و عەرەبەکانیش هاتبوون. «دوکتور قادری ئاسۆ» و ماڵ و منداڵەکانی و ژنی عەلی گەلاوێژ زوو زانیبوویان و هاتنە بەخێرهێنانم.

لە بیرم چوو بڵێم: هەر کە گەیشتینە مۆسکۆ، کۆنە دەفتەرێکی چاردە ساڵ لەوە پێشم بردبوو، ئادرێسی فەتحی خوشکنابی تێدابوو. تەلەفۆنمان کرد، ژنێک جوابی داوە کە زۆر ساڵە لێرە نەماوە، بەڵام ئادرێسی تازەیان ئەو ژمارە تەلەفۆنەیە. تەلەفۆنم لێ کرد:

- فەتحی دەمناسی؟
- چۆنت بناسم؟ تۆ کێی؟
- فکر بکەوە!
- بە خوا هەژارێکم دەناسی بەڵام نازانم لە کوێ گۆڕی گوم بووە! دەنگت تۆزێک لەو دەکا!
- وەرە لە فلان ئوتێلم. ئەمما ئەگەر هاتی چۆنت بناسمەوە؟
- وەک جاران درێژم! ڕیشم سپی بووە؛ کلاوێکی قووچی بۆرم بە سەرەوەیە.

هات و بە پەلە بردمیەوە ماڵە خۆی. ژنی ئازەربایجانی نەمابوو؛ ژنی ڕووسی هێنابوو. لە ئەنستیتۆی ڕۆژهەلاتناسی لە بەشی تاریخ دامەزرابوو. خانووی لە مۆسکۆ درابوویە و زۆر ساز بوو. گوتی ئیسماعیل کە لە تەرویز هەواڵمان بووە لە باکۆیە؛ با تەلەفۆنی بۆ بکەم. لێی پرسی: سمایل چۆنی؟ چ دەکەی؟ گوتی: هەژارم وە بیر هاتۆتەوە؛ دەگریم و حاڵم نییە! زۆر ڕێکەوتێکی سەیر بوو. گوتی: ئەمڕۆ هەژار هاتۆتە ماڵە من؛ ها قسەی دەگەڵ بکە!

جا ئەو شەوە هەر گەییمە باکۆ، تەواو لە ئوتێل توریست نەحەسابوومەوە، ئیسماعیل هات:

- با بڕۆین بۆ ماڵی ئێمە.

ڕەحیم قازی تەلەفۆنی کرد و بڕێک کۆخی:

- هەژار من نەخۆشم؛ نەمتوانی بێم. تۆ وەرە و دایکیشم لێرەیە!
- ڕەحیم من ژن ناهێنم! دایکت بدە بە یەکی تر!

دەگەڵ سمایل چووینە ماڵی ڕەحیم. نەیهێشت بەند بم؛ بردمیە ماڵە خۆی. کیژێکی بە ناوی «فەرزانە»ی هەبوو؛ مۆسیقای زۆر خۆشی بۆ لێداین.

بە داخەوە بیستمەوە کە سمایل جوانەمەرگ بووە! ئازەربایجانییەکی خەڵکی سەلماس بوو.

بیستمەوە کە پرۆفسۆر «جەعفەر خەندان» مردووە.



بەیانی بە ناو شاری باکۆیاندا گێڕاین. شەو میوانی سەرۆکی ئاکادێمی ئازربایجان بووین، عەلی گەلاویژم لەوێ دیتەوە. گوتی قەرارە بە وادەی چوار ساڵ تاریخی ئابووری ئازەربایجان بنووسمەوە. بۆ یەکەمجار میوەی «خورمالوو»م دیت؛ گوتم تا لە بەر چاوم نەیخۆن ناخۆم!

ڕەئیسی عەرەبەکان ملی لەوە نابوو کە خانووەکەی ڕەئیسی ئاکادێمی ناخۆشە! حقووقتان چەندە؟ ئێمە لە عیراق زۆر خۆشتر دەژین! کە لەو جێگەیەدا ئەو قسانە زۆر ئەحمەقانە بوو؛ پیاو شەرمی دەکرد. لە خواحافیزیدا من گوتم: سوپاس بۆ خانمی خانەخوێ کە ئەو چێشتە خۆشانەی لێناوە و زەحمەتی ئەو توانی وامان بەخێو کا.

خانم گوتی: دە ناو هەمواندا تەنیا ئەو پیاوە دەزانێ دەڵێ چی. مانای هەیە من هەر لە بەیانییەوە زەحمەت بکێشم، بە پیاوان بڵێن مەمنوون؟!

لە بەیانیەکی زۆر ساردی شەوی دووهەمدا هاتینەوە مۆسکۆ. دوکتور کەمال عەریزەیەکی دابوو کە چەند ڕۆژێک دەیەوێ متالا بکا و چەند ئەسنادێک ڕوونووس بکا. قبووڵ کرا کە کەمال و من بیست ڕۆژیتر لە مۆسکۆ بمێنینەوە و میوان بین. ئەو ڕۆژە چووینە بازار و بردیانینە دیدەنی «مۆزلە» (ئارامگای لینین). مامۆستا سەعید جەمیلێکی پیرمان دەگەڵ بوو هەر دەیگوت: ئەو کافرە خودانەناسە ڕووسانە!... ڕاوەستابووین؛ بەفر دەباری؛ تا نۆرەمان دێ بچینە سەر قەبری لینین. چوومە تەنیشتی گوتم: ئوستاد خودا زیارەتت قبووڵ بکا و نیازت پێک بێنێ!

عەرەب ڕۆینەوە و دەگەڵ کەمال ماینەوە و چووینە ئوتێلێکیتر. دەگەڵ فەتحی دەگەڕام، دەچوومە ماڵی، شەوانە دەچووینە ڕستووران پێکەوە.

ڕۆژێک دەگەڵ کەمال چووینە دیدەنی «غەفووروۆف». شەرەفنامەکەی لە پێش بوو؛ زۆری ئافەریم لێ کردم. گوتی: هەژار بە قسەم بکە وەرە مۆسکۆ! خانووت بۆ وەردەگرم. لەم ئەنستیتۆیە کارمان بۆ تۆ زۆر دەبێ. نەخوازە کە زانیومە عەرەبی و فارسی و کوردی چاک دەزانی. منداڵت زۆر باش دەخوێنن؛ خۆشت زۆر خۆش بەڕێ دەچی. هەر ئێستا با خەبەر بنێرم ماڵ و منداڵەکەت بێنە مۆسکۆ. تۆ مەچۆوە!

گوتم: زۆر سوپاست دەکەم؛ بەڵام تا مەلا مستەفا منی بوێ، لێی دوور ناکەومەوە. ئەگەر پێم بڵێ، دێم و پێم خۆشە.

کەمال ڕۆیشت بۆ ساڵۆنی کتێب خوێندنەوە. غەفووروۆف فارسی زمان بوو؛ تاجیک بوو. جگە لە سەرۆکایەتی ئەم ئەنستیتۆیە، لە مەکتەبی سیاسی حزبی کومۆنیستی شۆرەوی ئەندامێکی بالا بوو. لەوانە بوو کە لە کرملین دەژین. کورسیەکی هێنا پێش و گوتی: هەژار! من زۆر دۆستی بارزانیم. لە مەکتەبی سیاسی حیزبدا دۆستی هەن؛ بەڵام هەشن کە ناخۆشیان دەوێ. ئێستا قازانجی شۆرەوی لەوەدایە کە هیچ کێشە لە عیراقدا نەبێ. جا کە عیراق داوای کردووە جەبهەیەکی یەکگرتوو لە نێوان حیزبی بەعس، حیزبی شیووعی و حیزبی پارتی بارزانیدا پێک بێت، بە مەسلەحەتی سیاسەتی بالای شۆرەوییە. لە زمان منەوە بە بارزانی بڵێ خۆنەگرێ و بچێتە ئەو جەبهەوە.

گوتم: جەناب! دەزانم شۆرەوی و هەموو دەوڵەتێک دەڕوانێتە قازانجی خۆی. لێشم ڕوونە ئێوە بەعسی دەناسن کە چەند خوێنڕێژ و دوور لە هەموو پەیمان و قانوونێکن. بەڵێ حیزبی شیووعی لە پاش ئەو قەتلوعامەی بەعسی لێیان کرد، بە ئەمری ئێوە چوونەتەوە بەردەستی بەعس و ئێستا بە گژ ئێمەدا دێن کە ئەگەر نەیەنە جەبهەوە و شەڕ هەڵگیرسێتەوە، یارمەتی

دەوڵەتی بەعسی دەکەین. خەت و شوێنێکی بەعسی بۆ ئەو جەبهەیان کێشاوە، ئاشکرا هەرچی حقووقی میللی ئێمەیە و هەرچی داوای حیزبی کومۆنیستە دەماڵێتەوە. دەبێ نۆکەری ئالقەبەگوێی بەعس بین. پازدە ساڵە شەڕ و لێکدانمانە؛ هەزاران لاوی کورد لەم ڕێگەدا خوێنی ڕژاوە؛ بە هەزاران ماڵ سووتێنراوە و وێران بووە. چۆن باوەڕ بکەم بارزانی بێ وەرگرتنی هیچ حەقێک دەست لە سەر دەست دانێ؟ چی جوابی گەلە لێقەوماوەکەی بداتەوە؟ ئایا شۆڕەوی دەستەبەر دەبێ کە بەعسی خودموختاریمان بێ کەم و زیاد بدەنێ و پەیمانێکی داویانە پێکی بێنن؟ کوا ئەو شەرتە شۆڕەوی دەیگرێتە ئەستۆ؟ ئەگەر هەر مەسلەحەتی شۆڕەویە و ناتانکرێ هەقمان بۆ بچەسپێنن، مانای وایە ئێمە پاش دوازدە ساڵ گەڕاینەوە سەر خەتی هەوەڵێ و ئەوجار بەعسی تۆڵەی ئەو چەند ساڵەشمان لێ دەکەنەوە.

غەفوورۆف گوتی: من خۆم باوەڕ ناکەم بەعسی پەیمان بەرنە سەر. باوەڕ ناکەم جەبهە بە تەواوی نەگرنە دەست خۆیان. تەنانەت باوەڕم نییە کە شیووعیەکانیش لە دەست بەعس ئاسوودە بن. شۆڕەوی بشلێ، ناتوانێ عەرەبان ناچار بکا پەیمانیان کە بە کورد داوە پێکی بێنن. بەلام دەلێم زۆر لە سیاسەتمەدارانی شۆڕەوی دەیانەوێ عیراق هیچ کێشە و سەرێشەی تێدا نەبێ. ئەگەر بارزانی ئەمەش قبوول بکا دیارە زیانیەتی؛ بەلام مومکینە فرسەتێکی‌تر هەڵکەوێ.

گوتم: باشە هەموو شتێکی پێ دەلێم، ئەویش کەیفی خۆیەتی.

شەوێک میوانی «پرۆفسۆر بەکاییف» بووین کە کوردێکی ئەرمەنستانییە و مامۆستایە لە دانشگای زمانەکانی ڕۆژهەلات. بەر لە شام، پرۆفسۆر «قەناتی کوردیف» هات؛ کە هاتبووە مۆسکۆ فەرهەنگی ڕووسی-کوردی چاپ بکا. دەردی دل لە حالی پەرێشانی کورد دەکرا.

بەکاییف گوتی:

- کچی «گیو موکریان» بە ناوی «کوردستان» هاتووە کە لە سەر زمانی کوردی تەحقیق بکا و بخوێنێ. پێم خۆش بوو کە بە منیان سپارد.

- کچم لە کام زاراوەی کوردیدا دەتەوێ تەحقیق بکەی و دوکتورا بستێنی؟

- لە زمانی مامم: حوسێن حوزنیدا!

چونکە نەمزانیبوو حوسێن حوزنی زمانێکی سەربەخۆی هەبووە، خۆم لە دەرس پێگوتنی کێشایەوە!

گوتم: زۆر لەوانەی لە ڕووسیا دەرچوون و هاتوونەوە عیراق، ناویان دوکتورە و هیچ نازانن!

بەکاییف گوتی: هەموو گوناهی ئەم قەناتی کوردیفەیە!

کوردیف تووڕە بوو:

- من بۆچی؟

- چەند جارم پێگوتی یەکی وەک نەسرین فەخری، مارف خەزنەدار و کاوس قەفتان بە هاسانی و بە ناوی تەعەسسوبی کوردایەتی کارنامەیان مەدەیە؟ ئەوانە دەچنەوە لە کوردستان دەبنە مامۆستا، مێشکی هەزاران کوڕ و کچی کورد تێک دەدەن! هەر گوتت: ئاخر کوردن؛ چۆن دەریان نەچوێنم؟!

قەناتی کوردیف خەریک بوو شام نەخوا و بڕوا. بە زۆر دامانناوە و ئاشتمان کردەوە؛ بەلام گوتمان حەق بە بەکاییفە.

ڕۆژێک چووینە دانشگای زمانانی ڕۆژهەلات؛ بەزم بوو: یەک عەرەبی، دوو فارسی، یەک

ئوردوو، سێ پشتوو، زمانی سەیر سەیر دەرس دەخوێنرا. تووشـی دوکتـورێکی تاجیـک بـووین. ناوەکەم لە بیر نەماوە، مامۆستای دەرسی کوردی و تەحقیقات لە دەوری مەسەلەی کورد بوو.

توانیمان بە هۆی دکتور «پولیڤۆی» بلیتی باڵشۆی تیئاتر پەیدا کەین. «ئۆپرای کـارمن» بـوو. لە دوکتور پولیڤۆیم پرسی: تۆ لەگەڵ ئەو پولیڤۆیەی پاڵەوانی داستانی «پیاوێکی بە ڕاستی» کـە فڕۆکەوانێک بووە و لە پاش لاق پەڕین دووبارە بۆتەوە فڕۆکەوان لە شەڕی ئەڵمانان، خزمی؟

گوتی: نا، هەر ناومان وێک دەچێ.

ئەو دکتورە ژنەکەی تەتار بوو. کوڕێکی هەبوو لە تەمەنی پازدە ساڵ، دەیگـوت لـە مەدرەسـە زۆر هار و هاژە؛ مامۆستایان شکایەتی ئەوم لێ دەکەن و هەموو جاریش دەنووسن نەکـەی دڵـی بڕەنجێنی.

- یانی چی؟

- دەڵێن ڕیازیاتی زۆر بەهێزە و لەوانەیە ببێتە زانایەکی ئەتۆمی!

ئەمجارەش نزیک مانگێک لە ڕووسیا مامەوە. ڕۆژێک کە دەهاتین بڕۆین فەتحی گریا.

- ئەوە چییە؟

- لە تەورێز لێک جوێ بووینەوە، پاش چاردە ساڵ یەکترمان دیتەوە. چوویەوە عـیراق، پـاش چاردە ساڵ دیسان دیتمیەوە؛ چاردە ساڵی ئایندە ناژیم بتبینمەوە...

ڕایسپاردم کە لە بەغداوە «المنجد» و «نهج‌البلاغه»ی بۆ بنێرم؛ بۆم نارد. بەڵام بیستمەوە کـە لە ئینقیلابی ئیسلامیدا ناردرابووە تـەورێز کـە فیرقـە زینـدوو کاتـەوە و نەشـرەی ئازەربایجـانی بنووسێ. چووبوو قزلجی لە تاران دیتبوو؛ گوتبووی هـیچم بـۆ نـەکراوە و کـەس ئامـادە نـەبووە هاوکاریم بکا؛ دەچمە فەڕانسا و لەوێوە دەچمەوە مۆسکۆ. سـەلامی بـۆ نـاردبووم؛ خـۆی نـەهات بیبینمەوە. ئەم بەینە کە پێکەوە بووین بۆی گێڕامەوە کە ماوەی شەش مانگ دەگەڵ قزلجی لە بولغاریا ژیاوە و زۆری قسەی قۆڕی نێوان خۆیان بۆ دەگێڕامەوە.

حەیفە ئەمەشم لە بیر بچێ: ڕۆژێک لە ئوتێل «کۆنتیننتاڵ» - کـە تـازە چووبـووین- ژنێکـی خزمەتکاری ئوتێل سەری بە ژووردا کـرد. کـەمال گـوتی فـەرموو شـتێک بخـۆوە! بـە دەسـت ئیشارەی کرد کە بێدەنگ بە! دوایە لە دەرەوە پێی گوتبوو کەمترین قسە بکـەن میکرۆفـۆن لـە ژوورەکەتاندا هەیە زەبتی دەکا. کە چووینە ئوتێلەکەی‌تر، ئەو ژنە دەگەڵ یـەکێکی‌ترا هاتبوونـە دیدەنیمان. باسی خۆی کرد کە مێردی موهەندیسی کارخانە بووە؛ لە جەنگەی کاردا بەر ماشین کەوتووە و مردووە. دوو منداڵی لە پاش بە جێ ماوە. حقووقی مێردەکەی و حـەقی خـۆی -کـە ڕۆژێ هەشت سەعات یان بە شـەو، یـان بـە بـە ڕۆژ لـە ئوتێـل مانـدوو دەبـێ- تێـری خـۆی و منداڵەکانی ناکا و حاڵی زۆر ناخۆشە. دوکتور کەمال باسی فەرمایشتی مارکس و لێنینی بۆ دەکا کە خەم مەخۆ! سوسیالیستی دەبێتە کومۆنیستی و هەموو کەسێ حاڵـی خـۆش دەبـێ. ژن لـە دین دەرچوو؛ لە داخان گریا: من دەڵێم من و منداڵم تێر ناخۆین، ئەو دەڵێ بە قـسەی مـارکس حاڵت خۆش دەبێ!

ڕۆژێک دەگەڵ کەمال لە ئوتێل دەرچووین؛ ڕاستی پێمان وا بوو تەزاهوراتە -کە لـە شـۆڕەوی قەت ڕوو نادا. کەمال گوتی با ڕاکەینەوە ئوتێل، گوتم هەر دەچم بزانم چییە. دەرم بە خەڵـک دا: قەرتاڵەیەک پرتەقاڵی چکۆڵەی شین بوو؛ ئـەو خەڵـکە دەیانەویـست بیگـەنێ و سـەرو یـەکێک بکرن کە وەبەر بیست یەکیان نەدەکەوت!

دەگەڵ کەمال قەدەممان لێدەدا. چاوم بە کووچەیەکی تەنگی بن‌بەست کەوت؛ لە دەرگای کووچە نووسرابوو: «سەلام عادل». گوتم: «وەرە هەر بڵێ قەدری شیووعی عەرەب ناگیرێ! ئەگەر کوژران ئاوا لە مۆسکۆ ناوتان لە سەر کۆلانان دەنووسن!».

لە مۆسکۆڕا ڕاست هاتینەوە فڕگەی بەینەلمیلەلی ئەستەمبول؛ کە سەودا هەر بە دۆلارە. زۆرمان شت کڕی بۆ دیاری. چوومە دوکانێک داوای جغارەم کرد، کابرا گوتی: دەخیلە تۆ بچۆ پاکەتێک چای لیپتۆنم بۆ بکڕە. هەر جغارەیەکت بوێ دەتدەمێ و زیادت لێ ناستێنم. پاکەتە چام بۆ کڕی و لە بن دوکانەکەی شاردیەوە و چەند گلۆسێک جغارەی خارجیم لێ کڕی.

لە تەیارەی بەرەو عیراقدا زۆرمان ویسکی و ودکا کڕی کە بە دینارێک بوو؛ لە بەغدا بە پێنج دینار. چەمەدانەکانمان پڕ کرد. لە دوو بوتڵ پتر مەمنووع بوو. گوتمان ئەگەر لێیان ساندین ئەوە چش؛ ڕیسکی خۆمان دەکەین. شەو دەوری سەعات یەکی پاش نیوەشەو گەیینە فڕگەی بەغدا. کەمال لە پێشدا چوو تەفتیش بکرێ. ئەفسەرە بەعسییەکە گوتی: کوا پێناست؟ دیتی، گوتی: کوردن؟

- بەڵێ!

ئەویش کوردێک بوو، گوتی بڕۆنە دەر!

ئیحسان شێرزاد چاوەنۆڕمان بوو. ئێمە پێدەکەنین؛ گوتی: دڵتان خۆشە، دیارە لە ڕووسیا باش هاتوونەوە.

- بەڵێ باش هاتووینەوە. بەڵام پێکەنینەکەمان بەو دوو چەمەدانە پڕ لە مەشرووبەیە کە نەیانپشکنین!

لە سایەی سواڵ کردنی ئێمەوە، یەکجار زۆر کتێبی زۆر باشمان بۆ کۆڕ پەیدا کردبوو. «حاجی جەندی» و «قەنات» بوونە ئەندامی فەخری کۆڕی زانیاری. زۆر زوو چوومە کوردستان و پەیامی غەفوورۆفم بە بارزانی گەیاند. گوتی: ڕووس لە پەیمان بەستن دەگەڵ بەعسدا کە خودموختاریمان بدەنێ، خۆیان زۆریان حەول دا، کەچی ئێستە دەیانەوێ بێ هیچ حەقێک خۆمان تەسلیمی ئەوان بکەین! مردن سەد جار لەوە بەشەرەفترە کە پاش ئەو هەموو خوێنڕژانە، سەر بۆ دوژمن شۆڕ کەم و شەرمەزاری گەلم بم. ئەگەر مەسلەحەتی شۆڕەوی لەو تەسلیم بوونە دایە، مەسلەحەتی کوردی تێدا نییە...

لە پاش ئیعلانی خودموختاری، برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی و عومەر دەبابە و هەموو دەستە و بەستەیان هاتنەوە لای بارزانی و عەفووی کردن و لە چیا دەگەڵ خۆمان دەژیان؛ وەک قەت نێوانمان ناخۆش نەبووبێ. حاجی محەممەدی شێخ ڕەشید - کە دوژمنی هەرە سەرسەخت بوو- خۆی سەربەخۆ هات بۆ دیدەنی مەلامستەفا و دەخالەتی پێکرد. مالم هەقە مەلامستەفاش زۆری حورمەت گرت. جارێک بەغدا خەبەری بۆ حاجی محەممەد ناردبوو کە بچێتە بەغدا. لە وەرامی تیلگرافدا گوتبووی: من لەو ڕۆوە نۆکەری بارزانیم و هەر گەورەیەکم هەیە، تا ئەو نەمنێرێت من حکوومەت ناناسم!

بەعسی کە پەیمانی پازدە ساڵەیان دەگەڵ ڕووس بەستبوو، شیووعیەکانیشیان بردبوۆوە لای خۆیان و چاوی هەموو خوێندەوار و بە کاری کوردیشی بە پوول و پلە نووقاندبوو، دەیزانی زەحمەتە ئەم شۆڕشە دووبارە وەک جاران زیندوو بێتەوە؛ لێمان کەوتە گەندەڵ- فێڵان! هات‌وچۆکەر دەهاتن و لە لایەن دەوڵەتەوە گفتوگۆیان دەگەڵ بارزانی دەکرد و هەر خەریک

بوون لە ناوی بەرن.

ڕۆژێ بیستونۆی مانگی نۆی ۱۹۷۱، یازدە مەلا لە نەجەف و بەغداوە هاتبوون کە چاویان بە بارزانی بکەوێ لە حاجی ئۆمەران. پێشتریش زۆر دەستە لە بەغداوە دەهاتن. مەلاکانم لە قاوەخانەی حاجی ئۆمەران دیت؛ سالح مەحموودیان دەگەڵ بوو. گوتی تۆش وەرە دیوەخان بزانە ئەو مەلایانە دەڵێن چی. گوتم من حەز لە چارەی مەلایان ناکەم. چووم لە مالی عەلیە کوردە خەوتم. لە خەوەکەم بە دەنگی تفەنگان ڕاپەڕیم. دیتم لە دەوری مالی مەلامستەفا تەقەیەکی زۆر غالبە؛ ڕامکرد. کابرایەکم دیت هەڵدێت. هەرام کرد: مەهێڵن کەس لە دێ دەرچێ!

«سولەیمانی حاجیبەدری» سەردەستەی حەرەسەکانی بارزانی بوو؛ گوتی کۆلانان بگرن! گەییمە ناوەندی تەقەکە. گوتیان بۆمبایان لە مەلامستەفا تەقاندووە. دەگەڵ ئەوەشدا کە لە تاوان وەخت بوو شێت بم، هەرام کرد:

– پیاوی چا بن مەیانکوژن! بە ساغی بیانگرن! خەبەریان لێ وەردەگرین.

کەس گوێی بە من نەدا. من هەر ئەو هاوارەم دەکرد و بە ناو تفەنگچییەکاندا دەسووڕامەوە. لەپڕ بۆمبایەک کە لە بن ماشینێکی تۆیۆتاوە قایم کرابوو تەقی. پتر لە دوو میتر لە جێی خۆم پەریم؛ بەلام نەکەوتم. ڕانندەی تۆیۆتا -کە ئەفسەرێکی بەعسی و بە جلی ڕانندەییەوە دەگەڵ مەلایان هاتبوو- لە بن تۆیۆتاکەوە تەقاندبووی؛ خۆشی کوژرابوو. مەلامستەفا و دوکتور مەحموود لە ژوور هاتنە دەر. بارزانی سەروچاوی خوێناوی بوو؛ زۆر شاد بووین کە نەکوژراوە. ئەویش بە سولەیمانی حاجی بەدری گوت: مەیانکوژن! سولەیمان -کە بە جارێک شلەژابوو- لە بارزانی تووڕە بوو؛ گوتی: بڕۆ ئەوە کاری تۆ نییە! بارزانی گوتی: وا تووڕەیە لەوانەیە منیش بکوژێ! ڕۆیشت. زۆر زوو تەقە وەستا. هێندێک لە مەلاکان کە پەنایان بە ئاودەست و ژووریتر بردبوو کوژران و کەلاکیان ڕاکێشان. هەوەڵ کەس من چوومە ژووری دانیشتنەکەوە. یەک لە مەلاکان لە سەر کورسیەک دەستی وەبەر چەنەی دابوو؛ دانیشتبوو. وامزانی زیندووە. کە بۆی چووم، پارچەی بۆمبا وە بن هەنگلی کەوتبوو؛ هەر لە جێ مردبوو. ڕامکێشا سەر عەرز. کەلاکەکانیتریشیان هێنایە ئەو ژوورە. ئاگر بەر ببوە ژووری نوێنان؛ پیاو لە دووکەڵ دەخنکا. دەگەڵ عەلیە کوردە خۆمان دە ژووری ئاگر ڕاکرد و توانیمان بیکوژێنینەوە و لەبەر دووکەڵ و کۆخە چاومان سوور و هەڵمساو بوو. منیان کردە مەعمووری پشکنینی کەلاکان. گیرفانم بەتاڵ کردن. یادداشت و نووسراوەکانیان و سەعات و پووڵیان کۆ کردەوە؛ هیچ شتێکی وامان دەست نەکەوت کە مەلا بۆیە هاتبن بارزانی بکوژن. لە گیرفان یەکێکیاندا ڕۆژ بە ڕۆژی سەفەر لە نەجەفەوە نووسرابوو کە: «شەو لە ئوتێل موختار بووین. بەیانی سوار بووین و گەینە فلان جێگە و فلان شەو ڕامانبواردووە...»

من بە بڕوای خۆم وای بۆ چووم: مەلاکانیش خەبەریان لەو پیلانە نەبووە. ناردوویانن کە ئێوە دەگەڵ بارزانی قسە بکەن. دەزگایەکیان لە قەدی یەکێکیان بەستووە کە ئەمە زەبتی دەنگە. ئەگەر بارزانی دەستی بە قسە کرد ئەو دوگمەیە بکەوە! دەنگەکەی خۆیمان دەوێ. مەلا کە لە بەرانبەر بارزانی دانیشتووە، هەر کە دوگمەی کردۆتەوە، بۆمبا بووە و تەقیوە. بۆ خۆی ببوە پەنجا پارچەش زیاتر. گۆشت و خوێنی بە میچی ژوورەکەوە نووسابوو. دوو ئەفسەری بەعسی بە ناوی ڕانندە -کە مەلاکانیش نەیانناسیبوو- ترۆری بارزانییان پێ سپێرابوو. تێشگەیەنرابوون کە

بارزانی لە فلان وەتاغ میوانان دەبینێ. ماشینی تۆیۆتا لە بن دیواری ئەو وەتاغە پارک کرابوو. ماشینێکی تریشیان پێ بوو کە جێگەی پارک کردنی لەوێ نەبووە؛ دوورتر ڕاگیرابوو. بەلام ئەو ڕۆژە بارزانی لە وەتاغێکی دیکەدا چاوی بە مەلایان کەوت. ڕانندەکە زانیبووی کار لە کار ترازاوە، بۆمبای بن ماشینی تەقاند. سەربانی وەتاغەکەی نزیکی تەواو هەلوەشاند و تێکوپێکی دا. گەیشتینە سەر ماشینەکەی‌تر، دوو بۆمبی زۆر درێژ و ئەستووری لە بن قایم کرابوو. یازدە کەلاکمان بن گڵ خست و دوانیان وا لە بەر یەک چووبوون نەزانرا پارچەیان لە کوێیە. دوای دوو ڕۆژ، پیاوی سەدام هاتن و حاشایان کرد کە دەولەت ئاگای لێ هەبووە. بارزانی هیچ لۆمەی سەدام و دەولەتی نەکرد و بە سەر خۆی نەهێنا. ئەو ڕۆژە دەتوانم بلێم لە هەموو ڕۆژەکانم تالتر و دواییەکەی شیرین‌تر بوو کە دەمدی بارزانی لە کوشتن خەلستووە. دوایی لە بەغدا بیستمەوە کە ئاجودانی سەدام تەلەفۆنی بۆ کابرایەکی کوردی ئاشنای کردبوو کە بارزانیمان لە کۆل دنیا کردەوە.

دوو مانگێک دوای ئەو بەلایە، کوردێکی سووریایی گیرا کە چەمەدانێکی زۆر جوانی بە دیاری بۆ بارزانی هێنابوو. ئەویش بۆمبێک بوو لە هەر ژوورێکدا بتەقیبا کەسی لێ دەرنەدەچوو.

کاک مەسعوود و چەند کەسێک چووبوونە بەغدا. لە گەڕانەوەدا لە سووچی خەیابانێکی بەغدا بەر گوللە درابوون. جگە لە «عەریف حەمید» کە لاقی شکابوو، ئەوانی‌تر ساغ دەرچوون.

هەمیشە لەو چوار سالەی قەیرانەدا دەولەت خەریکی لە بەین دانی شۆڕش و بارزانی بوو. تەنانەت توانیبووی عوبێدیللای کوڕە گەورەی بارزانیش بکاتە جاسووس و پیاوی خۆی. وەک لە دوایی شەرەفنامەشدا گوتوومە: بارزانی لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا گوتی: تانک و تەیارە و تۆپی دوژمن پێمان نەوەستا، دەترسم پوول و پلە و ترومبیل و قەسر لە بەینتان بەرێ! ڕاست ئەوە بوو. ئەوانەی کە چەندین سال بوو لە شۆڕش بوون، وا شێتی دەرەجە و پوول و قەسر و ترومبیلی بەغدا ببوون کە بەعسی ڕوون دەیانزانی تازە ئەوانە تاقەتی بەرداوبەرد و شەڕیان نەماوە. لە ماوەی چوار سالەشدا، ڕێگەوبانی زۆر پان و قەلای زۆر قایمیان لە کوردستان دروست کرد و ئاشکرا ئامادەی هجوومی دیکە بوون. ئێمەش هەموو هومێدمان کەوتبووە سەر ئێران و چەک و یارمەتی ئەو. هەمیشە بە سەتان لە فەرماندەهانی پێشمەرگە، لە تاران و شارەکانی‌تری ئێران، خەریکی خۆشگوزەرانی و پوول خەرج کردن بوون.

ئیتر سەرت نەیەشێنم، لە سالی ١٩٧٠ڕا، شۆڕش بە جارێک بێ‌ناوەڕۆک ببوو. لە سالی ١٩٧٤دا بەعسی -کە زۆر پشت‌ئەستوور بوون لە یاریدەدانی ڕووسان- ڕایانگەیاند: کەرکووک، خانەقین، سنجار و ناوچەی شێخان بەر خودموختاری ناکەوێ. واتا بە زۆر شەڕیان بۆ ساز کردینەوە. شەڕ قەومایەوە...

لێرەدا دەمەوێ وچانێک بدەم و باسێکی گشتی خۆم بکەم: ئەو چەند سالە کە من خۆم دەهاتمە شۆڕش، چونکە لە شۆڕش -بە ناشوکری نالێم- مەدرەسە و خوێندن نەبوو، دەمگوت با مندالەکانم لە خوێندن بێ‌بەش نەبن؛ واتا ڕیسکێکم دەکرد. مستەفام گەیبووە شەش و دەبوو دیپلۆم بستێنێ. زۆر زیرەکێکی بلیمەت بوو؛ هەموو سالە لە مەدرەسەدا یەکەم بوو. زاگرۆسم گەیبووە دووهەمی ڕاهنمایی. ئەویش هەر زۆر هەلکەوتوو بوو. خانی چکۆلەش دەبوایە بچێتە چوارەمی ئیبتیدایی. هیچگاش دەولەت تەشقەلەی تێنەهالاندبوون. بەعسی لە سالی ١٩٧٢دا وێکەوتن، نزیکەی چل‌هەزار کوردی «فەیلی» کە سەدها سال بوو لە عیراق دەژیان، بە تۆمەتی

ئێرانی بوون دەرکرد. کە هات دەگەڵ ئێمەشی تێک دایەوە، بۆ ئەوە مخاریج لە سەر بارزانی زیاد بکا و ئاوارەی زۆر ببنە دەستوپاگیر، هەر کەس شبهەیان لێ دەکرد دەگەڵ شۆرشی بارزانییە، بە نیوەشەوێک لە بەغدا دەریانکردن. کە لەوانەی هەوەڵ کاروان، ماڵی من و سەد ماڵی‌تر بوون. پێش ئەوە بە ماوەیەک «مەلاحەسەنی بارزانی» -کە خزمی نزیکی مەلامستەفا و ژنێکی رووسی هەبوو- لە بەغدا جیرانم بوو؛ هاتبووە ناوپردان. گوتم: مەلاحەسەن تکات لێدەکەم محەممەدی ئیمامی و ژنەکەی با بچنە خانووی منەوە. وا دەکەم منداڵ و ماڵەکەم بێنمە کێو. تۆمەز مەلاحەسەن بۆخۆی بۆتە پیاوی بەعسیان و خۆی پێ فرۆشتوون! ژنەکەشی جاسووسی سەفارەتی رووسە! چووبوو باسی منی ورد و درشت بۆ ئیدارەی ئەمنی بەعسی کردبوو. شەوێک سەعات دووی پاش نیوەشەو پیاوی ئەمنی بەعسی رژابوونە ماڵەکەم، کلیلی هەموو ژوورەکان و دەرکەیان لە «مەعسووم» ساندبوو. بێ‌ئەوە بهێڵن ژن و منداڵ جلکی خەو بگۆڕن یان جلکیان هەلگرن، ڕەپیچەکیان دابوون. مەعسووم هەر ئەوەندەی پێ کرابوو دینار و ڕوبعێک (بیستوپێنج تمەن) لە سەر تەلەفیزیۆن دەست بداتێ. ئیتر سواری کامیۆنیان کردبوون، بردبوویاننە ئیدارەی ئەمن. لەوێ لێیان پرسیبوون: ئیمامی و ژنەکەی کێن کە دەبوو بێنەوە ماڵتان؟ لەوێوە بردبوویاننە دەری بەغدا. دەگەڵ چەند ماڵی‌تر کە بەوانەوە دەبوونە سەد، بە سەحرادا هێنابوویانن و لە هەولێرەوە دەرچووبوون و لە خوار هاوینەهەواری سەلاحەددین دایانبەزاندبوون. هەر کوڕێکی تەمەنی لە دوازدە ساڵ و بالاترە، لە سەفیان دابوون، تیرباریان بەرانبەر دانابوون کە ئیعدامیان کەن. ئەفسەرێک لەو دەمەدا گەیبووە، نەیهێشتبوو منداڵەکان ئیعدام کەن؛ بەلام بەرهەڵدای چیا و چۆلیان کردبوون کە بۆ کوێ دەچن بچن! بە پێ، بە ناو شاخ و جەنگەڵدا هاتبوون. کابرایەک دوو منداڵەکەمی سواری کەر کردبوو. گەیبوونە شەقلاوە. سەرمایە و رووتن؛ ژنە لادێی جلە کۆنی خۆیان دابوو بە ژنان. پیاوان لە جلکی شڕی خۆیان منداڵیان لە سەرما ڕزگار کردبوو. لەوێوە چووبوونە «هیران» و «نازەنین». بە کامیۆن باریان کردبوون بۆ «ڕانیە» و لە ماڵی «مام قادری باغەوان» شەوێک مابوونەوە. تۆزێک پۆشتە کرابوونەوە و ڕاست بۆ کەمپی ئاواران لە نەغەدەوە، لە خێوەتێکدا جێ کرابوونەوە و بە ژیانی پەناهەندەیی ئاوارە ژیابوون. من کە ئەو خەبەرانەم زانی، ناردم بە دزیەوە ماڵ و منداڵەکەم هاتنە حاجی‌ئۆمەران. پێم وایە یەکەم جار بوو مەعسوومم دیت بۆ ماڵ بگری. زۆرم دڵخۆشی دایەوە. خانی کە هەر دیتمی گوتی: بابە! زۆریان سواری کامیۆن کردین بە خۆڕایی و هیچ پوولیشیان لێ نەستاندین! خۆزگەم بە دڵی منداڵ کا...

جا بزانین من کە نزیکەی سی ساڵ زەحمەتم کێشاوە و ئەویش زەحمەتی فەرهاد، چم لێ سێندرابوو: هەشت هەزار و شەش سەد دیناری عیراقی، چوارسەد مسقاڵ زێڕ و خشڵی ژن، پڕی شەش وەتاغ مافوورەی ئێرانی، کتێبخانەکەم کە باوەڕ کە قەت بە ملیۆن دیناریشم نەدەدا. ئەو هەموو ساڵە کتێبی هەلبژاردەم وە سەر یەک نابوو. جگە لە عەرەبی و فارسی و تورکی ئازەری، هەرچی بە کوردی لە ئەستەمبووڵ و عیراق و سووریا چاپ کرابوو، هەمبوو. دووسەد و بیست و هەشت جلد هەر شەرەفنامەی دەست لێ‌نەدراوم هەبوو. دیاری و جایزەی مەقالات و ئەو هەموو عەکسە یادگاریانە و خولاسە بایی نزیکەی دوازدە هەزار دینار و خانوویێکی «ئیسکان» کە تەنیا قیستی پێنج ساڵی مابوو، تەلەفیزیۆن و چەند ڕادیۆ، فرگازی ئیتالی و جل‌شۆر و هەموو کەل‌وپەلی ماڵی تەیار و سازی شارستانی، مۆبلی هەرە چاک، هەمووی لە سەعاتێکی نیوەشەودا



موسادەرە کرا. جا چۆن ژنێک کە بە خوێنی دڵ شەریکی پەیدابوونی ئەو هەموو داراییە بووە و دەگەڵ گەسکێکیش عەلاقەی دڵی زۆرە، لەپڕ ببینێ هاتۆتەوە سەر سیفر و دەست بەتاڵ و نانی پەناهەندەی ئێرانی بخوا، خەمگین نابێ؟! بەلام چار چییە؟... دەڵێن «جونەیدی بەغدادی» وەعزی دەدا، سەری کوڕەکەیان بڕیبوو، لە کۆلانەوە خستیانە ناو کۆشی. گوتی: «ئەو مەنجەڵەی من سەر ئاگرم نابوو، دەبوایە کەلاکێکی عەزیزی تێدا بکوڵێ...».

داواکردنی ئازادی کوردستان لە مەنجەڵی جونەید گەرمتر بوو؛ دارایی منیشی تێدا کولا و هەلا-هەلا بوو. با ناهومێد نەبین؛ ئەگەر لە ئێرانەوە هەلاتم، پێنجسەد و شەش تمەنم پێ بوو. ئەگەر ماڵ و منداڵم بۆ هاتن، شەش تمەنم هەبوو. بەلام دوکانێکی عەکاسیشم شک دەبرد. لە پاش دەولەمەند بوون، ئێستا شەش تمەنەکەش شک نابەین! ئەو مەلاحەسەن بارزانییەی ببوە سەبەبی ماڵ وێرانی من، هەر بەعسی گرتیان و ئیعدامیان کرد. ژنەکەشی بە گوێپچڕ-گوێپچڕ خۆی گەیاندەوە ڕووسیا.

ڕێگای شاران نەمابوو. تەیریش نەیدەوێرا هاتوچۆ بکا. ڕۆژێک لەو ناخۆشیە گەورەدا «کەریم نەستانی» - کە پێشمەرگەیەکی ئێرانی و زۆر ئازا بوو- لە حاجی ئۆمەران پەیدا بوو.

- کەریم تۆ لە کوێیە دەژی، چۆنت وێراوە بێی و بگەیە ئێرە و بۆچی هاتووی؟

گوتی: من جاروبارە قاچاغیەتی دەکەم و بە کوێرە ڕێگایاندا خۆم لە جاش و سەرباز دەشارمەوە. محەممەد مەولوود (مەم) بیست دیناری حەقی ڕێگە داومەتێ کە سەد و بیست دینار پووڵ بۆ تۆ بێنم. زانیویە ماڵت هەموو داگیر کراوە و ئێستا بە دەستەنگی لە چیا ماویەوە.

لەو پیاوەتییە کە هیچ تەماحی دنیایی تێدا ڕەچاو نەکراوە و لەو لێقەومانە سەختەدا، برادەرێکی دەستکورت ئاوا دۆستی خۆی لە بیر نەچووبێتەوە؛ گریانم هات... جا چۆن نەڵێم ئافەریم مەردایەتی ڕاست! چۆن هەزار دۆستی زمانخۆش و لە کرداری پیاوانە بە دوور، بەقوربانی دۆستێکی وا نەکەم؟...

خێوەتێکمان پەیدا کرد. ماڵە مەلامستەفا دانەوێلە و کەلوپەلیان بۆ ناردین و ژیانمان دامەزراندەوە. هەموو ڕۆژ تەیارەمان دەهاتە سەر. مەعسووم لەوە دەترسا من بەرکەوم کە خۆم ناشارمەوە؛ ناچاری دەکردم کە هەتا من خۆم پەنا نەدەم ئەویش خۆی نەشارێتەوە. سەرما هاتبوو. ماڵمان بردە چۆمان؛ لە خانوویێکدا دەژیاین.

شەڕی ئەمجارە زۆر بێڕوحمانەتر بوو. هەموو ڕۆژ هەموو ئاوەدانی بۆمباران دەکران. ڕۆژ نەبوو چەند کەسێک لە بەر چاومان نەکوژرێ. من دیسان هەر لە سەر ڕادیۆی کوردی کارم دەکرد. ژیان لە چۆمان زۆر دژوار بوو؛ دەترسام خانووەکە و منداڵەکانم وەبەر بۆمبایەک کەون. ناچار گوتم بچنە سابلاغ و میوانی سەید عەبدوللای کولیجی بن! ئەگەر وێڕای ڕاتانگرێ، بمێننەوە. ئەو ڕەنگە بتوانێ لە گرتن ڕزگارتان کا. بەلام عەبدوللای برام هیچی بۆ ناکرێ و لەوانەیە خۆشی تووشی گێچەڵی ساواک بێت. بە ڕۆژێکی زۆر ساردی زستانی ناردمنەوە. چووبوونە ماڵی سەید عەبدوللا. چووبووە ورمێ گوتبووی: هەزار خزمی منە! منداڵی هاتوون میوانمن. ئەگەر ڕایاننەگرم ئابڕووم دەچێ و دەبێ لەم شارە بار کەم. گوتبوویان هیچ قەیدی نییە؛ با میوانت بن! تەبەقەی دووهەمی خانووەکەی خۆی بە هەموو ئەسپابێکەوە دابوونێ و ئەوپەڕی پیاوەتی نواندبوو.

هێشتان هەر پاییز بوو، بارزانی لە سەفەرێکی تاران گەڕابۆوە؛ گوتی: دەگەڵ شا دەربارەی تۆ

دواوم کە چەند ساڵە دۆستی منە و هاوکاری کردووم و دەبێ ببەخشرێ. شا قەولی داوە کە پەروەندەکەت نەکەوێتە کار و تا خراپە دەگەڵ ئێران نەکا و گوناهی دژی دەولەتی شاهەنشاهی لێ ڕوو نەدا، باسی نەکرێ و با بێتەوە ئێران. دە ئێستا خۆت حازر کە! بچۆ ورمێ و خۆت بە «سەیادیان» بناسێنە!

گوتم: کاکە! کاری ڕادیۆم یەکجار زۆرە، بڕواش بە قەول و بەڵێنی شا ناکەم. هەرگیز ناچمەوە.

گوتی: ئاخر من قەولم داوە کە دەگەڵ خۆم بچیەوە و لە ڕابردووت نەپرسنەوە.

گوتم: کاکە! هەر گا خۆت چوویەوە منیش دەگەڵت دێم. بەلام ئێستا کار بە جێ ناهێلم.

لە مانگی بەفرانباری ساڵی ١٩٧٥دا -نازانم کام ڕۆژ بوو- بارزانی دەهاتە تاران، گوتی تۆش دەگەڵ خۆم وەرە! هێنامیە ورمێ، چاوم بە سەیادیان کەوت. کوردێکی کرماشانی بوو؛ کە گوتی: بەلێ، مەراحمی ملووکانە تۆی گرتۆتەوە؛ ئێستا ئازادی! گوتم: بەو شەرتە ساواک-ماواک لە سابلاغ لێم نەپرسن.

- نا، خاترجەم بە! هەر ئێستا کە چووی با ساواک بتبینن. ئیتر کەس تازە باست ناکا.

دەگەڵ دوو ساواکی ناردیانمەوە مەهاباد. چوومە ئیدارەی ساواک، «سەرهەنگ ڕەشیدی» ناو ڕەئیسی ساواکی مەهاباد بوو؛ تەلەفۆنی لە کولیجی کرد کە وەرە کارێکی گرینگم پێت هەیە. کە منی دیت گریا... دەگەڵیا هاتمەوە ماڵ. دوای وا بزانم سێ ڕۆژ چوومەوە ورمێ. دەگەڵ مەلامستەفا و چەندێک لە هەوالانی هاتینە تاران؛ لە جێگەیەک دابەزین کە باشگای ساواک و جێگەی میوانی خارجی بوو بە ناوی «شیان»؛ لەوپەڕی ڕۆژهەلاتی تاران. ماڵی «ژەنەراڵ نەسیری» سەرۆکی باڵای ساواک لە نزیکی ئەوێ بوو. دوو کەسی ساواکی، یەک بە ناوی «ئەمانی» کە بریکاری نەسیری بوو، یەکی‌تریش بە ناوی «کیسەچی» هەمیشە لامان بوون. ئەمانی پیاوێکی سەر و ڕوو خۆش بوو؛ زۆری من دەدواند. ڕۆژێک پرسیم: نەسیری لە پێش تاوهەلاتدا دەڕوا. خوا غەزەبی لێ گرتووە کە تێر ناخەوێ؟!

گوتی: نا، نەسیری بە ناو معاونی سەرۆک‌وەزیرە، بەلام سەرۆک‌وەزیر (هوەیدا) لە ماڵە خۆی دەرناکەوێ تا نەسیری نەچێ لە شاوە دەستووراتی کاری ڕۆژانە وەرنەگرێ و پێی نەدات. جا نەسیری دەچێتە ماڵی شا، کە لە خەو خەبەری بۆوە، دەستووراتی لێ وەردەگرێ و دەچێتە ماڵی هوەیدا پێی ڕادەگەیەنێ...

کارمان هەر خواردن و نوستن بوو. جارێک بارزانی و دوکتور مەحموود چوونە لای شا.

خەبەرمان وەرگرت کە شا دەچێتە «جەزایر». شەوێک ژەنەراڵ نەسیری هاتە لای بارزانی، وەک هەمیشە ماچی کرد و دانیشت و زۆر قسەی خۆشی کرد. لەپڕ هەڵیدایە گوتی: بیستوومانە عیراق مووشەکی وای لە ڕووسیا وەرگرتووە کە نۆ میتر درێژە؛ هیچتان ناهێلن و قرتان دەکەن! دوکتور مەحموود گوتی: ئێمە فێرە مردن بووین؛ لەو شتانە ناترسین!

گوتی: دوکتور تۆ نازانی قسە بکەی! ئەعلاحەزرەتیش هیچ کەیفی بە قسەی تۆ نەهاتووە. من هاتووم شتێکتان پێ ڕابگەیەنم: ئێرانی شاهەنشاهی بە سەدها هەزار دۆلاری یاریدەی شۆڕش داوە. بە چەک و سەربازی خۆشمان هاتووینە یاریدەتان. ئێوە هیچ بەهرەتان پێوە نەماوە. گەورەکانی لەشکرتان هەموو دزن؛ هەر خەریکی گیرفانی خۆیانن؛ چەند جارمان گوتووە «حەسۆمیرخان»، «عەلی شەعبان»، «ڕەشید سندی» و کێ و کێ دز و خاینن بە شۆڕش؛

دەریان کەن! بە قسەتان نەکردووین. ئێستا لەم شەڕە گەورەیەدا هەرچی سەرانی شۆڕش و فەرماندەی هێزەکانتانن لە شارانی ئێران ڕایدەبوێرن و کەسیان لە جەبهە نییە. پەنجا هەزار گوللە تۆپمان لە داوێنی چیای «زۆزک» تەقاند و سەنگەرمان بە عەرەبان بەجێ هێشت، پێشمەرگە نەچوون سەنگەرەکان داگیر کەن. یاریدەدانتان جگە لە زیان بۆ ئێران هیچ بەهرە نادا. شا دەگەڵ سەدام ئاشت بۆتەوە و لە ئەمڕۆ بەو لاوە لەشکری خۆمان دەکێشینەوە و ئێوەش دەبێ تەسلیمی بەعس بن! ئەگەر ڕاکەن و بێنە ئێران پەناتان دەدەین. دەنا ئەگەر هەر شەڕ بکەن، لێتان دەدەین و یاریدەی بەعس دەکەین. ئەوا پەیامی شاهەنشاهم پێ ڕاگەیاندن. خۆتان فکری لێ بکەنەوە!

نەسیری ڕۆیشت. ماتییەک باڵی بە سەر مەجلیسەکە کێشا. مەلامستەفا گوتی: دەڵێن چی؟ من -کە ئەمانی تێنەگا- لە کاغەزێک نووسیم: بە بڕوای من پێشمەرگە نەهێڵن ئێرانی چەکەکانیان بێننەوە، ئێمەی کە هەوەڵ جار بە سێسەد تفەنگەوە شۆڕشمان کردووە، ئێستا بە چل ملیۆن فیشەک و بەو هەموو تۆپ و گوللە تۆپەوە، هێزێکی زۆر گەورەین. هەر کارێکی وا بکەین تۆ لە تاران نەگرن و ڕێگەت هەبێ بچیەوە، لەوێ تا توانیمان بەرەنگاری بەعس دەبین. ئەگەر زانیمان خۆ ناگرین، تۆ ئیختارێک دەدەی بە ئێران کە ناچارم بە هەموو هێزی چەکدارمەوە بێمە کێوەکان و ناو جەنگەڵی ئێران. لێم ڕوونە شا لەوە دەترسێ و هەر بۆ ئەوە شەڕی کورد، ملی خۆی نەگرێ، دیسان ناچارە یاریدەمان بدا.

بارزانی نامەکەی منی خوێندەوە و دای بە دوکتور مەحموود و گوتی: بیخوێنەوە و بیسووتێنە!

کەوتینە خەمی ئەوە کە بارزانی بتوانێ لە گرتن ڕزگاری ببێ. ڕۆژ بە ڕۆژیش خەبەر دەهات کە دوای ئەوە پێشمەرگە زانیویانە ئێران دەستی لێ بەرداون و یاریدەیان ناکا، کەوتوونە شەڕ کردنێک کە هەرگیز نەدیتراوە. بە گۆشتی ڕووت هجووم دەکەن و عەرەبان قڕ دەکەن! بە بارزانیمان پێشنیار کرد کە تێلگراف لە مەسعوود و ئیدریسەوە بێت بەو مانایە: پێشمەرگە هیچی بە قسەی ئێمە ناکەن. تا بارزانی خۆی نەیەتەوە، نە دەست لە شەڕ هەڵدەگرن، نە واش دەکەن لەشکری ئێرانی بێتەوە و سەریان بێ کڵاو بمێنێتەوە. تێلگرافەکە کاری خۆی کرد: ئێرانی گوتیان بارزانی زوو بگاتەوە و پێشمەرگە ڕازی کا کە دەست لە شەڕ بەردەن. لە ناو خۆدا -هەر لە تاران- قەرار وا درا هەر کە بارزانی گەیشتەوە دیوی عیراق، دەست لە شەڕی جەبهەیی بەردا و مل لە شەڕی چریکی بنێتەوە. بارزانی نەگیرا و هاتینەوە ورمێ. لەوێوە سەرێکی ماڵەوەم دایەوە، وەسیەتی یەکجاریم کرد کە دەچینەوە کێوان و شەڕ دەکەین. ئەسپابی پێشمەرگەیی: قرۆشکەی چا، دەرزی و دەزوو و وردە بابەتم تێک نا. چووینە نەغەدە و دەگەڵ بارزانی چووینەوە حاجی ئۆمەران.

لە ڕاستیدا پێشمەرگەی سادە -نەک فەرماندە زلەکان- کە دیتبوویان دەبێ هەر بڕوایان بە خۆیان بێ، زۆر شەڕی زۆر پاڵەوانانەیان کردبوو؛ دەشیان کرد. زۆر باش گەرم داهاتبوون. بەڵام ئێستاش نەمزانی چۆن بوو کە بارزانی لە شەڕی چریکی کردن پەشیمان کرایەوە. پێم وایە یەکەم پیری و بێتاقەت بوونەکەی بوو، دووهەمیش دەیدی کە هەوالانی چەند ساڵەی زۆر فاسید بوون و تا سەر دەگەڵی ناکەن.

لەپڕ فەرمان دەرچوو کە پێشمەرگە لە هەموو جەبهەکان تفەنگ دانێن و دەست لە شەڕ

بەردەن...

لە ژیانمدا ڕۆژی وا تاڵم نەدیبوو. پێشمەرگەی کوردستان دەستە-دەستە دەهاتن، بە دەنگی بەرز دەگریان، تفەنگیان دەشکاند و دە چۆمیان داویشتن. تووشی هەر کۆنە فەرماندەیەک ببوونایە دەیانکوشت. لەوە تاڵتر نابێ: پازدە ساڵ بە ئاواتی ئازادی کوردستان خۆت لە بەرانبەر گوللەی داگیرکەراندا ڕاگرتبێ، ئەو هەموو کوشتەت دابێ، ئەو هەمووەت لە دوژمن کوشتبێ، ئێستا بە جارێک هەموو ئاواتت تێک ڕووخابێ و بێهومێد و هەناسەسارد کەوتبیە دەشتەوە... بەعسی عەفوویان ڕاگەیاند؛ بەلام چەند ڕۆژی هەوەڵ هەر پێشمەرگەیەک چوو خۆی تەسلیم کا، دەست بەجێ کوشتیان. چوومە کوێستانی حاجی ئۆمەران بارزانیم دیت. گوتم:

- کاکە! تا ئێستا خزمەتکارێکی کوردستان بووم؛ تۆشم بە دروشمی ئەو خزمەتە زانیوە. وا ئێستا هەموو شتمان دۆڕاندووە. تۆ دەچیە ئێران. من سوور دەزانم نە شای ئێران قەول و قەراری هەیە، نە منیش عافوو دەکرێم. هاتووم خواحافیزی یەکجاریت لێ دەکەم و سەری خۆم هەڵدەگرم بزانم لە کوێ شرت و گوم دەبم...

- تۆ کە نایە ئێران، لە عیراقیش دەست بەجێ ئیعدامت دەکەن. ڕێگەش لە هەمووی پیاوکوشتنە و نائەمنیە، دەچیە کوێ؟

- جەناب! ملی ڕێ دەگرم! هەر چۆنێک بێ ئەگەر ژیانم مابێ، لە گوندێک دەبمە پەناهندە، دەرس بە منداڵیان دەڵێم؛ مەلایەتیان بۆ دەکەم. خۆم دەشارمەوە کەس خەبەرم نەزانێ. ئەگەر بتوانم خۆم بگەیەنمە سنووری سووریە، دەچمەوە جزیرێ و زۆر باش دەتوانم لە ناو کوردەکان خۆم حاشار دەم. بەلام بە هیچ جۆرێک حازر نیم بێمەوە ئێران؛ چونکە دەزانم عەجەم هەرچی بڵێن درۆ دەکەن و لێم ڕوونە بە زەلیلی دەمکوژن. یان دەبێ خزمەتی ساواک بکەم کە زۆرم لە مردن پێ ناخۆشترە و بە هیچ جۆرێک نایکەم، یان دەبێ لە زیندان و ژێر شکەنجەدا گیان بدەم. گەردنم ئازا کە و خواحافیزتان! بزانین خودا چی قەرار داوە...

بارزانی تاوێک لێمی دەڕوانی و سیغاری دەکێشا و جوابێکی نەدامەوە. دەیدی زۆر دڵم پڕە و گریان گەرووی گرتووم. گوتی:

- هەژار! هەر لە سابلاغەوە واتا سی ساڵ دەبێ دۆستی منی. ئەوا چەند ساڵیشە پێکەوەین. من تۆم بە وەفادارتر پیاو زانیوە لەوانەی کە ناسیومن. لە بیرتە کە بە ئەحمەد تەوفیقت گوتبوو ئەگەر بارزانی ببێتە پۆلیسی دەوڵەت، هێشتا دەستی لێ بەرنادەم؟ لە بیرتە کە لە کۆیە گوتت ئەگەر بە تەنیا لە سەر بەردێک بی و هەموو دنیا دوژمنت بن و هجوومت بۆ بکەن، من دێمە لات لەو سەر بەردە؟ ئەگەر هەموو کەس تەنانەت کوڕی خۆشم لێم دوور کەونەوە و بەجێم بێڵن، ئەوەندەم کار لێ ناکا کە تۆ لە ئاخرین دەمدا -کە زۆر تەنگانەیە- بەجێم بێڵی. تۆ دەتگوت ئامادەم بە گفتی تۆ بمرم. دە ئێستا بەجێم مەهێڵە! وا بزانە ئێرانی دەتکوژن. وەفادار بە و لە ڕێگەی ڕەفاقەت و وەفاداریدا گیان بدە! ئەمڕۆش نەبێ هەر دەمری. حەیفە بە وەفاداری بۆ دۆستی چەند ساڵەت نەمری...

گوتم: قوربان بەسیەتی! ئامادەم تا دەمرم وەفادار بم. لە ئێران بمکوژن یان حەتا ئابڕووم بچێ کە لە کوشتن خراپترە بەجێت نایەڵم. سەرم لە ڕێتایە و لە کوێ تۆ پێت دابنێی، خاکەکەی قیبلەی منە! ئەوا گیانم پێشکەش بە وەفاداری تۆ بێ و تۆ بیخەیە بەر سەگ، فەخری پێ دەکەم....

هەر چەند لێم وەک ڕۆژی ڕووناک بوو کە ئێرانی دە سەرمەوە ناچن و قەت دە ڕۆژ نابا دەمگرن و هیچ نەبێ لە زینداندا دەمرزێنن، خۆم ئامادەی هاتنەوەی ئێران کرد.

مام عەلی عەجەمم دیت، فرمێسکی بە ڕیشە سپیەکەیدا هاتە خوار...

- مام عەلی بۆ دەگری؟

- خەمی تۆمە. منیش دێم بۆ ئێران.

- کاکە دێیە چی؟ پیرەمێردێکی وەک تۆ عەمەلەییشت دەس ناکەوێ، عەرەبیش باوەڕ ناکەم کاریان بە پیرێکی وەک تۆ هەبێ. بۆ خۆت لە زینوێ بمێنەوە... مام عەلی لە بیرم چوو: دوو شووشە ئارەق لە ماڵی سولەیمانی پێشمەرگەیە؛ پێی دەڵێم بتداتێ!

بە چەند ڕانندەیەکم گوت بمباتە چۆمان؛ هێندێک کتێبم لەوێن بیانهێنم. کەس نەیدەوێرا بێ؛ لە ترسی پێشمەرگەی ناهومێد کراو. «حوسێن کاوانی» گوتی من دەتبەم. لە ڕێگە لە چەند جێ پێشمەرگە ڕایانگرتین، دەیانگوت: مام هەژار! تۆ پیاوی چاک بووی؛ دز نەبووی. ئێمە دڵمان نایە تۆ بکوژین... گەییمە چۆمان، ڕانندە گوتی برسیمە. گوتم با بچینە لای کاک سولەیمانی پێشمەرگەم، نانێکت بۆ پەیدا کەم. ئەگەر چووم چەندم پێ سەیر بوو: مام عەلی بە عیشقی دوو بوتڵ ئارەقەوە، لەو خەتەرە نەترسابوو، هاتبوو وەری گرتبوو! بە ناو دەنگی تەقە و گریانی پێشمەرگەدا هاتمەوە حاجی ئۆمەران. هەر وا کاروانی ماڵ بوون دەڕۆیشتن. گوتیان پیاوی ئێرانی لە سەر سنوور چەک و کتێب دەگیرنەوە. دەمانچەکەم دا بە مام عەلی، کتێبەکانیشم بەجێ هێشت. لەگەڵ ترومبیلێکی ماڵە بارزانی هاتمە نەغەدە. لەم هەرا و ناخۆشیەدا لە بیریان نەچووبوو ڕادیۆکەم بدزن!

لە ناو فەلەکەی نەغەدەدا دەگەڕام، «کوڕی ڕەش» (عەلی کوڕی پێشەوا قازی محەممەد) دابەزی و یەکترمان ماچ کرد. عەلی گوتی: زۆر بە داخەوەم کە ئێوە تازە هاتنە ئەو دیوە من لە ئەڵمان بووم. زۆری بەخێراتن کردم و ڕۆیشت. پاش ماوەیەکی زۆر، ڕۆژێک لە کەرەج هاتە لام، گوتی بمبە لای «شیرازی». لە ڕێگەدا گوتی: حەیف کە هاتیە سابلاغ لەوێ نەبووم.

گوتم: کاکە! لە نەغەدە دیتمی، گوتم منێکی کە زۆر لە بابی ئەو نزیک بووم و ئەویش ئەوەندە دەستی دەڕوا، هیچ نەبێ دەڵێ بچنە ناو خانوویکی منەوە لە سابلاغ تا فکرێکتان بۆ دەکرێتەوە. تۆ ئەو پیاوەتیەشت لە دەست نەهات. ئەگەر ئێستاش پێت دەڵێمەوە بۆیەیە کە هیچ چاوم لە چاکەت نییە. بەڵام کولیجی توانی ئەو کارە پیاوانەیە بکا. حەزم دەکرد تۆش زۆر پیاو بای!

گوتی: هەژار! دەوڵەت منی کردە دەسماڵ کاغەزی؛ چڵمی خۆی پێ سڕیم و ئیتر قەدرم نەما!

- کاکە! پیاو بای نەدەکرای بە دەسماڵ کاغەزی. فەرموو با بچین شیرازیت نیشان دەم!

دوای چەند ڕۆژ، لە نەغەدەوە ڕەگەڵ بارزانی کەوتم و هاتمەوە تاران. ئەمجارە لە مەیدانی تەجریش لە ماڵێک بووین کە ئەویش هەر سەر بە ساواک بوو. ڕۆژانە دەگەڵ «حەمەی عەزیز» شەش سەعات بە پیادەیی خەیابانی تارانمان گەز دەکرد. نە کار و نە بار... ئیجازەم وەرگرت بچمەوە سەری ماڵ و منداڵم بدەمەوە. «ئەمانی» گوتی لە مەهاباد شوناسنامەی خۆت وەرگرەوە! دەفتەرچەی پەناهندەگیت لێ دەستێنمەوە. چووموومە سابلاغ.

دەڵێن شاعیران بە خەیاڵ کۆشک لە پشت هەوران دروست دەکەن؛ بەڵام ناتوانن تیا بژین.

من ئەگەرچی هەموو ژیانی خۆم دۆڕاندبوو، بەڵام دەمگوت خەڵکی سابلاغ لێم ڕوونه ئەو هەموو ماندوو بوون و ژیان بە فیڕۆ چوونەی منیان هەر لە بەر چاوە و ڕەنگە زۆرم حورمەت بگرن. بەڵام تەواو پێچەوانه بوو. هیچ کەس نەیدەوێرا تەنانەت جوابی سڵاویشم بداتەوە. چەند کەسێک وەک «سەعیدخانی هومایون»، «خاڵەمین»، «یووسف ئەورامی» جاری وا بوو دەهاتن سەریان دەدام. کە لە ماڵیش دەردەچووم، دەچوومە دەواخانەی «ئەییووبیان» کە خزمم بوون، یان سەرم لە کتێبخانەی «خەلیل موەفەقی» دەدا. تەنیا دوو کەس هەبوون کە منیش و سەعید ناکامیش دەچووینە دوکانیان و بە ڕووی خۆشەوە دەیاندواندین: «حاجی موتەللیب» و «وەستا محەممەدی شووشەفرۆش». یەک دوو جاریش چوومە دوکانی «سدیق حەیدەری». لە شار و خەڵکەکەی تەواو بێگانه بووم. ناچار هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە سەربانی ماڵی سەید عەوڵای کولیجی دادەنیشتم و دەمڕوانیە کۆڵان و دەم چەم.

پیاو هەق بڵێ، «حەمەدی کەریمی» باش بوو؛ هاتوچۆی دەکردم و منداڵەکانمی بە ترومبیلی خۆی دەگێڕا. شەوێک دەهاتمەوە ماڵی کولیجی، لە پشتەوە یەکێک بانگی کردم؛ «جەعفەری کەریمی» بوو کە لە زەمانی کۆمەڵەدا زۆر ئاشنای نزیک بووین. گوتی: ببەخشە کە نەهاتوومە لات؛ لە ماڵ نەبووم.

گوتم: کاک جەعفەر! خەبەرم هەیە لە ماڵ بووی. چاویشم لەوە نییە تۆ بمناسی. حەمەدی برات تۆی لای من ڕوو زەرد کردووە کە دەوێرێ بمدوێنێ...

تووشی کەسانێک دەبووم لە سەر خەیابان، دۆستی قەدیمی بوون؛ بە چاو سڵاویان دەکرد و زوو تێدەپەڕین. هەموو کەس لای وابوو هەر ئەم ڕۆژانە من ئیعدام دەکرێم و ئەوانیش بە تۆمەتی سڵاو لە من کردن، تووشی بەڵا دەبن. بە ڕاستی زگم بەوانەش دەسووتا. هەر پێم خۆش بوو زوو سابلاغ بەجێ بێڵم. شتێکیش کە زۆر لە بەر دڵم گران هات: دەمدی هیچ سابلاغیەک خۆ بە کورد زانینی لە بیر نەماوە؛ سەر و بنی هەموو قسان، لە هەموو شوێنان، سفتە و بانک و فەرش و نەغدینە بوو. سابلاغێک کە مەرکەزی مەڕ و ماڵات و ماست و ڕۆنە، ماستی قوتووی تەوریزیان دەکڕی! هیچ وەک کوردستان نەدەهاتە بەرچاو...

ڕەفیقی سابلاغم هەر ئەو عیراقیانه بوون کە ماڵیان هاتبووە سابلاغ. دەگەڵ ئەوان دەچوومە قاوەخانە و گەڕان. بەیانیەک لە خەو هەستام، گوتیان ژاندارمێک لە ئاگاهی شارەبانیەوە هاتبووە دوات. عەبدوڵڵای برام و سەید عەبدوڵڵای کولیجی گوتیان ئێمەش دەگەڵتا دێین.

- نا کاکە خۆم دەچم بزانم چییان دەوێ.

کابرایەکی کورد (ڕەئیسی ئاگاهی) دەستی بە پرسیار کرد:

- ناوت؟ عومرت؟ تۆ وەختی خۆی کومۆنیست بووی، هەڵاتووی... لەو قسانە.

گوتم: تۆ کوردی سابلاغی؟!

- بەڵێ!

- کاکە خۆت نا، باوکت، دایکت، قەت بۆیان نەگێڕاویەوە کە کۆمەڵە هەبووە، قازی محەممەد هەبووە، داوای ئیستیقلالی کوردستان کراوە؟!

- نا، نەمبیستووە!

- حەزم دەکرد بیستبات! من داوای دابەش بوونی خاکی ئێران و ئیستیقلالی کوردستانم کردووە؛ قەت هێندە خوێڕی نەبووم کومۆنیست بم!

- تۆ لە دوێنێوە هاتوویە سابلاغ، بۆ خەبەرت بە شەهرەبانی نەداوە؟!
هەرچی دەپرسێ و جواب دەدەمەوە، دەینووسێ.
- دوێنێ؟ وا من حەوت ڕۆژە هاتوومەوە! تۆ بە هەموو زیرەکی خۆت دوێنێت پێ زانیوە؛ کەچی ماڵەکەشم لە نزیک شارەبانییە!
- ئەوانە ئیمزا کە!
خوێندمەوە، نەینووسیبوو حەوت ڕۆژە هاتۆتەوە. گوتم:
- تا نەنووسی ئیمزای ناکەم! دەبێ دەوڵەت بزانێ ئاگاهی چەند وریایە!
ژاندارمێکی بەو پەروەندەوە دەگەڵ ناردم بۆ ساواک کە بە ناو بازاڕدا تێپەڕین. لە ساواک کابرایەکم دیت بە ناوی «تویسەرکانی». هەر منی دیت ملی لە جنێودان بە ژاندارمەکە نا:
- بۆچیتان هێناوە؟ کێ گوتوویە؟
تەلەفۆنی لە ئاگاهی کرد و چەند جوێنێکی بەویش دا.
- بە شەرەفم نەمانگوتووە و ئاگاشمان لێ نەبووە تۆیان بانگ کردووە و هێناویانیە ئێرە!
- ئاغای تویسەرکانی! من هێندە سادە نیم. بە شەرەفت ئەگەر ئێوە داواتان نەکردمایە، ئاگاهی -کە سەگی خۆتانە- حەدی نەبوو بانگم کا. ئێستا بۆ چیتان هێناوم؟ ئاخر سەیادیان وەک تۆ سوێندی خوارد کە کەس باسم نەکا.
- بە هێندە سوێند و قورعانە ئێمە ئاگامان لێ نەبووە؛ بەڵام تازە هاتووی، چەند پرسیارێکت لێ دەکەم! ئەگەر پێت خۆش بوو جوابم بدەوە.
- بەڵێ فەرموو!
- عەبدوڕەحمانی قاسملوو دەناسی؟
- برادەرێکی خۆشەویستمە.
- لە کوێیە؟
- لە پراگ مامۆستای دانشگایە.
- دەرسی فارسی دەڵێ؟!
- دیارە خۆت نایناسی. ئەو پیاوە نۆ زمان دەزانێ، دەرسی ئیقتسادی سیاسی بە زمانی چیکی دەڵێ.
- کومۆنیستە؟
- باوەڕ ناکەم؛ چونکە حیزبەکەی مەلای نوێژکەری تێدایە، سەیدی تێدایە. ڕەنگە میللی بێ.
- حەمید خوسرەوی دەناسی؟
- بەڵێ، ئەوەی دوو مانگ گرتووتانە و لاتان وایە جاسووسی ڕووسانە.
- چۆن پیاوێکە؟
- باوەڕ ناکەم ڕووسیا ئەوەندە نەزان بێ پووڵی خۆی لە حەمید خەرج بکا تا جاسووسی پێ بکا. حەمید لە بازاڕ بەرەڵای کە، ماڵە خۆی پێ نازانێتەوە!
- دوکتور مرادی ڕەزماوەری دەناسی؟
- بەڵێ، ئەو بۆیە دەبێ جاسووسی گەورەی ڕووسان بێ؛ زۆر زیرەکە. بەڵام لە نێوان ئەڵمان و مۆسکۆدا هاتوچۆ دەکا و جاروبارەش دێتە بەغدایە.
- تۆ پێت خۆشە لە سابلاغ بی کە وەتەنی خۆتە؟



- حەز دەکەم لە چاپەهار بم نەک لە سابلاغ! ئەم هێنانەم بۆ ساواک دەزانم بۆ چییە: بە هەزاران پیاوی بێکار هەیە نانی شەوی دەست ناکەوێ، منیان کە لە کتێبخانە دیوە، یان لە دەواخانە، بە پەلە یەکێک هاتۆتە لات: هەژارم دیت سلاویان لێدەکرد! تۆش ڕەنگە دە تمەنێکت مژدە دابنێ. هەموو ڕۆژ تاقەتم نییە بێمە ساواک و بلاوی بکەنەوە کە من بوومەتە هاوکارتان. هەر ئێستا دەچمە لای سەیادیان و بزانم بۆچی قەولی دا کە ساواک کاری پێم نەبێ و درۆی کرد؟

لە ساواک ڕزگارم هات و ئیتر تازە ئەو خانووەم نەدیتەوە. داوای شوناسنامەم کردەوە. گوتیان ژمارەت چەند بوو؟ خوشکم گوتی: کاکم پێش منە و ژمارەی هەزار و چوارسەد و پەنجا و دووە. شوناسنامەی خۆم و منداڵەکانم ساند.

زۆر ڕۆژان دەچوومە نەغەدە؛ وا دەبوو چەند شەوێکیش دەمامەوە. جارێکیتر لە سابلاغەوە هاتمەوە تاران. ڕۆژێک نەسیری هاتە لای مەلامستەفا، بەخێراتنی منی کرد. بارزانی پێی گوت: هەژار دەگەڵ من هاتۆتەوە. دەبێ کارێکی هەبێ پێی بژی و نابێ لە خۆشم دوور کەوێتەوە.

گوتی: بەڵێ خانووێکی دەدەینێ لە نزیک تۆ بێ. بەلام لە بیرت نەچێ، شا هەر فەرموویە «پەروەندەی وەگەڕ مەخەن!» ئێمە ناتوانین کاری بدەینێ. بەلام بۆ خاتری تۆ، ئەو بۆ خۆی حەولی کار بدا، ئەگەر لە ئێمە پرسیار کرا، دەڵێین موافقین. خۆت دەزانی سپووری جادەش بە بێ موافقەتی ئێمە دانامەزرێ!

بارزانی چۆوە نەغەدە کە ماڵی لەوێ بوو. منیش چوومە ماڵێک کە هەر ساواک بۆ دوکتور شەفیق قەزازی گرتبوو. شاخەوانیش -کە موهەندسێکە- هەر لەوێ دەژیا. هەقی نوستنم نەدەدا. ماوەیەک وا مامەوە؛ نە کار، نە بار. کارمان ئێوارە سینەما و شەو تەماشای تەلەفیزیۆن بوو. پاش ماوەیەک دوکتور شەفیق دەڕۆیشت، هاتنە سەرمان کە ئەم ماڵە چۆڵ کەن! شەفیق ناو ماڵەکەی خۆی -جگە لە تەلەفزیۆن و ستوریۆ و یەخچاڵ و شتی بەقیمەت کە فرۆشتنی- دا بە من؛ کە تۆ ماڵت نەماوە. ئەوانەم بردە ژوورێکەوە کە ببوە مەنزلی بارزانی. «عەبدوڕەزاق مەنگوڕی» ناوێک هەبوو کە چەند ساڵ بوو لە تاران دەژیا و کۆنە پێشمەرگە بوو؛ زۆربەی شتەکانی لێ دزیبووم. داخم ناچێ کە دەفتەرێکی شیعر و چەند یادداشتێکی منیشی دزیبوو؛ نەیدامەوە.

ساواک خەریک بوو خانوو بۆ بارزانی و هەوالانی پەیدا کات. چەند شوێنێکمان دیت، بارزانی ڕازی نەدەبوو. یەک لەوانە عمارەتێکی جێ سەفارەتی ئینگلیس لە شاهاباد بوو لە بن چیای ئەلبورز کە «خوڕەم» کڕیبووی و دەسکاری تێدا دەکرد. خوڕەمم دی. ئازەربایجانیەکی زبری قامک ئەستوور، کە دەیانگوت لە فەعلەیەوە بۆتە خاوەنی ملیۆنها ملیۆن. کە هات ئەمانی پێی گوت دەمانەوێ ئەم خانووەت لێ بکڕین. گوتی: خودا شاهیدە من نۆکەری شاهم!

گوتم: ئەمانی! بە حەیاتی خۆی قسێکی ڕاستی کردووە!

ئەمانی زۆر پێکەنی. چووینە سەیری پارکی خوڕەم کە ئەویش مولکی خوڕەم بوو. کە هاتین بڕۆین خوڕەم گوتی: مەڕۆن دەنێرم کۆکاتان بۆ بێنن! بارزانی گوتی: پووڵەکە لە گیرفانت بمێنێ باشترە!... لە گەوهەردەشتی کەرەج زۆر خانوویان نیشان داین، بارزانی قبووڵی نەکرد. ئاخری بڕیار درا لە عەزیمیەی کەرەج چەند خانووێک بکڕن و تێیدا ببینە پەناهەندە.

وەختێ لە خانووەکەی دەگەڵ شەفیقیان ڕاگوێزتین، «ئاغای موبینی» ناوی ساواکی -کە لە

دوایه کرا به ئەستانداری ورمێ- گوتی: تۆ لە ئوتێل دیامۆند دادەمەزرێنین لە سەر حیسابی خۆمان. شەوێک لەوێ مام؛ وەک لە تەویلەدا بم. بەیانی بە کاک موحسین دزەییم گوت -کە کاروباری ئێمەی ئاوارەی هەوالانی بارزانی بەڕێوە دەبرد- کاکە! نە شەو چوار دینار حەقی خەوم بۆ بدەن، نە هیچم لێتان دەوێ. چوومە لای ڕەسوولی برام. پەتوێک و بەرهەیوانێک، ئیتر لە منەتی ساواک حەسامەوە.

خراپ نییە باسی ڕەسوولت بۆ بکەم: گوتم دایکی برا و خوشکەکانم سالێک دوای مەرگی بابم مێردی بە سەید حەمەدەمین ناوێک کردەوە کە وردە مالکێکی تەرەغە بوو. ڕەسوولی لەو سەیدە بوو. دایک کوێر بوو. مێردەکەی لێی وەڕەز بوو. هێنامەوە لای خۆم لە بۆکان. ڕەسوول منداڵێکی زۆر چکۆلە بوو کە بەجێم هێشت. لە سالانی ئاوارەییمدا خوێندبووی. ڕۆژێک لە «هەڵشۆ» کابرایەک گوتی: موعەللمێک لە سەردەشت زۆری یاریدە داوین. دەڵێ برای هەژارم و ناوم ڕەسوول قادرییە. خوا شوکور ڕەسوول گەیوەتێ و بۆتە پیاو... لە ئازربایجانەوە دوور خرابۆوە و لە تاران ببوە موعەلیم و من کە هاتمەوە تاران، لە ئاپارتمانێکدا دەژیا و موعەللیمی دەکرد و کردبوومە خانەخوێی خۆم.

«مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی» - کە باسم کرد- دۆستی زۆر لە مێژینەم بوو؛ هەر لە بەغدا دەمناسی. لە ئەدەبیاتی عەرەبی و کوردی و تورکی، زۆر نووسەری چاکە. لە هەمەدان، کە لە جەلال و جەماعەتی جوێ ببۆوە و هاتبووە تاران، قەولیان پێ دابوو بیکەنە مامۆستای دانشگا. بەلام درۆیان دەگەڵ کردبوو. لە ڕادیۆی «بروون مەرزی» دامەزرابوو. هەرچەند بە مەلامستەفایان گوتبوو دژی تۆیە، بەلام هەر خۆشم دەویست. «شەمسەدین فەقێ» بە ناوی «ئەمیر قاسمی» لە تاران وەکیلی بارزانی بوو. جارێک هاتە حاجی ئۆمەران. نامەیەکم دایە بۆ مەلا جەمیل، دوعا و سلاو و ئەحوالپرسی. نامەردی کردبوو، بە بارزانی گوتبوو هەژار ئێستاش دەگەڵ مەلاجەمیل دۆستە. بارزانی لێی پرسیم، گوتم: بەلێ نامەم بۆ ناردووە. من مەلاجەمیلم زۆر خۆش دەوێ چونکە زانایەکی گەورەیە و فەرقی دەگەڵ مەلایانی کورد زۆرە کە هیچیان هیچ نازانن... دوو نوسخەش شەرەفنامەم بۆ ناردبوو کە یەکیانی دابوو بە دانشکەدەی ئەدەبیات. هەر کە هاتمەوە تاران دیتمەوە. زۆر دەچوومە مەنزلەکەی. ڕۆژی جومعان دەچووینە دەری تاران بۆ سەیران. پێکەوە چەند جار چووینە دۆلی چالووس و وەرامین.

قەرار درا کە مالەکەم بێنمە کەرەج و لە بارزانی نزیک بم. چوومەوە سابلاغ، دەگەڵ چەند مالە عیراقییەکی لە نەغەدە و سابلاغ هاتمە کەرەج و لە خانوویێکدا -کە ئێستای تێدام- دامەزرام.

دەگەڵ مەلاجەمیل کەوتینە کار پەیدا کردن بۆ من. عەریزەیەکم نووسیبوو بە بێ ئەوە ناوی کەس بلێم: من کە ناوم و شۆرەتم فلانە. عەرەبی و فارسی و کوردی دەزانم. ئەگەر کارێک هەبێ دەیکەم... دەگەڵ مەلا لە زۆر دەرگامان دا، کەس گووی بە کلاومان نەپێوا! ڕۆژێک چووینە ئیدارەی «خانلەری» کە شاعیری مەشهوورە و مەلاجەمیل گوتی: ئەم شیعری هەلۆی - کە تۆش نەزمت کردووە- کردۆتە کوردی. گوتی: ئادرێسم دەنێ کارێکی بۆ دەدۆزمەوە. بە خوا ئەویش هیچی لێ شین نەبوو.

«عەلیخانی سەیفی قازی» لە کەرەج جیرانم بوو. ڕۆژێک گوتی: لە کۆبوونەوەیەکی ئەدیباندا چاوم بە جەعفەریان کەوتووە. گوتوومە: پیاوێکی وا شاعیر و کورد هەیە. گوتی: حەز دەکەم

ببینم. دەگەڵیا چووم. بە نیشانەیەکی کە درابوو بە عەلی‌خان، گەیشتمە جەعفەریان. هەر لە ڕێوە بە عارەبی قسەی دەگەڵ کردم. عەرەبی بە لەهجەی لوبنانی زۆر باش دەزانی. زۆر شارەزای ولاتی عەرەبان بوو. باسی زۆر لە شاعیران و نووسەرانی عەرەبی لێ پرسیم. عەریزە بۆرە بێ ناوەکەم دایە؛ گوتم: ئاغای جەعفەریان! عەرەب دەڵێ پیاو لە سەریەتی بە قازانجی خۆی حەول بدا؛ بەڵام زەمانە لە سەری نییە ئاوات پێک بێنێ. کە ئەوە شیعرێکی عەەبییە. گوتی: با بزانین؛ بەڵکو ئەمجار جێگەی خۆی گرتبێ! دەرکەوتین. تەلەفۆنی بۆ «میرافتابی» کردبوو کە کتێبێکی عەرەبی بدەنێ بە فارسی تەرجەمەی بکا. لە سەر بیری مەلاجەمیل قەرار کرا تاریخی سولەیمانی و دەوروبەری -کە ئەمین زەکی بە کوردی نووسیویە و مەلاجەمیل لە بەغدا کردوویە بە عەرەبی- لە عەرەبیەکەوە بیکەمە فارسی. بۆ یەکەم جار لە تاران دەستم لە کارێک بەند بوو کە مانگێ دوو هەزار تمەنم بدەنێ. لە خوا بە زیاد بێ. ڕۆژێکی دیکە مەلاجەمیل گوتی: وەرە پێکەوە بچینە لای جەعفەریان؛ گوتوویە هەردووکتان وەرنە لام. جاری پێشوو کە هەر بە عەرەبی دواندمی، پێم وابوو ئیمتیحانم دەکا داخوا ڕاستە عەرەبی دەزانم. ئەمجار بە فارسی هەردووکمانی دەدواند. پرسی: ئەو کابرای ئەو ڕۆژە دەگەڵت هاتبوو چ بوو؟!

گوتم: مەمنوونی ئەوم کە تۆی بە من ناساند...

گوتی: زۆری لێ دەترسم؛ بۆیە هەر بە عەرەبی دواندمی نەوەکا شتێکمان لە سەر بنووسێ و گوزارش بدا!

بۆ مانگی دووهەم مەعاشەکەم کرا بە دووهەزار و پێنسەد تمەن؛ بەڵام دیسان زۆر کەم بوو؛ بەشی هیچی نەدەکرد.

ڕۆژێک دەگەڵ مەلاجەمیل چووینە ئینتیشاراتی دانشگا، لای «دوکتور فەرەهوەشی». عەریزە تاینەکەم لە پێش دانا. گوتی: بۆ تەجرەبە عەرەبیەکم بۆ تەرجەمە کە! با بزانم چۆنە. فۆرمەیەکیان دامێ نازانم لە کام کۆنە کتێب بوو. باسی غەیبەتی ئەبووبەکر بوو کە گوتوویە: ئەگەر توورە بووم لێم نزیک مەبنەوە؛ نەوەک وەک پشیلە بتانڕنم! تەرجەمەم کرد و بۆم بردنەوە.

گوتم: دوکتور! ئەگەر ئەبووبەکر گورپە پشیلە بووبێ، یان عەلی ئاسک بووبێ، فایدەی بۆ ئێران و قازانجی بۆ کۆمەڵی بنیادەم چییە؟! ئەگەر ئەم قسە قۆڕانەم پێ تەرجەمە کەی، بە خوا تێدا نیم!

دوکتور زۆر پێکەنی، گوتی: کوڕە ئەوی ئەمەی داوە بە تۆ خۆیشی نەیزانیوە چی تێدایە! من دەمەوێ قانوونی ئیبن سینا - کە هەرگیز تەرجەمە نەکراوە- ئەگەر بتوانی بیکەیە فارسی پوولێکی باشت دەدەینێ.

گوتم: من بە پوولی تالیف کاری وا ناکەم. من دەمەوێ لە ئیدارەیەک دامەزرێنی. ئەوسا چۆن تۆ دەڵێی با وابێ.

گوتی: شەرت بێ لە ماوەی شەش مانگدا لە ئیدارە داتمەزرێنم. هەر ئێستاش بچۆ «پەژووهیشی ئیرانزەمین» خەریکی فەرهەنگی فارسی بە کوردی بە! بەو شەرتەی قانوون تەرجەمە کەی.

منێکی کە ئاوبردەی کارێک بووم، گوتم عەرەبی بێ دەتوانم تەرجەمەی کەم. قانوونی دامێ و هاتمەوە ماڵێ. نە بابم حەکیم بووە، نە دایکم هیچی لێ زانیوە... بردمەوە و بە سەرکزی گوتم:

من له تاوی بێکاری وەک هونەرپیشەیەک بووم کە سیناریۆی نەدیتبێ و قبوولّی بازی کردن لـە ڕۆڵێکدا بکا. دەو کتێبە ناگەم. من هەر لەگەڵ کتێبی ئەدەبیاتی عەرەبدا سەر و کارم بووە؛ لەوە سەرم دەرناچێ.

گوتی: تکایە ناهومێد مەبە! بچۆ حەول بدە! ئەگـەر مانگـێ دوو سـەفحەش تەرجەمـە کـەی قبوولمە. هەفتەی سێ ڕۆژ بچۆ ئیدارە خەریکی فەرهەنگ بە! سێ ڕۆژیش لە ماڵ بـە قانوونـەوە خەریک بە!

دیسان هاتمەوە و بە سەر قانووندا کورک بووم؛ تا توانیم لە زمـانی ئەبووعـەلی سـینا تێبگـەم. چونکە نە وەک هیچ کتێبێکی عەرەبییە و هەمووی وەک لەغز پرسینەوە وایە. ملـم لـێ نـا. زۆر شەوان گوێم لە بانگی سبەینە دەبوو؛ من هەر خەریک بووم. لە ئیـدارەش بـە هاوکـاری «خـانم موتەوەسیل» - کە سنەیی و لیسانس بوو- کاری فەرهەنگم دەکرد.

سەر لە هەوەڵ دوکتور فەرەهوەشی مانگێ دوو هەزار تمەنی بۆ قەرار کردم. پاش سێ مانـگ بۆی کردمە سێ هەزار. داوای کارمەند بـوونی بـۆ کردبـووم. پـاش شـەش مانـگ تـازە گوتیـان ئەوراقی لە ئیدارەی ساواک ون بووە، لە سەرڕا دەست پێکرایەوە. بۆ ساڵی ئایندە قبووڵ کرام کە کارمەندی قەراردادی بم. دوکتور فەرەهوەشی گـوتی بـە فـەوقی لیسانـسم قبوولـی و حقـووقم یەکجێ بوو بە شەش هەزار تمەن. لە ڕادیۆ و لە پەژووهەش کارم زۆر باش بوو. بیـستمەوە کـە لە سابلاغ ئەوانەی حازر نەبوون جوابی سلاوم بدەنەوە، کەوتوونە پێوشوێنم! یەکێک لە ڕادیـۆی سابلاغ گوتبووی: هەژار هەر زۆر لە مێژە دۆستی ئێران و ساواکی بووە؛ بۆیە ئێستا مانگێ حەوت هەزار تمەن وەردەگرێ! خەبەرم بۆ نارد کە حقووقم نۆ هەزارە، لێم کەم نەکاتەوە!

سەید عەبدوللای کولیجی گوتی: دەڵێن تۆ ناوت دەگەڵ ناوی ساواکیانە؛ ڕاستە؟

گوتم: کاکە! قسە زۆر دەکرێن. بۆت مەعلووم دەبێ کە کێ ڕاستە. مەترسـە! مـن خـۆفرۆش نیم...

لە دوای تەرجەمەی «تاریخی سولەیمانی»، کتێبێکی دیکەیان لە ڕادیۆ دامێ بە ناوی «ئێـران و عەرەب» کە بیکەمە فارسی. کابرایەکی مەسیحی بە نـاوی «سـەلیم واکـیم» کـە نووسـیبووی «ئەندام لە کۆمەڵی تاریخ نووسانی دنیادا و گەورەترین تاریخی ڕۆژهـەلاتناس». نزیکـەی نیـوەم تەرجەمە کردبوو. نووسیبووی: «ئیمام ڕەزا دەگەڵ مـەئموون دەچوونـە بەغـدا، لـە نیـوەڕێ لـە کەربەلا کوژرا و ئێستا قەبرەکەی زیارەتگایە!...» جاروبارێکیش نووسیبووی خەلیج هـی ئێرانـە. لە حاشیە نووسیم: «بە داخەوە ئەو کابرایە تـاریخزان نـەبووە و کلاوبـەردارە. ئەگـەر بیروانیبایـە ئەلمونجید -کە هاودینی خۆی تـالیفی کـردووە- دەیـزانی ئیمـام ڕەزا لـە مەشـهەد مـردووە و کەربەلاش لە سەر ڕێگەی بەغدا نییە». جەعفەریان گوتی: مـن ئـەوەم نـەزانیبوو؛ بـەلام دەزانم سێ ملیۆن تمەنی لێ ساندووین! کتێبێکی دیکـەم وەرگـرت: «پەیوەنـدی فەرهـەنگی ئێـران و میسر»، کۆمەڵێک لە زانایانی زۆر کارامەی میسری نووسیبوویان. بە ڕاستی کتێبێکی چاک بـوو. دابوویان بە «شێخ ئەمینی نەقشبەندی» -کە گوتبووی عەرەبی دەزانم- چاوی پێدا بگێڕێتـەوە. گوزارشی لێ دابووم کە هەژار خراپـەی هێنـدێک لـە مەشـایخی گوتـووە. ئیتـر نـەیزانیبوو مـن تەرجەمەی ئەمینم کردووە. لەوەدا ڕووزەردی بۆ مایەوە...

یەکێک بە ناوی «یەزدان پەرست» کە دەبوایە تەرجەمـەکانی مـن ببینـێ، گوتبـووی مانگـێ دەبێ سی ڕووپەڕی تەرجەمە هەر بدا. بۆ جەعفەریانم نووسـی: بـە سـرتە بـەو کارمەنـدەت تـێ

بگەیەنە کە تەرجەمە -وەک شێلم- بە کیلۆ نییە! تا ئایەتێکی قورعان مانـا دەکـەم، دەتـوانم دە ڕووپەڕ داستانی ئەمیر ئەرسەلان بنووسم! هەر چەند مانگێ پتر لە چل ڕووپەڕم بۆ بردووە.

جەعفەریان گوتی حەز دەکەم وشەی فارسی کە بوونەتە عەرەبی کۆ کەیەوە و هەر کتێبێکـت بوێ تەهیەی دەکەم و بە دوو ڕۆژ بۆت دێنن. لە بەشی کوردی چووبوونە لای کە هەژار با کـاری بەرنامەی کوردی بکا. گوتبووی ئەگەر خۆی حەز نەکا نابێ کەس ناچاری بکا.

«دوکتور محەممەدسدیق موفتیزادە» -کە بەرپرسی بەرنامەی کوردی بوو- زۆرم بە دەورەدا هات کە هاوکاری بکەم. پێم گوت: برا! بە ئارەزووی خۆم کاری خۆم هەڵنەبژێرم، نایکەم. نەچی ئینقلابی سپی و تەمەدونی ڕەشم بدەیەی! مەلای جزیری شەرح دەکەم و تاریخی ئەردەلانیش؛ ئیتر چیتر... ئەمجارە بە بەرنامە بوو؛ هەر بەرنامەی چوارسەد تمەن، نزیکەی پێنج هەزار تمـەن مانگانە دەکەوت.

خواهیشم کرد «خالیداغای حیسامی» وەک من بەرنامە بنووسێ، قبـووڵ کـرا. بـەلام زۆر زوو عەریزەی دابوو بە جەعفەریان کە دەبێ منیش وەک هەژار حیساب کەن و بە قەد ئەوم بـدەنێ. جەعفەریان نووسیبووی هەر ڕای مەگرن!

باوەڕ دەکەی یان نا، کەیفی خۆتە! ماوەی نزیک چـوار سـاڵ، کـە لـە ڕادیـۆی زەمـانی شـادا نووسیومەوە، یەکجاریش ناوی «ئەعلاحەزرەت ئاریامیهر»م بە سەر قەڵەمدا نـەهاتووە. هەمیـشە خۆم لێ دزیوەتەوە...

کاتێ «قانوون» لە چاپ درا، جیرانێکی ساواکی زۆر نازک و موحتەرەمم هـەبوو - تاجـداری- کە بە سەر کاری بێگانەکان ڕادەگەیشت. گوتی: لە پـشتی بنووسـە «دیـاری بـۆ شـەهبانوو». وا دەکەم جایزەی کتێبی ساڵت بدەنێ. گوتم: من کابرایەکی کوردی دەربـەدەری کـەس نـەناس، ڕێم ناکەوێ بۆ شابانوو دیاری بنێرم! خۆم لەوەش دزیەوە.

لە ڕاستی لا نەدەم: جەعفەریان بـۆ مەلاجـەمیل و مـن زۆر بـاش بـوو؛ خـوا جـەزای خێـری بداتـەوە. «قـوتبی» کـە مـودیر عامیـل بـوو چووبـووە کرماشـان و کوردسـتان، قـەولی دابـوو کارخانەیەکی ئەمرازی مۆسیقای کوردی دامەزرێنن. نامەیـەکم بـۆ جەعفـەریان نووسـی لـە ١٥ ڕووپەڕدا. پوختەکەی ئەمە بوو:

«ئێوە کە زمانلووسان پێتان دەڵێن کـورد شاپەرسـتن و نیـشتمانی ئێرانیـان خـۆش دەوێ، فریوتان خواردووە. هەموو کوردێک ڕقی زۆری لە ئێران و ئێرانییە...» بە دوور و درێـژی زوڵـمی دەوڵەتانی لە سەفەوی ڕا تا ئەمڕۆم نووسیبوو کە: «ئێستاش عومەر ناو لە تاران خۆی نـاو دەنـێ ئەمیر، بابەکر دەبێتە باقر... لە ڕادیۆ ئێمە کوردی دەڵێین، بەلام کتێبە کوردیەکان لە عیراقـەوە بە قاچاغی وارید دەکرێن و ئەگەر ساواک بیانگرێ واوەیلایە! زۆر شەرمە بو دەوڵەتێ کـە دەڵـێ کوردیش لە خۆمانن، ڕێگەی چاپ کردنی کوردی نـەدا و عـەرەب ڕێگـە بـدەن! ئەگـەر قـوتبی پوولی زوڕنا و دنبەگی دابا بە چاپخانەیەک و بمانگوتایە کێ کتێبی بە کوردی هەیـە، یـان بـۆی چاپ دەکەین و بە ئەقسات مخاریجی چاپەکەی بداتەوە، یان لێـی دەکـرین و چـاپی دەکـەین، ساواکیش تماشای کردبا، ئەگەر دژی سیاسەتی شای تێدابا، لێی فرێ بدا، هەم کورد لێتان ڕازی دەبوو، هەم پێویست نەدەبوو بە دزیەوە کوردی چاپکراو لە عیراقەوە واریـد کـەین و لـە ترسـی ساواک وەیشێرین...».

جەعفەریان ئەو عەریزە دوور و درێژە و پازدە ڕووپەڕەی دابوو بە قوتبی. قوتبی مەلاجـەمیل و

منی بانگ کردە ماڵە خۆی. قەولی دا کە ئەم کارە بکا و چاپخانەیەک تەرخان بکا بۆ کوردی چاپ کردن. بەلام مەودا نەما تا بزانین دەیکا یان نا... هەرای دژی شا قەوما. جەعفەریان ئیعدام کرا. قوتبی هەلات. لە ڕۆژانی ئاخردا بوو؛ جەعفەریان لە ماڵە خۆی بوو. گوتبوویان جارێ لە کار دوور بێ. دەگەڵ مەلاجەمیل چووینە لای. «سولەیمانی» - کە مودیری «بروونمەرزی» بوو- لەوێ بوو. بە تەنیا پێی گوتم: جەعفەریان تازە تەرجەمەی قانوونی دیوە. پێش هاتنت بە منی گوت زۆر بە داخەوەم کە قەدری هەژارم نەزانیوە. ئەو کارەی ئەو کردوویە لە دەست کەس نایە. ئەگەر لەوە بەولاوە بچمەوە سەر کار، دەبێ وەک لازمە قەدری بزانم...

ببووە تەزاهورات و هەر کەسە «مرگ بر شاه» (شا بمرێ) ببوە بنێشتە خۆشکەی زاری. خانمی مەسئوولی «پەژووهشی ئیرانزەمین» بانگی کردمە ژوورەکەی خۆی:

- هەژار! دەڵێن تۆ لە شەڕی چریکی شارەزای. ئەگەر شا نەڕوا تۆ دەبێ ببیە سەردەستەمان بۆ شەڕی چریکی.

گوتم: خانم فەرەحبەخش! دوعا لە خودا بکە پەشیمان نەبیەوە. ئێمە لە عیراق ئاوامان کرد و پەشیمان بووینەوە و زۆریشمان جزیای کاری خۆمان دیت...

ئەو ڕۆژە بە قەلسی جوابی دامەوە؛ بەلام لە هەوەڵین دە کەس کە دەریانکرد و گوتیان تاغووتییە، یەکیان ئەو خانمە بوو! ڕۆژێک هات گوتی بەڵێ پەشیمانەکە منم و تازەش هیچم بۆ ناکرێ.

من کە قانوونم تەرجەمە کرد و چاپ کرا، بەر لە چاپ دەرچوونی، «دوکتور فەرەهوەشی» لە ئینتیشارات نەما. «دوکتور عیرفانی» ناوێکی تورکی ئازەربایجانی هاتە جێگەی کە پاکنووسی قانوونەکەی کردبوو؛ یەک بەش لە دوو بەشی حەقی تالیفی درابۆیە. لام وایە لەوە نانەجیبتر کەم هەبووە. گێچەڵی تێهالاندم: پێشەکیەکم نووسیبوو، هەر چونکە ناوی کوردم بردبوو قبووڵی نەکرد. دەبوایە چل نوسخەم بداتێ، پێی داگرتبوو کە پازدە نوسخە بدا. کە دوکتور فەرەهوەشی گوتی دەبێ چل نوسخەم بدەنێ، سیونۆی دامێ:

- تۆ پەڕ-پەڕ بردووتەوە بۆ غەلەتگیری، دەکاتە نوسخەیەک!!

ناچار ئەو نوسخەم بە پووڵ لێ کڕی، گوتم: بڵێ با بۆم بەرنە ئەمیراباد.

گوتی: ئاغا ئێمە ماشێنمان نییە بیدەین بە تۆ. بچۆ تاکسی بێنە!

چاوەنۆڕی تاکسی بووم، دوکتور «سەید جەعفەری سەججادی» هات؛ بۆم گێڕاوە. گەڕاینەوە، بە کارمەندێکی گوت، کتێبەکانیان بۆ بردمە دوکانێک لە ئەمیراباد. لە حیسابدا دیتم «عیرفانی» دەیەوێ شتێکم لێ بدزێ... هەر چۆنێک بوو خەلاسیم هات. جلدی دووهەمیشم تەرجەمە کردبوو. پاش دوو ڕۆژ عیرفانی تەلەفۆنی کرد:

- ئوستاد! زۆر زوو جلدی دووهەم بێنە تا چاپی بکەین!

گوتم: جەناب! تا تۆ ماوی نامەوێ بەقالێکی وەک تۆ ببینم. کتێب ئاگر دەدەم و نامەوێ چاپ بکرێ.

هەر نەمدیتەوە تا گوتیان بە دەرمان خۆی کوشتووە.

هەرا و کوشت و کوشتار و تەزاهورات لە تاراندا پەرەی ساند. تەنانەت ڕۆژێک دەگەڵ زاگرۆسی کوڕم لە مەیدانی بیستوچواری ئیسفەند کەوتینە نێوان تەقەوە. زۆر کەسم دیت لە بەر چاومان کوژران. خۆمان خستە دوکانێکەوە؛ کابرا دەرکەی داخست تا ئەهوەن بۆوە و

دەرچووین.

شا ڕای کرد؛ حکوومەتی مەلایان دامەزرا. ڕۆژێک پیاوێکی مل باریک بە ناوی «فەخرەددین ئەنوار» هات کە من ڕەئیستانم. کۆی کردینەوە و قسەی بۆ کردین: ئیتر لەمەو بەولا باسی ئێران و ئێرانی نەما؛ دەبێ بڵێین موسوڵمان و هیچی‌تر... زۆر فەرمایشی‌تری لە دوو دا. گوتم: من تێت نەگەیشتووم. ئەوی من دەیزانم، عەرەبی پێش ئیسلام تەنیا کتێبێکیان نەبووە. خوێندەواری بە عەیب حیساب کراوە. تاجرانی مەککە بۆ حیسابی دەفتەرداری نووسەریان بە کرێ گرتوون کە بە خەتی سوریانی بۆیان بنووسن. عەرەب نەیانزانیوە کەوش و دەرپێ چییە. لە پاش فتووحاتی ئیسلام جل دەبەر کردن و تەرزی خواردن و ژیان لە ئێرانیان فێر بوون. ئێستا چۆن دەتەوێ باسی ئەبووعەلی سینا، ڕازی و زۆر لەو زانایانەی خزمەتی زۆریان بە ئیسلام و زمان و فەرهەنگی عەرەب کردووە تەنیا بڵێین موسوڵمانن و نەوێرین بڵێین خەڵکی کوێ یان سەر بە کام نەژاد بوون؟! گوتی: نا، بەو ئەندازەش ناڵێم!... لە پاشان لە هەر کەسەی پرسی کارت چییە؟ دەبوایە کارەکەی دەگەڵ بەرنامەی تەلەفزیۆن پەیوەندی هەبێ. کە لە منی پرسی، گوتم: من لێرەدا سیفرم! فەرهەنگ دەنووسم؛ عەرەبیم تەرجەمە کردووە؛ کە هیچیان بۆ تەلەفزیۆن نابن. دەفەرمووی بڕۆم؟ گوتی: نا تۆ هەر کاری خۆت بکە!

بەوەدا بیرم کەوتەوە کە زەمان شا جارێک چووینە لای کابرایێک، کە مودیری بەشی دووهەمی تەلەفزیۆن بوو. لە پاش زۆر تاریف کردن لە خۆی، گوتی دەبێ کاری هەر کەس بۆیە ببێ کە بکرێتە فیلم و نیشان بدرێ یان سیناریۆی لێ دروست بێ یان نازانم چی... کە لە منی پرسی کارت چییە؟ گوتم: مەلایەک وەعزی دەدا، گوتی: هەر کەس چاوێکی نەبێ نیوە پیاوە؛ هەر کەس عیلمی نەحوی نەخوێندبێ، نیوە پیاوە؛ هەر کەس مەلە نەزانێ، نیوە پیاوە. کابرایەک هەڵیدایە: لەو قەرارەی تۆ دەفەرمووی، من نیوە پیاوێک قەرز کەم تازە دەبمە هیچ!

ڕۆژێکی‌تر «فەخرەددین ئەنوار» هات و هەمووی کۆ کردینەوە. بە کزیکەوە و لە بن لێوان بەیاناتێکی دەس پێکرد؛ گوتی: ئێمە دەبێ هێندێک کەسان لە ناو خۆمان هەڵوەژێرین. دەبێ سەدی سەد ئیسلامی و بەرانبەر بە دڵی ڕژێم بمێنن. ساکەکەم هەڵگرت و جەلسەم بەجێ هێشت. دوو ڕۆژ دوایی کە چوومە ئیدارە، لە دەرگا وێستابوو. گوتی: وەرە ژوورەکەی من! گلەی کرد:

- ئەو ڕۆژە من تۆم لە بەرانبەر خۆم دانا؛ زۆرم قەدر گرتی. هەر دەستم بە قسە کرد بەجێت هێشتم. ئەوە جوان نەبوو!

- ئاغای ئەنوار! تێدەگەیشتم چ دەفەرمووی. هەر گوتت هەڵوەژارتن، دە فیکی خۆم گەیشتم. گوێ بگرە! من کوردم؛ مەهابادیم؛ بابم شافعی سوننی بوو؛ بۆ خۆم شیعە نیم، سوننیش نیم؛ ناوم عەبدوڕەحمانە؛ کە قاتلی ئیمام عەلیش عەبدوڕەحمانی ناو بووە. ئەوانەم هەموو گوناهن لە نەزەری ئێوەدا. نزیکەی شێست ساڵ لە عومرم بە خۆڕایی چووە؛ دەفەرمووی بڕۆم؟!

- کێ دەڵێ بڕۆ؟ نەخێر کاری خۆت بکە!

هەر ئەو ڕۆژە چووبوو گوتبووی دەبێ هەژار بکەنە کارمەندی ڕەسمی. گوتبوویان عومری زیادە و ناکرێ. گوتیان نابێ کەسێک لە ئیدارەیەک دوو مەعاش وەرگرێ. نووسیم بەرنامەی ڕادیۆ نانووسم. چووبوون بە «قوتبزادە»یان گوتبوو؛ ئیجازەیەکی نووسیبوو کە بۆ هەژار قەیدێ

ناکا. تا کوردێکی بنەجوو بە ناوی «میهراسا» - کە بە جوولەکەیی ناوی «بدوحی» بووە- کرا بە مودیری «برروونمەرزی». لێی پرسیم:

- لەو بەو لاوە چیمان بۆ دەنووسی؟

- بۆچی مەلای جزیری و تاریخی ئەردەلانتان ناوێ؟

- حەز دەکەین بەرنامەی مەزهەبی بنووسی!

ئیتر چوومە لای سولەیمانی و خۆم لە بەرنامەی مەزهەبی دوور خستەوە و ئیستعفام دا.

ڕۆژێک فەخرەددین ئەنوار بردمیە «جیهادی سازندەگی» کە لە مەیدانی ئینقیلابە. گوتیان بەرانبەر بە فەرمایشتی ئیمام دەزگایەک پێک دێ بۆ بلاو کردنەوەی فەرهەنگی قەومیەتانی ئێرانی: کورد، ئازربایجانی، بەلووچ، عەرەب. تۆ مەجەللە کوردییەکە دەستەبەر بە! دوکتور سدیق موفتیزادە و سدیق بۆرەکەیی بوونە هاوکارم. بریار درا مەجەللەیەک بە ناوی «هیوا» دەرکەین؛ بەلام من چەند شەرتێکم هەبوو: پیاوێکی زل لە ئینقیلابدا پێ رابگا؛ حەقی کورد لە مەجلیسی خوبرەگان بکرێتە قانوون و چەند جارێک لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن ئیعلان بکرێ؛ هەروەها ناوی ئەو مەجەللە، کە ئەدەبیات و فەرهەنگی کورد بلاو دەکاتەوە. کێش ئیمتیازەکەی بەناو بێ؟ گوتیان مەجلیسی خوبرەگان کاریان زۆرە؛ ناپەرژێن.

- بۆ دەپەرژێن نرخی تەماتە و کوولەکە دیاری بکەن؟ بۆ ناپەرژێن بلێن حەقی میللەتی کورد ئەوەندە دەدرێ؟ خولاسە پێک نەهاتین.

ڕۆژێک «ئەنوار» بردمیە ئیدارەی «سرووش» کە نەشریاتی دەولەتە. سەید ئیبراهیمی ستوودە و چەند لاوێکی کوردی ڕیش تەنک لەوێ بوون. باسی مەجەللەی کوردی کرا، دەنگ لە دار و بەردەوە هات لە من نەهات. ڕاستت دەوێ هەموویانم زۆر ناخۆش ویست. کە هاتینە دەر، ئەنوار گوتی: بۆ هیچ قسەت نەکرد؟ گوتم: برا! من کارم بە کاری کەسەوە نییە. خۆم بە تەنیایی هەرچیەکم بۆ بکرێ دەیکەم. نامەوێ کەس دەگەل مندا کار بکا. ئەوانەشم کە دیت، من لام وایە هەر بۆ خۆ خۆشەویست کردن خۆ نیشان دەدەن...

لە ئیدارە کەوتمە تەرجەمە کردنی نووسراوەکانی «شەریعەتی». یەکەمیان چاپ کرا نازانم لە کوێ. دووهەمیش چاپ کرا. سێهەمی دەبوو لە سرووش چاپ کرێ. چوومەوە لای یەکێک لەو گەنجانەی کە ئەو ڕۆژە زۆر بە خوێنتالم هاتە بەرچاو؛ بە ناوی «ماجد ڕۆحانی». دیتم «خەربزە بە ڕەنگ نییە!» نە هەرکەسێک خزمەت بەو ئیسلامە بکا و ڕیشی هێشتبێتەوە، تەواو خراپ و منافقە. زۆر کوڕێکی باشم هاتە بەرچاو؛ زۆرم خۆش ویست. ئەویش زۆر بە دڵ دەیەویست یاریدەم بدا. پاش چاپی کتێبی سێهەم و چوارەمی شەریعەتی، ویستم شەرحی مەلای جزیری چاپ بکەم. ماجید زۆر موافیق بوو. پێشنیارم بە «زەورەق» کرد کە سەرپەرستی «سرووش» بوو. گوتم کتێبی عیرفانییە و ئەگەر عیرفانتان بوێ بۆم چاپ کەن. «زەورەق» لە سەر تاریفێ کە ماجید لە منی کردبوو؛ وا بزانم زۆریشی موبالەغە پێوە نابوو. گوتی باشە؛ ئەگەر خۆت پەسندی دەکەی چاپی دەکەین.

گوتم: نا! تاقەتی ئەوەم نییە سبەینێ مەلایەکی سەرویشک یەخەم بگرێ: ئەمە چییە؟ مەیخانە و پیری موغان و ڕەقس و یاری قەدباریک و بالابەرز و تەرزی تێدایە و هەمووی حەرامە!

- دەیسا کوردی نازانین و کێ بۆت تماشا کا؟

- عەرەبیم هەیە بیبە نیشانی مەلایانی بدە! ئەوسا ئەگەر قبووڵ کرا چاپی کەن!

شەرحە عەرەبیەکەی «زفنگی»م بۆ هێنا. لام وایە نیشانی «بەهەشتی» درابوو؛ گوتبووی: ئەم دیوانە وەک دیوانی حافز دەچێ. ئیمام حافزی بەلاوە پیاوی چاکە. باشە چاپی بکەن! پیاو هەق بلێ، ماجید زۆر لە خۆمی پێوە ماندووتر بوو تا چاپ کرا و ئارەزووی چەند سالەم پێک هات.

بوومە ئاشنای مالی ماجید. دەتوانم بلێم مالی ئەخلاق بەرزن؛ کە دە پێشدا هیچ چاوەنۆڕی نەبووم خەلکی سنە مالی ئاوا ئەخلاق‌بەرز و کوردپەروەریان تێدا هەلکەوێ. برایانی ماجید هەموو پیاوی هەلبژاردەن. دایکی ژنێکی زۆر کەیخودایە و پیاو شەرمی لێ دەکا. باوکی (بابە شێخی ڕۆحانی) مەلایەکی زۆر زانایە. چل سالە وەک سەربازێکی گومنام سەری لێ داخستووە و حەولی داوە ناودارانی کورد لە تاریخدا کۆ کاتەوە و سیفرێکی زۆر گەورەی پێکەوە ناوە. ئەگەر گەلی‌کورد قەدری خزمەتکارانی خۆی بزانێ، بەڕاستی دەبێ ئەوپەڕی قەدری ئەو پیاوە بگرێ.

«کاک ئەحمەدی موفتی‌زادە» خالی ماجید، وەک دەلێن «نازی شاگرد بە هونەر دەگاتەوە مامۆستا»؛ دیارە ئەخلاقی کاک ئەحمەد کاری زۆر کردۆتە سەر خوارزا و خوشکی و خزمی.

لە هەرای ئازادیخوازی کوردستانی دوای ئینقیلابی ئیسلامیدا، زۆر کەس لە کوردەکانی سابلاغ و سنە خراپەی ئەحمەدی موفتی‌زادەیان دەگوت. بەلام کە دەگەلی بوومە ئاشنا، زانیم لە غەرەزێکی نەزانانەوە خراپەی دەلێن. گوناهی هەر ئەوە بووە کە موسولمانی بە ڕاستییە و ئەم بڕوایەش بۆ کومۆنیست و زۆر لە لاوانی ئەمڕۆمان قوت ناچێ. موفتی‌زادە بە دل ویستوویە ئازادی بۆ کوردستان بستێنێ؛ زۆریش ماندوو بووە. نەشیزانیوە مەلای حاکم درۆیان لە لا گوناح نییە؛ فریوی بە قسەیان خواردووە و لای وابووە کە قەولی ئازادی کوردستانی پێ دەدەن، ڕاست دەکەن. خۆی کە بێ درۆ و دلپاک بووە، لای وابووە قەولدەرەکانیش دلپاکن! وا ئێستا کە ئەم ڕووپەڕانە دەنووسم، کاک ئەحمەد لە زیندان دایە و زۆر جزیا دەدرێ و بە سەدان لە هاوکارانی - کە زۆریان تازە لاون- لە سووچی زیندان توند کراون و هیچیان لە پەیڕەوی کاک ئەحمەد پاشگەز نین و لە سەر بڕوای خۆیان سوورن. لەو ساوە خۆم ڕووبەڕوو کاک ئەحمەدم دیوە و سەفەرم بۆ شیمال دەگەل کردووە، زۆر وەبەر دلم کەوتووە. لام وایە بە مردووییش هەزاران کومۆنیستی نەزانی دەبێ بە قوربان بکرێ...

کەسی دیشم کە لە هاتوچۆی لای ماجد ناسی، «هادی موڕادی» بوو؛ کە ئەویش خەلکی سنەیە. زۆر لە عەرەبی شارەزایە. تا خوا حەز کا پیاوێکی نەرم و نیان و ئەخلاق باشە.

لە زەمانی شادا فەرهەنگستانی زمانیش بە ئەندامی قبوول کردبووم. هەفتەی دوو جەلەسە لەوێ حازر دەبووم. سەرۆکی «دوکتور کیا» بوو. حەول دەدرا وشەی فارسی لە جێگەی عەرەبی دابندرێ. دەگەل ئینقیلاب ئەویش هەولوەشا. بە دوکتور سەججادیم گوت: با ئەمجار وشە فارسیەکانمان پێ بکەن بە عەرەبی!...

هەر کە ئینقیلاب ڕووی دا و گەرماوگەرمی بوو، دیوانی «هەژار بۆ کوردستان» و «شەرەفنامە»م ئۆفسێت کردەوە. دیوانەکەم لە ماوەی دوو مانگدا هەموو فرۆشرا. شەرەفنامەش تا ئێستا زۆری لێ فرۆشراوە و کەمی ماوە. کە شەرەفنامەکەش باری گرانی کەوتە سەرشانی ماجید ڕۆحانی. لە مالە باوکی جێگەی کردەوە و بۆ فرۆشتن و ناردنی بۆ دەرەوەی تاران هەموو زەحمەتی خستە سەر خۆی. قسەی خۆمان بێ، بە لای منەوە ئەو ماجیدە ڕەنگە تۆزێک شێت بێ کە هێندە بە دەرد و مەرگی منەوەیە و خۆم پێوە ماندوو دەکا! چونکە تا ئێستا نەمبیستووە کەس لە سەر قەدر گرتنم و خۆ بۆ ماندوو کردنم میدالێکی درابێتێ! هەر چۆنێک بێت زۆر بە

خزمەتمەوە ماندووە و هەر کارێکم دەبێ، زۆر بە ڕووی خۆشەوە دەیکا. ڕەنگە بە پیاوی گەورەم بزانێ؛ کە بۆیە لام وایە شێتە! پێم وایە ئەگەر ڕابردووی ژیانەکەم بخوێنێتەوە، لێم پەشیمان ببێتەوە. تا ئەوساش خوا کەریمە. هەتا ئێستا لە هەموو کەسم لێ نزیکترە.

**دەربارەی دوکتورانەوە**

لە بەغدا ڕووت و پێخواس و کەس نەناسێک بووم؛ نەخۆش کەوتم چوومە لای دکتورێک بە ناوی «دوکتور نووری فتووحی». مەسیحی و کوردی خەڵکی سولەیمانی بوو؛ لە بەغدا دوکتوری دەکرد. موعایەنەی کردم؛ دەرمانی دامێ؛ پووڵی نەستاند. قەولیشی لێ ساندم کە هەتا کارم بە دوکتور بێ بچمە لای. نەک هەر بۆ من، بۆ هەموو فەقیرێک -عەرەب با یان کورد- باوکێکی دڵسۆز و خێرەومەند بوو. هەر ئەو دەگەڵ زور دوکتوریتری کردمە ئاشنا کە یەک لەوانە «دوکتور کەمال حوسێن» ناو بوو. کارتێکی دامێ بچمە لای. ئەویش کە پارەی نەستاند هیچ، تەنانەت مەعسوومیشی لە بیمارستانی «خەییال» عەمەلیات کرد و پارەی عەمەلیاتیشی نەستاند. من کە خەجالەتیان دەبووم، دەمەویست تۆڵەیان بۆ بکەمەوە و تەبلیغاتیان بۆ بکەم. جارێک کارتێکم بۆ کاک ئەمیری قازی بۆ دوکتور کەمال نووسی کە ئەوە دۆستی منە و پوولیشی هەیە. تکایە تماشای بکە و پوولیشی لێ وەرگرە! ئەمیر کە دەبوو شەو بێتەوە ماڵ، نەهاتەوە. تا سێ ڕۆژ هیچ خەبەرم نەزانی. لە بیمارستانەوە تەلەفۆنی کرد کە دوکتور کەمال بێدەنگ بردوومی عەمەلی کردووم و گوتوویە بە هەژار مەلێ! پوولیشی ناوێ.

ڕۆژێک بە دوکتور نووریم گوت: من ئەوسا کە تازە هاتمە لات، ڕووت و لات بووم. ئێستا پوولم زۆرە. تکایە لێم وەرگرە!

گوتی: هەژار! بۆ لات وایە پووڵ هەموو شتێکە لە ژیاندا؟ ئەدی پیاوەتی قەدری نییە؟ من ئینسانیەتم پێ لە پووڵ چاکترە...

لە دوایەش کە بە شاعیری کورد ناسرابووم، هیچ دوکتورێکی کورد پووڵی لێ نەدەستاندم. کە لەوانە: «دوکتور سەلام بالەتە»، «دوکتور ئیبراهیم»، «عومەر دزەیی»، «تەیب عەقراوی»، «دۆغرەمەچی» و زۆریتریش بوون.

لە هاتنە تارانیشمدا ڕاستی دوکتورە کوردەکان زۆریان قەدر گرتووم: «دوکتور ئەعلەم»، «دوکتور فەیزنەژاد»، «دوکتور مۆرەکی»، «دوکتور شافعی»، «دوکتور حەیدەری».

لە هەمووان سەیرتر ئەوە بوو کە جارێک سەربەخۆ چوومە لای دوکتورێک لە کەرەج بە ناوی «پاشا مشکاتی»؛ فارسە. گوتی پوولم ناوێ.

- دوکتور! دەمناسی؟

- دەتناسم؟ یانی چی؟! هەر خۆشم لە تۆ هاتووە و دەمەوێ دۆستت بم. گوتم: پوولم لێ وەرنەگری نایەمەوە لات! ئێستاش هەر زۆر دۆستمە.

جارێک لە بەغدا کاک محەممەد مەولوود (مەم) نەخۆشی زراوی بوو. چووینە لای دوکتور کەمال حوسێن. گوتی عەمەلت دەکەم. کاک مەم ڕازی نەبوو؛ گوتی دەچمە بولغاریا.

- کاکە من لە هەموو جەڕاحی بولغاری دوکتورترم!

- نەخێر، نایکەم!

بە منی گوت: لە هەولێر بچۆ لای دوکتور مەزهەر. ئەگەر ئەو پیاوە زوو عەمەلیات نەکرێ

خەتەرە! کە بە دوکتور مەزهەرم گوت، گوتی: تۆ دەگەڵ خۆت بۆم بێنە بیمارستان و حەقت نەبێ. بەو ناوە کە خۆم نەخۆشم، «مەم» لەگەڵم هاتە بیمارستان. لە ناو کۆریدۆردا دوو کەس تێی نووسان و هەرچی هاواری کرد بردیان و بێهۆشیان کرد و عەمەل کرا و هێنایانە سەر تەختێک ڕایانکێشا! کاکە مەم لە نەخۆشی ڕزگاری هات.

***

لە عیراق بە هەزاران ئاشنام بە جێ هێشتوون؛ بەڵام کاک محەممەد مەولوود (مەم) و تاهیر تەوفیق و کاک عەبدولخالقم هەمیشە لە بیرە و ئارەزوو دەکەم دووبارە بیانبینمەوە.[1] هەرگا دەهاتمە هەولێر، میوانی مەم دەبووم و گورجێ تاهیر تەوفیقم پەیدا دەکرد و دەگەڵیا ڕاماندەبوارد. «تاهیر» بە ناو گۆرانیبێژە؛ بەڵام نابێ وەک هیچ گۆرانیبێژێک حیساب بکرێ. زۆر پیاوێکی مەرد و ڕەند و شەرم بەخۆیە و ئەوی لە بەر چاوی نەبێ ماڵی دنیایە. لەوپەڕی سەربڵندیدا دەژی و هەرچی جارێکی دیوە، خۆشی دەوێ و قەت لە دڵی دەرناچێ.

وەختێ کە «عەبدولوەهاب ئوتروشی» ئەستانداری هەولێر بوو، لە ناوپردان دیتمی. گوتی: کاک هەژار! ئەستاندار لە مەڵبەندی ئەستاندا پادشایە. تۆ من بە پیاو نازانی؛ دێیە هەولێر نایەی سەرم بدەی؛ بەڵام لەگەڵ لۆتیەکی وەک تاهیر تەوفیق دەگەڕێی. گوتم: کاکە! پادشایەتیت لە خۆت مبارەک. من هەواڵەتی تاهیر بە تەختی پادشایەتی نادەم. چونکە خۆی لە من بە زلتر نازانێ، دەشزانێ قسەی خۆش بکا و دەنگیشی خۆشە...

کوردی ئێرانی زۆر زمانیان خۆشە. بەڵام بە داخەوە کەم وایە زمان و دڵیان یەکتر بگرێتەوە! بە زمان زۆر دۆستی نزیکن و بە کردەوە زۆر بێگانەن. زۆر کەسم لەوانە بوونە دۆست و زۆر کەمیان دڵمیان پێ خۆشە. لە ناو ئەوانەدا کە زۆر وەبەر دڵم کەوتوون: «ئەحمەدی قازی» نووسەرە کوردەکە، «حەسەن ئیسحاقی» کۆنە پێشمەرگە و برازای ئەحمەد تەوفیق؛ زۆریش بەوە شانازی دەکەم کە لە نزیکەوە «محەممەدی قازی»م ناسیوە کە فارسینووسە و گەورەترین موتەرجیمی ئێرانە و زۆر مەشهوورە. لە ئەخلاقی زۆر خۆشم هاتووە؛ بەڵام هاموشۆمان کەمە.

***

وابزانم تا ئێرە بە غارێک و بە پەلە، ژیاننامەیەکی خۆم تێگەیاندی کە ئەگەر بە وردی لێی ورد بیەوە، بۆ خۆت دەتوانی پانتری لێ بروانی و بزانی چۆنم ژیان دۆڕاندووە...

ئەمانەم لە ساڵی ١٩٨٣ز. (١٣٦٢ک.)دا نووسیون. وا ئێستا کە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧ی میلادی (١٣٦٥کۆچی)یە، سەری ژیاننامەکەم دەدەمەوە:

من کە لە ئیدارەی «پەژووهشی ئیران زەمین» بووم، شا هەڵات و مەلا حوکمیان کەوتە دەست، لە چەند جێیەک ئیشارەم بەو ئاڵوگۆڕە کردووە. کە ئینقیلابی ئیسلامی سەری گرت، کەس نەیدەزانی کاری ئێران بە کوێ دەگا. هەموو کەس بە هومێد بوو کە دنیا زۆر لە پێشوو

---

١- زۆر بە داخەوە لە ساڵی ١٩٨٤دا کاک عەبدولخالق لەسەر کتێبێکی کە دەربارەی ژن لە ئیسلامدا نووسیبووی و هەموو مەدرەکی لە قورعان و حەدیس و کتێبی «الام»ی شافیعی نیشاندابوو، مەلایانی هەولێر فتوای کوشتنیان دا و لەسەر جادە ترۆر کرا.

خۆشتر بێ. جحێلان لە هەموو گەڕەکان شەوانە کێشکیان دەکێشا و تا ڕۆژ نەدەهاتنەوە ماڵ. شەوێک ماشینێک لە بەر دەرکی مەلایەکی کورد بە ناوی مەلا حوسێن دابەزیبوو. گوتیان مەلا حوسێن ڕەنگە فارسی نەزانێ، تۆ بچۆ بەڵکو تەرجمانی بکەی. بە فزوولی چوومە ژوو. ئایەتوڵلا دزفوولی ناوێک، جحێل و بە ڕیش و پەشم لەوێ بوو. عەرەبی دەزانی و کار بە تەرجمانی من نەبوو. لە ناو قسانداا لە مەلا حوسێن ماریوونسی پرسی: حالّت چۆنە؟ گوتی: زۆر خراپین. گوتی: ئەم ئینقیلابە هەر بۆیە کراوە ئێمە تەبەقەی ڕووحانی خۆشی ڕابوێرین... دڵم لەو قسە ترسا.

بێ جێی نازانم باسی ئەو مەلاحوسێنە بکەم:

مەلایەکی یەکجار سەرمردوولەی شڕ و شڕۆڵ لە حاجیئۆمەران هاتە لای بارزانی. ئەوەندەی خۆ بە پیاوچاک و بێتەماح نیشان دا نەبێتەوە. بارزانی پارەی دایە، وەری نەگرت؛ تەنیا گوتی کتێبی دینیم بۆ بکڕی دەمەوێ. وای خۆ شیرین کرد، بارزانی کردیە ئامیرهێز لە بادینان. تا لێقەومان نەمدەزانی چ دەکا. لە نەغەدە بە پەناهەندەیی دیتمەوە؛ هەرای بوو دەگەڵ بارزانی کە بۆچی پوولی باشم نادەنێ! کوڕەکەی دەگەڵ ئێمە لە خزمەت بارزانیدا هاتە تاران کە گۆیا چل ماڵی خزمیان لە تورکیان و نانی شەویان نییە؛ بارزانی بینێرێتە تورکیا. دوو هەزار دیناری دایە و قەرار بوو هەتیو بچێ. دەگەڵ حەرەسێکی بارزانی چووینە بازار. کوڕی مەلا، چەخماخی دووسەد تمەنی و تەزبیحی گرانبایی و کراواتی سەد تمەنی دەکڕی!

- کاکە ئەوە بۆ چیتە؟ تۆ نالێی خزمم لە برسان دەمرن!
- ئەوانە بۆ دیاری دەکڕم!

ڕێگە نەدرا بچتە سەفەر و پارەش خورا. مەلاحوسێن مالی هاتە کەرەج. دوای حوکمی مەلایان زۆر زوو بوو بە دۆستیان. ناردیانە حەج. ئاخری خۆی کرد بە پاسدار و ئێستا لە دۆڵی چالووس مەقەڕی پاسدارانی هەیە و دوژمنی بەرەی ماڵە بارزانییە. بۆ عەقڵ و کەمالیش ئەگەر بڵێم مێشکی گووی تێدایە ڕەنگە درۆ نەبێ!

نزیکەی مانگێک بوو کە ئینقیلاب سەرکەوتبوو. داخی داخانم، بارزانی -کە زۆر لە مێژ بوو نەخۆش بوو- لە ئەمریکا وەفاتی کرد (١٩٧٩/٣/١) و جەنازەیان هێنایەوە. جەنازەکەیان بردە شنۆ. بە سەدان هەزار کوردی داخ لە دڵ، لە ناشتنیدا بەشدار بوون، منیش لەوێ شێعرێکم خوێندەوە.

زۆر کەس لە مەهابادەوە بە ناوی خۆیان هاتبوونە شنۆ، کە یەکیان «مەلاکەریم شاریکەندی» بوو. ئەویش وتارێکی خوێندەوە. زۆر لە شاعیران و نووسەرانیتریش شینیان بۆ بارزانی کردبوو، بەلام لە لایەن حیزبەکانی کوردی ئەم دیوە کەس نەهاتبوو.

ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی مەرگی بارزانی بۆ من لە هەموو کەس پتر مایەی غەمخۆری و تازیەباری بوو. بە ڕاستی باوکی هەرە دلسۆزم سێبەری لە سەرم لاچوو. بارزانی بۆ من هەموو کەس و کارێک بوو. لەو ڕۆژەوە کە لە ڕووسیاوە هاتەوە عیراق و منی دیتەوە، سایە و مایەم بۆ پەیدا بوو. ئەوانەی کە هەموو هونەری منیان بە کایەک نەدەویست، لە سایەی خۆشەویستی بارزانییەوە، زۆر ڕێزیان لێ دەنام. واتا وەک لە زۆر یادبوودەکانیدا گوتوومە: من هەر هیچکارە نەبووم و ئەگەر ئەو باڵی بە سەر نەکێشابام، هەرگیز کەسێکی نووسەری کورد بە ناوی هەژار لە ئارادا نەدەبوو. خوا جەزای بەخێری بداتەوە. لە پاش نەمانی ئەویش کوڕەکانی ئەو: «ئیدریس» و «مەسعوود» هەر بە وەفاداری بۆ باوکیان، زۆریان حورمەت گرتووم. پارەی لە چاپ دانەوەی

«هەژار بۆ کوردستان» ئەوان دایان؛ لە چاپ کردنەوەی «شەرەفنامە» زۆریان یاریدە کردم. هەر تێگیراویەکم هەبێ، ئەو دوو کوڕە بە هاوار و بانگمەوە دێن.

لە پاش سەرکەوتنی ئینقیلاب، کوردەکانی ئێران سەریان هەڵێنا و داوای ئازادی و خودموختاریان دەکرد. لە مەهاباد پادگانی دەوڵەتی ڕووت کرا، چەک و سیلاح دەس کوردان کەوت. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە سەرۆکایەتی قاسملوو دامەزرا. بە پەنا ئەوانیشەوە دەمبیستەوە پتر لە ٢٥ حیزب لە شاری مەهاباد هەبوو کە هەر یەکەی سەربەخۆ فکرێکی لێک جیای دەکردەوە و دژی یەکتر بوون. بیستمەوە کە مەلاکەریم شاریکەندی تڕۆر کراوە. دەگەڵ دەوڵەت کەوتنە وتوویژ. قاسملوو دەگەڵ چەند کەسێک هاتنە تاران کە مەلا شێخ عیزەدینیشیان دەگەڵ بوو. ڕۆژێک دەگەڵ ئەو دەستەیە -جگە لە شێخ عیزەدین- لە ماڵێک نەهارمان خوارد. قاسملوو گوتی: تۆ یارمەتی ئێمە دەدەی؟

گوتم: پووڵم نییە؛ بەڵام کتێبەکانم چاپ بکەنەوە؛ چی لێ پەیدا بوو بۆ خۆتان.

حەمەدەمینی سیراجی گوتی: بەو شەرتەی ناوی بارزانی لە نووسراوەکانت فڕێ دەی باشە!

- جا ئەگەر ناوی بارزانی دە نووسراوەکانمدا نەبێ، چیم دەمێنێ؟ کاک سیراجی پەشیمانم؛ ناتاندەمێ. بەڵام بۆ خۆم چاپیان هەر دەکەمەوە. وەک باسم کرد چاپیشم کردنەوە و کاریشم نەکەوتە سیراجی و میراجی.

هەر لەو ڕۆژانەدا بە قاسملووم گوت: من بە لامەوە سەیرە ئێوە حیزبێکتان هەیە! نازانم چۆن ڕەحیمی قازی کە ئێوە لە من چاکتری دەناسن، فەوزیەی قازی هەر چونکە کچی قازی محەممەدە، نەویدی موعینی هەر چونکە برای فایقە، غەنی بلووری کە ٢٤ ساڵ لە سەر تووده گیراوە و تازە بەڕەڵدا کراوە، لە خۆتان کۆ کردۆتەوە؟! بە لامەوە سەیرە... دەی ئەدی یووسفی ڕیزوانی کە ئێوە لە من باشتری دەناسن چۆن بۆتە هەواڵتان؟ زۆرتری ئەو پرسانە بێ جواب مانەوە...

حیزب لە مەهاباد کاروباری گرتە دەست. گفتوگۆ لە نێوان دەوڵەت و حیزب دامەزرا. بەیانێکی هەشت مادەیی درا بە دەوڵەت کە یەکیان دەڵێ: «دەبێ ئەو کوردە پەنابەرە عیراقیانە هەموویان لە ئێران دەربکرێن». نامەیەکم بۆ قاسملوو نووسی:

برا دەبوایە هەموو پێشنیارەکانتان بە دەوڵەت وابووایە کە هەتا سەدان ساڵیش هەر بەهرەی بۆ کورد بدایە. نووسیوتە پەنابەران دەرکەن. فکرتان لێ کردۆتەوە پتر لە بیست هەزار ماڵ کوردی پەناهەندەی عیراقی هەیە و لە ئێراندا بلاو کراون؟ ئەوا گریمان دەوڵەت بۆ دلخۆشی ئێوە گوتی دەریان دەکەم. چۆنیان دەردەکا؟ خۆ ئەو هەمووە خەلکە بە تەییارە نانێرێتە ئورووپا. لە ئورووپا کام دەوڵەت وەریان دەگرێ؟ چەندی مخارج تێدەچێ؟ تەنیا ڕێگەی ئەوەیە لە سنووریان کا بەو دیودا و لە ترسی سەدام لە سەر سنوور بمێنن. ئەوسا دوژمنایەتی ئێوە بکەن و هیچ نەبێ دە هەزار پیاوی شەڕکەر لە خۆتان دەهاروژێنن. بە دەرکردنی ئەوان ڕوکنێک لە باسی مافی کورد لە ناو دەچێ. بە لامەوە ئەم کارە، کاری سیاسەتمەداری عاقڵ نییە...

گۆیا قاسملوو گوتبووی: ڕاست دەکا؛ بەڵام خەتای سەلاحی موهتەدی و شێخ عیزەددین بووە ئەم کارەیان بە سەردا سەپاندووین...

ئێران هێرشی بردە سەر مەهاباد و سەقز و سنە و گەلێک شەڕ و کوشتار ڕووی دا. حیزب لە شاران دەرکەوتن و دایانە چیا. وردە-وردە هەڵقرچان تا بە سەر حیزبی دیموکرات و کۆمەڵەدا

ساغ بۆوە. ئەو دوانەش ملیان لە یەکتر کوشتن تا کە ئێستاش لەم سەرەتای سالّی ۱۹۸۷دا هەر شەڕیانە!

شەوێک کەسانێکی بەدفەڕ چووبوون جەنازەی مەلامستەفایان لە شنۆ لە قەبر دەرێنابوو؛ فڕێیان دابوو. ئەم ئیهانەت بە موقەدەساتی ملیۆنها کوردە، زۆر کارێکی نالەبار بوو. دیموکراتی تێدا موتەهەم کرا. ڕادیۆ دیموکراتیش حاشایەکی نەکرد و باسیشی نەکرد. من کە دەمدیت وەزع زۆر ناسکە و دەمبیستەوە لاگرانی بارزانی دەیانەوێ تۆلە بکەنەوە، چەند نامەیەکم بۆ کاک مەسعوود -کە سەرۆکی حیزبی پارتی دیموکراتی عیراقە- نووسی، بەم مانایە:

«من بە دلّ لام وایە کورد کاری هێندە بەدفەڕانە ناکا. مێژوو نیشانی نەداوە جارێک لە جاران کورد کەلاکی دوژمنی دەرێنابێ؛ بەلّام عەجەم زۆریان وا کردووە. لام وایە ئەم کارە، کاری حەسەنی بێ کە مەلایەکی شەللاتییە و لە ورمێ هەمەکارەیە. تکایە تۆ حەوسەلەت هەبێ و ئەم شەڕە کە دوژمن ناویەتەوە بەربەست بکە. با دیسان لەم لایەشەوە تووشی براکوژی نەبن...»

لە جوابمدا نووسیبووی: «حەز ناکەم براکوژی بکەین. بەلّام ئێمە چەند کەسێکمان ناو بردووە کە شکمان لێیانە و سەر بە قاسملوون. گوتوومانە بماندەنێ تاقیقیان لێ دەکەین؛ جوابیان نەداوینەوە...»

جارێکیتر نووسیبووی: «برا بە خوا هەوالّانی کۆنی بارزانی -کە چەکدارن- چەکیان بە سەر من داداوەتەوە و پێم بەربەست ناکرێن».

خولاسە شەڕ لە نێواندا قەوما و زۆر پیاوی کوردی بەکار و ئازا لەم سۆنگەیەدا کوژران. پیلانی حەسەنی کاری خۆی کرد...

ئەو سەر و بەندە کە دیموکرات بە سەر مەهاباد ڕادەگەیشتن و زۆر لە بەرەودا بوون، «موهەندس ئاریا» ناو هاتە لام لە کەرەج. دای دایە تای کەلامەللایە کە دەبێ تۆش بێیەوە شار و شێلە وا و بێلە وا...

گوتم: بە هیچ جۆر نایەم! کاکە بیستوومە ۲۵ حیزب لەو شارە بچکۆلە هەیە! ئەمن زۆریش زیرەک بم هەر دەتوانم یەکیان لە خۆم ڕازی کەم؛ بیست و چوارەکەی دی جوێنم پێدەدەن!

گوتم: دەلّێن مەلای ماوەڕانێ -کە ئێستاش ناوی پیرۆزە و خەلّکی عیراق سوێند بە گۆڕی دەخۆن- ڕۆژێک دوو کەس چوونە لای بۆ شەرع لە سەر بزنێک. فەرموویە دووسبەی وەرنەوە!

فەقێکانی بە تەنیا پێیان گوتووە ئەم شەرعە زۆر هاسان بوو، دووسبەی بۆ چ بوو؟ گوتبووی من گزرە و کایەکەم دانەپۆشراوە؛ شەرع بە لای هەرکامیاندا نەدەم، شەو لێم دەسووتێنێ. سبەی قەرارە دایپۆشم. دووسبەی شەرعیان دەکەم!

گوتم: کاکە! سۆفیەکی شێخ ڕەشیدی لۆلان لە گوندی ژێر بوو. ڕەمەزانێ بەڕۆژوو نەبوو؛ سەبیلەی دەکێشا. گوتیان تۆ تۆبەکاری، چۆن بەڕۆژوو نابی؟ گوتی: کەسم تەجرەبەم کردییە، وام ئاسوودەترە! من وام ئاسوودەترە کە نەیەمەوە ناوتان. بێم چ بکەم؟ کاسبی من لەوێ نییە. مەسەلێکە دەلّێ: «بۆ فەقیر، یان دارستان یان شارستان». منێکی بێماڵ و دەستەنگ، لە تاران حەولێکم پێ دەدرێ. لە سابلاغ دەبێ چاوم لەوە بێ پیاوێکی وەک تۆ جارێک تەنەکە ڕۆنێکم بە خێر و منەت بۆ بنێرێ...

بە دلشکاوی گەڕاوە، بەلّام هەر ئەو موهەندس ئاریایە حیزبەکەی بەجێ هێشت و عاقیبەتی خۆی گەیاندە پاریس و لەوێ ڕانندەی تاکسییە.

شەوێکیش کاک هێمنم میوان بوو،[1] لە ناو قساندا گوتم: کاکە من و تۆ پیر بووین؛ ڕەنگە بەرداوبەرد و ژیانی چیامان لە تاقەتدا نەمابێ. حەز دەکەم تۆ لە ئەندامەتی ئیفتیخاری حیزب واز بێنی و بچی لە ماڵە خۆت ئەدەبیاتی کوردی بنووسی؛ هەموو کەس حورمەتت دەگرێ. قبووڵی نەکرد. دوایی دەگەڵ غەنی بلووری و سیراجی و چەندێکی‌تر لە حیزب جوێ بوونەوە و بەر نەحلەت و جوێنی حیزب کەوتن و هێمنیان چەند ڕۆژێک لە چیا گل دایەوە و هاتەوە لە گوند بەوپەڕی پەرێشانی دەژیا. هەم ترس لە حیزبی دیمۆکرات، هەم ترس لە دەوڵەت. ئاخری چاری ناچار هاتە مەهاباد و خۆی دایە دەست دەوڵەت و بردیانە ورمێ و گۆڤاری سروەی بۆ دەنووسین. چوار ژمارە و نیوی نووسی و سەرەنجام لە ۱۳٦٥/۱/۲۹- کە دەبێتە ۱۸ی ئاپریلی ۱۹۸٦- بە سەکتەی قەلبی مرد و بردیانەوە مەهاباد ناژتیان. بە ڕاستی بە مەرگی هێمن خۆم زۆر بە تەنیا هەست دەکەم. بە داخەوە هێشتا من ماوم... لەم بەینەدا کە لە «ورمێ» بوو - جگە بە هۆی تەلەفۆن- چەند جارێکیش لە ورمێ دیتمەوە. تەنانەت جارێک پێکەوە چووینە «ڕاژان». ماڵە بارزانی و سەرانی پارتی زۆریان حورمەت گرت و هیچ بە چاویاندا نەداوە کە ڕۆژگارێک زۆری خراپەی بارزانی گوتبوو. تەنانەت پوولیشیان دایە.

دەمەوێ برێک بە قسەکانم بدەم و با بدەمەوە سەر دوو هەواڵی سێ تفەنگدارەکە کە بریتی بوون لە قزلجی و زەبیحی و هەژار:

لەو سەردەمانەدا کە مەلامستەفا لە رووسیاوە گەڕابۆوە بەغدا، قزلجی سەروکەللەی پەیدا بۆوە. دوای گەڕانەوەی لە تاران، ماوەی دوو ساڵ لە هەڵەبجە لە ماڵی شێخ ئەحمەد، نوشتەنووسی کردووە و ڕیشی هێشتۆتەوە و نان و دۆی تەکیەی خواردووە. هاتەوە بەغدا. مەلامستەفا بردیە لای کاربەدەستانی دەوڵەت، دەستەبەر بوو کە ئەم پیاوە عراقییە؛ ترسی نەما. ئەویش وەک باسم کرد عەکاسی دەکرد و عەرەبیشی بۆ ڕادیۆ دەنووسی.

لە ساڵی ۱۹٦۱دا کە بارزانی دەگەڵ قاسم تێک گیران و شەڕ هەڵگیرسا، قزلجی زۆر دەترسا کە هەر چونکە بارزانی ئەوی بە دەوڵەت ناساندووە، بیگرن. منیش تازە لە موسکۆ گەڕابوومەوە. حیزبی کومۆنیستی عیراق بە من و قزلجییان ڕاگەیاند کە ئەگەر پێتان خۆش بێ لە ئەڵمان دادەمەزرێن و دەکرێنە مامۆستا لە دانشگا. من قبووڵم نەکرد؛ گوتم: ئەگەر لە ئەڵمان بام و بارزانی لە دەوڵەت هەڵگەڕاباوە، لەوێوە دەهاتمەوە. قزلجی قبووڵی کرد و ناردیان. بەلام لە باتی ئەڵمان بردیانە بولغاریا. وتاری توودەی دەکردە کوردی و دەگەڵ کەریم حیسامی تەسجیلیان دەکرد و لە سەر ڕادیۆ «پەیکی ئێران» لە ئەڵمانی ڕۆژهەلاتەوە دەخوێندرایەوە. دەمێک بوو ڕادیۆکە نەمابوو، هیچ خەبەرمان لە قزلجی نەبوو. لەپڕ سەر و کەللەی لە تاران پەیدا بوو؛ کە پاش سەرکەوتنی ئینقیلابی ئیسلامی، دەگەڵ «ئیحسان تەبەری» هاتبۆوە. لە سەر ڕۆژنامەی «مردم»ی توودە دامەزرا؛ بەشە کوردییەکەی بۆ دەنووسین. جار-جار دەهات لە کەرەج سەری دەدام، چەند ڕۆژێک پێکەوە دەژیاین. بەلام قەت ئادرێس و تەلەفۆنی خۆی نەدامێ! حیزبی توودە کردبوویە کاندیدای بۆکان لە ئینتیخاباتدا؛ لەوێ سەرنەکەوتبوو. تا لەپڕ خەبەر هات کە هەرکێ دەنکە جۆیەکی توودەی خواردووە گیراوە. بیستمانەوە کە قزلجی دەگەڵ «عەلی

---

۱- هێمن لە مەهاباد گوتبووی: هەژار موتەعەهیدە بۆیە نایەتە لامان! نەمدەزانی مانای «موتەعەهید» چییە! درەنگێک تێگەیشتم کە یانی ئەو پەیڕەوی ماڵە بارزانییە؛ بۆیە سەر وە بەر باری حیزب ناهێنێ.

گەلاوێژ» گیراون. تا لە ڕۆژی ٢٧ی سێپتامبری ١٩٨٤دا بیستمان کە لە زیندانی «ئێوین»دا وەفاتی کردووە و تەنانەت نەمانزانی قەبرەکەشی لە کوێیە...

«زەبیحی» - وەک باس کرا- دەگەڵ کۆمەڵی برایم و جەلال کاری دەکرد. کە ئەوانیش بوونە هەواڵی دەوڵەتی بەعسی، زەبیحی ڕێگەی دەرک و دیوانی بۆ کرایەوە. گەیشتە ڕادەیەک کە هاتوچۆی قەسری جمهووری دەکرد. جارێک -نەمزانی چۆن بوو- بێ سەر و شوێن بوو؛ دوو ساڵ خەبەریم نەزانی. لەپڕ هاتەوە سەر دنیا و گوتی لە ماڵێکدا حەپسیان کردبووم. دیسان وەقەدر کەوتەوە. «بەختیار» -کە سەرۆکی ئەمنی ئێران بوو- لە دژی شا چووبووە دەر و لەوێوە هاتبووە بەغدا. زەبیحی کرابووە وەکیلی دەوڵەت و یاریدەری بەختیار. کە بەختیاریش بە فیکسی شای ئێران کوژرا، دیسان هەر هاتوچۆی ژنی بەختیاری دەکرد و کاری لە دەوڵەت بۆ پێک دێنان. ڕۆژێک بە نیوەگاڵتەوە گوتم: ئەو بەختیارە فەقیرەت چۆن بە کوشت دا! تووڕە بوو، حاشای کرد. گوتم: کاکە تۆ دەتگوت هەرکەس لە ئێرانەوە بێتە لای بەختیار، تا من قۆڵی لە سەر نەکێشم و نەڵێم باشە، قبووڵی ناکا. دەیسا چۆن ماشین‌نووس و خزمەتکاری بەردەستی قبووڵ کرابوون؟ کە هەر ئەوانیش ساواکی بوون و لە دەشت بەختیاریان کوشت.

من لە شۆرش و ئەو لە بەغدا خەبەرمان لێک نەما. پاش شکانی شۆرش و هاتنمان بە دیوی ئێراندا و پاش ئینقیلابی ئیسلامی و شا ڕووخان، گوتیان: زەبیحی هاتۆتە مەهاباد شێخ عیزەدینی دیتووە. ڕۆژێک بە تەلەفۆن قسەی دەگەڵ کردم، گوتی: نازانم چۆنت ببینم؟ گوتم: ئەگەر ناتوانی بێیە کەرەج وەرە شارە گەورەکە... پاش ماوەیەک شەوێک لە بەغداوە تەلەفۆنی کرد؛ حاڵی پرسیم: گوتم: ئەوە ئەم هاتوچۆ و هەڵبەز-هەڵبەزەت لە چییە؟ بۆ فەرهەنگەکەت چاپ ناکەی؟، گوتی: ئەم زستانە چاپی دەکەم. گوتیان هاتۆتە لای برای شێخ عیزەدین (شێخ جەلال)، لە ڕێگە دیموکرات گرتوویانە و چەک و پارەیان لێ گرتووە و بەریان داوە. ئیتر ناوی نەما. پاشان گوتیان لە عیراق بەعسی کوشتوویانە. ئەویش زۆر ئەسەح نەبوو. تا خەبەری ئەسەحم دەس کەوت کە هاتووە بۆ ئێران و لە نزیک تەورێز گیراوە. ئیتر لەو ساوە ئەویش وەک وەفایی: ئاخری خێر بێ، دەمێکە بێ‌سەر و شوێنە...

لە سێ تفەنگداران جارێ هەر من ماوم. کوا بزانین من چۆن شرت و گوم دەبم؟ خوا ئەیزانێ...

مەحوی شاعیر دەفەرموێ:

بەجێ ماوم لە یاران، نابەجێ ماوم؛ ئەجەل زوو بە!

بە مردن لەم قوسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم، چ بکەم؟

شاعیرێکی عەرەبی بەر لە ئیسلامیش دەڵێ: «بە بیری من مردن کوێرێکە دەست دەکوتێ. ئەگەر کەسێکی وە بەر نەهات، تا زۆر پیر نەبێ نامرێ...».

لەم شێست‌وشەش-حەو ساڵەی تەمەنم ئەگەر بە باری ئاساییدا لێکی دەمەوە، ڕەنگە دەبوایە سەد جار بمردمایە. ئەوانەی بە منداڵی ناسیومن، لەو شوێنانەی لێم خوێندوون، لەو گوندانەی لێیان ژیاوم، لەو سەفەرانەی کردوومن و لەو هەمووو بەلایانەی بە سەرم هاتوون، هەزاران کەسم ناسیون کە ئێستا دەپرسم -تاق و وازێک نەبێ- نەماون و هەموویان مردوون. کەچی وا من هەر ماوم و بە دەردی شێخ ڕەزا گوتی: «سەگ مەرگم و گیان‌سەخت...».

بەڵێ جگە لە دوو تفەنگداری هەوەڵم، سەدان ڕەفیقەڕێگەم دنیایان بەجێ هێشتووە. خۆم لە

بەرد و هەڵەمووت هەڵداشتووە، نەمردووم. برسیایەتی زۆرم کێشاوە، بە نەخۆشی سیل و دیق و چەندین نەخۆشی تووش بووم، سەدان جار گوللە تۆپ و بۆمبام بە سەردا هاتووە، خەتەریتر تووش بووم و ئیستاش هەر ماوم. جا چۆن نەڵێم مەرگ کوێرە و پەل دەکوتێ؟ با بزانین کەی ئەم ژیانە گوواویە دەبڕێتەوە...

**من و کەرەج**

لە عومرمدا بۆ یەکەم جار ئەم ناوەم لە پێشمەرگەیەکی کوردی عیراقی بیست، گوتی:

- لە شاری کەرەج قەتارەکەمان هێندێک ما.
- لە کوێیە؟
- چل کیلۆمیتر لە تاران دوورە.
- لای غەربی تاران یان شەرق؟
- لە شەرق(!)

وەک باس کرا، لە پاش شکانی شۆرش هاتمە تاران. لە کەرەج خانووێکی شێر و خورشیدی ئەوسا یان هیلال ئەحمەری ئێستایان بۆ دەسنیشان کردم و چوومە تێی. کارێکم لە «پەژووهشی ئیرانزەمین- فەعالیەتهای فەرهەنگی» درایە. لە سەر پێشنیاری دوکتور فەرەهوەشی سێ رۆژ دەچوومە تاران و سێ رۆژ بە تەرجەمەی قانوونی ئیبنی سیناوە سەرگەرم بووم. جزمی یەکەمی سالی ١٣٥٧ی شەمسی لە دانشگا چاپ کرا. جاری دووهەم دام بە سرووش و تا ئێستا سێ جار چاپ کراوە. ئیتر تەرجەمەی قانوونیش هەر بوو بە ئەرکی ئیدارەی «فەعالیەتهای فەرهەنگی». جزمی دووهەمیش چاپ و تەجدید چاپ کرا. جزمی سێهەمی وا ئێستا لە سەرەتای سالی ١٩٨٧دا، ساڵ و نیوێکە لە چاپ دەرنەچووە! دەڵێن کاغەزمان نییە! جا نازانم بۆ جزمی چوارەم و پێنجەم - کە من تەواو تەرجەمەم کردوون- چۆن دەبێ، یا عومر!

فەرهەنگێکی فارسی بە کوردیم نووسی بە خەتی لاتینی باوی ئێران، لە پاشان گوتیان فەرهەنگی کوردی بە فارسی بنووسە. ماوەی چوار ساڵێک دەگەڵیا ماندوو بووم. فەرهەنگێکم نووسیوە پتر لە ٥٥ هەزار وشەی کوردییە و لە ئاخریاندا فارسیەکەم نووسیوە. ئەویش وا لە سەر تاقە داندراوە و سرووش دەڵێ چاپی دەکەم و من بڕوام نەکردووە. تاریخی ئەردەلانم لە چەند تاریخێکی بە فارسی نووسراو کردۆتە کوردی و ئەویش چاپ نەکراوە. وەک باسیشم کرد دوو کتێبی عەرەبی بە ناوی «تاریخی سولەیمانی» و «ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و میسر»م لە عارەبییەوە کردە فارسی و چاپ نەکران و هەر وا بێکەس مانەوە. تەنانەت «ڕەوابیتی فەرهەنگی»یەکەم هەر زیراکسیشم دەس نەکەوتەوە!

لە کتێبی «آثارالبلاد و اخبارالعباد» تەئلیفی «محەممەد مەحموود ئەلقەزوینی» کە جوغرافیای تاریخی دنیایە و لە زەمانی ئاخر خەلیفەی عەبباسیدا نووسرایە، هەرچی دەربارەی ئێران بووە کردوومەتە فارسی و ئەویش لەبەر بێ کاغەزی! چاپ ناکرێ.

«چوارینەکانی حەکیم عومەر خەییام»، دووسەد و پەنجام لێ کردوونە کوردی، هەر لە سەر کێشی فارسییەکە. جارێک لە عیراق لە چاپخانەی شۆرش لە چیا چاپم کرد. لەو دەمەوە لە ئێران لە لایەن «سەیدیانی مەهابادی» کە قەدیم بە «ابن‌الشیطان» مەشهوور بوو، دوو جاران بە بێ‌پرسی من چاپ کراوە. دوو جاریش لە سنە هەر بێ‌پرسی من لە چاپ دراوە و بلاو

کراوەتەوە. بەڵام دەوڵەت ئیجازەی بە خۆم نەداوە چاپی بکەمەوە!

لەساڵی ١٩٨٦دا تەواو نەخۆش کەوتم. کەوتە بیرم کە بۆچی تا ماوم کارێک دەگەڵ مەم و زینی خانی نەکەم؟ چوار نوسخەی لێک جیای چاپیم هەبوو کە «حەمزە» ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەمبوول و «سیدا ڕودینکۆ» ساڵی ١٩٦٢ لە لنینگراد و «بوزئەرسەلان» ساڵی ١٩٦٨ لە ئەستەمبوول بە لاتینی و «مام گیو» لە هەولێر چاپی کردبوو لە بەر یەکم ڕاگرتن. نوسخەیەکی ڕاستم لێ نووسینەوە و خەیاڵم کرد کە دەگەڵ مەم و زینە تەرجەمە موکریانیەکەی خۆمدا لە چاپیان بدەم. بەڵام تا ئێستا بۆم نەلواوە. با بزانین چۆن دەبێ. کە وا بوو لێرەدا بێ جێی نازانم هەموو نووسراوەکانم -چاپ کراو و چاپ نەکراو- ئەوی تا ساڵی ١٩٨٧ نووسیومن بۆتی بنووسم:

١- «ئاڵەکۆک»: کۆمەڵە شیعرێکی زەمانی «کۆمەڵەی ژێ-کاف»، لە تەورێز ساڵی ١٩٤٥ لە لایەن «ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و شۆرەوی» لە تەورێز چاپ کراوە و بە ئازەری و ئەرمەنی و هێندێکی بە ڕووسیش تەرجەمە کراوە.

٢- «بەیتی سەرەمەڕ و لاسایی سەگ و مانگەشەو»: کۆمەڵە شیعرێکی هەزار بەیتییە. لە «شام» بە قاچاغ چاپ کراوە.

٣- «مەم و زینی خانی» بە موکریانی: ساڵی ١٩٦٠ لە بەغدا چاپ کراوە و ساڵی ١٣٥٧ی هەتاوی (١٩٧٩ی زایینی) ئۆفسێت کراوەتەوە.

چوار نامیلکەی «دوکتور عەلی شەریعەتی»، لە فارسیەوە کردوومە کوردی و لە تاران چاپ کراون:

٤- «یەک لە پەنای خاڵ و سیفری بێبڕانەوە».

٥- «ئاری برا، وا ڕابرا».

٦- «عیرفان، بەرامبەری، ئازادی».

٧- «دایە! باوە! کێ خراوە؟».

٨- «تاریخی سولەیمانییە»: لە عەرەبیەوە بۆ فارسی. چاپ نەکراوە.

٩- «ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و میسر»: لە عەرەبیەوە بۆ فارسی. چاپ نەکراوە.

١٠- «هۆزی لە بیرکراوی گاوان»: لە عەرەبیەوە بۆ کوردی. ساڵی ١٩٧٣ لە بەغدا لە سەر ئەرکی کۆڕی زانیاری چاپ کراوە.

١١- «شەرەفنامە» بە کوردی: کۆڕی زانیاری ساڵی ١٩٧٣ بڵاوی کردۆتەوە.

١٢- «دیوانی مەلای جزیری» بە شەرحەوە: ساڵی ١٣٦١ی هەتاوی (١٩٨٢ی زایینی) لە تاران لە چاپخانەی سرووش چاپ کراوە.

١٣- «فەرهەنگی فارسی بە کوردی». چاپ نەکراوە.

١٤- «فەرهەنگی کوردی بە کوردی». چاپ نەکراوە.

١٥- «تاریخی ئەردەلان»: لە فارسیەوە بۆ کوردی. چاپ نەکراوە.

١٦- «آثارالبلاد و اخبار العباد»: لە عەرەبیەوە بە فارسی. چاپ نەکراوە.

١٧- نامیلکەیەک بە ناوی «پێنج ئەنگوست دەبنە یەک مست»: لە فارسیەوە بۆ کوردی، بۆ مناڵاتە. دوو جار: ١٣٥٩ و ١٣٦٢ی هەتاوی (١٩٨٠ و ١٩٨٣ی زایینی) لە تاران، لە «مەکۆی ڕاهێنانی هۆش و بیری مناڵ و ڕۆڵان» چاپ کراوە.

١٨- «چوارینەکانی عومەر خەییام بە کوردی»: لە شۆڕش چاپ کراوە و لە ئێران بە دزی

منەوە چوار جار چاپ کراوەتەوە!

١٩- «هەژار بۆ کوردستان »: دیوانی شیعرە. لە عیراق دوو جار چاپ کراوە و لە ئێران تەجدید کراوەتەوە.

٢٠- «قانون در طب»: (تەرجەمە لە ئەبووعەلی سیناوە بە فارسی)، جزمی یەکەم، کە تا ئێستا سێ جار چاپ کراوە.

٢١- «قانون در طب»: (تەرجەمە لە ئەبووعەلی سیناوە بە فارسی)، جزمی دووهەم، کە دوو جار چاپ کراوە.

٢٢- جزمی سێهەم

٢٣- جزمی چوارەم

٢٤- جزمی پێنجەم لە «قانون در طب» کە هێشتا چاپ نەکراون.

٢٥- «مەم و زینی خانی»: عەسلەکەی بە ماناکردنەوەی وشە گرانەکان و ئیستلاحە موشکیلەکانیەوە لە نوسخەیەکی دروست دا.

جگە لە مانەش زۆرم مەقالات و شیعر لە زۆر ڕۆژنامە و گۆڤاراندا چاپ کراون و نازانم لە کوێن. کە لەوانە دەکرێ بڵێم لە ڕۆژنامەکانی: «خەبات»، «کوردستان»ی زەمانی قازی، «کوردستان»ی برای «خەبات»، مەجەللەی «هەلالە»، گۆڤاری «ڕووناهی» لە بەغدا، «هێوی»، ڕۆژنامەی عومەر جەلال کە وابزانم «چرای کورد» بوو، «کومسە مولسکی پراڤدا»، گۆڤاری «لیتیراتور ئی ژیزن»، کە بە ناوێکی‌تر چاپ کرا. «ڕێگەی گەل»، «نووسەری کورد» و زۆری‌تریش کە ئێستا لە بیرم نەماون. لە سروەشدا چەند مەقالێکم هەیە، لە پێشەنگیشدا هەروەها. هەر وەک وت‌ووێژێکیشم دەگەڵ «پێشەنگ» هەیە و چاپ کراوە.

لە ئاخر و ئۆخری پاییزی ساڵی ١٩٨٦ دەگەڵ «مەعسووم» چووینە پاریس، بووینە میوانی ڕەسووڵی برام کە ئێستا ژنێکی ئێرانی و کوڕێکی هەیە چوار ساڵان بە ناوی «دیاکۆ». سەفەری پاریسم بۆیە خۆش بوو کە دەگەڵ «ئەنستیتوی کوردی پاریس» و کاک کەنداڵی مودیری بوومە ئاشنا. ڕۆژانە هات‌وچۆی ئەو شوێنە پیرۆزەم دەکرد. ئەو شوێنە لە پاریس بە هاوکاری «یەڵماز گۆنەی» و «کاک کەنداڵ» دامەزرا. «یەڵماز گۆنەی» بڕیاری داوە کە هەرچی داهاتی فیلمەکانیەتی لەوێی خەرج بکا. کەنداڵیش کە یەکێکە لە زانایانی مەشهووری فیزیک، هەموو هێزی خۆی لەو بارەوە سەرف بکا. بەڵام داخی گرانم «یەڵماز گۆنەی» مردن مەودای پێ نەداوە و جوانەمەرگ بووە.

شوێنەکە لە چاکترین جادەی پاریس واتا «لافاییێت» دامەزراوە. بە هەزاران کتێب، بلاڤۆک، ئەفلامی ویدیۆ، کاسێتی وەرگێڕاو لە هەموو بابەتەکانی سەر بە کوردستانی تێدا کۆ کراوەتەوە. دەوڵەتی فەرەنسەی سۆسیالیست زۆر یارمەتی ئەو شوێنەی داوە. جگە لە ئەساسیە، ساڵانە هەشسەد هەزار فرانکی یارمەتی کردووە. بەڵام دوای ئەوە کە دیگۆڵیە دەستە ڕاستیەکان هاتوونە سەر کار، پاش دیدارێکی وەزیری دەرەوەی تورکیە، ئەو کۆمەکەیان بڕاوە و کەوتوونەتە بێ‌پووڵی و دەست‌تەنگی. ملیۆنێری کورد لە ئورووپا و شوێنی‌تر یەکجار زۆرن؛ بەڵام کورد فێری ئەوە نەبووە کە سەری خۆی بەو شتانەوە بێشێنێ! یارمەتی ناکەن. هەر چۆنێک بێت چاکترین جێگەی کۆ کردن و ڕاگرتنی کلتووری کورد لەو شوێنەیە.

لە سایەی هات‌وچۆم بۆ ناو ئەو مەرکەزە گرینگە، دەگەڵ زۆر کوردی دڵسۆزی فیداکار بوومە

ئاشنا. بە تایبەتی کاک شەوقی، تەیموور و زۆریتریش. بەر لەوە بڕۆم بۆ پاریس، مەم و زینە عەسلیەکەی خانیم بە مانا لێدانەوە لە تایپ دا. نوسخەیەکم نیشانی کاک ئیدریس بارزانی دا؛ خوێندبوویەوە. قەراری دا لە ئورووپا چاپ بکرێ. نامەیەکی بۆ مامۆستا پیرۆت لە «ڤیەن» نارد و کتێبەکەشی بۆ نارد کە بە زووترین کات - بە هەر نرخێک بێ‌بە چاپی بگەیەنێ. پاش ١٧ ڕۆژ تەئخیر توانیم تەلەفۆنی پیرۆت وەرگرم. قەرار درا پێکەوە حەولی لە چاپدانی بدەین. بە هۆی کاک کەندالْ کەوتمە پرس و ڕا، گوتیان زۆر جوان چاپ بکرێ، دووسەد و چل هەزار فرانکی تێ دەچێ. کە لێکم دایەوە بە پوولی ئێران دەیکردە سێ ملیۆن و ئەوەندە تمەن. دەمزانی ئەو پوولە بۆ ئیدریس هەلْناسوورێ. کەندالْ گوتی ئێمە ماشینێکی چاپی کامپیوتر دەکڕین بە حەوت هەزار دۆلار، مەشغوولی دەبین بەلام جارێ پوول نییە.

وەختێ هاتمەوە کەرەج، بە ئیدریسم گوت با ئەو حەوت هەزار دۆلارە تەرتیب کەین. گوتی شەرتە ئەگەر حیزبیش موافقەت نەکا، من خۆم تەرتیبی دەکەم. بەلام دوو ڕۆژ دوای ئەم وتوویژە، ئیدریس بە سەکتەی قەلبی مرد و ڕیسەکەم بۆوە بە خوری.

لەو سەروبەندەدا کە لە پاریس بووم، کۆبوونەوەی لاگرانی ئەنستیتۆ بوو کە لە هەموو لایەکی ئورووپاوە بێن. زۆر کەس لەبەر ویزا دەس نەکەوتن؛ نەهاتن. لە سوێدەوە چەندێک هاتن و لە ئەلمان و شوێنیتریشەوە هاتبوون. لە کۆبوونەوەکاندا شرکەتم دەکرد. ڕۆژی دوایی گوتیان بڕیار وا بووە «دوکتور عیسمەت شەریف وانلی» ڕەئیسی جەلسە بێ، نەخۆشە و ناتوانێ بێ. کە وا بێ با «هەژار» ئەم ڕیاسەتی جەلسەیە وە عۆدە بگرێ و قسەی خەلاس بوونی کۆبوونەوە ئەو بیکات.

لە جەلسەی تایندا من زۆر بە ڕاشکاوی تێرم گلە و گازن لە کورد کرد کە بابە ئەو هەموو حیزب-حیزبە چییە هەتانە؟ ئێمەی کورد لە هەموو لاوە بەر پەلامار دراوین کە خەریکن توخم و تۆممان ببڕنەوە و بە دەردی سوورپێستەکانی ئەمریکا بچین. ئەو هەموو حیزبە کە هەمووشی دژی یەکترە بۆ چییە؟ جاران دەمانگوت شێخ و ئاغا لێ ناگەڕێن ئازاد بین، ئێستا حیزبەکان لە شێخ و ئاغا خراپترن و زۆرتریشن! وەک خەلکی قورەبەرازمان لێ هاتووە: بە دوازدە ئاغا ڕەعیەتێکیان هەبوو! وەختە ناوی حیزبەکان لە هەموو کورد زیاتر بێ. بابە پیاوی چاک بن! ئێمە بێکەس و ڕووت لە دەشتێک لەبەر باران و بەفر ماوین، جارێ با پەنایەک دروست کەین سەرما نەمانبا، ئەوسا لە سەر ڕەنگ کردنەکەی، سوور بێ یا شین و زەرد بێ، شەڕ دەکەین... خولاسە زۆرم هەموو لایەک شێلا.

لە لایەن ڕۆژنامەی «کوردستان پرێس» و فەرهاد شاکەلیشەوە چەند وتوویژێکم دەگەلْ کرا.

هەرچەند ئیدریس سپاردبووی کە پیرۆت لە خەرجیدا یاریدەم بدا، بەلام ئەوی ڕاست بێ ئەگەر دوکتور «عەزیزی فەیزنەژاد» لە ئەلمانەوە یارمەتی نەدابام، لام وایە ڕەزیل دەبووم. خوا جەزای بەخێری بداتەوە.

کاک حەمەی عەزیزیش هات چەند ڕۆژێک میوانمان بوو. بە دیداری زۆر شاد و شوکور بوومەوە.

لەو سەفەرە پەنجا ڕۆژم پێ چوو. لە چەند مالێک لە پاریس دەعوەت کراین: مالی «نازیە خانم» (خوشکی کەندال)، «نازێ خانمی شافعی» و «کەمالی داودی». چەند جارێکیش نانمان لە مەتعەمێکی کوردی کرمانجی خوارد؛ کە ئاشپەزەکە ژنێکی مەهابادی بوو.

**کۆتایی**

ئەگەر بە چاوی ڕخنەوە چاو لە چێشتی مجێور بکەین، بە بۆچوونی من یەک لەو شتانە کە هەڵدەگرێ بەر ڕخنە کەوێ، چۆنیەتی دوایی هاتنی کتێبەکەیە. خوێنەر وا هەست دەکا مامۆستا قەڵەمەکەی داناوە چاییەک بخواتەوە، وچانێک بدا و ئەمجار دەستپێبکاتەوە؛ کەچی بە یەکجاری تەواو! زیاد لەوەش بە داخەوە سێبەرێک لە پەژارە و دڵگرانی، ئەم دواییانەی داگرتووە؛ کە بۆ کتێبێکی وا هێژا، زۆر حەیفە بە دڵساردی و ناتەواوی دوایی بێت.

وەک خوێندمانەوە، مامۆستا هەژار چێشتی مجێوری ساڵی ١٣٦٢ک. (١٩٨٣ز.) نووسیوە و سێ ساڵ لەوەدوا، ساڵی ١٣٦٥ک. (١٩٨٧ز.) پێیدا چۆتەوە. دەشزانین کۆچی دوایی مامۆستا ڕۆژی دووهەمی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٩ی کۆچی (١٩٩١/٢/٢١ز.) رووی داوە؛ یانی دەوری چوار ساڵونیو پاش نووسینی ئاخر دێڕی ئەم کتێبە. ئاخۆ ئەو ماوە چۆناوچۆن بەسەر چووبێ؟

لەڕاستیدا ئەو چەند ساڵەی ئاخری ژیانی مامۆستا، یەکجار پڕپیت بوو. زۆربەی کتێبەکانی لە چاپ دران و بلاو بوونەوە. بۆ خۆشی زۆر پڕکار بوو؛ شەو و ڕۆژی نەدەناسی و ئاوڕی لە خواردن و خواردنەوە نەدەداوە. دادە مەعسووم لەگەڵ ئەم بارەشی ڕاهاتبوو؛ لە پەنای دادەنیشت و پارووی لە زاری دەنا. جارێکیان دوای نان خواردنەکە، پرسیم: ئەرێ مامۆستا ئەم ژەمە چمان بوو؟ هەر چەند بیری کردەوە نەیزانی!

لەم کتێبەدا چەند جار ناوی دادە مەعسووم هاتووە و مامۆستا ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی خۆی بەرامبەر بەو دەربڕیوە؛ بەڵام بە بڕوای من لەبارەی کەسایەتی ئەو ژنە وەفادارە فیداکارەوە، کەم گوتراوە و زۆری ماوە. بۆ کەسێک بەو ماڵەوە نزیک دەبۆوە، دەردەکەوت کە ڕەمزی ئەو هەموو بڕشت و سەرکەوتوویی مامۆستایە، دادە مەعسوومە.

مامۆستا هەر کارێکی تازەی بە دەستەوە دەگرت، دادە مەعسووم ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی هەموو شتێک تەنانەت دەرکەوانی و هێنانە ژوور و بەڕێ کردنی میوانی بێئەژماری ماڵ وەئەستۆ گرێ؛ لەگەڵی شەونوخسی بکێشێ؛ لێی دوور نەکەوێتەوە، نەوەک شتێکی پێویست بێ. چارەکە سەعاتێک جارێ چاییەک، ئاوێک، میوەیەکی بۆ بێنێ. ئەگەر لێت بپرسیبا کارەکە گەیشتۆتە کوێ، بە وردی دەیزانی چەند لاپەڕەی چووە و چەندی ماوە و ئێستا خەریکی چییە! وای دەکرد مامۆستا کاری بەسەر هیچ شتێکەوە نەبێ؛ ئارخەیان دانیشێ و شانی لێ شل کا و خەریک کار بێ و بەس.

بەڵێ مامۆستا هزر و بیرێکی یەکجار بەقەوەت و قووڵی هەبوو، بەڵێ ئاگای تەنبەڵی نەدەزانی و قەت لە کار ماندوو نەدەبوو، بەڵام ئەگەر هاوسەرێکی وای نەبوایە، چۆن دەیتوانی بە بیری بڵاو و ئاڵۆزاوە، لە سەرینەی ئەرکی ماڵ و میوان و هەزار بەزم و ڕەزمیتر، بە ڕۆژ و شەو کار بکا و ئەو هەموو کارە بایەخدارە بەرهەم بێنێ؟

ڕستەیەکی شکسپیرە دەڵێ: «ئەگەر پیاوێکی زۆر گەورەتان بینی، لە سێبەری پشتەسەریدا شوێن ژنێکی گەورەتر بگەڕێن!». بریا ژیانی ئەو شێرەژنەش دەبووە کتێبێک بۆ دەرس لێ وەرگرتن و چاولێبڕینی هەموو ژن و پیاوێک.

***

مامۆستا هەژار بەرنامەیەکی خۆشی هەبوو: ئەگەر کارێکی تەواو دەکرد، نەوارێکی «ماملێ» یان «شەجەریان» یان «ئوموکولسووم»ی ئەخستە سەر و دەنگی بڵیند دەکرد. ئەمجار

خەبەری بە دۆستانیشی دەدا. جار-جار تەلەفوونێکیشی بۆ من دەکرد. جا کە گووشیم هەڵبگرتایە و یەک لەو دەنگانەم ببیستایە، دەمزانی کارەکە دوایی هاتووە و ئەورۆ ماڵی مامۆستا جێژنە! ئاوم بە دەستەوە بوایە دامدەنا و خۆم بەو جێژنە پیرۆزە دەگەیاند.

لەم دواییانەدا منیش فێر ببووم. هەرکام لە کتێبەکان لە چاپ دەردەچوون، بە تەلەفوون ڕامدەگەیاند: قوربان با ماڵیێ بخوێنێ؛ میوانێکی خۆشەویستت بۆ دێ!

چاپی تەرجەمەکەی قانوونی بووعەلیسینا بە فارسی لە حەوت بەرگدا بە جوانترین شێوە، وەک ڕووداوێکی گەورەی فەرهەنگی، لە ئێراندا دەنگی دایەوە و مامۆستایانی ناوداری فارسزمان، بە ئافەرین و سەرسووڕمانەوە باسی ئەم کارە گەورە و گرانەیان دەکرد؛ کە چۆن پاش هەزار ساڵ زانایەکی کوردزمان لە خۆی ڕادیوە دەست بۆ ئەم کارە دژوارە بەرێ و تێیدا وەها ئوستادانە سەرکەوێ. تەنانەت مەجەللەی مانگانەی «*کیهان فرهنگی*» کە ئەودەم ناسراوترین گۆڤاری وێژەیی- فەرهەنگی ئێران بوو، ژمارەیەکی بۆ ناساندنی مامۆستا بە کۆمەڵی بیرەوەران و زانایانی ئێران تەرخان کرد.

چاپی فەرهەنگی «*هەنبانە بۆرینە*» -کە ئێستاش پاش نزیک بە بیست ساڵ، باشترین فەرهەنگی کوردی بە کوردییە- پلەی بەرزی کوردیزانی و وێژەوانی مامۆستای زیاتر لە پێشوو دەرخست و لە هەموو لایەکەوە بارانی نامە و تەلەفوون بوو بۆ سپاس لەو خزمەتە گەورەیە.

«*مەم و زین*»ی خانی، بە شەرحە کرمانجییەکەیەوە و بە شێوازێکی ڕازاوە، هەر لە ئورووپا چاپ کرا و مامۆستا بەو ئاواتەشی گەییشت.

«چوارینەکانی خەییام»یش دیسان لە چاپ درایەوە و لە دوو مانگدا دەهەزار نوسخەی لێ فرۆشرا.

لە پاییزی ٦٨ (٨٩) دا، مامۆستا وەرگێڕانی قورئانی دەسپێکرد و ماوەی نۆ مانگ شاکارێکی بەدیاری بۆ گەلەکەی بەجێهێشت، کە بە بڕوای زورێک لە وێژەوانان، لە ئەدەبیاتی جیهاندا دەگمەنە.

سەرجەمی ئەمانە و ئی تریش، بوو بە هۆی ئەوە کە ناوی «ئوستاد هەژار» -وەک لە بەغدا- لە هەموو شوێنێکی ئەدەبی و فەرهەنگی تارانیشدا بەوپەڕی ڕێزەوە بێتە سەر زاران و یادی لێ بکرێ.

مامۆستا بۆ خۆشی بەو هەموو تاڵی و سوێرییەوە چەشتبووی و بەو گش گەرمی و سەردییەوە کێشابووی، تا دوامین ڕۆژی ژیانی تەواو دڵ زیندوو و دەم بە پێکەنین بوو. با ئەم دوو نموونەتان تۆ بگێڕمەوە:

* کاری مامۆستا سەر لە هەوەڵەوە، لە «واحد فعالیت‌های فرهنگی» بوو. پاشان بڕیار درا بێتە دەزگای چاپ و بلاو کردنەوەی «سرووش»؛ کە ئەمیش هەر سەر بە ڕادیۆ- تەلەڤیزیۆن بوو. ئەمجار قسە هاتە سەر ئەوە کە زۆر حەیفە مامۆستا کاتی بە هاتوچووی تاران و کەرەجەوە بڕوا. با لە ماڵ بێ و بە هاوکارێکدا کاری بۆ بنێرین و بۆمان بنێرێتەوە. هاوکارەکە برادەرێک بوو «زیرەک» ناو، خەڵکی شاری ڕەشت لە باکووری ئێران کە ماڵی لە کەرەج بوو. هەموو جارێک ئەوی پێویست بوو مامۆستا بیبینێ، بە ئاغای زیرەکم دەدا. مامۆستاش هەرچێکی دیتبوو پێی دەداوە؛ بەیانی کە دەهاتەوە، دەیهێناوە. جارێکیان دێر چووبوو، چۆن بوو، ئەگەر کارەکەی هێناوە و کردمەوە، دەبینم بەیتێکی فارسی لەسەر نووسیوە:



حقـا که با عقـوبـت دوزخ برابر اسـت            رفتن به پای زیرک رشتی سوی سروش![1]

* ڕۆژێک لە مالیان بووم، مامۆستا محەممەدی قازی و چەنـد کەسێکی‌تـر هـاتن. مامۆسـتا قـازی پێـشتر نەخۆشـی شـێرپەنجەی گـەروو تـووش ببـوو؛ تالـە دەنگـدەرەکانی گـەروویان دەرهێنابوو. بەو بۆنەوە قسەی ئاسایی پێ نـەدەکرا؛ ئـامرازێکی بـە لاملیـەوە دەنـا و دەنگێکـی نائاسایی لێ دەردەهێنا. بەو حالەش گفتی خۆشـی دوایـی نـەدەهات. ئـەوی جـۆک و نوکتـە و لەتیفەی تازە و کەس نەبیستوو هەبوو لە لای بوو؛ بێوچان و یـەک لـەدووی یـەک دەیگێـڕاوە. ڕۆحی شاد، بەڕاستی مەجلیسی خۆش بوو.

ئەو ڕۆژە دەوری نیوسەعاتێک لەسەریەک قسەی خۆشی کرد؛ تا باتری ئامرازەکەی تەواو بـوو. دەستی برد لە کیفەکەی یەکێکی تازە دەربێنێ و تێی‌بخاتـەوە، مامۆسـتا هـەژار گـوتی: ئەگـەر کەسێک ڕستەیەک، وشەیەکی هەیە، فرسەتە؛ دەنا تێی‌خستەوە هەیهاتە نۆرەی قسە بـە کـەس بدا! ئەمجار ڕووی کردە مامۆستا قازی و وتی: کاک قـازی وەڵـلا کـاری تـۆ بـەم وردە و پردانـە بەڕێوە ناچێ؛ بابە تۆ دەبێ باتری تەراکتۆر هەلگری!

ڕاستە مامۆستا نەخۆش بوو؛ لەشی - لەچاو تەمەنی- زۆر پیر ببوو. بەلام تا ئاخر ساتی ژیـانی گۆچانێکیشی هەڵنەگرت و بۆ بەڕێوەبردنی خۆی، پێویستی بە یارمەتی کەس نەبوو.

دادە مەعسووم دیگێڕێتەوە: بەیانی ئەو ڕۆژە کە لە خەو هەستام دیـتم هێـشتا هەڵنەسـتاوە؛ بەلام بەخەبەر بوو. پرسیم هەڵناسی؟

- بەلێ، بۆچی. هێندێک قورسم.

هەستا، ئاوێکی بە سەر و چاویدا دا و چاییەکی خواردەوە؛ بەلام هیچی‌تری پێ نەخورا. گـوتم با دوکتورێک خەبەرکەم. وتی نا، بۆ خۆم دەچم.

ماشینێکمان بانگ کرد و ڕێ کەوتین. دەوری سـەعاتێک بـەڕێوە بـووین تـا گەیـشتینە لای دوکتور حەیدەری لە تاران. خەبەریان دایە هاتووین، بە دەممانـەوە هـات و بردینیـە ژوورێـک و داوای کرد ڕاکشێ تا نەخۆشێک لەو دیوە، دەیبینێ و دێتەوە. بۆ خۆی کەوشـی دەرهـاورد و لـە سەر تەخت ڕاکشا. پاش پێنج- شەش دەقیقە دوکتور هاتەوە.

- دەی مامۆستا گیان! چۆن بووە تەشریفت هێناوە؟

جواب نییە. تەمەشا دەکا هەزار ساڵ!

تەرمی مامۆستا گوێزرایەوە مەهاباد و لە پەنای مامۆستا هێمن و مەلا غەفووردا نێژرا. ئەو ڕۆژە و سێ ڕۆژی پرسەی لە مزگەوتی سووردا، شتێک زۆر بەرچاو بوو: هەموو کوردێک - بە هەر بیر و بۆچوونێکەوە- هاتبوون. کەسانێک بە چاوی سوورەوە سەرخۆشییان لە یـەک دەکـرد کـە تـا دوێنێ بە دژمنی قەستەسەری یـەک دەناسـران. دیـار بـوو - وەک هـەموو ژیـانی- مەرگیـشی ڕەمزی یەکگرتن بوو.

هەزار درووود و ڕەحمەت لە گیانی پاکی.

---

١. بە کوردی ئاوای لێ دێ:

ڕاست هەر وەکوو جزیای جەهەننەم وایە      چوون بۆ سرووش بە پێی زیرەکی ڕەشتی!

بەیتەکە لە گولستانی سەعدیدایە؛ دەلێ:

حـــقـا کـه بـا عقـوبت دوزخ برابر اسـت      رفـتن بـه پـایمردی هـمسایه در بـهشـت

# ناونامه

## ب

## چ



## ح

## خ

## ش

## غ

ک



گ

## و



## ه



## ی



حاجی مەلا محەممەدی بۆر (بابی مامۆستا هەژار)



فەقێ ڕەحمانی تازە لاو



هەژار (عەبدوڕەحمان شەرەفکەندی) لە سەردەمی کۆماری مەهاباد



عەزیز قادری وێنەگر (مامۆستا هەژار)



پاش نۆسالآن یەک گرتنەوە، هەژار، مەعسووم، محەممەد (شێرکۆ)



سەردانێکی ماڵ و چاوپێکەوتنی ژن و منداڵان، مستەفا (ئاگری)، زاگرۆس، خانی و مەعسوومخان



وەکوو پێشمەرگەیەک لە شۆرش



مامۆستا هەژار، ماجد، دادە مەعسووم



له ڕاستەوە مامۆستایان: حەقیقی، ئاوات، هەژار



مامۆستایان: هەژار و محەممەدی قازی



مامۆستا هێمن، فرانسوا حەریری، مامۆستا هەژار



مامۆستا هەژار، ماجد، مامۆستا هادی مورادی



قازی محەممەد لە دەفتەری لە مەهاباد



ژنراڵ بارزانی و پێشەوا قازی



بارزانی، وەکوو پێغەمبەرێک لە ناو ئومەتەکەیدا



مەلا مستەفا بارزانی و مەسعوود بارزانی لە چیای هەندرێن



بارزانی و کوڕەکانی، لە ڕاستەوە: مەسعوود، ئیدریس و سابیر



مەلا مستەفا، ئیدریس و لە پشتەسەریان فرانسوا حەریری



بارزانی و عەبدوڕەحمان عارف، دوای شەری هەندرێن



لە ڕاستەوە: شێخ لەتیف، مەلا مستەفا، سەلیم فەخری و مەلا عەبدولباقی



له ڕاستەوە: سەدام حوسێن، بارزانی، فوئاد عارف، له ڕیزی دواوە: هەژار و نووری شاوەیس



له ڕاستەوە: سەدام حوسێن، مەسعوود بارزانی، ئەحمەد حەسەن بەکر، ئیدریس بارزانی و مەحموود عوسمان



کارنامەی ژیان: دەستێکی پڕ لە کتێبی هێژا بۆ کتێبخانەی کورد



دنیا ئەوەندە ناهێنێ ...



تەرمی مامۆستا لە سەر دەستان



هەموو هاتوون...



گڵکۆی مەلا مستەفا و ئیدریس لە بارزان



گڵکۆی هەژار لە مەهاباد. لای کەم با لێرەدا لە پەنای یەک بن

... سەر لە هەوەڵەوە لەو شاگرد گارسۆنییە بە خۆمدا دەشکامەوە؛ بە شەرمەوە ئامان ودەفرم لە پێش موشتەری لادەبرد؛ بەزەشم بە خۆمدا دەهات. بەیتێکی مستەفا بەگی کوردیم هاتەوە بیر کە دەڵێ:

**سەبا یارانی مەجلیس گەر دەپرسن حاڵی زارم لێت**
**بڵێ کێشایە مەیخانە دوو چاوی بێچووە عەیاریک**

بێچووە عەییاری ئەو شاعیرە، بەچکە ئاغایەکی لووسکە بووە. بێچووە عەییاری من، کوردستان و چەندین ملیون کوردی لێ قەوماوە؛ بۆشی بچمە سووچی مەیخانە و لەوەش ڕەزیل‌تر بم، جێ شانازیمە. ئیتر بە ڕاستی ئەم بەیتە شیعرە، شەرم و تەقیەی لابردم و زۆر بە ڕاشکاوی کاری خۆم دەکرد ...

ل. ١١٢ و ١١٣

Kitêbi Mehregan